# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک



## مێژووی تەعریب لە کەرکوک

مێژووی ئەو کۆمەڵە وڕێکخراو و حیزبانەی لە ناوچەی کەرکوکدا سەریان هەڵداوە.

ئەو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانەی سەردانی کەرکوکیان کردووە.

سەرپەرشتیاری گشتی نووسین و پێداچوونەوە

سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

بەرگی سێیەم



# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك

## بەرگی سێیەم

- مێژووی تەعریب لە کەرکوك.
- مێژووی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراو و حیزبانەی لە ناوچەی کەرکوکدا سەریان هەڵداوە.
- ئەو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانەی سەردانی کەرکوکیان کردووە.

سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە
سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

٢٠٢٣

دەزگای رۆشنبیری جەمال عیرفان

بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری
جەمال عیرفان ٢٠٢٣
زنجیرە: (١٤٠)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

**ناوی کتێب: ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك- بەرگی سێیەم: - مێژووی تەعریب لە کەرکوك- - مێژووی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراو و حیزبانەی لە ناوچەی کەرکوکدا سەریان هەڵداوە - ئەو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانەی سەردانی کەرکوکیان کردووە**
**نووسینی: کۆمەڵێك نووسەر**
**سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)**
**سەرپەرشتیاری زانستی و ئەکادیمی: د. یوسف گۆران**
**سەرپەشتیاری کارگێڕی: زاهیر شکور**
**دیزاینی ناوەوە: بورهان عەبدولکەریم عەلی - ئەنجام سەعید**
**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**
**تایپ: بێریڤان پیشتیوان - زەینەب حەمید**
**نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٣**
**تیراژ: ٥٠٠ دانە**
**چاپ: چاپخانەی تاران**

**لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی (٢٠٠٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە**

Tel: 0533202936 07736959302
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر قەیوان تاوەر

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك

## بەرگی سێیەم

- مێژووی تەعریب لە کەرکوك.
- مێژووی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراو و حیزبانەی لە ناوچەی کەرکوکدا سەریان هەڵداوە.
- ئەو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانەی سەردانی کەرکوکیان کردووە.


نووسینی:

سنوور سەباح سدیق
د. سەعدی عوسمان هەرووتی
ژیلوان لەتیف یار ئەحمەد
سمکۆ بەهرۆز محەمەد
هیوا حوسامەددین



٢٠٢٣

## بەشی یەکەم

# مێژووی تەعریب لە کەرکوك

سمکۆ بەهرۆز

*** چەمکی تەعریب لە کەرکوك:**

لە هەڵسەنگاندنی ڕووداوە مێژووییەکاندا، گەلێك چەمکی جۆراو جۆر هەیە کە دەرهاویشتەی ئەو ڕووداو دەسەڵاتە سیاسیانەیە کە دەسەڵات یان فەرمانڕەواییان دەسەڵاتی ڕەهایان وای کردووە کە ببێتە بنەمایەکی گرنگ لە دەست بەسەراگرتنی هەموو ئەو بنەمایانەو تواناکانیان لە توانەوەی دەسەڵاتەکانیان گەلێك ڕێبازو شێوازییان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی کە دەسەڵاتە فراوانەکانیان شەرعیەتو بەردەوامی خۆی هەبێت.

ئەو چەمکی دەسەڵاتانە خۆی گونجاندووە لەگەڵ جۆری شێوازەکانیان و توانییویانە ئەو شێوەیە لە فەرمانڕەواییان تا ماوەیەکی دوورو درێژ بنەمای خۆی بگرێت.

ڕاگواستن، تەعریب (عەرەباندن– بەعەرەبکردن)، پاکتاوی نەژادی، ئەنفال، جینۆساید، تەتریك، تەفریس هەموو ئەمانە لەو چەمکانەن کە دەوریان هەبووە لە سڕینەوەی نەتەوەیی ئاینیی نەتەوەیەك بەسەر نەتەوەیەکی تردا.

"کاتێك مرۆڤ لە مێژووی کورد وەکو گەل و نیشتمان وورد دەبێتەوە، زۆر بە ڕوونی بۆی دەردەکەوێت کە کورد وەکو نەتەوە بە درێژایی مێژوو دووچاری سیاسەتی جۆراوجۆری قاتو قڕیو چەوساندنەوەو سڕینەوەی مۆرکی نەتەوایەتی هاتووە، دەتوانین بڵێین هیچ میللەتێك وەك کورد لەم جیهانە تووشی نەهاتووە، وەك ڕاگواستنی بە کۆمەڵو پرۆسەی تەعریبو ئەنفالو ڕووخاندنی دێهات تا ڕادەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی، کە ئەمانە ئامراز گەلێکن، بوونە ڕێبازو ڕێـڕەوی هەموو حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بەبێ جیـاوازی، بۆیە ئێمە لێرەدا هـەوڵ دەدەیـن بەپێی توانا پێناسەو ڕاڤەی گرینگترین چەمکی ئەو سیاسەتانە بکەین"(١).

"نیشتمانی کوردان بەر لە هاتنی عەرەبە موسڵمانەکان، بەسەر دوو ئیمپراتۆریەتی زل هێز (ساسانی– بیزەنتی)دا بەشکرابوو، هەرچەندە ئەم دابەشکردنە لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر گۆڕانـی بەسـەردا هـات، بەهۆی شـەڕو شۆڕی بەردەوامی نێوان ئەم دوو زل هێزەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی کات بەشی زۆری هەرێمە کوردییەکان لەنێو سنووری ئیمپراتۆریەتی ساسانی دابوو"(٢).

بەڵام ئەگەر سەیری ئەو ماوەیەی پێش ئیسلام بکەین، دەبینین جیـاوازی خـۆی هـەبوو، ئـەویش لـەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەردەم کاریگەرییەکانی لە ململانێکان لەسەر بنەمایەکی بەهێزی دەسەڵاتەکان بوو، کە نەیدەتوانی بگاتە ئەو ئاستەی کە کارتێکردنەکان ڕەهای خۆی بەدەست بهێنێت یان بەشێوەیەکی ئەوتۆبێت ببێتە هۆکاری سڕینەوەکانی بنەمای نەتەوایەتی یان ئاینی بە شێوەیەکی فراوان و بەرچاو لەبەر ئەوە ئەگەر لە ڕابردووی پێش هاتنی ئیسلام سەیری ناوچەکەو کوردستان بکەین خۆی دەبینێتەوە لەم بوارانەی خوارەوە:

**١. ڕاگواستن:**

لە زۆربەی سەرچاوەکان بە تایبەتی لە ڕووداوە مێژووییە سەربازییەکاندا باسی لە گەلێك ڕووداوی ڕاگواستن کراوە لە سەردەمی شارستانی گۆتیو لۆلۆییو هوریو ئاشووریو مـاددو ئەشکانیو هەخامەنشیو گەلێك سەردەمی تردا. ئەگەر سەیری کوردستان بکەین لەو سەردەمانەدا پشکی شێری بەرکەوتووە لە ڕاگواستن و دەرکردندا.

گواستنەوە خـۆی لـە خۆیدا، گـۆڕیـن یـان هەڵکەندنی پێکهاتەیەکی نەتەوەییە یـان ئایینییە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر یان لە ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیەکی جیاواز.

"گـواسـتـنـەوەی جـوگـرافی یـان گـۆڕیـنـی شـوێـن بـە زۆر دەگەیەنێت لە ڕێگای بەکارهێنانی تۆقاندن و فشار خستنە سەر لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە کە گۆڕینێکی هەمیشەی

لە جێی نیشتەجێبوونی ماڵی ئاسایی لە یەکەیەکی جوگرافی بۆ یەکەی تری جوگرافی لە خۆدەگرێت"(٣).

یان:

"... شێوازی ڕاگواستنی بەشێوەی تاك یان بە کۆمەڵ لەلایەن دەسەڵاتەوە دژ بە دانیشتووان جێ بەجێ دەکرێت..."(٤).

یان:

"... زۆر جار دەسەڵات ڕاگواستن بە مەبەستێکی شارستانی وەك پرۆژەی ئاودێری یان جێ بەجێ کردنی پرۆژەی گەشە پێدان ئەنجام دەدرێت وەك ئەوەی لە ناوچەی گوندنشینەکان لەپێناو زیاتر خزمەت کردنیان دەکرێت، بەڵام ئەم جۆرانە زیاتر ڕوویەکی ئارەزوو مەندانەی پێوەیە ئەمەش دەبێت بە چەند خاڵێك لەخۆ بگرێت، وەك بەشداری جووتیارو فاکتەری ماددیو مەعنەوی ناوچەکە"(٥).

بۆیە ڕاگواستنیش بەپێی ڕۆژگارو سەردەمە جیا جیاکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە، هەر حکومەتو دەسەڵاتێك شێوازی خۆی هەبووە لە جێ بەجێ کردنیدا لە پێناو سەرکەوتنی ڕاگواستنو بەدەست هاتنی ئەنجامەکانیدا.

**٢. پاکتاو کردنی ئاینی:**

ئەمیش لە گەلێك لە ڕووداوە مێژووییەکاندا باسی لەو جۆرە پاکتاو کردنە هاتووە لە ڕێگای سەپاندنی ئاینێك بەسەر ئاینێکی تردا یان لە ڕێگای قەدەغەکردنی ئاینێك بۆ ماوەیەکی دیاری کراو یان لە ململانێ سەربازییەکاندا لە هەندێك سەردەمدا باڵا دەست بووە بەسەر ئاینێکی تردا.

**٣. ئابلووقەدان:**

ئەمیش جۆرێکی تر بووە لە شێوازی سەربازی کە حکومەتو شارستانییە یەك لەدوای یەکەکان بەکاریان هێناوە دژی گەلێك ناوچەو نەتەوەکان لە کاتێکدا لە ڕووی سەربازییەوە بۆیان داگیر نەکراوە بۆیە لەم ئاکامەدا گەلێك کەس بە کۆمەڵ کوژراوە یان لەناوچووە لە ئاکامی برسێتیو تینوێتی لەماوەی مێژووی ڕووداوەکانی کەرکوکیش دا گەلێك نموونەی لەم جۆرە هەیە.

**٤. دیلگرتنو سزادان:**

گەلێك لە سەرچاوەکان بەتایبەتی سەربازییەکان ئاماژە بە دیلگرتنی بە کۆمەڵو سزادانی بە کۆمەڵ دەکەن، یان لە دوایدا لەناودانیان چونکە دەکەوێتە شێوەی جۆرێك لە پاکتاوکردن ئەمیش لە چوارچێوەی ئەو شێوازانەی کە بەکارییان هێناوە کە نموونەی ئەم جۆرە زۆرە لە ڕابردوودا لە سەردەمی ئاشوورییەکان، ساسانییەکان باوو بووە.

**٥. شێوازی سزادانی دەروونی:**

لە پاڵ بەدیل گرتندا شێوازی سزادانی دەروونیش جۆرێك بوو لە پاکتاوکردنی نەتەوە یان پێکهاتەیەکی ئاینی کە ئەمیش شێوازوو جۆری هەبووە لە پەیڕەوکردن لە ڕێگای ترساندنو خەساندنو کەوی کردندا.

*** پرۆسەی تەعریب لە دوای هاتنی ئیسلام:**

"... ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە کە بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لە کوردستانداو بە موسڵمانبوونی کورد بە خاڵێکی وەرچەرخانی هەمەلایەنو هەرە مەزن دادەنرێت لە دیرۆکی کورداو لە هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتیو ئاینیو سیاسیو ڕۆشنبیری جڤاکی کوردەواریدا ڕەنگیدایەوە، دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی لە ساسانییەکانو ڕۆمە بیزەنتییەکانەوە گوێزرایەوە بۆ دەستی عەرەبە موسڵمانەکان، مزگەوتو حوجرەکان جێگەی ئاگرخانەو پەرستگاکانیان گرتەوە، لەئەنجام دانی ئەرکە ئاینییەکانو ڕێورەسمەکانیدا لە جیاتی پیرو موغو قەشە، لە سەرەتا مەلاو فەقێو دەرنگتریش شێخو سۆفی ڕێبەری خەڵکیان دەکرد ڕێگای ڕاستی خودا ناسینیان نیشاندەدان، بەڵام ئەم وەرچەرخانە کتوپڕ بەرپا نەبوو لە شەو ڕۆژێکدا ڕوویندەدا، بەڵکو سەدان ساڵی خایاند تا زۆربەی هەرە زۆری کورد بینە موسڵمان"(٦).

بۆیە هەر لە دوای پرۆسەی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام چەمکی (بەعەرەبکردن) سەری هەڵداوەو شێوازو ڕێگای تایبەتی خۆی هەبووە، کە بەپێی ڕۆژگار ئەم چەمکەش گۆڕانو پێشکەوتنی خۆی بەسەردا هاتووەو لە هەر سەردەمێکدا گۆڕان بەسەر بنەماو بنەڕەتی واتاکەیدا هاتووە.

سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەعەرەبکردن لە چوارچێوەی دیاریکراو بوو بەڵام لەسەردەمی ئەمەویو عەباسیدا چوارچێوەیەکی فراوانترو بیرکردنەوەو لێکدانەوەی زیاتری بەخۆیەوە بینی، لەسەردەمەکانی لەوە دواتریش تا کۆتایی عوسمانییەکان لەسەر بنەماو شێوازی جیاواز ئەم چەمکە خۆی دەبینییەوە.

"هاوشان لەگەڵ پرۆسەی لەشکرکێشو دەست بەسەراگرتنی هەرێمە کوردنشینەکان، دەوڵەتی خیلافەتی عەرەبی ئیسلامی سیاسەتی بەعەرەبکردنی پیادە کرد ئەویش بە نیشتەجێ کردنی هۆزە عەرەبەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی لە ڕێگای:-

١. جێگیرکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی خیلافەت لە ڕووی سیاسەتەوە، چونکە لەو کاتەدا تەنها ڕەگەزی عەرەب ئەرکی بەڕێوەبردنو کارگێڕیو سەربازییان لە دەستدا بوو، بۆیە دەبوایە ئەو شارانەش خەڵکی عەرەبی تیادا نیشتەجێ بکەن.

٢. هۆزە عەرەبە نیشتەجێبووەکان وەك ئۆردوێکی سەربازی هەمیشەیی لە شارەکان دادەنران، چونکە دەسەڵاتی ناوەند لەوە دەترسان شارە داگیرکراوەکان ڕاپەڕنو دەسەڵاتی عەرەبە موسڵمانەکان وەدەرنێن بۆیە ئەم هۆزە عەرەبانەیان نیشتەجێ دەکرد.

٣. قایلبوونی هۆزە عەرەبەکان بە بەجێهێشتنی زێدی باوكو باپیرانیان ئەمەش دەشێ هۆکارێکی کاریگەری لەدواوە بێت.

٤. هۆکاری ئاینی ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە، چونکە قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبی بوو.

٥. عەرەبە نیشتەجێبووەکان، وەك دەسەڵاتێکی سانسۆرێت بوون، لە چاودێری کردنی پێڕەوە ئاینییەکانی ترو هەوڵی قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەیان دەدا.

٦. هۆکاری کۆمەڵایەتی عەرەبەکانیش خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی بەرچاو بوو، ئەویش دوورکەوتنەوە بوو لە شەڕو شۆڕی ناوخۆو تۆڵەی خوێنو چەندین گرفتی تر کە لە سیما سەرەکییەکانی عەرەب بوو"[٧].

بەڵام ئەگەر سەیری چەمکی (تەعریب- بەعەرەبکردن) بکەین دەگەینە ئەو ڕاستییە کە لێکدانەوەو شرۆڤەکردنی هەڵگری چەندەها بیرو بۆچوونەو هەر وڵاتو شوێنێك ماناکانو ئامانجەکانی تێگەیشتن لێی ئەویش لەسەر بنەمای زمانو کەلتوورو شارستانییەتی نەتەوەکان هەر ناوچەیەکیش تایبەتی خۆی هەیە لە تێگەیشتنی ئەو چەمکەی تەعریبدا. هەر ناوچەیەکیش تایبەتی خۆی هەیە لە ڕێگاکانی بەکارهێنانی ووشەکەدا.

لە لای عەرەبو کتێبی (المنجد في اللغة والإعلام)دا بەم جۆرە پێناسە دەکات:

"تەعریب بریتییە لە بەعەربکردنی شتێکی ناعەرەبی وەك تەعریبکردنی ئیدارە یان خوێندن..."[٨].

دکتۆر خەلیل ئیسماعیل دەڵێت:

"بریتییە لە جێنیشین کردنی خەڵکی عەرەب لە شێوەی تاكو کۆمەڵ لە هەرێمی کوردستان لە ڕێگای دۆزینەوەی نشێنگا بۆیانو هەروەها بەمانای گۆڕینی ناوی شارو دێو گەرەكو دامەزراوە فەرمیو نافەرمییەکان بۆ ناوی عەرەبی دێت، ئەمەش بە مەبەستی گۆڕینی ڕاستییە نەتەوەییەکان بۆ بەرژەوەندی خەڵکی عەرەب"[٩].

یان:

"مەبەست لەو ئەنجامو شوێنەوارانەیە بۆ نیشتەجێکردنی تاكو کۆمەڵو هۆزەکانی عەرەب لە خاکی وڵاتی کورددا کە هاتوونەتە کایەوە، دامەزراندنی کۆمەڵگەی نیشتەجێبوون بۆیان، هەروەها هەوڵدان بۆ گۆڕینی ناوی گوندو شارو ناوچەکانی وڵاتی کورد، لەگەڵ ڕێگەخۆشکردن بۆ پەل هاویشتنی زمانی عەرەبیو چەسپاندنی وەك زمانی نەتەوەو ئاینی دەوڵەت"[١٠].

"... تەعریب واتە لە ڕەگ هەڵتەکاندنی نەتەوەیەك یان ڕەگەزێکی نەویستراو لە ناوچەیەکی دیاری کراودا کە کوردەو جێنیشین کردنی خەڵکی سەر بە ڕەگەزی عەرەبی لە شوێنی ئەواندا، یان هەوڵدان بۆ گۆڕینی کەلتوورو سیماو ناسنامەی ئەو ڕەگەزە بۆ سەر عەرەبیو توانەوەیان لە بۆتەی عەرەبدا"[١١].

"سیاسەتی تەعریب زیاتر لە ڕێگای توانەوەی ڕاستەوخۆی کەمە نەتەوەکان ئەنجام دەدرێت ئەمەش بە پەیرەوکردنی:

١. پاکسازی (قرکردن، واتا پاکردنەوەی ناوچەیەکی دیاریکراو لە ڕەگەزێکی نەویستراو (غەیرە عەرەب)و بە عەرەبکردنی ناوچەکە.

٢. ڕاگواستنو دەرکردن، واتە دەرکردنی خەڵکی غەیرە عەرەب بۆ ناوچەیەکی عەرەبنشینو جێ نیشین کردنی عەرەب لە شوێنیان بە تایبەت لەو شوێنانەی کێشەیان لەسەرە، ئەمەش دوو مەبەست دەپێکێت، لەلایەکەوە ئەوەی دەردەکرێت بە ئاسانی لە بۆتەی کۆمەڵگای عەرەبیدا بتوێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە خاكو نیشتمانەکەی بە ئاسانی تەعریب دەکرێت، زۆر جاریش ئەو پرۆسەیە شێوە.. نیزامێکی جیاواز ئەنجام دەدرێت، وەك هێنانی عەرەبو هەوڵدان بۆ سڕینەوەو گۆڕینی مۆرکی نەتەوایەتی ڕەگەزی غەیری عەرەب وەك دابونەریتو سیمای شارستانی شارو زمانو کەلتوور"[١٢].

لەبەر ڕۆشنایی ئەو لێکدانەوەی پێشوو بۆ تەعریب دەتوانین بڵێین:

"پرۆسەیەکە مەبەستی تواندنەوەی نەتەوەیی کوردە لەناو بۆتەی نەتەوەیی عەرەبدا ئەمەش بە دوو شێوە: ڕاستەوخۆ لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزو زەبرو زەنگەوە، ناڕاستەوخۆ بە هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ڕاستییە مێژووییەکانو دابو نەریتو شێوازی پەروەردەو کەلتوورو گۆڕینی ناوی شارو شوێنی کەسو گۆڕینی هەموو ئەو سیماو بەهاو چەمکە کوردییانەی دەیسەلمێنن کە کورد لە نەتەوەی عەرەب نییە"[١٣].

بەعەرەبکردنی زانستی بریتییە لە:

"پرۆسەی کۆکردنەوەو ڕێکخستنو لێکدانەوەی بەرهەمی هزری (فکری)ی هۆشیاری (عقلی)و زانستیی نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی خەلافەتی ئیسلامی، بەکارهێنانیان بۆ خزمەتکردنو دەوڵەمەندکردنی بزاڤی ڕۆشنبیریو زانستی نەتەوەی باڵادەست، کە نەتەوەی عەرەبەو بەکارهێنانی وەرگێڕان وەکو ئامرازێکی گونجاو بۆ گواستنەوەی پاشماوەی کولتووریو ئەدەبیو سیاسیو زانستییەکانی نەتەوەکانی تر بۆ نێو شارستانێتی عەرەبیی ئیسلامیو دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگو زمانی عەرەبی"[١٤].

ئەم جۆرە تەعریبەش خۆی لەو چوارچێوەیەدا دەبینێتەوە کە هۆکارێکی ترە لەو چەمکە بەڵام بە شێوازو بنەمای جیاواز کە لە هەندێك باردا کە ئەوانەی وەرگێڕانەکە دەکەن، هەستی دەمارگیرییان هەبێت هەموو شارستانییەتو کەلەپووری نەتەوە ژێر دەستەکە دەکەنە موڵکی خۆیان، کە ئەمەش لە خۆیدا زیانێکی گەورەی شارستانییەتو کەلەپوورە.

"پێش دەرچوونی عەرەبە موسڵمانەکان بۆ ناوچەکانی دەرەوەی نیمچە دوورگەی عەرەبی، کۆمەڵێك ڕۆشنبیریو شارستانییەتی جیاواز لە ناوچەکەدا هەبوون وەك شارستانییەتی فارسیو هیندیو یۆنانیو ڕۆمانی، هەرووەها کۆمەڵێك ئاینی جیاواز هەبوون وەك جوولەکەو مەسیحیو زەردەشتی، سەرجەم ئەم شارستانییەتو ئاینانە خاوەنی تایبەتمەندیو خەسڵەتی ڕۆشنبیریو ئاینی خۆیان بوون"[١٥].

بۆیە وەرگێڕانو گواستنەوەی ئەم کەلەپوورانە لەسەردەمە جیا جیاکاندا بە چاكو خراپ دەوری خۆی بینیوە لە گواستنەوەیدا لەبەر ئەوەی "... سیستەمە سیاسییەکە بە خەلیفەو ئاینیو زمانەوە عەرەب بوو، ئەمەش ڕێگە خۆشکردن بوو بۆ باڵادەستی شارستانییەتیو ئاینیو زمانی عەرەبی"[١٦].

"هەموو ئەو کردەوانەی کە حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق دژ بە میللەتی کورد پەیڕەویان کردووە،

بەمەبەستی سڕینەوەی مۆرکی نەتەوەی کوردو گۆڕینی بە سیمای نەتەوەی عەرەب لە ڕێگای ڕاگواستن و ئەنفال و بە عەرەبکردنەوە"[١٧] بوو.

تەعریب لە ڕووی پێناسەو چۆنیەتی مامەڵەکردن و شێوازی جێبەجێکردنی جیاوازی هەیە، هەر لق و دەستەواژەیەکی بنەمایەکی دیاری کراوی چەمکی تەعریبە:

تەعریبی ئابووری، تەعریبی کۆمەڵایەتی، تەعریبی خزمەت گوزاری، تەعریبی پەروەردە، تەعریبی زمان و کەلتوور، تەعریبی تەلارسازی، هەرییەکە لەمانە داشۆرانی هەموو ئەو کەلتوورانەیە لە پێناوی سەپاندو چەسپاندنی بنەماکانی زمان و کەلتووری عەرەبی و بەعەرەبکردن یان عەرەباندنی هەموو ئەولقانە بەپێی خواستی بۆچوونەکانی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عەرەب بۆ تێگەیشتن لەو ئایدۆلۆژیایەی کە لەپێناویدا کاردەکات.

هەر یەکێك لەمانە پێویستی بە بنەماو نەخشەی درێژ خایەن و کوورت خایەن هەیە (ستراتیژ- تەکتیك) بۆ ڕێگاکانی جێبەجێکردنی، هەر یەکەش پێویستی بەو قۆناغانە هەیە بۆ ڕێگایی چارەسەری.

ئایدۆلۆژیای بەعس بنەمایەکی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ جێ بەجێ کردنی (تەعریب) ئەو لەسەر ئەو بۆچوونە بیری دەکردەوە کە هەموو نیشتمانی عەرەبی تەنها بۆ عەرەبەو پێویستە نەتەوەکانی تر لە بۆتەی ئەودا بتوێنەوە:

"... نیشتمانی عەرەب تەنها بۆ عەرەبەو تەنها ئەویش ماف بەکارهێنانی سەروەت و سامانی ئەم نیشتمانەی هەیە"[١٨].

یان دەڵێت:

"... تاکی عەرەب هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە بە عەرەبی دەدوێن و شارەزای کەلتووری عەرەبن یان خۆیان لەگەڵدا گونجاندووەو لەسەر ئەوەی ئەوان پێی دەڵێن (خاکی عەرەب) دەژین"[١٩].

بۆیە بیرکردنەوەی بەعس بۆ کورد وەکو کەمە نەتەوایەتییەکی نیشتمانی عەرەب و هەر لەو چوارچێوەیە دەژێت کە عەرەب ماف دەداتێ و لەوە زیاتر نییە.

"کوردەکان تاکێکن لەگەڵ عەرەب، زیاتر لەوەیان ناوێت کە عەرەبەکان بۆ خۆیان هەوڵی بۆ دەدەن"[٢٠].

*** چەمکی تەعریبی کەرکوك:**

"حکومەتەکانی عێراق بۆ گەیشتن بە مەرامەکانیان سەبارەت بە کەرکوك، زۆر نا مرۆڤانە سیاسەتی تەعریبیان پیادەکردووە.

ئەو حکومەتانە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژو بە چەندین شێوە کوردستانیان تەعریب کردووە. لە کەرکوك و دەوروبەریدا خاك و خەڵکەکەی وەك یەك تەعریب کراوە"[٢١].

بۆیە کاتێك کە دێنە سەر تەعریبی کەرکوك دەبێت بگەڕێن بە دوای ئەو تایبەت مەندییەی کە بەکارهێنراوە لە کەرکوك و شێوازی جێ بەجێ کردنی لەو شارەدا لەڕووی بنەماکان و جۆری ئەو ڕێگایانەی کە گرتوویانەتە بەری یان بۆ جێ بەجێ کردنی شێوازەکانی تەعریب لە کەرکوك و گەرمیاندا.

بوونی نەوت، زەوی بە پیت، پێکهاتەو نەتەوەی جیاجیا، شوێنی بازرگانی، دەوری سەرەکیان بینیوە لە تایبەت مەندی لە تەعریب لە کەرکوك گرنگی بایەخ دان بەپەلە لە جێ بەجێ کردنی پرۆسەی تەعریب لەم شارەدا.

*** شێوازەکانی تەعریب لە کەرکوك:**

١. دەرکردنی خەڵك و کەسانی گوندو شارو شوێنەکانی کوردنشین، هێنانی کەس و خێزان و عەشیرەتی عەرەب لە ناوەراست و خوارووی عێراقەوەو نیشتەجێکردنیان لە شارو شوێنە کوردییەکان.

٢. هێنانی خێزان و عەشیرەتی عەرەب بۆ ناوچەکانی کەرکوك و بەکارهێنانیان بۆ مەسەلەی ئاسایش.

٣. گۆڕینی سنووری پارێزگا لەبواری یەکە کارگێڕییەکان.

٤. کردنەوەی شەقامی جۆراو جۆرو پانکردن و فراوانکردنی شوێنە گشتیە کوردییەکان بۆ ئەوەی لە ڕووی ئاوەدانییەوە پرۆسەی تەعریب جێ بەجێ بکات.

٥. گۆڕینی ناوی شارو شارۆچکەکانی پارێزگاکەو سڕینەوەی ناوی بنەڕەتی گوندەکانی.

٦. هاندانی کەسانی پارێزگاکە بە ناردنی منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە عەرەبییەکان.

٧. دروستکردنی پڕۆژەی جۆراو جۆر وەکو پڕۆژەی ئاودێری (حەویجە).

٨. دروستکردنی گەڕەکی عەرەب نشین.

٩. دەست بەسەرداگرتنی موڵکی هاووڵاتی کورد.

١٠. تەعریب کردنی فەرمانگە فەرمی و نا فەرمییەکانی کەرکوك.

١١. گۆڕینی نەتەوەو گواستنەوەی تۆماری نفووس.

١٢- شێوازی بەعەرەبکردنی زانستی و وەرگێڕان لە ڕێگای وەرگێڕانی کەلەپوورو شارستانی و شێواندنی بنەماکانی خۆی.

١٣- دروستکردنی گوندی عەرەبنشین و هێنانی عەرەب بۆی.

١٤- نووسینەوەی مێژووی لەسەر بنەمای ئایینی و نەتەوەیی عەرەب و شێواندنی مێژووی کەرکوك و پێکهاتەو نەتەوەکانی.

* **سەرچاوەو پەراوێزەکان:-**


١. (سیاسەتی تەعریب لە شاری کەرکوك، شیکردنەوەیەکی جوگرافی سیاسی)، حەمید عەبدوڵڵا ساڵح، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٨، لاپەرە (٣١).
٢. گۆڤاری (زانکۆی کۆیە)، ژمارە (٣)، ساڵی (٢٠٠٥)، لاپەرە (٣١). لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(پرۆسەی تەعریب لە کوردستاندا کەی‌و چۆن دەستی پێ کرد)، د. نەبەز مەجید ئەمین.
٣. گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (١٢)، ساڵی (١٩٩٩) لاپەرە (٤)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(ڕاگواستنی گوندنشینەکان لە هەرێمی کوردستانی عێراق)، سلێمان عەبدوڵڵا ئیسماعیل.
٤. (معجم العبارات السياسية الحديثة)، موجدی دەهبە، بیروت، چاپی دووەم، ساڵی (١٩٩٢)، لاپەرە (٨٧).
٥. (انماط الأستطيان الريفي في العراق)، خەلیل ئیسماعیل محەمەد، چاپخانەی حوادث، بغداد، ساڵی (١٩٩٢)، لاپەرە (٣٩٤).
٦. (کوردو کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئیسلامیدا)، د. زرار سەدیق تۆفیق، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ساڵی (٢٠١٣)، لاپەرە (٧٥- ٧٦).
٧. گۆڤاری (زانکۆی کۆیە)، ژمارە (٣)، ساڵی (٢٠٠٥)، لاپەرە (٣٤- ٣٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(پرۆسەی تەعریب لە کوردستاندا کەی‌و چۆن دەستی پێکرد)، د. نەبەز مەجید ئەمین.
٨. (المنجد في اللغة والإعلام، چاپی سی‌و هەشت، دار المشرق، بەیروت، ساڵی (١٩٨٦)، لاپەرە (٩٤٨).
٩. (مؤشرات سياسة التعريب والتهجير في اقليم كوردستان العراق)، خەلیل ئیسماعیل محەمەد، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ساڵی (٢٠٠١)، لاپەرە (٤).
١٠. (بەعەرەبکردن لە هەرێمە کوردنشینەکاندا ٦٣٧- ٨٤٧ ز، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی- شیکارییە)، ڕەحیم ئەحمەد ئەمین، سەنتەری کوردۆلۆجی، ساڵی (٢٠٠٨)، لاپەرە (١٣).
١١. (پاکتاوی ڕەگەزی لە ناوچەی کەرکوك‌و ئەگەری دەست تێوەردانی مرۆڤانە)، شاخەوان شۆڕش، سلێمانی، ساڵی (٢٠٠٣)، لاپەرە (٢٦).
١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٦).
١٣. (سیاسەتی تەعریب لە شاری کەرکوك، شیکردنەوەیەکی جوگرافی- سیاسی)، حەمید عەبدوڵڵا ساڵح، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، ساڵی (٢٠٠٨)، لاپەرە (٣٤).
١٤. (بەعەرەبکردن لە هەرێمە کوردنشینەکاندا ٦٣٧- ٨٤٧ز، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی- شیکارییە)، ڕەحیم ئەحمەد ئەمین، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢١).
١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢١- ٢٢).
١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٢).
١٧. (سیاسەتی تەعریب لە شاری کەرکوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٧).
١٨. (تطور الايدولوجية العربية الثورية، الفكر القومي)، د. ئلیاس فەرەج، چاپی حەوت، چاپخانەی بەغداد، ساڵی (١٩٧٩)، لاپەرە (٤٦).
١٩. (حزب البعث العربي الاشتراكي، مرحلة الأربعنيات التاسيس ١٩٤٠- ١٩٤٩)، شبلي ئەلعەیسەمی، بەرگی دووەم، دارالطليعة للطباعة والنشر، بەیروت، ساڵی (١٩٧٥)، لاپەرە (١٢١).
٢٠. (اوكار الهزيمة تجربتي في حزب البعث العراقي)، هانی ئەلفکیکی، چاپی دووەم، چاپخانەی (مجید)، لاپەرە (٢٩٥)، ساڵی
٢١. (تەعریبی کەرکوك سیاسەتی تەعریب لە دوو قۆڵی هەشت بەڵگەنامەدا)، شۆڕش حاجی، دار العلم، لەندەن، ساڵی (٢٠٠٤)، لاپەرە (١٩).

# مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردنی پارێزگای کەرکوك (١٩٢١-١٩٩١)

سنوور سەباح سدیق

*** پێشەکی:-**

کێشەی کەرکوك باڵی کێشاوە بەسەر ژیانی سیاسی ئەمڕۆی عێراق و کوردستاندا، ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش ئاڵۆزی ئەم کێشەیە خۆی دەنوێنێ و دەبێتە مایەی بگرەو بەردەی ناوخۆیی و دەرەکی، یەکێ لە هۆیە هەرە سەرەکییەکانی ئەم بارە سیاسەتی بە عەرەبکردنی ئەم پارێزگایەیە. هەوڵەکانی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بۆ بەرزکردنەوەی ڕێژەی عەرەب و کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد ئەم بارەی خولقاند. هەرلێرەوە توێژینەوە لە مێژووی سیاسەتی بە عەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوکدا خۆی دەسەپێنێ، بێ ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی وردەکارییەکانی ئەو سیاسەتە، بەتایبەتی لە سەردەمی حوکمڕانی بەعسدا.

زۆر ئەستەمە لە قەبارەی کێشەکە بگەین و توانای دەستنیشانکردنی چارەسەری لە باری بۆ بدۆزینەوە. ئەمە گرنگیی بابەتی ئەم نامەیە دەخاتە ڕوو، کە تەنها ئەرکێکی زانستی نییە کە لە مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە کەرکوك بکۆڵێتەوە و وردەکارییەکانی بخاتەڕوو لەو ڕێگەوە سەردەمێکی مێژووی نوێی ئەم پارێزگایە ڕوون بکاتەوە، بەڵکو ئەم بابەتە گرنگییەکی پراکتیکی و سیاسیشی هەیە، کە دەتوانێ یارمەتی بڕیاردەران بدات بۆ ئەوەی ئەم کێشەیە بەشێوەیەکی دادوەرییانە چارەسەر بکەن. زانیاری و شیکردنەوەکانی ئەم نامەیە بۆ کاربەدەستانی کورد گرینگن، بەتایبەتی ئەوانەی کە لەبواری کێشەی کەرکوك دا دەست بەکارن لە جێبەجێ کردنی ماددەی (١٤٠) بەرپرسیارن. لێرەدا گرێدانی ئەزموونەکانی مێژوو بەباری ئەمڕۆوە بۆ هەنگاونان بەرەو دواڕۆژ بە ڕوونی دەردەکەوێت.

توێژینەوەو هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە کەرکوك و شوێنەوارەکانی و شیکردنەوەی ڕووداوەکانی لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەو سەرچاوە مێژووییەکان کارێکی زۆر پێویستە بۆ ئەوەی بۆ خۆمان و بۆ خەڵکانی دیش ڕاستییە شێواوەکانی بخەینەروو، کەئەم مێژووە چی بەرهەم هێناوە.

سەرباری ئەمانە ئەم بابەتە واتا (مێژووی بەعەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك لە ساڵانی ١٩٦٣-١٩٩١) تا ئێستا بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی سەربەخۆ نەبووەو نامەو تێزی لەمەڕ نەنووسراوە. گەلێ لەو نووسیانەی لەسەر کەرکوك و پرسی بەعەرەبکردن و مێژووی کەرکوك بڵاو دەکرێنەوە بەتایبەتی لەلایەن نووسەرانی کوردەوە زیاتر بەرهەمی سۆز وکاردانەوەن نەك لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی پشت ئەستوور بە سەرچاوەی مێژوویی باوەڕپێکراو بۆ ڕوونکردنەوەی مێژووی ئەم پارێزگایە.

بۆیە ئێمە لەو بوارەدا زیاتر لە هەموو شتێ پێویستیمان بە توێژینەوەی زانستی هەیە لەسەر هەموو بوارەکانی ژیان لە کەرکوك و دەڤەرەکانی تری کوردستان کە بەر شاڵاوی بەعەرەبکردن کەوتوون.

هەڵبژاردنی ساڵی (١٩٦٣) وەکو دەسپێکێك بۆ توێژینەوەکەمان لەوەوە سەر چاوەی گرتووە کە لەو ساڵەوە سیاسەتی بەعەرەبکردن شێوازێکی ئاشکراو هێرشبەر دەگرێتە خۆو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەمەلایەنەو گشتگیر تر دەبێت.

ئەو ساڵە نەك هەر بۆ پارێزگای کەرکوك بەڵکو بۆ هەموو باشووری کوردستان و عێراقیش سەرەتای نەهامەتی و کارەساتە گەورەکان بوو کە چارەنووسی ئەم وڵاتەی گەیاندە ئەو ئاکامەی هەموو دونیا ئەمڕۆ دەیبینێ و بۆ کوردو گەلانی عێراق دەسپێکی سەردەمێکی پڕلە توندو تیژی و کارەسات بوو.

لەو چەند مانگەدا کە بەعس لەسەر دەسەڵات بوو هەموو پارێزگاکانی عێراق توندو تیژی و ڕاونان و ڕەشبگیری و بە کۆمەڵ کوشتن و لەسێدارەدانیان بەخۆوەبینی.

کەرکوکیش یەکێ لەئامانجە سەرەکییەکانی توندو تیژییەکانی بەعس بوو. هەر لەو چەند مانگە دا چەند

ئاوایی کوردی لە دەوروبەری کەرکوك وێران کران و دانیشتووانەکانیان سەرگەردان کران. لە ناوشاری کەرکوکیشدا سەدان خانووبەرەی کورد وێران کران و دەیان کەسایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری لە سێدارەدران و بە هەزاران کورد بەر شاڵاوی گرتن و ڕاونان کەوتن. گەڕانەوەی بەعس بۆ سەر دەسەڵات لە ساڵی (١٩٦٨) گەڕانەوەی توند وتیژی و پیلان و پرۆژەی سەرکوتکردن و بەعەرەبکردن و پاکتاوکردنی نەژادی و جینۆسایدی کوردبوو. پێگەی کەرکوکیش لەم پرۆژانەی بەعسدا لەبەراییدا بوو.

سڕینەوەی سیمای کوردستانی کەرکوك یەکێ لە ئامانجە سەرەکییەکانی هەموو سیاسەتەکانی حیزبی بەعس بوو. بەعەرەبکردنی کەرکوك لە دوای ساڵی (١٩٦٨)و بەتایبەتی لە حەفتاکان و هەشتاکان گەیشتە ئاستێکی ترسناك . ئەگەر داگیرکردنی کوێت و شەڕەکانی کەنداو و ڕامالینی دەسەڵاتی بەعس نەبوایە ئەوا کەرکوکێکی بێ کورد دەبووە ڕاستییەکی واقیعی.

دانیشتووانی کەرکوك بەتایبەت کورد پارێزگاکەیان لێکرابوو بە بەندیخانەیەکی گەورەو هەموو مافێکیان لێ سەندرابوو و لەسێبەری ترس و دڵەڕاوکێدا ژیانیان بەسەر دەبرد، کارگەیشتە ئەوەی لەدەزگاو قوتابخانەکاندا قسەکردن بەکوردی قەدەغە بکرێت.

ڕاستکردنەوەی باری نەتەوەیی (تصحيح القومية) بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی هەڵوەشاوە سەپێنرا بوو بەسەر زۆربەی ئەو کوردانەی لەو پارێزگایەدا مابوون. هەروەها ئەم سیاسەتەی دوایی تورکمانەکانیشی گرتەوە. ئەمانەو چەندین کاری تری لەم جۆرە کە دەرهەق بە دانیشتووانی ئەم پارێزگایە کراون، تەنانەت لەشارەکەیاندا ژیانیش بۆیان ئاستەم بوو بۆیە مێژووی دوای ساڵی (١٩٩١) تاوەکو ڕامالینی ڕژێمی سەدام حوسێن لە (٢٠٠٣) بابەتێکە پێویستی بەتەرخانکردنی ماستەر نامەی تایبەت هەیە.

ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە کە ڕاستییە مێژووییەکانی مێژووی بەعەرەبکردنی ئەم پارێزگایە لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەو دەکومێنتە فەرمییەکانی دەوڵەتی عێراق بەتایبەتی بڕیارەکانی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) و پارتی بەعس بخاتەڕوو پاشان لێکدانەوەی ووردیان بۆ بکات، بەتایبەتی کردەوەکانی ڕاگواستن و وێران کردن و خاپورکردنی گەڕەکە کوردییەکان و گۆڕینی ناوی گەڕەك و شەقام و کۆگاو قوتابخانەو تەنانەت منداڵانی کوردیش بەناوی عەرەبی.

کێشەی بەعەرەبکردنی کەرکوك تا ئێستە لە ئاستێکی نێوخۆییە، هەروەك ئاماژەمان بۆ کرد مادەیەکی دەستوری بۆ تەرخان کراوە. بەنێو دەوڵەتی کردنی ئەم کێشەیە کێشەکە قوڵترو درێژخایەن تر دەکات، چارەسەرنەکردن و مانەوەی کێشەکە بە هەڵواسراوی زیان دەگەیەنێ بە شارەکەو هەموو دانیشتووانی و بەرلە هەموویان کوردی کەرکوك، بەهۆی مانەوەی کێشەکەوە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوە وئاساییکردنەوەی ژیان تەگەرە و کۆسپی گەورەی لەبەردەمدا دەبێت.

*** بەشی یەکەم: باری گشتی کەرکوك تا ساڵی ١٩٦٣:**

**١. خاك و دانیشتووان:**

شاری کەرکوك ناوەندی پارێزگایەکە بەهەمان نێوو یەکێ لەشارە هەرە گرنگەکانی باشووری کوردستانە. پێگەی جوگرافی ئەم شارە بەگوێرەی باشووری کوردستان دەکەوێتە ناوەڕاستییەوەو لەباکوورەوە پارێزگای هەولێرو لەباشوورەوە دیالەو لە ڕۆژهەڵاتەوە سلێمانی و لە ڕۆژئاواوە پارێزگاکانی موسڵ و تکریت، سنوورەکانی دیاری دەکەن.

کەرکوك وەکو شارەکانی تری کوردستان دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی عێراقەوەو ٢٥٠ کم لە بەغداوەو ١١٠ کم لە سلێمانییەوەو ٩٦ کم لە هەولێرەوەو ١٨٠ کم لە موسڵ و ١٢٠ کم لە تکریتەوە دوورە[١] .

لە ڕووی پێگەی فەلەکییەوە شاری کەرکوك کەوتووەتە نێوان هەرییەك لە بازنەی پانی (٣٥,٢٣- ٣٥,٣١) باکووری گۆی زەوی و هێڵی درێژی (٤٤,٢٠- ٤٤,٢٧) ڕۆژهەڵاتی گۆی زەوییەوە[٢] .

بەرزیی سەرزەمینی ئەم پارێزگایە لە ڕووی دەریاوە ١١٧٥م لە ناوچەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی و ١٦٠م لە ناوچەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی[٣] .

هەرچی ڕووبەری ئەم پارێزگایە ئەوا بەهۆی سیاسەتەکانی بەعەرەبکردنەوە گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووەو لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر ڕووبەرەکەی گۆڕاوە. ئەم ڕووبەرە لە ساڵی ١٩٥٧دا (٢٠٣٥٥)کم$^2$ بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٧ بەرتەسك کراوەتەوە بۆ (١٠٢٨٢)کم$^2$. هۆی ئەمەش دابڕاندنی چەندین یەکەی ئیدارییە لە کەرکوك. ئەم گۆڕانکارییانە تاوەکو ساڵی ١٩٩٧یش هەر بەردەوام بوون کاتێ ڕووبەری پارێزگای کەرکوك گەیشتە (٩٦٧٩)کم$^2$[٤] .سیاسەتی بەعەرەبکردن و دابڕینی یەکە ئیدارییەکان وای کردووە ڕووبەڕووی ئەم پارێزگایە لە گۆڕانێکی بەردەوامدا بێت. بۆیە بە پێویستی دەزانین شارو ناوچە ئیدارییەکانی ئەم لیوایەو لەدواتریشدا کەبوو بە پارێزگا، بەر لەجێ بەجێکردنی سیاسەتی بەعەرەبکردن و دوای جێگیرکردنی ئەو سیاسەتەش دیاری بکەین.

لە ساڵی (١٩٥٧)دا لیوای کەرکوك لەم چوار قەزایە پێکهاتبوو:

١. قەزای سەنتەری کەرکوك لە ناحیەکانی ئاڵتون کۆپری (پردێ)، شوان، قەرە حەسەن، مەلحەو سەنتەری کەرکوك پێکهاتبوو.

٢. قەزای چەمچەماڵ لە ناحیەکانی ئاغجەلەر، سەنگاوو سەنتەری چەمچەماڵ پێکهاتبوو.

٣. قەزای کفری لە ناحیەکانی پێباز، قەڵای شێروانە، قەرەتەپەو سەنتەری کفری پێکهاتبوو.

٤. قەزای خورماتوو[*]ئەویش ئەم ناوچانەی لەخۆ گرتبوو داقوق، سەنتەری خورماتوو، قادر کەرەم[٥].

دوای پەیڕەوکردنی سیاسەتی بەعەرەبکردن و لەبەردەوامیی ئەم سیاسەتەداو بەمەبەستی کەمکردنەوەی

ژمارەی کورد لەچاو دانیشتووانی تری پارێزگای کەرکوکدا، ئەوەبوو قەزای (چەمچەماڵ) خرایە سەر پارێزگای سلێمانی و قـەزای (کـفری)یش، کەبەشی هـەرە زۆری دانیشتووانی کوردن، بەپارێزگای دیالەوە گرێدرا، قەزای خورماتووش کە بەهەمان شێوە بەشێکی زۆری دانیشتووانی کوردبوون، کرا بەیەکێ لە قەزاکانی پارێزگای سەلاحەددین (تکریت) هەر چەندە لێشێوە دوورە[٦].

لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییانەدا ئەم پارێزگایە لە ساڵی ١٩٨٧ تەنها سێ قەزای بۆ مایەوە (سەنتەری کەرکوك، دبس (دووبز)و حەویجە) کە لە ١٣ یەکەی کارگێڕی پێکهاتبوون. هەر بە گوێرەی ئەم سیاسەتەش ناوچەی زاب لە مووسڵەوە خرایە سەر پارێزگای کەرکوك، بۆ ئـەوەی ڕێـژەی عەرەب زۆرتر بکرێ و لەهەمان کاتیشدا ڕێژەی کورد لەوەی هەبوو کەمتر بکرێتەوە[٧].

یەکێك لەهۆکارە سەرەکییەکانی پەیڕەوکردنی سیاسەتی بەعەرەبکردن لەپارێزگای کەرکوکدا بۆ دەوڵەمەندی ئەم پارێزگایە بەکانزاکان بەتایبەتی نـەوت دەگـەڕێتـەوە، کە لەباشترین جۆرەکانەو یەکێکە لەگەورەترین کۆگاکانی نەوت لە ناوچەکەو لەجیهاندا. چاوگەو چاڵگەکانی نەوتی کەرکوك لەباشووری ڕۆژهـەڵاتـەوە درێـژ دەبـنـەوە بـەرەو باکووری ڕۆژئـاوا، بەناوبانگترینیان چاڵگەکانی بابـەگوڕ گـوڕو جەمبورە. سەرەڕای ئەمەش پارێزگای کەرکوك دەوڵەمەندە بە هـەنـدێ کـانـزای تـر وەك گـۆگـردو گـازی سروشتی، کە بەرێژەیەکی ئابووری باش لەخاکەکەیدا هەن. لەهەندێکیان سـوود وەرگـیـراوە بـۆ پـیـشـەسـازی، جگە لـەمـە کـەرکـوك دەوڵەمەندە بەکەرەستەی بیناسازی وەکو گەچ و چیمەنتۆو سیرامیك[٨].

سەرباری هەموو ئەمانە خاکەکەشی بەپیتە بۆ وەبەرهێنانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان. نزیکەی ٥٠٪ زەوی پارێزگاکە، ئەگەر ڕێـژەی باران بارین لەبارێ بۆ چاندنی گـەنم و جۆ شیاوە، هەروەها بەپشت بەستن بەئاودێری بەرووبوومی هاوینەی باشی هەیە. بەشی باکووری پارێزگاکە بەپشت بەستن بەباران بۆ چاندنی گەنم و جۆ لەبارە، هەرچەندە لەم پارێزگایەدا پـرۆژەی ئـاودێـری هەیە بۆ ئـاوەدانی زەوییە کشتوکاڵییەکان، بـەڵام مەبەستی حکومەتە یـەك لـەدوای یەکەکانی عێراق لە پـرۆژەکـانـی ئـاودێـری لـە پـارێـزگـای کەرکوك هێنان و جێگیرکردنی هۆزە عەرەبییە کۆچەرەکان و وەرزێـڕانـی عـەرەب بـوو، لـەسـەر خـاکـی ئـەم پـارێـزگـایـە، باشترین بەڵگەش پرۆژەی بەنداوی دووبز (کەرکوك)ەکە بۆ ئاودانی دەشتەکانی حەمرین و حەویجە جێبەجێ کرابوو. ئەم پرۆژەیە بەگەورەترین پرۆژە دادەنرێت لەپارێزگاکەدا و پشت بەئاوی زێیی بچووك دەبەستێت کە لە ساڵی(١٩٦٥) دا دروستکراوە[٩]. ئەم پرۆژەیە هۆکارێکی ڕاکێشانی هۆزە عەرەبەکان بوو بۆ ناوچەکەو جێگیر بووونیان بەمەبەستی بەعەرەبکردنی، کە بەوردی و هەمەلایەنە باسی لێوە دەکەین.

لە ڕووی مێژوویشەوە کەرکوك شارێکی دێرینەو بە ناوی جیاواز لەسەردەمە مێژووییە جیاوازەکاندا نـاوی بـراوە. لەسەردەمی (نەرام-سین)ی ئەکەدی دا لەدەوروبەری (٢٤٠٠ پ. ز)دا کوردستانی عێراقی ئێستا بە (سوبارتو) ناسراوەو ناوچەی (ئەراپخا)ش بەشێك بووە لەو وڵاتە. لەسەردەمی ماددەکانیشدا کەرکوك هەر بە (ئەراپخا) ناسراوە. لەکاتی هێرشی ئەسکەندەری مەکدۆنیشدا بۆسەر هەولێرو لەوێشەوە بۆ بابل ئـەم نـاوچـەیە بە (منس) یـا (منسس) نـاوبـراوە، ئاراميیەکانیش بە (کەرخە) ناویان بردوە[١٠].

سەرچاوە مەسیحییەکان بەناوی (بیث گەرمی یا باگرمێ- Bethgarme) یان (بەدجەرمە) ناویان بـردووە[١١] یاقوت ئەلحەمەوی لەکتێبەکەی دا (معجم البلدان) ناوی ئەم ناوچەیە بە (کەرخینی) دەبات[١٢].

ناوی کەرکوك بەم شێوەیەی ئێستای بۆ یەکەمین جار لـەمـێـژوودا لـەسـەردەمـی تـەیـموریـدا لەکتێبی زەفەرنـامـە (ظفرنامە)ی (شرف الدين علي يزدي)، کە لـەدەوروبـەری ساڵانی (١٤٢٤/ ١٤٢٥ز)دا نوسراوە هاتووە[١٣].

هـەرچـی پـێـکـهـاتـەی دانـیـشـتـووانـی کـەرکـوکـە ئـەوا هەمەجۆرەیەو لـەپـاڵ کـوردا تورکمان و عـەرەب و کلدان و ئـاشـووری دەژیـن و تـا سـەرەتـای پـەنجاکان کەمینەیەکی جوولەکەش لەم شارەدا ژیـاوە. بەدرێژایی ئەو مێژووەی دەیزانین کورد زۆرینەی دانیشتووانی ئەو شارەو پارێزگاکەی پێکهێناوە. بەڵگە مێژووییەکان ئەم ڕاستییە پشتڕاست دەکەنەوە. گەڕیدەی فەرەنسی (کلیمان) کە لە ساڵی ١٨٥٦ سەردانی ئەم شارەی کردووە، ژمارەی دانیشتووانی بە (٢٥) هـەزار کەس خەمڵاندووەو ئاماژەی بـەوە کـردووە کە سێ لەسەر چواری دانیشتووانەکەی کورد بوون.

ئـەنـدازیـاری ڕووسـی (یـۆسـپ چێرنـیـك) کـە لـە ساڵی (١٨٧٢- ١٨٧٣) سەردانی ناوچەکەو کەرکوکی کردووە بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لەبواری کەشتیوانی لەئاوەزێڵەی دیجلەو فوراتدا ژمارەی دانیشتوانی شارەکەی بە ١٢- ١٥ هەزار کەس خەمڵاندووەو جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە هەموویان کوردبوون بێجگە لە (٤٠) خێزانی مەسیحی، کە بەهەڵە بەئەرمەن ناویانی بـردووە[١٤]. بە وردبوونـەوە لەژمارەو خەمڵاندنەکانی کلیمان و چێرنیك هەندێ جیاوازی لە خەمڵاندنەکاندا دەبینین، ئەو سەردەمە سەرژمێری ورد لـەئـارادا نـەبـووەو ژمـارەکـان بریتین لەخەمڵاندن. ئەمانە گـەڕیـدە بـوون، هـی وایـان هـەیـە چـەنـد ڕۆژێـك لەشارەکە ماوەتەوە یا تەنها بەشارەکەدا تێپەڕیوە، بۆیە ئەم ژمارانە ناکرێ زۆر پشتیان پێ ببەسترێت. بەڵام ئـەوەی، کە تەنها کوردیان بینیوە یا زۆربـەی دانیشتووان بەلایانەوە کورد بوون ئەو ڕاستییە مێژووییە دەردەخات دانیشتووانی کورد زۆرینەیەکی بەرچاوی وایان پێکهێناوە کە ئەو بۆچوونانە لەبەرهەمەکانیاندا ڕەنگ بدەنەوە.

دانەری فەرهەنگی نێودارانی عوسمانی (قاموس الإعلام) (شەمسەدین سامی) لە کۆتایی سـەدەی نۆزدەهەمدا بەم شێوەیە باس لەلایەنی دیمۆگرافی دانیشتووانی شاری کەرکوك دەکات (ژمارەی دانیشتووانی کەرکوك دەگاتە نزیکەی ٣٠ هەزار کەس و سێ لەسەر چواری دانیشتووانەکەی کوردن ئەوی تر بریتین لەتورك و عەرەب و چەند کەمایەتییەکی تر لەوانە (٧٦٠) جوو و (٤٦٠) کلدانی[١٥].

دوای تێکشکانی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٨و دابەشکردنی موڵکەکانیو دروستکردنی دەوڵەتێك بەناوی عێراق کە لەژێر مەنداتی بەریتانیدا بوو، دەزگاکانی ئینگلیز کەحوکمی ڕاستەوخۆی کوردستانیان دەکرد لەنێوان ساڵانی ١٩١٨ تاکو ١٩٢٥ ژمارەو پێکهاتەی دانیشتووانی ئەو سەردەمەی کەرکوکیان بەم شێوەیە خەمڵاندوە (عەرەب ١٠٠٠٠، تورکمان ٣٥٠٠٠، کورد ٤٥٠٠٠، کلدانی ٦٠٠و جوو ١٤٠٠) کەس. واتە لەو سەردەمەشدا کورد بەپلەی یەکەم هاتووە[١٦] هەندێك لەسەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەلە ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٤ ڕێژەی دانیشتووانی کەرکوك بەم شێوەیە بووە کورد ٤٢,٥٪، عەرەب، ٣١,٩٪، تورکمان ٢٣,٤٪ و ئەوانی تر ٢,٢٪[١٧]، بەپێی ئەم ڕێژەیەش کە نزمترە لەڕێژەی کورد لە ساڵی ١٩٥٧ کورد زۆرینەی دانیشتووانی پێکدەهێنا لەم شارەدا.

سەرچاوەکان ئاماژە بەوەش دەکەن لە ساڵی (١٩٣٠) دا شارەوانی کەرکوك سەرژمێرییەکی کردووە، بەپێی ئەم سەرژمێرییە ژمارەی دانیشتووانی شارەکەی بە (٣٥) هەزار کەس خەمڵاندوە، کە (٢٢) هەزاریان کورد بوونەو ٧ هەزاریان تورکمانو هەزاریان مەسیحیو ٥٠٠ ئەرمەنیو ٢٥٠٠ جولەکە، دوو هەزاریشیان ئەوانی تر بوون[١٧] . هەر بەپێی ئەو سەرژمێرییەی ساڵی ١٩٣٠، لەنامەکەی محەمەد ئەمین زەکیشدا ئاماژەی پێکراوە، کە بۆ مەلیك فەیسەڵی یەکەمی ناردووەو لەسەر بنەمای نەتەوەیی کراوە، ڕێژەکان لەلیوای کەرکوك بەم شێوەیە بوونە: کورد ٥١٪، تورکمان ٢١,٥٪، عەرەب ٢٠٪، نەتەوەکانی تر ٧,٥٪[١٩].

دواتر ئاماری ساڵی ١٩٤٧ کراوە، بەڵام لەوێدا ئاماژە بە پێکهاتەی ئەتنیکی خەڵکی کەرکوك نەکراوە، تەنها باس لەپێکهاتەی ئایینی دانیشتووان کراوە کەبەم جۆرە بووە: موسوڵمان (٥٨٦٥٤) کەسو مەسیحی (٦٧١٥)و جولەکە (٢٨٧٣)و سابیئە (٣٧) کەسو ئایینەکانی تر (٢٨) کەس، ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئێزیدی لەسەر بنەمای ئایینی لەکورد جودا کراوەتەوە[٢٠]. بەپێی هەندێ سەرچاوە لەو سەرژمێرییە ڕێژەی کورد ٥٣٪ بووە[٢١]. بەپێی بەڵگەکانی ئاماری حکومەت لە ساڵی (١٩٥٤)دا کورد هەر زۆرینەی دانیشتووانی لیواکەی پێکهێناوە[٢٢].

دواتر لە ساڵی ١٩٥٧ سەرژمێرییەکی گشتی لەعیراقدا کرا. لەگەڵ هەموو کەموکورتییەکانیدا بەگونجاوترین سەرژمێری دادەنرێت، کە لەم بوارەدا مرۆڤ متمانەی پێبکاو پشتی پێبەستێت، چونکە بە بەراورد لەگەڵ سەرژمێرییەکانی پێشو پاش خۆی لە بارودۆخێکی گونجاو تردا کراوە[٢٣]. هەرچەندە ئەم سەرژمێرییە لەسەر بنەمای زمانی زگماکی دانیشتووان ئەنجام دراوە.

ئەو ڕەخنانەی دەتوانین ئاراستەی پێوەری زمانی دایكو ئەنجامەکانی ئەم سەرژمێرییە بکەین لەچەند خاڵێکدا دەخەینە روو:

**یەکەم:** مەرج نیە هەمیشە زمانی زگماکی دانیشتووان باری ڕاستەقینەیان بەرجەستە بکات، بەتایبەت کاتێ زمانی کەمینەیەك، لەم حاڵەتەدا زمانی تورکییە، کە بەهۆی دەسەڵاتی عوسمانیو کۆنتڕۆڵکردنی بازاڕو دەزگا حکومییەکانەوە باڵادەست بووە. ڕێژەیەکی یەکجار زۆر لەدانیشتووان بۆ ئەوەی کارەکانیان بەڕێوەبچنو کۆسپو تەگەرەیان بۆ دروست نەکرێ هەوڵیانداوە بەو زمانە بپەیڤن، بۆ کەسانی ناشارەزا لەباری ڕاستەقینەی ئەو شارە واهاتووەتە بەرچاو، کەزمانی تورکمانی زمانی زۆرینەی دانیشتووانی شارە.

**دووەم:** فاکتەرێکی تر، کە ئەم بۆچوونەی باڵادەست کردووە، لەوەدایە کە زۆربەی فەرمانبەرەکان کە ئەرکی سەرژمێرییەکەیان بەڕێوە بردووە بەڕەچەڵەك تورکمان بوونەو ژمارەیەکی یەکجار کەم کوردو ئەندامانی گروپە ئەتنیکییەکانی تر ئەو ئەرکەیان پێ سپێردراوە. ئەم ماڵنووسانە بەقازانجی خۆیان ژمارەیەکی زۆر کوردییان بەتورکمان نووسیوون هەر لەبەر ئەوەی هەندێ تورکمانیان زانیوە، بۆ ئەمەش بەڵگەی زۆر لەدادگای کەرکوکدا هەبووە.

**سێیەم:** لەسەرەتای سییەکانیشەوە زمانی عەرەبی دەبێ بەزمانی بەڕێوەبەرایەتیو خوێندن لە کەرکوکدا، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا هەندێ گۆڕانکاری دێنێتە کایەوە. کە لەهەڵکشانی ڕێژەی عەرەبی زمان بەرجەستە دەبێت.

**چوارەم:** زۆربەی هەرە زۆری کوردی کەرکوك نەخوێندەوارو هەژار بوونو نەیاندەزانی چی لەبارەیانەوە تۆمار دەکرێ.

ئەوەی شایانی باسە ئەم فاکتەرانەو گەلێ فاکتەری تر هەمووی لەبەرژەوەندی گروپەکانی تردابوونو بەزیانی کورد شکانەوە.

بەپێی ئەنجامەکانی سەرژمێری ١٩٥٧ ژمارەی دانیشتووانی پارێزگای کەرکوك (٣٨٨٨٣٩) کەس بوون. ژمارەی ئەوانەی، کە زمانی کوردییان بەزمانی زگماکی خۆیان زانیوە لە لیواکەدا (١٨٧٥٩٣) کەس بوونە لەکۆی سەرجەم دانیشتووان. ژمارەی عەرەبی زمانیش (١٠٩٦٢٠) کەس بوون. ئەگەر بەپێی ڕێژەش لێکیدەینەوە ئەوا ڕێژەی دانیشتووانی کورد زمان دەکاتە (٤٨٪)ی هەموو دانیشتووانی پارێزگاکەو عەرەبی زمانیش ٢٨٪و تورکمانی زمان (٢١٪)، ئەوانی تریش (٢,١٪)[٢٤].

لەم سەرژمێرییە ئەوە بەدی دەکرێت، کە ژمارەی دانیشتووانی عەرەب بەڕێژەیەکی بەرچاو زیادی کردووە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی ئەو سەردەمەی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەرامبەر بە پێکهاتەکانی تری ئەم لیوایەو هێنانی عەرەب بۆ ناوچەکە بەتایبەتی دوای دۆزینەوەو دەرکردنی نەوتو دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی عێراق (I.P.C)، کە خەڵکێکی زۆر بەمەبەستی کارکردن لەو کۆمپانیایەدا ڕوویان کردە کەرکوك. هەروەها لەسییەکاندا لەکاتی دروستکردنی پرۆژەی ئاودێری حەویجە زیاتر لە (٢٧٠٠٠) هەزار عەرەب لە هۆزەکانی (عوبێد، جبور، ئەلبوحەمدان... هتد) لەو دەڤەرە نیشتەجێ کران بەمەبەستی بەعەرەبکردنی ناوچەکە[٢٥].

لە ئەنجامی ئەو سیاسەتانەداو لەگەڵ هەڵکشانی ڕێژەی عەرەب ڕێژەی دانیشتووانی کورد بە بەراورد لەگەڵ هەڵکشانی ژمارەی دانیشتووانی عەرەب لە لیواکە

لەماوەیەکی کەمدا کەمی کردووە، سەرچاوە مێژووییەکان ئەم ڕاستییە بەزەقی دەخەنەڕوو، بەڵگەشمان ئەوەیە، کە لە ساڵی ١٩٣٠دا ڕێـژەی عـەرەب تەنها (٢٠٪)ی دانیشتووان بوو، کەچی لە ساڵی ١٩٥٧دا ئەم ڕێژەیە گەیشتووەتە (٢٨٪)ی دانیشتووان لەهەمان کاتیشدا لە ساڵی ١٩٣٠دا ڕێژەی کورد (٥١٪)ی دانیشتووان بووە، کەچی لە ساڵی (١٩٥٧)دا دەبێتە (٤٨٪)ی سەرجەم دانیشتووانی لیواکە، دواتر ئەم ڕێژەیە بەشێوەیەکی دراماتیکی کەم دەکات، وەکو لەبەشی دووەمو سێیەمی ئەم لێکۆڵینەوەدا بەووردی باسی لێوە دەکەین.

سەبارەت بە پێکهاتەکانی تری دانیشتووانی شارو لیوای کەرکوك کە لەپاڵ کـورددا دەژێـن ئـەوا ئەمانە لەسەردەمە جیاوازەکانی مێژوودا ڕوویان لەم شارو ناوچەیە کردووە. لەبـارەی تورکمانەکانەوەو هاتنیان بۆ کـەرکـوك بـیروڕای جیاواز لە ئارادان. هەندێ لە نووسەرە تورکمانەکان هاتنی ئەم گرووپە دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمانی ئەمەوییەکان کاتێك وەکو سەربازی کۆیلەو کرێگرتە بەکارهێنراون لە (فتوحات)ی ئیسلامیداو یەکەی سەربازیان لێ دروستکراوە[٢٦].

لە هەشتاکانی سەدەی دەی زایینیدا هۆزە تورکمانەکان هاتوونەتە عێراقی ئەمڕۆو لە ساڵی ١٠٥٥ز سەلجوقییەکان دەستیان بەسەر دەسـەڵاتـدا گـرتـووە[٢٧]. ئینجا سەردەمی فەرمانڕەوایی قرە قۆینلو (١٤١١- ١٤٦٨م)و ئاق قۆینلو (١٤٦٨- ١٥٠٨) . دەستپێدەکات، بەم شێوەیە شەپۆڵەکانی هاتنی هـۆزە تورکمانەکان بۆ ناوچەکە یـەك لـەدوای یەك دەستپێدەکات.

دەبـێ ئـامـاژە بـەو ڕاستییەش بکرێ کە هاتنی هـۆزە تورکمانەکان لـە نـێوەڕاسـتـی ئـاسـیـاوە لەسەردەمەکانی ئەمەویو عەبباسیو تەنانەت سەلجوقیو قەرەقۆینلۆو ئاق قۆینلۆشدا سەردەمی مانەوەو نیشتەجێبوون نەبووە، بۆیە لەهیچ جێگەیەکی کوردستانو عێراق شوێنەوارێکی ئەوتۆیان بەجێ نەهێشتووە. سـەردەمـی هاتنو نیشتەجێبوونیان لەکوردستانو عێراقی ئەمڕۆدا بۆ سەردەمی نوێی مێژوو بەتـایـبـەتـی لـەکـاتـی دەسـەڵاتـی سـەفـەویو ئـەفـشـاریو عوسمانیدا دەگەڕێتەوە.

هـۆزە تـورکـمـانـە شـیـعـەکـان کـەوتـنـە تـەك هێرشـەکـانـی شاعـەبـبـاس (١٦٢٣)و نـادر شـا (١٧٣٢-١٧٤٣)و لـەو ڕێـگـەیـەوە گەیشتنە کوردستان تورکمانە سوننەکانیش لـەسـەردەمـی دەسـەڵاتـی عـوسـمـانـیـدا لـەو شـارانـەی کـوردسـتـانـدا جێگیر بـوون، کە ئێستا لـەسـەر خاکەکەی دەژیـن. لـەم بـوارەشـدا دیـدو بۆچوونی جیاواز لـەئارادان. بـۆ نـمـوونـە بـۆچـوونـێـك هـەیـە دەڵـێ هـەریـەك لەسوڵتان سەلیمی یەکەم (یاوز) (١٥١٢- ١٥٢٠ز)و (سلێمان قانونی) (١٥٢٠- ١٥٦٦ز) لە ئەنادۆڵەوە هێناویانن بۆ پاراستنی ڕێگای سوڵتانی[*].

بەپێی هەندێك سەرچاوەی تریش بنەچەی تورکمانەکانی کەرکوك دەگەڕێننەوە سەر بنکە سەربازییە ئازەرییەکان کە شا عەباس (١٦٢٣)و نادرشا (١٧٣٠- ١٧٤٧) لەقزلباشەکان دروستیان کردن[**].

کـۆی ئـەو بـیروڕایـانـەی بـاسمـان کـردن ئـەوە پشت ڕاستدەکەنەوە کە تورکمانەکانی پارێزگای کەرکوك بەشێکیان پاشماوەی سەربازو فەرمانبەرە مەدەنییەکانی عوسمانینو بەشەکەی دییان لەگەڵ سوپای سەفەوی ڕوویان کردووەتە ئەم ناوچەیە. گرووپی یەکەمیان بەتایبەتی دوای گرتنی بەغداد لەلایەن سوڵتان مـورادی چوارەمـەوە ١٦٣٨ ز لەم ناوچەیە جێگیر بوونو بەڵگەمان بۆئەم بۆچوونەی سەرەوە ئەوەیە کە بەشێك لە تورکمانەکان شیعە مەزەبنو بەشەکەی تریان سوننەی حەنەفین، هەمان مەزەبی عوسمانییەکان. یەکێ لە ئەرکە سەرەکییەکانی ئەمانە پارێزگاری بوو لە پەیوەندییەکانی نێوان ئیالەتە باشووریو باکوورییەکانی دەوڵەتی عوسمانی[٢٨].

بـەشـی سێـیـەمـی تـورکـمـانـەکـانـی ئـەمـڕۆ بـەڕەچـەڵـەك لەدانیشتووانی ڕەسەنی ناوچەکەن.

لەبەر هۆی جیاوازو بەرژەوەندیو لەئەنجامی سیاسەتی عوسمانیداو باڵا دەستی ڕەگـەزی تـوركو زمانی تورکی لەگەڵ کاتدا بوونەتە تورکمان. ئەمانە زۆربەی هەرە زۆریان بەڕەچەڵەك کوردن، بـەرژەوەنـدی ئابووریو سیاسیو باڵا دەسـتـی زمـانـی تـورکـی عوسمانیو لـەدوایـیـدا تورکمانی وای لێکردوون خۆیان بەتورکمان ڕابگەیەنن، نەوەکانیان بەتورکمانی گەورەبوونو هیچ گومانیان لەتورکمانیبوونی خۆیان نییە.

لەکۆتاییدا مـرۆڤ هەست بەچی دەکـاتو خـۆی بەکێ لەقەڵەم دەدا ئـەوەیـە. ڕەنـگـبێ یەکێ لە بەڵگە گرنگەکان بۆپشت ڕاسـتـکـردنـەوەی ئـەو بۆچـوونـە، واتـا ڕەچـەڵـەکـی کوردیی هەندێ لە بنەماڵە تورکمانەکان، ئەوەیە کە تورکمانە بەڕەچەڵەك کوردەکان زۆربـەی زۆریـان شافعی مەزەبن. کە مەزەبی زۆربەی کوردانی موسڵمانە.

پەیدابوونی عـەرەب لە سـنـووری پارێـزگای کەرکوکدا مێژووییەکی زۆر دوورو درێـژی نییە. لە باسی سێیەمدا بەدوورو درێژی دێینەوە سەر ئەم بابەتە.

ئەوەش کە پەیوەندی بە جوولەکەو کلدانیو ئاسورییەوە هەیە ئـەوا گەلێ لەمانە مێژووییەکی کۆنیان لەپارێزگای کـەرکـوکـدا هـەیـە. سـەبـارەت بە جـووەکـان بـیروڕا هەیە کە لـە سـالـی (٦٠٤ پ.ز)، کاتێك نـەبوخـوز نـوسـەڕ هێرشی بـردووەتـە سـەر فەلەستین ئەمانەی لە ئۆرشەلیم (قـودس)ەوە بەدیل ڕاپێـچی کـردوون بۆ بابلو بەسەر وڵاتی بابلو ئاشوورو مـادا[٢٩] دابەشی کـردوون. جولەکەکان بەزمانی عیبری دەپەیڤینو مزگەوتە بچووکەکەی پێغەمبەر دانیال یادەوەری پێغەمبەری جووەکانە[٣٠]. پێغەمبەر (دانیال)یش لەو جووانە بوو کە لەلایەن نەبو خوزنوسەرەوە بەدیل گیرا لەگەڵ هاوڕێکانی بۆ ئەم ناوچەیە ڕاپێچکرا[٣١].

ئینسکلۆپیدیای جـووەکـان جولەکەی شـاری کەرکوك لە کۆتایی سەدەی نـۆزدەو دەستپێکی سەدەی بیستدا بە (٢٠٠) خێزان دەخەملێنێت. بەپێی هەمان سەرچاوە لە ساڵی (١٩٤٧) ژمارەی جوولەکەکان ٢٣٥٠ کەس بوونو لەساڵانی ١٩٥٠-١٩٥١ وەکـو جووەکـانـی تـری کـوردسـتـانو عێراق کەرکوك بەجێ دەهێڵنو بەرەو ئیسرائیل کۆچ دەکەن[٣٢].

سەبارەت بە پەیوەندی جوولەکەکان لەگەڵ پێکهاتەکانی تری کەرکوکدا د. نوری تاڵەبانی دەڵێ: جولەکەکان هەمیشە خەریکی بازرگانی بوون و لەگەڵ پێکهاتەکانی تری شاردا پەیوەندییان زۆر چاك بووە، تاڵەبانی لەم بارەیەوە دەڵێ (لەکاتی ڕۆیشتنیان لە کەرکوك بەبیرم دێت، کە بەگریانەوە ماڵ ئاواییان لەخەڵك دەکرد)(٣٣).

**٢. کورتەی مێژووی کەرکوك تا ساڵی ١٩٦٣:**

مێژووی ئاوەدانکردنەوەی شاری کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی پێنج و چواری پێش زاینی (٤٥٠٠–٣٥٠٠ پ.ز) (٣٤). مێژوونووسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە شاری کەرکوك لەلایەن گوتی و هورییەکانەوە (حورییەکان) بنیات نراوە، لەنووسینە بزمارییەکانی سەردەمی ئەکەدیشدا ئاماژە بۆ ئەوە هەیە کەشاری کەرکوك لەلایەن لولوبییەکانەوە بنیات نراوە. لەهەزارەی دووەم و یەکەمی بەر لەزایین هورییەکان دانیشتووانی کەرکوك بوون، کە ئەوکات بەدوو ناو ناسراوە (ئاراپخا و ئال–ئیلانی) واتە شاری خواوەندەکان (مدينة الالهة)(٣٥). گوتییەکانیش گەلێکن لە کۆنەوە لە ناوچەکە جێگیربوون و پێیەتەختەکەشیان شاری ئاراپخا بووە هەروەك نووسەری عەرەبی عێراقی د. شاکر خەسباك ئاماژەی پێدەکات و دەڵێ (مێژوونووسان کۆکن لەسەر هەبوونی گەلێك لە ناوچەی کەرکوك بەناوی گۆتی). هەروەها باسی ئەوە دەکات (سەرچاوە سۆمەرییەکان ئاماژە بەوە دەدەن، کە ناکۆکی زۆریان هەبووە لەگەڵ ئەم گۆتیانەداو بەردەوام ئەمانەی دوایی هێرشیان کردووەتە سەر شارە سۆمەرییەکان) و هەروەها دەڵێ: (سۆمەرییەکان و ئەکەدییەکان ناچار بوون دان بە پاشایەتی گوتییەکاندا بنێن کە پێیتەختەکەیان ئاراپخا بووە)(٣٦).

دواتر میدییەکان لە (٦١٢ پ.ز) توانیان ئەم ناوچەیە بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە(٣٧). لە ساڵی (٣٣١ پ.ز) ئەسکەندەری مەکدۆنی لەهێرشەکەیدا بۆ سەر ناوچەکە دەوڵەتی هەخامەنشی تێکدەشکێنێ و وڵاتی بابل داگیر دەکات و کەرکوکیش دەخاتە ژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریەتەکەی خۆیەوە(٣٨).

دواتر ناوچەکە بوو بە بەشێك لە دەوڵەتی سلوکییەکان (السلوقيين) و ئەوجار بەشێك لە دەوڵەتی ساسانی تا ساڵی (٦٣٦)ز، کاتێ عەرەبە موسوڵمانەکان لە نیمچە دوورگەی عەرەبەوە ڕوودەکەنە ناوچەکە(٣٩) . دوای ئەوە کەرکوکیش وەکو دەڤەرەکانی تری کوردستان دەبێ بە بەشێك لە دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی و لەدوای نەمانی دەوڵەتی عەباسیش و هاتنی مەغۆل و تورکمانەکان کەرکوکیش هەروەك دەڤەرەکانی تری ناوچەکە لەسەر دەستی سەلجوقی، تووشی هێرش و تاڵانکاری و گێرە شێوێنی دەبێت.

داگیرکاری عوسمانی لەنیوەی یەکەمی سەدەی شازدەهەمدا بارودۆخێکی ناهەموارو خراپ لە ناوچەکەدا دێنێتە کایەوە کە چوار سەدەی ڕەبەق دەخایەنێت لەو چەند سەدەیەدا ناوچەکە تووشی کێشەو گرفتی زۆر دەبێ بەهۆی ململانێ دوورو درێژی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران بەتایبەتی لە کاتی هێرشی شا عەباسی یەکەم لە ساڵی (١٦٢٣) و هێرشی نادرشای ئەفشاریدا لە ساڵی (١٧٣٢)، کە گەمارۆی کەرکوکیدا(٤٠). ساڵی دواتر عوسمانییەکان لە شەڕدا تووشی شکست دێن و لە ساڵی (١٧٤٣)دا جارێکی تر کەرکوك دەکەوێتە بەر هێرشی نادر شاو پاشان بەپێی ڕێکەوتننامەی ئاشتی ساڵی (١٧٤٦) دەگەڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بەم شێوەیە لەژێر دەستی ئیمپراتۆری عوسمانیدا دەمێنێتەوە تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی(٤١).

ئەوەی جێگای باسە دەوڵەتی عوسمانی لەسەدەی حەڤدەدا ئەو ناوچانەی کە عێراقی ئەمڕۆ پێکدێنن بۆ سێ ویلایەت دابەشکرد (بەغدا، بەسرە، مووسڵ)(٤٢)، ویلایەتی موسڵ سنوورەکەی چیای حەمرین بوو ئەم سنوورەش لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەکی هەرەمەکی دانەنرابوو بەڵکو بۆ جیاکردنەوەی دوو نەتەوەی جیاوازو بارودۆخی جوگرافیایی جیاواز بوو(٤٣). هەر چەندە کەرکوك بوو بەبەشێك لە موڵکەکانی عوسمانی بەڵام دەسەڵاتی ڕاستەقینە بەدەست دەرەبەگ و میرانی میرنشینە کوردییەکانەوە مایەوەو لە ساڵی (١٥٨٣)دا سوڵتان مورادی سێیەم داوای لەمیری موکریان کرد کە هەرێمەکانی مووسڵ و شارەزوورو هەولێر بەڕێوە ببات.

لە کۆتایی سەدەی حەڤدەشدا بوو بەبەشێك لە موڵکەکانی میرنشینی بابان، کە لە زۆر شوێندا جێگەی میرنشینی ئەردەڵانی گرتەوە لەو ناوچانەی، کە ئەمڕۆ بە کوردستانی عێراق ناسراوە. ئەو سەردەمە ویلایەتی شارەزوور لە پارێزگاکانی ئێستای کەرکوك و هەولێر و سلێمانی پێکهاتبوو(٤٤). دواتر والی بەغدا مەدحەت پاشا (١٨٦٩–١٨٧٢) عێراقی ئەمڕۆی بەسەر سێ ویلایەتدا دابەش کرد کە ویلایەتەکانی بەغدا، موسڵ و بەسرە بوون. ویلایەتی مووسڵ لە سێ سەنجەقی پێکهاتبوو: سەنجەقی ناوەندەکە قەزاکانی دهۆك، زاخۆ، ئامێدی، سنجارو ئاکرێی دەگرتەوەو، سەنجەقی کەرکوك کە قەزاکانی هەولێر، ڕانیە، ڕواندوز، کۆیە و کفری لەخۆ دەگرت ئەم قەزایانەش ١٧ ناحیەو ١٧١٢ گوندیان لە خۆ دەگرت. سەنجەقی سلێمانیش قەزاکانی بازیان، هەڵەبجە، شارەزوورو مەرگەی لەخۆ دەگرت(٤٥). ئەم دابەشکردنە هەر بەم شێوەیە مایەوە تا ساڵی ١٩١٨، کاتێ سێ قەزا لە باکووری زێی بچووك لە کەرکوك جیاکرانەوە بۆ ئەوەی لیوای هەولێریان لێ دروست بکرێت(٤٦).

بەریتانییەکان لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا چالاکییەکی بەرفراوانیان نواند بۆ داگیرکردنی کوردستان. لێرەوە هێزەکانیان بەرەو کەرکوك پێشڕەوییان کردو لە (٢٨)ی نیسانی (١٩١٨)دا توانیان کفری بگرن و ڕۆژی دوای ئەوەش خورماتوو داگیرکراو لە (٧)ی مایسی هەمان ساڵیشدا چوونە ناو کەرکوکەوە، بەڵام ناچاربوون لێی بکشێنەوە. دواتر جارێکی تر هێزەکانی بەریتانیا کەرکوکیان داگیر کردەوە پێنج ڕۆژ بەر لە ئاگربەستی مۆدرۆس واتە لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)(٤٧). هەر لەو ساڵەشدا واتا ١٩١٨، قەزای خانەقین و مەندەلی کەزۆرینەی دانیشتووانی

کوردبوون خرانەسەر لیوای دیالە، کە تازە دروستکرابوو. جێی سەرنجە ناوچەی سلێمانی لێ بترازێت، کە ئیدارەییەکی کوردی بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمودی حەفید تێیدا دامەزرا بەسەرپەرشتی ژمارەیەك لە ئەفسەرە سیاسییەکانی بەریتانیا لە ماوەی داگیرکردنی ویلایەتەکەدا، کە هەندێ ڕاوێژکاری بەریتانیا لە پاڵی دانران، ئەوا ناوچەکانی دیکەی ویلایەتی موسڵ لەژێر ئیدارەی ڕاستەوخۆی سوپای داگیرکەری بەریتانیادا بوون. دوای ئەوەی چاوگە گەورەکانی نەوتیان لە کەرکوك دۆزیەوە چاویان خشاندەوە بەسیاسەتی پێشویاندا لە ناوچەکەو هەوڵیاندا تێیدا بمێننەوە(٤٨). هەر چەندە بەپێی ڕێکەوتننامەی نهێنی سایکس- پیکۆ لە (١٦)ی ئایار (مایس) ١٩١٦ کە لەنێوان بەریتانیاو فەرەنساو ڕووسیادا مۆرکرابوو ئەم بەشەی کوردستان وەکو ناوچەی دەسەڵاتی فەرەنسا دانرابوو(٤٩). بەڵام مۆرکردنی پەیماننامەی سان ڕیمۆ لە (٢٤)ی نیسانی (١٩٢٠) لەنێوان بەریتانیاو فەرەنسا بەهۆی هەوڵەکانی لوید جۆرجی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیاوە لەگەڵ کلیمەنسۆی سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا بوونە هۆی دەستهەڵگرتنی فەرەنسا لەم ویلایەتە، بەرامبەر بەشداری کردنی فەرەنسا لە کۆمپانیای نەوتی تورکیدا(٥٠).

بەریتانیا لەعێراقدا حکومەتێکی کاتی بەسەرۆکایەتی (عەبدولڕەحمان ئەلنەقیب) لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی (١٩٢٠) پێکهێنا(٥١).لەم حکومەتەدا وەزارەتی بەرگری‌و وەزارەتی تەندروستی سپێردرا بەدوو کەسایەتی ناوچەی کەرکوك، کە ئەوانیش جەعفەری عەسکەری‌و عیزەت پاشا کەرکوکی بوون(٥٢) و فەتاح پاشاش کرا بە موتەسەڕیفی لیوای کەرکوك(٥٣). ئەم هەنگاوانەی حکومەتی بەریتانیا لەکاتێکدا بوو، کە هێشتا کێشەی ویلایەتی موسڵ لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە یەکلانەبووبۆوە، واتا ویلایەتی موسڵ بەلیوای کەرکوکەوە هێشتا بەڕەسمی نەخرابوونە سەر دەوڵەتی عیراق.

لە (٢٩)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢١ ئەمیر فەیسەڵی کوڕی شەریف حوسێن گەیشتە بەغدا، پاشان حکوومەتی عێراق ڕاگەیەندراو لە (٢٣)ی ئابی ١٩٢١ تاجی لەسەر نرا، دواتر ویلایەتی موسڵ، کە کەرکوك بەشێکی گرنگی بوو بەعێراقەوە لکێندرا، ئەویش پاش دەرچوونی بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە (١٥)ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٥ بۆ چارەسەر کردنی کێشەی سنووری نێوان تورکیاو عێراق. بڕیاری ناوبراو دوای ئەوە دەرچوو کە لیژنەیەکی تایبەت بۆ دەستنیشانکردنی سنووری نێوان دەوڵەتی عێراق‌و تورکیا دانرا، ئەم لیژنەیە پێکهاتبوو لە: کونت پۆل تیلیکی - Count Paul Teleky سەرۆك وەزیرانی پێشووی مەجەرو، ئە. ف ڤیرسن- A.F. Wirsen دیپلۆماتێکی سویدی بوو و عەقید پاولس کە ئەفسەرێکی خانەنشینی بەلجیکی بوو، لەگەڵ هەریەك لە سنیۆر رودولو - Rodolo کە ئیتاڵی بوو و. هوراس دی پورتالیە - Horace Pourtalis(٥٤). لیژنەکە پاش سەردانێکی بۆ ویلایەتەکە لە مانگی شوباتی هەمان ساڵدا ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش بە ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان کرد(٥٥). لە میانەی سەردانەکەیدا بۆ ویلایەتە کە لیژنەکە سەردانی کەرکوك، چەمچەماڵ، کفری، پردێ، خورماتوو، کەلارو قادر کەرەمی کرد. سەبارەت بەڕاپۆرتی لیژنەکە، کە ڤیرسن سەرۆکی بوو لە ڕاپۆرتی کۆتاییدا ئەو ڕاستییەی سەلماند کە زۆرینەی دانیشتووانی کەرکوك کوردن ئەو ژمارانەی ڤیرسن تۆماری کردوون بەم شێوەیە بوون: عەرەب (٣٧٠٠٠) و کورد (٤٨٠٠٠) و تورکمان (٢٦٠٠٠) کەس(*). لە سەرچاوەکاندا ئاماژە بەوە دراوە، کەرکوك لەکاتی مەندەیتی بەریتانیدا بەسەردەمێکی مێژوویی ناهەمواردا تێپەڕیوە چونکە ئینگلیزەکان لەناو کەرکوکدا خەریکی بەکارهێنانی سیاسەتی چاندنی تۆی دووبەرەکی بوون‌و لەهەوڵی ئەوەدا بوون کورد پەراوێز بکەن‌و کەمینەکانی تر باڵا دەست بکەن. هەروەك لە ڕووداوی ساڵی (١٩٢٤)دا بەدی دەکرێت، کە لە (٤)ی مایسدا ڕوویدا. چۆنییەتی ڕوودانی ئەو ڕووداوە بەشێوەی جیاواز باسی لێوە کراوە. ئەم جیاوازیەش لەنێو نووسەراندا دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی نەتەوەیی‌و ئایینی‌و تاڕادەیەك مەزهەبیش، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ڕووداوەکە بەم جۆرە بوو. ژمارەیەك لە سەربازانی لیڤی کە بەڕەگەز ئاسوری بوون لەناو بازاڕی شاری کەرکوك بوون، یەکێ لەم سەربازانە لەگەڵ گۆشت فرۆشێکی خەڵکی کەرکوك لە بازاڕی قۆریە دەبێتە شەڕیان(٥٦). سەربازەکە بریندار دەکرێت ئەویش دەگەڕێتەوەو هێزێکی زۆر دەڕژێتە ناو شارو هەرچیان بەردەست دەکەوێ تەقەی لێدەکەن(٥٧). لە ئەنجامدا پەنجا کەس(*) لەخەڵکی شار دەکوژرێن‌و ژمارەیەکی زۆریش بریندار دەبن(٥٨). ئەم ڕووداوەش لەبەرە جەژناندا بووە، هێزەکانی پۆلیس ویستیان ڕێگریان لێبکەن، بەڵام دوو پۆلیس دەکوژرێن‌و موراد بەگی مودیری پۆلیسیش بە بڕیاری بەریتانیا بێدەنگ دەکرێ بەناچاری بڕیار دەدەن خۆیان بەرگری لەخۆیان بکەن. لیڤییەکان پەلاماری مزگەوت‌و گەرماوی ژنان دەدەن، بەڵام خەڵکەکە بەرپەرچیان دەدەنەوە(٥٩). دواتر مەندوبی سامی بەریتانی فەرمانێکی دەرکرد بەگواستنەوەی هێزی لیڤی بۆ چەمچەماڵ‌و پەیمانی سزادانی تاوانبارانی دا(٦٠). بەڵام کەس سزا نەدرا، چونکە دادگای لێکۆڵینەوەی ئەم ڕووداوە نەیتوانی تاوانبارانی کوشتاری ڕۆژی یەکەمی کارەساتەکە بناسێنێ‌و دەوڵەتی عێراق‌و زۆربەی خەڵك لەم باوەڕەدا بوون کە کاربەدەستانی بەریتانی پشتی ئاسورییەکان دەگرن(٦١). ئینگلیزەکان زۆر لەکورد بەگومان بوون چونکە ئەو سەردەمە دروشمی بزاڤی کورد سەربەخۆیی کوردستان بوو، هەڵبەتە بە کەرکوکیشەوە، بۆیە ئەوەندەی پێیان دەکرا کوردیان لە کەرکوك بێ هێزو پەراوێز دەکرد، چونکە ئەو هەوڵەی بزاڤی کورد دەقاو دەق لەدژی بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز بوو لەعیراق‌و کوردستان.

لەگەڵ ئەوەشدا بزاڤی سیاسی کوردی لە کەرکوك خامۆش نەبوو. لە ساڵی (١٩٣٧)دا لەشاری کەرکوك حزبی هیوا دروست دەبێت، کەلە سەرەتادا کۆمەڵەی (دارکەر) بوو. دواتر ئەم کۆمەڵەیە بوو بەپارتێکی سیاسی بەهێز بەناوی پارتی (هیوا)، کە ڕۆڵێکی دیاری گێڕا لە پەرەپێدانی هەستی نەتەوایەتی. دواتر لەدوای (٧) ساڵ لەکاروچالاکی لە ساڵی ١٩٤٤ بەهۆی هەندێك کێشەی ناوخۆییەوە سەرکردایەتی

پارتی هیوا بڕیاری خۆ هەڵوەشاندنەوەی ڕاگەیاند[٦٢].

لە دوای ڕووداوی ساڵی (١٩٢٤)و پەیدابوونی پارتی هیوا ڕووداوی گاروباغی یەکێ لە وێستگەکانی چالاکی سیاسی بوو لەشاری کەرکوك. مانگرتنی کرێکاران لەگاورباغی نیشانەی پەرەسەندنی هۆشیاری چینی کرێکار بوو لە کەرکوك و ناوچەکە[٦٣].

دەسپێکی ڕووداوەکە بە بەرزکردنەوەی یاداشتێك بوو لەلایەن کرێکارانەوە بۆ چاککردنی باری گوزەرانیان، کە پێشکەش بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیای نەوتیان کردبوو[٦٤]. ئەو یادداشتە چەند داواکارییەکی تێدا هاتبوو، لەوانەش دامەزراندنی سەندیکایەك بۆ کرێکارانی نەوت بۆ ئەوەی نوێنەرایەتیان بکەن و داخوازییەکانیان بگەیەننە کاربەدەستان و چاککردنی بارودۆخی ژیان و گوزەران و کارکردنیان لە بوارەکانی موچەو دابینکردنی هۆکارەکانی گواستنەوەو خانوو بەرەو خەرجکردنی کرێی خانوو بۆ زامنکردنی ژیانیان[٦٥]. بەڵام بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیای نەوتی عێراقی گوێی لەم داواکارییانە نەگرت بۆیە کرێکاران بەردەوام بوون لەسەر پێشکەشکردنی یاداشت و مانگرتن، لە یاداشتەکانیاندا بێزاری خۆیان دەردەبڕی بەرامبەر بەکاربەدەستانی کۆمپانیاکە. لەیاداشتەکەدا ئەوەشیان ڕاگەیاند بوو کە ئەگەر ئاوڕ لە کێشەکەیان نەدرێتەوە، ئەوا کرێکاران پەنا دەبەنە بەر مانگرتنی گشتی[٦٦]. لە (٣)ی تەممووزی (١٩٤٦)دا کرێکارانی کۆمپانیای نەوت لەگاورباغی مانیان گرت، دوای چەندین دانیشتن و وتووێژ لەگەڵ نوێنەرانی حکومەت و کۆمپانیای نەوت نەگەیشتنە ئەنجام[٦٧]، ئیتر کرێکاران گەڕانەوە بۆ گاورباغی (واتا باخی گاوران) کە ڕۆژانە تیایدا کۆدەبوونەوە[٦٨].

لە (٧)ی تەممووزی ساڵی (١٩٤٦)دا بابە عەلی شێخ مەحمود وەزیری ئابووری گەیشتە کەرکوك و لەلایەن کرێکارانەوە خۆپیشاندانێکی گەورەکرا. وەزیری ئابووری داوای لێکردن بگەڕێنەوە سەر کارو بەڵێنی پێدان کە لە کێشەکانیان دەکۆڵنەوە، بەڵام کرێکاران لەسەر مانگرتنەکەیان بەردەوام بوون تا داواکارییەکانیان جێ بەجێ بکرێت[٦٩].

موتەسەڕیفی کەرکوك (حەسەن فەهمی) لە (١٠)ی هەمان مانگدا ئاگادارییەکی بۆ کرێکارە مانگرتووەکان بڵاو کردەوە، کە تیایدا بەڵێن درابوو گوایە کۆمپانیای نەوتی عێراقی ئامادەیە داخوازییەکانی کرێکاران جێبەجێ بکات و دەرماڵەی کرێی زیادەکاریی (ئۆڤەرتایم)یان بۆ خەرج بکات، هەروەها کرێی ڕۆژانی پشوودان و نەخۆشیان بۆ ئەژمارو خەرج بکرێ و نەوتیشیان بۆ دابین بکات، بەڵام مانگرتووان بەو وادەو بەڵێنانەی موتەسەڕیف ڕازی نەبوون[٧٠]. کرێکاران سووربوون لەسەر درێژەدان بە مانگرتن. موتەسەڕیف لە (١١) و (١٢) مانگی تەممووزدا دیسان لەگەڵ شاندی کرێکاران کۆبووەوەو داواکارییەکەی خۆی دووپات کردەوە، کە بریتی بوو لەداخوازی گەڕانەوەی کرێکاران بۆ سەر کارەکانیان. بەڵام کرێکاران پێداگرییان کرد لەسەر هەڵوێستی پێشوویان واتا بەردەوام بوون لە مانگرتندا[٧١]. کارەکە گەیشتە ئەوەی کە موتەسەڕیف فەرمان بە بەڕێوەبەری پۆلیس (عەبدولڕەزاق فەتاح) بدات بۆ لێدانی کرێکارانی مانگرتوو لە گاورباغی. لە ئەنجامی ئەو هێرشەی پۆلیس بۆ سەر مانگرتووان (٥) کرێکار کوژران و (١٤) کرێکاریش بریندار بوون[٧٢]. هەرچەندە داوای کرێکاران ڕەوا بوو بەڵام حکومەت بەچەك وەڵامی دانەوەو سزای ئەوانەش نەدرا کەبوونە هۆی ئەو کوشتارە. لەدوای گاورباغی باری سیاسی کەرکوك گۆڕانی زۆری بەسەردا نەهات و ڕووداوی گرنگی بەخۆیەوە نەبینی و بەو شێوەیە تا ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی مایەوە. کاتێ لە (١٤)ی تەممووزی (١٩٥٨)دا ڕژێمی پاشایەتی ڕووخێنرا. کورد پشتگیری لەم گۆڕانکارییە کردو چاوەڕوانی ئەوەبوو لە سایەی ڕژێمی نوێدا بەمافەکانی خۆی بگات. عەبدولکەریم قاسم یەکەمین ڕژێمی کۆماری لەعێراق ڕاگەیاندو بوو بەسەرۆك وەزیران. لە دەسپێکی گۆڕانکاری (١٤)ی تەممووزدا بانگەشەی ئەوەکرا کە کوردو عەرەب لە عێراقدا هاوبەشن و هەندێ هەنگاو لەلایەن ڕابەرانی ڕژێمی نوێیەوە بۆ پیشاندانی ئەو بۆچوونە نران، لەوانە ڕێگەدان بە گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزان و هاوڕێکانی لە یەکێتی سۆڤیەتەوەو پێشوازییەکی گەرمیان لێکرا[٧٣]. پاش سەرکەوتنی کودەتای سەربازی (١٤)ی تەمموز بەماوەیەکی کەم زەعیم ڕوکن نازم تەبەقچەلی[*] کرا بەسەرکردەی فیرقەی دوو، کە مەڵبەندەکەی لە کەرکوك بوو. چەند هەفتەیەك دوای (١٤)ی تەمموز کۆمەڵێ لە مامۆستایانی کورد یادداشتنامەیەکیان بەرزکردەوە بۆ وەزارەتی خوێندن (معارف) کە داوای بایەخدانیان بەزمان و کەلەپووری کوردی تێدا کردووە، هەروەها داوای دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتییەکی گشتی مەعاریفی کوردستانیان کرد کە ناوەندەکەی لە کەرکوك بێ و لیواکانی (سلێمانی، هەولێر، کەرکوك، قەزای خانەقین و قەزا کورد نشینەکانی مووسڵ) بگرێتەوە. تەبەقچەلی دوای بینینی ئەم بیرخەرەوەیە یاداشتێکی نهێنی نارد بۆ بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری سوپای عێراق (مديرية الاستخبارات العسكرية) تێیدا بە ڕابەرانی ڕژێمی گوتووە گوایە ئەم مامۆستایانە مەبەستیان لەم بیرخەرەوەیە دامەزراندنی (کۆماری کوردستان و قەوارەی کوردییە)و لەلایەکی ترەوە ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەوان، واتە مامۆستا کوردەکان شاری کەرکوکیان بەشارێکی کوردی داناوە، لە کاتێکدا بەلای تەبەقچەلییەوە ئەم شارە زۆرینەی (عەرەب و تورکمان و مەسیحیە). لەبەشێکی تری نوسراوەکەیدا داوای کردووە کە پۆستی سەرۆکی مەعاریف لە کەرکوك هەمیشە بدرێ بە کەسایەتیەکی عەرەب، گوایە بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی لەنێوان پێکهاتەکانی ئەم شارەدا[٧٤].

ئەمە سەرەتای سیاسەتی ئاژاوەنانەوەی نازم تەبەقچەلی بوو، چونکە ئەو ڕۆڵی کەم نەبوو لە ئاڵۆزکردنی پەیوەندییەکان و بارگرژی لەنێوان پێکهاتەکانی کەرکوکدا. ئەو سیاسەتانەی تەبەقچەلی لەلایەن گەلێك لەفەرمانبەرو کاربەدەستانی حکومەتەوە لە کەرکوك پەیڕەو دەکران و لەبەغدا پشتگیریان لێدەکراو لەئەنجامدا ڕووداوەکانی تەممووزی ١٩٥٩ لێ کەوتەوە.

هەر چەندە بەر لەڕوودانی توندوتیژی تەبەقچەلی تاوانبار کرابوو بە پەیوەندی لەگەڵ هەوڵی کودەتاکەی عەبدولوەهاب

شەواف لە مووسڵ، بۆیە لە پۆستەکەی لادراو ئەفسەرێکی تر بەناوی داود جەنابی، کە سەر بە کۆمۆنیستەکان بوو لە نیسانی (١٩٥٩) کرا بە سەرکردەی تیپی دووی سوپای عـێراق[٧٥]، بـەڵام پـاشمـاوەو شـوێـنـەواری سیاسەتەکانی تەبەقچەلی ڕەنگدانەوەیان لە کەرکوك زەقو بەرچاو بوونو لە ئەنجامدا ڕووداوەکانی (١٤)ی تەممووزی ١٩٥٩ لێکەوتەوە لەکاتی یادکردنەوەی ساڵیادی یەکەمی (١٤)ی تەممووزدا[٧٦]. موتەسەڕیفییەی کـەرکـوك وەك ناوچـەکـانـی تـری عێراق لیژنەیەکی بـاڵای بـۆ سـەرپـەرشـتـی کـردنو ڕێکخستنی ئاهەنگەکانی یـادکـردنـەوەی ١٤ی تـەممـوز پێکهێنابوو بەسەرۆکایەتی جێگری موتەسەڕیفو ئەندامیەتی نوێنەرانی سوپاو هەموو لایەنە ڕەسمیو جەماوەرییەکان[٧٧].

ئەم لیژنەیە بڕیاریدا خەڵك لـەڕۆژی (١٤)ی تەممووزی (١٩٥٩)دا ڕێپێوانێك بەناوشاردا بکەنو هەموو تیایدا بەشدار بنو بەهەموو شەقامە سەرەکییەکانی شاردا گوزەر بکەن[٧٨] . لێرەدا تەنها گروپێك لە تورکمانە توندڕەوەکان ئامادە نەبوون بەشداری ئەو لیژنەیە بکەنو ڕایانگەیاند کە ئەوان بەتەنیا بۆ خۆیان ڕێپێوان دەکەنو ئاهەنگ دەگێڕن..

ڕێپێوانەکە لە ئێوارەی (١٤)ی تەممووزی ساڵی (١٩٥٩) دا دەستـی پـێـکـرد بـەو ئاراسـتـەی کـە لـیـژنـەی ڕێـکـخـەر دیاریکردبوو[٧٩]. کاتێك ڕێپێوانەکە گەیشتە چایخانەی (١٤)ی تەمموز کە گەنجە تورکمانە دەمارگیرەکان تێیدا کۆدەبوونەوە چەند تەقەیەك کراو وا ڕاگەیەندرا کە لەچایخانەکەوە ڕووەو ڕێپێوانەکە کراوەو بووە مایەی سەر لێشێوانو یەکسەر شەڕ دەستیپێکرد لەنێوان ڕێپێوانەکەو کۆمەڵێك لەو تورکمانانە کە لەپێش چایخانەکە ڕاوەستابوون. دواتر تەقە دەستی پێکرد لەلایەن سەربازانو ئەندامانی بەرگری میللییەوە (المقاومة الشعبية) کە لەسەرەتاوە بەگوێرەی هەندێ سەرچاوە لەگەڵ ڕێپێوانەکەدا نەبوون[٨٠].

لـە ڕاپـۆرتـە ڕەسمییـەکـانـی بـەڕێـوەبـەرێـتـی پۆلیسی کـەرکـوك دەردەکـەوێـت، کـە ژمـارەی کـوژراوان ٣٢ کەس بوونو ١٣٠ کەسیش بریندار بوون. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بێگانە بەمەبەستو بۆ شێواندنی وێنەی ڕژێمی قاسمو تۆمەتبارکردنی کۆمۆنیستەکانو کورد ژمارەی کوژراوانیان بەسەدانو برینداران بەهەزاران لەقەڵەم داوە[٨١].

یـەکـێ لـە دەرئـەنجـامـە تـرسنـاکـەکانی ڕووداوەکـانـی (١٤)ی تـەممووزی ١٩٥٩ لە کـەرکوك دامـەزرانـدنـی هەندێ ڕێکخراوی نهێنی بوو، بۆ تۆقاندنو کوشتنی کورد لەلایەن تورکمانە تـووندڕەوەکانـەوە، کە ڕاستەوخۆی دەزگاکانی ئەمنو پۆلیسو کاربەدەستانی باڵای دەوڵەت لە کەرکوکدا پشتگیرییان دەکـردن. بۆ نمـوونـە بـەڕێـوەبـەری ئاسایش (نـوری خـەیات) یەکێ لەوانەبوو کە پشتگیری گەرمی لەم جۆرە گروپو باندانە دەکرد. ئەمانە بۆ کوشتنی کەسانی نـاوداری کورد کاریان دەکرد. یەکەمین کەس لەلایەن ئەم جۆرە ڕێکخراوانەوە کوژرا حەمە ئەمینی شەربەتچی بوو کە تەمەنی لە پەنجا ساڵ زیاتر بوو، لەبەردەم دوکانەکەی خۆیدا کوشتیان. لەئەنجامی ئەم جۆرە پیاو کوشتنەدا، خێزانێکی زۆری کورد بەناچاری کەرکوکییان جێهێشتو پەنایان بۆ شارەکانی تر برد. باندە شەڕانگێزەکان کەوتبوونە ئاگر تێبەردانی ماڵو کۆگای بازرگانانی کورد، هەندێ جاریش تێزابیان دەکرد بە دەمووچاوی هاووڵاتیانی کورداو بەیانیان ڕێگەیان لە کرێکارە هەژارەکان دەگرتو تەقەیان لێدەکردن، ئەم دەست درێژیانە بۆسەر کورد لەشاری کەرکوكو لەهەندێ لە شارۆچکەکانی تری لیواکەدا وەکو خورماتوو تا کودەتای (٨)ی شوباتی ١٩٦٣ ڕوویدا بەردەوام بوون. لە دوای (٨)ی شوباتەوە کوشتنو ڕاونانی کورد لە کەرکوك بە بەربڵاویو بەئاشکرا دەستیان پێکردو سەردەمێکی ترسناك لە مێژووی کوردانی کەرکوك دەستی پێکرد[٨٢].

شایانی باسە کاربەدەستانی تیپی دووی سوپاو دەزگا ئەمنییەکانی شار دەورێـکی ئاشکرایان لـە خۆشکردنی ئاگری دووبەرەکیو شەڕی نێوان پێکهاتەکانی کەرکوکدا دەبینی. ئەم دەورەیان پاش ڕووخاندنی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم بەباشی دەرکەوت، چونکە زۆربەیان پەیوەندی توندو تۆڵیان بەسەرکردایەتی کودەتای ١٩٦٣وە هەبووو ڕۆڵێکی دیـاریـان تـیـادا گـێـڕاو، هەندێکیشیان پـاش سـەرکـەوتنی کودەتای ناوبراو پێیەو بەرپرسێتی بەرچاوو گەورەیان گرتە دەست[٨٣].

ئەمانە زۆربەیان لەگەڵ ئەندامانی باندەکاندا بوونە ئەندام لەڕیزی گاردی نەتەوەیی (الحرس القومي) کە لاپەڕەیەکی خوێناویان لەمێژووی عیراقو کەرکوکدا بۆ خۆیان تۆمارکرد، ئەندامە تورکمانەکانی ئەم گاردانە پێگەو دەسەڵاتی نوێی خۆیان زۆر بەخراپی لەدژی کوردی کەرکوك بەکاردەهێنا.

**٣. پەیدابوونی عەرەب لە سنووری لیوای کەرکوك:**

پەیدابوونی عەرەب لە پارێزگای کەرکوك لەدوو ڕێگەوەو بـەدوو شێواز بووە. یەکەمیان وەکو هۆزو خێڵی کۆچەر لەسەر تخوبەکانی ئـەم پارێزگایە پـەیـدادەبنو لەدواییدا لەهەندێ ناوچە بەتایبەتی لە دەشتی حەویجە بەمەبەستی کۆتایی هێنان بەپێکدادانە خێڵەکییەکانو زیادکردنی ژمـارەی عـەرەب نیشتەجێ دەکرێن. دووەمیشیان وەکو کرێکارو فەرمانبەرو خاوەن پیشە، کە بەدوای کارو بژێوی ژیاندا دەگـەڕێنو ڕوودەکـەنـە کەرکوك، بەتایبەتی لەدوای دۆزینـەوەو دەرهێنانی نـەوتو دامـەزرانـدنـی کۆمپانیای نەوتی عێراق. ئەمانە زیاتر لەو پارێزگایانەوە دێن کەباری ئابوورییان زۆر خراپ بوو بە دەرکەرو توردەری دانیشتووان پێناسە دەکرێن.

هەڵبەتە لە تەك ئەمانەداو لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق بەهەزاران سەربازو پۆلیسو ئەفسەرو فەرمانبەری دەوڵەتیش دەهێنرێنە کەرکوك. پرۆسەی بە عەرەبکردنی بەشێك لە خاکی کوردستان لە ڕۆژئاوای مووسڵەوە دەستی پێکرد.

کۆچکردنی هـۆزی شـەممـەر سـاڵـی (١٦٤٠)زایـیـنـی لە شوێنە کۆنەکانیان لە ناوەڕاستی نیمچە دورگەی عەرەبەوە بـەرەو باکوور بـەرەو بیابانی شام دەستی پێکرد، هەر بەم بۆنەیەوە شەڕی خوێناوی لەنێوان شەممەرو خێڵی مولا، کە نیشتەجێی ئەوێ بوون دەستی پێکردو ماوەی بیست ساڵ

بەردەوام بوو، شەممەر سەرکەوتنی بەدەست هێناو مولای بەرەو سنووری سوریا گەڕانەوە.

ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەمەدا تێنەپەڕیبوو کاتێ شەپۆلێکی نوێ، لە ناوەڕاستی نیمچە دوورگەی عەرەبەوە دەستی پێکرد. ئەم شەپۆلە نوێیە هۆزی عەززە بوو. کێشەو ناکۆکی لەنێوان عەززەو شەممەردا، وەکو ئەوەی پێشتر لەنێوان شەممەرو مولادا ڕوویدا. عەززە توانی شەممەر دەربکاتو دووریانبخاتەوە بەرەو (جەزیرە) لەعێراق. ئەمە ئەنجامی چەندین شەڕی گەورەی نێوان هەردوو هۆز بوو[٨٤].

لە سەدەی هەژدەهەم هۆزی شەممەر لە ڕۆژئاوای فوراتەوە پەڕینەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەو ڕووبارە. ئەمەش بەهۆی پاڵە پەستۆی هۆزی عەززەوە بوو، دەسەڵاتداریی عوسمانیش بۆ شکاندنی شکۆمەندیو خۆ بەزلزانینی هۆزی عوبێد ئەم کۆچەی شەممەری ڕێگە دەدا، چونکە هۆزی شەممەر جێنشینی ناوچەکانی ئەوان دەبوون، لەدواتردا هۆزی شەممەر هەموو جەزیرەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە[٨٥].

یەکێك لەهۆزە عەرەبییەکانی تری ناوچەی کەرکوك هۆزی عوبێدە. هەبوونی ئەم هۆزە لەباشووری ڕۆژئاوای کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ شەپۆلێکی کۆچی خێڵەکی بەرفراوان لە ناوەڕاستی عێراقەوە بەرەو باکووری بەغدا لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا. ئەمەش هەر بەهۆی کۆچی هۆزی شەممەرەوە بوو لە ڕۆژئاوای فوراتەوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئەو ڕووبارە بە هۆی پاڵەپەستۆی هۆزی عەززەوە وەکو ئاماژەی پێکرا. لەئەنجامدا هۆزی عوبێد بەرەو ڕۆژهەڵاتی دیجلە پەڕینەوە. بەشێکیان بەرەو ناوچەی حەویجەو چیای حەمرین هاتن، لەوکاتەی هۆزی عوبێد لە ناوچەکەی خۆیان بەرەو ناوچەکانی کەرکوك هەڵکشان هەر لەسەر ژیانی کۆچەری بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوون[٨٦].

کاتێ شەممەر جەزیرەی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، هەروەکو هۆزی عوبێدی ناچار کرد بەرەو حەویجە مل بنێ، بەهەمان شێوەش فشاری بردە سەر بەیاتو جبورو لە شوێنەکانی خۆیان هەڵیکەندنو پەرتەوازەی کردن[٨٧]. دواتر هۆزی شەممەر نیشتەجێکراو ڕۆڵێکی بەرچاویان لەژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتی عێراقدا گێڕا.

لەلایەکی تریشەوە هۆزی (شەممەر جەربە) لە جەزیرەوە بەرەو ڕووباری فورات هاتنو لە ناوچەی جەزیرە لەنێوان مووسڵو خاپوور نیشتەجێبوون، بەشێکیشیان لەڕووباری دیجلە پەڕینەوەو لە تەنیشت زێی بچووك نیشتەجێبوون[٨٨]، هەروەها هۆزەکانی (جبور، تەی (طي)، جحێشو عگێدات) بە هەمان شێوە لە ناوچەکەدا نیشتەجێبوون[٨٩].

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (مەدحەت پاشا)ی والی بەغدا (١٨٦٩-١٨٧٢)، کە هەندێك چاکسازی کرد لەوانە نیشتەجێکردنی عەشیرەتە عەرەبییەکان، لە ڕێگەی ئەوەی زەوی دەوڵەتیان بدرێتێ، بۆ ئەوەی نیشتەجێ بن[٩٠]. مەدحەت پاشا مەبەستی خۆی هەبوو لە نیشتەجێ کردنی عەشیرەتەکان، لەوانە نەهێشتنی دەسەڵاتی خێڵەکانو کۆنترۆڵکردنیانو زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی[٩١]. بەم شێوەیە هۆزە عەرەبەکان لەم لیوایەدا نیشتەجێبوون.

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی (١٩٢١) حکومەتی عێراق لە هەوڵی بەردەوامدا بوو بۆ دانانی نەخشەو پلان بۆ جێ بەجێ کردنی پرۆژەی نیشتەجێ کردنی هۆزو خێڵە کۆچەرە عەرەبەکان لە لیواکانی (مووسڵو کەرکوكو دیالەو کوت)، دواتر پرۆژەی حەویجە، لەسەردەمی پاشایەتیدا بۆ هەمان مەبەست، بە ئەنجام دەگەیەنرێت کە لەقۆناغی یەکەمی نیشتەجێ کردنەکەدا زیاتر لە ٢٠ هەزار کەس لەم هۆزە کۆچەرانە لە ناوچەکەدا نیشتەجێ کران. ئەمەش بەیەکەم کاری نیشتەجێکردنی هۆزە کۆچەرە عەرەبەکان لە لیوای کەرکوکدا لەقەڵەم دەدرێت، دوای دروستکردنی دەوڵەتی عێراق[٩٢].

لە ئەنجامدا دەتوانین بڵێین بەشێکی زۆری ئەو عەرەبانەی لە لیوای کەرکوکی کۆنو پارێزگای کەرکوکی ئێستادا دەژین لە ڕێگەی کۆچی خێڵەکیەوە هاتوونەتە ئەم ناوچەیەو لەبەشی باشووری ڕۆژئاوای لیواکەدا گیرساونەتەوە[٩٣].

بەشەکەی تری، واتە بەشی دووەمی عەرەبەکانی ئەم ناوچەیە بریتین لە فەرمانبەری سەربازیو مەدەنیو کرێکارو هەندێکی تر لەکەسانی کاسبکار، کە زۆربەیان بۆ کارکردن هاتوونەتە ئەم لیوایە، بەتایبەتی دوای دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت لە لیواکە. کە بوو بەهۆی ئەوەی ئەم ناوچەیە ببێت بە خاڵی ڕاکێشانی ئەو کەسانەی بەدوای کاردا دەگەڕان، هەر بۆیەش کۆچکردن بۆ ئەم لیوایە بەشێوەیەکی زۆر بەرفراوان بووە. هەر لێرەوە ڕێژەی زیادبوونی دانیشتووانی لەنێوان ساڵانی ١٩٤٧- ١٩٥٧، بەڕادەی ٣٦٪ بووە[٩٤]. د. کمال مەزهەر ئاماژە بەژمارەی ئەوانە دەکات کە لە پارێزگاکانی تر لە دایکبوونو لە کەرکوك دەژین، بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧ ژمارەی دانیشتووانی ناوەندی قەزای کەرکوك تێکڕا (٦٧٧٥٦) کەس بووەو ژمارەی ئەوانەی لە لیوای کەرکوك هاتوونەتە دونیاوە تەنها (٤٩٤٤١) کەس بوون، ئەوانی تر واتا (١٨٣١٥) کەس لە لیواکانی تر هاتوونەتە دونیاوەو دانیشتوی ڕەسەنی شارەکە نین، بەڵام لە شارەکەدا دەژینو نیشتەجێن. ژمارەکان بەم شێوەن: (٣١٣٧) لە دایکبووی لیوای بەغدان، (٣١٦٥) لەدایکبووی لیوای مووسڵن، (١٦٣٩) لەدایکبووی لیوای دیالەن، لەنێویشیاندا لەدایکبووانی ناوچەکانی باشوورو ناوەڕاستیش بەدی دەکران کە زۆرینەیان لەگەڵ خێزانەکانیاندا بۆ کەرکوك هاتبوون لەپێناو کارکردن بەتایبەتی کارکردن لە کۆمپانیای نەوتی عێراق، (١٥٩٨) کەس لە لیوای عەمارەو (٨٦٣) لە دایکبووی لیوای (مونتەفیك)و (٤١٠) لە لیوای حلەو (٣٦٠) لە لیوای بەسرەو (٢٧) لەلیوای کوتو (٢١٣) لە لیوای دیوانیەو (٢٠٥) لیوای دلێم (ئەنبار)و (٩٨٥) لەدایکبووی لیوای کەربەلا بوون[٩٥].

سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧، کە تیایدا باس لە زمانی دایکی دانیشتووان کراوە یا دانیشتووان بەپێی زمانی دایك پۆلێن کراون، بەگشتی ژمارەی عەرەبی زمان لە لیوای کەرکوك (١٠٩٦٢٠) کەس بوون، ژمارەی تورکمانی زمان بە (٨٣٣٧١) کەسو ژمارەی کوردی زمان بە (١٨٧٥٩٣)کەس لەقەڵەم دراون. بەپێی هەمان سەرژمێری ژمارەی ئەوانەی کە لە کەرکوك دەژیانو لەدایکبووی لیواکانی تربوون بەم

شێوەیە بوو: مووسڵ و بیابانی جەزیرە (٥٤٩٤) کەس، بەغدا (٤٨٥٥) کەس، دیالە (٣٧٠٨) کەس، لیوای عەمارە (١٨٤٧) کەس، لیوای ناسریە (٩٩٥) کەس، و لیوای ڕومادی و بیابانی ڕۆژئاوا (٨٦٤)، لیوای بەسرە (٣٥٠)، لیوای کوت (٢٤٣)، لیوای حلە (٣١٣)، لیوای دیوانیەو بیابانی باشوور (٢٢٤)، لیوای کەربەلا (٧٥) کەس و لەدایکبووانی ناوچەکانی تری عەرەبیش (٣٠٠) کەس بوون[٩٦].

وردبونەوەو تێڕامان لەم ڕێژەو ژمارانە ئەوە دەردەخەن، کە بەرزبوونەوەیەکی ناسروشتی لەژمارەو ڕێژەی دانیشتووانی لیوای کەرکوکدا لەو سەردەمەدا بەدی دەکرێت، زیادەکەش ناگەڕێتەوە بۆ زیاد کردنی سروشتی ژمارەی دانیشتووانی، بەڵکو بۆ ئەو لێشاوەی کە لە لیواکانی تری عێراقەوە ڕوویان لە کەرکوک دەکرد، هەر چەندە زیادبوونی ئەم ڕێژەیە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کۆمپانیای نەوتەوە هەبوو، بەڵام هاتنی ئەو هەموو عەرەبە بۆ لیوای کەرکوک لە سییەکان و چلەکانی سەدەی ڕابردوودا مەبەستی شاراوەشی لەپشتەوە بوو، کە هەندێ لە کاربەدەستانی ناسیۆنالیستی عەرەب بەشێنەیی کاریان بۆ دەکرد، ئەویش زۆرکردنی ژمارەی دانیشتووانی عـەرەب بـوو لـەم پـارێـزگا دەوڵـەمـەنـدەو پـەراوێـزکـردنـی دانیشتووانی کورد کە لەلایەن ئەو ناسیۆنالیستانەوە بە هەڕەشە لەسەر یەکێتی دەوڵەتی عێراق دادەنران.

ڕاستییەکی مێژوویی هەیە، کە دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ هەروەك د. نوری تاڵەبانیش دەڵێت: (بەعەرەبکردنی کەرکوك لـەسـەردەمـی پاشایەتیدا بەشێوەیەکی وابـوو، کە کـورد دەرنەدەکرا تا عەرەب لە جێگای دا نیشتەجێ بکرێت بەڵکو عەرەب لە ناوچەکەدا نیشتەجێ دەکران کە ئەمەش دەبووە هۆی گۆڕینی باری دیمۆگرافی دانیشتووانی لیواکە بەڵام کوردەکان بەزۆرە ملێ دەرنەدەکران لە شوێنی خۆیان وەك لە دوای ساڵی ١٩٦٣ دەستی پێکرا)[٩٧].

**٤. سیاسەتی بەعەرەبکردنی شاراوە تاساڵی ١٩٦٣:**

کە باس لە سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکوك دەکەین بەر لە ساڵی ١٩٦٣ پێویستمان بەوە هەیە بگەڕێینەوە بۆ مێـژووی دروستبوونی دەوڵـەتـی عـێـراق لە ساڵی ١٩٢١و بەتایبەتی دوای ساڵی ١٩٢٥ کاتێ باشووری کوردستان بەبڕیاری ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان بەعێراقەوە لکێندرا.

سـەرچـاوەکـان ئـامـاژە بـەوە دەکـەن، کـە سـەرەتـای بەعەرەبکردنی ناوچەی کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکانی سەدەی ڕابردوو[٩٨] لێرەوە دەتوانین مێژووی بەعەرەبکردنی کەرکوك بەر لە ساڵی ١٩٦٣ بەسەر دوو قۆناغدا دابەش بکەین، سیاسەتی بەعەرەبکردنی لـیـوای کـەرکـوك لـەسـەردەمـی پـاشـایـەتـیـداو، سیاسەتی بەعەرەبکردنی لیوای کەرکوك لەسەردەمی کۆماریدا.

سەبارەت بەقۆناغی یەکەمی بەعەرەبکردنی ئەم پارێزگایە ئەوا کۆمپانیای نەوتی عێراق لە دەستپێکی کارکردنییەوە ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕا لەپرۆسەی زیادکردنی ژمارەو ڕۆڵی عـەرەب و خەڵکی تریش لە کـەرکـوك و لەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دیمۆگرافی ئەم شـارەدا[٩٩]. بەرپرسانی ئەم کۆمپانیایە کەوتنە هەوڵدان بۆ هێنانی کرێکارێکی زۆر لە پارێزگاکانی ترەوە بۆ کارکردن لەم کۆمپانیایەو پاشانیش نیشتەجێکردنیان لەشارەکەدا، هەروەك لەدواتردا باسی لێوە دەکەین.

لـێرەوە دەتـوانـین، بـاس لـەڕۆڵـی نـەرێـنـی (سـلـبـی) ئەم کۆمپانیایە بکەین لە گۆڕانکاری دیمۆگرافی و پێکهاتەی دانیـشـتـووانـی شـارەکـەدا دۆزیـنـەوەی نـەوت لـە کـەرکـوك هۆکارێك بوو بۆ لکاندنی ولایەتی موسڵ بە عێراقەوە[١٠٠]. بەرهەمهێنانی چاڵە نەوتییەکان درا بە کۆمپانیایەك کەناوی کۆمپانیای نـەوتـی تـورکـی بـوو Turkish Petrolium Company کە کۆمپانیایەکی بەریتانی بوو، کۆمپانیای ناوبراو دەستیکرد بە لێکۆڵینەوەی جیۆلۆجی و دروستکردنی ڕێگەوبان و خانوو بەرەی پێویست و لەسەرەتاوە (٥٠) پەنجا بەریتانی و (٢٥٠٠) عێراقی کەوتنە کارکردن.

بۆ یەکەمین جار لە (٢٧)ی تشرینی یەکەمی (١٩٢٧)دا نەوت لەچاڵە نەوتەکانی باوە گوڕ گوڕ دەرهێنرا، کە (٧) کیلۆمەتر لەباکووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوەیە[١٠١]. پاشان ناوی کۆمپانیاکە گۆڕا بە کۆمپانیای نەوتی عێراق (Iraq Petrolium Company I.P.C) لەدوا مانگەکانی ساڵی ١٩٣٤دا کۆمپانیاکە دەستی کرد بەناردنە دەرەوەی نـەوتـی خـاو، لـە سـاڵـی ١٩٣٥ هێڵێکی جـووت لوولـەیی لـە کـەرکـوکـەوە کـرایـەوە بـۆ گواستنەوەی نـەوتـی خـاو بـۆ بەندەری حەیفا و بەندەری تەرابلوس لەسەر کەناری دەریای نێوەڕاست[١٠٢].

لەئەنجامی دامـەزرانـدنـی ئـەم کۆمپانیایە گـۆڕانـکـاری بەسـەر پێکهاتەی دانیشتوواندا لـەم پـارێـزگـایـە داهـات، چونکە کۆمپانیای نەوتی عێراقی ژمارەیەکی زۆر کرێکارو فەرمانبەری عەرەبی لە ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراقەوە هێناو لەکۆمپانیای ناوبراودا دایمەزراندن، هەروەها ئاسوری و تورکمان و تەنانەت هندیش لەم کۆمپانیایەدا کاریان دەکرد، لە بەرامبەریشدا ڕێژەیەکی کەمی کورد لەم کۆمپانیایە وەردەگیران کە بەهیچ شێوەیەك ژمارەیان لەگەڵ ڕێـژیـان لـەنـاو شـارو پـارێـزگـاکـەدا نـەدەگـونـجـا[١٠٣] تـاوای لێهات لەدواتردا گەڕەکی سەربەخۆ کرایەوە بۆ بیانییەکان بەنـاوی (عـەرەفـە یـان کـەرکـوکـی نـوێ New Kirkuk)، ئەمە لە سەرەتای پەنجاکان دابوو، کە بەزۆری ئاسووری و ئەرمەنی و تورکمان و عەرەب لێی نیشتەجێ کران، بۆیە کورد هەر لە سەرەتاوە هەستیان بە پەراوێز کردن کرد، چونکە ژمارەیەکی زۆر کەمیان لە کۆمپانیای نەوت وەرگیرابوون و هێنانی ئەو ژمارە زۆرەی کرێکارانی پارێزگاکانی دیکە بۆ شارەکە، هەنگاوی یەکەمی پرۆسەی گۆڕینی دیمۆگرافی و بەعەرەبکردنی ناوچەکە بوو[١٠٤].

سەرچاوەکان ئاماژە بەڕێژەی عەرەب دەدەن لە کەرکوکدا بەر لەدۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت و دوای دەرهێنان و ناردنە دەرەوەی نـەوت. بۆ نـموونـە لـە سـاڵـی (١٩٣٠)دا ڕێـژەی عـەرەب لە کەرکوك بە ٢٠٪ سەرجەم دانیشتووانی لیواکە دەخەمڵێنرا، لە کاتێکدا ئەم ڕێژەیە دوای گەشەکردنی پیشەسازی نـەوت لـە کـەرکـوك و کۆچکردنی هـەزارەها

کرێکاری عەرەب و ئاشوری و ئەرمەنی دەبینن لەسەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ ڕێژەی عەرەب گەیشتە ٢٨٪ی دانیشتووانی لیوای کەرکوك.

هەنگاوێکی تری گرنگی حکومەتی پاشایەتی عێراق بۆ نیشتەجێ کردنی عەرەب لە لیوای کەرکوك، جێ بەجێکردنی پڕۆژەی ئاودێری (حەویجە) بوو.

* **پڕۆژەی حەویجە**(*):

سەرەتای ئەم پڕۆژەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٣٥) و لەسەر پێشنیازی (یاسین ئەلهاشمی) سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتەی عێراق. لە ساڵی ١٩٣٦ دەست کرا بەجێ بەجێکردنی ئەم پڕۆژەیە.

پڕۆژەی ئاودێری حەویجە بریتی بوو لە جۆگەیەکی سەرەکی کە دەبێتە (٣) لقی سەرەکییەوەو درێژی هەریەکەیان نزیکەی (١٣) کم دەبێ، و ڕووبەرێکی زۆری زەوی لە ئاوی زێی بچووکەوە ئاودێری دەکەن(١٠٥).

حکوومەتی ئەو سەردەمە ئەم پڕۆژەیەی بە بازووی زیندانیانی کەرکوك تەواو کرد. هەر بۆیەش ئەم پڕۆژەیە زۆر درێژەی کێشاو لە ساڵی (١٩٣٦)ەوە دەست کرا بەجێ بەجێکردنی و تا ساڵی (١٩٥٢) کاری تێداکرا. ئەم پڕۆژەیە لەژێرناوی (یەکەی وەبەرهێنانی زەوی و زار) دروستکرا(١٠٦).

ئامانجی ئەم پڕۆژە ئاودێرییە بەلێکدانەوەی زۆربەی نووسەران کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد بوو لە ناوچەی کەرکوك و لە بەرامبەریشدا بەرزکردنەوەی ژمارەو ڕێژەی عەرەب بووە(١٠٧). بیانووی حکومەت بۆ نیشتەجێ کردنی بەشێك لە هۆزی عوبێد لە باشووری حەویجە ئەوەبوو کە ئەمانە لە ناوچەکەدا لەکۆچ و کۆچبەریدان و لەلایەکی تریشەوە لە شەڕو پێکدادان لەگەڵ هۆزی (ئەلعەزە) لە لیوای دیالە، بۆیە بۆ دوور خستنەوەیان لەیەکترو کۆتایی هێنان بە ئاژاوەو کێشەکان پێویست بوو نیشتەجێ بکرێن!، کاتێ پڕۆژەی ئاودێری حەویجە تەواو بوو، حکومەتی عەرەبی عیراقی زەوی و زارەکانی ئەو دەڤەرەی بەم شێوەی خوارەوە دابەشکرد:

١. عەشایەری عەرەبی عوبێد (ئەلعوبێد) (١٠٠٠) هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیان بۆ تەرخان کرا لەو زەوییانەی دەکەوتنە لای خوارووی جۆگەی خۆرئاوای پڕۆژەکەوە تا دەگاتە سنووری ئیداری قەزای مەرکەزی کەرکوك(١٠٨). ئەمانەش هەر زوو بەم ڕووبەرەدا بڵاوەیان لێکردوو تا سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ ئەنجام درا، واتە لەماوەی (٢١) ساڵدا (١٢٤) گوندیان تیادا ئاوەدان کردەوە(١٠٩).

٢. عەشایەری عەرەبی جبور ڕووبەری (٩٠٠) کم$^2$ بۆ تەرخان کرا. کەلەزێی بچووکەوە دەست پێدەکات و لە لقی ڕۆژئاوای پڕۆژەکە کۆتایی دێت، ئەمانیش بەپێی ئامارەکانی سەرژمێری ١٩٥٧ ژمارەی گوندەکانیان گەیشتە (٨٥) گوند.

٣. عەشایەری عەرەبی ئەلبوحەمدان ڕووبەری (٢٠٠) کم$^2$ لە خاکی پڕۆژەی حەویجەیان بۆ دیاری کرا، کە دەکەوێتە نێوان زێی بچووك و ڕێی گشتی کەرکوك-حەویجە، ئەمانیش تا سەرژمێرییەکەی ساڵی ١٩٥٧، (١٤) گوندیان بۆ خۆیان ئاوەدان کردەوە.

٤. عەشایەری عەرەبی هەمەجۆرو هەندێك خێزانی پەراگەندەی تکریتی و ئەو خێزانە کوردانەی شوان و شێخ بزێنی، کە هەر لەدێر زەمانەوە لە دەشتی حەویجە جێگیر بوو بوون، ئەمانەش بەهەموویان تەنها (١٠٠) کم$^2$ بۆ نیشتەجێ کردنیان تەرخان کراو بەهەموویان تەنها لە (٥) گونددا نیشتەجێ کران(١١٠).

دەتوانین نیشتەجێ کردنی عەرەب لەم ناوچانە بەیەکەم هەنگاوی بەرنامە بۆ داڕێژراوی بەعەرەبکردنی ناوچەیەکی کوردی دابنێین و مەبەستی حکومەتی عێراقی لەم پڕۆژەیە ئەوەبوو کە ڕێگە نەدات هۆزە کۆچەرە کوردەکان لەحەویجە نیشتەجێ بکرێن و لە بەرامبەریشدا بەو ژمارە زۆرە هۆزانی عەرەب نیشتەجێ بکرێن، ئەمەش نیەتی ڕاستەقینەی حکومەتی دەردەخست کە قرتاندنی خاکی کوردستان بوو.

لە سەردەمی کۆماریشدا هەنگاوی تر بەدوای ئەو سیاسەتەی حکومەتی عێراقدا هاتن. لە ئەنجامی کودەتای (١٤)ی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق، ڕژێمی پاشایەتی لەنێو چوو، لەشکر بە سەرۆکایەتی ژمارەیەك لە ئەفسەرانی سوپای عێراق لەو وڵات دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئەنجومەنی وەزیران، کە زەعیم ڕوکن عەبدولکەریم قاسم سەرۆکی بوو، پۆستی وەزیری (بەرگری)یشی لە ئەستۆبوو. عەقید ڕوکن عەبدولسەلام محەمەد عارف جێگری سەرۆکی وەزیران و وەزیری ناوخۆ بوو حکومەتی قاسم هەموو دەسەڵاتەکانی لەوڵات گرتە دەست چ قانوندانان و چ جێ بەجێ کردنیشەوە(١١١).

هەر چەندە چاوەڕوان دەکرا بەنەمانی پاشایەتی لەعێراقداو جێگیربوونی سیستەمی کۆماری، ڕەوشی عێراق بەرەو باشی بچێت، بەڵام مەینەتیە گەورەکانی عێراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی لێرەوە دەستیان پێکرد. ساڵی ١٩٥٩، واتە دوای یەك ساڵ لە میانەی ئاهەنگەکانی یادی سەرکەوتنی (١٤)ی تەممووزدا کارەساتێك لە کەرکوك ڕوویدا، کە کوردو تورکمان تیایدا زەرەرمەند بوون و ٣٢ کەس ژیانیان لەدەستداو ١٣٠ کەسیش بریندار بوون.

هەر لەم ماوەیەشدا (نازم تەبەقچەلی) سەرۆکی فیرقەی دوو هەوڵی دەدا کارمەندە کوردەکان لە کەرکوك دووربخاتەوەو لەدژی بوونی ئەفسەرە کوردەکان بوو لە فیرقەی دوو، داوای دەکرد بۆ دەرەوەی فیرقەکە بگوازرێنەوە(١١٢). واتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکوك لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (عەبدولکەریم قاسم) یشدا بەشێوەیەك لە شێوەکان بەردەوام بوو، بەڵام بەشێوەیەکی شاراوە. دوای کودەتای بەعس بەسەر عەبدولکەریم قاسمدا دژایەتی کردنی کوردو سیاسەتی بەعەرەبکردن بەشێوەیەکی ئاشکراو بەربڵاو دەست پێدەکات و لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی پڕ لە کارەساتی کوردی کەرکوك دەستپێدەکات.

*** بەشی دووەم: سیاسەتی بە عەرەبکردنی ئاشکرا لە پارێزگای کەرکوکدا:**

**١. چەمکی بە عەرەبکردن لە بیری ناسیۆنالیستانی عەرەبدا:**

بە عەرەبکردن لە ڕووی زمانەوانییەوە بریتییە لە (بەزۆر بە عەرەبکردنی شتێکی ناعەرەب وەك بە عەرەبکردنی بەرێوەبەرایەتی یان خوێندن، یا داموو دەزگاکان..)[١١٣].

یەکێ لە بنەما سەرەکییەکانی بیری ناسیۆنالیستانی عەرەب دەربارەی ئەوەی، کە بە نیشتمانی عەرەب پێناسەی دەکەن و خاك و نیشتمانی چەند گەلێکی تریشی بەزۆر پێوە دەلکێنن بەم شێوەیە (نیشتمانی عەرەب تەنها بۆ عەرەبەو تەنها ئەوانیش مافی بەکارهێنانی سەروەت و سامانی ئەم نیشتمانەیان هەیە)[١١٤].

لە دیدی ناسیۆنالیستانی عەرەبەوە کورد نەتەوەیەکی سەربەخۆی خاوەن خاك و نیشتمان نییە کە مافی سەربەخۆیی و ئازادی خۆی هەیە، بەڵکو وەکو خەڵکێك لە قەڵەم دراوە کە هاتووەتە سەر خاکی عەرەب و لەسەر ئەم خاکە میوانە، بۆیە دەبێ هیچ هەڵس و کەوتێك نەکات زیان بە بەرژەوەندییە باڵاکانی نەتەوەیی عەرەب بگەیەنێ. هەروەها نابێ مافی ئەوەی هەبێ سامانی ئەو خاکە، کە کورد بە خاکی نەتەوەیی و نیشتمانی خۆی دەزانێ و ئەوانیش بە بەشێك لە خاکی عەرەبی دەزانن، بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاربێنێ، واتا کورد لەلایەن ئەو ناسیۆنالیستانەوە وەکو بێگانە لەسەر خاکەکەی خۆی سەیر دەکرێت.

پێناسەی ناسیۆنالیستانی عەرەب بۆ تاکی عەرەب زۆر بەربڵاوە، بەپێی ماددەی دەی پرۆگرامی حیزبی بەعس تاکی عەرەب هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە بە عەرەبی دەدوێن و شارەزای کەلتووری عەرەبن یا خۆیان لەگەڵدا گونجاندووە، لەسەر ئەوەی ئەوان پێی دەڵێن (خاکی عەرەب) دەژین[١١٥].

ئەم پێناسەیەی تاکی عەرەب هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە بە عەرەبی دەدوێن و لەسەر خاکی عەرەب دەژین. بە گوێرەی ئەم پێناسەیە ئەو کوردانەی شارەزای زمانی عەرەبین و لە یەکێ لەو وڵاتانەدا دەژین، کە بە خاکی عەرەب ڕاگەیاندراوە وەکو عێراق و سوریا بە عەرەب دادەنرێن.

میشێل عەفلەق[*] ڕابەری ڕۆحی حیزبی بەعس دەڵێت: (کوردەکان چەند سەدەیەکی دوورو درێژە لەگەڵ عەرەبدا دەژین، بە درێژایی ئەم مێژووە هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا نەبووە. بەڵکو ئەمانە یەك نەتەوەن و پاڵەوانە سیاسی و سەربازییەکانیان لەم مێژووە هاوبەشەدا پاڵەوانی عەرەبیش بوون و هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندانییە)[١١٦]. ئەم بێ جیاوازییە بەمانای یەکسانی نایەت، بەڵکو بەمانای توانەوەی کورد لەچوار چێوەی نەتەوەی عەرەبدا دێت. لە ساڵی (١٩٧٤)یش لە سیمینارێکدا لە شاری کەرکوك عەفلەق هەمان وتە دووبارە دەکاتەوە، کە گوایە بەدرێژایی مێژوو هیچ جیاوازییەك لەنێوان کورد و عەرەبدا نەبووە[١١٧]. لەوتەکانی تریشیدا هەر بە هەمان شێوە هەوڵدەدا کورد بە بەشێك لە عەرەب لە قەڵەم بدات و دەڵێت: (بە درێژایی چەندین سەدە کوردەکان، کە هاونیشتمانی عەرەبی موسڵمانن، هەروەك عەرەبە موسڵمانەکانی ترن و هیچ جیاوازییەك نەبووە لەنێوانیاندا لە سەردەمی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامیدا. لە سەردەمی نوێدا دەوڵەتە داگیرکەرەکان دەستیان بە دۆزینەوەی جیاوازی و جیاکاری لەنێوان عەرەب و کورددا کردووە، لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، زمانەوانی، ڕەگەزی دەربارەی کورد، ئەمەش بەو مەبەستەی کە ببێت بەدەستپێکێك بۆ دابەشبوون لەوڵاتانی ناوچەکەدا، کە ماوەیەکی زۆرە ئەم دەوڵەتە داگیرکەرانە پیلان دەگێڕن بۆ داگیرکارییەکانیان هەروەك لە ناوچەکانی تری نیشتیمانی عەرەبی وەك باکووری ئەفریقیا هەمان هەوڵیان داوە)[١١٨].

مەبەستی عەفلەق لێرەدا ئەوەیە ئەگەر لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتناسان نەبوایە دەربارەی مێژوو و زمان و کولتوری کورد، ئەوا کورد هەر بەشێك دەبوو لە نەتەوەی عەرەب و شتێك بە نێوەی دۆزی کورد پەیدانەدەبوو. واتا ڕابەری ڕۆحی بەعس کورد بە بەشێك لە نەتەوەی عەرەب لە قەڵەم دەدات و خاکەکەشی بە بەشێك لە نیشتمانی عەرەبی و خۆشی بەعەرەبێکی موسڵمان، کە لەسەر خاکی عەرەب دەژین دادەنێت. هەروەك لە وتارێکی تریدا سەبارەت بە کورد و ئەمازیخی (کە عەرەب بەبەربەر ناویان دەبەن)، لە ساڵی (١٩٥٥) دەڵێت: (کوردەکان تاکێکن لە گەلی عەرەب، زیاتر لەوەیان ناوێت کە عەرەبەکان بۆ خۆیان هەوڵی بۆ دەدەن)، لە درێژەی وتەکانیدا ئامۆژگاری کورد و ئەمازیخی دەکات کە بەشێك بن لە نەتەوەی عەرەب، کە لەجوگرافیایەکی فراوان کە جیهانی عەرەبییە بڵاوبوونەتەوە، لە جیاتی ئەوەی کەمینەیەکی بچووك بن تێیدا[١١٩]. کوردەکان لەوەش دڵنیا دەکاتەوە، کە لە فێربوونی زمانەکەی خۆیان هیچ کەسێك ڕێگریان نابێت بەڵام بە مەرجێك ملکەچی قانوونەکانی دەوڵەت بن و بە هیچ شێوەیەك مەترسی لەسەر وڵاتی عەرەبی دروست نەکەن[١٢٠].

لە تێڕامانمان بۆ ئەم وتانەی عەفلەق تێبینی ئەوە دەکەین کورد بە نەتەوەیەکی سەربەخۆ نازانێت و بە تاك ناوی دەبات و عەرەبیش بە نەتەوەیەکی گەورە، کە پێویستە کورد خۆی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیدا بگونجێنێ و خۆی تێدا بتوێنێتەوە، ئەگەر داوای مافی خۆیشی کرد ئەوا لە قانون لایداوە و سەرپێچی کردووەو تەنانەت مەترسیشی لەسەر نەتەوەی عەرەب دروست کردووە، کەواتە کورد هیچ مافێکی نییە، تەنها ئەوە نەبێت، کە بۆی هەیە بە زمانی خۆی بپەیڤێ و لە خزمەتی بەرژەوەندییە باڵاکانی نەتەوەی عەرەبدا بێ.

حیزبی بەعس بۆ جێبەجێ کردنی مەرامە سیاسییەکانی سڵی نەکردووەتەوە لە گرتنە بەری هەر ڕێگەیەك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی. ئەم حیزبە لە بەرامبەر پەرەسەندنی دۆزی کورد لە عێراق ناچار بوو خۆی وا پیشان بدات، کە ئەو بە دیدو بۆچوونەکانی خۆیدا چووەتەوەو گۆڕانی بەسەردا هێناوە.

لە کۆتایی ساڵی (١٩٦٢) حیزبی بەعس، بەتایبەتی دوای ئەوەی ڕووداوەکان بەرەو ئەوە دەچوون، کە ڕژێمی

عەبدولکەریم قاسم سەری تێدا بچێت، جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە گوایە ڕێز لە داواکارییەکانی نەتەوایەتی گەلی کورد دەگرێ، هەروەها بانگەشەی ئەوەشی دەکرد گوایە هەموو کەمینەکان دەبێت مافە نەتەوایەتییەکانی خۆیان بە تەواوەتی پێبدرێ. لە تەك ئەوەشدا داوای لە سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد دەکرد، بۆ یەکخستنی تێکۆشانیان دژ بە ئیمپریالیزم و دیکتاتۆری قاسم و دامەزراندنی فەرمانڕەوایەتییەکی دیموکراتی هاوپەیمانێتیان لەگەڵ بکات.

لە کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتی هەرێمی (القیادة القطریة)ی حیزبی بەعس لە ئاداری ساڵی (١٩٦٢)، ستار ئەلدوری[*] ئەو پرسەی وروژاند، دەبێت پارتەکەیان بانگەشەی ئەوە بکات کە باوەڕی بە مافی نەتەوەیی کوردی هەیە و پاڵپشتی لە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دەکات[١٣١]. هەروەك تالیب شەبیب[**] لە دوای دوورکەوتنەوەی لە دەسەڵات دەڵێت (ئێمە تێگەیشتنمان بۆ کورد وابووە، کە ئەوان ڕوویان لە خاکی عەرەبکردووەو لەسەر ئەم خاکە میوانن، بەڵام ڕاستییەکەی وا نەبوو، چونکە کوردەکان نەتەوەیەکی ڕەسەنن لە عێراقدا ماوەیەکی زۆر بەر لە عوسمانی یا عەرەب لە عێراقدا ژیاون)[١٣٢].

ئەو وتانەی ئەلدوری لە کاتێکدا کراوە، کە بەرژەوەندی بەعس لەگەڵ کورددا بووە تا پشتیوانی کورد بە دەست بهێنێ بۆ هاتنە سەر دەسەڵات. وتەکانی شەبیبیش گەلێ دوای کردەوەکانی بەعس هاتوون.

بەڵام کاتێ بەعس گەیشتە دەسەڵات ڕووی ڕاستەقینەی خۆی بەرامبەر بە کورد پیشان دەدا پێناسەی سەدام حوسێن بۆ نەتەوە بە گوێرەی تێڕوانینی ئەوەی ئەو پێی دەڵێ شۆڕشی تەمموزی ساڵی (١٩٦٨) گەلێ جیاواز بوو لەو وتانەی تالیب شبیب، سەبارەت بە نەتەوەی کورد دەڵێت: (کوردە عێراقییەکان بەشێکی تەواوی نەتەوەی عەرەبن)، بۆ ئەوەی پێناسەی فرەنەتەوەیی عێراقییەکان بتوێنێتەوە لە ناو ناسیۆنالیزمی عەرەبیدا دەڵێ: (عێراقییە نوێکانی (ئەمڕۆ) بریتین لە عەرەبی نوێ)[١٣٣].

سەدام حوسێن لە کۆبوونەوەیەکیدا لەگەڵ (ئەنجوومەنی یاسا دانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا) لە سەردەمی نسکۆی شۆڕشی کورداو هەستی سەدام بە سەرکەوتن دەڵێت: (نابێت کارێك ڕووبدات کاردانەوەی خراپی هەبێت بۆ سەر یەکێتی گەل و خاکەکەمان، پێویستە هێزە دوژمنکارەکان و لە ناویاندا ئەو هێزانەی ئارەزوویان لە جیابوونەوەیەو هەوڵی بۆ دەدەن، و گەلەکەمان لە کوردستان بڕوا بهێنین، کە چارەنووسیان بە یەکجاری بەستراوە بە یەکێتی خاکی عێراق و یەکێتی گەلەکەیەوە)[١٣٤].

لێرەدا سەدام حوسێن چارەنووسی کورد بە خاکی عێراق و یەکێتی عێراقەوە دەبەستێتەوە، بەڵام ئەم گرێدانە لەسەر بنەمای ئارەزوومەندانە نییە بەڵکو لەسەر بنەمای پاشکۆیی و کۆیلایەتیە، ئەوەتا لە وتارێکی تریدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە پێویستە کوردەکان لە خزمەتی خەباتی عەرەبدا بن و لەم بارەیەو دەڵێ: (پێویستە عێراق بکرێتە بنکەیەکی بەهێز لە هەموو بوارێکەوە تاکو خەباتی عەرەب لەپێناو نەتەوەدا پشتی پێببەستێ، ئەمە بەرپرسیارێتی هەموو عێراقییەکە سەرەڕای جیاوازی ئینتیمای نەتەوەییان، بۆ ئەوان باشترە نەتەوەی عەرەب بە هێز بێت و عێراقیش بەشێك بێت لە نیشتمانی عەرەب)[١٣٥].

هەر لەم بارەیەوە میشێل عەفلەق دەڵێت: (بۆچی کوردەکان یان بەشێك لە کوردەکان لە (عروبە) دەترسن؟ ئەم ترسە دەگەڕێتەوە بۆ پڕوپاگەندەی ئیمپریالیزمی نوێ بۆ پەنجا ساڵ لەمەوبەر لە ڕۆژگاری هاتنی ئینگلیزو فەرەنسییەکان بۆ ڕۆژهەڵاتی عەرەبی، کوردەکان سەدان ساڵە لەگەڵ عەرەبەکاندا دەژین و دەجەنگن و پارێزگاری لە خاکی عەرەب دەکەن)[١٣٦] بە بیروبۆچوونی عەفلەق کوردەکان نەك تەنها عەرەبن و لە سەر خاکی عەرەب دەژین بەڵکو پارێزگاریشیان لە خاکی عەرەبکردووە.

ناسیۆنالیستانی عەرەب هەوڵدەدەن لە ڕێگەی شێواندنی مێژووی کوردەوە بیسەلمێنن کوردستان بەشێکە لە خاکی عەرەب هەروەك سەدام حوسێن بە کوردەکان دەڵێ: (مێژووەکەتان دەهێنمەوە یادتان، هەموو سەرکردەکانی عێراق بەوانەشەوە، کە فەڵەستینیان لە سەردەمە کۆنەکاندا ڕزگار کردبوو عێراقی بوون، هەندێکیان لە باکووری عێراق بوون، هەندێکی تریشیان هی ئێرە بوون. بەڵام بۆ قودس چوون، نەچوونە قودس بۆ ڕزگارکردنی فەڵەستین بە تەنیا وەکو نوێنەری کورد و لەبەر ئەوەی کە کوردن و بەس، بەڵکو چوونە قودس تا فەلەستین ڕزگار بکەن بە ناوی کوردی عێراقەوە کە بەشێکن لە گەلێك بە ناوی گەلی عێراق، ئەم گەلەش بە کۆمەڵێك پەیوەندیی و بیرو باوەڕی ئاشکرا بە نیشتمانی عەرەبەوە گرێدراوە)[١٣٧].

زۆر بە ئاشکرا ڕوونی کردووەتەوە کە کوردستان بەشێکە لە عێراق و عێراقیش بەشێکە لە نیشتمانی عەرەب، واتا کوردستان بەشێکە لە نیشتمانی عەرەب و خاکی عێراقیش یەك پارچەیە هەروەك سەدام سەبارەت بە مەسەلەکانی (بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز) دەڵێ: (پێویستە لەسەرمان تێبگەین ئەم وڵاتە هەبووە بۆ ئەوەی هەروەك خۆی بمێنێتەوە عێراق هەتا هەتایە وەك خۆی دەمێنێتەوە بە سنوورە جوگرافیاییەکەیەوە، گۆڕینی دیمەنە سیاسییەکەشی بە خەباتی یەکگرتوویی و ئامانجەکانی یەکگرتنەوە بەندە)[١٣٨]. لێرەدا مەبەستی ڕوون و ئاشکرایەو گەلی کوردە کە دەبێت تێبگات و بڕواش بهێنێت کە خەبات کردنی بۆ سەربەخۆیی سوودی نییە، عێراق هەتا هەتایە بە یەك پارچەیی دەمێنێتەوە، هەروەك لە وتەیەکی تریدا دەڵێت: (دەبێ گەلەکەمان لە کوردستان بڕوا بەوە بهێنێ و هەموو ئاوات و ئامانجێکی لەم چوارچێوەیەدا ببەستێتەوە)[١٣٩].

لە ڕوانگەی بەعسەوە ئەو خەباتەی لە کوردستان لە دژی بەعس دەکرا، خەبات نەبوو بۆ ڕزگاری بەڵکو دژایەتی کردنی شۆڕشی عەرەب بوو، ئەو شۆڕشەی بە وتەی بەعس موژدەهێنەری ئاشتی جیهانی بوو، کە بەعس لە دژی ئیمپریالیزم هەڵیگیرساندبوو، کوردیش بە نوێنەرایەتی

ئیمپریالیزم لە کوردستان لەدژی ئەو شۆڕشە دەجەنگا[١٣٠].

میشێل عەفلەق لە ساڵی (١٩٥٥) لە وتارێکیدا، سەرکردە کوردەکان بە دەرەبەگ ناودەبات و بەوە تۆمەتباریان دەکات کە بەرژەوەندییە دەرەبەگایەتییەکان پاڵیان پێوەدەنێت و لەم بارەیەوە دەڵێت: (کوردەکان چیان گەرەکە؟ هەوڵەکانیان بۆ چییە؟ ئەو ژیانەی بۆ هەمووان فەراهەمە بۆ ئەوانیش بە هەمان شێوەیە، بێجگە لە هەندێك لە سەرکردەکانیان کە لە هەوڵی بەرژەوەندییە دەرەبەگایەتییەکانی خۆیاندان)[١٣١].

میشێل عەفلەق زۆر بە ئاشکراو ڕاشکاوانە هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە بزاڤی نیشتمانی کوردی ڕوون دەکاتەوەو دەڵێت: (چۆن دەبێت بزاڤی نەتەوەیی میللەتێکی بچووك بکەوێتە دژایەتی لەگەڵ کاروانی شۆڕشی عەرەب، هەڵبەتە ئەمە دەستی بێگانەو ئیمپریالیزم لە دواوەیەتی و ئەم بزاڤە هێشتا ئەو ڕاستییە ڕوونەی بۆ دەرنەکەوتووە کە نابێت لەگەڵ شۆڕشی دایك کە شۆڕشی عەرەبییە بکەوێتە دژایەتییەوە)[١٣٢].

تەنانەت لە دوای ساڵی (١٩٧٤) عەفلەق زۆر بە ڕاشکاوانە دەڵێت: (ئەمە شەڕی نێوان عەقلییەتێکی مرۆڤانەی هاوچەرخی کراوەیە، کە عەقلییەتی بەعس و عەقلییەتێکی ڕەگەزپەرستی فیوداڵی پاشکەوتووی نائەخلاقییە، کە هیچ ڕێز لە وەفاو ئازادی و سەربەخۆیی ناگرێت)، هەروەها دەڵێت: (شەڕی کورد بەشێکە لە شەڕی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم لە دژی عەرەب)[١٣٣]. لەگەڵ ئەو هەموو تاوانانەی، کە بەرامبەر بە کورد دەکرا کەچی لە دیدی عەفلەق و حیزبی بەعسەوە عەرەب خاوەن عەقلییەتێکی مرۆڤانەو کراوە بووو کوردیش خاوەن عەقلییەتێکی ڕەگەزپەرست و دەرەبەگانە بوو. هەر لەم بارەیەوە عەفلەق دەڵێت: (کەمینە دەمارگیرە ڕەگەز پەرستەکان هەستدەکەن بوونیان لە مەترسی دایە بەرامبەر بە قەومیەتی عەرەب بۆیە بەرپەرچدانەوەی نەتەوەیی دەمارگیریان هەیە وەك کوردەکان و ئەرمەنەکان....)[١٣٤].

لە ڕوانگەی بەعسەوە کەمە نەتەوەییەکی وەك کورد ئەگەر داوای مافەکانی خۆی بکات ئەوا دەبێ بە مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی عەرەب، بۆیە عەرەب مافی خۆیەتی بە توندو تیژی وەڵامی ئەو کەمینەیە بداتەوە ئیتر ئەو توندو تیژیە سانسۆر خستنە سەرو زیندانی کردنە، یا بە عەرەب و بەبەعس کردنە، یا تەنانەت بە جینۆسایدو پاکتاو کردنی نەژادییە، تێڕوانینی بەعس بۆ کورد ئەوەیە کە (کوردیش وەك هەموو کەمە نەتەوایەتییەکانی تری وڵاتانی عەرەبی، لە قۆناغێکی مێژوویدا لەسەر خاکی عەرەب گیرساونەتەوە، هەر تاقمێك....، لەگەڵ حیزبی بەعس نەبێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، ئەوا لە دیدی بەعسەوە بە دوژمنی خاك و نەتەوەی عەرەب لە قەڵەم دەدرێت. حیزبی بەعس بڕوای بە بەکارهێنانی زەبرو زەنگە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، هەموو ڕێگاو ئامرازێك لە لای حیزبی بەعس بۆ گەیشتن بە ئامانج ڕەوایە)[١٣٥].

بۆیە لەسەر هەموو تاکێکی کورد پێویست بوو ببێ بە ئەندامێکی دڵسۆزی بەعس ئەگینا ئەو حیزبە بۆی هەبوو سانسۆری بخاتە سەر هەروەك سەدام حوسێن دەڵێت: (کورد عێراقییەو ڕۆڵەی ئەم خاکەیەو ڕۆڵەی مێژووی عێراقییەکانە، بۆیە پێویستە ڕۆڵەیەکی دڵسۆز بێت و بەخۆیدا بچێتەوە بۆ ئەوەی ببێ بە ڕۆڵەی چاك لەم نیشتمانەداو دەرفەتی لە بەردەمدا بێت و دەرفەت هەیە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ڕیزەکانی ئێوە)[١٣٦]. مەبەستی ئەوەبوو خۆی ڕادەستی ڕژێم بکاو ئامادە بێ خواستەکانی بەجێ بێنێ و ئەوەی کە نێویان لێنابوو (گەڕانەوە بۆ ڕیزی نیشتمانی). سەبارەت بەم مەسەلەیە سەدام لە وتەیەکی تریدا دەڵێ: ئەوانە (واتە کوردەکان) دەبێت ئینتیمایان بۆ شۆڕش (مەبەستی کودەتای بەعس)ە ڕوون و ئاشکرا بێت، ئەگەر ئینتیمای هەندێکیان بۆ (شۆڕش) بەشێوەیەکی بنەبڕ کراو نەچەسپابێت، دەبێت ئەمە بەعسییەکان بۆ چاوکراوەیی و وریایی بەرامبەریان هانبدات[١٣٧]. مەبەستی ئەوەیە کورد دەبێت بڕوا بە پرنسیپەکانی شۆڕشی عەرەبی و حیزبی بەعس بهێنێت ئەگینا بەعسییەکان هەمیشە دەبێت لە ئامادەباشی دابن و سانسۆریان بخەنە سەر.

لەو کاتەی، کە کورد داوای دەکرد مافی ئۆتۆنۆمی بدرێتێ، ناسیۆنالیستانی عەرەب بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دیدی خۆیان خستووەتەڕوو، هەرچەندە بەر لە هاتنە سەر دەسەڵاتیان لە ساڵی ١٩٦٣ پەیمانی ئۆتۆنۆمیان بە کورد دابوو، تالب شبیب کە لە دوای کودەتای ساڵی (١٩٦٣) وەزیری دەرەوەی عێراق بوو، بەر لە دەستپێکردنەوەی شەڕ لەگەڵ کوردەکان دەڵێ: (پێویست ناکات تەنانەت قسەش لەسەر پێدانی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکان بکرێت، ئەگەر جەنەراڵ مستەفا بارزانی هاوکاری نەکات بۆ کێشەکە، ئێمە کێشەکە زۆر دواناخەین، یاخی بووان بە یەك جار لەناو دەبەین)[١٣٨]، بە هەمان شێوە ناسیۆنالیستی تری عەرەبی کە (سوبحی عەبدولحەمید) وەزیری ناوخۆ بوو لە ساڵی (١٩٦٥)دا دەربارەی ئۆتۆنۆمی وتوویەتی: (عێراق ڕازی نابێت ئۆتۆنۆمی بدات بە کوردەکان نە لە ئێستاو نە لە داهاتووشدا).

(عەبدولعەزیز عوقەیلی)[*]، هەڵگری بیرێکی توندڕەو بووو ناسیۆنالیستێکی پەرگیر بوو. بۆچوونی عوقەیلی لە بارەی دۆزی کوردەوە، ئەوەبوو، کە تەنها لە ڕێگەی شەڕو بەکارهێنانی چەکەوە چارەسەر دەکرێ و نابێ حکومەت ڕێگەی گفتوگۆ لەگەڵ بزاڤی کوردیدا بگرێتە بەر[١٣٩].

ساڵی (١٩٧٠) کە حکومەتی بەعس ڕێکەوتننامەی ١١ ئاداری ڕاگەیاند، ئەم کارەی لە دۆخێکی نائاساییدا کرد. ئەو نەیدەویست لە دوو بەرەدا خەریك بێ، چونکە حیزبەکە لە ناوخۆیدا کێشەی زۆری هەبوو، هەوڵیدا دۆزی کورد بەشێوەیەکی کاتی چارەسەر بکات، تا شوێن پێی خۆی قایم بکات و گروپەکەی سەدام دەست بەسەر حیزبی بەعسدا بگرێت و ئەوەی لە ساڵی (١٩٦٣) ڕوویدا جارێکی تر ڕوونەداتەوە. هەرچەند ڕابەرانی بەعس دان بەم ڕاستییەدا نانێن، کە لە دۆخێکی نائاساییدا ئەم بڕیارەیان دەرکردبێت، هەروەك سەدام حوسێن دەڵێ: (پێویستە تێبگەین کە مەسەلەی نەتەوەیی بە شێوەو داڕشتنی ئۆتۆنۆمی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ، ئەو ئۆتۆنۆمییەی عەقڵی ڕێنیشاندەرو بڕوا

بوو بە گەلەکەی دایناوە نەك بە زەبری دۆخی نائاسایی، کە پیایدا تێپەڕیوە)[١٤٠].

لەو کاتەی کە ئۆتۆنۆمییەکی پڕ لە کەلێن و ناتەواوی بۆ کورد ڕاگەیەندرا، دان بە خاکەکەی دانەنرا، کە کورد وەك کەمینە نەتەوەییەك لەسەر خاکی خۆی بژێت، بەڵکو سەدام حوسێن لە زۆر لە وتەکانی دووپاتی کردووەتەوە، کە خاکی عێراق یەك پارچەیەو ئۆتۆنۆمیش دراوە بە خەڵك نەك بە خاك واتە دراوە بە کورد وەك گروپێك نەك بە خاکێك کە ناوی کوردستانە. هەرچەندە ڕۆژگار دەریخست کە بەعس ئۆتۆنۆمی نە بە خەڵك نەبەخاك نەدا.

ناسیۆنالیستانی عەرەب لە سەرووی هەموشیانەوە بەعس بەم شێوەیە سەیری دۆزی کوردیان کردووە بۆیە ڕاگواستن و بە عەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان لە دیدی ئەوانەوە پاکانەی بۆ دەکرێت، چونکە ئەم مافە لە پرۆگرامی بەعسدا چەسپێنراوە واتە لەگەڵ دروستبوونی پارتەکەدا. لە ماددەی حەوتەمی پرۆگرامی سیاسی بەعس بەپێی تیۆری ناسیۆنالیزم دەڵێ: (سنووری ژووروی عەرەب لە زنجیرە شاخەکانی تۆرۆسەوە دەستپێدەکات و ئەو خاکەی، کە کەوتووەتە خوارووی ئەم زنجیرەیەوە خاکی عەرەبەو (ئێستا) چەند میللەتێك تیایدا دەژین کە کەمایەتین لە نیشتمانی عەرەبداو هیچ دوور نییە کە ئەمانە دووربخرێنەوەو رابگوێزرێن بۆ پشتی ئەم سنوورە ئەگەر هاتوو بوونە سەرچاوەی دروستکردنی کێشە بۆ نەتەوەی عەرەب)[١٤١].

زۆر لە بەڵگەو دەکومێنتەکانی بەعس، کورد بە بێگانە ناو دەبات و پێیان وایە هەر کاتێك ئەمانە واتا کورد بوونە مەترسی لەسەر نەتەوەی عەرەب ئەوا دەبێ بەتووندی ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت. مەترسیش لەسەر عەرەب هاوتایە لەگەڵ داواکردنی مافی نەتەوەیی کوردا. چونکە داواکردنی سادەترین مافی نەتەوەیی لە لای بەعس بە مەترسییەکی گەورە لە قەڵەم دەدرێ و لەو حاڵەتەدا بۆیان هەیە رایان بگوێزن هەروەك لە یەکێ لە ناملیکەکانی حیزبی بەعسدا خراوەتە ڕوو، لەوێدا نووسراوە: (کەمە نەتەوەییە ناعەرەبەکان کە ناتوانرێ لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا بتوێنرێنەوەو بە شێوەیەکی تەواو بە عەرەب بکرێن، دەخرێنە ژێر قانونی تایبەتەوە، کە ئەرك و مافەکانیان بە شێوەیەکی وا دیاری دەکا، کە نەتوانن زیان بە بەرژەوەندییەکانی عەرەب بگەیەنن و هەر بە بێگانەش دادەنرێن. مافی دەوڵەتی عەرەبیشە کە هەرکاتێ بیەوێ ئەوانەی کە زیان بە بەرژەوەندییەکانی دەگەیەنن، دەریان بکاو دروستکردنی قوتابخانەو دامەزراندنی ڕێکخراو و ڕۆژنامە بە زمانەکەیان و بانگەوازی نەتەوایەتیشیان لێ قەدەغە بکات)[١٤٢].

پاراستنی کولتوری نەتەوایەتی یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی ناسنامەی هەر نەتەوەیەك. لەلای ناسیۆنالیستانی عەرەبیش ئەم خاڵە بە خاڵێکی گرنگ دانراوە، ناسیۆنالیستانی عەرەب بەر لە هەموشیان بەعس پێیان وابووە لە بەرایی ئیسلامەوە، هەر نەتەوەیەك بەرگری لە خۆی کردبێ یان پێشوازی گەرمی لە سوپای عەرەبی ئیسلامی نەکردبێ، یاخود شارستانییەت، مێژوو، زمان، کولتورو یادەوەرییەکانی خۆی پاراستبێ، ئەوا ئەو میللەتانە بە (شعوبی) لە قەڵەم دراون، کە لە هزری گشتی عەرەبیدا واتایەکی زۆر ناحەز دەگەیەنێ. ئەو چەمکە ئەوەندە کاریگەر بووە تەنانەت لای ئەو میللەتانەش کە بە شعوبی ناوبراون ئەم چەمکە مایەی دڵگرانی بووە، هەرچەندە دەبوایە پێچەوانەکەی ڕاست بوایە. بەعس لایەنگرانی خۆی لە ڕیزی عەرەبەکان بە ڕقێکی ئەستوور بەرامبەر (شعوبیەت) پەروەردە کردووە. بەشی کوردیش لە چەمکی شعوبیدا لەهزری ناسیۆنالیستی عەرەبیدا کەم نەبووە[١٤٣].

هەموو هەوڵێك لەلایەن ناسیۆنالیستانی عەرەبەوە دراوە بە مەبەستی لەنێوبردنی ناسنامەی نەتەوەیی کوردی کە ئەویش لە قۆناغی یەکەمدا لە لەنێوبردنی زمان و کولتورو ناسنامەی کولتورییەوە دەست پێ دەکات، بەعس لەوە تێگەیشتبوو کە کولتورو کەلەپوری نەتەوەیی کورد یەکێ لە بنەما سەرەکییەکانی هەبوون و مانەوەی کوردە، چونکە ناسنامەی کولتوری سەرچاوەی هێزی نەتەوەکان و هۆی مانەوەیانە[١٤٤]. هەروەك سەدام حوسێن لەم بارەیەوە دەڵێ: (کاتێك باس لە فۆلکلۆری عێراق دەکەین پێویست ناکات باس لە فۆلکلۆری کوردی بکەین)[١٤٥].

کاتێ باسی ڕۆڵی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە عێراقدا دەکەین لە کۆلۆنیالیکردنی کولتوری کوردیدا، دەبێ سەرجەم ئەو بوارانەی کولتور بهێنینەوە بەر چاومان، کە بەعس هەوڵی سڕینەوەو لە ڕەگوڕیشەوە دەرهێنانی و بە عەرەبکردنی داوە، هەر لە بواری پەروەردەو فێرکردنەوە هەتا دابونەریت و هونەر، پرۆژەی بەعس بۆ لەنێوبردنی ڕەسەنایەتی کوردی پرۆژەیەکی داڕێژراوی بە بەرنامە ڕێکخراو بوو[١٤٦].

سەرکردەکانی حیزبی بەعس دیدو بۆچوونی خۆیان لەم بارەیەوە نەشاردووەتەوەو گەلێ جار ڕاشکاوانە ئەو بیرو بۆچوونانەیان خستووەتە ڕوو. یەکێ لە هەوڵە سەرەکییەکانی دەستکاریکردنی مێژووی کۆن و نوێی عێراق بوو. ئەم کارەیان لەژێر پەردەی سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژوودا دەکرد. ساڵی (١٩٧٨) سەدام حوسێن ئامۆژگاری مێژوونووسانی کردووە کە دەبێ میتۆدی بەعس بەکاربێنن بۆ نووسینەوەی مێژوو. سەدام هەر لە ساڵی (١٩٧٥) هانی مێژوونووسان و نووسەران و هونەرمەندان و شاعیرانی دەدا، کە نەك تەنها دانیشتووە کۆنەکانی میسۆپۆتامیا بکەن بە عەرەب، بەڵکو بەرهەمەکانی خۆشیان لەگەڵ بیری بەعسدا بگونجێنن. ئەمە جۆرێکی تری بیروڕای ناسیۆنالیستانەی بەعس بوو بۆ بە عەرەبکردنی کوردستان و کەرکوك بە تایبەت لە پیلان و نەخشە بۆ داڕێژراوەکانی بەعس تواندنەوەی گەلی کورد لە ڕێگەی کولتورەوە ڕێگەی خۆش دەکردو پرۆسەی تواندنەوەی کوردی ئاسان دەکرد بۆ ئەوەی بە یەکجاری لە بۆتەی عەرەبدا بتوێنەوە[١٤٧].

هەر لە ڕێگەی دەستکاری کردن و شێواندنی مێژووەوە حیزبی بەعس هەوڵی دەدا شەرعییەت بە خۆی و عەرەب بدات بۆ ئەوەی دەیانویست لە عێراقدا بیکەن. هەموو ئەمەش لەژێر پەردەی (دووبارە نووسینەوەی مێژوو) دەکرا[١٤٨]. بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە مێژوو بە شێوەیەکی وا بنووسنەوە

بە ئاراستەیەکی وایـدای بـەرن کە لـەگـەڵ ئایدیۆلۆژیاو لێکدانەوەی بەعس بۆ ژیان بگونجێت، سەدام حوسێن دەڵێ: (ئـەوەنـدە لە تایبەتمەندێتی کوردیدا خۆتان نوقم مەکەن (مەبەستی نووسەرە کوردەکانە س. س) بۆ ئەوەی ئەمە واتان لێنەکات ئالآی شەکاوەترو گەورەترتان لە بیر بچێتەوە کە ئالآی عێراق و عێراقییەت و ڕۆڵیان لە بیناکاری شارستانێتی مەزندا بە هەمان گیانی باوو باپیران، کە عێراقیان لە زەمانی کۆندا بونیات ناوەو تەلاری بالآو ڕێنیشاندەری ڕۆڵەکان و ڕۆڵی سەرکردایەتی دەگێڕا بۆ نیشاندانی ڕێگەی شارستانێتی بە مرۆڤایەتی کاتی بابل هێمایەکی بالآ بوو، و ئاشووریش ئالآیەکی بڵندی مرۆڤایەتی بوو)[١٤٩].

بە وردبوونـەوەمـان لـەو وتانەی سـەرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە سـەدام لە هـەوڵی ئـەوەدابوو مێژووی کورد بە مـێـژووی بابل و ئـاشـوورەوە ببەستێتەوە لە کاتێکدا سەرچاوە مێژوورییەکان گەواهی ئەوە دەدەن، کە کورد بۆ خۆی خاوەن مێژوورییەکی تایبەت بووە ئەو گرێدانەی بە عەرەبەوە نەبووە، هیچ نەبێ بەر لە ئیسلام. بە عەرەبکردن تەنها نـاوی گەڕەکەکانی کـەرکوك و دام و دەزگاکانی ئەو شارەو هێنانی عەرەب بۆ ناوچەکەو ڕاگواستنی کوردەکان لە ناوچە کوردییەکانی نەگرتووەتەوە، بەڵکو شێواندنی مێژووش پێیەیەکی گرنگی ئەو سیاسەتە بوو.

ناسیونالیستانی عـەرەب بۆ زیاتر شێواندنی مێژووو کولتوری کـورد خوێندنیان کـرد بە عـەرەبی و خوێندنی کوردییان لە زۆر لە دەڤەرەکانی کوردستان و بەر لە هەمووش لـە کـەرکـوك هـەڵـوەشـانـدەوە. سـاڵانـی (١٩٧٧-١٩٧٨) قۆناغێکی نوێ بوو لە بە عەرەبکردنی پارێزگای کەرکوك لەلایەن حکومەتی بەعسەوە. لەو کاتەدا بەعس بڕیاریدا خوێندنی بابەتەکانی مـێـژوو، جوگرافیاو پـەروەردەی نیشتمانی و ئابووری و کۆمەڵناسی و ئایین لە قۆناغەکانی خوێندندا لە کوردییەوە بکرێ بە عەرەبی. هاوتا لەگەڵ ئەو هەنگاوانەدا گۆڕانکاری لە کتێبەکانی خوێندنیشدا کرا بۆ ئەوەی ئەو پرسانەی لە کاتی خۆیدا حکومەت ناچار ببوو لە پرۆگرامەکانی خوێندندا دانیان پێدا بنێ بە ئاسانی لایان ببات. بەتایبەتی لە بابەتەکانی مێژووو جوگرافیا گۆڕانکاری کـران و ئـەوەی لـەسـەر کـورد دەخـوێـنـرا لابـراوو جێگایان بەمێژووی عەرەب و جوگرافیای عێراق و (نیشتمانی عەرەبی) پڕ کرایەوە، ئەو بەشانەی کە پێشتر بە ناوی جوگرافیای کوردستان یان هەرێمی چیاکان (کوردستان) وە بوو ئەم جارەیان کرا بە جوگرافیای باکووری عێراق. لەسەر بنەمای ئەو تێڕوانینە ناسیۆنالیستانەی عەرەب کە تاکو ئێستاش کوردستانی لکێندراو بە عێراقەوە بە باکووری عێراق ناو دەبات هەر چەندە ئەم ناوە تەنانەت لەدیدی جوگرافیشەوە دروست نییە.

لـە لایـەکـی تـرەوە پـرۆگـرامـی پـەروەردەی نیشتمانی کە پێشتر پـرۆگـرامێك بـوو بـۆ ڕاهـێـنـانـی قوتابی لەسەر خۆشەویستی نیشتمان و نەتەوەکەی گۆڕا بۆ پرۆگرامێك کە پـەروەردە کردنی منداڵی کورد بە فیکرو تێڕوانینی بەعس واتـە ناسیۆنالیزمی عەرەبی پـەروەردە بکات کە ئـەوەش پڕۆژەیەکی جیدی بەعس بوو بۆ تێکدانی هەست و هۆش و عەقڵی منداڵی کوردو دوورخستنەوەی لە بنەڕەتی خۆی، ئەمەش بۆ کورد بە ترسناکترین شێوازی کۆلۆنیالیکردن لە قەڵەم دەدرێ[١٥٠].

سـەدام حوسێن بە مەبەستی دوورخستنەوەی نـەوەی داهاتووو وشیار نەبوونی ئەم نەوەیە سەبارەت بە دۆزی کـورد دەڵـێ: (لـە پـەروەردەی نیشتمانیدا کاتێك باس لە ئۆتۆنۆمی دەکـەن و ڕووبـەڕوووی ئەم چەمکە دەبنەوە لە قسە کردن لەسەری زۆر وورد مەبنەوەو زێدەڕۆیی مەکەن)[١٥١]. مەبەستی ئەوەیە لە پەروەردەی نیشتمانیدا پێویستە تەنها باسی حیزبی بەعس بکرێت کە مافی کوردی داوە بۆ نموونە ئۆتۆنۆمی پێبەخشیووە بەبێ باس کردن لە چۆنێتی ئـەو ئۆتۆنۆمییە، کە ئـەم حیزبە دەیویست بەسەر بزاڤی کوردیشدا بسەپێنێ و لە هەموو ماناو جەوهەرێك دوور بوو.

گۆڕینی مێژووو جوگرافیای کوردستان تەنها کتێب و نووسینەکانی نەگرتەوە، بەڵکو لەسەر ئـەرزی واقیعیش گـۆڕانـکـاری گـەورە ئـەنجـامـدران کـە یـەکـێ لـە تـەوەرە سەرەکییەکانی گۆڕینی پێکهاتەی نـەتـەوەی کـەرکـوك و ناوچەکانی تری کوردستان بوو. حکومەتی بەعس دەستی کرد بە ڕاگواستنی بەربڵاوی دانیشتووانی کوردو هێنانی دەیـان هـەزار عـەرەب بۆ کەرکوك و ناوچە کوردییەکانی تر کە بـەر شـاڵاوی بە عەرەبکردن کەوتن. لە شوێنی کوردە دەرکـراوەکـان ئـەو عەرەبانە نیشتەجێ دەکـران، هـەروەك عەلی حەسەن ئەلمەجید لە کاسێتێکی تۆمارکراودا دەڵێت: (دەمەوێت باس لە دوو خاڵ بکەم، یەکەمیان بە عەرەبکردن، دووەمـیـان، ناوچە هاوبەشەکانی نێوان خاکی عـەرەب و ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی، ئەو بابەتەی کە باسی لێوە دەکەم باسی کەرکوکە، لەو کاتەی کە من هاتم بۆ ئێرە (مەبەستی کاتێ هاتووەتە کەرکوك)، ژمارەی عەرەب و تورکمان لە ٥١٪ زیاتر نەبوو. لەگەڵ ئەو هەموو کارانەی کردمان و خەرج کردنی زیاتر لە ٦٠ ملیۆن دینار ئەوجا ژمارەکە گەیشتە ئەم بارودۆخەی ئێستا. دوای هێنانی ئەو هەموو هاوولاتییە عەرەبە ئەوجا ڕێژەی عەرەبمان گەیاندە ٦٠٪)[١٥٢].

تاریق عەزیز[*] لە ووتەیەکیدا لەگەڵ ئەندامانی شاندی کورد بۆ وتووێژ لە ساڵی ١٩٩١ وتبووی، کورد مافی ئەوەی هەیە کە کاتی بە کەرکوکدا تێدەپەڕێ بگیرێت وەکو چۆن عـەرەب بۆ ئـەنـدەلـوس دەگـریـن[١٥٣]. ئـەم دوو پرسە زۆر لێك دوورن و بە هیچ شێوەیەك یەك ناگرنەوە لە کاتێکدا عـەرەبـە موسڵمانەکان ئەندەلوسیان لـە وڵاتـی ئیسپانیا داگیرکردو ئەوانیش دوای چەندین سـەدە ئـازادیـان کرد، هەر چی کەرکوکە بە درێژایی مێژووی زانراو بەشێك بووە لـە جوگرافیای کـوردسـتـان و کـورد لەگەلێکی تـری داگیر نەکردووە.

لـە پوختەی بیروبۆچوونـی ناسیۆنالیستانی عـەرەب بەرامبەر بە کوردو پرسی بە عەرەبکردنی کوردو کەمینەکانی دی لە دیدی ئەواندا کارێکی ئاساییە چونکە کورد خاکی نییەو ئـەو خاکەی لـەسـەری دەژێـت نیشتمانی عـەرەبـە، ئەگەر داوای مافیش بکات لە یاسا لایـداوەو تاوانبارە،

تەنانەت هەندێك جار كورد لە نەتەوەی خۆی داشۆراوەو بە عەرەب لەقەڵەم دراوە، بەتایبەتی كوردەكانی كەركوك بە نامۆ دانراون لەسەر خاكی خۆیان هەروەك د. جەبار قادر لە كتێبەكەیدا (قضايا كردية معاصرة) باس لە یادەوەرییەكی خۆی دەكات كە گەواهیدەری ئەم وتانەن دەڵێ: (لە یادمە ڕۆژێك كرێكارێكی میسری كە بۆ كار كردن هاتبووە ئەم شارە لەگەڵ كوردێكی نا و شاری كەركوك لێی بوو بە شەڕ كوردەكە بە میسرییەكەی وت ئەگەر كەسێكی (غەریب) نەبوویتایە لەم شارە خۆم دەمزانی چیم پێ دەكردی، میسرییەكە سەرەڕای غەریبی خۆی لەم شارەدا بە كوردەكە دەڵێت: (من غەریبم یان تۆ، ئەم زەویە خاكی عەرەبەو تۆ غەریبیت لەسەر ئەم خاكە)[154]. كەواتە كوردی كەركوك لەسەر خاكی خۆی نامۆیە، ئەمەیە بیری ناسیۆنالیستانی عەرەب بەرامبەر بە دۆزی كوردو بە عەرەبكردنی خاكەكەی.

خەیاڵ هەندێ لە ناسیۆنالیستانی عەرەبی بە ئاستێكدا بردووە، كە بە عەرەبكردنی كورد لە قازانجی ئەمان دایە. چونكە ئەو دەمە لە كەمینەیەكی پەراوێزكراوەوە دەبنە بەشێك لە نەتەوەیەكی گەورەو خاوەن پێگەی گرنگ. گەلێ لە وتەكانی ڕابەرانی بیری ناسیۆنالیزمی عەرەبی بەتایبەتی سەركردەكانی بەعس وەكو میشێل عەفلەق و سەدام حوسێن و ئەوانی دی تەنها ئەم لێكدانەوەیە هەڵدەگرن. ئەمان پیاوەتی بەسەر كوردا دەكەن كاتێ هەوڵدەدەن بیكەن بەعەرەب و (شەرەفی) ئەوەی پێدەدەن، كە بەعەرەب لەقەڵەمی بدەن، بەبۆچوونی ئەوان نابێ كورد لەم ڕەوتەی ڕووداوەكان لاری بێت، بەڵكو دەبێت سەربەرزو كامەران بێت.

**٢. هەوڵە سەرەتاییەكانی حیزبی بەعس بۆ بە عەرەبكردنی كەركوك لە ساڵی ١٩٦٣:-**

ساڵی ١٩٦٣ بە دەستپێكی قۆناغێكی نوێی بە عەرەبكردنی پارێزگای كەركوك لە قەڵەم دەدرێت. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی نۆ مانگەی حیزبی بەعسدا كوردستانی عێراق بە گشتی و كەركوك بەتایبەتی ڕووبەڕووی پلان و كردەوەی توندی بەعس بوونەوەكە لە كەركوكدا خۆی لە پەیڕەوكردنی سیاسەتی بە عەرەبكردندا بەرجەستە دەكرد. ئەم قۆناغە لەگەڵ دەسەڵات گرتنە دەستی حیزبی بەعس لە (٨)ی شوباتی ١٩٦٣ لە ڕێی كودەتایەكی سەربازییەوە دەست پێدەكات. دیارترین سەركردەكانی ئەم دەسەڵاتە ئەمانە بوون: عەبدولسەلام عارف[155]، ئەحمەد حەسەن ئەلبەكر، عەلی ساڵح سەعدی[156]، حازم جواد، تاڵیب شەبیب، موحسین ئەلشێخ ڕازی، فەیسەڵ حەبیب ئەلخەیزەران[157]. حكومەتی عەبدولكەریم قاسم هەرەسی پێ هێنراو بەعس بۆ ماوەی ٩ مانگ و دە ڕۆژ جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست.

عەبدولسەلام عارف كرا بە سەرۆكی كۆماری عێراق، بەر لە ڕوودانی كودەتاكە بەعسییەكان پەیوەندیان بە سەركردایەتی بزاڤی كوردەوە كردبوو هەروەك فوئاد عارف[158] لە یادەوەرییەكانیدا دەڵێت: "عەلی ساڵح ئەلسەعدی داوای چاوپێكەوتنی لەگەڵ دا كردم، لە چاوپێكەوتنەكەمان باسی دۆزی كوردو ڕێگاكانی چارەسەركردنی ئەم دۆزەی كرد ئەگەر كودەتاكە سەربكەوێت. پێموت هەر چەندە من كوردم و زۆر بە پەرۆشم بۆ چارەسەركردنی دۆزی كوردی، بەڵام من وا بە باشتر دەزانم پەیوەندی لەگەڵ بزووتنەوەی كوردیدا بكەیت بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ، پێشنیارم كرد، كە پەیوەندی بە ساڵح یوسفییەوە بكات، كە لەو كاتەدا بە نهێنی لە بەغدا دەژیا. لە ڕێگەی شەوكەت ئاكرەییەوە پەیوەندی لەگەڵ ساڵح یوسفی كردو ڕێككەوتن لەسەر ڕێگاكانی چارەسەركردنی دۆزی كوردی لەحاڵەتی سەركەوتنی كودەتاكە، بەڵام ڕێككەوتنەكەیان بە زارەكی بوو نەك بە نووسراو"[159].

لە شوباتی ساڵی (١٩٦٢)شدا عەقید تاهیر یەحیا[160]. پەیوەندی بە (ئیبراهیم ئەحمەد)ەوە دەكات كە سكرتێری ئەو كاتەی پارتی دیموكراتی بوو پرسیاری ئەوەی لێ دەكات (بە چ مەرجێك شۆڕشی كورد پشتگیری لە كودەتایەكی دژ بە قاسم دەكات)، برایم ئەحمەد لە وەڵامدا دەڵێت بە (پاداشتی ئۆتۆنۆمی بۆ كوردستانی عێراق). هەر بۆیەش كوردەكان یەكسەر دوای كودەتاكە پشتگیری خۆیان بۆی دەربڕی و یەكلایەنانە ئاگر بەستیان ڕاگەیاند[161]. لە دوای كودەتاكە ڕووداوەكان وایان پیشاندا ئەو پەیمانەی عەلی ساڵح وەكو نوێنەری بەعس كە بە ساڵح یوسفی و شەوكەت ئاكرەیی دابوو بێ واتا و دوور لە ڕاستی بوو. ئەو نەك هەر پەیمانی ئۆتۆنۆمی دابوو بەڵكو بە ساڵح یوسفی ڕاگەیاندبوو كە ئێوە نەك هەر مافی خۆتانە ئۆتۆنۆمی وەربگرن، بەڵكو لەوەش زیاتر ئێوە مافی چارەی خۆنووسینتان هەیە[162].

یەكەم پەیوەندی فەرمی نێوان بزووتنەوەی كوردو حكوومەتی عێراق لە دوای كودەتاكە لە (٥)ی مارتی ١٩٦٣ بوو. ئەو دەمە شاندێكی فەرمی حكومی، كە پێكهاتبوو لە فوئاد عارف، تاهیر یەحیا، عەلی حەیدەر سلێمان بۆ لای بارزانی چوون بە مەبەستی وتووێژكردن[163]. بارزانی لە كاتی گفتۆگۆكاندا پڕۆژەی ئۆتۆنۆمی دا بە سەرۆكی شاندەكە. داواكارییەكانی سەركردایەتی شۆڕش بریتی بوون لە چەند خاڵێك لەوانە: داننان بە مافی ئۆتۆنۆمیدا بۆ كوردستان بە زووترین كات، دەستنیشانكردنی سنووری ئەو جوگرافیایەی ئەم قانونە دەیگرێتەوە كە لە دیدی شۆڕشەوە بەم شێوەیە بوو: لە باكوورەوە توركیا، لە ڕۆژهەڵاتەوە ئێران، لە ڕۆژئاوایەوە سوریا، لە باشوورەوە چیای حەمرین. لەتەك ئەمانەدا چەند داواكارییەكی تریش لەسەر زمانی كوردی لە پڕۆژەكەدا هەبوون[164].

وردبوونەوە لە داواكارییەكانی سەركردایەتی شۆڕشی كورد ئەوە دەخاتە ڕوو كە خاڵی هەرە گرنگ بە لای ڕابەرانی كوردەوە مافی ئۆتۆنۆمی بووە لەو سنوورە جوگرافیەدا كە كورد هەمیشە باسی لێوە كردووە واتا تا زنجیرە چیای حەمرین. كە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە ئەو ناوچە ئۆتۆنۆمییە گەرمیانی لە خۆ گرتووە. بەڵام وەڵامی (ئەنجوومەنی سەركردایەتی شۆڕش) واتا دەسەڵاتی كودەتاچییەكانی ١٩٦٣ لە یانزەی هەمان مانگدا هیچ یەك لە داواكارییەكانی شۆڕشی دەستەبەر نەكردبوو بەڵكو جەختی لەسەر یەكێتی خاكی عێراق دەكردەوە. لە بەیاننامەكەدا

هاتبوو، کە ئەنجوومەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕش مافی نەتەوەی کورد دەدات لەسەر بنەمای لامەرکەزیو ئەم بنەمایەش لە دەستووری کاتیو هەمیشەییدا جێگیر دەکرێ، ئەویش لە کاتی دانانی دەستووردا، هەروەها لیژنەیەکی پسپۆڕ لەم بوارە بۆ دانانی بنەماکانی لامەرکەزی پێکدەهێنرێت.

دوای چەند خولێکی تری وتووێژ لەنێوان هەردوولادا هەندێك خاڵ لێك نزیکبوونەوە بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد هاتنە کایەوە، بەڵام کاتێ گفتوگۆکان هاتنە سەر سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی جارێکی تر لەسەر کەرکوك ناکۆکی پەیدا بوو، چونکە بەعس بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوو لەسەر ئەوەی کە ناوچەکانی کەرکوكو خانەقینو زمار لە چوارچێوەی ناوچەکانی ئۆتۆنۆمیدا بن. لە بەرامبەریشدا سەرکردایەتی کورد سوور بوو لەسەر کوردستانێتی کەرکوكو گرێدانی بە جوگرافیای کوردستانەوە لە سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا. هەر بەم هۆیەشەوە گفتوگۆکان نەگەیشتنە هیچ ئاکامێك[١٦٥].

دوای ئەوەی نەتوانرا دۆزی کورد لە ڕێگەی گفتوگۆوە چارەسەر بکرێت. حکومەت لیژنەیەکی وزاری پێکهێناو بەرپرسیارێتی دانانو سەرپەرشتی کردنی پرۆژەی (قانونی پارێزگاکانی) لە عێراق پێسپارد لیژنەکە لە پێنج وەزیرو پێنج کەسایەتی سیاسی پێکهاتبوو، کە ئەمانە بوون:-

- فەریق ڕوکن ساڵح مەهدی عەمماش، وەزیری بەرگری.
- زەعیم ڕوکن ناجی تالب، وەزیری پیشەسازی.
- زەعیم ڕوکن مەحموود شیت خەتاب، وەزیری شارەوانی.
- حازم جەواد، وەزیری ناوخۆ بە وەکالەت.
- مەهد ئەلدولعی، وەزیری داد.
- شێخ محەمەد ڕەزا ئەلشبیبی، سەرۆکی حیزبی بەرەی گەلی هەڵوەشاوە (حزب الجبهة الشعبية).
- پارێزەر فائق ئەلسامەڕائی، جێگری سەرۆکی حیزبی سەربەخۆی هەڵوەشاوە (حزب الاستقلال).
- پارێزەر حوسێن جەمیل، سکرتێری حیزبی نیشتمانی دیموکراتی هەڵوەشاوە (الحزب الوطني الديمقراطي).
- د. عەبدولعەزیز ئەلدوری، سەرۆکی زانکۆی بەغدا.
- عەلی حەیدەر سلێمان، باڵوێزی عێراق لە واشنتن.

ئەم لیژنەیە پرۆژەیەکی لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣)دا پێشکەش ئەنجوومەنی وەزیران کرد، کە پەسندی کرد بەپێی سیستەمی لامەرکەزیو لەژێر ناوی (قانونی پارێزگاکان) بڵاوکرایەوە، مەبەست لەم قانونە دابەشکردنی عێراق بوو بەشێوەیەکی ئیداری بۆ سەر (٦) پارێزگا یا هەرێم کە هەریەکەیان لەبەڕێوەبردنی کارەکانیاندا لەژێر سەرپەرشتی حکومەتدا هەندێ سەربەخۆ بن. بەپێی ئەم یاسایە عێراق بۆ سەر شەش پارێزگا دابەش کرا کە بریتی بوون لە:

١. پارێزگای سلێمانی، کە دەبوایە لە لیواکانی سلێمانیو هەولێرو دهۆك پێکبێ.

٢. پارێزگای موسڵ کە لیوای موسڵی دەگرتەوە.

٣. پارێزگای کەرکوك کە لیوای کەرکوکی دەگرتەوە بەبێ چەمچەماڵ.

٤. پارێزگای بەغدا کە دەبووایە لیواکانی بەغداو ڕومادیو دیالەو کوت بگرێتە خۆ.

٥. پارێزگای حیلە کە لیواکانی حیلەو دیوانیەو کەربەلای دەگرتە خۆ.

٦. پارێزگای بەسرەش لیواکانی بەسرە، ناسریەو عیمارەی لە خۆدەگرت[١٦٦].

واتە بەشێوەیەکی یاسایی کەرکوكو خانەقینو شێخانو سنجار لە کوردستان دابڕێندران. بەشێوەیەکی فەرمیش چەمچەماڵ لە کەرکوك جیاکرایەوەو خرایە سەر پارێزگای سلێمانی. هۆیەکی سەرەکی ئەوەش ئەوە بوو، کە دانیشتووانی چەمچەماڵ هەموو کوردن ئەمەش کاری دەکردە سەر ڕێژەی کورد لە پارێزگای کەرکوکدا. بۆیە خرایە سەر سلێمانی، کە حکومەت ئامادە بوو لە چوارچێوەی لامەرکەزی یا ئۆتۆنۆمیدا دان بە جۆرێك لە بەڕێوەبەرایەتی کوردیدا لەو ناوچانەدا بنێت. پاساوی لیژنەکە بۆ ئەم کارە ئەوەبوو گوایە ئەمان هەوڵدەدەن ناوچە کوردییە پەرشو بڵاوەکان لە چوارچێوەی یەك بەڕێوەبەرایەتیدا کۆ بکەنەوە. بە بۆچوونی ئەوان چەمچەماڵ ناوچەیەکی کوردنشینەو سەر بە پارێزگایەکە بە کوردی دانانرێت (واتا کەرکوك)، بۆیە دەیخەنە سەر پارێزگایەکی کوردنشین تا لە سنووری جوگرافیای ئەم یاسایانەدا بێت. بە هۆی دەرچوونی ئەم یاسایەوە کێشەکان قوڵتر بوونەوە، ئیتر بە هەزاران کەس لە دانیشتووانی کەرکوك، کە بێگومان زۆربەیان کورد بوونو کەمێکیش تورکمان لە زیندانەکانی کەرکوكو گەلێ شوێنی تری ناو شار توووند کرانو تاکە مەرجی بەربوونی زۆربەیان ئەوەبوو کە ئەو شارە بەجێبهێڵن[١٦٧]. لە ئەنجامدا بارودۆخ بەرەو گرژی زیاتر دەچوو بەعس پەیوەندی بە هۆزە عەرەبو کوردەکانەوە دەکردو چەکداری کردن، کوردەکان بە ناوی سوارەی سەڵاحەددینو عەرەبەکانیش بە ناوی سوارەی خالیدی کوڕی وەلید، ئەمانە لە کاتی شەڕدا لە دژی بزووتنەوەی چەکداری کورد بە کار دەهێنران. لە (١٠)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣)دا هێزەکانی حکومەت هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر کوردستانو پێشمەرگە[١٦٨].

هەرچەندە ماوەی دەسەڵاتی بەعس کورت بوو. بەڵام ئەوەی لە دەستی هات کردی. هەر لە دەستپێکی فەرمانڕەواییەکەیەوە سەلماندی کە سیاسەتێکی داڕێژراوی بۆ بە عەرەبکردنی کوردستان بە گشتیو کەرکوك بەتایبەتی هەیە. خاڵە سەرەکییەکانی ئەم سیاسەتە زیندانی کردنی هەزاران کوردو لە سێدارەدانی گەلێ کەسایەتی ڕۆشنبیرو سیاسەتمەداری چالاکی کورد بوو بەتایبەتی لە شاری کەرکوكو وێرانکردنی چەندین گوندی کوردی دەوروبەری کەرکوكو ڕاگوێزانی بە زۆری دانیشتووانی و هێنانی عەرەب بۆ سەر زێدو زەوییەکانیان.

توووندو تیژی سوپای عێراق لە کوردستانو هەموو عێراقدا ڕوو لە زیاد کردن بوو لەم سەردەمەدا[١٦٩]. دانیشتووانی گوندو شارەکان وەك هێزی پێشمەرگە لەلایەن حکومەتی

عێراقەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا. ڕەشبگیری و لە نێو بردنی خەڵك بوو بە دیاردە، بەتایبەتی دوای دەستپێکردنەوەی شەڕ زەعیم سدیق مستەفا لە سلێمانی لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکدا زیاتر لە ٥٠٠ هاووڵاتی گوللە باران کرد، تەنها لە شەوی (٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣)دا ٣٦ کەس لە حامییەکەی سلێمانی بەیەکەوە گوللە باران کران(١٧٠).

تەها شەکرچیش لە کۆیە دەیان کەسی گوللە باران کردو ٦ هاووڵاتی بە کۆڵەکەی دوکانەکانی ناو بازاڕی ئەو شارۆچکەوە بەستەوەو لەبەر چاوی خەڵك گوللە بارانیانی کردن. لە ڕەواندوزیش بە هەمان شێوە بە کۆمەڵ هاووڵاتی گوللەباران کران، هێزی ئاسمانی عێراق بە بۆمبای ناپاڵم گوندو شارەکانی کوردستانیان بۆمباران دەکرد، گوند سووتاندن و ماڵ و کێڵگە تاڵانکردن ڕووداوی ڕۆژانەی سەردەمی بەعس بوون، عێراق بە هاوکاری سوپای سوریا و هێزی میلیشیایی کە بە گاردی نەتەوەیی (حرس قومی) ناونرابوو، پەلاماری کوردستانیاندا پێش سووتاندنی گوندەکان، ئەو عەشایەرە عەرەبانە دەستیان بە تاڵانکردن دەکرد(١٧١). تەنانەت عەبدولسەلام عارف لە کاتی شەڕەکەدا داوای لە (ئایەتوڵڵا موحسین ئەلحەکیم) کرد کە مەرجەعی مەزهەبی شیعە بوو لە عێراق کە فەتوایەك دەربکات و تیایدا کوشتنی کورد حەڵاڵ بکات، بەڵام ناوبراو فەتوای کوشتنی کوردی دەرنەکرد(١٧٢). ئەمانەو چەندین کردەوەی تری دژ بە کورد پەیڕەو کران.

لەم کردەوانە بەشی شێر بەر شاری کەرکوك دەکەوت. یەکەمین کار کە گاردی نەتەوەیی، بە هاوکاری لەگەڵ دەزگا ئەمنییەکانی شاردا کردیان، ئەوە بوو (گەڕەکی کۆماری)، کە کوردە هەژارەکانی تێدا دادەنیشتن، سەرلەبەری بە بلدۆزەرەکانی شارەوانی و سوپا خاپوور کردو دانیشتووانەکانیان سواری زیل کردو ڕاگوێزران و ڕێگەیان پێ نەدرا لە گەڕەکەکانی تری شاردا بگیرسێنەوە، زۆربەیان گەڕێندرانەوە بۆ ئەو گوندانەی کە لێیەوە هاتبوون(١٧٣). هەر لەو ساڵەدا بە گوێرەی هەندێ سەرچاوە نزیکەی هەشت هەزار خێزانی کورد لە کەرکوك دەرکران(١٧٤).

ڕووخاندنی گوندە کوردییەکانی دەوروبەری شاری کەرکوك بەتایبەتی ئەوانەی، کە لە چاڵگە نەوتەکانەوە نزیك بوون و ژمارەیان سێزدە گوند بوو کە ئەمانەن (سۆنە گۆلی، یاروەلی، پەنجا عەلی، وەلی پاشایی، قزلقایە، چیمەنی گەورە، چیمەنی گچکە، جەوەڵ بۆر، هەنجیرە، قوتان، قوشقایە، شۆراو، باجوان) یەکێ لە کردارە توندڕەوەکانی بەعس بوو. دواتریش کۆچ پێکردنی دانیشتووانی گوندەکانی سەر بە ناحیەی دووبز بوو، کە دواتر کرایە قەزاو نێوی (دبس)ی بەسەردا برا.

هەر لەگەڵ ئەم کردارانەداو بە مەبەستی بە عەرەبکردنی ناوچەکە هەندێ خێڵی عەرەب هێنران بە سەرۆکایەتی کەسێك بە ناوی هەواس کەنعان ئەلسەدید (هواس كنعان الصدید) بۆ ئەوەی لەو گوندانە نیشتەجێبکرێن. ڕاگوێزانی کوردو بە عەرەبکردن ئەم گوندانەی گرتەوە: (قەرەدەرە، عەمشە، مەڕعی، مەلا عەربەت، کتکە، قوتانی خەلیفە، قوتانی کوردەکان، سێکانیان، گورگە چاڵ، شێخان، نادراوە، دڕکەی کوردان، قەرە هەیبەت، عەلەغێر، مامە، شیرنا و، تەقتەق، کونە ڕێوی، چەخماخەو مەلحە)(١٧٥). تەنانەت هەندێك لەم گوندانە لەسەر دەستی (گاردی نەتەوەیی) سوتێنران کە ئەوانیش (قەرەدەرە، چەخماخە، مەڕعی، عەمشەو، قوتان) بوون.

هەر لە هەمان ساڵدا ڕژێمی ئەو سەردەمەی عێراق بە مەبەستی بە تاڵانبردنی سەرو ماڵی کوردانی ئەو ناوچەیە لە ڕێی هاندانی چەند عەشیرەتێکی خێڵەکی عەرەبەوە (بدو) ەوە لەوانە (عەشیرەتی رکابی، شەممەر، و عەشیرەتەکانی حەویجە) کەوتنە وێزەی دانیشتووانی ناوچەکەو ئەوەی بەردەستیان کەوتبایە بە تاڵان دەیان برد ڕێگریش لەو کارانە سزای گوللە باران کردن بوو. چەندین کەس لەو ڕووبەڕووو بوونەوانەدا کوژران(١٧٦). پاشانیش هەروا کاری ڕاگواستنی زۆرەملێ و بە عەرەبکردن چارەنووسی ئەم گوندانە بوو (جاستانە، دەربەند، سەر بە شاخ، پەڵکانە، عەوڵاخان، سارەلوو، شناغە، دڕکەی گەورە، دڕکەی بچووکە، چەوت (کیسمە)، تەل هەڵاڵە، گەزۆشان و گەڕاو)(١٧٧). دانیشتووانی ئەم گوندانەش بەر شاڵاوی ڕاگواستن و بە عەرەبکردن کەوتن.

هەنگاوی تری بەعسییەکان ئەوە بوو، کە بزاڤی کوردایەتی لە کەرکوك بێ سەرکردایەتی بکەن بۆ ئەم مەبەستە لە (٢٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣) (٢٨) کەسایەتی دیاری ئەم شارە لە سێدارەدران، کە هەموویان کورد بوون(١٧٨):- (مارف بەرزنجی، حوسێن بەرزنجی، جەبار ناسراو بە (جەباری پیرۆز خان)، نوری سەید وەلی، ئیحسان حوسێن سالحی، نوری عەبدوڵڵا، فەتاح سالح زەنگەنە، عەتا جەمیل، عەبدولحافیز شەریف، محەمەد حوسێن، کەریم رەمەزان، تالب عومەر، فاتح داود جەباری، موختار برغش، مەهدی مەڕوان، مەحمود عەلی بەستێ، نەجمەددین نادر شوانی، خەلیل ئیبراهیم عومەر، تۆفیق مستەفا، حوسێن خورشید، عەبدولڕەحمان سەعید محەمەد، خورشید مەحموود، مەحموود مەجید)(١٧٩) بوون، بە تۆمەتی بەشداریکردن لە ڕووداوەکانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٩(١٨٠).

زۆربەی ئەمانە لەدوای ڕووداوەکانی ١٤ تەممووزی ١٩٥٩ گیران و هەندێکیان ئازاد کران چونکە بێتاوان بوون، بەڵام لەگەڵ گەیشتنی بەعس بە دەسەڵات لە ساڵی ١٩٦٣ دووبارە گیرانەوەو بە تۆمەتی کۆمۆنیستی و بەشداری کردن لە ڕووداوەکانی کەرکوکدا درانە دادگا و بڕیاری لە سێدارەدانیان درا(١٨١). مستەفا عەسکەری وەك شایەد حاڵێکی ئەو لە سێدارە دانە دەگێڕێتەوە کە بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین لە سێدارە دران و بە داردا هەڵواسرابوون لە ناو کەرکوکداو هەندێ لە تورکمانەکانیش ئاهەنگیان دەگێڕا(١٨٢). ژمارەیەك لەوانەی لە سێدارە دران کەسانی خوێندەوارو ڕۆشنبیر بوون و لەنێو بردنیان بەو شێوەیە زەبرێك بوو لە بزاڤی کورد لە کەرکوك. بەعس بە لە سێدارەدانی ئەم کەسایەتیانە نەوەستا، بەڵکو سەدان کوردی لەسەر کار لابرد، لەوانە کۆمەڵێکی زۆر لە کرێکارانی کورد کە لە کۆمپانیای نەوتدا کاریان دەکرد. ئەمانە بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك گوێزرانەوە.

هەروەها ژمارییەك لە فەرمانبەرانی کوردی کەرکوکیش

بۆ ناوەڕاستو باشووری عێراق دوورخرانەوە. ئەمانە بەشێکیان مامۆستای سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەیی بوون. لە بەرامبەریشدا ژمارەیەکی زۆری عەرەبی هێنا وەك پۆلیسو کرێکاری کۆمپانیای نەوت دایمەزراندن لەگەڵ ئەوەی هیچ شارەزاییەکیان نەبوو، چونکە زۆربەیان ئەندامانی خێڵەکان بوون[١٨٣]. لە تەك ئەمانەشدا ژمارەیەکی زۆر مامۆستاو فەرمانبەری عەرەب بۆ کەرکوك هێنران. لە کاتی دەرکردنی کوردەکان لە گوندەکانی خۆیانو لەسەر زێدی باوو باپیرانیان خێڵی عەرەبیان بۆ نیشتەجێ کردنیان لەو گوندانە دەهێناو دەستیان بەسەر موڵكوماڵو زەویو زاری کوردەکاندا دەگرت. بۆ زیاتر بەهێز کردنیان ئەم خێڵانە لەلایەن حکومەتەوە چەکدار دەکران[١٨٤].

حکومەت بە ناوی پاراستنی ناوچە نەوتییەکانەوە دەیان خاڵی چاودێریو ڕەبایەی سەربازییان لەسەر لوتکەی تەپۆڵکەو گردەکانی دەوروبەری شاری کەرکوك دانا، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کە لە کۆمپانیاو چاڵگەکانی نەوتەوە نزیك بوونو هەموو ئەو شوێنانە بە ناوچەی ئەمنی ڕاگەیاندران، کە نەدەبوو کەس لێیان نزیك ببێتەوە، هەر بەوەش نەوەستا بەڵکو ئەو شوێنانەیان مین ڕێژیش دەکرد[١٨٥].

لە دوای ئەو هەموو کردەوانەی، کە کودەتاچییەکان لەم پارێزگایەدا ئەنجامیاندا بۆ زیاتر بە عەرەبکردنی ناوچەکەو گۆڕینی سیمای شارەکە بەشێوەیەکی ئاشکراو ڕووهەڵماڵراو دەستیان بە گۆڕینی ناوی قوتابخانەو شەقامەکانی کەرکوك کردو خاوەن کۆگا بازرگانییەکان ناچار دەکران ناوی عەرەبی لە کۆگاکانیان بنێن. هەروەها هاوتەریب لەگەڵ ئەم هەنگاوانەدا دەستیان کرد بە هێرشێکی سەربازی بەربڵاو بۆ سەر بەشی زۆری گوندەکانی پارێزگاکە بە مەبەستی تۆقاندنی دانیشتووانیان بۆ ئەوەی ناچار بکرێن گوندەکانیان بەجێبهێڵنو عەرەب لە شوێنیان نیشتەجێ بکرێن[١٨٦].

ورد بوونەوە لە پلانو هەنگاوەکانی بەعس لە دژی کورد هەندێ جیاوازی لەگەڵ حکومەتەکانی پێش خۆی دەخستەڕوو. ئەم حیزبە بە کراوەییو ڕاشکاوەیی سیاسەتی بە عەرەبکردنی پەیڕەو دەکردو کوردی ڕادەگوێزا یا ناچاری دەکردن کەرکوك بەجێبهێڵن. هەرچی سەردەمی حکومەتەکانی بەر لە فەرمانڕەوایی ئەم بوون بەشێوەیەکی شاراوە پەیڕەوی سیاسەتی بە عەرەبکردنیان لە پارێزگای کەرکوك دەکرد بە پشتگیریکردن لە هاتنی عەرەب بۆ پارێزگاکەو ڕێو شوێنیان بۆ دیاریکراوەو یارمەتی دراون، بەڵام کورد بەشێوەیەکی ئاشکراو بە بەرچاو دونیاوە ڕانەگوێزراون. بەڵام لە سەردەمی دەسەڵاتی بەعسدا کورد نەك هەر بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕادەگوێزرانو ناوچەکانیان عەرەبنشین دەکران، بەڵکو حکومەتی بەعس بە چڕی خەریکی گۆڕینی سیمای شارەکە بوووەو کەوتبووە گۆڕینی ناوی قوتابخانەو شەقامو شوێنە گشتییەکان، وەك گۆڕینی گەڕەکی قەسابخانە بۆ (المجزرة)و گەڕەکی (تسن) بۆ (تسعین)و دواتر بۆ (تسعین الجدیدة). هەر بەم کارانەش ڕانەوەستان، بەڵکو بەشی زۆری کاربەدەستو کرێکارانی کوردیان بۆ دەرەوەی کەرکوك گواستەوەو بەشێوەیەکی فەرمی کەرکوکیان لە ناوچە کوردییەکان دابڕی.

ئەمە سیاسەتی بەردەوامی هەموو ئەو حکومەتانەی عێراق بوو لەساڵی (١٩٦٣)ەوە تا حکومەتە تاکڕەوەکەی سەدام حوسێنو ڕامالینی دەسەڵاتەکەی لەنیسانی ٢٠٠٣ کە لە کەرکوکدا پەیڕەو کراوە.

**٣- بە عەرەبکردنی کەرکوك لە سەردەمی دەسەڵاتی برایانی عارفدا:**

لە (١٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٣) عەبدولسەلام عارفو کۆمەڵێك لە جەنەڕاڵەکانی سوپای عێراق لە بەعس هەڵگەڕانەوەو دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرتو حکومەتی بەعسیان ڕووخاندو گەڵێ لەلایەنگرانی بەعسیان دوورخستەوە. ئەم کودەتایە بەهۆی کێشە ناوخۆییەکانی بەعسو هاوپەیمانەکانییەوە ڕوویدا. باری ناوخۆی حیزبی بەعس هێندە ڕووی لە گرژیو ئاڵۆزی کردبوو کە ئەمینداری گشتی بەعس میشێل عەفلەق لە (١٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٣)دا ناچار بوو بێتە بەغدا بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانو کاروباری حکومەتی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. عەبدولسەلام عارف سەرۆك کۆمار بە ڕەفتارەی عەفلەق توڕە بووو ئەمەی بەکەمکردنەوەی سەنگی خۆی لەقەڵەمدا. هەمان ڕۆژ لە بەغدا بووە تەقەو پێکدادان لەنێوان (بەعسیە چەپڕەوەکان)و سوپای عێراقدا ڕوویدا، ئەوە دەرفەتێکی چاکی بۆ عارف ڕەخساند کە کودەتایەك بەسەر هاوپەیمانە بەعسییەکانی خۆیدا بکات[١٨٧]. لە دوای کودەتاکە عەبدولسەلام عارف بە سەرۆکی (ئەنجوومەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕش) هەڵبژێردراو کرا بە سەرۆکی هێزە چەکدارەکانی وڵات[١٨٨]. تاهیر یەحیاش کرا بە سەرۆك وەزیران. لە دوای چەند مانگێكو دوای تاقیکردنەوەی تواناکانی لە دژی بزاڤی چەکداری کورد حکومەتی نوێ بە ناچاری لەگەڵ سەرکردایەتی ئەو بزاڤەدا دەستی بە دانوسان کردو لە (١٠)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٤)دا بەپێی بەیاننامەیەکی بارزانی کە تێیدا هاتبوو (بۆ جێبەجێ کردنی خواستەکانی سەرۆکی کۆمار عەبدولسەلام عارفو بۆ پاراستنی یەك ڕیزی نیشتمانیو کۆتایی هێنان بە شەڕو خوێنڕشتنو بۆ سەلماندنی نییەتی چاکمان بڕیارماندا شەڕ ڕابگرینو گەڕانەوەی براکانمان بۆ سەر شوێنو کاری خۆیان. لێرەوە حکومەت بۆ دانپێنان بە مافی نەتەوەی کورد لە چوارچێوەی گەلی عێراقو یەکێتی نیشتمانیدا دەرفەتی لە پێشە)[١٨٩].

شەڕ ڕاگیراو گفتوگۆ دەستی پێکردەوە. مەبەستی عەبدولسەلام عارف لەم شەڕ ڕاگرتنە، کە هەندێك لە سەرچاوەکان بە ئاگربەستی عارف نێوی دەبەن، ئەوەبوو لە دووبەرە لە هەمان کاتدا شەڕ نەکات لە لایەك لە دژی کوردو لەلایەکی تریش دژی بەعسییەکان، بەڵکو ئاگربەست لەگەڵ کورد ڕابگەیەنێ تا بتوانێت پاکتاوی دەسەڵاتی بەعسییەکان بکاتو پێگەی خۆی لە وڵات بە هێز بکات. سەرکردایەتی

کوردیش لەم ئاگر بەستە مەبەستی خۆی هەبوو ئەمیش لە هەوڵی ئەوە بوو کە دوای ئەو هەموو شەڕەی لە ساڵی (١٩٦١)ەوە لە دژی حکومەتەکانی قاسمو بەعس کردبووی‌و شەڕکەران‌و خەڵك هیلاك‌و شەکەت ببوون‌و زیانێکی زۆریان لێکەوتبوو بتوانن بحەسێنەوەو خۆیان ڕێکبخەنەوە[١٩٠].

شایانی باسە ئەم ئاگر بەستە بووە هۆی ئاژاوەو ناکۆکی لە ڕیزی بەشدارانی بزاڤی کوردیدا. هەندێ لایەنی نێو ئەم بزاڤە ئەم ئاگر بەستەیان بە هەنگاوێکی باش دانەناو پێیان وابوو کە شتێکی ئەوتۆی بۆ کورد تێدا نەبوو. هەر بۆیەش بوو بە مایەی لێکترازان لەڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا، گەلێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی، کە دژی ئەو ڕێککەوتنە جیابوونەوە لە سەرکردایەتی بارزانی[١٩١]. لایەنی بڕیاردەریش پێی وابوو، کە ئەم ئاگر بەستە کارێکی پێویستە چونکە جەنگاوەران‌و خەڵك شەکەت بوونەو پێویستیان بە پشووو حەسانەوە هەیە. خاڵە سەرەکییەکانی ئاگر بەستەکە بریتی بوون لە داننان بە مافەکانی گەلی کورددا لە چوارچێوەی عێراقداو ئازادکردنی زیندانییە سیاسییەکان. گێڕانەوەی موڵك‌و ماڵی کوردان، گەڕانەوەی دام‌و دەزگاکانی دەوڵەت بۆ کوردستان‌و هەڵگرتنی ئابلۆقەی ئابووری لەسەر کوردستان‌و گێڕانەوەی کارمەندان بۆ سەر کارەکانیان. ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان، کە لە دواییدا بە باڵی مەکتەبی سیاسی ناسران ناڕەزایی خۆیان بەرامبەر ئەم ئاگر بەستە ڕاگەیاندو پێیان وابوو، داخوازییەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، بەتایبەتی ئۆتۆنۆمی، کە داخوازی‌و دروشمی سەرەکی شۆڕشی ئەیلول بوو لەو بەیاننامەیەدا باس نەکراوەو باس لە بەڕێوەبردنی خۆجێی نەکراوە، بەڵکو حکومەت وەکو جاری جاران هەر باسی (شیمال)ی کردووە[١٩٢].

لە (٢٩)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٤)دا دەستووری کاتی لەلایەن حکومەتەکەی عەبدولسەلام عارفەوە ڕاگەیەندرا. دەستوورەکە بەو شێوەیە نەبوو کە کورد چاوەڕوانی دەکردو مافەکانی گەلی کوردی دەستەبەر نەدەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە ماددەی یەکەمی دەستوورەکەدا هاتبوو (کۆماری عێراق دەوڵەتێکی دیموکراتی‌و سۆشیالیستیەو بنەماو ڕیشاڵەکانی دیموکراتی‌و سۆشیالیستی لە میراتی عەرەبی‌و ڕۆحی ئیسلام وەردەگرێت)[١٩٣]، لێکدانەوەی ئەو بەندە شۆفینیزمی نەتەوەی سەر دەست دەخاتە ڕوو، کە حکومەتی عارف بەرجەستەی دەکرد، ڕاگەیاندنی عێراق بە دەوڵەتی عەرەبی واتا پشتگوێ خستنی کوردو باسی میراتی عەرەبی لە وڵاتێکی فرە نەتەوەدا واتا پشتگوێ خستنی میراتی گەلانی تر. بڕگەی دووەمی ئەم مادەیەش لە دەقەکەی داهاتووە (گەلی عێراق بەشێکە لە نەتەوەیی عەرەب‌و ئامانجیشی یەکێتی گشتگیری عەرەبییە)[١٩٤] لە ماددەی (١٩) ئەو دەستوورەدا ئاماژە بە کوردو مافەکانی بەم شێوەیە کرابوو: (هەموو هاووڵاتیان هاوکاری دەکەن بۆ پاراستنی قەوارەی ئەم نیشتمانە بە عەرەب‌و کوردەوەو ئەم دەستوورە دان بە مافە نەتەوەییەکانیاندا دەنێ لە چوارچێوەی یەکێتی عێراقدا) [١٩٥]، لەگەڵ ئەو دەقە تەم‌و مژاوییەدا، ماددەکانی تری دەست ڕووخسارێکی عەرەبی‌و عروبی تەواویان دەدا بە عێراق[١٩٦].

ئەم دەستووره مەسەلەی کوردی بەشێوەیەکی وا فەرامۆش کردبوو کە سیاسەتمەدارێکی عارەبی وەك (کامل چادرچی) سەرۆکی (پارتی نیشتمانی دیموکراتی) بێنێتە قسە. چادرچی لە ٢ی حوزەیرانی ١٩٦٤ بیرخەرەوەیەکی پێشکەش بە ڕژێمی عارف کرد کە تێیدا هاتبوو: (دەستووری نوێ، کێشەی کوردی بە هەموو تێکچڕژاوی‌و ئالۆزییەکانییەوە، هەروا هێشتووەتەوە، باشتر وایە دانی پێدابنرێت‌و مەوداو چارەسەری گونجاوی بۆ دەستنیشان بکرێت)[١٩٧].

ئەم دەستووره لە چاو دەستووری ساڵی (١٩٥٨) هەنگاوێك بوو بۆ دواوە. چونکە ئەم دەستوورە لە گەڵ هیواو ئاواتی خەڵکی کورددا یەکی نەدەگرتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی شۆڕش لەگەڵ حکوومەتدا لە پەیوەندی بەردەوامدا بوو. ئەوە بوو لە (٢)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٤) دا سەرۆك وەزیران تاهیر یەحیا سەردانی سەرکردایەتی شۆڕشی[*] کردو (پڕۆژەی چارەسەری) پێشکەش کرد، بەڵام پڕۆژەکە مافی کوردی دیاری نەکردبوو. تەنانەت لە کاتی گفتوگۆکانیشدا لەگەڵ بارزانیدا نوێنەرانی حکومەت هەر بە (یاخی بووان) ناوی ئەندامانی بزاڤی کوردیان دەبرد. سەرکردایەتی شۆڕش بەو پڕۆژەیە قایل نەبوو. دوا تر تاهیر یەحیا پەیمانیدا کە پێداچوونەوە بە دەستووردا دەکرێت‌و مافی کورد لەو دەستوورەدا جێگیر دەکرێت، بەڵام بەڵێنەکەی نەهاتە دی. لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵدا بارزانی پڕۆژەیەکی[١٩٨] پێشکەش بە حکومەت کرد، لە پڕۆژەکەدا، داوای لە حکومەت کردبوو، کە لێبووردنی گشتی دەربکات‌و حکومەت دان بە مافی کورددا بنێت لە دامەزراوو ڕێکخراوە سیاسییەکانیاندا، هەروەها داوای دروست کردنی یەکەیەکی ئیداری کرابوو، کە لە تەك ناوچەکانی تری کوردستاندا کەرکوك‌و خانەقینیش بگرێتە خۆ، و بە ناو هێنانی کەرکوك لە وتووێژەکاندا لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشەوە حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق توڕەو بێزار دەبوون‌و کۆسپ‌و تەگەرە دەهاتنە بەردەم هەوڵەکانی چارەسەر کردنی کێشەکان‌و پەیوەندییەکان ئالۆز دەبوون‌و سەرلەنوێ شەڕ دەستی پێدەکردەوە.

دانووسانەکان بە بێ ئەنجام بەردەوام بوون‌و لە (١١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٤)دا بارزانی بیرخەرەوەیەکی نوێی پێشکەش بە عەبدولسەلام عارف کرد[١٩٩]. لەم بیرخەرەوەیەدا بارزانی ئاماژەی بەوە کردبوو، کە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك لە کۆمپانیای نەوتەوە بووە بە کۆمپانیای بە عەرەبکردنی شاری کەرکوك، چونکە لەو پارێزگایە چەندین خێزانی کورد لە ماڵەکانیان دەرکراون‌و خێزانی عەرەبیان لە جێگەدا نیشتەجێ کراوە، ئەم شاڵاوی ڕاگواستنە بە وتەی هەندێك لە (بەرپرسە گەورەکانی دەوڵەت) لە پێناوی عروبە دایەو بۆ تێگەیشتنی گەلی عەرەبە، کە مانەوەی عروبە لە عێراقدا بە لە ناوبردنی گەلی کوردەوە بەندە. لە درێژەی وتەکانیدا بارزانی ڕایگەیاند بوو کە لە ماددەی (١٩)

ی دەستووری کاتیدا هاتووە: مافە نەتەوەییەکانی کورد لە چوارچێوەی یەکێتی عێراقدا دانی پێدا دەنرێت. داخوازی بارزانی ئەوە بوو، کە ئەم ماددەیە بەم شێوەیە دابڕێژرێتەوە (دەستوور دان بە مافی گەلی کوردا دەنێت لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی یەکێتی عێراقدا)[٢٠٠]. هەروەها داوای گۆڕینی ماددەی یەکی دەستوورەکەی کردبوو، کە گەلی عێراقی بە بەشێك لە نەتەوەی عەرەب ڕاگەیاندبوو. داخوازی بارزانی و سەرکردایەتی شۆڕش ئەوە بوو کە ئەو ماددەیە بەم شێوەیە بێ: (گەلی عەرەب لە عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب)[٢٠١].

لەم بیرخەرەوەیەدا بارزانی داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان کردبوو، کەرکوك و خانەقینی بە بەشێکی دانەبڕاو لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی دانابوو، هەر لەو بیرخەرەوەیەدا داوای بەکارهێنانی زمانی کوردی وەك زمانی ڕەسمی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی کردبوو، لەگەڵ تەرخان کردنی بەشێکی دادپەروەرانە لە داهاتی نەوت بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەگەڵ چەند داواکارییەکی تردا. حکومەت وەڵامی ئەم بیرخەرەوەی بەشێوەیەکی ڕەسمی نەدایەوە بەڵام بارودۆخەکە تا دەهات بەرەو ئاڵۆزی و گرژی دەچوو و ئەگەری هەڵگیرسانەوەی شەڕ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەهێز دەبوو.

پرۆسەی ڕاگوێزان هەر بەردەوام بووو بە درێژایی ساڵی (١٩٦٤) دەرکردنی خێزان و کەسوکاری پێشمەرگە لەناوچەکانی ڕێدار، لەیلان و دووبز درێژەی هەبوو[٢٠٢]. دوای چەندین گەڕی وتووێژی سەرنەکەوتوو لە کۆتایی مانگی مارت و سەرەتای مانگی نیسانی ساڵی (١٩٦٥)دا شەڕ دەستی پێکردەوە[٢٠٣]. حکومەتەکەی عەبدولسەلام عارف هەر لە سەرەتای دروست بوونییەوە هەڵوێستی بەرامبەر بە کورد نەرێنی بوو، خودی عەبدولسەلام عارف لە سەروبەندی دەست پێکردنەوەی شەڕ لە تەلەفزیۆنی بەغدا ڕایگەیاند (کە کورد بە ڕەچەڵەك عەرەبن)[٢٠٤]، ئەو هێرشەشی بۆ سەر کوردستان بە (گەشتی بەهار) ناوزەد کردبوو[٢٠٥]. هەروەها (عەبدولرەزاق سەید مەحموود)[*] دەڵێت: وەك هەر یەکێك لە گەورە سەربازەکان لە سوپای عێراقدا هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی ڕوونم نەبوو لەسەر سروشتی شۆڕشی کوردی و هۆکارەکانی هەڵگیرسانی، یاخود هەر زانیارییەك دەربارەی مێژووی کێشەی کوردو پێشکەوتنەکانی، ئێمە جەنگاوەرە کوردەکانمان تەنها وەك داردەست و گێرە شێوێن دەناسی کە هێزێکی بیانی دەیان جوولێنێت لە پێناوی شێواندنی ئاسایش و هێمنی لە عێراقدا، گوتنی وشەی کوردستان لەلامان زۆر گران بوو، ئێمە بەراستی پێمان وابوو کە شۆڕشگێرە کوردەکان دەیانەوێت ئیسرائیلی دووەم لەباکووری عێراقدا دروست بکەن کە عەبدولسەلام عارف زۆربەی جار لەکاتی ووتارەکانیدا لەبەرامبەر گەورە سەربازەکاندا ئەم بیروڕایەی دەربڕیوە[٢٠٦]. لە کاتی شەڕدا ناوچەکانی کوردستان بە گشتی تووشی زەرەرو زیانێکی زۆر هاتن و هەڵبەتە کەرکوکیش بێ بەش نەبوو لەم زەرەرو زیانانە. لەم دەمەدا حکومەت بە بیانووی شەڕکردنی پێشمەرگە لەگەڵ سوپای عێراقدا لە ناوچەکە هەندێ گوندی

شوانی لە بناری چیای خاڵخاڵان لە ساڵی (١٩٦٤-١٩٦٥) سووتاند[٢٠٧]. لە کاتی شەڕدا (تاهیر یەحیا) سەرەك وەزیران لابراو عەبدولڕەحمان بەزاز[*]جێگەی گرتەوە. لە سەردەمی بەزازدا جۆرە گۆڕانکارییەك لە سیاسەتی حکومەت بەرامبەر بە کورد بەدی دەکرا. بەزاز لەوە گەیشتبوو، کە دۆزی کورد یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی عێراقە، لەم بارەیەوە بەزاز نووسیوویەتی دەڵێ: (ئەمە کێشەیەکی سەرەکی عێراقەو مانەوەی ئەم وڵاتە بەندە بە چارەسەر کردنی ئەم کێشەوە، هەروەها عێراق هێمنی و جێگیری بەخۆیەوە نابینێت تا وەکو ئەم کێشەیە بەشێوەیەکی دادپەروەرانە چارەسەر نەکرێت. تەنها ئەو کاتە یەکێتی گەلی عێراق بەدی دێت)[٢٠٨].

هەر سەبارەت بە دۆزی کورد دەڵێت: (کێشەی کورد کێشەیەکی سەردەمەو کۆن نییە، وەك هەندێك لە عێراقییەکانی ئەمڕۆ وای لێك دەدەنەوە، جەخت کردن بۆ ڕوون کردنەوەی کێشەی کورد لە ڕۆژگاری ئەوڕۆماندا پێویستە چونکە هەندێك لە بەرپرسان ڕاستی ئەم کێشەیە نازانن)[٢٠٩]. لە وتەیەکی تریدا دەڵێت: (کێشەی کورد لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقدا لە ساڵی ١٩٢١ سەری هەڵداوە[٢١٠]. بەزاز بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کە ئەو دژی بەکارهێنانی هێزەو دەیەوێت بە ئاشتی کێشەکان لەگەڵ کورددا چارەسەر بکات. لە مانگی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٥)دا هەندێ گۆڕانکاری لە ماددەی (١٩)ی دەستووری عێراقدا کرد، کە بەم جۆرە بوو (ئەم دەستوورە مافە نەتەوایەتییەکانی کورد لە چوارچێوەی یەکێتی نیشتمانی و برایەتی گەلی عێراق دابین دەکات)[٢١١]. پێشتر دابین کردنی مافی کورد بە بەرژەوەندی باڵای نەتەوەی عەرەبەوە دەبەسترا، بەڵام لە لای بەزاز هەندێ لێکدانەوەی جیاوازی بۆ دەکرا. لە ٦ی تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا کارنامەی وەزارەتی بەزاز بڵاوکرایەوە. لەوێدا بەم جۆرە باس لە دۆزی کورد کراوە (وەزارەتەکەمان بە هەموو شێوەیەك، کە لە توانایدا بێ هەوڵدەدات ئاشتی تەواو بگێڕێتەوە بۆ هەموو عێراق و یەکێتی خاکەکەی بپارێزێ. لە کاتێکدا وەزارەتەکەمان مافی برا کوردەکانمان ئەپارێزێت وەکو لە دەستووری کاتیدا سەرلەنوێ جەختی لێ کراوەتەوە، حکومەتەکەمان پڕ بە دڵ حەز دەکات لەسەر ئەو بنەمایە کار بکات، کە لە دەستووردا هاتووە. سەربارەی هەموو ئەمانە حکومەت بە زووترین کات قانونێکی نوێی بەڕێوەبەرایەتی خۆجێی (الإدارة المحلية) دەردەکات، کە دان بە کەسایەتی نەتەوەیی کوردا دەنێت و ڕێگە بە براکانمان لە باکوور دەدات پارێزگاری لە زمان و میراتی فیکری خۆیان بکەن. هەروەها دەرفەتیان دەداتێ چالاکییە ناوچەییەکانی خۆیان بنوێنن بەشێوەیەك، کە ناکۆك نەبێ لەگەڵ یەکێتی وڵاتداو ڕێگە بە داپچڕانی هیچ پارچەیەکی نەدات)[٢١٢]. ئەم وتانەی عەبدولڕەحمان بەزاز جۆرە نەرمییەك بەرامبەر بە کوردو چارەسەر کردنی دۆزەکەی، پیشان دەدات، کە لە گوتاری حکومەتەکانی پێش و پاش خۆیدا بەدی نەدەکرا. لێرەدا کورد وەك نەتەوە ناو دەبات، هەرچەندە ئەویش بەشێوەی ئەوانی تر ناوی کوردستان نابا بەڵکو هەر بە (باکوور) ناوزەدی دەکات و سوورە لەسەر یەکپارچەیی خاکی عێراق،

-----

هەروەك لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیدا ئەوە دووپات دەکاتەوەو دەڵێت: ڕۆڵەکانمان لە باکوور سووربن لەسەر یەکێتی خاکی عێراق، کوردەکان مافی پەرەپێدانی مانەوەی نەتەوایەتی خۆیان هەیە. لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا بەزاز جەختی لەسەر هەمان بیروبۆچوون دەکاتەوەو دەڵێت: (کوردەکان جیابوونەوەیان ناوێت بەڵکو مەبەستیان پارێزگاری کردنە لەسەر مانەوەی خۆیان، ئێمەش ئامادەیی خۆمان دەربڕیوە بۆ ئەم مەبەستەو چەند جارێك دووپاتمان کردووەتەوە کە دان بە بوونی کورددا دەنێین وەك نەتەوەیەك کە زمان و کولتوری خۆی هەیەو مافی پارێزگاری کردنیشیان لێیان هەیە) لە وتەیەکی تریشدا کە لە ڕۆژنامەی (النهار)ی بەیروتی دا بڵاوکراوەتەوە دەڵێ (کێشەی کورد یەکێکە لە گرنگترین کێشەکانی عێراق و حکومەت هەوڵی جیدی دەدات بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە)(٢١٣). دەتوانین هەوڵەکانی بەزاز بە هەنگاوێك دابنێین بۆ دەست پێکردنەوەی وتوێژ لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی کورددا.

لەگەڵ هەموو هەوڵەکانی بەزازدا بۆ هێمن کردنەوەی باروودۆخەکە، سیاسەتی بە عەرەبکردنی کوردستان و بەتایبەتی کەرکوك هەر بەردەوام بوو. ئەوەتا لە ئامارێکی فەرمی حکومەتدا کە لە ساڵی (١٩٦٥)دا لەسەر بنەمای زمان کراوە ڕێژەی کورد لە کەرکوك بەشێوەیەکی وا کەم کراوەتەوە، کە لە دوای ڕێژەی عەرەبەوە هاتووە، ئامارەکان بەم جۆرە بوون: عەرەبی زمان ٣٩٪، کوردی زمان ٣٦،١٪، تورکمانی زمان ١٩،٥٪،و کەمینەکانی تر ٥،٤٪(٢١٤).

ناو بەناو شەڕ هەر بەردەوام بوو تا لە (١٣)ی نیسانی (١٩٦٦)دا عەبدولسەلام عارف لە ڕووداوێکی کەوتنە خوارەوەی هێلیکۆپتەردا لە بەسرە گیانی لە دەستدا(٢١٥).

کاتێ مردنی عەبدولسەلام عارف ڕاگەیەندرا، بارزانی یەك لایەنە شەڕی ڕاگرت تا ڕژێمی نوێ بتوانێ (بیر لە داخوازییەکانی کورد) بکاتەوە، بەڵام زۆری نەخایاند عەبدولڕەحمان عارف(*) بوو بە سەرۆك کۆماری عێراق. عارفی دووەم لە وتارێکیدا ئاماژەی بە دۆزی کوردو چارەسەر کردنی کێشەکەی کردو لەم بارەیەوە دەڵێ: (هەرگیز ئۆتۆنۆمی بە کورد نادرێ و حکومەت هەرگیز نەیویستووە لەگەڵ یاخیبوواندا گفتوگۆ بکات)(٢١٦). ئەمە گەڕانەوەیەك بوو بۆ دواوە. لە وتەیەکی تریشدا سەبارەت بە دۆزی کورد دەڵێت ( نیشتمانی عەرەب بۆ عەرەبە)(٢١٧). لێرەدا هیچ مەبەستی شاراوە نییە، بەڵکو ڕوون و ئاشکرایە دەڵێ عێراق عەرەبەو بۆ عەرەبە.

بەم جۆرە لە مایسی (١٩٦٦) سوپای عێراق دەستی بە شەڕ کردەوە لە دژی بزووتنەوەی کوردو دوای چەندین شەڕو پێکدادانی بێ ئاکام کەوتنەوە گفتوگۆ، دوای دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕش و حکومەتی بەزاز، هەردوولا لەسەر بەیاننامەیەك ڕێککەوتن کە لە (١٢) ماددە پێکهاتبوو، لە (٢٩)ی حوزەیرانی (١٩٦٦) بەزاز لە ڕێگەی رادیۆوە بەیاننامەکەی بڵاوکردەوەو بۆ ڕۆژی دواتر بارزانی پێشوازی لە بەیاننامەکە کرد(*). بەپێی ماددەکانی بەیاننامەی بەزاز نەتەوەی کورد لە ناو عێراق بە ڕەسمی ناسێنرابوو، حکومەت تەئکیدیشی کردەوە کە ئەم دانپیانان و ناساندنەی کورد لە دەستووری هەمیشەیی عێراقدا دەنووسرێتەوەو عەرەب و کورد لە مافەکان و ئەرکەکانیاندا یەکسانن و کوردەکان بەشداری لە هەموو پلەو پێیەکانی دەوڵەت دەکەن (لە وەزارەتەکان و دەزگاکانی دادوەری و دیبلۆماسی و سەربازی). هەروەها کورد بەپێی ژمارەیان بەشداری لە ئەنجوومەنی نیشتمانیشدا دەکەن. لە کاتی ڕاگرتنی شەڕیشدا لێبووردنی گشتی دەردەکرێت بۆ هەمووان، ئەوانەی بەشداریان لە شەڕدا کردووەو ئەوانەش، کە بە بۆنەی شەڕەوە گیراون یا دوور خراونەتەوە. جگە لەمە لەسەر پێکهێنانی لێژنەیەکی تایبەت بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و تەرخان کردنی بودجەی تایبەت بۆ ئەو کارە ڕێککەوتن. سەر باری ئەمانە پشتگیری لە گەشەی کولتوری کوردی دەکرێ و زمانی کوردیش وەکو زمانی ڕەسمی لە کوردستاندا هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرێت، و پەیمانی ئەوەشی دابوو کە لە ماوەی ساڵێکدا حکومەتێکی پەرلەمانی لە وڵاتدا پێکبهێنێ... تاد)(٢١٨).

ئەوەی جێگای تێڕامانە لەم بەیانەدا بە هیچ شێوەیەك باس لە کەرکوك نەکراوە، تەنانەت ئاماژەشی پێ نەدراوە، هەرچەندە سەرکردایەتی کورد لەسەر ئەم بەیاننامەیە ڕەزامەندی خۆشی دەربڕیبوو، بەڵام بە هیچ شێوەیەك مافی کورد لە پارێزگای کەرکوك لەم بەیاننامەیەدا زامن نەکرابوو.

بەندەکانی بەیاننامەی (٢٩)ی حوزەیرانی (١٩٦٦) نەچوونە بواری جێبەجێکردنەوە. سەرەك کۆمار (عەبدولڕەحمان عارف) لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٦٦) دا سەردانێکی کوردستانی کردو چاوی بە بارزانی کەوت. بە مەبەستی چارەسەر کردنی دۆزی کورد بەڵێنیدا خاڵەکانی ئەو بەیاننامەیە جێبەجێ بکات و باری گوزەرانی خەڵکی کوردستان چاك بکات، بەڵام بەڵێنەکانی هەرگیز نەکەوتنە بواری جێبەجێکردنەوە(٢١٩). نەك هەر بەڵێنەکانی جێبەجێ نەکران بەڵکو بە عەرەبکردنی کوردستان و بەتایبەتی کەرکوك هەر بەردەوام بوو.

لەم ماوەیەدا تا کودەتای ساڵی (١٩٦٨) چەند وتووێژێکی تریش لەنێوان سەرکردایەتی بزاڤی چەکداری و حکومەت ئەنجامدران، بەڵام هیچ بەرهەمێکیان لێ نەهاتە دی، کە لێرەدا جێگەی باس کردن بێت. هەروەك لە سەرچاوەکاندا باس کراوە زۆرینەی وتووێژەکان بە هۆی کێشەی کەرکوکەوە شکستیان هێناوەو ئەو حکومەتانەی کە لە بەغدا بە دوای یەکتردا هاتنە سەر دەسەڵات تێکڕا خواستی کوردیان لەسەر کەرکوك ڕەتکردووەتەوە(٢٢٠).

بەعسییەکان بۆ جاری دووەم لە (١٧)ی تەممووزی (١٩٦٨)دا بە کودەتاییەکی دوو قۆناغی دەسەڵاتیان گرتە دەست و (ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر) بوو بە سەرەك کۆمارو عەبدولڕەزاق نایف بە سەرۆك وەزیران(٢٢١).

دوای گەڕانەوەیان بۆ سەر کورسی دەسەڵات، سەرکردەکانی حیزبی بەعس لە سەرەتادا ویستیان خەڵکی هێور بکەنەوەو دیمەنی پێشووی پڕ لە زەبرو زەنگیان و کوشتنی هەزاران عێراقی و کورد بە دیمەنێکی نوێ بگۆڕن،

بەڵام تەنانەت لەو کاتەشدا سیاسەتی بە عەرەبکردنی کەرکوك و باڵا دەستکردنی عەرەب لەو پارێزگایە نەك هەر ڕانەگیرا بەڵکو مەودایەکی زۆر بەربلاوتری گرتەخۆ ئەمجارەیان بەگوێرەی نەخشەیەکی داڕێژراوو پرۆگرامێکی جێگیر کە دەوڵەت بەڕێوەی دەبرد[222]. هەر لەو کاتەی کە دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئەو ژمارە کەمەی کارمەندە پلە نزمەکان لە مامۆستایان و کرێکارانی کەرتە جیاوازەکانی دەوڵەت و کرێکارانی کۆمپانیای نەوت بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك گوێزرانەوە، بڕیاری ئەوەش درابوو کە ئەو کوردەی کەرکوك لەبەر هەر هۆیەك بەجێ دەهێڵێت نابێ ڕێگەی پێ بدرێ جارێکی تر بۆ ئەو شارە بگەڕێتەوە[223]، ڕژێمی بەعس لە ساڵی (١٩٦٩) دانیشتووانی حەوت گوندی (گوڵدار، باشتەپە، کیتکا، گورزایی، شانە شین، نایلیئا وای بنار، کەلۆری بنار، دارەمانی بنار) لە ناحیەی پردێی سەر بە پارێزگای کەرکوك، و گوندی یاروەلی لە ناحیەی قەرە هەنجیری هەمان پارێزگا ڕاگواست و گوندەکانیانی بە عەرەبکرد[224].

سەرۆکایەتی شارەوانی، کە پۆستێکی گرنگە، بە یەکێك دەسپێردرا کە نوێنەرایەتی زۆربەی دانیشتووانی شار بکات، تا ساڵی ١٩٦٩ بە هیچ عەرەبێك نەسپێردرابوو دوای کودەتای (١٩٦٨) مەزهەر تکریتی (مظهر التكريتي) یەکەم عەرەب بوو کرا بە سەرۆك شارەوانی کەرکوك[225]. لە حەفتاکاندا سیاسەتی بە عەرەبکردن بە شێوەیەکی بەربلاوتر بەردەوام دەبێت وەك لە باسی داهاتوودا بە وردی لێی دەدوێین.

**٤. کێشەی بە عەرەبکردن لە سێبەری ئاشتیدا ١٩٧٠- ١٩٧٤:**

دوای ئەوەی بەعس بۆ جارێکی تریش هێزی خۆی لە دژی بزاڤی کورد تاقیکردەوەو زنجیرەیەك هێرشی کردە سەر کوردستان، لەوە گەیشت کە بەزەبرو زەنگ ناتوانێت پرسەکە یەکلایی بکاتەوە، بۆیە بڕیاریدا پەنا بباتە بەر گفتوگۆو کات کوشتن، بۆ ئەم مەبەستە لە ١٨ کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٩ سەمیر عەزیز ئەلنەجم کە ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی بەعس و ئەندامی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) بوو لەگەڵ دوو کەسایەتی دیار لەسەر ئاستی عێراق و کوردستان، کە عەزیز شەریفی نزیك لە کۆمۆنیستەکان و ئەندامی بزووتنەوەی ئاشتی جیهان و فوئاد عارفی کورد چوونە لای بارزانی[226].

سەمیر عەزیز ئەلنەجم لە وتەکانیداو لە گفتوگۆکردنی لەگەڵ بارزانیدا هەوڵیدا ئەوە ڕوون بکاتەوە، کە پارتەکەی ئارەزووی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی هەیە، ڕێگاکانی پێشوو، کە حیزبەکەی بەکاری هێناون بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بە هەڵە دادەنێت ئەمەش لە کەم تاقیکردنەوەی پارتەکەیانەوە دێت، بۆیە گەیشتوونەتە ئەو بیرۆکەیەی تەنها ڕێگە بۆ ئاشتی ڕێککەوتنە لەگەڵ بارزانیدا. سەمیر ئەلنەجم لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ بەغدا دارا تۆفیقی وەك نوێنەری بارزانی لە بەغدا لەگەڵ خۆیدا برد، گفتوگۆکردن لەگەڵ سەدام حوسێن ئەلتکریتی بکات کە ئەو کات جێگری ئەمینداری سەرکردایەتی عێراقی حیزبی بەعس و جێگری سەرۆکی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) بوو، لە دوای گەڕانەوەی دارا تۆفیق بۆ کوردستان شاندێکی حکومی لە (٣١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٩)دا چوونە ناوپردان بۆ لای بارزانی بۆ درێژەدان بە گفتوگۆکان[227]. دواتر لە (١٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٠) سەدام حوسێن سەردانی کوردستانی کردو لەگەڵ بارزانیدا کۆبۆوە. سەدام لەم چاوپێکەوتنەدا ڕەزامەندی حیزبی بەعسی دەربڕی بۆ چارەسەر کردنی دۆزی کورد لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی. لە (٢٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٠) شاندێکی تر بە سەرکردایەتی حەردان تکریتی سەردانی کوردستانی کردو لە کاتی وتووێژەکاندا کێشەو ئاڵۆزی لەسەر کەرکوك دروستبوو لەو کاتەی عەبدوڵا سەلوم سامەڕایی بە بارزانی گوتبوو: (کەرکوك کوردستانی نییەو کێ دەتوانێت پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنێت)، بارزانی بە توڕەییەوە پێی دەڵێ (من دەڵێم کەرکوك کوردستانییە، ئاگاداربە لەوەی کە بڵێیت کوردستانی نییە، بەڵکو بڵێ ئێمە داگیرمان کردووە، تەنانەت تەنها یەك کوردیش لە کەرکوکدا بمێنێت شارێکی کوردییە، ئەوەش بزانە کە هەرگیز دەست لە کەرکوك هەڵناگرین)[228]. ئەم بۆچوونەی حیزبی بەعس لەسەر کەرکوك ڕەگو ڕیشەی لە بیری ناسیۆنالیستانی عەرەبدا داکوتابوو، بۆیە گفتوگۆو وتووێژەکانیان لەگەڵ کورددا بۆ ئەوە بوو لەو قەیرانانە خۆیان دەرباز بکەن کە لە نێو حیزب و دەوڵەت و لەسەر ئاستی پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکاندا ڕووبەڕوویی بووبوونەوە. لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٩) میشێل عەفلەق ڕایگەیاندبوو، کە (حیزب دژی ئەمە نییە مافی ئۆتۆنۆمی بدات بە کوردەکان). لە مانگی تشرینی یەکەمیش، گۆڤاری ناوخۆی حیزبی بەعس کە ناوی ئەلسەورە ئەلعەرەبییە (الثورة العربية) بوو، نووسیبووی : (ئۆتۆنۆمی باشترین ڕێگا چارەیە بتوانێ مافەکانی کورد دابین بکات)، ئەگەر ئەو کۆسپ و تەگەرانە لە بەردەم حیزبی بەعس نەبوونایە ئەوا ئەو حیزبە هەرگیز بیری لە دانووسان لەگەڵ سەرکردایەتی کورد نەدەکردەوە. لە کاتی دانووسانە فەرمییەکانیشدا، تەگەرەو گرفتی گەورە لەسەر کەرکوك پەیدا دەبوو. پارتی دیموکراتی کوردستان سوور بوو کە ئەم ناوچانە دەبێ بخرێنە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی، بەعس دەیویست ئۆتۆنۆمی بە خەڵك بدات نەك بە خاك، واتە ئامادە بوو دان بە کوردا بنێ وەکو گرووپێك بەڵام ئامادە نەبوو دان بە هەبوونی کوردستاندا بنێ[229]، یا ڕاستتر نەیدەویست دان بەوەدا بنێ، کە هیچ بستە خاکێك بەشێکە لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی خاکی کوردەو لە ئەنجامدا وتووێژو دانوسان لەنێوان هەردوو لادا ڕاوەستا و نەگەیشتنە ئەنجام و ئەگەری دەستپێکردنەوەی شەڕ هاتبووە ئاراوە، تا لە (٢)ی ئاداری (١٩٧٠) شاندیکی حکومی بۆ وتووێژ گەیشتنە لای بارزانی و دوای لێك تێگەیشتن، شاندێکی گەورە بە سەرۆکایەتی سەدام حوسێن گەیشتە ناوپردان و لە (١١)ی ئاداردا بارزانی و سەدام ڕێککەوتنێکیان مۆر کرد[230]. بەپێی ئەم ڕێککەوتنامەیە لە مێژووی دەوڵەتی عێراقدا یەکەم جار بوو، بە ڕەسمی مافە سیاسی و فەرهەنگییەکانی کورد بسەلمێنرێت، هەروەها

یەکەم جار بوو، کە بەری ڕەنج و خەباتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ببێتە دەستکەوتێکی مادیی و مەعنەوی بۆ هەموو گەلی کورد، لە دەستپێکردنی شۆڕشەوە تا ئاداری ساڵی (١٩٧٠) گفتوگۆو دانوسانی زۆر لەگەڵ حکومەتدا کرابووو ناو بە ناو ئاگر بەست ڕاگەیەندرابوو، بەڵام لە هەمووی درێژخایەنترو بەرفراوانتر وتووێژی ساڵی ١٩٧٠ بوو، کە چوار ساڵ ئاشتی بە دوادا هات. ئەم ڕێککەوتنامەیە چەند ماددەیەکی لەخۆ دەگرت مادە بنچینەییەکانی ئەمانە بوون (زمانی کوردی لەگەڵ زمانی عەرەبی دەبێتە زمانی ڕەسمی لەو ناوچانەی کە زۆربەی دانیشتووانیان کوردن، یەکێک لە جێگرەکانی سەرۆکی کۆمار کورد دەبێت، گەلی کورد بەشداری دەکات لە دەسەڵاتی یاسا دانان بەپێی ژمارەی لە عێراق، هەروەها دانیشتووانی گوندەکانی عەرەب و کورد بۆ شوێنی دانیشتنی پێشووی خۆیان دەگەڕێنەوەو. هەروەها کوردەکان بەشداری لە دەسەڵاتدا دەکەن بەبێ ئەوەی لەنێوان ئەوان و نەتەوەی تردا (مەبەستی عەرەبە) جیاکاری بکرێت، ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیار دەدات جەژنی نەورۆز بەشێوەیەکی ڕەسمی وەک جەژنێکی نەتەوەیی لە کۆماری عێراقدا دانی پێدابنرێت، هەروەها بڕیار درا لێبووردنی گشتی دەربچێت بۆ هەموو ئەوانەی لە شەڕی کوردستاندا بەشدار بوون... تاد)[٢٣١]. لە ماددەی ژمارە (١٤)ی ڕێککەوتنامەکە بە مەبەستی یەکلاکردنەوەی مەسەلەی ئەو ناوچانەی جێگای ناکۆکی بوون (مەبەست پارێزگای کەرکوک و هەندێ ناوچەی تری وەکو خانەقین و شەنگارو ... تاد) بوو، کە دەبوایە سەرژمێریان تێدا بکرێت پێشبینی ئەوە کرابوو، کە لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٠) بە ڕەزامەندی هەردوولا بۆ بەهاری ئایندە دواخرابوو، بەڵام کاتێ بەهار هات حکومەت بۆ کاتێکی نادیار دوای خست بارزانیش حکومەتی بەمە تاوانبار کرد، کە عەرەب بۆ ناوچەکانی کەرکوک و خانەقین و شەنگار دەهێنێ بە مەبەستی بە عەرەبکردنیان[٢٣٢]، کە ئەمەش ڕاستی ڕووداوەکان بوو چونکە لەکاتی ئاهەنگ گێڕانی ڕاگەیاندنی ڕێککەوتننامەی (١١)ی مارت ڕۆژنامەنووسێکی میسری لەپارێزگاری کەرکوکی ئەوکاتەی پرسیبوو: ئایا سەرژمێری ئەنجام دەدەن؟ ئەویش لەوەڵامدا گوتبووی: هەتا کاتی ئەو سەرژمێرییە دێت، پێکهاتەی دیمۆگرافی کوردستان دەگۆڕێت. بەو شێوە وەڵامەش مەبەستی ڕوون و ئاشکرای بەعسی دەرخستبوو[٢٣٣].

شایەنی باسە کودەتاچییەکان لە (٢١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٨)دا دەستوورێکی کاتیان نووسیبوو، بەڵام ئەم دەستوورە لەگەڵ دەستووری ساڵی (١٩٦٤) جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو، مۆرکی عروبەی پێوە دیاربوو، هەرچەندە لە ساڵی (١٩٦٩)دا بەعس گوایە هەوڵی چارەسەرکردنی دۆزی کوردی دەداو هەندێک بڕیاری دەرکرد، بەڵام ئەمانە چارەسەری کێشەی کوردی نەدەکردو لەگەڵ داواکارییەکانی کوردا نەدەگونجا. دواتر لە ڕێککەوتننامەی ئاداری ساڵی (١٩٧٠)دا بڕیار درا، کە هەموار کردنی دەستووری کاتی بەم شێوەیە بکرێت: (گەلی عێراق لە دوو نەتەوەی سەرەکی پێکدێت کە کوردو عەرەبن)، ماددەی چوارەمیش بەم شێوەیە دادەڕێژرێتەوە کە (زمانی کوردی زمانی ڕەسمیە لە پاڵ زمانی عەرەبیدا لە ناوچە کوردییەکان)، ئەمە دەسکەوتێکی گەورەی شۆڕشی کورد بوو چونکە هەتاوەکو ئەو سەردەمە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دان بە مافی نەتەوەی کوردا نەنرابوو لە چوارچێوەی عێراق، کە هاوشانی عەرەب بێت.

لە (١٦)ی تەمموزی ساڵی (١٩٧٠) دەستوورێکی تری کاتی لەلایەن حیزبی دەسەڵاتدارەوە دەرچوو، لە ڕاستیدا ئەم دەستوورەش مۆرکی عروبە بەتەواوی بەسەریدا زاڵبوو[٢٣٤]، هەروەک لە ماددەی (١٢)ی دەستوورەکەدا هاتبوو:-

أ. سەروەری عێراق یەکگرتووەو پارچە پارچە نابێت.

ب. خاکی عێراق یەکپارچەیەو پارچە پارچە نابێت و دەست لە هیچ پارچەیەکی وڵات هەڵناگیرێت. شۆڤینێزمی عەرەبی لەم دەستوورەدا عێراقی بە بەشێک لە نیشتمانی عەرەب ڕاگەیاندبوو بە نووسراویش پەیتا پەیتا ئەم بۆچوونەیان دووپات دەکردەوە[٢٣٥].

لە ڕاستیدا ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئاداری (١٩٧٠) چوار ساڵ ئاشتی هەندێ دەسکەوتی پەروەردەیی و ڕۆشنبیری بۆ کورد تێدابوو، بەڵام بەعس لە هەوڵەکانی خۆی دەستبەردار نەبوو بەتایبەتی بۆ بە عەرەبکردنی کەرکوک هەر لە ساڵی (١٩٧٠)ەوە بەشێکی زۆری مووچەخۆرانی ناوەندی شاری کەرکوک. بەهۆی گواستنەوەی ئیداری یان هۆکاری سیاسی بۆ باشووری عێراق یاخود شارەکانی تری کوردستان گوێزرانەوەو بە مەبەستی بەعەرەبکردنی ناوچەکە خەڵکی تر لە شوێنیان نیشتەجێکران[٢٣٦]. هەر پاش ماوەیەکی کەم لە مۆرکردنی ڕێککەوتننامەکەی (١١)ی ئاداری نێوان ڕژێم و بزووتنەوەی کورد، نزیکەی ٦٠٠ خانوو لە جێگایەکی گرنگ و ستراتیجی لە بەرامبەر گەڕەکی (ئازادی)و گەڕەکی (ئیسکان)دا، واتا چوار باغی جاران، کە دوو گەڕەکی کورد بوون لە نزیک ڕێگای گشتی نێوان کەرکوک و سلێمانی دروست کران و ناوی لێنرا گەڕەکی (کەرامە). هەروەها ئۆردووگایەکی تانک و زرێپۆشیش هەر لە نزیکی گەڕەکی ناوبراو قوت کرایەوە بە مەبەستی پارێزگاری کردنی دانیشتووانی ئەم گەڕەکە[٢٣٧]. لە ساڵی ١٩٧١ لە دووری یەک کیلۆمەتر لە (گەڕەکی کەرامە)، بە لای باکوورو لەنێوان گەڕەکی ئیسکانی کۆن و ئازادیدا نەخشەی (گەڕەکی موسەننا) کێشرا کە (٥٠٠) خانوو بوو. لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٢) ئەم نەخشەیە جێبەجێ کرا. باروتخانە بەناوبانگەکەی شاری کەرکوکیش تە نیا (٣) کم لەم نیشتەجێکەوە دوورە، لەنێوان (گەڕەکی کەرامە)و (گەڕەکی موسەننا)دا[٢٣٨].

بارزانی سوور بوو لەسەر ئەوەی کەرکوک شارێکی کوردییە هەروەک لە وتەکانیدا زۆرجار دووپاتی دەکردەوە (دە ساڵ بۆ ئۆتۆنۆمی شەڕمان کردووە، ئەگەر پێویست بێ، پێنج ساڵیش بۆ کەرکوک دەجەنگین)[٢٣٩]. بەعس ڕاستگۆ نەبوو لە سیاسەتەکانی بەرامبەر بە کوردو هەر خەریکی پیلانگێڕان بوو. لە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١دا هەوڵی کوشتنی بارزانی درا لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێمەوە.

لە یەکی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٢) عێراق کۆمپانیای

نەوتی خۆماڵی کردو بەم شێوەیە سەرچاوەیەکی گەورەی دارایی دەستکەوت. بەرهەمی خۆماڵی کردنی نەوت بۆ کەرکوك ئەوە بو کە ناوی پارێزگاکە لە دواییدا کرا بە پارێزگای (تەئمیم)(٢٤٠). بە مەبەستی بە عەرەبکردنی شارەکە. لێرەشەوە کێشەکان لەسەر مەسەلەی کەرکوك قووڵتر بوونەوە. هەر لەو ساڵەدا حکومەتی بەعس سەدان خێزانی لە سێزدە گوندی سەر بە پارێزگای کەرکوك دەرکرد کە بریتین لە (حەشیشە، دەڵسی گەورە، دەڵسی بچووك، کومیە، ڕەبعاوە، گرد ڕابیعە، عەتشانە، تەل مەغار، ئەرغوون، سێکانی، کەراکەرە، کەریمیەو سەی محەمەد)(٢٤١).

لە ساڵی (١٩٧٣) حکومەت بە جارێك ١١٨ کرێکاری کوردی لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك دەرکردو لە جیاتی ئەوان کرێکاری ناشارەزای عەرەبی هێناو لە کەرکوکدا نیشتەجێی کردن. جارێکی ترو هەر لە هەمان ساڵدا (٥٠٠) کرێکاری کورد گوێزرانەوە. لە ساڵی (١٩٧٤)یشدا (٥٦) کرێکاری دیکە لەوانەی لە پیشەسازی نەوتدا کاریان دەکرد گوێزرانەوەو عەرەبیان لە جێگا دامەزرێنرا(٢٤٢)، کاتێکیش سەبارەت بەڕاستی دەرکردنی کرێکارە کوردەکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، لە شوباتی ساڵی (١٩٧٤) لە بولگاریادا پرسیارێکیان ئاراستەی بەرپرسێکی باڵای بەعس کرد، بەرپرسەکە زۆر بە ڕاشکاوانە وەڵامی دایەوەو گوتی: (ئێمە لەبەر نەوتی کەرکوك ئامادەین نەك تەنیا کرێکارە کوردەکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بەڵکو هەموو کوردی کەرکوك دەرکەین(٢٤٣). کێشەکان لەو کاتە لەسەر کەرکوك قووڵتر بووەوە چونکە بارزانی داوای ئۆتۆنۆمییەکی دەکرد، کە هەموو ئەو پارێزگایانە بگرێتەوە کە زۆرینەی کوردن، ئەم پێناسەیە پارێزگای کەرکوکیشی دەگرتەخۆ بارزانی (کەرکوکی) وەك (پێیتەخت)ی کوردستان پێشنیار دەکرد.

لەسەر مەسەلەی کەرکوك تا دەهات پەیوەندی بارزانیو پارتی بەعس بەرەو خراپی دەچوو دوا هەوڵو کۆششێك، کە بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆ لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستانو بەعس درا، لە کانوونی دووەمی (١٩٧٤)و سەرەتای ئاداری هەمان ساڵدا بوو. بەڵام لەسەر کەرکوك ڕێککەوتن نەبوو. لە ساڵی (١٩٧٤)دا (٧٠٪)ی نەوتی عێراق لە کەرکوك دابین دەکرا، نرخی کەرکوك زیاتر بەرز ببۆوە، لەو کاتەی گفتوگۆ کردن هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو، لە (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٤)دا حکومەت یەك لایەنە یاسای ئۆتۆنۆمی ڕاگەیاند، مۆڵەتی بە بارزانیدا، کە لە ماوەی دوو هەفتەدا ئەم یاسایە پەسەند بکات(٢٤٤)، بەڵام ماددەکانی ئەم یاسایە مایەی ناکۆکی بوون، چونکە داخوازی کوردی لەمەڕ کەرکوكو ناوەندی دەسەڵاتی تێدا نەبوو. هەر بۆیە بارزانی ئەم یاسایە ڕەتکردەوەو بۆ جارێکی تر شەڕ لە کوردستان هەڵگیرسایەوە لەم شەڕەدا کورد تووشی نسکۆ هات، بەتایبەتی دوای ڕێککەوتننامەی جەزایر لەنێوان ئێرانو عێراق لە (٦)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٥). بەپێی ڕێککەوتننامەکە ئێرانو عێراق لە کۆنفرانسی ئۆپێك لە جەزایر کێشە هەڵپەسێردراوەکانی نێوان خۆیان لەسەر حیسابی کورد چارەسەر کرد. لە بەرامبەردا ئێران یارمەتییەکانی خۆی بۆ بزوتنەوەی کورد ڕاگرت، کە پێشتر یارمەتی دەدا. حکومەتی عێراقیش مۆڵەتی بە هێزەکانی کوردیدا، کە بۆ ئێران بکشێنەوە یان خۆیان بدەن بە دەستەو ە بەم شێوەیە شۆڕش تووشی نسکۆ هات.

لە دوای نسکۆی شۆڕشی کورد حکومەتی عێراق شاڵاوەکانی خۆی بۆ بە عەرەبکردنی کوردستان بە گشتیو کەرکوك بەتایبەتی زۆر زیاترو بەهێزتر دەکات هەروەك لە بەشی داهاتوودا بەوردی لێی دەکۆڵینەوە.

*** بەشی سێیەم: سیاسەتی بەعەرەبکردنی ڕەها لەپارێزگای کەرکوکدا:**

*** یەکەم: سەردەمێکی نوێ لە سیاسەتی بە عەرەبکردن لە دوای ١٩٧٥:**

ساڵانی دوای نسکۆی شۆڕشی کورد لە (١٩٧٥)دا هەڵمەتو سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکوك دەسپێکی لاپەڕەیەکی نوێ بوو، لەم سەردەمەدا ئەم سیاسەتەی بەعس بەرامبەر بە دانیشتووانی کورد لە پارێزگای کەرکوك هەموو سنوورەکانی پێشووی تێپەڕاند. حکومەتی بەعس توانی خواستی لەمێژینەی دەسەڵاتداران لەم بوارەدا بەدی بێنێ، واتە لەنێو بردنی بزاڤی چەکداری کوردو گەڕانەوەی دەسەڵاتی حکومەت بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان بابۆ ماوەیەکی کورتیش بێت. هەر لەوکاتەوە پڕۆژەکانی حیزبی بەعس بۆ کۆنترۆڵکردنی هەموو دەڤەرەکانی کوردستان دەستیان پێکرد. بەم جۆرە سەدام حوسێن بێ پەروا ڕایگەیاند، کە نیازی وایە خەڵکی ناوچەکانی سەر سنووری تورکیاو ئێران ڕاگوێزێ. کەواتە مەسەلەکە لەوە تێپەڕی کە تەنها مەسەلەی لەناوبردنی شۆڕش بێت، مەسەلەکە بووە مەسەلەی بێ دانیشتووان کردنی هەزارەها کیلۆمەتری زەویو پێکهێنانی ناوچەیەکی قەدەغەکراو کە هەرکەسی تێدا دەستگیر دەکرێ، یەکسەر لەناودەبرێ(٢٤٥).

ئەوەی لە کەرکوك ئەنجام دەدرا لە چوارچێوەی هەڵمەتێکی گشتیدا بوو، کە هەموو کوردستانی گرتبووەوە، بەڵام لە کەرکوك زۆر بەربڵاوو سیستماتیکتر بوو. هەر یەکسەر دوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ حکومەتی بەعس دەستی بەسەر دەیان گوندی پارێزگای کەرکوکدا گرت. زەوی وزاری جوتیارو دانیشتووانە کوردەکانی زەوت دەکردو زۆر جار لەسەر زێدی خۆیان بە زۆر ڕادەگوێزران و زەویو زارەکانیان بەسەر هۆزە عەرەبەکاندا دابەش دەکران(٢٤٦).

بیانوی هەمیشەی حکومەت بۆ چۆڵکردنی گوندەکان هەبوونی نەوتو هۆی ئەمنیو ستراتیجی بوو. ئەمەش بەپێی بڕیارێکی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی ژمارە (٣٦٩) بوو کە لە مانگی ئاداری (١٩٧٥)دا دەرچوو. بەپێی ئەم بڕیارە دەست بەسەر (١٣٥٠٢٢) دۆنم زەویو زاری جووتیارانی کوردا گیرا لە ناحیەی دووبز(دبس)و قەزای ناوەندی کەرکوكو ناحیەکانی قەرەحەسەن (لەیلان) و یایچیو قەزای خورماتوو و تازە خوورماتوو. گوندەکانی ناحیەی دووبز (دبس) بریتی بوون لە: (قەرە دەرە، مەرعی، قوشقایە، قوتان، چەخماخە)، گوندەکانی مەرکەزی کەرکوكو

قرە حەسەنیش بریتی بوون لە (ساریتەپەی بچووك، ساریتەپەی گەورە، قەرەلو، لەیلان، تۆقماقلو، یارمجە، یەحیاوە، ترکەشکان، تەرجل، رجیبات) گوندەکانی ناحیەی یایجی بریتی بوون لە (یایچی، جدیدە، شریفیە، هندیە، مەلا عەبدوڵلا). گوندەکانی ناحیەی تازە خورماتووش بریتی بوون لە (تازە، مشرنجە بولاق، زندانە)، گوندەکانی قەزای خورماتووش بریتی بوون لە (شاجوان، توز، کۆکس). شایانی باسە ئەوەی ناوی لێنرابوو قەرەبووشتێکی ئەوتوو نەبوو، بۆ نموونە بۆ هەر دۆنمێك، دوو دینارو پێنج سەد فلس تەرخان کرا بوو، بە مەبەستی جێ بەجێکردنی ئەم بڕیارەش لێژنەیەك پێکهێنرا بە سەرۆکایەتی (ڕوشدی ئاکا) قایمقامی قەزای ناوەندی کەرکوك‌و بە ئەندامێتی (داود سلێمان- بەڕێوەبەری داهاتەکانی پارێزگای کەرکوك و، عەتیە شنداخ - نوێنەری ناوچەی کشتوکاڵی کەرکوك. سەعدون مستەفا سەرۆکی کۆمەڵەی جوتیاران)، لە ئەنجامی ئەو هەنگاوانەدا ئەم ناوچانە هەموو عەرەبنشین کران.

هەر لە هەمان ساڵداو بەمەبەستی هەڵوەشاندنەوەو گۆڕینی سنوورو نەخشەی کارگێڕیی پارێزگای کەرکوك‌و کەمکردنەوەی ژمارەی دانیشتووانی کوردو بەعەرەبکردنی ناوچەکانی ئەم پارێزگایە، بەپێی (مەرسومی کۆماری) ژمارە (٦٠٧) ناحیەی (شێروانە)ی سەر بە قەزای کەلار ناوەکەی گۆڕا بۆ ناحیەی سەر قەڵا (سەر قلعة)و (٢٤) گوند لە ناحیەی شێروانە (سەر قلعە) پەیوەندی کارگێڕییان هەڵوەشێنرایەوەو خرانە سەر ناوەندی قەزای کفری، ناوچەکان بریتی بوون لە (سەر قەڵا - سر قلعە)، ئۆمەر بل، میل قاسمی گەورە، کانی ماران، چوارشاخ، وەلی حەیدەر، فەتاح عومەر، سەید جەژنی، ئیبراهیم خان، میل قاسمی بچووك، درۆزنەی گەورە، درۆزنەی بچووك، ناسالح، یەکە چاڵاوپاشا، کوبان، کاکولی، عەبدولاقوت، زەکی، حاج عەواد، بەکرەشەل، بلکە، کەواچەرمك، دێ بنە، سیدە، شاکەل)(*).

هەر بۆ هەمان مەبەست لە پارێزگاکەدا بەپێی (مەرسومی کۆماری) ژمارە (٦٠٨) کە لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٧٥)دا دەرچوو قەزای چەمچەماڵ‌و کەلار لە پارێزگای کەرکوك دابڕێنران‌و خرانە سەر پارێزگای سلێمانی. هەر بەپێی هەمان مەرسومی کۆماری، بەهەمان شێوە قەزای کفریش لە پارێزگای کەرکوك دابڕێنراو خرایە سەر پارێزگای دیالە ئەم هەنگاوانە بوونە هۆی کەمبوونەوەی بەرچاوی ژمارەی کورد لەم پارێزگایە چونکە ئەم ناوچانە گشتیان ناوچەی کوردنشین بوون[٢٤٨].

ئامانجی ڕژێم لەم کردەوانە چاککردنی بەڕێوەبردن یان بەستنەوەی ناوچە دوورەکانی پارێزگاکە نەبوو بە پارێزگایەکی نزیکترەوە، وەکو لەدەزگاکانی دەوڵەتدا بانگەشەیان بۆ دەکرا. بۆ نموونە، قەزای حەویجە، کە هەر لەپاڵ پارێزگای سەلاحەددین دایەو زۆربەی هەرەزۆری دانیشتووانی عەرەبن، نەلکێنرا بە پارێزگای سەلاحەدینەوە، کەچی قەزای خورماتوو، کە زۆریش لەو پارێزگایەوە دوورە خراوە سەر سەلاحەدین، سەرباری ئەوەی، کە حکومەتی بەغدا دەیویست ژمارەی کورد لەپارێزگای کەرکوك کەم بکاتەوە بەم کارەی، هەبوونی نەوت لە هەندێ ناوچەی خورماتووش یەکێ لە هۆ سەرەکییەکان بوو بۆ ئەم سیاسەتە[٢٤٩].

حکومەتی بەعس لە هەوڵی ئەوە دابوو ناوچە نەوتییەکانی سەر بە پارێزگای هەولێریش بخاتە سەر پارێزگای کەرکوك. بە بیرو ڕای بەعس کەرکوك شارێکی کوردستانی نەبوو بۆیە ناوچە نەوتییەکانی هەولێریش خرانەسەر پارێزگای کەرکوك، بەپێی (مەرسومی کۆماری) ژمارە (٣٢) چەند ناوچەیەکی ناحیەی کەندێناوەی سەر بە قەزای مەخموری هەولێر لکێندران بە ناحیەی دووبز سەر بە پارێزگای کەرکوك ئەوناوچانەش بریتی بوون لە (مەلحەوالی، شەنەغە، دەربەندی سارەلو، گابەرەکە، دڕکەی گەورە، دڕکەی گچکە، چەرت، گێسمە، هەڵاڵە، گەزەوشان، شەحەل، کەنداڵ، سلێمان بەخشیان، داودگورگە، سەرگەڕان، خەڕابە، پەتکانە، خسرۆ بولاقلو، عەولافات، سەربەشاخ، دەربەندی گۆم، قۆچ، لهێبات، خۆشاو، سێقۆچان، قاپلان، جاستان، قەرەبۆتك، دەرماناو)(*).

هەر لەو ساڵەدا خێزانێکی زۆری عەشیرەتی جبور بۆ ئەو گوندانە هێنران‌و لەسەر زەوی‌و زاری کوردەکان جێنشین کران[٢٥٠]. لەم گوندانەش ناحیەیەك پێکهێنرا بە ناوی ناحیەی (قودس) کە ناوەندەکەی (سەرگەڕان) بوو ولکێنرا بە قەزای دووبزەوە[٢٥١].

ڕژێم ویستی بەهەمان شێوە ناحیەی (تەقتەق) ی سەر بە قەزای (کۆیە) ببەستێ بە مەڵبەندی قەزای کەرکوکەوە، چونکە نەوتی تێدا دۆزرابووەوە بۆ ئەم مەبەستەش هەموو گوندەکانی سەر بەو ناحیەی کاولکردو ناحیەکەیشی کردە شارە دێیەکی ئاسایی[٢٥٢].

هەر بەپێی هەمان مەرسومی کۆماری هەندێك ناوچەی ناحیەی (قەراج) ی سەر بەقەزای مەخموری دابڕێندران‌و خرانە سەر ناحیەی دووبزی سەر بە پارێزگای کەرکوك، گوندەکانیش ئەمانە بوون: (پیر مهیدی، قەڵاتە، سۆران بامند، ساردك، هەمین مردی، هەمزە ئاغا، دوازدە هەوار، خازر، جاربردان، کردروە، کراو، کندی بکرە).

هەر بەپێی هەمان مەرسوم چەند ناوچەیەك لە ناحیەی قوشتەپەی سەر بە پارێزگای هەولێر خرانە سەر ناحیەی ئاڵتون کۆپری، کە ئەمیش سەر بە پارێزگای کەرکوك بوو ئەمانەش(ساری چەمی بچووك‌و ساری چەمی گەورە) بوون[٢٥٣]. لە دواتریشدا دانیشتووانی ئەم گوندانە کۆچیان‌و پێکراو، ناوچەکانیان عەرەبنشین کرا.

حکومەتی بەعس بە مەبەستی زیاتر شێواندنی باری کارگێڕی پارێزگای کەرکوك، بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە (٣٢) ژمارەیەك گوندی قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای سلێمانی قرتاندو لکاندنی بە ناحیەی قەرە حەسەنی سەر بە پارێزگای کەرکوکەوە کە ئەمانیش (گورگی خان، ساتی، سەیدان، واستی، سەیدانی سەروو، قەرە وەیس) بوون[٢٥٤].

هەر بە مەبەستی بە عەرەبکردنی پارێزگای کەرکوك ڕژێمی بەعسی لە ساڵی (١٩٧٦)دا بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە (٤١) بڕیاری دا پارێزگایەك دروست بکات بەناوی پارێزگای (سەلاحەدین) کە ناوەندەکەی شاری تکریت بوو

**چەند قەزایەکی لە خۆ گرت، کە ئەمانەن تکریت، سامەڕا، بەلەد، خورماتوو، کە زۆرینەی دانیشتووانی کورد بوون‌و لە کەرکوک کرانەوەو لکێنران بەم پارێزگا نوێیەوە کە پارێزگایەکی عەرەبنشین بوو.**

**هەر بەپێی هەمان مەرسومو بۆ زیاتر بە عەرەبکردنی کەرکوک ناوی پارێزگای کەرکوک کرا بە پارێزگای (التأميم) کە تەنها دوو قەزای لە خۆ دەگرت کە (قەزای کەرکوک‌و حەویجە بوو)[٢٥٥].**

**ناوەندی قەزای کەرکوک ڕووبەرەکەی (٥٤٢٩) کم$^{٢}$ بوو ڕووبەری حەویجەش (٢٢٧٣) کم$^{٢}$ بوو[٢٥٦]. هەر بەمەبەستی شێواندنی باری کارگێڕی‌و بەڕێوەبەرێتی کەرکوک ڕژێمی بەعس بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە(٢٥٦) بڕیاری دا ناحیەی داقوق لە قەزای خورماتووی سەر بە پارێزگای سەلاحەدین بپچڕێنێت‌و بیلکێنێت بە ناوەندی پارێزگای کەرکوکەوە[٢٥٧].**

**هەر بەهەمان شێوە ڕژێم نۆ گوندی ناوچەی (پالانی)ی سەر بە ناحیەی (قەرەتەپە)ی بەست بە ناحیەی (جەلەولا)ی سەر بە پارێزگای دیالەوەو دانیشتووە کوردەکانیان کۆچ پێکرد بۆ پارێزگای ئەنبارو خەڵکێکی عەرەبی لە خێڵی (کەڕەوی) هێناو لەو گوندانە دا نیشتەجێی کردن. ڕژێم هەر بەوە وازی نەدەهێنا، کە خێڵی عەرەبی لە پارێزگاکانی ناوەڕاست‌و باشوورەوە بهێنێت‌و لە کەرکوک دایانبمەزرێنێت‌و زەوی‌و زاریان بەسەردا دابەشبکات‌و بەرژەوەندی زۆریان بداتێ‌و چەکیان بداتە دەست، بەڵکو سەدان گوندی کوردو هەندێ مەڵبەندی ناحیەی کوردیشی ڕووخاند کە لەتوانایدا نەبوو ئاسایشیان دابین بکات‌و عەرەبیان تێدا نیشتەجێ بکات. ڕژێم کۆچی بە دانیشتووانی ئەم گوندو ناحیانە کردو بردنی بۆ کۆمەڵگا زۆرە ملێکان، کە لەمەڵبەندی هەندێ قەزاو ناحیە لە پارێزگای تر بۆی کۆکردبوونەوەو ناچاری کردن لەو کۆمەڵگایانەدا ژیانێکی پڕ لە مەینەتی بەسەر بەرن. ئەم کۆمەڵگا زۆرە ملێیانە بەلای ڕاگوێزراوانەوە نیمچە گرتووخانەیەك بوو، لەم کۆمەڵگایانەدا ڕادەی هەرە کەمی هۆیەکانی گوزەران‌و پێداویستییەکانی ژیان دابین نەکرابوون[٢٥٨].**

**لە هەمان کاتداو هاوتەریب لەگەڵ ئەم کردەوانە دەسەڵاتی بەعس لەسەر پرسەکانی تریش کاری دەکرد. لە ساڵی (١٩٧٣) دا حکومەتی عێراقی بانگێشتی کۆمپانیای (دۆکسیادیس Doxiadis)ی نێودەوڵەتی کرد، کە کۆمپانیایەکی یۆنانی بوو بە مەبەستی دانانی ماستەر پلانێك بۆ شاری کەرکوك لەژێر پەردەی ئاوەدانکردنەوەو نۆژەنکردنەوەی شاری کەرکوك بۆ ٢٥ ساڵی داهاتوو.**

**ئامانجی ماستەر پلانەکە کەمکردنەوەی چڕیی گەڕەکەکانی ناو شارەکەو ڕێکخستنیان بوو. بۆ ئەم مەبەستە نەخشە کێشرا بۆ دروستکردنی ژمارەیەك گەڕەك لە بەشی باشووری شارەکەو دانانی پلانێکی فراوان بۆ نۆژەنکردنەوەی ناوچەی قەڵای کۆن.**

**حکومەتی عێراقیش لەلایەن خۆیەوە لیژنەیەکی هەمەلایەنی، کە پێکهاتبوو لەئەندازیاران‌و ئابووری ناسان‌و ئامارناسانی عێراق بۆ هەماهەنگی کردن لەگەڵ کۆمپانیای (دۆکسیادیس) دامەزراند، ئەو پلانە بە کورتی ئامانجی دروستکردنی چەند گەڕەکێك‌و فراوانکردنی شارەکە بوو بەرەو ئاراستەی باشووری، مەبەستی ئەوەبوو، کە قەڵا دووبارە جێنشین بکاتەوەو ژمارەیەك گەڕەکی کوردنشین تێکبدات، کە کەوتبوونە بەشی ڕۆژهەڵاتی شارەکە، بەتایبەتی گەڕەکەکانی (شۆڕیجە، موسەڵلا، ئیمام قاسم، ئازادی، ڕەحیماوا)، نەخشەیان بۆ کێشرابوو کە تێکبدرێن‌و شوێنەوارەکانیان بکرێت بە یاریگایەکی گەورەو ژمارەیەك باڵەخانەی گشتی[٢٥٩].**

**ئەم کۆمپانیایە لە کاتی کارکردنیدا بۆی ڕوون بۆوە کە حکومەتی عێراقی هەوڵدەدات جوگرافیایەکی نوێ بۆ شاری کەرکوك دروست بکات. کەرکوك شێوازێکی ئەوتۆ وەرگرێت کە گەڕەکە کوردنشینەکان‌و تورکمان نشینەکان بکەونە سەنتەرێك‌و دەور بدرێن بە زنجیرەیەك گەڕەکی عەرەبنشین[٢٦٠]، ئەم پیلانە لە ڕێگەی هێنانی عەرەبە هاوردەکان بوو بۆ شاری کەرکوك دەبوایە جێ بەجێ بکرێت.**

**حکومەت بە مەبەستی جێ بەجێ کردنی پیلانەکەی، پرۆسەی بەعەرەبکردنی لەناو شاری کەرکوکدا گەیاندە چڵە پۆپەی. دەیان یەکەی نیشتەجێی بۆ عەرەبە هاوردەکان دروستکرد. بەتایبەتی لەم بەرو ئەو بەری شارێکاندا. وەکو ئەوەی نێوان کەرکوك-دووبز، کە زیاتر لە (١٠٠٠) خانوو دروستکرا بۆ کرێکارانی کارگەی غازو کبریت‌و پاڵاوتنی نەوت. کە پێیان دەوترا (خانووەکانی عەمەل شەعبی) و ئەو کرێکارە عەرەبانەیان تێدا نیشتەجێ دەکرا کە لە شوێنی کرێکارە کوردە ڕاگوێزراوەکان دادەمەزرێنران. هەر لەسەر هەمان ڕێگا کۆمەڵە خانوویەکی تر بەناوی (گەڕەکی ئەفسەران) دروستکرا، دواتریش زیاتر لە (٨٠٠) خانوو لە (تسعین)ی کۆن بە ناوی گەڕەکی بەعس (حي البعث) دروستکراو عەرەبیان لێ نیشتەجێ کرا. زیاتر لە (١٥٠) خانوو بەناوی گەڕەکی واسیتی (حي الواسطي) دروستکرا، هەر لە هەمان ناوچەدا زیاتر لە (٤٥٠) خانوو بەناوی خانووەکانی هێڵی شەمەندەفەرەوە (دور السكك) دروستکران.**

**هەروەها زیاتر لە (١٠٠) خانوش بە ناوی گەڕەکی سۆشیالیزم (حي الاشتراكية) دروستکراو گەڕەکێکی تریش بە ناوی گەڕەکی غەرناتە (حي غرناطة) دروستکرا، کە (١٦٠٠) خانووی لەخۆدەگرت.**

**لە سەر ڕێگای کەرکوك- لەیلانیش زیاتر لە (١٠٠٠) خانوو بە ناوی گەڕەکی حەجاج (حي الحجاج) دروستکران. هەر لە ناو شاری کەرکوك (١٥٠٠) خانوو دروستکران بە ناوی گەڕەکی عروبە (حي العروبة)و (٣٠٠) خانوو بە ناوی گەڕەکی یەکێتی (حي الوحدة)، (١٥٠) خانوو بەناوی گەڕەکی ئازادی (حي الحرية)، خانووەکانی ئەفسەران (حي الضباط) کە لە (١٠٠) خانوو پێکهاتبوو.**

**لە دواتریشدا گەڕەکی پۆلیس (حي الشرطة)و گەڕەکی قوتەیبە (حي قتيبة)ش دروستکران[٢٦١]. هەڵبژاردنی ناوی ئەم گەڕەکانە لەلایەن کاربەدەستانی بەعسەوە لەسەر**

بنەمایەکی ناسیۆنالیستی توندڕەو ڕەگەزپەرستی بوو چونکە هەموویان ئاماژەیان بەسەرکردە عەرەبەکان و دروشمەکانی حیزبی بەعس دەکرد. مەبەست لەم نێوانە ئەوە بوو، کە ڕووخسارێکی عەرەبیانەی تەواو بە پارێزگای کەرکوک ببەخشێت و مۆرکی کوردستانێتی بسڕێتەوە، کارەکە لە ئاستی شاری کەرکوکدا نەمایەوە بەڵکو گوندەکانیشی گرتەوە کە بەپێی فەرمانی پارێزگای کەرکوک ئەنجام دەدرا، بەپێی بڕیاری ژمارە (١١٩٤٤)ی فەرمانی (ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوک) ناوی گوندەکانی سەر بە ناحیەی (قەرە حەسەن) ی پارێزگای کەرکوک بەم شێوەیە گۆڕدران:

| ناوی ڕاستەقینە | ناوی گۆڕدراو |
|---|---|
| شرنجە بولاق | یەرموک (الیرموک) |
| زندانە | نەسر (النصر) |
| یارمجە | جەدە (جدە) |
| قرەلو | میقدادیە (المقدادیة) |
| ساری تەپەی گەورە | ڕازی (الرازي) |
| ساری تەپەی بچووک | سیناء (سینا) |
| ساری تە پەی یونس | وەلید (الولید) |
| ڕجیباتی سەروو | موتەنەبی (المتنبي) |
| ڕجیباتی خواروو | کیندی (الکندي) |
| توقما قلوو | خەنسا (الخنساء) |
| تەرجل | قادسیە (القادسیة) |
| پەنجا عەلی | ئەبو محجن ئەلسەقەفی[٢٦٢] |

سەرەڕای دروستکردنی ئەو هەموو نشینگەیە و عەرەب جێنشینکردنیان چەندین نەخشە و پرۆژەی تریان لە ناوجەرگەی شارەکە دا بە تایبەتی لەناو گەڕەکە کوردەکاندا جێبەجێکرد.

هەروەک لە گەڕەکی شۆڕیجە نزیکەی (١٠٠) خانوو تێکدراو زیاتر لە (٥٠٠) کەس بێ جێگاو شوێن مانەوە، ئەم کارە لەژێر ناوی کردنەوەی شەقامێکی فراوان بوو، کە شۆڕیجەی کەرت کرد. لەنێوان موسەڵلاو قەسابخانەی کۆندا (٤٠٠) شوقەیان بەسەر ماڵە عەرەبەکان دا دابەشکرد و هەر ماڵێکیش (١٠) هەزار دیناریان دەدانێ، مەرجی حکومەت بەرامبەر ئەو هەموو یارمەتیە ئەوە بوو، دەبوایە عەرەبە هاوردەکان شوێنی ناونووسین و جێگای لەدایکبوونیان بۆ کەرکوک بگۆڕن.

ئەم هەنگاوەی بەعس یەکێک بوو لە هەنگاوە مەترسیدارەکان بۆ بە عەرەبکردنی شارەکە و ئەمڕۆ بووەتە کێشەیەکی فرەڕەهەند، کە دوا ڕۆژی کەرکوکی خستووەتە ژێر پرسیارەوە.

هەروەها میری(٢٠٠) پارچە زەوی نشینگەی لە گەڕەکی ئیمام قاسم کە گەڕەکێکی کوردییە دابەشکرد بەسەر کۆمەڵانی عەرەبداو هەریەکەیان(١٠)هەزار دیناریشی پێدان، سەرەڕای ئەوەی قەرزی بانکی عەقاریشیان دەدرایە بۆ ئەوەی زەوییەکەی پێبکەن بە خانوو (٢٢٠) خانووی تریش دروستکران لەنێوان گەڕەکی ئازادی و شۆڕیجەداو ناوی لێنرا گەڕەکی خانووی ئەمنەکان (دور الأمن)[٢٦٣].

دەسەڵاتدارانی بەعس لە کەرکوک هەر بەوە نەوەستان، کە ئەو هەموو خانووەیان بۆ عەرەبی هاوردە دروستکرد، بەڵکو بە بیانووی هەمە جۆر کەوتنە ڕووخاندنی گەڕەکە میللییەکان بە تایبەتی گەڕەکە کوردییەکان، کارەکانیان بەناوی ئاوەدانکردنەوەو پەرەپێدان و جوانکردنی شارەکەو کردنەوەی ڕێگەو بانی تازەو کردنەوەی فەرمانگەی حیزبی و ئەمنی ئەنجام دەدان.

لەم بوارەدا ئەو شەقامەی، کە بەنێو گەڕەکی شۆڕیجەدا تێپەڕی باشترین نموونەیە بۆ وێرانکردنی زۆرترین خانووبەرەی دانیشتووانی کوردو ناچار کردنیان تا بۆ گەڕەکەکانی ترو دەرەوەی کەرکوک، بار بکەن.

هەر بەمەبەستی پەیڕەوکردنی پرۆسەکە ڕژێم لە ناحیەی پردێی سەر بە پارێزگای کەرکوک لە ساڵی (١٩٧٦)دا ئۆردوگای (کتکە)ی دروستکرد، کە (٧٠) خانووی دەگرتە خۆ. هەر لە هەمان ساڵدا ئۆردوگای (گورزەیی)یشی لەگەڵ (٤٠) خانوودا دروستکرد.

ڕژێم ئەم ئۆردوگا گەورە گەورانەی لە زەوی و زارێکی کشتوکاڵیدا دروست دەکرد، کە زۆر بەپیت بوون و زەوییە کشتوکاڵییەکان هی جوتیارە کوردەکان بوون و ئەم ئۆردوگایانە بوونە مایەی وێرانکردنی چەندین گوندی کوردی، کە جووتیارانی کوردی تیایدا دەژیان[٢٦٤].

لە ناوەڕاستی ساڵانی حەفتاوە ڕژێم دەستی کرد بە بەعەرەبکردنی هەندێ گوندی سەر بە قەزای (خورماتوو) دواتر بڕیاری ڕووخاندنی بەشی زۆریانیدا چونکە نەیدەتوانی پارێزگاریی لەو عەرەبانە بکات کە هێنابوونیە ئەم ناوچەیە. باری ئەمنی ڕێگر بوو لە بەردەم جێگیر بوونی ئەم عەرەبە هاوردانە[٢٦٥].

پرۆسەی بەعەرەبکردن پانتاییەکی فراوانی گرتبووەوە، کە ئەمڕۆ پێیان دەڵێن ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە بۆ نموونە قەزای (خانەقین) بەدوور نەبوو لە پەیڕەوکردنی ئەم پرۆسەیە تیایدا، تەنها لەنێوان ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٦ (١٥٤) گوند تێکدرا کە (٤٩٠٣٥) کەس تیایدا دەژیان، ئەمانە هەندێکیان ڕاگوێزران بۆ ناوەڕاست و باشووری عێراق و هەندێکی تریشیان لە کۆمەڵگە زۆرەملێکانی کەلار و پێباز و دەربەندیخان گیرسانەوە.

لە ناحیەی مەیدان (٤٢) گوند وێرانکران و لە ناحیەی قورەتوو(٦٨) گوندو لە ناحیەی جەلەولا (١٤) گوند، لە هەمان کاتیشدا ناوچەکانیان عەرەب نیشینکران[٢٦٦].

لە ساڵی (١٩٧٦) ڕژێمی بەعس لە ناحیەی (داقوق)دا چەند ئاواییەکی دروستکرد کە بریتی بوون لە ئاوایی (یافا) لە نزیک گوندی (ئەلبوسەباح-البو صباح) کە نزیکەی (٣٠٠) خێزانی عەرەبی تێدا نیشتەجێ کرد. و ئاوایی (ئەلمەساولە) لە نزیک خورماتوو، کە جێگای بۆ (٥٠٠) خێزانی تری

عەرەب تێدا ئامادەکردبوو، ناوایی (ئەلعەسریە-العصریة) ی دروستکرد لە (٤٨٠) خانوو پێکهاتبوو لە نزیك گوندی (هەفتەغار)و چەند خێڵێکی عەرەبی تێدا نیشتەجێ کرد[٢٦٧]. ناحیەی قەرەهەنجیریش بەهەمان شێوە بە عەرەبکراو لە ساڵی (١٩٧٧)دا (٤٠٠) ماڵی عەرەب بۆ مەرکەزی ئەم ناحیە هێنا بە مەبەستی بە عەرەبکردنی[٢٦٨].

لەگەڵ ئەو هەموو مەینەتیانەدا بە بەعسکردنیش کێشەکانی قووڵتر دەکردەوە، هەر لەدوای نسکۆی شۆڕش، حکومەت دەستی کرد بەوەی، کە زۆرترین ژمارەی کورد بکات بە بەعسی. ئەم شاڵاوە بە تایبەتی لە ڕیزەکانی خوێندکاران و لاوان و مامۆستایاندا، بە ڕادەیەکی زۆر پیادەکرا، ئەو هەوڵانە لەلایەك هەڕەشەو تۆقاندن و لە لایەکی تریشەوە لە خشتەبردن و پاداشتیان لەگەڵ دابوو، هەروەها هەوڵێکی زۆر لەگەڵ ئەوانە درا، کە لە دوای نسکۆی شۆڕش تەسلیم بووبوونەوە تا ببن بە بەعسی[٢٦٩].

ئەم سیاسەتە لە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان بەردەوام دەبێت و شێوازی توندترو بەربڵاوتر بەخۆیەوە دەبینێ، مەبەست لەم سیاسەتانە کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد بوو لە پارێزگاکەدا، وەکو هەنگاوی یەکەم لە ڕێگەی پاکتاوکردنی کەرکوك لە دانیشتووانی کورد بەیەکجاری وەکو لەباسی دا هاتوودا تیشکی دەخەینە سەر.

*** دووەم: سیاسەتی بە عەرەبکردن لە کەرکوك کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان:**

لە کۆتایی حەفتاکاندا سیاسەتی بە عەرەبکردن زۆر بە ڕوونی و بەئاشکرا پەرەی سەندو ئەنجامەکانی بە دەردەکەوتن و سیمای پارێزگاکە گۆڕانی تەواوی بەسەردا هات. بەهۆی هێنانی ئەو ژمارە زۆرەی عەرەبەوە بۆ پارێزگای کەرکوك تا سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧) ڕێژەی عەرەب بەشێوەیەکی بەرچاو هەڵکشاو لەم سەرژمێرییەدا بەزەقی خۆی دەنواند. هەر چەندە ئەم سەرژمێرییە لە بارودۆخێکی نائاساییدا ئەنجام دراوە، چونکە لە ساڵی (١٩٧٦) سەرلەنوێ بزاڤی چەکداری لە کوردستان دەستی پێکردەوەو ڕژێم لە بەر باری ئەمنی و نائاسایی کوردستان، تیمەکانی ئامار کردنیان نەدەناردە ئەو شوێنانەی دوورە دەست بوون، یان مەترسی هەبوونی هێزی پێشمەرگەی لێبوو[٢٧٠]. لەلایەکی تریشەوە کاتێ لە ساڵی (١٩٧٧) سەرژمێری دەستپێیکرد، پارێزگای کەرکوك پارچە پارچە کرا بوو هەروەك لە مەوپێش باسمان لێوەکرد. لە (٢٢) یەکەی کارگێڕی تەنها (١٣) یەکەی سەر بە کەرکوك مابووەوە کە بەسەر سێ قەزا دابەش کرا بوون کە ئەوانیش: قەزای ناوەندی کەرکوك و دووبزو حەویجە بوون[٢٧١].

ئەو ناوچانەی کە لێشی دابڕابوون بریتی بوون لەو ناوچانەی کە بەشێوەیەکی گشتی کورد نشین بوون ئەمانیش (کفری، کەلار، چەمچەماڵ، خورماتوو) بوون. هەموو ئەمەش بەمەبەستی کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد بوو لە پارێزگاکەدا وەکو دەزانرێ لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)دا ڕێژەی کورد (٤٨,٣٪) بوو، بەڵام لە سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧) ئەم ڕێژەیە دادەبەزێت بۆ (٣٧,٦٪). لە هەمان کاتدا ڕێژەی عەرەب کە لە سەرژمێری (١٩٥٧)دا تەنها (٢٨,٢٪)[٢٧٢]، ئەم ڕێژەیە لە سەرژمێری (١٩٧٧)دا بەرزدەبێتەوە بۆ (٤٣٪)[٢٧٣].ئەم بارە تەنها دانیشتووانی کوردی ئەو پارێزگایەی نەگرتەوە بەڵکو ڕێژەی تورکمانیش لە کەمبووەوەدا بوو، لە کاتێکدا لە ساڵی (١٩٥٧) ڕێژەیان (٢١,٥٪)ی دانیشتووانی ئەم پارێزگایەی پێکدەهێنا، دەبینین لەسەرژمێری (١٩٧٧)دا ئەم ڕێژەیە نزم دەبێتەوە بۆ (١٩٪)ی کۆی گشتی دانیشتووانی پارێزگای کەرکوك[٢٧٤].

لەسەر ژمێری ساڵی (١٩٧٧)دا بەعەرەبکردنی ئەم پارێزگایە بە شێوەیەکی ئاشکرا بەرچاو دەکەوێت، ڕێژەی ئەوانەی لە پارێزگای کەرکوك لەدایك ببوون (٧٨,٩٪). ڕێژەی ئەوانەش کە لەپارێزگاکانی تر هاتوونەتە دونیاوەو دانیشتووانی ڕەسەنی شارەکە نەبوون بەڵام لە شارەکە دا دەژیان و نیشتەجێبوون بەم شێوەیە بوو:(٢,٩٪) پارێزگای بەغدا، ٢،٤٪ پارێزگای موسڵ، (٢,٤٪) پارێزگای سەلاحەددین، (١,٩٪) پارێزگای دیالە، (١,٤٪) پارێزگای زیقار، ٠،٩ ٪ قادسیە، ٠،٨ ٪ لەدایکبووی پارێزگای بەسرە بوون، (٠,٧٪) پارێزگای بابل، (٠,٧٪) پارێزگای واسیت،(٠,٦٪) پارێزگای ئەنبار، (٠,٦٪) لە پارێزگای میسان، (٠,٤ ٪) پارێزگای نەجەف، (٠,٣٪) پارێزگای موسەننا بوون و (٠,٣٪) پارێزگای کەربەلا بوون.

ڕێژەی ئەوانەی لە پارێزگا کوردنشینەکان هاتبوونە دونیاوەو نیشتەجێی کەرکوك بوون بە هەرسێ پارێزگاکەوە (٣,٧٪) بوو، ئەمانەش زۆربەیان خەڵکی ئەو ناوچانەبوون، کە لە کاتی خۆیدا سەر بە کەرکوك بوون وەکو پردێ و چەمچەماڵ و کەلار کە بەم شێوەیە بوو: هەولێر (١,٧٪) سلێمانی (١,٧٪) دهۆك، (٠,٣٪) لەکاتێکدا ڕێژەی ئەوانەی لە ناوچە عەربنشینەکان هاتبوونە دونیاوەو لە کەرکوکدا نیشتەجێ بوون (١٦,٧٪)ی تێکرای دانیشتووانی کەرکوك بوون[٢٧٥].

وردبوونەوە بۆ ڕێژەی ئەوانەی لە ناوچە عەرەبنشین و کوردنشینەکان هاتبوون و لەم پارێزگایەدا جێگیربوون ئەوە دەردەخات، کە ڕێژەی هاوردەی عەرەب و هاتنی عەرەب بۆ پارێزگاکە پێنج بەقەد ڕێژەی کورد بووە کە هاتوونەتە ئەم پارێزگایە، هاتنی ئەو ژمارە زۆرەی عەرەب بۆ پارێزگاکە بە هەرشێوەو بەهانەیەك بوو بێت، وەك ئاشکرایە مەبەستی شاراوەی لە دوواوە بووە کە ئەویش خۆی لە بە عەرەبکردنی پارێزگا کەدا دۆزیوەتەوە.

بەپێی ئەم سەرژمێرییە ڕێژەی ئەوانەی لە بنەڕەتدا خەڵکی پارێزگاکەن و لە پارێزگاکە دا دەژین (٦٨,٥٪) بوون، ئەوانەی بەر لە ساڵی (١٩٦٧) هێنراون بۆ ئەم پارێزگایە ڕێژەیان (٨,٥٪) بووە لە تێکرای گشتی دانیشتووانی پارێزگاکەو ئەوانەی لەنێوان ساڵانی ١٩٦٧-١٩٧٢ هێنرانە ئەم پارێزگایە ڕێژەیان (٤,٢٪)ەو، لەنێوان ساڵانی ١٩٧٢-١٩٧٤ ئەم ڕێژەیە بەرز دەبێتەوە بۆ (٤,٩٪)، هەرچەندە ئەم ماوەیەی دوایی دەمی ئاشتی ڕێککەوتنامەی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) بوو، بەڵام بەرزبوونەوەی ڕێژەی عەرەبی هاوردە

بەڵگەیە لەسەر بەردەوامی پرۆسەی بەعەرەبکردن و نیازی حکومەتی بەعس لە جێ بەجێنەکردنی ڕێککەوتنامەکەدا. ئەم ڕێژەیە لەنێوان ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٧ بە شێوەیەکی وا بەرز دەبێتەوە هەموو سنوورەکان دەبەزێنێت و تەنها لەم سێ ساڵەدا سێ بەقەد خۆی ئەم ڕێژەیە بەرز دەبێتەوەو دەگاتە (١٢,٦٪). ئەوەی جێگای تێبینی کردنە بەر لە ساڵی (١٩٦٧) ڕێژەی هاوردە بۆ شارەکە تەنها (٨,٥٪) بوو کە چی تەنها لە سێ ساڵدا (١٩٧٤-١٩٧٧)دا ئەم ڕێژەیە بەرز دەبێتەوە بۆ (١٢,٦٪). ئەمەش ئەوە دەردەخات، کە ڕژێم چەندێ بەتەنگ بەعەرەبکردنی ئەم پارێزگایەوە بووەو هەوڵی بۆ داوەو کاری باشی بۆ کردووە.

هەروەك لە مەو بەر ئاماژەمان بۆ کرد بەر لەم سەرژمێرییە ناوچە گشتییە کوردنشینەکان لەم پارێزگایە جوێکرابوونەوەو ناوچەی گشتی عەرەبنشینی پێوەلکێنرابوو پارێزگاکە تەنها سێ قەزای دەگرتە خۆ: قەزای ناوەندی کەرکوك لە مەرکەزی قەزاکەو پێنج ناحیە پێکهاتبوو. ناوەندی قەزای کەرکوك (٦٣,٤٪) ی دانیشتووانی پارێزگاکەی پێکدەهێنا، ناحیەی قەرەحەسەن (٤,٤٪)، ناحیەی داقوق (٤,٢٪)، ناحیەی شوان (٣,٤٪) ناحیەی یایچی (٣,٤٪)، ناحیەی تازە خورماتوو (٣,٠٪)، قەزای حەویجە لە ناوەندی قەزاکەو دوو ناحیە پێکدەهات ناوەندی قەزاکە ٤,٤٪ و ناحیەی، ڕیاز (٣,٦٪)، ناحیەی عەباسی (٢,٥٪)، قەزای دووبز لە ناحیەی دبس و ناحیەی پردێ (ئاڵتون کۆپری) پێکهاتبوو. ناحیەی دبس (٤,٦٪)، ناحیەی پردێ (ئاڵتون کۆپری) (٣,١٪) بوو[٢٧٦].

هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد ئەو قەزاو ناحییانەی ژمارەی کوردیان زۆر بوو لە پارێزگای کەرکوك جیاکرانەوەو قەزا عەرەبنشینەکانیان پێوەلکان، هەروەك سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ گەواهی دەری ئەم ڕاستییەن، بەپێی ئەم سەر ژمێریە بەم شێوەیە بوون:

| قەزا | کورد | عەرەب | فەیلی | تورکمان | هی تر |
|---|---|---|---|---|---|
| چەمچەماڵ | ٪٩٧,٧ | ٪١,٩(*) | - | ٠,٠٣ | ٠,٣ |
| کەلار | ٪٨٥,٣ | ٪١٤,١ | ٠,٠٣ | ٠,٢ | ٠,٣ |
| کفری | ٪٥١,٥ | ٪٤١,٩ | - | ٥,٧ | ٠,٨ |
| توزخورماتوو | ٤٥,٢ | ٪٣٥,٣[٢٧٧] | ٠,٤ | ١٨,٤ | ٠,٥ |

قەزا عەرەبنشینەکان کە بە کەرکوکەوە لکێنرابوون، ڕێژەی پێکهاتەی نەتەوەییان لەم سەرژمێرییە بەم شێوەیە بوو:

| قەزا | کورد | عەرەب | تورکمان | هیدیکە |
|---|---|---|---|---|
| حەوێجە | ٪٤ | ٪٩٥ | ٠,٨ | ٠,٢ |
| عەباسی | ٪٢,٠٩ | ٪٩٧,٨ | ٠,١١ | - |
| ڕیاز | ٪١,٣٧ | ٪٩٧,٢٦ | ١,١٤ | ٠,٢٣ |

لە تەك دابڕینی یەکە ئیدارییەکان لە کەرکوك و ڕاگوێزانی بەزۆری کوردو وێرانکردنی گوندە کوردییەکانی، کە هەموویان فاکتەری گرنگ، بوون، دابەزینی ڕێژەی کوردو هەڵکشانی ڕێژەی عەرەب بوون، لە سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧) دیاریدەیەکی تریش پەیدا بوو کە ئەم پرۆسەیەی قوڵتر دەکردەوە ئەویش ناونووسکردنی ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی کوردو تورکمان بە عەرەب، هەندێکیان بەزۆرو هەندێکی تریشیان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان و خۆ ڕزگار کردن لە ڕاونان و چەوسانەوە. بۆ نموونە لەم سەرژمێرییە دا ڕژێم کوردانی کاکەیی بە عەرەب نووسیوە لەکاتێکدا تا ئەو کاتەو ئێستاش هیچ گومانێك نەبوو لە کورد بوونی کاکەییدا، بەهەمان چەشن کوردانی یەزیدیش لەم سەرژمێرییە دا بەعەرەب لەقەڵەم دراون، لەگەڵ ئەوەشدا لە سنووری قەزای شنگار بەرسیاسەتی ڕاگواستنی زۆرە ملێ کەوتوون و لە ئۆردوگا زۆرەملێیەکاندا کۆکراونەتەوە[٢٧٨]. بەهەمان شێوە کوردانی شەبەك و ئاشووریش بە عەرەب ناونووس کراون[٢٧٩].

لە هەمان سەرژمێریدا شێخانی (بەرزنجە)ش، کە لەهەندێ ناوچەی پارێزگای کەرکوك دەژین بەعەرەب ناونووس کران بەبیانووی ئەوەی ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر پێغەمبەر (د.خ)، بۆ نموونە شێخانی (کرپچنە) لە قادر کەرەم لە سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧)دا خۆیان بەعەرەب نووسیووە[٢٨٠]. لەم سەرژمێرییەدا تەنانەت هەندێ عەشیرەتی کوردیش، کە سەر بە پارێزگای کەرکوکن بەهەموو ئەندامەکانیانەوە بە عەرەب نووسراون و تەنانەت ناوی عەشیرەتەکانیش کراون بە عەرەبی، واتە نەك تەنها ئەندامانی خێڵەکە بە عەرەبکراوە بەڵکو ناوی خودی خێڵەکەش بەهەمان شێوە تەعریب کراوە، هەرچەندە دەبێ دان بەم ڕاستییە دا بنرێ کە ئەم دیاردەیە پێشینەیەکی دوورتری هەیە چونکە بەر لە تەعریبیش هەندێ بنەماڵەی ساڵەیی کە دەهاتنە ناوشار یان دەچوونە بەغدا نازناوەکەیان دەکرد بە (ساڵحی) هەندێك لەوانە دەبوون بە تورکمانی توندڕەو، لەم سەرژمێرییەدا بەشێوەیەکی ڕەسمی ناوی ئەم عەشیرەتە کراوە بە ساڵحی (الصالحي)و شێخ بزێنی کرا بە (حمدانی)[٢٨١]. ئەمانە ناچار کران کە خۆیان بەعەرەب لە قەڵەم بدەن وگوایە لە خێڵی ئەلقەیسی (القيسي) عەرەبین[٢٨٢]. پاڵانییەکانیش لە ئاماری ساڵی (١٩٧٧)دا بە عەرەب ناووس کراون و هەر لە هەمان ساڵدا ڕژێم خەڵکەکەی

ڕاگواستووە بۆ ناوچەکانی خواروو و ناوەڕاستی عێراق[٢٨٣]. لەم سەرژمێرییەدا کوردە فەیلییەکانیش جودا ناوبراون و لەتێکڕای کورد جیاکراونەتەوە[٢٨٤].

لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەدا کەبەعس بۆ بە عەرەبکردنی قەزای ناوەندی کەرکوك دای ژمارەی کورد لەم سەرژمێرییە دا لە قەزای ناوەند لە عەرەب زیاتر بوو، بەم شێوەیە، ڕێژەی کورد (٤٠,٤)٪، عارەب (٣٨,٥)٪، تورکمان (١٩٪)، ئەوانی دی (٢,١٪)، ڕێژەی عەرەب بە ئەندازەی (١,٩٪) لە هی کورد کەمتر بوو.

لەسەرژمێری ساڵی (١٩٧٧)دا دیاردەیەکی تر بە زەقی خۆی نیشان دەدات و پرۆسەی بە عەرەبکردنی شارەکە بەڕوون وئاشکرا دەخاتە بەرچاو، ئەویش ناوی گەڕەکەکانی ناوەندی پارێزگای کەرکوکە، ئەم ناوانە لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)دا بوونیان نەبووە بۆ نموونە گەڕەکی بەعس(حي البعث)، ئەلخەزرا (الخضراء)، ئەلواستی (الواسطي)، یەکی حوزەیران (١ حزيران)، یەکی ئادار (واحد اذار)، گەڕەکی زانایان (حي العلماء)، ئەلحەجاج (الحجاج) مەمدودە (ممدودة)، قادسیەی یەکەم و دووەم (القادسيه ١-٢)، گەڕەکی سەربازی (حي العسكري)، سەرکەوتن (النصر)، گەڕەکی دیل و بێ سەرو شوێنەکان (الاسرى والمفقودين)، دۆمیز (دومين) غەرناتە (غرناطة)، کەرامە (الكرامة)، دوو هەزار خانوو (الفين دار)، ئەلموسەنا (المثنى)، سۆسیالیزم (اشتراكية)، قوتەیبە (قتيبة)، گەڕەکی پۆلیس (حي الشرطة)، گەڕەکی ئەلئەمن (حي الامن)، شوقەکانی گەڕەکی موسەڵلا (شقق حي المصلى)، هێڵی ئاسن (السكك)، گەڕەکی ئەفسەران (حي ضباط)، گەڕەکی عەمەل شەعبی (حي العمل الشعبي)، ئەلڕەشید (الرشيد)، شەهیدەکانی ١٩٨١-١٩٨٢ (الشهداء ١٩٨١-١٩٨٢)، شوقەکانی سەدام حوسێن (شقق صدام حسين)، حەتین (حطين)، نشینگە عەرەب نشینەکانیش بریتی بوون لە (نور، ١٧ تموز، حي الوحدة، حي الحرية، المجزرة، عروبة، حي الاندلس، منصور، المعسكر) کە پێشتر لە ئاماری (١٩٥٧)دا ئەمانە بوونیان نەبوو[٢٨٥].

لە دوای سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ کە مبوونەوەی ژمارەی کورد لە پارێزگای کەرکوك بەشێوەیەکی بەرچاو تێبینی دەکرێت، کاتێ ڕژێم ئەو ئەنجامانەی لە ناو شار بە دەستهێنا، ئەمە زیاتر هانی دا ئیتر گوێ بەهیچ نەداو لەسەر سیاسەتی بەعەرەبکردن و پشت ئەستوور بەداهاتی زۆری نەوت پەرە بەم سیاسەتە بداو مەودایەکی بەربلاو بگرێتە خۆ. هەڵکشانی نرخی نەوت و گەشەکردنی داهاتی دەوڵەتی عێراق لە فرۆشتنی نەوت فاکتەری گرنگ بوو بۆ ئەوەی حکومەت توانای دارایی زۆری هەبێ و زۆرترین ژمارەی عەرەب بێنێتە کوردستان و بەتایبەتی لە کەرکوك جێگیریان بکات. داهاتی نەوت بەشێوەیەکی وا بەرزبۆوە، کە لە کۆتایی حەفتاکاندا، ئابووری عێراق بەهۆیەوە بووژانەوەیەکی باشی بە خۆوە دیت، بەرهەمی نەوت لە (١٩٧٨)دا لە (٢,٥) ملیۆن بەرمیل لە ڕۆژێکدا بۆ (٣,٥) ملیۆن بەرمیل لە ڕۆژێکدا لە (١٩٧٩) زیادی کرد، زیادەکە نزیکەی (٣٠٪) پێك دەهێنا. هەروەها داهاتی نەوت لە هەمان ماوەدا بەڕێژەی (٩٧,٢٪) بەرزبۆوە بەجۆرێ کە لە (١٠,٨) ملیار دۆلارەوە گەیشتە (٢١,٣) ملیار دۆلار[٢٨٦].

هەر لە ساڵی (١٩٧٧)دا لە ناحیەی دووبز ١٠٠ خانوو بەناوی (مەیسەلون) لە نزیك گوندی (چراخ) دروستکراو عەرەبیان تیا نیشتەجێ کرا[٢٨٧].

هەر لەهەمان ساڵدا ڕژێم بە مەبەستی گۆڕینی باری کارگێڕی ئەم پارێزگایە بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە (٦٥٢) قەرەهەنجیری کرد بە ناحیەی ئەلرەبیع (الربيع) و بە قەزای ناوەندی کەرکوکیەوە بەستەوە، ژمارەیەك گوند گرێدران بەم ناحییەوە کە بریتی بوون لە (گورگەیی خان، ساتی، سەیدانی ناوەڕاست، سەیدانی سەروو، بنەی سەروو، بنەی خواروو، کەوەڵە جاف و مەملی، کەوەڵە، زەنگەنە، چیمەنی گەورە، خالۆبازیانی، چیمەنی بچووك، هەیبە، شۆڕیجە، حلفە، قەرەهەنجیر، باشبولاخی، شێخ جیری، ئۆمەڕەگەدە، تەیمەز ئاوا، شێردەرە، قەرەوەیس، قەفار، سوورە دێی خواروو، سوورە دێی سەروو، پیریجان، دەلۆ، گۆران، گولمکەوە، دارییلە مەحمود قاتە، ئاوباریك، بەختەخان، کلاوقوت)[٢٨٨].

کردەوەکانی بەعس لە ساڵی (١٩٧٧)دا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ شێوەیەکی توندتر لەخۆ دەگرن لەو ساڵەدا دەستەی تایبەتی کەرکوك (الهيئة الخاصة في كركوك) لە (٢٧)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٧٧)، بەپێی بڕیاری (١٤٢٦)ی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) دامەزرا. ئەم دەزگایە بوو بەشوێنی ئەشکەنجەدان و لێکۆڵینەوەو بڕیاردان، لەسەر چارەنووسی پێشمەرگەی گیراوو ڕێکخستنەکانی ناو شارو هەموو ئەوانەی گومانی هاوکاری بزووتنەوەی کوردیان لێدەکرا. ڕۆژانە چەندین کەس لەم دەزگایە بڕیاری لەسێدارە دانی دەدراو چەندانی تر لەژێر ئەشکەنجەدا دەمردن[٢٨٩].

لە ساڵی ١٩٧٨، بە مەبەستی بە عەرەبکردنی ناوچەکە ٣٠٠ ماڵە عەرەب هێنران بۆ ناحیەی قەرەحەسەن – لەیلان و نیشتە جێکران لە ناوچەکەدا[٢٩٠]. لە ناحیەی داقوق ساڵی (١٩٧٩) نشینگەی (مهاوش) دروستکرا، کە (٣٠) ماڵی عەرەبی لە عەشیرەتی (عەلگاوین)ی تیا نیشتەجێ کرا[٢٩١]. هەر لە هەمان ساڵدا لەلای کەرکوکی نوێوە، کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای شارەوە، پرۆژەکانی (دوو هەزار) خانووو لە دواتریشدا (چوار هەزار) خانوو دەست پێکران کە یەکەمیان لەلایەن بەڵێندەرانی کەرتی تایبەتەوە جێ بەجێ کراو دووەمیشیان لەلایەن کۆمپانیایەکی بیانییەوە بەجێ هێنرا[٢٩٢].

هەر لە ساڵی (١٩٧٩) داو بە مەبەستی گۆڕینی باری کارگێڕی پارێزگای کەرکوك، بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە (٢٣٣) ناوچەی (عەلی میکائیل) لە قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای سلێمانی کرایەوەو لکێنرا بە ناحیەی ئەلڕەبیع (قەرەهەنجیر)ی سەر بە پارێزگای کەرکوك[٢٩٣]. ڕژێم لەساڵانی (١٩٨٠- ١٩٨٢)، دوو سەد ٢٠٠ پارچە زەوی نیشتەجێی بەسەر کەسوکاری ئەوانەی بە (شەهیدانی قادسیەی سەدام) نێو دەبران دابەش کرد لەسەر ڕێگای کەرکوك و سلێمانی وپارەی زۆریشی پێ دەبەخشین و قەرزی بێ سوودی

عەقاریشی پێدەدان بۆ ئەوەی زەوییەکانیان بکەن بەخانوو، زۆربەی ئەمانەش عەرەب بوون[٢٩٤].

لەو سەردەمەدا ڕەگەزنامەی عێراقی دەدرا بە عێراقییەکان و لێیان دەسێندرایەوە لەسەر بنەمای دڵسۆزییان بۆ ڕژێمی فەرمانڕەوا. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بەعس ماف بەخۆی دابوو ڕەگەزنامەی عێراقی وەرگرێتەوە لە هەر کەسێ یا هاووڵاتییێ تەنها لەبەر ئەوەی ئەو هاووڵاتییە بیرو ڕاو بۆچوونەکانی لەگەڵ ئەم حیزب و ڕژێمەدا ناکۆك بوون[٢٩٥].

لە (٢٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨١) (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) بەسەرۆکایەتی سەدام حوسێن، بڕیاری ژمارە (١٣٩١) سەبارەت بەڕاگواستنی کوردانی دەرکــرد. لەبنەچەدا بڕیارەکە بۆ کوردانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی (لەژێر پەردەی) ئەوانەی کە کاریان نیە ببرێن بۆ ئەو پارێزگایانە، بەندی (١٣) کرێکاران و فەرمانبەرانی کوردو تورکمانی کەرکوکیشی گرتەوە، کە تیایدا هاتووە: لە قۆناغی یەکەمی گواستنەوە فەرمانبەران و کرێکارانی پارێزگای کەرکوك دا، لەپێشینەدا تورکمانەکان و دوایی کوردەکان ئەنجام دەدرێت. لەهەمان مەرسوم دا هاتووە بەپێی ئەم بڕیارە لێژنەیەك پێکبهێندرێت بۆ سەرپەرشتی دروستکردنی خانووبەرە لە پارێزگاکانی (موسەننا، قادسیە، زی قاڕ، ئەنبار) بۆ ئەو کوردو تورکمانانەی کە لە کەرکوك ڕادەگوێزرێن[٢٩٦].

لە ناحیەی داقووق ئاوایییەکی تر لە ساڵی (١٩٨١)دا دروستکرا لەنێوان گوندی (ئەلبوسەباح) و (هەفتەغار) و خێڵی عەرەبی تێدا نیشتەجێ کرا. ئاوایییەکی تریش لە (داقوق) کە پتر لە ٥٠٠ خانووی نشینگەیی تێدایە لە ساڵی (١٩٨٢) دا بۆ عەرەبی دەشتەکی دروستکرا. ئەم ئاوایییە دەکەوێتە نزیك ڕێگای گشتی نێوان کەرکوك و بەغداوە[٢٩٧]. دوو ئاوایی تریش کە لە هەر یەکێکیان دا (١٠٠) خانوو دروستکرا، کە دەکەونە نزیك ئاوایی (ئەلعەسرییە)وە، لە ساڵی (١٩٨٠)ەوە عەرەبی دەشتەکی تێدا نیشتەجێ کرا هەرچی جووتیاری کورد هەبوو لە گوندی (لهێب) هەموو کۆچیان پێکراوە و عەرەبیان لە جێگا دا نیشتەجێ کراون[٢٩٨].

لە سەرەتای هەشتاکاندا سیاسەتەکانی حیزبی بەعس بە شێوەیەك پەرەی سەند کە لە دوای دەرکردنی خەڵکی ئەم پارێزگایە لەسەر موڵك و ماڵی خۆیان و زێدی باو باپیرانیان و خانووەکانیشیان، کە موڵکی تایبەتی خۆیان بوون دەفرۆشران و بەهیچ شێوەیەك گوێ لەگازاندە و داخوازییەکانیان نەدەگیراو ماف قەرەبوو کردنەوەشیان پێ ڕەوا نەبینرا، ئەوەتا لە ساڵی (١٩٨١)دا بەپێی فەرمانی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی ژمارە (١٤٦٩) لە دوای ڕاگواستنی کوردەکان لە خانەقین و جەلەولا لێژنەیەك پێکهێنرا بە سەرۆکایەتی قایمقامی قەزای خانەقین و ئەندامەتی ڕێکخراوی پارتی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی و وەزارەتی دارایی بۆ فرۆشتنی خانووەکانی ڕاگوێزراوان، لە هەمانکاتیشدا بۆ عەرەبەکان هەبوو کە خانووی کوردەکان بکڕن و بیخەنە سەر ناوی خۆیان، وەك ئەوەی کوردەکان دوای دەرکردنیش لە ماڵی خۆیان هەر خاوەن ماڵ و موڵکی خۆشیان نەبووبن[٢٩٩].

بە گشتی هەشتاکان ساڵانێکی سەخت بوون بۆ هەموو کوردستان و بۆ کەرکوك و ئەو ناوچانەی بەر شاڵاوی بەعەرەبکردن کەوتبوون، بەتایبەتی خۆپیشاندانی خوێندکاران لەو شارەدا لە ساڵی (١٩٨٢) وساڵانی دواتر ئەوەندەی تر ڕق و کینەی ڕژێمی بەرامبەر بە کورد ئەستورکرد. هەر لەم کاتەشدا بە بڕیاری (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی ژمارە (٤١٨) لە کورد قەدەغە دەکرێ ببێتە خاوەن زەوی و موڵك لە کەرکوك. کورد تەنها بۆی هەبوو زەوی و خانووبەرەی خۆی، بە عەرەب بفرۆشێت[٣٠٠]. نەك هەر ئەمە بەڵکو دانیشتووانی کورد ماف ئەوەشیان نەبوو خانوو و موڵکەکانیان نۆژەن بکەنەوە. لەم بارەدا کاتێ کوردێك ماڵەکەی وێران دەبوو بەبێ جێگەی ژیان دەمایەوە و ناچار دەبوو یا شار بەجێبهێڵێت یاخود لە گەڕەکێکی تردا خۆی حەشار بدات.

ئەم هەنگاوەش خۆی لەخۆیدا بەعەرەبکردنێکی تری شاری کەرکوك بوو، کوردێکی خەڵکی ناو شارەکە بۆی نەبوو پارچە زەوییەك لە ناو شارەکەی خۆیدا بکڕێت یان خانووەکەی خۆی نۆژەن بکاتەوە لە کاتێکدا ئەو لە دانیشتووانی ڕەسەنی شارەکە بوو بەڵام هاووڵاتییەکی عەرەب کە لە ناوچەکانی تری عێراقەوە بۆ بە عەرەبکردنی ناوچەکە هێنراون بۆیان هەبوو زەوی بکڕن و بیگۆڕنە سەر ناوی خۆیان و پارەیەکی زۆر لە بوودجەی دەوڵەت وەربگرن و خانووەکانیان نۆژەن بکەنەوە کورد وتەنی (ماڵ لە خانە خۆی حەرام کرا).

لە ساڵی (١٩٨٤) بەپێی (فەرمانی کۆماری) ژمارە (٥١٤)، بەمەبەستی زیادکردنی ژمارەی عەرەب لە پارێزگای کەرکوك و لە بەرامبەریشدا کەم کردنەوەی ڕێژەی کورد، ڕژێم ناحیەی (زاب)ی عەرەبنشینی لە قەزای شەڕگاتی سەر بە پارێزگای موسڵ جوێ کردەوە و لکاندی بە قەزای حەویجەی سەر بە پارێزگای کەرکوکەوە، هەڵبەت بەمەش ڕێژەی عەرەب لە پارێزگاکەدا لە بەرامبەر ڕێژەی کورد زیادی کرد[٣٠١].

لە ساڵی (١٩٨٦) بە نووسراوی ڕەسمی ئەوە بەسە رهەموو دەزگاکانی دەوڵەت و حیزبی بەعسدا گشتاندن دەکرا کە هەر هاووڵاتییەکی عەرەب، کە بیەوێ بار بکات بۆ کەرکوك و ناسنامەی کەسێتی خۆی و بنەماڵەکەی بگوازێتەوە بۆ کەرکوك، ئەوا پارچەیەك زەوی و (١٠٠٠٠) دە هەزار دیناری لەلایەن دەوڵەتەوە پێ دەبەخشرێت سەرباری هەموو ئەمانە ئەو کەسانە لە کۆمپانیای نەوت و دەزگاکانی ئەمن و هەواڵگیری و سوپای عێراق و فەرمانگە حکومییەکاندا پلەو پێیەی دیاریان پێدەدرا. ئەم بڕیارانەی حیزبی بەعس و حکومەت و بە دواداچوون و لێکدانەوەی زۆریان نەوێت. مەبەست لەو سیاسەتانە روون و ئاشکرایە و بۆچی ئەم کردەوانە لە کەرکوك و دەڤەرە بە عەرەبکراوەکانی تر دەکران لای هەمووان ڕوونە.

هەر لە ساڵی (١٩٨٦)دا، لە پارێزگای کەرکوك دوو گوند لە ناحیەی پردێ و سێ گوندیش لە ناحیەی قەرەحەسەن ڕاگوێزران و ناوچەکانیان عەرەبنشین کران، لە ناو شاری

کەرکوك خۆشی ۲۰۵ خێزانی کوردی ڕاگوێزران. لەنێوان ساڵانی (۱۹۸۵-۱۹۸۷) (۳٤) گوند لە پارێزگای کەرکوك خاپوورکران[٣٠٢].

هەڵبەتە لایەنە پەیوەندیدارەکان تەنها ڕێگەیان بە بە عسییەکان و دارو دەستەی خۆیان دەدا کە لەم شارەدا نیشتەجێبن و خانوویان بۆ دروست بکرێت. ئەم سیاسەتەشی تەنها بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی کورد لە ناو شارو زیادکردنی ژمارەی عەرەب بوو، هەروەك کوردەکان ئەم عەرەبانە بە عەرەبی هاوردەو عەرەبی دە هەزارو سەد هەزار دیناری ناو دەبەن، ڕژێم لەو سیاسەتەیدا توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و ژمارەی کورد لەم شارەدا کەم بکاتەوەو لەبەرامبەر دا ژمارەی عەرەب بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد بکات، کردەوەکانی ڕژێم ئەوەندە بەربلاو و فرە ڕەهەند بوون و ستراتیژی حیزبی بەعس لەم بوارەدا ئەوەندە لە ئەنجامە کۆتاییەکانی نزیك بۆتەوە، کە ئەوەتا دوای پێنج ساڵ لە ڕاماڵینیشی کێشەی کەرکوك بۆتە پرسێکی ئەوەندە ئاڵۆز، کە چارەسەرکردنی و گەڕانەوەی ماف بۆ خاوەنەکانیان گەلێ ئەستەمە. زۆربەی هەرە زۆری هێزە عەرەبییەکان ئەگەر بە قسەو بلاکراوە ئەم سیاسەتەی بەعس بەخراپیش لەقەلەم بدەن، بەلام زۆربەیان ئامادەنین شوێنەوارەکانی بسڕنەوە.

*** سێیەم :پاکتاوکردنی ڕەگەزی کورد لە کەرکوك وەکو تروپکی سیاسەتی بە عەرەبکردن:-**

پاکتاوکردنی نەژادی هەولێك بوو بۆ گۆڕینی پێکهاتەی باری نەتەوایەتی دانیشتووانی پارێزگای کەرکوك لەلایەن حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقەوە، کە لەسەردەستی حیزبی بەعس گەیشتە تروپك. پرۆسەی بەعەرەبکردن لەسەردەستی (یاسین هاشمی)و (تەها هاشمی) لە ساڵانی (۱۹۳۵-۱۹۳٦) دەستپێیکردو زەوی و زاری بەسەر خێزان و هۆزە خێڵەکییە عەرەبەکاندا دابەشکرد هەروەك لەمەو بەر ئاماژەمان پێکرد. ئەم سیاسەتە بەشێنەیی تا ساڵی (۱۹٦۳) بەردەوام بوو وساڵ لە دوای ساڵ شێوەی بەربلاوترو توندو تیژ تری لەخۆ دەگرت.

لە هەشتاکاندا سیاسەتی پاکتاوکردنی ڕەگەزیی گەیشتە ئاستێکی ترسناك بەتایبەتی دوای ئەوەی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) لە (۲۹)ی ئازای ساڵی (۱۹۸۷)دا بەپێی بڕیاری ژمارە (۱٦۰) دەسەلاتی ڕەهای لە کوردستان و باکووری عێراق بە (عەلی حسەن ئەلمەجید) بەخشی بۆ ئەوەی دۆزی کورد بەو شێوەی حیزبی بەعس دەیویست چارەسەر بکات. بەپێی ئەو بڕیارە ناوبراو بوو بە ئەمینداری گشتی بیرۆی باکووری ڕێکخستنی حیزبی بەعس و نوێنەری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و سەرکردایەتی هەرێمی عێراقی حیزبی بەعس، کە ئەوکات بارەگاکەی (بیرۆی باکووری ڕێکخستنی حیزبی بەعس) لە شاری کەرکوك بوو.

بەپێی ئەم بڕیارە عەلی حەسەن ئەلمەجید هەردوو دەسەلاتی یاسادانان و جێ بەجێکردنی خرایە ژێر دەست[٣٠٣]، بەلکو هەموو دەسەلاتەکانی سەرۆك کۆماری لە کوردستان پێدرا. بەگەیشتنی ئەلمەجید بۆ کەرکوك دەرکەوت کە حکومەتی عێراق بڕیاری داوە (کێشەی کورد بۆ هەمیشەو بەیەکجاری) چارەسەر بکات. بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەش سەرچاوەکانی داهاتی دەولەتی بۆ تەرخان کرابوو[٣٠٤]. هەموو دەزگا حکومی و سەربازی و ئەمنی و جاسوسییەکانی عێراق بەگشتی و ئەوانەی لەکوردستان بوون خرابوونە ژێر دەسەلاتی ڕەهای ئەلمەجیدەوە. ئەم دەزگایانە هەموو دەقی بڕیاری (۱٦۰)ی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشیان) پێگەیشتبوو لەگەڵ ئەوەشدا عەلی حەسەن ئەلمەجید دەستی کرد بە زنجیرەیەك کۆبوونەوەی دوورو درێژ لەگەڵ هەموو دەزگا حکومی و حیزبی و ئەمنی و سەربازییەکانی کوردستان لەو کۆبوونەوانەدا بەڕاشکاوی سیاسەتی حیزبی بەعس و حکومەتی بەرامبەر گەلی کورد بە گشتی و گوندەکان و هێزی پێشمەرگە بەتایبەتی ڕوون دەکردەوە. ئەلمەجید لە کۆبوونەوەو ڕێنماییەکانیدا بە تەواوی ئەوەی خستبووە ڕوو، کە دەبێت گوندەکانی کوردستانی عێراق نەمێنن و خەلکەکەی تەفرو تونا بکرێن[٣٠٥].

لەگەڵ هاتنی عەلی حەسەن ئەلمەجیدا بارودۆخی کوردستان بە گشتی و کەرکوك بەتایبەتی زۆر لەجاران زیاتر بەرەو شەلەژان هەنگاوی نا. بەهۆی ئەو سیاسەتانەی ئەلمەجیدەوە، کە لە ناوچەکەدا پەیڕەویانی دەکرد.

دەتوانین بلێین پارێزگای کەرکوك جۆرێکی تری بەعەرەبکردنی بە خۆیەوە بینی. لە دوای ساڵی (۱۹۸۷)ەوە ئەو کوردانەی، کە لەم پارێزگایە دەردەکران و ناوچەکانیان عەرەبنشین دەکرا پێناسەی کەسایەتیان دەگوازرایەوە بۆ ئەو ناوچانەی کە بۆی ڕادەگوێزران. هەروەك دۆکیومێنت و بەلگە ڕەسمییەکانی دەولەت گەواهی دەدەن، خەلکی دووبزو داقوق و ناو شاری کەرکوك ڕادەگوێزران بۆ هەولێرو هەندێکیشیان بۆ ئەنبارو ناسنامەکانیشیان بۆ ئەو شوێنانە دەگوێزرانەوە کە بۆی دەنێردران بە مەبەستی سڕینەوەی کەرکوکی بوونی ئەمانەو بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد لە ناو پارێزگاکەداو لەبەرامبەریشدا زیاد کردنی ژمارەی عەرەب[٣٠٦].

پاکتاو کردنی ڕەگەزی ناحیەکانی سەر بە پارێزگای کەرکوکیشی گرتەوە، بۆ نموونە ناحیەی شوان (ڕێدار)، کە ژمارەی گوندە کاولکراوەکانی ۷۰ گوند بووو ۲٦٥۰ خێزانی جووتیاریان تێدا نیشتەجێ بوون، لە ساڵانی (۱۹۸۷-۱۹۸۸)دا کۆچیان پێکرا بۆ کۆمەلگا زۆرەملێکانی پارێزگای هەولێر. ئەو جار ڕژێم دەستی کرد بە دروستکردنی سەربازگە بۆ سوپا لە مەلبەندی ناحیەکەو ناوچەکانی دەوروو بەری ئیتر سەرانسەری ناوچەکە بوو بە دەڤەرێکی سەربازی قەدەغەکراوو کەس بۆی نەبوو، هاتوو چۆی تێدا بکات. هەروەها کێلگەو ڕەزەکانی ئەو گوندانە لە خاوەنەکانیان حەرام کراون و هەموو بەر تالان و کاولکاری کەوتن[٣٠٧].

لە ناحیەی لەیلان (قەرە حەسەن)یشدا ڕژێم لە ساڵی (۱۹۸۷)دا خانووی نیشتەجێی بۆ نزیکەی ۳۰۰ خێزانی عەرەب، کە هێنابوونی بۆ ئەم ناحیەیە دروستکردو لەوێدا نیشتەجێی کردن و گوندەکانی ناحیەکەش کە ژمارەیان (٤٥) گوندی گەورەو بچووك بوو، ڕژێم لە ساڵانی (۱۹۸٦-۱۹۸۷-

١٩٨٨)دا هەمووی خاپوور کردن. ژمارەی ئەو خێزانە جووتیارانەش، کە لەو گوندانەدا بوون و بەر ڕاگوێزان کەوتن نزیکەی (٢٤٢٩) خێزان بوون کەناچارکران لە کۆمەڵگا زۆرە ملێکانی چەمچەماڵ نیشتەجێ بن. ناحیەی سەنگاویش کە (٧٠) گوندی لەخۆ دەگرت هەموویان لە ساڵانی (١٩٨٧-١٩٨٨)دا لەگەڵ ناوەندی ناحیەکە وێرانکران. ژمارەی خێزانەکانی ئەم گوندانە (٢٦٤٨) خێزانی جووتیار بوون. لە ناحیەی قادر کەرەم دا ژمارەی ئەو خێزانانەی کە لەناوەندی ناحیەکەو گوندەکانییەوە کۆچیان پێکرا دەگەیشتە (١١٦٩٤) خێزانی جووتیار، کە سەرجەم ئەندامەکانیان دیکردە (٦١٣٩٤) کەس، ئەم کۆچ پێکردنەیش لە ساڵانی (١٩٨٧-١٩٨٨) ئەنجامدرا[٣٠٨]. بەشێك لە دانیشتووانەکەی ڕاگوێزران بۆ ئۆردووگا زۆرەملێکانی چەمچەماڵ- شۆڕش، هەندێکی تریشیان پەرتەوازە بوون. ژمارەی ئەو خێزانانەی کە لە ناحیەی نەوجول کۆچیان پێکرا دەگەیشتە ١٩٦٩ خێزانی جووتیار[٣٠٩]. لە ساڵانی (١٩٨٥-١٩٨٨)دا هەموویان براونە کۆمەڵگا زۆرەملێیەکانی قەزای خورماتوو.

لە ناحیەی (جەبارە)ش (٣٠) گوندی کوردی وێرانکران. ژمارەی ئەو خێزانە جووتیارانەیش کە بە زۆر کۆچیان لەو گوندانە پێکراوە (١٦٣٧) خێزانی جووتیار بوون. ئەمانە هەموویان لە ساڵانی (١٩٨٧-١٩٨٨)دا بە زۆر لە کۆمەڵگای (سمود) لە (کەلاری تازە)و لە کومەڵگای (قەرەتەپە) نیشتەجێ کران.

لە ناحیەی (قەرەتەپە)ش ڕژێم لە ساڵی (١٩٨٨) هەموو گوندەکانی وەك گوندی (گاخۆر، قەرەیەتاخ، عەین فارس)و ئەوانی دی وێران کرد. لە قەزای کەلاریش هەموو گوندەکانی ئەم قەزایە کە (١٦) گوند بوون لە ساڵانی (١٩٨٧-١٩٨٨) کاولکران و خێزانە جووتیارەکانیان ناچارکران بگوێزنەوە بۆ کۆمەڵگای زۆرە ملێی (سمود). ناحیەی تیلەکۆی سەر بە قەزای کەلار دوای تێکدانی گوندەکانی لە ساڵی (١٩٨٧-١٩٨٨) خێزانە کوردەکانی ئەم گوندانەش ڕاگوێزران بۆ کۆمەڵگەی (سمود)[٣١٠]. بەهەمان چەشن و لە هەمان ساڵدا ناحیەی پێباز (باوەنور) گشت ئاواییەکانی کە (٧٣) ئاوایی بوون بە (٢٩) خوێندنگاو (٢٤) مزگەوت و (٢) بنکەی تەندروستیشەوە کاولکران، خەڵکەکەش ناچارکران بگوازنەوە بۆ ئۆردووگای زۆرەملێی (سمود). ناحیەی شێروانە (سەرقەڵا)ش بەهەمان چەشن بە (٢٥) ئاواییەوە خاپوور کراو، خەڵکەکەی بۆ ئۆردووگای زۆرە ملێی (سمود) گوێزرانەوە، ناحیەی قەرەهەنجیریش لە ساڵی (١٩٨٨)دا بە یەکجاری سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی تێدا ئەنجامدراو کرا بەناوچەیەکی بەعەرەبکراو و سەربازی و داگیر کزاو[٣١١].

بە شێوەیەکی گشتی ڕژێم لەنێوان ساڵانی (١٩٨٧-١٩٨٨) (٧٧٩) گوندو (٤٩٣) قوتابخانەو (٥٩٨) مزگەوت، (٤٠) بنکەی تەندروستی لەپارێزگای کەرکوك وێران کردو (٣٧٧٢٦) خێزانی کوردی ڕاگواستووە[٣١٢]. ئەمەش بە مەبەستی شێواندنی باری دیموگرافی پارێزگای کەرکوك و کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد لەم ناوچەیە و ئەو کوردانەی لەم پارێزگایە ڕادەگوێزران لەگەڵ ڕاگواستنەوەکەدا ڕەگەزنامەی شارستانیان دەگوێزرایەوە. لە بەرامبەریشدا لە ساڵی (١٩٨٨) بەپێی بڕیارێکی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) هیچ عێراقییەکی بەڕەگەز عەرەب بۆی نەبوو ڕەگەزی خۆی بگۆڕێت بەهیچ شێوەیەك و لەبەر هەر هۆیەك بێت ئەمانە کە عەرەبن دەبێت هەر بەعەرەبی بمێننەوە، لە خاڵی دووەمی بڕیارەکەشدا هاتووە هەرکەسێ سەرپێچی ئەم بڕیارە بکات بۆ ماوەی ساڵێك بەند دەکرێت[٣١٣].

نەك هەر ئەمەش بەڵکو ڕژێم دەستکاری سەرژمێری (١٩٥٧)یشی کرد بەشێوەیەك کە کلدانی و ئاشورییەکانی شاری کەرکوکیش هەموو بەعەرەب ناونووسکران. شێواندنی تۆمارەکانی سەرژمێرییە کە بە دەستکاری کردنی تۆمارو ناونوسکردنی عەرەبە هاوردەکان بەمەبەستی ئەوەی بە شێوەیەکی ڕەسمیش لە کەرکوك تۆمار بکرێن.

وەك دەسپێك بۆ شاڵاوەکانی ئەنفال حکومەتی بەعس بڕیاری دا سەرژمێرییەکی گشتی دانیشتووانی عێراق بکات. ئەم سەرژمێرییە فەرمییەی حکومەت لەدوای سەرژمێری (١٩٧٧) دێت. ئەمەش بەگوێرەی یاسای عێراق بوو، دەبوو هەر (١٠) ساڵ جارێك سەرژمێری ڕەسمی بکرێت. ئەم سەرژمێرییە واتە (١٩٨٧) لەم سۆنگەیەوە دێت، ئەمە مەبەستی ئاشکرای ئەم سەرژمێرییە بوو، بەڵام لە تێڕوانینمان بۆ مەبەستی شاراوەی ئەم سەر ژمێرییە دەردەکەوێت بەمەبەستی دەستنیشانکردنی ناوچە گوندنشینەکان بووەو خۆ ئامادەکردن بوو بۆ دەستپێکی ئەنفال، هەروەك لەنوسراوێکی (ئیبراهیم محەمەد حەسەن)ی پارێزگاری هەولێر ناسراو بە(ئیبراهیم زەنگەنە) بۆ سەرکردایەتی هۆبەی ئاسایشی هەولێرو سەرکردایەتی پۆلیسی هەولێرو (دەزگای ئاسایشی ڕێکخراوی باکووری) ناردووەو تیایدا هاتووە: (دەبێ لێژنەکانی ئاسایش لە ماوەی ٩/١٦ تا ١٠/١٧ -١٩٨٧ سەرژمێری خێزانی یاخیبووەکان بکەن بۆ ئەوەی یەکسەر دەست بە گواستنەوەیان بکرێت بۆ ئەو ناوچانەی کە کەس و کاری یاخیبووەکانیان لێیە، دەبێ کۆبوونەوەی جەماوەری بۆ ئەم مەبەستە سازبکرێ و باسی گرنگی ئەو سەرژمێرییە بکرێت، کە دەبێت لە ١٠/١٧/ ١٩٨٧ ئەنجام بدرێت. پێویستە گرنگی بەوە بدرێت و بەباشی ئاشکرا بکرێت، کە هەر کەسێك بە شێوەیەکی شیاو (مەعقول) بەشداری لە سەرژمێری نەکات، ناسنامەی عێراقی لەدەست دەدات و بە ڕاکردوو لە قەڵەم دەدرێت). ئەو ڕەفتارەی ڕژێمی سەدام حوسێن زیاتر پەیوەندی بە پلانێکی نەخشەکێشراوەوە هەبوو بۆ لە ناوبردنی گەلی کورد لەوەی، کە سەرژمێرییەکی حکومی ڕەسمی بێت[٣١٤].

لە سەرژمێرییەکەی ساڵی (١٩٨٧)دا بە عەرەبکردنی ئەم پارێزگایە بە ئاشکرا دەکەوێتە بەرچاو. ژمارەی دانیشتووانی پارێزگا کە لە ساڵی (١٩٧٧) (٤٩٥٤٢٥) کەس بوو، لەگەڵ ڕاگواستنی ڕێژەیەکی زۆری کورد لە پارێزگاکە، هەروەك لە مەوبەر ئاماژەمان پێدا، کەچی ژمارەی دانیشتووان بەرزدەبێتەوە بۆ (٦٠١٢١٩). ئەم هەڵکشانەی ژمارەی دانیشتووان دەگەڕێتەوە بۆ پلانی حکومەتی بەعس لە ڕێگەی هێنانی ژمارەیەکی زۆری عەرەبی هاوردە

بۆ پارێزگاکە بە مەبەستی زیادکردنی ژمارەی عەرەب لە پارێزگای ناوبراو[٣١٥].

لەم سەرژمێرییەدا ڕێژەی ئەوانەی لە پارێزگای کەرکوك هاتوونەتە دونیاوە، (٨٤,٤٪)، لە ساڵی (١٩٧٧) ئەم ڕێژەیە (٧٨,٩٪) بوو. ئەم بەرزبوونەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەکۆتایی حەفتاکان ژمارەیەکی زۆر عەرەب هێنران بۆیە ڕێژەی ئەوانەی لە کەرکوك هاتوونەتە دونیا زۆر بووە. لە سەرژمێری ساڵی (١٩٨٧)دا ڕێژەی ئەوانەی لەپارێزگاکانی تر هاتوونەتە دونیاوەو دانیشتووانی ڕەسەنی شارەکە نین بەڵام لە شارەکەدا دەژینو نیشتەجێن بەم شێوەیەن: (٢,٥٪) لەدایکبووی بەغدا، (٢,٣٪) پارێزگای سەلاحەددین، (٢,٠٪) پارێزگای موسڵ، (١,٨٪) بیانین (میسری، فەڵەستینیو عەرەب بەگشتی)، (١,٧٪) پارێزگای دیالە، (٠,٦٪) لەدایکبووی پارێزگای بەسرە، (٠,٥٪) پارێزگای ئەنبار، (٠,٤٪) پارێزگای زیقاڕ، (٠,٣٪) پارێزگای میسان، (٠,٣٪) پارێزگای قادسیە، (٠,٢٪) پارێزگای واسیت، (٠,٢٪) پارێزگای بابلن، (٠,١٪) پارێزگای موسەننا، (٠,٤٪) پارێزگای نەجەف (٠,١٪) پارێزگای کەربەلان، (٠,٤٪) ئیتر ڕێژەی ئەوانەی سەر بە پارێزگا کوردنشینەکان بوونو بەپێی ئەم سەرژمێرە لە کەرکوك نیشتەجێ ببوون، ئەمانەش زۆربەیان خەڵکی ئەو ناوچانە بوون کەلەکاتی خۆیداسەر بەکەرکوك بوون بە هەرسێ پارێزگا کوردییەکە ڕێژەکە(٢,٥٪) بوو کە ئەمیش بەم شێوەیە بوو: سلێمانی (١,٣٪)، هەولێر (١,٠٪)، دهۆك (٠,٢٪)، لە کاتێکدا ئەم ڕێژەیە لە سەر ژمێری ١٩٧٧ (٣,٧٪) بوو[٣١٦].

بە هۆی هێنانی ئەو هەموو عەرەبانەی کە لە پارێزگاکانی باشوورو ناوەڕاستەوە بۆ ئەم پارێزگایە هێنران لە ماوەی (١٠) ساڵی بەر لە سەرژمێرییەکەو بە هۆی زیاد بوونی وەچەی نوێوە ژمارەی لەدایکبوون لەم پارێزگایە بەرز بۆتەوە. ئەوانەی بەر لە ساڵی (١٩٨٠) هێنراون بۆ ئەم پارێزگایە ڕێژەیان (٨,٩٪) ە لە تێکڕای گشتی دانیشتووانی پارێزگاکەو ئەوانەی کە لەنێوان ساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٢) هێنراونە ئەم پارێزگایە ڕێژەیان (١,٥٪)ە، و لەنێوان ساڵانی (١٩٨٢-١٩٨٤) (١,١٪) و لەنێوان ساڵانی (١٩٨٤-١٩٨٧) (٣,٥٪)ە، هی تر (١,٤٪)، جێگای تێبینیە کە لەدوای سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧) تا دەستپێکردنی شەڕی نێوان عێراقو ئێران واتە ئەو ماوەیەی کە عێراق بارودۆخی ناوخۆی ئارامی بە خۆیەوە بینییوە لە سیاسەتی دەرەوەشی دا هەر بەم چەشنە ئارامی بە خۆیەوە بینییوە پرۆسەی بە عەرەبکردنی ئەم پارێزگایە گەیشتووەتە لووتکە، تەنها لەنێوان ساڵی (١٩٧٧-١٩٨٠) ڕێژەی عەرەبی هاوردە گەیشتووەتە (٨,٩٪) دانیشتووانی پارێزگاکە[٣١٧].

دوای سەر ژمێری ساڵی (١٩٨٧)و دەست نیشان کردنی ناوچەکانی کوردستان بۆ شالاوی ئەنفالو دەرکردنی خێزانی پێشمەرگە بۆ ناوچە قەدەغەکراوەکان. ئیتر بارودۆخی کەرکوك وای لێهات لە ساڵی (١٩٨٨)دا کوردەکانی کەرکوك بۆیان نەبوو بەبێ پرسی لایەنە ئەمنیو حیزبییەکان لە شارەکەیاندا جێگیر بن بەڵکو دەبوو لایەنە بەرپرسەکان ڕەزامەندی بدەن لەسەر ڕێگە پێدانیان بۆ ئەوەی لەناو شارەکەیان بژین ئەگینا تووشی کێشەو ڕاگواستن دەهاتن. بۆ نموونە، خێزانێکی دانیشتووی ناحیەی شوان لە کاتێکدا کە تووشی ڕاگواستن دێت ڕوو دەکەنە ناو شاری کەرکوك لە گەڕەکی قەڵای شاری کەرکوك دەگیرسێنەوە، بەڵام کاربەدەستانی حیزبی بەعس ئەم خێزانە بۆ هەولێر ڕادەگوێزن، چونکە ئەمانە بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی حیزبی بەعسو دەزگای ئەمنی هاتوون لە کەرکوك نیشتەجێ بوون[٣١٨]. لێرەدا کەرکوکییەکی ناحیەی شوان بۆی نییە لە ناو شارەکەی خۆییدا نیشتەجێ بێتو پارچەیەك زەوی هەبێت یان خانوویەك بکڕێت، خەڵکی ناوشار بۆیان نییە خانووەکانیان بە کوردێك بفرۆشن یان خانووەکانی خۆیان لە زێدی بابو باپیرانیان نۆژەن بکەنەوە کە چی ئەم مافانە هەمووی دەدرێتە عەرەبێکی عێراقی غەیرە کەرکوکی. نەك تەنها ئەمانە بەڵکو دەبوایە دەزگاکانی ئەمن لەسەردانی خزمانو هاتنی میوان ئاگادار بکرێنەوە.

سەرەڕای هەموو ئەمانە لە سنوورەکانی ئەم پارێزگایە لە ساڵی (١٩٨٨)دا لەلایەن حکومەتی بەعسەوە تاوانێکی ترسناکی دژی مرۆڤایەتی ئەنجام دەدرێت کە ئەویش شالاوی (ئەنفال)ە، ئەنفال ئەو هەلە بوو کە حکومەتی بەعس بۆی دەگەڕا بۆ ئەوەی بە یەکجاری هەموو ناوچە گرنگەکانی کەرکوك لە کورد پاکتاو بکات.

(ئەنفال) ناوی سورەتی هەشتەمە لە قورئانی پیرۆزدا. ئەم ناوە لەلایەن ڕژێمەوە لەم کردەوەیە نرا بۆ ئەوەی شەرعیەت بە کارەکانی بدات، هەرچەندە ئەم شالاوانە نەك لەگەڵ قورئاندا بەڵکو لەگەڵ هەموو ئایینە ئاسمانییەکانو ڕەوتی مرۆڤایەتیدا دژو ناکۆکن.

ئەنفال زنجیرە شالاوێك بوو بۆ قڕکردنی کورد بەتایبەتی لەگوندەکانو دەرەوەی شارە گەورەکان، ئەنفال بەئاشکراو بەبەر چاوی دونیاوە جێبەجێ دەکراو پڕوپاگەندەی حکومەتی بەعسی[٣١٩]، بەکردەوەیەکی قارەمانێتی بۆ سوپای عێراق دایدەناو سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانی عێراق ڕۆژانە بەیانو ڕاگەیاندنی ڕەسمیان لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە دەربارەی بڵاو دەکردەوە[٣٢٠]. نەخشەی ئەنفال لەسەر بنەماو نۆرمەکانی نازییەکان داڕێژرابوو، کە ئەمیش سێ قۆناغی یەك لەدوای یەکنو بریتین لە: پێناسەکردنی ئەوانەی کە دەیانەوێت لەناویان ببەن، لە دواتر کۆکردنەوەیان لە شوێنێکی دیاری کراوو ئەوجا لەناو بردنیان[٣٢١].

لە سەرەتادا (عەلی حەسەن ئەلمەجید) ئەو گوندانەی، کە دەبوایە شالاوەکان بیانگرێتەوە لەسەر نەخشە بە هێڵی سوور جیابکرێنەوە. ئەو گوندو ناوچانە بە (ناوچە قەدەغەکراوەکان) ناوبرانو بەم شێوەیە قۆناغی یەکەمی واتا دەستنیشان کردنی گروپی ئامانج دیاری کرا. بۆ جێ بەجێ کردنی قۆناغەکانی دی دەبوایە ئەم خەڵکانە دەستگیر بکرێنو لەجێگەیەکدا کۆبکرێنەوە.

بەپێی بڕیاری ژمارە (٢٦٥٠)ی بەرپرسی لیژنەی ڕێکخستنی باکوور عەلی حەسەن ئەلمەجید ڕۆژی (٢٠)ی حوزیرانی ساڵی (١٩٨٧)ی دەستنیشانکردبوو، کە قۆناغی یەکەمو دووەمی ئەنفالی تیادا کۆتایی پێبهێنرێت، بەپێی

بڕیاری ژمارە (٤٠٠٨)ی هەمان بیرۆكە بۆ سەركردایەتی فەیلەقەكانی یەك‌و پێنج نێردراو لەلایەن ئەلمەجیدەوە واژوو كراوەو تیایدا هاتووە: گوندەكانی كوردستان كە ژیانیان تێدا قەدەغە كراوە تا (٢١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٨٧) دانیشتووانەكانیان دەبێت كۆبكرێنەوەو لە (٢٢)ی حوزەیرانی هەمان ساڵیشدا بڕیار درا بەوەی: هەموو گوندەكانی ناوچە قەدەغەكراوەكان بوونی مرۆڤ‌و ئاژەڵیش تێیدا قەدەغە بكرێت‌و بكرێنە ئامانج بۆ هێرشی موشەكی‌و گولە بارانی ئازاد. سوپا بۆی هەبوو هەموو جۆرە چەكێك بەكار بهێنێت. سوپا شەوو و ڕۆژ لە گرتن‌و كوشتنی هەر زیندەوەرێك (مرۆڤ و ئاژەڵ) لە ناوچەكەدا ئازاد بوو. هەركەسێك لەو ناوچانەدا بوایەدەستگیر دەكرا. ئەوەی تەمەنی لە (١٥) ساڵ بەرەو سەرەوە بوایا تا (٧٠) ساڵ لە سێدارە دەدرا دوای ئەوەی سوود لە زانیارییە ئەمنییەكانی وەردەگیرا، واتا دوای لێكۆڵینەوە لەگەڵ ئەوگیراونەدا دەبوایە بەپێی ئەو فەرمانەی مەجید لەسێدارە بدرێن.

هەموو جۆرە هاتووچۆو كاری كشتوكاڵی‌و ئاژەڵداری لە ناوچەكەدا قەدەغەكرا، جاشەكان هەر تالانییەكیان دەكرد بۆخۆیان بوو تەنها چەكی قورس نەبێت كە دەبوایە ڕادەستی سوپای بكەن[٣٢٢].

سەرەڕای ئەوەی هەموو گوندەكان بوون بەناوچەی قەدەغە كراو هەر كەسێ لەوێدا ببینرابوایە سوپا بۆی هەبوو دەستگیری بكات‌و دوای لێكۆڵینەوە بیكوژێت. دواتر هێرشكردن بۆ سەرگوندەكان‌و پێشمەرگە دەستی پێكردو سەرەڕای هەموو ئەو توندو تیژیەی لە هێرش‌و پەلامارەكانیاندا بەكاریان هێنا سوپاو جاشەكان چەكێكی زۆر كاریگەرو كوشندە لەو كاتەدا بۆ قڕكردنی خەڵك بە بێ گوێدان‌و جیاوازی لەنێوان منداڵ‌و سڤیلەكان‌و چەكداران بەكار هێنرا، كە ئەویش چەكی كیمیاوی بوو. دواتر لە ڕێگەی یاسای دەوڵەتەوە خەڵكی گوندەكان كران بە دوژمنی خاك‌و گەلی عێراق ئەمەش لە ڕێگەی سەرژمێرییەوە بوو[٣٢٣].

لە (٦)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٨٧) عەلی حەسەن ئەلمەجید كۆبوونەوەیەكی بە گەورە لێپرسراوانی حیزبی بەعس كرد بۆ وتوێژكردن لەسەر خۆئامادەكردن بۆ سەرژمێری. ئەلمەجید ڕایگەیاند: ئەو تێكدەرانەی پەشیمان دەبنەوە تا ڕۆژی سەرژمێری ڕێگەیان پێ دەدرێت بگەڕێنەوە، بەڵام هیچ گەڕاوەیەك دوای (١٧)ی تشرینی یەكەم وەرناگیرێنەوە. لەهەمانكاتدا ناوبراو ڕایگەیاند كە كارێكی پەسند نییە ڕێگە بە خێزان‌و كەس‌و كاری ئەو (تێكدەرانە) بدرێت كە پەشیمان نەبوونەتەوە لە ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی حكوومەتدا بمێننەوە ئەو خەڵكە دەبێت بەزۆر دەربكرێن‌و ڕەوانەی لای كەسوكاری تێكدەریان لە ناوچە قەدەغەكراوەكاندا بكرێن. دواتر ئەلمەجید لێژنە ئەمنییەكانی هەموو پارێزگاكانی باكووری ئامادەكرد كە ناونووسێك بكەن‌و خێزانە دەست نیشانكراوەكان دەربكەن بۆ ئەو شوێنانەی كەسووكاری (تێكدەرانی) تێدایە بێجگە لە پیاوەكانیان ئەوانەی تەمەنیان لەنێوان (١٢-٥٠) ساڵدایە ئەوانە دەبێ دەسبەسەر بكرێن[٣٢٤]. دواتر سەركردایەتی نووسینگەی باكوور فەرمانیدا ئەو كەسەی ناتوانێت بە بێ بیانویەكی بەجێ بەشداری سەرژمێرییەكە، بكات ئەوە ماڧی هاووڵاتی بوونی عێراقی لە دەست دەدات‌و بە هەڵاتووی سوپاش لە قەڵەم دەدرێت.

سەرژمێرییەكە ئەنجام درا بە بێ ئەوەی زۆربەی دانیشتووانی (ناوچە قەدەغەكراوەكان) لە كوردستان‌و ناوچە زەنگاوەكانی باشووری عێراق بگرێتەوە. ئەوەی ئەم سەرژمێرییە لەگەڵ ئەوانی پێش خۆی جیا دەكاتەوە ئەوەیە ئەو كەسەی لەم سەرژمێرییە بەشداری نەكرد ماڧی عێراقی بوونی نەما[٣٢٥].

هەموو ئەو نەخشەو بڕیارانە تەنها بۆ جێ بەجێ كردنی دوو قۆناغی نەخشەی جینۆسایدی گوندنشینەكان بوون. هەموو ئەوانە زەمینە خۆشكردن بوون بۆ جێ بە جێ كردنی قۆناغی سێیەم، كە لە ناوبردنیان بوو. هەنگاوی سێیەم لەم ڕێگەیەدا شاڵاوەكانی ئەنفال بوو.

ڕەوتی ڕووداوەكان‌و پیادەكردنی سیاسەتی حكوومەتی عێراق بەرانبەر كورد ئەوە دەردەخات كە دەمێك بوو بیرۆكەی قڕ كردنی كورد لە مێشكی سەرانی حكومەتی عێراقدا دەخولایەوە، ئەو بیرۆكەیە لای حیزبی بەعس بڕوا بووو لای دەزگا جێبەجێكەرو دەسەڵاتدارەكانی عێراقیش سیاسەتێكی نەگۆڕ بوو[٣٢٦].

ئەنفال لەلایەن (هێزەكانی فەیلەقی یەك‌و پێنج لە كەركوك‌و هەولێر، هێزێكی هەڵبژێردراو لە گاردی كۆماری (الحرس الجمهوري)، هێزی تایبەت (القوات الخاصة)، هێزی مغاویر، ئاسایش، فریاكەوتن، هەندێ مەفرەزەی بچووك لەگەڵ هێزی سوپای گەل (الجیش الشعبي)و فەوجەكانی بەرگری نیشتمانی)، جێ بەجێ كراو هەموو جۆرەكانی چەك بە چەكە قەدەغەكراوەكانیشەوە بەكار هێنران[٣٢٧].

شاڵاوەكانی ئەنفال لە (٢٣)ی شوباتی ساڵی (١٩٨٨)ەوە دەستیان پێ كردو لە ٦ی ئەیلولی هەمان ساڵدا بە ڕەسمی كۆتاییان پێهات. شاڵاوەكانی ئەنفال بە هەشت قۆناغ بەپێی شوێنی جوگراڧی دەست نیشانكردنی گوندەكان‌و كۆكردنەوەی خەڵكەكە تیایدا جێبەجێ كران.

قۆناغی یەكەمی ئەنفال لە (٢٣)ی شوباتدا تا (١٩)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٨)ی خایاندو ناوچەكانی دۆڵی جافایەتی گرتەوە. ئەنفالی دوو- ناوچەكانی قەرەداغی گرتەوەو لە (٢٢)ی ئادار تا (٢)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٨) بەردەوام بوو.

ئەنفالی سێ، كە جێگای باس‌و لێكۆڵینەوەیە لەم توێژینەوەی ئێمەدا، ناوچەی گەرمیانی گرتەوەو ئۆپەراسیۆنەكە لە (٧-٢٠)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٨) درێژەی كێشا، سنووری پەلامارەكانی ئەنفالی سێ بریتی بوو لە : كەركوك، خورماتوو، كفری، كەلار، دەربەندیخان، زنجیرە چیای قەرەداغ، تەكیە، چەمچەماڵ‌و قەرەهەنجیر[٣٢٨].

ئەنفالی سێ یەكێكە لە گەورەترین‌و سامناكترین قۆناغەكانی ئەنفال‌و پەلامارەكانی ئەم شاڵاوە ناوچەیەكی زۆر فراوانی گەرمیانی گرتەوە، سەدان گوندی ناوچەكانی جەباری، زەنگنە، داوودە، جاڧ ڕۆغزایی كەوتنە بەر شاڵاوی هێزەكانی دەوڵەت.

سامناکی ئەنفالی سێ لەوەدایە کە دەیان هەزار ژن و منداڵ و پیاو لەو پەلامارانەدا گیران و بێ سەرو شوێن کران. هەزارانیش هەر لە شوێنی گرتنیاندا گوللەباران کران. ئەم شاڵاوە لە شاڵاوەکانی تر جیا دەکرێتەوە لە ڕێگەی هەندێك وردەکارییەوە. لە ڕێگەی سی و سێ بروسکەی (نهێنی و بە پەلە)ی ئیستخباراتی سەربازییەوە، ئەوە دەزانین کە نزیکەی (١٢٠) گوندی ناوچەکە گیراون و تێکدراون یان سوتێندراون و وێران کراون[٣٢٩]. ڕێژەی کورد لە دەورو بەری کەرکوك بە شێوەیەکی دراماتیکی لەکەمیدا.

بە کۆتایی هاتنی ئەنفالی سێ، ئیدی لایەکی کوردستانی عێراق لەو بەری ڕێگای کەرکوك- سلێمانی و لە حەوزی کەرکوك- خورماتوو- کەلار- دەربەندیخان- سلێمانیدا، ئاسەواری هیچ جۆرە ژیانێکی مرۆڤی کوردی تێدا نەما.

هێرشەکانی سوپای عێراق لەمیانەی ئەنفالی سێدا لەم قۆڵانەوەبوو.

- لە کفرییەوە بەرەو ئۆمەربل و عەزیز قادر.
- لە کفرییەوە بەرەو دووڕاجی.
- لە کەلارەوە بەرەو تێلەکۆو کولەجۆ.
- لە پێبازەوە بەرەو شێخ تەویل.
- لە دەربەندیخانەوە بەرەو درۆزنە.
- لە چیای قەرەداغەوە بەرەو تەپە کەرۆس.
- لە قادر کەرەمەوە بەرەو ئیبراهیم غولام.
- لە چیای قەرەداغەوە بەرەو درۆزنە.
- لە قەرە حەسەنەوە بەرەو هەنارەو مەحمود پەریزاد.
- لە لەیلانەوە بەرەو تازە شار.
- لە سەنگاوەوە بەرەو سەرقەڵا[٣٣٠].

نەخشەی پەلاماری سوپا خەڵکەکەی والێکرد تەنها یەك ڕێگایان هەبێ بۆ دەرچوون تاکو لە شوێنێکی دیاریکراو کۆ ببنەوەو لەوێ گەمارۆیان بدەن و دەستگیریان بکەن. چەمچەماڵ مەڵبەندی کۆکردنەوەی گیراوەکانی باکووری گەرمیان بوو[٣٣١]. لە ڕۆژی (٢٠)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٨) دا هێزەکانی حکوومەتی عێراق کۆتایی قۆناغی سێیەمی ئەنفالیان ڕاگەیاند[٣٣٢].

زۆربەی خەڵکی ناوچەکە لە گوندەکان و هەردوو شێوەکانی دەورو بەری گوندەکان گیران، بەشێکی ئەوانە هەرلە شوێنی گرتنیان گوللە باران کران، بەشێکی تری خەڵکەکە توانیان بگەنە هەندێ لە شارەکانی کەلارو چەمچەماڵ و ئۆردوگاکانی شۆڕش و نەسرو لەوێ گیران، ئەوانی تر کە گیران لەوانەبوون لە هەردوو شێوەکەدا خۆیان حەشار دابوو بەڵام خۆیان تەسلیم کردەوە، هەموو ئەوانەی، کە گیران یان خۆیان بە دەستەوە دا ناونووس کران و نێردرانە ئۆردوگای تۆبزاوەی نزیك شاری کەرکوك و لەوێشەوە بەرەو ئاکامی نادیار بەڕێ کران[٣٣٣].

لە ئەنفالی چواریشدا بەشێك لە ناوچەکانی کەرکوك بەر شاڵاوی هێزەکانی دەوڵەت کەوتن، سنووری پەلامارەکانی ئەنفالی چوار بریتی بوون لە: کەرکوك، ئاڵتون کۆپری و دێگەڵە، کۆیە، خەلەکان، دوکان، سووورداش، تەکیە، چەمچەماڵ. ئەم قۆناغەی ئەنفال لە (٣-٨)ی ئایاری ساڵی (١٩٨٨) ئەنجام درا[٣٣٤]. حکوومەتی عێراق لەم قۆڵانەوە پەلامارەکانی ئەنفالی چواری ئەنجام دا:

- لە ئاغجەلەرەوە بەرەو گۆپتەپەو عەسکەرو بۆڵقامیش.
- لە سوسێ وە بەرەو کەڵەشێرو چەمی ڕێزان.
- لە ڕێگای سورداشەوە بەرەو شیلەخان و عەودالان.
- لە دوکانەوە بەرەو کلکەسماق و بۆگدو کلێسە.
- لە خەلەکانەوە بەرەو هەیبەت سوڵتان و کانی کوردەو داوداوە.
- لە کۆیەوە بەرەو ئەسکی کۆیەو شەوگێڕو تیمارۆك.
- لە تەقتەقەوە بەرەو مەلا زیادو کانەبی ڕەش.
- لە تەقتەقەوە بەرەو کانی لەلەو ئۆمەر گومبەت و سێگرتکان.
- لە ئاڵتون کۆپرییەوە بەرەو قەشقەو خوڕخوڕ.
- لە شیوە سوورەوە بەرەو ئۆمەرمەندان و تورکمان باغ.
- لە ڕێگای شوان تەق تەقەوە بەرەو شێخ بزێنی سەروو خواروو.
- لە چەمچەماڵەوە بەرەو تورکی تیژەو تیلیان[٣٣٥].

ئەنفالی چوار، لە ڕۆژی (٣)ی ئایاری ساڵی (١٩٨٨)دا بە کیمیا باران کردنی گوندی گۆپتەپەو عەسکەری سەر بە ناحیەی ئاغجەلەر دەستی پێ کرد. ڕژێم ئاوی بەنداوی دوکانی زیاد کرد بۆ ئەوەی خەڵکەکە نەتوانن لە ئاوەکە بپەڕنەوە. خەڵکەکە هەندێك بۆ ناوچەی چەمچەماڵ و هەندێك بۆ ناوچەی شێخ بزێنی ڕایان کرد، پاشان هێرش بۆ سەر ناوچەکانی ڕۆژ هەڵاتی تەقتەق دەستپێکرد. لە دوای وێران کردنی گوندەکان هێرش بۆ سەر ناوچەی شوان دەستی پێ کرد، کە ژمارەی گوندەکانی (٧٦) گوند بوون. لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٧) چەندینیان ڕووخێنرا بوون و خەڵکەکەشیان ڕاگوێزرابوون بۆ کۆمەڵگا زۆرەملێکانی دارەتووو بنەسلاوەی نزیك شاری هەولێر. سەرەنجام لە ڕۆژی (٧)ی ئایاری ساڵی (١٩٨٨)دا، هێزەکانی عێراق هەموو گوندو ئاواییەکانی (دەشتی کۆیەو تەق تەق و شێخ بزێنی و شوان و ئاغجەلەرو خاڵخالان و چەمی ڕێزان)یان وێران کرد. لە ناوچەی ئاغجەلەر (٧٥) گوندو لە کۆیە (٢٦) گوندو (٦١) گوندیش لە شوان (ناحیەی ڕێدار) لەگەڵ (٥٢) گوندی ناحیەی تەق تەق و (٢٣) گوندی پردێ کە هەمووی بەسەر یەکەوە دەکاتە (٢٣٧) گوند. بەپێی خەملاندنێك زیاتر لە (٢٥٠٠) کەس لە دەشتی کۆیەو (٣٠٠٠) کەس لە ناوچەکانی شێخ بزێنی و قەڵا سێوکەو شوان شوێنبزر کراون[٣٣٦]. بەپێی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی (چاودێری ماف مرۆڤ - میدڵ ئیست وۆچ) ژمارەی قوربانیانی ئەم قۆناغە بە (١٠) هەزار سیڤیل دادەنرێت[٣٣٧].

ئەنفالی چوار کاریگەری تایبەتی هەبوو لەسەر ڕووداوەکان و بە کۆتایی هاتنی ئەنفالی چوار هیچ شوێنێك نەما لە ناوچەی کەرکوك و سلێمانی کە پێشمەرگەو خەڵك بتوانن تێیدا بحەوێنەوەو گوزەران بکەن. ناوچەکانی سنووری ئەنفالی چوار وەکو پردی گرێدان بوون لەنێوان ناوچەکانی کەرکوك و سلێمانی و هەولێر[٣٣٨].

گیراوەکانی ئەنفالی چواریش وەك هی قۆناغەکانی پێشوو لەلایەن دایەرەی ئیستخباراتی عەسکەریو دایەری ئەمنەوە ناونووس کران، لە دواییدا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کراو ڕەوانەی ئۆردووگای تۆبزاوی نزیك شاری کەرکوك کران لەوێشەوە بەرەو گۆڕە بەکۆمەڵەکان ڕەوانە کران(٣٣٩)، ناوچەی کەرکوك لە شاڵاوەکانی ئەنفالی سێو چواردا ژمارەی گوندە کاولبووەکانو ژمارەی ئەو خەڵکەی لەم کردەوە سەربازییەدا تێدا چوون بەم شێوەیە بوون:

*** ئەنفالی سێ:**

**خشتەی ژمارە (١)**
**ژمارەی سەرجەم ئەنفالکراوەکانی قۆناغی (سێیەم)**

| ناحیە | ژمارەی ئەنفالکراوەکان |
|---|---|
| قادر کەرەم | ٣٨٠١ |
| قەرەهەنجیر | ٢١٧٠ |
| قەرەحەسەن (لەیلان) | ١٢٠٧ |
| ئاڵتون کۆپری | ١٤٣٨ |
| سەنگاو | ١٥٢٤ |
| تێلەکۆ | ١٥٦٧ |
| کەلار (سەنتەر) | ٩٨٩ |
| سەرقەڵا | ٢٧٨ |
| پێباز | ٩٥٠ |
| نەوجول | ٩٢٢ |
| سەرگەران (قودس) | ٢٠٠ |
| خورماتوو (سەنتەر) | ١٥ |
| سەرجەم | ١٥٠٦١ |

* سەرچاوە:
- Shorsh M.Resool. Destruction of a Nation, First Printing, U,S.A, 1990 , P.28-30, 42- 43, 37-38, 33- 34, 92-94, 129-132, 133, q. 95-97, 39-41.

**خشتەی ژمارە (٢)**
**ژمارەی گوندە وێرانکراوەکان لەقۆناغی سێیەمی ئەنفالدا**

| ناحیە | ژمارەی گوند |
|---|---|
| سەنگاو | ٦٧ |
| پردێ (ئاڵتون کۆپری) | ٤٩ |
| سەرقەڵا | ٤ |
| سەرگەران (قودس) | ١ |
| قەرەحەسەن | ١٥ |
| قەرەهەنجیر | ٣٩ |
| کەلار (سەنتەر) | ١٢ |
| تیلەکۆ | ١٠٨ |
| پێباز | ٤٨ |
| خورماتوو (سەنتەر) | ١ |
| نەوجول | ٢٥ |
| قادر کەرەم | ٧١ |
| سەرجەم | ٤٤٠ |

* سەرچاوە:
- Shorsh M.Resool. Destruction of a Nation, First Printing, U,S.A, 1990 , P.28-30, 42- 43, 37-38, 33- 34, 92-94, 129-132, 133, q. 95-97, 39-41.

*** ئەنفالی چوار:**

**خشتەی ژمارە (٣)**
**ژمارەی سەرجەم ئەنفالکراوەکانی قۆناغی (چوارەم)**

| شوێن | ژمارەی ئەنفالکراو/کەس |
|---|---|
| قەڵاسێوکە - ئاغجەلەر | ١٠٤٩ |
| دۆڵی سووورداش - دوکان | ١٤٢ |
| شوان | ٣٨٥ |
| شێخ بزێنی سەروو | ١٦٥٨ |
| شێخ بزێنی خواروو | ٩٢ |
| تەق تەق و دەوروبەری | ١٩٩ |
| کۆیەو دەوروبەری | ٦٤٢ |
| سەرجەم | ٤١٦٧ |

* سەرچاوە:
**- یادگار عەبدوڵڵا عەلی هەمەوەندی، ڕەهەندە سیاسییەکانی پرۆسەی ئەنفال لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا، نامەیەکی ماستەری بڵاو نەکراوەیە، کۆلێژی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٨، لاپەڕە ١٠٨.**

**خشتەی ژمارە (٤)**
**ژمارەی گوندە وێرانکراوەکان لەقۆناغی چوارەمی ئەنفالدا:**

| ناحیە | ژمارەی گوند |
|---|---|
| شوان | ٦١ |
| پردێ | ٢٣ |
| ئاغجەلەر | ٧٥ |
| کۆیە (سەنتەر) | ٤٠ |
| تەق تەق | ٧٢ |
| شۆڕش | ٢٦ |
| خەلەکان | ٢٤ |
| سەرجەم | ٣٢١ |

سەرچاوە:
– یادگار عەبدوڵڵا عەلی هەمەوەندی، ڕەهەندە سیاسییەکانی پرۆسەی ئەنفال لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، نامەیەکی ماستەری بڵاو نەکراوەیە، کۆلێژی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٨، لاپەڕە ١٠٨.

سنووری پەلامارەکانی ئەنفالی پێنج و شەش و حەوت بریتی بوون لە کۆیە، دێگەلە، ئاڵتون کۆپری، هەولێر، شەقڵاوە، ڕەواندوز، چۆمان، چیای قەندیل، ڕانیە، چوار قوڕنە، هیزۆپ و چیای باواجی. دوا ئەنفال (ئەنفالی هەشت) بوو لەدەڤەری بادینان لە (٢٥)ی ئاب تا (٦)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٨)[٣٤٠].

بە کۆتایی هاتنی ئەنفالی هەشت شاڵاوەکانی ئەنفال کۆتاییان هات، ئەنفال بە ڕەسمی لە ڕۆژی (٦)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٨) تەواو بوو و لە ناوەڕاستی مانگی نیسانی ساڵی (١٩٨٩) عەلی حەسەن ئەلمجید پۆستی وەزیری بەرگری عێراقی پێ سپێردرا و حەسەن عەلی ئەلئەمیر، لە جێگای دانرا[٣٤١].

لەدوای شاڵاوەکانی ئەنفال عەلی حەسەن ئەلمجید لە کاسێتێکی تۆمارکراودا سەبارەت بە ئەنفال و ناوچە ڕاگوێزراوەکانی کەرکوک دەڵێت: (کەرکوک تێکەڵەیەکە لەنەتەوە و ئایین و مەزهەب. ئەو خەڵکانەی، کە ئێمە لە (٢١)ی ئایاری بۆ (٢١)ی حوزەیران، ڕامانگواستن یەک دانەیان خەڵکی ناوچە قەدەغەکراوەکان نەبوون بەڵام لەژێر کۆنترۆڵی تێکدەرەکان بوون، جا لەگەڵیان بووبێتن یا دژیشیان بوبێتن)[٣٤٢].

بە کۆتایی هاتنی ئەنفال بە تایبەتی سێ و چوار، کەرکوک زیانێکی زۆری بەرکەوت، ژمارەی کورد لە پارێزگاکەدا بە ڕێژەیەکی بەرچاو دابەزی و لە بەرامبەریشدا ژمارەی عەرەب زیادی کرد، ڕژێمی عێراق بێ باکانەتر لە جاران و ڕوونتر پەردەی لە ڕووی سیاسەتی شۆفینیانەی خۆی بەرامبەر گەلی کورد لادا و شاڵاوی بە عەرەبکردنی کەرکوک و دووبزو مەخموور و گەرمیان لە جاران زیاتر پەیڕەو دەکرا، لە دەشتی گوندە تەخت کراوەکانی ناوچەی کفری، خورماتوو، کەرکوک، دەشتی قەراج و دووبزدا هەزاران ماڵە عەرەبی مەڕدار نیشتەجێ کران، بەردەوامیش ماڵە عەرەبی زیاتر بۆ کشتوکاڵ کردن لە سەر زەوی و زاری ماڵە جووتیارە کوردەکان، بۆ ئەو ناوچانە دەهێنران.

ئەنفالی سێ و چوار ئەو هەلە بوو، کە حکومەتی عێراق ماوەیەکی زۆر بوو لە چاوەڕوانیدا بوو بۆ ئەوەی بەیەکجاری دەڤەرە گوندنیشنەکانی کەرکوک لە کورد پاکتاو بکات، لەڕاستیدا دەزگاکانی حکومەت ئەو هەلەیان بۆ بەدیهێنانی ئەو خەونە لە مێژینەی حکومەتە عێراقییەکان قۆزتەوە.

لە ساڵی (١٩٨٩)دا حیزبی بەعس ئەو مافەی بە خۆیدا کە هەموو عێراقییەک بێجگە لە دانیشتووانی ناوچەی (ئۆتۆنۆمی) پارچە زەوییەک لەو ناوچەیە وەربگرێت. (عێراقییەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمیش) زەوی وەربگرن لە پارێزگاکانی تری عێراق بە مەرجێک لە پارێزگاکانی (نەینەوا، کەرکوک، دیالە) نەبێت، مەبەستیش لەم بڕیارە زیاتر هێنانی عەرەب بوو بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی و دوورخستنەوەی کورد بوو لە کەرکوک و موسڵ و دیالە[٣٤٣].

هەر لە هەمان ساڵداو بۆ کەم کردنەوەی ڕێژەی کورد لەو پارێزگایەو بە مەبەستی گۆڕانکاری لە یەکە کارگێڕییەکانیدا بەپێی (مەرسومی کۆماری) ژمارە (٤٣٤) ناحیەی پردێ لە کەرکوک دابڕا و خرایە سەر پارێزگای هەولێر[٣٤٤].

پرۆسەی بە عەرەبکردن تا ساڵی (١٩٨٩) بەگەرمی لەبرەودابوو نزیکەی (٥١) جێنشینگە بۆ عەرەبەکان دروستکرا لەشاری کەرکوک کەنزیکەی (٢٠٠٠٠٠) کەسیان تێدا جێنشین کرا[٣٤٥].

ئەو کردەوانەی بەعس، کە لە پارێزگای کەرکوک بە ئەنجامی گەیاندن، پێشێل کردنێکی تەواوی مافی مرۆڤ بوون، تاوانی دژی مرۆڤایەتیش هاوشانی تاوانی جەنگە. شاڵاوەکانی ئەنفال بوو بەهۆی بێسەرو شوێنکردنی هەزارەها کوردی ئەو ناوچانەو سەدان گوندی کوردستان وێرانکران و مەڕومالاَت و سامانیان تالاَنکران خانووبەرەکانیان ڕووخێنران[٣٤٦]. لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە بەهۆی تاوانی نازی و فاسیشتەکانەوە لەیاسای تازەی نێو دەوڵەتاندا ئەو پرنسیپە بەتەواوی جێگربوو، کە جینۆساید تاوانێکی دڕندانەیە لە دژی مرۆڤایەتی بۆیە نەک هەر وڵاتان، بەڵکو ئەو کەسانەش کە بەئەنجامدانی جینۆساید تاوانبار دەکرێن لێپرسینەوەی یاسایی، نێو نەتەوەیی دەکەوێتە ئەستۆیان[٣٤٧].

ورد بوونەوە لە سیاسەتی بە عەرەبکردن و پاکتاوی ڕەگەزی لە پارێزگای کەرکوک، هەروەک لەمەو بەر تیشکمان خستە سەر ڕووداوەکانی، بەڕوونی ڕەگەزەکانی جینۆساید تێیدا بەدی دەکرێت.

لەم پارێزگایەدا بە هەزاران کەس گوللە باران کران تەنها لەبەر کورد بوون و کەرکوکی بوون. تەنانەت بە مەبەستی کەم کردنەوەی کورد لەم پارێزگایە بەعس خەڵکی گوندەکانی ئەم پارێزگایەی ئەنفال کردو بەکۆمەڵ گوللە بارانی کردن و خەڵکی ئەم گوندانە بە سەدانیان زیندانی کراون و ئەندامانی

خێزانەکانیان لێك دوور خراونەتەوە هەروەك لە پرۆسەی ڕاگواستنی کوردی کەرکوك بە مەبەستی بە عەرەبکردن پەیڕەو کراوە زۆر جار باوك و دایك کەوتوونەتە شوێنێك و کوڕو کچ کەوتونەتە شوێنێکی تر ئەمەش بۆتە مایەی دابڕینی ئەندامانی خێزانەکە لەیەك.

بەعس بۆ بەعەرەبکردنی پارێزگاکەو شێواندنی ڕۆشنبیری کوردی و قەدەغەکردن و شێواندنی مێژووەکەی، بۆ پێکانی ئەم مەبەستە هەموو کتێبەکانی مێژووی کوردی سووتاندووە، کتێبخانە گەورەو پڕ کتێبە بەهاکانی ڕۆشنبیری کوردی ڕاگوێزاوەو سیمای ڕۆشنبیری و شوێنەواری کوردی شارەکەی سڕیوەتەوە. هەر بە مەبەستی شێواندنی کەلتووری کوردی و لاوازکردنی پێگەی زمانی کوردی ڕژێمی بەعس بڕیاری دەرکرد بۆ ئەو قوتابخانانەی زمانی کوردییان تێدا دەخوێنرا بڕیارەکەش بریتی بوو لەوەی کە هەر قوتابییەك لە وانەی کوردیدا دەرنەچێت ئەوا ئەو قوتابییە بە دەرنەچوو هەژمار ناکرێت بەڵکو قوتابی لەم وانەیەدا بشکەوێت هەر دەرچووە ئەمەش وای کرد زمانی کوردی زیاتر پشت گوێ بخرێت و بەهیچ شێوەیەك گرنگی پێ نەدرێت، چونکە زمانێکی لاوەکیەو هیچ کارو فەرمانێکی دەوڵەت بەم زمانەوە بەند نییە. لە برگەی دووەمیشدا بڕیارەکە کراوە بە بڕیارێکی یەکلایی کەرەوەو تیایدا هاتووە (کار بە هیچ دەقێکی تری پێچەوانەی ئەو دەقە ناکرێت)، ئەم بڕیارەش بۆ ساڵی خوێندنی ساڵی (١٩٨٩-١٩٩٠) چووە بواری جێ بە جێ کردنەوە[٣٤٨].

لە ڕووی ئابوورییەوە کوردستان بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی ژێرخانی ئابووری بە هۆی بە عەرەبکردنەوە شێوێندراوە، چەندین گوندی تاڵان کراون و شێوێندراون. ئەو تاوانانەی بۆ بە عەرەبکردن لە کوردستان بە گشتی و کەرکوك بە تایبەتی بە ئەنجام گەیەنراون ڕاستەوخۆ دەچنە چوارچێوەی تاوانی جینۆسایدەوە[٣٤٩].

هەڵبەتە ئەم سیاسەتەی بەعس کاریگەری زۆر خراپی هەبوو لەسەر هەموو بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و دەروونی و سیاسی خەڵکی کوردستان بە گشتی و کوردی کەرکوك بە تایبەتی و کارەساتی گەورەی لێ کەوتەوە.

*** چوارەم: ئاکامەکانی سیاسەتی بە عەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك:**

پلانی بە عەرەبکردنی کوردستان و کەرکوك بە تایبەتی پلانێك بوو بۆ سڕینەوەی هەبوونی نەتەوەیەك لەسەر زێدی خۆی، ئەم سیاسەتە لەلایەن حیزبی (بەعس) پلانڕێژی بۆ کرا. ئەم سیاسەتە لە هزری ناسیۆنالیستانەی توندڕەو سەرچاوەی گرتبوو، هزرێك کە تەنها بوونی خۆی دەبینێ و بوونی خەڵکانی تر ڕەت دەکاتەوەو چاو دەبڕێتە خاکیان بۆ ئەم مەبەستەش پەنا دەباتە بەر شێوازەکانی قڕ کردن و جینۆسایدو پاکتاوی نەژادی و دەست بەسەر داگرتنی خاك[٣٥٠]. ئەم سیاسەتە سیاسەتێکی دوژمنکارانەو درێژ خایەنی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بوو بە جۆرێك لە چەندین ڕێگای نامرۆڤانەیان دژ بە دانیشتووانی کورد لە شاری کەرکوك پەیڕەو کرد لە کۆچ پێکردن و وێرانکاری و بە عەرەبکردنی هەموو گوندە کوردییەکانی سەر بە قەزاو ناحیەکانی ئەم پارێزگایەو بە هەندێ مەڵبەندی ناحیەشەوە، حکومەت توانیویەتی تا ڕادەیەکی زۆر ئامانجەکانی بپێکی لەم سیاسەتەداو ڕێژەی کورد لەم شارەدا بۆ ئاستێکی نزم بەرێت.

هەر بۆیەش دەستی کردوە بەکاولکردنی گوندەکانی ئەم پارێزگایەو سەدان گوند دووچاری ڕاگوێزان و بەعەرەبکردن هاتوون و دانیشتووانەکانیان پەرتەوازە کراون یان ڕاگوێزراون یان تووشی شاڵاوی ئەنفال بوونەتەوە، (بڕوانە خشتەی ژمارە ٥).

هەر بە مەبەستی بە عەرەبکردنی پارێزگاکە ڕژێم یەکە کارگێڕییەکانی پارێزگاکەی هەڵوەشاندووەتەوەو شوێن گۆڕکێی پێ کردوون، کە لە ئاکامدا ڕووبەری ئەم پارێزگایە هەمیشە لە گۆڕانکاری بەردەوام دابووە، چونکە ڕژێم بۆ پێکانی مەبەستەکانی چەند گوندو ناحیەو قەزای لەم پارێزگایە دابڕیوە. ئەمەش کاری کردووەتە سەر تەسك بوونەوەی ڕووبەری ئەم پارێزگایە، لیوای کەرکوك لە ساڵی (١٩٤٧) ڕووبەرەکەی (٢٠٣٥٥) کم² بوو، لەئاکامی پەیڕەو کردنی ئەم سیاسەتەو بەهۆی گۆڕانکاری لە یەکە ئیدارییەکانی و دابڕینی چەند ناوچەیەك لەم پارێزگایە ڕووبەرەکەی تەسك کرایەوەو لە ساڵی (١٩٨٧) تەنها (١٠٢٨٢) کم² مایەوە، گۆڕانکاری لە یەکە ئیدارییەکانی دوای ئەو ساڵەش بەردەوام بوو ئەمە یەکێ لە ئاکامەکانی سیاسەتی وێرانکردن و بە عەرەبکردنی جوگرافیای کەرکوك بوو.

لە هەمانکاتدا ڕژێم هەربۆ بە عەرەبکردن و سڕینەوەی ناسنامەی ئەم پارێزگایە ناوی یەکە کارگێڕی و گەڕەك و شەقام و شوێنە گشتییەکانی گۆڕی بۆ ناوی عەرەبی. یەکە کارگێڕییەکانی پارێزگای کەرکوك کە ناوەکانیان گۆڕانی بەسەردا هات بەم شێوەیە بوو:

- پارێزگای کەرکوك گۆڕا بە (التأميم).
- قەزای دووبز گۆڕا بە (دبس).
- ناحیەی لەیلان (قەرەحەسەن) گۆڕا بە (أم المعارك).
- ناحیەی سەرگەڕان بە (القدس).
- ناحیەی قەرەهەنجیر گۆڕا بە (الربيع).
- ناحیەی (العهد) لە قەزای داقوق لە پرۆسەی بە عەرەبکردن پێکهێنرا.
- ناحیەی (ڕەشاد) لە قەزای داقوق لە پرۆسەی بە عەرەبکردن پێکهێنرا.
- ناحیەی (ڕیاز) لە پرۆسەی بە عەرەبکردن پێکهێنرا.
- ناحیەی (عەبباسی) لە پرۆسەی بە عەرەبکردن پێکهێنرا.
- ناحیەی (یایچی) بە عەرەبکراوە بۆ (الملتقى)[٣٥٢].

دواتریش هەر لە ناوشاری کەرکوکدا (٣٦) گەڕەکی نوێ دروستکران بۆ عارەبە هاوردەکانی ناوەڕاست و خواروی عێراق، کە خەڵکی بەگوێرەی ئەو پارەی میری پێیانی دەدا ناویان دەبردن[٣٥٣]. گەڕەکەکان بریتی بوون لە (الكرامة،

**خشتەی ژمارە (٥)**

**ژمارەی گوندو بنکەکانی خزمەتگوزاری و ژمارەی خێزانە دوورخراوەکان لە پارێزگای کەرکوك لە ئاکامی سیاسەتی بەعەرەبکردن**

| ز | ناحیە | گوندە تێکدراوەکان | قوتابخانە | مزگەووت | بنکەی تەندروستی | خێزانە دوورخراوەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | سەنتەری خورماتوو | ٩ | ٨ | ٩ | ١ | ١٠٥٤ |
| ٢ | ناحیەی داقوق | ٦ | ٥ | ٥ | – | ٨٦٠ |
| ٣ | ناحیەی نەوجوڵ | ٣٩ | ٢٨ | ٣٢ | ٢ | ١٩٦٩ |
| ٤ | ناحیەی قادر کەرەم | ٨١ | ٣٨ | ٦٥ | ٣ | ٤٠٥٥ |
| ٥ | ناحیەی پردێ (ئاڵتون کۆپری) | ٣١ | ٢٨ | ٣٠ | ٥ | ٢١٨٢ |
| ٦ | ناحیەی سەرگەران (قودس) | ٣١ | ٢٤ | ٣٢ | ٤ | ٢١٢٣ |
| ٧ | ناحیەی لەیلان (قەرەحەسەن) | ٤٥ | ٢٩ | ٤٠ | ٣ | ٢٤٢٩ |
| ٨ | ناحیەی شوان (ڕێدار) | ٧٠ | ٥٢ | ٥٧ | ٤ | ٢٦٥٠ |
| ٩ | ناحیەی قەرەهەنجیر (ربیع) | ٤١ | ٢٧ | ٣١ | ٥ | ٢٣١٠ |
| ١٠ | ناحیەی مەخموور | ٥٢ | ٣٧ | ٥١ | – | ٩٠٦ |
| ١١ | ناحیەی ئاغجەلەر | ٧٥ | ٦١ | ٧٣ | ٢ | ٦٧٣١ |
| ١٢ | ناحیەی سەنگاو | ٧٠ | ٢٨ | ٦٧ | ٢ | ٢٦١٩ |
| ١٣ | سەنتەری قەزای چەمچەماڵ | ١٩ | ٨ | ١٧ | – | ٥١٦ |
| ١٤ | ناحیەی تێلەکۆ | ١١٣ | ٤٧ | ٤٢ | ١ | ١٦٥٩ |
| ١٥ | سەنتەری کەلار | ١٦ | ١٦ | ١٦ | ١ | ١١٧٤ |
| ١٦ | ناحیەی پێباز | ٥٢ | ٢٩ | ٢٣ | ١ | ١٠٤٥ |
| ١٧ | قەزای کفری | ٨١ | ٦٠ | ٥٩ | ٦ | ٤٣٤٦[٣٥١] |

البعث، ١٧ تموز، الوحدة، الحرية، العروبة، النصر، القادسية ١، ٢، ١ اذار، ١ حزيران، الواسطي، الرشيد، المأمون، الحجاج، النخوة، الفاروق، الخضراء، الزوراء، غرناطة، الخلفاء، سعد، بدر، عدنان، المثنى، العمل الشعبي، ٣٠ تموز، ممدودة، ساحة الإحتفالات، حي العسكري، دورالأمن، الڤين دار، النداء، دور السكك، دور الضباط، (٢،١، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧)، الأندلس، منطقة لواء العشرين، الأسرى والمفقودين)[٣٥٤].

ئاکامی ئەم سیاسەتەو ئەو هەموو گەڕەکە عەرەبییە لەناو شارو لە پارێزگاکەشدا ئەوە بوو کە ڕووخسارو سیمای مێژوویی شارو پارێزگا بە ڕووخسارێکی تر کە زۆر جیاواز بوو لەوەی کە بەر لە هاتنی بەعس لە ئارادا بوو گۆڕدرا. هەر بە مەبەستی گۆڕینی ڕووخساری شارەکە لە سەرەتای هەشتاکاندا کۆمەڵێك باخچە لە نزیك گەڕەکە کوردییەکان هەبوون زۆربەیان تێکدران بە تایبەتیش ئەوانەی نزیك گەڕەکەکانی زێوەییەو ئیمام قاسمو باخچەی کەرکوکی کۆنو چوارڕێیانی قەڵا لە بەرامبەریشیدا دەسەڵاتداران ژمارەیەکی زۆر دار خورمایان لەسەر ئەم شەقامو شوێنە گشتییەکان چاند تاوەکو ببێت بە ئاماژەیەك کە ئەم شارە بەشێکە لەزێدی عەرەبی[٣٥٥].

گەلێ گەڕەکی کوردیش لە ئاکامی ئەم سیاسەتەدا لەناو شاری کەرکوکدا ڕووخێنران، بۆ نموونە بە بیانووی کردنەوەی شەقامێك سەدان خانووی گەڕەکەکانی شۆڕیجەو ئەلماسو بلاخو پیریادیو موسەلاو بەرتەکیە ڕووخێندرانو ڕێگای خاوەنەکانیشیان ڕێگەیان پێ نەدرا خانووی تر یا پارچە زەوییەك لەناو کەرکوکدا بکڕنو بیکەن بە خانوو. پاشان ئەوەشی لێ قەدەغە کردن کە لەناو کەرکوکدا بمێننەوە. بە هۆی ئەم سیاسەتەوەو بە چاو گێڕانێکی بە پەلە بە هەموو ئەو دەزگاو ساختمانو بەڕێوەبەرایەتییانەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو کات لە کەرکوکدا کۆمەڵە خەڵکێ، کە هیچ پەیوەندیەکیان بە ناوچەکەوە نەبووە دەستیان بەسەر هەموو شتێکدا گرتووە بوون بە فەرمانڕەوای هەموو شتێ، کەچی خەڵکی ناوچەکە بوون بە نامۆو بێگانەو چەوساوەو بە سووك سەیر کراون لەلایەن ئەوانەوە[٣٥٦].

لە دواتریشدا ڕژێم دەستی گرت بەسەر هەزاران دۆنم زەوی جووتیارانی کورد لەم پارێزگایەداو خاوەنەکانیان ڕاگوێزران و عەرەبی هاوردە لە جێگایان نیشتەجێ کران[٣٥٧]. ئەم جووتیارە کۆچ پێکراوانە ناچار کران لە کۆمەڵگا زۆرە ملێیەکان دانیشن کە ڕژێم لە هەندێ ناحیەو قەزادا دروستی کردبوون بێ ئەوەی هیچ کارێ یا سەرچاوەیەکی ژیان بۆ خۆیان و خاوو خێزانیان دابین بکەن لەو پارە کەمو ناچیزە بەو لاوە کە داوینەتێ، گوایا خانووی لەو کۆمەڵگایانەدا پێ بکەن بێ ئەوەی لە پارچە زەوییەك بەو لاوە شتێکیان بداتێ[٣٥٨]. ڕاگوێزراوەکان ڕەنجی زۆریان کێشا تاکو لەگەڵ ئەو جۆرە ژیانەدا ڕاهاتن[٣٥٩]. لە کاتێکدا کەمپێکی وەك کەمپی (بەردەقارەمان) کە زۆربەی ئەو خەڵکەی لەوێ دەژیان خەڵکی ڕاگوێزراوو جێنشینی ناوشار بوون، ئەمانە فێری ژیانی شارنشینی بوون زۆر ئەستەم بوو بۆ ئەوان لەژێر خێوەتدا ژیان بەسەر بەرن[٣٦٠]. هەر بۆیەش ئۆردوگا زۆرە ملێیەکان تا ماوەیەك بۆ ئەوان نیمچە گرتووخانەیەك بوون و کاریگەرییەکی نەرێنی کردە سەر دەروونی تاکەکان[٣٦١]، ئەمەش ڕەنگدانەوەی لەسەر ژیانی ڕۆژانەی ئەم کەسانە جێهێشتبوو کە ئەویش خۆی لە گۆشە گیری و دوورە پەرێزی و کەم بوونەوەی بەشداری خەڵك لە ئاهەنگ و بۆنە کۆمەڵایەتییەکان و کزبوونی پرۆسەی ئەنجامدانی سەردانی یەکدی دەدۆزیەوە[٣٦٢].

دوای ڕاگواستنیان نەخۆشیەکان بە هەموو جۆرەکانی لەناویاندا زیادی کرد چ جەستەیی و چ دەروونی چونکە ئەمانە بە زۆرەملێ لە پارێزگاکەیان دەرکرابوون و ئازاری زۆریان چەشتبوو، لە هۆیەکانی ژیان بێ بەش کرابوون و ئەو شوێنانەی، کە بۆیان ڕادەگوێزران بە هۆی کەمی خزمەتگوزاری و بایەخ پێنەدانیانەوە دەیان ناڵاند[٣٦٣].

بەهۆی ڕاگواستن و بە عەرەبکردنی ناوچەکانیان پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکانیان تووشی لاوازبوون و لێکترازان بوون تەنانەت نەك تەنها لە خودی پەیوەستە خزمایەتییەکاندا بەڵکو لە خودی خێزانەکانیشدا. ئەم خەڵکە کە ڕاگوێزرابوون شوێنەکانیان عەرەبنشین کرابوون یان خاپوور کرابوون لە خزم و کەس و کارو دۆستان دوور کەوتبوونەوە، ئەوە هۆیەك بوو بۆ خراپ بوونی باری ژیانیان ئەمانەش کاریگەریان لەسەر لاواز بوونی کەسایەتیان هەبوو، چونکە دوور کەوتنەوەی ئەمانە لەزێدی خۆیان و تێکەڵ بوونیان بە ژینگەیەکی نامۆ لە ڕێگای ڕاگواستنەوەو بە تێپەڕ بوونی کات بوو بەمایەی لاواز بوونی پەیوەندیی خزمایەتی و سەرەنجامیش نەمانی[٣٦٤]. تەنانەت ئەم سیاسەتە پەیوەندییە خێزانییەکانیشی لەبەر یەك هەڵوەشاندەوە چونکە زۆر جار لە پرۆسەی ڕاگواستن دا بەشێك لە ئەندامانی خێزان وەك (دایك و باوك) یان (کوڕو کچ) بەر شاڵاوەکە کەوتبوون و بەشێکی تریان ماونەتەوە بەرەو شوێنی تری جیاواز ڕاگوێزراون. لە ئەنجامی ئەم بەربەستانەش، کە دەسەڵاتداران لەبەر دەم بەیەك گەیشتنەوەی ئەم خەڵکە دایان ناوە هۆکارێك بووە بۆ دابڕان و یەکتر نەبینینەوەی ئەو خێزانانە بۆ ماوەیەکی زۆر[٣٦٥].

هەڵبەت ئەمەش ڕۆڵی بینی لە رووی دەروونییەوە بۆ کەمکردنەوەی توانای خۆ گونجاندنی ئەو کەسانە لەگەڵ ژینگە تازەکەدا، بە مانایەکی تر ئەو کەسانە تووشی گرفتی خۆنەگونجاندن بوون لەو کۆمەڵگایانەی کە بۆی دەچوون[٣٦٦]. لەلایەکی تریشەوە خراپی باری ئابووریان کێشەیەکی تر بوو، کە تەنانەت کێشەی کۆمەڵایەتی قوڵیشی بۆ دروستکردبوون، ئەمانە کە لەسەر زێدی باو باپیرانیان ڕیشە کێش دەکران و دەردەکران و گوندەکانیان خاپوور دەکران و عەرەبنشین دەکران یا لەناو شاری کەرکوك خانووەکانیان عەرەبی دەهێنرایە ناو[٣٦٧]. کەلێکیان بۆیان نەبوو تەنانەت کەلوپەلی ناو ماڵەکەی خۆشیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن، کە ڕاشدەگوێزران لە ئاکامی ئەم ڕاگواستنەدا تا ماوەیەکی زۆر لە ئۆردوگا زۆرە ملێیەکان دەمانەوە بەبێ هیچ کارو کاسبیەك و بەبێ ئەوەی ڕژێم کاریان بۆ دابین بکات یان بیانژێنێت[٣٦٨]. تەنانەت لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەم کەسانە کارێکیشیان دەست کەوتبایە دەخلی مانگانەیان ئەوەندە کەمبوو، کە نەدەتوانرا ژیانی پێ دابین بکرێ.

بەپێی ئەو ڕاستییانەی لەبەر دەستمان دان حکومەتی عێراق لە نیوەی دووەمی ساڵانی حەفتاکانەوە پرۆژەی چۆڵکردنی بەشێکی زۆری گوندەکانی کوردستانی داناو بڕیاریدا دانیشتووانی ئەو گوندانە لە ئۆردوگا زۆرە ملێکاندا کۆ بکاتەوە. مەبەستی سەرەکی حکومەت دوور خستنەوەی گوندنشینەکانی کوردستان بوو لە زێدی باو باپیرانیان، ئەویش لەلایەك بۆ ئەوەی بیانخاتە حاڵەتی هەست بە نامۆیی کردنی بەردەوامەوە، کە ئەمەش بەرەو وونبون دەیانبات، لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی لە ئۆردوگای زۆرەملێدا نیشتەجێیان بکات بەو هیوایەی هەرچی داب و نەریتی کوردەواری هەیە تێکی بشکێنێ و لە ڕەگەزو ڕەسەنایەتی خۆیان دووریان خاتەوە. بەڵام هۆی سەرەکی ئەوە بوو لەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە چیاکان و گوندەکان دووریان بخاتەوە.

دیارە ترسناکترین هەنگاو بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك ئەوەیە لەداب و نەریتی خۆی دابشۆرێت بەعس هەوڵی دەدا کورد بکات بە نەتەوەیەکی یان کەسانێکی بێ ڕەگ و ڕیشە بۆ ئەوەی بە ئاسانی لەناو ببرێن. دیارە ئەمەش ترسناکترین هەنگاوی بەعس بوو بۆ لەناو بردنی کەلتوری کوردی. بە تێکدانی گوندەکانی کەرکوك کەلتوری ڕەسەنی ئەم ناوچەیە کە مێژوویەکی درێژی هەبووەو بەشێك بوو لە میراتی مرۆڤایەتی سرایەوەو شیرازەی کۆمەڵایەتی دانیشتووانی ناوچەیەکی فراوان تێکدرا[٣٦٩].

ئامانجی حکومەت ئەوە بوو، کە سووکایەتی بە داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان و کەلتوری ڕەسەنی ئەم شارە بکات، چونکە هەر یەك لەم خەڵکانە خاوەن کۆمەڵێك خەسڵەت و داب و نەریتی تایبەت بە خۆیان بوون و زۆر جیاوازیان هەبوو لەگەڵ ئەوەی، کە لە ژینگەی تازەدا دەیان بینی، ئەمەش وای دەکرد کە زۆر جار مندالەکانی ئەم خێزانانە لە چوارچێوەی ڕێنماییەکانی خێزانەکانیان دەرچن و سەر کێشی بکەن و پابەند نەبن پێیانەوە کە بێگومان ئەمەش لە ئەنجامدا بووە بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزانەکان[٣٧٠].

بە عەرەبکردن لەسەر بواری ڕۆشنبیری و پرۆسەی فێرکردنیش ڕەنگی داوەتەوە ئەوەتا لە ساڵی (١٩٨٩) حکومەت بە مەبەستی پشتگوێ خستنی زمانی کوردی بڕیارێکی فەرمی دەکرد، کەتیایدا هاتووە قوتابی بە دەرنەچوو (راسب) هەژمار ناکرێت ئەگەر هاتوو لە زمانی کوردیدا دەرنەچوو بێت[٣٧١].

بۆ تەواو کردنی هەنگاوی پێشووو لە پاش ساڵی (١٩٧٥) حکوومەتی عێراق لە هەڵمەتێکی فراواندا ناوی قوتابخانە کوردی و تورکمانەکانی گۆڕی بۆ ناوی عەرەبی بەم جۆرە:

*** بەعەرەبکردنی ناوی قوتابخانە کوردی و تورکمانییەکانی کەرکوك لەدوای ساڵی ١٩٧٥ )؛**

| ناوی بنەڕەتی | ناوگۆڕاو |
|---|---|
| ئامادەیی کوردستان | عبد الملك بن مروان |
| ناوەندی کاوە | معاذ بن جبل |
| ناوەندی زێوەر | الاندلس |
| ناوەندی چەمی ڕێزان | الرافدین |
| سەرەتایی پیرەمێرد | البکر |
| سەرەتایی مەولەوی | الأدریسي |
| سەرتایی هەڵمەت | العراقیة |
| سەرەتایی بارزانی | أم الأیمن |
| سیلدزلار | الفجر الجدید |
| یدی قارداش | قادسیة صدام |
| موطلو | النصر |
| اق طاش | المتنبي[٣٧٢] |

تەنانەت بە عەرەبکردن ناوی کتێبخانەکانی ئەم شارەشی گرتەوە هەروەك (ئاسۆ بوو بە الطلیعة– دار العربیة) و (هەندرێن بوو بە التأمیم) و کتێبخانەی (گەل) بوو بە (الشعب). ئازادی چاپەمەنی لەم شارەدا لەئارادا نەبوو گۆڤارو ڕۆژنامەکان داخران وەك (گاورباغی) و (گۆڤاری ڕای گەل) و ڕۆژنامەی (شەفەق)[٣٧٣].

بەکوشتن و لەسێدارەدانی ڕۆشنبیرانی کورد لە شارەکەدا هەر وەك لە بەشی پێشووی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئاماژەمان پێیدا بە مەبەستی کەمکردنەوەی ڕۆشنبیران لە شارەکەدا وەك لە سێدارەدانی مارف بەرزنجی و هاوڕێیانی، چەند ڕۆشنبیری تر لە شارەکە لە ترسی ڕژێم و لەترسی لەناو چوونیان ڕوویان لە هەندەران کردبوو[٣٧٤]. لە ئەنجامی هێنانی ئەو هەموو عەرەبە بۆ ناو شارەکە ڕۆشنبیری عەرەبی بەسەر شاردا زاڵبوو، ووشە عەرەبییەکان پانتایی بەکار هێنانیان فراوان بوو، بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکار دەهێنران، باڵادەستکردنی عەرەبەکان لە پلەو پێیەکانی ناو شارداو دوور خستنەوەی کورد لەدام و دەزگاکانی دەوڵەت زمانی عەرەبی کرد بەزمانی ڕۆشنبیری و بەڕێوەبەرایەتی لەناو شارەکەدا. لەلایەکی تریشەوە هێنانی ئەو ژمارە زۆرە لە هۆزەکانی عەرەب، کە ئەمانە زۆرینەیان (بەدو) بوون کاری کردە سەر گۆڕینی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کەرکوك لەکۆمەڵگەیەکی شارستانییەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی لادێیی و کەرکوکی کردە گەورە دێیەك.

بێگومان هەر یەکێك لەم عەرەبە هاوردانە خاوەن داب و نەریت و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆی بوو کە تا ئەندازەیەکی زۆر لەگەڵ داب و نەریتی خەڵکی ڕەسەنی شارەکە چ لە کوردو چ تورکمان جیاواز بوون[٣٧٥].

بە عەرەبکردن تەنانەت بابەتەکانی خوێندنی مێژوو و جوگرافیا و پەروەردەی نیشتمانی و ئابووری و کۆمەڵناسی و ئاین لە قۆناغەکانی خوێندندا بە کوردی قەدەغە کران ئەو بابەتانە جارێکی تر بە عەرەبی دەبوایە بخوێندرابانایە، ئەمە جگە لەوەی بەشێکی زۆری کتێبەکان گۆڕانکارییان تێدا کرا بە تایبەتی مێژوو و جوگرافیا[٣٧٦]، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەسەڵاتدارانی عێراقی هەرچی کتێب و چاپەمەنی هەبوو بە زمانی کوردی لە کتێبخانەی گشتی کەرکوك گواستیانەوە بۆ کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغداد بە بیانوی دەوڵەمەند کردنی، بەمەش حکومەت شاری کەرکوکی بێبەش کرد لە فەرهەنگ و ڕۆشنبیری ڕەسەنی کوردی[٣٧٧].

سەرەڕای هەموو ئەو تاڵی و تەنگەژەیەی بەسەر خەڵکی ئەم پارێزگایەدا هات لە کاتی ڕاگواستنیان بۆ کۆمەڵگا زۆرە ملێیەکان یەکەمین شت، کە ڕوو بەڕووی دەهاتن ڕێکخراوی حیزبی بەعس و دەزگا ئەمنییەکان بوو، کە زۆریان لێدەکرا ببنە ئەندامی ئەو حیزبە[٣٧٨].

دەسەڵاتداران ترسیان وەك میکانیزمێك بەکار دەهێنا بۆ تێکشکاندنی کەسایەتی ڕاگوێزراوان بۆیە لەم قۆناغەدا سیخوڕی بوو بە پیشەی کەسانێکی بەرچاو و بە هۆی ئەم سیخوڕانەشەوە کەسانێك لە سێدارە دەدران و کەسانێکی زۆر زیادەتریش دووچاری ئەشکەنجەی جۆراو جۆر دەهاتن. ئەو کۆنترۆڵ و چاودێرییە بەردەوامەی بەعسییەکان لەسەر دانیشتووانی ئۆردوگاکان دەیانکرد ژیانی ئەوانی بەرەو بێزاری و دڵەڕاوکێیەکی بەردەوام دەبرد، چونکە جگە لەوەی زۆر توند بوو، ئەم خەڵکە بە تایبەتی هی قەزاو لادێکانی پارێزگای کەرکوك لەسەر ئەم چاودێریکردنە ڕانەهاتبوون، لەبەرامبەریشدا حکومەت ئەو عەرەبانەی کە دەهێنران بۆ ئەم پارێزگایە و بۆ ناو شاری کەرکوکیش هەموو پێداویستییەکانی ژیانی بۆ دابین دەکردن. تەنانەت کاریشی بۆ دابین دەکرد، بە تایبەتی بەشێکی زۆری ئەم عەرەبە هاوردانە لەناو سوپا و دەزگاکانی ئاسایش و موخابەرات و ڕێکخراوەکانی حیزبی بەعس دادەمەزران بەشێوەیەك لەناو شاری کەرکوکدا ژیان بۆ کورد و تەنانەت تورکمانیش شتێکی زەحمەت بوو، ئەمانیش کە لەناو شار مابوونەوە ژیانیان لە خەڵکە ڕاگوێزراوەکە خۆشتر نەبوو بەڵکو ڕەنگدانەوەی پرۆسەی بە عەرەبکردن لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو خەڵکانەی لە شارەکەدا مابوونەوە بە زەقی دەردەکەوت. ئەمانە هەمیشە لە چاوەڕوانی و دڵەڕاوکێدا دەژیان لە ترسی ئەوەی کە ڕۆژێك دێت ئەوانیش وەك خەڵکەکەی تر

دووچاری هەمان چارەنووس دەبنەوەو ڕادەگوێزرێن، ئەمە جگە لەو ڕێگاو شێوازانەی، کە دەسەلآت پیادەی دەکرد دژ بە هاوولاتی غەیرە عەرەب وەك نەهێشتنی کارکردن و نەدانی پلەو پێیەی کارگێڕی لە داموو دەزگاکانی دەولەت بە مەبەستی بێکارکردنیان و لە ئەنجامیش ناچارکردنیان بۆ ئەوەی شارەکەیان بەجێ بهێڵن[٣٧٩].

هەر وەك عەلی حەسەن مەجید لە کاسێتێکی تۆمارکراودا دەڵێت (ئێمە ڕێنماییمان دەرکرد کە نابێت کورد لە کەرکوك و دەورو پشتیشی کاربکەن)[٣٨٠].

جیاوازی نەتەوایەتی لە سەردەستی سەرانی بەعس لە شارەکەدا گەیشتە ئەو پەڕی. لە بەرامبەر ئەو ڕەفتارەی لەگەڵ کوردەکان دەکرا، عەرەبە هاوردەکان ڕێگەیان پێدەدراو کار ئاسانیان بۆ دەکرا پلەو پێیەی کارگێڕی لەم شارەدا وەرگرن و خانووو زەویان پێ دەدرا[٣٨١]. لە بەرامبەریشدا بە هۆی هێنانی ئەو شالأوە زۆرەی عەرەب بۆ پارێزگاکە بوو بە هۆی کز بوونی پەیوەندییە کۆمەلآیەتییەکان لەنێوان خەلکی شارەکە لەگەڵ خزم و کەسانیان لە شارەکانی تری هەرێمی کوردستان[٣٨٢].

یەکێك لە ئاکامە ترسناکەکانی بە عەرەبکردنی ئەم شارە ئەوە بوو، کە سیمای کوردی بوونی تا ڕادەیەکی زۆر بەم شارەوە نەمابوو، ناوی گەڕەك و شەقام و کۆگاو دوکانەکان عەرەبی بوون سیمای کاولکردن بە شارەکەوە دیار بوو بەجۆرێکی وا کە لە هەر دەروازەیەکی شارەکە بچویتایە ئەم شارەوە ڕاستەو خۆ کۆمەڵێك ڕەبیەو خالی چاودێری و مۆڵگەی عەرەب لەدەشتایی و سەرگردو تەپۆلکەکانی بەسەر شارەکەدا دەڕوانن، دەردەکەوتن[٣٨٣].

بە هۆی ئەوەی ڕێگە بە کوردی خاوەن ماڵ نەدەدرا خانووەکەی نۆژەن بکاتەوە زیاتر کاولکاری بەم شارەوە دیار بوو، دەتوانین ئەو کارو کردەوانەی بەعس بۆ ئەوە بگەڕێنینەوە، کە ئەم شارە خاوەنی نەوتێکی زۆرە، ئەوانیش واتە کوردەکان بەهۆی کورد بوونیان بە بڕوای بەعس مەترسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی عەرەب، دروست دەکەن بۆیە ڕژێم بەمافی خۆی دەزانی هەر شێوازێك بەکار بهێنێت بۆ دەرکردنیان لە شارەکەیان و عەرەب نشینکردنی ناوچەکەیان.

پاشکۆی ژمارە (١)

## ١ـ الوثيقة الأولى :

**قيادة الفرقة الثانية**

**الاستخبارات**

الرقم:ـ ح ـ ش ـ ٣ ـ ٩١٤

التأريخ:ـ ٩\٩\١٩٥٨

## (سري للغاية وشخصي)

الى/ مديرية الاستخبارات العسكرية بوزارة الدفاع

الموضوع/ مذكرة للدرسين الاكراد الى وزارة المعارف حول رفع مستوى الثقافة في كردستان خاصة.

بطيه نسخة من المذكرة اعلاه للاطلاع .

ورد في الصفحة (١٥) تحت عنوان (ب ـ التطبيق)

للمادة (١) مايلي:

( تحديد منطقة الطرف الكردية بألوية السليمانية و اربيل و كركوك وخانقين وأقضية للوصل الكردية ). نود ان نلفت النظر الى خطورة التحديد اعلاه حيث نبدي المطالعة التالية:ـ

١ـ ان اقرار حدود معارف كردستان معناه ضمناً الاعتراف بالخطوة التي يهدف اليها المدرسون الاكراد وهو الاعلان كيان كردستان السياسي.

٢ـ ان زج لواء كركوك ضمن منطقة المعارف الكردية، وهي ليست كردية بالمعنى الذي فسرته المذكرة، اذ فيه اكثرية (عربية وتركية ومسيحية)، فالتعبير يبطن في طياته روح الرغبة في الاستيلاء على (النفط وهي الثروة الوطنية للجمهورية العراقية التي حررت هذا المصدر الحيوي لحياة ومستقبل العراق. كما ان ادعاء المذكرة بكردية كركوك معناه صهر القوميات الاخرى في اللواء وهذا ما ينافي روح دستور الجمهورية العراقية.

٣ـ ليس من المصلحة تأسيس مديرية معارف كردستان وليس من الصحيح أن يكون مركزها في مدينة كركوك.

٤ـ يجب أسناد منصب مدير المعارف في كركوك دوما وأبدا الى شخص عربي شرط أن تتوفر فيه صفة الحياة ويعمل للمصلحة وخدمة التعليم دون تحييز لقومية أو عنصرية.

٥ـ أما ماجاء في بقية المذكرة فنترك أمرها لوزارة المعارف لأنها فرضت شروطا وليس أصلاحا.

أرجوا إطلاع الجهات المعنية لخطورة المذكرة المبرقة بأسم الأصلاح أننا لاننكر على أخوتنا الأكراد حقهم في المطالب المنوه عنها على أن نتفق والمصلحة العامة التي هي رائد المخلصين لهذا الوطن .

توقيع

الزعيم الركن

ناظم الطبقچلي

قائد الفرقة الثانية

المصدر: د. نوري طالباني
منطقة كركوك و محاولات تغيير واقعها القومي، لندن، ١٩٩٥.

**پاشکۆی ژمارە (۲)**

رقم ٣٦٩

استنادا الى احكام الفقرة ( ٦ ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت ، وبناء على مقتضيات المصلحة العامة . ولوقوع الاراضي المبينة تفاصيلها في القائمة المرفقة بهذا القرار بالقرب من محرم الشركة العراقية للعمليات النفطية والمنشآت العسكرية .

قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ ٣١-٣-١٩٧٥ مايلي : —

١ — تستملك الاراضي المبينة تفاصيلها في القائمة المرفقة بهذا القرار لقاء بدل نقدي مقداره ١٠٠٥/٢) ديناران وخمسمائة فلس للدونم الواحد ؛ وذلك استثناء من احكام قانون الاستملاك ؛ وتسجيل الاراضي المستملكة باسم الادارة المحلية لمحافظة كركوك .

٢ — تشكل لجنة برئاسة رشدي اكسا ؛ قائمقام قضاء مركز كركوك ؛ وعضوية كل من : —

أ — داود سليمان — مدير واردات محافظة كركوك .

ب — عطية شنداخ — ممثل المنطقة الزراعية في كركوك .

جـ — سعدون مصطفى — رئيس اتحاد الجمعيات الفلاحية في كركوك .

تتولى توزيع بدلات الاستملاك على مستحقيها من اصحاب الاراضي المشار اليها في (١) اعلاه .

٣ — تقوم وزارة المالية برصد المبالغ المقتضية لتغطية بدلات الاستملاك المستحقة بموجب هذا القرار .

٤ — يتولى الوزراء المختصون تنفيذ هذا القرار .

احمد حسن البكر
رئيس مجلس قيادة الثورة

**قائمة الاراضي المستملكة في محافظة كركوك**

| اسم المقاطعة | المساحة المستملكة | |
|---|---|---|
| ١ — ناحية دبس : | | |
| ١٦/قره دره | ٦٥٤٦ | دونما |
| ٨/مرعي | ١٠٧٢ | = |
| ١٠/قوشقايه | ٢٢٢٣ | = |
| ٢ و ٣/قوطان | ٢٩٠٩ | = |
| ١١/جقماغة | ٣٨٦٤ | = |
| ٥/قره دره | ٨١٦ | = |

ب ـ مركز كركوك وقرة حسن :

| | | |
|---|---|---|
| ٥٢ و ٥٤/خاصة تيمارى | ١٢١٢٤ | = |
| ٦٤/خاصة تيمارى | ٤٤١٨ | = |
| ١/رجيبـــان | ٢٤١٤ | = |
| ٢/ترجيـــلي | ٦٢٧٨ | = |
| ٤/تركشكان | ٢٢٠٧ | = |
| ٥/بجيــــاوة | ٢٦٠٣ | = |
| ٢٨/ليــــــلان | ١٠٤٧٩ | = |
| ٩/صارى تپـة صغير | ٢١٢٤ | = |
| ١٠/صارى تپـة كبير | ٢٥٨٨ | = |
| ٦/قـرة لـو | ٤٥٦٨ | = |
| ٨/طو نمسا قلـو | ٢٢٨٩ | = |
| ١١/بارمجـه | ٤٩٥٨ | = |

جـ ـ ناحية يايجـي :

| | | |
|---|---|---|
| ١٨/يايجــي | ٤٠٠ | = |
| ١٤/جـــديدة | ٤٦٠٦ | = |
| ١٢/شريفيـــة | ١٨٥٩ | = |
| ٢٢/عنايـــــه | ٧٢٢٢ | = |
| ١٦/مـلا عبـدالله | ١٩٦٤ | = |

د ـ ناحية تازة خورماتو :

| | | |
|---|---|---|
| ٤١/تــــــازة | ٠٠٠ | |
| ٢٨/شرنجة بـولاق | ٢٦٥ | = |
| ١٢/زنـدانـــة | ٧٢٦٧ | = |
| ٢٩/مطـــــارة | ٢٠٠٥ | = |
| ٢٨/ينكيجـــة | ١٠٧٣ | = |
| ٣٧/كايـــــة | ٦٩٩ | = |

هـ ـ قضـاء طـوز :

| | | |
|---|---|---|
| ٤/شـــاهوان | ٢١٨٢ | = |
| ٥/طـــــوز | ١١٨٨٩ | = |
| ٩/كوكـــس | ٢١١٧ | = |
| ١٠/خاصة تيمارى | ٢٢٦٤ | = |
| ٢٤٠/اوزاوة | ٩٤١٩ | = |
| | ١٢٥٠٢٢ دونما | |

**وەرگیراوە لە: نەجات حەسەن، چەمکێك لە مێژووی کەرکووك، بەرگی یەکەم، کوردستان- کەرکووك، ٢٠٠٦.**

## پاشكۆی ژمارە (٣)

مراسيم جمهورية

### رقم ٦٠٦

استنادا الى احكام الفقرة الاولى من المادة السادسة من قانون المحافظات رقم (١٥٩) لسنة ١٩٦٩ (المعدل) ، وبناء على ماعرضه وزير الداخلية .

رسمنا بما هو آت : ـ

احداث ناحية في قضاء كلار باسم ناحية (بلاكو) ، يكون مركزها في قرية (تيلاكو كبير) ، وتتبعها المقاطعات المبينة ارقامها واسماؤها ادناه : ـ

(٢٨) روتين ، (٣١) توكن ، (٣٢) سي خران ، (٣٣) سماقه ، (٣٤) نرج ويس ، (٣٥) قلارويله ، (٣٦) تيلاكو كبير ، (٣٧) سركل ، (٣٨) زالان ، (٣٩) كاكه برا ، (٤٠) تبه سبي ، (٤١) عليان كبير ، (٤٢) كاكه حمه ، (٤٣) عزيز قادر ، (٤٧) قلا جرمله ، (٤٩) عليان الصغير ، (٥٠) بياز جار ، (٥١) قره قوجالي ، (٥٢) ميل قاسم صغير ، (٥٤) كامه خل ، (٥٥) كومه زرد ، (٥٨) سي كردان ، (٥٩) تبه سوز ، (٦٠) كلاجو ، (٦١) هواره برزه ، (٦٢) تيلاكو صغير ، (٦٣) زرد محمود ، (٦٤) زرد قادر ، (٦٥) زرد حمه ، (٦٦) خلوه ، (٦٧) ناوه ، (٦٨) هواره قوله ، (٦٩) بلاوشك ، (٧٠) توران شيخ سعيد ، (٧٣) توران بابا رسول ، (٧٤) تبري ملا ، (٧٦) زرين ، (٨٣) بيره موني ، (٨٤) قوالي، (٨٥) بوقه ، (٨٦) شوراو ، (٨٨) دو خران ، (٨٩) منصور الكان ، (٩٠) كاني عبيد ، (٩١) بوه ، (٩٢) شاه نظر ، (٩٧) تازه دي ـ نازي ، (١٠٣) كيزوك ، (١٠٤) كاني جابله ، (١٠٥) كومه زمرد ، (١٠٨) توه فوت ، (١٠٩) دو ميلان ، (١١٠) ده تكه وه ره ، (١١١) كرمك وصوفي ، (١١٢) خاله بك ، (١٢٠) قوله سوتا و ، (١٢٥) بنه براز سرو وخوارو ، (١٢٦) خان رؤوف اغا ، (١٢٧) قولجان سرحد ، (١٢٨) قولجان امين قهرمان ، (١٢٩) سه رش / ناحية سر قلعة (شيروانه) .

وتكون حدودها الادارية الحدود الخارجية للمقاطعات المرقمة (٨٤) و (٨٣) و (٩٢) و (١٢٦) و (١٢٠) و (١٢٨) و (١٢٧) و (١٢٨) مرة ثانية و (٩٠) و (٣٩) و (٥٥) و (٥٤) و (٣٧) و (١٢٥) و(١١١) و (١١٢) و(١٠٨) و (١٠٤) و (٩٧) و (٨٦) و (٧٣) و (٧٠) و (٥٠) و (٥١) و (٥٨) و(٥٩) و (٣٣) و(٣٢) و (٣١) و(٤٣) و (٤٧) و(٨٣) مرة ثانية .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم .

كتب ببغداد في اليوم الثاني من شهر ذي القعدة سنة ١٣٩٥ المصادف لليوم السادس من شهر تشرين الثاني سنة ١٩٧٥ .

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية

### رقم ٦٠٧

استنادا الى احكام المادة الخامسة من قانون المحافظات رقم (١٥٩) لسنة ١٩٦٩ المعدل ، وبناء على ماعرضه وزير الداخلية .

رسمنا بما هو آت : ـ

فك ارتباط ناحية سر قلعة (شيروانة) المتألفة من المقاطعات المبينة ارقامها واسماؤها ادناه من قضاء كلار ، والحاقها بقضاء كفري : ـ

(٢٥) سر قلعة ، (٢٦) عمر بل ، (٢٧) ميل قاسم كبير ، (٢٩) كاني ماران ، (٣٠) جوار شاخ ، (٤٤) ولي حيدر ، (٤٥) فتاح عمر ، (٤٦) سيد جزني ، (٤٨) ابراهيم خان ، (٥٣) ميل قاسم صغير ، (٥٦) دروزنة كبير ، (٥٧) دروزنة صغير ، (٧١) نا صالح ، (٧٢) يكه جالاو وباشا ، (٧٧) كوبان ، (٧٨) كاكولي ، (٧٩) عبدالله قت ، (٨٠) زكي وحاج عواد ، (٨١) بكرة شل ، (٨٢) بلكة ، (٨٧) كواجر مك ، (٩٣) دي بنة ، (٩٤) سيده ، (١٢٤) شاكل .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم .

كتب ببغداد في اليوم الثاني من شهر ذي القعدة سنة ١٣٩٥ المصادف لليوم السادس من شهر تشرين الثاني سنة ١٩٧٥ .

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية

### رقم ٦٠٨

استنادا الى احكام المادة الخامسة من قانون المحافظات رقم (١٥٩) لسنة ١٩٦٩ المعدل ، وبناء على ماعرضه وزير الداخلية .

رسمنا بما هو آت : ـ

١ ـ فك ارتباط نفاتي جمجمال وكلار من محافظة كركوك ، والحاقهما بمحافظة السليمانية .

٢ ـ فك ارتباط قضاء كفري من محافظة كركوك ، والحاقه بمحافظة ديالى .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم .

كتب ببغداد في اليوم الثاني من شهر ذي القعدة سنة ١٣٩٥ المصادف لليوم السادس من شهر تشرين الثاني سنة ١٩٧٥ .

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية

الوقائع العراقية عدد ٢٥٠٣ ١٩ ١٩٧٥/١٢/١٥

المصدر: الوقائع العراقيه، عدد ٢٥٠٣، ص ١٩، ١٩٧٥/١٢/١٥.

**پاشکۆی ژمارە (٤)**

التشـكيلات الادارية

رقم: ٣٣

بسـم الله الرحمن الرحيم

## مرسوم جمهوري

استنادا الى المادة الرابعة من قانون المحافظات رقم ١٥٩ لسـنة ١٩٦٩ (المعـدل) وبناء على ماعرضه وزير الداخلية •

رسمنا بما هو آت :ــ

١ ــ فك ارتباط المقاطعات المبينة أرقامها وأسماؤها أدناه من ناحيـة كنديناوة التابعة لقضاء مخمور بمحافظة أربيل والحاقها بناحية دبس التابعة لقضاء مركز كركوك بمحافظة كركوك : (١) ملحة والي (أم الحوالي) و(٢) شناغة و(٣) دربند صارلو و(٤) قرية كابلكه و(٥) دركه الكبيرة و(٦) دركه الصغيرة و(٧) جسـرد و(٨) كيسومه و(٩) هلاله و(١٠) كزوشان و(١١) شحل و(١٢) كندال ،و(١٣) سليمان بختيان و(١٤) داود كركه و(١٥) سركران و(١٦) خرابه و(١٧) بلكانـــه و(١٨) خسرو وبولاقلو و(١٩) عبدالله قاني و(٢٠) سريشاخ و(٢١) دربندكومي و(٢٢) توج و(٢٣) ليهيان و(٢٤) خوشاو و(٢٥) سيقوجان و(٢٦) قيلان و(٢٧) جاستان و(٦٧) قره بوتك و(٦٨) دومان اوه •

٢ ــ فك رتباط المقاطعات المبينة ارقامها واسماؤها ادناه من ناحية قراج التابعة لقضاء مخمور بمحافظة أربيل والحاقهـا بناحيـة دبس التابعـة لقضاء مركز كركوك بمحافظة كركوك : (٧١) بير مهدى و (٧٣) قلاته سوران بامند و (٧٤) ساردك و(٧٥) همين مردى و (٧٦) حمزة اغا و (٧٧) دوازده حـوار و (٧٨) خازر و(٧٩) حاربردان و(٨٠) كردروه و (٩٠) كراو و (١١٢) كندي بكره •

٣ ــ فك ارتباط المقاطعتين الذين رقميهما واسميهما ادناه من ناحية قوش تپه التابعة لقضـاء مركـز اربيل بمحافظـة اربيل والحاقهمـا بناحيـة التـون كوبـرى التابعة لقضاء مركز كركوك بمحافظة كركوك (١٨٢) صارى جم صغير و (١٨٣) صـارى جم كبير •

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرســوم

كتب ببغداد في اليوم الرابع والعشرين من شهر محرم لسنة ١٣٩٦هـ

المصادف لليوم الخامس والعشرين من شهر كانون الثاني لسنة ١٩٧٦م

**احمد حسن البكر**

**رئيس الجمهورية**

ments in Kurd

**وەرگیراوە لە :**

Ethic cleansing Decuments in Kurdistan Iraq, published by Patriotic Union of Kurdistan–Kirkuk organize action center, part one Kurdistan–kirkuk, 2004

**الوقائع العراقية، عدد ٢٥١٤،ص ١٤ ، ١٩٧٦/٢/١٦.**

پاشکۆی ژمارە (٥)

مراسيم جمهورية

رقـــم ٤١

استنادا الى موافقة مجلس قيادة الثورة ، والمادة الرابعة من قانون المحافظات رقم (١٥٩) لسنة ١٩٦٩ (المعدل) ، وبناء على ماعرضه وزير الداخلية .

رسمنا بما هو آت :ـ

١ ـ احداث محافظة باسم ( محافظة صلاح الدين ) ، يكون مركزها في مدينة تكريت ، ويتبعها الاقضية التالية بكامل حدودها الادارية :ـ

ا ـ قضاء تكريت .

ب ـ قضاء سامراء .

جـ ـ قضاء بلد .

د ـ قضاء طوز .

٢ ـ ابدال اسم محافظة كركوك باسم ( محافظة التاميم ) ، ويتبعها كل من الاقضية التالية :ـ

ا ـ مركز كركوك .

ب ـ قضاء الحويجة .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم .

كتب ببغداد في اليوم الثامن والعشرين من شهر محرم لسنة ١٣٩٦ المصادف لليوم التاسع والعشرين من شهر كانون الثاني لسنة ١٩٧٦ .

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية

رقـــم ٤٢

استنادا الى موافقة مجلس قيادة الثورة ، والمادة الرابعة من قانون المحافظات رقم (١٥٩) لسنة ١٩٦٩ (المعدل) ، وبناء على ماعرضه وزير الداخلية .

رسمنا بما هو آت :ـ

احداث محافظة باسم ( محافظة النجف ) ، يكون مركزها في مدينة النجف ، ويتبعها الوحدات الادارية التالية بكامل حدودها الادارية :ـ

١ ـ قضاء النجف .

٢ ـ قضاء الكوفة .

٣ ـ قضاء ابي صخير .

٤ ـ ناحية الشبكة .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم .

كتب ببغداد في اليوم الثامن والعشرين من شهر محرم لسنة ١٣٩٦ المصادف لليوم التاسع والعشرين من شهر كانون الثاني لسنة ١٩٧٦ .

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية

الوقائع العراقية عدد ٢٥١٣ ٦

المصدر: الوقائع العراقيه، عدد ٢٥١٣، ص ٢٦، ١٩٧٦/٢/٩.

**پاشکۆی ژمارە (٦)**

رقم ٢٥٦

بناء على ما جاء بكتاب مجلس قيادة الثورة ــ مكتب أمانة السر المرقم م ق/١٠/٢٣/٢٢١٥ في ١٧ــدــ١٩٧٦ . واستنادا الى احكام المادة ( الرابعة ) من قانون المحافظات رقم (١٥٩) لسنة ١٩٦٩ المعدل ؛ وبناء على ماعرضه وزير الداخلية .

رسمنا بما هو آت :ــ

فك ارتباط ناحية ( داقوق ) من قضاء طوز بمحافظة صلاح الدين ؛ والحاقها بقضاء مركز كركوك بمحافظة التأميم .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم .

كتب ببغداد في اليوم التاسع عشر من شهر جمادى الاولى سنة ١٣٩٦ المصادف لليوم الثامن عشر من شهر أيار سنة ١٩٧٦ .

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية

سەرچاوە: الوقائع العراقيه، عدد ٢٥٣٢، ص ١٢، ١٩٧٦/٦/٧.

**پاشکۆی ژمارە (٧)**

رقم ١١٩٤٤

بناء على ما جاء بقرار مجلس محافظة التاميم
المرقم (٥٠١) في ٢-٣-١٩٧٦ .
قررنا تبديل أسماء القرى المدرجة أدناه التابعة
لناحية قره حسن بمحافظة التأميم : بالاسماء المبينة
ازاء كل منها :-

وزير الداخلية

| الاسم القديم | الاسم الجديد |
|---|---|
| ١ – شرنجة بولاق | اليرموك |
| ٢ – زندانه | النصر |
| ٣ – يارمجه | جده |
| ٤ – قره لو | المقداد |
| ٥ – صاري تبه كبير | الرازي |
| ٦ – صاري تبه صغير | سيناء |
| ٧ – صاري تبه يونس | الوليد |
| ٨ – رجيبات عليا | المتنبي |
| ٩ – رجيبات سفلى | الكندي |
| ١٠ – طوقما قلو | الخنساء |
| ١١ – ترجيل | القادسية |
| ١٢ – ينجه علي | ابو محجن الثقفي |

الوقائع العراقية عدد ٢٥٢٠ ١٩٧٦/٣/٢٩

وەرگیراوە لە :
Ethic cleansing Decuments in Kurdistan Iraq, published by Patriotic Union of Kurdistan–Kirkuk organize action center, part one Kurdistan–kirkuk,2004

**پاشکۆی ژمارە (٨)**

| جدول 30 توزيع السكان حسب محافظة الميلاد والبيئة 1977 | | | |
|---|---|---|---|
| محافظة الميلاد | المجموع | النسبة % | نسبة المحافظات الكوردية والعربية |
| التاميم | 391018 | 78.9 | 78.9 |
| دهوك | 1599 | 0.3 | |
| السليمانية | 8288 | 1.7 | 3.7 |
| اربيل | 8481 | 1.7 | |
| نينوى | 12041 | 2.4 | |
| ديالى | 9551 | 1.9 | |
| الانبار | 3175 | 0.6 | |
| بغداد | 14576 | 2.9 | |
| بابل | 3639 | 0.7 | |
| كربلاء | 1654 | 0.3 | |
| واسط | 3612 | 0.7 | 16.7 |
| صلاح الدين | 12001 | 2.4 | |
| النجف | 2201 | 0.4 | |
| القادسية | 4574 | 0.9 | |
| المثنى | 1351 | 0.3 | |
| ذي قار | 7164 | 1.4 | |
| ميسان | 3212 | 0.6 | |
| البصرة | 3763 | 0.8 | |
| غير مبيت | 186 | 0.0 | 0.0 |
| خارج العراق | 3339 | 0.7 | 0.7 |
| المجموع | 495425 | 100.0 | 100.0 |

| جدول 30 توزيع السكان حسب مدة الاقامة في محافظة التاميم 1977 | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| الفئة الزمنية | الفترة الزمنية | حضر | ريف | المجموع | النسبة % |
| منذ الولادة | منذ الولادة | 218616 | 120767 | 339383 | 68.5 |
| اقل من ثلاث اشهر - اقل من ثلاث سنوات | 1974 - 1977 | 50761 | 11438 | 62199 | 12.6 |
| ثلاث سنوات - اقل من خمس سنوات | 1972 - 1974 | 19612 | 4909 | 24521 | 4.9 |
| خمس سنوات - اقل من عشرة سنوات | 1967 - 1972 | 16455 | 4484 | 20939 | 4.2 |
| عشرة سنوات واكثر | قبل 1967 | 36504 | 5458 | 41962 | 8.5 |
| غير مبيت | | 5589 | 832 | 6421 | 1.3 |
| المجموع | | 347537 | 147888 | 495425 | 100.0 |

**الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧، محافظة التأميم ، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء بغداد، ١٩٧٨.**

**پاشکۆی ژمارە (٩)**

التشـــكيلات الاداريــة

رقـم ٦٥٢

بسـم الله الرحمن الرحيم

## مرسوم جمهوري

استنادا الى أحكام الفقرة الاولى من المادة السادسة من قانون المحافظات رقم ١٥٩ لسنة ١٩٦٩ المعدل وبناء على ماعرضه وزير الداخلية

رسمنا بما هو آت :ـ

احداث ناحية في محافظة التأميم بأسم ناحية (الربيع) ترتبط بقضاء مركـــز كركوك ويكون مركزها في قرية ( قره هنجير ) وتتألف من المقاطعات المبينة أرقامها وأسماؤها أدناه :ـ

(٣) كوردكەی خان و(٤) ساتي و(٥) سيحان وسفلى و(٦) ميـدان عليا و(٧) بنا عليا وسفلى و(٢١) سفلي وكاوله جاف و(٢٢) كاوله و(٢٣) زنكنه و(٢٤) جمن كبير و(٢٥) خالد يازباني و(٢٦) جمن صغير و(٣١) هيبه و(٣٢) شـوريجه و(٣٣) جلقه و(٣٤) قره هنجير و(٣٥) ياش بولاق و(٣٦) شيخ جكري و(٤٢) عمر آغـده و(٤٣) تيمز آوا و(٥٢) شيره دره و(٦٣) قره ويس/ناحية قره حسن •

و(١٩) قرية قفار و(٢٠) سوردەی سفلى و(٢١) سوردەی عليا و(٢٢) بسرى جاف و(٢٣) دلو و(٢٤) كوران و(٢٥) آلم كاوه ومحمود فاته ودازبياه واوبازيلك و(٢٦) قرية يخته خان و(٢٨) كلاوتوت/ناحية شوان •

وتكون حدودها الادارية الحدود الخارجية للمقاطعات التالية :ـ

(١٩) و(٢٨) و(٢٥) و(٢٦) و(٦) و(٧) و(٣) و(٣٥) و(٣٦) و(٤٢) و(٦٣) و(٥٢) و(٤٣) و(٤٢) مرة ثانية و(٣٦) مرة ثانية و(٢٥) و(٢١) و(٢٣) و(٢٤) و(٣٢) و(٢٠) وهي من المقاطعات المذكورة أعلاه •

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرســـوم

كتب ببغداد في اليوم الحادي والعشرين من شهر ذي القعدة لســـنة ١٣٩٧هـ المصادف لليوم الثالث من شهر تشرين الثاني لسنة ١٩٧٧م

احمد حسن البكر
رئيس الجمهوريـة

سەرچاوە: الوقائع العراقيه عدد ٢٦٢١، ص ١٦٨٦، ١٩٧٧/١١/١٤.

**پاشکۆی ژمارە (١٠)**

بسم الله الرحمن الرحيم

## مرســـوم جمهـوري

## رقــم ( ٢٣٣ )

استنادا الى أحكام المـادة ( الرابعة ) من قانـون المحافظات رقـم ١٥٩ لسنة ١٩٦٩ ( المعدل ) ، وبناء على ما عرضه وزير الداخلية •

رسمنا بمـا هـو آت : ـ

نلك ارتباط المقاطعة المرقمة ( ٢٧ ) علي ميكائيل من قضاء جمجمال بمحافظة السليمانية والحاقها بناحية الربع التابعة لقضاء مركز كركوك بمحافظة التأميم •

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسـوم •

كتب ببغداد في اليوم العاشر من شهر جمادى الاخرة لسنة ١٣٩٩ هـ • المصادف لليوم السادس من شهر ايار لسنة ١٩٧٩ م •

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية

سەرچاوە: الوقائع العراقيه، عدد ٢٧١١، ص ٥٧٧، ١٩٧٩/٥/٢١.

## پاشکۆی ژمارە (١١)

# قرارات مجلس قيادة الثورة

استنادا الى احكام الفقرة ( أ ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت .

قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ ٢٠-١٠-١٩٨١ ما يلي :

١ ـ تشكل لجنة تنفيذية للاشراف على بناء المجمعات والوحدات السكنية في المحافظات الوسطى والجنوبية ( عدا بغداد ـ ديالى ـ صلاح الدين ) التي سيعين فيها العاملون في منطقة الحكم الذاتي وعلى النحو التالـي .

أ ـ وزير الحكم المحلي ـ رئيسا .

ب ـ وكيل وزارة الحكم المحلي ـ عضوا .

جـ ـ رئيس المؤسسة العامة للاسكان في وزارة الاسكان والتعمير ـ عضوا .

د ـ رئيس هيئة تخطيط التشييد والخدمات في وزارة التخطيط ـ عضوا .

٢ ـ تشكل اللجنة التنفيذية لجانا فرعيـة لهـا في المحافظات التي سيشملها بناء المجمعات السكنية برئاسة المحافظ وعضوية الجهات المعنية للاشراف على سير التنفيذ ، ولها ان تخولها بعض صلاحياتها.

٣ ـ يحدد كحد اقصى في المرحلة الاولى بناء ( ٢٠ ) الف وحدة سكنية .

٤ ـ تحدد المحافظات التالية كبداية لبناء الوحـدات السكنية المقترحة التي يتم نقل وتعيين العاملين فيها واليهـا وهي :

أ ـ محافظة القادسـية .

ب ـ محافظة المثنى .

جـ ـ محافظة ذي قار .

د ـ محافظة الانبار .

٥ ـ تقوم اللجان الفرعية بتحديد الشواغر المتوفـرة لديها ضمن محافظاتها وحسب الدوائر ووفقا للملاك المصدق مع مراعاة التوسع في الملاك للسـنوات الخمس القادمة وتحدد في كل محافظة حاجة كل دائرة من ذلك .

٦ ـ تقوم اللجان الفرعية بتحديد مواقع المجمعـات السكنية التي ستبنى ، على ان تكون ضمن مواقع سكنية قائمة في مراكز المدن والاقضية والنواحي .

٧ ـ تشمل المجمعات المذكورة بالامتيازات والاعفاءات الواردة في القانون رقـم ( ١٥٧ ) لسـنـة ١٩٧٣ لتسهيل مهمة التنفيذ وتخول اللجنة التنفيذيـة صلاحية التنفيذ بالطريقة التي تراها مناسبة .

٨ ـ تخول اللجنة التنفيذية صلاحية مجلس التخطيط فيما يخص الاحالة والدعوات والغرامات وزيادة الكلف .

٩ ـ تقوم اللجنة التنفيذية بالتنسـيق مع لجنة شؤون الشمال لاختيار العناصر المطلوب نقلها او تعيينها من القاطنين الى المحافظة المعنية ، عند انجاز المجموعة السكنية المنقولين او المعينين فيها .

١٠ـ تملك الوحـدات السكنية لشاغليها من العمـال والاكراد وفقا للاسـس التالية .

أ ـ تكون قيمة الدار وفق الكلفة الفعلية .

ب ـ تملك الارض مجانا .

جـ ـ يكون كامل سعر الدار قرضا من المصرف العقاري دون تقديم مقدمة ويسدد خلال مدة ( ٢٥ ) سنة دون فائدة .

١١ـ يكون نقل المعينين او المنقولين وعوائلهم الى مناطق عملهم الجديدة على حساب الدولة .

١٢ـ توضـع اسس مفصلة لكيفية تعيين او تأمين الاشخاص المطلوب نقلهم او تعيينهم وبالتنسيق مع لجنة شؤون الشـمال .

١٣ـ شمول بعض الموظفين والعمال من سكنة محافظـة التأميم ( التركمان ) بالدرجة الاولى والاكـراد بالدرجة الثانية .

١٤ـ يكون ارتباط اللجنـة التنفيذية بلجنة شـؤون الشمال لاغراض التوجيه .

١٥ـ تقدم اللجنة التنفيذية تقريرا دوريا كل ثلاثة اشهر ومن خلال لجنة شؤون الشمال الـى رئاسـة ديوان رئاسة الجمهوريـة لعرضـه على رئيس الجمهورية للاطلاع وتلقي توجيهاته بشأنها .

١٦ـ تتولى الجهات المختصة تنفيذ هـذا القـرار .

صـدام حسـين
رئيس مجلس قيـادة الثورة

سەرچاوە: الوقائع العراقيه، عدد ٢٨٥٦، ص ١٠٤٩، ١٩٨١/١١/٢.

**پاشکۆی ژمارە (١٢)**

## قرارات مجلس قيادة الثورة

### رقم ١٤٦٩

استنادا الى احكام الفقرة ( أ ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت .

قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ ١٩٨١/١٢/٣ ما يلي :ـ

اولا ـ تشكل بامر من محافظ ديالى لجنة او اكثر برئاسة قائمقام قضاء خانقين وعضوية ممثلين من منظمة حزب البعث العربي الاشتراكي ووزارة المالية ودائرة التسجيل العقاري في المحافظة تتولى اجراءات بيع دور المرحلين من قاطع خانقين وجلولاء والدور العائدة الى وزارة المالية والاموال المجمدة في القضاء المذكور وتكون قراراتها خاضعة للتدقيق من قبل لجنة تؤلف في مركز المحافظة برئاسة نائب المحافظ واعضاء اخرين من ذوي الاختصاص ينسبهم المحافظ ، يكون بضمنهم مدير امن المحافظة ، وتعتبر القرارات نهائية بعد مصادقة المحافظ عليها .

ثانيا ـ تقدر قيمة الدار في ضوء الاسعار السائدة وقت الترحيل ويجوز للجنة تخفيض بدل البيع بنسبة لاتتجاوز ( ٢٥٪ ) خمسة وعشرين من المائة من القيمة المقدرة بعد مصادقة المحافظ .

ثالثا ـ يجرى بيع الدور وفق هذا القرار للاشخاص الذين لايملكون دارا على وجه الاستقلال ووفق الضوابط التي تحددها التعليمات التي يصدرها النائب الاول لرئيس الوزراء .

رابعا ـ أ ـ يتعهد المشتري باشغال الدار بنفسه وافراد عائلته التي يعيلها شرعا حصرا ولايحق له ان يؤجرها الى الغير او ترتيب حق منفعة عليها او بيعها ويؤشر ذلك في السجل العقاري .

ب ـ اذا توفي المشتري فلورثته الشرعيين نقل ملكية الدار الى الغير بعد موافقة المحافظ .

خامسا ـ تسجل الدار في دائرة التسجيل العقاري باسم المشتري دون استيفاء اي رسوم .

سادسا ـ يصدر النائب الاول لرئيس الوزراء التعليمات في كل ما يتعلق بتسهيل تنفيذ هذا القرار .

سابعا ـ ينفذ هذا القرار من تاريخ صدوره .

صدام حسين
رئيس مجلس قيادة الثورة

### رقم ١٤٧١

استنادا الى احكام الفقرة ( أ ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت .

قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ ١٩٨١/١١/٢ ما يلي :ـ

١ ـ تصحح الفقرة ( ٤ ) من قرار مجلس قيادة الثورة المرقم ١٠٧٩ في ١٩٨١/٨/١٢ على الوجه الاتي :ـ
( ٤ ) ينقل الموظفون من منتسبي البلديات وامانة العاصمة العاملين في دوائر المرور لجباية الرسوم المنصوص عليها في قانون المرور رقم ٤٨ لسنة ١٩٧١ المعدل الى مديرية المرور العامة .

٢ ـ ينشر هذا القرار في الجريدة الرسمية .

صدام حسين
رئيس مجلس قيادة الثورة

### رقم ١٤٧٢

استنادا الى احكام الفقرة ( أ ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت .

قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ ١٩٨١/١١/٣ ما يلي :ـ

١ ـ إعادة المتقاعدة جنان شوكت صالح ( الموظفة بدرجة سكرتير اول في وزارة الخارجية ) الى الخدمة بنفس وظيفتها السابقة . وتعتبر الفترة بين تاريخ احالتها على التقاعد وتاريخ اعادتها الى الخدمة بمثابة خدمة فعلية لاغراض قانوني الخدمة الخارجية والتقاعد (فيما عدا استحقاق الراتب).

٢ ـ يتولى وزيرا الخارجية والمالية تنفيذ هذا القرار .

صدام حسين
رئيس مجلس قيادة الثورة

### رقم ١٤٧٤

استنادا الى احكام الفقرة ( أ ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت .

قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ ١٩٨١/١١/٣ ما يلي :ـ

١ ـ تطبق على المواطنين المتطوعين ممن يلتحقون بالقوات المسلحة للمشاركة في المعركة القومية ضد العدو الفارسي ؛ الاحكام المطبقة على مقاتلي الجيش الشعبي المساهمين في العمليات العسكرية ضد العدو الفارسي . وتعتبر فترة التطوع خدمة لكافة

الوقائع العراقية ـ العدد ٢٨٥٩ ١١٥٠ ١٩٨١/١١/٢٣

سەرچاوە: الوقائع العراقيه، عدد ٢٨٥٩، ص ١١٥٠، ١٩٨١/١١/٢٣.

٦. گۆڤاری (سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی)، ژمارە (٤)ی ساڵی چوارەم، کانونی دووەمی ١٩٩٦، سلێمانی، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(خەباتی کورد لە ڕوانگەی یاسای نێو دەوڵەتی یەوە)، نووسینی: د. جاسم توفیق خۆشناو.
٧. گۆڤاری (سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی) ژمارە (٢) ساڵی حەوتەم، مایسی ١٩٩٩، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(پێکهاتە نەتەوەیی دانیشتووان لە کوردستاندا)، نووسینی: جەزا توفیق تالب.
٨. گۆڤاری (سیاسەتی دەولی)، ژمارە سێ، ساڵی سێیەم، تشرینی یەکەمی، ١٩٩٤، سلێمانی، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(دوورابییە مێژووییەکانی دابەشبوونی جوگرافیای عەرەب لە عێراقدا)، نووسینی: د. خلیل اسماعیل.
٩. گۆڤاری (سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی)، ژمارە (٢)ی ساڵی هەشتەم، مایسی، ٢٠٠٠، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(گۆڕینی سنووری پارێزگای کەرکوك)، نووسینی: د. خلیل اسماعیل.
١٠. گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، ژمارە (٢٠)، هاوینی ٢٠٠١، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کێشەی بەعەرەبکردنی کەرکوك، لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ)، نووسینی: د. رفیق شوانی.
١١. گۆڤاری (کرکوك)، ژمارە (٢)ی ساڵی پێنجەم، ٢٠٠٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(دەروازەیەکی مێژووییانە بۆ ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ی شاری کەرکوك)، نووسینی: سمکۆ بەهرۆز محمد.
١٢. گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە(٥)، کەرکوك، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کاریگەری کۆچکردن لە سەر ژیانی کوردەکانی شاری کەرکوك، لێکۆڵینەوەیەکی ئەنثرۆپۆلۆجی مەیدانیە)، نووسینی: عەبدوڵڵا خورشید عەبدوڵڵا.
١٣. گۆڤاری (سیاسەتی دەولی)، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە(٤)ی ساڵی سێیەم، کانونی دووەمی ١٩٩٥، سلێمانی، ١٩٩٥، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(شۆڕش، دەسەڵات، دەوڵەت)، نووسینی: فەرید ئەسەسەرد.
١٤. گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە (١)ی ساڵی چوارەم، هاوینی، ٢٠٠٢، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(پارێزگای کەرکوك، لەناو پاکتاوی ڕەگەزیدا)، نووسینی: مەحمود سەعید سۆفی.
١٥. گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠٠١، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(سیاسەتی گۆڕینی واقعی نەتەوەیی کەرکوك لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ)، نووسینی: د. نوری تاڵەبانی.
١٦. گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە(٢)ی ساڵی پێنجەم، سلێمانی. ٢٠٠٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(ویلایەتی موسڵ لەلایەن ئینگلیزەوە لکێندرا بە دەوڵەتی عێراقەوە لەبەرژەوەندی خۆیی و لە بەر ئەوتی کەرکوك نەك لەسەر هەڵوێستی کورد)، نووسینی: د. نوری تاڵەبانی.
١٧. گۆڤاری (سیاسەتی دەولی) سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە (٣)ی ساڵی دووەم، تشرینی یەکەمی ١٩٩٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(سیاسەتی ئابووری عێراق ١٩٦٨-١٩٩٠)، نووسینی: هیوا تاڵەبانی.

**ب. بەزمانی عەرەبی:**

١. مجلة (نداء الحق)، العدد التجريبي، ١٩٩١، موضوع بعنوان:
(لماذا التهجير في كردستان بأسم الانفال)، كتابة: د. بختيار عةبدولَلاَ.
٢. مجلة (هاواری کەرکوك)، العدد (٤)، هەولێر، ١٩٩٩، موضوع بعنوان:
(اصل اسم كركوك)، كتابة: توفيق وهبي.
٣. مجلة كركوك، العدد (١٧)، سليَماني، ٢٠٠٣، موضوع بعنوان:
(قرن ونصف من التتريك والتعريب)، كتابة: د. جبار قادر.
٤. مجلة (كركوك)، العدد(٤)، لسنة ثالثة، سليماني ٢٠٠٢، موضوع بعنوان:
(كركوك، المدينة الضاحكة بالنار والنور)، كتابة: عوني داودي.
٥. مجلة (الثورة العربية)، العدد(٤)، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٩، موضوع بعنوان:
(نشوء وتكوين حزب البعث العربي الاشتراكي، من البواكير الاولى الى المؤتمر التأسيسي الاول).

**نۆیەم: سەرچاوەی ئەلکترونی:**

١. www. Wikipedia. Org/wihi/
٢. د. خليل اسماعيل محمد، كركوك في ظل الحقائق التاريخية والجغرافية. في موقع
www.kurdistan-times.org.

# سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی دژ بە کورد لە کەرکوك لە ساڵانی دوای ڕاپەڕیندا، توێژینەوەیەکی شیکاری لە بەڵگەنامە فەرمییەکاندا

د. سەعدی عوسمان هەروتی

*** شێوازەکانی پاکتاوی ڕەگەزی دژ بە کورد لە کەرکوکدا:**

لە ئەنجامی ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی (١٩٩١)دا هەلو مەرجێکی نوێ لە عێراق بە گشتیو کوردستان بە تایبەتی هاتە کایەوە، کە تیایدا حکومەتی بەعس وەك ڕژێمێکی شکست خواردووی وڵات وێران لە جەنگی دووەمی کەنداو و وەك دەسەڵاتێکی نیمچە سەرکەوتوو بەڵام ماندوو لە پرۆسەی سەرکووتکردنی ڕاپەڕین هاتە دەرەوە. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا کێشەی کورد لە عێراقدا پێی نایە قۆناغێکی نوێ، بە تایبەتی کە بەرێوەبەرایەتییەکی کوردی خۆجێی لەو ناوچانەی کوردستان دامەزرا کە دەسەڵاتی حکومەتیان لێ بەدەر نرابوو. مەسەلەی کورد سۆزو پشتوانییەکی نێودەوڵەتی بەدەست هێنا بە جۆرێك دەتوانین بڵێین لە ئاستی کێشەیەکی نێوخۆییدا نەماو گەیشتە ئاستێکی جیهانی[١].

سەرەڕای ئەم گۆڕانکارییە گرنگانە کە هاوکات لەگەڵیدا فشاری ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لەسەر حکومەتی سەدام بەردەوام بوو بۆ دامالینی لە چەکی کۆکوژ، بەڵام ئەم حکومەتە دەستبەرداری سیاسەتی پاکتاوکردنی ڕەگەزی نەبوو لەو ناوچە کوردییانەی کە لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا مابوونەوە. لەبەر ئەوەی ئەم سیاسەتو ڕەفتارانە بەشێکی گرنگی ستراتیژی ئەم حکومەتەیان پێکدەهێنا، لە پەیڕەو و پرۆگرامی حیزبی بەعسی دەسەڵاتداردا بە توندی ڕەگو ڕیشەی داکوتابوو[٢].

دەڤەری کەرکوك لە نێو ئەم ناوچە کوردییانەدا بوو کە لە ماوەی دوای ڕاپەڕین بە شێوەیەکی دڕندانە دووچاری سیاسەتی بە عەرەبکردنو شاڵاوی پاکتای ڕەگەزی بۆوە. ئەم دەڤەرە لە ئەنجامی هەندێ فاکتەری ئابووری (دەوڵەمەندی بە سامانی نەوت)و ستراتیژی لە ساڵانی بەر لە ڕاپەڕینیش گورزی هەرە گەورەی ئەم سیاسەتەی بەرکەوتبوو، کە لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا گەیشتە ترۆپك[٣].

سیاسەتی ناوبراو لەم قۆناغەشدا خاوەن سیماو تایبەتمەندی خۆی بوو، ئەگەر چی بە گشتی لە ئەنجامی هەمان هۆکارو بۆ هەمان ئامانج پیادە دەکرا کە بریتی بوون لە تواندنەوەی میللەتی کوردو سڕینەوەی مۆرکی کوردایەتی لە ناوچەکانی کوردستان. ئەمەش لە ڕێگەی کردارێکی گشتگیریو هەمەلایەنە کە دەسەڵاتدارانی بەعس خۆیان زاراوەی (تەعریب – بەعەرەبکردن)یان بۆ بەکاردەهێنا، تا لە ئابی ساڵی ٢٠٠٠ خۆیان شەرمیان لەم زاراوەیە کرد (یان لە ڕاستیدا هەستیان بە هەڵەی خۆیان کرد) بۆیە لە جیاتی ئەمە ووشەی (تطویر – پەرەپێدان)یان بۆ بەکارهێنا[٤].

پرۆسەی پاکتاوی ڕەگەزی لەم قۆناغەدا لەلایەك بەرتەسکتر بوو (بە حوکمی ئەوەی ناوچە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەت کەمتر بووە)[٥]، لە لایەکی تر شاڵاوی قڕکردنی هاوشێوەی ئەنفالی بەخۆوە بینی. بەڵام لەهەمان کاتدا پرۆسەکە لەم قۆناغەدا زۆر خێراترو بێ شەرمانەتر بوو هەروەها هەمە لایەنەش بوو (بێجگە لە چەند ساڵێکی کەمی دوای ڕاپەڕین کە لەم بوارەدا کەمێك نەرمی پیشان درا وەك بەرپرسێکی بەعس خۆی ئاماژە بەوە دەکات)[٦]. مەبەست لەم هەمە لایەنییە ئەوەیە کە سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی ئەم قۆناغە لە کەرکوك بە چەندین شێواز ئەنجامدرا وەك لێرە بەدوا هەوڵ دەدەین لە ڕێگەی تاوتوێکردنی بەڵگەنامەکانی حکومەتی بەعس بەدیاری بخەین:

**أ. شێوازی کارگێڕی:**

لە ساڵانی پێش ڕاپەڕین حکومەتی بەعس چەندین گۆڕانکاری کارگێڕی لە ناوچەکە ئەنجامدا کە مەبەستو ئامانجی شۆڤێنییان لە دواوە بوو، وەك ئەوەی هەندێ ناوچەیان لەو مەڵبەند کارگێڕییە دەکردەوە کە دەیانویست ئاکاری نەتەوەیی بگۆڕن، بۆ ئەوەی ڕێژەی دانیشتووانی کورد تیایدا کەم بێتەوە. لە کردارێکی پێچەوانەشدا لە هەندێ باری تردا چەند گوندێك یان شارۆچکەیەکی

کوردییان دەخستە سەر ئەو مەڵبەندە کارگێڕییەی کە سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزیو پرۆسەی بەعەرەبکردن تیایدا قۆناغێکی زۆری بڕیبوو، بۆ ئەوەی ئەم گوندو شارۆچکانەش ڕووبەڕووی هەمان چارەنووس ببنەوە(٧). بۆیە دەتوانین بڵێین گۆڕانکارییە کارگێڕییەکان وەك ئامرازێك بۆ سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی بەکاردەهێنرا.

دیارە لە ماوەی دوای ڕاپەڕینیش ئەم سیاسەتە هەر بەردەوام بوو، بەڵکو بە شێوەیەکی فراوانتریش پیادە کرا، دەبێ بایەخێکی زیاتریشی پێدرابێ، بە جۆرێك ئەم بڕیارانە لە شێوەی مەرسومی کۆماریو لەلایەن خودی (سەدام حوسێن)ی سەرۆکی ڕژێمەوە دەردەچوون. ئەوەتا لە بڕیارێکی لەم شێوەیە لە بەرواری (٢٥)ی ئەیلوولی (١٩٩٦) دا (٣٨) گوند، کەتا ئەو کاتە بە فەرمی سەر بە قەزای هەولێر بوون لە پارێزگای هەولێردا، خرانە سەر ناحیەی دووبز (الدبس)ی سەر بە پارێزگای کەرکوك (التأميم) کە لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی دابوو، لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی ئەژمار نەدەکرا، گرنگترین ئەم گوندانە ئەمانە بوون: (سەر بەشاخ، جاستان، شەناغە، سەرگەڕان، دەرمانـاو)(٨). دواتریش بە بڕیارێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش (مجلس قيادة الثورة) کە لە بەرواری (٢٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٠) لەلایەن خودی (سەدام حوسێن)ەوە دەچوو ناحیەی دووبز کرایە قەزایەك لە پارێزگای کەرکوكو گوندی (سەرگەڕان)یش کرایە مەڵبەندی ناحیە لەم قەزایەدا، ناوی (القدس)ی لێ نرا کە پێشتر هەڵوەشێنرابۆوە(٨).

جێگەی سەرنجە ئەم سیو هەشت گوندەی کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد دیارە زۆربەیان لە ناوچە کوردییە ئازادکراوەکان بوون بەڵام لە ئەنجامی شاڵاوە سەربازییەکەی لە ساڵی (١٩٩٦)دا حکومەتی بەعس خستبوونییەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بۆیە بەم شێوەیە لەگەڵ مەڵبەندو کارگێڕییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی گرێدان.

لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە فەرمانێکی نهێنی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمارەو بە ژمارە (ب (ق/ ٣٦٤٣٨))و لە بەرواری (٢٤)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٨)دا دەرچووە، بڕیار دراوە بە گێڕانەوەی ناحیەی (قەرە حەسەن)ی هەڵوەشاوەو گۆڕینی ناوەکەی بۆ ناحیەی (أم المعارك). ئەم ناحیەیەش کە دەبوو سەر بە قەزاری ناوەندی کەرکوك بێت (٤٠) گوندی پێوە گرێدرابوو، لە نێویاندا گوندەکانی (یارمجە، لەیلان، عەلیاوە، چیمەن، ساڵەیی، شوان)(٩).

جێگەی تێبینییە بەشی هەرە زۆری ئەم گوندانە لە کۆتایی هەشتاکاندا کەوتبوونە بەر سیاسەتی ڕاگواستنو ئەنفالو خاپوور کردن(١٠). ئەوەتا بەپێی ئامارێك بۆمان دەردەکەوێ کە تەنیا لە ساڵی (١٩٨٨)دا (١٥) گوند لە ناحیەی قەرەحەسەن وێران کراوە(١١). دواتریش ناحیەی ناوبراویان هەڵوەشاندبۆوە بۆ ئەوەی ئەم ناوچەیە لە کارگێڕی فەرمی دابڕن. بەڵام دیارە لە ساڵانی دواتر لە چوارچێوەی سیاسەتی جێنشینکردنی هۆزە عەرەبەکان لە دەوروبەری کەرکوك ئەم ناوچەیان ئاوەدان کردووەتەوە(١٢). بۆیە سەرلەنوێ حکومەت ئەم ناحیەیەی دامەزراندووەتەوە.

**ب. گۆڕانکاری دیمۆگرافی- ئەتنۆگرافی:**

گۆڕانکاری کردن لە بارودۆخی دیمۆگرافیو ئەتنۆگرافی ناوچەکانی کوردستان یەکێك بوو لە بنەما سەرەکییەکانی سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی کە حکومەتی بەعس لە هەمبەر کورد پیادەی دەکرد. بە هۆی ئەم گۆڕانکارییانە ڕژێم دەیویست مۆرکی کوردایەتی لە ناوچەکانی کوردستان بەرە بەرە بسڕێتەوە تا لە ئاکامدا میللەتێك بەناوی کورد لەسەر ئەم خاکە هەبوونی نەمێنێتو لە شوێنی ئەو ڕەگەزی عەرەبو کەلتوورەکەیان زاڵ بێت. لە ئەنجامی چەندین هۆکار. ئەم سیاسەتە لە کەرکوکدا بە شێوەیەکی کاریگەرانە جێبەجێ دەکرا، بۆیە مەسەلەی موڵکدارێتی خانووبەرە (عقارات) لەم شارەو دەوروبەریدا ڕەهەندێکی زۆر هەستیاری وەرگرتبوو لای دەسەڵاتدارانی حیزبی بەعس، بەجۆرێك (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) کە سەدام حوسێن سەرکردایەتی دەکرد لە (٧)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٣)دا بڕیاری ژمارە (٩٧)ی دەرکرد بۆ ئەوەی نەهێڵێ هیچ کردارێکی گواستنەوەی موڵکدارێتی خانووبەرە لە کەرکوكو دەوروبەریدا بێ ڕەزامەندی خودی پارێزگاری کەرکوك ئەنجام بدرێت(١٣). بێگومان ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە لەم ڕێگەیەوە دەستکاری باری دیمۆگرافیو ئەتنۆگرافی دەڤەرەکە بکەن. ئەم ئامانجەش بە شێوەیەکی گشتی بە چەند ڕێگەیەك هەوڵی بۆ دەدرا کە ئەمانە بوون:

**١. ڕاگواستنی کورد:**

لە پێناو کەمکردنەوەی ڕێژەی دانیشتووانی کورد لە کەرکوکدا حکومەتی بەعس لە ساڵانێکی زووەوە دەستی دابووە سیاسەتی ڕاگواستنی کورد لەم دەڤەرەدا، ئەوەتا بەڵگەنامەیەکی فەرمی ئاماژە بەوە دەکات کە لە ماوەی جەنگی عێراق- ئێراندا ژمارەیەکی گەورەی کوردان لە ناوەندی شاری کەرکوكو هەروەها ناوچەکانی شوانو قەرەحەسەنو قادر کەرەم بۆ هەردوو پارێزگای هەولێرو سلێمانی ڕاگوێزران، بەڵام سەرەڕای ئەمەش هێشتا ڕێژەی کوردان لە شاری کەرکوك بەر لە ڕاپەڕین دەگەیشتە (٤٠٪) وەك لە هەمان بەڵگەنامەدا هاتووە(١٤).

لە دوای سەرکووتکردنی ڕاپەڕینو دووبارە داگیرکردنەوەی کەرکوك حکومەتی ناوبراو بەشێوەیەکی خێراترو بەربڵاوتر ئەم سیاسەتەی پەیڕەو کرد(١٥)، هەروەکو لە بەڵگەنامە فەرمییەکانی ئەم ماوەیەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە. هەر ئەم بەڵگەنامانە بۆمان دیاردەخەن کە دەسەڵاتداران بە بیانووو هۆکاری جۆراو جۆر دانیشتووانە کوردەکانی کەرکوكو ناوچەکانی دەوروبەریان ڕادەگواست، یان دەتوانین بڵێین لەسەر هەندێ بنەمای دیاریکراو کە ئەوان ناویان دەنا (ضوابط) ئەو خێزانە کوردانەیان دیاری دەکرد کە کرداری ڕاگواستن دەیانگرێتەوە(١٦).

لە سەرەتادا دەبێ ئاماژە بە ڕووداوی (کۆڕەو) بکەین کە بە هۆی سەرکووتکردنی ڕاپەڕینو دووبارە داگیرکردنەوەی زۆربەی شارو ناوچەکانی کوردستان ڕووی داو لە ئەنجامدا هەزارەها خێزانی کورد لە ترسی دڕندایەتی بەعس ماڵو

خانووی خۆیان بەجێهێشت و بەرەو سنوورەکان رایانکرد. چونکە حکومەتی بەعس ئەم دەرفەتەی قۆستەوەو ڕێگەی نەدا زۆربەی ئەو کوردانەی کە لە ئەنجامی کۆڕەوەکە لە کەرکوک هەڵاتبوون بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان، هەرچەندە سەرکرایەتی کورد لە دانووساندنەکانی ئەو ساڵەدا داوای لە حکومەت کردبوو کە دەست لەم کارە هەڵگرێ[١٧]. بە ووردبوونەوە لە بەڵگەنامە نێوبراوانە بۆمان روون دەبێتەوە کە بەشێکی ئەم خێزانە کوردانەی لە کەرکوک ڕاگوێزراون لەوانە بوون کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەعسەوە (ئاماژەی ئاسایش – مؤشرات امنية) یان لەسەر بوو، وەك ئەم (١٥٧) خێزانەی کە لیژنەی کاروباری باکوور لە نووسراوی نهێنی ژمارە (٢٠/ ١٥٤٩)و بەرواری (١١)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٩٧) بڕیاری ڕاگواستنی دان[١٨]. بێگومان مەبەست لە (ئاماژەی ئاسایش) ئەوە بوو کە بنەماڵەکە یان ئەندامێکی هەستی کوردایەتی هەیە یان یەکێکیان ڕایکردووە بۆ دەرەوەی عێراق یان لە ناوچە کوردییە ئازاد کراوەکانە. چونکە لە بەڵگەنامەیەکی تردا داوای ڕاگواستنی هەندێ خێزانی کورد کراوە لە شاری خانەقین لەبەر ئەوەی ڕۆڵەکانیان چوونەتە ڕیزی خەباتی ڕزگاریخوازی کورد کە ئەوان پێیاندەگوتن (المخربين) وەك لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە[١٩].

لە کەرکوکیش هەنگاوی لەم جۆرەیان ناوەو تەنانەت دەستیان بەسەر موڵك و خانووی ئەو ماڵانەشدا گرتووەو بەسەر عەرەبە هاوردەکان دابەشیان کردووە[٢٠]. بەڵام هەندێ جاریش ناوچەیەك پڕۆژەیەکی گرنگی تێدا دامەزراوەو بە بیانووی زامنکردنی ئاسایشی ئەم پڕۆژە خێزانە کوردەکانی ئەم ناوچەیان ڕاگواستووە بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك، لە کاتێکدا دانیشتووانە عەرەب و تورکمانەکانیان لە ناوچەکانی دەوروبەری پڕۆژەکە سەرلەنوێ دامەزراندووەتەوە. وەك ئەم بارەی کە لە بەڵگەنامەیەکی ساڵی (١٩٩٨)ی حیزبی بەعسدا باس کراوە[٢١]. لە پاڵ ئەمانە بیانوویەکی کۆنیش هەمیشە لە ئارادا بوو، ئەویش بریتیی بوو لە ڕاگواستنی ئەو خێزانە کوردانەی کە تۆماری (نفوس)یان لە دەرەوەی پارێزگای کەرکوکە. ئەوەتا لە بەرواری (١١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٩٧) دا (٣٧) خێزان بەم بیانووە بڕیاری ڕاگواستنیان لە کەرکوك بۆ دراوە[٢٢].

تەنانەت لە کاتی دابەشکردنی زەوی بەسەر سەربازو هێزەکانی ئاسایشدا حکومەت ئەم سیاسەتەی لەبیر نەدەکرد، ئەوەتا لە ساڵی (٢٠٠١) پارێزگاری کەرکوك لە نووسراوێکیدا بۆ شارەوانی بە پشت بەستن بە نووسراوی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار داوا دەکات بۆ سەربازو ئاسایشە عەرەبەکان زەوی لە کەرکوك تەرخان بکرێت و ناعەرەبەکانیش لە دەرەوەی کەرکوك زەوییان پێ بدرێت[٢٣].

ئەوەی لێرەدا جێگەی تێڕامانە ئەوەیە کە دەسەڵاتدارانی بەعس لە چوارچێوەی ڕاگواستنی کورد لە پارێزگای کەرکوکدا تەنانەت دەستیان لەو کوردانەش نەدەپاراست کە یارمەتیدەرو چاوساغی دەزگا سیخوڕییەکانی بەعس بوون، وەك بەڵگەنامەیەکی ساڵی (١٩٩٦)ی پارێزگای کەرکوك بە ئاشکرا ئەمە دەردەخات [٢٤]. کەواتە زۆر ئاساییە ئەگەر ڕاگواستنی ئەو کوردانەش بگرێتەوە کە چەکی حکومەتیان هەڵگرتبوو بۆ دژایەتیکردنی شۆڕشی کورد (مەبەست جاشەکانە) بێجگە لە سەرۆکەکانیان کە پێیان دەگوترا (مستشار)[٢٥].

لەبەر ئەوەی ڕژێمی بەعس ئەزموونێکی دوورو درێژی هەبوو لە کرداری ڕاگواستنی کورد دا بۆیە مەسەلەیەکی بەڵگەنەویستە کە لەم بوارەدا بەرنامەو پلانی داڕێژراوی هەبێت، ئەوەتا لە نێو بەڵگەنامەکانی بەعسدا چەندین جار ئاماژە بە زاراوەی (پلانی ڕاگواستن – خطة الترحيل) کراوە[٢٦]. هەروەها باس لە جێبەجێ کردنی پرۆسەی ڕاگواستن بەپێی قۆناغی جیاجیا کراوەو هەر قۆناغێکیش ماوەیەکی دیاریکراوی بۆ دانراوە، بەدواداچوونی ئەم کردارەش دەسەڵاتداران داوای ڕاپۆرتی ناوبەناویان دەکرد بە تایبەتی بە شێوەی هەفتانە[٢٧]. دیارە لیژنەیەکیش لە کەرکوك پێکهێنراوە بە ناوی (لجنة الترحيل – لیژنەی ڕاگواستن) کە ئەرکەکانی لە ناوەکەی ڕا دیارە[٢٨].

سەبارەت بە پلانی ڕاگواستن تێبینی ئەوە دەکرێ کە لە نووسراوێکی ئەیلوولی ساڵی (١٩٩٧)دا سەرۆکی لیژنەی کاروباری باکوور (تەها یاسین ڕەمەزان) داوا لە پارێزگاری کەرکوك دەکات کە پلانێك دابنێن بۆ ڕاگواستنی (١٥٧) خێزانی کورد لە ماوەی سێ مانگداو بە شێوەیەکی (هێمنانە)[٢٩] لەمەوە دەردەکەوێ کە بەرپرسە باڵاکانی بەعس هێڵە گشتییەکانی پلانەکانیان داناوەو بەرپرسانی ژێرەوەش لە سەریان بوو ووردەکارییەکانی تەواو بکەن. ئەوەتا لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە دوو مانگ دواتر نووسراوە باس لە هەبوونی پلانێك دەکرێ کە لەلایەن بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگای کەرکوك داندراوە بۆ پیادەکردنی کرداری ڕاگواستن بە شێوەی (١٥) ماڵ لە هەر حەفتەیەکدا. ئەمەش لە بەر ئەوە بوو نەوەکو ڕاگواستنی کوردەکان بە شێوەیەکی فراوان کێشەیان بۆ دروست بکات بە تایبەتی ئەگەر بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی بێت، وەك لە هەمان بەڵگەنامەدا هاتووە[٣٠] دیارە مەبەستیان لەم کێشانە ئەو فشارە نێودەوڵەتییە بوو کە لەوانەبوو دروست بێت ئەگەر سیاسەتەکەیان بە زەقی و بە شێوەی بەرچاو پیادە بکەن.

سەرەڕای ئەم پلانە داڕێژراوانەش کرداری ڕاگواستن هەموو کات وەك ئەوەی دەسەڵاتداران دەیانویست بەڕێوە نەدەچوو، بە تایبەتی کە هەندێ خێزانی کورد لە ترسی ئەم سیاسەتە شوێنی دانیشتنی خۆیان دەگۆڕی بۆ ئەوەی پۆلیس و دەزگا سەرکووتکەرەکانی تر نەیاندۆزنەوە. لە نووسراوێکی ئەیلووی ساڵی (١٩٩٧)دا سەرۆکی لیژنەی باکوور داوا لە پارێزگاری کەرکوك دەکات بە دوای ئەو (١٤٥٥) خێزانە کوردە بگەڕێن کە جێگەیان دیار نییە، لە کاتی گرتن یان دۆزینەوەیان دەبێ دەستبەجێ دەربکرێن و پسوولەی ئازووقەیان لێ بسێنرێتەوە[٣١]. جێگەی ئاماژە پێدانە کێشانەوەی پسوولەی ئازووقە لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە وەك فشارێك بەکاردەهێنرا بۆ ملکەچ کردنی خێزانە کوردەکان بۆ بڕیاری ڕاگواستنیان.

هەروەها جاری وا هەبوو هەندێ خێزان دوای ڕاگواستنیان

دەگەڕانەوە بۆ كەركوك و خۆیان لە هەندێ شوێنی نادیاردا حەشاردەدا وەك ئەوەی خانوویەكیان بەكرێ دەگرت یان لە ماڵی كەسێكی نزیكیان یان لە كارگەو كۆگاكان دەحەوانەوە. بەڵام دەسەڵاتدارانی بەعس بۆ ڕێگەگرتن لەم دیاردەیە ئەو كەسانەیان بە بەندكردن سزا دەدا كە ئەم ڕاگوێزراوانە (یان ئەوانەی كە دەیانەوێ ڕایانبگوێزن دەحەوێننەوە)[32] هەروەها ئەو ماڵە ڕاگوێزراوانەشیان بۆ ماوەی مانگێك بەند دەكرد[33]، ئەم خێزانە كوردە ڕاگوێزراوانە لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە دوو ڕێگەیان لە بەردەم دادەنرا، ئەوانیش بریتی بوون لە كۆچكردن بەرەو ناوچە ئازاد كراوەكانی كوردستان، كە لە بەڵگەنامەكان پێی دەگوترا (ناوچەی ئۆتۆنۆمی) یان دەبوو پارێزگاكانی ناوەڕاست و باشووری عێراق هەڵبژێرن جگە لە هەردوو پارێزگای موسڵ و دیالە[34]، بەڵام دیارە زۆربەی یان هەموو ڕاگوێزراوەكان بەرەو ناوچە كوردییەكان كۆچییان كردووە وەك نووسراوێكی پارێزگای كەركوك بە ژمارە (١١٣٣)ی بەرواری (١٨)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩٩٨) ڕایدەگەیەنێ، ئەمەش جێگەی دڵخۆشی دەسەڵاتداران نەبوو چونكە دەیانزانی ئەم ڕاگوێزراوانە دەبنە هێزی زیادە بۆ حكومەتی هەرێمی كوردستان، هەروەها بەم شێوەیە خاكی كورد بە عەرەب دەكەن بەڵام كوردەكان بە عەرەب نابن. بۆیە پارێزگاری ناوبراو لە نووسراوەكەی پێشوودا داوا لە بەڕێوەبەری پۆلیس دەكات كە ڕاگوێزراوەكان هان بدەن بۆ ئەوەی پارێزگاكانی ناوەڕاست و باشووری عێراق هەڵبژێرن، لەم بارەشدا لە چەند خاڵێكدا سوودمەند دەبن كە گرنگترینیان بوون:

١. بردنی هەموو ماڵ و موڵكی لەگەڵ خۆی.

٢. وەرگرتنی پارچەیەك زەوی لەو پارێزگایەی كە بۆی دەگوێزرێتەوە.

٣. وەرگرتنی بڕی (٥٠ هەزار دینار).

٤. وەرگرتنی قەرزی بانقی خانووبەرە بۆ ئەوانەی فەرمانبەرن.

لەگەڵ چەندین ئاسانكاری تر[35].

سەبارەت بە ماڵ و موڵكی كوردە ڕاگوێزراوەكان تێبینی ئەوە دەكەین كە حكومەتی بەعس بەرە بەرە پێ درێژی كردووە و لەم لایەنەدا هەنگاوی دڕندانەتری هەڵێناوە. دیارە سەرەتا ماوەی سێ مانگ مۆڵەت بە هەر ڕاگوێزراوێك دەدرا بۆ ئەوەی موڵكە نەگوازراوەكانی بفرۆشێت، بەڵام لەبەر ئەوەی كرداری فرۆشتنە كە لەو خێراییە نەدەبوو كە دەسەڵاتداران دەیانویست بۆیە (تەها یاسین ڕەمەزان)ی سەرۆكی لیژنەی باكوور لە نوسراوێكی نهێنی بە ژمارە (١٧/٣٣)ی لە بەرواری (٤)ی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٦)دا ڕەزامەندی دەردەبڕێ لەسەر پێكهێنانی لیژنەیەك لە هەر یەكە لە پارێزگاكانی كەركوك و موسڵ و دیالە بۆ فرۆشتنی موڵكە نێوبراوەكان و بەخشینی نرخەكانی بە خاوەنەكانیان[36]. بێگومان لێرەدا خاوەنەكان زیانیان پێ دەكەوت چونكە كارێكی ئاسایی بوو كە لیژنەكە بەهەر نرخێ بێ دەیویست ئەم موڵكانە بفرۆشێت.

سەرەڕای ئەمەش هێشتا ئەم مەسەلەیە چارەسەر نەبوو چونكە كڕیاری بۆ هەموو خانووبەرەیە پەیدا نەدەبوو، بەتایبەتی كە ئەوانیش تەنیا بە ڕەگەزی عەرەبیان دەفرۆشت، بەو پێیەی كوردەكان نەیاندەتوانی خانووبەرە لە كەركوك بكڕن وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ كرد، ئەوەتا پارێزگاری كەركوك لە نووسراوێكیدا بە ژمارە (٥٠٤)و لە بەرواری (١٣)ی ئابی ساڵی (١٩٩٦)دا بۆ وەزیری ناوخۆ ڕوون دەكاتەوە كە دوای ڕاگەیاندن بۆ فرۆشتنی (٥٥) خانووی خێزانە ڕاگوێزراوەكان تەنیا سێ كڕیار لە مەزادەكە ئامادە بوون. لەبەر ئەوەی ئەم خانووانە دەكەونە ناوچە كوردییەكان و تەنیا عەرەبیش مافی هاتنە ناو موزایەدەیان هەیە. بۆیە ناوبراو پێشنیار دەكا پارێزگا ئەم خانووانە بە نرخێكی خەمڵێنراو بكڕێتەوە بۆ ئەوەی دواتر بە خۆڕایی بەسەر عەرەبە هاتووەكاندا دابەشی بكات[37]. ئەگەر هەڵوەستەیەك لەسەر ئەم هۆكارە بكەین كە پارێزگاری ناوبراو باسی دەكات، بۆمان بەدیار دەكەوێ كە عەرەبەكانی كەركوك (بە هاوردەكانیشەوە)یان هەموویان خانووی تایبەتی خۆیان هەبووە، پێویستییان بەم خانووانە نەبوو، یان نەیاندەویست لە گەڕەكە كوردنشینەكان نیشتەجێ بن یاخود موڵكیان هەبێ، دیارە هەستیان بەدڵنیایی نەدەكرد چونكە دەیانزانی ئەوان نامۆن لە كەركوك و ناتوانن تا سەر لەم شارەدا بمێننەوە. لە ڕاستیدا ئەم پێشنیارە پەسەند كراو لە بەڵگەنامەكانی تردا دەبینین كە ماڵە كوردەكان لە خانووەكانیان دەردەكرێن و لە بەرامبەر خانووەكانیان نرخێكی ڕەمزییان لە پارێزگا بۆ تەرخان دەكرێت بۆ ئەوەی ئەم كردارە بچێتە چوارچێوەی فرۆشتنی شەرعییەوە. ئینجا عەرەبە هاوردەكان دێنە سەر ئەم خانووە ئامادەو چۆڵكراوانە[38]، كە بە ڕواڵەت كڕاون بەڵام هەر حكومەت خۆی لە بەڵگەنامەكانیدا بە (دور مصادرة- خانووی دەست بەسەردا گیراو) ناوی دەبردن[39].

بەر لەوەی كۆتایی بە باسی مەسەلەی ڕاگواستن بێنین دەبێ ئاماژە بە نووسراوێكی دەستنووسی جێگری پارێزگاری كەركوك بكەین لە بەرواری (١٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٧)دا بۆ پارێزگاری ئامادە كردووە، لەم نووسراوەدا هەندێ ئاماری وورد لەسەر ڕاگواستنی كورد خراوەتە ڕوو، كە ئاماژە بەوە دەكەن دەسەڵاتدارانی بەعس لە ماوەی ساڵانی (١٩٩١- ١٩٩٥) تەنیا (٣٥٧) خێزانیان ڕاگواستووە، بەڵام لە هەر سێ ساڵی (٩٥- ٩٦- ٩٧) ئەم ژمارەیە بەرز بۆتەوە بۆ (١٨٢٠) خێزان و بڕیاریش بوو ڕاگواستن (١٨٤٣) خێزانی تر بگرێتەوە[40]. ئەگەر لەم ئامارانە وورد بینەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە ژمارەی ڕاگوازراوان لە ماوەی یەكەمدا لەبەر ئەوە كەمترە لە چاو ساڵانی دواتر چونكە حكومەتی بەعس لە دوای ڕاپەڕین بۆ ماوەیەك پەندی لە ئەزموونی ڕاپەڕین وەرگرت و نەیدەویست دڕندایەتییەكەی بە شێوەی پێشوو زۆر زەق و بەرچاو بێت.

**٢. هاوردن و جێنشینكردنی عەرەب:**

لە ساڵانی بەر لە ڕاپەڕین ژمارەیەكی زۆری عەرەبی هاوردە لە كەركوك و ناوچەكانی دەوروبەری نیشتەجێ كرابوون بۆ ئەوەی گۆڕانكاری لە باری ئێتنۆگرافی دەڤەرەكەدا

بکەن[٤١]. بۆ مانەوەی ئەم هاوردانە چەندین هەنگاویان هەڵێنابوو، جۆرەها ئاسانکارییان پێشکەش کردبوون، وەك تەرخانکردنی زەوی کشتوکاڵی بۆ جووتیارەکانیان و گواستنەوەی سەربازەکانیان بۆ یەکە سەربازەییەکانی نزیك شوێنی نیشتەجێبوونیان و چەندین کاری تری لەم جۆرە[٤٢] سەرەڕای هەموو ئەمانەش عەرەبە هاوردەکان لە ئەنجامی ڕاپەڕینی ئاداری ساڵی (١٩٩١)و ڕزگارکردنی کەرکوك لەلایەن کوردەوە مەترسییان لێ نیشت و بۆیان ڕوون بۆوە کە ئەوان ناتوانن هەتا سەر ماف و موڵکی کوردەکان زەوت بکەن. بۆیە دەبینین ژمارەیەکی زۆری ئەم عەرەبانە داوای گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان پێشکەش بە حکومەت دەکەن کاتێ گوێ بیست دەبن کە ڕێگەیان پێدراوە بگەڕێنەوە، ئەم زانیارییە لە نووسراوێکی نهێنی ژمارە (١٧٤٤/٣٨)و لە بەرواری (٢١)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٣)دا کە لە لقی کەرکوکی حیزبی بەعسدا هاتووە و تیایدا ئەمینداری لق داوا دەکات فشاری ماددی بخرێتە سەر ئەم عەرەبانە بۆ ئەوەی ئەوانی تر چاویان لێ نەکەن و ئەوانەش پاداشت بکرێن کە بڕیاریان داوە لە شوێنی خۆیان بمێننەوە[٤٣]، هاوکات لە گەڵ ئەمەدا دیاردەیەکی تریش لە ئارادابوو وەك لە ڕاپۆرتێکی فەرمی ساڵی (١٩٩٦)دا هاتووە، ئەویش ئەوەبوو کە لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٩١)دا ژمارەیەکی زۆری کوردی دانیشتووی ناوچەی ئۆتۆنۆمی (ئازاد کراو) بەرەو کەرکوك ڕەویان کردو لە نێویاندا هەندێ خێزان هەبوون کە بەر لە ساڵی (١٩٩٠) لە کەرکوك ڕاگوێزرابوون، دیارە ئەم تەوژمە بەڕادەیەك بەرچاو بووە کە ڕێژەی دانیشتووانی کورد لە کەرکوکدا گەیشتووەتە نزیکەی (٦٠٪)، تەنانەت هەندێ گەڕەکی تەواو عەرەبی بوونەتە کوردنشین وەك گەڕەکەکانی (الكرامة)و (ئیسکان) و (شورتە)و (شۆڕیجە). ئەمەش لەبەر ئەوەی دانیشتووانە عەربەکانیان دوای ڕاپەڕین بەجێیان هێشتوون، وەك لە ڕاپۆرتە ناوبراوە کە دەردەکەوێ[٤٤].

لە ئەنجامی ئەم بارودۆخ و هەڵوێستە، کە بێگومان بە دڵی ڕژێمی بەعس نەبوو لە بەڵگەنامەکاندا تێبینی ئەوە دەکرێ کە لەو ماوەیەدا ڕژێمی ناوبراو بە شێوەیەکی دڕندانەترو بەرنامە ڕێژتر، لە هەمان کاتیشدا فراوانتر ڕەگەزی عەرەبی لە دەڤەری کەرکوك نیشتەجێ کردووە. تەنانەت لاسایی هەردوو دەوڵەتی ئیسرائیل و سوریایان کردووەتەوە لە دامەزراندنی نشینگەو کۆمەڵگەی نیشتەجێی عەرەبی لە ناوچە کوردنشینەکان بۆ ئەوەی پشتێنەیەکی ئاسایش (الحـزام الامـني) لە دەوری کەرکوك دروست بکەن وەك لە بەڵگەنامەیەکی ساڵی (٢٠٠٠)دا بەرپرسانی بەعس خۆیان ئاماژەیان بەمە کردووە[٤٥]. ئەوەتا لە نووسراوێکی پارێزگاری کەرکوك بە ژمارە (٤٨٢)ولە بەرواری (١٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٥)دا باس لە دروستکردنی گوندێك و کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێبوون کراوە بۆ هۆزە عەرەبەکان لە شارۆچکەی پردێ وناحیەی (القدس – سەرگەڕان)ی هەڵوەشاوە، هەروەها گوندێك لە ڕێگای (کەرکوك – لەیلان)و پێنج کۆمەڵگەش لە ناوچەی دارەمان لە گوندەکانی (کەڵوڕ، نەبیاوە، گەڵۆزی گچکە، یارمجە) بۆ هەمان مەبەست دامەزراوە[٤٦]. شایانی باسە زۆر جار حکومەت بۆ جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە دەستی دەگرت بەسەر موڵك و زەویوزاری کوردان لە بەرامبەر نرخێك کە خۆی دیاری دەکرد[٤٧]. بۆ نموونە لە نووسراوێکی لیژنەی باکوور بۆ پارێزگاری کەرکوك بە ژمارە (١٥٣٦/٢٠)و لە بەرواری (١٠)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٩٧)دا ڕەزامەندی پیشاندراوە لە سەر دامەزراندنی سێ کۆمەڵگەی نیشتەجێبوون بۆ هۆزە عەرەبەکان، یەکێکیان لە کەرتی (تۆراغ)و دووەمیان لە مەڵبەندی ناحیەی (شوان)ی هەڵوەشاوەو سێیەمیش لە ناحیەی (قەرەهەنجیر – الربیع)ی هەڵوەشاوە. هەروەها بڕیار دراوە لەم ناوچانەی کە هۆزە عەرەبەکانی تێدا نیشتەجێ دەکرێن (٢٠٠) دۆنم بدرێتە هەر جوتیارێك و (٣٠٠) دۆنمیش بۆ سەرۆك هۆزەکە[٤٨]. لە نووسراوێکی تری هەمان ئەو ماوەیەدا کە تایبەتە بە تەرخانکردنی زەوی ناوچە کوردییەکان بۆ هۆزە عەرەبە هاوردەکان، بۆ دەسەڵاتداران ڕوون کراوەتەوە کە:

– هیچ ڕووبەرێکی بەتاڵ و تەریك نەماوە لە تەوەری شوان کە بەسەر هۆزە عەرەبەکان دابەش نەکرابێ.

– هیچ زەوی و زارێکی کشتوکاڵی چۆڵ و بەتاڵ نەماوە لە تەوەری شوان و ئاڵتون کۆپری کە بەسەر هۆزە عەرەبەکان دابەش نەکرابێ.

– هیچ زەوییەکی موڵکی تایبەت نییە لە تەوەری شوان– ئاڵتون کۆپری کە دابەش نەکرابێتە سەر هۆزە عەرەبەکان[٤٩].

کاتێ دەسەڵاتدارانی بەعس بەم شێوەیە هەندێ هۆزی عەرەبیان وەك داشی دامە بۆ سیاسەتی بەعەرەبکردن بەکارهێناوە و لەم پێناوەدا سوودو قازانجی زۆریان پێداون. ئەمە وای لە هەندێ هۆزی عەرەبی تریش کردووە کە داوا بکەن شوێنی نیشتەجێ و زەوی و زاریان لەسەر حیسابی کوردان بۆ دابین بکرێ وەك هۆزی (الجمیلة)[٥٠].

بێگومان هاوکات لەگەڵ ئەمانەدا لەناو شاری کەرکوکیش پرۆسەی هێنان و نیشتەجێکردنی ڕەگەزی عەرەب لە ئارادا بوو. لە نووسراوێکی حیزبی بەعسدا کە لە شوباتی ساڵی (١٩٩٤)دا دەرچووە ئاماژە بەوە کراوە کە زەوی نیشتەجێبوون بۆ ژمارەیەکی زۆر لە ئەندام و کادیرە عەرەبەکانی حیزب تەرخان کراوە[٥١]. لە نووسراوێکی پارێزگای کەرکوك بۆ لیژنەی باکوور لە بەرواری (١٥)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٧)دا چەند پێشنیارێك خراونەتە ڕوو لە پێناو ڕاکێشانی ژمارەیەکی زۆری عەرەب بۆ دانیشتن لە شاری کەرکوك و بەرز کردنەوەی ڕێژەی ئەم ڕەگەزە تیایدا. کە ئەمانە بوون:

١. تەرخانکردنی داهاتی گومرگی سلێمانی بۆ بنیادنانی خانووی کەم تێچوو لە شارەکەدا.

٢. دروستکردنی خانووەکانی نیشتەجێبوون لە نزیك ئەو گەڕەکانەی کە ڕێژەیەکی گەورەی کەمایەتییەکانی تری تێدایە (مەبەست کوردو تورکمانە).

٣. دابەشکردنی ئەم خانووانە بەسەر عەرەبە هاوردەکان.

ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هەمان ئەو نووسراوە ئاماژە بەوە دەکات کە بە پێ ئاماری ساڵی (١٩٩٧) لە پارێزگای ناوبراودا ڕێژەی (٧٣٪)و لە خودی شاری کەرکوکیش

(٥٨٪) بوو[٥٢]. بێ گومان بەرزبوونەوەی ڕێژەی عەرەب بەم شێوەیە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر خێرایی و کاریگەری سیاسەتی بەعەرەبکردن لەم ماوەیەدا.

لێرەدا ئەوە ماوە بڵێین کە دەسەڵاتدارانی بەعس لە سیاسەتی هێنان و نیشتەجێکردنی عەرەبەکان لە کەرکوك هەندێ بنەماو ڕێ و شوێنیان دانابوو کە پەیڕەویان دەکرد: لە پێش هەموو شتێکدا ئەوان مەبەستیان بوو ڕەگەزی عەرەب بهێننە کەرکوك ئەگەر عێراقیش نەبێ، بۆیە دەبینین هەندێ عەرەبی میسریشیان لە کەرکوك نیشتەجێ کردووەو بۆ ئەم مەبەستە زەوییان پێداون[٥٣]. ئینجا زیاتر ئاراستەکە بەرەو ئەوەبوو کە عەرەبی دەرەوەی پارێزگای کەرکوك بهێننە ئەم پارێزگایە[٥٤]، بێگومان بۆ ئەوەی کار لە ڕێژەی دانیشتووان بکەن. بۆ ئەوەی ئەم عەرەبە هاوردانە بە تەواوی پەیوەندییان بە شوێنی ڕەسەنی خۆیان بپچڕێ مەرجیان بۆ دادەنان کە دەبی تۆماری نفوس و هەروەها پسوولەی ئازووقەیان بگوازنەوە بۆ شوێنی جێنشینکردنی تازەیان. لە چەندین بەڵگەنامەدا ئەمە دووپات کراوەتەوە[٥٥]. تەنانەت لە هەندێ باردا فشاری توونديان دەخستە سەر ئەوانەی کە ئەم کارەیان ئەنجام نەداوە، ئەوەتا لە ساڵی (١٩٩٧)دا بەرووبومی دانەوێڵەی چەند جووتیارێکی عەرەبی هاوردەیان بە شێوەیەکی کاتی دەست بەسەرداگرت تا تۆمارەکانیان دەگوازنەوە ئەو شوێنەی کە بۆی هاتوون[٥٦].

لە لایەکی تر بۆ ئەوەی هۆزە عەرەبە هاوردەکان بتوانن بەرگری لە مانەوەیان بکەن لەم شوێنانەی پارێزگای کەرکوك کە تیایدا نیشتەجێ کراون، دەسەڵاتداران بڕیاریان دابوو ئەم هۆزانە چەکدار بکرێن وەك لە بەڵگەنامەیەکی ساڵی (١٩٩٦)دا دەردەکەوێ[٥٧]. لە ساڵانی بەر لە ڕاپەڕینیش ئەم هۆزە عەرەبیانەی کە ڕەتیان دەکردەوە چەك هەڵبگرن بەوە تاوانبار دەکران کە لەگەڵ پێشمەرگەکان (المخربین) هاریکارن[٥٨]. بێگومان ئەمەش وەك فشارێك بوو بۆ سەر ئەم هۆزانەی دوایی.

مەسەلەیەکی بەڵگە نەویستیشە کە ڕژێم چەندین ئاسانکاری ئەنجام دەدا بۆ نیشتەجێکردنی هۆزە عەرەبەکان لەو ناوچانەی کە دەیەوێ، بە تایبەتی لە لێدانی بیری ئیرتیوازی و ڕاکێشانی تەزووی کارەبا و هی تر[٥٩].

لە کۆتاییدا خاڵێك هەیە کە جێگەی سەرنجە ئەویش ئەوەیە کە بەشێکی کەمی ئەم عەرەبە هاوردانە ڕۆشنبیرو خاوەن بڕوانامەی خوێندن بوون، ئەوەتا سەرەڕای ئەم هەموو لێشاوەی هێنانی ڕەگەزی عەرەب بۆ کەرکوك کەچی لە ساڵی (١٩٩٧)دا لە هەموو شارەوانییەکانی کەرکوك تەنیا ئەندازیارێکی عەرەب نەبوو، وەك بەڕێوەبەری شارەوانییەکان خۆی وا دەڵێ[٦٠]. هەروەها بەرپرسانی پەروەردەش هەندێ جار سکاڵایان پێشکەش کردووە لەبەر کەمی مامۆستا[٦١].

### ٣. گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی:

لە پێناو سڕینەوەی مۆرکی نەتەوایەتی کوردی لە دەڤەری کەرکوك و بە ئاکام گەیشتنی سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی لەم دەڤەرەدا، دەسەڵاتدارانی بەعس هەوڵیان دا بە تەواوی سیما و ڕووخساری بگۆڕن و کاڵای عەرەبی بە باڵای کەرکوکدا بکەن. لەم بوارەدا هەوڵەکانیان دوولایەنە بوو:

#### لایەنی یەکەم:

جوگرافیا و شوێن و دیاردەکانی شارستانی گرتەوە، بێگومان لە ساڵانی بەر لە ڕاپەڕینیش ئەم مەسەلەیان بە بیردا هاتبوو، هەڵمەتێکی فراوانی بەعەرەبکردنی ناوی گەڕەك و ناوچەو مزگەوت و قوتابخانەو کتێبخانەکانیان پیادە کردبوو[٦٢]. کە دیاردەترین کاریان لەم بوارەدا گۆڕینی ناوی پارێزگاکە بوو لە (کەرکوك)ەوە بۆ (التأمیم) بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە (٤١)و لە بەرواری (٢٩)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٦)دا[٦٣]. تەنانەت دارخورمایەکی زۆریان لەسەر شەقامە گشتییەکانی کەرکوکدا چاند هەر بۆ ئەوەی ڕووکارێکی عەرەبانە بدەن بە شارەکە[٦٤].

لە دوای ڕاپەڕینیش ئەو هەوڵانە هەر بەردەوام بوون، بۆ نموونە بەپێی فەرمانێکی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار لە (٢٤)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٨)دا ناوی ناحیەی قەرەحەسەن گۆڕا بۆ (أم المعارك)[٦٥]. جێگەی پێکەنینە کە حکومەتی بەعس لە هەزارەی سێیەمیش دەستبەرداری ئەم کردارانەی نەبوو، ئەوەتا پارێزگاری کەرکوك لە نووسراوی ژمارە (٥٤٧)و لە بەرواری (١)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠١) دا بڕیاری پێکهێنانی لیژنەیەك دەدات بۆ گۆڕینی ناوی گەڕەکەکانی شاری کەرکوك و قەزاو ناحیەو گوندەکانی کە ناوەکانیان کوردییە بۆ ناوی عەرەبی وا کە کرۆکی نەتەوەییان هەبێ[٦٦]. لە بەرواری (١١)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠١)دا داوا لە شارەوانی کەرکوك دەکات کە ناوی ئەو دوکان و شوێنە بازرگانییانە بگۆڕێن کە عەرەبی نین بۆ ناوی عەرەبی وا کە بگونجێ لەگەڵ هەلومەرجی ئەو کاتە[٦٧].

#### لایەنی دووەمی:

ئەم سیاسەتە مرۆڤەکانی دەگرتەوە، ئەمەش کاتێك دەسەڵاتدارانی بەعس لەژێر فشاری ڕاگواستن و دەربەدەرکردن هەندێ لە خێزانە کوردەکانیان ناچار دەکرد کە ڕەگەزو نەتەوەی خۆیان لە کوردییەوە بگۆڕن بۆ عەرەب. ئەم کردارە کە لەژێر ناوی (تصحیح القومیة – ڕاستکردنەوەی نەتەوە) ئەنجام دەدراو چەندین خێزانی کورد لە ناچاری پەنایان بۆ دەبرد[٦٨]، لەلایەن حکومەتی بەعسەوە لە پاڵ سیاسەتی ڕاگواستن پەیڕەو دەکرا. چونکە بەم شێوەیە دەیانتوانی لە ڕێگەی گۆڕینی تۆمارە فەرمییەکان باری ئەتنۆگرافی کەرکوك بە لای ڕەگەزی عەرەبدا بشکێننەوە. بە تایبەتی کە هاوکات لەگەڵ ئەمەدا قەدەغەیان کردبوو عەرەبەکان ڕەچەڵەکی نەتەوەیی خۆیان بگۆڕن بۆ نەتەوەیەکی تر[٦٩].

ئەم کوردانە کە پەنایان بۆ ئەم ڕێگا چارەیە بردووە لە پێناو ئەوەبوو کە لە چەوسانەوە ڕزگاریان بێت و هەمان مافی دانیشتووانە عەرەبەکانی کەرکوکیان هەبێت لە خاوەندارێتی و نیشتەجێبوون و کارکردندا، بەڵام هەرگیز بە چاوی یەکسانی سەیر نەکراون لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە. ئەوەتا پارێزگاری کەرکوك کاتێك لە ساڵی (١٩٩٧)دا تێبینی ئەوە دەکات کە

ژمارەیەکی زۆری ئەم کوردانە خانووبەرەو زەوی کشتوکاڵی دەکڕن و بە ناوی خۆیانەوە تۆماری دەکەن و بەو پێیەی بە عەرەب ئەژمار دەکرێن، لە نووسراوێکدا بۆ لیژنەی باکوور پێشنیاری ئەوە دەکات کە ئەمانە ئەگەر تۆماری (نفوس)یان هی دەرەوەی پارێزگای کەرکوکە ئەم مافە نەیانگرێتەوە[70].

لە نووسراوێکی تردا کە ژمارە (٩٤٦)ی هەڵگرتووەو لە بەرواری (١)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٩٨)دا ئاماژە بەوە دەکات کە سەرۆکی لیژنەی باکوور فەرمانی داوە ئەگەر دانیشتووانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی (ڕاستکردنەوەی نەتەوە) شیان کردبێ ئەمە بیانوی نیشتەجێبوونیان لە پارێزگای کەرکوک ناداتێ و مانەوەیان لەوێ هەر کاتییەو جێگەی خۆشحاڵی ئەوان نییە[71].

لە ساڵی (٢٠٠٠)دا بەرپرسانی باڵای حکومەت بڕیاریان داوە کە ئەم جۆرە کوردانە تەنیا ئەگەر دانیشتووی شاری کەرکوک بن و لە ئاماری (١٩٥٧)دا لەوێ ناویان هەبێ ئینجا دەتوانن مولکیان لەو شارەدا هەبێت، بەڵام ئەگەر تۆمارەکانیان لە قەزاو ناحیەکانی پارێزگای کەرکوک بێ و لە ئاماری ساڵی (١٩٥٧)دا ناویان لەوێ هەبێ ئەوانە مافی مولکدارییان نابێ لە شاری کەرکوک، بەڵکو تەنیا دەتوانن لەم قەزاو ناحیانە مولك بکڕن[72]. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە عەرەبەکان لە هەر ناوچەیەکی عێراقدا هاتبان دەیانتوانی لە هەر جێگایەکی پارێزگای کەرکوک دانیشن و مولکیان هەبێ، وەك پێشتر بۆمان روون بۆوە.

**ج. بواری پەروەردەو فێرکردن:**

بێگومان پەروەردەو فێرکردن بوارێکی زۆر هەستیارە لە هەر کۆمەڵگایەکدا لەبەر ئەوەی بناغەی هۆشیاری و رۆشنبیری کۆمەڵ لەوێرا دادەمەزرێ و گەشە دەکات، بۆیە ڕژێمی بەعس ئەم لایەنەی زۆر بەلاوە گرنگ بوو لە سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزیدا کە لە هەمبەر کوردانی کەرکوك پەیرەوی دەکرد. بە شێوەیەکی تایبەتی مەبەستیان بوو بە گیانێکی نەتەوە پەرستی عەرەبی و بەعس قوتابییەکان پەروەردە بکەن و زمان و رۆشنبیریی عەرەبی لە نێویان بڵاوبکەنەوە، بە تەواوی رۆشنبیری کوردی فەرامۆش بکەن، بەتایبەتی کە لە ساڵانێکی زووەوە خوێندن بە کوردی لە پارێزگای کەرکوك قەدەغە کرابوو بەو پێیەی لەگەڵ پارێزگاکانی ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی ئەژمار نەدەکرا[73].

لەم چوارچێوەیەدا وەزارەتی پەروەردە لە ساڵی (١٩٩٣) دا لە رێنماییەکانیدا بۆ بەرێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی پارێزگای کەرکوك ڕایگەیاند کە نابێ بێجگە لە عەرەب هیچ ڕەگەزێکی تر لە دامەزراوە پەروەردەییەکانی کەرکوك دابمەزرێ، تەنیا ئەم کوردو تورکمانانە نەبن کە ئەندامن لە حیزبی بەعسدا یان رۆڵەی ئەندامانی حیزبن[74]. سەرباری ئەمەش لیژنەی باکوور لە ناوەندی و ئامادەیی (١٥٩) مامۆستای سەرەتایی لە هەردوو ڕەگەزو (١٥) فەرمانبەر لەگەڵ (١٤٦) فەرمانبەری خزمەتگوزار (پاسەوان و بەردەست) بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك کە هەموویان کورد بوون. بڕیاریش بوو ئەم کارە قۆناغ بە قۆناغ ئەنجام بدرێت، بەڵام دیارە بەرپرسانی حیزبی بەعس لە کەرکوك داوای دواخستنی ئەم بڕیارەیان کردووە لەبەر ئەوەی گواستنەوەی ئەم ژمارە زۆرەی مامۆستاو فەرمانبەران کەلێنێکی گەورە دروست دەکات و هەروەها لەوە دەترسان ئەم مەسەلەیە کێشەیان بۆ بنێتەوە[75].

لە لایەکی تر بەعسییەکان دەیانویست کۆنترۆڵی هەموو دیاردەو جموجۆڵێك بکەن لە قوتابخانەکاندا بە پێچەوانەی خواست و ئارەزووی شۆڤینستانەی ئەوان بوو، تەنانەت ئەگەر ئەم دیاردەیەی، کە ئەوان بە مەترسیان دادەنا، بریتی بێت لە ئاخاوتنی قوتابیانی کوردو تورکمان و سریانی بە زمانی زگماکی خۆیان لە کاتی پشووی نێوان وانەکاندا. ئەوەتا لە ساڵی (١٩٩٩)دا پارێزگاری کەرکوك چەند رێنماییەکی بەسەر قوتابیانی قوتابخانەکان و مامۆستایاندا سەپاندا کە ئەمانەن:

١. قەدەغەیە زمانەکانی کوردی و تورکمانی و ئاشووری و کلدانی لەلایەن مامۆستایان بەکاربهێنرێت لە کاتی وانە گوتنەوەو روونکردنەوەی ڕستە گرانەکان.

٢. نابێ ئەم زمانانە لەلایەن مامۆستایانەوە لەگەڵ قوتابیان بەکاربهێنرێت لە کاتی پشووی نێوان وانەکانیشدا.

٣. نابێ بە هیچ جۆری قوتابیانی قوتابخانەکان لە نێوان خۆیاندا هیچ زمانێك جگە لە زمانی عەرەبی بەکاربهێنن[76].

**د. چەوساندنەوەی ئابووری:**

بێگومان مانەوەی هەر گروپێکی دیموگرافی یان ئیتنوگرافی لە ناوچەیەکی جوگرافیدا پەیوەستە بە خاڵێکی بنەڕەتی ئەویش ئەوەیە کە ئەم ناوچەیە تا چەند پێداویستییە ئابوورییەکان و بژێوی ژیانی ئەم گرووپە دابین دەکات، حکومەتی بەعسیش، کە ڕژێمێکی گشتگیر (شمولی) بوو، لە سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی دژ بە کورد لە کەرکوکدا ئەم خاڵەی زۆر بە هەند هەڵگرتبوو، بە چەندین ڕێگە هەوڵی دەدا بنەماو بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی کورد لەم دەڤەرەدا لە نێوببات، ڕەگ و ڕیشەی کورد لە بنەوە هەڵتەکێنێ، یەکێك لەو ڕێگایانە ئەوەبوو کە دەرفەتی کار لە بەردەم کوردانی کەرکوك کەم بکەنەوەو بەڵکو بەرە بەرە نەیهێڵن، بۆیە حکومەتی بەعس بڕیاری دابوو کە ڕەگەزی کوردو هەروەها تورکمانیش لە فەرمانگەکانی دەوڵەت دانەمەزرێن.

بەڵام لە هەندێ باری زۆر دەگمەن و لە ناچاریدا ڕەزامەندییان پیشانداوە کە بە پێچەوانەی بڕیارەکە کار بکەن، ئەوەتا پارێزگاری کەرکوك لەبەر کەمی دەستی کار کە لە نێو ڕەگەزی عەرەبی بۆ ئەوەی بۆشاییەکانی کارگەی مافووری دەستکرد پڕبکەنەوە، سکاڵای بردووەتە بەر لیژنەی باکوور، دیارە لیژنەی ناوبراویش لە نووسراوێکی ژمارە (١٣٦/٢)و لە بەرواری (١٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٥)دا ڕەزامەندی پیشانداوە کە ئافرەتانی کوردو تورکمان بە شێوەی (استثناء) لەم کارگەیە دابمەزرێن بەڵام (بە مەرجێ دەبێ لە بنەماڵە بەعسییەکان بن و لەلایەن حیزب و ئاسایشەوە پاکانە بکرێن و هەروەها ژمارەیان لە نیوەی ژمارەی داواکراو بۆ دامەزراندن زیاتر نەبێت و بەردەوامیش

بن لە هەوڵەکان بۆ ئەوەی نیوەکەی تر بە ڕەگەزی عەرەب پڕبکرێتەوە جا ئافرەت بن یان پیاو)[٧٧]. لە بارێکی تریشدا بە ناچاری ڕێگەدراوە کە تەنیا ڕەگەزی تورکمانی بەعسی وەك پاسەوانی شەوانەی قوتابخانەکان دابمەزرێن[٧٨].

مەسەلەکە هەر تەنیا دامەزراندنی نەدەگرتەوە بەڵکو هەوڵدرا بە بیانووی جۆربەجۆر ئەو کوردانەی لە فەرمانگەکانی دەوڵەت مابوونەوە دەربکرێن یان بگوازرێنەوە بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك. لە باسەکەی پێشوودا ئاماژە بە گواستنەوەی ئەو ژمارە زۆرەی مامۆستاو فەرمانبەرانی کورد کرا کە بڕیار درا بگوازرێنەوە بۆ دەرەوەی پارێزگای ناوبراو. هەروەها ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە دانیشتنی ڕۆژی (٧)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٠)دا دەسەڵاتی دایە بەڕێوەبەری کۆمپانیای نەوتی باکوور کە بە بیانووی هەلومەرجی ئاسایش کارمەندە نا عەرەبەکانی ئەم کۆمپانیایە خانەنشین بکات. ئەم بڕیارە تەنانەت ئەوانەشی گرتەوە کە ڕەگەزی خۆیان کردبوو بە عەرەب[٧٩].

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا بەرپرسانی بەعس لە هەوڵی ئەوە دابوون کە بیانووی هەبوونی بۆشایی لە فەرمانگەکان ڕەگەزی عەرەب لە ناوچەکانی ناوەڕاستو باشووری عێراق بهێنن بۆ کەرکوك[٨٠].

لە بواری بازرگانیو سەرمایەگوزاریشدا دەسەڵاتدارانی بەعس سیاسەتی جیاکاری ڕەگەزییان پەیڕەو دەکردو بە گومانەوە سەیری چالاکییە ئابوورییەکانی کوردو تورکمانەکانیان دەکرد لە کەرکوکدا، بەتایبەتی کە لە ڕاپۆرتێکی ساڵی (١٩٩٦)دا تێبینی ئەوەیان کرد کە بازرگانیو کاروباری ئابووری لە شارەکەدا هێشتا بە دەست کوردەکانەوە مابۆوە، بەڵێندەران (کۆنتراکتەر)و خاوەن پیشەکانو هەروەها دامەزراوە گشتیو خزمەتگوزارییەکان بە زۆری هی ئەوانن[٨١].

لە بەڵگەنامەیەکی ساڵی (١٩٩٦)دا بەرپرسێکی بەعس بە وەڵامی گومانەکانی لیژنەی باکوور لە هەمبەر هەندێ پرۆژەی ئابووریو تەلارسازی کوردو تورکمانەکان دەڵێ: (دەمانەوێ پێتان ڕابگەیەنین کە کاری لەم جۆرە هەیە بەڵام بەم قەبارەیە نییە کە ڕەهەندی سیاسی هەبێت لە نیازەوە. ئەگەرچی دژی کرداری بەعەرەبکردنی کەرکوکە لە ڕێی وابەستە بوونیان بە بەرژەوەندییە بازرگانیو تەلارسازییەکانیان... دەبێ هەوڵ بدەین عەرەبەکانیش هانبدەین بۆ ئەم کارە لە ڕێی پێشکەش کردنی هەندێ ئاسانکاری بۆیان، لەگەڵ ئەمەشدا کار لەو کوردو تورکمانانە بکەین کە خاوەن زەویو زارو تەلارن بۆ ئەوەی بیانفرۆشن، ئەویش بەخستنەڕووی نرخی وا کە هانیان بدات بۆ فرۆشتن، یان گۆڕانکاری لە نەخشەی ئاوەدانی ناوچەکان بکەین، ئەویش بە کردنەوەی شەقام یان گۆڕینی هەندێ ناوچە بۆ شوێنی گشتی...)[٨٢].

هەروەها لە پێناو (دابینکردنی دەرفەتی بژێویو جێگیربوون) بۆ عەرەبە هاوردەکان لە کەرکوك، بەپێی گوتەی پارێزگاری کەرکوك[٨٣]، بڕیار درا بە پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ کرێدانی ڕێژەی (٢٥٪)ی دوکانو مولکە بازرگانییەکانی حکومەت بۆ ئەم عەرەبانە[٨٤].

لە ناوچەکانی دەوروبەری شاری کەرکوکیش کشتوکاڵو جووتیارو خاوەن زەوی کورد بەهۆی سیاسەتی بەعس زەبری زۆر کاریگەریان بەرکەوت، کاتێ زۆربەی زەویو زارە کشتوکاڵییەکانی ئەم ناوچانە، کە هەندێکیان زەوی میری بوونو هەندێکیش مولکی تایبەت، لەژێر دەستی کوردان دەرهێنرانو کرا بە هۆکارێك بۆ ڕاکێشانی هۆزە عەرەبەکان بۆ دەڤەری کەرکوكو نیشتەجێکردنیان لەو دەڤەرە.

پێشتر ئاماژەمان بەوە دا کە کردارێکی لەم جۆرەیان لە هەردوو ناوچەی شوانو ئاڵتوون کۆپریدا ئەنجامداو لە ساڵی (١٩٩٦)دا ڕایگەیاند کە هیچ زەوییەکی کشتوکاڵیو مولکی تایبەت نەماوە کە بەسەر هۆزە عەرەبەکان دابەشی نەکەن. هەروەها لە ساڵی (١٩٩٥)دا لیژنەی باکوور بڕیاری دا هەموو مافێکی مولکی تایبەتی زەوییە کشتوکاڵییەکانی کەرتی (ڕەمەزانیە) ڕەش بکەنەوەو هەموو گرێبەستە کشتوکاڵییەکان کە لەگەڵ هاووڵاتی ناعەرەب بەستراوە هەڵوەشێنێتەوە[٨٥].

بۆ ئەوەی جووتیارە کوردەکان بە تەواوی لە سەرچاوەی بژێوی بێبەش بکەن دەسەڵاتدارانی بەعس بڕیاریان دا تەنانەت ئەو مافەشیان پێ نەدەن کە بە شێوەی (نیوەتۆ) یان (بەکرێ گرتن) زەوی گوندە زەوتکراوەکان لە عەرەبە هاوردەکان بگرنەوە. ئەوەتا بەڵگەنامەیەکی حیزبی بەعس لە ساڵی (١٩٩٨) ئاماژە بە ڕووداوێکی لەم جۆرە دەکات کە لە گوندەکانی (سێ قۆچان، لهێبان، سەربەشاخ، پەڵکانە، ڕەحمانیە) ڕووی داوەو تیایدا بەرپرسە حیزبییەکە داوای سزادانی ئەو کەسانە دەکات کە سەودای لەم جۆرە ڕێکدەخەن[٨٦].

* دەرئەنجام:

دوای تاوتوێکردنو شیکردنەوەی بەڵگەنامە فەرمییەکانی حکومەتی بەعس بۆمان بەدیارکەوت کە ئەم حکومەتە لە دوای ڕاپەڕینیش هەر بەردەوام بوو لە سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی لە هەمبەر کورد.

هەر چەندە دوای ڕاپەڕین بۆ ماوەیەکی کەم ئەم سیاسەتە کەمێك خاویی پێوە دیاربوو، بەڵام دواتر بەتایبەتی لە ساڵانی (١٩٩٤- ١٩٩٥ بەولاوە) پرۆسەی پاکتاوی ڕەگەزی خێراترو بێ شەرمانەتر پیادە کراو ئەم شێوازانەی لەخۆ گرت:

أ. لە پێناو سڕینەوەی مۆرکی کوردایەتی لە ناوچە کوردییەکان دەستکاری کردنی یەکە کارگێڕییەکان هەر بەردەوام بوو، وەك گرێدانی (٣٨) گوندی سەر بە قەزای هەولێر بە ناحیەی (دووبز) کە کرایە قەزا.

ب. بە هۆی گۆڕانکارییە دیمۆگرافیو ئیتنۆگرافییەکانەوە حکومەت هەوڵی دەدا ڕێژەی دانیشتووانی عەرەب لەسەر حیسابی کورد زیاد بکاتو بەرە بەرە هەبوونی کورد لە دەڤەری کەرکوکدا نەهێڵێ، ئەمیش بەچەند ڕێگەیەکەوە:

**١. ڕاگواستنی کورد لە کەرکوكو ناوچەکانی دەوروبەری:**

بەڵگەنامەکانی حکومەت بەدیاریان خست کە ئەم کردارە بە هەنگاوی خێراو بە بیانووی جۆراو جۆر درێژەی هەبوو، وەك بیانووی (مؤشرات امنية - ئاماژەی ئاسایش)یان لە

دەوروبەری پارێزگای کەرکوکە.

حکومەتی بەعس لەم کردارەدا پیلانی داڕێژراو و بەرنامەی تۆکمەی هەبوو، لیژنەیەکیش بە ناوی (لیژنەی ڕاگواستن) بۆ سەرپەرشتی کردنی کردارەکە دامەزرابوو کە بە هێمنیو بە چەند قوناغێك ئەنجام دەدرا، بە تایبەتی بە شێوەی (١٥) ماڵ لە هەفتەیەکدا. هەرچەندە دەسەڵاتداران زیاتر پێیان خۆش بوو ئەم ڕاگوێزراوانە ڕێگەی باشوور هەڵبژێرن بەڵام ئەوان زۆربەیان بۆ ناوچە کوردییە ئازادکراوەکان دەهاتن، دوای ئەوەی خانووەکانیان لە بەرامبەر پارەیەکی کەم، کە زۆر جار وەریان نەدەگرت، دەستی بەسەردا دەگیراو تەرخان دەکرا بۆ عەرەبە هاوردەکان.

٢. جێنشینکردنی عەرەب:

دوای ماوەیەکی کەم لە سەرکووتکردنی ڕاپەڕین حکومەت بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژو فراوانتر کەوتە جێنیشینکردنی عەرەبی هاوردە لەو کۆمەڵگانەی کە بە ناوی (الحزام الامني – پشتێنەی ئاسایش) لە دەوروبەری کەرکوك بۆ ئەم مەبەستە دایمەزراندن. ئەمەش بە زۆری لەسەر حیسابی موڵكو زەویو زاری کوردان بەڕێوە دەچوو. هەروەها لە ناو شاری کەرکوکیش ڕێژەی عەرەب لە پارێزگای کەرکوك بەرز بۆوە بۆ (٧٣٪)و لە شارەکەش بۆ (٥٨٪) وەك بەڵگەنامەکانی بەعس خۆیان ئەمە دەدرکێنن.

هۆزە عەرەبە هاوردەکان چەکدار دەکرانو هەروەها بە گشتی لەسەر هاوردەکان پێویست بوو تۆماری نفوسو پسوولەی ئازووقەیان لەگەڵ خۆیان بگوازنەوە شوێنی نوێیان. لە بەرامبەردا خزمەتگوزاری ئاو و کارەباو زەویو چەندین ئاسانکاری تریان بۆ دابین دەکرا.

٣. گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی:

ئەم کردارەش دوو لایەنی هەبوو، لەلایەك ناوی گەڕەکەکانی شاری کەرکوكو قەزاو ناحیەو گوندەکانو دوکانو شوێنە بازرگانییەکان گۆڕاو لە جیاتی ئەوە ناوی عەرەبییان بۆ دانرا، لەلایەکی تریش فشار خرایە سەر کوردەکان بۆ ئەوەی لە تۆمارەکانی دەوڵەتدا ڕەگەزی خۆیان بگۆڕن بۆ عەرەب، ئەم کارە کە بە ناوی (ڕاستکردنەوەی نەتەوە – تصحيح القومية) ئەنجام دەدرا، نەدەبووە هۆی زامنکردنی یەکسانی لە نێو عەرەبە ڕەسەنەکانو ئەو کوردانەی کە بە ناچاری کراون بە عەرەب.

ج. لە بواری پەروەردەو فێرکردنیشدا حکومەتی بەعس هەوڵی دەدا مامۆستاو کادیری کورد لە دەزگاکانی پەروەردە کەم بکاتەوەو بەرە بەرە نەیانهێڵێ، هەروەها جموجۆڵی قوتابیانیان بەربەست دەکردو هەوڵیان دەدا تەنیا کەلتووری عەرەبیو بیری نەتەوە پەرستی بەعسی لەم قوتابخانانەدا بسەپێو ڕۆشنبیری کوردی لە نێوەبچێ.

د. لە ڕێگەی فشاری ئابووریش حکومەت دەیویست کوردەکانی کەرکوك بەرە بەرە ناچار بکات لەوێ نەحەوێنەوە. بەتایبەتی لە ڕێگەی کەمکردنەوەی دەرفەتی کارو دانەمەزراندنیان لە دەزگاکانی دەوڵەتدا. هەروەها بە نیگەرانییەوە سەیری چالاکییە بازرگانیو سەرمایە گوزارییەکانی کوردانیان دەکردو هەوڵیان دەدا کە لە باری بەرن، لە کاتێکدا دەرفەتی زیاتریان بۆ عەرەبەکان دەڕەخساند تا خۆیان کۆنترۆڵی ئابووری شارەکە بکەن. هەروەها لە ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوکیشدا جووتیارو موڵکداری کورد لە تەواوی تەنگیان پێ هەڵچنراو بەرە بەرە زەوییەکانیان لە دەست دەردەهێنراو ڕادەستی هۆزە عەرەبەکان دەکرا، وەك ئەوەی لە ناوچەکانی شوانو ئاڵتون کۆپریدا ئەنجامیان دا.

بێگومان ئەم بەڵگانامانە شایەدی سەلماندن لەسەر تاوانەکانی پاکتاوی ڕەگەزی دژ بە کورد لە کەرکوکدا کە ڕژێمی بەعس ئەنجامی داون، بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی ئەوێ پێویستە ئەم بەڵگەنامانە لەبەر چاو بگرێن.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. کۆمەڵێك لە نووسەران، (گەلێکی پەژمووردەو نیشتیمانی پەرت)، سەرپەرشتیار: ژێرارد چالیاند، وەرگێرانی: م. گۆمەیی و ا. حەوێزی، سوید، ساڵی (١٩٩٨)، لاپەڕە (٤١٦ - ٤١٧).

٢. بڕوانە:

- د. جبار قادر، (قضايا كردية معاصرة، كركوك الانفال - الكرد وتركيا)، هەولێر ساڵی (٢٠٠٦)، لاپەڕە (١٣١).

- سۆزان کەریم مستەفا، (بەعسیزم و کورد)، سلێمانی ساڵی (٢٠٠٧)، لاپەڕە (١٠٩)و دواتر.

٣. گۆڤاری (پەیڤین) ژمارە (٢)، لاپەڕە (٢٧١، ٢٧٣). (ڕاپۆرتی MEW).

4. Ethnic Cleamsing Documents In Kurdstam-Iraq, Part 2, Published by: Patriotic union of kurdistan- kirkuk organization center, kirkuk 2004, P. 160.

٥. گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، ساڵی (٢٠٠٤)، لاپەڕە (١٥٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:

(ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسەتی ڕاگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعسدا)، نووسینی: مراد حەکیم محەمەد.

٦. بڕوانە دەقی نووسراوێکی ئەم بەرپرسە لە: (Ethnic Cleansing...).

٧. گۆڤاری کاروان، هەولێر، ساڵی (١٩٩٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:

(البعد القومي للتغيرات في الحدود الادارية لمحافظة كركوك)، نووسینی: د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد.

8. (Ethnic Cleansing)..., P. 23.

9. (Ibid), P. 28.

10. (Ethnic Cleansing)..., P. 25.

١١. گۆڤاری (پەیڤین)، ژمارە (٢)، لاپەڕە ٢٩٢. (ڕاپۆرتی MEW)

١٢. مراد حەکیم، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٥٣.

١٣. د. خليل اسماعيل محمد، (مؤشرات سياسة التعريب والتهجير في اقليم كردستان العراق)، منشورات مكتب الفكر والتوعية، سليمانية، ٢٠٠٣، الصفحة ٢٦.

١٤- بڕوانە دەقی بڕیارەکە لە:

(Ethnic Cleansing...), P. 53.

١٥- بڕوانە دەقی ئەو ڕاپۆرتەی کە لە ساڵی (١٩٩٦) پێشکەش بە لیژنەی باکوور کراوە لە: (Ibid), P. 28)وە بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:

- د. مارف عومەر گوڵ، (جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر ڕۆشنایی یاسای نێودەوڵەتاندا)، چاپی چوارەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی (٢٠٠٧)، لاپەڕە (٣١، ٣٤، ٥٠).

- گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، لاپەڕە (١١٦)، و دواتر، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:

(ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسەتی ڕاگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعسدا)، نووسینی: موراد حەکیم.

١٦- د. خليل اسماعيل، (مؤشرات سياسة التعريب والتهجير في اقليم كردستان العراق)، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو وشیاری، سلێمانی، ساڵی (٢٠٠٣)، لاپەڕە (٦٣).

١٧- بڕوانە چەند بەڵگەنامەیەك لە:

(Ethnic Cleansing...), P. 193, 239.

١٨- بڕوانە:

- د. نوري الطالباني، (منطقة كركوك ومحاولات تغير واقعها القومي)، لەندەن، ساڵی (١٩٩٥)، لاپەڕە (١٣٦)، هەروەها:

- مراد حەکیم، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (١٥٩).

19. Ethnic Cleansing..., P. 226.

٢٠. بڕوانە نووسراوی بەرپرسی ڕێکخستنەکانی دیالە بۆ لیژنەی باکوور لە ساڵی (١٩٩٤)، لە:

(Ibid), P. 190.

٢١. بۆ نموونە بڕوانە هەردوو بەڵگەنامەی ژمارە (٧٢)و (٧٧) لە:

(Ibid), P. 95, 105.

٢٢. بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکە لە:

(Ibid), P. 112.

٢٣. بڕوانە دەقی نووسراوی لیژنەی باکوور بۆ پارێزگاری کەرکوك بە ژمارە (٢٠/ ١٥٤٩) لە:

(Ibid), P. 226.

٢٤. بڕوانە دەقی بەڵگەنامەی ژمارە (٩٣) لە:

(Ibid), P. 170.

٢٥. نووسراوی پارێزگاری کەرکوك بە ژمارە (٣٨٣)و بەرواری (٢٠)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٦) بۆ وەزارەتی ناوەخۆ لە:

(Ibid), P. 201.

٢٦. نووسراوی لیژنەی باکوور بۆ پارێزگای کەرکوك بە ژمارە (١٠/ ١٩٧) لە (١٣)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٩٨) لە:

(Ibid), P. 250.

٢٧. بۆ نموونە بڕوانە نووسراوێکی پێشتری لیژنەی باکوور لە:

(Ibid), P. 226.

٢٨. بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٩٧) لە:

(Ibid), P. 193.

٢٩. بڕوانە نووسراوی لیژنەی ناوبراو بە ژمارە (٢٠/ ١٥٤٩) لە:

(Ibid), P. 226.

٣٠. نووسراوی جێگیری پارێزگار بۆ خودی پارێزگار لە (١٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٧) لە:

(Ibid), P. 239.

٣١. بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:
(Ibid), P. 226.
٣٢. بۆ نموونە بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١٠٧) لە:
(Ibid), P. 215- 217, 220- 223.
٣٣. بۆ نموونە بڕوانە نووسراوی پارێزگاری کەرکوك بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس بە ژمارە (١٢٧١)و لە بەرواری (٢٥)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٨) لە:
(Ibid), P. 258.
٣٤. بڕوانە نووسراوی ژمارە (٢٠/ ١٥٤٩)و لە بەرواری (١١)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٩٧)ی لیژنەی باکوور لە:
(Ibid), P. 226.
٣٥. بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:
(Ibid), P. 256.
٣٦. بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:
(Ibid), P. 196.
37. (Ibid), P. 204.
٣٨. بڕوانە چەند بەڵگەنامەیەك لەم بارەیەوە لە:
(Ibid), P, P. 224, 231, 223.
٣٩. بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١١٣) لە:
(Ibid), p. 240.
٤٠. بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:
(Ibid), p. 239.
٤١. د. گوینتەر دێشنەر، (کورد: گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێ کراو، گۆڕینی بۆ کوردی حەمە کەریم عارف)، چاپی دووەم، هەولێر، ساڵی (١٩٩٩)، لاپەڕە (٢٢٩- ٢٣٠).
٤٢. دەقی بەڵگەنامەی لیژنەی باکووری سەر بە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە:
(Ethnic Cleansing…), p. 36- 37.
43. (Ibid), p. 47.
٤٤. بڕوانە دەقی ڕاپۆرتەکە لە:
(Ibid), p. 82.
٤٥. د. خلیل اسماعیل، (مؤشرات...)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨).
٤٦. بڕوانە دەقی ڕاپۆرتێکی فەرمی لەم بارەیەوە لە:
(Ibid), p. 90.
شایانی باسە زۆربەی جووتیارو خاوەن زەوییە کوردەکان ئەم پارەیان وەرنەدەگرت و بۆ فرۆشتنی زەوییەکانیان مۆریان نەدەکرد.
47. (Ibid), P. 104.
٤٨. بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:
(Ibid), P. 90- 91.
٤٩. بڕوانە دەقی داواکاری سەرۆکی ئەم هۆزە لە:
(Ibid), P. 140.
٥٠. بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:
(Ibid), P. 64.
٥١. بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:
(Ibid), P. 107- 108.
٥٢. بڕوانە نووسراوی لێژنەی باکوور ژمارە (٢٠ / ١٦٨٣) و لە بەرواری (٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٦) بۆ پارێزگاری کەرکوك. هەروەها نووسراوی پارێزگاری کەرکوك بۆ بەڕێوەبەرایەتی ڕەگەزنامەو کاروباری شارستانی بە ژمارە (١٧/ ٥٨٩٢)و لە بەرواری (٢٨)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٧) لە:
(Ibid), p. 84, 93.
٥٣. بڕوانە نووسراوێکی لێژنەی باکوور بۆ پارێزگاری کەرکوك لە:
(Ibid), p. 104.
٥٤. بۆ نموونە بڕوانە بەڵگەنامەکانی ژمارە (٦٣، ٦٥، ٨٥) لە:
(Ibid), P. 64, 69, 140.
٥٥. بۆ نموونە بڕوانە سکاڵای هاووڵاتییەکی عەرەب لە بەرواری (٢٥)ی ئابی ساڵی (١٩٩٧) لە:
(Ibid), P.101.
٥٦. بڕوانە نووسراوی لیژنەی باکوور بۆ بەرپرسێکی بەعس لە:
(Ibid), p. 80.
٥٧. بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٣) لە: د. خلیل اسماعیل، (مؤشرات...)، الصفحة ٦٧.
٥٨. بڕوانە هەردوو نووسراوی لیژنەی باکوور بۆ پارێزگاری کەرکوك بە ژمارەکانی (٢٠/ ٥٧٣)و (٢٠/ ١٥٣٦) لە بەرواری (٦)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٥)و (١٠)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٩٧) لە:
(Ethnic Cleansing…), P. 67, 104.
٥٩. نووسراوی ژمارە (٧٠) بەرواری (٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٧) بۆ پارێزگاری کەرکوك لە:
(Ibid), P. 234.
٦٠. بڕوانە نووسراوێکی بەرپرسی ڕێکخستنەکانی بەعس بۆ لیژنەی باکوور لە:
(Ibid), P. 61.
٦١. عبدالرحمن صدیق، (کرکوك، مأساة مدینة)، چاپی یەکەم، هەولێر، ساڵی (٢٠٠٣)، لاپەڕە ٢٩، هەروەها: عەبدال نوری عەبدال، (کلتوورو ناسیونالیزم و بە عەرەبکردن)، چاپخانەی هاوار، دهۆك، ساڵی (٢٠٠٦)، لاپەڕە (٣٩).
٦٢. د. خلیل اسماعیل محمد، کرکوك، دراسات في التکوین القومي للسکان، هەولێر، ساڵی (٢٠٠٢)، لاپەڕە ( ١١٧).
٦٣. د. ڕەفیق شوانی، کێشەی کەرکوك و چۆنیەتی چارەسەرکردنی، هەولێر، ساڵی (٢٠٠٧)، لاپەڕە (٣٤).
64. (Ethnic Cleansing…), P. 25.
٦٥. بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:
(Ibid), P.162.
٦٦. بڕوانە دەقی ئەم نووسراوە لە:
(Ibid), P. 164.
٦٧. بڕوانە نووسراوێکی پارێزگاری کەرکوك بە ژمارە (١٧/ ٦٢٠١) لە بەرواری (٨)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٧) بە:
(Ibid), P. 95.
٦٨. بڕوانە دەقی بڕیاری ئەنجوومەنی شۆڕش ژمارە (٨٥٠)

لە:

(Ibid), P. 15.

٦٩. بڕوانە دەقی نووسراوەكە لە:

(Ibid), P. 95.

70. (Ibid), P. 126.

٧١. سەیری دەقی بڕیارەكە بكە لە:

(Ibid), P. 152.

٧٢- بڕوانە:

- كۆمەڵێك لە نووسەران، (گەلێكی پەژمووده...)، لاپەڕە ٣٩٧- ٣٩٨.

- د. ڕەفیق شوانی، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٣٣.

٧٣. بڕوانە دەقی نووسراوی بەڕێوەبەرایەتی ناوبراو بۆ پارێزگاری كەركوك لە:

Ethmic Cleansing…), P. 55.

74. (Ibid), P. 60- 61.

٧٥. د. جبار قادر، المصدر السابق، الصفحة ٧٩- ٨٠.

76. (Ethnic Cleansing…), P. 71.

٧٧. بڕوانە دەقی نووسراوی لیژنەی باكوور بۆ پارێزگاری كەركوك بە ژمارە (٢٥/ ٢٠٥)و لە بەرواری (١٧)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٦) لە:

(Ibid), P. 76.

٧٨. بڕوانە دەقی بڕیارەكە لە:

(Ibid), P. 26.

٧٩. بڕوانە نووسراوی لیژنەی باكوور ژمارە (٢٩/ ١٥٦٣) لە بەرواری (١٤)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٩٧) بۆ پارێزگاری كەركوك لە:

(Ibid), P. 229.

٨٠. بڕوانە دەقی ڕاپۆرتەكە لە:

(Ibid), P. 82.

81. (Ibid), P. 73.

٨٢. بڕوانە نووسراوی ژمارە (٤٢١٢) لە بەرواری (١٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠١) بۆ دەزگا حیزبییەكانی پارێزگاری كەركوك لە:

(Ibid), P. 172.

٨٣. بڕوانە دەقی نووسراوی پارێزگار لەم بارەوە لە:

(Ibid), P. 174.

٨٤. بڕوانە نووسراوی لیژنەی ناوبراو بۆ پارێزگاری كەركوك لە:

(Ibid), P. 123.

٨٥. بڕوانە دەقی بەڵگەنامەكان لە:

(Ibid), P. 129.

*** لیستی سەرچاوەكان:**

**أ. بە زمانی ئینگلیزی:**

1. Ethnic Cleansing Documents in kurdistan-Iraq, part 2, Union of kurdistan- kirkuk -1 published by: patriotic organization center, kirkuk 2004.

**ب. بە زمانی كوردی:**

٢. د. ڕەفیق شوانی، (كێشەی كەركوك‌و چۆنیەتی چارەسەركردنی)، هەولێر، ساڵی (٢٠٠٧).

٣. سۆزان كەریم مستەفا، (بەعسیزم‌و كورد)، سلێمانی، ساڵی (٢٠٠٧).

٤. عەبدال نووری عەبدال، (كلتوورو ناسیونالیزم‌و بەعەرەبكردن)، چاپخانەی هاوار، دهۆك، ساڵی (٢٠٠٦).

٥. گۆڤاری (پەیڤین) ژمارە (٢) سلێمانی، ئۆكتۆبەری ساڵی (١٩٩٧)، لاپەڕە (٢٧٠- ٢٩٧)، ڕاپۆرتێكە بە ناونیشانی: (Middle East Watch) (Human Rights Watch)، وەرگێڕانی: ڤیان عەبدولستار تاهیر.

٦. كۆمەڵێك لە نووسەران، (گەلێكی پەژمووده‌و نیشتیمانی پەرت)، سەرپەرشتیار: ژێرارد چالیاند، وەرگێڕان. م. گۆمەیی و ا. حەوێزی، سوید، ساڵی (١٩٩٨).

٧. د. گوینتەر دێشنەر، (كورد: گەلی لە خشتە براوی غەدر لێ كراو)، گۆڕینی بۆ كوردی: حەمە كەریم عارف، چاپی دووەم، هەولێر، ساڵی (١٩٩٩).

٨. د. مارف عومەر گوڵ، (جینۆسایدی گەلی كورد لەبەر ڕۆشنایی یاسای نێودەوڵەتاندا)، چاپی چوارەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی (٢٠٠٧).

٩. مراد حەكیم محەمەد، (ئاكامە كۆمەڵایەتییەكانی سیاسەتی ڕاگواستنی كورد لە عێراق لەسەردەمی بەعسدا)، سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیژی كوردستان، سلێمانی، ساڵی (٢٠٠٤).

*** بە زمانی عەرەبی:**

١٠. د. جبار قادر، (قضايا كردية معاصرة، كركوك- الانفال- الكرد وتركيا)، چاپی یەكەم، بڵاوكراوەكانی ئاراس، هەولێر، ساڵی (٢٠٠٦).

١١. خليل اسماعيل محمد، (البعد القومي للتغيرات في الحدود الادارية لمحافظة كركوك)، گۆڤاری كاروان، هەولێر، ساڵی (١٩٩٧).

١٢. د. خليل اسماعيل محمد، (كركوك، دراسات في التكوين القومي للسكان)، هەولێر، ساڵی (٢٠٠٢).

١٣. د. خليل اسماعيل محمد، (مؤشرات سياسة التعريب والتهجير في القليم كردستان العراق)، منشورات مكتب الفكر والتوعية، سليمانية، ساڵی (٢٠٠٣).

١٤. عبدالرحمن صديق، (كركوك، مأساة مدينة)، چاپی یەكەم، هەولێر، ساڵی (٢٠٠٣).

١٥. د. نوري الطالباني، (منطقة كركوك ومحاولات تغير واقعها القومي)، لەندەن، ساڵی (١٩٩٥).

# بڕیارە جۆر بە جۆرەکانی سیاسەتی تەعریب

| ژ | ژمارەی بڕیار | بابەت |
|---|---|---|
| ١ | ٢٠١٥/٣٢ لە (٢٣)ی ئابی ساڵی (١٩٩٩) | ڕاگواستنی کورد لە ناوچەی حوکمی زاتیو ڕێگەنەدان بە نیشتەجێبوون تێیدا |
| ٢ | ٣٩٨١/٥/٩ لە (١٦)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٠) | ڕاگواستنی دانیشتووانی غەیرە عەرەب لە پارێزگای کەرکوک |
| ٣ | (٦٦) لە (١١)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٨) | گرێبەست لەگەڵ جووتیارانی عەرەب لەسەر پرۆژەی ئاودێری (سەدام) |
| ٤ | ژمارە (بێ ژمارە) لە (١٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٩) | پێدانی چەك بەو عەرەبانەی کە گرێبەستیان لەگەڵدا کراوە |
| ٥ | (٣٤٨) لە (٢٠)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٠) | ئەو ئاقارە کشتوکاڵییانەی لە نێو پشتێنی ئەمنیدان لە شاری کەرکوک تا بۆ ئەوەی ئامادەبکرێن بۆ دابەشکردن بەسەر هۆزە عەرەبەکان |
| ٦ | /٢٥٠/٢٠ لە (١٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٥) | هاندانی گرێبەستە عەرەبەکان بۆ گواستنەوەی دۆسێی باری شارستانیو پسوولەی خۆراك بۆ پارێزگای کەرکوكو نەینەوا |
| ٧ | ٨٢١ لە (٨)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠١) | مەرجی ئەوەی لەسەر گرێبەستە عەرەبەکان پێویستە لە ناوچەی پشتێنەی ئەمنی دەبێت لایەنگری بە وەفای حیزبو شۆڕش بن |
| ٨ | بڕیاری ئەنجومەنی شۆڕش (٨٥٠) لە (٢٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٨) | قەدەغەکردنی گۆڕینی باری نەتەوەیی بۆ عەرەب |
| ٩ | بڕیاری ١٩٩ لە (٦)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠١) | ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە گۆڕانکاری غەیرە عەرەبەکان بۆ گۆڕینی باری نەتەوەییان بۆ عەرەبی |
| ١٠ | ١٥٥٨/٦/٦ لە (٢٥)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٠) | لەسەر پێشنیاری ڕێنماییەکانی وەزارەتی ناوخۆ بۆ هەموو کارمەندانی دەزگاکانی پارێزگا بۆ چاککردنی باری نەتەوەییان، بە پێچەوانەوە کاری پێویستیان لەگەڵدا دەکرێت |
| ١١ | نووسراوی ژمارە ١٩٣١/٧/٨ لە (١٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٠) | دانانی لیستێك بۆ ڕاگواستنی ئەو کەسانەی کە باری نەتەوەیی خۆیان نەگۆڕیوە بۆ عەرەبی |
| ١٢ | ٧١٠٩/٦/١ لە (١)ی تەموزی ساڵی (٢٠٠٠) | ژمارەی ئەو کەسانەی کە باری نەتەوەیی خۆیان گۆڕیوە بۆ عەرەبی |

| | | |
|---|---|---|
| ١٣ | ٢٨٣٩ لە (١٥)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٠) | پابەندبوونی هەموو کارمەندانی دەزگاکانی پارێزگای کەرکوك بە گۆڕینی باری نەتەوەییان بۆ عەرەبی |
| ١٤ | ١٩٨٧/١٨/٧ لە (١٧)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٩٩) | پاداشتی تایبەتی بە ئەوانەی کە باری نەتەوەیی خۆیان گۆڕیوە |
| ١٥ | ٦٧٣٩/٦/٩٥ لە (٢)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٠) | فەرمانی کارگێڕی بە گواستنەوەی ئەو هاوولاتیانەی کە باری نەتەوەییان نەگۆڕیوە |
| ١٦ | بڕیاری ١٣٩١ لە (٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨١) | پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ ڕێکخستنی هاتووەکان بۆ ناوەڕاست و خوارووی عێراق |
| ١٧ | ١٤٠٧ لە (١٧)ی تەموزی ساڵی (١٩٩٩) | گواستنەوەو دوورخستنەوەی فەرمانبەرانی تورکمان و کوردو دانەمەزراندنیان لە پارێزگاکە |
| ١٨ | ٥٨٩ لە (١٦)ی ئابی ساڵی (١٩٩٧) | تۆمارکردنی خانووی ڕاگوێزراوەکان بە ناوی عەرەبە هاوردەکان |
| ١٩ | ٦٧٩/٢ لە (١٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٩) | دەستبەسەرداگرتنی ماڵ و موڵکی ڕاگوێزراوەکان لە پارێزگای کەرکوك |
| ٢٠ | بڕیاری ٥٢٩ لە (٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٩) | مافی هەر هاوولاتییەکی عێراقی لە دەرەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بە موڵکدارێتی زەوییەك لە نێو ناوچەی ئۆتۆنۆمی، بەڵام هاوولاتیانی نێو ئۆتۆنۆمییەکە بۆیان هەیە لە دەرەوەی ناوچەکە موڵکیان هەبێت |
| ٢١ | ژمارە ١٢٠٣/٦٨٧/٢٩ لە (٧)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٩٩) | لیستێك بە ناوی کوردە ڕاگوێزراوەکان و خێزان و موڵکەکانیان |
| ٢٢ | ١٠٨٨/٨/١١٧٣ لە (٢٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٤) | لیستێك بە ناوی گواستنەوەی فەرمانبەرانی کوردو کرێکارانی بۆ دەرەوەی پارێزگاکە |
| ٢٣ | ٢١٦٥/٦/٣ لە (١٤)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٩) | زانیاری دەربارەی خێزانە ڕاگوێزراوەکانی کوردو تورکمان بۆ دەرەوەی پارێزگاکە تەنها لە ساڵی (١٩٩٨)دا |
| ٢٤ | بڕیاری (٧٣٧) لە (٧)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٩) | دەستبەسەرا گرتنی خانوو لە گەڕەکی (١٧ تەموز، ٣٠ تەموز، کەرامە) |
| ٢٥ | بڕیاری (٩٧٢) لە (٢٩)ی تەموزی ساڵی (١٩٧٩) | دەستبەسەرداگرتنی خانوو لە گەڕەکی (١٧ تەموز، ٣٠ تەموز، کەرامە ئەلمەنسور، شۆڕیجە) بۆ هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ |
| ٢٦ | بڕیاری (٩٠٠) لە (١٠)ی ئابی ساڵی (١٩٧٧) | دەستبەسەرداگرتنی بەشێك لە زەوی هاوولاتیانی کوردو تۆمارکردنی بە ناوی پارێزگای کەرکوکەوە (شارەوانییەکان) |
| ٢٧ | بڕیاری (٩٠١) لە (١٠)ی ئابی ساڵی (١٩٧٧) | ڕاسپاردنی پارێزگاری کەرکوك بە فرۆشتنی عەرەسەکانی دانیشتووان لە بڕیاری (٩٠٠) بۆ کرێکارو فەرمانبەران لە کەرکوك |
| ٢٨ | نووسراوی ١٣٢٤ لە (١٢)ی ئابی ساڵی (١٩٩٨) | دەستبەسەرداگرتنی کەسێك لە هەر خێزانێکی ڕاگوێزراو و ئامادەکردنی لیستێك بە ناوەکانیان و خێزانە ڕاگوێزراوەکانیان |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٩ | برووسکەی وەزارەتی ناوخۆ لە (١١)ی نیسانی ساڵی (١٩٧٧) | گواستنی ڕاگوێزراوان بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی نەگەرانەوەی ڕاگوێزراوانی پارێزگای کەرکوك و دیالەو نەینەوا بۆ پارێزگاکانیان |
| ٣٠ | س/٨٢٣١٤٣١ لە (١٣)ی تەموزی ساڵی (١٩٩٨) | لیستێك بە ناوی (٥٤٥) خێزانی ڕاگوێزراو لە پارێزگای کەرکوك |
| ٣١ | ٣٩٨١/٥/٩ لە (١٦)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٠) | ڕاگوێزانی دانیشتووانی غەیرە عەرەب بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك |
| ٣٢ | ٢٤٧ لە (٢١)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٥) | قەرەبوونەکردنەوەی خێزانە کوردە ڕاگوێزراوەکان و فرۆشتنی موڵکەکانیان سنووردار کراوە بۆ عەرەب |
| ٣٣ | ٣٥٢١ لە (٤)ی نیسانی ساڵی (١٩٩٥) | ڕاگوێزانی خێزانە کوردەکان لە پارێزگاکانی کەرکوك و دیالەو نەینەوا بۆ پارێزگاکانی تر |
| ٣٤ | ٣٠١٥/٣٢ لە (٢٣)ی ئابی ساڵی (١٩٩٩) | ڕاگوێزانی خێزانە کوردەکان بۆ دەرەوەی ناوچەی حوکمی زاتی و ڕێگەنەدان پێیان بە نیشتەجێکردن لە پارێزگانی نەینەواو دیالەو کەرکوك |
| ٣٥ | ٢٠٠٧ لە (٩)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٩٨) | کارپێنەکردنی کوردەکان لەلای هۆزە عەرەبەکان لە چوارچێوەی پشتێنەی عەرەبی |
| ٣٦ | ٥٢٥ لە (١٨)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٠) | بەکارهێنانی ووشەی (تەتویر – تطویر) لە جیاتی ووشەی (تەعریب – تعریب) کاتێك باس لە پارێزگای کەرکوك دەکرێت |
| ٣٧ | ١٢١٣٦ لە (٢١)ی ئەلولی ساڵی (١٩٩٩) | پابەندکردنی قوتابیان لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن بە زمانی عەرەبی، قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانە ناوخۆییەکانی غەیرە عەرەبی |
| ٣٨ | ١٠٤١٥/٨٤ لە (١٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٩) | پێکەوەنانی لیژنەیەك بۆ پێداچوونەوەی جێبەجێکردنی زمانی عەرەبی لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن |
| ٣٩ | ١٨٧٩/١١/٩ لە (٢٦)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٠) | سەرکەوتنی جێبەجێکردنی پابەندبوون بە زمانی عەرەبی لە هەموو قوتابخانەکان و گۆڕینی ناوی کۆگە بازرگانی و پیشەسازی و قاوەخانەو مزگەوتەکان |
| ٤٠ | ٢١٧ لە (١٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٠) | قەدەغەکردنی غەیرە عەرەبەکان لە بەشداری کردن لە کەمکردنەوەی بازرگانی |
| ٤١ | ٩٥٧ لە (٧)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٠) | پابەندبوونی بازرگانی بۆ عەرەبە هاوردەکان |
| ٤٢ | ١٢٠٤٥ لە (٢٠)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٩٩) | دابەشکردنی زەوی بەسەر هۆزە عەرەبەکان لە ناحییەی (ڕیان)دا |
| ٤٣ | ٣٤٨ لە (٢٠)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٠) | پشتێنەی ئەمنی لە شاری کەرکوك ئەوەی هاوپەیوەستە بە هۆزە عەرەبەکانەوە |
| ٤٤ | ١١٩ لە (١)ی نیسانی ساڵی (١٩٩٨) | دابەشکردنی زەوی بەسەر هۆزی (شەمەر) لە قەزای دووبز |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٥ | ١٠٨٧٨ لە (٢٩)ی ئابی ساڵی (١٩٩٨) | هەڵبژاردنی هۆزەكانی تری عەرەبی لە جیاتی هۆزی (شەمەر) |
| ٤٦ | ٤٥٩ لە (٨)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٩٨) | هەڵبژاردنی هۆزەكانی (دلێم، بەنی تەمیم، بەدیر، سادە) بۆ نیشتەجێكردنیان لە پارێزگای كەركوك و دابەشكردنی زەوی كشتوكاڵی بەسەریاندا |
| ٤٧ | ٤٦٧٤ لە (٢٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٠) | پێشدەستی عەرەبە هاوردەكان بەسەر كوردەكانی پارێزگاكەوە لە كاتی دابەشكردنی زەوی بەسەریاندا |
| ٤٨ | ١٠٤٢/٢٠ لە (٢٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٧) | رێگەدان بە دروستكردنی لیژنەیەك بۆ نیشتەجێكردنی هۆزە عەرەبەكان لە ئاقاری كەركوك، پردێ، شوان، دووبز، لەیلان |
| ٤٩ | بریاری ٣١ لە (١١)ی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٥) | دەستبەسەراگرتنی زەوییەكانی كەركوك (شارەوانییەكان) ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش |
| ٥٠ | بریاری ٩٤٩ لە (٢٣)ی ئابی ساڵی (١٩٧٧) | دەستبەسەراگرتنی زەوی بە ناوی وەزارەتی داراییەوە بۆ پێویستی دارایی لە پێناو كشتوكاڵدا |
| ٥١ | بریاری ٤٨٠ لە (١٨)ی نیسانی ساڵی (١٩٧٩) | دەستبەسەراگرتنی زەوی بۆ شارەوانی كەركوك |
| ٥٢ | ١٣١٣٨ لە (٥)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩٩٨) | نیشتەجێكردنی هۆزەكانی عەرەبی لە پارێزگای كەركوك |
| ٥٣ | ٢٢٤١ لە (١٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٨) | دابەشكردنی زەوی بەسەر هۆزە عەرەبییەكان لە ناوەندی كەركوك |
| ٥٤ | ٥٦٨ لە (٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٠) | دابەشكردنی زەوی ڕاگوێزراوانی كورد بەسەر هۆزە عەرەبییەكان |
| ٥٥ | ڕاپۆرتی سەركردایەتی لقی كەركوكی حیزبی بەعس | زۆربوونی ڕێژەی عەرەب لە كەركوك دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕینی باری نەتەوەیی و نیشتەجێكردنی عەرەب |
| ٥٦ | داواكاری لە (١٠)ی تەموزی ساڵی (٢٠٠٠) | داواكاری هۆزی (مفەرجی) بۆ سەركردایەتی حیزب لە كەركوك لە ئارەزووی نیشتەجێبوونیان لە پشتێنەی ئەمنی كەركوك |
| ٥٧ | ١٤٧١/٩ لە (٢٤)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩٨٥) | رازینەبوونی دانیشتووانی گوندە عەرەبییەكان دەربارەی هەڵگرتنی چەك دژی كورد |
| ٥٨ | س/١٧/٥٩٣٦ لە (٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٧) | دابەشكردنی زەوی و زاری كشتوكاڵی كورد لەسەر هاوردەكانی عەرەب لە هۆزی (زەوبەعی) لە پردێ |
| ٥٩ | ژمارە ١ لە (٧)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٩٤) | زەوییەكانی پشتێنەی ئەمنی سەر بە دەوڵەت و كۆمەڵگای نیشتەجێیی بۆ عەرەب لێ دروست دەكرێت |
| ٦٠ | ٥٦٨ لە (٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٠) | هەڵبژاردنی هۆزە عەرەبەكان لەسەر حیسابی ڕاگوێزراوە كوردان بۆ نیشتەجێ كردن لە ناحیەی پردێ و كەركوك |

| | | |
|---|---|---|
| ٦١ | بریاری (٨٢٤) لە (٢٨)ی تەموزی ساڵی (١٩٧٦) | دەستبەسەراگرتنی زەوییەکانی ناحییەی داقوق بۆ وەزارەتی کشتوکاڵ تا دابەش بەکرێت بەسەر جووتیارەکان (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) |
| ٦٢ | (٢٣٨) لە (١٨)ی ئابی ساڵی (١٩٩٩) | نووسراوی دابەشکردنی زەوییەکان بەسەر عەشیرەتی (ئالبوحەمدان)و گۆڕاوانی باری نەتەوەیی |
| ٦٣ | (٣٢٤٤) لە (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٩) | هەڵوەشاندنەوەی ماف زەوییەکانی کەرکوك‌و تۆمارکردنی بە ناوی دەوڵەتەوە |
| ٦٤ | (٨٥) لە (٢٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٩) | داواکاری فەرمانگای کشتوکاڵ بۆ نیشتەجێکردنی هاووڵاتیانی هۆزی (ئالبوحەمدان)و (ئالبدێر) لە ناحییەی دووبز |
| ٦٥ | بریاری (٤) لە (٣١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٩) | دەستبەسەراگرتنی پارچە کشتوکاڵییەکانی هاووڵاتی (کوێخا رەزا محەمەد ساڵح)و سڕینەوەی ماف لەسەر زەوییەکەی‌و گەڕانەوەی موڵکدارێتی بۆ وەزارەتی دارایی |
| ٦٦ | نووسراوی کشتوکاڵی (١٦٠١) لە (١١)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٩) | ئاگادارکردنەوەی هۆزەکانی عەرەب بۆ نیشتەجێ کردن‌و جێبەجێکردنی ڕێنماییەکان لە ناحییەی دووبز |
| ٦٧ | داواکاری کشتوکاڵی (١٦٠٣) لە (١١)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٩) | ڕەتکردنەوەی داوای یەکێك لە هاووڵاتییەکانی کورد بۆ گەڕانەوەی زەوییەکەی لەبەر ئەوەی هەر لە ساڵی (١٩٩٦)ەوە دابەش کراوە بەسەر هۆزەکانی عەرەب |
| ٦٨ | نووسراوێك لە قایمقامی کەرکوك لە (١٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٩) | نووسراوێك ئاشکرای دەکان ئەو هۆزە عەرەبییانەی کەوا زەوی دابەش کراوە بەسەریان |
| ٦٩ | نووسراوێك لە قایمقامی کەرکوك لە (١٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٩) | داوای کردنی هۆزەکانی عەرەبی بۆ چەك |
| ٧٠ | بریاری (٥٧٣) لە (٢٩)ی نیسانی ساڵی (١٩٧٨) | دەستبەسەراگرتنی زەوییەکانی (تازە) لە پارێزگای کەرکوك |
| ٧١ | بریاری (٦٦٨) لە (٢٦)ی ئایاری ساڵی (١٩٧٩) | دەستبەسەراگرتنی زەوییەکان بۆ شارەوانی (تازە) |
| ٧٢ | داواکراوی هۆزی (ئالبومفەرەج) لە (١٠)ی تەموزی ساڵی (٢٠٠٠) | دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێبوون لە کۆپری بە هۆی زۆربوونی ڕێژەی دانیشتووان |
| ٧٣ | نووسراوێکی کشتوکاڵی کەرکوك ژمارە (١٣٦٨٧) لە (١٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٩) | دابەشکردنی زەوییەکان لەسەر هۆزەکانی عەرەبی‌و کێشەکانیان |
| ٧٤ | نووسراوێکی کشتوکاڵی کەرکوك ژمارە (٨٨٧١) لە (٥)ی ئابی ساڵی (١٩٩٨) | دروستکردنی کۆمەڵگای نیشتەجێبوون بۆ هۆزەکانی عەرەبی لەسەر حیسابی زەوییەکانی تر |
| ٧٥ | نووسراوێکی کشتوکاڵی کەرکوك ژمارە (٧٢٧٠) لە (٢)ی تەموزی ساڵی (١٩٩٨) | هەڵبژاردنی هۆزە (عەزە) بۆ گرێبەست لەگەڵیدا لە ناحیەی پردێ |
| ٧٦ | نووسراوی (پارێزگای کەرکوك) س/٥٩٣٦/١٧/ لە (٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٧) | دەستبەسەراگرتنی زەوی هاووڵاتیان لە ناحیەی پردێ |

| | | |
|---|---|---|
| ٧٧ | نووسراوی ٢١٦/٦/٣ لە (١٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٩) | ژمارەی خێزانە ڕاگوێزراوەکانی کوردو تورکمان لە ماوەی ساڵی (١٩٩٨)دا |
| ٧٨ | مەرسوومی کۆماری (٤٠٣) لە (٣٠)ی ئاداری ساڵی (١٩٦٩) | ڕووداوەکانی ناحیەی (جەبارە) لە قەزای کفری |
| ٧٩ | مەرسوومی کۆماری (٤٣٩) لە (٣)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٩) | ڕووداوەکانی ناحیەی (ئامرلی) لە قەزای خورماتوو |
| ٨٠ | مەرسوومی کۆماری (٤٤٠) لە (٥)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٩) | ڕووداوەکانی ناحیەی (سەلمان بێگ) لە قەزای خورماتوو |
| ٨١ | مەرسوومی کۆماری (١٣٦) لە (٢٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٠) | دابڕانی پارچەکانی ناحیەی (قادر کەرەم) بۆ قەزای خورماتوو |
| ٨٢ | مەرسوومی کۆماری (١٣٧) لە (٢٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٠) | دروستکردنی قەزای کەلار لە ناحیەی شێروانەو پێباز |
| ٨٣ | مەرسوومی کۆماری (٣٨٤) لە (٤)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٢) | دروستکرنی ناحیەی یایچیو بنکەکەی گوندی یایچییە |
| ٨٤ | مەرسوومی کۆماری (٤٦١) لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٢) | دروستکرنی ناحیەی (کۆکس)و بنکەکەی دێی (کۆکس)ە |
| ٨٥ | مەرسوومی کۆماری (٤٦٠) لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٢) | دروستکرنی ناحیەی (نەوجول)و بنکەکەی گوندی (نەوجول)ە |
| ٨٦ | مەرسوومی کۆماری (٦٥٢) لە (٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٧) | دروستکرنی ناحیەی (ئەلرەبیع)و بنکەکەی (قەرەهەنجیر)ە |
| ٨٧ | مەرسوومی کۆماری (٦٠٨) لە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٥) | دابڕانی هەر یەکە لە قەزای (چەمچەماڵ)و (کەلار) لە پارێزگای کەرکوكو قەزای کفری ولکاندنەوەی بە پارێزگای سلێمانیو دیالە |
| ٨٨ | مەرسوومی کۆماری (٦٠٦) لە (٦)ی تشریمی دووەمی ساڵی (١٩٧٥) | دروستکرنی ناحیەی (تیلەکۆ)و بنکەکەی گوندی (تیلەکۆی گەورە)یە |
| ٨٩ | مەرسوومی کۆماری (٦٠٧) لە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٥) | دابڕانی ناحیەی (شێروانە) لە کەلارو لکاندنەوەی بە کفری |
| ٩٠ | مەرسوومی کۆماری (٧٣) لە (١٥)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٦) | دروستکرنی قەزای (دووبز)و بنکەی شارەدێی (دووبز)ە |
| ٩١ | مەرسوومی کۆماری (٣٥٦) لە (١٨)ی ئایاری ساڵی (١٩٧٦) | دابڕانی ناحیەی (داقوق) لە ناحیەی (خورماتوو)و لکاندنەوەی بە پارێزگای (سەلاحەددین) |
| ٩٢ | مەرسوومی کۆماری (٤٣٤) لە ئەیلولی ساڵی (١٩٨٩) | هەڵوەشاندنەوەی قەزای (دووبز)و دروستکردنی قەزای (داقوق)و ناحیەی (دووبز)و لکاندنەوەی بە مەرکەزی کەرکوك |

# حەویجە لە مێژووی تەعریبدا

**ژیلوان لەتیف یار ئەحمەد**

لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە لەسەر پرۆژەی بەعەرەبکردن لە قۆناغە سەرەتایەکانی مێژووی عێراقی پادشاییدا تێکرا تیشك خراوەتە سەر پرۆژەی حەویجەو کاریگەری لەسەر بەعەرەبکردنی پارێزگای کەرکوك بەو پێیەی شارۆچکەی حەویجە لەسەرەتای دروستبوونەوە تا ئەمرۆکە کێشەکانی نێوان عێراق‌و کوردەکان ئاڵۆز کردووە، حەویجەی پاشایەتی هەوڵێك بوو بۆ بەعەرەبکردن‌و حەویجەی فیدراڵی تەقەلایەکە بۆ تێرۆر.

لەم کۆڵینەوەیە هەوڵمداوە پەنجە بخەمە سەر کێشەی مێژووی پرسە نیشتمانیەکەو ئەو ماوەیەی کە من لەم لێکۆڵینەوەیە بەهەند وەرگرتووە، سەرەتاکانی مێژووی ڕاگواستنە لەگەڵ دەست بەکاربوونی حکومەتی نوێی عێراقی لە سەرەتای دروستبوونیدا کە دەکاتە ساڵانی (١٩٣٥-١٩٣٦)و قسەکردن لە سەردەمەکانی حوکمەتی پادشایەتی عێراق‌و وەزارەتەکەی یاسین هاشمی کە بۆ یەکەم جار لە چوارچێوەی سنوورێکی کرداری‌و خاکێك لەسەر ئاستی سیاسی نێودەوڵەتی کە عێراقە پرۆسەکانی سرینەوەی نەتەوەو ناسنامەو گۆڕانکارییەکانی سەر بە پارێزگای کەرکوك ئەنجامدرا، کە تێکرا مێژووەکەی بۆ ئەم قۆناغە دەگەڕێتەوە

دەرخستنی ئەم ڕاستییە مێژووییانەیە کە شارەکە لە ڕووی کورد بوون‌و سنووری جوگرافی‌و بەڕێوەبەرایەتی‌و پێکهاتەی نەتەوەیی قۆناغی یەکەمی تەعریب لەوادەی دامەزراندنی حکومەتی عێراقدا بوونی هەبووە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەمرۆ ئەم کێشەیە بەردەوامی هەیەو فاکتەرێکی گرنگە بۆ سەرکەوتنی ئەزمونەکان بە بردنەوەی سەرجەم ئەو پرەنسیپانەی کە ڕێگرن لەبەردەم کوردبوونی شارەکە، بۆیە جێی خۆیەتی باس لەو گۆڕانکارییانە بکرێت کەبەسەر پارێزگاکەدا هاتووەو باس لەشێواندنی باری نەتەوەیی‌و هەوڵەکان بکرێت کە بۆ ڕاگوێزانی خێڵانی عەرەبی بۆ ناوچە کورد نشینەکان لە ناوچەکانی ناوەڕاست‌و باشووری عێراق‌و هەنگاوە سەرەتاییەکان بۆ گۆڕینی سنووری بەڕێوەبەرایەتییەکان‌و پێکهاتەی دانیشتووانی ئەنجامدراوە.

*** پرۆژەی حەویجە:**

حکومەتی عێراق هەر لە ناوەڕاستی ساڵەکانی سیەوە هەنگاوێکی تری دەستدایە، بەمەبەستی نیشتەجێ کردنی هەندێ خێڵی عەرەب لە دەشتی حەویجە، کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای کەرکوکەوە. ئەم پرۆژەیە شێوەیەی یەکەی وەبەرهەمهێنانی لە زەوی‌و زارێکی کشتوکاڵیدا لەو دەشتە گرتبووە خۆی، پاش ئەوەی بە لێدانی جۆگەیەکی گەورە لە زێی بچووکەوە ئاوی بۆ بێت. حکومەتی ئەو سەردەمە ئەم پرۆژە گەورەیەی بە بازووی زینددانیانی کەرکوك تەواو کرد، هەربۆیە لەماوەی چەند ساڵێکی دوورو درێژدا تەواو کرا[١].

ئەم پرۆژەیە بە یەکێك لە پرۆژەکانی سەر زەمینی کوردستان دادەنرێت، کەلە ساڵی (١٩٣٦)دا دەست بە دروستکردنی کراوەو[٢]، سیاسەتی بەکارهێنانی ئاوی کورد لە دژی کورد هەر لە بنیادنانی ئەم پرۆژەیەوە دەستی پێ کرد لە دووری (٧٠) کم لە ڕۆژئاوای شاری کەرکوك، مەبەست لەمە دابینکردنی ئاو بوو بۆ زەوی کشتوکاڵی کە (٢٣٧٠٠٠٠) دۆنم بوو. دەستکرا بە دابەشکردنی زەوییەکانی پرۆژە بۆ زەوی کشتوکاڵی بچووك بەمەبەستی دابەشکردنیان بەسەر عەرەبدا کە لە ناوچەکانی ترەوە هێنرابوون[٣]، ئەم پرۆژەیە شوێنەوارو دەستکردی شارستانییەتیەکی زۆر کۆنە پێش هاتنی عەرەبە موسوڵمانەکان بۆ ناوچەکە هەبوو، کەلە نزیك شارۆچکەی ئاڵتون کۆپەری دەڕۆیشت ئێستا بە (١٠) کیلۆمەتری باشووری ڕۆژئاوای شارەکە شوێنەواری بەنداوێکی کۆن لەسەر زێی بچووك دەرکەوتوەو مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ پێش هاتنی موسوڵمانەکان بۆ

ناوچەکە، رووبارەکانی (قیل و عەباسی و ئەلحەزەر) لەبەردەم ئەم بەنداوەوە جیا بوونەتەوە[٤].

لە راپۆرتێکی کارگێری کە لە ساڵی (١٩١٩)دا لە ناوچەی کەرکوك بەئەنجام هاتووە، کە یەکێك لەو ناوچانەی دەشێ مەسەلەی ئاودێرییان گرنگ بێت دوو ناوچەن، یەکێك لەو ناوچانە ناوچەی حەویجەیە، دەبێ کارێکی ئاسان بێت دەروازەی نوێ بنیات بنرێت و کەناڵە کۆنەکان پاك بکرێنەوە تا ناوچەکانی حەویجە ئاودێرییان پێ بکات. بەڵام ئەم کارە ئاسانە، خەرجی زۆرە لەوانەیە خەرجیەکەی (٣٠٠-٥٠٠) هەزار پاوەندی بوێت، تا بگاتە ئەو ئاست و رادەیەی کە سوودی هەبێت بۆ (٦٤٠٠٠) جوتیار. ئەم پێشنیارەی لەو راپۆرتەدا هاتووە بۆ کاروباری ئابووری ناوچەی حەویجە، یەکەم بیرۆکەو بۆچوونی پلاندانانی ئەو پرۆژەیەیە کە بە پرۆژەی حەویجە ناونراوە[٥].

دکتۆر نوری تاڵەبانی دەڵێت: "ئەم پرۆژەیە کۆنە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٣٥) پێشنیاری (یاسین هاشمی)[*] سەرۆك وەزیرانی عێراق بووە، کە لە ساڵی (١٩٣٥)دا ویستی پرۆژەکە بکاتەوە، ئەو دەشتە ئاوەدان بکاتەوە، بۆ خێڵی (عوبێد) لەگەڵ خێڵی (جبور) کەهەر لەو ناوچەیە بوون، ویستی لە پرۆژەی حەویجەدا نیشتەجێیان بکات، نزیکەی (١٠-١٢) ساڵی پێچووە، کە پرۆژەکە تەواو بووە ناوەڕاستی چلەکان بووە"[٦].

هەروەها ئاماژەش بەوە دەکات و دەڵێت: "هەڵەیەکی تریش هەیە کە جاروبار بەرچاوم دەکەوێتن ئەوەیە کە ئەم پرۆژەیەی لە ساڵی (١٩٣٦) کە لەلایەن (یاسین هاشمی)یەوە دەست پێ کراوە، ئەوە هەڵەیە، چونکە یاسین هاشمی پاش کودەتای بەکر سدقی بۆ سوریا هەڵهات، لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٣٦) دا هەر لەوێش مرد، بیرۆکەکە بیرۆکەی یاسین هاشمی بوو"[٧]. بەڵام دوای ئەوە دەست بە جێبەجێکردنی کراوە، ئەوانەی خەریکی جێبەجێکردنی بوون زیندانییەکانی کەرکوك بوون، کە بەشێکی زۆریان کورد بوون، ئیشیان پێ دەکردن، بەتایبەتی لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا، بە قازمەو بێل، کاریان لە پرۆژەکەدا کردووە[٨].

لە سەرەتادا یاسین هاشمی پلانی ئەم پرۆژەیەی لە سەردەمی مەلیك غازیدا دانابوو. نەبوونی ئاو و زەحمەتی کێڵانی زەوی بەیاری ئەو دەشتە وووبوو بەهۆی ئەوەی کەس نەتوانێت تێیدا سەقامگیر ببێت، لەبەرئەوە جوتیارانی لادێ کوردەکانی نزیك ئەو دەشتە بەهاران بە خۆیان و ئاژەڵیانەوە روویان تێدەکرد. هەروەها هەندێك خێڵی کۆچەری عەرەبی وەکو (عوبێد و جبوریش) هەر بەدوای لەوەڕدا بۆ ئاژەڵەکانیان بەهاران روویان دەکردە باشووری دەشتی حەویجە[٩].

پرۆژەکە بریتییە لەجۆگەلەیەکی ئاو کە (٥٥) کم لە زێی بچکۆلەوە بەرەو رۆژئاوای پارێزگەی کەرکوك درێژدەبێتەوە[١٠]، لەنزیك گوندی سایەر یەك و لە نزیك شۆراویش دابەشی سەر سێ جۆگە دەبوو[١١]، درێژی هەرییەکەیان نزیکەی (١٣) کم دەبێت، و رووبەرێکی زۆری زەوی لەئاوی زێی بچووکەوە ئاودێری دەکەن[١٢].

یەکێکیان بەرەو باشور دەڕۆیشت (ڕیازی ئەمرۆ) و یەکێکی دیکەش بەرەو رۆژئاواو ئەوی دیکەش بەرەو خوارووی رۆژئاوا[١٣]، بە مەبەستی ئاوەدانی پانتاییەکی بەر فراوان لەزەوی کەپترلە(٢٢٠) هەزار مەشارەی چوارگۆشە لە زەوی دروستکرا[١٤]، لە ساڵی (١٩٣٦)دا دەست بە هەڵکەندنی پرۆژەی حەویجە کرا، کەئاوی لای چەپی زێی بچووکی دەگواستەوە[١٥].

قەزای حەویجە بە پلەی سێهەم دەهات لەپارێزگای کەرکوك لە بارەی بەدەست هێنانی ئاوەوە، کەرێژەکەی گەیشتە ٨،٥٪، گەورەترین رێژەی ئاوی دەست کەوتوو لەلایەن دانیشتووانی لادێ لە رێگەی ئاوی ئەم قەزایەوە بوو بەرێژەی ٥٣،٤٪ کە دەکاتە زیاتر لە سێ ئەوەندەی ئاوی دەست کەوتوو لە قەزاکانی تر[١٦].

ئەگەر ئەم پرۆژەو کارەش دادپەروەرانە جێبەجێ بکرایە ئەوا سەراپای ئەو پێدەشتانەی ئەکەونە رۆژهەڵاتی زێی بچووك و باشووری رۆژئاوای شاری کەرکوك تا ناوچەکانی دووزو رێڕگەی رووباری عوزێم، بەر ئاوی ئەم پرۆژەیە ئەکەوتن و بەرهەم و سامانێکی کشتوکاڵی هەم بۆ شارەکەو هەم بۆ کوردستان بەدەست ئەهێنرا[١٧].

*** باسی یەکەم: پرۆژەی حەویجەو رۆڵی لە بەعەرەبکردنی ناوچەی کەرکوکدا:**

لەبەر گرنگی پێگەی جوگرافی و دیموگرافی و تۆبۆگرافی پارێزگای کەرکوك، وەکو شادەمارو سەرچاوەی سامانی نەوت و ئابووری عێراق،کەم و زۆر گشت حکومەتەکانی عێراق، هەر لە سەردەمی پاشایەتییەوە، سیاسەتی پاکتاوکردنی رەگەزیان لە ناوچەکانیدا ئەنجام داوە[١٨].

بەعەرەبکردنی باشووری کوردستان لەلایەن دەوڵەتی داگیرکەرەوە پرۆسەیەکی کۆنە، رەگە مێژووییەکەی بۆ سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق[١٩] لە ساڵی (١٩٢١) دەگەڕێتەوە، لە یەکێك لە بەڵگەنامە چەسپێندراوەکانی تردا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەو راستییەی کە لە ساڵی (١٩٢٩) کاتێك سەرۆکی هێزی کەرکوك کە کەسێکی عەرەبی شۆڤێنی بوون گواسترایەوە بۆ ناوچەی کەرکوك، ئەو بەرپرسیاریەتیە خرایە سەر شانی، کە لە بەڵگەنامەکەدا ئەوەی خستە روو کە ژمارەی ئەو عەرەبانەی لە ناوچەکەدا بوونیان هەیە کەمە، بە رادەیەك ناکرێت پشتیان پێ ببەسترێت لە پرۆسەی بەعەرەبکردندا، پێشنیار دەکات لە نامەکەیدا، کە پێویستە عەرەبی تر بۆ ئەو ناوچەیە هاوردە بکرێت. ئەم بەڵگەیە زۆر گرنگە، چونکە یەکەم بەڵگەیە کە ئاماژە بە دەستپێکردنی تەعریب دەکات لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی، جەخت دەکاتە سەر راستییەك، ئەویش ئەوەیە کە عەرەب لە ناوچەی کەرکوك بوونیان نەبوو، بەڵکو پاش سێ ساڵ لەم رێکەوتە دەستکرا بە هێنانی خێڵی عەرەب بۆ ناوچەی حەویجە[٢٠].

دکتۆر (محەمەد عەبدوڵا) دەڵێت: "بەعەرەبکردن نەگەیشتە کەرکوك تا ساڵی (١٩٣٦)، کاتێك کە پرۆژەی حەویجە دروستکرا، بەمەش بەعەرەبکردن گەیشتە

ئەوپەڕی"[٢١].

هەروەها دکتۆر ئالان دەروێش دەڵێت: "ئێمە ئاگاداری ئەوەین کە سیاسەتی بەعەرەبکردن لە دەوروبەری ساڵی (١٩٣٠) دەستپێکردبوو کاتێك کە حکومەت عەشیرەتە عەرەبەکانی هێناو لە ناحیەی حەویجەدا نیشتەجێی کردن[٢٢].

لە دوای بیستەکان و سەرەتای سییەکان چەند بنەماڵەیەکی عەرەب بەهۆی دوژمنکاری لە ڕووباری دیجلە دەربازبوون وەك پەنابەر هاتنە لای کوردانی حەویجە، لەسەرەتای سییەکانیش بەهۆی ووشکەساڵی چەند بنەماڵەیەکی عەرەبی شەرگات داوا لە سەید ئەحمەدی خانەقا(*) دەکەن کە ڕێگەیان پێبدات تا ساڵی داهاتوو مەڕەکانیان لەسەر زەوی ئەو بهێڵنەوە، سەید ئەحمەدیش ڕێگەیان پێدەدات، ئیتر ئەم عەرەبانە دووبارە داوا لە سەید ئەحمەدی خانەقا دەکەنەوە، کە پارە دەدەن بۆ مانەوەیان تا ساڵێکی تر سەید ئەحمەدیش دەڵێت: "پارەم ناوێت و ڕەشماڵ هەڵدەدەن و خانوو دروست بکەن" ئەوانیش خانوو دروست دەکەن و بە یەکجاری دەمێننەوە[٢٣].

دانیشتووانی گوندەکانی دەشتی هەولێر دەڵێن "سەرەتای سییەکان (سەعید قەزاز)، کە لە سەردەمی پاشایەتیدا وەزیری ناوخۆ بووە، بەچەند ئاغایەکی دەشتی هەولێری ڕاگەیاند هەریەکێك دەیەوێت لە دەشتی حەویجە نیشتەجێ بێت، ژمارەیەك لە جوتیارەکانی لەگەڵ خۆی بهێنێت و زەویان بەسەردا دابەش دەکەین، بەڵام هیچ ئاغایەك قبوڵی نەکردن، سەعید قەزازیش دەیوت: "ئێستا من دەتوانم کورد نیشتەجێ بکەم ئەگەر ئێوە نەیەن ئەوا دوور نییە عەرەب لەم ناوچەیە نیشتەجێ بکەن"، ئینجا کە پرۆژەکە تەواو بوو ژمارەیەکی زۆر لە هۆزانی عەرەبیان هێناو لەم دەشتە نیشتەجێیان کردن[٢٤]، ئەمەش دەرفەتێکە بۆ هێنانی عەشیرەت و خێڵە عەرەبەکان و نیشتەجێ کردنیان لە ناوچەی حەویجەدا بەمەبەستی زیادکردنی ڕێژەی عەرەب لە پارێزگای کەرکوکدا.

لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە بەرنامەو پرۆسەی بەعەرەبکردن لە کۆتایی سەدەی بیستەکان و سەرەتای سەدەی سییەکاندا لە ناوچە جیاجیاکانی باشووری ئەم بەشەی کوردستان دەستی پێکرد[٢٥].

مەبەستی سەرەکی حکومەتی عێراق لە دروستکردنی ئەم پرۆژەیەدا ئەوەبوو کە ڕێنەدات هۆزە کۆچەرە کوردەکان لە حەویجەدا نیشتەجێ بکرێن و لە بەرامبەریشدا بەو ژمارە زۆرە هۆزانی عەرەب نیشتەجێ بکرێن، ئەمەش نیەتی ڕاستەقینەی حکومەت دەردەخات کە قرتاندنی خاکی کوردستان بوو[٢٦].

بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییەش دکتۆر (نوری تاڵەبانی) دەڵێت: ئەم پرۆژەیە بۆ کورد دروست نەکراوە، بەڵکو تەنها لەپێناو عەرەب و بۆ عەرەب بووە، چونکە کاتێك کە (حەمید بەگی جاف) لەو سەردەمەدا قائیمقامی چەمچەماڵ دەبێت، پێشنیارێك بە نووسراوی ڕەسمی دەنێرێت بۆ وەزارەتی ناوخۆی عێراق، هەڵبەتە ئەو کاتە (سەعید قەزاز) وەزیر نەبووە، داوا دەکات کە بەشێك لە خێڵی کۆچەری کورد وەك (خێڵی جاف) لە قەزای کفری و کەلاردا بوون، کە بەردەوام لە زستاندا کۆچیان دەکردوو لە شارەبان نزیك دەبوونەوە، لە ناوچەی حەویجە نیشتەجێ بکرێن[٢٧]، بەڵام یاسین هاشمی گوێی بەو داوایە نەداو لە جیاتی کورد عەرەبی هێنا، حامید بەگی جاف دەستی لەکارکێشایەوە[٢٨]، کاتێك وەزارەتەکەی یاسین هاشمی دەستی کرد بە نیشتەجێکردنی عەشیرەتی عوبێد، کەلە دیالەوە هێنابوونی بۆ دەشتی حەویجە[٢٩].

ئەمە بە بیانووی ئەوەی کە ئەمانە لە ناوچەکەدا لە کۆچ و کۆچبەریدان و لە لایەکی تریشەوە لە شەڕو پێکدادانن لەگەڵ هۆزی (العزه)دا[٣٠](*) * کە ئەمەش تەنها پاساوێك بووە لە پێناو زیادکردنی ڕێژەی ڕەگەزی عەرەب لە ناوچەی کەرکوك.

هەر سەبارەت بە هێنانی عەشیرەتی عوبێد، پارێزەر مستەفا عەسکەری دەڵێت: "من ئاگاداری ئەوە نیم کە مەلیك فەیسەڵ بۆ پشتیوانی خۆی عەشیرەتی عوبێدی هێنابێتە ئەو ناوچەیە، بەڵام بێگومان بۆ عروبەچێتی هێناونی، گرنگ ئەوەیە عەرەب بوون و لە ناوچەیەکی ترەوە هێنراون بۆ حەویجە، بۆئەوەی وڵاتی پێ داگیر بکەن، لە کوردی داگیر بکەن، بۆئەوەی ناوچەکە ببێت بە پشتیوانی خۆیان، ئیتر ئەگەر مەلیك فەیسەڵ بێت یان هەر حکومەتێکی تری عێراق بێت، بەڵگە نەویستە حکومەتی عێراقی هەموو سەردەمێك حکومەتی عەرەبی بووە، چونکە هەرگیز نەووتراوە حکومەتی کوردی"[٣١].

دواتر عەشیرەتی کۆچەری جبوریشیان هێناو دوای دروستکردنی پرۆژەی حەویجە زەویان بەسەردا دابەشکردن[٣٢]، بۆ هەر خێزانێك (٧٠-٨٠) مەشارەی بەرکەوتووە[٣٣]، دانانی شارەزایانی کشتوکاڵ بۆئەوەی فێری کاری کشتوکاڵیان بکات، بەمەبەستی تەواو نیشتەجێکردنیان، بۆ زیادکردنی ڕەچەڵەکی عەرەب لە ناوچەی کەرکوکدا[٣٤]، لەسەرەتادا دەستیان کرد بە هێنانی شوانەکان و هۆزە کۆچەرییەکان بۆناوچەی حەویجە، پاشان دەستیان کرد بە دامەزراندنیان لە دەزگاکانی سەر بە شاری کەرکوك، لەپاش ئەوەش باروذۆخەکە گەیشتە ئەوەی کە دەست بکەن بە پرۆسەی ڕاگواستنی کوردو جێنشینکردنی عەرەب لە ماڵەکانیان و مولکەکانیان، لەدواجاردا لەماوەی فەرمانڕەوایی بەعسییەکان کارگەیشتە لەناوبردنی ناسنامەی کوردو گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی لە کوردی و تورکمانییەوە بۆ عەرەبی بەزۆرە ملێ[٣٥].

سەرۆك وەزیران (یاسین هاشمی) لە سەردەمی پاشایەتیدا بە نیشتەجێکردنی هەردوو عەشیرەتی (عوبێدو جبور) لە ناوچەی حەویجە هەوڵیدا ئەو ئاوە دووبەرەکی و ناکۆکییەی نێوان کوردو عەرەب بڕێژێت کە دواتر بەعس ڕشتی، چونکە بەعس ئەم دوو نەتەوەیەی (کوردو عەرەب)ی کردە دوژمنی یەك و وەکو دوو گەلی سەردەست و ژێردەست وێنەی کێشان[٣٦].

پارێزەر مستەفا عەسکەری دەڵێت "هەر فەرمانبەرێك لە

هەر شوێنێکدا کێشەیەکی هەبووایە ئەیانهێنا بۆ کەرکوك، بۆ ئەوەی ژمارەی عەرەبی پێ زۆر بکەن، واتە لە ساڵانی چلەکاندا سێ جۆر عەرەب هەبوون لە ناوچەی کەرکوك:

جۆری یەکەم: ئەو عەرەبانە بوون لە ناوچەکانی تری عێراق هێنرابوون.

جۆری دووەم:– عەرەبە حەدیدییەکان بوو، کەلەناو شاری کەرکوکدا وەکو بنەماڵەیەك یان هۆزێك هاتبوونە کەرکوك، بەڵام زۆر لە کۆنەوە لە کەرکوك ژیاون.

جۆری سێیەم:– ئەو کارمەندو فەرمانبەرانە بوون کە حکومەت نەفی کردبوون"[٣٧].

بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) رێژەی کورد لە قەزای حەویجەدا لە ٥٪ بووە[٣٨]، هەروەها ژمارەی عەرەبی هاوردە بەپێی هەمان سەرژمێر (٢٧٧٠٥) کەس بووە[٣٩]، دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٦٣) پرۆژەیەکی زۆری کشتوکاڵی پەلەوەر لە حەویجە کرایەوە ژمارەیەکی کوردی ئاوارەی گوندەکانی دووبزو حەویجە لەم پرۆژانە کاریان دەکردو ژمارەی کورد لە حەویجە زیادی کردەوە، بەڵام حکومەت بۆ جارێکی تر لە ساڵی (١٩٩٥) ئاوارەی کردنەوە[٤٠].

لە ساڵی (١٩٧٧) پرۆژەی ئاودێری (سەدام) بەئەنجام گەیەندرا لەهەمان ناوچەدا[٤١]، ئەگەر پرۆژەی حەویجە ئاودێری (١٣٩) هەزار دۆنم زەوی کردبێت، ئەوا پرۆژەی ئاودێری (سەدام) ئاودێری زیاتر لە (١٣٧) هەزار دۆنم زەوی کردووە، کەدەکاتە زیاتر لە( ٤٥٪) لەکۆی زەوییە بەراوەکانی قەزای حەویجە[٤٢]، ئەم پرۆژەیەش بووە هۆی نیشتەجێ بوونی ژمارەیەکی تر لە هۆزە عەرەبییەکان، هەروەها بووە هۆی زۆربوون و گەشەکردنی دانیشتووانی لادێ لە قەزای حەویجە بە شێوەیەکی سروشتی بەرێژەی ٥٪ی تۆماری ساڵانە[٤٣]، لێرەدا ئەگەر بە پێی سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧) ئاماژەیەك بە پێکهاتەی نەتەوەیی قەزای حەویجە بکەین لەدوای پرۆسەی تەعریب و ڕاگواستن، دەبینین ژمارەی دانیشتووانی بەم شێوەیە بووە:

رێژەی کورد ٧,١٣٪ رێژەی دانیشتووانی قەزای ناوەندی حەویجە پێکدەهێنن و عەرەبیش لە ٩١,٦٧٪ رێژەی تورکمانیش٠,٨٩٪ و رێژەی سریانیش ٠,٠١٪ و کەمینەکانی تریش ٠,٢٩٪ دانیشتووانی قەزاکەیە[٤٤].

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بەهۆی هێنان و جێنشینکردنی ژمارەیەکی زۆری عەرەبی هاوردە، ژمارەی کورد کەمی کردوو لە بەرامبەریشدا ژمارەی عەرەب زیادی کردووە بە پێچەوانەی دانیشتووانی قەزاکانی تر، پاشان لەنێوان ساڵانی (١٩٧٧–١٩٨٧) رێژەی دانیشتووانی قەزای حەویجە ٩٪ی تێپەڕاند، لە کاتێکدا دانیشتووانی لادێکانی پارێزگاکانی تر ڕووەو کەمبوونەوە بوو، لە لایەکی ترەوە کارکردن بۆ نیشتەجێ بوونی عەرەبەکان بووەهۆی بەرزبوونەوەی خێرا لە رێژەی گەشەکردنی دانیشتووانی قەزای حەویجە، بەشێوەیەك کە قەزاکانی تری تێپەڕاند، رێژەی قەبارەی دانیشتووانی قەزاکە لە (٨٪)ەوە گەیشتە ١٨٪ لە کۆی ژمارەی دانیشتووانی پارێزگای کەرکوك لە نێوان ساڵانی (١٩٦٥–١٩٨٧) لەهەمان کاتدا رێژەی ڕووبەری قەزای حەویجە لە ١٦,٦٪ بوو بە ٣٠٪ لە ڕووبەری پارێزگای کەرکوك لە هەمان ماوەدا[٤٥].

*** هاتنی ئەو هۆزە عەرەبانەی کە لەحەویجە نیشتەجێ بوون و ڕاگواستنی کوردەکانی ئەو ناوچەیە:**

ئەگەر بێین و ئاماژەیەك بە سەرەتای بوونی هۆزە عەرەبییەکان بکەین لە ناوچەی کەرکوك، دەبێت ئاماژە بە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی خێزانە هاشمییەکان بکەین، کە لەو سەردەمەوە سەرەتاکانی پرۆسەی بەعەرەبکردن دەستیپێکردووە، پاش ئەوەی ئینگلیزەکان لە ساڵی (١٩٢١)دا (فەیسەڵی کوری حوسێن)یان کردە مەلیکی عێراق، ئەویش لەلایەن خۆیەوە دەستیکرد بەئەنجامدانی گەشتێك بەنێو ئاغاو دەرەبەگەکانی کوردو عەرەبدا بۆئەوەی سەبارەت بە حکومەتەکەی گوێ لە بیروڕایان بگرێت، لێرەدا بۆی دەرکەوت گەورەترین کێشە لە ناوچەی کەرکوکدا، ڕاگرتنی کۆچکردنی هۆزەکانی کۆچەرە عەرەبەکان و گیروگرفتی دامەزراندن و چاککردنەوەی باری ئابوورییانە، بۆیە بە باشی زانی کە بەشێك لە خێڵی عوبێدو جبور، کەلە بیابانەکانی ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلە (نێوان موسڵ و سامەڕا) بڵاوببونەوەو ژمارەیەك لە تیرەکانیان لە کەنارەکە پەرشبوونەوەو گەیشتبوونە خوار خانەقین، بیانگوێزێتەوە بۆ ناوچەی کەرکوك و لەوێدا نیشتەجێیان بکات[٤٦]، مەلیك فەیسەڵ پێی وابوو کە گواستنەوەی ئەو خێڵە عەرەبیانە لە دوو لایەنەوە گرنگی و بایەخی هەیە، لە لایەك پەسەندترین چارەسەرکردن بوو بۆ پێشخستنیان و، لە لایەکی تریشەوە، لاوەکانیان لەدوارۆژدا دەتوانن ببن بە پاسەوانی کانگاکانی نەوت لە بابەگوڕگوڕدا لە جیاتی لاوانی کورد، بەڵام ئەم پلانە لەبەر مردنی مەلیك فەیسەڵ جێی خۆی نەگرتەوەو نەخرایە بواری جێبەجێکردنەوەوە[٤٧]، تا ساڵی (١٩٣٦) لەکاتێکدا کە دەسەڵاتی سیاسی کەوتە دەستی چەند توندڕەوێکی عەرەبییەوە لە بەغداد (بەتایبەت لە سەردەمی مەلیك غازی) داو بەفەرمانێکی ڕەسمی ئەو خێڵانەی عوبێدو جبوری گواستەوە بۆ ناوچەی (کانخوێ) کە لەدوای دا ئەو ناوە کوردییە گۆڕدرا بە (الملحە)ی عەرەبی و دواتریش کرا بە ناوەندی (الحویجە)[٤٨].

لەسەرەتادا پێویستە ئاماژەیەك بەو هۆزە عەرەبیانە بکرێت کەبەر لەماوەیەکی نزیك کە لە نێوان (٢٠٠–٣٠٠) ساڵ لەمەوبەر لە جەزیرەی عەرەبی و شامەوە هاتوونەتە پارێزگای کەرکوك و ناوچەی حەویجەدا نیشتەجێ بوون، زۆربەی ئەو هۆزانەش پێشتر، بەر لەوەی بەرەو ئەو پارێزگایە بکشێن و تێیدا جێگیر بن، لە چەند ناوچەیەکی دیکەی عێراق نیشتەجێ ببون.

ئێمە لێرەدا تەنها ئەو هۆزانە دەخەینە ڕوو کە لە ناوچەی حەویجەدا نیشتەجێ بوون:

١. هۆزەکانی شەممەر: ئەم هۆزانە لە نەجد (لە باکووری دوورگەی عەرەبییەوە) بە شێوەی چەند شەپۆلێکی پچڕپچڕ بەرەو عێراق هاتوون و لەوانەش هۆزی (الغداعنة) کە بەردەوام

پەیوەندیان لەگەڵ خزمەکانیاندا لە ناوچەی حەویجەدا هەبووە، لەهەمان کاتدا هۆزی (الاسلام) لە ناوچەی نێوان بەعاج (باشوورو بەرزاییەکانی ژەنگار)و حەویجە لە پارێزگای کەرکوك.

٢. هۆزەکانی ئەلزوفەیر: ئەم هۆزانە لە سەرەتاکانی سەدەی سیانزەمی کۆچی لە نەجدەوە بەرەو عێراق هاتوون، لەوانەش (البوحفرج) کەلە حەویجە نیشتەجێ بوون، وەك (الحليحل) و (الكراعنه)و (الخشاحنه)و (ابو عامر).

٣. هۆزەکانی عەنزە: لەوانە ئەلبوشاوس کە (٢٥٠) ساڵ لەمەوبەر هاتووەتە عێراق و لە قەزای حەویجە نیشتەجێبووە.

٤. جومەیلە: لەو هۆزە عەرەبیانەیە کە (٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش هاتووەتە عێراق و هەندێکیان لە سووریاوە هاتوون و پێش دوو سەدە لەمەوبەر لە حەویجە نیشتەجێ بوون.

٥. ئەلجەواله: لە نەجدو حیجازەوە هاتووەتە عێراق و لە ناوچەکانی کەرکوك و حەویجە نیشتەجێ بووە.

٦. ئەلعوبێد: لە زوبیدی قەحتانیەو لە کەناری راستی رووباری دیجلە لە نێوان سامەراو کەرکوك جێگیر بووەو پێشتر لەگەڵ هۆزەکانی (تەی و حەدیدی) لە ناوچەی حەویجە لەوێ بۆ ئەوێ دەیانگواستەوە.

٧. ئەلقەرەغول: لە باکووری دوورگەی عەرەبییەوە (نەجد) هاتووەتە عێراق و لەگەڵ هۆزی (ئەلعوبێد) لە ناوچەی حەویجە ژیاوەو بەزۆری لە ناحیەی (ریاض)ن، هەروەها لە شاری کەرکوکن.

٨. ئەلجحێش: هۆزێکی زوبەیدی رەسەنە لە دوورگەی عەرەبییەوە بەرەو وولاتی شام و پاشان لە رێگەی ژەنگارەوە بەرەو عێراق هاتووە، لە دوو سەدە لەمەوپێش لە موسڵەوە بەرەو حەویجەو دووبزو قەرەتەپە چووە.

٩. ئەلجبوور: ئەم هۆزە لە پارێزگاکانی نەینەواو ئەنبارو سەلاحەدین و کەرکوك نیشتەجێن و پێنج سەدە لەمەوبەر لە دوورگەی عەرەبییەوە هاتوون و لەوانەش (الحطور) ە کە لە حەویجەو هەژدە گوندی ناوچەی زابی خواروو نیشتەجێن،هەروەها (البونجاد) کەلە تەنیشت هۆزی (الحطور) نیشتەجێیە.

١٠. ئەبو زەمەرە: لە هۆزەکانی حەربەو لە نەجدو حیجازەوە هاتووەو لە ناوچەی حەویجە لە بەرزاییەکانی حەمرین گیرساوەتەوە، هەروەك هۆزی خەفاجەی نەجدی کە لەهەمان ناوچەدا نیشتەجێ بووە.

١١. ئەلبووسەباح: لە هۆزەکانی ئەلبوحەمدانی عەدنانیەیە، لە ناوچەکانی زێی خواروو و خورماتوو حەویجە کەرکوك نیشتەجێ بوو[٤٩].

بێگومان نیشتەجێ کردنی ئەو هۆزە عەرەبانە لە ناوچەی کەرکوك، بەتایبەت رۆژئاوای کەرکوك، سەرەتای هێرشە بەردەوامەکانی تەعریب بوو کەلە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق زۆر بە توندی پلانی بۆ کێشرا بوو، دیارترین وێنەی ئەو تەعریبە لە پرۆژەی حەویجە خۆی نیشان دەدا[٥٠].

کاتێك پرۆژەی ئاودێری حەویجە تەواو بوو، حکومەتی عێراق لە قۆناغی یەکەمی پرۆژەکە زیاتر لە ٢٠٠٠٠ هەزار کەسی لەو هۆزە عەرەبییە کۆچەرانە لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ کرد[٥١]،حکومەتی عێراق هەستا بە دابەشکردنی زەوی ئەو ناوچەیە بەسەر هۆزە عەرەبییە نیشتەجێبووەکاندا بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. عەشیرەتی عەرەبی عوبێد: (١٠٠٠) کیلۆمەتری چوارگۆشەیان بۆ تەرخان کرا، لەو زەوییانەی دەکەوتە لای خوارووی جۆگەی خۆرئاوای پرۆژەکەوە تا دەگاتە سنووری ئیداری قەزای مەرکەزی کەرکوك، ئەمانەش هەرزوو بەم رووبەرەدا بڵاوەیان لێ کرد[٥٢].

بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) ژمارەی سەری خێڵی عوبێد پاش (١٠) ساڵ لە نیشتەجێ کردنیان لە دەشتی حەویجە گەیشتە نزیکەی ١١٠٠٠کەس و[٥٣]،هەر لەسەرەتای دروستکردنی پرۆژەکەوە تا ساڵی (١٩٥٧) (١٢٤) شوێنیان داگیر کردووە، گرنگە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین، کەپاش ئەوەی عەشیرەتی عوبێد گوێزرانەوە بۆ شوێنە نوێیەکەیان زۆربەی هەرە زۆریان پەیوەست نەبوون بەخاکەوە، بەڵکو زۆرێکیان بەردەوام بوون لەسەر ژیانی کۆچەری و رەوەندی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ[٥٥].

لەراپۆرتێکی نهێنی بەریتانی کە تایبەت بوو بە هۆزەکانی عەرەب لە ساڵی (١٩١٧)دا دانرا،ئەم دەقە هاتووە ((عەشیرەتی عوبێد لەکەناری رۆژاوای رووباری دیجلە جێنشین بوون، لەنێوان موسڵ و بەغداد، لەرووباری دیجلە پەرینەوەو لە شوێنەکەی خۆیان کە حەوێجەی عوبێدە نیشتەجێبوون، گەورەترین لقی عەشیرەتی عوبێد (ئەبوعەلی)یە، بەشێکی زۆریان سەرقاڵی کشتوکاڵن لە نزیك رووباری دیجلە، ئەوانی ماون سەرقاڵی بەخێوکردنی حوشترن، زۆرینەی ئەندامانی هۆزەکە لە دەوار دەژین))، گۆرانکاری ئەوتۆ لەژیانیان رووی نەدا، تا جێبەجێکردنی پرۆژەی حەویجە لەسەر دەمی پاشایەتیدا[٥٦].

هۆزی عوبێد لە گرنگترین هۆزی عەرەبی بووە لە کەرکوك و پاشکۆکانی دا، بوونی ئەم هۆزەش لە باشوری رۆژئاوای کەرکوك دا، پەیوەستە بە جووڵەیەکی گەورەی هۆزی لە ناوەراستی عێراق، باکووری بەغداد لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە لە دەرئەنجامی کۆچکردنی هۆزی (شەمەر)ی ناسراو لە رۆژهەڵاتی فوراتەوە بۆ رۆژئاوای فورات، ئەمەش لەژێر فشاری هۆزی (عەنزە) بوو، هەروەها بە هاندانی حکومەتی عوسمانیش بوو، کە مەبەستی تێکشکاندنی دەسەڵاتی هۆزی عوبێد بوو، لە ئەنجامی ئەمانەش عەشیرەتی عوبێد لە کەناری رۆژئاواوە بەرەو رۆژهەڵاتی دیجلە کۆچی کردوو، هەندێکیان بەرەو حەویجە بەرێکەوتن، پاش ئەوەی لە شاخەکانی حەمرین پەرینەوە، بۆ یەکەم جار لە مێژوویەکەیدا[٥٧].

(عەباس عەزاوی) دەڵێت: "لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە هۆزی عوبێد دووچاری فشارێك بوون لەلایەن هۆزی شەمەرەوە[٥٨]، لە ئەنجامدا هۆزی شەمەر توانی هۆزی عوبێدو چەندین هۆزی تریش لە نیشتیمانەکەیان دوور بخەنەوە[٥٩]، ئەو فشارە زۆرەی کە شەمەر کردی نائارامیەکی دروستکرد، کە کاریگەری کردە سەر هۆزی جبور، هەروەها

ڕەنگدانەوەشی هەبوو لەسەر بنەڕەتی نیشتەجێ بوون لە باشووری خۆرئاوای كەركوك".

لەم بارەیەشەوە دەڵێت: "شەمەر كاریگەری ڕوو لە زیاد بوون بوو تا توانی جەزیرە داگیر بكات، پاڵی بە هۆزەكانی ناوچەكەوە نا بەرەو ئاراستەی جیاواز، لە ئەنجامدا هۆزی عوبێد گەیشتە حەویجەو، (بەیات)ی ناردە ئەو شوێنەی كەوا ئێستا تێیدا نیشتەجێن، هۆزی جبووریش دووچاری پەرتەوازەیی بوون"[٦٠].

٢. عەشیرەتی عەرەبی جبور: ڕووبەری (٩٠٠) كیلۆمەتر دووجای بۆ تەرخان كرا، كە لە زێی بچووكەوە دەست پێدەكات و لە لقی ڕۆژئاوای پرۆژەكە كۆتایی دێت[٦١]، بە پێی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) ژمارەیان (١٢٥٩٥)كەس بووەو[٦٢]، (٨٥) گوندیشیان هەبووە[٦٣].

٣. عەشیرەتی عەرەبی ئەلبوحەمدان: ڕووبەری (٢٠٠) كم٢ لە خاكی پرۆژەی حەویجەیان بۆ دیاری كرا. كە دەكەوێتە نێوان زێی بچووك و زێی گشتی كەركوك- حەویجە[٦٤]، كە هەر بەپێی سەرژمێری پێشوو نزیكەی (٢١٤٠) كەس و[٦٥]، (١٤) گوندیان بۆخۆیان دروستكردووە[٦٦].

٤. عەشیرەتی عەرەبی هەمەجۆرو هەندێك خێزانی تكریتی و ئەو خێزانە كوردانەی شوان و شێخ بزێنی و دووری، كە لەدێر زەمانەوە لە دەشتی حەویجە نیشتەجێ ببون، ئەمانەش بەهەموویان تەنها (١٠٠)كم٢ بۆ نیشتەجێ كردنیان تەرخان كراو بە هەموویان تەنها لە (٥) گونددا نیشتەجێ كران[٦٧].

٥. عەشیرەتی شیشان: كە عەرەب نین لە قەبقازەوە لە ناوەراستی سەدەی نۆزدە هاتوون بۆ حەویجە پاش ئەوەی رووسیای قەیسەری وولاتەكەیانی خستە پاڵ خۆی لەگەڵ هێنانی هۆزە عەرەبییەكان و نیشتەجێكردنیان لە ناوچەی حەویجە لەدوای بەئەنجام گەیاندنی پرۆژەی حەویجە، سەرپەرشتیارەكانی پرۆژەكە بەرژەوەندییەكانی هۆزە كوردییەكانیان پشت گوێخستن بەتایبەتی داوودییەكان كەلە شوێنی خۆیان هەڵكەندران، پاش ئەوەی هۆزی عوبێد لە شاخەكانی حەمرین پەرینەوەو فشاریان بۆ هێنان، مایەی داخ و پەژارەیە كەسانی ئەم خێڵە عەرەبەكانی كە لەناوەراستی ساڵانی چلەوە لە دەشتی حەویجە نیشتەجێ كراون، كەمێكیان نەبێت لە سەرۆكەكانی خێڵی عوبێد كە شێخ (نازم عاسی و شێخ موزهیر عاسی) برای لەپێش هەموویانەوەیە، لەو هێرشە چەكدارانەدا بەشداربوون كە سوپای عێراق لە ساڵی (١٩٦٣) لەوەو پاشەوە كردوویەتیە سەر دێهاتە كوردەكان. ڕژێم هەندێك تیپی جاشی لەمانە پێكهێنابوو ناوی لێنابوون (سوارەی خالیدی كوری وەلید) و شانبەشانی چڵكاوخۆرە كوردەكان كە ناوی لێنابوون (سوارەی سەلاحەدین) بەكاری دەهێنان بۆ هێرشبردن لەگەڵ سوپای عێراقدا، بە بیانووی ئەوەوە گوایا (پێشمەرگە)ی كورد لەو ناوچانەدا هەن یان خەڵكی ئەو دێهاتانە یارمەتی پێشمەرگە دەدات[٦٨].

لەگەڵ هێنانی ئەو عەشیرەتە كۆچەریە عەرەبانەو نیشتەجێكردنیان لەلایەن حكومەتی عێراقەوە، دەستی كرد بە دابینكردنی زۆرترین پێداویستییەكانیان لەپێناو ئەوەی كە بە تەواوەتی نیشتەجێ بن لەسەر زەوی و ئاوی كوردن هەروەها ڕاگواستنی زۆرەملێی كوردەكان و هەڵكەندنیان لەسە خاكی خۆیان.

دوای ڕێككەوتننامەی ١١ی ئازاری: ساڵی ١٩٧٠ كوردی دەركراوی شارۆچكەی حەویجەو گوندەكانی ناوچەكە گەڕانەوە شارۆچكەی حەویجە، بەڵام حكومەتی عێراق لێنەگەڕا هیچ ماڵە كوردێك بگەڕێتەوە گوندەكانیان[٦٩].

لە دوای ساڵی (١٩٧٤)یش بە بروبیانوی جۆراوجۆر كورد لە حەویجە دەركراو تا ئازادبوونی عێراقیش دەركردن لە حەویجە بەردەوام بوو[٧٠].

* **دەرئەنجام:**

لە ئەنجامدا گەشتینە ئەوەی كە:

١. بە ئاشكرا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە ڕژێمی عێراقی هەر لە سەرەتاوە هەوڵی تەواوی داوە بۆ شێواندنی سنووری كارگێڕی و جوگرافی پارێزگای كەركوك و تەسككردنەوەی سنووری پارێزگاكە بۆئەوەی یەكە كارگێڕییەكانی كەم بكاتەوە بەوەش ژمارەی دانیشتووانی كوردی تیادا كەم بێتەوە، كە هەر لەسەرەتاوە هەوڵی دابەشكردنی دراوەو قەزای حەویجە هەنگاوە سەرەكییەكانی شێوازی ئەم هاوكێشەیە بوو.

٢. دروستكردنی پرۆژەی ئاودێری حەویجە، هەوڵێكی سەرەكی و سەرەتایی حكومەتی عێراقی بووە بۆ پیادەكردنی سیاسەتی تەعریب كردن و هەوڵدان بۆ لەناوبردنی باری ناسنامەو نەتەوەیی كورد لە ڕێگەی ئەنجامدانی پرۆژەیەكی لەم شێوەیە تا خێڵە عەرەبییەكانی ناوەندو باشوور بهێننە ناوچە كوێستانەكانی كوردستان.

٣. ڕژێمی عێراقی هەوڵی گۆڕینی باری نەتەوەیی دانیشتووانی كوردی داوە لەم پارێزگایەدان بەمەبەستی كەمكردنەوەی ژمارەو ڕێژەی كوردو كەمینە ناعەرەبەكان و زیادكردنی عەرەب لە سنووری پارێزگاكەدا كە هەنگاوە سەرەكییەكانی لە ساڵی (١٩٣٦)ەوە بە پرۆسەی بەعەرەبكردن دەستپێدەكات، لەم پێناوەدا چەندان ساڵ عەرەب هێنراوەتە سنووری پارێزگاكە لەبەرامبەریشدا هەزاران ماڵی كورد ڕاگوێزراوەتەوە بۆ ناوچەكانی دەرەوەی پارێزگای كەركوك.

٤. هەوڵدانی حكومەتی عێراقی بۆ یەكلاییكردنەوەی كێشە سیاسییەكانی نەتەوایەتی و سنوورییەكان لە ئایندەدا بە بەرژەوەندی نەتەوەی عەرەب و عێراق.

٥. ناوچەی كەركوك لە هەموو ناوچەكانی تری كوردستان زیاتر كەوتوەتە بەر شاڵاوی درندانەی داگیركاری خاكی كوردستان، بەهەموو شێوەیەك هەوڵی سڕینەوەی مۆركی كوردبوونی ئەو شارە دراوە.

٦. هەر لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی پێكهێنراوی عێراقەوە بەرنامەی بەعەرەبكردنی كەركوك و قڕكردنی نەتەوەی كورد بە پێی بەرنامەی ووردی سیاسی كاری جدی بۆ كراوە.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. د. نوری تاڵەبانی، (ناوچەی کەرکوك)، لاپەرە ٥١-٥٢.
٢. فەرمان عەبدولڕەحمان، (پاکتاوی ڕەگەزی کورد لە کوردستانی عێراقدا)، لاپەرە ٦٣.
٣. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك، في بحوث مؤتمر علمي حول كركوك، ٣-٥ نيسان ٢٠٠١، اربيل)، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، لاپەرە ١٤٣.
٤. محەمەد ئەحمەد سەعید، (کەرکوك و بزافی شیعری کوردی)، لاپەرە ١٣-١٤.
٥. ڕاپۆرتی کارگێڕی دەڤەری کەرکوك ماوەی (١)ی کانوونی دووەم تا (٣١)ی کانونی یەکەمی ١٩١٩، لەلایەن کاربەدەستانی ئەو کاتەی دەڤەری کەرکوك و میزۆپۆتامیاوە، وەك ڕاپۆرتی ڕەسمی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا نووسراوە، وەرگێڕان: سەربەست کەرکوکی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەرە ٦٦-٦٧.
(*) پاش ئەوەی (جەمیل مەدفەعی) لە پۆستی سەرۆك وەزیران کشایەوە، مەلیك (غازی) بڕیارێکی دەرکرد کە لەدووتوێی نامەیەکدا ئاراستەی یاسین هاشمی کرد، تیایدا دەڵێت: "وەزیری پایەدارم یاسین هاشمی بە پشت بەستن بەدەست لەکار کێشانەوەی پایەدار جەمیل مەدفەعی، لە پۆستی سەرۆك وەزیران بە پێی ئەوەی کە متمانەمان بە شارەزایی و دڵسۆزیتان هەیە، بۆیە پۆستی سەرۆك وەزیرانی نوێمان خستە ئەستۆی ئێوە، دەبێت هاوڕێکانت دەستنیشان بکەیت و ناوەکانیانمان پێ نیشان بدەیت، خودا پشتیوانیانە"، ئەم بڕیارە لە ١٩٣٥/٣/١٧ لە کۆشکی پاشایەتی لە بەغدا دەرچوو. بڕوانە: عبدولرەزاق ئەلحەسەنی، (تاريخ العراق السياسي الحديث)، بەرگی ٣، چاپی سێیەم، چاپخانەی (العرفان)، سەیدا، لوبنان، لاپەرە ١٢٠.
٦. عەدنان کاکە ڕەش (بابەتێکی نووسەر)، (کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت)، سلێمانی، ٢٠٠٧، لاپەرە ١٧-١٨.
٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٩.
٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٩.
٩. د. نوری تاڵەبانی: (ناوچەی کەرکوك)، لاپەرە ٥٢.
١٠. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك)، لاپەرە ٢٠٧.
١١. عەباس سلێمان سمایل، (حەویجەو دووبز لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا)، لاپەرە ٧.
١٢. سنوور سەباح سدیق، (مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك ١٩٦٣- ١٩٩١)، لاپەرە ٥٢.
١٣. عەباس سلێمان سمایل، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٧.
١٤. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك)، لاپەرە ٢٠٧.
١٥. د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (ڕۆڵی قەزای حەویجە لە پرۆسەی بەعەرەبکردنی پارێزگای کەرکوك)، لاپەرە ٧.
١٦. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك)، لاپەرە ١٤٧.
١٧. محەمەد ئەحمەد سعید، (کەرکوك و بزافی شیعری کوردی)، لاپەرە ١٣.
١٨. محەمەد سەعید سۆفی، (پارێزگای کەرکوك لەناو پاکتاوکردنی ڕەگەزیدا، گۆڤاری کەرکوك)، ژمارە ١٦، ٢٠٠٢، لاپەرە ٣٤.
١٩. د.عەبدوڵڵا غەفور، (پێکهاتنی نەتەوەیی و ئاینی دانیشتووانی هەرێمی کوردستانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی)، ژمارە ٣١، لاپەرە ٣١.
٢٠. عارف قوربانی، (كركوك الحقائق والارقام)، کەرکوك، ٢٠٠٩، لاپەرە ٧١-٧٢.
٢١. (تأريخ شاهدة على كوردية الكركوك)، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە ٥، ٢٠٠٣، لاپەرە ١٢٤.
٢٢. عونی داوودی، (كركوك رحلة في ذاكرة التأريخ)، کەرکوك، لاپەرە ٨٢.
(*) ئەحمەد کوڕی عەبدولقادری کوڕی ئەحمەد سەرداری بەرزنجەیە،لە ساڵی ١٨٦٨ لە کەرکوك لەدایکبووە، لە ساڵی (١٩٢٣) بۆ بەغداد دورخراوەتەوەو لە (١١)ی ئەیلولی ١٩٥٢ لە کەرکوك کۆچی دوای کردووە.
بڕوانە: سمکۆ بەهرۆز، (بیبلۆگرافیای ڕۆشنبیران و ناودارانی کەرکوك)، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە ٣٤، ٢٠٠٧، لاپەرە ٨٨.
٢٣. عەباس سلێمان سمایل، (حەویجەو دووبز لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا)، لاپەرە ٧.
٢٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٧.
٢٥. د.عەبدوڵڵا غەفور، (پێکهاتنی نەتەوەیی و ئایینی دانیشتووانی هەرێمی کوردستانی عێراق)، لاپەرە ٦.
٢٦. سنوور سەباح سدیق، (مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك، ١٩٦٣-١٩٩١، لاپەرە ١٨.
٢٧. عەدنان کاکە ڕەش، (کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت)، سلێمانی، ٢٠٠٧، لاپەرە ١٨.
٢٨. لەتیف فاتیح و مەجید ساڵح، (کوردقران)، چاپخانەو ئۆفسێتی (تیشك)، سلێمانی، ٢٠٠٣، لاپەرە ٣٥.
٢٩. بڕوانە:
- شۆڕش حاجی، (تەعریبی کەرکوك)، لاپەرە ٣٩.
- عونی الداوودی، (كركوك، رحلة في ذاكرة التاريخ)، کەرکوك، لاپەرە ١٨.
٣٠. سنوور سەباح سدیق، (مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك ١٩٦٣-١٩٩١)، لاپەرە ٥٢.
(*) هۆکاری ئەم دوژمنایەتیە ئەو هێرشە فراوانە بوو کە عەشیرەتی عەززە کردیە سەر مێگەل و لەوەڕگاکانی عەشیرەتی عوبێد، کە زۆربەیان لە ڕاستیدا موڵکی کریستیانەکانی کەرکوکن گێڕانەوەی ئەو مێگەلانە، یەکەم بڕیاری ئەنجوومەن بوو، پاش شەش مانگ مێگەلەکان گێڕدرانەوە. بڕوانە،

راپۆرتی کارگێری دەڤەری کەرکوك ماوەی (١)ی کانوونی دووەم تا (٣١)ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩، وەرگێرانی سەربەست کەرکوکی، لاپەرە ٤٠-٤١.

٣١. عەدنان کاکە رەش، (کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت)، لاپەرە ٤٦.

٣٢. عەونی داوودی، (كركوك مدينة الضاحكة بالنار والنور)، لاپەرە ٤١.

٣٣. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (البعد القومي للاستيطان العربي في محافضة كركوك، في بحوث المؤتمر علمي حول كركوك ٣-٥-نيسان ٢٠٠١، اربيل)، چاپی ٢، هەولێر، ٢٠٠٢، لاپەرە ٢٠٧.

٣٤. عەونی داوودی، (کرکوك..)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤١.

٣٥. عارف قوربانی، (كركوك الحقائق والارقام)، کەرکوك، ٢٠٠٩، لاپەرە ٧٢.

٣٦. لەتیف فاتیح فەرەج: (کوردو کەرکوك)، لاپەرە ١١٣.

٣٧. عەدنان کاکە رەش، (کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت)، لاپەرە ٤٥-٤٦.

٣٨. عەلی محمود محەمەد، (کەرکوك شاری قەڵاو ئاگرو خوێن)، چاپخانەی (ئارابخا)، کەرکوك، ٢٠٠٦، لاپەرە ٢١٥.

٣٩. فاتیح عەبدوڵلا شوانی، (پارێزگای کەرکوك لە ١٩٥٧-١٩٧٧)، چاپخانەی (رامان)، سلێمانی، ٢٠٠٥، لاپەرە ٦٤.

٤٠. سلێمان سمایل عەباس، (حەویجەو دووبز لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا)، لاپەرە ٢١٥.

٤١. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك)، لاپەرە ٢٠٧.

٤٢. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (رۆڵی قەزای حەویجە لە پرۆسەی بەعەرەبکردنی پارێزگای کەرکوکدا)، لاپەرە ٨.

٤٣. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٢٠٧.

٤٤. فاتیح عەبدوڵلا شوانی، (پارێزگای کەرکوك لە ١٩٥٧-١٩٧٧)، لاپەرە ١٠٣-١٠٤.

٤٥. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك)، لاپەرە ٢٠٧.

٤٦. دکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد: (کەرکوک و ناوچەی گەرمیان و مافی کۆنترۆلکردنیان لەلایەن کوردەوە)، چاپخانەی (خانی)، دهۆك، ٢٠٠٨، لاپەرە ٥٥.

٤٧. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٥.

٤٨. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٦.

٤٩. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد، (البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك)، لاپەرە ٢٠٥-٢٠٦.

٥٠. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٠٦.

٥١. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٠٧.

٥٢. دکتۆر نوری تاڵەبانی، (ناوچەی کەرکوك)، لاپەرە ٥٣.

٥٣. فاتیح عەبدوڵلا شوانی، (پارێزگای کەرکوك لە ١٩٥٧-١٩٧٧)، لاپەرە ٥٦.

٥٤. سنوور سەباح سدیق، (مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك ١٩٦٣-١٩٩١)، لاپەرە ٥١.

٥٥. دکتۆر کەمال موزهر ئەحمەد، (كركوك وتوابعها.. حكم التاريخ والضمير)، لاپەرە ٧٣.

٥٦. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٧١.

٥٧. (عشائر العراق)، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٤٧، لاپەرە ١٤٤.

٥٨. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٢٨.

٥٩. دکتۆر کەمال موزهر ئەحمەد، (كركوك وتوابعها.. حكم التاريخ والضمير)، چاپخانەی (رینوین)، بەشی یەکەم، لاپەرە ٧٢.

٦٠. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٤٧.

٦١. سنوور سەباح سدیق، (مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك ١٩٦٣-١٩٩١)، لاپەرە ٥٣.

٦٢. دکتۆر نوری تاڵەبانی، (ناوچەی کەرکوك)، لاپەرە ٥٤.

٦٣. فاتح عەبدوڵلا شوانی، (پارێزگای کەرکوك لە ١٩٥٧-١٩٧٧)، لاپەرە ٥٦.

٦٤. سنوور سەباح سدیق، هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٣.

٦٥. فاتح عەبدوڵلا شوانی، هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٦.

٦٦. دکتۆر نوری تاڵەبانی، (ناوچەی کەرکوك)، لاپەرە ٥٤.

٦٧. سنوور سەباح سدیق، هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٣.

٦٨. دکتۆر نوری تاڵەبانی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٥٥.

٦٩. عەباس سلێمان سمایل، (حەویجەو دووبز لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا)، لاپەرە ٧.

٧٠. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٧.

*** سەرچاوەکان بە گشتی:**

**سەرچاوەکان بە زمانی کوردی**

١. سنوور سەباح سدیق: مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك (١٩٦٣-١٩٩١)، دەزگای چاپ و پەخشی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩.

٢. محەمەد ئەحمەد سەعید: کەرکوک و بزاڤی شیعری کوردی، لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن، نامەی دکتۆرا، سلێمانی، ٢٠٠١.

٣. راپۆرتی کارگێری دەڤەری کەرکوك ماوەی (١)ی کانوونی دووەم تا (٣١)ی کانووونی یەکەم (١٩١٩)، و: سەربەست کەرکوکی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٤. د. ئەردەشیر خودادادیان: ئارییەکان و ماددەکان، و: عەلا نوري بابە عەلی، سلێمانی، ٢٠٠٣

٥. عەدنان کاکە رەش: کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت، سلێمانی، ٢٠٠٧.

٦. د.خەلیل اسماعیل محەمەد: رۆڵی قەزای حەویجە لە پرۆسەی بەعەرەبکردنی پارێزگای کەرکوك.

٧. لەتیف فاتیح و مەجید سالح، کورد قران،چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٣

٨. عەلی مەحموود محەمەد، کەرکوك شاری قەڵاو ئاگرو خوێن، چاپی یەکەم چاپخانەی ئارا، کەرکوك، ٢٠٠٦.

٩. د. نوری تاڵەبانی: ناوچەی کەرکوك، هەوڵی گۆرینی باری نەتەوەیی ئەم ناوچەیە، و: محەمەدی مەلا کەریم، چاپی

دووەم، هەولێر، ٢٠٠٤.
١٠. فاتیح عەبدوڵڵا شوانی: پارێزگای کەرکوك لە ١٩٥٧–١٩٧٧، چاپی یەکەم، چاپخانەی رامان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
١١. فەرمان عەبدولرحمان: پاکتاوی رەگەزی کورد لە کوردستانی عێراق، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٦.
١٢. عەبدوڵڵا قەرەداغی: راگواستنی کورد لە مێژوودا، چاپی دووەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.
١٣. د. جەمال رەشید ئەحمەد: کەرکوكو ناوچەی گەرمیانو مافی کۆنترۆڵکردنیان لەلایەن کوردەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨.
١٤. سۆزان کەریم مستەفا: بەعسیزمو کورد، چاپی یەکەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.
١٥. شۆرش حاجی: تەعریبی کەرکوك، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤.
١٦. ئازاد سەراوی: بەرەو کەرکوك، بەرگی دووەم، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکوك، ٢٠٠٧.
١٧. لەتیف فاتیح فەرەج: کوردو کەرکوك، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم،، سلێمانی، ٢٠٠٢.
١٨. د. محەمەد هماوەندی: راگواستنی کوردو زاموارکردنی دیموکراتیەت لە کوردستان، کەرکوك، ٢٠٠٤.
١٩. عارف قوبانی: پاکتاوی رەگەزی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، کەرکوك، ٢٠٠٤.
٢٠. عارف قوربانی: لەبارەی کەرکوکەوە، کەرکوك، ٢٠٠٥.
٢١. سەمەد چاوشین: لە پێناو کەرکوکدا، کەرکوك، ٢٠٠٥.
٢٢. د. خەلیل اسماعیل محەمەد: رۆڵی قەزای حەویجە لە پرۆسەی بەعەرەبکردنی پارێزگای کەرکوك، و: د. جەزا تۆفیق تالیب، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٢٣. هەورامان کەمال میرزا عەبدوڵڵا و تاریق رەئوف محەمەد: ناوچەکانی ململانێ لە نێوان کوردو حکومەتەکانی عێراقدا،دەزگای چاپو پەخشی مەحوی، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٨.
٢٤. سمکۆ بەهرۆز محەمەد: مێژووی سەردەمە کارگێڕیو بەڕێوەبەرایەتییەکانی پارێزگای کەرکوك، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکوك، ٢٠٠٥.
٢٥. پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری: شاری کەرکوك لە نێوان ساڵانی (١٩١٧–١٩٢٦)، چاپی یەکەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.

*** گۆڤارو رۆژنامەکان:**

٢٦. ئارمان رەئوف محەمەد: پاکتاوکردنی رەگەزی لە هەرێمی کوردستان، گۆڤاری سەروەری، ژمارە ١٦، ساڵی ٢٠٠٦.
٢٧. جەلال جەوهەر عەزیز: ٨٠ ساڵ تەعریبکردنی کوردستان، گۆڤاری کەرکوك ژمارە (١)، ساڵی ٢٠٠٠.
٢٨. پ.ی.د. نەبەز مەجید ئەمین: پرۆسەی تەعریب، گۆڤاری زانکۆی کۆیە، ژمارە (٣)، ساڵی ٢٠٠٥.
٢٩. وریا جاف: بەعەرەبکردنی کەرکوك لە سەردەمی کۆماری دا، گۆڤاری نەوشەفەق، ژمارە (٨)، ساڵی ٢٠٠٣.
٣٠. هیوا محەمەد تاهیرو سەروەر سابیر مەحمود: ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی بەعەرەبکردن لە سەردەمی رژێمی بەعسدا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٣١)، ساڵی ٢٠٠٧.
٣١. لەتیف دەلۆ: گەرەکی شۆریجە رەگەزنامەی کوردایەتی، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٣٥)، ساڵی ٢٠٠٨.
٣٢. د. جەبار قادر: پێکهاتەی نەژادی دانیشتووانی کەرکوك لە نێوان ساڵانی (١٨٥٠–١٩٥٨)، گۆڤاری نەوشەفەق، ژمارە ١٠، ساڵی ٢٠٠٤.
٣٣. د. رەفیق شوانی: کێشەی بەعەرەبکردنی کەرکوك لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، و: پێرس زەنگەنە، گۆڤاری نەوشەفەق، ژمارە (٣١)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
٣٤. سمکۆ بەهرۆز: بیبلیۆگرافیای رۆشنبیرانو ناودارانی کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٣٥)، ٢٠٠٧.
٣٥. عەباس سلێمان سمایل: حەویجەو دووبز لە لێکۆڵینەوەیەکی میدانیدا، گۆڤارە نەوشەفەق، ژمارە (٩)، ٢٠٠٣.
٣٦. محەمەد سەعید سۆفی: پارێزگای کەرکوك لەناو پاکتاوکردنی رەگەزیدا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (١٣)، ساڵی ٢٠٠٢.
٣٧. د.عەبدوڵڵا غفور: پێکهاتنی نەتەوەییو ئاینی دانیشتووانی هەرێمی کوردستانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە (٣١).

*** سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی:**

٣٨. عارف قوربانی: كركوك الحقائق والارقام، كركوك ٢٠٠٩.
٣٩. قسم بحوث وإطلاعات الراي: كركوك بموجب احصاء عام (١٩٥٧)، مطبعة حمدي، سليمانية، ٢٠٠٨.
٤٠. د. خليل اسماعيل محمد: البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك، في بحوث مؤتمر علمي حول كركوك، ٣–٥ نيسان ٢٠٠١، اربيل)، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢.
٤١. عبد الرزاق الحسني: تاريخ العراق السياسي الحديث،طبعة الثانية، مطبعة عيرفان، لبنان، ١٩٥٧.
٤٢. عوني الداودي: كركوك رحلة في ذاكرة التاريخ، كركوك.
٤٣. عوني الداودي: كركوك المدينة الضاحكة بالنار والنور.
٤٤. د.كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها.... حكم التأريخ والضمير، الجزء الاول، مطبعة دينوين.
٤٥. عباس عزاوي: عشائر العراق، بغداد، ١٩٤٧.

*** گۆڤار بە زمانی عەرەبی:**

٤٦. د. عبدالله عمر: تاريخ شاهيداً على كوردية كركوك، مجلة نوشفق، العدد (٥)، ٢٠٠٣

*** تەعریبێکی نوێ لەدوای ١٦ی ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠١٧ لە کەرکوك:**

**هیوا حوسامەدین**

پارێزگاری کەرکوك بە وەکالەت (راکان سەعید) بە ملیۆنان مەتر دووجا زەوی کورد و تورکمانی کەرکوك، جارێکی دیکە دەداتەوە و بەو عەرەبانەی کە سەدام حوسێن لە چوارچێوەی سیاسەتی بەعەرەبکردن هێنابوونی بۆ پارێزگای کەرکوك.

رووبەری ئەو زەوییانە یەك ملیار و سێ سەد ملیۆن مەتر دووجایە، لەسەر بازگەی کەیوانەوە دەستپێدەکات تاکو دەگاتە زەوییەکانی (حەفتەغار) لە سنووری شارۆچکەی (داقووق)، زەوییەکانیش موڵکی ئەو کورد و تورکمانەن کە لە سەردەمی سەدام حوسێن لێیان سەندراوە و بە گرێبەست دراوەتە عەرەبی هاوردە. زەوییەکانیش بەپێی سنووری ناوچەکە لە چۆپلیجە و هەنجیرە و باجوان و شیرین و تەقتەق و مامە و کەیوان و گوندی ئەبو سەیف لە سنووری مەلا عەبدوڵڵا و یایچی و تازە و بەشیر تا دەگاتە سنووری (داقووق).

بەڵام ئەم بڕیارانە نادەستوورییە و بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك راستەخۆ مامەڵە لەگەڵ ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق دەکات بە بیانووی ئەوەی ئەنجوومەنی پارێزگا پەکی کەوتووە، کە چەند ئەندامێکی ئەنجوومەنەکەی بەلای خۆیدا راکێشاوە، لە هەمان کاتدا لەگەڵ چەند وەزارەتێك رێك کەوتوونە.

کار کردن بە بڕیارەکانی مەجلیسی قیادەی سەورەی حیزبی بەعس راگیراوە، سەرجەم ئەو بڕیارانەی لەلایەن ئەو مەجلیسە دەرچوون بە تەعریبی کەرکوکیشەوە لەلایەن ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقەوە هەڵوەشاونەتەوە.

بەپێی ماددەی (١٤٠)ی دەستووری عێراق زۆربەی ئەو زەوییانەی پێشتر دراون، بە عەرەبی هاوردە، بۆ خاوەنە رەسەنەکانیان گەڕێندراونەتەوە و ئەو عەرەبە هاوردانەشی هێنرابوونە کەرکوك زۆربەیان دوای قەرەبووکردنەوەیان گەڕێندراونەتەوە زێدی خۆیان زۆربەی ئەو گوند و زەوییانە، هیچ کێڵگە و بۆرییەکی نەوت و بارەگایەکی سەربازی لێ نییە، ئامانجەکانیشی روونە کە هێنانەوەی عەرەبە هاوردەکانە.

لەو زەوییانەی کە نووسراوەکەی پارێزگای کەرکوك بە وەکالەت دەیانگرێتەوە، زۆربەی جووتیارانی کوردە، بەڵام یایچی تاوەکو تازە و بەشیر و کەمێك لە داقووقیش زەوی تورکمانە شیعەکانە، بۆیە حیزبە تورکمانەکانیش جیاواز لە کورد بە توندی لە دژی ئەو هەوڵانەی (راکان سەعید) وەستاونەتەوە.

فەلاح یایچی، قائیمقامی قەزای کەرکوك، لە نووسراوێکیدا کە بە ژمارە (٣٧٢٩) لە رۆژی ١٩ی نیسانی ٢٠١٨ ئاراستەی پارێزگاری کەرکوك بە وەکالەتی کردووە دەڵێت:-

" گوندی سەید خەڵەف کە پێشتر ناوی گوندی بەعسی لێنرابوو، لەسەردەمی بەعس خەڵکە کورد و تورکمانەکەی لێدەرهێنراو لە ساڵی ١٩٨٧ زەوییەکانیان زەوتکرا، خاوەنە رەسەنەکانیان دوای نەمانی رژێمی بەعس لە (٢٠٠٣) زەوییەکانیان بۆ گەڕێنرایەوە و ئەو هاوردانەش کە دەستیان بەسەر زەوییەکاندا گرتبوو، قەرەبووکرانەوە بە پێدانی زەوی لەسەر زێی (حەویجە)، بۆیە داوا دەکەین دەست لەو زەوییانە هەڵبگرن و لەلای خاوەنەکانیان بمێنێتەوە.

پارێزگاری کەرکوك بە وەکالەت، چۆڵکردنی ئەو گوندانەی بە ناوچەی (موحەرەمە - قەدەغەکراو) ناوبردووە، کە دەبێت لە ماوەی یەك مانگدا خانووەکانیان چۆڵ بکەن، بەڵام ئەم بڕیارە تەنها کوردەکانی دانیشتووانی ئەو گوندانەی گرتووەتەوە، بە عەرەبەکانیش گوتراوە ئەو بڕیارە ئێوە ناگرێتەوە، هەرچەندە ئەو کوردانە تاپۆی رەشی عوسمانیان هەیە.

*** بڕیارێك لە بارەی زەوییە کشتوکاڵییەکانی کەرکوك:-**

وەزیری کشتوکاڵی عێراق، لەبارەی گرێبەستە کشتوکاڵییەکانی کەرکوك کە ماددەی (١٤٠) دەیانگرێتەوە لە ٢٤ی نیسانی ٢٠١٨ لیژنەیەکی پێکهاتووە لیژنەکە کۆ نووسێکی حەوت خاڵییان پەسەند کردووە، بە نووسراوی ژمارە (١٦٧١٦) لە رێککەوتی ٢٦ی حوزەیرانی ٢٠١٨ ئاراستەی بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی پارێزگای کەرکوکیان کردووە لە ناوەرۆکەکەیدا هاتووە:-

١- هەڵگرتنی بڕیاری سڕکردنی ئەو گرێبەستە کشتوکاڵییانەی کە بەپێی یاسای ژمارە ٣٥ی ساڵی ١٩٨٣ و بڕیارەکانی دابەشکردنی یاسای ژمارە (١١٧)ی ساڵی ١٩٧٠ گرێبەستیان بۆ کراوە، بەپێی یاسا گرێبەستەکانیان بۆ نوێ بکرێتەوە کە تایبەتن بەو زەوییانەی دەستیان بەسەردا گیراوە.

٢- جێبەجێکردنی بڕیارە یەکلاکەرەوەکانی دادگاکان و بڕیارەکانی دەستەی داواکاری موڵکییەی زەویوزار کە لە بارەی ئەو زەویوزارانەی (خاوەندارێتی و مافی مامەڵەپێکردنیان گەڕێندراوەتەوە بۆ دەوڵەت) دەرچوون.

٣- هەموو گرێبەست و بڕیارەکانی دابەشکردنی زەوییەکان و ئەو زەوییانەی دەستیان بەسەردا گیراوە، کە بە ناوکراون یاخود مافی مامەڵەکردنیان بۆ دراوە یاخود دابەشکراون یاخود پێشتر گرێبەستیان بۆ کراوە، بە هەڵوەشاوە دادەنرێن و بۆ دۆخی پێشوویان دەگەڕێندرێتەوە.

٤- هەڵوەشانەوەی سەرجەم گرێبەستە کشتوکاڵییەکان کە لە ناوچەی (پشتێنەی ئەمنی) واژۆیان لەسەر کراوە و تایبەتن بەو زەویوزارانەی بە ناوکراون، یاخود مافی مامەڵەکردنیان پێدراوە لەگەڵ عەرەبە هاوردەکان بۆ پارێزگاکە (بەدەر لە دانیشتووانە رەسەنەکانی پارێزگای کەرکوك) جێبەجێکردنی بڕیارە یەکلاکەرەوەکانی سەبارەت بەم زەوییانە.

٥- هەموو ئەو گرێبەستە کشتوکاڵیانە دەمێنێتەوە کە لە ناوچەی پشتێنەی ئەمنی لەگەڵ دانیشتووانی رەسەنی کەرکوك کراون، سەبارەت بەو زەوییانەی دادگای سکاڵای ئەوانەی رەتکردووەتەوە کە پێشتر مامەڵەیان پێکردووە

و گرێبەستی نوێ بۆ خاوەنی ئەو زەوییانە دەکرێت کە دانیشتووانی ڕەسەنی کەرکوکن.
٦- زیانمەندان لە نەتەوەی عەرەب، کورد، تورکمان، ئەوانەی زەوییەکانیان ئیستیملاک کراوە، دەتوانن پەنا بۆ دادگا ببەن، بە مەبەستی یەکلاکردنەوەیان لە دادگای تایبەتدا و بڕیاری دادگاش یەکلاکەرەوە دەبێت و پێویستە جێبەجی بکرێت.
٧- پێویستە لەسەر پارێزگای کەرکوك و لیژنەی کشتوکاڵ لە پارێزگاکە، بە هاوئاهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی کەرکوك ڕۆڵێکی کاراو بنیاتنەرانە ببینن لە چارەسەرکردنی ئەو کێشە و گرفتانەی یەکلاکەرەوەکانی دادگاکان دروست دەبن، بە لەبەر چاوگرتنی بۆچوونی وەزارەتی کشتوکاڵ لە کاتی پێویستدا.

* سەرچاوە:-
- ڕۆژنامەی ڕووداو، ژمارە ٥١٥، لە ڕۆژی ٣٠ی تەمموزی ٢٠١٨، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی "ملیۆنان مەتر دووجا زەوی کەرکوك تەعریب دەکرێنەوە، هیوا حوسامەدین

## بەشی دووەم

# مێژووی ئەو کۆمەڵە و ڕێکخراو و حیزبانەی لە ناوچەی کەرکوکدا سەریان هەڵداوە


**د. ئیمان عەبدولحەمید ئەلدەباغ**
**محەمەد باقی سەعید**
**لەتیف فاتیح فەرەج**
**نۆژین ئیبراهیم ڕەزا**
**سمکۆ بەهرۆز**
**سالار ڕەشید**


*** پێشەکی:**

کوردستان بەشێوەیەکی گشتی، ناوچەی کەرکوك بەشێویەکی تایبەتی، شوێنێکی گرنگی چالاکی و بزووتنەوەی ڕۆشنبیری گەورەبووە، کە هەردەم گۆڕەپانی ململانێی کۆنەپەرستان و ئازا دیخوازان بووە بۆ بڵاوبوونەوەی ئاوەزی نەتەوایەتی و ڕزگارکردن لەکۆتی کۆنەپەرستی.
ناوچەی کەرکوکیش هەردەم هەوڵی داوە کە خۆی لەپارچە گەورەکەی کوردستان دانەبڕێت و هەردەم ببێتە مەشخەڵی ئەو ڕۆشنگەرییەی کە بەهەموو کوردستاندا پەلی هاویشتووە, ویستوویەتی هەموو کاتێك ببێتە بانگەواز بۆ هەرەسی ژیانی کۆیلایەتی و دەربەدەری و تەعریب کردن، ئینجا یان لەسەر ئاستی ناوچەکە بەگشتی یان لەسەر ئاستی دەڤەری کەرکوك بووە.
گەلێك کۆمەڵەو ڕێکخراوو حیزب سەریان هەڵداوە یان لقیان لەوێ هەبووە یان لە ناوجەرگەی کەرکوکدا گەشەیان کردووە.
هەندێك لەو ڕێکخراوو کۆمەڵەو حیزبانەی کە لە ناوچەی کەرکوك سەریان هەڵداوە بریتی بوون لە (کۆمەڵەی دارکەر)و (حیزبی هیوا)و (کۆمەڵەی ڕزگاری)و (ڕێکخراوی ئازادی کوردستان)و (لقی حیزبی شیوعی)و (لقی پارتی دیموکراتی کوردستان) و (لقی ژ.ك)و (لقی حیزبی نەتەوەیی دیموکراتی)و (کۆمەڵەی یارمەتی لێقەوماوانی ئەرمەن)و (کۆمەڵەی دیاری ئیسلام)و (کۆمەڵەی ئۆتۆمۆبیل)و (کۆمەڵەی یارمەتی قوتابیانی هەژار)و (کۆمەڵەی چاکەی سریانی ئەرسەدۆکس)و (کۆمەڵەی بەزەیی کارانی کوردستان)و (بزووتنەوەی هالتۆس)و (ڕێکخراوی هاجانا)و ( کۆمەڵەی تۆرانچێتی)و (لقی کۆمەڵەی ئیتحادوتەرەقی) و (لقی نادی اخوان الحریە)و (حیزبی کەرانی کەرکوك)و (کۆمەڵەی شوان)و (ڕەوتی کۆمۆنیست).
ئەوەی سەرەنج رادەکێشێت، کە دروست بوونی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانە لە ناوچەی کەرکوکدا هەریەکەی جۆرەها توێژو چینی کۆمەڵی تێدا بووە، لەبەرئەوەی شارەکە جێگای فرەنەتەوەییە بۆیە دەبینین هەرییەکە لەم ڕێکخراوانە، بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان سەریان هەڵداوە، لەسەر ئاستی نەتەوەیی و ئاینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و مرۆڤایەتی ڕەنگیان داوەتەوە، لەدروست بوونی ڕێکخراوەکانیاندا کە هەندێکیان ڕۆڵی گەورەیان بینیووە بۆ تێکدان و ئاژاوەو شەڕو بژێوی لەنێوان نەتەوەکانی شارەکەدا.

*** لقی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی:**

یەکێکە لەو کۆمەڵانەی کەدەوری خۆی بینیووە لە ناوچەکەداو لقی لە زۆربەی شارەکانی سەر بەدەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا هەبوو.

کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی یەکێکە لەو کۆمەڵە نهێنیانەی کەداوای چاککردنی دەستووری دەکرد، تا هەموو گەلانی ناو ئیمپراتۆرییەتی دەوڵەتی عوسمانی مافە نەتەوەییەکانی خۆیان وەرگرن[1].

بۆیە دەبینین کۆمەڵەیەکی وا لە سەردەمێکدا سەری هەڵدا کەتوانی هەنگاوی تەواو بەرەو پێشەوە بنێت و بتوانێت بۆ گرتنی دەسەڵاتی سیاسی بێتە پێشەوە تا وایکرد کەوا لە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بکات لە ساڵی (١٩٠٨) دەستور رابگرێت[2].

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم باوەڕی بەدەستوور نەبوو، هەر یەکە لە خۆیو دەستو پێوەندەکانی، وا سوڵتانیان تێدەگەیاندبوو کە فەرمانڕەوایی گەل مانای هەرەسهێنانی دەوڵەتی عوسمانییە، بۆیە وایان لێکردبوو کەدان بەدەستووردا نەنێت، ئەمە وای کرد ئەنجومەن هەڵوەشێنێتو مەدحەت پاشا بۆ (تایف) دووربخاتەوە، تا لەوێ بەخنکاندن چوو[3].

پێش ساڵی (١٩٠٨) کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی لەلایەن کۆمەڵێك لە کوردو تورك دروست بوو، لە کۆبوونەوەیەکیاندا لە (٢١)ی ئایاری ساڵی (١٨٨٩). بیرۆکەی دروستکردنی کۆمەڵەکە لەلایەن قوتابییەکی ئەلبانی بەناوی ئیبراهیم تیمو، کە لە خوێندنگەی پزیشکی سەربازی سوڵتانی دەیخوێندو لەگەڵ هاوڕێ خوێندکارەکانی، بۆ ڕووخاندنی سوڵتان عەبدولحەمید هاتە ئاراوە، بۆیە ئەم کۆمەڵەیە لە سەرەتای دروست بوونیەوە بە تەرەقیو ئیتحاد بەناوبانگ بوو[4].

دامەزرێنەرەکانی کۆمەڵەکە بریتیبوون لە:

ئیسحاق سکوتیو شەرەفەدین مەغمومیو عەبدوڵڵا جەودەتو محەمەد ڕەشید ئەلشەرکەسیو ئەساف دەروێشو عەلی ڕوشدیو محەمەد تەمیریدو حەسەن زادە عەلیو حیکمەت ئەمینو ئیسماعیل ئیبراهیم بابان زادەو کەریم سیباتیو سەبری مکلیو ناژم سلانیکلیو نەجیب دراغاو تەلعەت بەگو شتین بەگو کقوسوالی ئیبراهیمو شەفیق کەرتنلیو جەودەت عوسمان[5].

هەندێك لەو ئەفسەرە کۆنەپەرستانەی سوڵتان عەبدولحەمید هەستیان کرد لە ناوچەی ڕۆم ئیلی لە سلانیك بەبوونی کردنەوەی کۆمەڵەیەکی نهێنی دژی حکومەت کە دروشمی (سەربەستی.. یەکسانی.. دادوەری)یان بەرزکردبۆوە. بەڵام ئەم کۆمەڵەیە توانی خۆی ئاشکرا بکات کاتێك نیازی بەگ مانی گرت لە سلانیك، لەگەڵیدا هەرییەکە لە ئەنوەر بەگو عاتف بەگ مانیان گرتو نیازی خۆیان ئاشکرا کردو وایانکرد هەڕەشە لە سوڵتان بکەن بە ڕاگەیاندنی دەستوور، ئەگەر ئەوە نەکات ئەستەمبوڵ دەگرن.

بەڵام هێزی ئەنوەر بەگو نیازی، هێرشیان کردو بەرەو ئەستەمبوڵ ڕۆیشتنو لە ڕۆژی (٢٣)ی تەمووزی ساڵی (١٩٠٨)دا داگیریان کردو دەستیان بەسەر وەزیرەکانو پیاوانی کۆشكو دەستو پێوەندەکانیدا گرتوو وەزارەیەکی تازەیان دانابە سەرپەرشتی کامیل پاشاو دەستووریان جاڕدا.

بەپێی دەستوور هەڵبژاردن دەستی پێکرد. ژمارەی نائبی ولایەتەکانی عێراق (١٨) نائب بوون. نائیبەکانی کەرکوك پێکهاتبوون لە محەمەد عەلی فازڵو ساڵح نەفتچی، ئەمە وایکرد دەسەڵات بەدەست لایەنگرانی کۆمەڵەوە بێت.

لە ساڵی (١٩٠٩)دا ئەو کۆمەڵەیە توانیان سوڵتان عەبدولحەمید لابدەنو لە ڕۆژی (١٣)ی نیسانی ساڵی (١٩٠٩)، لەکۆشکەکەیدا بەندیان کرد، لەو ماوەیەی لەژیاندا بوو (محەمەد ڕەشاد)یان کرد بە سوڵتانو خەلیفەی موسڵمانان[6]. دەبینین زۆر لقی کۆمەڵە لەعێراقدا کرایەوە، لەوانە لە موسڵو کەرکوكو شارەکانی تر.

مامۆستا مستەفا نەریمان بەم جۆرە باسی کۆمەڵە دەکات:

((هەوای سەربەستیو ئازادی ناوچەکەی گرتەوە, خوا لێخۆشبوو مستەفا ئەفەندی ماڵەلڵا کە بە مستەفا ڕێژەی ناوبانگی دەرکردبوو، لقێکی لە ئیتحادو تەرەقی لەم شارە کردەوە دەیان کەسی لەگەڵ بوو، بڵاوکراوەکانی ئەو ڕێکخراوە لە ئەستەمبووڵەوە دەگەیشتە دەستیان[7]. مستەفا ماڵەلڵا خەلەف لە سەردەمی عوسمانیدا مەئموری گومرگ ڕێژەی بووە[8].

کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی پەیڕەوی ڕێگای (ماسونیا)ی دەگرتە بەرو لەکاتی بەستنی کۆبوونەوەکانیدا مەراسیمی تایبەتییان هەبوو بۆ وەرگرتنی ئەندامە تازەکانیان[9]. بەڵام لەدواییدا کۆمەڵە لەڕێڕەوی خۆی لایداو، ئەویش پاش ئەوەی لە ساڵی (١٩١١)دا هاتە سەر حوکم، تورکچێتی خۆی ڕاگەیاندو کەوتە لێدانو لەناوبردنی ئەندامانی بەڕێگای نامرۆڤانە، تەنانەت هێزی بەکارهێنا بۆ لەناودانیان[10].

*** کۆمەڵەی (مدافعه ملیه):**

ئەمە یەکێکە لەو کۆمەڵانەی کە لە ماوەی ساڵی (١٩٠٨) دا لە ناوچەی کەرکوك سەری هەڵدا هەرچەندە کە مێژووی دامەزراندنەکەی بەتەواوەتی دیار نییە. ئامانجەکانی ئەم کۆمەڵەیە بریتی بوو لە ووریاکردنەوەی خەڵکی لەنەزانیو ڕزگارکردنی وڵات لە دەردی کۆمەڵایەتیو ئابووریو کشتوکاڵیو زانستیو هونەریو ئەدەبی، ئەوەی کە لە گۆڕەپانەکەدا باو بوو. بیروڕاو بۆ چوونەکانی ئەم کۆمەڵەیە زیاتر لە گۆڤاری (كوكب المعارف)دا بڵاوبۆتەوە، دەتوانین بڵێین کە ئەڵقەی لێك گەیشتنە لەگەڵ کۆمەڵەکەدا.

ئەو ئەندامانەی کە لە کۆمەڵەکەدا کاریان دەکرد بریتی بوون لە عورفی دیار بەکری، ئەحمەد مەدەنی، هیجری دەدە، حوسێن جەمال بەگ، مستەفا ساڵح، یعقوب زادە مستەفا، ئەحمەد ئەفەندی، واعیز مەلا ڕەزاو دکتۆری شارەوانی فەتحوڵڵا ئەفەندی، کۆمەڵەی (مدافعة ملية)، کاروبارەکانی خۆی لە ڕێگای چوار دەستەوە (هيئە) بەڕێوەدەبرد کە هەرییەکەی خاوەنی تایبەتمەندی خۆی بوو.

هەروەها ئەم کۆمەڵەیە دوو سەرۆکی هەبوو کە یەکێکیان

دیار بەکری عورفی‌و ئەوی تریشیان حوسێن بەگ ئەفەندی بوو، کە لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (کوکب المعارف)[11] ناویان دیاریکراوە.

*** کۆمەڵەی (کوردستان تعالی جمعیتی - جەمعییەتی تەعالی کوردستان):**

"جەمعییەتی تەعالی کوردستانی لە (١٧)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٣٣٤) بەرامبەر بە (١٧)ی شوباتی ساڵی (١٩١٨) دامەزراوە"[12]، "جەمعییەتی کوردستان لە قۆناغی ئاگربەستی نێوان دەوڵەتی عوسمانی‌و دەوڵەتە هاوپەیمانەکاندا دامەزرا"[13].

"هەروەها لە نووسینێکی تردا، تاریق زەفەرتونایا لە کتێبی (حیزبە سیاییەکانی تورکیادا) بەم جۆرە باسی کۆمەڵەی تەعالی کوردستانی کردووە: (لە ساڵی (١٩٠٨) دا ڕێکخراوێکی کوردی بە ناوی (کورد تعاون جەمعییەتی) دامەزرا، کە ڕێکخراوێکی چاکەخوازی‌و بە یاسای بنەڕەتی‌و ئایدیۆلۆژی عوسمانییەوە بەسترابوو، بەڵام (کوردستان تعالی جەمعییەتی) لە دوای شەڕ ڕاگرتنی (موندروس) لەو ساڵانەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی نزیکی لە ناوچوون بوو دامەزرا، بریتی بوو لە ڕێکخراوێك کە کوردی بە میللەتێکی جیاواز دادەنا‌و ڕێکخراوێکی نەتەوەیی بوو، مەبەستی جیابوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی بوو"[14].

"کۆمەڵەی تەعالی کوردستان بەفەرمی لە (٢٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩١٨)دا بووە، بارەگا سەرەکییەکەی لە گەڕەکی (جانمال ئۆغلوو)ی ئەمستەمبوڵ، نزیك بە تەلاری (اجتهاد) بووە، کە عەبدوڵڵا جەودەت خاوەنی بووە"[15].

"ئەم کۆمەڵەیە ئاڵایەکی تایبەت بە خۆی هەبووە، بەشی سەرەوەی سپی‌و بەشی خوارەوەی سەوزو لە ناوەڕاستیدا خۆرێکی زەرد دانراوە"[16]، "سەبارەت بە ناوی دامەزرێنەرەکانی کە زۆربەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن، بەمجۆرەیە:

- سەرۆك: شێخ عەبدولقادری نەهری.
- جێگری یەکەمی سەرۆك: ئەمین عالی بەدرخان.
- جێگری دووەمی سەرۆك: فەریق فوئاد پاشای کوڕی سەعید پاشای خەندان.
- سکرتێری گشتی: لیوا ڕوکنی خانەنشین فەریق (حەمدی پاشا).
- ژمێریار: سەیید عەبدوڵڵای کوڕی شێخ عەبدولقادر"[17].

"لە ئامانجەکانی کۆمەڵەکە:

١. کارکردن لە پێناو دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی.
٢. گەڕانەوەی ئەو کوردانەی ئاوارەکراون، یاخود دوورخراونەتەوە.
٣. سەربەخۆبوونی کوردستان‌و جیابوونەوەی بەتەواوی لە تورکان"[18].

"ئەم جەمعییەتە جیا لەوانەی بەر لە خۆی لقی لە زۆر شوێنی کوردستاندا کردبووەوە، ئەوەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە لایەنگرانی لەگەڵێك شوێنی کوردستاندا هەبووە، ئەوەتا ئیسماعیل حەقی شاوەیس لە وتارێکیدا ئاماژە بە بوونی ٣٦ لقی لە باکووری کوردستاندا هەبووە سەرباری لقەکانی لە موسڵ‌و هەولێرو کەرکوك‌و سلێمانی‌و بەغدا"[19].

*** کۆمەڵەی نهێنی تۆرانچی:**

ساڵی (١٩٢٠) ئەم کۆمەڵەیە لەشاری کەرکوك دامەزراو داوای گەڕانەوەی تورکی عوسمانییان دەکرد بۆ کەرکوك، و بەشداری ململانێ سیاسیەکانی دژی بەریتانیا‌و بەقازانجی تورکەکان دەکردو شێخ قادر سیامەنسووری تاڵەبانی هەڵبژاردبوو بەباوەڕپێکراوی‌و عەشیرەتەکەی هاتبوونە ناو ئەم کۆمەڵەیەوە.

کۆبوونەوەکانیان لە ماڵی مستەفا ئەفەندی یەعقوبی دەکرد کەخانووەکەی پێکهاتبوو لە دوو نهۆم، سیخوڕەکانی ئینگلیز خۆیان لە نهۆمی ژێرەوە مەڵاس دەدا، و کاتێك کەکۆبوونەوەکە تەواو دەبوو، دەست بەجێ دەکەوتنە داوی سیخوڕەکانەوە. بۆیە پێش ئەوەی کارەکانیان جێبەجێ بکەن ئاشکرا دەبوون. کاتێك شێخ قادر سیامەنسووری ڕێگای نێوان کفری‌و کەرکوکی گرت چارێك بۆ مێجەر لۆنگریك نەمابەوە تەنها ئەوە نەبێت کە هێرش بکاتە سەر دێی سیامەنسوورو کاولی بکات، کەئەمە وایکرد شێخ قادر رابکات‌و تا لە (٣٠)ی ئایاری ساڵی (١٩٢١) بڕیاری لێبووردن گرتیەوە، و ئەندامەکانی تری کۆمەڵەکە گیران‌و هەندێکیان رایانکردو ڕزگاریان بوو[20].

*** لقی حیزبی شیوعی عێراق:**

بە هەمان شێوەی حیزبی شیوعی سوری- لوبنانی لە ساڵی (١٩٢٤)دا دامەزرا ئەمە وای کرد، ڕێگا خۆشکەر بێت بۆ دامەزراندنی حیزبی شیوعی عێراق لەبەر ئەوەی لەڕووی جوگرافیاوە سوریا لکاوە بەعێراقەوە، بۆیە زۆر ئاسان بوو بەگواستنەوەی بیروباوەڕی نەتەوەیی بۆ ناو خاکی عێراق، لەگەڵ گواستنەوەی چاپکراوەکانی مارکسی- لینینی بۆ عێراق..[21].

لە دواییدا یوسف سەلمان (فەهد) دەستی کرد بەڕێکخستنی شانەکانی حیزب لەعێراقدا کە ئەوکاتە کرێکار بوو لەمینای بەسرەو لە ساڵی (١٩٢٧) لەگەڵ کرێکار حەسەن عەیاب، کە لەسەرەتادا شانەکان زۆر گەورە نەبوو، بەڵام لە ساڵی (١٩٣٢)دا چووە ناسریەو کارگەرییەکی سەهۆڵ هەبوو توانی شانەیەکی چاك دروست بکات لەمامۆستا‌و قوتابی‌و کرێکاران، هەروەها پەلی هاویشت بۆ بەغداو بەسرە، بەڵام لە کۆتایی ساڵی (١٩٣٣)دا دەسەڵاتداران ژمارەیەك خەڵکیان لەناسریە بەتۆمەتی شیوعیەت گرت[22].

بۆیە دەبینین بڵاوبوونەوەی حیزبی شیوعی لەسەرەتادا لەشارەکانی بەغداو بەسرەو ناسریە بنەی داکوتاو ئینجا پەلی بۆ شارەکانی تر هاویشت[23].

بەڵام لە ناوچەکانی کوردستان تا سەرەتای ساڵی (١٩٤٣) یەك کوردێك چییە تێیدانەبوو، بێجگە لە ساڵح حەیدەری لە هەولێر، کەتەنها کەسی مارکسی بوو، ژمارەیەك لەکورد لەدەوری کۆبوونەوەو، هەموویان پەیوەندی تەواویان بە (فەهد)ەوە نەبوو بەڵکو کۆمەڵەی میللەت کۆیانی کردبووەو

بڵاوکراوەیەکیان بەناوی (دەنگی کورد)ەوە[٢٤] هەبوو.

بەڵام لە دواییدا لەناو شاری کفری و کەرکوك و دەوروبەری وردە وردە حیزبی شیوعی بنەی داکوتا، ئەگەر چی پێشتر لایەنگری پەیدا کردبوو[٢٥]، هەر بۆیە دەبینین لە ناوچەی قادرکەرەم ڕۆژنامەیەکیان بەناوی دەنگی داس وەکو ئۆرگانێکی حیزبی شیوعی عێراق دەردەکرد کە بەدە نووسخەی دەسنووس دەردەچوو بەقەبارەی (١٦) لاپەڕەی دەفتەری..[٢٦].

"لە بواری ڕێکخستن و چالاکییەکاندا بە شێوەیەکی نهێنی لە چوارچێوەی شانەی بچووك بچووك کارەکانی بەڕێوە دەبرد، شاری هەولێر بنکەی سەرەکی جموجوڵەکانی لقی کوردی حیزبی شیوعی عێراقی بوو، ژمارەیەك لە ئەندامانی چالاك لە ڕێکخستنەکاندا کاریان دەکرد وەکو یەحیا سەلیم، جەوهەر حوسێن، مەلا ئەنوەر عەبدوڵڵا (ئەنور دڵسۆز)، کەریم ئەحمەد، عەزیز محەمەد، یونس ڕەئووف (دڵدار) سنووری چالاکییەکان لە دوای هەولێر لە شارەکانی کەرکوك و سلێمانی تێپەر نەبووە"[٢٧].

لە شاری کەرکوکیش ژمارەی ئەندامان گەیشتە ڕادەیەك کە توانرا لیژنەی ناوخۆی تێیدا دابمەزرێت و جگە لە کوردەکان وەکو شێخ مارف بەرزنجی و شێخ حوسێن بەرزنجی و موکەڕەم تاڵەبانی و شێخ عەتا تاڵەبانی، هەندێك لە مەسیحییەکان بوونە ئەندامی لیژنەکە وەك (حەننا ئەلیاس، یوسف حەننا، حکمان فارس، عەبدولجەببار ئەلزوهەیدی)[٢٨].

موکەڕەم تاڵەبانی بوو بە پەیامنێری حیزب لە نێوان لق و ڕێکخراوەکانی تر، بارەگای سەرەکیش لە شاری کەرکوك کاروباری لقیان بەڕێوە دەبرد، بەڵام لە دوای دەستگیرکردنی مالك سیف لە تشرینی یەکەمی (١٩٤٨) لیژنەی سەرکردایەتی لقی کوردستان لە کەرکوك کەوتنە بەر شاڵاوی گرتن و دەستگیر کران"[٢٩].

لە سەرەتای کۆمارییەوە، حیزبی شیوعی کەوتە چالاکی نواندن لەناو شاری کەرکوك.. پارتی و شیوعی ڕێکخراوی تایبەتی خۆیان هەبوو، پارتی لەناو لاوان و قوتابیان و کرێکارانی کورد دەوریان دەگێڕا، شیوعیش لەناو گەنج و کرێکاران و قوتابیانی کوردو تورکمان پروپاگەندەیان ئەکرد[٣٠].

لە نیسانی ساڵی (١٩٥٩)دا داود جەنابی بووە سەرۆکی فرقەی دوو لەوێستگەی شەمەندەفەر لەشاری کەرکوك و ماوەی سێ مانگ لەکەرکوك مایەوە، لەوماوەیەی ئەودا شیوعی لەکەرکوك زۆر پەرەی سەند. بارەگاکانی شەبیبە (گەنجان) لەهەموو گەڕەکەکانی کوردو تورکمان کرایەوە، ڕێکخراوەی ئافرەتان و جوتیاران و لاوان و قوتابیان و کرێکاران کەوتنە دەست شیوعییەکان، ئەو ڕێکخراوانە کە ئاهەنگیان دەگێڕا داودجەنابی لەڕیزی پێشەوە دادەنیشت و سەرکردەی شیوعییەکان، وەك بازنە دەوریان دەدا.. لەهەموو لایەکی کوردستان سەدان کەس بەبیانووی دەرەبەگ و کۆنەپەرست و تۆرانی دەستگیر کران، لەپاڵ ئەوانەشدا چەند پارتییەك ڕاپێچ ئەکران[٣١].

پاش ڕۆیشتنی داود جەنابی، عەمید ڕوکن مەحموود عەبدولوەهاب بوو بە جێگری قائید، ئەمەیش کاری کردە سەر حیزبی شیوعی و زۆربەی ئەو تورکمانانەی کەلەترسا لەناو ریزی ڕێکخراوەکان خۆیان مەڵاس دابوو، بڵاوەیان لێکردو هەندێکیشیان هەڵگەڕانەوەو بوون بەدوژمنی حیزبی شیوعی[٣٢].

*** (کۆمەڵەی زانستی کوردان - جمعیەت زانست کوردان):**

"بەپێی ڕاپۆرتێکی بەریتانی باس لە کۆمەڵەیەکی زانستی لە کەرکوك بە ناوی (جمعیەتی زانستی لە کەرکوك)، دەکات و دامەزراندنەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ (٢١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٦)، سەرۆکی کۆمەڵەکە (مەلا عەبدولقادر ئەفەندی- بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکوك) بوو"، "جێگری سەرۆك (مستەفا ئەفەندی)و (عەبدولخالق ئەفەندی کوڕی شێخ حوسێن نەقشبەندی) بوو، دەستەی کۆمەڵەکە بریتی بوو لە (ئەحمەد ئەفەندی، قادر ئەفەندی، حەسەن بەلوە، عیزەت ئەفەندی تۆفیق ئاغا(*))"، "هەروەها لە هەمان ڕاپۆرتدا ئاماژە بەوە دراوە، چەند سەرۆك هۆزێکی کوردی ناوچەی کەرکوك پەیوەندییان بەو جەمعییەتەوە کردووە، لەوانە (ڕەفعەت بەگ، ئیسماعیل بەگ سەرۆك عەشیرەتی داودە، شێخ عیزەددین ئەفەندی سەرۆك عەشیرەتی تاڵەبانی و سەیید خەلیل ئاغا سەرۆکی عەشیرەتی کاکەیی)"[٣٣].

"بەپێی هەمان ڕاپۆرت ئەم کۆمەڵەیە هیچ ڕەنگێکی سیاسییانەی لە خۆ نەگرتووە تەنها خوێندەواری لە ناو کوردەکاندا بڵاوکردووەتەوەو پەیوەندیشی بە جەمعییەتی زانستی کوردان لە سلێمانییەوە هەبووە"، "هەر لەو مانگەدا لە (پردێ - ئاڵتون کۆپری) بە سەرۆکایەتی (ساڵح ئاغای محەمەد والی ئاغا) لقێکی جەمعییەتەکەی کەرکوك دامەزرێنرا، دەستەیەکی بۆ لقەکە دەستنیشانکرا، لقەکە پەیوەندی بەتینی لەگەڵ هەولێرو سلێمانیشدا دروست کرد"[٣٤].

*** لقی کۆمەڵەی لاوان:**

"ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵی (١٩٢٨) لە بەغدا لەسەر دەستی ژمارەیەك خوێندکاری کوردی پەیمانگاو زانکۆکانی بەغداو ژمارەیەك لە ڕۆشنبیران دامەزراوە، ئامانجە ڕووکەشەکانی ئەم کۆمەڵەیە تەنها لە بواری ڕۆشنبیریی و وێژەیی و کۆمەڵایەتی دا بووەو گوایە هیچ ئامانجێکی سیاسییان نەبووە، ئەم کۆمەڵەیە لەلایەن (محەمەد ئەمین زەکی)یەوە ئاراستە دەکرا، وەکو زمانحاڵ گۆڤارێکیان لە ژێر ناوی (دیاری لاوان)دا دەردەکرد، کە تەنها دوو ژمارەی لێی دەرچوو و تایبەت کرابوو بە بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوەی وێژەیی و هۆنراوەی نیشتمانی، لە نووسەرە دیارەکانی ئەم گۆڤارە ناوی هەر یەك لە (ئیبراهیم ئەحمەد، حامید فەرەج، شاکر فەتاح، فازڵ تاڵەبانی، حاجی قادر، گۆران) هاتووە، دواتر کۆمەڵەکە لقی خۆی لە شارەکانی کەرکوك و هەولێرو سلێمانی و موسڵ کردەوە، ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەکە نزیکەی (٦٠ - ٧٠) ئەندام بووە. سەبارەت بە دیارکردنی مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی لاوان بیروڕای جیاواز هەیە"[٣٥].

*** ڕێکخراوی ئازادی کوردستان:**

ئـەگـێڕنـــەوە لـە بیستەکان لـە کـفـری و دەوروپـشـتـیـدا ڕێکخراوەیەکی نهێنی بەناوی ئازادی کوردستان هەبووە کە محەمەد جاف لەکۆتایی بیستەکاندا پەیوەندی لەگەڵ چەند ڕۆشنبیرێکی کوردی ئەو سەردەمەی ناوچەی کفریدا هەبووە، بۆ ئەوەی پارتێك پێکبێنن و لە ئەنجامدا ڕێکخراوێکیان بەناوی (پارتی ئازادیی کوردستان) پێکهێنا. کە ئەم کەسانەی تێدا بوو حەمە بەگی فەتاح بەگی جاف (١٩٣٤)، شێخ جەمالی تاڵەبانی (١٨٩٨-١٩٤٣)، موفتی سەعید ئەفەندی سیوەیلی (١٨٥٨- ١٩٤١)، وەستا ساڵحی جلدروو (١٨٨٧-١٩٧٥) تۆفیق ئاغای گەلاڵی و مەلا محێدین مەلا سەعیدی زەلـزەلە، ڕەئـووف بەگی جەلالی کەرکوکی، ئیبراهیم ئەدهەم، شێخ محەمەدی گولانی، میرزا تۆفیق قەزاز، سەید محەمەدی جەباری، شێخ سلێمان شاکەلی، سەعید وەنداوی و گەلێکی تری ناوچەکانی تر.

بەڵام بەهۆی ئەوەی بڕێك لە ئەندامانی ئەم پارتە بوون بەکارمەندی دەوڵەتی تازەی عێراق و چەند کەسێکیشیان کۆچی دواییان کرد، ئەو پارتە نەیتوانی ڕۆڵێکی باش و دەرکەوتوو ببینێت و زۆری نەخایاندن ڕێکخراوەکەیان تێکچوو[٣٦].

*** لقی کۆمەڵەی کوردیی ڕزگاری:**

لە بارەی ئەم کۆمەڵەیەوە هیچ سەرچاوەیەك باسی لێوە نەکردووە، تەنها لە بەڵگەنامەیەکی بەریتانیدا نەبێت، کە لە ڕێککەوتی (٢٢)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٣٢)دا لەلایەن سەرکردایەتی گشتیی سوپا، بەشی زانیاری بیرۆی دووەم (نهێنی)، بەمجۆرە ناوی هێناوە: "ڕزگاری کۆمەڵەیەکی نهێنی کوردییە، کە بۆ ئامانجی بە گیرخستنی سەربەخۆیی کوردستان کاردەکات، ناوەندەکەی لە بەغدایە و لقەکانی لە (هەولێر، کەرکوك، سلێمانی، ڕەواندوز، موسڵ) جێگیر بوون، ئەم کۆمەڵەیە بە شێوەیەکی سەرەکی سەرۆکی هۆزەکانی دزەیی و پشدەر و ئەو هۆزانەی کە ملکەچ نەبوون، وەك هۆزی (بارزان) دەگرێتەوە، کە چاوەڕوانی فەرمانی ئەوە دەکەن پەیوەندی بەمەی دواییەوە بکەن.

هۆزی (دزەیی)، کە لە دەوروبەری هەولێر جێگیر بوون بە قەد هۆزی پشدەرەکان جەنگاوەر نین، بەڵام نزیکەی ٦٠٠٠ پیاویان هەیە کە دەشێ بجەنگن، ساڵی (١٩٣٠) لە کاتی شۆڕشی (شێخ مەحموود)دا چەك و چۆڵ و ئازووقەیان کڕیوە، سەرۆکی هۆزەکە (حوسێن مۆلتا)یە، تەمەنی ٥٠ ساڵە."[٣٧].

*** لقی کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن ١٩٣٠ - ١٩٦٣:**

دامەزراندنی کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن وەك ناوەندێکی ڕووناکبیری - کۆمەڵایەتی و زانستی. لە سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوو، لە شاری بەغداو بە ڕێپێدانی وەزارەتی ناخۆی عێراقی ئەوکاتە بۆ خۆی بە یەکێك لەو هەنگاوە گرنگ و زیندووانەی ڕووناکبیران و دەستەی ڕووناکبیری کوردی دادەنرێ کە لەگەڵیدا کۆمەڵێك کەسایەتی پیاوی کۆمەڵ و خوێندکاری زانکۆی ئەو دەمانەی کوردی لە شاری بەغدا لە دەوری چالاکییەکانی خۆی کۆ کردبێتەوە بەوەی یانەی سەرکەوتن کۆمەڵەیەکی زانستی و کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاری بووە و هیچ پەیوەندیەکی ئەوتۆی بە ڕوونی لەگەڵ کاری سیاسی و چالاکی سیاسیدا نەبووە، ڕۆژی (١٩)ی تەموزی ساڵی (١٩٤٣) باوەڕپێکراو لە گەڵ یاوەرەکانی دا، بە ناوچەی بنکوڕەدا بەرەو شارە دێی کەلار بۆتەوە، کە بەزۆری لەو دەمانە دا لەلایەن بەگزادەکانی جافەوە بەڕێوەبراوە و پاش کۆکردنەوەی بڕێکی باش یارمەتی لە ناوچەی بنکوڕە و خەڵکی بنکوڕە وکەسایەتی و سەرۆك هۆزەکانی باجەلان، تاڵەبانی و جەمبور لە تەنیشت قەڵای شێروانەوە چوونەتە کەلار ولە ماڵی کەسایەتی ناسراوی گەرمیان و کەلاری ئەودەمەی کەریم بەگی جاف (١٨٨٩- ١٩٤٩) دەمێننەوە پاش چەند ڕۆژێك مانەوەیان لە کەلارو ڕاگۆڕینەوەو کۆکردنەوەی باربوو لەنێو خانەوادەکانی بەگزادەی جاف کەلار، لە شەوی (٢٢)ی تەمووزی هەمان ساڵەوە بە یاوەری چەند سوارێکی جاف و مستەفا بەگی کوڕی کەریم بەگی جاف (١٩٢٠-١٩٩٧) گەیشتونەتە شاری کفری، چاویان کەوتووە بە ئەحمەد بەگی بابان کە لەو ماوەیەدا لە گوندی قنگربان بووە، هەر لەوێش داود بەگی جاف (١٩٠٥-١٩٦٦) کە لە ڕێگای گەڕانەوەیدا بووە لە کەرکوکەوە بۆ کەلار پەیوەندی پێوە کردوون ولەگەڵ جەماوەرێکی زۆری خەڵکی کفریدا بە ئامادە بوونی وەکیلی قایمقامی شاری کفری لە یانەی داوەت و کۆبوونەوەیەکی چا خواردنەوەی گەورە، بەڕێوە چووە و باوەڕ پێکراو واتە مەعروف جیاووك ووتارێکی بۆ ئامادەبووان داوە، لە هەمان کاتیشدا لە ڕێگای دانیشتوانەوە باربوویەکی زۆر بۆ یانەی سەرکەوتن کۆکراوەتەوە بە ڕادەیەك ئەندامانی لیژنەی باربوو ستایشێکی زۆری هەردوو لاوی ئەو دەمانەی گەرمیان موکەڕەم تاڵەبانی و ئەحمەد بەگی بابانیان کردوو کە هاوکارییەکی زۆر وخزمەتێکی زۆریان کردوون . هەرکەکاروباریشیان لە شاری کفری دا بە تەواوی بەڕێوە چوو، بۆ ڕۆژی (٢٣)ی تەموزی ساڵی (١٩٤٣) بەرەو ناوچەی ڕاوێ و حەوتەغارو شارۆچکەی داقوق و بۆ ناو هۆزی کاکەیی شۆڕ بوونەتەوە.

بە جۆرێ ئەندامانی لیژنەن لەسەر ڕێـڕەوی گەشتەکەیان بەردەوام بوون. تا ئەو کاتەی گەیشتوونەتە شاری کەرکوك بەڵام دوای ئەوەی کە لەناو هۆزی داودە و ساداتو سەرۆك و بنەماڵەکانی کاکەیی باربوویەکی باشیان پێ بەخشراوە، لە وێستگەی شەمەندەفەری شاری کەرکوك لەلایەن دانیشتووانەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێکراوە، باوەڕ پێکراویش دوای مانەوەیان لە ماڵی پورزایەکی خۆی لە گەڕەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك بۆ ڕۆژی دواتر سەردانی وەکیلی موتەسەڕیفی شاری کەرکوك کە لەو سەرووبەندەدا جەنابی جەلال سائیبی قایمقامی شاری چەمچەماڵ بووە، لەگەڵیشیدا لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون کە لە باخچەی یانەی فەرمانبەران کۆبوونەوەیەکی جەماوەری ڕێکبخرێ. بەڵام کەسێك ئەو پرۆسەیەی لێتێکداون و وایان

بە چاك زانیوە کە بەپێی کۆبوونەوەی جەماوەریو (داوەت نامە) باربوو لە خەڵك کۆبکرێتەوە، دوای چوار ڕۆژ مانەوەیان لە کەرکوك لە (٢٩)ی تەموزی ساڵی (١٩٤٣) گەیشتوونەتە سلێمانی[٣٨].

*** کۆمەڵەی نهێنی کوردی:**

بە وتەی شاکر فەتاح، کۆمەڵەیەکی تر لە ساڵی (١٩٣١)دا لە شاری سلێمانی دامەزراوە بە ناوی (کۆمەڵەی نهێنی کوردی)، لە ئەندامەکانی (شێخ قادری شێخ سەعید، عەلی مستەفا شەوقی، تۆفیق وەهبی)، کۆمەڵەکە لقی لە شوێنانی تری کوردستانی باشووردا هەبووە، ئامانجی کۆمەڵەکە خەباتکردن بووە بۆ بەدەستهێنانی مافی نەتەوەی کورد، ئەم کۆمەڵەیە (سورەیا بەدرخان)یان وەك کوردێکی دڵسۆز کردووە بە نوێنەی کورد لە جنێف بۆ ئەوەی گفتوگۆ لە بابەت خواستەکانی کوردەکانی عێراقەوە لەگەڵ (کۆمەڵەی گەلان)دا بکات، لەم سەرچاوەیەدا ئاماژە بە پەیڕەو پرۆگرامو تەمەنی کۆمەڵەکە نەدراوە لەگەڵ ناوی ئەو شوێنانەی کە لقی تیادا کردووەتەوە[٣٩]، بەڵام پێ دەچێت بەپێی هەندێك قسەی دەماودەم لە کەرکوکیش لقیان هەبووبێت.

*** کۆمەڵەی یارمەتی لێقەوماوانی ئەرمەن ( جمعیة معاونیة محتاجي الارمن ):**

ئەم کۆمەڵەیە لە (١٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٣٣)دا لەکەرکوك دامەزرا، ئامانجی کۆمەڵەکە زیاتر کۆمەڵایەتی بوو[٤٠]. تایبەت بوو بە کاروباری ئەرمەنەکان.

*** لقی کۆمەڵەی دیاری ئیسلام ( جمعیة الهدایا الاسلامیة ):**

ئەم کۆمەڵەیە لە بەغدا لە (١)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٣٠) دامەزرا، و لقی لەشاری کەرکوك لە (٢١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٣٣)دا کرایەوە.

بیرو بۆچوونەکانی ئەم کۆمەڵەیە لەم خاڵانەدا خۆی دەگرێتەوە:

١. بڵاوبوونەوەی ڕاستی ئیسلامەتی، کە بەشێوەیەك لەگەڵ ڕۆحی سەردەمدا بگونجێت.

٢. بەرگری کردن لە (الالحاد)و پڕوپاگەندەی نا ئیسلامیانە بەڕێگایەکی ڕێكو پێك.

٣. هەوڵدان بۆ چاککردنی پێڕەوشتیو چەوتی.

٤. هەوڵدان بۆ ئەوەی دەوڵەمەندەکان یارمەتی هەژارەکان بدەنو هەوڵی کردنەوەی پرۆژەی خێرخوازی بدەن.

٥. هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریو زانیاری ئیسلامی، و هەوڵدان بۆ چاککردنی ڕێڕەوی فێرکردن..

٦. هەوڵدان بۆ نزیك بوونەوەی گەلانی ئیسلام لەیەکتری. ئەم کۆمەڵەیە لقی لە (مووسڵو بەسرەو سلێمانیو کەرکوكو هەولێرو عەمارەو ڕومادیو سامەڕاو خانەقینو دهۆكو عەمادیە) دا هەبوو تاوای لێهات ژمارەی ئەندامانی گەیشتە چەند هەزار کەسێك، هەفتەنامەیەکیان بەناوی (هدایا) دەردەکرد.

ئەم کۆمەڵەیە لە چلەکاندا دەوری هەبوو لە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە دژی ئینگلیزو جولەکەو بزووتنەوەی سەهیۆنی لە فەلەستین[٤١].

*** ( لقی حیزبی ئیسلامی کورد ):**

"تەنها سەرچاوەیەك ئاماژەی بەم حیزبە داوە، کە مێژووی دامەزراندنەکەی بۆ ساڵی (١٩٣٤) دەگەڕێتەوە لە شارۆچکەی هەڵەبجە، ئەندامە سەرەکییەکانی بریتی بوون لە (عەبدوڵڵا بەگی ئەحمەد تاپۆ، شاهۆ، محەمەد سەعید بەگی سەلیم بەگ)، وا پێدەچێت ئەم حیزبە درێژکراوەی ئەو حیزبە ئیسلامییە کوردییە بێت کە لە ساڵی (١٩١٩) دامەزرا، پاش ماوەیەك ئەندامە دیارەکانی ئەم حیزبە بەرەو شاری سلێمانی دەچن، لەو کاتەدا چەند ئەندامێکی نوێ دەچنە ناو حیزبەکە، لەوانە (نەجمەددین حاجی مەلا ڕەسوڵ، مەحموود فەقێ محەمەد هەمەوەندی)، پاشان سنووری چالاکی حیزبەکە تێدەپەڕێت بۆ شاری هەولێرو (گیوی موکریانی)"، دەبێتە دەمڕاستی حیزبەکە، نوێنەری شاری (کەرکوك)یش بریتی دەبێت لە (خەلیفە عەلی بەسێ)، جگە لەوەش سنووری چالاکی دەگاتە کرمانشان، هەروەها لە چەندین شارۆچکەی تر چالاکی دەنوێنن لەوانە (پێنجوێن، تەوێڵە)، ئامانجی سەرەکی ئەم حیزبە گەیشتن بووە بە مافە ڕەواکانی گەلی کورد لە ڕێگەی ئاینییەوە، وێڕای ئەو زانیارییانە، هیچ زانیارییەکی تر لە بارەی ئەم کۆمەڵەیەوە لەو سەرچاوەیەدا نەهاتووە"[٤٢].

*** کۆمەڵەی دارکەر:**

لە ڕۆژانی نیوەی یەکەمی مانگی ئەیلولی ساڵی (١٩٣٧)دا کۆمەڵەیەکی بچووك بەناوی (کۆمەڵەی دارکەر) لە قوتابیانی قوتابخانەی ئامادەیی مەرکەزی کەرکوك دامەزرا کە یەکەم کۆبونەوەی نهێنی خۆی لەو ساڵەدا سازداو کۆبونەوەی دووەم لە ماڵی بورهان جاف کرا.

لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٣٧)دا لە باخچەی (ام الربعین) کە لەسەر ڕێگای (کەرکوك-هەولێر)ە یەکەم کۆنگرەی کۆمەڵەی دارکەر بەسترا، لەو سەردەمەدا بۆ تاقیکردنەوەی (بەکالۆریا) ی هەموو قوتابخانەکانی کوردستان، قوتابیانی پۆلی شەشەمی سەرەتاییو پۆلی سێیەمی ناوەندی لەکەرکوك بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە کۆدەبنەوەو زۆربەی مامۆستایانیش لەگەڵیاندا بەشداری دەکەن لەبەرئەوە (دارکەر) بەهەڵی زانی ئەم کۆنگرەیە ببەستێت. لەم کۆنگرەیەدا (٦٠) ئەندام بەشداریان کرد کە (دلدار)و شەهید (مارف بەرزنجی) وتاری خۆیان دەربارەی کۆمەڵەی ناوبراو خوێندەوە.

ناوی دارکەر لە کۆمەڵەی (کاربۆنالی .. خەڵوزفرۆشان) ی ئیتاڵیاوە هاتووە، کە سەرنجیان ڕاکێشاوە بۆ ناوێکی وەکو کاربۆنالی بگەڕێن تا گەیشتنە ئەوەی ناوی (دارکەر) یان دۆزییەوە.

دەربارەی بەرنامەی دارکەر مامۆستا د. موکەڕەم دەڵێت:

دارکەر بەرنامەی نووسراوی نەبوو، ئەو بەرنامە نە نووسراوەی کە دەمانوتەوە وەکو بەدیهیاتی ئەندازیاری وابوو. کوردستان وڵاتێکی دابەشکراوە, میللەتی کورد ستەم لێکراوەو چەوساوەیە, بۆ کوردستانێکی ئازادو ڕزگاری میللەتی کورد تێدەکۆشێ.. بەڵام بۆ ئەم مەبەستانە

دەبێت شتێك بكرێت.. ئەو شتە چییە نەماندەزانی.
داركەر لە سلێمانی و هەولێرو كۆیەو كفری و شەقڵاوەو چەمچەماڵ، پەلوپۆی هاویشتبوو، لقی دامەزراندبوو. زۆربەی ئەندامی مامۆستایان و قوتابیان بوون[٤٣]. كۆمەڵەی (داركەر) لەكەركوك لەلایەن قوتابیانی ئامادەییەوە لەم كەسانە بناغەی دانراوە:
(یونس ڕەئووف- دلدار)و (موكەڕەم تاڵەبانی)و (بورهان جاف)و (مەعروف بەرزنجی)و (ڕەشید باجەلان)و (فازڵ تاڵەبانی)[٤٤].

* (كۆمەڵەی برایەتی و پشتیوان):-
ئەم كۆمەڵەیە بەپێی ئەو سەرچاوانەی كە دەماودەم باسی لێوە كراوە، لە ناوەڕاستی سییەكانی سەدەی ڕابردوو دامەزراوە لە خانقین و كفری، كە (عەبدولعەزیز پشتیوان) یەكێك بووە لە ئەندامەكانی و دوای هەڵوەشاندنەوەی ئەندامەكانی چوونەتە نێو حیزبی (هیوا)وە.
مامۆستا (كەریم زەند) لە چاوپێكەوتنێكیدا لەگەڵ كەناڵی ئاسمانی (ڕووداو) ئەوەی خستە ڕوو كە: (ئەندامی كۆمەڵەی برایەتی بووە كە لە ساڵی (١٩٣٧) دامەزراوەو لە دوای هەڵوەشانەوەی ئەندامەكانی چوونەتە نێو حیزبی (هیوا)وە).
بەشێك لە ئەندامەكانی بریتین بوون لە (مستەفا كەریم، محەڕەم كەریم، ئەسعەد مەحوی).

* لقی (الجمعیة الكردیة الاصلاحیة):
ئەم كۆمەڵەیە لە دوای دروستبوونی وەزارەتی سلێمانی حیكمەت سلێمان واتە، دوای كودەتاكەی بەكر سدقی پێكهات، كاری ئەم كۆمەڵەیە ئەوە بووە كە لە ڕێگای پۆستەوە كارەكانی خۆی ئەنجام بدا، ئەویش بەناردنی نامە بۆ هەندێك لە هاووڵاتیان و داواكردن لێیان بە جێهێشتنی وڵات ئەگەر هاتوو بەجێی نەهێڵێت ئەوا چارەنووسی كوشتنە. كە ناوەڕۆكی یەكێك لە نامەكان بەم جۆرەیە: (وا پێویست دەكات كە عێراق بەجێ بهێڵێ لەماوەی سێ ڕۆژ لە مێژووی ئەم نامەیەوە، ئەگەر وا نەكەیت سزای بەكوشتن دەدرێیت) ئیمزا (الجمعیة الكردیة الاصلاحیة)، ئەگەر چی ئەندامانی ئەم كۆمەڵەیە لە ناوچەی كەركوكیشدا بڵاوبۆتەوە، بەڵام چالاكییەكانیان دیار نییە[٤٥].

* كۆمەڵەی ڕەحمەی كلدانی:
ئەم كۆمەڵەیە لە ناو شاری كەركوك بەپێی نوسراوی وەزارەتی ناوخۆی عێراق بە ژمارە (٩٦٨٠)ی ڕۆژی (٩)ی ئایاری ساڵی (١٩٣٩) دامەزراوە، كە تاكو ئێستا بەردەوامە بۆ خزمەتكردنی كلدانییەكانی كەركوك و باربووكردنیان لەهەموو لایەنێكەوە[٤٦].

* كۆمەڵەی ڕەحمەی ئاسووری:
ئەمەش یەكێكە لەو كۆمەڵە چالاكانەی ئاسورییەكانی ناو شاری كەركوك.

* كۆمەڵەی باربووی لێقەوماوانی ئەرمەن (جمعیة تعاونیة محتاجي الارمن):
ئەم كۆمەڵەیە بۆ یارمەتی لێقەوماوانی ئەرمەنەو یەكێكە لەو كۆمەڵە چالاكانە كە تاكو ئێستا بەردەوامە[٤٧].

* حیزبی (هیوا):
كۆمەڵەی (هیوا) لە ساڵی (١٩٣٩)دا لەسەر بناغەی ڕێكخراوی (داركەر) دامەزرا.. لاوانی (داركەر)، بۆ ئەوەی كۆمەڵەكە پەرەپسێنێ پەیوەندیان بە مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)یەوە كردو ئەویش پێشنیاری كرد كە ناوی كۆمەڵەكە ببێتە (هیوا)، خۆشی بووە سەرۆكی (هیوا)[٤٨].
لە ساڵانی پاش شەڕی یەكەمی جیهانی، لە كوردستانی بەشی عوسمانیدا پارتێكی سیاسی بەناوی (هێڤی) دامەزرابوو، زۆربەی ڕۆشنبیران و ئەفسەرانی كورد لەو پارتەدا بوون.. (ڕەفیق حیلمی)یش ئەندامی ئەو پارتە بوو، بۆ زیندووكردنەوی یادی تێكۆشانی ئەو پارتەو زیندوكردنەوەی ناوی (هێڤی) ناوی پارتی (هیوا)ی لێنرایەوە[٤٩]. حیزبی هیوا پێكهاتبوو لە ڕۆشنبیران و قوتابیان و ئەفسەرانی كورد و ئاغا و دەرەبەگەكانی كوردستان[٥٠].
زۆربەی ئەندامانی حیزبی هیوا بریتی بوون لە خەڵكی ناوچەكانی خانەقین و كفری و هەولێرو كەلارو كەركوك[٥١]، دەتوانین حیزبی (هیوا) بە حیزبێكی نەتەوەیی كورد دابنێین كە تێكەڵاوە لە چینێكی هەڵگری بیروباوەڕی نەتەوەیی و دیموكراسی لە كوردستاندا[٥٢]. لە سەرەتادا زۆر بەهێزنەبوو، بەڵام لەدوایدا پەلوپۆی داكوتا، تاوای لێهات بووبە حیزبێكی فراوانی پەلوپۆ هاویشتراو، وای لێهات كە پەیوەندی بەحیزبەكانی كوردستانی ئێرانەوە كردوو گۆڕینەوەی ڕاوبۆچوون و هاتووچۆ لەنێوانیاندا هەبوو. ناوبانگی نەك لە عێراق بەڵكو لە ئێران و توركیاو سوریاش بڵاوبوبۆوە[٥٣]، تا ساڵی (١٩٤٣) بە بەهێزترین حیزبی گۆڕەپانی كوردستان دادەنـرا[٥٤]. حیزبی هیوا پەیڕەوو پرۆگرامی ناوخۆیی دیاریكراوو چاپكراوی نەبوو، بەڵام توانیان كە چەند چاپكراوێك و بڵاوكراوەیەكی ناوخۆیی بڵاوبكەنە بە ناوی (شیلان) بەزمانی كوردی كە بەنهێنی لەسەر ئامێری چاپ چاپدەكراو پێشتر لەلایەن عەتا تاڵەبانی لە ئاوایی زەرداو تایپ دەكرا[٥٥].
ئەندامە ناودارەكانی حیزبی (هیوا) بریتی بوون لەم كەسانە: محەمەد قەرەداغی و عەبدولقادر زەنگەنەو وەهاب قەمبەرو عەبدولڕەحمان كریم و تاهیر سالح و عەتا تاڵەبانی و محەمەد نەجیب تاڵەبانی و ئەحمەد بابان و مستەفا جاف و شەوكەت جاف و ئەحمەد براحەمەو شێخ ئەحمەد شاكەلی و سابیر حاجی فەتحوڵڵا[٥٦].
"لە ساڵی (١٩٤٣)وە بیروڕای چەپڕەوی كەوتبووە نێوان هەندێ لە ئەندامانی كۆمەڵەی هیواوە، ناكۆكیش لەناو ئەفسەرەكان و سەرۆكی باڵادا هاتبووە گۆڕێ.
"لە مانگی شوباتی ساڵی (١٩٤٤) لە شاری كەركوك كۆبوونەوەی فراوان پێكهات بۆ لێكۆڵینەوە لەو هەلومەرجەی

حیزب تیایدا دەژیا، لە ماوەی گفتوگۆکانی ئەو کۆبوونەوەیە ململانێ و ناکۆکییەکانی نێوان باڵەکانی حیزب زیاتر قوڵبووەوە.
ململانێ و جیاوازییەکان گەیشتنە ئاستێك کە بووە هۆی دووبەرەکی لە ناو حیزب بە گشتی. لە هاوینی ساڵی (١٩٤٥) بە تەواوی لە یەك هەڵوەشایەوەو بووە چەند بەشێك کە دەکرێت ئاماژە بۆ دوو لایەنی سەرەکی بکرێت:
١. کۆمەڵەی (شۆڕش) کە ڕۆژنامەی شۆڕشیان دەرکرد. سەرکردەکانیان: عەلی عەبدوڵلا، نوری شاویس، جەمال حەیدەری، ساڵح حەیدەری.
٢. کۆمەڵەی ڕزگای کە پاشتر بوونە بەشێك لە (حیزبی دیموکراتی کورد) لە عێراق لەو کەسانە: جەعفەر محەمەد کەریم، سدیق ئەتروشی، تەها محێددین مەعروف)"(**).
بۆیە ئەمە لە ساڵی (١٩٤٤) بەزەقی کەوتە بەرچاو، بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتانە لە کەرکوك کۆبونەوەیەك بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە بڕیاردرا کە دوو کەس لە نوێنەری ئەفسەرەکان لە کەلار کۆبونەوەیەك لەگەڵ سەرۆکی باڵاو هەندێ لە ئەندامان ببەستنەوە ئەمە لە هاوینی ساڵی (١٩٤٤) بوو، دوو ئەفسەرەکە مەحموود تەهای بەرزنجی و مەجید عەلی بوون کە بەشێویەکی نهێنی هاتنە کفری و ئەو شەوە لە کەلار لە ماڵی داود بەگ بۆ کۆتایی هاتنی کێشەکان کۆبونەوە. لە نێوان ساڵانی ١٩٤٥- ١٩٤٦ حیزبی هیوا بەتەواوەتی هەرەسی هێناو ئەندامەکانی بڵاوەیان لێکرد".
"لقی کەرکوکی حیزبی (هیوا) ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە چالاکییەکانی حیزبی (هیوا)، لەلایەکەوە ژمارەیەکی گەورەی ئەفسەرو سەربازانی تیپی دووی سوپای عێراق (کە بارەگاکەی لە کەرکوك بووە) پەیوەندییان بە ڕێکخستنەکانی حیزبی (هیوا) کردووە، لەلایەکی دیکەوە کەرکوك ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە دامەزراندنی کۆمەڵەی (دارکەر) و دواتر حیزبی (هیوا) بە هۆی ئەو ئەندامانەی کە بەشدارییان کردووە، وەك: بورهان حامید جاف، کاکە حەمەی خانەقا، موکەڕەم تاڵەبانی.
مستەفا نەریمان، کە لەو سەردەمە خوێندکار بووە لە خانەی مامۆستایانی بەغداو خەڵکی شاری کفرییە، لە چاوپێکەوتنێك بە مێژووی (١٨)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٧) دەگێڕێتەوە:
من لە ساڵی (١٩٤٢) خوێندکاری خانەی مامۆستایان بووم لە شاری بەغدا، ژمارەی خوێندکارە کوردەکان نزیکەی (٢٠ - ٢٥) خوێندکار دەبووین، لە پەیمانگەو کۆلێژەکانی بەغدا، کە لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی عێراقەوە هاتبووین، من لایەنگری حیزبی هیوا بووم، بڵاوکراوەکانمان دەگەیاندە خەڵکی، لە هاویندا دەگەڕامەوە شاری کفری، بەرپرسی ڕاستەوخۆمان لە شاری بەغدا شەهید ساڵح یوسفی بوو، کە خوێندکاری کۆلێژی زانست بوو.
ناوبراو لە سەرباسەکانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ:
لە هاوینێك لە قەزای کەلار کۆبوونەوەیەکی فراوان بەسترا، چەند کەسایەتییەك لە ئەندامانی حیزبی هیوا ئامادەی بوون، لەوانە (ڕەفیق حیلمی، موکەڕەم تاڵەبانی، ڕەشید باجەڵان، عەتا تاڵەبانی، حاجی عەلی خان، عەزیز پشتیوان، کەریم بەگی جاف)، هەروەها هەردوو ئەفسەر (مەجید عەلی، مەحموود شێخ تەها)، ئامادەبوون کە بە شێوەیەکی نهێنی لە بەغداوە هاتبوون.
دەربارەی چالاکییەکانی حیزبی ئەم ناوچەیە، مستەفا نەریمان دەڵێ:
ئێمە توانیمان چەند بڵاوکراوەیەك چاپ بکەین و بڵاوی بکەینەوە، لەناو ئەندامەکانی حیزبی هیوا، وەك: محەمەد قەرەداغی، عەبدولقادر زەنگەنە، وەهاب قەمبەر، عەبدولڕەحمان کەریم، تاهیر ساڵح، عەتا تاڵەبانی، محەمەد نەجیب تاڵەبانی، ئەحمەد بابان، مستەفا جاف، شەوکەت جاف، ئەحمەد برا حەمە، شێخ ئەحمەد شاکەلی، سابیری حاجی فەتحوڵلا)" (٥٧).

*** ئەو هۆیانەی وایکرد حیزبی هیوا هەرەس بهێنێت ئەمانەن:**
بەشداری نەکردنی چینی جوتیار وەکو هێزێکی بەهێز لەناو حیزبەکەدا، کە ئەمە وای کرد لەبەر ڕەزامەندنەبوونی ئاغاو دەرەبەگ نەتوانن دەرگا والآبکەنەوە بۆ جوتیارو کرێکار ئەمەش بەزەقی ڕوویدا لە کاتێکدا کە پشتگیری شۆڕشی (مەلا مستەفا) بکەن، کاتێك داوایان لێکرا هەموویان سوێندی پشتگیری بخۆن بۆ بەرگری کردن، بەڵام کاتێك هاتنەسەر کردەوە کارەکەی هەرەسی هێنا کە ئەمە بوو بە پەند بۆ هەموو حیزب و ڕێکخراوێك کە ئەوەندە پشت بەئاغاو دەرەبەگ نەبەستێ و ڕێگەبدا بچنە ناو جەماوەری پان و بەرینی کوردەوە(٥٨).
داواکردنی سەرۆکی باڵا (ڕەفیق حیلمی) لەلایەن بەریتانیاوە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵیدا، کە ئەمە بەکشانەوەی هێزی ڕاستڕەوی ناو حیزبەکەو لەدوایدا پەشیمانی سەرۆکی باڵا لەوکارەو هەستی بەفرت و فێڵی بەریتانیا کرد لەم کارەیدا کە ئاژاوەی خستە ناوەوە(٥٩).
گوێزرانەوەی بنکەی پارت بۆ بەغداو هاتنی (ڕەفیق حیلمی)، ئیتر شێوەی لێکۆڵینەوەی سیاسی و هەڵبژاردنی کاربەدەستانی پارت بەشێوەیەکی دیموکراسی لە مێژووی پارتدا سڕایەوە، لەمەولا نە کۆنگرە، نە هەڵبژاردنیش نەمان، لێپرسراوان لەلایەن سەرۆکەوە دادەنران و هەر لەلایەن ئەویشەوە لادەبران(٦٠).
دەرکردنی دامەزرێنەرانی حیزبی هیوا وەکو یونس ڕەئووف و کاکە حەمەی خانەقاو مارف بەرزنجی کە لەدەرکراوەکان بوون(٦١).
دەوری داگیرکەری بەریتانیا کەم نەبوو بۆ لێدانی چینی ڕاستڕەو، کە دەستێك بوو بۆ لێدانی چینە پێشکەوتوخوازەکان بۆ ئەوەی شوێنەواریان نەهێڵن(٦٢)، بۆیە بوونی کۆمەڵەیەکی وەکو کۆمەڵەی شوان هەر چەندە کە دیارنیە تائێستا چۆن چۆنی بووە، بەڵام وادیارە کە بەریتانیا دەوری هەبووە لە هەرەسهێنانی حیزبی هیوا بۆ بێ هێزکردنی ئەم حیزبە بەناوی کۆمەڵەی شوانەوە(٦٣).

*** لقی بزووتنەوەی (حالوتس - قصوروت)ی پێشڕەو:**

ئەم بزووتنەوەیە لەکاتی بشێوی کە بەناوبانگە بە فەرهود، لەڕۆژانی یەکەمو دووەمی حوزەیرانی ساڵی (١٩٤١)دا، دروست بوو.

ئەم بزووتنەوەیە لەسەر بنەمایەکی نهێنی لەلایەن چەند جوولەکەیەکی فەلەستین کە بۆ ئەم کارە نێردرانە عێراق دامەزرا، لەوانە سیرینو خزوریو جوتهان، دەستیان کرد بەوەرگرتنی لاوانی تەمەن لەنێوان (١٤-١٧) ساڵ بەجۆرێ، لەچواردە ساڵ کەمتریان وەرنەدەگرت.

سەرەتای بزووتنەوەکە لە بەغداوە دەستی پێکرد، چونکە زیاتر دەیانتوانی بچنە ناو قوتابخانەکانی جولەکەوە لە بەغدا، وزیاتر دەیانتوانی جێ پێی خۆیان جێگیر بکەن(٦٤). لەدواییدا دەستکرا بەکردنەوەی لقی ئەم بزووتنەوەیە لە هەولێرو کەرکوكو عەمارەو حلەدا(٦٥).

"ئەم بزووتنەوەیە بایەخی بە پڕوپاگەندە دەدا لە چوارچێوەی وەرگێڕانو بڵاوکردنەوەی چەندین کتێب، وەك کتێبی (دەوڵەتی جولەکە) لە نووسینی (هرتزل). هەروەها ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامەی نهێنی بڵاوکردەوە، لەوانە: ڕۆژنامەی (هنیف هتنوعاه) کە بە واتای باسەکانی بزووتنەوە دێت، ئەم بڵاوکراوەیە بۆ ماوەی یەك ساڵ دەرچوو لە ئەیلولی ساڵی (١٩٤٢) تا ئەیلولی ساڵی (١٩٤٣)، سەرەڕای چەندین بڵاوکراوەی دیکە وەك: صهیون، پێشەنگی لاو.

بزووتنەوە لە هەوڵی ئەوەدا بوو بیروباوەڕی زایۆنیزمی بگەیەنێتە قوتابخانەی جولەکەکان لە ڕێگای ئەو مامۆستایانەی ئەندامانی بزووتنەوەکە بوون بە هۆی سوودوەرگرتن لە وانەکانی ئەدەبو زمان.

بزووتنەوە چەند ئامێرێکی چاپی هەبووە بە هەردوو زمانی عەرەبیو عبری لە شاری بەغدا لە ماڵێکدا شاردرابوونەوە.

بزووتنەوە بایەخێکی زۆری بە کچان داوە کە ببنە ئەندام، بۆ ئەم مەبەستە ڕێکخراوی جولەکە لە ساڵی (١٩٤٣) ئافرەتێکی بە ناوی (ملکە روقیە) ناردە عێراق بۆ فێرکردنی کچان بە زمانی عبری"(***).

دەربارەی ئەم بزووتنەوەیە ئەوەیە کە شوێنێکی دیاریکراویان نەبوو، بەڵکو لەسەر ئەو شێوەیە دانرابوو، کەهەر یەکێك ماڵەکەی لەژێر دەسەڵاتی بزووتنەوەکە بوو، بۆ کۆبوونەوە، بۆیە هەر جارەی لەماڵی یەکێك کۆدەبوونەوە، تەنها لەوانە خۆش دەبوون کەماڵەکانیان نزیکی بنکەی پۆلیس یان دەزگاکانی حکومەت یان ماڵی موسڵمانەکان بێ، یان نزیکی چایخانەو شوێنی گشتی بێ، بۆ ئەوەی هەستیان پێ نەکرێت.

لە شاری کەرکوك لە ساڵی (١٩٤٦)دا بزووتنەوەکە دەستی کرد بە ڕاهێنانی قوتابیانی جوو، لەسەر کشتوکاڵ،و وای لێهات پارچە زەویەکیان دیاری دەکرد لەتەك قوتابخانەکەیان بۆ فێرکردنی کشتوکاڵ، تا بۆ ئەوەی میوەو سەوزەی تێدا بچێنن،و ژمارەیەك جوولەکەیان بۆ پارێزگاری کردنی لەسەر دادەنا، بۆیە لە کۆبوونەوەی گشتی بزووتنەوەکەی (حالوتس)دا ڕێزی ئەو کارەی کەرکوك گیرا.

ژمارەی قوتابییە وەرگیراوەکان دیار نییە لە نێوان ساڵانی (١٩٤٢-١٩٥١)دا، بەڵام لە ساڵی (١٩٤٢)دا هی کەرکوكو موسڵو بەغدا گەیشتنە نزیکەی ٣٠٠ کەس، لەوانە کەرکوك ٢٥ کەس دەبوون هەتا ساڵی ١٩٤٥ هیچ لقێکی نوێی لێ نەبوو، بەڵام لە ساڵی (١٩٤٧)دا بوو بەسیانزە لق کەناوی لقی کەرکوك (قصوروت) بوو، کە لە ساڵی (١٩٤٨)دا بوو بەشانزە لق لەسەرتاپای عێراقدا..(٦٦).

لە سەرەتادا ئەندامانی بزووتنەوەکە، تەنها پێکهاتبوون لە لاوان بەڵام کیژانی تێدا نەبوو، ئەویش لەبەر ئەوەی کەڕێگای ئافرەت نەدەرا بەسەربەستی بچێتە دەرەوە،و بڕوا بۆ شوێنی یەککگرتنی لەگەڵ لاواندا(٦٧).

لەناو بزووتنەوەی حالوتسدا شێوە دابەشبوونێك هەبوو لەشێوەی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ناو بزووتنەوەکە، هەوڵی پەیوەندی کردنی لقەکان بەبنکە بنەڕەتییەکەوە لەناو بەغدا، هەرییەکە دەستەی دیاریکراو دانرا بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان کەئەمە وای کرد لەسەرەتادا ژمارەیەکی زۆر لەخۆی کۆبکاتەوە، بەڵام وردە وردە بزووتنەوەکە تووشی نوشتو داڕووخان بوو، کە چەند هۆیەك هەبوو بۆ لەناوچوونی:

١. هۆی کاری نهێنیو گەڕانی پۆلیسو ئەمن بەدوایاندا، وای لێیان کرد بزووتنەوەکە نەتوانێت کارەکانی بە ڕێکوپێکی بەڕێوەبەرێت.

٢. نەبوونی توانای نێردراوەکانی فەلەستینو شارەزا نەبوونیان لە زمانی عەرەبی بەتایبەتی لەهجەی عێراقی.

٣. نەبوونی ڕێبەرانی ناوخۆیی کە ئەمیش وای لێهات بێتە کۆسپ لە ڕێگای بەردەوامبوونی.

٤. نەبوونی کۆچو نەبوونی تواناکانی کۆچکردن، چونکە کۆچکردنەکان بەشێوەیەکی ئاسایی نەبوون بەڵکو زۆری ڕێگاکان ناشەرعی بوون، بۆیە وازیان لێدەهێنا.

٥. کۆچکردنی ئەندامەکانیان بۆ فەلەستین وای لێهات ژمارەی بزووتنەوەکە کەم بێتەوە خەڵکی تر نەبوون جێگایان بگرێتەوە.

٦. هەروەها بە هۆی بڵاوبوونەوەی شیوعیەت وای لێهات ژمارەیەکی زۆریان، واز لە بزووتنەوەی حالوتس بهێنن لەبەر ئەوەی ڕێبازێکی ڕەگەزایەتیو دەمارگیری بوو، بە پێچەوانەی حیزبی شیوعی.

٧. کارەساتی ئاشکرا بوونی ڕێکخراوو لقەکانیان لە کۆتایی ساڵی (١٩٤٣)و سەرەتای ساڵی (١٩٤٤)دا، لەگەڵ ئاشکرا بوونی زۆری شانە نهێنییەکانیان.

٨. گرنگیدانی بزووتنەوەکە تەنها بەلاوان.

٩. نوێژی بەکۆمەڵ.

ئەمە وای کردبوو، نەتوانرێت بزووتنەوەکە لایەنی نهێنی خۆی بپارێزێت، بەتایبەتی لەبەرامبەر کەسوکارو هاوڕێی ئەنداماندا(٦٨).

(حالوتس) ووشەیەکی عیبرییە بەمانای (الرائد، الطلائعي، المستكشف - بەمانای ڕێخۆشکەر، پێشڕەو، دۆزێنەر)، ڕێکخراوێکی نهێنی جوولەکە بووە، کە ئامانجی کارکردبووە بۆ ڕێگەخۆشکردنی جوولەکە بۆ کۆچکردن بۆ (ئیسرائیل)، بۆ ڕێکخستن جوولەکەی کوڕو کچ بۆ ڕاهێنان لەو ژینگە

تازەیە، کارکردن بۆ فێربوونی ئیشی دەستیو فێربوونی زمانی (عیبری).

*** بزووتنەوە (ملورون):-**
بزووتنەوەیەکی نهێنی جوولەکە بووە کە لە کەرکوك بوونی هەبووەو ناوە نهێنی یەکەی (ملورون) بووە، ژمارەی ئەندامەکانی (٢٥٠) ئەندامی جوولەکە بووە لە کەرکوك. مێژووی دامەزراندنی نازانرێت.

*** بزووتنەوەی (سکاف عام):-**
بزووتنەوەیەکی نهێنی جولەکە بووە لە (کفری)بوونی هەبووە، ناوە نهێنییەکەی (سکاف عام) بووە، ژمارەی ئەندامەکانی (٣٠٠) جولەکە بووە. مێژووی دامەزراندنی نازانرێت.

*** بزووتنەوەی (ماعوز):-**
بزووتنەوەیەکی نهێنی جولەکە بووە لە شارۆچکەی (خوورماتوو) ناو نهێنییەکەی (ماعوز) بووە، ژمارەی ئەندامەکانی (٣٥٠) جوولەکە بووە، مێژووی دامەزراندنی نازانرێت.

*** رێکخراوی (التنظیم الصهیوني السري):-**
ئەم رێکخراوە تا ساڵی (١٩٤٩) لە زۆربەی پارێزگاکانی عێراق لقی هەبوو وەکو:- بەغداد، بەسرە، کەرکوك، هەولێر، موسڵ، حیلە، عەمارە، قەلعە ساڵح عەزیز.
تەنها کەرکوك (١٠٠) ئەندامی هەبوو کە دابەش ببوو بەسەر (١٣) بەش کە (١٣) سەرپەرشتیار کارەکانی دەبردە رێگاوە.

*** لقی کۆمەڵەی ژ.ك (ژیانەوەی کوردستان):**
ئەم کۆمەڵەیە بەنهێنی ساڵی (١٩٤٢) لە کوردستانی ئێران دروست بوو، بەڵام هەر زوو پەلی هاویشت لە زۆربەی شارە گەورەکانی کوردستاندا لقی لێ بووەوە وەکو هەولێر، کەرکوك، رەواندوز، شەقڵاوە، سلێمانی، هەروەها لە کوردستانی سوریا و تورکیاشدا[٦٩].
"سەرکردایەتیی کۆمەڵە هەر لە سەرەتاوە بایەخی بە دامەزراندنی پەیوەندی پتەو لەگەڵ کوردەکانی پارچەکانی تری کوردستان بە تایبەتی کوردستانی عێراق دەدا، بۆ ئەم مەبەستەش لە ئاداری ساڵی (١٩٤٤) محەمەد شەرەفی کە یەکێك لە ئەندامە باڵاکانی کۆمەڵە بووە رەوانەی کوردستانی عێراقی کرد لە شاری کەرکوك ناوبراو چاوی بە سەرکردایەتی (هیوا) کەوتو پاشان لە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولاو رێگرە سەرەکییەکانی بەردەم خەباتی نەتەوایەتی کورد باس کرا"[٧٠].
سنووری رێکخستنەکانی کۆمەڵەی ژ.ك لە کوردستانی عێراقدا لە سەرەتا زۆر فراوان نەبوو بە هۆی هەلومەرجی تایبەتی سیاسی تەنیا لە شارەکانی سلێمانیو کەرکوكو کفری چالاکییەکانیان دەنواند. دواتر سنووری چالاکییەکانی ئەم رێکخستنە ناوچەکانی شەقڵاوەو رەواندوزو بەغداو موسڵیشی گرتەوە.

سەبارەت بە ئەندامەکانی کۆمەڵە لە کوردستانی عێراق دەتوانین بڵێین لە رۆشنبیرانو پێشکەوتنخوازو بازرگانی بچووكو پیشەساز پێکدەهات.
لە ئەندامە چالاکەکانی فایق بێکەس (١٩٠٥-١٩٤٨)، سدیق شاوێس (ساڵی ١٩٧٤ مردووە)و محەمەد عەلی مەدهۆشو ساڵح رۆشدیو عەتا تاڵەبانی کە لێپرسراوی لقی کفری بوو، حوسێن خانەقا لێپرسراوی لقی کەرکوك.
سەعید محەمەد کە ناسراو بوو بە (سەعید تەتەر) رێگای پێدراوبووە بۆ هاتووچۆکردنی کوردستانی ئێرانو رۆڵێکی بەرچاوی پێشەوە بووە، لە ئەندامە چالاکەکانی کۆمەڵە بوو"[٧١].

*** برایانی موسڵمان (الإخوان المسلمین):**
"سەرەتای چاکییەکانی دەگەڕێتەوە ساڵی (١٩٢٧) لە شاری ئیسماعیلیەی میسر لەسەر دەستی شێخ حەسەن ئەحمەد بەنا (١٩٠٦- ١٩٤٩)، دەستی پێکرد لە ساڵی (١٩٤٢) چالاکییەکانی گەیشتە عێراق وشاری موسڵ وەك بنکەیەکی سەرەکی ئەم بزووتنەوەیەی لێهات، کە ژمارەکانی گۆڤاری (الاخوان المسلمین) دەگەیشتە ئەم شارەو بە شێوەیەکی ئاشکرا دەفرۆشرا ئەوەش بوبووە هۆی دروستبوونی گروپی نهێنی کە هەلگری ئەم بیروباوەڕە بوو بەڵام هیچ رێکخراوێکی تایبەت بەم ناوەندە نەبوو"[٧٢].
"هەروەکو لە سەرچاوەکان ئاماژەی پێ کراوە کە بزووتنەوەی (ئەلئیخوان ئەلموسلمین) لە هەموو وڵاتە عەرەبییەکان پەلو پۆی هاویشت، عێراقیش یەکێ بوو لەو وڵاتانە کە هەر لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا بە سەرکردایەتی گەلێك لە رابەرانو ئەندامانی بزووتنەوەو زانایانی ئایینیو شێخو گەلێك قوتابی کۆلێژو پەیمانگاکانی عێراق، هەموو ئەمانە نوێنەری بنەرەتی کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری ئەم کۆمەڵەیە بوونە لە عێراق، بە تایبەتی لەو ماوەیەی فەرمانڕوایی پاشایەتی لە نێوان ساڵانی (١٩٢١-١٩٥٨) کە ماوەی دەسەڵاتی بەریتانییەکان بوو لە عێراقدا"[٧٣].
"لە سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەم دکتۆر (حوسێن کەمالەددین) کە هەلگری ناسنامەی میسری، بوو یەکێك بوو لەوانە کە هەلگری بیروباوەڕی (ئیخوان موسلمین) بوو لە میسرەوە بۆ عێراق، کە خۆی لە کۆلێژی ئەندازیاری بوو لە زانکۆی بەغدا، لەگەڵ کۆمەڵێك لە مامۆستایانی میسری لە هەمان زانکۆ، توانی لە رێگای بانگهێشەکانی دامەزرێنەری بزووتنەوەکە (شێخ حەسەن بەنا) دەور ببینێت لە گەشەکردنی بزووتنەوەکە"[٧٤].
"لە هاوینی ساڵی (١٩٤٦) دوای گەڕانەوەی محەمەد مەحموود سەواف لە میسر داواکارییەکی پێشکەش بەوەزارەتی ناوخۆ کرد بۆ رێگا پێدانیان بۆ کارکردنی ئاشکرا بەڵام وەزارەت رەزامەندی پیشان نەدا لەسەر داواکارییەکە، لە ساڵی (١٩٤٩) لەژێر ناوی کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامی وەك رووپۆشێکی ئاشکرای ئەم کۆمەڵەیە جارێکی تر داواکارییان پێشکەش بە وەزارەت کردەوەو ئەمجارەیان وەزارەت لە (١٣)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٤٩) رێگای پێدان وبەمجۆرە لە

چالاکییەکانیان بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٥٤ بە شێوەیەکی ئاشکرا تا ئەوکاتەی مۆڵەتی کاری ئاشکرای هەموو حیزبە ئاشکراکان هەڵوەشایەوە.

کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامی لە زۆربەی شارەکانی کوردستاندا لقی تایبەتیان هەبوو، سەرۆکی کۆمەڵەکە شێخ ئەمجەد زەهاوی بەرەچەڵەك کوردبوو ولێپرسراوی موسڵ مەلا عەبدوڵڵا محەمەد عومەر ئەربیلی کە ئەویش کورد بوو، ئۆردووگاکانی ڕێکخستنی خۆی وخۆپۆشنبیرکردنیش هەر لە کوردستاندا دەکردەوە"[٧٥].

"ڕێکخراوی (ئەلئیخوان ئەلموسلمین) کاتێك لە ناوچە کوردییەکان بڵاوبووەوە لە ڕێگای پارێزگای موسڵەوە بووە، لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا یەکەم کەسێك کە بیروڕاکەی بڵاوکردەوە لە کوردستاندا ناوی (مەلا عوسمان عەبدولعەزیز) بوو، لە دواییدا بوو بە دامەزرێنەری (بزووتنەوەی ئیسلامی کوردی)، هەروەها هەر یەکە لە (مەلا ساڵح عەبدولکەریم، حاجی سلێمان) دەوریان هەبوو لە ناوچەکەدا بە تایبەتی ئەوەی دواییان لە کەرکوکدا دەوری بینی.

ئەو چینانەی لە کەرکوکدا بیروڕاکانی ئیخوانیان تێدا بڵاوبوبووە بریتین لە چینی شێخ و مەلاو چینە ئائینییەکان وەکو نووسەری دادگاو خاوەنی ئوتوچێتی و مامۆستا"[٧٦].

"لە دوای ساڵی (١٩٥٦)وە لە کەرکوکیش بارەگایان هەبوو کە تا شۆڕشی ساڵی (١٩٥٨)ی عێراق بەردەوام بوو، جێگەکەی بەرامبەر لەلای پردی دووەم بوو پردی مریشك فرۆشەکان لە بەرامبەر باڵەخانەی حەسەن نەجمی ئێستا لەوانەی کەدەوریان لەو کۆمەڵەیەدا هەبوو بریتی بوون لە: سلێمان کوڕی ئەمینە ئەفەندی خەڵکی گەڕەکی پیریادی، ئەحمەد سەید محێدین ئاسنگەر، قابیل کوڕی شێخ حەسیب تاڵەبانی"[٧٧].

" لە ساڵی (١٩٤٦) لە دوای سەرهەڵدانی بزووتنەوەکە بە شێوەیەکی ئاشکرا، گەلێك لە شارەکانی بەغداو کەرکوك بارەگایان کرایەوە، بۆ نموونە هەر یەکە لە (ساڵح مەهدی ئەلدەباغ، کەماڵ ئەلقەیسی، عەبدولحەکیم ئەلموختار، ئیبراهیم مونیر ئەلمودەڕیس، نوعمان عەبدولڕەزاق ئەلسامەڕائی، وەلید ئەلئەعزەمی) لە پێشەنگەکان بوون لە شاری بەغدا، هەر یەکە لە (نورەددین ئەلواعیز، سەلمان محەمەد ئەلقابلی) لە کەرکوك دەوریان هەبوو لە گەشەکردنی بزووتنەوەکە"[٧٨].

بەڕێز د. عەبدولستار تاهیر شەریف ئاوها یادگاری خۆی دەربارەی (اخوان المسلمین) لە کەرکوك دەگێڕێتەوە:

"مامۆستا عابد تۆفیق سەر بە کۆمەڵەی (الاخوان المسلمین) بوو، پیاوێکی نوێژکەرو بە دین بوو، دەورێکی باڵای هەبوو لە چاندنی تۆوی دامەزراندنی بزووتنەوەی ئیسلامی لە شاری کەرکوك، یەکێ لەوانە من بووم، کە بە ڕێگای ئەوەوە بووم بە ئیخوان و دەستم کرد بە نوێژ کردن و ڕۆژوگرتن و خوێندنەوەی قورئان و نووسینەکانی (حەسەن ئەلبەنا) و مورشدی گشتی (الاخوان المسلمین) لە میسر، لەو کتێبانەی دەم خوێندەوە لە پۆلی دووەم و سێیەم دا (رسائل حسن البناء) کە واتە (نامەکانی حەسەن ئەلبەنا)، لەگەڵ نووسینەکانی سەید قوتب و عەبدولقادر عودەو ڕەمەزان سەعیدو محەمەد ئەلغازالی و باقوری و.. هتد.

لە ساڵانی (١٩٥٠-١٩٥١) تا ساڵی (١٩٥٤) لە پشووەکانی نیوەی ساڵ یان سەر ساڵ (هاوین) سی چل قوتابی و مامۆستایان و ئەندامانی (الاخوان المسلمین) دەچووینە دێهاتەکانی (خاڵە بازیانی) و (ئۆمەرە گەردە) و (شێخ جگری) لە ناحیەی قەرە حەسەن (لەیلان) بۆ سەربازگای الاخوان ماوەی یەك حەفتە لە سەربازگەکە دەماینەوە لەوێ مەشقمان دەکردو گوێمان لە موحازەرات ڕادەگرت، کەواتە لەم تەمەنەدا لە (١٦-٢٠) ساڵی خەریکی دینداری و خوێندنەوەی کتێب و نامیلکە ئاینییەکان بووم ڕاستگۆو ڕەوشت پاك و جوان. فێری ئاکارو ڕەوشتی باش بووم لێیانەوە. تا ساڵی (١٩٥٧) لە ڕیزی الاخوان المسلمین مامەوە و گەیشتمە پلەی (نەقیب) کەواتە ڕێکخەری شانە.

لە ساڵی (١٩٥٤) (کۆمەڵەی الاخوان) ئیجازە درا پێی بە ڕەسمی و لە کەرکوك لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێن خانوەکەی مەلا خالید مان بە کرێ گرت و کردمان بە بارەگای الاخوان لە نزیك بنکەی پۆلیسی کەرکوکیش لە ژێر ئۆتێل المرکزی کتێبخانەیەکمان هەبوو (مکتبة الاخوة الاسلامية) بەناو سلێمان محەمەد ئەلقابلی و سەید ئەحمەد محێددینەوە تۆمار کرابوو.

بەهەر حاڵ بارەگاکەمان ئەوەندە دەوامینەکرد لەگەڵ ڕۆژنامەی (الحساب) لە بەغدا حوکمەت دای خست، ڕۆژنامەی (الحساب) وتارەکان و نووسینەکانی زۆر دژی پرۆژەی (النقطة الرابعة)ی ئەمریکی بوو. هەروەها هەموو بارەگاکانی تری الاخوان لەعێراق داخرا.

محەمەد مەحموود ئەلسەواف چاودێری گشتی ئیخوان بوو، ئەمجەد ئەلزەهاوی مورشدی گشتی بوو، محەمەد مەحموود ئەلسەواف زۆر چالاك بوو، دوای (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨) بەرەو سعودیە هەڵات و وەك پەنابەری سیاسی لە سعودییە وەرگیرا، تا ساڵی (١٩٩٨) لە سعودییە بوو، لە فڕۆکەخانەی ئەستەمبوڵ لە ساڵی (١٩٩٨) بە سەکتەی دڵ کۆچی دوایی ئەکا. لە قۆناغی ئامادەیی چالاکی باشمان هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بیرو باوەڕی الاخوان لە شاری کەرکوك، تا ڕادەیەك توانیمان لە ڕیزی خێزانەکانی کوردو تورکمان ژمارەیەکی باش ئەندامیان تیا پەیدا بکەین، سەرۆکی کۆمەڵەکەمان مامۆستا نورەددین ڕەزای واعز بوو، کوڕی مامۆستا مەلا ڕەزا، نورەددین کورد بوو بەڵام خێزانەکەی تورکمان بوو.

لە ئەندامە ناسراوەکانی سلێمان محەمەد ئەمین ئەلقابلی و سەید ئەحمەد سەید محێددین و ئایدن عەبدولڕەحمان ئەلهورمزی و محەمەد محەمەد ئەلشێخ مامۆستای زمانی عەرەبی و میسری بوو، لە عێراق پەناهەندە بوو، لە دەست ڕژێمی جەمال عەبدولناسر ڕای کردبووە عێراق و لە قاهیرە لێپرسراوی خەتی قوتابیان بووە. ئێمەش (من، عەبدولسەتار تاهیر شەریف وموحسین عەبدولحەمیدو نەشئەت غەفور ئاغاو ئەحمەد بەرزنجی و عەبدوڵڵا بەرزنجی و غالب

خورشیدو ئەحمەد هەریسەچیو حەسەن حاجی وەهابو عەبدوڵڵا عومەر)، خەتی دووەمی کۆمەڵەکە بووین، لە ساڵی (١٩٥٤) بە ڕەسمی ڕێگەدرا پێمان چالاکی بنوێنین وەك باسم کرد))[٧٩].

لە چاوپێکوتنێکی گۆڤاری (لیڤین) ژمارە (٥٥) لە ئابی ساڵی (٢٠٠٧) لەگەڵ بەڕێز د. نوری تاڵەبانی ئاوها باسی ئیخوان ئەلمسلمین دەکات لە کەرکوك:

"تا ساڵەکانی ناوەڕاستی پەنجاکان هاوینان جاروبار خوالێخۆشبوو شێخ ئەمجەدی زەهاویو چەند پیاوێکی ئاینی شاری بەغدا دەهاتنە کەرکوك، لەوێوە دەچوونە شارەکانی دیکەی کوردستان، بەڵام لە کەرکوك میوانی باوکم دەبوون. ساڵێکیان شێخ ئەمجەد تەکلیفی لێدەکات ببێت بە ڕابەری ڕێکخراوی (الاخوة الاسلامیة) لە کەرکوك، بەڵام عوزری بۆ دەخوازێت. ساڵێك دواتر کە دێنەوە بۆ کەرکوك لە ماڵی ڕەزای واعیز لەگەڵ شێخ محەمەد مەحموود سواف میوانی ئەو دەبن، ئێوارەوەختێك دێنە تەکیە بۆ سەردانی باوکم، پرسیاری لێدەکات: بۆ وەکو جاران لەتەکیە میوان نەبوون؟ پاشان ئاماژە بۆ سەواف دەکاتو دەڵێت: دەزانم خەتای ئەوە کە ئەمجارە لێرە میوان نەبوون! خوالێخۆشبوو مەلا ڕەزای واعیز بووە ڕابەری ئەو ڕێکخراوە لە کەرکوك[٨٠].

"سەرەتای دەستبەکاربوونی هێڵی سدیق عەبدولعەزیز بۆ ساڵی (١٩٧٩) دەگەڕێتەوە، بە یەکەم ڕێکخستنی ئیخوان لە باشووری کوردستان دادەنرێت، لە دوای هەڵوەشاندنەوەی ئیخوان لە ساڵی (١٩٧١)دا بە شێوەیەکی ڕێکخراو دەستی بەکار کردبێت، سدیق عەبدولعەزیز بناغەدانەری ئەم کارەیە، ناوبراو یەکێکە لە ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان، بە گوتەی خۆیو سوبحی داودی، ئەندامی یەکەم شانەی ڕێکخستنی ئیخوانە لە هەڵەبجەدا، بە هۆی ئەوەی ناوبراو عەقڵییەتێکی ڕامیاریی و ڕێکخراوەیی هەبوو، لەگەڵ زۆرێك لە سەرکردەکانی ئیخوان ناکۆکی بۆ دروست ببوو، دەستپێکردنی ئەم کارەش، دوای هەشت ساڵ لە وەستاندنی کاری ئیخوان لە عێراق، مایەی سەرنجو تێڕامانی ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان بوو، ئەوان ئەو کارەیان بە یاساغ دەزانی، بۆیە هەر لەگەڵ هەستکردنیان بە جموجۆڵی سدیق عەبدولعەزیز، کەوتنە دژایەتی کردنیو ساردکردنەوەی خەڵك لێیو دروستکردنی تەنگو چەڵەمە بۆی"[٨١].

"یەکەم شانەی ئەم ڕێکخستنە بریتی بوو لە (مەلا ئەحمەد شافعی، نازم عەبدوڵڵا، مەلا فەرەیدون)، دواتریش (محەمەد ڕەئووف، ئومێد پارەزانی، مەولود باوەموراد)، هاتنە پاڵ یەکەم شانەی ڕێکخستنو لەلایەن خودی سدیق عەبدولعەزیزەوە سەرپەرشتی دەکران.

ئەمانە کۆمەڵێ گەنج بوون، بوونە بەردی بناغەی ئەم باڵە، دیارە دژایەتی ئیخوانە دێرینەکان هێندە توند بووە، بۆیە کەسیان ئامادە نەبوون بێنە ناو ئەم ڕێکخستنەوە، ئەمەش وای لە سدیق عەبدولعەزیز کردووە، کە ئەم گەنجانە بکاتە جێداری ئەوان. ئەمەش هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵێ گرفتی بۆ دروستکردوون، لە سەرووی هەموویانەوە کەم ئەزموونی ئەم گەنجانەیە لە کاری ڕێکخراوەیدا، بەڵام دواتر ئەم گەنجانە بوونەتە بناغەیەکی پتەوی کارەکە"[٨٢].

یەکەم ئەڵقەی ڕێکخستن لە سلێمانی لە (فەرحان عومەر، ئیسماعیل فەتحوڵڵا، عەبدوللەتیف فەتحوڵڵا، عەبدولڕەحمان غەفور) پێکهات، دواتریش ئەڵقەی دووەم لە پەیمانگای ئیسلامیی سلێمانی دانرا، کاری ئەم باڵە لە سلێمانی، بە شێوەیەکی بەرفراوان گەشەی کرد، لە نێوان ساڵانی (١٩٨٣-١٩٨٥) توانییان وانەی گشتی لە زیاتر لە (٣٠) مزگەوت دابنێن.

ساڵی (١٩٨٢) هەر یەکە لە (محەمەد ڕەئووف) لە زانکۆی بەغداو (مەولود باوەموراد) لە زانکۆی موسڵ بوونە خوێندکار، ئەم دوانەش لەو دوو شارە لە ناو خوێندکاراندا دەکەونە کار، چەند شانەی ڕێکخستن بنیاد دەنێن.

لە زانکۆکاندا، خوێندکاری زۆربەی شارەکانی کوردستان بوونیان هەبوو، ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئەوەی کاری ئیخوان لەسەر دەستی ئەوان بگاتە ئەو شارانە، خوێندکاران توێژێکی ڕۆشنبیریو چالاك بوون، ئەمەش وای کرد بە زوویی کاری ئەم باڵە فراوان بێتو بگاتە زۆربەی شارەکان، ئەوانەش کە دەبوونە ئەندام بە زۆری لە چینی گەنجو خوێندکار بوون.

تا ساڵی (١٩٨٣) کە گەیشت بووە هەولێر، لە ساڵی (١٩٨٤) دا بە هۆی (خەلیل ئیبراهیم) کە خوێندکاری کۆلێژی شەریعە بوو لە بەغداو بووە ئەندامی ئەم باڵە، توانرا ڕێکخستن بگەیەنرێتە دهۆك"[٨٣].

هەر چەندە کەرکوك لە دوای هەموو شارەکانی تری کوردستان درەنگ تر ئەم ئیخوانانە گەشەیان کرد، بەڵام بە شێوەیەکی بەربڵاو بڵاوبوونەوە، لە هەمان کاتدا تووشی بەربەرەکانی بوون لەگەڵ ئیخوانە کۆنەکاندا، تا ڕادەیەك وای کرد ئەم گەشەکردنە بە سستی بڕوات، بەڵام لەبەر بوونی خوێندکارێکی زۆری کەرکوك لە شارەکانی تری عێراقو کوردستان هۆکار بوو بۆ گەشەکردنی ئەم ڕێکخراوە لە نێو شاردا، لە هەمان کاتدا چاودێری حکومەتیش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ سستی بڵاوبوونەوەی لە شارەکەدا.

"لە دوای ساڵی (٢٠٠٣) لە دوای پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراق بە پێچەوانەی لقەکانی تری لە میسرو وڵاتانی تر لە عێراقیش بە شێوەیەکی ئاشکرا کەوتە چالاکی خۆیو بە ناوی ئاشکراوە بە تایبەتی لە (٢٠)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٣) دا ناوی خۆی ئاشکرا کردو لە یەکەم هەڵبژاردنیدا لە عێراق بۆ بەشداریکردنی لە دەزگاکانی بەڕێوەبردندا بۆ یەکەم جار کوردێکی شاری کەرکوك بە سەرۆکی حیزبەکە هەڵبژێردرا ئەویش (موحسن عەبدولحەمید) بوو کە کەسایەتییەکی ئیسلامی کوردی بوو، ماوەیەکیش ئەندام بوو لە ئەنجومەنی حوکمو پەرلەمانی عێراق"[٨٤].

*** لقی یانەی (اخوان الحریة):**

هەر وەکو نووسەری بەریتانی فریاستارك دەڵێ: "بیرۆکەی دروست کردنی ئەم یانەیە دەگەڕێتەوە بۆ عەدەن ئەویش لە نێوان کۆمەڵێك لە ئینگلیزەکانی ئەوێ، ئینجا کە ڕۆیشتە قاهیرە، هەست بەڕاکێشانی قوتابیانی کۆلێژی ئاداب بۆ

یانەکە کرا، تا وای لێهات کۆمەڵەی فراوان کرد".

لە کاتی هاتنی فریاستارك بۆ عێراق لە ساڵی (١٩٤١)دا دەست بەدروستکردنی کۆشکێکی گەورە لەدەوروبەری بەغدا کراو کاری کرد بۆ زیندوو کردنەوەی ئەم کۆمەڵەیە وەکو ئەوەی باوبووە لە قاهیرە.

هەر چەندە ستارك هەوڵی دەدا لاوانی عێراق وا تێبگەیەنێت کەئەمە کۆمەڵەیەکی دیموکراتییە نەك سیاسی بەڵام ئەوە زۆری نەخایاندو دەرکەوت لەبەرژەوەندی ئینگلیزەکاندایە.

ستارك دەڵێت: "لە ناخۆشترین ڕۆژەکانی شەڕی جیهانیدا ژمارەی ئەندامەکانی گەیشتە حەوت هەزار کەس، پاش ڕۆیشتن لە عێراق ئەندامی چالاکی تێدا هەبوو، لەوانە (عەبدولمەسیح)ی وەزیرو محەمەد عەلی بەغدادی کەدەورێکی گرنگیان بینی لە کاری وەرگێڕان و ئیشکردن لەکۆمەڵەکە بەبەردەوامی".

ستارك هەوڵی دەدا بە نێو هۆزەکاندا شۆڕبێتەوە تا لەدوورترین شوێن ئەندامان بۆ خۆی کۆبکاتەوە جگە لە هەوڵدان بۆ ناساندنی بیروباوەڕەکانی بەسەرۆك عەشیرەت و پیاوە گەورەکان.

کۆمەڵەی (اخوان الحرية) لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بڵاوبوونەوە ئەویش لە کاتی ڕۆیشتنی بۆ ئەم ناوچانە لە ساڵی (١٩٤٣)دا. ڕێژەیەکی زۆری گەورە کارمەندان و پیشەکارو گەورە پیاوانی پەیوەندییەکانی بەریتانیاو بنکەی ڕۆشنبیری بەریتانی دەوری گرنگیان بینی لە گەشەکردنی کۆمەڵەی (اخوان الحرية)دا.

هەر چەندە ڕێکخراوەکە پێشوازی لێکرا لەلایەن بەشێکی زۆری خەڵکەوە بەڵام لە هەمان کاتدا گەلێك لایەن دژی وەستان و بەکلکی ئینگلیزەکانیان دەزانی هەروەکو ئەوەی لە نەجەف ڕوویدا.

هەرچەندە کۆمەڵەی (اخوان الحرية) وایان ڕادەگەیاند کە گوایە سیاسی نییەو سەر بە بەریتانیا نییە، بەڵام لەکاتی ڕۆیشتنی سەفیری بەریتانیا لەعێراق ئەوەی ڕوون کردەوە بە پەیوەندی کۆمەڵەی (اخوان الحرية) لەگەڵ باڵیۆزخانەی بەریتانیادا هەیەو گەلێك کاری سیاسی نواندووە بۆ بەریتانیا، چونکە پێویستییان بەوە بووە کە لە چینەکانی کۆمەڵەی عێراق کۆببنەوە، بۆیە هیچ سەیر نییە کەهەر یەکە لە (نادی اخوان الحرية)و بنکەی ڕۆشنبیری بەریتانی دوو دەزگای گرنگ بوون بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری گشتی ئینگلیز لە بەغداو موسڵ و کەرکوك و بەسرەو هەوڵدان بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەر هەموو چینەکانی کۆمەڵ و یەکە کارگێڕییەکانی عێراق و شیکردنەوەیان لەبەرژەوەندی خۆیان.

دەربارەی چالاکییەکانی کۆمەڵەی (اخوان الحرية) لە کەرکوك، ڕۆژنامەی (کەرکوك) بەم جۆرە وەسفی چالاکییەکانی (اخوان الحرية) دەکات: ئەویش ئەوەیە کە دەستەی دامەزرێنەری (اخوان الحرية) لە کەرکوك بەسەرۆکایەتی (ئیبراهیم ئیسماعیل ئال جەمیل)ی بەڕێوەبەری پەروەردەی ناوچەی سەرووی ڕۆژهەڵات، کۆبوونەوەو بڕیاردراوە کە مەکی سدقی شەربەتی موتەسەڕیفی کەرکوك، ئەندامێکی شەرەفی ئەم کۆمەڵەیە بێت و موتەسەڕیف داواکەیانی قبوڵ کردووە، بەهۆی ساڵێك بەسەر دامەزراندنی دەستەی دامەزرێنەری (اخوان الحرية)، بۆیە کۆبوونەوە لە ڕۆژی (١١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٣) کراوەو، هەڵبژاردن بەشێوەیەکی نهێنی کراو ئیبراهیم ئیسماعیل ئال جەمیل بە سەرۆکی لقی کەرکوك هەڵبژێردرا.

بە پێی ئەو ئامارانەی لەبەردەستدان ئەندامانی لقەکانی (اخوان الحرية) لەپارێزگاکاندا بەم جۆرە بووە:

تا ناوەڕاستی شوباتی ساڵی (١٩٤٣)، بەغدا ٤٤٦ کەس، کەرکوك ٢٦٠ کەس، دیالە ٢٤٠ کەس، موسڵ ١٩١ کەس، کەربەلا ١٨٠ کەس، سەماوە ١٤٨ کەس، دیوانیە ١٤٢ کەس، حیلە ١٠٠ کەس، هەولێر ٩٠ کەس، سلێمانی ٦٨ کەس، کوت ٤٠ کەس، دلێم ٨ کەس.

بەپێی نووسراوی موتەسەڕیفی بەغدا کەنێردراوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کەکۆمەڵەی (اخوان الحرية) بە مێژووی (٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٤٥) داخراوەو هەموو کەرەستەکانی ئەم یانەیە بووەتە مولکی باڵیۆزخانەی بەریتانیا، بەڵام لە دوایدا جارێکیتر یانەکە بەناوی (المرأة العراقية) کراوەتەوە[٨٥].

*** لقی کۆمەڵەی زەردەواڵە:**

مامۆستای هێژا (کەمال مەزهەر) ئاوا باسی ئەم کۆمەڵەیە دەکات:

".. وەزارەتی ناوخۆی عێراق وا دەست پێدەکات کە گوایە تۆفیق قەزاز هەستاوە بەدامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نهێنی لە ساڵی (١٩٤٥) بەناوی کۆمەڵەی زەردەواڵە، وا دیارە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە ویستویانە وەك زەردەواڵە بەو کەسانەوە بدەن کە سەر بەمیری بوون، .. وەك بەڵگەنامەکان دەڵێن پەخشەیەکی تایبەتیشیان هەر بەناوی زەردەواڵەوە هەبووەو ژمارەکانیان بەنهێنی بەناو شاردا بڵاوکردووەتەوەو گەیاندویانەتە هەڵەبجەش، فایەقی کوڕە گەورەی تۆفیق قەزازو عەلی پیاوی بە ئەمەك و دڵسۆز ئەرکی بڵاوکردنەوەی پەخشەکەیان کەوتۆتە ئەستۆ. بەڵگەنامەکان ناوی ئەندامانی کۆمەڵەی زەردەواڵەی بۆ تۆمارنەکردووین، بەڵام چەند جارێك باسی کۆبوونەوەی یەك لە سەرییەکی تۆفیق قەزازو شێخ قادری برای شێخ مەحموودو ئەحمەد تەقی و حەمەی ئەوڕەحمان ئاغاو کوێخا ئەمینی جافەتی و مەلا تایەری خوردەلۆکی بۆ کردووین. بۆ نموونە جارێك لەو جارانە لەسەرچنار کۆبوونەتەوەو بۆ ڕۆژی داهاتوو، شێخ قادرو حەمە ئاغاو ئەحمەد تەقی بە تایبەتی چوونە بۆ کەرکوك، وا دیارە ڕابەرانی کۆمەڵە لەهەموان زۆرتر بایەخیان بە بەگزادەی جاف داوەو ویستویانە دژی میری هانیان بدەن. لەوەیش سەیرتر ئەوەیە کە بەپێی گێڕانەوەی بەڵگەنامەکە کۆمەڵەی زەردەواڵە پەیوەندی بەو کوردانەی بەغداوە هەبووە کە بە ئاژاوەچی و گێرە شێوێن ناویان دەبات[٨٦]. بەڵام دەتوانین ئەم سەرنجانە بدەین:

– کۆمەڵەی زەردەواڵە لە ماوەیەکی کەمدا سەری هەڵدا، کە ناتوانرێت زۆر بەچڕی چالاکییەکانی دیاری بکرێت. بۆیە شتێکی ئەوتۆ لە چالاکییەکانی بەرچاو ناکەوێت.

- بڵاوبوونەوەی کۆمەڵەی زەردەواڵە لە ناوچەی کەرکوکدا زۆر کەم بووە، ئەوەی کە بیستراوە زیاتر لە ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوك بڵاوبۆتەوە وەکو لەناو شاری کەرکوکدا، وەك لە ناوچەکانی کفری و کەلارو هەڵەبجەو خورماتوودا.
- دەست و بردی کاربەدەستان بۆ لەناودانی کۆمەڵەکە وایکرد کە کۆمەڵەکە نەتوانێت پەلوپۆی زیاتر بهاوێت و بیروباوەڕەکانی ئاشکرا بێت.
- نادیاریی بیرو باوەڕەکانی کۆمەڵەی زەردەواڵە، ئەویش بەوەی خاوەنی بەرنامەیەکی دیاری کراو نەبووە، جگە لەدەستکەوتنی پەخشنامەکەیان زەردەواڵە تابزانین تا چ رادەیەك بیرو باوەڕەکانیان لەگەڵ قۆناغە سیاسیەکەدا گونجاو بووە.

*** لقی کۆمەڵەی رزگاری کورد:**

ئەم کۆمەڵەیە لەساڵی (١٩٤٥) لە حیزبی شیوعی کوردو هەندێك لە ئەندامانی حیزبی هیواو بێلایەن دروست بوو، دامەزرێنەرانی ئەم حیزبە پێکهاتبوون لە:

ساڵح حەیدەری و نافع یونس و نوری شاوەیس و جەعفەر حەمە کەریم و ڕەشید باجەلان و تەها محێدین و عەلی حەمید. کە لقی هەبوو لە زۆربەری پارێزگاکانی کوردستاندا[٨٧].

بەپێی چەند بەلگەنامەیەکی سەردەمی پاشایەتی، ناوچەی کفری و کەرکوك شوێنێکی گرنگی بڵاوکردنەوەی ئەم حیزبە بوون.

بەرێوەبەری گشتی پۆلیسی لیوای کەرکوك دووجار ئەفسەری پۆلیسی شاری کفری لەوە ئاگادارکردەوە کە کۆمەڵەی رزگاری گەیشتۆتە کفری و دەوروبەری و داوای لێدەکات بەپەرۆشەوە بکەونە سۆراخی ئەو باسە، کە یەکەمیان رۆژی هەشت و دووەمیان ڕۆژی چواردەی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٦) بوو.

بەپێی پوختەی زانیارییە زۆرەکانی ناو ئەو بەلگەنامانە حاجی عەلی حاجی محەمەد سەلیم ئاغای موختاری گەڕەکی سادەی ناوشار سەرۆکی لقی پارتی رزگاری بوو لە ناوچەی کفری، ئەندامە چالاکەکانی ناو شاریش بریتی بوون لە محێدین حاجی مستەفا بەزاز کە بەرپرسیاری بڵاوکردنەوەی پەخشنامەکانی حیزب بوو، سابیری حاجی فەتحوڵڵای بەزاز کە بەرپرسیاری کاروباری دارایی لق بوو حەسەنی وەستا ئەحمەدی بەزازو حەسەنی حاجی سەمین کە پێکرا بەرپرسیاری کاروباری پروپاگەندەو راگەیاندن بوون و حوسێنی وەستا ئەحمەدی بەزازو فەقێ محەمەدی سەعاتچی و حاجی فەتاحی حاجی ئەمینی بەزازو سەعید حەمەڕەش بەزازو ئەحمەد ڕەشیدی بەقاڵ و سەعیدی بەرگدرووو حەسەنی حاجی ئەمینی بەزازو محێدین حاجی محەمەد سەلیم ئاغای برای سەرۆکی لق و شێخ نەجیبی کوڕی شێخ عەلی تاڵەبانی کە ئەوساکە لە کفری فەرمانبەر بووە.

لەدەرەوەی شاریش ئەم ئەندامانە چالاك بوون:

لە زەرداو شێخ عەتاو شێخ موکەڕەمی کوڕانی شێخ جەمالی تاڵەبانی، لە گوندی قەرەبولاغ شێخ نەجیب و شێخ نازی کوڕانی شێخ وەهابی تاڵەبانی، لە گوندی دوازدە ئیمام عەزیز عەبدولڕەحمان، لە کەلار مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی (مستەفا سەید ئەحمەد-مستەفا نەریمان) کە بەرپرسیار بووە، لە سلێمان بەگیش مامۆستا ئەحمەد محەمەد قەرەداغی و ناوی کوڕانی وەستا ئەحمەدی بەزازیش محەمەدو حەسەن و حوسەین هاتووە.

جگە لە ناوشار لقی کفری چوار ڕێکخراوی تری هەبووە لە شۆرتەپەو شیرین تەپەو بانەبۆرو کەڵەشێرتەپە کە کەوتونەتە نێوان قەرەبولاغ و کەلارەوە. هەر یەك لەم چوار ڕێکخراوە بەرپرسیاری خۆی هەبووە ئەمانیش لەبەرێوەبردنی لقدا رۆڵی خۆیان هەبووە[٨٨].

*** لقی ڕێکخراوی هاجانا - هاگانا:**

هەر چەندە ڕێکخراوی هاجانا چالاکی لەساڵی (١٩٤٢)دا بەرەو نەمان دەڕۆیی، بەڵام دامەزرێنەریان دەگەیشتە ٦ کەس کەدوانیان توانیان ٢٠ لاو مەشق پێ بکەن لەسەر بەکارهێنانی چەك. چالاکی ڕێکخراوەکە بەتەواوەتی لە ساڵی (١٩٤٣)دا وەستا کاتێك حکومەت دەستی گرت بەسەر ژمارەیەك لە کۆچەرەوەکان کەبەشێویەکی ناشەرعی دەیانویست دەرچن، ئەوەش وای کرد بزووتنەوەکە لە چالاکی بوەستێت، لە ساڵی ١٩٤٥ توانی جارێکی تر بکەوێتەوە جووڵەو چالاکی نواندن و لە ساڵی (١٩٤٦)دا لەکەرکوك لقی کرایەوە، لەبەرئەوەی ئەمجارەیان لقیان تەنها لە کەرکوك و بەسرە کرایەوە، چونکە ئەو هێزە چالاکەی نەبوو کە لەهەموو پارێزگاکاندا لق بکاتەوە، لەبەر ئەوە چالاکی لقەکانی (کەرکوك و بەسرە)یش وەستابوو لەسەر ئەو ئەندامە ناوخۆییانەی سەهیۆنییە ناوخۆییەکان، بەڵام کاری ئەم ڕێکخراوە کۆتای پێهات پاش تەواوبوونی زۆری کۆچی جولەکەکان لە ساڵانی ١٩٥٠-١٩٥١، لە سەرەتای ساڵی (١٩٥١)دا شالام ساڵح گیرا کە لە چالاکترین ئەندامەکانی ڕێکخراوی هاجانا بوو، دەستی هەبوو لە هەڵگرتنی چەك لە کنس، جگە لە دەست هەبوون لەهاویشتنی نارنجۆك بۆ ناو بازاڕی گشتی جولەکەکان بۆ ترساندنیان[٨٩].

بێجگە لەو دوو ڕێکخراوەیەی کەباسمانکرد، ڕێکخراوی تر هەبوون، وەکو کۆمەڵەی هشورای چەکدارو کۆمەڵەی (تنوی) بەڵام زانیاریمان دەربارەیان نییەو لە ناوچەی کەرکوك گوایە لقیان هەبووە، بەڵام بەهۆی ئەو ژمارە زۆرەی جولەکەکان لە ناوچەی کەرکوك وای کردبوو کە ڕەگی چالاکی سەهیۆنی خۆی بخاتە ناویانەوەو جوڵانەوەی خۆی تێدا دروست بکات.

ئەگەر سەیری ڕووداوەکان بکەین دەبینین ڕووداوێکی خوێناوی ڕووی نەدا تا بێتە هۆی زەرەروزیان بە جولەکەو خەڵکی کەرکوك، ئەمیش تەنها لەو چوارچێوەیەدا سەری هەڵدا کەتەنها مەبەستیان کۆچکردن بێت بەرەو فەلەستین.

*** لقی پارتی دیموکراتی کوردستان:**

کاتێك خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزان وەزعە ئاڵۆزە داپۆشراوە سیاسییەکەی کوردستانی ئێرانی هاتە بەرچاو

زۆر بەپێویستی زانی، کە ئەمیش هەوڵی ئەوە بدات حیزبێکی سیاسی کوردی لەکوردستانی عێراق دروست بکات. بۆیە داوای لە هەمزە عەبدوڵڵا کرد کە بچێتە عێراق و هەوڵ بدات بۆ پێکهێنانی حیزبێکی کوردی، خۆشی چەند نامەیەکی پێدا نارد بۆ پیاوە ناسراوو نیشتمان پەروەرەکانی کوردستان بۆ هاوکاریکردن. لە (١٦)ی ئابی ساڵی (١٩٤٦) دا حیزبێکی سیاسی بەناوی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق پێکهات[٩٠].

لەو ساڵەدا یەکەم کۆبوونەوەی دامەزرێنەری بەست کە ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی حیزبی شۆڕش و ڕزگاری کورد تیادا بەشدارییان کرد، دوای لکاندنیان بەپارتییەوە[٩١].

لە کۆتایی ساڵی (١٩٤٦)دا هەمزە عەبدوڵڵا پەیوەندی بە ساڵح حەیدەری و عەلی عەبدوڵڵا لە حیزبی شۆڕش و ئیبراهیم ئەحمەد لە (ژ. ک.)و جەعفەر محەمەدو ڕەشید باجەلان لە حیزبی ڕزگاری کورد کرد بۆ هاتنە ناو پارتییەوە[٩٢].

لە (٢٦)ی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٥٣)دا حیزب کۆبوونەوەیەکی لەشاری کەرکوک کرد, کە بەکۆبوونەوەی سێیەم بەناوبانگە، ئەویش بۆ مەسەلەی یاخیبوون و سەرهەڵدانی جیاوازی و دروستبوونی باڵی جیاواز تێیدا. کە کۆبوونەوەی کەرکوک بڕیاری دەرکردنی هەمزە عەبدوڵڵای داو ناوەکەی کرا بە حیزبی دیموکراتی کوردستان- عێراق..و ئیبراهیم ئەحمەد بوو بەسکرتێری دەستەی دامەزرێنەر.. [٩٣]. جیابوونەوەکان، لە ناوچەکانی کەرکوکەوە سەری هەڵدەداو دەوری گرنگیان لەبڕیاری ڕووداوەکاندا دەبینی.

لە سەرەتای کۆمارییەوە پارتی دیموکراتی کوردستان لەکوردستان پەرەی سەندو ڕۆژنامەی (خەبات)ی لەبەغدا دەردەکرد،و کەوتە چالاکی کردن لەشاری کەرکوک شان بەشانی حیزبەکانی تری ناوشاری کەرکوک[٩٤].

سیاسەتی پارتی لەناو شاری کەرکوک لەو ڕۆژانەدا هاوکاری کردن بوو لەگەڵ شیوعی و دیموکراتییەکان بەرامبەر کۆنەپەرست و ئیستعمار[٩٥].

لە کارەساتەکەی ساڵی (١٩٥٩)دا لەشاری کەرکوک پارتی ئەو دەورەی نەگێڕا کەوا بتوانێت کارەساتەکە بەسەر کوردی بێ تاواندا نەشکێتەوە، چونکە تەنها دەیویست بەپەیوەندی و بێ لایەنی کارەساتەکە چارەسەر بکات، بێ ئەوەی ڕاستەوخۆ دەستی خۆی درێژ بکات تا کار گەیشتە ئەوەی شۆڤینیەکان تێزابیشیان بەکار دەهێنا بۆ دەمو چاوی مرۆڤی کورد لە گەڕەکەکانی شۆڕیجەو ئیمام قاسم, ئینجا پارتی داوای لەو کوردانە کرد ئاگادار بن بەتایبەتی ئەوانەی لەناو گەڕەک و بازاڕی تورکمانەکاندا ئەژین ئاگاداربن و لەو ناوچەیە دوور بکەونەوە[٩٦]، بەمەش تورکمانەکان وایانکرد، کەکوردێکی زۆریان لە ناوچەی نیشتەجێی تورکمانەکان چ بەکوشتن و برین و ترساندن، دەربکەن.

بەڵام لە دوایدا لەناو پارتیدا دەستێکی سوور پەیدا بوو بۆ تۆڵە سەندنەوە، لیژنەی ناوچە بەزۆربەی دەنگ لەگەڵ ئەم ڕایەدا نەبوون، تازە جڵەو کەوتبووە دەست جەماوەری سەر بەپارتی، ئەو کەسانە لەپێشدا هەندێ لەناودارەکانی تورکمانەکانیان لە مەترسی ئەم پیاو کوشتنە ئاگادارکرد، بەڵام سوودی نەبوو، لەلای ئەوانیش کار بەدەست پیاوە عاقڵەکانیانەوە نەمابوو. پاش ئەوەی چەند کەسێکیان کوژرا، تورکمانەکان وازیان لەم پیاو کوشتنە هێناو بۆیان دەرکەوت، کە کوردەکان تۆڵەی خۆیان دەست بەجێ دەکەنەوە.

لەوانەی کە لەگەڵ تۆڵە سەندنەوە بوون لەناو پارتی جەلال عەبدولڕەحمان، عەبدولڕەحمان کەریم بوون، کەڕێبازی تۆڵەسەندن و کوشتن بەرامبەر تۆڵەسەندن و کوشتن بوون[٩٧].

*** کۆمەڵەی چاکە ( جمعية الاحسان ) لە کەرکوک:**

لە ساڵی (١٩٤٨)دا دروست کراوەو، ئامانجی خزمەتکردنی کڵێسە بوو لەهەموو لایەنەکانەوە، بەتایبەتی لەلایەنی ئابوورییەوە. هەروەها سازدانی ئاهەنگی کۆمەڵایەتی بەقازانجی سەندوقی کڵێسە بۆ یارمەتی لێقەوماوان.

دەستەی کارگێڕی ئەم کۆمەڵەیە وەکو (مجلس المللي) وایە، ئەم کۆمەڵەیە ماوەیەك وەستاو لە ساڵی (١٩٥٥) دووبارە ژیایەوەو تاکو ئێستا بەردەوامە بۆ خزمەتی کڵێسە..[٩٨].

*** لقێکی بچووکی حیزبی شیوعی عێراق:**

ئەمە بریتی بووە لەدەستەی کوردی حیزبی شیوعی عێراقی کە (مەلا شەریف ئەربیلی) بەڕێوەی دەبردو ڕۆژنامەیەکی بەناوی (ئازادی-الحرية) بەزمانی کوردی دەرکرد، بەڵام ئەم لقە زۆر بێ هێز بووەو بریتی بووە لە کۆمەڵەی بچووك.. بچووك لەچەند شارێکدا وەکو سلێمانی و هەولێرو کەرکوك[٩٩].

*** کۆمەڵی ئازادی برایەتی کفری:**

لەلایەن ئەمین ڕەواندوزی و ئیبراهیم ئەدهەم و ڕەئووف جەلالی و شێخ جەمالی تاڵەبانی ئەم ڕێکخراوەیان لە کفری دامەزراند. ئەم زاتانە بوونە ئەندامیان حەمە جاف، شێخ جەمال تاڵەبانی، موفتی سەعید ئەفەندی، وەستا سالمی خەیات، تۆفیق ئاغای گەلاڵی، مەلا محێدین زەلزەلە[١٠٠].

*** لقی (اخوية المحبة ) لە کەرکوك:**

ئەم کۆمەڵەیە، کۆمەڵەیەکی جیهانییە، بنکە سەرەکییەکەی لە ڕۆمایە، کە لە هەوڵی ئەوەیە بە شێوەیەکی گشتی لەخزمەتی جیهانی ئاینی مەسیحیدا بێت، لقی ئەم کۆمەڵەیە لە کەرکوك لە نزیك کڵێسەی مەریەمانەیە.

*** لقی حیزبی نەتەوەیی دیموکراتی:**

وەکو لقێك بارەگایان لەپەنجاکاندا لەشاری کەرکوك هەبووە، بەڵام تەنها چەند کەسێکیان لەگەڵدا هەبووەو هیچی تر حیزبی وەتەنی دیموکراتیش وەك بیروباوەڕێك چەند کەسێکیان لەگەڵدا بووەو ڕۆژنامەیەکیان بەکوردی دەرئەکرد کە خوالێخۆشبوو سدیق بلوکێنی بەسەرەوە بوو[١٠١].

سدیق بلوکێنی لەدوایدا لەلایەن دەستێکەوە لەناو شاری

کەرکوکدا کوژراو نەزانرا ئەو دەستە کێ بوو. ئەو ڕۆژنامەیەی کە دەریان دەکرد ناوی (رای گەل) بوو کە سێ ساڵ زیاتری خایاند لە(٦)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٩)وە خاوەنەکەی سدیق بلوکێنی بوو، لێپرسراوی ڕۆژنامەکە پارێزەر سدیق عەبدوڵڵا بوو، بەڵام ژمارەی کەمی لێدەرچوو[١٠٢].

*** ناوەندی ڕۆشنبیری ئەمریکی لە کەرکوك:**

ئەم ناوەندە وەك پەیمانگایەکی ڕۆشنبیری وا بوو کە بایەخی تایبەتی دەدا بە ڕۆشنبیری گشتی و ڕۆشنبیری تایبەتی شارەکە، لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا چالاکی بەرچاوی هەبووە لە شاری کەرکوکدا.

شوێنی ئەم ناوەندە لە شەقامی مەجیدیە بووە لە بازاڕی عەسری لە تەنیشت بەڕێوەبەرایەتی پۆستەو گەیاندنی ئێستا، شوێنێکی دیاریکراوی هەبووە کە خەڵکی دەیتوانی لە هەموو کاتێکدا سەردانی بکات.

لە ماوەی بوونی وەکو دەزگایەکی ڕۆشنبیری چالاکی جۆراوجۆری کردووە، بۆ نموونە گۆڤارێکیان هەبوو بە ناوی (پەیام) کە هەمان گۆڤار بە زمانی عەرەبیش دەردەچوو لە بەغدا بە ناونیشانی (اخبار الولايات المتحدة الامريكية)، هەروەها چالاکی کردنەوەی پێشانگای شێوەکاری لە کەرکوك و هەولێر لە پاڵ کردنەوەی پێشانگای ڕۆشنبیری گشتی و پێشانگای پیشەسازی و کشتوکاڵی، بۆ نموونە لە یەکێ لە پێشانگاکانیاندا دەربارەی (الذرة من اجل السلام) لە ساڵی (١٩٥٦) لە گەڕەکی (قەسابخانە) کردوویەتەوە، لە هەمان ساڵدا پێشانگایەکی پیشەسازی و کشتوکاڵییان کردووەتەوە بۆ ئەو کەرەستە پیشەسازی و بەرهەمە کشتوکاڵییانە کە لە کەرکوکدا باوی هەبووەو بەرهەمی هێناوە.

هەندێك سەرچاوە ئاماژە بە بوونی تیپێکی وەرزیش دەکەن بە ناوی (تیپی پەیمانگای ڕۆشنبیری ئەمریکی) لە کەرکوك کە گەلێك چالاکی وەرزشی کردووە[١٠٣].

*** لایەنگرانی حیزبی (الامة الاشتراكي):**

لە ماوەی ژیانی سیاسی عێراقدا گەلێك کۆمەڵ و ڕێکخراوی جۆربەجۆر سەریان هەڵدا، یەکێك لەوانە حیزبی (الامة)و حیزبی (الامة الاشتراكي) بوو، ئەوەی یەکەمیان لە ساڵی (١٩٢١) بوو، ئەوەی دووەمیشیان لە ساڵی (١٩٥١) دامەرزا. ئەوەی لێرەدا گرنگە بیڵێن کە حیزب (الامة الاشتراكي) یەکێك بوو لەو حیزبانەی کە پەلوپۆی لە بەشێکی زۆری عێراقدا بڵاوبووەوەو تا ماوەیەکی چاك چالاکی خۆیان بڵاوکردبووەوەو چینێك و توێژێکی زۆر بەشدارییان تێدا کردبوو.

"لە ڕۆژی (٢٠)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٥١) داواکارییەك بۆ وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی عێراق بەرزکرایەوە لەلایەن (ساڵح جەبر، سەیید عەبدولمەهدی ئەلمونتەفکی، عەبدولکازم ئەلشەمخانی، جەواد جەعفەر، عەبدولڕەزاق ئەلئەزری، دکتۆر حەنا خەیات، ئەحمەد ئەلجەلیلی، عیزەددین ئەلنەقیب (کەسایەتی لە مەندەلی)، (محەمەد ئەلنەقیب) کەسایەتی لە هەولێر، نەزیف ئەلشاوی، شێخ حەبیب تاڵەبانی (کەرکوك))، بە مەبەستی دامەزرانی حیزبێکی سیاسی بەناوی حیزبی نەتەوەی سۆسیالستی"[١٠٤].

"ئەم حیزبە زۆربەی سەرکردەکانی پێکهاتبوو لە دەرەبەگ و پیاوە دەسترۆیشتووەکانی کە تایبەت بوو بە بەرژەوەندییەکانی داگیرکاری ئینگلیز، لەبەر ئەوەی داگیرکەر بە هاوکاری لەگەڵ کۆشکی پاشایەتی ئەم حیزبەی دروست کرد تا بۆ ئەوەی ببێتە هێزێکی سیاسی سێیەم لە دوای کۆشکی پاشایەتی و نوری سەعید، لەوەدا خۆی دەبینییەوە تا بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی جێبەجێ بکات لە پێناو ئەوەی دەسەڵاتی نوری سەعید کەم بکاتەوە"[١٠٥].

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت کە کەرکوك یەکێك بووە لەو شارانەی کە ئەندام و لایەنگریان هەبووە لە نێو ئەم حیزبەداو بە تایبەتی لە بنەماڵەی تاڵەبانییەکانی کەرکوك، بۆیە لە یاداشتەکانی (پیرۆت تاڵەبانی)دا بەم جۆرە باسی لێوە دەکات:

"ساڵی (١٩٥١-١٩٥٢) ساڵح جەبر بۆ پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن سەردانی کەرکوك دەکات ودەبێتە میوانی شێخ حەبیب تاڵەبانی، ساڵح جەبر سەرۆکی حیزبی (ئومە) بوو، لە کەرکوکیش شێخ حەبیب نوێنەریان بوو، حیزبی (ئومە)ی ساڵح جەبر وحیزبی (دەستوری) نوری سەعید، ڕکابەری سەرسەختی یەکتر بوون.

شێخ حەبیب شێخ عەلی شێخ عەبدولڕەحمان خالیس، کەسایەتییەکی سیاسی وکۆمەڵایەتی ومیحوەری کەرکوك بوو، ئەندامی ئەنجوومەنی دامەزراندن (مجلیسی تاسیسی) عێراق بوو، لە زۆربەی هەرە زۆری خولەکانی پەرلەمانی عێراق وەك نوێنەری کەرکوك ئەندام پەرلەمانی عێراق بووە، هەر چەندە نوێنەری ساڵح جەبر بووە، نوری سەعیدیش دۆست ونزیکی بووە.

لە سەردانەکەی ساڵح جەبر بۆ کەرکوك، شێخ حەبیب بۆ ساڵح جەبرو وەفدە هاوڕێکەی (١٠٠) سەر حەیوان دەکاتە چێشت و خواردن و زیاتر لە (٧٠٠) کەس نان دەخۆن، دیوەخانەکەی شێخ حەبیب بەتەنیشت ماڵی شێخ پیرۆت وتەکییەی تاڵەبانییەوە بوو، بنەماڵە گەورە وناودارەکانی کەرکوك نموونەی (بنەماڵەی سەید ئەحمەد خانەقا، هورمزییەکان، یەعقوبییەکان، نەوتچییەکان، گاورەکانی قەڵا، لە هونەرمەندان سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی) هەموو ئەمانە بە میوانی دەهاتنە دیوەخانەکەی شێخ حەبیب بۆ پرسەگرنگەکان پرسیان بە شێخ حەبیب دەکرد"[١٠٦].

هەروەها لە یاداشتەکانی دکتۆر (نوری تاڵەبانی)یشدا بەم جۆرە باسی لێوە دەکات:

" لە ساڵی (١٩٥٣) ساڵح جەبر حیزبێکی تازەی دروستکردبوو، کۆمەڵێك پیاو ماقوڵانی کوردی لەگەڵ بوو، وەك: تۆفیق وەهبی بەگ و شێخ حەبیب تاڵەبانی و شێخ بابا عەلی کە زاوای شێخ حەبیب بوو.

لە پایزی ئەو ساڵە لەگەڵ کۆمەڵە کەسایەتییەکی عەرەب و کورد دێنە کەرکوك و لە ماڵی شێخ حەبیب میوان دەبەن، ڕۆژی دواتی ساڵح جەبر دەیەوێت سەردانی باوکم لە تەکیە

بکات کە هەر سەد مەترێك لە ماڵی شێخ حەبیبی مامەوە دوورە، باوکم عوزر دەخوازێتو ڕێگە نادات سەردانی بکات"[١٠٧].

"وەك زۆرێك لە پارتو ڕێکخراوەکانی تری سەر گۆڕەپانی سیاسی عێراق، هەر زوو پارتی نەتەوە دووچاری لە یەکترازان بوو، کاتێك (تۆفیق وەهبی) وەك جێگری سەرۆکی پارتەکە لە (١٨)ی ئابی ساڵی (١٩٥٤) بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوەو تێیدا هەڵوەشاندنەوەی حیزبەکەی ڕاگەیاند، ئەم ڕووداوەش وای کرد سەرکردایەتی حیزبەکە لە (٢٠)ی ئابی هەمان ساڵ بە پەلە کۆببنەوەو تێیدا بڕیاری دەرکردنی (تۆفیق وەهبی)و هاوڕێیەکانی لە حیزبەکە دەربکەن، ئەم بارەش یەکێتی ڕیزی حیزبەکەی لەتکردو دەرئەنجام پارتەکە نەیتوانی لەمە زیاتر لەسەر پێی خۆی بوەستێت"[١٠٨].

ئەوەی سەرنج دەدرێت لەم حیزبە لە شاری کەرکوك گرنگییەکی ئەوتۆی نەبووەو لەلایەن خەڵکییەوە بە چاوێکی ڕێزەوە سەیر نەکراوە، تەنانەت لە نێو خودی تاڵەبانییەکانەوە گرنگی نەبووە.

*** ڕێکخراوی (أنصار السلام):**

بریتی بووە لە ڕێکخراوێکی سەربە حیزبی شیوعی عێراق، کە لە ساڵی (١٩٤٩)دا دامەزراوە لە بەغدا، لە دوایدا لقی ئەم ڕێکخراوە لە موسڵ وکەرکوك وسلێمانیش کرایەوە، کە لە ساڵی (١٩٥٢) لە کەرکوك کرایەوە ولە سلێمانی لە نێوان ساڵانی (١٩٥١-١٩٥٢) کرایەوە.

ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە بریتی بووە لە:

بایەخ دان بەوەی کە شەڕ نەبێت لە جیهانداو دژی شەڕی ئەتۆمیش بوون لە نێوان ئەمریکا ویەکێتی سوڤێت ودژی لێدانی کۆریای سەروو بوون وئیمزایەکی زۆریان کۆکردەوە لە سەرئەو شەڕە هەوڵدان بۆ بەشداری کردن لە کۆنگرە جیهانییەکان کە بۆ ئاشتی دەبەسترێت، بایەخ دان بە پێکەوە ژیانی نەتەوەکان لە بۆنەیەکی ئاشتییانە ئەم ڕێکخراوە لە شاری کەرکوکدا گەلێك ئەندامی حیزبی شیوعی غەیرە شیوعی لە خۆی کۆکردبووەوە، هەروەها هەوڵی دەدا بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە ڕێگە چارەی ئاشتیانە.

ئەوانەی دەوریان هەبوو لەم ڕێکخراوە لە کەرکوکدا بریتی بوون لە مەجید کاکەی حاجی مەحموود، عەبدوڵڵا ناوێك، نوری فەقێ، سلێمان نامێق خەڵکی هەولێر بوو، حەمە ساڵح بەگ ساڵەیی، سەعید عەباس، عەلی شوکر، شێخ فاتح شێخ جەلال تاڵەبانی.

لەکاتی ڕووداوەکانی شوان و ڕووداوەکانی (١٩٥٩)ی شاری کەرکوکدا دەورێکی گەورەیان بینیوو بانگەوازی خۆیان دەربڕیووە دەربارەی ڕووداوەکان.

بانگەوازی (انصار السلام) لە کەرکوك:

"ایها المواطنون الشرفاء یا ابناء شعب ثورة ١٤ تموز المجیدة، حین نوجه الیکم نداءنا في هذا الیوم التأریخي الاغر نشعر بانه علینا انطلاقاً من شعارنا (السلم وصیانة الجمهوریة) وحفظا لکثیر من الدماء والدموع ان نواجه الکثیر من الحقائق والوقائع والاحداث التي تجري امامنا واننا بذلك ولا شك ندرك موضع اقدامنا ونتعرف على السبل الصحیحة المؤدیة الى صیانة السلم والجمهوریة، علینا وقبل کل شيء ان نعرف معنى صیانة السلم والجمهوریة وان ذلك یحتم علینا ربط مفهوم السلم بمفهوم الجمهوریة ربطا مستمدا من الواقع. فصیانة السلم لا تعني مجردا عنه اذ صیانة بهذا المعنى تعني کذلك العمل للقضاء على الاستعمار والفاشیة ومن مظاهرها کبت الحریات والاستعمار. واضح ان الحرب هي جزء متمم بل حتمیة تأریخیة لوجود الاستعمار والفاشیة، لهذا یتعین علینا فضح الوقائع والاحداث والوسائل العاملة لعبودیة مستمرة لعودة الاستغلال والاستعمار وبالتالي الحرب.

ان الواجب یلزمنا بان نعمل بکل دقة واخلاص وصدق وجراءة لصیانة مکتسبات جمهوریتنا الدیمقراطیة المنبعثة عن ثورة ١٤ تموز المجیدة التي نحتفل بها جمیعا بمناسبة الذکرى الاولى لمولدها. وهکذا نجد بان هذا الواجب نفسه یدعونا ایظا الى ان نعلن ان هذه المکتسبات هي الیوم في خطر، اذ بدء الرجعیون (الاذناب) ینشطون ویتحرکون بل انهم خطوا خطوات واسعة بعد ان افرج عن المبعدین والمعتقلین منهم وتمکنوا من العودة الى محلات اقامتهم، کما وان الاقطاع بدء یرفع راسه من جدید وشرع یرتکب جرائم القتل المشهودة في انحاء مختلفة من البلاد وبدا یحاول الاجتماع وبالتعاون لاعادة نفوذه وسیطرته واستغلاله هذا وانهم بالتعاون مع القوى الاستعماریة المعروفة یسعون حثیثا لقلب الکثیر من المفاهیم الواضحة وتشویه الکثیر من الحقائق الناصعة وذلك بقصد تشویه سمعة المنظمات الوطنیة وضربها والتي هي في الحقیقة بذاتها مکسب عظیم من المکاسب الوطنیة والتقول علیها واظهار الوطنیین بمظهر المندسین وباعثي الفوضى والهدم وهم باعمالهم هذه انما یعملون على خلق الاخطار لتحدق بجمهوریتنا وتقضي علیها وتجسیم هذه الاخطار واقناع السذج والبسطاء، ولم یکتفوا بذلك وانما لازالوا مستمرین في محاولاتهم الخبیثة لضرب العناصر الوطنیة، تلك العناصر المخلصة عیون ساهرة یقظة منذ اثني عشر شهرا لحراسة الجمهوریة وصیانة مکاسبها الدیمقراطیة.

ان الاستمرار على هذا السلوك المعادي للنهج الدیمقراطي لجمهوریتنا او السکوت عنه وعدم فضحه یدعونا الى المزید من الیقظة والحذر والعمل للحیلولة دون عودة الاستغلال والاضطهاد ومع اوسع الجماهیر الشعبیة من ممارسة حقها في الحریة مما یعرض السلم والجمهوریة لاخطار لا یمکن صدها.

لهذا قدمنا لکم یا ابناء ثورة تموز هذه الحقائق عاریة سافرة فلنکن حذرین یقظین وعلینا رصد ما یدور حولنا من نشاطات مریبة والعمل في نطاق میثاق جبهة الاتحاد الوطني وتحت رایتها الخفاقة للوقوف امام هذه المحاولات والاتجاهات الخطرة بحزم وقبر کل مؤامرة في مهدها وبذلك نحقق شعارنا (السلم وصیانة الجمهوریة)، ونحن على ثقة کبیرة، ومؤمنون وواثقون کل الثقة من انکم لن تسمحوا ابدا بعودة الرجعیة والاقطاع وسوف تقضون على خطتهم قضاء مبرما کما فعلتم في مثل هذا الیوم منذ عام مضى، وبذلك لن یعود الاستغلال ولن تعود الفاشیة ولن یعود الاستعمار الى هذا الوطن العزیز وبذلك تصونون جمهوریتکم الدیمقراطیة والسلام علیکم.

عاشت جمهوريتنا حرة ديمقراطية.
عـاش نـضـال الـشـعب الـعـراقـي الـعظيم في سبيل السلم والديمقراطية.
عاش نصير السلم والديمقراطية.
الزعيم عبد الكريم قاسم"[109].

*** گروپی هونەرمەندانی کەرکوك (جماعة فناني كركوك):**

گروپی هونەرمەندانی کەرکوك لە ساڵی (١٩٥٣)دا لەسێ ئەندام پێکهات: ئەویش مەحموود ئەلعوبەیدی‌و سدیق ئەحمەد عاشوورو سنان سەعید. ئەم سێ هونەرمەندە، یەکەمین پێشانگای خۆیان بەناوی (جماعة فناني كركوك) لە ساڵی (١٩٥٣)دا لەهۆڵی بینایەی قوتابخانەی غازی سەرەتایی کردەوە، پاشان پێشانگای سێیەمیان لە ساڵی (١٩٥٤) لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی کۆنی کەرکوك کردەوە، کە ئەم هونەرمەندانەی خوارەوە بەشداریان تێدا کرد، عیزەدین ئەلسەندوق، سدیق ئەحمەد، ئینجا لەهەمان ساڵدا پێشانگای چوارەم کرایەوەو ئەم هونەرمەندانەی هاتنە ناو گروپەکەوە: محەمەد مەهدی، عەبدوڵڵا ئەمین، هاشم ئیسماعیل ئەلموسڵی، خاتوو زاروهی کیورك.

لە پێشانگای پێنجەمدا، لە ساڵ ١٩٥٥، لە هەمان شوێن کرایەوە تەنیا، ئەم هونەرمەندانە بەشداریان تێدا کرد: مەحموود ئەلعوبەیدی، سینان سەعید، سدیق ئەحمەد عاشور، عیزەددین ئەلسەندوق، محەمەد مەهدی، عەبدوڵڵا ئەمین، خاتوو زاروهی کیورك، هاشم ئیسماعیل.

هەمان ئەم هونەرمەندانە، لە هەمان شوێندا پێشانگای شەشەم‌و حەوتەم‌و هەشتەم‌و نۆیەم دەکەنەوە، بەڵام پێشانگای دەیەمیان لە هۆڵی یانەی مامۆستایانی کۆن کرایەوە. لە ساڵی (١٩٥٧)دا پێشانگای یازدەهەم‌و دوانزەهەمیان لەبینایەی (المعهد الثقافي الامريكي) لەکەرکوك، بە بەشداری ئەم هونەرمەندانە کردەوە: مەحموود ئەلعوبەیدی، سدیق ئەلسەندوق، ناتق محەمەد عەلی، هاشم ئیسماعیل، تاریق ئەحمەد عەلی، قەنبەر ئوزدەمیر.

لە ساڵی (١٩٥٩)دا، موئەید ڕاوی، ئەنوەر مەحموود سامی، خێزانی (سادق ئەلبەحرانی)یش پەیوەندیان پێوە دەکەن‌و پێشانگای سێزدەهەم‌و چواردەهەم بەناوی پێشانگای (الثورة)، لەبینایە تازەکەی کتێبخانەی گشتی کەرکوك دەکەنەوە، پاشان لە ساڵی (١٩٦٠) ئەم هونەرمەندە تازانە دەبنە ئەندام: سەلاح تیری، زەینەلعابدین دامرچی، موەفەق ئەنتوان ئەلوەکیل‌و پێشانگای پانزەهەم لەهەمان بینایە دەکەنەوە هەروەها (جماعة فناني كركوك) چەندین پێشانگای دیکەیان لەدەرەوەی کەرکوك بەتایبەتی لەبەغداو تورکیا کردووەتەوە"[110].

*** کۆمەڵەی فەقێکانی کوردستان:**

ئەم کۆمەڵەیە لە نێوان فەقێکانی کوردستاندا سەری هەڵدا، هەر وەکو ئەوەی (محەمەدی مەلا کەریم) بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە:

"دوادوایی ساڵی (١٩٥٣) بوو جووڵانەوەی نیشتمانی لە کوردستان‌و لە هەموو لایەکی عێراقدا دیسانەوە برەوی سەندبوو. عورفی هەڵگیرابوو، چەند پارتییەکی نیشتمان پەروەر مافی ئیشی ئازادیان وەرگرتبووەوە، چەند ڕۆژنامەیەکی ئازادی خوازیش دەرئەچوون.. بەڵام لە کوردستانا تەنها (ژین) هەبوو کە مامۆستا گۆرانی ئەمر دەری ئەکرد. هەرچەند بەناو ڕۆژنامەیەکی ئەدەبی بوو، بەڵام بە پێ‌و دانگی ئەو ڕۆژەو بەش بە حاڵی کوردستانی ئەو سەردەمە ئەوەندەی ڕۆژنامەیەکی ئازادی سیاسی دەوری هەبوو.

لەسولەیمانیدا دوو یەکێتیی قوتابییان هەبوو، یەکێکیان سەر بە پارتیی کۆمۆنیست‌و ئەوی تریان سەر بە پارتیی دیموکراتی کوردستان بوو. جووڵانەوەی ئەم دوو یەکیەتییە، هەر وەك جووڵانەوەی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی تر شێوەیەکی ئاشکرای هەبوو. ئەندامەکانیان بە ئاشکرا یەکترییان ئەناسی‌و خەڵکی خاوەن پەیوەندییش ئەیان ناسین. بەڵکو هەموو ڕۆژنامە خوێنێك ئەیزانی هەرکام لەم دوو یەکێتییە چەند کەسی لەدەورە، چونکە هەر چەند ڕۆژ جارێك یادداشتێك یا عەرزو حاڵێك بە ناوی یەکێکیانەوە لە ڕۆژنامەیەکی دیموکراتی وەك (الاهالي)دا بە چەند سەد ئیمزایەکەوە بڵاوئەکرایەوە، کە ئەتوانین بڵێین ژمارەی تێکڕای ئەندام‌و لایەنگرەکانیان بوو.

(فەقێ)یش ئەو سەردەمە وەك ئێستا نەبوون. هەر چەند کەسێکیان لە دێیەك یا لە مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی شارەکاندا ئەژیان‌و خەڵکی ئەو دێیە یا خەڵکی گەڕەکی دەوروپشتی ئەو مزگەوتەی شارەکە نان‌و چێشتیان ئەدانێ‌و شەکرو چایشیان لە سەر دەوڵەمەندانی دێ یا گەڕەك بوو. بۆ کتێب‌و جلوبەرگ‌و خەرجیی گیرفانیش، یا پشتیان بە کەس‌و کاریان ئەبەست یا ڕەمەزانان ئەچوون بۆ مەلا ڕەمەزانی‌و (سەرفیترە)یان وەردەگرت. بە هارانیش دوو دوو بەناو خێڵ‌و دێهاتەکانا ئەگەڕان‌و ڕۆن‌و کەرەیان کۆئەکردەوەو ئەیان فرۆشت‌و کەلەبەرێکی ژیانی خۆیانیان پێ ئەگرت. خوێندنیشیان، هەر چەند لەبارەی ووردەکاری‌و زاخاودانی مێشکەوە پلەیەکی بەرزی هەبوو، بەڵام بەپێی پرۆگرامێکی پاشماوەی کۆن‌و بە بێ هیچ جۆرە چاودێری‌و سەر پەرشتییەك بوو. تەنها پەیوەندییەکیان بە میرییەوە ئەوەبوو کاتێ کە ئەگەیشتنە سەردەمی سەربازی لە دائیرەی سەرباز گرتندا ناویان بە (فەقێ) ئەنووسراو، هەموو ساڵێ لە پۆلێکی تایبەتیدا تاقی ئەکرانەوە تا دوانزە پۆلیان ئەبردەسەر. بەڵام مەرج نەبوو لە پۆلی یەکەمەوە دەس بکرێ بە تاقی کردنەوەیان، چونکە بەپێی پلەی خوێندەوارییان، لە کاتی بانگ کردنیاندا بۆ سەربازی، پۆلیان بۆ دیاری ئەکرا.

لەو سەردەمەدا لە کوردستانی عێراق‌و بەتایبەتی لە ناوچەی سولەیمانیدا کۆمەڵە فەقێیەك هەبوون پەیوەندی یان بە پارتییەکانی جووڵانەوەی نیشتمانییەوە هەبوو. من خۆم یەکێك بووم لەوانە. ئێمە زۆرمان بیر لە باری ژیان‌و خوێندنی خۆمان ئەکردەوەو بەمایەی سووکی‌و سەر شۆڕیمان ئەزانی ئێواران ماڵ بە ماڵی ئاوایی‌و گەڕەك بگەڕێین بۆ نان چنینەوەو چێشت وەرگرتن‌و ژیانمان بەند بێ بە سەرفیترەی

خەڵکەوەو پاشانیش، کە بووین بە مەلا، هیچ پاشەڕۆژێکی لە ڕابوردوو باشترمان نەبێ و، جگە لەوەش خوێندنەکەمان هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە ژیانی سەردەمەوە نەبێ.

ڕۆژێ لە ڕۆژانــی دەمــەو بــەهــاری (١٩٥٤) تاقمێکمان چووبووینە دەرەوەی شار (سولەیمانی) بۆ گــەڕان و وەك هەموو جارێ باسی باری ناڵەباری ژیانی خۆمانمان ئەکرد... باسی ئەم جارەمان وەك جارەکانی تر قسەیەکی ڕووت نەبوو بێ و بڕوا... ئەم جارە بڕیارمان دا کۆمەڵێك دانێین بە ناوی (یەکێتیی قوتابییانی ئایینی)یەوەو پرۆگرامو پێڕەوێکی نــاوخــۆی بــۆ ڕێــك خــەیــن. هــەر ئــەو ڕۆژە دوانــمــان لــە نــاو خۆماندا هەڵبژارد بۆ نووسینی پرۆگرامو پێڕەوی ناوخۆ، کە من خۆم یەکێکیان بووم. ڕۆژێکیشمان دیــاری کرد بۆ لێکۆڵینەوەی پرۆگرامو پێڕەوەکە. تا ڕۆژی دیــاری کــراو ڕوونووسی پێڕەوو پرۆگرام ئامادەکراو، لە گردی سەیوان کۆبووینەوەو بەدرێژی لێی کۆڵینەوەو، هەر دەستکارییەکی پێویست بوو کردمان و بڕیارمان لەسەر دا.

بیرمان لەوەش کردەوە کە چۆن فەقێکانی شار ئاگادار بکەین لە دامەزرانی ئەم یەکیەتییە بەجۆرێك کە ترسی ئەوەمان نەبێ هەواڵەکە بگا بە کەسێ کە لەوانە بێ لای پیاو خراپێك بیدرکێنێ.. لە ئەنجاما هاتینە سەر ئەوە کە باشتر ئەوەیە ئەوەندەی ژمارەی ئەو مزگەوتانەی کە فەقێیان تیایە دانەی لەبەر بنووسینەوەو هەر خۆمان لە شەوێکی جومعە یا سێ شەممەوە لە کاتێکی تایبەتیدا دابەشی کەین بەسەر ئەو مزگەوتانەدا.

مەبەستمان لە بڵاوکردنەوەی پرۆگرامو پێڕەوەکە بەوشێوەیە ئەوەبوو بۆ سبەینێی شەوی دابەش کردنەکەی بزانین فەقێکان ئەڵێن چی و کامیان لەگەڵمانن و کامیان لەگەڵمان نین.. بۆ سبەینێی شەوی دابەش کردنەکەی دەسمان کرد بە گەڕان بە مزگەوتەکانداو، بووین بە بەشداری ئەو باس و خواسەی لەناو فەقێکاندا پەیدا بووبوو. دیمان هەرایە، هەر کەسێ شتێ ئەڵێ، بەڵام ئەوەی لە هەموو لێکدانەوەیەکی تر بڵاوتر بوو ئەوە بوو کەوا کۆمۆنیستەکان بەیان نامەیان بۆ فەقێ بڵاو کردووەتەوە. کەس بیری لەوە نەئەکردەوە کە ئەو کارە کاری ئێمەیە، هەر چەند لەناو مەلاو فەقێکانیشدا تــاڕادەیــەك نــاســراوبــوویــن و نــاوێــکــمــان لــەســەر هــەبــوو. کۆنەپەرستەکانمان ئەوەیان بە هەل زانی بۆ ئەوەی ئەو کارە بدەنە پاڵ مامۆستایەکی تێگەیشتوو کە دەرزی حیساب و هەندەسەی لە مزگەوتەکەیدا بە فەقێ ئەوتەوە. ڕاستەکەی ئەو مامۆستایە هیچ ئاگایەکی لە مەسەلەکە نەبوو، ئێمەش هیچمان لای نەدرکاند. هەر چەند پاکانەی بۆ خۆی ئەکرد، سوودی نەبوو. بەجۆرێك بێزایان کرد زۆری پێ نەچوو وازی لە مەلایەتی هێناو بوو بە پێش نوێژی سوپا.

بێینەوە سەر باسی ئەنجامی دابــەش کردنی پــرۆگــرامو پــێــڕەوی نــاوخــۆ... لە مــاوەی چەند ڕۆژێکدا تێکڕا دەمو دووی هەموو فەقێکانی سلێمانیمان کرد، تێگەیشتین کێ لە گەڵمانەو کێ لە گەڵمان نییەو کێ خۆی لە قەرەی ئەم جۆرە کارانە نادا، ئەمجا ڕاستیی دامەزراندنی یەکێتییەکەمان بەوانە وت کە بە دۆستمان زانین و، هەر کام لە ئەندامانی دامەزرێنەری یەکێتی بەڕێوەبردنی چەند کەسێکمان گرتە ئەستۆ.

وا پێمان نایە قۆناغێکی تازەوە. ئەمجار گۆڤارێکمان ئەوێ دەنگمانی پێ ڕابگەیەنین. بڕیاری دەرکردنی (دەنگی فەقێ)مان دا. زۆری پێ نەچوو ژمارەی یەکەمیمان بە (٣٠ - ٤٠) دانەیەك بڵاو کردەوە. (دەنگی فەقێ) مانگی جارێك لەسەر کاغەزی تەنك و بە کاربۆن، وەك لە یادمە بە (١٦- ٢٠) لاپــەڕە دەردەچــوو. لــە هــەر ژمــارەیــەکــیــدا چەند بەندێکی پرۆگرامو پێڕەوی ناوخۆمان لێك ئەدایەوەو، گەلێك ووتارو باسی گیروگرفتی ژیانی فەقێ و چۆنیەتیی باش کردنی ژیانیان و ووتاری سیاسییشمان بڵاو ئەکردەوەو، هەروەها شیعریشمان تیادا بڵاو ئەکردەوەو، هەوڵمان تێدا دەدا بۆ نەهێشتنی ئەو لەیەك نەگەیشتنە کۆنەی کە لە نێوان فەقێ و قوتابییانی قوتابخانە تازەکاندا هەبوو. ئەوەبوو لە سەرەتای کردنەوەی قوتابخانەدا کۆنەپەرستان وایان بڵاو ئەکردەوە کە هــەر کــەس بچێتە قوتابخانە (کــافــر!) ئــەبــێ. فەقێیش سەردەمێك هــەر لــەبــەر ئــەوەی کە قوتابیی ئایینی بــوون، بووبوون بە هەڵگری ئەم بیرو باوەڕە چەوتە.

وورده وورده ژمــارەی دانــەی نــووســراوە کــەمــان زیــادی کــردو توانیمان بیگەیەنینە کــەرکــووك و هــەولــێــرو کۆیەو خانەقی و هەڵەبجەش. بەڵکو لە کەرکووك دانــەی تری لە بەر ئەنووسرایەوەو، لقێکی ڕێــك و پێکی یەکێتییەکەمان دامــەزرا... لە هەموو لایەکەوە نامەمان بۆ ئەهات و، ڕێ و شوێنێکی باشمان پەیدا کردبوو... لە هەندێ نامەدا بە (کۆمێتەی ناوەندیی یەکێتی !) یان ناو ئەبردین.

بۆ دەربڕینی بێزاری لە نیازی بەستنی پەیمانی تورکیاو پاکستان یادداشتێکمان دا کە (٦٣) فەقێ مۆریان کردبوو. بۆ داخوازیی تایبەتییش یادداشتێکمان دا کە لە (١١٥) فەقێی ئەو سەردەمەی سولەیمانی (١١٣)یان مۆریان کرد. بێ گومان ئەمە نیشانەی ئەوەبوو کە تاچ ڕادەیەك خواست و ئاواتی فەقێکانی ترمان دەرئەبڕی. ئەم یادداشتانەمان لە ڕۆژنامەکانی (الاهـالـي)و (الاستقلال)و (الجـريـدة)دا بڵاو ئەکرانەوە.

داخوازیی تایبەتیمان کردنەوەی خوێندنگای ڕەسمی بوو لەو چەشنەی کە ئەمڕۆ لە هەموو لایەکی عێراق و کوردستاندا کراوەتەوە بۆ فەقێ و، داوای مانگەنەمان ئەکرد بۆ سەردەمی خــوێــنــدن و دانــانــی پــرۆگــرامــێــکــی نــوێــمــان ئــەویــســت بۆ خوێندن و، ئەمان ویست پاش لێبوونەوە لە خوێندن لێمان بنێرن بۆ میسرو بمانکەن بە مانگانە خۆری میری... گەلێ مەبەستی تریشمان هەبوو لەم بابەتە.

لقی کــەرکــووکــمــان مــانــی بــە فــەقــێــکــان گــرت و نەیهێشت بچنە تاقی کردنــەوەی ســاڵانــەوە. لە ئەنجامی ئــەوەداو بە هاندانی هەندێ لە مەلاکانی کەرکوك میری هێرشی بردە سەر مزگەوتەکان و کەوتە گرتن و ڕاونانی فەقێ، کارێکی بەو بەدبەختانە کرد با بە دەواری شڕی نەکردبێ. لێرەدا جێی خۆیەتی باسی ئەوەش بکەین کە تاقمێك لە مەلاکان خەباتی فەقێکانیان بە لە ئاین لادان ئەدایە قەڵەم و ئەیان ووت ئیمامی شافیعی خۆی بە نان چنینەوە خوێندنی تەواو

کردووە!. ئەوانە ئێستا زۆربەیان مامۆستای ئەو خوێندنگا ئایینییانەن کە لەو سەردەمەدا ئێمە هەوڵمان ئەدا بکرێنەوەو لەو ساڵانەی دواییدا کرانەوەو ئامانجی تێکۆشانمانیان پێ هاتەدی.

یەکێتیی قوتابییانی ئایینی، بە پێچەوانەی جووڵانەوەی ئەو ڕۆژەی قوتابییانو بەڵکو جووڵانەوەی ئەمڕۆشیانەوە، یەکێتی هەموو قوتابییانی ئایینی بوو. گوێی نەئەدایە جیاوازی بیرو باوەڕی سیاسی، هەڵکەوتووترین تێکۆشەرێکی لقی یەکێتییەکەمان لە کەرکووك خوا لێ خۆش بوو (مەلا مەجیدی داڕۆخانی) بوو کە تێکۆشەرێکی پێشکەوتووی پارتیی دیموکراتی کوردستان بوو. ئەم تێکۆشەرە جارێکیشیان هات بۆلامان بۆ سولەیمانیو بە درێژی لە بارەی یەکێتییەکەمانەوە پێکەوە دواین، لە نەخشەی کارمان کۆڵینەوە. ئەم تێکۆشەرە پاشان بە دەردی سیل کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا ڕۆشنبیرە پێشکەوتووەکان پشتیان ئەگرتین. یەکێ لەوانە مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی بوو کە لە ڕۆژنامەی (الاهالی)دا ووتارێکی لەسەر نووسین، منیش ووتارەکەم کرد بە کوردیو لە (ژین)دا بڵاوم کردەوە.

لەیەکێك لە ژمارەکانی گۆڤارەکەماندا نووسەرێك پێشنیاری کردبوو کە ئەندامانی یەکێتی دەسکەوتی (مەلا ڕەمەزانی)ی ئەو ساڵەیان ببەخشن بە یەکێتی بۆ ئەوەی تایپێكو ڕۆنیۆیەکی پێ بکرینو گۆڤارەکەمان بە چاپ بڵاو بکەینەوە. لەو سەردەمەدا کوڕەکانی سولەیمانییش کۆمەڵێکیان هەبوو، گۆڤارێکیان بۆ دەرئەکردن بە ناوی (ڕووناکی)یەوە. جارێکیان داوایەکمان لەم کۆمەڵەوە بۆ هات کە شتێکی وەك (بەرەی نیشتمانیی یەکگرتوو!) پێکەوە بنێین، ئەم کۆمەڵی کوڕانە خۆپیشاندانێکی بە کوڕەکان کرد بۆ لای موتەسەڕیف بۆ داوای مانگانە"[111].

*** پارتی سۆشیالیستی کورد ( پاسۆك ):**

لە (١١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٥) لە کەرکوك دامەزراوە بە دەست پێشخەری سەرکردەکەی (ئازاد مستەفا)، چالاکییەکانی چۆتە دەرەوەی کەرکوكو تا ماوەی دوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١) چالاکی بەردەوام بووە لە کوردستان. "سەرەتا بە ناوی (پارتی سۆشیالستی نەتەوەیی کورد) دامەزرا، دواتر لە کۆنفرانسی یەکەمی لە (١١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٦) ناوەکەی گۆڕاو بووە (پارتی سۆشیالستی کورد).

لە کادیرە سەرکردایەتییەکانی ئەم پارتە: ئازاد مستەفا (سکرتێری پارت لە ساڵی (١٩٨٩) کۆچی دوایی کردووە)، مولازم مەنسور، مولازم کەریم، مولازم شوان، فەرهاد عەبدولقادر، جەلال حاجی حوسێن، عەبدوڵڵا ئاگرین.

دروشمەکانی ئەم پارتە دەکرێت لەم خاڵانە کورت بکرێنەوە:

کوردستانێکی سەربەخۆو گەلێکی ئازاد.

پێش ئەوەی هەر شتێك بین.. دەبێ کورد بین.

کوردستان تەنها موڵکی کوردە.

کوردایەتی مرۆڤایەتیە.

جەماوەر سەرچاوەی بوونو دەسەڵاتە.

بەشێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە بیروباوەڕەکانی (پاسۆك) بۆ کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد دەگەڕێتەوە، کە لە ساڵانی (١٩٥٩) دامەزرابوو.

(پاسۆك) لە ساڵی (١٩٧٦) بەشداری لە خەباتی چەکداری کردووە لە کوردستان دژ بە ڕژێمی سەدام حوسێن، لە ماوەی ساڵانی خەباتی چەکداری بۆتە ئەندامی بەرەی (جود)و هەروەها لە بەرەی کوردستانی.

سنووری چالاکییەکانی ئەم پارتە زیاتر لە ناوچەکانی دەوروبەری سلێمانی بووە، ساڵی (١٩٩٣) بەشداری لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان کرد، پاشان لە هاوینی هەمان ساڵ لەگەڵ هەردوو حیزبی گەلی دیموکراتو حیزبی سۆشیالست یەکیان گرت لە ژێر ناوی حیزبی یەکگرتن"[112].

"(شێرزاد فاتیح محەمەد) یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی (پاسۆك)و لە نێوان سەرەتای ساڵی (١٩٧٤) هەتا بەهاری ساڵی (١٩٧٥) ئەندامی سەرکردایەتی کاتیی (کاژیك) بوو. یەکێ بوو لەو سێ هاوبیرەی کە دامەزراندنی (پاسۆك)یان لە (١١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٥) گرتە ئەستۆ هەتا کۆتایی ساڵی (١٩٨٠) سێکوچکەی سەرکردایەتی ئەو حیزبە بوون.

لە یاداشتەکانیدا دەربارەی دامەزراندنی (پاسۆك) بەم شێوەیە باس دەکات:

(.. چەند کۆبونەوەیەکمان بە سێ قۆڵی ئەنجام دا کە زۆربەیان لە سلێمانیو کەمتریش لە کەرکوك بوو. هەر یەکەمان ڕەشنووسێکی ئامادە کرد بۆ پرۆگرامی حیزب، هەروەها بۆ پەیڕەوی ناوخۆی ئەو ڕێکخستنە نەتەوەییە تازەیە کە وەك بیرو بۆچوونو ستراتیژ بە تەواوکەری (کاژیك) ئەژمار دەکرێت. من بەش بە حاڵی خۆم تێبینیو بۆچوونەکانم لە زادەی بیروبۆچوونی نەتەوەییەوە سەرچاوەی گرتبوو و کۆپیکردنی پەیڕەوو پرۆگرامی هیچ حیزبێکی تر نەبوو. تەنانەت (کاژیك)یشی لەگەڵدا بێ. کە حەوت ساڵ تێیدا ئەندام بووم هیچ شتێکم نەدی بەناوی پەیڕەوی ناوخۆی (کاژیك)ەوە.

دوای ئاڵوگۆڕکردنی بیرو بۆچوونەکانمانو دوای چەند کۆبوونەوەو دانیشتنێکی زۆر کە زۆربەیان لە ماڵی (فەرهاد عەبدولقادر) دەکران کە ماوەیەکی زۆر نەبوو ماڵی لە کەرکوکەوە گواستبۆوە سلێمانی، دوای ئەوەی گەیشتینە دواشێوەی پرۆگرام. واتا (بەرنامەی کار) دواجار داڕشتنی پەیڕەوی ناوخۆی حیزبێکی نەتەوەیی کە لە سەرەتاداو بۆ ماوەی ساڵێك بەناوی (پارتی سۆشیالیستی نەتەوەیی کورد)ەوە کاری کردو بەیانی یەکەممان لە (١١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٥) بە تایپکراوی بڵاوکرایەوە. لە ڕاستیدا ئەو بەیانە پێشتر ئامادە کرابوو. بەڵام چاوەڕانی ئەوەمان دەکرد کە لە یادی (١٤) ساڵەی شۆڕشی ئەیلولدا ئەو بەیاننامەیە بڵاوبکەینەوە کە هەمان مێژووی لەسەر بوو بۆ وەڵامدانەوەی دەسەڵاتی داگیرکەری بەعسی کە لە دوای ڕێککەوتننامەی (جەزائیر) لە (٦)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٥)دا بەیاننامەیەکی دەرکردو لە یەکێ لە ڕستەکانیدا گوتبووی: (انتهت والی الابد اسطورة الجیب العمیل)، بەو واتایەی (کە بۆ هەتا هەتایە

کۆتایی بە شۆڕشی کورد هات)..

لایەنە فیکری و تەنزیمیەکە گورزێکی کاریگەرتر بوو لەوەی (شۆڕش) بەرپا بێتەوە. بۆیە شاری (کەرکوك)یشمان بۆ شوێن و دەسپێکی دەرچوونی بەیاننامەکە هەڵبژارد. تا ئەمیش گورزێکی تری کاریگەر بێ بۆ دوژمنانی کورد بە گشتی و دەسەڵاتی بەعس بە تایبەتی کە کەرکوك هەمیشە هێڵی یەکەم بووە لە بەرگریکردن لە خاك و نەتەوە. ئەمە جگە لەوەیش کە دوان لەو سێ کەسەی کە پاسۆکمان دامەزراند (شێرزاد فاتیح)و (فەرهاد عەبدلقادر) کەرکوکی بووین و سەرەتا وەك پێشتر ئاماژەم بۆی کرد بیرۆکەکەش لێرەوە واتە لە کەرکوکەوە سەری هەڵدا.

لێرەدا دەمەوێ ئەوە ڕوون بکەمەوە کە تەنها بەیانی یەکەمی ئەو حیزبە تایپکرا. بەڵام لە ڕاستیدا نە پرۆگرام (بەرنامەی کار) چاپ کرا، نە (پەیڕەوی ناوخۆ) بەڵکو لەو قۆناغەدا هەر دەسنووس بوون"[١١٣].

*** بەرەی یەکێتی نیشتمانی ( جبهة الاتحاد الوطني ):**

لە دوای لێدان وەدەستدرێژی بۆ سەر وڵاتی میسر لە ساڵی (١٩٥٦)دا، کاریگەرییەکی گەورەی دروستکرد بۆ دروست بوونی بەرە لە نێو حیزبە عێراقییەکاندا یەکێك لەو بەرانە بەرەی یەکێتی نیشتمانی بوو لە نێوان حیزبەکانی: الاستقلال، الوطني الديمقراطي، البعث العربي، شيوعی نهێنی، کۆمەڵێك کۆبوونەوەیان لەنێواندا ئەنجام درا لەگەڵ دیموقراتیە سەربەخۆییەکانی عێراقدا، کۆبوونەوە لە نێوان ئەندامەکانی ئەم چوار حیزبەدا کرا لە بارەگای سەرۆکی حیزبی الاستقلال)، محەمەد مەهدی کوبە، ئەویش بە تایبەتی لەکاتی گرتنی کامل چادرچی ومحەمەد سدیق شەنشەل لەلایەن حکومەتەوە ئەوەی دوایی دوور خرایەوە بۆ کوردستان هەر لەو ماوەیەدا ئەم حیزبانە چەند ئامانجێکیان خستە ڕوو کە خۆی چڕ کردەوە لە چەند خاڵێکدا:

- لابردنی نوری سەعیدو هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نیابی.
- دەرچوون لە (حلف بغداد).
- ڕێگەدان بە سەربەستی و دیمقراتی دەستوری لە عێراقدا.
- هەڵوەشانەوەی بەڕێوەبەری و کارگێڕی عورفی لە عێراقدا.

لە نێوان ئەم حیزبانەدا ڕێککەوتن ڕوویدا بۆ بەکارهێنانی چاپخانەی نهێنی کە حیزبی شیوعی ئامادەی کردبوو، لە ساڵی (١٩٥٧) لە مانگی شوباتدا، ئەم بەرەیە بەیانێکیان بڵاوکردەوە لەسەر شێوەی کتێبۆڵەیەکەوە لە دوانزە لاپەڕەدا بەناوی (ميثاق جبهة الاتحاد الوطني) کە تێدا هەستابوون بە شرۆڤە کردنی ئامانجەکانی بەرەی یەکێتی نیشتمانی، ئەم بەرەیە بەردەوام بوو لە نێوان ئەم حیزبانەدا تا تەقینەوەی شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ لە ساڵی (١٩٥٨)دا بەڵام لەگەڵ هاتنی شۆڕش و گۆڕانەکانی باری سیاسی عێراق لەگەڵ خۆیدا گۆڕانێکی گەورەی دروست کرد لە بەرەی یەکێتی نیشتمانی وقۆناغێکی بەرچاوی پێکهێنا لە دروستبوونی بەرە بە شێوازێکی ترو بە گەلێك هەنگاوی جۆر بەجۆر لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژدا بەرەیەکی یەکێتی نیشتمانی لە نێوان حیزبەکانی: حیزبی شیوعی و (حزب الوطني الديمقراطي)و (الحزب الديمقراطي الكردستاني – پارتی).

بەڵام ئەم ڕێککەوتنە سەری نەگرت لە نێوان حیزبی شیوعی و (الحيزبي الوطني الديمقراطي) دەربارەی کێشەکانی (مقاومة الشعبية)و (ڕێکخراوە پیشەییەکان) وچونێتی کارەکانی، بەڵام نەگیشتنە هیچ ئامانجێك بە شێوەیەکی گشتی.

لەگەڵ تەنگ و چەڵەمەکاندا بە هەموو لایەك هەوڵیان دا بە گەڵاڵە کردنی چەند ئامانجێك وەکو ئەمانەی لای خوارەوە:

- هەموو لایەنەکانی بەرە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کەدژایەتی کۆماری و (عەبدولکەریم قاسم) نەکەن.
- بەرەو حیزبەکانی نێو بەرە ڕاگەیاندنی ئاشکرای خۆیان بڵاوکردەوە.

بەشداری ڕێکخراوەکانی جەماوەری وکۆمەڵایەتی ئەم بەرەیە وا بکات ڕێگە بە حیزبەکانی بەرە بدرێت بۆ بەرگری وبەرپەرچی بڕیارەکان ئەگەر سەیرێکی ئەم بەرەیە بکەین دەبینی کە نەتوانرا ئامانجەکانی جێبەجێ بکات وهەنگاوی پێویست بەجێ بهێنێت وهەردەم گێچەڵ وگیروگرفت لە نێوانیاندا هەبوو، بەتایبەتی هەندێك لە حیزبەکان بوونی پارتی یان لە نێو ئەو بەرەیە بەپێویست نەدەزانی وهەوڵی لابردنیان دەدرا، لە تەنیشت ئەم بەرەیەدا بەرەیەکی یەکێتی نیشتمانی تر هەبوو لە نێوان حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردستان، کە تا ڕادەیەك دەورێکی گەورەیان بینی لە سەر ڕووداوەکانی کەرکوك لە نێوان ساڵانی (١٩٥٨ – ١٩٥٩)دا وجێ پەنجەیان بەدیار بوو لەسەر ڕووداوەکان و ڕێکخراوەکانیان لە کەرکوکدا دەوری کاریگەرییان دەبینی.

یاداشتی بەرەکە:

سيادة قائد البلاد عبد الكريم قاسم..

نستعرض مذكرة قيام الجبهة الوطنية الموحدة في العهد الملكي ودورها اسقاط ذلك النظام واقامة الجمهورية واسنادها ثم تقول: "لم يكن بامكان اية قوة بمفردها ان تصون الثورة وجمهورية الرابع عشر من تموز، فقد آزر الشعب جيشه الباسل وحكومته الوطنية ووقف الجيش مع الشعب واستندت الحكومة على الشعب وقواه الوطنية المخلصة وظل المخلصون لارادة الشعب ومبادئ الثورة وانتم على راسهم متمسكين في كل الظروف والاوقات العصيبة التي مرت بجمهوريتنا لشعار (وحدة الصفوف)، هذا الشعار الذي التزمت به ودافعت عنه الغالبية الساحقة من القوى الوطنية ولم تشذ عنه سوى بعض العناصر والجماعات التي تضافرت جهودها مع جهود الطامعين والقوى المعادية للجمهورية من الاستعماريين والاقطاعيين. ولولا وعي الشعب ويقظة القوى الوطنية لكان بمستطاع تلك الزمر المعادية والمفرقة شق وحدة الشعب وتلاحم صفوفه والتسبب في جلب الكوارث الحقيقية على البلاد. بيد الشعب فوت الفرص على الاعداء والطامعين ومفرقي الصفوف وبقي صامداً موحدا تحت زعامتكم. وقد اصبح ذلك ممكنا بفضل وحدة الشعب والجيش بقيادتكم الحكيمة الحازمة. الوحدة التي

كانت العامل الاساس الذي مكن البلاد من تخطي المؤامرات والهزات التي تعرضت لها والقضاء بتفوق باهر وسرعة فائقة. لقد ركز الاستعمار خلال الاشهر الاخيرة بوجه خاص كل جهوده من اجل بث الشكوك والريبة داخل القوى الوطنية بغية الاخلال بوحدتها وتأليب بعضها ضد بعض لفتح الثغرات والنفوذ منها جريا على سياسته التقليدية (فرق تسد)، وتعلمون سيادتكم ان الاستعمار لا ينهج لتحقيق اغراضه سبلا مكشوفة يمكن تمييزها بسهولة او بيسر، بل يعمد الى استخدام اعقد الخطط واكثر السبل الماكرة وغير المباشرة والملتوية والخبيثة، ان مما ياسف له كل مخلص حدوث بعض الامور والالتباسات والمواقف التي صدرت من هذا او ذلك من الاطراف الوطنية والتي ادت الى تقوية امل المستعمرين وانتعاش مقاصدهم اللئيمة ضد بلدنا الحبيب وكان من نتائج ذلك مع الاسف هذه البلبلة الواضحة التي سرت في صفوف الشعب وقواه الوطنية، ان الشعب تعلم من خلال تجربته وتجارب الامم الاخرى ان الاستهانة بالاعداء المتربصين سواء كانوا خارجيين او داخليين هي داء وبيل اصابت عدواه حركات وطنية كثيرة ادت بها الى انتكاس والخذلان ومما لا ريب فيه ان المخلصين كافة لا يوجد بينهم من يرغب او يقبل مثل هذا لثورتنا المباركة.

ان واقع الوضع المؤسف هذا قد اثار اقصى درجات اليقظة لدى الشعب وحفز وعيه، فبرز على الالسن كما تغلغل في القلوب اكثر من اي وقت مضى شعار (اعادة الوحدة الى الصف الوطني) وتقويتها بالدفاع عن الجمهورية وعن مكاسب ثورة الشعب وجيشه المقدام. وما كان لهذا الرغبة النبيلة الواعية لدى جماهير الشعب الا ان تعكس على مختلف قواه الوطنية التي يقف على راسها ويرعاها سيادتكم.

ونحن كجزء من هذه القوى الوطنية حملنا شعورنا بالمسؤولية ازاء هذا الوضع الراهن، ودفعنا الى التقارب بين بعضنا البعض، وتوصلنا بنتيجة دراستنا للعوامل التي ادت الى الاخلال بوحدة الصف والاساءة اليه وتحري الحلول الممكنة والعملية التي تساعدنا على بعث الوحدة مجددا وعلى افضل وجه، توصلنا الى مواصلة نشاطنا في (جبهة الاتحاد الوطني) واتخاذ جميع الخطوات المقتضية لاعادة حيويتها وتحويلها الى دافع عملي ملموس، وبناء عليه فقد تم الاتفاق فيما بيننا على قرار (ميثاق انشائي) تبلور في الظرف الراهن، وهذا الميثاق الوطني هو عهد مقدس بين القوى المنضوية او التي ستنضوي في المستقبل تحت لواء جبهة الاتحاد الوطني التي ستمارس نشاطها المشترك تحت قيادتكم الحكيمة.

وما من شك ان ما جاء في هذا الميثاق قد يحتمل الاضافة او التعديل والتغيير متى ما قدمت الاطراف المشتركة فيه ذلك او متى ما ارتات القوى ضرورتها، وباعتقادنا ان خطوتنا هذه من اجل وحدة الصفوف ستكون ذات اهمية اكبر واكثر جدوى في خدمة الجمهورية كلما ضمت جبهة الاتحاد الوطني قوى شعبية اخرى وامكانات جديدة.

واننا اذ نقدم اليكم يا سيادة الزعيم بصورة من ميثاقنا الوطني الذي تم اتفاق كلمتنا عليه برغم الاختلاف بين اتجاهاتنا وميولنا السياسية نحن القوى المؤتلفة في جبهة الاتحاد الوطني لنا الامل الوطيد باننا سنجد من لدن سيادتكم كل التشجيع والرعاية.

وتقبلوا فائق احترامنا يا زعيم البلاد.

عن الحيزب الشيوعي لكردستان:
عامر عبد الله ناجي
عبد القادر اسماعيل
زكي خيري سعيد
محمد حسين ابوالعيس
بهاء الدين نوري
عزيز احمد
كريم احمد

عن الحيزب الوطني الديمقرطي:
يوسف المحامي
الدكتور احمد الجلبي
الدكتور صلاح خالص
عبد المجيد الونداوي
علي جليل الوردي
نايف الحسن
حسين احمد العاملي

عن الحيزب الديمقراطي الموحد:
حمزة عبد الله المحامي
نوري شاويس المهندس
خسرو توفيق
نزار احمد
عزيز صالح الحيدري
شمس الدين المفتي
صبغة الله المزوري[٣١١].

*** حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست:**

"حیزبی بەعسی لە سەرەتادا لە شێوەی کۆمەڵەیەکی نهێنی لە سوریا دەستی پێکرد کە ڕۆشنبیرە نەتەوە خوازەکانی لە خۆ دەگرێت، دوای ئەوەی ئەم کۆمەڵەیە فراوانتر بوو. لە (٤- ٦)ی نیسانی ساڵی (١٩٤٧) یەکەمین کۆنگرەی بەستو بەشێوەیەکی ڕەسمی لە حەوتی نیسانی هەمان ساڵ حیزبی بەعسی عەرەبی لە دیمەشق دامەزرا لە دوای دامەزراندنی حیزب، بیروباوەڕەکانی ئەم حیزبە بەناو وڵاتانی عەرەبیدا بڵاوبوونەوە".

عێراقیش یەکێك بوو لەو وڵاتانەی کە حیزبی بەعسی تێدا بڵاوبووە، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینیەوە کە شوێنێکی لە باربوو بۆ گەشەکردن وجێبەجێ کردنی بیروباوەڕەکانی.

"سەرەتای ڕێکخستنەکانی لە عێراقدا لە ڕێگای ئەو خوێندکارو مامۆستا عەرەبانەوە بوو کە لە عێراقدا دەیانخوێند ویەکەمین شانەی حیزبیش لە هەمان ساڵدا دامەزرێندرا.

"لە (١٧)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٣)دا ڕێکخراوەکانی حیزب لە عێراقدا فراوانتر بوو، یەکەمین سەرکردایەتی هەرێمایەتی لە عێراقدا پێکهێنراو لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٥) لە شاری بەغدا یەکەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی حیزبەکە بەسترا.

قۆناغەکانی گەشە کردنی بەعس لە کوردستاندا زۆر بە سستی گەشەی کردووە، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ بیروباوەڕ و بۆ چوونەکانی بەعس بەرامبەر کێشەی کوردو چواندنی کوردستان بەپارچەیەکی وڵاتە عەرەبییەکان بێ ئەوەی بۆچوونێکی مێژووییانەی کوردستانیان هەبێت، ئامانجەکانی بەعس لەوێدا خۆی دەبینیەوە کە باوەڕیان بە توانەوەی هەموو کوردوکەمە نەتەوەییەکانی عێراق هەبوو لەبۆتەی بەعسیزم وبیروباوەڕەکانی بەعس بۆ باڵا دەستی نەتەوەی عەرەب، ئەویش لە ئامانج وهەنگاوەکانیاندا ڕەنگی دابۆوە، بەڵام کەرکوک یەکێك بووە لەو شوێنانەی کە بەعسیەکان ویستوویانە کە جێگەی خۆیان لەم شارەدا بکەنەوەو هەوڵ بدەن لە شارەکە، هەرچەند وەکو حیزبێکی ئاشکرا نەیتوانیبووە چالاکی خۆی بکات، بەڵام وەکو کەس ونهێنی کاری خۆی کردووە ئەویش لەم بەڵگانەدا ڕاستی بۆ چوونەکەمان دەپێکێت:

پەیوەندی کردنیان لەگەڵ قەومیەکان، چ لە موسڵ وکەرکوک بۆ هەڵگیرسانی پشێووی لە ناوچەکەدا ئەویش بەڕوونی لە پەیوەندییەکانی ئەواندا بەدەردەکەوێت.

پشتگیری کردنی تورکمانەکان وهاندانیان، ئەویش بە هۆی ئەندازیار (عەبدولمەلیك) کە کارمەندێك بوو لە دەزگای هێڵی شەفەندەفەر، دژی شۆڕشەکەی (١٩٥٨).

بە هۆی باڵا دەستی پارتیو شیوعییەکان لە کەرکوکدا، چالاکییەکانیان زۆر ئەستەم بوو، بۆیە زیاتر لە ڕێگای عەرەبەکانەوە جموجووڵەکانیان دەست پێدەکرد[115].

*** بەرەی بەرگری لە کۆماری (جبهة الدفاع عن الجمهورية):**

ئەم بەرەیەش لە نێوان ساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٩)دا، سەری هەڵداو، لە سەردەمی تەبەقچەلیدا داوایان لێکرد بۆ ڕێگەدان بە کارکردن لەو شارەدا، ئەویش ڕەزامەندی خۆی نیشان دا کە مەرامی تایبەتی خۆی هەبوو.

ئەندامەکانی پێکهاتبوو لە کوردو وعەرەبو تورکمان کە هەوڵیان کارکردن بوو بۆ پاراستنی پێکەوە ژیان لەو شارەدا، بەڵام دوای ئەوەی کەزانییان کارەکانیان ڕێگر هەیە لە پێشیان ومەرامی تایبەتی هەیە تا لە ژێر ئەم بەرەیە کاربکات، وردە .. وردە هەڵوەشایەوە.

لەو ئەندامانەی لەم بەرەیەدا بوو بریتی بوون لە: تەحسین ڕەئفەت، موکەڕم تاڵەبانی، محەمەد عیزەت خەیات[116].

*** یانەی (خەبات):**

یەکێکە لەو یانە وەرزشیانەیە کە لەکەرکوك دروست بووە لەنێوان ساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٩) تاکو ساڵی (١٩٦٠) ئەم یانەیە بەردەوام بووە.ئەوانەی کەدەوریان بووە لە دروست بوونی ئەم یانەیە بریتی بوونە لە:

مامۆستا سەلمان قادر، جەبار تاهیر، سەلاح عیسامەدین، شێخ ستار بەرزنجی، عیزەدین نوری، عومەر محەمەد ، ئەنوەر یاسین، جەمیل موفتی، حەسەن کەشاف، جەودەت خانەقا، عەزیز تاهیر، سابیر محەمەد.

*** کۆمەڵەی ئازادیو ژیانەوەی کورد:**

لە (١٤)ی نیسانی ساڵی (١٩٥٩) لە شاری کەرکوك دامەزراوە لەسەر دەستی جەمال نەبەز، کامیل ژیر، فایق عارف، ئەحمەد هەردی، د. ئیحسان فوئاد، عەبدوڵڵا جەوهەر.

بەڵام هیچ شتێکی ئەوتۆ نازانرێت دەربارەی چالاکییەکانیان لە ناو کەرکوکداو دەوریان چی بووە لە دەرەوەی کەرکوك[117].

*** کۆمەڵەی هەرەوەزی دروستکردنی خانووبەرە لە کەرکوك (جمعية بناء المساكن التعاونية في كركوك):**

لە ڕۆژنامەی کەرکوك ژمارە (١٤٢٩)ی ڕۆژی (٢٥)ی ئاياری ساڵی (١٩٦٦)دا، بەم جۆرە باسی دروستکردنی ئەم کۆمەڵەیە دەکات:

(کۆمەڵێك لەم بەڕێزانە هەستان بەدروستکردنی کۆمەڵەیەکی هەرەوەزی دروستکردنی خانووبەرە کە هەرییەکە لەکەمال محەمەد حەبیب، ئەکبەر شکور، عەونی بلال دەدە، سوهام یونسو، هاوڕێیانی کە ئەوانەی نیشتەجێن، لەپارێزگای کەرکوك، ئەوانەی کە لە خوارەوە ئیمزایان کردووە بۆ داواکردنی دروستکردنی کۆمەڵەیەکی هەرەوەزی دروستکردنی خانووبەرە بەپێی ئەودەسەڵاتەی کە ڕێگەی پێ دراوە لە هەردوو مادەی (١٠)و (١١)ی یاسای دروستکردنی کۆمەڵەی هەرەوەزی ژمارە (٧٣) لە ساڵی (١٩٥٩)دا، بە پێی ئەو گۆڕانانەی کە بەسەریدا هاتووە بڕیاردرا بە ڕێگەدان بەدروستکردنی ئەم کۆمەڵەیە لەژێر ناوی (جمعية بناء المساكن التعاونية لاعضاء نقابة المعلمين في كركوك المحدودة) بە مەرجێك پابەندبێ بەو بڕگانەی یاساکانی کۆمەڵەوە کە لەکاتی خۆیدا دەرچووە[118]، بەڵام وەك دەردەکەوێت ئەم کۆمەڵەیە دەورێکی گرنگی نەبینیوە لەخزمەتکردنی هاووڵاتیانو لەماوەیەکی کورتدا لە کارکەوتووە.

*** یانەی ئۆتۆمۆبێل:**

تەنها ئەم ناوەی لە (دليل العراق الرسمي)دا هاتووە لە ساڵی (١٩٦٠)، بەڵام هیچ شتێك نازانرێت دەربارەی کاری ئەم یانەیەو ئەندامەکانی ئەم یانەیە[119] ئەنجامیان داوە.

*** یانەی سەلام:**

ئەم یانەیەش تەنها لە (دليل العراق الرسمي)دا لەساڵی (١٩٦٠)دا باسی هاتووە، بەڵام هیچ زانیارییەکمان نییە دەربارەی ئامانجەکانی[120].

*** حیزبی کەران:**

گۆڤاری (ئەلعەرەبی) بەمجۆرە باسی ئەم حیزبە دەکات:
کورد بەوە بەناوبانگە کە ڕوحێکی خۆشی هەیە، مەیلی بەلای گاڵتەو پێکەنینەوە دەڕوات، کەکار گەیشتۆتە ئەوەی عوسمان محەمەد نادر، هەستێت بەدروست کردنی حیزبێك بەناوی حیزبی کەران لە سلێمانی لەژێر ناونیشانی (ئەی گوێدرێژەکانی جیهان یەکگرن) کە چەند لقێکی هەیە لەعێراقو هەولێدات لق لە هەموو جیهاندا بکاتەوە.. سەرۆکی حیزب هەڵدەستێت بەپشکنینی ددانی یەکێك لەئەندامە تازەکانی، چونکە یەکێك لە مەرجەکانی ئەم حیزبە ئەوەیە کەدەبێت هەموو ددانەکانی لەجێگەی خۆی بێت[131].

هەروەها لقی ئەم حیزبەیش لە کەرکوك و دەوروبەریدا برەوی هەبوو، لە ماوەی نێوان ساڵانی شەستەکانو حەفتاکان بەماوەی گەشەکردنی لەکەرکوکدا دادەنرێت.
بۆیە لە سەرەتادا ژمارەیەکی زۆری لە دەوری کۆببوۆوەو چەند کردەو کارێکیان دەکرد کەسەرنجی خەڵکیان رادەکێشا وکو ئەوەی کەریان بەپیرۆز دادەناو قەبوڵیان نەدەکرد لێی بدرێت ئەوەی لێی بدایە لێیان دەدایەوە، یان ئەو گوێدرێژەی خاوەنەکەی ناڵی نەبوایە، پێیان دەگوت کە ناڵی بۆ بکات، بۆ ئەوەی ئازاری نەبێت لەکاتی ڕۆیشتندا. بەیانیان سڵاویان لەیەکتری بکردایە شانیان دەدا بەیەکتری داو پێیان لە زەوی دەخشاندو وەکو کەر دەیان زەڕاند. هەموو لە باخەڵیان وێنەی کەرو ئاژەڵانیان هەڵدەگرتو بەپیرۆزیان دادەنا. ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتی لەنێو ئەم حیزبە هەبوون، لە ناو شاری کەرکوکدا و تا ڕادەیەکی چاك برەوی پەیداکرد بوو.



*** کۆمەڵەی مانگی سوور لقی کەرکوك ( جمعیة الهلال الاحمر ):**
ئەم کۆمەڵەیە هەر لە ساڵانی (١٩٦٠-١٩٦١)ەوە چالاکی خۆی لەناو شاری کەرکوك هەیەو، بەردەوامەو خاوەنی گۆڤارێکی وەرزییە بەو ناونیشانەوە[132].

*** گروپی کەرکوك ( جماعة کرکوك ):**
لە شەستەکاندا کۆمەڵێ شاعیرو ئەدیبی خەڵکی شاری کەرکوك بەگروپی کەرکوك (جماعة کرکوك) ناسرابوون. شۆڕشێکی شیعرییان بەرپاکردو هەوڵی نووسینی جۆرێك لە پەخشانە شیعری عێراقیان دەدا جیاواز بوو لە هەوڵەکانی گروپی شیعری لوبنانی. ئەم شاعیرو ئەدیبانە بریتی بوون لە سەرگۆن پۆڵس، جان دەمۆ، جەلیل قەیسی، موئەید ڕاوی، سەلاح فایەق، فازڵ عەزاوی، ئەنور غەسانی، یوسف حەیدەری، محێدین زەنگەنە، الاب یوسف سەعید، قەحتان هورمزی، جەلال وەردە، زوهدی داودی، خاچیك گرابێت ئایدنجیان.
گروپی کەرکوك گەرچی قوتابخانەیەك، یاخود ڕێبازێکی ئەدەبییان پێك نەهێنا، تەنانەت مانیفێستێکی شیعری، گۆڤارێکیشیان دەرنەکرد، هەروەها ناوی گروپی کەرکوکیش لە خۆیان نەبووە، بەڵکو پاش چەند ساڵێك، پاش ئەوەی ڕایەڵێکی گرنگیان لە شیعری نوێی عێراقیدا بینی، ئەو ناوەیان لێنرا، ئەویش بە هیچ مەبەستێکی ئەدەبی نا، بەڵکو تەنها بەمەبەستی ئاماژەبۆکردنیان لەلایەن ئەدیبانی بەغداو شارەکانی ترەوە. ئەم شاعیرانە خاوەنی تایبەتمەندی خۆیانو نوێنەرایەتی لایەنە یاخی و وجودی و ئەزموونگەری و تازەگەرییەکی شیعری نوێی عێراقیان دەکرد. بەڵام ئەم کۆمەڵە شاعیرە تەنها گروپێك بوون لە شەستەکاندا توانیان بەئەزمونێکی تایبەتەوە، لەژێر کاریگەری شیعری ئازادی ئینگلۆسەکسۆنیدا پەخشانە شیعر بنووسنەوەو جۆرە دابڕانێك لەگەڵ شیعری عێراقی ئەو سەردەمەدا دروست بکەن کە (تفصیلە)ی کردبووە توخمێکی جەوهەری بینای شیعری خۆی، تەنانەت خۆیان لەگروپی شیعری لوبنانیش جیادەکردەوە، کە کاریگەری پەخشانە شیعری فەرەنسیان بەسەرەوە بوو.
بەڵام بەهۆی بچووکی شاری کەرکوك و نەگەیشتنی گۆڤارو کتێب و هەستکردنیان بەنامۆیی ڕۆشنبیری لەو شارەدا مەیلی کۆچکردنیان کەوتە سەر. ئەوەبوو لە ناوەڕاستی شەستەکاندا ئەنوەرو سەرگۆن و موئەیدو جان، چوونە بەغدا، (فازڵ)یش پێش ئەوان بۆ خوێندن چوو بوو، جەلیل قەیسی لە بەغدا نەمایەوەو، پێش ئەوان بۆ ئەمەریکا سەفەری کردو پاش ساڵێك گەڕایەوە کەرکوك. سەلاح فایەق لە سەرەتای حەفتاکاندا چووە بەغدا. لەو نووسەرو ئەدیبە کوردانەی کە بەشداریان لەم گروپە کرد ژمارەیەکیان ڕۆڵێکی کاریگەریان لە هونەرو ئەدەبی کوردی بینی لەوانە: سەلاح فایەق و یوسف حەیدەری و محێدین زەنگەنەو جەلال وەردەو زوهدی داودی[133]، بەڵام زیاتریان محێدین زەنگەنە، دەنگی دایەوەو چەند شاکارێکی بەنرخی نووسی کە جێ پەنجەی جوانکاری پێوە دیاربوو لەهەموو ڕوویەکەوە.

*** لقی کۆمەڵەی ( جمعیة مکافحة التدرن الرئوي ):**
پارێزگاری کەرکوك ڕێگەی بە بەڕێز حیسامەدین ساڵەیی و هاوڕێکانیدا بە نووسراوی ژمارە (٨٠٥٣)ی ڕۆژی (٢١)ی تەموزی ساڵی (١٩٦٦)دا بەکردنەوەی ئەم کۆمەڵەیە لەکەرکوکدا ئەویش بەپێی ئەو کارپێکردنەی برگەی یەکەمی مادەی سیانزەهەمی یاسای کۆمەڵەکانی ژمارە یەك ساڵی (١٩٦٠)، هەروەها بنکەی گشتی ڕەزامەندی خۆی نیشاندا بەکردنەوەی لقی ئەم کۆمەڵەیە لە کەرکوك بەنووسراوی ژمارە (١١٣)ی ڕۆژی (١٣)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٠)[134].

کە ئەمە وادەگەنێت پارێزگاری کەرکوك دوای ڕەزامەندی بنکەی سەرەکی کۆمەڵەکە لەبەغدا، ڕێگەی داوە بەکردنەوەی ئەم کۆمەڵەیە لە کەرکوك.

*** کۆمەڵەی (منداڵپارێزی) لقی کەرکوك (جمعیة حمایة الاطفال فرع کرکوك):**

لە ڕۆژنامەی (کەرکوك) ژمارە (١٨٠٧)ی لە ڕۆژی (١٣)ی ئاداری ساڵی (١٩٦٣)دا بەم جۆرە باسی ئەم کۆمەڵەیە هاتووە:

لە سەعات دەی بەیانی ڕۆژی هەینی (٢٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٦٣) لە شوێنی کۆمەڵەکە هەڵبژاردنی دەستەی کارگێڕی کۆمەڵە کراو بەم جۆرە بوو:

| | |
|---|---|
| دکتۆر ڕەزا تاهیر عوسمان | سەرۆك |
| حیسامەدین ساڵەیی | جێگر |
| نازم ساڵەیی | سکرتێر |
| شاکر شوکری | سندوقدار |
| د. جۆرج نوری | ئەندام |
| د. خەیری حەججاسی | ئەندام |
| د. سابیر ڕەشید | ئەندام |
| محەمەد ساڵەیی | ئەندام |
| حاجی عەبدولواحید | ئەندام[١٢٥]. |

*** یانەی وەرزشی سۆلاڤ (نادي سولاف الریاضي):**

ڕۆژنامەی کەرکوك ئاوا باسی کردنەوەی ئەم یانەیە دەکات: (کۆمەڵێك لە وەرزشەوانە بەناوبانگەکانی گۆڕەپانی وەرزش لە شاری کەرکوك، وەکو مامۆستا ستار شێخ عەبدوڵڵا، نەجیب ساڵح، پیرۆت تاڵەبانی، سەلاح ساڵح، ستار محەمەد ڕەسوڵ، مەجید کەریم و ژمارەیەکی تر، داواکارییەکیان پێشکەش بەوەزارەتی ناوخۆ کرد بۆ دروستکردنی یانەیەکی وەرزشی بەناوی سۆلاڤەوە[١٢٦]. هەروەها لە ژمارە (١٩٧٩)ی ڕۆژنامەی کەرکوك ڕۆژی (١٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٩)دا بەمجۆرە باسی ڕێگەدانی ئەم یانەیە دەکات. (وەزیری ناوخۆ ڕێگەیدا بەکردنەوەی ئەم یانەیە لەلایەن بەڕێز عەبدولستار محەمەد ڕەسوڵ و، هاوڕێکانی بەکردنەوەی یانەکە بەناوی (یانەی وەرزشی سۆلاڤ) لەکەرکوك بەپێی نوسراوی ژمارە (١٧٤٧)ی ڕۆژی (٣٠)ی تەموزی ساڵی (١٩٦٩)[١٢٧]. ئەم یانەیە دەورێکی گرنگی لەشاری کەرکوکدا بینی و گەلێك چالاکی گرنگی نواند لە ڕووی وەرزشەوە کە تاکو کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان هەر بەردەوام بوو، کە لەدوایدا ناوەکەی گۆڕاو شوێنەکەی گوێزرایەوەو کرایە (نادي الکرامة الریاضي) لەگەڕەکی ئازادی.

*** کۆمەڵەی (ڕەنجدەرانی کوردستان):**

"دوای ڕاگەیاندنی بەیانی (١١) ئاداری ساڵی (١٩٧٠) و تێکەڵبوونەوەی هەردوو باڵەکەی (پارتی دیموکراتی کوردستان)، مام جەلال پێی وابوو کە پێویست دەکات ڕێکخستنێکی مارکسی – لینینی بێتەکایەوە. بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی (١٩٧٠) لە شاری بەغدا چەند کۆبوونەوەیەك بەسترا، لە کۆتاییدا لە (١٠)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٠) بڕیار لەسەر دروستکردنی کۆمەڵەی مارکسی – لینینی کوردستان درا (دواتر ناوەکەی گۆڕا).

ئەم کۆمەڵەیە سەرەتا بەشێوەی ڕەوتێکی هزری لە ئارادا بوو، یەکەمین دەست پێشخەری بۆ ئەم کارە بە سەرپەرشتی مام جەلال و بەشداریکردنی (شەهاب شێخ نوری، فازڵ مەلا مەحموود، فەرەیدون عەبدولقادر) ئەنجامدرا، وورده وورده چالاکییەکانیان پەرەی سەند، کۆمەڵە بە ڕەنگدانەوەیەکی تێروپڕی بیروباوەڕی (ماوتسی تۆنگ)و تێزەکانی جەنگی میللییەوە هاتە مەیدانی تێکۆشان.

ئەندامەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ساڵی (١٩٧٠) لەم ناوانە پێکهاتبوون:

– (شەهاب شێخ نوری) سکرتێری کۆمەڵە (لە ناوخۆ).
– (محەمەد میرزا سەعید عەباس)، لێپرسراوی لیژنەی بەغدا.
– (جەعفەر عەبدولواحید) لێپرسراوی لیژنەی هەولێر.
– (ئاوات عەبدولغەفور) لێپرسراوی لیژنەی سلێمانی.
– (فەرەیدون عەبدولقادر) لێپرسراوی لیژنەی کەرکوك.

ئەندامانی کۆمەڵە لەم قۆناغەدا زۆر بە ژیری و وریایی کاریان دەکرد بۆ پاراستنی نهێنی و ڕێکخستنەکانیان، لە ماوەی شەڕی ساڵی (١٩٧٤ – ١٩٧٥) لە نێوان کوردو حکومەتی بەغدا بەشی زۆریان بەشداری کارایان کردووە، هەر لە دوای تێکشکانی شۆڕش.

لەو ساڵەدا کادیرو ئەندامانی کۆمەڵە گەڕانەوە بۆ شارەکانی خۆیان بۆ خۆ ڕێکخستن و خۆ ئامادەکردن بۆ خەباتی پارتیزانی درێژخایەن.

لە ئەیلولی ساڵی (١٩٧٥) ئاشکرابوونی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەو دەستگیرکردنی ژمارەیەك کادیری سەرکردایەتی و ئەندامانیان، کارەساتێك بوو بەسەر کۆمەڵە، کە لە دوایشدا چەند سەرکردەیەکی وەك (شەهاب شێخ نوری، جەعفەر عەبدولواحید، ئەنوەر زۆراب)، بڕیاری کوشتنیان لەسەر جێبەجێ کرا.

لەم بارودۆخەدا (ئارام) شاسوار جەلال کە کادیرێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوو بە هاوکاری چەند هاوڕێیەکی توانییان کۆمیتەیەك پێکبهێنن بۆ سەرپەرشتیکردنی شارەکان، ئەندامانی کۆمیتەکە بریتی بوون لە:

١. شاسوار جەلال (ئارام).
٢. نەجمەدین عەزیز (سالار).
٣. ئازاد هەورامی (عادل).
٤. حیکمەت محەمەد (مەلا بەختیار).
٥. عەبدولڕەزاق محەمەد.

کۆمەڵە لە دروستبوونی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) وەك باڵێکی سەرەکی بەشداری کرد لە هەموو دامەزراوەو ئۆرگانەکانی، لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی ساڵی (١٩٧٦) زۆر بە گەرمی کادیرو پێشمەرگەکانی بەشدابوونەو بە دەیان شەهیدیان هەبووە.

کۆمەڵە لە ماوەی ساڵانی خەباتی ئاشکرای لە ساڵانی (١٩٧٦ – ١٩٩١) لە شاخدا چەند گۆڕانکارییەك بەسەر ڕێکخستنەکانی و پێکهاتەی هاتووەو تووشی چەندین

ململانێ و دووبەرەکی بۆتەوە.
لە یەکەم کۆنگرەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لە ساڵی (١٩٩٢) کە (نەوشیروان مستەفا) سکرتێری کۆمەڵە بووە، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی خۆیان داوەو تێکەڵی ڕێکخستنەکانی یەکێتی بوون"[١٢٨].
لە ماوەی چالاکییان تاوەکو هەڵوەشانەوەی دەورێکی باڵایان بینییوە لە ڕێگای ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناو شاری کەرکوکداو گەلێك چالاکی گرنگو بە پێزیان ئەنجامداوەو گورزی کوشندەیان لە حکومەتی بەعس وەشاندووە.

*** کۆمەڵەی (سەوز - البساط الاخضر):**
هەندێك لە سەرچاوەکانی دەماودەم باس لە دروستکردنی ئەم کۆمەڵەیە دەکان لە حەفتاکان لە گوندی (باوە)ی ناوچەی کەرکوك کە بنکەی سەرەکیشی لەم گوندە بووەو عەبدولکەریم ناوێك سەرۆکی بووە. هەرییەکە لە حەسەن بەکر مەعروف و نەجم ڕەحیم عەبدولکەریم ئەندام بوونە لەم کۆمەڵەیەدا.

*** یەکێتی نووسەرانی کورد - لقی کەرکوك:**
دوابەدوای ساڵانی (١٩٦٩)و سەرەتای ساڵی (١٩٧٠) بیرۆکەی دامەزراندنی ڕێکخراوێك بۆ نووسەرانی کورد لە کوردستان و بەغدا سەری هەڵدابوو، ئەمەبوو لەو ماوەیەدا دوو لاوی ڕووناکبیرو چالاك لە کۆڕی وێژەی کوردی، کاکە مەم بۆتانی و جوانەمەرگ لەتیف سەید حامید لە سەردانێکیان بۆ بەغدا بیرۆکەی دامەزراندنی ڕێکخراوێکیان بۆ نووسەران خستە سەر باس لەگەڵ بەڕێز (عوسمان مستەفا خۆشناو).
ئەوەبوو لە ڕۆژی (٣٠)ی ئابی ساڵی (١٩٧١) بە بیروباوەڕێکی بە هێزو پڕ لە حەماسەت ڕۆشنبیرو ئەدیبانی کەرکوك کە ژمارەیان (٣٨) کەس بوو خۆیان کۆکردەوەو ئامادەبوون لە هۆڵی بارەگای پارتی دیموکراتی کورد، بۆ هەڵبژاردنی لقی کەرکوك بە چاودێری شاندێك کە لە بەغداوە بۆ ئەو مەبەستە هاتبوون و بریتی بوون لە عەزیز عەقراوی، دارا تۆفیق و حەمەدەمین عوسمان، لەگەڵ لیژنەیەکی میری بۆ هەمان مەبەست لە سەرۆکایەتی جێگری پارێزگاری کەرکوك بەڕێز شێخ ئەحمەد نەقشبەندی بە کۆنفرانسەکە ناسێنران، ئینجا شێخ ئەحمەد ڕووی کردە ئەندامانی کۆنفرانسەکەو وتی:
"ئێوەی ئەندامانی (یەکێتی نووسەرانی کورد) لە کەرکوك بە خێرهاتن لە ئێوەو میوانە بەڕێزەکان دەکەین ئێستا سەرەبستن لە کاروبارەکانتان تکایە دەستەیەك بە پێشنیاری نهێنی، لەناو خۆتان هەڵبژێرن بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری لقی کەرکوك.
ئەوە بوو کاغەزی سپی کە بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرابوو دابەشکراو بە ڕێنمایی کاك عەزیز عەقراوی یەکێك لە ئەندامان هەستا لەسەر تەختەڕەش ئەم (٧) ناوەی خوارەوەی تۆمار کرد:
(شێخ ڕەئووف خانەقا، عەزیز خانەقا، تاهیر سادق، فوئاد تاهیر سادق، ڕەزا شوان، شێخ حوسێن بەرزنجی، عوسمان خۆشناو)".
لە کۆتاییدا ڕێژەی ئەندامەکان بەم جۆرە بوو:

١. عوسمان مستەفا خۆشناو (٣١) دەنگ.
٢. شێخ ڕەئووف خانەقا (١٧) دەنگ.
٣. عەزیز خانەقا (١٥) دەنگ.
٤. ڕەزا شوان (١١) دەنگ.
٥. فوئاد تاهیر سادق (١٠) دەنگ.
٦. تاهیر سادق (٩) دەنگ.
٧. شێخ حوسێن بەرزنجی (٧) دەنگ[١٢٩].

*** کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی:**
ئەم کۆمەڵەیە لە بەرواری (٦)ی ئاداری ساڵی (١٩٧١) مۆڵەتی کارکردنی وەرگرت وبارەگای لە گەڕەکی شۆڕیجە دانرا ستافی دامەزرێنەریش لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو:
جەمیل جێماو، عەبدولڕەحمان محەمەد عەلی، محەمەد ڕەشید سەید عەلی، عەلی محەمەد مستەفا، عەلاو، عەلی کەریمی بۆیاخچی، عەزیز سەیدە، سالار ئەحمەد شا محەمەد، نیعمەت خەیات، سەردار محەمەد خورشید، محەمەد حاجی حوسێن
کاریان ئاگاداری وکۆکردنەوەی ئەدیب وهونەرمەندان بوو لە دەوری کۆمەڵەو پاشان خۆ سازدان بۆ بەستنی کۆنفرانس و هەڵبژاردنی دەستەیەکی تۆکمە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش وکارەکان، ئەوەبوو لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧١) یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە بەسترا.
هەروەها بەڕێزان:
فایەق عەبدوڵلا عوزێری و نعیمەت خەیات و عەلی کەریم و ڕەحیم عەلی، بە ئەندامی یەدەك دەرچوون.
دواتر بە گیانێکی پێشمەرگە ئاسا دەستکرا بە ئەنجامدانی کاروچالاکی جۆراوجۆر، ئەوەبوو پاش چەند ڕۆژێك لە دوای کاروچالاکی جۆراوجۆر، ئەوەبوو پاش چەند ڕۆژێك لە دوای هەڵبژاردن، ئاهەنگێکی قەشەنگیان سازکرد لە قوتابخانەی سەلاحەدین لە گەڕەکی شۆڕیجە بووە جێی خۆشحاڵی جەماوەری شار، چالاکییەکانیش بریتی بوون لە شانۆگەری کەبابخانەی خولە شەل لە نووسین و دەرهێنانی جەمیل جێماو ئۆپەرێتی شەهید لە ئامادەکردن و دەرهێنانی مەهدی ئومێد و چەندین گۆرانی وپارچە مۆسیقاش پێشکەش کران و بۆ ماوەی سێ ڕۆژیش بەردەوام بوو، ئەمەو چەندین ئاهەنگ وچالاکی دیکەی بەپێز پێشکەش کران لەوانە زنجیرە درامای مەرەزە، بەهاری دزراو، شانۆگەری تەقینەوە کە خەڵاتی یەکەمی فستیڤاڵی یەکەمی شانۆی کوردی بە دەست هێنا لە ساڵی ١٩٧٤ لە بەغدا کە لە دەرهێنانی هونەرمەند سەلمان فایەق کاکەیی بوون.
کاروچالاکییەکانی کۆمەڵە تا دەهات لە گەشەسەندندا بوو، بەڵام لە ئەنجامی پێشێلکردنی بەندەکانی ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) لەلایەن ڕژێمەوە، کە ڕەنگدانەوەیەکی زۆر نێگەتیڤانەی لەسەر نەتەوەکەماندا هەبوو، کۆمەڵەش وەك ڕێکخراوێکی ڕۆشنبیری کوردی باری ئاسایی خۆی لەدەستدا هەروەها بەپێی ئەو زانیارییانەی کە لە ئەرشیفی هونەرمەندی خوالێخۆشبوو جەمیل جێماو دەستمان کەوت ئەو کات لە نزیکەوە ئاگای لە باری ئاسایی

ونائاسایی لقەکە بوو، دوای پیلانە شوومەکەی جەزائیر ونسکۆی شۆڕشی کورد، دەستەیەك لە هونەرمەندان وئەدیبان بەمەبەستی ژیانەوەی کۆمەڵە سەردانی پارێزگای ئەو کاتەی کەرکوکیان کرد وئەویش پێی ڕاگەیاندن دەبێ ڕەزامەندی (مدير امن) وەربگرن، وارێککەوت (مدير امن) لەو کاتەدا لەوێ دانیشتبوو، ئەویش وتی مەرجێك ڕازی دەبین بەرهەمەکانتان ببینین و پاشان نمایش بکرێ ئەوەبوو ئەندامانی کۆمەڵ هیچ وەڵامێکیان پێ نەبوو، بۆیە لە کۆبونەوەییەکی نائاسایی بڕیاریاندا ئەو نۆکەرایەتییە قبوڵ نەکەن لە ئەنجامدا ئیدارەی شار بڕیاری داخستنی کۆمەڵەی دەرکردو دەستیشی گرتە سەر کەلوپەلەکانی[١٣٠].

*** کۆمیتەی ئاگر - کۆمیتەی ئیمام قاسم (یەکێتی نیشتمانی کوردستان):**

ئەمیش یەکێك لەو هێزە سیاسیانەی گۆڕەپانی کوردستان کەدەورێکی باڵای بینیووە، لەخەبات کردن وجۆشدان هێزی گەل لەگەڵ هەنگاوەکانی بەدەست هێنانی مافەکاندا لەگەڵ هەرەس هێنانی شۆڕشی کورد لە ساڵی (١٩٧٤)دا ودەست تێوەردانی هێزی ئەقلیمی ودراوسێکانی عێراق لە شۆڕشەکەو ئیمزاکردنی ڕێککەوتنامەی جەزائیر لە نێوان عێراق وشای ئێران هەنگاوێکی گەورەی نێودەوڵەتی بوو بۆ توانەوەی شۆڕشی کورد لەو کاتەدا.

لەگەڵ دووبارە ڕێکخستنەوەی چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگە لەم شارەدا چالاکی و ڕێکخستنەکانی یەکێتی پەل وپۆی داکوتا و بەشێوەیەکی چالاك گەلێك پۆڵ و دەستەو ڕێکخستنی لەناوشاردا چالاکی خۆیان بەردەوام کرد چ لەسەر ئاستی سەربازییان، چالاکی حیزبی کە بەشێوەیەکی بەرچاو سەرنجی ڕاکێشاو کەوتە کەمین وچاودێری کردنی ئەو چالاکییانەی وگرتنی خەڵکێکی زۆر بۆ ئاشکرا کردنی چالاکییەکانیان.

یەکێك لەو چالاکییانەی کە لە شاری کەرکوکدا برەوی سەند لە چوارچێوەی کۆمیتەی ئاگر بوو. کە زۆر دەورێکی باڵایان بینی لە خەبات لە نێو شارەکەدا.

"ئەو کۆمیتەیە لە کۆمەڵێك خەڵکی قارەمان و چاونەترس پێکهاتبوو، خەباتیان دەکرد لە پێناو بەرز کردنەوەی ئاستی وشیاری خەڵکی شارەکە وچاندنی گیانی فیداکاری لە ناو خەڵکدا، ئەمە یەکێك بوو لەئامانجە سەرەکییەکانی ئەوکۆمیتەیەو هەمیشە هاوکات لەگەڵ خەباتی سیاسی ونهێنی کاریان بۆ دەکردو لەو کاتەوە کۆمەڵێك لاویان لە دەوری خۆیان کۆدەکردەوە ئەڵقەکانی ڕۆشنبیری وشانەکانی ڕێکخستنی دروستبوون، گەلێك لێپرسراوەیی ئەو کۆمیتەیەیان گرتۆتە ئەستۆ لەوانە شەهید سیروان تاڵەبانی و شەهیدی سەرکردە ئازاد هەورامی وکاك ئەبوشەهاب و ئەحمەد کرێکار و مامۆستا کاکە ڕەشیش لە نێوان ساڵانی (١٩٧٩-١٩٨٠) ئەوئەرکەی پێ سپێردرا.

لە ناوەڕاستی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨١) ڕژێمی بەعسی ڕووخاو چەند قارەمانێکی ئەو کۆمیتەیەی دەستگیر کردو ڕاپێچی زیندانەکانی کردن وبڵێسەی شۆڕش زیاتر پەرەی سەند تا حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەکردن.

شەهیدەکان: مەلا محێدین، هادی قادر، مامۆستا ڕەشاد، عەبدولمەستور، فاررووق عومەر، جەنگی نەجمەدین، فەهمی ئەمین، ئەسعەد عەزیز، حەسەن حەمە عەلی، عەبدولقادر بەکر، سیروان محەمەد ئەمین، جەبار ساڵح فەرەج، عەبدولکەریم حەمە عەلی، عەدنان محەمەد ئەمین، فەرهاد محەمەد سەعید، لەتیف محەمەد ئەمین بوون[١٣١].

"لە یاداشتەکانی (ئەحمەد کرێکار)دا ئاوها باسی سەرەتای دروستبوون و چالاکی و ئەنجامەکانی کۆمیتەی ئاگر دەکات: ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەناو شاری کەرکوك سەرەتا لیژنەی شار بوو، نەك کۆمیتەی ئاگر، بە هەوڵ و تێکۆشانی عەلی بچکۆل و ئەبو شەهاب و مام حەمید محەمەدو پاشان کاك فەرەیدون عەبدولقادر، دروست بوو، لە ساڵی (١٩٧٣) وە ئیبراهیم جەلال بە هۆی وەزیفەکەیەوە هاتە کەرکوك و بەشداری کردووە لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا، بە تایبەتی لیژنەی شار.

لە ساڵی (١٩٧٤)دا کە شەڕ دەستی پێکردەوە، زۆربەی برادەران چوونە دەرەوە، لەوانە (فەرەیدون عەبدولقادر، عەلی بچکۆل، ئازاد هەورامی)، ئیتر ئەبو شەهاب بوو بە سەرپەرشتیاری لیژنەی شاری کەرکوك بە ئەندامێتی ئەحمەد کرێکارو ئیبراهیم جەلال، ئەبو شەهاب دوای سێ مانگ پەیوەندی کرد بە پێشمەرگەوە، بە ئێمەی نەوتبوو کە ئەڕوات ئەبێت بە پێشمەرگە، دواتر عەلی بچکۆل نامەیەکی بۆ من ناردو ئەڵێت: ئەبو شەهاب بۆتە پێشمەگەو ناگەڕێتەوە، ئێوە لە کاری خۆتان بەردەوام بن، هەر لەو سەردەمەدا ئیبراهیم جەلال دەستگیر کرا.

لەناو شاردا ژمارەیەکی کەمماینەوە لەوانە نەجمەددین فەقێ عەبدوڵڵاو مامۆستا محەمەد حەسەن و محەمەد دێوانە شەریف و هەندێکی تر، ئەوەندەی پێ نەچوو، شکستی شۆڕشی بەسەردا هات، برادەرانی دەرەوە هاتنەوە ناو شار، یەکسەر بە حەماسەتەوە هەوڵیاندا ڕێکخستنەکانی ناوەوەو دەرەوە یەك بخەن.

پاش یەکخستنەوەی کۆمیتەی شارو شاخ کۆمیتە نوێیەکە ناونرا کۆمیتەی کەرکوك، ئەندامەکانی بریتی بوون لە (سیروان تاڵەبانی، ئازاد هەورامی، ئەحمەد کرێکار)و سێ کۆبوونەوەش کرا: یەکەم کۆبوونەوە بە سەرپەرشتی سیروان تاڵەبانی بوو لە ماڵی خۆیان ئەنجامدرا، کۆبوونەوەی دووەم لە ماڵی ئازاد هەورامی کراو سێیەمین کۆبوونەوەش دیسان لە ماڵی سیروان تاڵەبانی کرایەوە، لە سەرەتای کۆبوونەوەکەدا ئازاد هەورامی وتی: ئەمجارە دەبێت خۆمان شۆڕش بەرپا کەین و خۆشمان بچینە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی..و ئیتر ئەم کۆمیتەیە دواتر ناونرا (کۆمیتەی ئاگر).

هەر بۆیە جەماوەری شاری کەرکوك بە گشتی بە هەموو شێوازێك ویستویانە ڕووبەڕووی ئەم ڕژێمە ڕەفتار فاشییە ببنەوە، بۆیە بەشێکی زۆری سەرکردەکانی ئەو کاتەی کۆمەڵە خاڵە شەهاب و فەرەیدون عەبدولقادرو ئەنوەر زۆراب و چەندانی تر لەو شارە ئەمانەوەو کۆبوونەوەیان ئەکردو ئیختیفایان ئەکرد، واتە کەرکوك هەمیشە کوانووی



شەهید جەلیل نەجمەددین نوری



شەهید جەبار فەرەج ساڵح



سەید حەسەن ئەحمەد جەباری



شەهید عەبدلوەهاب حازم محەمەد



شەهید ئەسعەد عەزیز شەریف



شەهید حەسەن محەمەد عەلی شەریف



شەهید هادی قادر عەلی



شەهید فەهمی ئەمین ڕەشید



شەهید فەرهاد محەمەد سەعید



شەهید محێدین حوسێن حەسەن



شەهید ڕەشاد محەمەد ئەمین

خەبات و پەناگەی خەباتگێڕان و شۆڕشگێڕان بووە و یەکەمین حەشارگەی کۆمەڵە لە شاری کەرکوکدا بوو.

ژێـر زەمینەکەی ماڵی مام حەمید محەمەد کە لە گەڕەکی ئازادی بوو لە ساڵی (١٩٧٢)دا درووستکرا، درووستکردنی بە پێشنیاری خاڵە شەهاب و بەکاری هەرەوەزی ئەندامانی کۆمەڵە بوو، لە ساڵی (١٩٧٣)دا تـەواو بوو، ئەم خانووە ژێرزەمینێکی بۆ کرا بوو، لەوێدا یەکەمین بڵاوکراوە بە ناوی (ئـاڵای سـوور)ەوە دەرکـراو لـەلایـەن (مـەلا عەبدولڕەحمان پێنجوێنی)ەوە چاپ کرا، بەیانەکەش لەلایەن خاڵە شەهاب و کاك فەرەیدونەوە نووسرا.

کاك عەلی بچکۆل دەگێڕێتەوە: تابیعەکەم لە ماڵ فەرەیدون عەبدولقادر، کە ئەو کات ماڵیان لەسەر ڕێگەی بەغدا بوو وەرگرت و هێنامە ماڵی خۆمان لە گەڕەکی جووت قاوە، بۆ بەیانییەکەی (تەئمینی نەوت)مان بەو تایپێستە دەرکرد، کە فەرەیدون عەبدولقادر نووسیبووی.

ئەو تابیعەیە بچووك بوو، پیتەکانیشی بە کوردی بوو، پاش ئەوەی ماڵەکەی مام حەمید تەواو کراو ژێر زەمینەکەی کرا بە (حەشارگە)، تابیعەکە برایە ئەوێ.

هەر بۆ هەمان مەبەست مام حەمید دەڵێت:

لەناو باخچەی ماڵەکەمان دەرگایەکی نهێنیمان دروستکردبوو بۆ ژێرزەمینەکە، هەر کەسێك هاتوچۆی ماڵی ئێمەی بکردایە وەردە مستەفای خێزانم ئەیناسی و قەپاغی سەردەرگاکەی بۆ هەڵئەدایەوە، قەپاغەکە وەك سەری مەنهۆڵ دروستکرابوو، کە قەپاغەکە لائەدرا دەرگایەك ئەکرایەوە بە پلیکانە ئەچوویتە ژێـرزەمـیـنـەکـە، سـەری مـەنـۆهـڵ ئـاسـاکـەش بـە خـۆڵ و گڵ دائەپۆشرایەوە، زۆر بە وەستایی و شارەزایی ئەم دەرگایە و قەپاغەکەی دروستکرابوو.

دوای چوونە دەرەوەی خاڵە شەهاب و فەرەیدون عەبدولقادر و عەلی بچکۆل نەمانتوانی پارێزگاری لەو تابیعە بکەین و بەکاری بهێنین، بۆیە ناردمانە چەمی (سوور قاوشان) بۆ لای عەلی بچکۆل.

دوای ڕووداوەکەی هەکاری برادەران هەندێکیان گەڕانەوە، بێستون عەسکەری تووشی نەخۆشی ببوو، لە سلێمانی مابووە بۆ چارەسەرکردن، ئێمە خەتێکی ڕێکخستنەمان لە سلێمانی هەبوو ژمارەیان (١٧) کەس بوو، پەیوەندیان بە کەرکوکەوە هەبوو لە ڕێگەی بێستونەوە (دواتر شەهید کرا).

ئەو هێڵی ڕێکخستنەی کە شەهید حەمە غەریب (هیوا ساڵح)و ئاسۆ عەلی سەرپەرشتیان ئەکرد پەیوەندیان کرد بە ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگرەوە لە کەرکوك و چەندین چالاکیان لەناو شاری سلێمانیدا ئەنجام دابوو، یەکێك لەو چالاکییانە ڕفاندنی دوو تابیعە و ڕۆنیۆیەك بوو لە ئامادەیی بازرگانی سلێمانی بە هاوکاری مام بێستون، ئاسۆ عەلی شـارەزایـی تـەواوی نـاو ئامادەیەکە و کاتی ئامادەبوونی ئێشکگرەکە بوو، ئاسۆ عەلی و هیوا سـاڵح دەسـت و پێی ئێشکگرەکە ئەبەستن و مام بێستون لە دەرەوەی ئامادەییەکە بە عەرەبانەیەکی شێلم فرۆشییەوە ئەوەستێ و بە پەلە خۆی ئەکات بەناو ئامادەییەکەداو دوو تابیعە و ڕۆنیۆکەی لێ بار ئەکەن و ئەیبەنە ماڵی هیوا لە (ولۆبە)، دواتر بڕیاردرا تابیعەیەك و ڕۆنیۆکە تەسلیمی هـاوڕێ سەلیم بکرێت بۆ جێبەجێکردنی کـاروبـاری ڕێکخستنەکانی سلێمانی و تابیعەی دووەمـیـش گەیەنرایە کـەرکـوك و درایـە دەسـتی ئەحمەد کرێکار، پاشان تابیعەکە خرایە ناو کارتۆنێکەوە و برا بۆ ماڵی ئەبو شەهاب لە گەڕەکی ئیمام قاسم، ئیتر لەو کاتەوە ئـەو تابیعەیە ئیش و کـاری کۆمیتەی ئاگری پێی ئەنجام ئەدرا.

ئەو کەسەی یەکەمین جار لەسەر ئەو تابیعەیە کاری کرد سوهەیلە حەسەن خورشید بوو، خوشکی محەمەد حەسەن، کە ژنێکی قارەمان و لە خۆبوردوو بوو.

یەکەمین بڵاوکراوەی کۆمینەی ئاگر سەبارەت بە بارودۆخی شۆڕشی نوێی کوردستان دوای کارەساتی هەکاری بەو تابیعەیە چاپ کرا، لە ماڵ محەمەد حەسەن، لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٠) (تـەل)ێـکـی تایپەکە قرتـا، لـەو کاتەشدا پەیداکردنی ئەو تەلە کارێکی لە مەحاڵ نزیك بوو، بۆیە بە باشمان زانی تابیعەکە لە ناو دیوارێکی کۆندا بشاردرێتەوە، هـەرواشـی لـێـکـرا، چونکە محـەمـەد حـەسـەن سەفەرێکی نـاوچـەی قـەرەداغـی پـێ سـپـێـردرابـوو بـۆ بینینی ئـازاد هەورامی و چۆنێتی خۆئامادەکردن بۆ کۆنفراسی یەکەم، بۆیە دەمانچەیەك و تابیعەیەك و هەندێك نووسراومان لە ناو

دیوارەکەدا شاردەوە.
مالّی شەهید ئازاد هەورامی بەخاو خێزانەوەو شیرین‌و پەروین خوشکەکانی شەهید ئازاد هەورامی ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاو ئامینە خانی دایکی ئەبو شەهاب کە بەڕاستی وێنەی ژنی قارەمان‌و ئازای ڕێکخستنەکان بوو (ئاسیێ)ی کچی دێوانە شەریف‌و زەکیە خانی خوشکی هەڤاڵ عومەر قادر، کە ئەندامی یەکەمین کۆنفراسی کۆمەڵە بوو لە مالیمۆس‌و سانیە خانی خوشکی ئەبو شەهاب‌و خوشکەزاکانی، بە تایبەتی سوهەیلە خان‌و مامۆستا کوردستانی خێزانی کاکە ڕەش‌و شوکری مەلا ڕەشید ناسراو بە ئاوارەو بەهار تاڵەبانی.
با ڕۆڵی شوکریە خانی خێزانی ئیبراهیم جەلال لە یادنەکەین، هەروەها (عصریە) خەڵکی (تەرجل)و هاوسەری نائیب زابتێك بوو، ژنێکی تێکۆشەرو ماندونەناس بوو، ئەو ژنە کارێکی بێوێنەی ئەوتۆی کرد ئەوپەڕی جێگای شانازیو ستایشکردنە، بە ڕاستی قارەمان بوو، لەلایەن ڕژێمەوە دەستگیریشکرا بەڵام خۆشبەختانە بە لێبووردنی گشتی ئازاد کرا.
لە (١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٧٩) دوای هەکاری شیرازەی ڕێکخستنەکانمان پچڕا بوون، پەیوەندیمان بە سلێمانی و هەولێرەوە نەمابوو، وەزعمان خراپ بوو، کاریگەری کارەساتی هەکاری زۆر گەورە بوو، ئازاد هەورامی لە هەکاری گیرابوو، فەرەیدون عەبدولقادرو عەلی بچکۆل لە ئەبو غرێب زیندانی بوون، مام حەمید ئاگادارە ئەوەی ڕێکخستنمان پێ ڕاگرتبوو ئەو قسانە بوون کە خۆمان تەتەڵەو گەلاڵەمان ئەکرد، باوکی شەهید شاخەوان خەڵکی چالاو بوو، برادەرێك هەبوو ئیمان‌و خەتیبی یەکێك لە مزگەوتەکانی قەلادزێ بوو، بە مام تالیب مان ووت: ئێمە لە دونیای دەرەوە پچڕاوین‌و ئەمانەوێت بچین بۆ سەرکردایەتی و پەیوەندی دروستبکەین، ئیتر چووینە لای برادەرەکەی کە ناوی مەلا محەمەد بوو، مام تالیب ووتی: ئەمانە ڕەفیقمان‌و برایەکیان هەیە لەوێ پێشمەرگەیەو ئەیانەوێت بیهێننەوە، چونکە حکومەت گوشاریان ئەخاتە سەر، مەلا محەمەد پیاوانە لەگەڵمان هات بۆ ئۆردوگای (ژاراوە)و تەسلیمی قاچاغچییەکی ناسیاوی خۆی کردین‌و داوایکرد بمانگەیەنێتە (شێنێ)، لەو سەفەردا من‌و بێستون مەحموود پێکەوە بووین، بێستون شارەزابوو بۆیە هەر لەوێ وڵاخێکی بە کرێ گرت، ئێوارە دەرچووین‌و بەرەبەیان گەیشتینە خوار (شێنێ).
لەوێ وەهاب فەرماندەی مەفرەزەمان بینی (وەهاب ناوەڕاستەکەی بەهائەدین ئەحمەد)ە، بردینی بۆ مەکتەب عەسکەریو لەوێ ئەبو شەهاب لێپرسراوی لقی (شاربازێڕ) بوو، چووینە لای ئەو دواتر ئێمەی بردە لای نەوشیروان مستەفا، لەوێ قسەو باسی خۆمان بۆ کرد، ئیتر نامەی بۆ نووسین‌و ناردینی بۆ لای جەنابی مام جەلال، ئەویش زۆری پێخۆش بوو کە ئێمە لە کەرکوکەوە چووین، پرسیاری زۆری لێکردین‌و وتمان ئێمە بەناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە خەڵك کۆ ئەکەینەوەو لەناو ئەو خەڵکەشدا خەڵکە ڕۆشنبیرەکە بۆ کۆمەڵە تەنزیم ئەکەین.
پاش گەڕانەوەمان بۆ کەرکوك، بیرمان لە گەشەپێکردنی ڕێکخستنەکان کردەوە ڕێکخراوێکمان دروستکردو ناومانا ڕێکخراوی (ئیمام قاسم) کە سنووری چالاکییەکەی ئیمام قاسم‌و ناحیەی قەرەهەنجیرو قەزای چەمچەماڵ‌و ناو شوان بوو کە مەلا محێددین‌و فاتیح سابیرو مستەفا چالاوی ئەندام بوون تیایدا.
ڕێکخراوی دووەم: مام حەمید محەمەد سەرپەرشتی ئەکردو حاجی حەبیب‌و عەلی قەساب‌و جەبارە ڕەش زەنگنەیی ئەندامی بوون‌و سنوورەکەیان شۆرپجەو جەباری‌و خورماتوو و داقوق‌و تا سەر ئاوەسپی بوو.
ڕێکخراوی سێیەم: ناوی تەپەی مەلا عەبدوڵڵاو ڕەحیم ئاواو ناحیەی شوان‌و پردێ‌و دووبزی لە خۆی ئەگرت، عەلی موغاویر سەرپەرشتی ئەکرد بە ئەندامێتی عەریف نامیق‌و موحسین عومەر (ناسراو بە ڕەنجەی مام عومەر)و مەلا فەرمان.
ڕێکخراوی چوارەم: ڕێکخراوی خوێندکاران بوو مامۆستا محەمەد حەسەن سەرپەرشتی ئەکرد.
ڕێکخراوی پێنجەم: ڕێکخراوی کاسبکاران بوو محەمەد دێوانە شەریف سەرپەرشتی ئەکرد.
لە سەرکردایەتی پێیان ڕاگەیاندبوو کە ئەبێت جێ دەستتان جگە لە کاروباری ڕێکخستن لە کاروباری سەربازیشدا دیار بێت.
مام حەمید دەمانچەیەکی چواردە خۆری کۆنی کڕی بوو بە ٤٠٠ دیناری ئەو کاتەو دەمانچەیەکی گۆڵتی وەسەتیشمان پەیدا کرد.
ئینجا عەلی بچکۆل لە زیندان ئازاد کرابوو، ببوو بە فەرماندەی هەرێمی دوو، دەمانچەیەکی (میکارۆف- کاتم صوت)و دوو دەمانچەی تری میکارۆڤ مسك سووری لە ڕێگەی مەلا بەهائەدین مامە ڕیشەوە بۆ ناردین‌و ئەویش تەسلیمی مەلا محەمەدی دێوانە شەریفی کردبوو لەوێوە ئێمە بەدەستمان گەیشت"[١٣٢].

*** بزووتنەوەی سۆشیالستی دیموکراتی کوردستان:**
"دوای تێکشکانی خەباتی چەکداری کورد لە کوردستانی عێراق ساڵی (١٩٧٥)و گەڕانەوەی ژمارەیەکی زۆری سەرکردەو کادیرو پێشمەرگەکانی بۆ ژێر دەسەڵاتی ڕژێم، دەستەیەك لە سەرکردەو کادیرانی بڕیاریاندا بە پێکهێنانی ڕێکخراوێکی سیاسی شۆڕشگێڕ لە ژێر ناوی (بزووتنەوەی سۆشیالستی دیموکراتی کوردستان).
ڕابەری ئەم بزووتنەوەیە شەهید (ساڵح یوسفی) بوو، کە پێشتر ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، لە سەرکردەکانی تری بزووتنەوە:
عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە، خالید سەعید، سەیید کاکە، تاهیر عەلی والی، ڕەسوڵ مامەند، مەلا ناسیح، سەعدی گچکە، عەلی هەژار، کاردۆ گەلاڵی.
یەکەم بەیانی ڕاگەیاندنی دامەزراندنی بزووتنەوە لە مانگی ئایاری ساڵی (١٩٧٦) دەرچووە کە تیایدا ئاماژە بۆ ئەو کارە جینۆسایدانە دەکات، کە ڕژێمی بەعس لە عێراق پێی

هەستاوەو درێژەی پێدەدا بەرامبەر بە نەتەوەی کورد.

(محەمەد شاکەلی) لە کتێبەکەی لە ژێر ناوی (لە بزووتنەوەوە بۆ حیزبی سۆشیالستی کوردستان) نووسیویەتی:

لە سەرەتای دامەزراندنی بزووتنەوەو پاشان حیزبی سۆشیالست بە هۆی کاریگەری ڕووداوە یەک لە دوای یەکەکان کە ڕووبەڕووی ئەو ڕێکخستنە نوێیە بووەو چۆنایەتی و کەسایەتی ئەو هەڤاڵانەی کە دامەزرێنەرو سەرکردەی بزووتنەوەکە بوون، زۆربەیان لە دوو هێڵی فیکری جیاوازەوە هاتبوون و پاش نسکۆی ساڵی (١٩٧٥) و لە دوای گفتوگۆیەکی زۆر گەیشتبوونە قەناعەت بەوەی سەر لە نوێ ڕێبازێکی جیاواز لەوەی پێشوویان هەڵبژێرن بۆ پێکەوە کارکردن بە بێ دژایەتی کردنی فیکری پێشوویان کە لە دوو حیزبی دیاردا (پارتی و یەکێتی) بەرجەستە بوون و هەڵسوکەوت لەگەڵ واقیعی نوێی شۆڕشدا بکەن وەکو خۆی و لە هەمان کاتدا ڕۆڵی چاکەو تەبایی لە کوردستان ببینن. بزووتنەوە بەشێک لە ئەندامەکانی سەرکردایەتی و ژمارەیەکی زۆرتر کادیرو پێشمەرگە ڕەوانەی شاخ کرد لە ناوچەکانی کوردستان بۆ دەست پێکردنەوەی خەباتی چەکداری. لە شارەکانیش چەند لقێک ڕێکخستنی نهێنی پێکهێنا وەک لە بەغداو باشووری عێراق، سلێمانی، کەرکوک، هەولێر، دهۆک"[١٣٣].

*** حیزبی (ئەلدەعوە ئەلئیسلامییە - الدعوة الاسلامية):**

"هەر چەندە لە ڕابردوودا بەشێک لە شیعەکان چووبوونە نێو هەندێک لە کۆمەڵە نهێنییەکان بۆ بەرەو ڕووبوونی داگیرکەری بەریتانی لە عێراق، وەکو (کۆمەڵەی حەرەس ئەلئیستیقلال) کە زۆربەی ئەندامەکانی لە شیعەکانی عێراق بوون، سەرکردایەتی ئەم کۆمەڵەیەش لەلایەن (محەمەد ئەلسەدر) ەوە بوو کە یەکێک لە کوڕەکانی (حەسەن ئەلسەدر) بوو لە شاری کازمییە.

ڕاوبۆچوونی شیعەکانی فیقە دەربارەی بوونی ئینگلیزەکان لە عێراقدا دوو جۆر بوو لە نێوان بەرگریکار دەژیان وەکو (سەید محەمەد کازم ئەلیەزدی) لەو سەردەمەدا گەورەترین بەرگریکاری دژی ئینگلیزەکان بوو، بەڵام یەکێکی وەکو (میرزا ئایەتوڵڵا ئەلشیرازی) لەو کەسانە بوو داوای ئەوەی دەکرد کە بیروڕای بەرگریکردن بۆ کاتێکی نادیار داخرێت، لەبەر ئەوەی هۆزەکان توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ئینگلیزەکانیان نەبوو بۆ شەڕکردن، چونکە لەوە دەترسا ئینگلیزەکان دەست بەسەر باری ئاسایشدا بگرن و ببێتە هۆکاری گێرە شێوێنی"[١٣٤].

"یەکەم ناوهێنانی (حیزبی ئەلدەعوە ئەلیسلامیە) لەلایەن (سەید محەمەد باقر ئەلسەدر)ەوە بوو، چونکە هەموو بابەتە فیکری و بڵاوکراوەکان لەلایەن ئەوە دەنووسران، لە دواییدا دەیدایە ئەندامانی دامەزرێنەر بۆ سەرنج و بۆچوون دەربارەی، لە ساڵی (١٩٥٩) یەکەم کۆنگرەی حیزب لە (کەربەلا) بەسترا"[١٣٥].

ئەوە سەرنج دەدرێت ئەو حیزبە لە ماوەی فرمانڕەوایی حیزبی بەعسدا بە هەموو جۆرێک دژی وەستاونەتەوەو گەلێک قوربانیان داوە لەو پێناوەداو تا ڕادەیەک ڕێکخستنەکانیان تووشی نووشست بووەو بەشێکی زۆریان لە بەندیخانەکانی ڕژێم تووشی کوشتن و بڕین بوونە.

"لە کاتی خۆیدا (حیزب دەعوە) بۆ بەرگریکردن لەو کارانەی بەعس کردی لە بەرامبەریان هەستان بە ڕێکخستنی ڕێپێوانی گەورە گەورە کە هەڵگری بیرو باوەڕی ڕووخاندنی ڕژێم بوون و داوای دروستبوونی دەوڵەتێکی ئیسلامییان دەکرد، بۆ نموونە گەلێک خۆپیشاندان لە (کوفە) و (نەجەف) و (بەسرە) و (ڕومێسە) و (سەماوە) ڕووبەڕووی بەعس بوونەوە"[١٣٦].

"سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران دەورێکی گەورەی بینی لە باری شیعە لە جیهاندا، بە تایبەتی لە شیعەی عێراقدا، چونکە تەنها گۆڕین نەبوو لە ڕژێمێکی سیاسی بەقەد ئەوەی گۆڕانکاری بوو لە بیروبۆچوونە فیقهییەکانەوە دەربارەی تێگەیشتن لە دەوڵەت و چۆنێتی کارووبارەکانی سەرکردە فقهییەکان تا بۆ ئەوەی بانگەوازو فەتوا ئاینییەکانی خۆیان دەربکەن"[١٣٧].

ئەوەی لە کەرکوکدا بەرچاو دەکەوێت بڵاوبوونەوەی (حیزبی دەعوە) خۆی دەبینێتەوە لە ماوەی نێوان هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، بەڵام لە ماوەکانی پێشووتردا بەو شێوە زەقە بەرچاو ناکەوێت، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ هۆی:

١. کۆچپێکردنی ڕێژەیەی زۆری شیعەکان لە خواروو و ناوەڕاستی عێراقەوە بۆ کەرکوک لە جێبەجێکردنی پرۆسەی تەعریب، ئەویش بە زەقی بەدەردەکەوێت لە کۆچپێکردنی ئەو شیعانە لەسەر ماڵ و زێدی خۆیان بۆ ئەوەی هەرەس بە بزووتنەوەکە بهێنێت.

٢. کۆچپێکردنی ئەم شیعانە بۆ کەرکوک زۆر بە زەقی بەدەرکەوت لە دوای شەڕی (عێراق - ئێران) کە بەشێکی زۆریان لە پارێزگا سنوورییەکانەوە کۆچیان پێ کرا.

٣. بەشێک لەو شیعانەی کەرکوک کە لە کۆندا نیشتەجێ بوونە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی شەڕی نێوان سەفەوی و عوسمانییەکان کە بەشێکیان لە ڕێکخراوە ئاینییەکاندا خۆیان بینیوەتەوە.

٤. بوونی ڕێژەیەکی زۆری تورکمانی شیعە لە کەرکوکدا پاڵپشتێکی گەورە بوو بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم حیزبە لە نێو کەرکوکدا، چونکە بە شێوەیەکی بەربڵاو لە (تازە، داقوق، گەڕەکی تسن) بوونیان هەبووە.

٥. هەڵهاتنی بەشێک لە شیعەکان لە خواروو و ناوەڕاستی عێراقەوە لە ترسی بەدوادا گەڕانی بەعس لە ڕێکخستنەکانیان لە شارەکانی ناوەڕاست و خواروی عێراق، بۆیە جێگیر بوونیان لە کەرکوک جۆرێک لە ئاسوودەیی و خۆشاردنەوەیانی پێیوە دەدیت.

"ئەوە لێرەدا پێویستە بڵێین کە ڕووی دیاری حیزبی دەعوە لە نێو شیعەکانی تورکمانی عێراقدا بیریتییە لە (حیزب الاتحاد الاسلامي لتركمان العراق) کە لە ماوەی شەڕی (عێراق - کوێت)دا لە ئاداری ساڵی (١٩٩١) لە ئێران دامەزرا، لە سەرەتادا سێ نووسینگەی لە شیرازو قوم و ئەسفەهان کردەوە. بەڵام لە دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام و پرۆسەی ئازادی ئەم حیزبە خۆی لکاند بە لایەنە

شیعەکان کە لە نێو پەرلەمانی عێراقدا (عەباس بەیاتی) بەڕێوەی دەبرد.
ئەم کۆمەڵە تورکمانی شیعەیە لە نێو ئەم حیزبەدا لە خۆشی و ناخۆشی لایەنە شیعییەکاندا بوون بە تایبەتی لە باسکردنی کێشەی کەرکوکدا، یان ئەوەی هاوپەیوست بوو بە هەرێمی کوردستانی عێراق.
لەبەر ئارەزوومەندی لایەنی شیعی و دەربڕین دەربارەی هەستی نەتەوەیی تورکمانەوە هەموو کاتێك هەوڵی داوە پارچەیەکی دانەبڕاو بێت لە لایەنە شیعییەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان بە تایبەتی لە چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوکدا"(١٣٨).

*** ڕەوتی کۆمۆنیست:**

ئەمەش ڕێکخراوێکی مارکسی-لینینی بوو کە لە باڵی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان جیا بوونەوە، لەدوای کارەساتەکانی ئەنفال ڕۆڵێکی بەرچاویان لە ناو شاری کەرکوکدا گێڕا، لە ناو خۆشیاندا هەوڵی دابینکردنی کاریان دەدا بۆ ئەندامەکانی خۆیان بە تایبەتی ئەندامە چالاکەکانی ناو شاری کەرکوك کە ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو بریتی بوون لە جەماڵ چاوشین، ئیسماعیل سەید قادر، شەهید خالید محەمەد عەزیز، محەمەد سەید کەریم، حەسەن کاکەیی.
لە ڕاپەڕینەکەی ساڵی (١٩٩١) چالاکی بەرچاویان لە کەرکوك ئەنجام دا، وەك دروستکردنی شورای گەڕەکەکان و دروست کردنی مەفرەزەی تایبەت کە پیاوانی تاوانباری ڕژێمی بەعسیان بە سزای گەل دەگەیاند.
ئەم ڕێکخراوە لە کۆمەڵەی کوردی ئێران و حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە نزیك بوون، بۆیە ئەو کاتە نزیکەی پانزە ژمارەی گۆڤاری پێشڕەویان لە ناو شاری کەرکوك دا بلاوکردەوە. دوای ساڵی (١٩٩٢) بە دواوە زۆربەی ئەندامەکانی ئەم ڕێکخراوە بەرەو هەندەران کۆچیان کرد.

*** حیزبی شیوعی کوردستان:**

"لە پاڵ دروستبوونی ئەم حیزبەوە کۆمەڵێك فاکتەری خودی وبابەتی بوونیان هەبوو، جیابوونەوەی شیوعیە کوردەکان لە حیزبی شیوعی عێراق و دامەزراندنی پارتێکی شیوعی کوردستانی، بۆ هەل و مەرجی دوای ڕاپەڕینی گەلی کوردستان لە ساڵی (١٩٩١) زۆر گرنگ و پێویست بوو، ئەزموونی نوێ حوکمڕانی کوردو داڕوخانی یەکێتی شورەویی و سەرهەڵدانی چەندین گۆڕانکاری ناوچەیی و نێودەوڵەتی، پێکەوەڕا زەمینە خۆشکەر بوون بۆ دامەزراندنی (ح. ش. ك.).
پێشتر وەکو دیفاکتۆ لە کۆنگرەی ساڵی (١٩٦٧)ی حیزبی شیوعی عێراقدا لیژنەی هەرێمی کوردستانی حیزب پێکهات، تاکو ساڵی (١٩٩٣) درێژەی کێشا و سەرەنجام لە کۆنگرەی (٥)ی حیزبی شیوعی عێراق، بە ڕێککەوتن و ڕەزامەندی هەمووان لیژنەی هەرێمی کوردستان گۆڕدرا بۆ حیزبی شیوعی کوردستان، بۆیە لە (١٨)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٢) بە فەرمی دروستبوونی حیزبی شیوعی کوردستان ڕاگەیاندرا، لێرە بە دواوە سەرەڕای مانەوەی پەیوەندییەکی ستراتیژی و بتەو لەگەڵ حیزبی دایك دا، بەڵام ئەم حیزبە بووە خاوەن سەرکردایەتی و ڕێکخستن و بەرنامەی تایبەت بە خۆی.
لە ڕۆژانی (١٠ - ١٨)ی تەموزی ساڵی (١٩٩٥) حیزبی شیوعی کوردستان یەکەم کۆنگرەی خۆی بەست و تێیدا (کەریم ئەحمەد داود) بە سکرتێری حیزبەکە هەڵبژێردرا، هەرچی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بوون پێکهاتبوون لە (کەماڵ شاکر ئەلزەهاوی، عەلی محەمەد کەریم، فەتاح تۆفیق فەتاح، ڕەحیم شێخ عەلی حەیدەر، سوهێل عەبدولمەجید ئەلزەهاوی، مەجید عەبدولڕەزاق مەحموود، ئیبراهیم مەحموود ئەلسوفی).
دواتر ئەم حیزبە پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ حیزبە کوردستانییەکان گرێ داو ڕێکخستنەوەکانی لە سنووری پارێزگای سلێمانی و هەولێرو دهۆك و گەرمیان ڕێکخستەوە، بارەگای لە زۆربەی شارو شارۆچکەکان کردەوە، هەروەها بەپێی قورسایی خۆی بەشداری پرۆسەی حوکمڕانی کوردستانی کرد.
لە ڕۆژانی (١٥ - ١٦)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠١)، دووەم کۆنگرەی خۆی بەست و هەڵبژاردنی بۆ سەرکردایەتییەکی نوێ کرد، لە ئێستادا (کەماڵ شاکر) سکرتێری گشتی حیزبەکەیە، لە پەرلەمانی کوردستان ئەندامێکیان هەیە و بە یەك وەزیریش بەشداری کابینەی شەشەمی حکومەتی هەرێمی کوردستانیان کردووە، لە بواری ڕاگەیاندن دا ڕۆژنامەی (ڕێگای کوردستان) بە شێوەی هەفتانە وەکو زمانحاڵی حیزبەکە دەردەکەن، هەروەها گۆڤاری (بیری نوێ)یش وەکو گۆڤارێکی هزری وەرزی دەردەکەن، چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنی و ڕادیۆیی لۆکاڵیان هەیە لە شارەکانی (سلێمانی و هەولێرو دهۆك و کەرکوك و کەلارو شەقڵاوە..)"(١٣٩).

*** کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی پارێزگای کەرکوك:**

ڕێکخراوێکی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی ومرۆڤ دۆستانەی سەربەخۆیە و کەسایەتییەکی مەعنەوی هەیە .
یەکەم کۆنگرەی کۆمەڵە لە (٢٧- ٢٩)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٥) لە هەولێر بەسترا، بۆ یەکەم جار بارەگاکەی لە هەولێر بوو لە دوایدا گوازرایەوە بۆ سلێمانی و لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە بارەگاکەی لە شاری کەرکوکەو بەردەوامە لە چالاکی خۆی و تاکو ئێستاکە بارەگاو لقی هەیە لە کفری و کەلارو دووزو داقوق و لقی چەمچەماڵی ئێستا وە ستاوە.
ئێستاکە ئەم کۆمەڵەیە سێ گۆڤارو ڕۆژنامەیەك دەردەکات کە گۆڤارەکانی (بانەڕۆژ، کەرکوك، المستقبل) و ڕۆژنامەکەی (کەرکوکی ئەمڕۆ)یە، بەڵام ڕۆژنامەکە ئێستا وەستاوە و بە شێوەی گۆڤاری دەردەچێت بە ناوی (كركوك اليوم).
ئامانجەکانی کۆمەڵە بەم جۆرەیە:
١. هەوڵدان بۆ پاراستن وگەشە پێدانی کەلتوری وفیکری و

ئەدەبی و هونەری و مێژوویی وشوێنەوارەکانی پارێزگاکە .

٢. کارکردن بۆ برەودان بە بزووتنەوەی ڕۆشنبیری وهونەری و زانستی و وەرزشی پارێزگاکەو سڕینەوەی ئاسەواری سیاسەتی شۆڤێنیانەی ڕژێم لەم بوارانەو کۆکردنەوەی کەلتووری پارێزگاکەو ڕزگارکردنی لە لەناوچوون و شێواندن

.

٣. بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری نەتەوەیی و نیشتمانی خەلکی پارێزگاکە .

٤. ڕێکخستن و پتەوکردنی پەیوەندی بە ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی نێوان سەرجەم خەلکی پارێزگاکەو چەسپاندنی نەریتە کۆمەڵایەتییە ڕەسەنەکان و ڕەتکردنەوەی ئەوانەی نارەسەن و سواوو بە زۆر بە سەر خەلکەکەیدا سەپێندراوە.

٥. کارکردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارانەی تایبەتن بە جیاکردنەوەی هەندێك لە یەکە ئیدارییەکانی پارێزگای کەرکوك وەك (دووز، کفری، کەلار، چەمچەماڵ) و گێڕانەوەیان بۆ سنووری ئیدارەی پێشووی خۆیان.

٦. هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ کێشە کۆمەڵایەتییەکان بە گشتی و بە تایبەتیش ئەو کێشانەی لە ئەنجامی پرۆسەی ڕاگواستن و ئەنفال وئاوارە بوون کەوتونەتەوە و سڕینەوەی ئاسەوارە سایکۆلۆژیەکانی.

٧. ئاساندنی ئاوەندە بە ناوخۆیی هەرێمی ونێو دەوڵەتییەکان بە دۆخی پڕکارەساتی ئاوارەو قوربانیانی ئەنفال و ڕاگوێزراوەکانی پارێزگاکە هەوڵدان بۆ بە دەستهێنانی پاڵپشتی بۆ کێشەکەیان.

٨. بەشداری کردن لە چاککردنی باری گوزەرانی دانیشتوانی پارێزگاکەو بە تایبەتیش ئاوارە و کەسوکاری ئەنفال و شەهیدان وکۆچ پێکراوەکان لە ڕووی نیشتەجێ بوون و فێربوون وباری تەندروستی و هاوکاری کردن لە گەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان وئیدارەی ناوخۆو ڕێکخراوە خێر خوازە کوردستانی و بیانییەکان[١٤٠].

٩. کارکردن بۆ گەڕانەوەی ئاوارەو کۆچ پێکراوو دوور خراوەکانی پارێزگاکە بۆ ڕێ و شوێنی خۆیان بە ڕێگایەکی ڕەوا.

١٠. هەوڵی جدی بدرێ بۆ ئەوەی پارێزگای کەرکوك ببێتە بەشێك لە ناوچەی ئارامی ژێر سایەی پارێزگاری نێو دەوڵەتی و سوودمەند بێ لە خزمەتگوزاری وپرۆژەی ڕێکخراوە خێرخوازو مرۆڤ دۆستە نێودەوڵەتییەکان بۆ کەم کردنەوەی مەینەتی خەلکی پارێزگاکە.

١١. ناردنی وەفدی کۆمەڵە: بۆ کۆڕو کۆبوونەوە نێو دەوڵەتی و هەرێمییەکان بۆ ئاگادار کردنەوەی ئەو لایەنانەو ڕای گشتی دنیا لە ژیانی پڕ مەینەتی خەلکی پارێزگاکە، لە پێناو بە دیهێنانی پاڵپشتی و پشتگیری کردن لە کێشەکانیان.

١٢. زیندووکردنەوەی بۆنە نەتەوەیی و نیشتمانی و ناوخۆییەکان.

١٣. چەسپاندنی گیانی برایەتی و خۆشەویستی وهاوکاری نێوان دانیشتوانی پارێزگاکەو دانیشتوانی پارێزگاکانی دی بەبێ جیاوازیی.

١٤. هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و ئاماری تەواو لە بارەی سەرجەم لایەکانی ژیانەکانی ژیانی خەلکی پارێزگاکە بە تایبەتی و ژمارەی ئاوارە و کۆچ پێککرا و کەسوکاری ئەنفال و ڕاگوێزراوەکان.

بەڵام لە دوای کۆنگرەی دووەمەوە چالاکییەکانی لەسەر ئاستی پێویست نەبووەو تا ڕادەیەك لە کارەکان و ئامانجەکانی لایان داوە.

*** ڕێکخراوی (ئەلقاعیدە - القاعدة):**

"سەرهەڵدانی ئەم ڕێکخراوە لە عێراقدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٢٠٠٣) لە کاتی هاتنی ئەمریکییەکان بۆ داگیرکردنی عێراق، کە بوو بە هۆی دروستبوونی پەشێوییەکی گەورە لە سەرتاپای عێراقدا، بۆیە شوێنێکی لەبەرچاو بوو بۆ گەشەکردنی ئەم ڕێکخراوە، هەروەها کارکردن لە ئەو شوێنانەی کە سوننەکانی تێدا بلاوبوونەتەوە، دەوری ئەم ڕێکخراوە لەوەدا گەشەی کرد کە ئەمریکییەکان لە ساڵی (٢٠٠١)دا ئەفغانستانیان داگیر کردو لە ساڵی (٢٠٠٣) عێراقیشان داگیر کرد"[١٤١].

بۆیە کەرکوکیش وەکو سەرتاپای بەشەکانی تری عێراق چالاکی ئەم ڕێکخراوەی تێدا گەشەی کردو تووشی گەلێك ماڵوێرانی و تەقینەوەو کاولکاری بووە.

*** حیزبی (ئەلعەودە - العودة):**

لە دوای داگیرکردنی ئەمریکییەکان بۆ عێراق لە بەهاری ساڵی (٢٠٠٣) لە دوای (حیزب البعث العربي الاشتراكي) ڕێکخستنەکانی قەدەغە کرا، بە ڕێکخستنێکی ترەوەو لە چوارچێوەی بەرگری چەکداری لە عێراق بە ناوی (حیزبی ئەلعەودە - حیزب العودة) دەستی کرد بە چالاکییەکانی لە شێوەی شەڕی بەرامبەر پارتیزانی لە بەرامبەر سەربازانی داگیرکەر، هەروەها هەوڵی دا بە پەیوەندی کردن لەگەڵ لایەنەکانی تری بەرگری لە عێراق.

بەشداری گەلێك چالاکی جۆربەجۆری کرد لە ناوچەکانی عێراق بە تایبەتی لە (فەلوجە، ڕومادی، دیالە، موسڵ،

کەرکوك، بەغدا)"(١٤٢).

*** کۆمەڵەی (ئەنسار ئەلئیسلام - انصار الاسلام):**

"ئەم گروپە پێش ساڵی (٢٠٠٣) لە هەرێمی کوردستانداو بە تایبەت لە ناوچەی هەورامان و شارەزووردا بالادەست بوون و زۆربەی جومگە سەرەکییەکانی ئەم گروپە بەدەست کوردە جهادییە توندڕەوەکانەوە بوون، بەڵام دوای ساڵی (٢٠٠٣) و هێرشی سەربازیی ئەمریکا و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ ناوچەی هەورامان، ئەم گروپە بە تەواوی چالاکییەکانیان لەو ناوچانە کۆتایی هات و دواتر لە شارەکانی نەینەواو تکریت و کەرکوك خۆیان ڕێکخستەوە. ئەگەرچی لە ئێستادا زانیاریی تەواو لەسەر ئەم گروپە کەمە، بەڵام پێدەچێت ژمارەیەك ئەندامی کورد بە هاوکاریی عەرەبە سوننەکان گروپەکە بەڕێوەبەرن لەو شارانەدا.

(ئەنسار ئەلئیسلام) ناکۆکییەکی زۆریان لەگەڵ (داعش) هەیە، بەتایبەت کە ئەم گروپە نفوزی بەهێزی خۆی لەو شارانەی عێراقدایە کە ئێستا بەناوی خەلافەتی ئیسلامی لەلایەن (داعش)ەوە بەڕێوەدەبرێن.

(ئەنسار ئەلئیسلام) کێشەی لەگەڵ ئەوەدا نییە کە خەلافەتی ئیسلامی ڕابگەیەنرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ناکۆکە داعش خەلافەتەکە پاوانخواز بکات، تەنانەت ئەنسار پێیوایە ئەوە (داعش) نییە کە خاوەنی هەموو سەرکەوتنەکانە، بەڵکو (داعش)یش گروپێکە لەناو کۆمەڵە گروپێکدا کە ئەم سەرکەوتنانەیان بەدەستهێناوە.

ناکۆکیی نێوان (داعش)و (ئەنسار ئەلئیسلام) پێشینەی هەیەو تەنانەت لە ساڵی (٢٠١٣)دا، ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداریش لە نێوان ئەم دوو گروپەدا ڕوویداوە.

هاوکات لەگەڵ ئەم ناکۆکیانەشدا ژمارەیەك چەکدارانی گروپی (ئەنسار ئەلئیسلام) لە ژێر کاریگەری کەسێتیی (بەغدادی) چوونە ناو ریزەکانی (داعش)و لە گرتنی شاری تکریتدا بە تەواوی جێگە دەستیان دیاربووە"(١٤٣).

*** (سوپای موجاهیدین):**

"پێشینەی دروستبوونی گروپی (سوپای موجاهیدین) دەگەڕێتەوە بۆ دوای ساڵی (٢٠٠٣)و ئامانجیان لێدانی بەرژەوەندییەکانی حکومەتی ناوەندیی بەغدایە، ئەم گروپە بە ئامانجی ململانێی و ڕکابەرێتی (داعش) لە دوای هاتنیان بۆ عێراق بە تەواوی خۆیان لە گروپی ئەنسار ئەلئیسلام نزیککردووەتەوەو هەماهەنگییەکی پتەو لە نێوانیاندا هەیە بە تایبەت لە ناوچەی کەرکوك و ئەنبار.

ئەگەر چی سوپای موجاهیدین هاوکارێکی باشی (داعش) ی کرد لە کۆنترۆڵکردنی چەند ناوچەیەکی ئەنبارو لە کۆکردنەوەی غەنیمەتەکاندا هاوبەشیش بوو، بەڵام هێشتا لەسەر بنەمای ڕاستی بە تەواوی تێکەڵاویی و هەماهەنگی سەربازی لە نێوان سوپای (موجاهدین)و (داعش)دا بەدیناکرێت. ڕەنگە ئەمانیش هەر تەنیا لە گرێبەستێکی کاتی بەولاوە هیچی دیکە نەیانکاتە ژێر رکێفی خەلیفەی (داعش)ەوە"(١٤٤).

*** کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد:**

"زۆربەی ئەندامانی پشتیوانان لە ژیانی ئاوارەیی خۆیان ڕازی نەبوون، بۆیە پاش ئەوەی هێرشەکان دژ بە ئەمریکا لەلایەن گروپە ئیسلامییە جیاجیاکانەوە دەستی پێکرد، ئەندامانی پشتیوانانیش بڕیان لە گەڕانەوە بۆ عێراق کردەوە.

پێدەچێ ئەو کاتە شتێك نەمابووبێ ناوی سەرکردایەتی پشتیوان بێت، زۆربەی ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە پەرتەوازە بوون و خەریکی دابینکردنی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان بوون، هەروەها سەرکردایەتی ئەم ڕێکخراوەش تا ئاستێکی زۆر پەیوەندی لەگەڵ ئەندامانی نەمابوو، لە نێو ئەندامانی شوراشدا کۆدەنگییەك نەبوو بەرامبەر بە شێوەی کاری داهاتوو، بۆیە کاتێك کە بڕیاری هاتنەوە بۆ عێراق لەلایەن هەندێ لەو ئەندامانە درا، هیچ پرسێکیان بە سەرکردایەتیی شورای پشتیوانان نەکرد، بەم شێوەیە چەند ئەندامێکی باڵای گروپی تەوحید کە زۆربەیان پێشتر لە کەتیبەی (فەتحی پشتیوانان) بوون، وەك (عومەر بازیانی)و (هێمن بانی شاری) بڕیاری گەڕانەوە بۆ عێراقیان دا.

لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٣) (عومەر بازیانی)و (ئەبو ئەسما)و (عەلی باینجانی) بەڕێی قاچاغەوە پەڕینەوەو لە ڕێی کەلارەوە چوون بۆ بەغدا، بڕیاری ڕۆیشتن بۆ بەغداو نەمانەوە لە کوردستان ڕەنگە لەو کاتەدا پەیوەست بوو بێت بەوەی کە ئەندامانی پشتیوانان ترسی ئەوەیان هەبوو بێت لە کوردستان لەلایەن دامودەزگا ئەمنییەکانەوە بناسرێن، هەروەها بەغدای پاش ڕووخانی سەدام پاشاگەردانییەکی زۆری تێدا بوو، ژینگەیەکی گونجاو بوو بۆ خۆشاردنەوە.

لە بەغدادا (بازیانی)و گروپەکەی پەیوەندییان بە (زەرقاوی) کرد، کە لە فەلوجە دادەنیشت، پاش ئەوە بە مانگێ گروپەکەی (عومەر بازیانی) بەیعەی خۆیان بۆ (زەرقاوی) ڕاگەیاند، زەرقاویش داوای لێکردن کە بانگەشەی سەرجەم هەڤاڵانی خۆیان بکەن کە لە دەرەوەی عێراق بوون بۆ گەڕانەوە.

لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٤)دا لە کۆبوونەوەیەکی باڵای گروپەکەی (ئەبو موسعەب زەرقاوی) لە شاری فەلوجە (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد) ڕاگەیەندرا، لەم ئەندامانی شوراش پێکهاتبوون لە (ئەبو ئەنەس) بەرپرسی دەستەی شەرعی و (عومەر بازیانی) ئەمیری بەغداو (ئەبو محەمەد لوبنانی) بەرپرسی عەسکەری بەغداو (کازم) ئەمیری دیالەو بەرپرسی ڕاگەیاندن و (هێمن بانی شاری) ئەمیری پارێزگاکانی هەولێرو کەرکوك و سلێمانی و (ئەبو تەڵحە) ئەمیری موسڵ و (ئەبو عەزام) ئەمیری ڕومادی. بەم شێوەیە لە (٩) ئەندامی شورای (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد) دوو کورد ئەندام شورا بوون، بەمەش کوردەکان لەو ڕێکخراوە تازە دامەزراوەدا کەمینە بوون، ئەم واقیعە بۆ داهاتوو سەرجەم ڕێکخراوە کوردییەکانی هاوشێوەی قاعیدەی گرتەوە.

کوردەکانی نێو (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد) بە بەراورد

لەگەڵ ئەندامە عەرەبەکان زۆر کەم بوون، (بازیانی) کاتێك کە خۆی‌و گروپەکەی ڕازی بوون بەیعەت بە (زەرقاوی) بدەن ژمارەیان لە نێوان (٣٠ – ٣٥) کەس دەبوو، کە چی تەنها ئەمیری موسڵ (ئەبو تەڵحە) نزیکەی (٤٠٠) ئەندام‌و (ئەبو محەمەد لوبنانی) (١٠٠) ئەندامی لەگەڵ بوو، دەزگای هەواڵگری حکومەتی کاتی ئەوسای عێراق ژمارەی ئەندامانی (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد) لە سەرجەم عێراق لە نێوان (١٠٠٠ – ١٥٠٠) کەس مەزەندە دەکرد، بەم شێوەیە دەبینین هەر چەندە کوردەکان لە سەرەتای دروستبوونی (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد) لە دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە بوون، بەڵام ڕۆڵیان لە نێو ئەم ڕێکخراوەدا زۆر فراوان نەبووە.

ئەندامە کوردەکانی (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد) ئەوانەی لە دەرەوەی عێراق دەگەڕانەوە بۆ پاراستنی گیانی خۆیان لە ناوچەکانی سلێمانی‌و هەولێر دانەدەنیشتن‌و زیاتر لە کەرکوك‌و موسڵ دەگیرسانەوە. بۆیە کاتێك (هێمن بانی شاری) بوو بە ئەمیری کوردستان، ئەم کۆمەڵەیە کەرکوکی کردە بارەگای سەرەکی خۆی‌و گروپەکەی.

زۆربەی ئەم ئەندامانە شارەزای کەرکوك نەبوون‌و خەڵکی ئەوێش نەبوون، تەنانەت لە ترسی دامەزراوە ئەمنییەکانی پارتە کوردییەکان لە گەڕەکە کوردییەکانی ئەم شارە دانەدەنیشتن، بەم شێوە دەستنیشانکردنی ئامانجی چالاکییەکان‌و پەیداکردنی ئەندامی تازەو گەشەسەندنی کۆمەڵەکە تووشی گرفتی قورس بوونەوە.

ئەندامە کوردەکانی (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد) هەوڵێکی زۆریاندا، کە ڕێکخستنەکانیان لە سلێمانی زیندوو بکەنەوەو کۆنە ئەندامانیان بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆریستی کۆبکەنەوە، بەڵام پێدەچێ لەم مەسەلەیە بە هۆی نەبوونی ناوچەیەکی ئارام بۆ کۆکردنەوەیان، کە بتوانێ بنکەیەك بۆ شاردنەوەی ئەنجامدەران‌و چەك‌و تەقەمەنییەکانیان فەراهەم بکات سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهێنابێ. لە ڕاستیدا دوورکەوتنەوە لە ناوچەکانی سلێمانی‌و هەولێر گرفتی زۆری لۆجستی‌و قورسی پەیوەندیکردن بە ئەندامانیان‌و هاتووچۆی بۆ دروستکردوون، بۆیە لە بڵاوکردنەوەی ڕێکخستنەکان‌و چالاییەکانیان بۆ ناوچەکانی تری کوردستان سەرکەوتوو نەبوون.

چالاکیی کوردەکانی نێو کۆمەڵەکە لە کەرکوکیش بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی تری عێراق زۆر سەرکەوتوو نەبوو پاش زیاتر لە ساڵێك لە دامەزراندنی لقی باکووری کۆمەڵەکە گەورەترین چالاکی ئەم گروپە تێکدانی بۆرییە نەوتییەکانی ڕێگای (کەرکوك – تکریت) بوو، بەڵام ڕەنگە گەورەترین شکست کە تووشی ئەم گروپە هاتبێت گرتنی ئەمیری بەغدا (عومەر بازیانی) بوو بێ، کە باڵاترین ئەندامی کوردی نێو (تەوحیدو جیهاد)و زۆر لە (زەرقاوی) نزیك بوو، (بازیانی) لە کەمینێکدا ڕۆژی (٣٠)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٤) لە ناوەڕاستی بەغدا گیرا.

گرتنی (بازیان) سەرجەم ئەندامە کوردەکانی نێو (تەوحیدو جیهاد)ی شڵەژاندو تووشی پەشۆکانی زۆری کردن، ئەندامانی کەرکوك لە سەرووی هەموویانەوە (هێمن بانی شاری) بەرەو فەلوجە بە مەبەستی خۆشاردنەوە ڕۆیشتن، هەندێ لەو ئەندامانەش وەك (هیوا گۆپاڵەیی)، بەوە نەوەستایەوە بڕیاری وازهێنانی لە کۆمەڵە داو، پاشان پاش وازهێنانیان چوونە ئێران‌و کەوتنە کاسبی‌و باشکردنی گوزەرانی خۆیان.

پاش گرتنی (بازیانی)و چۆڵکردنی کەرکوك لەلایەن گروپەکەیەوەو ڕۆیشتن بۆ فەلوجە (هێمن بانی شاری) بوو بە دەمڕاستی کوردەکانی نێو (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد)، (بانی شاری) هەوڵی زۆریدا کە قەناعەت بە هاوڕێیانی بکات بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك‌و سەرپەرشتی کارەکانی ئەوێ بکەن، بەڵام زۆربەیان قایل نەبوون بە گەڕانەوە بۆ کەرکوك، بەم شێوەیە بەشێکی زۆریان لە فەلوجە مانەوەو پاش هێرشی دووەمی ئەمریکا لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) بۆ سەر فەلوجە ئەمیری کوردستانی (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد) بەهێزترین کەسایەتی کورد لە ناویاندا (هێمن بانی شاری) لەگەڵ دوو لە هاوڕێکانی لەو شەڕەدا کوژران‌و پاشانیش گروپەکەی (بانی شاری) پەرتەوازە بوون. بە کوشتنی (بانی شاری) سەرکردەیەکی سەربازیی شارەزای کوردەکانی نێو کۆمەڵ بوو گورزێکی مەعنەوی‌و مادی گەورە لە کوردەکانی نێو کۆمەڵی توحید درا بە تایبەتی ئەم گورزە تەنها پاش کەمتر لە (٦) مانگ لە گرتنی (بازیانی) هات.

لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٤)دا پاش گرتنی فەلوجە لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە ئەوەندەی تر مەعنەویاتی (کۆمەڵی تەوحیدو جیهاد) لاوازتر بوو، بەشێکی تری ئەندامە کوردەکانیان وازیان هێناو چوونە دەرەوەی عێراق.

پێدەچێ پاش گرتنی هەندێ لە سەرکردە کوردەکانی گروپەکەی (زەرقاوی) وەك (بازیانی)و (هیوا گۆپاڵەیی)و گرتنی فەلوجەو پەرتەوازەبوونی تۆڕەکانی (زەرقاوی) بەسەر ناوچەکانی تری عێراق کوردەکانی نێو (جیهادو تەوحید) ڕۆڵێکی گرنگیان لەنێو ئەو گروپە نەمابێ، ئەوەش بۆ خۆی بەڵگەیە کە چالاکییەکانی ئەم گروپە لە کوردستان بە بەراورد لەگەڵ گروپە ڕکابەرەکەی (پشتیوانانی سوننە) زۆر کەم بۆوە، بەڵام ئەم کەمبوونی چالاکییە تا سەر نەبوو"[١٤٥].

*** لقی (بزووتنەوەی گۆڕان) لە کەرکوك:**

"لە ساڵی (٢٠٠٦)و لە ناو ڕێکخستنەکانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بزووتنەوەیەك سەری هەڵدا بە ناوی (ڕیفۆرم) کە ئامانجی چاکسازی‌و دژایەتی گەندەڵی بووە.

ئەم ڕەوتە لەلایەن (نەوشیروان مستەفا ئەمین) ڕابەرایەتی کراوە دوای ئەوەی لە ئەندامیەتی مەکتەبی سیاسی‌و جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان وازی هێنا.

لە بەهاری ساڵی (٢٠٠٩) لە پڕ لەگەڵ نزیکبوونەوەی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان بڕیار درا بە بەشداریکردن لەو هەڵبژاردنە وەك لستێکی سەربەخۆ، دیارە ئەم هەنگاوە بووە هۆی دوورکەوتنەوەو جیابوونەوەی ئەو ئەندام‌و کادیرانەی پەیوەندییان بە ڕیفۆرمەوە هەبووە لە

ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان. هەر لە هەمان ساڵی بەشدارییان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق کردو چەند ئەندامێکیان گەیشتنە پەرلەمان.
بزووتنەوەکە گەشەی کردو لە ڕێککەوتی (١)ی ئایاری ساڵی (٢٠١٠) مۆڵەتی فەرمی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان وەرگرت"[١٤٦].

ئەم بزووتنەوەیە لە سەرەتادا لقێکی گەورەی لە کەرکوکدا کردەوەو لە چالاکی خۆی بەردەوام بوو، بەشداری دوو هەڵبژاردنی نێو کەرکوکی کرد، بەڵام نەیتوانی دەنگی پێویست بە دەست بهێنێت و تەنانەت کورسییەکیشی بەدەست نەهێنا.

*** ڕێکخستنی (دەوڵەتی عێراقی ئیسلامی - دولة العراق الاسلامية):**
"ئەم ڕێکخستنە خۆی ئاشکرا کرد لەلایەن کۆمەڵێك لە پارچە چەکدارەکانی سوننەوە لە عێراق لە (١٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٦)، بەڵام لە ساڵی (٢٠٠٨) پاشەکشێیان بە خۆوە بینی کە هۆکاری ڕێکخستنەکانی (ئەلسەحوە – الصحوة) بوو، کە لە ساڵی (٢٠٠٦) تا (٢٠٠٧) چالاکییان هەبوو، لە دواییدا هەوڵیان دا بە دووبارە زیندووکردنەوەی سەحوەکان بە بەرگێکی تازە لە دوای کۆتای هێنانی بە ڕێکخستنەکان (ئەلسەحوە) لە ساڵی (٢٠٠٩)، ڕێکخستنی (دەوڵەتی عێراقی ئیسلامی) بوو بە پرۆژەیەکی سەرەکی گرنگ بۆ گەشەکردنی (ئەلقاعیدە) لە عێراق.
لە ماوەی چالاکییەکانیدا توانیان توانای خۆیان لە ناوچەکانی (بەغدا، ئەنبار، دیالە، سەلاحەددین، نەینەوا، کەرکوك) هەروەها لە ناوچەکانی (بابل)و فوراتی ناوەڕاست و ئەنباریان کردە پایتەختی چالاکییەکانیان، کە ئەمە لە ساڵی (٢٠٠٦)ەوە ڕووی دا[١٤٧].

*** ڕێکخراوی (ئەلحەشد ئەلشەعبی ئەلشیعی - الحشد الشعبي الشيعي):**
ئەم ڕێکخراوە بریتیە لە هێزێکی نیمچە سەربازی شیعە لە عێراقدا، سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ (١٣)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٤) لە کاتی سەرهەڵدانی ڕێکخراوی (دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام – داعش) ئەمیش لە دوای فەتوای زانای ئاینی (عەلی سیستانی)یەوە هات بانگەوازی جیهادی دژی کافران بەرز کردەوە لە عێراق.
ئەم ڕێکخراوە بەهیچ جۆرێك لە ژێر کاریگەری وەزارەتی ناوخۆدا بە شێوەیەکی ڕێکوپێك کار ناکات، چونکە چالاکییەکانی لە چوارچێوەی ڕفاندن و تۆقاندندایە، بەڵام گەلێك ڕاوبۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەی ئەم ڕێکخستنە لە نێو خودی شیعەکانیشدا.
لە ماوەی شەڕکردن لەگەڵ (داعش) بە تایبەتی لە ناوچەکانی (کەرکوك، خورماتوو، داقوق، جەلەولا، سەعدیە) گەلێك کێشەی گەورە گەورەیان ناوەتەوە دژی کوردو شیعەکان بە تایبەتی لە کوشتن و بڕین و ڕفاندن، هەر ئەمەش وای کرد چەند جارێك خۆپیشاندان لە خورماتوو دژیان بکرێت لەبەر ئەوەی لە چوارچێوەی ڕێکخستنە سەربازییەکاندا کار ناکەن[١٤٨].

*** چەند حیزب و ڕێکخراوێکی سیاسی لە کوردستان کە لق و چالاکی لاوازیان لە کەرکوکدا هەبووە:**
"- (بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی کوردستانی عێراق)، ١٩٧٩.
- (ئاگری سووری کوردستان)، ١٩٩٢.
- (یەکێتی تێکۆشانی کۆمۆنیستی کرێکاری)، ١٩٩٢.
- (بزووتنەوەی ڕزگاری دیموکراتی کوردستان)، ١٩٩٣.
- (بزووتنەوەی جوتیارانی کوردستان)، ١٩٩٣.
- (بزووتنەوەی سۆشیالستی کار)، ١٩٩٣.
- (ڕێکخراوی تێکۆشانی ڕەنجدەرانی کوردستان)، ١٩٩٣.
- (پارتی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان)، ١٩٩٣.
- (پارتی ئاواتی کوردستان)، ١٩٩٥.
- (یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان)، ١٩٩٦.
- (بزووتنەوەی ئیسلامی نەتەوەیی کورد)، ١٩٩٨.
- (پارتی هاوپەیمانی فەیلی گەرمیان)، ١٩٩٨.
- (یەکگرتووی دیموکراتی کوردستان)، ١٩٩٨.
- (پارتی یەکسانی کوردستان)، ١٩٩٩.
- (پارتی نەتەوەیی کوردستان)، ٢٠٠٠.
- (پارتی نەتەوەیی کوردستان)، ٢٠٠١.
- (حیزبی کۆنگرەی ئازادی کوردستان)، ٢٠٠٢.
- (یەکێتی نەتەوەیی کوردستان)، ٢٠٠٢.
- (هاوکاری تورکمانی کوردستان – کەرکوك)، ٢٠٠٤.
- (حیزبی سەبەرخۆیی کوردستان)، ٢٠٠٥.
- (حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی / سەرکردایەتی باشوور)، ٢٠٠٥.
- (پارتی گەشەکردنی کوردستانی)، ٢٠٠٥.
- (حیزبی پێشکەوتنخوازی دیموکراتی کوردستان)، ٢٠٠٦.
- (بزووتنەوەی سەربەخۆیی کوردستان).
- (بزووتنەوەی کۆمونیستی و کرێکاری جیهانی).
- (ڕەوتی کۆمۆنیست).
- (کۆمەڵەی شۆڕگێڕانی کۆمۆنیستی).
- (پارتی پارێزگارانی دیموکراتی کوردستان).
- (بزووتنەوەی ڕزگاری دیموکراتی).
- (پارتی پێشکەوتنخوازانی کوردستان).
- (پارتی کەرگەل)"[١٤٩].

*** لق و نووسینگەی حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی تورکمان لە کەرکوك:**
بەپێی ئەم لیستە نزیکەی (٢٠) حیزب و ڕێکخراوی سیاسی تورکمانی عێراقی هەیە، زۆربەی ئەو قەوارانە بارەگاکانیان لە شارەکانی کەرکوك و هەولێرو سلێمانی و بەغدا، بەشێك لەم حیزبانە تەنها بریتین لە دەستەیەکی سەرکردایەتی، بنکەی جەماوەرییان لاوازە، بە پاڵپشتی حیزبە گەورە دەسەڵاتدارەکان دروست بوونە.
١. لقی حیزب تورکمان ئیلی.
٢. لقی حیزبی نیشتمانی تورکمانی (الوطني التركماني).
٣. حیزبی (القرار)ی تورکمانی.

٤. حیزبی ئیسلامی بۆ تورکمانی عێراق (الحيزب الاسلامي لتركمان العراق).

٥. حیزبی برایەتی (الاخاء)ی تورکمانی.

٦. حیزبی گەلی تورکمانی (الشعب):

"لە مانگی ئابی ساڵی (١٩٩٦) دامەزراوەو ئێستا لەلایەن (عیرفان کەرکوکی)یەوە سەرۆکایەتی دەکرێت، بارەگای سەرەکی ئەم پارتە لە شاری کەرکوکە، پارتێکی نەتەوەیی میانڕەوەو دۆستایەتی باشی لەگەڵ پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردو عەرەب دا هەیە، بانگەشە بۆ مافە نەتەوەیی و سیاسییەکانی تورکمان دەکات لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستان دا، سیاسەتی بەرانبەر بە کورد سیاسەتێکی جیاوازە لە بەرەی تورکمانی و زۆرێك لە ڕێکخراوەکانی تری تورکمان، هەمیشە بانگەشە بۆ دۆستایەتی و برایەتی نێوان کوردو تورکمان دەکات، کەسی یەکەمی ئەم پارتە لە دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعسەوە ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوکە"[١٥٠].

٧. حیزبی (الشروق)ی تورکمانی.

٨. بزووتنەوەی ئیسلامی تورکمانی (الحركة الاسلامية التركمانية).

٩. بزووتنەوەی تورکمانە سەربەخۆکان (حركة التركمان المستقلين).

١٠. بزووتنەوەی (الوفاء)ی تورکمانی:

"ڕێکخراوێکی سیاسی تورکمانییەو لە ساڵی (٢٠٠٢) دامەزراوە، زۆرێك لە سەرکردەکانی لە تورکمانەکانی قەزای (خورماتوو)ن، ماوەیەك لەلایەن (سامی دونمین)ەوە سەرۆکایەتی دەکرا، سەرکردە دیارەکانی ئەم بزووتنەوەیە بریتین لە (فریاد عومەرو سامی دونمین)و چەندانی تر، بارەگای لە شارەکانی (خورماتوو، کەرکوك، تازە، تەلەعفەر، قەرەتەپە) هەیە، بەشداری پرۆسەی سیاسی دەکات و لە هەڵبژاردنی ساڵی (٢٠٠٥) لە سایەی حیزبە شیعییەکانی عێراقدا (فریاد عومەر) بووە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، زمانحاڵی ئەم بزووتنەوەیە ڕۆژنامەی (الوفاء) کە مانگی دوو ژمارەی لێ دەردەچێت و تاکو ئێستا زیاتر لە (٧٥) ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە، یەکێکە لە ڕێکخراوە سیاسییە بچووکەکان و کاریگەری جەماوەری و ڕێکخراوەیی لاوازە"[١٥١].

١١. حیزبی (داد)ی تورکمانی (العدل):

"مێژووی دامەزراندنی ئەم پارتە دەگەڕێتەوە بۆ (٢٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٤) وەك لە یەکەم بەیاننامەی دامەزراندنیان دا هاتووە، پارتێکی سەربەخۆیەو بڕوای ڕەهای بە پڕۆژەی نیشتمانی عێراقی هەیە، هەروەها تێکۆشان لە پێناو چەسپاندنی مافە نەتەوەیی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی تورکمان، بەو پێیەی نەتەوەی سێیەمن، پارتی دادی تورکمانی هەوڵ دەدات کێشەو داخوازییەکانی تورکمان لە ڕوانگەو دیدێکی ئیسلامییەوە بە بەرجەستەبوونی دادپەروەری و چاکسازی چارەسەر بکات، یەکێکە لەو پارتانەی کار بۆ یەکخستنی ڕیزەکانی تورکمان دەکات، هەر چەندە پارتێکی گچکەو بێ کاریگەرە لە نێو شەقامی تورکمانی دا، بارەگای لە شاری کەرکوکە، لە ئێستادا (دکتۆر فاروق عەبدوڵڵا)، سەرۆکی ئەم پارتەیە"[١٥٢].

١٢. یەکێتی ئیسلامی بۆ تورکمانی عێراق (الاتحاد الاسلامي لتركمان العراق).

١٣. ڕێکخراوی دیموکراتخوازە نیشتمان پەروەرەکانی تورکمان (منظمة الديمقراطيين الوطنيين التركمان).

١٤. بزووتنەوەی تورکمانی نیشتمانی دیموکراتی (الحركة التركمانية الديمقراطية).

١٥. حیزبی (الوحدة)ی تورکمانی.

١٦. حیزبی دیموکراتی تورکمانی کوردستان (الحيزب الديمقراطي التركماني الكردستاني).

١٧. حیزبی (الانقاذ)ی نەتەوایەتی تورکمانی.

١٨. بەرەی تورکمانی (الجبهة التركمانية).

١٩. بزووتنەوەی دیموکراتی تورکمان (الحركة الديمقراطية التركمانية).

٢٠. بزووتنەوەی چاکسازی تورکمان (حركة الاصلاح التركماني).

*** ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراوو حیزب و سەندیکایانەی لە نێوان ساڵانی (٢٠٠٣) تا (٢٠١٥) لە کەرکوك و دەوروبەری سەریان هەڵداوە:**

لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە گەلێك کۆمەڵ و ڕێکخراو و حیزب و بنکەی جۆراوجۆر لە شارێکی وەکو کەرکوکدا سەری هەڵداوە کە گەلێکیان نە لە ئاستی ناو و ناوبانگی ئیشەکەدا نین، یان گەلێك هۆکاری سیاسی دەوری بینیوە لە سەر هەڵدانی، بۆیە بەشێکیان بۆ ماوەیەکی کەم بەردەوام دەبێت و لە دوایی‌دا لە کار کردن دەوەستێت، ئەمانەی خوارەوەش نموونەیەکن لەو کۆمەڵە و ڕێکخراوو حیزبانە:

١. ڕێکخستنەکانی (التيار الشيوعي) لە کەرکوك.

٢. کۆمەڵەی (ئاوارەکانی کەرکوك).

٣. کۆمەڵەی (بابە گورگوڕی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی).

٤. دەزگای (شەفەقی ڕۆشنبیریی) لە کەرکوك.

٥. دەزگای (هەواڵ) بۆ ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی.

٦. ناوەندی (ئەراپخا) بۆ ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوە.

٧. (التجمع الثقافي) لە حەویجە.

٨. (یەکێتی نووسەرانی تورکمان) لقی کەرکوك.

٩. جمعية الخطاطين العراقيين، فرع كركوك.

١٠. (المركز الثقافي الرياضي التركماني) لە ناحییەی لیلان.

١١. (مركز اعمال كركوك).

١٢. (رابطة كركوك للثقافة والفنون).

١٣. (یەکێتی ژنانی تورکمان) لە کەرکوك.

١٤. (التجمع الثقافي العراقي المستقل) لە کەرکوك.

١٥. (التجمع العربي الوطني) لە کەرکوك.

١٦. حیزبی (سەلامی کوردستانی) لە کەرکوك.

١٧. یانەی (قەڵەم) لە کفری.

١٨. کۆمەڵەی (مافی مرۆڤ)ی عێراق لقی کەرکوك.

١٩. ناوەندی (سیویچ)ی ڕۆشنبیری.

٢٠. سەنتەری ڕۆشنبیری (پردێ).

٢١. مركز (صاري كهية) للثقافة والفنون.

٢٢. (اتحاد المحامين والحقوقيين التركمان) لە كەركوك.
٢٣. ڕێكخراوی (گەشەپێدانی قوتابیانی كوردستان) لە ناحیەیی تەكیە بە ناوی (قوتابیانی یەكگرتووی ئیسلامی).
٢٤. بنكەی (گەلاوێژ لقی كەلار.
٢٥. منظمة (الاحرار المستقلين للمشروع الانساني)، لقی كەركوك.
٢٦. (الرابطة الاسلامية لنساء العراق) لقی كەركوك.
٢٧. منظمة الخطوة لتطوير المجتمع.
٢٨. منظمة (الحياة للاعمار والمساعدات الانسانية)، لقی كەركوك.
٢٩. (الجمعية الطبية الخيرية) لە كەركوك.
٣٠. مەڵبەندی ڕۆشنبیری (ئاڵتون كۆپری).
٣١. یەكێتی بەڵێندەرانی كەركوك.
٣٢. حیزب (الجمهوريين الاحرار).
٣٣. دەزگای (خەندان) بۆ پەخش و وەشاندن، لقی كەركوك.
٣٤. مؤسسة (الفيصل) الاعلامية.
٣٥. دەزگای ڕاگەیاندی (الرعد)، مؤسسة (الرعد) الاعلامية.
٣٦. (یەكێتی بەندییە سیاسییەكان)، لقی كەركوك.
٣٧. منظمة كركوك للمساعدات الانسانية
٣٨. منظمة تخفيف العناء لحقوق الانسان.
٣٩. مؤسسة (اليمامة) للاعلام والاعلان.
٤٠. پارتی (چارەسەری دیموكراتی كوردستان)، لقی كەركوك.
٤١. منظمة الوسام لتعليم ثقافة حقوق الانسان.
٤٢. كۆمەڵەی (دۆستایەتی كورد–توركمان) لە كەركوك.
٤٣. (دەنگی هۆزەكانی شیشان و داغستان و شەركەس لە عێراق)، لقی كەركوك.
٤٤. ڕێكخراوەكانی چالاكییەكانی مین هەڵگرتن لە كوردستان.
٤٥. كۆمەڵەی ڕۆشنبیری و پەرەپێدانی كۆمەڵایەتی لە كەركوك.
٤٦. منظمة (نساء الجمهورية)، لقی كەركوك.
٤٧. جمعية (احفاد الفاتح للطلبة وشباب تركمان العراق).
٤٨. (الرابطة الاسلامية لنساء العراق).
٤٩. ڕێكخراوی (ئاشتی B.C.R).
٥٠. یەكێتی پیشەوەرانی كەركوك.
٥١. یەكێتی سەندیكای كرێكاران و پیشەوەرانی كوردستان لقی كەركوك، سەندیكای نەوت.
٥٢. یەكێتی ئەدیبانی توركمان لە كەركوك.
٥٣. سەندیكای كیمیاگەرانی كوردستان لقی كەركوك.
٥٤. جمعية السجناء السياسيين وعوائل شهداء تركمان العراق.
٥٥. جمعية الاخوة والثقافة لتركمان العراق.
٥٦. سەنتەری ڕووناكبیری ئێڵبەگی جاف، لقی كەركوك.
٥٧. دەزگای (سبەی) ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندن بۆ لاوان.
٥٨. مركز كركوك الوطني للحوار والانماء الاجتماعي.
٥٩. (رابطة القوميات) لە شاری كەركوك.
٦٠. المنظمة العراقية للدفاع عن حقوق العمال.
٦١. هيئة شباب محبي أهل البيت (ع) لە خورماتوو.
٦٢. منظمة (فرح لحقوق الامهات والاطفال) لە كەركوك.
٦٣. كۆمەڵەی (ایشیق)ی ئەدەبی توركمانی.
٦٤. دەزگای (دار القلعة للصحافة والنشر) لە بەغداو كەركوك.
٦٥. ناوەندی ڕۆشنبیری (تەكێ).
٦٦. منظمة (الوطن الانسانية والثقافية) لە كەركوك.
٦٧. جمعية ضباط كركوك.
٦٨. مركز التنمية الاقتصادية والاستثمار في محافظة كركوك.
٦٩. جمعية النماء الخيرية.
٧٠. الحركة القومية التركمانية.
٧١. بنكەی ئەدەبی و ڕووناكبیری (سەنگاو).
٧٢. بنكەی (گەلاوێژ)، لقی كەركوك.
٧٣. كۆمەڵەی ڕووناكبیری و كۆمەڵایەتی كاكەیی.
٧٤. دەزگای تەكنۆلۆجیا و لێكۆڵینەوەی زانستی.
٧٥. ناوەندی ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتی شەهید سیروان تاڵەبانی.
٧٦. كۆمەڵەی ڕۆشنبیری و پەرەپێدانی كۆمەڵایەتی كەركوك.
٧٧. ڕێكخراوی (ئاشتی).
٧٨. سەنتەری (ڕۆنیا) بۆ چالاكیی ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتی.
٧٩. مركز كركوك الثقافي والاجتماعي.
٨٠. دەزگای ڕۆژ بۆ پێگەیاندنی ئافرەت و داكۆكی كردن لە مافەكانی.
٨١. ڕێكخراوی لاوانی پێشكەوتوخوازانی سەربەخۆی كوردستان.
٨٢. ڕێكخراوی (دایك) لە كەركوك.
٨٣. ناوەندی ڕۆشنبیری (خەلیل منەوەر) لە داقوق.
٨٤. (مجلس المجتمع المدني والتطور الديمقراطي) لە كەركوك.
٨٥. یەكێتی مامۆستایانی كوردستان، لقی كەركوك.
٨٦. خانووی قوڕین بۆ پێگەیاندنی ڕۆشنبیری.
٨٧. ڕێكخراوەی پەرەپێدانی چەمچەماڵ.
٨٨. مؤسسة الاقمار الاعلامية.
٨٩. نادي الاخاء التركماني، لقی كەركوك.
٩٠. سەندیكای پزیشكانی ڤێتێرنەری كوردستان لقی كەركوك.
٩١. ڕێكخراوی پاراستنی ژینگە.
٩٢. مركز كركوك الثقافي والاجتماعي، المنتدى العلمي العراقي.
٩٣. مركز كركوك للاعجاز العلمي في القران والسنة.
٩٤. (جمعية نساء تركمان العراق)، لقی كەركوك.
٩٥. نووسینگەی كەركوك ناوەندی هەڵەبجە دژ بە ئەنفال و جینۆسایدی گەلی كورد (چاك).
٩٦. كۆمەڵەی ڕووناكبیری و كۆمەڵایەتی كەركوك نووسینگەی خورماتوو و داقوق.
٩٧. سەنتەری ڕۆشنبیری چەمچەماڵ.
٩٨. دەزگای (دار الضيائي).
٩٩. البيت الثقافي في كركوك.
١٠٠. (منظمة السلام والتنمية الديمقراطية)، لە كەركوك.

١٠١. ڕێکخراوی پەرەپێدانی قوتابیانی کوردستان.
١٠٢. منظمة مبادرة المجتمع المدني بتضامن الصندوق الوطني للديمقراطية، لە چەمچەماڵ.
١٠٣. الهيئات المدنية العامة في قضاء طوز خورماتوو.
١٠٤. ڕێکخراوی (هەنجیرە).
١٠٥. (الاشراف العقائدي التثقيفي للممهدون) لە کەرکوك.
١٠٦. (مركز التضامن الوطني العربي) لە کەرکوك.
١٠٧. (تجمع الوحدة الوطنية العراقي)، نووسینگەی کرکوك.
١٠٨. شبكة كركوك لمنظمات المجتمع المدني.
١٠٩. دەستەی وەبەرهێنانی کەرکوك.
١١٠. ناوەندی پێگەیاندنی چالاکی لاوان لە شۆڕیجە.
١١١. منتدى شباب ورياضة طوز.
١١٢. لیژنەی ئۆلۆمپی هەرێمی کوردستان، نوێنەرایەتی کەرکوك.
١١٣. گرووپی کۆمپانیاکانی (العادل المتحدة).
١١٤. کۆمەڵەی (رسالة الشباب).
١١٥. بنکەی (پەنا) بۆ لە ناوبردنی توندو تیژی دژی ئافرەت.
١١٦. منظمة الحق لثقافة حقوق الانسان.
١١٧. دەزگای شەبەنگ.
١١٨. ناوەندی محەمەد ئەمین عەسری بۆ لێکۆڵینەوە.
١١٩. مەکتەبی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی ئەنجومەنی سیاسی عەرەبی لە کەرکوك.
١٢٠. مركز القوارير للاقراء وتحفيظ القران الكريم.
١٢١. مؤسسة صناع السلام لدعم حقوق الانسان.
١٢٢. مؤسسة الحنان الوافي للاغاثة وتنمية الطفل والمراة.
١٢٣. مؤسسة الزهراء لتطوير المراة الريفية.
١٢٤. جمعية كركوك الخيرية لرعاية الايتام والارامل.
١٢٥. جمعية مكوفي كركوك الانسانية.
١٢٦. جمعية القلعة الرياضية لتركمان العراق.
١٢٧. مركز تنمية الرياض للارشاد والبحوث الزراعية.
١٢٨. مركز سلسبيل لتعليم وتأهيل الاطفال.
١٢٩. مركز دليل للتنمية والتطوير.
١٣٠. منظمة عين الحياة لرعاية المراة والطفل.
١٣١. منظمة شمس العراق لمكافحة المخدرات.
١٣٢. منظمة الزاب لتطوير المراة.
١٣٣. ڕێکخراوی (ڕێگا)ی مرۆڤ دۆستی.
١٣٤. منظمة بيت ابن الرافدين.
١٣٥. ناوەندی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی کەرکوك.
١٣٦. کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان / لقی زانکۆ.
١٣٧. کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان / لقی ئامادەیی.
١٣٨. کۆمەڵەی خوێندکاران / لقی دەرەوە.
١٣٩. سەنتەری ئازادی لاوان.
١٤٠. یەکێتی جوتیارانی کوردستان / لقی کەرکوك.
١٤١. سەندیکای ئەندازیارانی کشتوکاڵ / لقی کەرکوك.
١٤٢. یەکێتی ئەندازیارانی کوردستان / لقی کەرکوك.
١٤٣. یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان / لقی کەرکوك.
١٤٤. کۆمەڵەی کیمیاوی و فیزیاوی / لقی کەرکوك.
١٤٥. یەکێتی وێنەگرانی کوردستان / لقی کەرکوك.
١٤٦. یەکێتی نابینایانی کوردستان / لقی کەرکوك.
١٤٧. یەکێتی ئابووری ناسان / لقی کەرکوك.
١٤٨. یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی کوردستان / لقی کەرکوك.
١٤٩. یەکێتی مافپەروەران / لقی کەرکوك.
١٥٠. سەندیکای هونەروەری کشتوکاڵییەکان / لقی کەرکوك.
١٥١. سەندیکای بایلۆجی / لقی کەرکوك.
١٥٢. سەندیکای تەکنیکارانی ئەندازەیی / لقی کەرکوك.
١٥٣. کۆمەڵەی (٦٣+) بۆ بەساڵاچووان.
١٥٤. کۆمەڵەی ڕۆژی کەمئەندامان / لقی کەرکوك.
١٥٥. کۆمەڵەی کورتەباڵاکان / لقی کەرکوك.
١٥٦. کۆمەڵەی کەرو لاڵان / لقی کەرکوك.
١٥٧. کۆمەڵەی کوردستانێکی سەوز / لقی کەرکوك.
١٥٨. کۆمەڵەی بریکارانی خۆراك / لقی کەرکوك.
١٥٩. کۆمەڵەی زانستە سیاسییەکان / لقی کەرکوك.
١٦٠. سەندیکای پارێزەران / لقی کەرکوك.
١٦١. نوێنەرایەتی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی دووبز.
١٦٢. ناوەندی عەلی مەردان بۆ مەقامات.
١٦٣. یەکێتی نووسەرانی کوردستان / لقی کەرکوك.
١٦٤. یەکێتی فەرمانبەران / لقی کەرکوك..
١٦٥. کۆمەڵەی هونەری میللی کوردستان / لقی کەرکوك.
١٦٦. مركز التآخي والسلام.
١٦٧. جمعية اعادة تأهيل المرحلين التركمان.
١٦٨. اتحاد نساء بيت النهرين.
١٦٩. منظمة فينوس للمراة والطفل.
١٧٠. منظمة أطياف النسوية.
١٧١. مركز الخزافين، كركوك.
١٧٢. مركز المراة للخياطة.
١٧٣. جمعية المعوقين، كركوك.
١٧٤. اللجنة العليا للمرحين العائدية.
١٧٥. جميعة بيت النهرين النيانية.
١٧٦. جمعية هدى لنساء العراق.
١٧٧. منظمة المسرة الخيرية لرعاية المراة والطفل.
١٧٨. منظمة ميديا لحقوق الانسان.
١٧٩. منظمة العدالة والمساواة لحقوق الانسان.
١٨٠. جمعية ضحايا الارهاب، فرع كركوك.
١٨١.جمعية معوقي كركوك.
١٨٢. رابطة الحقوقيين في كركوك.
١٨٣. مركز التنمية والثافة القانونية.
١٨٤. منظمة الوحدة لطلبة وشباب العراق.
١٨٥. منظمة التضامن لبناء القدرات.
١٨٦. منظمة لم الشمل العائلي.
١٨٧. جمعية المرحلية والمتضررين في كركوك / يايچي.
١٨٨. رابطة الحقوقيين الشمالية.
١٨٩. منظمة اغاثة المهجرين والمعوزين في العراق.
١٩٠. منظمة سوز لحماية البيئة.
١٩١. مركز كاورباغي الثقافي التركماني.

١٩٢. منظمة التنمية الديمقراطية.
١٩٣. منظمة التنمية والنهوض العراقية.
١٩٤. منظمة النهج الحر الديمقراطي.
١٩٥. جمعية الحقوقيين التركمان.
١٩٦. جمعية الثقافة الرياضية التركمانية.
١٩٧. جمعية التعايش التركماني.
١٩٨. منظمة زيان لنساء الانفال.
١٩٩. المعهد العراقي لحقوق الانسان.
٢٠٠. منظمة العطاء للطلبة والشباب.
٢٠١. جمعية نحاتي كركوك.
٢٠٢. جمعية الافق للمستقبل.
٢٠٣. منظمة الفردوس لرعاية المعوقين.
٢٠٤. مؤسسة الحوار الانساني والثقافي.
٢٠٥. جمعية الغصن الاخضر الزراعية.
٢٠٦. منظمة الصداقة للاغاثة الانسانية.
٢٠٧. جمعية الثقافية الشبابية الزنور.
٢٠٨. جمعية الثقافية والانسانية في تركلان.
٢٠٩. منظمة الشهاب للتنمية البشرية والحافظ على البيئة.
٢١٠. منظمة الازدهار والتنمية.
٢١١. منظمة ارانجا الثقافية.
٢١٢. الجمعية الاعلامية لرسوم الكاريكاتير.
٢١٣. منظمة البراعم لحقوق الاطفال.
٢١٤. منظمة تنمية قدرات الشباب / طوز.
٢١٥. منظمة شباب الحر.
٢١٦. منظمة سابات.
٢١٧. منظمة عشتار للمراة.
٢١٨. منظمة العدالة وتنمية حقوق الانسان.
٢١٩. منظمة كنوز الهدى الخيرية.
٢٢٠. منظمة تل الاغر الزراعية / الزاب.
٢٢١. کۆمەڵەی داکۆکی لە کەرکوك.
٢٢٢. دەزگای (شەفەق).
٣٢٢. یەکێتی نووسەرانی کورد، لقی کەرکوك[١٥٣].

٣٢٣. جمعية الخطاطين العراقيين/ لقی کەرکوك
ئەم کۆمەڵەیە لە (٢٣)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٤) لە هۆڵی چالاکی قوتابخانەکان دامەزراوە بە بەشداری (٧٣) خۆشنووس لە هەموو پێکهاتەکانی کەرکوك، کە هەر یەکە (شاهین بەهائەددین، ئیبراهیم عەلی حوسێن، ئەیوب خەلیل ئەحمەد، سدیق نازم فەرهەد، لوقمان محەمەد یوسف، وەردە ساڵح مستەفا، جەلال خەلیل ئیبراهیم، عەدنان محەمەد حوسێن کاکەیی، ئەنسام مانوئیل زەیا) دەنگی پێویستیان

هێنا بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکە.

*** ناوەندی (سیکۆلار) لە کەرکوک:-**

ئەم ناوەندە لە کەرکوک لە (٢٦)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٥) دامەزراوە، ئەم ناوەندە تێدەکۆشێت بۆ دەستوورێکی عیلمانی لە کوردستان، هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی بیروباوەڕە عیلمانییەکان و بەستی کۆڕو هوشیارکردنەوەی مەعریفی و هزری بۆ پرسە عیلمانیەکان لە کوردستان و کەرکوک. دەستەی دامەزرێنەر پێکهاتبوو لە:-

نەوزاد مەلا عومەر، سیروان مستەفا، بەختیار محەمەد، مامۆستا بەکر (بەکر فەرەج سەعید)، زاهیر شوکور، عەلی قەڵایی، سەلاح علیمانی، هاشم مەلا عەلی، ئازاد مەجید، عەلی مامی، سەمیر نوری (خالید محەمەد)، شێخ سدیق.

*** یەکێتی ژنانی کوردستان:-**

یەکێتی ژنانی کوردستان لە ساڵی (١٩٨٩) لە شاری (مەهاباد) لە کوردستانی ڕۆژهەڵات لەسەر دەستی چەند ژنێکی شۆڕشگێڕی کوردستانی عێراق دروست بوو، لەو کاتەدا مەبەست لە دروستبوونی زیاتر کۆکردنەوەی ژنانی ئاوارە بوو بۆ یەکخستن و ئاگاداربوون لە باروگوزەرانیان.

لە ساڵی (١٩٩١) خەباتی شاخ و ئاوارەیی گواستەوە بۆ شارو لە سەرجەم شارو شارۆچکەکاندا لق و لیژنەی دامەزراند، بەشدارییەکی کارای هەبوو لە هۆشیارکردنەوەی ژنان لە مەسەلەکانی ئەرك و مافدا.

لە ساڵی (٢٠٠٣)ەوە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق لە ناوچە دابڕێنراوەکان بەهەمان شێوەی هەرێمی کوردستان لق و لیژنەی دامەزراندو لقی کەرکوك یەکێك بوو لەو لقانە، کەراستەو خۆ لەلایەن مەکتەبی سکرتارییەتەوە دامەزراو ستافێکی چالاکی بۆ جێگیرکرا.

یەکێتی ژنانی کوردستان لقی کەرکوك لە ساڵی (٢٠٠٣) دامەزراو لە چەند بەشێك پێکهات.

١- بەشی ئیدارە، سەرپەرشتی سەرجەم ئیش و کارەکان دەکات.

٢- بەشی تەندروستی، تایبەتە بە هۆشیاری و تەندروستی و کۆڕو کۆبوونەوەو دابینکردنی پزیشکی پسپۆڕ بۆ ئەو گەڕەك و شوێنانەی پێویستیان پێیەتی.

٣- بەشی ڕاگەیاندن، تایبەتە بەئەرشیفکردنی کاروچالاکی و بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و کۆکردنەوەی ئامار لە سەر مەسەلەکانی ژنان.

٤- بەشی پرۆژەکان، تایبەتە بەکردنەوەی خولی دوورمان، کۆمپیوتەر، نەهێشتنی نەخوێندەواری، کاری دەستی، کردنەوەی پێشانگا.

٥- بەشی کۆمەڵایەتی، تایبەتە بەچارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتی و بەشی کۆڕی هۆشیاری لەسەر یاساو ماف و کێشە کۆمەڵایەتییەکان و بەشی ژوانگەی منداڵان بۆ ئەو منداڵانە دەگرێتە خۆ کە دایك و باوکیان جیابوونەتەوەو لە بارەگای ژنان دایك و باوکیان دەبینن.

٦- بەشی پەیوەندییەکان، تایبەتە بە تەنسیق بۆ چالاکی و کاری هاوبەش و سەردانی دام و دەزگاکان.

ژنانی لقی یەکێتی کەرکوك لەسەرەتادا پێکهاتبوو لە (٢٢) کادیری ژن کە (١٠) کادیریان زۆر چالاکن.

یەکێتی ژنانی کوردستان خاوەنی ڕۆژنامەیەکی تایبەتە بە ژنان بەناوی ژیانەوە، کە لە چاپخانەی (تەوار) هەفتانە بەچاپ دەگەیەنرێت.

خاوەنی رادیۆی (تەوار) کە زمانحاڵی یەکێتی ژنانی کوردستانە. یەکێتی ژنان لەسەرجەم پرسە نەتەوایەتی و یاسایی و هەرێمییەکاندا، هەڵوێستی هەبووە. چەندین ژنی پێگەیاندووە بۆ پەرلەمان و حکومەت و خاوەن پۆستی ئیداری و حیزبی لە ساڵی (٢٠٠٣)ەوە تا ساڵی (٢٠١٦) ئەم بەڕێزانە لقی کەرکوکی یەکێتی ژنانیان بردووەتەڕێوە:-

١- ئەسمەر

٢- دیمەن محەمەد

٣- جوان حەسەن

٤- کوردە خالید

٥- لاوە عوسمان

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. (العراق في التأريخ)، لاپەڕە (٦٤٦).
٢. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٦٤٧).
٣. گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (٣)، تشرینی دووەم، ساڵی دەیەم، ١٩٨٤.
٤. (الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨)، دکتۆر عەبدولستار تاهیر شەریف، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٩ لاپەڕە (١٨).
٥. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٢).
٦. گۆڤاری (مجلة آفاق عربية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٣).
٧. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، لاپەڕە (١٥).
٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١).
٩. (الجمعيات والمنظمات)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢).
١٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٧).
١١. (باجين تأريخى، تأريخ الصحافة في العراق باللغة التركمانية ١٨٦٩-١٩٧٩)، سەلاحەددین ساقی وەلی، محەمەد خورشید داقوقلی، بەغدا، ١٩٨٠ لاپەڕە (١١١-١١٢).
١٢. (جەمعییەتی تەعالی کوردستان)، ئیسماعیل گۆیلداش، وەرگێڕانی: زریان ڕۆژهەلاتی، بنکەی (ژین)، سلێمانی، ٢٠١١، لاپەڕە (١٠).
بۆ زیاتر بڕوانە: (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣.
١٣. (دۆزا کـوردان)، زنار سلوپی، دەزگـای چاپی (بلأفکرنا ستێر)، بەیروت، ١٩٦٩، لاپەڕە (٥٢).
بۆ زیاتر بڕوانە: (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣.
١٤. گۆڤاری (کـاروان)، ژمـارە (٦٤)، ١٩٨٨، لاپـەڕە (٨٩)، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی:
(ڕۆژنامەو ڕێکخراوە کوردییەکانی تورکیا لە سەردەمی یەکەم جەنگی جیهانیدا)، عەبدوڵلا بابەکر حەمە ئاغا.
بۆ زیاتر بڕوانە: (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣.
١٥. (کـوردەکـانـی ئەستەمبوڵی کـۆن)، ڕۆهـات ئـالاکـۆم، وەرگێڕانـی: شکور مستەفا، دەزگـای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥، لاپەڕە (١٢٢).
بۆ زیاتر بڕوانە: (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣.
١٦. بۆ زیاتر بڕوانە: (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣، لاپەڕە (٩٦).
١٧. (کوردستان و ڕاپەڕینەکانی کورد)، عەبدولعەزیز یامولکی، وەرگێڕانی: شێرزاد کەریم، دەزگای چاپ و پەخشی (سەردەم)، لاپەڕە (٦٥).
بۆ زیاتر بڕوانە: (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣.
١٨. بڕوانە:
- (الحياة السياسية في كوردستان ١٩٠٨-١٩٢٧)، عەلی تەتەر تۆفیق، وەرگێڕانی: تەحسین ئیبراهیم ئەلدۆسەکی، پێداچوونەوە عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی، دەزگـای چاپ و پەخشی (سپیرێز)، دهۆك، ٢٠٠٧، لاپەڕە (١٦١).
- (كردستان والحركة الوطنية الكردية)، سەلاحەددین محەمەد عەبدوڵلا، بەغدا، ١٩٥٩، لاپەڕە (٢٢).
- بۆ زیاتر بڕوانە: (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣.
١٩. گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)، ژمارە (٦)، کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٠)، لاپەڕە (٤٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(خەباتی گەلی کورد لە ڕۆژەکانی جەنگی گێتی یەکەمیندا)، ئیسماعیل حەقی شاوەیس.
بۆ زیاتر بڕوانە: (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣.
٢٠. (الـثـورة العراقية الـكبرى)، عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی، ١٩٧٨، (دار الكتب لبنان)، لاپەڕە (٢٤٦-٢٤٧).
٢١. (النشاط الصهيوني في العراق)، لاپەڕە (١٣٠-١٣١).
٢٢. (اضـواء على الحركة الشيوعية في العراق، الجزء الاول ١٩٣٤-١٩٥٨) دکتۆر سەمیر عەبدولکەریم، دکتۆر سەلاح محەمەد، لاپەڕە (٢٠).
٢٣. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢١-٢٢).
٢٤. (للتأريخ لسان، ذكريات وقضايا خاصة بالحزب الشيوعي العراقي منذ تأسيسه حتى اليوم)، مالیك سەیف، ١٩٨٣، لاپەڕە ١٧١.
٢٥. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، لاپەڕە (١١٥).
٢٦. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە ٣، ١٩٩٩، لاپەڕە (٩٤).
٢٧. (پێشهاتەی سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ١٩٤٥-١٩٥٨)، مەهدی محەمەد قادر، ٢٠٠٥، لاپەڕە (٧٩).
٢٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٠).
٢٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٣).
٣٠. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، لاپەڕە (١٥٩).
٣١. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(*) بەلام هەندێك سەرچاوە ناوی (عیزەت ئەفەندی تۆفیق ئاغا) بە (عەزیز ئەفەندی تۆفیق فەتاح) ناو دەبەن، بڕوانە:
- (حیزب و ڕێکخراوە سیاسیە عێراقییەکان ١٩١٠ - ٢٠١٠)، محەمەد فاتیح، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕە (٩٢).
٣٣. بڕوانە:

- (کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا)، وەلید حەمدی، وەرگێڕانی: محەمەد نوری تۆفیق، دەزگای پەخشی (سەردەم)، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩، لاپەڕە (١٧٤).
- (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣.
- (کوردستانی گەورە: چەند لاپەڕەیەك لە سەردەمی خەباتی سیاسی ساڵی ١٩٢٩، لێکۆڵینەوەی سەردەم و تەرجەمەی چەند دۆکیومێنتێکی بریتانی)، دکتۆر سەربەست کەرکوکی، کەرکوك، ٢٠١٤، لاپەڕە (٣٥ - ٤٠).

٣٤. بڕوانە:
- (کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٧٥).
- (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٢٠١٣.
- (کوردستانی گەورە: چەند لاپەڕەیەك لە سەردەمی خەباتی سیاسی ساڵی ١٩٢٩، لێکۆڵینەوەی سەردەم و تەرجەمەی چەند دۆکیومێنتێکی بریتانی)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٥ - ٤٠).

٣٥. (مەوسوعەی پارتە سیاسییەکانی کوردستان و عێراق ١٩٠٨ - ٢٠٠٥)، حەسەن بارام، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕە (٨٧ - ٨٨).

٣٦. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، لاپەڕە (١٨-٢٠).

٣٧. (کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردییەکان ١٩١٨-١٩٣٣ لە بەڵگەنامەکانی هەردوو وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا و فەرەنسادا)، بەگی یەکەم، وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا، بنکەی (ژین)، سلێمانی، ٢٠٠٧، لاپەڕە (١٧٥).

٣٨. گۆڤاری (هەشتاو هەشت، ژمارە (٢) هاوینی ٢٠٠٤ لاپەڕە (٨٥-٨٦).

٣٩. (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣، لاپەڕە (٢٦٩-٢٧٠).

٤٠. (دليل مشاهير الألوية العراقية الرسمية)،

٤١. ڕۆژنامەی (کەرکوك)، ژمارە (١٨٠٧)، ڕۆژی (١٣)ی ئاداری ساڵی (١٩٦٣)، لاپەڕە ٤١٦.

٤٢. (ڕەوتی ئیسلامی باشووری کوردستان ١٩٤٦-١٩٩١)، ئیدریس سیوەیلی، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٩، لاپەڕە (٢٣).

بۆ زیاتر بڕوانە: (بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعییەت و حیزبە کوردییەکان ١٩١٩-١٩٤٥)، عەبدولخالید سابیر کەریم، سلێمانی، ٢٠١٣.

٤٣. (تەئریخی جاف، کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف)، لێکۆڵینەوەی د. حەسەن جاف، چاپی یەکەم، ١٩٩٥ لاپەڕە (١٠٥- ١٠٦).

٤٤. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە ٥٢، ١٩٩٣، لاپەڕە (١٨-٢٠).

٤٥. (الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨)، دکتۆر عەبدولستار تاهیر شەریف، چاپی یەکەم، بەغدا، (١٩٨٩)، لاپەڕە (٩٢).

٤٦. ڕۆژنامەی (کەرکوك)، ژمارە (١٩٧٩)، (١٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٩).

٤٧. ئەم زانیاریانەم لە (ئیستیڤان ڕەبان)ەوە وەرگرتووە لە کەرکوك.

٤٨. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٩. گۆڤاری (ڕەنگین)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١).

٥٠. (الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨- ١٩٥٨)، دکتۆر عەبدولستار تاهیر شەریف، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٩، لاپەڕە (٩٥).

٥١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٩٦).

٥٢. (موسوعة العراق السياسية)، عەبدولڕەزاق محەمەد ئەسوەد، لاپەڕە ٣٧٨، بەرگی شەشەم.

٥٣. (الجمعيات والمنظمات)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠٣).

٥٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠٢).

٥٥. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢٠).

٥٦. (الجمعيات والمنظمات)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٩٦-٩٧).

(**) (حیزب و ڕێکخراوە سیاسیە عێراقییەکان ١٩١٠ - ٢٠١٠)، محەمەد فاتیح، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕە (١٠١).

٥٧. بڕوانە:
- (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٤-٨٥).
- (پەرەسەندنی ژیانی حیزبایەتی لە کوردستانی باشووردا)، محەمەد فاتیح، هەولێر، ٢٠١٤، لاپەڕەکانی (١٤٣ - ١٤٤).

٥٨. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٩٠).

٥٩. (موسوعة العراق السياسية)، لاپەڕە (٣٨٨).

٦٠. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (٥٢)، لاپەڕە (٢٢).

٦١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕ (٢٢).

٦٢. (الجمعيات والمنظمات)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠٦).

٦٣. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٩).

٦٤. (النشاط الصهيوني في العراق ١٩١٤-١٩٥٢)، سادق حەسەن ئەلسودانی، (دار الرشيد للنشر)، ١٩٨٠، لاپەڕە (١٤٨-١٤٩).

٦٥. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٥٠).

(***) (حیزب و ڕێکخراوە سیاسیە عێراقییەکان ١٩١٠ - ٢٠١٠)، محەمەد فاتیح، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕە (٧١).

٦٦. (النشاط الصهيوني في العراق ١٩١٤-١٩٥٢)، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٥١).
- القاموس الموسوعي، اليهود في العراق في فترة الأسر البابلية الى سنة (١٩٥٢) شامل عبد القادر، لاپەڕە ٨٠ دار الحكمه، لەندەن، ٢٠١٢.

٦٧. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە(١٥٣).
٦٨. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٥٤-١٦٣).
٦٩. (امة في شقاق، دروب كردستان كما سلكتها)، جوناسان راندل، وەرگێڕانی: فادی حمود، (دار النهار للنشر)، بەیروت، ١٩٩٧ لاپەڕە (١٧٢).
٧٠. (پێشهاتەی سیاسییەكانی كوردستانی عێراق ١٩٤٥-١٩٥٨)، مەهدی محەمەد قادر، ٢٠٠٥، لاپەڕە ٦٢.
٧١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦٦-٦٧.
٧٢. (پێشهاتەی سیاسییەكانی كوردستانی عێراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠٩-٢١٤).
٧٣. (الحركات الاسلامية في الوطن العربي)، بەرگی یەكەم، سەرپەرشتی دكتۆر عەبدولغەنی عیماد، (مركز دراسات الوحدة العربية)، ٢٠١٣، لاپەڕە (٣٧٣).
٧٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٧٤).
٧٥. (پێشهاتەی سیاسییەكانی كوردستانی عێراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠٩-٢١٤).
٧٦. (١٠٠ عام من الاسلام السياسي بالعراق،ج ٢ السنة)، ڕەشید ئەلخەیون، دەزگای (المسبار)، دوبەی، ٢٠١١، لاپەڕە (١٤٩ - ١٥٠).
٧٧. چاوپێكەوتن لەگەڵ نوری فەقێ.
٧٨. (الحركات الاسلامية في الوطن العربي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٧٤).
٧٩. (یاداشت)، عەبدولستار تاهیر شەریف، لاپەڕە (١٩ - ٢٠).
٨٠. گۆڤاری (لیڤین)، ژمارە (٥٥)، ئابی ساڵی (٢٠٠٧)، لاپەڕە (٤٢- ٤٤)، چاوپێكەوتن لەگەڵ دكتۆر نوری تاڵەبانی دەربارەی (ئیخوان ئەلموسلمین) لە كەركوك بە ناونیشانی:
(بیرەوەرییەكانی لەگەڵ كەركوكدا دەگێڕێتەوە)،
٨١. (ڕەوتی ئیسلامی لە باشووری كوردستان ١٩٤٦-١٩٩١، توێژینەوەیەكی مێژوویی لە كارو چالاكی پارتو كۆمەڵە ئیسلامییەكان)، ئیدریس سیوەیلی، چاپخانەی (گەنج)، سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەڕە (١٠٣).
٨٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەكانی (١٠٤-١٠٥).
٨٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەكانی (١٠٦-١٠٧).
٨٤. (١٠٠عام من الاسلام السياسي بالعراق،ج ٢السنة)، ڕەشید ئەلخەیون،دەزگای(المسبار)،دوبەی،٢٠١١،لاپەڕە (٨٦).
٨٥. گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارەی (١١-١٢)، تشرين دووەم- كانون یەكەم، ساڵی بیستو یەكەمین، ١٩٩٦، لاپەڕە (٢٧-٣١)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونیشانی:
- (نوادي اخوان الحرية في العراق)، دكتۆر خالید حەبیب ئەلراوی.
٨٦. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (١٢٥)، لێكۆڵینەوەیەكی دكتۆر كەماڵ مەزهەر دەربارەی كۆمەڵەی زەردەواڵە.
٨٧. (موسوعة العراق السياسية)، لاپەڕە (٣٨٩).
٨٨. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارەی (١٢١)، لاپەڕە (٦-٧).
٨٩. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارەی (١٢١)، لاپەڕە (١٦٥-١٦٦).
٩٠. (یاداشتەكانم)، عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری، بەرگی یەكەم، بەغدا، ١٩٩٢، لاپەڕە (٧٩).
٩١. (موسوعة العراق السياسية)، لاپەڕە (٣٩٤).
٩٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩٥).
٩٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩٦)
٩٤. (بیرەوەرییەكانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، لاپەڕە (١٥٥).
٩٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، (١٥٩).
٩٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، (١٦٨).
٩٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، (١٩٢).
٩٨. (تاريخ ابرشيه الموصل السريانية)، سلێبا شەمعون، مەترانی سریانی ئەرسەدۆكسی موسڵو دەوروبەری، چاپخانە (شەفیق)، بەغدا، ١٩٨٤، لاپەڕە (٧٠).
٩٩. (كردستان والحركة القومية الكردية)، جەلال تاڵەبانی، چاپی یەكەم، بەغدا، (١٩٧٠)، لاپەڕە (٨٣).
١٠٠. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (٦٣).
١٠١. (بیرەوەرییەكانی ژیانم)، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٥٥).
١٠٢. (تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لە ڕۆژنامەگەریی كوردیدا)، دكتۆر كەماڵ مەزهەر، چاپخانەی (كۆڕی زانیاری كورد)، ١٩٧٨، لاپەڕە (٢٢٥).
١٠٣. ئەم زانیاریانەم لە هەر یەكە لە (جەلیل محەمەد شەریف) و (ڕەمەزان زامدار) وەرگرتووە.
١٠٤. بڕوانە:
- (حیزبو ڕێكخراوە سیاسیە عێراقییەكان ١٩١٠ - ٢٠١٠)، محەمەد فاتیح، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕە (٥٦).
- (الاحزاب والجمعيات السياسية في القطر العراقي ١٩٠٨ - ١٩٥٨)، عەبدولجەبار حەسەن ئەلجبوری، (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٧٧، لاپەڕە (١٩٧).
١٠٥. (الاحزاب والجمعيات السياسية في القطر العراقي ١٩٠٨ - ١٩٥٨)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٩٧ - ١٩٨).
١٠٦. (جارانی كەركوك)، زاهیر شكور، بەرگی دووەم، دەستنووس.
١٠٧. گۆڤاری (لڤین)، ژمارە (٥٥)، ساڵی (٢٠٠٧)، لاپەڕە (٤٤)، چاوپێكەوتنێك لەگەڵ (دكتۆر نوری تاڵەبانی).
١٠٨. (مەوسوعەی پارتە سیاسییەكانی كوردستانو عێراق ١٩٠٨ - ٢٠٠٥)، حەسەن بارام، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕە (١٨٧ - ١٨٨).
١٠٩. (تاريخ الوزارات العراقية في العهد الجمهوري)، لاپەڕە (٢٩ - ٣٠).
١١٠. گۆڤاری (هاواری كەركوك)، ژمارە (٥)، (١١٩-١٢٠).
١١١. گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (٧)، ١٩٧٢، لاپەڕە (١٨ - ٢٠)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونیشانی:
(لاپەڕەیەك لە خەباتی فەقێكانی كوردستان)، نووسینی: محەمەدی مەلا كەریم.
١١٢. (حیزبو ڕێكخراوە سیاسیە عێراقییەكان ١٩١٠ - ٢٠١٠)، محەمەد فاتیح، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕەكانی (١٥٦ - ١٥٧).
١١٣. گۆڤاری (قەقنەس)، ژمارە (١)، ساڵی (٢٠١٤)، لاپەڕە (٨٠ - ٨٤)، بابەتێكە بە ناونیشانی:
(چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی (پاسۆك))، نووسینی: شێرزاد فاتیح محەمەد.
١١٤. بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

– (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، ١٩٩٠، لاپەڕە (١٥٦).
– (تأريخ الوزارات العراقية)، عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی، بەرگی دەیەم، لاپەڕە (٢١٣-٢١٤).
– (تأريخ الوزارات العراقية في العهد الجمهوري، ٧ شوبات-١٣ تمووزی ١٩٥٩)، لاپەڕە (٢٩٣-٢٩٥).
١١٥. (پێشهاتەی سیاسییەکانی کوردستانی عێراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠٩-٢١٤).
١١٦. چاوپێکەوتن لەگەڵ نوری فەقێ.
١١٧. ئەم زانیارییەم لە خەڵکی وەرگرتووە.
١١٨. ڕۆژنامەی (کەرکوك)، ژمارەکەی دیار نییە.
١١٩. (دليل العراق الرسمي)، ١٩٦٠، لاپەڕە ٤١٦.
١٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤١٦.
١٢١. گۆڤاری (العربي)، ژمارە (١٤٦)، کانوونی دووەم، ١٩٧١، لاپەڕە (١٢٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(الاكراد)، ڕاپۆرت: سەلیم زەبال، وێنەگرتن: ئۆسکار متری.
١٢٢. (دليل الجمهورية العراقية ١٩٦٠-١٩٦١).

بەڵام هەندێك لە سەرچاوەکان ئەوە باس دەکەن، کە شوێنی سەرەتایی ئەم کۆمەڵەیە لە شەقامی ئەلماس بووە، هەر لە ساڵی (١٩٥٥)ەوە ئاهەنگ و بۆنەی خۆی گێڕاوە لە هەموو ماوە مێژووییەکاندا.

ئەم کۆمەڵەیە لە عێراقدا لە سەردەمی پاشایەتی لە ماوەی دەسەڵاتی سەرۆك وەزیران ئەرشەد ئەلعامری لە ساڵی ١٩٣٢ لە بەغدا دامـەزراوە، بـەڵام لە ساڵی ١٩٥٥ لقی لە کەرکوك لێکراوەتەوە کە عەبدوڵڵا ئاوچی وەکو سەرکی کارگێڕیی بەڕێوەبەری هەڵبژێردراوە بە ئامادەبوونی یوسف زەیبە موتەسەریفی کەرکوك. بە هەڵبژاردنی هەریەکە لە ئەندامێتی د. سەلیم ئەلنوحاس، سەلاحەدین نەفتچی، عەبدولعەزیز بەیاتی، نەجیب قیردار، فازڵ تاڵەبانی، حیسامەدین ساڵەیی، کامیل عەبدوڵڵا یەعقوبی.

لە ساڵی ١٩٩١ دووبارە لەسەر بنەمایەکی تازە لە عێراقدا هەڵبژێردرایەوە و کەرکوکیش لقی خۆی کردەوە و بەشەکانی خۆی کارا کردەوە وەکو: لاوان، بڵاوکردنەوە، تەندروستی، گەڕان بەدوای ونبووان، کارەساتەکان.

ئەم کۆمەڵەیە لە کەرکوك گۆڤارێك دەردەکات بەناوی (الهلال الاحمر) کە لە ئێستادا د. یاسەمین عەبدولواحید سەرپەرشتی دەکات.

١٢٣. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (٨٣)، ئەیلول (١٩٩٥).
١٢٤. بڕوانە:
– ڕۆژنامەی (کەرکوك)، ژمارە (١٤٢٩)، لە (٢٥)ی ئایاری ساڵی (١٩٦٦).
– ڕۆژنامەی (کەرکوك)، ژمارە (١٨٨٩) دەربارەی هەمان بابەت.
١٢٥. ڕۆژنامـەی (کـەرکوك)، ژمـارە (١٨٠٧)، ڕۆژی (١٣)ی ئاداری ساڵی (١٩٦٣)، لاپەڕە (٣).
١٢٦. ڕۆژنامەی کەرکوك، ژمارە (١٩٠٠)، (١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٦) لاپەڕە (٢).
١٢٧. ڕۆژنامەی (کەرکوك)، ژمارە، (١٩٦٩)، (١٥)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٩).
١٢٨. (حیزب و ڕێکخراوە سیاسیە عێراقییەکان ١٩١٠ – ٢٠١٠)، محەمەد فاتیح، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕەکانی (١٥٤ – ١٥٥).
١٢٩. (گلاوەریوەکان)، عوسمان مستەفا خۆشناو، ٢٠٠٧، لاپەڕە (٢٨٠ – ٢٩١).
١٣٠. ڕۆژنامەی (سێبەر)، ژمارە (١)، ٢٠٠٤، لاپەڕە (٢).
١٣١. ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ساڵی ٢٠٠٣، لەبەر کۆنی ڕۆژنامەکە نە ژمارە و ڕۆژی دەرچوونەکەی نەزانراوە.
١٣٢. پاشکۆی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ) ژمارە (٥٩٠٦)، ڕۆژی (١٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٢)، پاشکۆیەك بەناوی (کۆمیتەی ئاگر)، تایبەتی بە ساڵیادی شەهیدانی کۆمیتەی ئاگر، لاپەڕە (٢-٦).
١٣٣. (حیزب و ڕێکخراوە سیاسیە عێراقییەکان ١٩١٠ – ٢٠١٠)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (١٦٠ – ١٦١).
١٣٤. (الحركات الاسلامية في الوطن العربي)، بەرگی دووەم، سەرپەرشتی دکتۆر عەبدولغەنی عیماد، (مركز دراسات الوحدة العربية)، ساڵی (٢٠١٣)، چاپی یەکەم، لاپەڕە (٢١٢٤-٢١٢٥).
١٣٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٤٥).
١٣٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٧٣).
١٣٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٧٤).
١٣٨.(١٠٠ عام من الاسلام السياسي بالعراق، ج١ الشيعة)، ڕەشید ئەلخەیون، دەزگای (المسبار)، دوبەی، ٢٠١١، لاپەڕە (٢٥٩).
١٣٩. (مەوسوعەی پارتە سیاسییەکانی کوردستان و عێراق ١٩٠٨ – ٢٠٠٥)، حەسەن بارام، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕە (٣٧٦ – ٣٧٧).
١٤٠. (پەیرەو پرۆگرامی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك)، کۆمەڵێك لاپەڕەی جۆراوجۆر.
١٤١. (الحركات الاسلامية في الوطن العربي)، بەرگی دووەم، سەرپەرشتی دکتۆر عەبدولغەنی عیماد، (مركز دراسات الوحدة العربية)، ٢٠١٣، لاپەڕە (١٤٤١).
١٤٢. (الاحزاب والحركات والتنظيمات القومية في الوطن العربي)، سەرپەرشتی محەمەد جەمال بارووت، (مركز دراسات الوحدة العربية)، بەیروت، ٢٠١٢، لاپەڕە (١٩٨-١٩٩).
١٤٣. ڕۆژنامەی (چاودێر)، ژمارە (٤٧٥)، لاپەڕە (٢)، ڕۆژی (٧)ی تەموزی ساڵی (٢٠١٤)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (هاوسەرگیریی کاتیی داعش و چوار گرووپەکە)، نووسینی: ڕزگار فایق.
١٤٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٤٥. گۆڤاری (سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی)، ژمارە (٥٩)، ساڵی حەڤدەهەم، ئابی ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەڕە (٧٥ – ٧٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(دەرکەوتنی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە کوردستانی عێراق)، نووسینی: د. یوسف گۆران.
١٤٦. (حیزب و ڕێکخراوە سیاسیە عێراقییەکان ١٩١٠ – ٢٠١٠)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٥).
١٤٧. (الحركات الاسلامية في الوطن العربي)، بەرگی دووەم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٤٧١).

١٤٨. (ویکیبیدیا، الموسوعة الحرة)، تۆڕی ئەنتەرنێت.
١٤٩. (حیزبو ڕێکخراوە سیاسیە عێراقییەکان ١٩١٠ - ٢٠١٠)، محەمەد فاتیح، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕەکانی (١٧٩ - ١٨١).
١٥٠. (مەوسوعەی پارتە سیاسییەکانی کوردستانو عێراق ١٩٠٨ - ٢٠٠٥)، حەسەن بارام، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕە (٣٨٨).
١٥١. (مەوسوعەی پارتە سیاسییەکانی کوردستانو عێراق ١٩٠٨ - ٢٠٠٥)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤١٢ - ٤١٣).
١٥٢. (مەوسوعەی پارتە سیاسییەکانی کوردستانو عێراق ١٩٠٨ - ٢٠٠٥)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٧٠).
١٥٣. سوپاسو پێزانینمان بۆ بەڕێز (ڕزگار حاجی حەمە) بەرپرسی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بۆ پێدانی زانیاری لەسەر بەشێکی زۆر لە ڕێکخراوە مەدەنیو دیموکراتییەکانی پارێزگای کەرکوك.

## * هێزی (لیڤی):-

لە ساڵی (١٩١٥) پێشەنگ (ئێدیە – Major Eadie) لە سوپای هیندی، کە ئەو کاتە لە لەشکری (مونتەفیك) لە میسۆپۆتامیا ئەفسەری کارگوزاری تایبەتی بوو، چل سوارەی عەرەبیان لە خێڵەکانی دەورووبەری ناسرییە لەسەر رووباری فورات، بۆ کارکردن لەژێر کارگێڕی هەواڵداریدا، خستنە ریزی سەربازییەوە.

لەم هێزە بچووکە چل کەسییەوە، وردە وردە هێزێك پێکهێنرا، کە دوای چەند ناوێکی جیاواز، لە دواجار ناونرا (لیڤی)و لە ساڵی (١٩٩٥)ەوە لە هێزێکی چل کەسییەوە ژمارەکەی لە مایس ساڵی (١٩٢٢) بەرزبۆوە بۆ (٦١٩٩) کەس، لە دوای ئەو رۆژەوە بەرەبەرە یەکەکانی کەم دەبوونەوە، یان دەگوێزرانەوە بۆ ناو سوپای عێراق.

لە یەکەیەکی بچووکەوە گۆڕا بۆ هێزێکی بڵاوی تێکەڵ، بەهەموو جۆرە چەکێکی رێکوپێکەوە، سەربازەکانیشی لە تەواوی عەرەبەوە گۆڕان بۆ هێزێکی تێکەڵ لە عەرەب، کورد، ئاشووری، تورکمان، ئێزیدییەکان، لەدوا جاریشدا تەواو بوون بە هێزێکی (ئاشووری). هەروەها ئەو ناوچەیەی یەکەم جار بۆی بەکارهێنرا، بەر لە هەمووی بە تەواوی لە باشووری بەغدادا دیاریکرا بوو، دواتر بە تەواوی بۆ کوردستان دیاریکرا.

لە ساڵی (١٩١٦)دا بڕیاردا، کە هێزەکە دەبێ بەرگێکی هاوپۆشی دیاریکراوی هەبێت و لێرەشدا کێشەکە هاتە پێشەوە. تەنیا بەرگێك، کەلە پێ هەڵکێشرێ یان دەبێ پانتۆڵی کورت، یاخود پانتۆڵی سوارە بێت، کەلای سمتەوە کەمێ فشەڵە، بەڵام عەرەبەکان ئامادە نەبوون، ئەمانە هیچیان بپۆشن، بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە دەرخستنی لاقەکان شتێکی نەشیاوەو دژی هەموو دابونەریتێکە. چارەسەری ناوەند ئەوەبوو، کە عەرەب دیشداشەکانی خۆیان بەسەر بەرگە هاوپۆشەکەدا بپۆشن، بەهەر حاڵ، لەماوەی ساڵی (١٩١٧)دا راهاتن لەگەڵ ئەوەی بەرگی سەربازانی بەریتانی بپۆشن و ئەوەش لەناو هەموو هێزەکەدا پەیرەویی کرا.

لە تەموزی ساڵی (١٩١٩)دا، جارێکی تر ناوی هێزەکە لە نیمچە نیزامییەوە گۆڕا بە (لیڤی) ئێستا لە بەکارهێنانیدا بۆ یەکەم جار ولە یەکێ ئابدا دەستوورەکانی (لیڤی)و دەرەك بڵاوکرایەوە.

ئەو دەستوورانە بەکۆنترۆڵکردنی (لیڤی)و ئەرکەکانی ئەفسەری پشکنەری (لیڤی) ناسراوە، کە پشکنین و کارگێڕی سنووردار کردووە. بۆیە بەپێی ئەم دەستوورانە لیڤی لەژێر فەرمانی سێ کەسی جیاوازدا بووە:-

١- ئەفسەری پشکنەر.

٢- بەرپرسی سیاسی ناوچەکە.

٣- سەرۆکی کارگێڕیی ناوخۆ.

لەسەرو ئەوەشەوە بودجە لە لایەن ئەفسەری پشکنەرەوە تاووتوێی کراوە، جگە لە لیڤیی کەرکوك و سلێمانی و موسڵ، ئەفسەرانی سیاسی کاریان لەسەر کردووە.

لە کەرکوك ئەوەی زیاتر پەیوەندی کرد بە لیڤییەوە تورکمانەکانی کەرکوك بوو کە پەیوەندییان کرد بە لیڤیی کوت و بە عقوبە و کەرکوکەوە.

شوێن و توانای لیڤی لە کەرکوك لە کۆتایی (١٩٢١)دا بریتی بووە لە فەوجی دووەم لە کەرکوك، لەگەڵ نیو تیپ لە پیادەی سلێمانی لە چەمچەماڵ، هەروەها فەوجی چوارەم لە هەولێر. ئەوەی جێگەی سەرنجەکە ئەم هێزەی ئینگلیزەکان وەکو دەسکەلایەکی کتوپڕ بەکاریان هێنا بۆ سەرکوت کردنی هەر جمووجوڵ و چالاکییەك لە ناوچە جۆر بەجۆرەکانی عێراق لە هەمان کاتدا ئەم هێزە لە هەندێ باردا کێشەیان بۆ خەڵکی ناوچەکە دروست دەکرد.

لە مانگی مایسی ساڵی (١٩٢٤)دا بەتالیۆنی دووەمی (لیڤی) عێراق لە کەرکوك بوو، هەروەها خێزانەکانیشیان لەگەڵیاندا بوون، بەتالیۆنەکە خەریکی پێکهێنانی سەربازگەیەك بوو لە چەمچەماڵ بۆ ئۆپەراسیۆنەکانی سلێمانی، لە ٤ی مایسدا تەنها دووتیپ و خێزانە ئاشوورییەکان لە کەرکوك مابوونەوە.

لە سەعات نۆو سی دەقیقە لە رۆژی ٤ی مایس ئاژاوەیەك لە بازاڕدا هەبوو. سەربازێکی ئاشووری بە بریندااری گەڕایەوە، دوای ناکۆکییەك لە بارەی نرخی شتێکەوە لە دوکانێکدا (راب خامشی بایجۆ) لەگەڵ پۆلیسی فەوجدا چوون لە بازاڕدا ئاشوورییەکان گردکەنەوە، فەرمانیش درا، کە بە تالیۆنەکە ئەوەی ماوە لە ئامادە باشیدا بن، لەو شوێنەی لێسین، سەرتیپ (گرۆودن – Captain Growdon) ئەفسەری پۆلیسی، گەیشتە سەربازگەی (لیڤی)و لەگەڵ سەرتیپ.

(کینگ Captain p. p king) هەریەکەو فەرماندەی یەکێ لەو دوو تیپەیان دەکرد، کەلە کەرکوکدا مابوونەوە، هەردووکیان پێکەوە بەرێز رۆیشتن، هەر کە گەیشتن (راب خامشی بایجۆ)و پۆلیسی فەوجەکە گەڕانەوە، دوو پیاوی بریندااری تریان .لەگەڵ خۆیان هێنایەوەو رایانگەیاند، کە بازاڕ پاککراوەتەوە، دووپیاوە بریندارەکە ووتیان ئەوان لە کاتی ناکۆکییەکەدا بە دارێکی قورس لە دواوە لێیاندراوە. هەروەها وتیان خەڵکی لە بازاڕدا پێیاندەوتین ئێستا نیوەتان چووە بۆ چەمچماڵ ئێمە لە ئێوە ناترسین.

سەرتیپ کینگ (Captain p. p. king)و سەرتیپ گرۆودن – (Captain Growdon) بۆ پیاوەکانی لە ریزی ئامادەباشیدابوون روونیانکردەوە، لەبەر ئەوەی لە بازاڕدا کێشە هەیە، بۆیە ئەمڕۆ نابێ سنوور ببەزێنین. خاوەن دوکانەکان، کە هۆی ئاژاوەکەن، دەبێ بگیرێن و دادگایی بکرێن. هەروەها دەبێ بەتالیۆنەکە لە باشترین ئاستی هەلسووکەوتدا بێت و نەبێتە هۆی ئاژاوەنانەوە. دەستەیەکی پۆلیس لەسەر پردەکە دادەنرێت. پیاوەکانی تر سکاڵاکانیان هێنابووە پێشەوە. گرۆودن و کینگ دەستیانکرد بە لێکۆڵینەوەو چوونە ناو سکاڵاکانەوەو ریزی نمایشکاران مەرەخەسکران.

لەکاتی جێهێشتنی مەیدانی نمایشەکە، پیاوەکە، دەبووایە بەلای چایخانەیەکدا تێپەڕن. کوتوپڕ لە وەڵامی هەندێ توانج لەلایەن میللەتەوە لەناو چایخانەکەدا، ئاژاوەی لێکەوتەوە.

پیاوەکان هەڵیانکوتایە سەر شوێنەکەو کورسییەکانیان لەناو چایخانەکەدا لەسەری خەڵکەکەدا شکاند. ئینجا گرووپێکی بچووکی دار بەدەست چوونە پێشەوە بۆ سەر پردەکە. سەرتیپ کینگ (Captain p. p. King) لەگەڵ بایجۆو گۆرگیس، ئەفسەرانی دانیشتووی ئەوێ، بەخێرایی بەرەو پردەکە چوون، بۆ ئەوەی هەوڵبدەن پیاوەکان بوەستێنن‌و چاوشی پۆلیس بورجس لە بەشی پۆلیس، بۆ ئەو مەبەستە عارەبانەیەکی ئامادەکرد.

دەستەکەی پۆلیس‌و ئەفسەرەکان هەوڵیان دا پیاوەکان ناچارکەن لە پردەکە بگەڕێنەوە، بەڵام هەندێك زووتر چووبوونە سەر پردەکەو لە بەرەکەی ترەوە تەقەیان لێدەکردن. ئەوە بڵاوەی پێکردن‌و ژمارەیەك زیان هەبوو. هەروەها دەستەکەی ئاشوورییەکان لەبەری ڕۆژئاوای پردەکەوە کەوتنە ژێر تەقەوە. ژمارەیەك لەپیاوەکان لەگەڵ تفەنگ‌و تەقەمەنیەکانیان گەڕانەوە بۆ ڕیزەکانی خۆیان‌و تەقە لە هەموو لایەکەوە دەستیپێکرد.

سەرتیپ کینگ چەندی توانی لە پیاوەکانی دەستگیرکرد، بردنی بۆ قەڵای کەرکوك، لەوێ چەك کران‌و لە گەنجینەی هێزی سوارەدا خرانە ژێر چاودێرییەوە.

لەهەمان کاتدا کۆمەڵێك توانیان ڕێی خۆیان ببڕن‌و بە پردەکەدا بپەڕنەوەو دەستبگرن بەسەر خانوویەکی بەرزی ناسراو بە خانووی تۆما، لەوێ لەسەربان پێگەی خۆیان وەرگرت، کە لەوانەیە لە قەڵای کەرکوکەوە بەدیبکرێن. سەرتیپ میلەر - (Captain A. T.Miller) پشکنەری کارگێری کەرکوك، لەگەڵ سەرتیپ کینگ‌و گرۆودن، لە ڕێی بێتەلەوە پەیوەندەییان بە سەرهەنگی فەرماندەوە کرد، کە لەگەڵ فەرماندەی ناوچەکەدایە لە بەغدا، ئەویش بە فڕۆکە هات، شوفێری زرێپۆشەکانیان بۆ نارد، پەیامێکیشیان نارد بۆ سەرهەنگی دووەم کامیرۆن - (Lieut. Colonel Cam-eron) لە چەمچەماڵ، وبروسکەش بۆ بەغدا کرا، کە چ کێشەیەك لە ئارادایە.

سەرتیپ فرای - (Captain 0 . M. fry) لە لیڤیی فڕۆکەخانە بوو، پەیامێکی پێگەیشت، کە دەستبەجێ بێت، ئەویش لەژێر تەقەی ماڵەکانی کەرکوکدا کەوتەڕێ، نزیکی پۆلیسخانە، بەسەر پردەکەدا بۆ ماڵی تۆماو دوای هەندێك لە هەموو لایەکەوە کۆمەڵانی ئاشووری کۆبوونەوە، لە کۆتاییدا هەشتا ئاشوورییەکی پێکەوە گردکردەوە، کە سێ ئەفسەریشیان تێدابوو، ئیدی بردینییەوە بۆ ناو قەڵاکە، لە ماڵەکانی نزیك پۆلیسخانەکەوە تەقەیان لێدەکرا، تەقەکردن لە شارەکەدا بەردەوامە، لیڤیەکان زیانی پێنج کوژراوو حەوت برینداریان داو کارمەندێکی مەدەنی عەرەبیش کوژراوە، قوربانییەکانی خەڵکی کەرکوك بریتی بوو لە پەنجا کوژراو، هەروەها نزیکەی سەد پەناهەندەی مەسیحی لە قەڵاکەدا کۆکرانەوەو خواردەمەنییان بەسەردا دابەشکردن، دەورووبەری سەعات پێنجی ئێوارە شارەکە بێدەنگ بوو، لەو سەعاتەدا کەرتێك لە (فەوجی ئنیسکلین فوسیلیەرسی پاشایەتی)، کە (فەوجێکی سەربازی پیادەی ئایرشە) بە فڕۆکە گەیشتن‌و ئەرکی پاسەوانی‌و پۆلیسی دیدەوانیان گرتەدەست، هەروەك بارودۆخەکە زیاتر قەیراناوی‌و هەستێکی زۆر تاڵ بوو، هەموو بەتالیۆنی ئاشوورییەکان‌و خێزانەکانیشیان بە تەواوی چوونە دەرەوەو چوار میل دوور لە دەرەوەی شار هەڵیاندا، لەوێدا بە ڕابەریی سەرتیپ فرای - (Captain. Fry) بۆ ماوەی ڕۆژێك مانەوە، ئینجا دوای کۆکردنەوەی هەندێ ئامرازی گواستنەوە، ئەوەندەی دەستیانکەوت، لە ڕێگەی عارەبانەو ئاژەڵەکانەوە ماوەی دوورییەکی کورتیان بەرەو چەمچەماڵ بری. سەرهەنگی دووەم کامیرۆن - Lieut. Colonel Cameron لە ٦/ مایسدا کەرکوکی جێهێشت، فەرمانده‌ی تابورەکەی گرتەدەست‌و دەستیکرد بە ڕۆیشتن بۆ چەمچەماڵ.

تابورەکە بریتی بوو لە ٢٣ پیاوی پیر، ٤٠٤ ژن‌و ١٧٢ منداڵ، هاوڕێیەتی دوو تیپ. لە ٦ی مایس گەیشتنە چیمەنی بچووك‌و لە ٧ی مایس گەیشتنە قەرەهەنجیر. لەوێدا لە سەعات شەشی ئێوارەدا، کوردەکان پەلاماری یەکێ لە دەستەکانیان دا، بەڵام ناچاریانکردن هەڵبێن‌و یەکێکیان بینی هەڵیانگرتبوو.

لە ڕۆژی دوایدا تابورەکە لە سەعات ٨/٣٠ دەستی بە ڕۆیشتن کرد، کوردەکان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان هێنا، و بەردەوام تەقەیان لە تابورەکە دەکرد، تا ماوەی سێ میل لە چەمچەماڵەوە دوور. زیانی تابورەکە، کوژراوێك‌و یەکێکیش بێ سەروشوێن بوو. کوردەکان بە فڕۆکە تەقەیان لێدەکرا و لە خاڵێکدا ئاشوورییەکان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا بۆ داخستنی بنکەکان‌و زیانی ژمارەیەك قوربانیان دا، ١٥ کوژراو گواسترایەوە بۆ کەرکوك.

لە ئێستادا بەتالیۆنەکە لە چەمچەماڵدا ماوەتەوە، ئەنجامی ئەم مەسەلەیە دادگایەکی لێکۆڵینەوەی بۆ ئامادەکرا، دوای ئەوە سێ ئەفسەرو دوانزە پیاو دەستگیرکران، بەڵام دوای دادگاییەکە، سێ ئەفسەرەکەو دوو پیاو، دەرکەوت بێتاوان بوون‌و نۆ کەسەکەی تر تاوانبارکران‌و خرانە بەندیخانەی بەغداوە.

کوشتنی ئەو هەموو خەڵکە بێ چەکە، ناکرێ لێیگەڕێیت بەبێ سزایەکی توند هەروا تێپەڕێت، بەڵام ئاشکرا بوو، کە ئاشوورییەکان هۆیەکی گەورەن لە بێزارکردن‌و بوون بە ئاگری هەڵگیرسانی سەرگەرمی ئەو خەڵکە، تا ئەوە بکەن، کە کردیان.

سێر هێنری دوبس - (Sir Henry Dobbs)، مەندوبی سامی، بەڵێنیدا کێشەی ئەو پیاوانەی دەرکەوت تاوانباران، دەبێ لە ماوەی نۆ مانگدا چاوی پیابخشێنرێتەوە. دوای کارە چاکەکەی بەتالیۆنی دووەم لە ئۆپەراسیۆنەکانی دژی شێخ مەحمود لە (١٩٢٥)دا، سکاڵانامەی ئازادکردنیان خراوەتە سەرەوە، دیسانەوە لە ١٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٦دا جارێکی تریش خرایەوە سەرەوە، لە کۆتایی ڕێکەوتنەکانی سنوور لەگەڵ تورکیاداو دووبارە لە ١٥ی نیسانی ساڵی ١٩٢٦دا سەرۆك وەزیران، عەبدلموحسین بەگ، خودی خۆی لەو مەسەلەیە چووە پێشەوە.

ئیدی حوکومەتی عێراقی بڕیاری ئازادکردنی دان، لە ٥ی کانونی دووەمدا گەیشتنە موسڵ‌و ڕاستەخۆ چوون بۆ

(مای)، کە بە فەرمانی حوکومەتی عێراق چوون لەوێ بژین. لە کۆتاییدا ئەو وابەستەیە لە کارخراو ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان.

سەرتیپ فرای - (Captain Fry) لە یاداشتی ئەو هەڵوێستە مەردانەیەی لە میانەی ئەو قۆناغە پڕ ئاژاوەیەدا هەیبوو، خەڵاتی خاچی سەربازیی وەرگرت لەگەڵ ئەوەی، کە کارەساتەکان ئێستا ڕابردوویەکی درێژەو لەلایەن حکومەتی عێراقەوە کۆتایی پێهێنراوەو زیندانییەکان ئازادکراون، هەروەها لەلایەن (دەیڤد دمار شەمعون)ەوە، سوپاسگوزاری بۆ مەلیک، مەندووبی سامیو سەرۆک وەزیران نوسراوە بۆ بەخشندەییان، کەچی هێشتا لە کەرکوک هەڵچوونەکان یاد دەکرێتە، کارەساتی بچووک جار جارە ڕوودەداو هێشتا لەوێ ئەگەری کێشە هەر هەیە.

ساڵی ١٩٢٥، بوو بە ساڵێکی پڕ لە چالاکی بۆ لیڤییەکان. بارودۆخی یەکەکان لەسەرەتای ساڵەوە بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:-

فەوجی یەکەمی سوارەی لیڤی - ئەربیل.

فەوجی دووەمی سوارەی لیڤی - کەرکوک.

بەتالیۆنی یەکەمی عەرەبی هۆزەکان - بەغدا، لەگەڵ یەک تیپ لە شەرگات، بەتالیۆنی دووەمی ئاشوورییەکان - چەمچەماڵ، یەک تیپ لە کۆیسنجاق. بەتالیۆنی سێیەمی ئاشوورییەکان - ئاکرێ، لەگەڵ دوو تیپ لە بێبادی. بەتالیۆنی چوارەمی ئاشوورییەکان - کانی وتمان، یەک تیپ لە ڕەواندوز. بارەگاکانی لیڤی، دەستەی پشتیوانی، یەکەی فریاگوزاری، ئەمبار، گواستنەوەو جبەخانە، هەمووی لە موسڵ بوو. بارەگاکانی تیپی چەکی ڕەشاش لە موسڵ لەگەڵ بەشەکانی لە بێبادی، چەمچەماڵ و کانی وتمان.

ساڵی(١٩٢٦- ١٩٢٧) کە هێزی لیڤییەکان لە ڕێگای یەکگرتنەوەو تێکەڵکردنەوە کەم دەکرێتەوە، یان بە بڵاوەپێکردن، کە لە ڕاستیدا دەستپێکرد. ئەوەش بەپێی سیاسەت، کە وەک یەکەکانی سوپای عێراق مەشقی پێکرا، ئیدی لیڤی دەبێت نەمێنێت.

لە مانگی حوزەیراندا، لە سەرکردایەتی هێزەکانی ئاسمانییەوە فەرمانەکان بۆ یەکگرتنەوەی فەوجەکانی یەکەمو دووەمی سوارە هات، کە لەم شوێنانەی لای خوارەوەن:- فەوجی یەکەمی سوارە لە ئەربیل، لەگەڵ تیپێک لە کۆیسنجاق. بە ڕابەریی سەرهەنگی دووەم تێرۆت - (Lieut. Colonel. C. R. Terrot)، کە (مەدالیای خزمەتگوزاریی هەڵکەوتووی وەرگرتووە)، فەوجی دووەمی سوارە لە کەرکوک، لەگەڵ تیپێک لە چەمچەماڵ، بە ڕابەریی سەرهەنگی دووەم ئەلەکساندەر - (L. Alexander Lieut. Colonel)، ئەم یەکگرتنەوەیە ٧ ئەفسەری بەریتانیو ٢ ئەفسەریاری بریتانیو ٣٥٠ پلەی تری دانیشتووی وڵاتەکەی کەمکردەوە.

یەکگرتنەوەکە بەم شێوەیە کرا:- لە ١٩ی حوزەیراندا سوپای عێراقی دەستیگرت بەسەر (ئەربیل)دا، کە سەرهەنگی دووەم تێرۆتی- (Colonel Lieut . C. R Terrot) ئازادکرد تا لەگەڵ ڕێکخستنەکەدا بگونجێت، لە ١٤ی ئاب تیپەکەی فەوجی یەکەمی سوارە، کۆیسنجاقی جێهێشتو لە ١٦ی ئابدا دەگاتە ئەربیل، کە لەگەڵ فەوجی یەکەمی سوارە یەکدەگرێتەوە، یەکگرتنەوەکە لەسەر کاغەز تەواوبوو، لە میانەی سێیەم هەفتەی مانگی ئابدا، ئەفسەرەکانو پیاوەکانی سوارە هەموو دەستیانکرد بە چوون بۆ کەرکوک، کە فەجی نوێکانی یەکەمو دووەمی سوارەی لیڤی بنکەی تێدا کردووە. هەموو کارەکە تەواوبووەو نووسینگەیەکی بچووکی تێدا کرایەوە. ئەوەی ئەربیل لە ٥ی تشرینی یەکەمدا داخرا. سەرهەنگی دووەم ئەلەکساندەر - (Lieut Colonel L. Alexandre -) فەرماندەیی فەوجی یەکەمو دووەمی سوارەی نوێی وەرگرت، سەرهەنگی دووەم تێرۆت (Colonel Lieut) چوو بۆ موسڵو بوو بە کەسی دووەم لە فەرماندەیی لیڤیەکان، هەموو کاری یەکگرتنەوەکە بە باشی دەچوو بەرێوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەی کەرکوک بۆ سلێمانی لەو ماوەیەدا پێویستی بە پاسەوان هەبوو، چونکە جارجار لە ناوچەکەدا پەلاماردانی بە خۆوە دەبینی.

لە ١ی تەموزدا لیڤیی عێراقی لەژێر کۆنترۆڵی وەزارەتی موستەعمەرات چووە دەرەوە، خرایە ژێر دەستەڵاتی هێزی ئاسمانیی پاشایەتیو دابەشکردنی نوێی هێزەکانو ڕێکخستنەوەکان دەستپێکرد، هەرچۆن هێزی ئاسمانیی پاشایەتی دەرماڵەو چەکو تەقەمەنیو هەموو کاروباری کارگێریی لیڤی گرتە ئەستۆ.

بەر لە ڕووداونی ئەوە، بڕیار درابوو، کە دەبێت هێزی لیڤی لە سلێمانی هەر هەبێت، بۆیە لە مانگی مایسدا سێ تیپ لە (موسڵ)ەوە لە هەمان مانگدا دەگەنە سلێمانی. ئەوان هێشتا لەناو شارەکەدا دانرابوون، بەڵام شوێنێک لە نزیک کارێزی (شێخ مەحمود)ەوە، دیاریکرا بۆ سەربازگەو دواتر سەربازگەی تەواوی تێدا بیناکرا بەهێزی کاری لیڤی. بۆیە لەم کاتەدا بارەگای بەتالیۆن لە موسڵ دەمێنێتەوەو لە ئەنجامدا لە ١ی تشرینی یەکەمدا ئەویش گەیشتە سلێمانی.

ئینجا بریکاری مارشاڵی هێزی ئاسمانی فەرمانیدا بارەگای لیڤی، موسڵ جێبێڵێ و بچێت بۆ بەغدا، ئەوەش لە لایەکەوە لەبەر مەسەلەی ئابووری بوو، چونکە لەوێ دەخرێنە سەربازگەی (هینەیدی)ەوە، لەلایەکی تریشەوە بۆ ئاسوودەیی لایەنی کارگێریە لەلایەن فەرماندەی هێزی ئاسمانییەوە، لەو لاشەوە لەبەر ئەوەی دوا بەتالیۆنی سەربازی هیندی ئامادەیە بۆ ڕۆیشتن، لیڤییەکان دەبێ ئەرکی پاسەوانی ماڵی مەندووبی سامیو یاریدەدەری مارشاڵی هێزی ئاسمانیی بگرنە دەستو هەندێ پاسەوانیش بۆ فڕۆکەخانەو هەروەها بۆ دابینکردنی ژمارەیەکی زۆر لە یاوەرەکان.

بۆیە ئەم ئامادەکارییانەی لای خوارەوە جێبەجێکرا. نووسینگەی موچەی لیڤی لە موسڵ داخرا ولە ٢٩ی حوزەیراندا چوو بۆ بەغدا. پاسەوانانی لیڤی لە فڕۆکەخانەی موسڵ لە ٢٧ی ئەیلولدا درایە دەست سەربازی عێراقی، کە ئەم ئەرکەی وەرگرت.

عەماری چەکو تەقەمەنی لە موسڵ داخراو هەموو ئامێرو کەرەسەکانی هەڵنەوەشێنران، بەڵکو لە بازاری ناوخۆدا فرۆشران. لە ١٣ی تشرینی یەکەمدا بەشێک لە بارەگای

لیڤی، تیپی چەکی ڕەشاش، عەماری ئازوقە، دەستەی فریاگوزاری‌و گواستنەوەو ئەسپی بەکارنەهێنراوو هەموو ئەسپی ئەفسەرەکان‌و مەیتەری وڵاخەکان بەپێ ڕۆیشتن بۆ کەرکوك. بەشی گواستنەوەو ئەسپە بەکارنەهێنراوەکان لە کەرکوکدا مانەوە لە هێڵەکانی تیپی ژمارەی (٣٠)کۆن. ئەوانەی مابوونەوە گواسترانەوە بۆ بەغداو لە ٢٥ی تشرینی یەکەمدا گەیشتن. دوو تیپی بەتالیۆنی دووەمی ئاشووری بە رابەریی سەرتیپ ئەلدوۆرز – (Captain Aldworth) چوون بۆ بەغدا بۆ گرتنەدەستی کارەکانی پاسەوانی‌و یاوەری، لە ١٨ی تشرینی یەکەمدا ئەو کارانەیان لە (مهراتس)ەکانی – Mahrattas سێیەم‌و پێنجەم وەرگرتووە. لە ئەنجامدا، لە ٢٩ی تشرینی یەکەمدا بارەگای لیڤی، بارەگا کۆنەکەی لە موسڵ جێهێشت، کە لەو شەقامەدا بوو، ناسراوە بە "(Stink Alley)" – واتە کۆڵانی بۆگەن، دوای نزیکەی شەش ساڵی تەواو مانەوە لە موسڵ لە ٣٠ی تشرینی یەکەمدا لە هینەیدی کرایەوە.

لە ١ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٩، عەماری پێداویستی لە هینەیدی داخراو سەرهەنگی دووەم ئەلێکزاندەر – (Lieut. Colonel. Alexander) چوو بۆ کەرکوك‌و فەرماندەیی بەشی گواستنەوەو ئاژەڵی گواستنەوەی گرتە دەست دەستەی یاریدەدری جێگرو ئازوقەو جلوبەرگ‌و بیناسازی لەناو کارمەنداندا دیارنەمان، ئێستا فەرماندەی هێزی ئاسمانیی، هەموو ئەو کارانە جێبەجێ دەکات، کە تا ئێستا لەلایەن ئەوەوە کراوە تیپی کارکەران بریتیە لە فەرمەندەی پێشەنگ‌و سەرتیپی پلەدار، دواتر کەمکرایەوە بۆ ئاستی ئەفسەری پلەداری پلە یەك‌و ئەفسەری پلەداری پلە دوو.

لە ٢ی ئاب، لیڤیەکان بەهۆی کۆچی دوایی ئەفسەر وەلاس (Lieut M.H. Wallace) دووچاری زیانێکی گەورە هاتن، کە بۆ ماوەی دوو ساڵ سەرتیپ – Captainی پلەدار بوو. ئەو تازە گەیشتبووە ئەوەی پێنج ساڵەکەی تەواو کردو دەگەرایەوە بۆ بەریتانیا، کەچی بەهۆی دووچاربوونی بە نەخۆشی مەلاریای مێشکەوە کۆچی دوایی کرد.

لە ٦ی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠، ئاژاوەی هەڵبژاردن لە سلێمانیدا بەرپابوو، جەنجاڵییەکە لە دەست دەرچووەو سوپای عێراقی داوای گەرانەوەی دەستووریان دەکرد. دوابەدوای ئەوەش، شێخ مەحمود دەستبەجێ لە وڵاتی فارسەوە سەریهەڵدایەوە، بۆ سێیەم جار، یان لەوانەیە دوا دەرکەوتنەوەی بێت، وەك سەرۆکی یاخیبوون دژی حوکومەت هێرشی کردە سەر پێنجوێن.

لە ٣ی تشرینی دووەم، بە فەرمانی بریکاری مارشاڵی هێزی ئاسمانیی، فەرماندەی هێز براون – (Brigadier. Browne)، فەرماندەی لیڤیەکان، ڕاستەوخۆ بۆ سلێمانی بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی فەرماندەی لەوێ، سیستمی بەرگریکای ڕێکخست‌و پلانێکی کاتی بۆ بەرگریکردن دەرکرد. تیپی گواستنەوە بە رابەریی سەرهەنگی دووەم ئەلێکساندەر – (Lieut. Colonel. Alexander)لە کەرکوکەوە بۆ سلێمانی ڕێکەوتن، لە ٦ی تشرینی دووەمدا گەیشتن. ئەوەش لیڤی کرد بە گەڕۆك ئەگەر پێویست بکات.

بە کۆتایی مانگی تشرینی دووەم، هێرش بۆ سەر پێنجوێن سەرکەوتوونەبوو، ئیدی مەسەلەکان هێوربوونەوە. سوپای عێراقی بەرگریکردنی سلێمانییان گرتە. ئەستۆو بارەگای لیڤی پێشوو، کە لەوێدا دامەزرابوو، گەرایەوە بۆ بەغدا. لیڤییەکان بەگوێرەی باقی یاخیبووانەکانی شێخ مەحمودەوە وەك هێزی یەدەك دانران. بەشێك لە بەرگری سلێمانییان گرتبووە ئەستۆ، هەروەها بەدرێژایی ئۆپەراسیۆنەکە دەبێ هەندێکشیان فرۆکەکان بارکەن لە تەقەمەنی‌و بەو شێوەیە بۆ ئەوە چوونە پێشەوە، ئەگەر پشکێکی هەست پێنەکراوبێت، بۆ سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنەکە.

لە شوباتی ساڵی ١٩٣١دا، تیپەکانی گواستنەوەو چەکی ڕەشاش وەك یەکەیەکی جیاواز دیاری دەکرێن، هەردووکیان لەنێوان دوو بەتالیۆنی ئاشووریدا دابەشکران. لە کەرکوك کەرتێك لە بەتالیۆنی دووەمەوە دانرابوو بۆ پاسەوانی بێتەلەکەو گەنجینەکانی تری هێزی ئاسمانیی پاشایەتی دواتر لەو ساڵەدا لە ٢١ی تشرینی یەکەمدا، بەتالیۆنی یەکەم پاسەوانێتی فرۆکەخانەی موسڵی گرتەدەست. لە ١ی ئاب ئەو تیپەی لە (بلی) بوو گەرانیانەوە، بەتالیۆنێك لە سەربازی عێراقی شوێنەکەی پڕ کردەوە.

لەدیدی مەرجەکانی پەیمانەکان لەگەڵ عێراقدا، کە دەبێت هێزە کاراکانی سوپاکە ببێت بە ١٢٥٠کەس، وردە وردە کەمکرێنەوە بۆ ئەو ژمارەیەی لە ١ی نیسانی ساڵی ١٩٣٣دا گیرابووە دەست.

ئەوە دەرکردنی ژمارەیەك لە ئاشوورییەکانیشی گرتەوەو بە ئامانجی یارمەتیدانیان لەسەر سەقامگیرکردنیان لە ناوچەی برادۆست لەلایەن مەندوبی سامییەوە پێشنیار کراوەو حوکومەتی عێراقیش بڕیاری لەسەر داوە. بۆ یارمەتی ئەم پلانە یەك تیپ لە بەتالیۆنی دووەم لە ٢٨ی ئابدا چوو بۆ برادۆست، بەڵام ئەوانەی بڕیارە لەوێ نیشتەجێکرێن نەگەیشتوونە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆر هۆ، کە پەیوەندە بەخۆیانەوەو شێخ ئەحمەدی بارزان مەسەلەکەی زیاتر گران کردووە بەو شەڕە تایبەتییەی لە ناوچەکەدا دژی شێخ ڕەشیدی لۆلان، لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەمدا تیپەکە لە دیانە پەیوەندی کردەوە بە تالیۆنەکەوە.

لە ١٦ی شوباتی ساڵی ١٩٢٣، یەك تیپ لە بەتالیۆنی دووەمی ئاشووری لە سلێمانیەوە چوو بۆ بەسرە، بۆ گرتنەدەستی ئەرکی پاسەوانی لە مارجل‌و شەیبە. ئەو ئەرکانە لە ١٩ی شوباتی ساڵی ١٩٣٢ گیرانە دەست.

لە میانەی ساڵەکەدا گۆڕانی تر کراو لە کۆتایی ساڵدا ناوی " لیڤی" کۆتایی هات‌و ناوە نوێکەی "هێزی بەرگری ئاسمانی" هاتە کایەوە.

* سەرچاوە:-
– لیڤییەکانی عێراق ١٩١٥-١٩٣٢، ف.ه. جۆن گیلبەرت براون، وەرگێرانی: مینە، ناوەندی توێژینەوەی مێژووی جەمیل ڕۆژبەیانی، ٢٠١٦

*** حیزبی ئیسلامی عێراقی - ئیخوان موسلمین:-**

د. ئیمان عەبدولحەمید ئەلدەباغ.

لە (١) کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٦٠) حکومەتی عێراقی مۆڵەتی کردنەوەی حیزب‌و ڕێکخراوەکانی دەرکرد. (اخوان مسلم)ەکان ئەمەیان بە دەروازەیەکی باشی زانی بۆ ئەوەی مۆڵەتی کردنەوەی حیزبێکی ئیسلامی وەربگرن، تا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ئاشکرا چالاکی خۆیان بکەنەوە و لە هەمان کاتدا پابەندی بڕیارەکانی سەرکردایەتی (اخوان المسلمین) بن بەنهێنی.

بۆیە لە ساڵی (١٩٦٠)دا لیژنەیەك لە ئەندامانی (اخوان المسلمین) دروستکرا بۆ ئەوەی داوای مۆڵەتی کردنەوەی حیزب بدەن، لە ٢ی شوبات ساڵی (١٩٦٠) داواکاری خۆیان بۆ وەزارەتی ناوخۆ کرد، کە پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:-

نورەدین واعیز، داود سەلمان عیساوی، عەدنان ئەحمەد ئەلمەشایخی، نوعمان عەبدولڕەزاق، سەبری مەحمود، وەلید عەبدولکەریم (شاعیرو خۆشنووس)، ئیبراهیم مونیر (مامۆستا) فلەیح حەسەن، فازڵ دۆڵان (پارێزەر)، حەمید حاجی حەمەد (بازرگان)، مەحمود محەمەد ئەللاقی (مامۆستای ئاینی)، عەبولجەمیل ئیبراهیم (ئیمام‌و پێش نوێژ)، یوسف تەها (پارێزەر)، جاسم ئەلعانی (دکتۆر)، ٥٠ کەس واژۆیان لەسەر داواکارییەکە کردبوو کە لە عەرەب‌و کورد‌و تورکمان‌و سوننە‌و شیعە پێکهاتبوو.

لە ٢١ی ئاداری ساڵی (١٩٦٠) مۆڵەتی کردنەوەی حیزبیان پێدرا، بەڵام لە دوایدا بەربەرەکانی کراوە لەبەر ئەوەی لەگەڵ برگەکانی ماددەی چواری یاسای ڕێکخراوەکاندا ناگونجێت لە ژمارە (١)ی ساڵی (١٩٦٠) دادگای پیاهەڵچوونەوەی عێراقی بڕیاری دامەزراندنی دا.

لە ٢٩ی تەمووزی ساڵی (١٩٦٠) حیزبی ئیسلامی عێراقی کۆنگرەی یەکەمی خۆی بەست لە بەغدا بۆ جێبەجێکردنی بڕیارو ڕاسپاردەکانی دامەزراندنی حیزب لە بارەی پرۆگرام‌و یاسا پێڕەوی ناوخۆ.

حیزب لەدوای وەرگرتنی مۆڵەتەکەی، لە هەوڵداندا بوو بۆ کردنەوەی لقی جۆراوجۆر لە پارێزگاکانی عێراق لە ڕوومادی، موسڵ، کەرکوك، بەسرە، و گەلێك شوێنی تر.

لە (٣١)ی ئابی ساڵی (١٩٦٠)، بەشێك لە لایەنگرانی حیزب لە کەرکوك داواکارییەکیان پێشکەشکرد بۆ مۆڵەتدان بە کردنەوەی لقی حیزبی ئیسلامی عێراقی لە کەرکوك. لە دوای ڕەزامەندی، ئەندامان هەستان بە هەڵبژاردن بۆ دەستەی کارگێڕی لقەکەو ئایدن عەبدولڕەحمان بەکر وەکو سەرۆك هەڵبژێردرا.

ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە کە ئەم لقە دەستەیەکی کارگێڕی ڕوونی نەبووە بەڵام سەرۆکی لق لەلایەن چەند کەسێکەوە یارمەتی دەدرا وەکو:-

(ڕەئووف مەردان، عەبدوڵڵاحوسێن بەرزنجی، عومەر ئەحمەد، بەڵام (اخوان المسلمین) لە کەرکوك خۆیان کاروبارەکانی حیزبیان دەبردەڕێوە بڕیارو ڕاسپاردەکانی دەردەکرد وەکو هەموو لقەکانی تر.

ناوەندی لقەکە خانوویەکیان لە شەقامی کۆماری بەکرێ گرتبوو، لە نزیك مزگەوتی حیسامەدین. دەورێکی گەورەیان هەبوو لە چالاکی جۆراوجۆر لە بەستنی کۆڕو مێزگرد لە نێو بارەگاو لە مزگەوتەکان، دیارترین چالاکییان کردنەوەی ئاهەنگێکی ئیسلامی گەورە بوو لە مزگەوتی ئیبراهیم بەگی تکریتی، کە جەماوەرێکی زۆر لە خەڵکی شارەکەو کەسایەتییە ئیسلامی‌و پیاو ماقووڵانی شار، هەروەها بەشێك لە زانایانی هەڵەبجەو ڕومادی‌و بەغداش بەشدارییان کرد، هەریەکە لە نورەدین واعیز، نازم عاسی، موحسن عەبدولحەمید، لێدوانی خۆیان داوە لە کونگرەکە هەروەها سلێمان ئەلقابلی شیعرێکی ئایینی درێژی خوێندۆتەوە. بەڵام کاری حیزب بەردەوام نەبوو، لەکاتی هەڵوەشانەوەی حیزب لە بەغدا، لقی کەرکوکیش بۆ ماوەیەکی کەم لەکار وەستاو دەست بەسەر ماڵوموڵکیدا گیرا.

*** (ئیخوان موسلمین لە کەرکوك):-**

هەر لە ساڵی (١٩٥١- ١٩٥٩) نورەدین واعیز بەرپرسیارێتی کاروبارەکانی ئیخوانی لە کەرکوك دەبردەڕێوە، ئەویش لەدوای ئەوەی لە سەرۆکایەتی شارەوانی کەرکوك دوورخرایەوەو گواسترایەوە بۆ بەغدا کەلە ساڵی (١٩٥٨) دەستبەکاری شارەوانی بوو.

ڕۆیشتنی (نورەدین واعیز) کاریگەری گەورەی بەسەر ئیخواندا لە کەرکوك بەجێهێشتو، تووشی سەرلێشێوانی کرد لە هەموو بوارەکانەوە کە ماوەی دوو مانگی خایاند بەتایبەتی لەدوای بزووتنەوەکەی موسڵ‌و کەرکوکدا، هەموو پەیوەندییەکیان لەگەڵ بەغدادا برا، تەنها کاروبارەکانیان لەسەر ئاستی تاکەکەسی بەڕێوە دەبرد، سەید ئەحمەد سەید محێدین سەرپەرشتی بەشێك لە کاروبارە زارەکییەکانی دەکرد، تا بەوەی (ئیخوان) توانیان سەرۆکایەتییەکی خۆجێی دابمەزرێنن بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانیان کە پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:-

١- سەید ئەحمەد سەید محێدین، سەرۆك.

٢- سلێمان محەمەد ئەمین قابلی، جێگر.

٣- ئیحسان قاسم، ئەندام.

٤- سوبحی محێدین داودی، ئەندام.

ئەمانە کاروبارەکانی ئیخوانیان بەشێوەیەکی گشتی لە کەرکوك دەبردەڕێوە، بەڵام کاروبارەکانی ناوەوەی کەرکوك سپێدرابوو بە:-

١- عەبدوڵڵا حوسێن بەرزنجی.

٢- ئایدن عەبدولڕەحمان بەکر.

بەرپرسیارێتی سەرۆکایەتی کارگێڕی خۆجێی گرنگی خۆی بۆ ئیخوانەکانی کەرکوك لەوەدا دەبینییەوە، کە کاروبارەکانی کەرکوکی دەبردەڕێوە، لە هەمان کاتدا هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی سەرۆکایەتی گشتی لە بەغدا، کە لەلایەن ئەندامی پەیوەندکارەوە (سلێمان حوسێن) دەگەیشتە کەرکوك هەروەها سەرۆکایەتی خۆجێی

دەوری گەورەی هەبوو لە ڕێکخستنی کوردەکانی سەرووی عێراق بۆ نێو ئیخوان.

لەبەر نهێنی ڕێکخستنەکانی ئیخوان لە کەرکوك لە بەرئەوە پەیوەندییەکان لەسەر ئاستی تاکە کەسی و کۆ بوو، ئەویش بەپێی ئەو باروودۆخەی کە باووبوو لە ناوچەکەدا، ئەندامەکانی سەرۆکایەتی خۆجێی وەکو چاودێردا بوون کە سەرپەرشتی چەندان (نەقیب)یان دەکرد، بەو پێیە ئەوانیش سەرپەرشتی چەندان خێزانیان دەکرد، بەم شێوەیە پەیوەندی لەنێوان ئیخوانەکان دروست دەبوو.

هەروەها سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی کرێکارو قوتابی و جوتیارو مامۆستایانیش. لە سەرەتای شەستەکان لە کەرکوك هێزێکی بەرچاو بە ڕێکخستنەکانی ئیخواندا هاتوو لە گەلێك شوێنی کەرکوك ڕێکخستنەکان برەویان سەند:- بەشێوەیەکی روون ڕێکخستن سەری هەڵدا لە ناوچەی (سەید عەلاوی) لە قۆریە، دوای ئەوەی گوازرایەوە لە گەرەکی پیریادی، ئەمیش بەچالاکی (سوبحی دوادی) لەو ناوچەیە، سەرپەرشتی بەسەر ئەو قوتابییانەوە دەکرد کە سەریان لە مزگەوتەکانی عومەر، مەلا سەید حەسەن، حاجی تاهیر بیرەقدار) دەکرد بەپاڵپشتی بەشێك لە ئیخوانەکانی وەکو:- تەلعەت عیزەت فەتاح، زوهێر سدیق، عەونی عومەر لوتفی، رەئووف مەردان.

چالاکی ئیخوان لە گەرەکی (موسەلا) بەرفراوان بوو، بەتایبەتی لەدوای گواستنەوەی کاری ئیحسان سالەیی بۆ ناوەندی موسەلا، لەگەڵ ئەوەی کە چەند ئەندامێکی (ئیخوان) یارمەتیان دەدا وەکو:- عابدین رەشید، سەید تەها سەید ئەحمەد، عەبدولرەحمان عەبدوڵلا.

چالاکبوونی ئیخوانەکان لە ناوچەی (تەپەی مەلا عەبدوڵلا) لەپشت باخچەی (أم الربيعين)، بەهەوڵ و هیمەتی ئەو ئیخوانانەی لە کۆمپانیای نەوتی عێراق بوون لە کەرکوك وەکو:- عەبدوڵلا حوسێن بەرزنجی، لەگەڵ کۆمەڵێك لە خەڵکی ناوچەکە لە نموونەی:- عەبولکەریم شێخ رەشید، تاهیر عەبدولحەمید، لەگەڵ چەند عەرەبێکی جبوور کە ژمارەیان لەنێوان (١٥- ١٧) کەس بوون، لەگەڵ لاوان و قوتابیانی ئەو مزگەوتانەی ئەو ناوچانەو خێزانەکانیان.

ئەو یەکگەیشتنەی ئیخوانە کۆنەکان لە ئیخوانە تازەو گەنجەکان، لەگەڵ یەکدی لە ئەڵقەکانی مزگەوتەکان سەرکەوتنی ئەرێنی هەبوو بۆ ڕێکخستنەکانی ئیخوان و هاتنە پاڵی ئەندامانی تر بۆ نێو ڕێکخستنەکان کتێبخانەی (جمعية الاخوة الاسلامية)، کە (سلێمان محەمەد ئەمین ئەلقابلی سەرپەرشتی دەکات، دەورێکی باڵای بینی لە کۆکردنەوەی ئەو لاوانەی سەردانی کتێبخانەکەیان دەکرد، بۆ کڕینی کتێب و بەدواداگەرانی سەرچاوە، ئەم کتێبخانەیە خەڵکێکی زۆری هێنایە ریزی ئیخوان و بەپێی قۆناغەکانی سەردانیان هاتنە ریزی ڕێکخستنەکانەوە.

هەروەها دەوری بەشێك لە ئیخوانەکان بۆ پێگەیاندنی لە رووی هیزر و فکرەوە وەکو (سەید موحسن ئەترەقچی) کە دەوری بینی لە بڵاوکردنەوەی برایەتی نێو ئیخوانەکان ئەویش لە ڕێگای ئەو کۆڕانەی کە لە ماڵەکەی دەبەسترا یان لە گەرەکی (بازاری عەسری).

چالاکی ئیخوانەکان برەوی سەند لە کەرکوك بەتایبەتی لەنێوان چینی قوتابی و مامۆستایان، ساڵی (١٩٦١- ١٩٦٢) ساڵێکی پڕ بەپێز بوو بۆ ئیخوانەکان لە ناوەندی فێرکردن لە قوتابخانەکانی ناوەندی و سەرەتایی، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ توانای بەشێك لە مامۆستایانی ئیخوان بۆ بڵاوکردنەوەی برازای ئیخوان وەکو:- موحسن عەبدولمەجید، عەباس عەلی عەتار، داودی، سالەیی، مامون رەشید، لە مامۆستایانی سەرەتایش وەکو:- ئەدیب ئیبراهیم دەباغ، حەسەن عوسمان، عەباس سالح، عابدین رەشید، تاهیر عەبدولحەمید و گەلێکی تر.

هەروەها چالاکییان هەبوو لە هەڵبژاردنی سەندیکاکان، بەتایبەتی لە سەندیکای مامۆستایان لە کەرکوك.

کاری ڕێکخستنەکانی ئیخوانەکان بەدەر نەبوو لە بەربەست لەلایەن شیوعی و بەعسییەکانەوە، بەتایبەتی کە ئیخوانەکان توانیان بووەستنەوە لە بەرامبەر تەوژمی هەڵسانەوەی شیوعییەکان.

لە سەرەتای ساڵی (١٩٥٩) ئیخوانەکانی کەرکوك، خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخست لە خەڵکی شارەکە، کە لە کتێبخانەی (الاخوة الاسلامية)وە لە شەقامی ئەتلەس) دەرچوو بە سەرپەرشتی (سلێمان محەمەد ئەمین ئەلقابیلی )و (ئەحمەد نەجمەدین بەرزنجی)و (عادل زەینەل بەیاتی) کاتێکش خۆپیشاندانەکە گەیشتە بەشی ناوخۆی قوتابیانی ئامادەییەکان گەلێك لە قوتابیان هاتنە نێو خۆپیشاندانەکەوە، ئەمە رەنگدانەوەیەکی گەورەی بەرامبەر شیوعییەکان دروست کرد، کاتێك گەیشتنە لای مەحکەمەی کۆن بەشێکی زۆر لە (شیوعی وانصار)کان رایانکرد.

لە دوای رووداوەکانی بزوتنەوەکەی موسڵ لە ساڵی (١٩٥٩) دا، ئیخوانەکانی کەرکوك تووشی گرتن و کوشتن هاتن لەلایەن (مقاومه الشعبيه)، لە دوای رووداوەکەی کەرکوکیش، هێزی ئیخوانەکان گەرایەوە دوواوەو چالاکییەکانیان پاشەکشێی کرد تا هاتنی بەعسییەکان لە ٨ شوباتی ساڵی (١٩٦٣) بۆ سەر دەسەڵات، زیاتر چالاکییەکانیان چڕ کرایەوە لە چەند بواری ڕێکخستنی بەرتەسك و زۆرکەم، بەڵام لەدوای بزوتنەوەی ١٨ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٣) دووبارە چالاکییان دەستی پێکردەوە.

کارەکانی سەرکردایەتی کارگێری خۆجێی ئیخوانەکان لە کەرکوك بەردەوام بوو تا ساڵی (١٩٧١)، کە چالاکییەکانیان هەڵپەسارد، تەنها سوبحی محێدین داودی نەبێت کەلە ڕێکخستنەکانی ئیخوان دەرچوو لە ئەیلولی ساڵی (١٩٧٠)، ئەویش لە سەر ئەوەی جیاوازی بیرورا هەبوو لەسەر چۆنێتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کورد.

ئەم بریارەی هەڵپەساردن ئیخوانەکانی کەرکوکی ساردنەکردەوە، بەڵکو هەریەکە لە ئاستی تاکە کەسی کاری ڕێکخستنی خۆیان دەکرد.

*** بەشێك لە ئیخوانەکانی کەرکوك:-**

**١- عەبدولکەریم عیزەت:-**

ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوك لە دایکبووە، هەر لە ساڵی (١٩٧٩)ەوە بەرپرسیارێتی لە ڕێکخستنەکانی ئیخوان هەبوو، هەروەها ئەندام بووە لە مەکتەبی سیاسی حیزبی ئیسلامی عێراقی.

**٢- عەبدولجەبار حەسەن:-**

ساڵی (١٩٣٩) لە کەرکوك لەدایکبووە، ئامادەیی تەواو کردووە، هەر لە ساڵی (١٩٥٩)ەوە لە ڕێکخستنەکانی ئیخوانە بووە، لە ساڵی (١٩٦٤) دامەزراوە بە کارگوزار لە (شرکة المشروبات الغازیة)، ساڵی (١٩٨٩) خانەنشینکراوە، لەدوایدا لە بازرگانی کاری کردووە.

**٣- ئایدن عەبدولڕەحمان بەکر:-**

ساڵی (١٩٣٤) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە ساڵی (١٩٥٥-١٩٥٦) لە خولی پەروەردەیی دوای ئامادەیی دەرچووە، هەر لەساڵی (١٩٤٩)ەوە هاتۆتە نێو ڕیزەکانی ئیخوانەوە، مامۆستای خانەنشینە.

**٤- د. عەباس عەلی ئەلعەتار:-**

لە ساڵی (١٩٣٣) لەدایکبووە، ساڵی (١٩٥٨) کۆلیژی پەروەردەی تەواو کردووە، ساڵی (١٩٧٥) ماستەری بەدەست هێناوە، ساڵی (١٩٨٠) دکتۆرای بەدەست هێناوە.

لەساڵی (٢٠٠٣- ٢٠٠٤) سەرۆکی زانکۆی کەرکوك بووە، لە ساڵی (٢٠١١) کۆچی دوایی کردووە.

**٥- سوبحی محێدین داودی:-**

ساڵی (١٩٣٣) لە کەرکوك لەدایکبووە، دەرچووی (دار المعلمین العالیە)یە بەشی فیزیا، ماوەیەك مامۆستاو سەرپەرشتیاری گەلێك قوتابخانە بووە، ئێستا لە هەولێر دادەنیشێت.

**٦- عەبدوڵلا حوسێن بەرزنجی:-**

ساڵی (١٩٢٧) لە گوندی قەرەوەیس لەدایکبووە، زمانی ئینگلیزی بەباشی دەزانی و وەرگێر بوو لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، زمانەکانی کوردی و عەرەبی تورکمانی و ئینگلیزی و فارسی و فەرەنسی و سریانی دەزانی، لەدوای خانەنشینی کردنی کتێبخانەی (البیان)ی بۆ وەرگێران کردبۆوە، ساڵی (٢٠٠٩) کۆچی دوای کردووە.

**٧- تەلعەت عیزەت فەتاح:-**

ساڵی (١٩٤٢) لەدایکبووە، هەر لەساڵی (١٩٦٠)ەوە لە ڕێکخستنەکانی ئیخوان بووە، دەرچووی کۆلێژی یاسابووە لە زانکۆی بەغدا لە ساڵی (١٩٦٩)، ساڵی (١٩٧٦) دادوەری پێداهەلچوونەوە بووە لە دادگای کەرکوك.

**٨- عەدنان عەبدولسەمەد عەلی:-**

ساڵی (١٩٣٧) لەدایکبووە، ساڵی (١٩٥٢) هاتۆتە ڕێکخستنەکانی ئیخوانەوە، ساڵی (١٩٦٣) کۆلیژی پەروەردەی بەشی فیزیای تەواو کردووە ساڵی (٢٠٠٠) خانەنشین کراوە.

**٩- نورەدین واعیز:-**

ساڵی (١٩٢٨) لە کەرکوك لەدایکبووە، سەرەتایی وناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە، ساڵی (١٩٥١) زانکۆی بەغدا بەشی یاسای تەواو کردووە لەدوایدا لە ساڵانی (١٩٦١- ١٩٦٢) دبلۆمی لە بەشی (معهد الدراسات الاسلامیة) کردووە، هەر لە ساڵی (١٩٥١)ەوە پیشەی دادوەریی کردووەو ئێستا لە تورکیا دادەنیشێت.

**١٠- حەسەن عوسمان وەهاب:-**

ساڵی (١٩٣٣) لە کەرکوك لەدایکبووە، هەر لەساڵی (١٩٥٠)ەوە هاتۆتە ڕیزی ئیخوان، دبلۆمی لە پەروەردە بەدەستهێناوە، مامۆستا بوو لە گەلێك لە قوتابخانەکان.

**١١- د. محەمەد رافع رەئوف:-**

لەو کاتەی قوتابی بووە لە کۆلیژی پزیشکی لە ڕێکخستنەکانی ئیخوان بووە.

**١٢- سلێمان محەمەد ئەمین:- کارمەند لە (الشرعیە).**

**١٣- عەبدولڕەحمان سەعید:- کارمەند لە بانك.**

**١٤- عەبدولڕەحمان حاجی ئیبراهیم:- سەرمایەدار.**

**١٥- عەبدوڵلەتیف ئیسماعیل تالیب:- خوێندکار لە کۆلیژی پزیشکی.**

**١٦- سالم شاهین ئەلسەراج:- کارمەند لە بواری پەروەردە.**

**١٧- عەبدولڕەحمان عەبدوڵلەتیف:- کرێکار.**

*** کۆمەڵەی (الامانی) لقی کەرکوک:-**

بەشێك لە ئەندامانی پەروەردەیی ئیخوانەکانی کەرکوك، لە کۆتایی ساڵی (١٩٦٣)دا داواکارییەکیان پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆ کرد بۆ کردنەوەی لقی کۆمەڵەی (الامانی) وەکو ئەوەی کە لە بەغدا ڕەزامەندی لەسەر دراوە، ئەندامەکانیش بریتی بوون لە:-

ئیحسان قاسم ساڵەیی، عەباس عەلی ئەلعەتار، ڕاجی ئەلبەیاتی، یوسف سدقی.

لەدوای ئەوەی ڕەزامەندی کردنەوەی لقی کۆمەڵەکە درا، بۆیە نزیکەی بیست ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر کۆ بوونەوەو هەڵبژاردنی خۆیان کرد کە بەم شێویەی خوارەوە دەرچوو:-

١- ئیحسان قاسم ساڵەیی، سەرۆك.
٢- ڕاجی عابد ئەلبەیاتی، جێگر.
٣- حەسەن عوسمان وەهاب، خەزنەدار.
٤- یوسف سدقی، ئەندام.
٥- عەبدولجەبار حەسەن، ئەندام.
٦- عەباس عەلی ئەلعەتار، ئەندام.
٧- عەدنان عەبدولسەمەد، ئەندام.
٨- ئیسماعیل عەبدوڵڵا، ئەندامی یەدەك.
٩- عابدین ڕەشید، ئەندامی یەدەك.

بنکەی سەرەکی کۆمەڵەکە لە شەقامی (الجمهوري)بوون کە خانوویەکیان لەوێ بەکرێ گرتبوو، لەوێدا لێکۆڵینەوەیان دەربارەی کاروبارەکانیان دەکرد، یەکەم کارێکیان کردنەوەی باخچەی ساوایان و سەرەتاییەکی بەیانیان و ناوەندییەکی ئێواران بوو کوران، کە بەهۆی توانای پەروەردەییان گەلێك کەس لە بوارەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

*** چالاکی پەروەردەیی کۆمەڵە:-**

١- کردنەوە باخچەی منداڵانی (الامانی) بۆ منداڵان:-

دوای ماوەیەکی کەم لە مۆڵەتەکەی توانیان هەستن بە چالاکی بۆ ئەم مەبەستە لە سەرەتای ساڵی (١٩٦٤)، ڕەزامەندیان بەدەستهێنا بۆ کردنەوەی باخچەیەکی نموونەیی منداڵان.

سەرۆکی باخچەی منداڵانی ئەمانی ئیحسان قاسم ساڵەیی بوو، کە ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی باخچەکەی دەکرد، بەڵام کارگێڕی باخچەکە (گول تەکینی) وەکو مامۆستا دەیبردە ڕێوە، ماوەیەك گەلێك شوێنی کرد تا لەدوایدا هەستا بەکرێنی زەوییەك لە ئەلماس بەرامبەر چایخانەی (ئەحمەد ئاغا)ی تازە، کە لە هەمان کاتدا بووە بنکەی کۆمەڵەکەو لە هەمان کاتدا باخچەی (ئەمانی).

ئیدارەی باخچەکە کارەکانی چڕ کرد بووەوە بۆ ئەوەی یارمەتی منداڵان بدا لە بوارەکانی:- توانای دەربڕین لەلایەن خودی خۆیانەوە، فراوانکردنی تێگەیشتنیان و وەرگرتنی زانیاری لە ژینگەی دەوروبەرییان و زیادکردنی ئەو دابونەریتانەی کە ئارەزوویان لێیەتی، پێگەیاندنیان لە ڕووی ئارەزووی لەشییەوە، هەروەها دروستکردنی پەیوەندییەکی باش لەنێوان ماڵ و قوتابخانە، باخچەکە چەند مەرجێکی دیاریکرد بوو بۆ وەرگرتنی کە پۆلەکان پێکهاتبوو لە دوو پۆل، پۆلێك بۆ ئەوانەی چوار ساڵیان تەواو کردووە کە ساڵێك لەوێ بەسەر دەبەن، پۆلی دووەم بۆ ئەوانەی کە تەمەنیان پێنج ساڵە کە قۆناغێکە بۆ پێگەیاندنیان بۆ سەرەتایی، کرێی خوێندن وەردەگیرا بەشێوەی بەش (قسط) لە ساڵێکدا. پرۆگرامەکانی هەمان ئەو پرۆگرامانەیە کە لەلایەن وەزارەتی پەروەردەو خوێندنەوە دەهات

لە شێوەی جێبەجێکردنی خوێندن و جێبەجێکردنی لەگەڵ یاریکردن.

هەروەها دەستەی ئیدارەی باخچەکە هەڵدەستان بە ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەکانیان بە شێوەیەکی زانستی و دەروونی لەسەر هەڵسوکەوتی منداڵەکان لە ڕووی دەروونی و مێشکی و سۆزو کۆمەڵایەتی، کە لە دۆسیەی تایبەتیدا هەڵدەگیرا، لەهەمان کاتدا خواردنی سووك دەدرا بە منداڵەکان لەژێر سەرپەرشتی مامۆستاکان و ئیدارە، ئیدارە پێویستییەکانی وەکو ڕووناکی و هەواو باخچەو یاریگای جۆراوجۆرو باخچەی ئاژەڵانی دابینی کردبوو.

*** ناوەندی (الامانی) ئێواران بۆ کوران:-**

لە ساڵی (١٩٦٤- ١٩٦٥)، کۆمەڵەی (الامانی) توانی ڕەزامەندی وەزارەتی پەروەردەو خوێندن بەدەست بهێنێت بۆ کردنەوەی (ثانوية الأماني المسائية للبنين)، کە کەوتبووە بەرامبەر چایەخانەی (زوهێر) لە گەرەکی (شاتەرلو)، لەدوایدا گوازرایەوە بۆ (ساحة الطيران) کە بەناو (الاعدادية الاسلامية) بەناوبانگە.

دەستەی ئیداری (عەباس عەلی ئەلعەتار) وەکو بەڕێوەبەر هەڵبژێردراوەو هەریەکە لە (ڕاجی عابد ئەلبەیاتی)، (عەدنان عەبدولسەمەد عەلی) وەکو جێگر دەستنیشان کرا لەدوای ئەویش لە ساڵی (١٩٧١) (عەبدولجەبار حەسەن) دەست نیشانکرا. هەروەها (سەدرەدین بەهائەدین) وەکو نووسەر بۆ ڕێکخستنی دۆسیەو تۆماری گشتی دیاریکرا.

لە یەکەم ساڵی خوێندندا (٣٥٠) قوتابی هەبوو، کە (٢٢) مامۆستایان هەبوو بۆ وانە ووتنەوە، بەهۆی توانای زانستی خوێندن تێدا کە وەکو ئاستی بەیانیانی خوێندن بوو، بۆیە لە ساڵی داهاتوودا (٣٩٠) قوتابی بووە، لە هەمان کاتدا کرێی خوێندنیان لە هەژاران نەسەندووە یان نیوەیان وەرگرتووە.

بۆ چاککردنی باری ئاستی خوێندن هەوڵیداوە بەکردنەوەی خولی هاوینە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی قوتابیان، بۆ ئەم مەبەستە (مەحمود سەید جیهاد) خوولی هاوینەی لە نزیك (ساحة العمال) کردووەتەوە، ئەم هەنگاوانەی بەردەوام بووە لە بواری پەروەردەدا دواتر مۆڵەتەکەی لێ سەنراوەتەوە.

*** یەکێتی مامۆستایانی کوردستان:-**

**محەمەد باقی سەعید**

کۆمەڵێك لە مامۆستایان و ڕێکخراوی مامۆستایان لە ساڵی (١٩٦١) بەدواوە لە گەرمەی شۆڕشی ئەیلولدا، کاریان ئەکرد بۆ ڕێکخستنی مامۆستاو فەرمانبەران لە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان.

لە ئەنجامدا کۆمەڵێك پێشنیارو بیروراو بۆچوون و هەنگاوی بەجێیان هێنایە ئاراوەو کۆمەڵێك مامۆستای شارەزایان بۆ ئەم مەبەستە هێنایە ئەم ڕێکخراوەوە کە زۆربەیان ئەندام بوون لە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان کە ئەمانە نموونەیانە:-

عەبدولقادر مەلا عومەر گومبەدی، ڕەفعەت محەمەد عەبدولرەحمان، عەبدوڵلا زێباری، عارف عەبدوڵلا، محەمەد مەجید ئەرسەلان، فەرەیدون عەلی ئەمین، جوامێر مەلا مۆرز، کەمال محەمەد ئەمین، شێخ نوری شێخ ڕەزا، عیزەت تاهیر، محەمەد مەلا حوسێن، فەرەج عەلی، ئەکرەم فەوزی، جەمال عومەر ملۆزم، عومەر مام ڕەحیم، ئەحمەد مارف قوریاسی، عەبدوڵلا ڕەزا ئەژدەر، ئەحمەدی حاجی بیلال، کەریم زەندی، مەجید سەعید دزکوژ، ئیبراهیم سەعید، بابا عەلی شێخ عەلی، حوسێن سالح ئاغا، درەخشان شێخ جەلال حەفید، بەهیە شێخ مەعروف، پاکیزە شەکیب، ڕووناك عەبدوڵلا زوهدی، پەخشان میرزا غەفور، عەبدولخالق عەبدولرەحمان، فائیق میرزا عارف، ئەحمەد ڕەشوانی، عەبدولخالق جەباری لەو مامۆستایانە هەریەکە لە عەبدولقادر مەلا عومەر عەبدولخالق جەباری لە مامۆستایانی کەرکوك بوون. هەروەها دەستەیەکی مامۆستای ئافرەتانیش بەشداری کۆبوونەکانیان کرد.

ئەم مامۆستایانەی لە کۆبوونەکەیاندا تا ووتوێی هەندێك بیروران کردبوو، چەند خاڵێکی گرنگیان پێشنیار کرد بۆ بەستی کۆبوونەوەی مامۆستایان.

لەدوایدا پەیوەندیان کرد بە زۆربەی شارە گەورەکانەوە وەکو:- کەرکوك، هەولێر، دهۆك، بەغدا، خانەقین، و زۆر شاری دیکە بۆ پۆلینکردنی ناوی مامۆستایان بۆ ئامادەکاری کۆنگرە.

لە پانزەی مایسی ساڵی (١٩٦٢) کۆنگرەی خۆی بەست لە ماوەی دووڕۆژدا، یەکەم ڕۆژ کۆنگرەکە لە ماڵی دکتۆر (کامیل حەسەن بەسیر)گیرا، دووەم ڕۆژ کۆنگرەکە لە ماڵی شەهید (یاسین محەمەد سالح) بەسترا، ژمارەی ئەندامانی ئامادە بووان بۆ کۆنگرە تەنها حەڤدە مامۆستا بوون کە ناوەکانیان بەم جۆرە بووە:-

١- دکتۆر (کامیل حەسەن ئەلبەسیر).
٢- شەهید (ئەنوەر سەعید دارتاش)
٣- محەمەد باقی سەعید
٤- درەخشان شێخ جەلال حەفید.
٥- شەهید یاسین محەمەد سالح.
٦- کەمال میرزا غەفور.
٧- شەهید (محەمەد حەمە سالح - حەمە بۆر).
٨- شەهید (ئیسماعیل ئیبراهیم - بەلوعە).
٩- شەهید عەبدولقادر مەلا عومەر گومبەدی - کەرکوك).
١٠- شەهید ئەحمەد ڕەشوانی - هەولێر.
١١- ئیبراهیم سەعید - کەرکوك
١٢- ڕووناك عەبدوڵلا زوهدی.
١٣- محەمەد مەجید ئەرسەلان.
١٤- فەرەیدون عەلی ئەمین
١٥- فائق میرزا عارف.
١٦-عیزەت محەمەد ئەمین - کەرکوك.
١٧- بابا عەلی شێخ ئەحمەد.

*** یەکەم دەستەی سکرتارییەتی مامۆستان بەم شێوەیە بوو:-**

١ - دکتۆر (کامیل حەسەن ئەلبەسیر)، سکرتێر.
٢- شەهید ئەنوەر سەعید دارتاش، جێگری سکرتێر.
٣- محەمەد باقی سەعید، ئەندام.
٤- شەهید عەبدولقادر مەلا عومەر گومبەدی، ئەندام
٥- فایەق میرزا عارف، ئەندام

لە دەستەی ئەندامانی کار ڕاپەڕین لە کەرکوك، بەرپرسی لقی کەرکوك، (ئیبراهیم سەعید) دەرچوو.

*** سەرپەرشتیارو لێپرسراو ئەندامانی لقی کەرکوك:-**

بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:-

١- محەمەد باقی سەعید - سەرپەرشتیار.
٢- ئیبراهیم سەعید - لێپسراوی لق.
٣- عیزەت محەمەد ئەمین - ئەندامی لق.
٤- محەمەد سەعید سابیر - ئەندامی لق.
٥- بابە عەلی شێخ ئەحمەد - ئەندامی لق.
٦- قادر حاجی عەلی - ئەندامی لق.
٧- عەبدولخالق عەبدولرەحمان - ئەندامی لق.
٨- حەسیب محەمەد ئەمین - ئەندامی لق.
٩- عەبدولقادر مەلا عومەر گۆمبەدی - ئەندامی لق.

لەبەر ئەوەی مامۆستا (عەبدولقادر مەلا عومەر) مامۆستا بوو لە دێیەکی نزیك سلێمانی، بەکاری پێشمەرگایەتییەوە خەریکبوو زۆر دەستی نەئەپەرژایە سەرکارو چالاکی مامۆستایان، بەتایبەت بەشی لقی کەرکوك.

مامۆستا (بابەعەلی شێخ ئەحمەد) زۆر چالاك و بەجەرگ بوو، ڕۆڵی گرنگی هەبوو لە ئاسانکردنی کارەکانی لقی کەرکوك، هەرچی نووسین و بڵاوکراوەو ڕاپۆرت هەبوو لە نێوان سلێمانی و کەرکوك ئەو ئەیهێنا و ئەیبرد، بگرە ئەو پەیوەندی بەهەولێریشەوە هەبوو.

بەدرێژایی ساڵەکانی (١٩٦٣) بەدوا، چەند جار ژمارەی ئەندامانی لقی کەرکوك گۆرانی بەسەردا هاتووە، تا گرتنی کۆنگرەی دووەمی یەکێتی مامۆستایان، ئەم مامۆستا بەڕێزانەی خوارەوە بوونە ئەندامی لقی کەرکوك لەگەڵ ئەو ئەندامە بەڕێزانەی کە مابوون، هەندێکیش پەیوەندییان نەدەما بەهۆی گرتن و دوورکەوتنەوەو بوونە پێشمەرگەو

شەهید بوون.
١ - عەبدوڵڵا حەمید
٢- عەبدوڵڵا سەراج
٣- عەبدولقادر سەلام
٤- عەبدولستار تاهیر شەریف
٥- جەلال عەبدولرەحمان.
٦- نورەدین عەبدولرەحمان.
٧- عەباس حوسێن.
٨- عەبدولخالق عەبدولرەحمان.
٩- محەمەد سەعید سابیر.

لە ساڵی (١٩٦٣) بەتایبەتی لە وەرزی هاوین، هەموو کارو چالاکییان لە ئاستێکی باشدابوو، مامۆستا (ئیبراهیم سەعید) لێپرسراوی لق بوو، بەهۆی باری خراپی ناوچەکەو کاروتاوانی بەعسو شپرزەبوونیو تێکچوونی ڕێکخستنەکانی پێویست بوو هەندێك گۆڕانکاری بکرێت لە ئەندامانی لقداو ژمارەیان زیاد بکرێت.

مامۆستا (بابەعەلی شێخ ئەحمەد) ئەندامی لقی کەرکوك ڕۆڵێکی وریایی ئەنواند لەو کاتە ناسکەدا، ڕاپۆرتو نووسراوی هەردوولای ئەگەیاند.

مامۆستا عەبدولقادر مەلا عومەر هەرچەندە پێشمەرگە بوو، بەڵام لە ساڵی نوێ(١٩٦٤)، هەنگاوەکانی فریای کەرکوکیش دەکەوتو کارەکانی ڕادەپەڕاند.

هەر لەو ماوەیەدا مامۆستایان چالاکی ڕۆشنبیری خۆیان هەبوو کە چەند گۆڤارێکیان دەردەکرد وەکو گۆڤاری (ئامانج) لە سلێمانی، گۆڤاری (هەڵمەت) لە هەولێر، گۆڤاری (پشکۆ) لە کەرکوك.

لە کەرکوکیش مامۆستایان دەستبەکاربوون بۆ دەرکردنی گۆڤارێك بەناوی لقە کەیانەوە، کۆمەڵێك مامۆستا سەرپەرشتی دەستەی نووسەرانیان دەکرد، بەردەوام لە گۆڕانکاریدا بوو.

١ - عەبدولقادر مەلا عومەر گومبەدی، سەرنووسەر.

| | |
|---|---|
| ٢- عەبدولستار تاهیر شەریف | ئەندام |
| ٣- عەبدوڵڵا سەراج | ئەندام |
| ٤- عەبدولقادر سەلام | ئەندام |
| ٥- عەبدوڵڵا حەمید | ئەندام |

سەرکەوتنی (عەبدولسەلام عارف) بەسەر بەعسییەکاندا بواری بۆ مامۆستایان کردەوە تا بتوانن فریابکەون دەستێك بە خۆیاندا بهێننو ڕیزەکانی مامۆستایان ڕێکبخەنەوەو لیژنەو لقەکان سەرلەنوێ بەسەر بکەنەوە، تا ئەوەی پێویستە لە گۆڕانکاریو چاکسازی بکرێت، یەکێك لەو چالاکییانە هەئیەی تەنفیزی بوو، کە هەوڵیان دا فراوانتر بێت، بۆیە هەریەکە لە لقەکانی سلێمانیو کەرکوکو هەولێرو بەغداو ناوەراستی عێراق بەشدارییان کرد.

کە لقی کەرکوك بریتی بوو لە (عیزەت محەمەد ئەمین)، (ئیبراهیم سەعید)، (بابەعەلی شێخ ئەحمەد).

ساڵی (١٩٦٧) دووەم کۆنگرەی مامۆستایان بەسترا کە دووڕۆژ بەردەوام بوو، کە لە سلێمانی بەسترا، هەریەکە لە عەبدولقادر مەلا عومەر، عەبدوڵڵا سەراج، عەبدولستار تاهیر شەریف، ئیبراهیم سەعید، لە کەرکوکەوە بەشدارییان لە کۆنگرەکرد، هەروەها لەوەدەچێت لەو ماوەیەدا گۆڤاری (پشکۆ) وەستا بێتو دەرنەچووبێت.

لە ٥ی ئابی ساڵی (١٩٧٠) کۆنگرەی سێی مامۆستایان گیرا لە ناوپردان لەژێر چاودێر مەلا مستەفای بارزانی بە دروشمی (ئاشتی... زانست... برایەتی).

لە ٢ی شوباتی ساڵی (١٩٧٢) کۆنگرەی چوارەم بەسترا لە (هەولێر) کە ئەندامانی بەشداربوو (٢٥٠) ئەندام بوو، کە هەردوو باڵەکەی یەکێتی مامۆستایان لە پەیوەندیو گفتوگۆ دا بوون بۆ یەکگرتنەوە.

لە ١ی شوباتی ساڵی (١٩٧٤) کۆنگرەی پێنجەم لە سلێمانی گیرا لە سینەما دڵشاد، ژمارەی ئامادەبووان (٢٥٠) ئەندام بوون.

لە مانگی تشرین دووەمی ساڵی (١٩٧٧)، کۆنگرەی شەشەم بەسترا لە (پیرمام) کە ناونرا (کۆنگرەی بووژاندنەوەی یەکێتی مامۆستایان، کە کۆنگرەکە یەك ڕۆژی خایاند مامۆستا عەبدولقادر مەلا عومەر بەشداری کۆنگرە کە بوو.

لە مانگی شوباتی ساڵی (١٩٨٢) کۆنگرەی حەوتەم لە (بالیسان) بەسترا، کە ژمارەی مامۆستایانی ئامادەبوو (٣٥) مامۆستا بوون و ئەم کۆنگرەیە ناونرا (کۆنگرەی هاوبەشی مامۆستایانی شارو شاخ)، هەر لەم کۆنگرەیەدا بڕیاری دەرکردنی گۆڤاری (خەباتی مامۆستا)درا.

لە (٢- ٤)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٤) کۆنگرەی هەشتەم لە گوندی سەروچاوە لە دۆڵی سماقولی بەسترا، کە کۆنگرەکە دووڕۆژی خایاند، کە شەهید عەبدولقادر مەلا عومەر ئەندامی سکرتارییەت بوو.

لە ٦ی تشرین یەکەمی ساڵی (١٩٩٢) کۆنگرەی (نۆیەم) لە هەولێر بەسترا لە هۆڵی میدیا بە بەشداری (٢١٣) ئەندام لە کەشێکی ئازاردا.

* سەرچاوە:-
١- دامەزراندنو خەباتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان، محەمەد باقی سەعید، ٢٠١٣.

*** لقی کۆمەڵێك ڕێکخراوی لینینی - مارکسی کوردستان لە کەرکوك**
**سالار ڕەشید**

*** کۆمیتەی ئەستێرەی سوور:-**

کۆمیتەیەکی سەرکردایەتییە لە ئاداری ساڵی (١٩٧٤) دامەزراو ئەرکی بەڕێوەبردنی بە (جەعفەر عەبدولواحید) سپێردرا. پاڵنەری سەرەکیی پێکهێنانی کۆمیتەکە پەیوەندیی بە هەلومەرجی دەستپێکردنەوەی شەڕی نێوان کوردو حکومەتی عێراقەوە هەیە، چونکە لەو هەلومەرجەدا بەشێکی زۆری سەرکردەو ئەندامەکانی کۆمەڵە لە بەرنامەیاندا بوو کە بچنە دەرەوەو پەیوەندی بە شۆڕشەوە بکەن. ئەم کۆمیتەیە بۆ ئەوە دامەزرا کە سەرپەرشتیی ڕێکخستنی ناوشارەکان بکات.

کۆمیتەکە لە چوار ئەندام پێکهات:- (جەعفەر عەبدولواحید) وەك لێپرسراوی کۆمیتەو لێپرسراوی ڕێکخستنی هەولێرو موسڵ، (ئەنوەر زۆراب) وەك لێپرسراوی ڕێکخستنی بەغداو خانەقین، (ئاسۆ شێخ نوری) وەك لێپرسراوی ڕێکخستنی سلێمانی، (ئیحسان نەجم محێدین - ئەبو شەهاب) وەك لێپرسراوی ڕێکخستنی کەرکوك. پاش ئەوەی (ئیحسان نەجم محێدین) پەیوەندی بە شۆڕشەوە کرد، سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنی کەرکوك کەوتە ئەستۆی لێپرسراوی کۆمیتەکە. لەسەر دەستی ئەم کۆمیتەیە، کۆمەڵە بە ئاشکرا خۆی وەك گروپێکی سیاسی راگەیاندو هەندێ بڵاوکراوەی بە ناوی خۆیەوە لە چەند گەڕەکێکی سلێمانی بڵاوکردەوە.

پاش هەرەسهێنانی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥) کۆمیتەکە بەردەوام بوو لەسەر هەڵسوڕانی خۆی و دوا بەدوای گەڕانەوەی سەرکردەکان و ئەندامان بۆ شارەکان، (عەلی بچکۆل) لە جیاتی (ئیحسان نەجم محێدین) بۆ سەرپەرشتیکردنی ڕێکخستنی کەرکوك دانرا.

لەبەر هۆی ئەمنی و لەبەر هەندێ کێشەی ناو کۆمیتەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە، کۆمیتەی سەرکردایەتی کە پێکهاتبوو لە:- (شەهاب شێخ نوری، ئاوات عەبدولغەفوور، فەرەیدون عەبدولقادر، حەمەی میرزا سەعید، جەعفەر عەبدولواحید) بڕیاریدا هەموو دەسەڵاتەکانی خۆی بدا بە کۆمیتەی ئەستێرەی سوور، بەم پێیە کۆمیتەکە لە کۆمیتەیەکی سەرپەرشتیاری ڕێکخستنەوە بوو بە کۆمیتەی سەرکردایەتی بەشێوەیەکی کاتی.

*** (ڕێکخراوی سرك):-**

کورتکراوی سوپای رزگاریی کوردستانە. ڕێکخستنێکی چەکدارە بە شێوەی سوپایەکی نهێنی لەناو شارەکان دروست کرا. مێژووی دروستکردنی بۆ ناوەراستی ساڵی (١٩٨٩) دەگەڕێتەوە، کاتێك سەرکردایەتیی نیشتمانیی کوردستان داوای لە ڕێکخستنەکانی ناوشارەکان کرد شانەی چەکدار دروست بکەن.

ئەو شانە چەکدارانەی لەو کاتەدا لەناو شارەکان دروست کران، ژمارەیان زۆر نەبوو، هەروەها هیچ چالاکییەکیشیان بە کردەوە ئەنجام نەداوە. بەڵام پاش سەرهەڵدانی قەیرانی کوێت لە ساڵی (١٩٩٠) وزیاد بوونی ئەگەری لێدانی عێراق، دروست کردنی شانە چەکدارەکان گەشەکردنێکی زۆری لە ماوەیەکی کورتدا بە خۆوە بینی.

بەشێکی زۆری پێشمەرگە دێرینەکان پەیوەندییان بە ڕێکخستنەکانەوە کردو لە شانە چەکدارەکان ڕێکخران و ژمارەیەکی زۆری شانەی چەکداریش لە ناو میلیشیا چەکدارە کوردەکانی سەر بە ڕژێمی عێراق دروست کران. لەو هەلومەرجەدا (سرك) هەموو جۆرە چەکێکی پێویستی بە هۆی سەربازە راکردووەکانەوە پەیدا کرد.

شانە چەکدارەکان لە ناوچەکانی: (هەولێر، سلێمانی، کەرکوك، عەربەت، کفری، دەربەندیخان، باوەنوور، کەلار، شارەزوور، سەید سادق، زەرایەن، رانیە) دروست کران.

لە راپەڕینی ساڵی (١٩٩١)دا (سرك) ڕۆڵێکی سەرەکی لە زۆربەی شوێنە رزگارکراوەکاندا گێڕا.

لە دروستکردنی (سرك)دا مستەفا سەید قادر ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە. پاش گیرانی لە(٢٩)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٩٠)، کادیرەکانی تری ڕێکخستن لەوانە:- مستەفا ئیبراهیم دەروێش، شاسوار، عەبدولقادر محەمەد عومەر، ئەرکی تەواو کردنی پلانەکەیان گرتە ئەستۆو توانییان ژمارەیەکی زۆر شانەی چەکدار دروست بکەن.

وەستا رەسول ئاوا باسی (سرك) دەکات:- "... لەناوەراستی ساڵی (١٩٨٩) بە ئاگادارییەکی گشتی ئاگادار کراینەوە کە شانەی چەکداری لە ژێر ناوی (سوپای رزگاری کوردستان - سرك) دروست بکەین، ئێمە لە کەرکوك سێ مەفرەزەمان دروست کرد کەراستەوخۆ من بەرپرسیان بووم، دیارە (سرك) لە شێوەی سوپایەکی نهێنی لە ناوشارەکان دروستکران شان بەشانی مەفرەزە پارتی زانەکان بۆ هەندێ چالاکی دیاریکراو بەکار دەهاتن...).

*** (کۆمیتەی شارەکان):-**

کۆمیتەیەکە پاش لەبەر یەك هەڵوەشانەوەی کۆمیتەی ئەستێرەی سوورو ئاشکرابوون و گیرانی ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی کۆمەڵەی (مارکسی - لینینی) کوردستان و هانا بردنی ئەندامانی سەرکرادایەتیی کۆمەڵە بۆ ئێران، بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ڕێکخستن لە ئەیلولی ساڵی (١٩٧٥) پێکهات.

ئەم کۆمیتەیە لە برایم جەلال لە سلێمانی، ئیحسان نەجم محێدین - ئەبو شەهاب، ئازاد هەورامی، ئەحمەد کرێکار، حەمید محەمەد کاکەمەند لە کەرکوك، عەبدولرەزاق ئەحمەد لە هەولێر پێك هات و توانی لە بواری گرتنەوەی هەندێ لە هێڵە پچراوە پەرش و بڵاوەکانی ڕێکخستنی نهێنی سەرکەوتووبێ.

لە مانگی تشرینی دووەم بەدواوە هەندێ لە کادیرەکانی تری ڕێکخستن کەوتنە پەیوەندی کردن بە یەکترییەوە بۆ پێکهێنانی سەرکردایەتییەکی ئەلتەرناتیڤ بەناوی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە. کۆمیتەی شارەکان دژی ئەم هەوڵە وەستایەوەو بەشداریی تێدا نەکرد، بەڵام هەندێ

لەئەندامەکانی لەوانە:- ئازاد هەورامی، پشتیوانیان لە دروست کردنی سەرکردایەتییەکی ئەلتەرناتیڤ کردو بەشدارییان لە پێکهێنانی کۆمیتەی هەرێمەکاندا کرد.
پاش پێکهێنانی کۆمیتەی هەرێمەکان بە رابەرایەتیی شاسوار جەلال (ئارام)، لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٦) کۆنتاکت لە نێوان هەردوو کۆمیتەدا بۆ تێکەڵبوونەوە هاتەئاراوەو لە مانگی ئایاردا کۆمیتەی شارەکان لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکاندا یەکی گرتەوە.

*** (کۆمیتەی هێرش)**

کۆمیتەیەکی رێکخستنی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانە، سنووری چالاکیی لە هەردوو پارێزگای هەولێرو کەرکوکی گرتۆتەوەو لە هەمان کاتدا جۆرە سەربەخۆییەکی لە رایکردنی کارەکاندا هەبووە، چونکە نەسەر بە کۆمیتەی هەولێر بوو نەسەر بە کۆمیتەی ئاگر بوو لە کەرکوك، بەڵکو راستەوخۆ سەر بە ناوەندي کۆمەڵەبوو.
مێژووی پێکهێنانی بۆ ساڵی (١٩٧٩)وە دەگەرێتەوە، کاتێك ئەو هێڵانەی رێکخستن کەراستەوخۆ سەر بە ناوەندی کۆمەڵە بوو، پەرەیان سەندو جموجوڵیان زیادی کرد، بۆیە لە دواییدا بریاردرا کۆمیتەیەکیان بە ناوی کۆمیتەی هێرشەوە لێ پێك بێ.
لێپرسراوی کۆمیتەکە (خالید فەقێ محەمەد رەسوڵ) بوو، ئەندامەکانیشی بریتی بوون لە (نامیق عومەر، عادل شەریف، عەبدولقادر محەمەد عومەر).
هەر ئەو ساڵە، کۆمیتەکە بریاریدا پەرە بە هەڵسورانی خۆی بداو دەست بە ئەنجامدانی چالاکیی شۆرشگێرانەو کاری تەقینەوە بکات لەناو شاری هەولێر لە دژی کاربەدەستان و دامودەزگاکانی رژێمی بەعس.
ئەندامانی کۆمیتە لەو کەرەستانەی لەبەر دەستیاندا بوو بۆمبیان دروست کرد ئەجێندای کارەکە بەو جۆرە دابەشکرا کە (عادل شەریف) لە کەرکوك لە دوکانێکی ئاسنگەری بەرگی دەرەوەی بۆمب دروست بکات، (کوردۆ رەحمان) لە کەرکوك باروتی ماددەی (تی ئێن تی) پەیدا بکات، (عەبدولقادر محەمەد عومەریش) ئەرکی دروستکردنی کەپسوولی بۆمب لە تەلی باریکی تەنگستن بگرێتە ئەستۆ. یەکەم تاقیکردنەوەی بۆمبە دروستکراوەکان لە گوندی ئۆمەراوە بە سەرکەوتوویی ئەنجام درا.
ئەنجامدانی چالاکیی شۆرشگێرانە لەناو شاری هەولێر، هەندێ کێشەی لێکەوتەوە، چونکە پەلهاوێشتنی سنووری چالاکیی کۆمیتەی (هێرش) بۆ ناو سنووری چالاکیی هەردوو کۆمیتەکەی هەولێرو کەرکوك شێوایی لە رایی کردنی کاروبارەکانی رێکخستندا دروست کردو کاریگەری خراپی لەسەر کاروباری رێکخراوەیی هەردوو کۆمیتەی کەرکوك و هەولێر بەجێ هێشت. دواتر، بریاری هەڵوەشاندنەوەی کۆمیتەکە دراو لەم رووەوە وا بە پەسند زانرا کە شانەکانی هەولێری ئەو کۆمیتەیە بخرێتە سەر کۆمیتەی هەولێرو شانەکانی کەرکوکیش بخرێتە سەر کۆمیتەی ئاگر لە کەرکوك.

*** رێکخراوی رەنجدەرانی کوردستان**

"رێکخراوی رەنجدەرانی کوردستان" یەکێك بوو لەو رێکخراوە چەپانەی نیوەی دووەمی ساڵی حەفتاکان لە کوردستان. کە لە کۆمەڵەی مارکسی – لێنینی کوردستان جیابووەوەو پاش ماوەیەکی کەم لە کارو هەڵسووران کەوتە بەر شاڵاوی گرتن و لەسێدارەدان و سەرەنجام بەو. کۆمەڵەی مارکسیی لێنینیی کوردستان هەر وەکوو بە ناوەکەیدا دیارە، هەر لە کاتی دروستبوونییەوە رێکخراوێکی مارکسیی لێنینیی بوو، وە پشتی بە تیۆرەکانی ماوتسێتۆنگ بەستبوو، تا ئەو دەمەی، خاڵە شەهاب و بەشێك لە رابەرایەتی و کادیرانی لەلایەن رژێمی بەعسەوە دەستگیر ئەکرێن، دوای ئەوان ئارام (شاسوار جەلال) جڵەوی سەرکردایەتی ئەگرێتە دەست و کۆمیتەی هەرێمەکان دروست ئەکات و گۆرانکاری لە رێبازی سیاسیی کۆمەڵەدا ئەکات، کە دیارترینیان: لابردنی ناوو رێبازی ماو لە پاڵ مارکس و لێنین، لابردنی رێبازی سیاسی سێ جیهانی، باسکردن لە حیزبێکی مارکسیستی بۆ کوردستانی عێراق، پتەوکردنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ هێزە مارکسیست و شۆرشگێرەکانی عێراق و بەرێکخستنی شۆرشی دیموکراتی لە عێراقدا.
ئەم ئاڵوگۆرانەی ناو کۆمەڵە، بوو بەهۆی توورەیی کۆمەڵێ کادری کۆمیتەی سلێمانی و جیابوونەوەیان لە کۆمەڵە. ئەمە سەرباری ئەوەی، ئەو کادیرانە پێیان وابوو، کە نابێ رێکخراوێکی مارکسیستی وەك کۆمەڵە کەسێکی وەك مام جەلال رابەرایەتی بکات و جڵەوی سیاسی بەدەستەوە بگرێت. لەبەر ئەو هۆیانە، ئەو کۆمەڵە کادرەی کۆمیتەی سلێمانی کۆمەڵە لە ساڵی (١٩٧٦) رێکخراوی رەنجدەرانی کوردستانیان دامەزراند، کە دیارترین رابەرانیشی ئیبراهیم خەلیل، ئیبراهیم حەسەن، کەمال حەمە ساڵح، کاك عەبدوڵا (ئەم دووانەی دواییان لە ساڵی (١٩٧٧) لە زیندانی مووسڵ لە سێدارە دران) بوون.
رێکخراوی رەنجدەران بڵاوکراوەیەکی بە نێوی رەنجدەران" ەوە هەبوو، کە تەنها یەك ژمارەی لێ دەرچوو، دوای ئەوە ئیتر بە هۆی شاڵاوی گرتنەوە ئەم رێکخراوە هیچی بەسەر هیچەوە نەما. بڵاوکراوەی رەنجدەران نە سەرنووسەرو نە دەستەی نووسەرانی هەبوو. تەنانەت نووسەریشی نەبوو، بە تەنها ئیبراهیم خەلیل خۆی دەری ئەکرد. چونکە لەو هەلومەرجە مێژووییەدا ئەو کەسانەی کە دەستی نووسینی سیاسییان لە بزووتنەوی چەپدا هەبوو، زۆر کەم بوون. ئەمەش نەك بە تەنها لە کوردستان، بەڵکوو لە سەرتاسەری عێراقیش هەر بەو جۆرە بوو. ئەم مەسەلەیەش هۆکاری زۆری هەبوو، کە لێرەدا جێگای باسکردن نییە.
وتارو نووسینەکانی بڵاوکراوەی رەنجدەران، تەشهیری شەخسی و رەخنەی غەیرە سیاسی لە سەرکردەکانی کۆمەڵەو یەکێتی بوون. لاپەرەکانیشی بە ئامێری رۆنیۆی دەستکرد راکێشرابوون، کە ئیبراهیم حەسەن خۆی دروستی کردبووو چەند وێنەیەکی داس و چەکوش و کرێکاری بازوو ئەستووری تێدا بوو، زۆر بە جوانی کێشرا بوون. لە سەر

ئەم وێنانەش لاوێکی خوێنگەرم بە ناوی ئەحمەد خدر، کە خوێندکاری زانکۆ بوو، لە سێدارەدرا. لەو کەسانەی کە دۆستو لایەنگری ئەم ڕێکخراوە بوون، تاقە یەك ژمارەشی لای کەس نەماوە.

ڕێکخراوی ڕەنجدەران رابەرایەتییەکی نهێنی هەبوو، لە (٤) کەس پێك هاتبوو، کە جگە لەو چەند کەسەی کەسەی سەرکردایەتی، کەسی ترئەوانی نەئەناسی. لە دوای کۆمیتەی سەرکردایەتی، کۆمیتەی شارەکان هەبوو، بەلام لە گشت کوردستاندا، تەنها لە سلێمانیو کەرکوك کۆمیتە هەبوو.

لەشارو ناوچەکانی تر ڕێکخستنیان هەبوو، هەر دوو - سێ کەس پەیوەندییان بە کادرێکەوە هەبوو، ئەو کادیرانە زۆر بەیان لە دوو کۆمیتەی سلێمانیو کەرکووکەوە ئەنێردران. لە شاری هەولێر ڕێکخستنیان زۆر بوو، بەلام رابەرایەتییان کەم بوو، نەیان ئەتوانی کۆمیتەی پێ دروست بکەن، قەناعەتیشیان بەوە نەبوو، کە ئەندامانو بەرپرسی کۆمیتە لە شارەکانی ترەوە بۆ شارێکی تر بچن. لە دهۆك ڕێکخستنیان زۆر کەم بوو، بە پەنجەی دەست ئەژمێردران. لە ناوچەی گەرمیانو دەورووبەری تا ئەگاتە دەربەندیخان ڕێکخستنی باشیان هەبوو. ئەمانیش زیاتر لە ڕێگای پەیوەندییە کۆمەلاتییەکانەوە بوو زۆربەیان پەیوەندییان بە کۆمیتەی کەرکووکەوە هەبوو. لە شارەکانی بەغداو مووسل، بە تایبەتی لە زانکۆکان لایەنگرو کادریان هەبوو، ئەوانیش کەسانی تریان بۆ دیراسەو موناقەشەی سیاسی ئاراستە ئەکردو بۆ ڕیزەکانی ڕێکخستن ئامادەیان ئەکردن.

ئەو گرتنو ڕاوەدوونانە لە کۆتایی مانگی سێی سالی (١٩٧٧) دەستی پێ کرد، هەتا وەکو مانگی شەشی هەمان سال درێژەی هەبوو.

ڕێکخراوی ڕەنجدەرانی کوردستان لەو هەلومەرجە مێژووییەدا لەگەل یەکێتیی نیشتمانی کوردستان خەریکی گفتوگۆ بوو، بۆ ئەوەی ئەمانیش وەك کۆمەلەو بزووتنەوەو خەتی گشتی، ببنە ئەندامی ئەو بەرەیەی یەکێتی دروستی کردووە. وەفدی گفتوگۆکە بە تەنها ئیبراهیم حەسەن بوو، کە ئەندامی ناوەندیو کەسی دووەمی ڕێکخراوەکەش بوو، لەبەر باری ئەمنی دەبوو بە تەنها بێت، چونکە ئەو کات ڕژێم هێزی سەربازیی یەکجار زۆری لە کوردستان جێگیر کردبوو، بۆ سەرکوتکردنی بچووکترین نارەزایەتیو جوولانەوە ئەگەر هەبێو لەگەل ئەمانەدا هەولێکی زۆری ئەدا، بۆ ئەوەی لەشارو شارۆچکەکانی کوردستان، دەیەهاو سەدەها سیخوری نهێنی دروست بکات، بۆ بەرگرتن بەو شەپۆلی نارەزایەتییەی کە لە ناخی هەر تاکێکدا پەنگی خواردبووەوە، کە هەمیشە وەك بورکان ئەگەری تەقینەوەی هەبوو. ئەو کەسەی کە کۆبوونەوەکانی ڕێك ئەخست، وەستا ئەنوەری هەلەبجە بوو، کە دواتر لەلایەن ڕژێمی درندەی بەعسەوە سزای لە سێدارەدانی بۆ دەرچووو لە هەیئەی کەرکووك گیانی لەدەست دا. چەندین جار ئیبراهیم حەسەن بۆ گفتوگۆ لە ڕێگای وەستا ئەنوەرەوە بەرپرسانی یەکێتی ئەبینیو لە ئەنجامدا ئەگەنە سووکە ڕێککەوتنێك، کە دانیشتنی ئەم جارەیان دوا دانیشتن ئەبێت.

کۆمیتەی کەرکووك نەك بە تەنها نەبەردییەکەی لەوەدا بوو، کە هیچ کەسێکیان تووشی گرتنو ئەشکەنجەدان نەکرد، بەلکووو لە دانپێنانەکاندا هەر پێنجیان بەلێنیان بە یەکتری دابوو، کە بلێن، ئێمە لە ڕێکخستن نەبووینو تەنها لایەنگری ڕێکخراو بووینو بلاوکراوەکەمان خوێندووەتەوەو کۆمەکیشمان کردووە. هەرچەندە ئەمنی کەرکووك فرتو فێلو ئەشکەنجەی زۆر نامرۆڤانەی لەگەلیان بەکار ئەهێنا، بەلام ئەو بەلێنەی کە بە یەکترییان دابوو، تا کۆتایی لێکۆلینەوە لەوە زیاتریان نەدرکانو بەلێنەکەیان بردە سەر، بە مەرجێ کۆمیتەی کەرکووك ئەندامو لایەنگری لە کفری، کەلارو دێیەکانی دەورووبەری ئەو دوو قەزایە، حەویجەو لەناو شاری کەرکووك، زۆر بووو زۆربەشیان پەیوەندییان بە بەرپرسی کۆمیتەکەوە هەبوو، بەلام تەنها یەکێکیش تووشی گرتنوراوەدوونان نەبوو.

کۆمیتەی کەرکووك پێك هاتبوو لە: عوسمان محەمەد کەریم (بەرپرسی کۆمیتەی کەرکووك)، حەسەن عەلی، ستار محەمەد کەریم (فوئاد سادق)، ڕەحمان داود، محەمەد نەجم. لێکۆلینەوەکان لە ئەمنی سلێمانی، کەرکووكو هەولێر کرانو هەر کەسێ بەپێی شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی. بەلام دواتر هەموو بەندکراوەکانیان لە هەیئەی کەرکووك کۆ کردەوەو لێکۆلینەوە تازە کرایەوە. زۆرێك لە ئەندامان لە دانپێنانەکانیان پەشیمان بوونەوە، کە لە شارەکانی خۆیان لەگەلیاندا کرابوو، چونکە ئەشکەنجەدان لە هەیئەی کەرکووك لەچاو ئەمنی شارەکان ئەهوەنتر بوو. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە ئەو لێکۆلینەوەیەی کە لە هەیئەی کەرکووك ئەکرا، ئەوە بۆ دادگاییکردنەکە ئەیخوارد، بۆیە زۆر شت لە هەیئە ئەگۆڕێ. دوای ئەوەی کە لێکۆلینەوە کۆتایی پێهات، لەدواییدا ڕەوانەی دادگای تایبەتی کەرکووك کرانو یەك ڕۆژ بۆ دادگاییکردنەکەیان دیاریکراو سەرەنجام حوکمی جۆراوجۆریان بەسەردا درا: پێنج ئەندامیان سزای لە سێدارەدانیانو ئەوانی دیکە لە (٣ - ١٥) سال حوکم دران.

ئەو ئەندامانەی کە خەلکی کەرکووك بوون: عوسمان محەمەد کەریم، ڕەحمان داود، محەمەد نەجم، محەمەد حاجی ڕەشید، حەسەن عەلی، نەجمەدین (مامۆستا جوامێر)، ستار محەمەد کەریم (فوئاد سادق)، عەدنان کەریم (ئەحمەد موعین)، ئیسماعیل قادر (سمکۆ)، عەفان عوسمان، مەحموود مستەفا چایچی، مامۆستا مەحموود، خالید، بەکر ڕەحیم، کەریم سابیر، نەعمان شوانی، ئەمین عەبدلجەبار، سابیر کاکی، جومعە حاجی ڕەشید، عادیل مسەوەر، عوسمان ئیبراهیم.

ئەو هاوڕێیانەیش کە خەلکی سلێمانیو دەورووبەری بوون: کەمال حەمە سالح، عەبدولا، ئەحمەد خدر، کاك فایەقی جابی، عەلی (ئەم پێنج هاوڕێیە لە سێدارە دران)، زەینەدین نەجمەدین (دکتۆر ساجید)، کاکە سوور، ئەحمەد مەولوود، سەردار محەمەد ئەمین (قەلا دزێ)، ڕەفیق برای عەبدولا، کاوە حەمە سالح برای کەمال، عەباس برای عەلی، جەبار خەیات، نزار، فەرهادی موهەندیس، فەرەیدوون، عەدالەت تالەبانی، محەمەد حەمە کەریم، ئاوات، ئاراس، دکتۆر عومەر محەمەد ئەمین، ئەحمەد کاکاو، سیروان، هێرش موحەرەم، سەرداری

خەیات، عەبدوڵا حەسەن خەیات، شازاد هەورامی، بەهادین (شەقڵاوە)، پێنج بر ینپێچ بە ناوەکانی: شێخ بەهادین، شێخ عەزەدین، سەردار، حەمید، حوسێن، کچێکیش بە ناوی هاوین، کە خوێندکاری کۆلێجی ئەندازیاری بوو، دواتر لە دادگا بە ساڵێك زیندانی بەبێ تەنفیز ئازاد کرا، وەستا ئەنوەر هەڵەبجەیی، سەلاح سەعید، سەلاح ئەحمەد، ئەکرەم محەمەد، سەردار محەمەد، کاك ئەحمەد هەڵەبجەیی و چەند هاوڕێیەکی تری خەڵکی هەڵەبجە.

ئەو هاوڕێیانەیش کە لەسەر کۆمەڵە گیرابوون:- ئازادی مەلا محەمەد (ئازادی مەلا)، لەتیف شێخ عومەر، عادیل رەحیم (مامۆستا عادیل)، محەمەد رەحیم (ئاسۆ رەحیم)، تەهای حەمە رەش، جەبار مستەفا (جەلال محەمەد)، کە دوو تۆمەتی لەسەر بوو: یەکێکیان، کۆنە کۆمەڵە بوو، ئەوی تریان یەکێك لە کەسە دەرکەوتووەکانی رەوتی سەرانسەری (عێراقی) بوو، شێخ هیشام بەرزنجی و عەلی میرزا بە تۆمەتی ئەندامێتییان لە ریزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی (قیادەی مەرکەزی)، محەمەد مستەفا (ئازاد مستەفا)، کە سکرتێری پاسۆك و مامۆستا فەرهاد ئەندامی سەرکردایەتیی پاسۆك لەنێو گیراوەکاندا بوون.

دوای شاڵاوی گرتنە بەرفراوانەکەی رێکخراوی رەنجدەرانی کوردستان، ئەوانەی لەو شاڵاوی گرتنە رزگاریان بوو، چوونە شاخ و چەند مەفرەزەیەکیان بە رابەریی کەسی یەکەمی رێکخراوەکە کە ئیبراهیم خەلیل بوو، دروست کرد. بەڵام ئەم مەفرەزە چەکدارانەش لە ماوەیەکی زەمەنی زۆرکورتدا هەر هەموویان لە ناوچوون و تەنها یەك کەسیان لێ رزگار نەبوو

*** بەرەی رزگاریی زەحمەتکێشان - بەرزە**

بەرەی رزگاریی زەحمەتکێشان - بەرزە یەکێك بوو لەو سازمانە کۆمۆنیستییانەی دەیەی هەشتاکانی سەدەی رابردوو لە کوردستانی عێراق. بەرزە ئەگەرچی لە ناوەراستی هەشتاکان وەك رێکخراوێك خۆی بانگەواز کرد، بەڵام ریشەی ئەم سازمانە بۆ سەردەمانێکی گەلێك لەوەبەر دەگەرێتەوە. بۆ سەردەمانێك کە کۆمەڵێك لە کادیرانی کۆمەڵەی مارکسیی لێنینیی کوردستان دەست لە کار دەکێشنەوە و دەیانەوێت بە جۆرێکی دی درێژە بە کارو هەڵسوورانی کۆمۆنیستی خۆیان بدەن. ئەم رێکخراوە بە یەکێك لە رێکخراوە دیارەکانی ئەو دەمە دێتە ژماردن کە دامەنەی رێکخراوەیی بە بەراورد لەگەڵ ئەڵقەو گرووپەکانی ئەو دەمە فراوانترو نووسین و باسەکانیشی زۆرتر بوون.

١- نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا (نەجمەدین رەشید عەبدوڵا) لە ساڵی (١٩٥٦) لە شاری کەرکوك لە دایك بووە. خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندی هەر لەو شارە تەواو کردووە و پاشان لە زانکۆی بەغدا/ کۆلێجی کشتوکاڵی/ بەشی ئابووریی کشتوکاڵی لە ئەبووغرێب وەردەگیرێ. بەڵام لە ساڵی (١٩٨١)و لە قۆناغی سێهەمی خوێندیندا، بەهۆی مەترسی ئەو شاڵاوی گرتنەی کە بۆسەر کۆمیتەی ئاگر (کۆرەك) لە شاری کەرکوك دەستی پێ کرد. دەیت لە خوێندن هەڵدگرێ و دەچێتە شاخ. لە ساڵی (١٩٨١) لە شاخ، یەکەمین لێکۆڵینەوە بەنێوی: سیاسەتی بەعەربکردن لە کەرکووکدا چاپ و بڵاو دەکاتەوە. لە ساڵی (١٩٨٢) لە دەستەی نووسەرانی خولی دووەمی گۆڤاری کۆمەڵە بووە. لە ساڵی (١٩٩٧)ەوە لە هۆڵەندا نیشتەجێ بووە و لە ساڵی (٢٠٠٣) بروانامەی دیپلۆم لە ژمێریاری تەتبیقی لە زانکۆی ئیراسمۆس لەو وڵاتە بە دەست دەهێنێ.

کۆمەڵێ کتێب، وتارو وەرگێرانی لە زمانی هۆڵەندییەوە هەیە. ئێستا لە دەستەی نوسەرانی گۆڤاری "کەوانە" یە و سەرۆکی دەزگای خەندان ە بۆ پەخش و بڵاوکردنەوە.

بەرلەوەی باس لە بەرەی رزگاریی زەحمەتکێشان بکرێت، پێویستە ئاماژەیەك بۆ پێشینەکەی بکرێت، کە بۆ ساڵی (١٩٧٩) دەگەرێتەوە. لە سەروبەندی راپەرینە جەماوەرییەکانی ئێراندا رەوشی گشتیی ناوچەکە کەم و زۆر کەوتە ژێر کاریگەریی ئەو گۆرانکارییانەی لەو راپەرینەوە وەك مۆدێلێکی تازەی خەبات هاتە کایەوە. چەند کەسێك کە ژمارەیان لە پەنجەکانی دەست تێنەدەپەرین، هەر هەمووشمان دەرچووی قوتابخانەکەی کۆمەڵەی مارکسیی لێنینیی کوردستان (نەك کۆمەڵەی رەنجدەرانی نەوشیروان مستەفا) بوون، هەر یەکە و لەبەر هۆیەك یان زیاتر لە کۆمەڵە دوورکەوتبوونەوە و رەخنەی توندیان (بە تێروانینی ئەو دەمەیان) لە بەرامبەر جووڵانەوەی چەکداریی کوردستان بەگشتی و (یەکێتیی نیشتمانی کوردستان)و کۆمەڵە هەبوو، کە لە دەوری ئەم خاڵانەدا ئەسوورایەوە:

١- رەتکردنەوەی درووشمی " دیموکراتی بۆ عێراق و حوکمی زاتیی راستەقینە بۆ کوردستان"و پێداگرتن لەسەر درووشمی " مافی بریاردانی چارەنووس تا رادەی جیابوونەوە.

٢- رەخنە لە مۆدێلی شێوە خەباتی چەکداری لە شاخەوە. ئەو بیرۆکەیە بە تایبەتی لەگەڵ شۆرشی ئێراندا بە تەواوی لامان چەسپی.

٣- رەخنە لە کۆمەڵە کە (گوایە) بە تەواوی لە بنەماکانی مارکسیزم - لێنینزم لای داوە و ناوزەدکردنی بە رێکخراوێکی ناسیۆنالیستیی وردەبۆرژوایی.

٤- رەخنەلەکارو کردەوەو ئەو رەفتارە رۆژانەییانەی لەناوجووڵانەوە چەکدارییەکەوە برەویان هەبوو.

٥- رەخنە لە زاڵبوونی بۆرژوازیی قەومیی کوردی (کە نێوی جۆراوجۆریان لێدەنان، لە چەشنی: بۆرژوازیی عەشایەری، مشەخۆر، کۆمپرادۆر، نیمچە نیشتمانی، نارەسەن.. هتد).

٦- کەوابوو، رەخنەکانمان لە کۆمەڵەو لە یەکێتیی نیشتمانی کوردستان لە چوارچێوەی مەیلێکی رادیکاڵانەی ناسیۆنالیستیدا پەنگیان خواردبووەوەو جیاکردنەوەی ناسنامەی فیکری لەسەر بناغەی رەخنەی مارکسیستی ئەسڵ و بناغەیەکی رۆشنی نەبوو.

لەگەڵ هەلومەرجە ورووژێنەرە نارۆشنەکانی ساڵی (١٩٧٩)دا بیرۆکەی دامەزراندنی رێکخراوێکی چەپی تازەیان لەلا گەڵاڵە بوو. بیرۆکەکەم لەگەڵ یەکە بەیەکەی ئەو برادەرانەی تر (کە چوار کەس بوون) بە جیا باس کرد. یەکێکیان کە زۆر هاورێی نزیکیان بوو، زۆر سەرسەختانە دژی وەستایەوەو پاش دوو ساڵ بۆیان دەرکەوت (لە رێگەی ئازاد هەورامییەوە)،

هەموو قسەو باسەکانی بۆ کۆمیتەی کەرکووکی کۆمەڵە گواستبۆوەو ئەوانیش لەو ماوەیەدا دوانزە ڕاپۆرتیان لەسەر بیروباوەڕو جموجووڵەکانیان بۆ نێوزەنگ ناردبوو. هەرچی سێ برادەرەکەی تریان بوو، دوانیان کشانەوە، بەڵام چوارەمیان کە سەباح حەسەن خورشید (سۆران)بوو، بە حەماسەتەوە بیرۆکەکەی وەرگرت.

سەبارەت بە قسەو باسەکانیشیان لەسەر ئەم خاڵانە ڕێککەوتن:

١- پەرەپێدانی بیرۆکەی پێویستیی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی مارکسی وەکو کاکڵەی پارتی پێشڕەوی کرێکاران و زەحمەتکێشان. ئاراستەکردنی ڕەخنەی هەمەلایەنە لە دژی ڕێکخراوە قەومییەکان، بە تایبەتی کۆمەڵەو یەکێتی و سیاسەت و درووشم و بیرو باوەڕەکانیان.

٢- بەرزکردنەوەی درووشمی مافی بڕیاردانی چارەنووس تا ڕادەی جیابوونەوەو پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ وەك درووشمێکی ئەڵتەرناتیڤی تاکتیکی لە بەرامبەر ڕێکخراوە قەومییەکان.

٣- خەبات لە دژی دیکتاتۆرییەت و ڕووخاندنی لە ڕێگای جووڵانەوەیەکی دیموکراتیی گشتی و دابینکردنی مافە دیموکراتییەکانی کرێکاران و زەحمەتکێشان و چارەسەری کێشەی نەتەوایەتی و... هتد (دیدی ڕۆشنمان بۆ ئەڵتەرناتیڤی سیاسی نەبوو).

٤- ڕەتکردنەوەی شێوازی خەباتی چەکدارانە لە شاخەوە بەرەو شار. پەرەپێدانی بیرۆکەی ڕاپەڕینی گشتی تا ئاستی ڕێکخستنی ڕاپەڕینی چەکدارانە.

٥- پەرەپێدانی بیرۆکەی پارتی پێشڕەوی کرێکاران و زەحمەتکێشان وەك مەرجی حاشاهەڵنەگری ڕێکخستن و ڕابەریکردنی ڕاپەڕینی گشتی و چەکداران و بەسەرکەوتن گەیاندنی. گەڕانەوە بۆ سەرچاوە ڕەسەنەکانی مارکسیزم - لێنینزم و مۆدێلی حیزبی بۆلشەڤی و شۆڕشی ئۆکتۆبەر.

٦- ڕەتکردنەوەی ماویزم، ئەلبانیزم، تێزی سێ جیهان، گیڤاریزم...هتد.

٧- دووپاتکردنەوەی هەڵوێست بەرامبەر بە یەکێتیی سۆڤێت وەك سۆسیال - ئیمپریالیزم. دژایەتیکردنی ڕیڤیژنیزم لە گشت ڕوویەکەوە.

٨- لە ڕووی عەمەلییەوە، هەوڵدان بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ هەموو جۆرە خەڵکێکی ناڕازی لە وەزعەکەو ڕێکخستنیان بە دوو قۆناغ:

ا- لە ئەڵقەی ڕۆشنبیریدا، تا ئەو ئاستەی دەگاتە بڕواهێنان بە پێویستیی دامەزراندنی حیزبی پێشڕەوی کرێکاران و زەحمەتکێشان.

ب- خۆڕێکخستن لە شانەیەکدا، بەرەو خۆئامادەکردن بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی مارکسی وەکوو کاکڵەی حیزب. ئەرکی سەرەکی بریتی بوو لە، یەکەم خۆوشیارکردنەوە. دووەم دروستکردنی ئەڵقەی ڕۆشنبیریی تازە.. هتد.

لە مانگی ئۆکتۆبەر یان نۆڤەمبەری ساڵی (١٩٨٢)شدا کاتێك نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا و سەباح حەسەن خورشید و هۆشیار عەبدولخالق لە گوندی مەلا سەفی کۆبوونەوە، پێشنیاری دامەزراندن و ڕاگەیاندنی بەرەی ڕزگاریی زەحمەتکێشانیان کرد. سەباح دژی بیرۆکەکە وەستایەوە. بەڵام هەموویان سووربوون لەسەر بەرەسمیکردنی ئەو ڕێکخراوەو هەر بەو جۆرەش بوو. دیارە سەرجەم ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکان، کە پەیوەندییان پێوە هەبوو، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بوون بە بەرزە. لەو کاتەداو دەستبەجێ هیچ بەیاننامەیەکی تایبەتییان بۆ دامەزراندن و ڕاگەیاندنی بەرزە دەرنەکرد، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت نامیلکەیەکی تایبەتیی بە ناونیشانی " مەنتیقی سەردەم و مەنتیقی گەشەکردنی کۆمەڵ" گەڵاڵە کرا و نووسرایەوە لەلایەن نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا، کە لەڕاستیدا هێڵە سەرەکییەکانی بەرنامەی لەخۆ گرتبوو و بوو بە ناسنامەی سەرەکی بەرزە.

بەدوای ئەوە ساڵی (١٩٨٣)دا گۆڤاری "ڕێبازی زەحمەتکێشان"یان دەکرد، کە تا سەرەتای ساڵی (١٩٨٥) وابزانم سێ ژمارەی لێدەرچوو. پێم وایە، ژمارەی دووەمیان تایبەت بوو بە مەسەلەی مافی بڕیاردانی چارەنووس و مەسەلەی ڕێکخراوی سەرتاسەری (عێراق) و کوردستانی و پەیوەندیی پاشکۆیەتی و ژێر دەستەیی قەومی و ئەگەرو ڕێگاکانی چارەسەری مەسەلەی قەومی لە عێراقدا. بێگومان پێشتریش چ لە شێوەی ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکاندا و چ ئەو کاتەی ناوی بەرزەیان لە خۆیان نا، لە بۆنە کرێکارییەکاندا، هەروەتر لەگەڵ ڕووداوە گشتییەکاندا بەیاننامەیان چ بۆ هەڵوێست نواندن، یان بۆ هاندان بووبێت، دەرکردووە. زۆربەی ئەوانەش لە بازنەیەکی تەسکی ناوخۆیان، یان دەرەوەی خۆیاندا دەبینران و دەخوێندرانەوەو دەستاودەستیان پێدەکرا.

لەلایەکی دیکەوە هەر لە ساڵی (١٩٨٥)دا لەسەر پێشنیاری نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا، خالید مەجید (ناسراو بە دکتۆر خالید) کە کادرێکی هەرە چالاکی بەرزە بوو، لەسەر ئاستی شاری کەرکووکدا دەستپێشخەری بۆ دەرکردنی بڵاوکراوە یان گۆڤارێکی ناوخۆیی بە ناوی " هەنگاوە"وە کرد، کە تایبەت بە ئەندامانی بەرزە بوو. هەر هاوڕێیەك بابەت و بیروبۆچوونی خۆی هەبووایە، لە وێدا بڵاو دەکرایەوە. ئەو بڵاوکراوەیە ڕەنگدانەوەی دیموکراسییەکی ناوخۆیی بوو، کە تا ئەو دەمە نموونەی نەبوو. ئەگەرچی بەناکامیش مایەوەو پاشان بە بێدەنگی هەر وەکوو چۆن بەرزە هەڵوەشایەوە، هەڵوەشایەوە.

با ئەوە بڵێین، کە بەهۆی ئاشکرابوونی کۆمیتەی ئاگری سەر بە کۆمەڵە لە کەرکوك و گرتنی پتر لە (٧٠) کەسیان لە کەرکووك و هەولێر لە مانگی (تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٨١) دا، بەرزەشی ناچار کرد (بەهۆی پەیوەندییە کۆنەکانەوە)، کە شار بەجێبهێڵێن. سەباح حەسەن بەلایەکداو هۆشیار عەبدولخالق بەلایەکی ترداو حوسێن سێودین بە هەمان شێوە. نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا و سەباح مەحموودو خالید بەلایەکی تردا. گۆشادو کەسانی تر لە هەولێرەوە... بە پەرتەوازەیی نیمچە ئاشبەتاڵێکیان لێ کردو هەموو پەیوەندییەکان بۆ ماوەی پتر لە ساڵێك هەڵوەشانەوە.

جا لەو دەورەیەدا بوو، واتە لە ساڵانی نێوان (١٩٨١ - ١٩٨٢) دا لە بڵاوکراوەی " کۆمەڵە" گۆڤاری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی

کوردستاناندا، نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا چەند وتارێکی بڵاوکردەوە، کە سەرەنجی زۆر کەسی بۆ خۆی ڕاکیشا بوو. ئیتر هەر لەوێشەوە ناوی "عێراقچی"ی بەسەردا بڕی.
هەر لەو کاتەشدا لەنێوزەنگ لەگەڵ هەندێك لە برادەرانی کارگەران ئاشنایەتی پەیدا کرد، لەوانە، ساڵحی مەلا دەڵگەیی (نادر عەبدولحەمید)، ئاسۆی کەریم زەند، ڕێبوار، ئەڵوەند خانەقینی، عەفان عوسمان... هتد. لە هەمان کاتدا ئاشنایەتی لەگەڵ کۆمەڵەی ئێراندا پەیدا کردو لە بەهاری ساڵی (١٩٨٢)دا لەگەڵ سەباح مەحموود دا، بەسەردان بۆ ناوەندیی کۆمەڵەی زەحەتکێشان چوون و چەند ڕۆژێك لەوێ مانەوەو چەند جارێك کۆبوونەوەیان لەگەڵ دکتۆر جەعفەری شەفیعی، فاروقی بابەمیری، عومەری ئێلخانیزادە، ئیبراهیمی عەلیزاد دەکرد. لەو دەمەدا ئەوان لەگەڵ سازمانی یەکێتیی تێکۆشەرانی کۆمۆنیستدا پەیوەندییەکانیان زۆر چووبووە پێشەوەو "پرۆژەی بەرنامەی کۆمۆنیستی" یان نووسیبووەوە. کۆپییەکیان لەو بەرنامەیە لەگەڵ خۆیاندا هێنایەوە، کە لەسەر داوای نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا، ئازاد هەورامی بۆ کوردی وەریگێڕا. بۆ بەرزەش شتێکی زۆر تازە بوو، کە لەسەر بناغەی بەرنامەیەکی کۆمۆنیستی ناسنامەی چینایەتی و ڕێکخراوەیی ڕێکخراوێك دیاری بکرێت و سەرخەتی گشتی و ڕەخنەی مارکسیستی لە سیستەمی کۆمەڵایەتیی مەوجوود بەیان بکرێت.
لەم بارەیەوە نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا دەڵێت:- (ئێمە لە "نێوزەنگ"دا پێنج کەس بووین و نزیکەی دوو هەفتە جارێك بە نهێنی کۆبوونەوەی خۆمان دەکرد، هەر زوو کەوتینە ژێر کاریگەریی بۆچوونەکانی یەکێتیی تێکۆشەرانی کۆمۆنیستەوەو لەوێوە ئاشنایەتیمان لەگەڵ چەمکی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ پەیدا کرد، هەر لەو کاتەشەوە ساخکردنەوەی ناسنامەی چینایەتیی ڕێکخراوێکی چەپی مارکسیستی، هەروەتر مەرجی کۆبوونەوەی گرووپ و دەستەو تاقمە چەپەکان لە دەوری بەرنامەیەکی لەو چەشنە کەوتە بەرنامەی کارمانەوە. ئەم باسانەمان لەگەڵ هەندێ لە برادەرانی کارگەرانیش لە گوندی تووژەڵە هێنایە پێشەوە، بەڵام بێ سوود بوو).
خۆپێشاندانەکانی بەهاری ساڵی (١٩٨٢) (کە بەحەق بەیاننامەی دەسپێکردنەکەی لە "قەڵادزێ"وە لەلایەن " ساڵحی مەلا دەڵگەیی"یەوە نووسرابوو، کە پێش بڵاوکردنەوەی لە ئێزگەوە پێشانیدام و قسەمان لەبارەیەوە کرد) بووە دەرفەتێك بۆ کارگەران بۆ بڵاوکردنەوەی زنجیرەیەك لە بەیاننامەی هاندەرانە بەناو خەڵکدا. من پێنج یان شەش بەیاننامەم لەوانە لەنێوزەنگ پێ گەیشت. دەستبەجێ لە گەرماوگەرمی ڕووداوەکاندا وتارێکی دوورودرێژم لەسەر ئەو بەیاننامانە نووسی و بە دوو تەوەرە ڕەخنەم لێگرتن، یەکەم: ناوەڕۆکی سەندیکالیستیی بۆ چوونەکانیان. دووەم: هەندێك مەیلی سێ جیهانی کە لەوێدا هەستیان پێ دەکرا. بەڵام ئەو ڕەخنانە بوونە هۆی ئەوەی، ئەو برادەرانە زیاتر بە چاوی نەیارێکەوە تەماشام بکەن.
ئەو هاوینە سەردانی سەباح حەسەنم لە گوندی قەمچووغە کرد (وابزانم، عەدنان کەریمیش ئەو دەمە لەوێ بوو). بیروبۆچوونە نوێکانم هێنایە بەرباس، بەڵام سەباح تەقەی سەری ئەهات و بۆی قووت نەچوو!
هەر لەو ماوەیەدا لە ڕێگای چەند نامەیەکەوە پەیوەندیم لەگەڵ هەندێ برادەری ناوشارەکان دروست کردەوەو بیربۆچوونە تازەکانم لە بارەی خەباتی بەرنامەیی و مارکسیزمی شۆڕشگێڕ بۆیان نووسی.
لە هاوینی ساڵی (١٩٨٤)دا هەوڵیان دا، کە یەکەمین کۆبوونەوەی فراوانی جیدی ڕێکبخەن. ئەو کۆبوونەوەیەیان لە گوندی " ئێلینجاخ"ی دەشتی کۆیە گرت. کە (٩) کەس لە شارەکانی کەرکووك، سلێمانی و هەولێر بەشدارییان تێدا کرد. کۆبوونەوەکەیان دوو ڕۆژی خایاندو بڕیاریان لەسەر چەند مەسەلەیەك دا:
١- جەختکردنەوە لەسەر تێزی ساخکردنەوەی بەرنامەی کۆمۆنیستی وەك بناغەی لێکنزیکبوونەوەی گرووپە چەپەکان و پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیست.
٢- بڕیاری دەرکردنی ئۆرگان یان گۆڤارێکی فیکری.
٣- پەیوەندیکردن بە گرووپە چەپەکانەوە.
٤- جەخت لەسەر ئەوە کرایەوە، کە کەمتر خۆیان بە چەپی باوی پیشەییەوە خەریك بکەن و هەوڵبدەن بچنە ناو خەڵك و ناو کرێکاران و ڕێکیان بخەن.
٥- گەڵاڵەکردنی هەیکەلێك بۆ بەرزە، بێ ئەوەی دەستەیەك بۆ سەرپەرشتیکردن (وەك ڕابەرایەتییەك)ی بەرزە دیاری بکرێت. کێشەکە بریتی بوو لە نەبوونی کادری ڕابەرایەتی.
سەرەنجام ئەو گۆڤارەش کە دەریان ئەکرد، واتە، ڕێبازی زەحمەتکێشان هەر بەتەنها نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا دەری دەکردو یەك حەرف لەلایەن هیچ کەسێکەوە نەنووسرایەوە. لە ماوەی ساڵێکدا (تا هاوینی ساڵی ١٩٨٥) سێ ژمارەی لێ دەرچوو.
ڕەخنە لە پۆپۆلیزم لەنێو بزووتنەوەی چەپ (بە بەرزەشەوە)، پێداگرتن لەسەر مارکسیزمی شۆڕشگێڕو بایەخ بۆ ڕۆڵی فیکری و عەمەلیی بەرنامەی کۆمۆنیستی، تەوەرەی قسەو باسەکانی ئەو ساڵانە بوون.
نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا دەڵێت:- (سەرەتا با لەوێوە دەستپێبکەم، لە هاوینی ساڵی (١٩٨٤)دا بوو، ژمارەیەك لە برادەرانی کارگەران لەلایەن ڕژێمەوە دەستگیر کران و ناوی من، سەباح مەحموودو هۆشیار عەبدولخالقیش لەلایەن ئەڵوەند خانەقینی (کە بەداخەوە دوایی لە سێدارەدرا) دراو جارێکی تر بەر شاڵاوی ڕاوەدوونان کەوتینەوە. سەباح مەحموود دەستگیر کرا، هۆشیار بەرەو ئێران ڕۆیشت، منیش بە نهێنی لە دەشتی کۆیەو ناوشوان تا نەورۆزی ساڵی (١٩٨٥) مامەوە. پەیوەندییەکانمان دیسانەوە ساردو سڕ بوونەوە).
دوای ئەوە و لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٥)دا بوو، ڕێکخراوی یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستیم لەو چادرەوە ڕاگەیاندو بیرو بۆچوون و نووسراوەکانم بە دکتۆر خالید دا لای کەسە سەرەکییەکان ئەڵقەو شانە کۆنەکانی بەرزە کرد. لەوێدا مەسەلەکان هەر بەڕووکەش گۆڕانیان بەسەردا هات، بەڵام

شێوەکاری ئەڵقەیی هەر وەك خۆی مایەوەو سێ بارە بووەوە. من لەوێوە چیتر بڕوام (لەناخی خۆمدا) بە توانای ئەو برادەرانەو ئەو شێوەکارە ڕۆشنفکرییە ئەڵقەییە کە چەپەکان لە شیوێکداو چینی کرێکاریش لە شیوێکی مەریخیدا بێت، ئەما ئیتر کۆڵم داو بۆ ئەو گوندانەی دیوی مەرزی ئێران (لای بانە) گواستمەوەو ساڵێکیشم لەوێ گوزەراند.

دیار بوو، بەشێك لەو برادەرانە (بەتایبەتی لە کەرکووك) هەر بەناوی یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستییەوە درێژەیان بە کارەکانیان دابوو. لە بەهاری ساڵی (١٩٧٨)دا نوێنەرێکیان بەناوی (نەسرەدین) بۆلام نارد، تاوەکو قسەو باس‌و گیروگرفتەکانی خۆیان بەمن بگەیەنن. ئەگەرچی من نەسرەدینم هەر لە منداڵییەوە دەناسی، بەڵام نەمزانی بوو، کە بەرزەو پاشان یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستی بووە، نەسرەدین هۆشیارانە قسەی دەکرد. بێ هیوایی خۆمم لە بەرامبەر ئەو چەپە ڕۆشنفکرییە دەربڕی‌و ڕاشکاوانە خوازیاری ئەوە بووم، هەمووی هەڵوەشێتەوە. من نەمدەتوانی جووڵانەوەیەکی کرێکاری دروست بکەم بۆ ئەوەی جووڵانەوەی کۆمۆنیستی واتای عەمەلی‌و ڕاستەقینە پەیدا بکات.

لە هاوینی ساڵی (١٩٨٧)دا بەنهێنی‌و بەیارمەتی دکتۆر ئەکرەم‌و مەمەند چاوشین هاتمە ناو شاری ڕانیە. لە ماوەیەکی کورتدا زەمینەی کۆبوونەویەکمان لە کەرکووك ڕێکخست‌و منیش لە ڕانییەوە بۆ کەرکووك چووم. شەش یان حەوت کەسی سەرەکی ئامادە بوون‌و کۆبوونەوەکە دوو ڕۆژ درێژەی کێشا. ئەو برادەرانە لەنێو خۆیاندا زۆر ناکۆك بوون. قەناعەتم بە هەموویان هێنا (یەك دەنگ نەبێت، کە دژی بڕیارەکە بوو)، کە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستی بدەین. نووسینی ڕاپۆرتی هەڵوەشاندنەوەکە بە من سپێردرا. منیش پاش گەڕانەوەم بۆ شاری ڕانیە لە دیدێکی ڕەخنەگرانەوە ڕاپۆرتەکەم نووسییەوەوبانگەوازی ئەوەشی بۆ گرووپە چەپەکانی تر تێدا بوو، کە ئەوانیش هەمان هەنگاو بنێن. ئەمەش بەبێ ئەوەی ئەڵتەر ناتیڤێکی دیکەم خستبێتە بەرچاو. ئیتر بەو جۆرە ئاشبەتاڵمان لێی کرد.

دیارە هەندێك لەو برادەرانە درێژەیان بە کاری ئەڵقەیی دابوو، بەڵام هیچێکی ئەوتۆ نەبوو.

زۆری پێ ناچێت، کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە ئەبەستری‌و محەمەدیش بەشداری تێدا دەکات. پاشان بەهۆی ناکۆکیی فکرییەوە واز لە کۆمەڵە دەهێنێت.

لە دوای گفتوگۆکانی ساڵی (١٩٨٤)ی نێوان (ی. ن. ك) و ڕژێمی عێراق، شەهید محەمەد دێتە ڕیزەکانی بەرزەوەو دەبێتە هەڵسووڕاوێکی چالاکی ئەو ڕێکخراوە. پاشان دوای هەڵوەشاندەوەی بەرزەو دامەزراندنی یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستی، درێژە بە تێکۆشانی خۆی ئەدا. کۆبوونەوەی فراوانی کادیرە سەرەکییەکانی کەرکووکی یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستی لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٨٧)دا لە ماڵی شەهید محەمەد لە کەرکووك ئەنجام درا، کە لەوێدا بە زۆرینەی دەنگ بڕیار درا، ئەو ڕێکخراوە هەڵوەشێنرێتەوە.

لە ڕاپەڕینی (١٩٩١)دا لە بزووتنەوەی شووراکاندا بەشدار بوو. لە ڕووداوەکانی (٣١ی ئابی ساڵی ١٩٩٦) شەهید محەمەد لەلایەن هێزی سەربازی‌و هەواڵگری عێراقەوە لە شاری هەولێر دەگیرێ‌و پاشان سزای زیندانی بەسەردا دەدرێت‌و ڕەوانەی ئەبوو غرێب دەکرێت. دوای ئەوە جۆری حوکمەکەی دەگۆڕن‌و هەر لەوێ لەسێدارەدان دەکرێت.

ئەوەی شایانی باسە، ماڵی ناوبراو چ لە کەرکووك‌و چ لە هەولێر لە نیوەی دووەمی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا هەمیشە پەناگەی حەشاردانی خەڵکانی چەپ بووە، کە مەرج نەبووە بەرزە بووبن.

١- سالار کەریم: برای د. نەجمەدین کەریمەو ئێستا نیشتەجێی ئەمریکایە.

٢- تاهیر ڕەحیم (دکتۆر تاهیر): کارمەندی تەندروستی بوو، ئێستا نیشتەجێی ئەڵمانیایە.

٣- نورەدین شێخ عەبدلواحێد: ناسراو بە حەمە ڕەش‌و پێشمەرگەی دێرین لە ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) دا.

٤- کەمال ئەمین: پێشمەرگەی دێرین‌و ئێستا نیشتەجێی شاری کەرکووکە.

نەجمەدین عەبدلقادر: ناسراو بە کاکە سوورو ئێستا نیشتەجێی سوێدە.

٥- ئەحمەد شۆڕیجەیی: کارمەندی تەندروستی بوو. لە ئەڵقە ڕۆشنبیرییە سەرەتاییەکانەوە بەشدار بووە.

٦- سەید قادر سەید مستەفا: ناسراو بە قادر ئاڵتوونچی تێکۆشەرێکی دێرینی ئەڵقە چەپەکانی شاری کەرکووك‌و هەڵسووڕاوێکی بەرزەو یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستی بوو. لەگەڵ د. خالیددا بەشداری چالاکانەی هەبوو لە ڕەخنەگرتن لە چەپی" حیرفەیی" بە (بەرزە)شەوەو لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی بەرزەو دامەزراندنی یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستیدا بوون. ئێستا کارگێڕی بەشی پەیوەندییەکانە لە مەڵبەندی دووی (ی.ن.ك) لە کەرکووك.

٧- شەهید عوسمان عەلی: کرێکاری بیناسازی بوو، لە ڕێگای د. خالیدەوە لە بەرزەو پاشان لە یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستیدا ڕێکخراو بوو. شەهید عوسمان لەلایەن حکوومەتی بەعسەوە بە تۆمەتی فیراری لە سەربازی دەستگیر دەکرێ‌و لە ڕۆژی ١٣ی کانوونی دووەمی ساڵی١٩٨٦دا شەهید دەکرێ. شەهیدی ناوبراو زۆر قارەمانانە پێش گوللەبارانکردنی هوتاف لە دژی ڕژێمی بەعس دەکێشا.

٨- نەسرەدین کەریم: ناسراو بە نەسر یان کەمال‌و ئێستا نیشتەجێی سویسرایە.

٩- جەمال مەحموود: (پ.م)ی دێرین‌و خەڵکی کەرکووك بوو، بەڵام دانیشتووی سلێمانی بوو، پەیوەندی بە هاوڕێیانی سلێمانییەوە هەبوو. ئێستا دانیشتووی کەنەدایە.

١٠- ئەحمەد (برای سۆرانی گەرمیان).

١١- شەهید ئازاد فەقێ عەبدوڵا.

١٢- مەلا ناسیح تۆماری: ناوبراو تێکۆشەرێکی سەرەتاکانی کۆمەڵەی مارکسیی لێنینی بوو. لە ڕێگای عوبێد خالیدەوە

پەیوەندی بە بەرزەوە کردبوو. لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو، بە نەخۆشی شێرپەنجە لە شارۆچکەی تەقتەق کۆچی دوایی کرد.

*** کرێکارانی کۆمۆنیست - هەستەی کرێکارانی سۆسیالیست و سەرنجی کرێکار:-**

"کرێکارانی کۆمۆنیست" یەکێکە لەو گرووپە کۆمۆنیستییانەی دەیەی هەشتاکانی سەدەی رابردوو، کە چەند ساڵێك کارو هەڵسووڕانی هەبووەو لێکدانەوەو تێڕوانینی خۆی لەو دەمەدا بۆ خەبات و کاری کۆمۆنیستی هەبووە. ئەم گرووپە سەرەنجام هەڵدەوەشێتەوەو بەشێك لە بنیاتنەرانی بەشداری پێکهێنانی "هەستەی کرێکارانی" دەکەن.

کرێکارانی کۆمۆنیست" ناوی گۆڤارەکەیان بوو، کە (٣) ژمارەی لێ دەرچوو. باسەکانیان دەرباری گرفتەکانی بزووتنەوەی چەپ و رەخنە لە گرووپەکانی ئەو دەمە بوو. سەبارەت بە مەسەلەی میللی و ماڤ چارەنووس لە کوردستان و سیاسەتەکانی بەعس و رووداوە سیاسییەکانی عێراق و کوردستان و یەکی ئەیار.

ئەندامانی هەستە لە سێ شاری سلێمانی، هەولێر، کەرکوك هەبوون و لە رانیە، قەڵادزێ و شارۆچکەکانی دیکەش هەبوون. ئەم گرووپە دەستەیەکی دامەزرێنەری فراوانی هەبوو، کە ئەمانە بوون:- خەسرەو سایە، موزەفەر عەبدوڵا، وەستا جەلال، سامان کەریم، شەماڵ عەلی، عەبدوڵا مەحموود، شوان، مامۆستا محەمەد، ئەکرەم میهرداد و ئاسۆ کەمال.

جیاوازییەك کە هەستە لەگەڵ کرێکارانی کۆمۆنیستدا هەیبوو، ئەوە بوو، کە هەستە بەرهەمی بەشداریی کۆمۆنیستەکان لە لەراپەرینێك و بزووتنەوەیەکی شوورابیدا بوو. بزووتنەوەیەکی جەماوەرییان بەرێخستبوو، شووڕای چەکداریان دروست کردبوو، رابەرانی عەلەنیی بزاوتێك بوون، کە دژ بە ناسیۆنالیزم لە مەیداندا بوو. رێپێوانی هەزاران کەسیان بەرێ خستبوو، بەردەرگایان بە بەرەی کوردستانی گرتبوو، شەری بەعسیان کردبووو شەهیدیان دابوو. لەگەڵ کۆمۆنیستەکانی تر لەدەوری بەرنامەیەکی عەمەلی و سیاسی کۆبوونەتەوە. هێزێکیان لە سێ شار و چەند شارۆچکەیەکدا هەبوو. چالاکیی سیاسییان دەکرد و دوای هاتنەوەشیان بۆ ناو شارەکان هەواڵنامەی هەستەیان دەردەکرد. ئەمانە جیاوازیی گەورە بوون، نەك لەگەڵ کرێکارانی کۆمۆنیست، بەڵکوو لەگەڵ رەوتی کۆمۆنیست و هەموو گرووپەکانی تریشدا.

هەڵوەشاندنەوەی هەستە بەرهەمی ئەو سەرلێشێواوی و ئامانجە سەرابییەی ئەم بەشە لە بنیاتنەرانی بزووتنەوەی شوورایی و کۆمۆنیستە کاراو جەماوەرییەکان بوو. لە جێگای بردنی چەپ لە هەستەوە بەرەو حیزبی سیاسی و دەخاڵەتگەری کۆمەڵایەتیی زیاتر و سوودوەرگرتن لە فرسەتی نەبوونی حکوومەت و دەسەڵات لە کوردستان بە هۆی کشانەوەی بەعس لە شارەکاندا، کەچی وەکو چەپ بەرەو دواوە گەڕاینەوە.

هەڵوەشاندنەوەی هەستە یەکێك لەو گەڕانەوە بەرەو دواوەی چەپ بوو، کە لە رێکخراوەکانی تری چەپدا بە پێداچوونەوەی ناوەرۆکی هەڵسووڕانی دەورانی شووراکانیان و گەڕانەوە بۆ قاڵبی پێشووی فەعالییەت و نەریتی کاری مەحفەلی تەواو بوو.

*** گرووپی پرۆژەی نووسینەوەی بەرنامە :-**

گرووپی پرۆژەی نووسینەوەی بەرنامە" کە بە کورتکراوەیی بە پرۆژە دەناسرا" یەکێك بوو لەو گرووپە چەپ و کۆمۆنیستییانەی کۆتایی هەشتاکانی سەدەی گەورەی لە بەهێزکردنی ئەو رێکخراوەکانی هەبووە.

بیرۆکەی پرۆژەی نووسینەوەی بەرنامە دەگەرێتەوە بۆ ساڵی (١٩٨٦)ئەوکات لەنێو رۆشنفکران و بە تایبەت قوتابییانی زانکۆکاندا قسەو باس و گرووپی جیاجیا لە ئارادا بوون. لەو سەردەمەداو لەرووی ژمارەی کادرەوە پرۆژە یەکێك لە مەحفەلە گەورەکانی چەپی کوردستان بوو.

زەمینەی بابەتیی دروستبوونی ئەم مەحفەلە بەند بوو بە بوونی بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کوردستان بە هەموو دیاردەکانییەوەو بوونی نیزامێکی دیکتاتۆریی ناسیۆنالیستیی عەرەبی. هەروەها بوونی جۆرەها گرووپ و ئەحزابی ناسیۆنالیستی لە دەرەوە (شاخ). سەرەرای ئەمانەش بوونی کۆمەڵی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران و سەرهەڵدانی مارکسیزمی شۆرشگێر، وەك شۆرشگێرترین تیۆریی شۆرش لەو سەردەمە لە ناوچەکەدا. دامەزرێنەرانی سەرەتایی پرۆژە بریتی بوون لە: د. کامران ئەمین، د. ئەمین عوسمان، ئاوات سەعید (د.سامان) و کاك ماجید.

یەکێك لە هۆکارەکانی تەشەنەکردنی پرۆژە بە بروای ئەندامانی بەهێزیی پایەگای کۆمەڵایەتی و کەسایەتیی کادیرانی پرۆژەو بوونی تۆرێکی کۆمەڵایەتی لە دەورووبەریان بوو. ئەمە سەرباری ئەوەی، هاورێیانی پرۆژە لە چەندین شاری جیاوازی وەکوو سلێمانی کەرکوك و ئاکرێوە هاتبوون، کە ئەویش بە خۆی کاریگەری لەسەر فراوانبوونەوەی پرۆژەدا هەبوو.

لە رووی کاری عەمەلیی سازماندیییەوە، پرۆژە بەبێ ئەوەی کە پەیرەوێکی ناخۆی هەبێ، زۆر بە بەرفراوانی پەرەی سەند و دەتوانین بڵێین، چەند قاتی مەحفەلەکانی تر لەوانە رەوتی کۆمۆنیست.

پەیوەندیی هاورییان لەنێو پرۆژەدا لە شێوەی رێکخستنی تەسبیحیدا بوون، بەڵام لە هەندێك جێگا شانەی دوو - سێ کەسیشیان هەبوو.

لە رووی تەشکیلاتییەوە، پرۆژە کادرو لایەنگرانی زۆری لە شارە جۆراو جۆرەکاندا هەبوو، لەوانە: سلێمانی و دەورووبەری چەمچەماڵ، کەرکوك، لەیلان، دووزخورماتوو، هەولێر، دهۆك، ئاکرێ، مووسڵ و بەغدا.

سەرەرای باری ئەمنی ئەوسای کوردستان، دیارە کادیرانی بزووتنەوەی چەپ ئاشنایی و تەماسیان بەیەکەوە هەبوو. نزیکایەتیی ئێمە لەگەڵ هاورێیانی رەوتدا لە کەرکوك و سلێمانی بوو. دیارە د. ئەمین عوسمان لە کەرکوك

پەیوەندیی لەگەڵ سادق عەزیزو لە سلێمانیش د. کامەران پەیوەندیی لەگەڵ ئاوات سەعید هەبوو. دوای دانوستانێکی زۆر هەردوولا بەو قەناعەتە گەیشتن، کە یەك بگرن. دیارە بەهۆی ئەو سیکتاریزمو ئەزموونەی کە لەنێو ڕەوتدا هەبوو، لە ڕووی تەشکیلاتییەوە گۆڕانکارییەکی گەورە نەهاتە ئاراوە. ئەوەبوو، کە ئێمە وەك پرۆژە لەناو ڕەوتدا توانەوەو هێڵەکانی ڕێکخستنیش بەپێی ناوچەکان تێکەڵ بەیەك کران. لەراستیدا لەنێوان ئەوان و ڕەوتدا جیاوازیی فیکری یان هەر ناکۆکییەکی تری ئەوتۆ لە ئارادا نەبوو.

کاریگەرییان بەسەر ڕەوتدا: بە حوکمی زۆریی کادیرانی پرۆژە، کە چەندین جار لە ژمارەی کادیرانی ڕەوت زیاتر دەبوون، هەروەها بەهۆی بوونیان لە زۆربەی شارو شارۆچکەکاندا، کاتێك کە هاتنە ناو ڕەوتەوە، لە ڕووی عەمەلییەوە تەوژمێکی گەورەیان بە ڕەوتو بزووتنەوەکەش دا، بە تایبەتی بەر لە ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی(١٩٩١) لە ڕووی بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەو پەیداکردنی چەك. بۆ نموونە، یەکەم شانەی چەکداری ئامادەبەکار لە زستانی ساڵی (١٩٩٠) لەلایەن هاوڕێیانی کۆنی پرۆژەوە لە شاری کەرکووك دامەزرێنرا. دیارە هەموویان ئەو ڕاستییەش دەزانن، کە بەشی ئاشکرا ڕەوتی کۆمۆنیست کە تەنها ڕووی ئاشکرای بزووتنەوەی چەپی عێراق بوو، زۆربەی زۆری کادیرانی پرۆژە بوون. لەوانە بارەگاکانی سلێمانی، کەرکووكو ئاکرێ، دواییش هەڵەبجەو ڕانیە. هەروەها بۆ یەکەمین جار ڕۆژنامەیەکی چەپی وەکو "بۆپێشەوە" (کە تا ئەو دەمە بە کۆپیو قەبارەی بچووك دەرئەکرا) لە دەزگای چاپەمەنی گەورەو بە تیراژێکی یەکجار زۆر بڵاوکرایەوە، کە ئەو سەردەمە وەك دەسکەوتێکی مێژووی سەیر دەکرا، هاوڕێ ئاوات سەعید سەرنووسەرو د. ئەمین عوسمان، خاوەنی ئیمتیازی بوون، کە دیسانەوە هەردووکیان لە کادیرانی کۆنی پرۆژە بوون.

*** کۆمەڵەی تێکۆشەرانی کۆمۆنیست - کۆتك:-**

"کۆمەڵەی تێکۆشەرانی کۆمۆنیست" کە کورتکراوەی ناوەکەی "کۆتك" بوو یەکێك بوو لەو کۆڕو کۆمەڵە کۆمۆنیستە چوستو چالاکانەی نیوەی دووەمی دەیەی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو. کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەنێو بزووتنەوەی چەپو کۆمۆنیستی لە کوردستان ڕۆڵو کاریگەریی هەبووە.

کۆتك ڕێکخراوێکی چکۆلە بوو، ناوی تەواوی "کۆمەڵەی تێکۆشەرانی کۆمۆنیست" بوو لە ساڵی (١٩٨٧)دا بە شێوەی ڕاستەوخۆ سالار ڕەشیدو ڕەحمان داوودو ڕێبوار ئەحمەد دایانمەزراند. بەڵام کەسانو کۆڕو کۆمەڵی دیکەشمان لەگەڵدا بوون. ئەم ڕێکخراوە ئۆرگانێکی بە ناوی " ئاسۆی سۆسیالیزم" دەردەکردو پێم وابێت سێ یان چوار ژمارەو یەك پاشکۆیەکی لێ دەرچوو. هەر ئەم سێ کەسەش نووسەرانی ئەسڵی ئۆرگانەکە بوون. ئەگەر هاوڕێی تریش نووسینی لە ئۆرگانەکە بلاو کردبێتەوە. بڵاوکراوەکە هەر بە خەتی دەستیی هاوڕێ سالار دەنووسرایەوە. هەر کات وەختی دەرکردنی ژمارەی تازە بهاتایە بەرەوە، چەند شەوێك ڕێبوار ئەحمەد و سالار نەدەخەوتن، بەڵکو بەڕۆژ دەخەوتنو بەشەو ئۆرگانەکەیان ئامادە دەکرد. نووسراوەکان کە پێشتر ئامادەیان دەکرد، لە ماوەی ئەو چەند شەوەدا ڕێبوار دەیخوێندەوەو سالاریش بە خەتێکی جوانو بە زەحمەتێکی زۆر لەسەر کاغەزی رایز دەینووسییەوەو لەگەڵ نوسخەی ئەسڵیدا هەشت نوسخەی بە جارێك دەردەکرد.

پاشان هاوڕێمان شلێر ڕەشید (خوشکی سالار ڕەشیدەو ئێستا لە کەنەدایە)، کە ئەو کاتە لە زانکۆی سەلاحەدین لە شاری هەولێر خوێندکاری کۆلێجی ئاداب بەشی کوردی بوو، لاپەڕەکانی ئۆرگانەکەی تێکەڵ بە لاپەڕەی محازەرەکانی زانکۆ دەکردو لە دوکانی ئیستینسناخێك بە ناوی عاسف، لە نزیك پارێزگای هەولێر، کە کابرایەکی مەسیحیی بە تەمەنی بەڕێزو فەقیر کاری لەسەر دەکرد، هەر بەناوی کۆپیکردنی محازەرەی هەموو پۆلەکەیانەوە، (٢٠) نوسخەی لێ کۆپی دەکردو تازە بە هەرزانیش بۆی دەکرد، چونکە پارەی جوملەی لێ وەردەگرتن. سەختترینو پرمەترسیترین کاریان ئەم کۆپیکردنەی ئۆرگانەکەیان لای عاسف بوو. ئەو کاتە ئەمە کارێکی لە لە ئەندازە بەدەر خەتەر بوو، لەسەر ئەم کارە ئەگەر کەسێك بگیرایە، مەترسی گەورەی لەسێدارەدانی لەسەر بوو. بۆیە لەو ساتەوە کە شلێر ئۆرگانەکەی بۆ کۆپیکردن دەبرد، ئێمە لە نائارامییەکی زۆردا بووین، کە نزیکەی (٢) سەعاتێکی پێ دەچوو، چونکە دەزگای کۆپیی ئەو کاتە وەکو برنەو کاری دەکرد، تا دەتهێنایە سەر پێیو نوسخەیەکت دەردەکرد، گرفتی تیا دروست دەبوو، زۆر جاریش خەڵکی تر بۆ کۆپیکردن دەهاتنو ناچار ئەبوو، ڕێگەی پێ بدەیت، تا ئەو تەواو بێتو بڕوا. بە هەرحاڵ ئەو ماوەی (٢) سەعاتە ڕێبوار و سالار دڵیان لە مشتیاندا بووە، وە بۆ ئەوەی چاودێری کارەکەی شلێر بکەین، هەر یەکەیان لە سەرێکی ئەو کۆڵانە، کە دوکانەکەی عاسفی لێ بوو، ڕادەوەستان.

پاش ئەوەی شلێر کاری خۆی تەواو دەکرد، لاپەڕە کۆپیکراوەکانی دەدا بە ئەوان دیسان ئەوەش پرمەترسی بوو، کە ئەو هەموو کاغەزە بگەیەنێنە ئەو شوقەیەی کە لە کۆتایی جادەی دکتۆرەکانی هەولێر بەکرێیان گرتبوو. ئەو کاتە لەناو جادەوباندا هەمیشە لە بەردەم خەتەری ئەوەدا بووی، یەخەت بگرنو داوای ناسنامەت لێ بکەنو بتپشکنن. سەدویەك هۆ هەبوو بۆ ئەم مەسەلەیە، خەڵکێکی زۆر لە سەربازیو زۆرێکی تر لە جەیشی شەعبی هەڵاتبوون، لەبەر ئەمە لە زانکۆ دەرکرابوون، ئەمانیش بە جۆرێك قاچاغ بوون. زۆرێکی تر لەبەر هۆی سیاسی چاودێری دەکران.

بەهەرحاڵ پاشان ڕێبوارو سالار لاپەڕەکانیان دەهێنایەوە بۆ شوقەکەو بەبێ ئەوەی هاوڕێیانێکی تر کە لە شوقەکە لەگەڵیان دەژیان پێی بزانن، لاپەڕەکانی ئۆرگانەکەیان ڕێك دەخستنو دەرزییان لێدەدان. بەم جۆرە بە نوسخە دەستنووسەکانی سالارەوە دەگەیشتە نزیکەی (٣٠) نوسخە. بۆ ئەو کاتە (٣٠) نوسخە کەم نەبوون، چونکە هەر نوسخەیەکی دەیتوانی دەیان دەست بکات. پاشان بۆ کەرکووك، سلێمانی، هەولێر،

ڕانیەو گەرمیان... دابەشیان دەکردن و دەستاودەست بڵاو دەکرانەوە.

کۆتك ڕێکخراوێکی چکۆلەو کەم خاراو بوو، بەڵام چالاك بوو. لەسەر زۆربەی مەسەلەکانی ئەو کاتە قسەی دەکرد، لەسەر ئەو مەسەلانەی کە لەنێو چەپدا جەدەلی لەسەر هەبوو، لەگەڵ ڕێکخراوەکانی تر جەدەلی دەکرد.

بەرەبەرە گەشەی دەکردو کەسانی تر پێوەی پەیوەست دەبوون. کۆڕێکی کرێکاری لە دەوری تاهیر حەسەن هەبوو، ناویان لە خۆیان نابوو، کۆمەڵەی کرێکارانی یەکی ئایار" کە لە ناو کرێکارانی چەند کارگەیەکی بچووکی سلێمانیدا کەسیان هەبوو، لە یەکی ئایاردا چالاکییان لەناو کرێکاراندا زۆربوو، وەکو، دابەشکردنی شیرینی و ئاشناکردنی کرێکاران بە مێژووی یەکی ئایارو سەیرانسازکردن بەو بۆنەیەوە... ڕێبازی فکری و سیاسیی کۆتك، کۆمۆنیزمی کرێکاری بوو. نووسراوەکانی ئەو کاتەی مەنسوور حیکمەت بۆیان بنەمابوون. ئەوەی کە چەندە لێکدانەوەکانیان، هەڵوێستە سیاسییەکانیان، بیروبۆچوونیان، پراکتیك و شێوەی کاریان، لەگەڵ کۆمۆنیزمی کرێکاری جووت دەبوو، یان نا، ئەوە مەسەلەیەکی ترە بەڵام بە تێروانینی خۆیان، پێیان وابوو، لە هەموو گرووپ و ڕێکخراوەکانی تر کۆمۆنیزمی کرێکاریترن.

دواتر کۆڕو ئەفرادی تر لە ڕانیە، کەرکوك و سلێمانی پێیانەوە پەیوەست بوون. هەر ئەو کاتە بەچاوکردن لە نەریتی ئەو کاتەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ئێران و مەنسوور حیکمەت دەستیان بەوە کرد، کە ئیمزای فەردی لە نووسراوەکانیان بدەین. ڕێبوار بە ناوی ئازاد، سالار بە ناوی هیواو ڕەحمان بە ناوی وریا، دەیاننووسی. ڕەحمان لە نووسین بۆ گۆڤارەکە زۆر چالاك نەبوو، بەتایبەتیش لەسەر مەسەلەی کوردو فیدرالیزم و خودموختاری کەوتبووە کێشەوە لەگەڵیان، بۆیە زۆرتر ڕێبوار کەڵکی لە ناوەکەی ئەو وەردەگرت و بەناوی ئەوەیشەوە شتی دەنووسی، بۆ ئەوەی گۆڤارەکە قەڵەباڵغترو هەمەجۆرتر بێت.

کۆتك وەکو وتم، سنووری هەڵسوورانی بە واقیعی کوردستان بوو، بەڵام زۆر بەتوندی باوەڕی بەوە هەبوو، کە دەبێ سەرئەنجام بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و کرێکاری لەسەر ئاستی عێراق لە یەك حیزبدا ڕێکخراوو یەکگرتوو بکرێت، ئەو سەردەمە ئەمە پێی دەوترا، عێراقی و ئەمە یەکێك بوو، لە ناکۆکییە گەورەکانیان لەگەڵ ناسیۆنالیزمی چەپی کوردستان کە خۆی لە کۆمەڵەی ڕەنجدەراندا دەبینییەوە.

*** ئەڵقەی ئۆکتۆبەر:-**

ئەڵقەی ئۆکتۆبەر کە هەر بە ناوەکەیدا دیارە بە نێوی شۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزنی رووسیاوە بووە. کە ئەمەش گوزارش لە هەواداری بۆ ئەو شۆڕشەو گەڕانەوە بۆ ئەرتەدۆکسی مارکسیستی و دوورکەوتنەوە لە مارکسیزمی دەستاودەستکراو دەکات. ئەم ئەڵقەیە لە نیوەی دووەمی هەشتاکاندا پەیدا بوو، کە زۆرترین ئەڵقەو سازمانەکان لەو دەمەدا هاتنە دامەزراندن.

ئەڵقەی ئۆکتۆبەر ئەگەر بە هەڵەدا نەچین، لە کۆتایی ساڵی هەزارو نۆ سەدو هەشتاو حەوت لەلایەن جەمال ئەیووب، سالار ڕەشیدو سادق محەمەد ناسراو بە "ڕاستگۆ"ەو دامەزرا. دامەزرێنەرانی ئەم ئەڵقەیە هەموو خوێندکاری زانکۆ بوون. یان بە هۆی ڕاوەدوونانی ئەمنیی ڕژێمی بەعسەوە بە نهێنی خۆیان حەشار دابوو. بەهۆی باری ئەمنییانەوە هیچ کەسێکیان کارێکی ڕشتەییان نەدەکرد، بەڵام بەهۆی هەندێك بەڵگەنامەوە کە خۆیان بۆ خۆمانیان دروست کردبوو، بڕێك لە هاتوچۆکردن دەستئاوەڵا بوون. جەمال ئەیووب و سالار ڕەشید خەڵکی کەرکووك بوون، لە بنەڕەتدا خەڵکی کەرکووك بوو، لە بەغداد گەورە بووبوو، بەڵام بەهۆی شەهلای هاوسەرییەوە کە خەڵکی سلێمانی بوو، لە سلێمانی نیشتەجێ بوو. بەڵام ئەو دەمەی ئەو ئەڵقەیەیان پێکهێنا، هەموویان لە هەولێر لە باڵەخانەیەکدا دەژیاین، کە دەکەوتە سەر دەرمانخانەی ژێر.

*** ئەڵقەی ئەدەبیانی کۆمۆنیست:-**

نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد: یەکێك بوو لەو سێ کەسەی ئەڵقەی ئەدەبیانی کۆمۆنیستیان دامەزراند. وەك لە وەڵامەکانی مەشخەڵیشدا هاتووە، ئەمە لە ساڵی (١٩٨٧)دا بوو. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد دەڵێت:- ئێمە کۆمەڵێ گەنج بووین، کەوتبووینە ژێر کاریگەریی نووسینەکانی تەوژمە چەپ و کۆمۆنیستییەکانی ئەو کاتەوە، وەك ئێوەش دەزانن، ساتەوەختی هەفتاکان و هەشتاکان لە رووی مێژووی سیاسی و فکرییەوە ساتەوەختێك بوو، بیری چەپ و مارکسیستی برەوو بەربڵاوییەکی زۆری هەبوو. کەم نووسەرو ڕۆشنبیرو سیاسەتمەدار هەبوو، هەڵگری بیروباوەری مارکسیزم و ئەو ئاراستەیە لە بیرکردنەوەی چەپگەرایی نەبووبێ. من پێشتر لە یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بە نهێنی کارم کردبوو، لە رووی نووسینیشەوە بەر لە ئەڵقەی ئەدەبیانی کۆمۆنیست هەر بە ئاراستەی ئەدەبی پێشکەوتنخوازی دەمنووسی و بابەتم وەردەگێڕا. واتە، بەر لە ئەڵقەی ئەدەبیانی کۆمۆنیست و گۆڤاری ڕابەر ئەزموونم لە دەرکردنی دوو گۆڤاری تردا هەبوو، یەکێکیان گۆڤارێك بوو بە ناوی " ئاسۆس" کە لە ساڵانی (١٩٨٣ -١٩٨٤) لەگەڵ کۆمەڵێ لە خوێندکارانی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر دەرماندەکرد. ئەو کاتە من لەو زانکۆیە خوێندکاری بەشی عەرەبی بووم، ئەویتریشیان گۆڤارێك بوو لەگەڵ مارف عومەر گوڵ و خوالێخۆشبوو زاهیر ڕۆژبەیانی لە ساڵانی (١٩٨٤ - ١٩٨٥) بە ناوی گۆڤاری نێرگز لە کەرکووك دەرماندەکرد. دواتریش لە ساڵانی (١٩٨٧ - ١٩٨٨) لەگەڵ عەبدوڵا سلێمان و جەمال کۆشش گۆڤاری کۆمۆنیستیی ڕابەرمان دەردەکرد، کە بە دەست و بەکاربۆن دەماننووسییەوەو بەسەر ژمارەیەکی دیاریکراو لە هاوڕێکانمان بڵاومان دەکردەوە. لەوانەیە ئەمە موفارەقەو شتێکی سەیر بێت، لە ئاسۆس و نێرگزەوە بۆ ڕابەر، بەڵام من وەك وتم، لەو کاتانەشدا هەر بە ئاراستەی ئەدەبی مارکسیستی دەمنووسی و بابەتی نووسەرە مارکسیستەکانم وەردەگێڕا. بۆ نموونە، لە گۆڤاری نێرگزدا لێکۆڵینەوەیەکم

دەربارەی قوتابخانەی ئەدەبیی کلاسیزم بڵاوکردەوە. لەوێدا له دیدی مارکسیزمو بەپێی میتۆدی ماتەریالیزمی مێژوویی له ئەدەبو قۆناغی کلاسیزم ورد بوومەتەوە. بەڵام هەر ئەو کاتەش پێم وابوو، له باسکردنی ئەدەبو کۆمەڵگا، یان ئەدەبو مارکسیزم، پێویستە ئاگاداریی سیما تایبەتییەکانی ئەدەب له ڕووی ئێستاتیکاو فۆرمو ڕەگەزە هونەرییەکانی ئەدەبەوە بن. باوەڕم به هەندێ چەمکی وەك ئەدەبی پرۆلیتاری، دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریاو ڕیالیزمی سۆسیالیزم زۆر پتەو نەبوو، بەو پێیەی دەبێ ناوەڕۆکی بابەتی ئەدەبی پتر بابەتی هیومانیستی بێت، واتە، من بەو باکگراوندە ڕۆشنبیرییەوە چوومە ناو ئەڵقەی ئەدیبانی کۆمۆنیستەوە. بۆیە ماوەیەکی زۆری پێ نەچوو، لەگەڵ بۆچوونی توندی ئەو دوو هاوڕێیەدا بەریەك کەوتین. بەر لەوەی باسی ناکۆکییەکانی خۆم لەگەڵ برادەرانی ئەڵقەی ئەدیبانی کۆمۆنیست بکەم، پێویستە زۆر به کورتی باسێکی ئەو ساتەوەختانە بکەم که کورد بەگشتی ئاشکرا بکەم، به تایبەتی له سەروبەندی پرۆسترۆیکاو لاوازبوونی بلۆکی سۆڤێتیو پاشان ڕووخانی.

له دوادوایی کوردی عێراقو ئێران حیزبی بەعس له جاران دڕندانه تر کەوتە لێدانی بزووتنەوەی کوردیو داپڵۆسینی خەڵکی کوردستان، لەو کاتانەداو بەتایبەتی پاش ئەنفال، یەکێتیی نیشتمانی کوردستانو هێزە کوردییەکانی تریش به تەواوی لاواز بوونو بۆ دەرەوەی سنوورەکانی کوردستان ڕۆیشتبوون. لەو کاتانەدا ئێمە هەستمان به بۆشاییەکی سیاسیی بەرچاو دەبووایە لایەنێك یان ئاراستەیەكو ڕەوتێك هەبێت، خۆمانی پێوە گرێ بدەینو لەبەرامبەر دڕندەیی بەعس کاردانەوەمان هەبێت. تەنها لایەنێکیش له گۆڕەپانەکەدا بەفیعلیو به ئاکتیڤێکی بەرچاوەوە بوونی هەبوو، بریتی بوو، له بزووتنەوەی چەپ، بەتایبەتی تەوژمە جیاجیاکانی کۆمۆنیزمی کرێکاری که له شارەکاندا به نهێنی کاریان دەکرد، بەڵام ڕەواج و لایەنگریان زۆر بوون. من پێم وایه یەکێك لەو هۆکارانەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی تا ئەندازەیەك بەهێز کردبوو و لایەنگری زۆری بۆ پەیدا کردبوو، چۆڵیی گۆڕەپانەکە و لاوازبوونی هێزە سیاسییەکانی تر بوو، ئەمە له ڕووی سایکۆلۆجییەوە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو. باشە ئەو هەموو گەنجە نارازییەو ئەو خەڵکە بێزارو چەوسێنراوەی ژێردەستی ڕژێمێکی دڕندەی وەك بەعس چی بکەن، بۆ کوێ بچنو پەنا بۆ کێ بەرن؟! بەشێکی زۆریان خاڵیکردنەوەی ئەو خواستە شۆڕشگێڕیو لەڕاستیدا دەروونییانەیان له خۆنزیککردنەوە له بزوتنەوەی کۆمۆنیستیدا دەبینییەوە، که بەڕاشکاوی دەیڵێمو دان بەوەدا دەنێم، که من یەکێك بووم لەوانە. بۆیە لەپاش ڕاپەڕینو نەمانی حیزبی بەعس، لەلایەك هێزە سیاسییەکانی تر بووژانەوەو هاتنەوە ناو گۆڕەپانەکەو بگرە بوون به حاکمی کوردستانیش. لەلایەکی تر بزووتنەوەی کۆمۆنیستی وردەوردە بەبەراورد لەگەڵ نیوەی دووەمی هەشتاکان بەرەو خامۆشی ڕۆیشت. بێگومان لوتکەی گەشەکردنو فراوانبوونی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی له بزووتنەوەی شووراکانی سەردەمی ڕاپەڕیندا بوو، که دەیتوانی ململانێی هێزە سەرەکییەکانی کوردستان بکات، بەڵام دواتر زۆر بەخێرایی، هێزو جەماوەریبوونەکەی پاشەکشەی کردو خامۆش بووەوە.

بێگومان له نیوەی دووەمی هەشتەکانو له ساڵی (١٩٨٧)دا جەمال کۆشش (حەسەنی توببیە)، عەبدوڵا سلێمان (مەشخەڵ) و من (هۆشەنگ) گرووپێکی ئەدەبیی کۆمۆنیستیمان به ناوی ئەڵقەی ئەدیبانی کۆمۆنیست دروست کردو گۆڤارێکمان به ناوی ڕابەر دەردەکردو بەدەست دەماننووسییەوەو به کاربۆن کۆپیمان دەکرد. هەموو ژمارەیەك نزیکەی (٢٥- ٣٠) دانەمان لێ کۆپی دەکردو بەسەر هەندێ له هاوڕێکانمان دابەشمان دەکردمن ئەوسا زانکۆم تەواو کردبوو، بۆ سەربازی نەچووبوومو ناسنامەکەی زانکۆم تەزویر کردبووو هەروەك جاران بەسیفەتی خوێندکار هاتۆچۆم ئەکرد. هەر له هەولێر له گەڕەکی تەیراوە شوقەیەکمان مانگی به (١٦) دینار بەکرێ گرتبووو بەزۆری لەوێ کۆبوونەوەمان دەکرد. بەهەر شێوەیەك بووایە، مانگانە ئەو پارەیەمان کۆ دەکردەوە. یەکێك لەو کەسانەی یارمەتیی دەدایین هاوڕێ فاتیمە ئەحمەد (هاوسەری سالار ڕەشید) بوو، که له دایرەی مەبانیی کەرکووك فەرمانبەر بوو، مانگی پێنج دیناری له مووچەکەی خۆی وەك یارمەتی دەداینێ، ئەو ئەیزانی بۆ چ ئامانجێك شوقەمان بەکرێ گرتووە.

من تەنها له سێ ژمارەی گۆڤارەکەدا بەشداریم کردو دوای ئەوە بەهۆی ناکۆکییەکی قووڵەوە دەستم لەکار کێشایەوە، که له نووسینێکدا به بۆنەی کۆچی دوایی جەمیل ئەمین هەندێ لەو ناکۆکییانەم درکاندووە لێرەشدا باسیان دەکەمەوە هەر له سەرەتاوە ناکۆکییەك لەنێوماندا سەبارەت بەوەی گرووپەکەمان سەربەخۆ، یان سەر به ڕەوتی کۆمۆنیست بێت، سەری هەڵدا. بێگومان من زۆر داکۆکیم لەوە دەکرد که گرووپەکەمان سەر به هیچ حیزبو ڕەوتێکی سیاسی نەبێت، بۆ ئەوەی به ئازادی بنووسینو ڕای خۆمان دەرببڕین، بەڵام جەمال کۆشش (که درەنگ بۆم دەرکەوت، خۆی سەر به ڕەوتی کۆمۆنیست بوو) مەیلی ئەوەی هەبوو، گرووپەکە سەر به ڕەوتی کۆمۆنیست بێت. کەچی مەشخەڵ (که تا ئەو ساتەوەختە بێلایەن بوو) هەندێ جار هەمان بۆچوونی منی هەبووو هەندێ جاری تریش لایەنگری جەمال کۆشش بوو. ئەمە یەکێك له ناکۆکییەکان بوو.

ناکۆکییەکی تر ئەوە بوو، جەمال کۆشش هەندێ بابەتی بڵاو کردەوە، من پێم وابوو، زۆر توندنو کەمتر دەچنە نێو بابەتی ئەدەبو ڕەخنەی ئەدەبییەوە، به تایبەتی ئەو بابەتانەی لەسەر شێرزاد حەسەن دەینووسیو ئەو بۆچوونانەی لەسەر ڕۆمانەکانی حوسێن عارفو عەبدوڵا سەراج دەریدەبڕین. هەردوو ئەو هاوڕێیە ئەدەبی ئەو دوو ڕۆماننووسەیان به ئەدەبی بۆرژوازیو وردەبۆرژوازی وەسف دەکرد، که من نەمدەتوانی بەو چەشنە وەسفی ڕۆمان بکەم.

جگه لەمانه من له هەندێ مەسەلەی دی دوودڵ بووم، بۆ نموونه، پێداگرتن لەسەر ئەدەبی ڕیالیزمی سۆسیالیزم، یان ئەدەبی پرۆلیتاری، یان جەختکردنەوە لەسەر دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا. ئەگەرچی زۆر بەئاشکرا ئەو چەمکانەم ڕەت نه

دەکردنەوەو نەمدەوێرا، یان لە رووم نەدەهات، راستەخۆ بڵێم، دیکتاتۆریی پرۆلیتاریاو ئەدەبی پرۆلیتاری رەت دەکەمەوە.

بە هەر حاڵ دەمویست، بڵێم، مەرج نییە، ئێمە هەر هەموومان لەناو ئەو سنوورەو ئەو چوارچێوەیەدا بنووسین. سەرجەمی ئەمانە ناکۆکییەکانی ئێمەیان قووڵتر کردەوەو سەرەنجام من دەستم لەکار کێشایەوە. بابەتێکم لەسەر دەستلەکارکێشانەوەکەم نووسیو وابزانم، ئەوانیش لە ژمارەی دواتری گۆڤارەکەدا بڵاویان کردەوە. دواتر جەمال کۆشش بە وتارێك بە ناونیشانی هۆشەنگ و هۆشەنگیزم وەڵامی دامەوە. بیرم نەماوە لە کام ژمارەی رابەردا بڵاوی کردەوە. بەڵام هەمیشە منیان بە کەسێکی راڕاوبۆرژوازیی بچووك ئەناساند، بەتایبەتی کە لەو دەمانەدا من بابەتم لە رۆژنامەی "هاوکاری"و گۆڤاری "بەیان"و گۆڤاری "رۆشنبیریی نوێ" دا بڵاو دەکردەوە. بابەتەکانی من بە وتەی ئەوان، لە ئەدەبی پرۆلیتارییەوە دوور بوون.

*** رێکخراوی پرۆلیتاریای کۆمۆنیست:-**

پرۆلیتاریای کۆمۆنیست یەکێك بوو لەو کۆڕو کۆمەڵە کۆمۆنیستییانەی نیوەی دووەمی دەیەی هەشتاکانی سەدەی رابردوو. کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەنێو بزووتنەوەی چەپ و کۆمۆنیستی لە کوردستان لە مەیداندا بووەو خاوەنی لێکدانەوەو تێروانینێك بووە، جیاواز لەوەی لە دەمەدا لەنێو بزووتنەوەی چەپ و کۆمۆنیستیدا باوو زاڵ بووە.

جەمال ئەحمەد دەڵێت:- (بۆ خۆمان ئەو ماوەیەی کە لە دەرەوە یان لە زانکۆ بووین، کۆمەڵێك پەیوەندیی پانوبەرینمان هەبوون ئەو پەیوەندییانە هەر بەردەوام بوون، دائەنیشتین، قسەو باس و راگۆڕینەوەمان ئەکرد، نووسراوەی لایەنەکانمان دەستئەکەوت و موناقەشەمان ئەکرد. ئیتر بەو جۆرە فەزایەکمان بۆ خۆمان دروست کردبوو.

لە ساڵی (١٩٨٧)دا هەلومەرجێك هاتە پێشەوە کە حکوومەت بەنیاز بوو، گوندەکان بهێنێتە خوارەوە. بەو هۆیەوە پێکدادانێك لەنێوان خەڵك و حکوومەتدا هاتە پێشەوە، کە وەك بەبیرم بێت، لە شەقڵاوە، لە سەیسایەق، لە چەمچەماڵ (ئەمەی کە ئێستە باسی ئەکەین، نزیکەی (٢٥) ساڵێك بەر لە ئێستەیە. لەبەر ئەوە ئەگەر هەموو ئەو رووداوانە زۆر بەتەواوەتی نەیاتەوە بیرم، وە یان زۆر رۆشن نەبم، ئەگەرێتەوە بۆ ئەو ماوە دووردرێژە. داوای لێبووردن ئەکەم لە هەر هەڵەیەك، ئەگەر شتێکم بە هەڵە باس کردبێ ئاگادارم بکەیتەوە). ئیتر لەو سەردەمەدا کارگەران نەمابوو، بووبووە چەند بەشێکەوە. بەشێکی رەوتی کۆمۆنیستی دروست کردو بەشەکەی تری لەگەڵ کەسانی تردا چەند رێکخراوی دیکەیان دروست کرد. بەڵام ئەوان چالاك تر بوون، لە بەر ئەوەی رەوت زیاتر بابەتی تیۆری دەخستەروو و نەیئەویست خەباتی عەمەلی بکات. ئەو بەشەی تری بوو، بەیاننامەیەکیان سەبارەت بەو وەزعە دەرکردو هەر لەناو بەیاننامەکەدا وەك بێتەوە بیرم، باسی ئەوە ئەکات، کە چۆن خۆمان ئامادە بکەین و چۆن خۆمان رێك بخەین. شێوەی رێکخستنەکانی بەوە دەخستەروو، شوورا لە لادێکان دروست بکەین و کۆمیتە لە شارەکان. ئێمەش ئەو کاتە لەشار بووین، بیرمان لەوە کردەوە، کە ئەو پەیوەندییانەی خۆمان رێك بخەین، بۆ ئەوەی بۆ هەر وەزعێك ئامادە بین. بۆ ئەوەی ئەگەر ئەو نارەزایەتییانە هاتە ناو شارەکانەوە، بتوانین رابەرایەتی بکەین، بەرەو پێشەوەی بەرین و لەگەڵ حکوومەتدا بەرەورووو ببینەوە. ئەلەوێدا بەپێی شوێنەکان کۆمیتەمان پێکهێنا. کۆمیتەی ئیمام قاسم، ئیسکان، شۆریجە، زانکۆی سەلاحەدین، دوبز، بەغدامان پێکهێنا. لە سلێمانییەوە ئەکرەم میهرداد بۆلامان هات. قسەو باس لەسەر ئەوە کرا، کە کۆمیتە لە سلێمانی دابمەزرێ. پاشان لەگەڵ کۆمەڵێك برادەر قسەو باسمان کرد، بەڵام نەگەیشتینە حاڵەتی کۆمیتەدانان. لە زانکۆ بووین، لەگەڵ نزار ئاکرەیی (سەیدا حوسێن) قسەو باسمان کرد. ئیتر نازانم، ئەو لە ئاکرێ و لە ناوچەی بادینان چیکرد. بەیاننامەمان دەرکرد، بڵاومان کردەوە. زیاتر ناوەندی هەڵسوورانمان لەنێو زانکۆ بوو، لە بەشەناوخۆییەکان کارمان دەکرد. بەڵام ئەو وەزعە گەشەی نەکرد. ئیتر هەر لەوێدا دامرکایەوەو ئەو نارەزایەتییە جەماوەریەو ئەو پێکدادانە جەماوەرییانە نەهاتنە نێو شارەکان و ئێمەش بە شوێنێك نەگەیشتین و لەوێدا راوەستاین.

لە دوای ئەوەی کە وتم، وەزعەکە نەچووە پێشەوەو هەر لە جێی خۆمان ماینەوە، بەو پرسیارە گەیشتین، باشە ئێمە بۆچی لەم کۆمەڵە خەڵکەی کە لە دەورووبەرمانە، رێکخراوێکی سیاسی دانەمەزرێنین و پاشان بەردەوامی پێبدەین و بەرەو پێشەوەی بەرین. هاتینە سەر ئەو بڕوایەی ئەو کارە بکەین. ئەویش ئەڵقەیەکمان بەناوی ناوەندی دروست کرد، کە پێکهاتبوو لە کرمانج (ئیبراهیم مستەفا)، سەید نەوزاد (نەوزاد عەبدوڵا)، کاروان ئەسعەدو من، ئەم چوار کەسە بووین. لە گەڕەکەکانیش ئەڵقەمان پێك هێناو لەدەوری ئەم ناوەندە دامان ناو پەیرەوێکی ناوخۆشمان دانا. پاشان کەوتینە قسەو باس، کۆبوونەوەی دەوری، ئابوونە کۆکردنەوە، دوای ئەوە هاتینە سەر ئەوەی لە کوێ کار بکەین؟ مەیدانەکان و کرێکارانی مەیدانمان دانا، دەستمان بە نەوت نەگەیشت، ئەمانەویست بەرەو ئەوێ بڕۆین. لە دائیرەی ئەشغال و کارگەی چیمەنتۆی لەیلانیش ئەڵقەمان پێك هێنا.

ئیتر ئەگەر نەختێك بۆ دواوە بگەرێمەوە، سەلام لەدوای ئەو وەزعە کۆمیتەی بەجێهێشت و لەگەڵ " پرۆلیتاریای کۆمۆنیست دا نەهات. دوای ماوەیەك کارکردن، لەسەر بارودۆخێك کە لە کەرکووك هەبوو، بەیاننامەیەکمان بڵاو کردەوە، کە وەك بێتەوە بیرم، ساڵی (١٩٨٨)بوو، کاتێك کە پرۆسەی ئەنفال دەستی پێکرد. پێکدادنێك لە چەمچەماڵ رووی دا، چەند ئەندامێکی ئێمە تیایدا بەشدار بوون. بەیاننامەیەکیشمان دەرکردو لەوێ و لە باڵەخانە نیشتەجێکەی کەرکووك، گەڕەکەکانی تر، لە شاری سلێمانی، هەڵێرو هەندێك لە قەزاو ناحییەکان، کە ژمارەکەی نازانم، بڵاو کردەوە. دوای ئەوە لە باڵەخانە نیشتەجێکە کۆمەڵێك

گیران. وابزانم، بیست کەسێك دەبوون، پێم وابێ دو کەسیش فەسڵ کران، بەڵام ئەوکرێکارانەی کەفەسڵ کران و گیران هیچیان ئەندامی ئێمە نەبوون و ئەوانەی ئێمە بەرنەکەووتن و بۆ حکوومەتیش دیار نەبوو، کێن ئەوانەی ئەمە ئەکەن.

دوای ماوەیەك هەستمان بەوە ئەکرد، کە کارەکانمان لەلای هاوڕێ کاروان و سەید نەوزادەوە ناچنە پێشەوە، بۆیە هاتینە سەر ئەوەی کە گۆڕانکاری لە ناوەندا بکەین. حەیدەر محەمەد ئەمین هاتە ناوەندو سەید نەوزادو کاروان بە جێیانهێشت. ئیتر ناوەندمان کردەوە من و کرمانج و حەیدەر، بەڵام ئەندامانی تریش هەر مانەوەو کەس وازی نەهێنا. واتە تەنها ئاڵوگۆڕ لە ڕێکخراوەکەدا کرا. دوای ئەوە ڕێکخراومان بەسەر سێ خەت دابەشکرد، هەر کەسە خەتی خۆی بەجیا هەبێت. ئەمەش بۆ ئەوەی ئەگەر خەتێك زەربەی ئەمنی خوارد، ئەوانی تر بمێننەوە. من لە لای خۆمەوە لەگەڵ نەوشیروان، فوئاد، فاروقە سوورو مامۆستا ئەسعەد کارم دەکرد. ئیتر ئەوانیش ئەڵقەی تریان لە دەوری خۆیان هەبوو، پەیوەندییان دامەزراند. لەلای کرمانجەوە (من سەبارەت بە خەتی خۆم ئەتوانم بە دڵنیاییەوە قسە بکەم، بەڵام بۆ ئەوانەی کە لەلای کرمانج و حەیدەر بوون، ناتوانم بە دڵنیاییەوە قسە بکەم، ئەوە خۆیان باشتر ئەزانن) وابزانم، عومەر مەولوود، نەجمە سوور، جەلال حەمید ڕۆستەم و مەجید مەلا حەمید بوو. لە لای حەیدەرەوە لە دوبزو هەولێر ئەندامی هەبوو. هەروەها لای من لە هەولێر خەلیل شورتە هەبوو، ئەویش ئەڵقەی لەدەوری خۆی هەبوو. لە شاری سلێمانی کرمانج زیاتر ئەڵقەی هەبوو، ئیتر بەشەکانی تر بە درێژی نازانم.

سەبارەت بە ئەرشیفی پرۆلیتاریای کۆمۆنیست هیچی لە لای من نەماوەتەوە، نازانم ئەگەر لە جێگایەك هەبێ. وابزانم ئەو باسەی کە من لەسەر مەسەلەی میللی نووسیبووم، لە لای خەلیل ماوە. نووسینەکانیش بەشی زۆری من دەمنووسینەوە. حەیدەر شیعری ئەنووسی. ئیتر نایەتەوە بیرم. هیچ بڵاوکراوەیەکی دەوریمان نەبوو، زیاتر بەیاننامەمان هەبوو، بەڵام قسەو باس و کتێبخوێندنەوە لەناو ئەڵقەو گرووپەکانماندا هەبوون. هەم شانەی ڕێکخراوەییمان هەبوو، هەم ئەڵقەی ڕۆشنبیریمان هەبوو، کە بەدەوری شانە ڕێکخراوەییەکانەوە بوون.

ئەو ڕووداوە لە ساڵی (١٩٩٠)دا بوو. من خۆم لە ڕێکەوتی (١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠)دا گیرام، بەڵام کەسانێك هەبوون، لە پێش منەوە گیران، وابزانم لە مانگی هەشت و نۆوە شاڵاوی گرتنەکە دەستی پێ کرد. لە لای ئێمەوە یەکەمجار نەوشیروان، دوای ئەو فاروقە سوور، دوایی من گیرام، پاشان خەلیل، مامۆستا ئەسعەد، قەحتان گیران. یانی زەربەکە لە بەشی لای منەوە بوو، بەڵام لە بەشەکانی تر، واتە، لە خەتی حەیدەرو کرمانج هیچ کەس نەگیرا. لای حکوومەتیش ناوی ئەوان و جێی ئەوان دیار نەبوون. ئەوەی لە دانپێنانەکان لەسەر ئێمە تۆمار کرا، ئەوەبوو کە ئێمە ئەڵقەیەکی کرێکارین، هەر ئەم بەشەین و هیچی ترمان نییە. وە ئەوەی من بە ناڕاست بە ئەندامەکانم وتووە، گوایە کەسی ترمان هەیە، ئەوە بەو جۆرە نییەو هەر ئەوەندەین.

ئیتر مەسەلەی ئێمە بەو جۆرە لەوێ ڕاوەستا. جگە لە ئێمە گرووپی تریشی تێدا بوو، وەکو ڕەوتی کۆمۆنیست و دەستە. ڕێکخراوی تریش کە بۆ حکوومەت ڕۆشن نەبوو. ئەم ڕێکخراوانە بەهۆی کەسانێکەوە ئاشکرا بوون، کە سەر بە ئەمن بوون و دزەیان کردبووە ناویان، وە ماوەیەك لەمەوبەر زانیارییان بە حکومەت دابوو. بەڵام گرتنەکە بۆ ئەوە ئەگەڕایەوە، دوای ئەوەی دەوڵەتی عێراق کوێتی داگیر کرد، لەناو شارەکاندا بێجگە لە کۆمۆنیستەکان هیچ کەسێکی تر نەبوو، فەعالییەت بکات هیچ لایەنێکی سیاسی نەبوو، کاری سیاسی بکات، نە ئیسلامییەکان، نە قەومییەکان. تەنها مەترسییەك کە هەبووبێ، چەپەکان بوون. بۆ ئەوەی ئەو مەترسییەش لەبەردەم خۆی لاببات و نارەزایەتی لە شارەکاندا ڕوو نەدەن، لەگەڵ داگیرکردنی کوێتدا دەستی کرد بەو شاڵاوە.

سەبارەت بەچۆنییەتی ئاشکرابوونمانیش، ئەوەندەی بە ئێمە بگەڕێتەوە، دوو کەس هەبوون بە ناوی حەمە گرێزەیی و مامۆستا ئەحمەدی مەتبەعە، کە نەوشیروان پەیوەندی پێوە کردبوون. ئەمانە چونکە پێشتر ئاڵای شۆڕش بوون و گیرابوون، وەك کەسی شۆڕشگێڕ سەیری کردبوون، نووسراوەی پێ دابوون و قسەو باسی لەگەڵیان گۆڕیبووەوە. ئەوانیش ئەوەندە زانیارییان هەبوو، کە نەوشیروان دوو کەس ئەناسێ: فوئادو جەمال، لەمە زیاتر لە دانپیانانەکانیدا نەبوو، مامۆستا ئەسعەدو فاروقە سووریشی تێدا بوو. خەلیلیش کە لەگەڵ ئێمە بوو، لە هەولێر گیرابوو.

*** دەستەی پێشڕەوانی پرۆلیتاریا، هەستە و سەرنجی کرێکار:-**

دەستەی پێشڕەوانی پرۆلیتاریا یەکێکە لەو سازمانانە کۆمۆنیستییانەی کە لە نیوەی دووەمی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو لە کوردستانی عێراق سەری هەڵداو لە ڕێگەی نووسراوێکی دووردرێژو چڕوپڕەوە، کە لەژێر کاریگەری نووسراوە پایەییەکانی مەنسوور حیکمەتەوە نووسرابوو، پێی نایە نێو مەیدانی

دەستەی پێشڕەوانی پرۆلیتاریا لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٧)دا دامەزرا. دامەزرێنەرانی حەیدەر هیدایەت، خەسرەو سایەو سامان کەریم بوون. حەیدەر ئەندازیاری تەلارسازی بوو، بەڵام بەهۆی هەڵاتنی لە سەربازی، کارەکەی تەنها ببوو بەکاری سیاسی. خەسرەو دەرچووی پەیمانگای کەرکووك بوو، ئەویش لەبەر هەمان هۆ لە مەیدانی خۆیدا کاری نەدەکرد، بەڵام ئەو خۆشنووسێکی زۆر باش بوو، جار بەجار بۆ بژێوی خۆی و کۆمەکی ڕێکخراوەکە کاری دەکرد. سامان کەریم لە بەشی ئەندازیاریی زانکۆی مووسڵ بوو، بەهۆی کاری سیاسییەوە نەیتوانی تەواوی بکات. پێویستە بە حەقیقەتێك ئاماژە بکەین، ئەویش ئەوەیە کە خێزانی خەسرەو بە تایبەت دایکی و خوشکی و براکەی و براژنەکەی بەڕاستی کۆمەکێکی بێ وینەی ڕێکخراوەکەیان لە باری ئەمنییەتی و جێگاوڕێگا و تەنانەت بژێوییەوە دەکرد. هەرگیز ناتوانرێ، لوتف و میهرەبانی ئەو خێزانە لەیاد بکرێت، بەتایبەت دایکی ئازیزی، کە وەك دایکی هەمووان وابوو.

بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە دەستە لە ساڵی (١٩٨٩)دا واتە ساڵو مانگێك دوای پێکهاتنی، پلینۆمی بەستو لەو پلینۆمەدا کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرا، کە پێکهاتبوو لە هاورێیان جەمال ئەیووب، سادق (ڕاستگۆ)، مونا خالید، شێخ حوسێن، حەیدەر هیدایەت، خەسرەو سایەو سامان کەریم.

سامان کەریم دەڵێت: (ئەوەندەی بە منو حەیدەر هیدایەت بگەڕێتەوە، ئێمە پێشتر ئەندامو هەڵسووڕاوی هیچ لایەنێك نەبووین، زیاتر وەکو ئەڵقەیەكو کەسانی نزیك بەیەك لەگەڵ چەندین ڕێکخراوو ئەڵقەو کەسایەتیی کۆمۆنیستیدا لە شارەکانی عێراقو کوردستان هاورێیەتیو دۆستایەتیمان هەبوو. بەڵام خەسرەو پێشتر ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، لە ساڵی (١٩٨٢) پێش کۆنفرانسی کۆمەڵە، کە ئەو کاتە لە شاخ بەسترا، وازی هێنا دوای ئەوە ئەویش لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەدا ئەڵقەیەکی کۆمۆنیستییان پێکهێنا بوو، بە ناوی ئەڵقەی ئەرکەکانمان نووسینێکیشیان بە هەمان ناوەوە بڵاوکردەوە. منو ئەو پێکەوەش پەیوەندییەکی توندوتۆڵمان لەگەڵ یەکدا هەبوو. ئێمە یەکەم ڕێکخراو بووین، کە ئۆرگانمان لە شێوەی چاپدا دەرهێنا. بەڵێ ئۆرگانمان هەبوو، چاپمان دەکرد و لەمبارەیەوە، ئیمکاناتی ئێمە لە تەواوی ڕێکخراوەکانی دیکەی ئەو دەمە لەسەرتر بوو. هەم ڕێکخراو هەیئەتێکی بۆ سەرپەرشتیکردنی کاری چاپەمەنی هەبوو، هەم جێگاوڕێگای گونجاوی بۆ دیاری کردبوو، ئۆرگانو نووسراوەکانی ترمان چاپ دەکرد.

ئێمە لە شاری سلێمانی، هەڵەبجە پشدەر، بیتوێن، پێماڵك، تووەسووران، ڕانیە، کەرکوك، دوبز، حەویجەو هەولێر کۆمیتەمان هەبوو. (٣) کۆمیتەی سەرەکیمان هەبوو، کە سەرپەرشتی گشت کارەکانی ڕێکخستنی دەکرد، بەڵام کۆمیتەکان بەشێوەی لێککدابراو کاریان دەکرد. هەر لە سلێمانی سێ خەتی فراوانی تەشکیلاتیمان هەبوو، کە کۆمیتەی سلێمانی سەرپەرشتی دەکرد. کۆمیتەی سلێمانی پێکهاتبوو لە سێ ئەندام، کە بریتی بوون لە: ئیسماعیل، شێخ حوسێن، سەردار عەبدوڵاو بەرپرسی کۆمیتەکەش شێخ حوسێن بوو. ژمارەی ئەندامانی ڕێکخستنی سلێمانی ئەوەندەی یادم بێت، تەنها لەنێو شاری سلێمانیدا (٥٠) کەس دەبوون، جگە لە قەزا، ناحیەو ئۆردووگاکان.

کۆمیتەی کەرکوك لە سێ ئەندام پێکهاتبوو، کە بریتی بوون لە: جەمال ئەیووب، ئازاد مەجید، عادیل ئەحمەدو بەرپرسی کۆمیتەکەش جەمال ئەیووب بوو. ئەم کۆمیتەیە پێش دوو مانگ لە هەڵوەشاندنەوەی دەستەکە دەستیان لەکارکێشایەوە، بەڵام هیچم لە ناوەرۆکی نامەی دەست لەکارکێشانەوەکەیان لە بیر نەماوە. بەڵام دواتر و لە پێکهێنانەوەی ڕێکخراوی سەرنجی کرێکاردا جەمال ئەیووب دیسانەوە لەگەڵمان هاتەوە. هەر لە شاری کەرکوك ڕەحمان داوود کەسی ناسراوی ئەو کاتانەی بزووتنەوەی چەپ بەناوی " ئامانج ڕەبیع"ەوە لەگەڵماندا بوو، بەڵام ڕاستەوخۆ لەلایەن سەرکردایەتیی دەستەوە ڕێکخرابوو، واتە، پەیوەندیی بە کۆمیتەی کەرکووکەوە نەبوو.

لە ناوچەی پشدەر پەیوەندیی ئێمە لەگەڵ خەڵکی زەحمەتکێشی ناوچەکە بە پێودانگی ئەو دەمە پۆزەتیڤ بوو. هەروەها لە کەرکووكو سلێمانی لەنێو کارگەی کاشی، چیمەنتۆ و کارگە ئەهلییەکاندا نفووزێکی بەرچاومان هەبووو چەندین ئەڵقەی کرێکاریی جیاوازیش لە ناوچە جیاوازەکاندا بە دەورووبەری ئێمەوە بوون.

هەر بە هۆی پەیوەندیی فراوانی ڕێکخراوەکەو بوونی ژمارەیەکی بەرچاو لە کرێکاران لە ڕیزەکانماندا، لەنێو کرێکاراندا سیاسەتی فراوانکردنەوەو برەودان بە کۆمۆنیزمو کاری ڕێکخراو لەنێو کرێکاران لە ڕێگەی ئەڵقەگەلی کرێکارییەوە لە دەستووری کارماندا بوو. لەنێو ئەڵقەکاندا قسەو باسی جیاواز چ دەربارەی بزووتنەوی چەپو کۆمۆنیستیو ڕێکخراوەکانیانەوە، یان دۆخی عێراق، کوردستانو بزووتنەوەی کرێکاریو خواستە هەنووکەییەکانی کرێکارانەوە لە ئارادا بوون. لەم نێوەدا هەڵوێستو سیاسەتی ئێمە ئەوە بوو، کە بەشی پێشرەوی کرێکاران ئاستی هۆشیارییان لەم ڕێگایەوە بچێتە سەرو سەرەنجام لەنێو دەستەدا ڕێکیان بخەین. بەشێکی تری کارەکانمان لە پێناو بەهێزکردنی ئەم ئاراستە سیاسییەدا، بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرتو چالاکییە کرێکارییەکان بوو، کە ئەو کاتە لە ڕێگای ئەندامانو لایەنگرانی خۆمانەوە بەدەستمان دەگەیشتو کاتێك دەگەیشتنەوە دەستی کرێکاران، هیواو عەزمێکی باشیان بۆ پەیدا دەبوو. لە هەمان کاتدا ئێمە وەڵامی سیاسیو ڕێکخراوەییو ڕێنمایی ڕێکخراوی دەستەمان هەر بەهۆی نامەوە بۆ هەموو ئەڵقەو ڕێکخستنەکان دەناردەوە. بەڵام ئەوە بڵێم، وەکو سیاسەت، تەواوی کاری ئێمە لەگەڵ ئەڵقەکاندا بەهۆی مەسائیلی نهێنیکارییەوە بەشێوەی لێکدابراو بوو، کە ئەوەش بۆخۆی ڕێگرییەکی گەورەی لە بەردەم چوونە پێشەوەی کارەکانماندا دانابوو.

هەر وەکو لە سەرەوە ئاماژەم پێکرد، ئێمە جگە لە نووسینی یەکەم کە لەنێو بزووتنەوەکەدا بە نێوی نووسراوی " ئەزمە"وە ناوبانگی پەیدا کرد، چەند زنجیرە وتاری ڕەخنەییمان لە سەر لایەنە جیاوازەکانی ئەو کاتەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی هەبوو، لەوانە: ڕەخنە لە نووسینێکی ڕەوتی کۆمۆنیست، کە پێم وابێت، بە نێوی "بەرنامەی موشەخەس، یان ئەنتەرناسیۆنال" بوو، کە ئێمە بە زنجیرەیەك وتار وەڵاممان دایەوە. لە هەمان کاتدا ئێمە ئۆرگانێکی خۆمان بە نێوی "کرێکارانی کۆمۆنیست"ەوە هەبوو، کە دوو ژمارەی بە قەوارەی تا ڕادەیەك گەورەی لێ دەرچوو، وە لە دەزگای چاپی خۆمان چاپمان کردن. نووسراوەکانمان بە زمانی کوردی بڵاو دەکردنەوەو بە تەواوی لە ڕێگای ڕێخستنەکانی خۆمانەوە دەگەیشتنە گشت ئەو شوێنانەی کە ئەندامو کۆمیتەی خۆمانی لێ بوون. لەم ڕێگایەشەوە. دەگەیشتە دەست لایەنگرانو دۆستانی ڕێکخراو، کە ژمارەیان لە ئەندامانو کادیرانی ڕێکخراوەکە زیاتر بوون.

هۆی سەرەکیی هەڵوەشاندنەوەی دەستەی پێشرەوان، نەبوونی ئاسۆیەکی سیاسیی ڕۆشن لە بەرانبەر ڕووداو

ئاڵوگۆڕەکانی ئەو کاتەدا بوو. گرنگترین ڕووداوو ئاڵوگۆڕ لەو کاتەدا، هەرەسی یەکێتیی سۆڤێت وەك یەك بلۆکی کۆمۆنیستیی بۆرژوازیی جیهانی بوو لە لایەكو لە لایەکی دیکەشەوە باسەکانی کۆمۆنیزمی کرێکاری لەنێو بزووتنەوەکەماندا ئاڵاو پەرچەمێکی تازەی چینایەتی بەرز کردبووەوەو وردەوردە دەگەیشتە ئێمە، کە نەك هەر ئێمە، بەڵکوو گشت بزووتنەوەی چەپ و کۆمۆنیستیی ئەو کاتەی لەگەڵ واقیعیەتێکی تازەی فکریو سیاسیدا دەرگیر کردبوو، کە پێویستی بە تێگەیشتن و لێکدانەوەی جیاواز هەبوو، بەتایبەت کە گشت کۆمۆنیزم لەژێر پرسیاری بۆرژوازیی جیهانیدا دانرابوو، مەرگی کۆمۆنیزم ڕاگەیەنرابوو. سەرباری ئەوە، ئێمە بەتایبەت، لەژێر گوشارێکی هێجگار قورسی ئەمنیدا بووین. ئەندامانی کۆمیتەی سلێمانی کە یەکێکیان شێخ حوسێن خاوێی ئەندامی ئەو کاتەی کۆمیتەی ناوەندیی دەستە بوو، لە زینداندا بوو. بە دۆست و لایەنگرەوە زیاتر لە (٧٥) کەس هەر لە شاری سلێمانیو دەوروبەری واتە پشدەر، بیتوێن، هەڵەبجەو بازیانیان لە زینداندا بوون، یان خۆیان شاردبووەوە. هێندێکیان گەیشتبوونە ئێران و بەتەواوی لێکدابرابووین. منو خەسرەو نەبێت ئەویش بە دوومانگ جارێك یەکترمان دەبینی.

بڵاوکردنەوەی بەیانی دژی داگیرکردنی کوێت لەلایەن ئێمەوەو گەیشتنی بە حکومەتی بەعس ئەوەندەی تر هەلومەرجەکەی لەسەر ئێمە قورستر کردبوو. بە کورتی دەستە وەکو ڕێکخراوو هەیکەلەی ڕێکخستنەکانی بە تەواوی لە بەریەك ترازابووو هەڵوەشابووەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوانەش هەر وەکو ئاماژەم پێکرد، دیسان هەڵوەشاندنەوەی دەستە بە هەڵەیەکی گەورە دەزانم.

هەستە واقیعیەتی خۆی هەڵیوەشاندەوە. بە بڕوای من، هەستە کە پێك هات، لەگەڵ خۆیدا زەمینەی هەڵوەشاندنەوەی هەبوو. هەر وکوو ئێمە جەمعێك هەڵسووڕاوی بزووتنەوەی شووڕایی لە سلێمانی، هەڵەبجە، هەولێر، پشدەرو کەرکووك بووین، هاتین هەستەمان پێك هێنا، چونکە شووڕایی بووین و تەنانەت بەشێکی زۆرمان پێشتر یەکتریمان نە دەناسی. بەڵام بزووتنەوەی شووڕایی بەهۆی ئاوارەیی خەڵکی کوردستانەوە شکابوو، وەشکانی بەسەردا فەرز کرابوو. بۆیە ئیتر باس و مەسائیلەکان چوارچێوەیەکی دیکە دەگرێتە خۆ، کە ئیتر ناکرێت تەنها بە بزووتنەوەی شووڕاییو هەڵچوون و ڕاپەڕینی خەڵکەوە گرێ بدرێنەوە، بەڵکوو مەسائیلی تازە دێنە بەردەمی کۆمەڵگاو پێویستییان بە وەڵامی تازەیە. هەستە لەبەرانبەر ئەو واقیعیەتە تازەیەدا هەڵدەوەشێتەوە.

بەڵام لە هەستەوە ناگەینە سەرنج لەم نێوەدا هەم وەکو ماوە ماوەیەکی زۆر هەیە، هەم وەکو هەلومەرجی سیاسیی بزووتنەوەکە ئاڵوگۆڕێکی تازە پەیدا دەبێت، هەم ڕۆڵی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و بەتایبەت فراکسیۆنی کۆمۆنیزمی کرێکاریو شەخسی مەنسوور حیکمەت دێتە پێشەوە. باسی "سەرنجی کرێکار" باسێکی برێك جیاوازە". سەرنجی کرێکار لە سەرەتاوە تەنها بڵاوکراوەیەکی کرێکارییەو سامان کەریم سەرنووسەرێتیو تەواوی ئەندامانی دەستەی نووسەرانی، بەشی چالاك و پێشڕەوی کرێکارانی کەلوپەل چیمەنتۆ بوون، کە هەموویان هەڵسووڕاوانی ڕیزی پێشەوەی بزووتنەوەی شووڕایی لە کارگەکانی خۆیاندا بوون. وەکو فاروق عەبدلرەحمان (فاروقی ئەلبیسە)، چیمەن حەمە ڕەفیق و گوڵزار حەمە ڕەفیق کرێکارانی ناسراوی ئەلبیسە بوون، هەروەها سروەی ئەلبیسە، شێخ قادر، عوسمانی چیمەنتۆو حەسەن مەعروف فەرمانگەی ڕێگاو بان.. ئەم هاوڕێیانە هەموویان دەستەی نووسەرانی سەرنج بوون و پێکەوە کارمان دەکردو هەموو هەفتەیەك یەکتریمان دەبینی).

بڵاوکراوەی "سەرنجی کرێکار" لە مانگی ئابی (١٩٩١)دا یەکەم ژمارەی لێ دەرچوو وەکو بڵاوکراوە لە سەرەتاوە لە هەلومەرجێکدا پێکهات، کە بزووتنەوەی کۆمۆنیستی هێشتا لەگەڵ کوتانەوەی خۆیو ڕەخنەگرتن لە خۆی لە سایەی نووسینەکەی ئیرەجی ئازەرێندا دەرگیر بوو. سەرنج وەڵامێك بوو بۆ کارکردن. بەڵام پاش دەرچوونی سێ ژمارە لەگەڵ خەسرەو سایە، ئاسۆ کەمال و ڕێنوار جەباردا" سەرنجی کرێکاریان وەك ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی ناساندو بەخێرایی وەکو ڕەوتێکی چالاکی کۆمۆنیستی لەنێو بزووتنەوەکەدا دەرکەوت، بە تایبەتی کە لەنێو کرێکاراندا لە نفوزێکی بەرچاوو تا ڕادەیەکی فراوان بەهرەمەند بوو.

ئەوان هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا نەبووە. بڵاوکراوەکانیان پێدەگەیشت، بەڵام لە ڕێگای شەخسییەوە، هەندێك جار خۆیان کەسیان دەنارد، کە ناسیاوی لەنێویاندا هەبوو. بەهۆی هەندێ کەسانی چەپی عێراقەوە کە لەنێویاندا بوون، پێم وابێت، هەواڵی ئەوانیان دەزانی، بەڵام بەشێوەیەکی هێجگار کرچوکاڵ و سنووردار. بەڵام ئەگەر پرسیار لەسەر کاتی دوای ڕاپەڕینە. بەڵێ! ئەوتن هەر لەکاتی ڕاپەڕینەوە سەرەتایەك لە پەیوەندییان هەبوو، دواتر لە مانگی ئایاری ساڵی (١٩٩١)دا بۆ یەکەمجار بەشێوەی ڕەسمی ئەوانیان بینی.

* (**ڕێکخراوی بروسك**):-

شانە چەکدارەکانی بروسك، ئەو شانە چەکدارانەن کە لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٠) دەست بە دروستکردنیان کرا بە مەبەستی بە گەڕخستنیان لە کاتی ڕاپەڕیندا.

شانەکان سەرەتا لە ئەندامان و دۆستانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان پێکهێنران.

لە ناوەڕاستی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩١) بەدواوە، پاش دەستپێکردنی گورزی ئاسمانی هاوپەیمانان لە دژی عێراق، هاووڵاتیان و چەکدارانی سەر بە ڕژێمی عێراق بە لێشاو کەوتنە دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخستنەکانداو لەوانە ژمارەیەکی زۆر شانەی چەکدار بۆ کاتی پێویست دروستکرا.

لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٠)وە تا (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٩١)، ژمارەی شانە چەکدارەکان گەیشتنە (٧٣٠) شانە. هەر شانەیەکی چەکداری (بروسك) ژمارەیەکی تایبەتی بۆ دانرابوو، لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانەوە بروسکەو

ڕێنماییان پێ دەدرا.

فەرماندەیی شانە چەکدارەکان لیژنەیەك بوو بە ناوی (لیژنەی کاری ڕاپەڕین) کە لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٠) دامەزرابوو، لە چوار ئەندام پێکهاتبوو کە بریتی بوون لە هەریەك لە:- (قادر محەمەد عومەر، مستەفا برایم دەروێش، ئەحمەد حوسێنی، خالید ڕەسوڵ ڕەسوڵ).

هەر ئەم لیژنەیەش بوو کە لە کۆبوونەوەی (٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٠)دا ناوی بروسکی بۆ (شانە چەکدارەکان) هەڵبژارد.

شانە چەکدارەکانی (بروسك) هەموو شانە چەکدارەکانی سنووری:- (هەولێر، حەوزی بتوێن، کەرکوك، دهۆك، ئۆردوگا زۆرە ملێکانی خەڵکی پشدەری پایزگای سلێمانی دەگرتەوە.

*** ڕێکخراوی ڕەوتی کۆمۆنیست و شوورا کرێکارییەکان:-**

کۆمۆنیستەکان باسی شوورایان بیستبوو، ئەزموونی کۆمۆنی پاریس و شۆڕشی ئۆکتۆبەر و شۆڕشی ئێرانیان دەرس کردبوو، وەلێ بەعەمەلی تا دەمی ڕاپەڕین کارێکی وایان ئەنجام نەدابوو. بەڵام لەگەڵ ڕاپەڕین و ڕاماڵینی دەسەڵاتی بەعس لە کوردستان، کە ئەوان دەستپێشکەر و نەخشەسازی بوون و ئەو دەمە هێشتا هێزە ناسیۆنالیستەکان لە دیوی ئێراندا بوون، یەکسەر دەستیان بۆ دامەراندنی شووراکان برد و بزووتنەوەی شوورایییان بەرپخست. بزووتنەوەی شوورایی بەهەر کەموکوورییەکییەوە، نمایشێکی گەورەی هێزو ئالتەرناتیڤی کرێکاران و زەحمەتکێشان و بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لە بەرامبەر هێزو پارتگەلی کۆنەپەرست و میللەتگەرای کوردستان بوو، کە کێشمەکێشی لەسەر دەسەڵاتی سیاسی لەگەڵیاندا دەکرد و ترس و بیمی زۆری لە دڵیاندا خستنەوە.

سەمیر نووری:- (لە مانگی ئایاری ساڵی (١٩٩١) بوومە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی ڕەوتی کۆمۆنیست. کاتێك من بووم بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، خۆم لەو کۆنفرانسەدا نەبووم. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ دووری من لەو کاتەدا لە هاوڕێیانی تری ڕابەرایەتیی ڕەوتی کۆمۆنیست. ئێمە تەشکیلاتی هەولێری ڕەوتی کۆمۆنیست کاتێك حکوومەتی بەعس هێرشی هێنایە سەر ڕاپەڕین و سەرکوتی کرد، لە هەولێرەوە بۆ ناوچەی ڕانیە و قەڵادزێ چووین و لە سەرەتادا لە قەڵادزێ کۆبووینەوە و ژمارەی کادیرو ئەندامەکانمان لەوێ خۆی لە (٢٠)کەس دەدا. توانیمان هەندێك چەك و پارە پەیدا بکەین و دواتر بنکەی ڕانیەمان کردەوە. من بە حوکمی ئەوەی بەرپرسی تەشکیلاتی هەولێر بووم، بەرپرسیارێتی تەشکیلاتەکان لەم ناوچەیە کەوتە دەست من. دوای ئەوەی بنکەمان کردەوە و مەراسیمی ئایارمان لەم ناوچەیە بەرپا کرد، کۆمیتەی ناوەندی هاوڕێ عەبدوڵا ساڵحیان ڕاسپاردبوو، کە بێتە لای من و پێم ڕابگەیەنێ. من وەك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوم و کۆنفراس هێشتا درێژەی هەیە و هاوڕێیان لە پێنجوێنن، دەبێ منیش بڕۆم بەشداری ئەو کۆنفرانسە بکەم. پێش ئەم کۆنفرانسە، بەهۆی سەرکوتی سیاسی و نهێنیکارییەوە لە لایەك، وە لە لایەکی ترەوە بە هۆی نەبوونی چالاکی فراوانی سیاسییەوە، ئێمە نەمان دەزانی، لە سەرووی خۆمانەوە چی دەگوزەرێ (لە پەیوەند بە ڕابەرایەتییەوە). من پێم وابوو، نابێ پرسیار بکەم و ئەمە کارێکی ئەمنی بوو. بۆیە من نازانم، ئەگەر هاوڕێیان بە شێوەی کۆمیتەی ناوەندی کاریان کردبێت. بەڵام دوای ئەوەی دەستمان کرد بە کار بەشێوەیەکی ئاشکرا، دوای کۆنفرانسەکەی پێنجوێن زانیم، تەنها سێ هاوڕێ ڕابەرایەتیی ڕەوتیان کردووە، کە بریتی بوون لە: موئەیەد ئەحمەد، ئەمجەد غەفووری و نادر عەبدولحەمید. لەو کۆنفرانسەدا شەش هاوڕێ بۆ کۆمیتەی ناوەندی زیاد کرا، کە بریتی بوون لە: ئەحمەد (موحسین کەریم)، خەسرەو (سادق عەزیز)، سامان (ئاوات سەعید)، تەیب (سەمیر نووری)، خاڵە (عەبدوڵا ساڵح) و جەمیل ئەمین. ئەم دوو هاوڕێیەی دوایی وەك ئەندامی یەدەك بۆ کۆمیتەی ناوەندی دیاری کران. دیارە ئێمە هیچ هەڵبژاردنێکمان ئەنجام نەداو ئەگەر هەڵە نەبم، هاوڕێیان موئەیەد، ئەمجەد و نادر ئەم کارەیان پێشوەخت قەرار دابوو. هەیئەتێکمان بە ناوی هەیئەی تەنفیزی پێکهێنا، کە پێك هاتبوو لە: نادر، ئاوات، موحسین، سادق، جەمیل و من، نادریش بەرپرسی بوو. بەڵام ئەم هەیئەتە هەر زۆر زوو ڕەخنەی لێ گیراو کارمان پێی نەکرد. لە ڕاستیدا ئەگەر بە ئەقڵی ئەمڕۆ کارمان بکردایە، دەبووا لانی کەم کۆمیتەی ناوەندی بکەینە (٢٥)کەس نەك ٩ کەس. بۆیە قسەیە دەکەم، بۆ ئەوەی پێویستی زیادکردنی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ڕوون بکەمەوە. کۆمەڵگە واردی بارو دۆخێك ببوو، کە ئاڵوگۆڕەکان زۆر خێرا بوون و هێزە سیاسییەکان زۆر بەفراوانی گەشەیان دەکرد و گۆڕانیان بەسەردا دەهات. ئێمە لە بزووتنەوەیەك (بزووتنەوەی شوورایی)ی زۆر گەورەدا مەلەمان دەکرد. کە سەدان کادیرو چالاکوانی هێنابووە دەرەوە. سەدان کێشەی سیاسی ئاوەڵا ببوون. ڕەوتی کۆمۆنیست یەك حیزبی سیاسیی گەورە بوو. ئێمە دەست و پەنجەمان لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا نەرم دەکرد. چووینە شەڕی دەستویەخە لەگەڵ بەرەی کوردستانی، کە شەش حیزبی گەورە بوون و هەزاران چەکدارو ئۆرگانیان هەبوو. من ئەم قسانە بە عەقڵییەتی ئێستا دەکەم و ئەو کاتەش ئەوە خۆی سەپاندبوو، کە دەبێ کۆمیتەی ناوەندی فراوان بکرێتەوە. بۆیە من دەڵێم: لەچاو زەرورەتەکەیدا ئەوە هیچ نەبوو).

ڕەوتی کۆمۆنیست سکرتێری هەڵبژێرراوی نەبوو، بەڵام موئەیەد ئەحمەد دەوری سکرتێری دەگێڕا و ئەمە زیاتر شتێکی مەعنەوی بوو نەك تەشکیلاتی و حقوقی.

ڕەوتی کۆمۆنیست لە زۆربەی شوێنەکانی کوردستان ڕێکخستنی هەبوو. لە شارەکانی: سلێمانی، هەولێر، دهۆك، ئاکرێ، کەرکووك، بەغدا، مووسڵ و بێجی، هەروەها لە زۆربەی شارۆچکەکانیش ڕێکخستنی هەبوو.

شێوەی ڕێکخستنەکانی ڕەوت زیاتر هەرەمی بوو، شکڵی تەزبیحیشی لە خۆ گرتبوو، بەڵام هەمیشە سەرەوە پەیوەندی لەگەڵ خوارەوەدا دەگرت. ئەویش بۆ پاراستنی ڕێکخستن

لە لێدانی ئەمنی. واتە خوارەوە زۆر بەقورسی ئەیتوانی پەیوەندی لەگەڵ سەرووی خۆیدا بکات.
پێش ڕاپەڕین ئێمە کۆمیتەیەکیان هەبوو. لە سەمیر نووری، سادق‌و جەمیل پێکهاتبوو و لەژێر چاودێریی نادردا ئیدارەی تەشکیلاتیان لە هەولێرو کەرکووک‌و هەندێ شوێنی تر دەکرد. بەڵام لەدوای ڕاپەڕین ئیتر ڕێکخستن هەر هەمووی بووە هەرەمی ولە زۆربەی شوێنەکان کۆمیتەیان دامەزراند.
لە بەشە ئاشکراکەشدا بەشێوەی شانەیەکی گەورە کۆدەبوونەوە، جگە لە کەرکووک، بەغداو مووسڵ نەبێت.
کۆمیتەی سلێمانی، کۆمیتەی هەولێر، کۆمیتەی ڕانیەو قەڵادزێ، کۆمیتەی شارەزوور، ڕێکخستنەکانی کەرکووک، کە تا هاوڕێیانی عوسبە وەك ڕێکخستنی ڕەوت کاریان دەکرد. سەمیر نووری بەرپرسی تەشکیلاتییان بوو. تەنها پەیوەندیی لەگەڵ هاوڕێ سەمیر عادیلدا هەبوو. ئەگەر بە شکلی کۆمیتە بوون، یان هەر شکڵێکی تر.
هەڵبژاردن لەنێو ڕێکخستنەکان نە دەکراو ئۆرگانەکانی زیاتر تەنسیبی بوون. یەك جار هەڵبژاردنیان بۆ بەرپرسی بنکەی ڕانیە کرد.
لە دەورانی ڕەوتدا سێ بڵاوکراوەیان دەرکردووە: یەکەمیان "پرۆلیتاری" بوو، حەوت ژمارەی لێ دەرچوو. لە دوای سەفەری ئەو سێ هاوڕێ (نادر، ئەمجەدو موئەیەد) یەی دەریان دەکرد بۆ تورکیا ڕاوەستا. ئەم بڵاوکراوەیە سەرنووسەری ڕاگەیەنراوی نەبوو. بڵاوکراوەی "بۆ پێشەوە" یەکەم ژمارەی کە لێ دەرچوو، هێشتا ئەو سێ هاوڕێیە نەچووبوونە دەرەوەی وڵات، ئەگەر هەڵە نەبین. سەرنووسەری یەکەم ژمارە ئەمجەد بوو، دواتر ناژانرێ کەی ئاوات سەعید بوو بە سەرنووسەر. دواتر لە دەرەوە، مەبەست دەرەوەی دەزگاکانی ڕەوت خۆی، چاپ کراو، بە تیراژی زۆر بڵاو کرایەوە. هاوڕێیانی هەولێر دەورێکی زۆریان لە چاپکردنیدا هەبووو تیراژەکەی لە (٢٠٠٠) کەمتر نەبوو. زۆر دڵنیانیم، بەڵام ئەگەر هەڵە نەبین، سادق عەزیز سەرنووسەری بڵاوکراوەی "الی الأمام" بوو. مۆنتاژی ئەم بڵاوکراوانە کارێکی زۆری دەخواست، جاری وا هەبوو، سێ ڕۆژو چوار ڕۆژ خەریك دەبووین‌و چاپیان دەکردن، کە دیارە کەسی تایبەتیان هەبوو، کاری چاپکردن بوو. ئینجا لەسەر یەك لاپەرەی سپی دەیانبڕی‌و ڕێکمان دەخست، تا هەموو لاپەرەکانیان تەواو دەکرد، کە ئەمە کارێکی دەستیی زۆر قورس بوو. پێش ئەوەی بیبەینە چاپخانەی دەرەوە، تیراژەکەی (٥٠٠ بۆ ١٠٠٠) دەبووو کارێکی زۆری دەویست.
لە پرۆلیتاریدا ئەو سێ هاوڕێیە، ئەمجەد، ـەیەدو نادر نووسەری سەرەکی بوون. بەڵام ئاوات‌و ـسێن بابەتیان تێدا نووسیبوو. بەڵام "بۆ پێشەوە" و "الی الامام" ئەو چوار کەسە (ئاوات، سەمیر، سادق‌و موحسین)ی لە ناوەوەی وڵات بوون، کەسانی سەرەکی بوون‌و هاوڕییانی تریش وردەوردە هاتنە ناوەوە.
بێجگە لە وەرگێڕاوەکانی مەنسوور حیکمەت‌و حەمیدی تەقوایی‌و بابەتەکانی "کارگری ئامروز (کە ڕەزا موقەدەم بە فارسی دەری دەکرد)، بابەتەکانی تر زیاتر لە دەوری ڕەخنەی سیاسی لە ناسیۆنالیزمی کورد، مەسەلەی ژنان‌و مەسەلەی کرێکاری چەقیان بەستبوو.
"نامە بۆ هاوڕێیەك" نووسراوەی لینینیان، کە لەنێو ڕێکخستندا بڵاویان کردەوەو پێم وابێ، وەرگێڕانی ڕەوت بوو. بەڵام بابەتەکانی مەنسوور حیکمەت‌و حەمیدی تەقوایی زۆریان بۆ سەر زمانی کوردی‌و عەرەبی وەرگێڕان.
بۆ وەرگێڕانی کوردی هاوڕێیان موحسین‌و ئاوات دەورێکی زۆریان هەبوو، بەڵام هاوڕێ عادیل حەسەن زۆربەی ئەو بابەتانەی کە کرابوونە کوردی، بۆ سەر زمانی عەرەبی وەریدەگێڕان. ڕەوت خۆشی نامیلکەی بڵاو دەکردەوە، بەڵام مارکسیزم‌و جیهانی ئەمرۆ، نووسراوێکی حەمید لەسەر دین. نامیلکەیەکی ڕەوت لەسەر کۆمۆنیزمی کرێکاری، کە ئێستا ناوەکەیمان لەیاد نییە، ئەو نامیلکانە بوون، کە بڵاویان کردنەوە.
بۆ گوێزانەوەی بڵاوکراوەکانیان هەمیشە سوودیان لە ئۆتۆمبیل وەردەگرت ولە ناو دەرگاو ژێر کوشنەکاندا دەیانشاردنەوەو دەیانگوێزانەوە بۆ شارەکانی هەولێر، کەرکووك‌و دهۆك.
باسی شووراکان لە پێش ڕاپەڕین لەنێو بزووتنەوەی چەپدا وەك باسێکی فیکری خرابووە ڕوو، بەڵام لەگەڵ ڕاپەڕیندا بزووتنەوەی چەپ یەکێك لە شاکارەکانی ئەوە بوو، دەستی بۆ دروستکردنی شووراکان برد. سەرەتا لە سلێمانی‌و دواتر هەولێرو پاشان هەموو کوردستانی گرتەوە.

*** ڕێکخراوی ( جيش تحرير كركوك ):-**

ئەم ڕێکخراوە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو لە کەرکوك دامەزراوە، کە بە نهێنی کاری کردووە لەلایەن کۆمەڵێك لاوی تورکمانەوە، بۆ بەدەستهێنانی مافە زەوتکراوەکانیان.
لە ساڵی ١٩٨٠ حکومەتی بەعس کۆمەڵێك لەم ئەندامەکانی دەستگیر کردو لەسێدارەی دان و بەشێکیان سزای بەندکردنیان بەسەردا درا.
یەکێك لە ئەندامانی ڕێکخراوەکە ناوی (حاجی سامی توتنچی) بوو کە لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ٢٠١١ کۆچی دوایی کرد.
شەهیدەکانیان بریتی بوو:- نیزامەدین عارف، محەمەد سەعاتچی، عەبدولجەبار مستەفا، مۆفەق حوسێن، عەبدولکەریم حەمزە.

* سەرچاوە:-
- مجله التحرير، ژمارەکانی (١٤٣-١٤٤-١٤٥) لە ساڵی ٢٠١٨، لاپەرە ١٥.

* الحرس القومي:-

میلیشیاكانی (الحرس القومي) یەكێكە لەو تاقە میلیشیایانەی عێراق كە لە دەرەوەی عێراق پێكهێنراوە، كە بریتی بووە لە یەكەی مەدەنی كە راهێنانی سەربازی پێكراوە لە سوریا هۆكاری سەرهەڵدانی ئەم رێكخراوە بەهۆی كاری توندو تیژی سیاسییەوە سەری هەڵداوە، كاتێك كە بەعسییەكان لەلایەن شوعییەكانەوە دەچەوسێنرانەوەو ئەمانیش وەكو بەرپەچدانەوەیەك خۆیان رێكدەخستەوە بۆ تۆڵەكردنەوە.

هەروەها (الحرس القومي) تاكە میلیشیا بووە لە عێراق كە بەشداری كودەتای سەربازی كردووە كە لە ٨ی شوباتی ساڵی (١٩٦٣) روویداوە.

هەروەها دووەم میلیشابوو لە دوای (المقاومة الشعبية) لە سەردەمی كۆماری، كە لە دوایدا بەپێی یاسا رێكخستنی بۆ كراوە وەكو یەكەیەكی سەربازی.

دەربارەی لایەنگران‌و دژی ئەم میلیشیایە لەلایەن خەڵكەوە جۆراو جۆر بووە، كە زۆری خەڵكی عێراق پشتگیریان لێ نەكردووەو كردەوەكانیان بە دڵ نەبووە.

میلیشیاكانی (الحرس القومي) گەلێك تاوانی جۆربە جۆریان ئەنجامداوە لە دژی لایەنگرانی حیزبی شیوعی بە رێگای ئازاردان‌و كوشت‌و سەرەونگومكردن، هەروەها توانیان سەركەوتووبن لە راوەستاندنی چالاكی سیاسی شیوعییەكان لە عێراقداو توانیان كە دزەبكەنە نێو رێكخستنەكانیانەوەو گەلێك كێشەیان بۆ دروست بكەن لە هەڵوەشاندنەوەی رێكخستنەكانیان.

لە هەمان كاتدا بەكارهێنانی توندوتیژی لەلایەن (الحرس القومي) لە دژی شیوعییەكان، رەزامەندی لەلایەن زۆربەی لایەنە سیاسییەكانەوە لێدەكرا، بەڵام كاتێك ترسی دەسەڵاتی شیوعییەكان نەما، لایەنە سیاسییەكان ترسیان لێدەنیشت لەوەی دەسەڵات پەیدا بكەن‌و هەموو دەزگاكانی دەوڵەت كۆنترۆڵ بكەن.

لایەنە سیاسی‌و ئایینە شیعییەكان بۆچوونی جۆراو جۆریان هەبوو دەربارەی (الحرس القومي) بۆ نموونە (سەید موحسن ئەلحەكیم) لایەنگریان نەبوو، بەتایبەتی لە شێوازی لەناودانی شیوعییەكان، بەڵام یەكێكی وەكو (شێخ محەمەد مەهدی ئەلخالسی) لایەنگریی دەكردن، لەبەر ئەوەی زۆر دژی شیوعییەكان بوو، بەهەموو جۆرێك دژیان بوو.

(الحرس القومي) لە زۆربەی پارێزگاو ناوچەكانی عێراق بوونیان هەبوو، یان رێكخرابوون لە یەكەی سەربازی بەجلوبەرگی مەدەنی‌و چالاكییەكانیان لەنێو خەڵكیدا بوونی هەبوو.

ئەم رێكخراوە لە پارێزگاكانی سەرووی عێراق بوونی هەبوو، لەژێر ناونیشانی (المناطق الشمالية في العراق قيادة للحرس القومي) كە پێكهاتبوو لە كەركوك، موسڵ، هەولێر، سلێمانی، كە لە كەركوك ئامری ئەم یەكەیە (تۆفیق حاجی ئەحمەد) بوو.

زۆربەی ئەندامەكانی ئەم ناوچانە لە كارمەندانی عەرەب‌و توركمان رێكخرابوون.

* (رابطة أفق الثقافية):-

لە ٢٤ی كانوونی یەكەمی ساڵی (٢٠١٥) (رابطة افق الثقافية) كرایەوە لە نزیك گازینۆ مەجیدیە، كە گەشە دانە بە بواری رۆشنبیری‌و كولتووری‌و كۆمەڵایەتی شارەكە.

* (گروپی ماڵی فیلم):-

لە پێناون خزمەتكردن بە بوارەكانی سینەماو هونەر لە شارەكە، گروپی ماڵی فیلم لە شاری كەركوك كرایەوە لە ساڵی (٢٠١٥) كە كاروان عەبدولڕەحمان رێكخەری گروپی ماڵی فیلمە لە شارەكە.

* (ناوەندی مێژووی جەمیل رۆژبەیانی)

ئەم ناوەندە مێژوویيە لە ساڵی (٢٠١٥) لەلایەن بەختیار سەعیدەوە كراوەتەوە كە بەڕێوەبەری دەزگاكەیەو بەسەرپەرشتی دەزگای جەمال عیرفان كار دەكات.

* (دەزگای رۆژ)

دەزگایەكی كارایە لە بواری مافەكانی ئافرەتاندا، بارەگای سەرەكی لە كەركوكەو مۆڵەتی كاركردنی یاسایی لە ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقەوە لە ١٧ی تشرینی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٣) پێدراوە.

ئەم دەزگایە خاوەنی چەندین بەشی جۆراو جۆرە لە رێگایانەوە خزمەت بە ژنانی شاری كەركوك پێشكەش دەكات وەكو بەشی یاسایی‌و كۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و پەیوەندی‌و تەندروستی ئەم دەزگایە خاوەنی دوو گۆڤاری مانگانەی كۆمەڵایەتیە بە ناوەكانی (كۆماری رۆژ)و (اناامل) بە زمانی كوردی‌و عەرەبی، هەروەها خاوەنی سایتێكی ئەلكترۆنییە.

* (رێكخراوی لیلۆس)

ئەم رێكخراوە لە رۆژی (٢٧)ی تەمووزی ساڵی (٢٠٠٩) لە كەركوك دامەزراوە، یەكەم بەر پرسی میدیا ئەحمەد عەبدوڵلایە، كاركردن بۆ بەدەسهێنانی مافەكانی ئافرەتان‌و منداڵان.

* (رێكخراو سازان)

ئەم رێكخراوە لە (١٠)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٨) لە كەركوك دامەزراوە یەكەم بەرپرسی (رووناك عەلی حوسێنی)ە.

* (رێكخراوی بەژین)

ئەم رێكخراوە لە ٤ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٩) لە ناحیەی رزگاری دامەزراوە، یەكەم بەرپرسی (غەزالە محەمە ساڵح) ە ئامانجی دابینی كردنی داهات‌و سەرچاوەی بژێوی ژیانی خێزان‌و ژنانی بە جێماوی ئەنفال لە گەرمیان.

*** ( ڕێکخراوی دلۆڤان )**
ئەم ڕێکخراوە لە ٢١ی شوباتی ساڵی (٢٠١٠) دامەزراوە، یەکەم بەرپرسی (نەسرین سالح حوسێنی)، هەنگاو دەنێت بۆ پەرەپیدانی توانای ئافرەتان لە بوارە جیاجیاکاندا.

*** ( سەنتەری کەرکوك بۆ خانمانی پیشەدار )**
لە ڕۆژی ١٢ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩) دامەزراوە، یەکەم بەرپرسی (نەشوە حەمید محەمەد) هەوڵدەدات هەلی کار بۆ خانمان دابین بکاتو هۆشیاری لە بارەی سەر بەخۆبوونی خانمان خۆیان ئاشنا بکات.

*** ڕێکخراوی ( تجمع وسيطات كركوك لحل الأزمات )**
*** کۆمەڵەی ( کیژانی ژیر )**
*** گرووپی شار**

*** ئەنجوومەنی ئەدیبانی کەرکوك**
بیرۆکەی ئەنجوومەنی ئەدیبانی کەرکوك لەلایەن هەردوو چیرۆکنووس جەلیل کاکە وەیس و فەیسەڵ هەمەوەندییەوە بوو، بە دەنگەوەچوونی نووسەرانی کەرکوك برەوی بە ئەنجوومەنەکە دا. داهێنانی گرووپێك لە خۆڕا نابێت، هەڵبەت لە خەمخۆرییەوە دێ، دوای ئەوەی ئەو دوو بەرێزە بانگهێشتی فێستیڤاڵی ئەدەبی بەرگری دەکرێن، لە شاری هەڵەبجە. بەهۆی بەشدارنەبوونی نووسەرانی کەرکوك لەو فێستیڤاڵە، لە کاتێکدا کەرکوك بۆخۆی لە شەڕدا بوو بەرانبەر بە دوژمنان، چۆن دەبێ نووسەرانی کەرکوك بێ هەڵوێست بن بەتایبەت لە فیستیڤاڵی تایبەت بە ئەدەبی بەرگری. دوای سکاڵاکردنی هەردوو چیرۆکنووس لە بەرانبەر لیژنەی ئامادەکاری فێستیڤاڵەکە، بە وتەی ئەوان نووسەرانی کەرکوك خۆیان کەمتەرخەمبوونە لە نەناردنی دەق. ڕەنگە هۆکاری سەرەکی هەر نووسەرانی کەرکوك نەبووبن، لە زۆربەی فێستیڤاڵەکان کەرکوك هاوشان بە شارەکانی تر بانگهێشت نەکراون، ئەویش پشکی خەمنەخۆری لایەنی پەیوەندیداری دەزگا ڕۆشنبیرییەکان دەگرێتەوە، کە نەیانتوانیوە پەیوەندییەکانیان چڕتر بکەن. یا نووسەرانی کەرکوك بەهۆی تەکەتوولاتەوە.. ئەو میانە ئەدەبییەیان بۆ بەرجەستە نەکراوە، بۆ زیاتر خزمەتی ئەدەبی لە دەڤەرەکە. ئێدی پەرتەوازیی نێو نووسەرانی کەرکوك هۆکارێکبوو لە دابران و کەمتر بانگهێشت کردنیان بۆ فێستیڤاڵەکان. بۆ یەکخستنەوەیان دەبوو هەوڵێك بدرێت، ئەوەبوو ئەو گرووپە دامەزرا کە گشت هاوکێشەکانی خستە بەردەم ڕای دەزگا ڕۆشنبیرییەکانی هەرێم کە نووسەرانی کەرکوك دوو ساڵە لە چالاکی بەردەوامن کە هیچ هاوکارییەك و هیچ پاڵپشتییەکیان نییە، ئەمەو کۆڕەکانیش لە دەرەوەی شار دەکرا، بۆ خستنە ڕووی برشت و پرزەی نووسەرانی کەرکوك بوو، کە لە ڕێی دڵسۆزیانەوە دەتوانن خزمەت بە ئەدەبی کوردی بکەن.
ساڵی یەکەمی گردبوونەوەی نووسەران بۆ درێژەدان بە چالاکییە ئەدەبیەکانی، توانیان لەو بارە سەختەو لەو دەشت و دەرە (٥) کۆڕ سازبدەن. ئەمەش دوای بەرنامە دارێژی و ئاگادارکردنەوەی نووسەرانی کەرکوك بۆ ڕێکخستنی گرووپێکی ئەدەبی، دوور لە حزبایەتی و دام و دەزگا ڕۆشنبیرییە کرکەوتووەکان، کە ببوون





بە لەمپەرێك بۆ یەكخستنەوەی نووسەرانی شارەكە. بە تایبەت ئەو گەنجانەی مەیلی ئەدەبیان هەبوو، یا ئەوانەی دەیانوویست بە جددی لە ئەزموونی نووسەرانەوە نزیك ببنەوە.

دوای بەرنامە دارێژی و ئاگادار كردنەوەی نووسەران بۆ كۆڕی یەكەم، توانییان (١٦) نووسەرو ڕووناكبیر كۆبینەوە، لەژێر ناونیشانێكی پێش وەخت بۆ سنووردارکردنی ناوی گرووپەكە، كە بە كۆی دەنگی ئامادەبووان ڕێكەوتن لەسەر (گرووپی داهێنان). كۆڕەكە (٥) كاتژمێری خایاند، بە خوێندنەوەی دەقی شیعری و چیرۆك و گفتوگۆكردن لەسەر چۆنییەتی ڕێكخستنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و ئاشتكردنەوەی هەموو نووسەران و دووركەوتنەوە لە كوتلە و كوتلە بازی. ئەوەی جێی باسە لە كەناڵەكان كە خەمخۆری ئەو گردبوونەوەیە بوون، كەناڵی (ڕێگا) بوو.

بەشداربووانی كۆڕی یەكەم.. لە هەولێرەوە، جەلیل كاكە وەیس و ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل و حەكیم كاكەوەیس. لە چەمچەماڵیشەوە..خالد عبدل و هیوا حوسێن و ئەنوەر عومەر و شێخ عوسمان. لە كەركوكیشەوە خالید كاویس و خالید مەجید و مستەفا حەمید و حەسەن جومعە و سۆران كامەران و عەلی عومەرو ئیبراهیم تاڵەبانی و شێرزاد هەمەوەندی و فەیسەڵ هەمەوەندی. شوێنی كۆڕەكە دەشتی چیمەن بوو، بەر لە بەهاری ساڵی ٢٠١٥ بە درووستی لە بەرواری (٢٢ی





شوباتی ساڵی ٢٠١٥ ) کاتژمێر (١٠)ی بەیانی بە ساتێك وەستان بۆ گیانی پاکی شەهیدانی کورد و کوردوستان کۆڕەکە کەوتە گەڕ. خوانەکەیش بریتی بوو لە خوانی مجیور، کە هەر یەکەو توێشووبەرەکەی لەماڵەوە بۆی پێچرابووەوە، لەسەر خوانەکە ڕیزکراو گردبوونەوەکەی ئەوەندەی تر جوان کرد. دوا بە دوای تەواوبوونی کۆڕەکە، بە کۆی دەنگ ڕێکەوتن لەسەر کۆڕی ئاینده کە لە باخەکەی باوکی شێخ عوسمان دەبێت، ئەویش بە خواستی شێخ عوسمان بوو، بۆ بەرواری (١٤ ی ئاداری ساڵی ٢٠١٥ ).

دوای بڵاوبوونەوەی دەنگۆی کۆڕەکە بەو شێوازە سرووشتییەو بەو گردبوونەوەیە، نووسەران هاتنە ژێر سایەی ئەو داهێنانەو بەشدابوونیان زیاتربرەوی بە گرووپەکە دا. ئەوانەی بەشداربوون لە کۆڕەکان دوای کۆڕی یەکەم.. چنوور نامیق و یوسف لەتیف و شوان سەدایی و نزار محەمەد سابیر و ئەحمەد تاقانەو حەمەسەعید زەنگنەو سەباح ئیسماعیل و ئەمین شوان و عەبدوڵا قەرەداخی و فەلاح سەلاح و بورهان ئەحمەدو شێخ سدیق و نەوزاد یوسف کاکەیی و ڕێبوار تەیب و تەیب جەبارو ڕەنج خاڵۆ بازیانی و عەبدولرەحیم سەرەڕۆ و بورهان بەرزنجی و سمکۆ محەمەد و ڕووزار ئەحمەد و سەلاح قابیل و سیروان خانەقاو سەباح بازرگان و مەلا شاخەوان و فەیسەڵ ئەمین و مامۆستا محەمەد تەها مامۆستای زانکۆ و شەفیق حاجی خدر و نەوزاد رفعەت و ئەدیب نادر و سابیر ڕەشید و هەڵەت کەریم ئاغا و رابەر ڕەشید و لەتیف فاتیح فەرەج و سەباح شێخانی و عارف مەعروف و ستار جەباری و تاریق کارێزی و ئیسماعیل هەنارەیی و دانا عەسکەر و خالید جاف. ئەمەو کۆمەڵێك ئەدەب دۆست و ڕووناکبیر لە گەنج و مامۆستا ئامادەبوون، کە هەموو ناوەکان بە کۆنووسی کۆڕەکان وەك کتێبێك دواتر چاپ دەکرێت،

ناوەڕۆکی کۆڕەکان لەنێوان دەق خوێندنەوەو توێژینەوەو گفتوگۆی جددی لەسەر ئاستی ڕۆشنبیری و بەربەستەکانیدا جێی جەدەلێکی بەرفراوان بوو، لە کۆڕەکاندا، بە تایبەت ڕۆمانی کوردی کە کەوتووەتە دوادوای کاروانی داهێنان و ئەو بازارە گەرمەی وەرگێران، کە وایکردووە ڕۆمانە خۆماڵییەکانی کورد پشتگوێ بخرێت.

وەزارەتی ڕۆشنبیری بە پلەی یەکەم کەمتەرخەم بووە، کە هیچ بەرنامەیەکی نییە بۆ ڕۆشنبیران و سیمینارێکی بەرفراوانی ڕێکنەخستووە بۆ لا کردنەوە لە بوارەکەو گوێی لە نووسەران نەگرتووە، بۆچی ئەدەب بە بازرگانی دەکرێت، لە کاتێکدا کورد دەبوو برەو بە ڕۆمان بدات و کارەساتەکان کەم نین، ڕۆمانیان پێ نەنووسرێتەوە.

دوای گردبوونەوەی کۆڕی پێنجەم بە کۆی دەنگ ڕەزامەندی درا لەسەر ناوی گردبوونەوەکە، بۆ ئەنجوومەنی ئەدیبانی کەرکوك، ئەگەر چی لیژنە بۆ بەڕێوەبردنی ئەنجوومەنەکە دامەزرا، وەلێ هەندێ نووسەر ئەوەیان قبووڵ نەبوو، چونکە زۆربەی نووسەرانی کەرکوك جارێ نەهاتوونەتە ژێر سایەی گردبوونەوەکەو دواجار بە دەنگدان کار بۆ ئەو لیژنەیە بکرێت. بۆیە بە کۆی دەنگی ئامادەبووان ئەو لیژنەیە هەڵوەشێنرایەوە تا ڕۆژی گردبوونەوەی زۆرینەی نووسەران. ئەنجوومەن بەردەوامە لە کۆڕو سیمینارو چالاکییەکانی بەو هیوایەی ئەم گرووپە مێژوویەکی پڕ شکۆی بۆ شارەکە و ئەدەبی کوردی نووسیبێتەوە.

*** ژووری بازرگانی کەرکوك:-**

ژووری بازرگانی کەرکوك بەپێی یاسای ژوورە بازرگانییەکانی ساڵی (١٩٣٦) دامەزراوە، دەزگاکە پێکهاتبوو لە بازرگان و خاوەن پیشەو ئەو کەسانی کە بەرژەوەندی بازرگانیان هەبووەو پاراستنی شوێنەکانیان لە ناوچەکان.
هەڵدەستا لە سەرەتادا بە پێدانی زانیاری بۆ دەزگاکانی دەوڵەت و دادگاکان دەربارەی بازرگانی و دیاریکردنی رای دەربارەی لایەنە جۆر بەجۆرەکان کە تایبەتە بە کارو هەوڵدان بۆ پاککردنەوەی ئەو ئاستەنگانەی کە دێتە رێگای، هەروەها تۆمارکردنی نرخی ئەو کەلوپەلانەو کەرەستانەی کە هاوردە دەکرا، هەڵسان بە کاری یەکلاکردنەوەی ئەو کێشە بازرگانییانە، دەرکردنی بڕوانامەی باوەڕپێکردنی کەلووپەلی.
یەکەم جار لە رۆژی ١٦ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٧) ژووری بازرگانی کەرکوك کۆبوونەوەی خۆی سازکرد بە سەرۆکایەتی حاجی عەبدولهادی ئاوچی و محەمەد سالەیی وەکو جێگرو بە ئەندامێتی (٨)کەس.
لە ساڵی (١٩٦٦) یاسایی ژمارە (١٠٠) دەرچوو، بەپێی ئەم یاسایە ژووری بازرگانی بەسترایەوە بە وەزارەتی ئابووری، توانی شوێنی خۆی بکاتەو پشتێکی بزوێنەربێت بۆ جووڵەی بازرگانی و ئابووری و گەشە بە خۆی بدات کە جێگەی خۆی لە هەموو بوارەکان بکاتەوە، رۆژ بەرۆژ کارمەندانی لە زیادبووندا بووە.
لە ساڵی (١٩٨٣)دا یاسای ژمارە (٣٤) دەرچوو کە بەپێی ئەم یاسایە بووە پێکەوە لکاندنی یەکێتی ژوورە بازرگانییەکان لەگەڵ یەکێتی دروستکراوانی عێراق بە یەکێتییەکی تازە بەناو یەکێتی گشتی ژوورە بازرگانی و دروستکراوە عێراقییەکان، هەروەها یاسای خانەنشینی بەسەردا سەپێنرا بەپێی یاسای ژمارە (٣٣) لە ساڵی (١٩٦٦)دا کە دەرچووە.
لە ساڵی (١٩٨٩)دا یاسای ژمارە (٣٤)ی ساڵی (١٩٨٩) دەرچوو کە بەپێی ئەم یاسایە هەریەکە لە یەکێتی ژووری بازرگانی و یەکێتی دروستکراوانی عێراق لێك جیاکرایەوە بە یەکێتیەکی پیشەیی دانرا، پابەندنین بەیاساکانی ساڵانی خزمەتەوە، دەستەی ئەنجوومەنی کارگێڕی لە ئەندامانی کەرتی تایبەت هەڵدەبژێرێت.
لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٩)دا یەکەم کۆنگرەی خولی تازەی بەست کە (موزهر مدحت دەدە کاکەیی) بوو بە سەرۆکی ژووری بازرگانی وە سەباحەدین محەمەد سالح سالەیی بوو بە جێگر لەگەڵ (٨) لە ئەندامانی تر.
لە (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٣)دا هەڵبژاردنی خولی (١٨)ی دەستەی کارگێڕی کرا کە سەباحەدین محەمەد سالح بە سەرۆکی ژووری بازرگانی و مستەفا رەئووف و عەبدولواحید شاکر جەدوع وەکو جێگر دەستنیشان کرا.
لە (١٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٧)دا هەڵبژاردنی خولی (١٩)ی دەستەی کارگێڕی کرا کە سەباحەدین محەمەد سالح وەکو سەرۆك و خەلیل ئیسماعیل ئیبراهیم و عەبدولواحید شاکر جەدوع وەکو جێگر دەست نیشان کرا.
لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠١)دا هەڵبژاردنی خوولی (٢٠)ی دەستەی کارگێڕی بەسترا کە سەباحەدین محەمەد سالح وەکو سەرۆك و خەلیل ئیسماعیل ئیبراهیم و عەبدولواحید شاکر وەکو جێگر دەست نیشان کرا.
لە ئێستادا دەستەی کارگێڕی بریتییە لە:- سەباحەدین محەمەد سالح، خەلیل ئیسماعیل ئیبراهیم، عەبدولواحید شاکر جەدوع، سەباح نورەدین، خالید حەنا نعوم فرجۆ، کەمال تۆفیق، مستەفا رەئوف، ئەحمەد شوکور، عەبدولواحید حاجی سالح، سەباح فازڵ حوسێن.

*** حەرەس قەومی و کورد ئاوڕێکی کورت لەو ڕۆژگارە**

**لەتیف فاتیح فەرەج**

لێرەو لەوێ زۆر باسی حەرەس قەومییەکانی ١٩٦٣ دەکرێت، ئەو حەرەس قەومییانەی پاش کودەتاکەی هەشتی شوباتی ئەو ساڵە، سەرەتا لە بەغداو دواتر لە کوردستان بە شێوازێکی جیاتر بەربوونە وێزەی خەڵکی بێچەك و بێپەناگە. حەرەس قەومی میلیشیایەکی سەرەتا بێسەرەو بەرەی پەلاماردەرو شەڕفرۆش بوونە، لەدوای کودەتا بەربوونەتە ناو بەغداو هەرچی نەشیاوە کردوویانە، لە پەلاماردانی خەڵك و کوشت و برو سووکایەتیکردن بە ئازادیخوازان، دواتر ئەم هێزە ڕێکخراوەو حکومەت وەك شانازییەك سەیری کردووە، بۆ خۆجیاکردنەوە لە خەڵك هەموویان قۆڵی خۆیان بە پارچە پەڕۆیەکی سەوز دەبەست، زۆربەی ئەوانەی کە شاهیدی بینینی ئەوانن باس لە بەستنی قۆڵیان دەکەن.

حکومەت لە ئاکامی زۆری ستەم و دەستدرێژی ئەوان بۆ سەر شیوعی و ئۆپۆزسیۆن و خەڵکی مەدەنی ناچار بوو بە یاسایەك ڕێکیان بخات، ئەو یاسایە بە یاسای ژمارە ٣٥ ی ساڵی ١٩٦٣ ناسراوە، یاساکە لە ١٨ی ئایاری ساڵی ١٩٦٣ دەرچووە و بریتییە لە ١٤ ماددە، لەو یاسایەدا سنوور بۆ کاری حەرەس قەومییەکان دانرا، بەڵام وەك هێزێکی خۆبەخشی نیشتمانی ناسێنرا.

لە مادەی دووی ئەو یاسایەدا هاتووە "حەرەس قەومی هێزێکی میللی ڕێکخراوی مەشق پێکراوە لەسەر بەکارهێنانی چەك گەل خۆی دروستی کردووە تا ژیانێکی سەربەست و ئازادانە بژی، ئەرکەکانی:

یەکەم: پاراستنی سەرهەڵدانی عەرەبی لە ئێراق و نەخشەکێشانی ڕێگای شۆڕشێکی پێشکەوتووخواز.

دووەم: هاوکاری هێزی سەربازی لە کاتی شەڕو پەلاماری دەرەکی

سێیەم: بەشداری لە پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ.

چوارەم: بەشداری لە کردەکانی بنیاتنانەوەو بنیادنانی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

پێنجەم: هەستان بەو کارانەی بۆی دیاری دەکرێ لە شوێنی دیکەوە یان سەرپێشکی دەکەن.

لە مادەی سێیەمدا هەر بە خۆبەخشی ئێراقی ناوەستێ کە لەو هێزە وەردەگیرێن، خاڵی جیم دەڵێ خۆبەخشی وڵاتانی عەرەبیش دەتوانن کاری تیابکەن بە مەرجی ڕازی بوونی سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا. "دەقی یاساکە لە بەڵگەنامەکاندا هەیە بە زمانی عەرەبی و کوردی "

بەڵام ئەم حەرەس قەومییانە نەك نەبوونە هۆی ئاشتی و ئارامی بگرە هەموو وڵاتیان پڕ کرد لە کێشەو ململانێ و ستەمکاری.

ئەوانەی لە یادداشت و بیرەوەرییەکانیاندا باسی حەرەس قەومییەکان دەکەن بە تایبەت ئەو کارانەی لە بەغدا کردوویانە، مرۆڤ تووشی شۆك و سەرسوورمان دەکات، بۆ نموونە حامید حەمدانی لە یادداشتەکانی خۆیدا وەك ئاماژەیەك بۆ دڕندەیی بەعس و قەومییەکان باس لەوە دەکات پێشتر عەبدولکەریم قاسم لە عەبدولسەلام عارف خۆش بوو لە داری نەدا بەڵام ئەوان لە ٩ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ یەکەمین کاریان سووکایەتیکردن بوو بەلاشەی عەبدولکەریم قاسم بوو. حامید حەمدانی ڕووداوەکان لە یادەوەریمدا بەشی شەشەم لە ئینەترنێتەوە.

هەروەها زەکی فەرحان و زۆری تریش هەمان ئەو چیرۆکانە دەگێڕنەوە، حەرەس قەومییەکان پاش کودەتاکەو بیستنی بەیاننامەکە، ڕژاونەتە ناو شەقامەکانی بەغداو بەربوونەتە وێزەی ئازادیخوازو شیوعییەکان و سووکایەتییەکی زۆریان بە خەڵکی سڤیل و بێچەك کردووە، دیارە ئەوان پێشتر ئامادەکاریان کردووە بۆیە لە یەکەمین چرکەوە دەڕژێنە ناوشارو لە هەموو لایەکەوە دەردەکەون و بۆ جیابوونەوە و ناسین قۆڵیان بە پارچە پەڕۆیەکی سەوز بەسترابوو. زەکی فەرحان وەك شایەدێکی ئەو ڕۆژە باس لە کردەکانی گرووپەکانی مردن دەکات لە جادە سەرەکییەکانی بەغداو گەڕەکی ئەفسەران و زەیونەو شوێنەکانی تر، هەروەها باس لەوە دەکات چۆن پەلاماری ژن و منداڵیان داوەو ئەوپەڕی ستەمکاریان نواندوە.

زەکی فەرحان سەبارەت بە حەرەس قەومییەکان دەنووسێت: دوای بیستنی یەکەمین بەیاننامە کە دەنگی ئەبو غرێب خوێندییەوە کۆمەڵی گەنجی بەعسی و هەرزە ڕژانە سەر شەقامەکان و بەربوونە وێزەی خەڵك. حەرەس قەومییەکان چەند گرووپێکی مردنیان دروستکردبوو کە ئەیاد عەلاویشیان تیا بوو.

لەم نووسینەدا ناگەڕێینەوە بۆ ئەوەی حەرەس قەومییەکان لە بەغداو شوێنەکانی دیکەی ئێراق چیان کردووە و چەند ستەمکارانە پەلاماری ئازادیخوازانیان داوە، لەم نووسینەدا تەنێ لەسەر پەلاماری حەرەس قەومییەکان و بەعس بۆ سەر کوردستان دەوەستین، بە هیوای ئەوەی ئەو ستەمکارییانە بە ئاسانی لە یادەوەریدا نەسردرێنەوە بۆ ئەوەی چیدی ستەمکاری دووبارە نەبێتەوەو دادگایی ئەو ڕابردووە تاریکە بکرێت.

*** حەرەس قەومییەکان و کورد:**

وەك پێشتر باسمان کرد ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ بەعسییەکان و قەومییە توندڕەوە ئێراقییەکان کودەتایەکی ڕەشیان بەسەر قاسمدا کردو دواتریش سووکایەتیان بە تەرمەکەی کرد، ڕۆژانی دواتر دەستەیەك بەناوی حەرەس قەومی بەناو کوچەو کۆڵانەکانی بەغدایا بڵاوبوونەوەو کەوتنە کوشت و بری خەڵکی سڤیل و شیوعییەکان، حەرەس قەومییەکان لە سنووری کەرکوك بە شێوەیەك پەلاماری کوردیان داوە، کە ئیدی مرۆڤ لە بەردەمیدا واقی وڕ دەمێنێ، ئەوان سەدان چیرۆکی ستەمکارانەو نا ئاکارییانەیان لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە پیادەکردووە، لە کوشتن و تاڵان و ناپاکی و خیانەت، کە هێشتا بە تەمەنەکان لە هەردوو نەتەوەی کوردو عەرەب لەم ناوچەیە باسیان دەکەن، لەم ڕۆژانەدا شێخێکی عەرەب خۆی چیرۆکی تاڵانکردنی مەڕو

مالآتی کوردی لەلایەن یەکێکی ترەوە بۆ گێڕامەوە، ئەوان لە رێگەی بەعسەوە فێرکرابوون کە پەلاماری کورد بدەن و بڵێن " ئێمەی عەرەب خودان غیرەتین-دوژمن لەم ناوچەیە دەرئەکەین " هۆسە گەلی جیاجیان دەکردو وەك گەلە جاشی عەرەب پەلاماری گوندەکانیان ئەدا، ئەو گەلە جاشانە دواتر عەرەبەکانیان پێیان دەوترا "فورسان وەلید" و کوردەکانیش کە دروستکرابوون پێیان دەوترا "فورسان سەلاحەدین " حکومەت بە هەموو شێوەیەك پشتگیری دەکردن و بەریدابوونە سەر ئەو خەلکە هەژارە.

ئەوەی بۆ من جێگەی داخە تا ئێستا وەك پێویست کار لەسەر ئەو پرسە هەستیارە نەکراوە، جگە لە هەولی چەند نووسەرو قەلەمبەدەستێك، بەلام عەرەبە ئێراقییەکان چەندین بابەت و لێکۆلینەوەیان لەسەر نووسیوە، لە کاتێکدا قوربانی راستی لەم ستەمکارییە کورد بووە نەك کەسی تر.

لەو رووداوانەدا سەدان گوند سوتێنران و مەرو مالآتێکی زۆر تالانکران، ئەوە جگەلەوەی لەناو شارەگەورەکانیشدا لە لایەن سوپاو پیاوەکانی دەسەلاتەوە ستەمکاری زۆر کرا، لەم کورتە وتارەدا ئاماژە بە کۆکردنەوەی بەشێك لەو زانیاریانە ئەدەین، کە تا ئێستا لەسەر رەفتارو هەلسوکەوتی حەرەس قەومییەکان لە ناوچە دابرێنراوەکان کۆکراونەتەوە، بە باوەری من ئەمە بەسە بۆ ئەوەی لە دادگای بالای تاوانەکان دۆسیەیەکی تایبەت بەو بابەتە بکرێتەوە، ئەگەر ئەوەش نەکرێت هەر پێویستە حکومەت ئەم زانیاری و داتاو چیرۆکانە کۆبکاتەوە، ئەوەی خوارەوە بەشێکە لەوکارانەی کە حەرەس قەومییەکان لە ماوەی دەسەلاتی ٨ مانگەی خۆیاندا لە هەندێك لە ناوچە دابرێنراوەکان و سلێمانی کردویانە.

شێخ رەوف خانەقا لە یاداشتەکانیدا دەنووسێ " رۆژی ٨-٦-١٩٦٣جگە لە قوەی عەسکەری و شورتە نزیکی ١٥ بۆ ٢٠ هەزار عەرەبی رەش و رووت، بۆ تەماعی مال لەگەل ژمارەیەکی گەلی زۆری حەرەس قەومی لە پڕێکا ئەم هەموو سوپایە هێرشیان بردە سەر کوردستان " یادگاری خانەقا لاپەرە ٥٩ -٦٠چاپی ٢٠١٣ کەرکوك.هەرلەو یاداشتەدا باسی تالانکردنی بازاری ئاخور حوسێن دەکات و دەنووسێ " لە کەرکوك بازاری ئاخور حوسێن کە بازاری کوردەکانە سەراپا تالانکرا، تەنانەت دوکانەکانیشیان بە بلدۆزەر لە تەمەلەوە رووخێنراو لەگەل زەویدا یەکسانکرا " لاپەرە ٦١.ئەوە لە گەرەکی شۆریجەش کراوە و تالانی زۆر کراوە، لە رەحیماوە جگە لە تالان رەشبگیر کراوەو خەلکێکی زۆر بەرەو گرتوخانەکان براوە، شۆراو کە نزیکەی ٦٥٠ مال بوە تالانکراوە و سوتێنراوە. هەروەها باس لە جۆری کوشتنەکە دەکات کە ١٠ بۆ ١٥ کەس بەریز وەستێنراون و بە رەشاشی سەر دەبابە کوشت و برکراون. ل٦٣ ئەو باس لەوەدەکات کە ژمارەی گیراوان بە بۆچونی ئەو ٥٠ بۆ ٦٠ هەزار بووە " بە تەقدیری من ٥٠ -٦٠ هەزار کەسی گیران " ل ٦٤ باس لە گرتنی خۆی دەکات ودەلێت " من خۆم لە گەل ٢٨٠٠ نەفەر لە قشلەی موسەیەب حەپس کرابووین " دەلێت " خەزعەل سەبری کە لەو کاتەدا معاونی ئەمن بووە سەعات ٩ی بەیانی گرتمی و بردمی بۆ سەرا " ئەو کاتە شێخ رەوف مودیری مەکتەبەی عاسیمەی کەرکوك بووە.بە کورتیش باسی خۆیان ئەکات لە موسەیەب.

وەك شێخ رەوف نوسیویەتی دلۆپێکە لە دەریایەك لەو دیدارو چاوپێکەوتنانەی کردومانە چیرۆکی وا دەگێرنەوە کە تەنانەت هیچ درندەو بڕندەیەکیش ئەو کارە ناکات کە حەرەس قەومییەکان کردویانەو شانازیشیان پێوە کردووە. ئەمە هەر لە کوردستان نا تەنانەت لەکاتی کودەتاکەیاندا لە بەغدا لە مەودا لە چەند رۆژێکی کەمدا ئەو شارەیان خەلتانی خوێن کرد.

لەو بارەیەوە نموونە زۆرە و ئێمە دوو نموونە دەخەینە بەر چاو کە لە بەغدا چیان کردووە:

فواد عارف لە یادەوەریەکانی خۆیدا سەبارەت رۆژی دووەمی کودەتاکە، واتە رۆژی ٩ی مانگ دەنووسێ "بەرەبەیانی رۆژی ٩ی مانگ ئۆتۆمبیلێك هات بە شوێنما تا بمبا بۆ دەزگای رادیۆ لەوی پێیان ووتم عەبدولکەریم قاسم بەگیراوی دێت و لەسەری ئەدەین، وتم من ناتوانم ئەوە ببینم و داوای لێبوردنم کردو گەرامەوە بۆ مال " یاداشتەکان بەشی یەکەم لاپەرە ٢٦١چاپی ١٩٩٩.

دوو کورد لە حکومەتی دوای ٨ی شوبات دەبنە وەزیر یەکێکیان فواد عارفە دەبێتە وەزیری ئەوقاف ودووەمیان بابەعەلی شێخ مەحمودە دەبێتە وەزیری کشت و کال. نوسەری ئەم بابەتە دیدارێکی دوورو درێژم لەگەل فواد عارف کردووەو کاتی خۆی بەشێکی بلاو کراوەتەوە، من و مەجید سالح کردومانە و دوو جار فواد عارفمان بینیوە جارێك لە بەغدا لەمالی دکتۆر کەمال مەزهەر، جاری دوەم لە مالەکەی خۆی لە سلێمانی.

حەنا بەتاتو لە کتێبی سێیەمی ئێراقدا بەشێکی بۆ بابەتی هەشتی شوبات و کودەتای بەعسییەکان تەرخان کردووە، ئەو دەلێت ئەو کودەتایە خاوەنەکەی بەعسەو کەسی تر نیە هەر لەوێدا باسی رۆلی سەرەکی عەلی سالح سەعدی دەکات لە کودەتاکەداو ئەوەش دەنووسی کە کوردە و خەلکی هب هبی تەنیشت بەغدایە کە ئەو دەم سەر بە دیالە بووە.

حەنا بەتاتو باسی خۆبەدەستەوەدانەکەی قاسم دەکات لە کاتژمێر ١٢/٣٠ خولەکی رۆژی ٩ی مانگ. کاتژمێر یەك و نیو گوللە باران کرا.دوای یەك کاتژمێر لە خۆبەدەستەوەدان.

لە ماوەی سی رۆژی ٨-١٠ی شوبات بە پێی خەملاندن لە شیوعییەکان نزیکەی ٥٠٠٠ کەس کوژراوە.هەندێکیش باس لە ژمارەی کەمتر دەکەن

لە کتێبەکەی حەنا بەتاتودا ستەمکاری زیاتر باس کراوە هەروەك چۆن یاداشتی شیوعییەکانیش ئازاری زۆر دەگێرنەوە.

ئەحمەد بانیخێلانی لە یاداشتەکانی خۆیدا بە ناوی یادەوەرییەکانم کە سالی ٢٠١٤ لە سلێمانی چاپکراوە باس لە درندەیی و ستەمی حەرەس قەومییەکان دەکات، بەتایبەت ئەو کاتە ئەو لە کەرکوك گیراوەو زیندانی کراوە.

بەگشتی حەرەس قەومییەکان لەو ماوەیەدا هەرچی نەشیاوە کردوویانە، مرۆڤ کە شاهید و گەواهی دەرەکان دەدوێنێ، یەك بە خۆی مچورکە بە لەشیا دێت، ئەو درندەو بڕندانە لە

چیدا لە مرۆڤ چونە، دەستیان لە هیچ نەپاراستوە، شوانیان کوشتوەو مەڕو ماڵاتەکەیان بردوە، پەلاماری ماڵی ئەوانەیان داوە کە پێشتر دۆستیان بوونەو لەلایەن ئەوانە وە هاوکاری کراون، ئەوان بە تالان کردن و سوکایەتی پێکردنیان چاکەیان داونەتەوە.

کورد هەوڵی داوە پێش کودەتاکە لەگەڵ بەعسی و قەومییەکان پێك بێت و بەپێی یاداشتێك برایم ئەحمەد لە ڕێگەی کەریم قەرەنیەوە لە ساڵی ١٩٦٢ نامەیەکی بۆ تا هیر یەحیا ناردوە ئەمە لە کتێبەکەی دانا ئادەمز شمیدت "گەشتێك بە وڵاتی قارەماناندا " جارێکی تر باس کراوە گوایە تاڵەبانی بۆی گێڕاوەتەوە.

دیارە ئەم هەوڵە لەلایەن پارتیەوە بووەو پێیان وابووە، بەعسییەکان ماف کورد دەدەن، ئەحمەد بانیخێلانی لە بیرەوەریەکانی خۆیدا باس لەو خۆش باوەڕیەی کادیرەکانی پارتی دەکات کاتی پێکەوە لە زیندان بوونە، بەڵام زۆری نەخایاندوە بەعسی و قەومییەکان لە وادەو بەڵێنی خۆیان پاشگەز بوونەتەوەو بە شێوازێکی دڕندانەو وەك ئەوەی شێخ رەوف خانەقاو شایەدەکان دەیگێڕنەوە پەلاماری کوردستانیان داوە.

لەگەڵ ئەوەشدا برایم ئەحمەد باس لەوە دەکات کە پارتیش بەگومان بووە، لە بەعسی و قەومییەکان و پێش پەلاماری ئەوان بۆ سەر کوردستان ئەمان خۆیان پاراستوە " بڕوانە دیداری نێوان مامۆستا برایم ئەحمەد و عەبدوڵا ئۆچ ئالان، دادگای مێژوو "لەوە دەچێت بە عسیەکان و قەومییەکان ویستبێتیان لە ڕێگەی بە نەرمی مامەڵە کردن لەگەڵ کوردو دەستی دەستی پێکردنیان زیاتر جێپێی خۆیان قایم بکەن، هەربۆیە کاتی تەواو لەسەر پێی خۆیان دەوەستن، یەکسەر هەڕەشەی توند لە کورد دەکەن. بۆ ئەمەش سوود لە حەرەس قەومی و بە کێگیراوە کانی کورد دەبینن.

### * جاش فرسانەکان

بەعسی و قەومییەکان لەلایەکەوە بە درۆ بەڵێنی ئەوەیان بە کورد ئەدا کە مافەکانیان ئەدەن، لە لایەکی دیکەشەوە سەرقاڵی ئەوە بوون جاش درووستبکەن، ئەوە بوو لە ٩- ٦ -١٩٦٣ هێرشیان هێنایە سەر کوردستان و یەك ڕۆژ دواتر داوایان لە شۆڕشی کورد کرد بێقەیدو شەرت و لە ماوەی بیست و چوار سەعاتا خۆیان بدەن بە دەستەوە، حەرەس قەومییەکانیشی بەردایە کورد، جگە لە حەرەس قەومییەکان کە وەك هێزێکی میلیشیای دڕندە دەردەکەوتن، هەر لەوان هێزێکی عەشایەری عەرەب بەناوی " فورسان وەلید " وەك ئاماژەیەك بۆ هێزەکانی خالیدی کوڕی وەلید و لە کوردیش هێزێکی بەناوی " فورسان سەلاحەدین " وەك ئاماژە بۆ سەلاحەدینی ئەیوبی دروستکرد، فورسان سەلاحەدین ڕاستەوخۆ لە ژێر سەرپەرشتی بەدرەدین عەلی پارێزگاری هەولێردا بوون، ئەو پارێزگارەی دواجار لە شۆڕش کوشتیان، لە دەستنوسێکدا کە ئەو ڕۆژگارە نووسراوەو ناوی خاوەنەکەی بەسەرەوە نیە ئەمە دەگێڕێتەوە" حکومەتی عێراق ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٩ هێرشی دڕندانەی بۆ سەر کوردستان هێنا کە هیچ حکومەتێکی عێراقی تا ئەوسا ئەوەندە دڕندەییەی لە گەڵ کوردا بە کارنەهێنابوو.

حکومەت لە ٦/١٠ دا بە ڕەسمی داوای لە شۆڕشی کورد کرد کە بێ قەیدو شەرت لە بیست و چوار سەعاتدا تەسلیم ببی، دەسەڵاتی هەموو کوشتن و بڕین و تالان و لە نێو دانێکی بە پێی (قانونی ژمارە ١٨ی ساڵی ١٩٣٥) دا بە هێزەکانی لەشکر کە بەو پەڕی بەر بڵاوی بەکار هێنرا، کۆمەڵێك بەیانی عەسکەری بۆ پاراستنی نەوتی کەرکوك لە مەترسی کورد دەرکرا، جگە لە عەشایەری جاشی کورد بە ناوی فورسان سەلاحەدین، کە پێشوو تر بەدرەدین عەلی موحافزی هەولێرو پیاوی ئینگلیز و دوژمنی بارزانی سازی کردبوون، ئەوەبوو بارزانی بەدرەدین عەلی کوشت، عەشایەری عەرەبیش بەناوی فورسان وەلید نێردرانە زۆر ناوچەی کوردستان، کە بە شێوەی زەمانی مەغۆل ڕەفتاریان دەکرد، ماڵ و ناوماڵی کوردیان داگیر دەکرد و تەنانەت کچ و ژنی کوردیشیان لە دەورو بەری کەرکوك بە تالان دەبرد " تا دوای ئەو دەستنوسە بەو جۆرە چیرۆکە ستەمکارییەکە دەگێڕێتەوە.

لەو چاو پێکەوتنانەدا کە کردومانە شایەدەکان چیرۆکی زۆر کاریگەرو غەمناك دەگێڕنەوە، بۆ نموونە چۆن شوانەکان بە دیلی دەکوژن و دواتر مەڕو ماڵاتەکەی تالان دەکەن،یان چۆنێتی کۆکردنەوەی خەڵکی ئاوای فەرقان و دواتر گوللە بارانکردنی چەندین کەس لێیان لە چەندین شوێن ئەم چیرۆکە تالانە دووبارە دەبنەوە. عەبدوڵا کۆمەڵە کە خەڵکی ئاوای چنار توە بەم جۆرە باسی کوشتنی باپیری دەگێڕنەوە، لە کانی پونگەڵەو گردە بۆڕو قولەکەوە دەوری ئاوای دەگرن و بە هۆسە دەچنە سەر ئاوایی، هەموو شتەکان بە تالان دەبەن و هەر لەوێش نیشان لە مامە قالە " دەروێش قادر " دەگرن و عەرەبێك گوللەیەك دەنێ بە تەوێڵێوەو دەیکوژێ، چنار توو گوندێکە لە نزیك لە سنووری ناحێی ئاخجەلەر، شێخ ڕەوف خانەقا لە شیعرێکی درێژدا بەم جۆرە ئەو تالان و تالانکارییە دەگێڕێتەوە

رۆژی هەشتی شەش ساڵی شەست و سێ
مێژووی دەرناچێ لە بیری کەسێ
مێژووی ئەم ڕۆژە پڕ لە برینە
رۆژی مەعرەکەی مردن و ژینە
بەلی هەشتی شەش مانگی حوزەیران
کوردستان کەوتە بن بۆمبوردمان
هەزاران پۆلیس عارەب و عەسکەر
هەر لە ناکاودا بێ جواب و خەبەر
هێرشیان هێنا بۆ شارو لادێ
وەك گورگی برسی بۆسەر بەرخی می
تاویان دایە سەر کوردانی فەقیر
دایانە بەر تۆپ تفەنگ و شەستیر
مەگەر حکومەت قەراری دابوو
ئەسبابیش هەموو حازر کرا بوو
لە پێش گەیشتن بە مانگی تەموز
کوردو کوردستان بکەنە خەڵوز
بۆ تواندنەوەی ئیحساسی قەومی

هێنرایه وجود حوراسی قەومی
ئیتر باسی تاڵان و برۆكە دەكات و دەڵێت:
خانوو، دەغل و دان، مەزاریع سووتا
زۆر بێگوناهیش تێكەڵ بوو سووتا
بە تاڵان رۆیی ئەشیاو مەرو ماڵ
لە تەشت و مەنجەڵ جاجم و بەرماڵ
ژن دوو سێ منداڵ بە باوەشەوە
بێ نان و بێ ئاو بەو نیوە شەوە

ئەوەی شێخ رەوف دەیگێڕێتەوە دڵۆپێكە لە دەریایەك لە ستەمكاری، ستەمكارییەك كەلانی كەم پێویستە رۆژگارەكەی سزا بدرێت بۆ ئەوەی دووبارە نەبێتەوە، ئافرەتێكی بەتەمەنی ئاوای شیرناو بۆی گێرامەوە چۆن عەرەبەكانی هەمان ناوچەكەی خۆیان و ئەوانەی كە شەو ورۆژ پێكەوە بوون و وەك كەس و كاری یەكتریان لێهاتبوو دەكەوتنە پێش حەرەس قەومییەكان بۆ تاڵانكردن و سووتاندنی گوندەكانی كوردەواری، خەڵكی ئاوایەكانی دووبز، سالەیی، شوان و شوێنەكانی تر بە جۆرەها شێوە چیرۆكە ئازار بەخشەكان دەگێڕنەوە.

* جوگرافیای ناوچە پەلامار دراوەكان:

حەرەس قەومییەكان بە هاوكاری سوپا پەلاماری هەموو ناوچەی سۆران دەدەن، ئەو پەلامارانە كە سەرەتا لە كەركوكەوە دەست پێدەكات، هەموو ناوچە كوردەوارییەكانی ئەو پارێزگایە دەگرێتەوە، وەك ناوچەكانی شوان و سالەی و شێخ بزێنی و ئاو داوێ و گل و بان جەباری و ناوزەنگنەو شێخان و ناحیەكانی نەوجول، قادركەرەم، شوان، ئاخجەلەرو سەنگاوو تەواوی شوێنەكانی تر، لەو پەلامارانەدا عەرەب هەموو شتێ بە تاڵان دەبەن، هەندێك لە گێرەرەوەكان باس لە تاڵانی كچ و ژنی كوردیش دەكەن، بە گشتی دەبێ بڵێین، پەلامارەكانی حەرەس قەومی هەموو ئەم ناوچانەی گرتوەتەوە:

یەكەم: هەموو بەشە كوردەوارییەكەی پارێزگای كەركوك، بەتەواوی قەزاو ناحیێ و گوندەكانەوەو لەو سنوورە سەدان گوند سوتێنران و تاڵانكران، ئەوە جگە لەوەی پەلامارو تاڵانەكان ناو شاری كەركوك و قەزاو ناحیەكانیشی گرتوەتەوە.

دووەم: بەشە كوردییەكانی هەردوو پارێزگای دیالەو تكریت، بەعسی و قەومییەكان لەو دوو پارێزگایەش دەستیان لە كورد نەپاراست و تاڵان و تاڵانكاری زۆریان كرد.

سێیەم: پارێزگای هەولێر، قەومی و بەعسییەكان لە زۆربەی ناوچەكانی پارێزگای هەولێر هەمان تاڵان و تاڵانكارییان بە رێوە بردو چەندین گوندیان لە سنووری مەخمورو قەراج و كەندێناوەقەرەچوغ سووتاند و چەندین كەسیان كوشت، ئەو گوندانەی لەم ناوچەیە بەر كەوتن بە شێكیان بریتی بوون لە " كاوەرە، سمایلاوە، تەلرەخێمەكان، سۆق سمایل، ئازیكەند، دەربەندسیان، شەعەل، گورگە، سێبیران، مشار، قەرانە سۆرانی مەزن و تا دوای ".

چوارەم: سنووری پارێزگای سلێمانی و ناو سلێمانی و مەنعە تەجەولەكەی زەعیم سدیقی جەلاد، كە ئەویش یەك بە خۆی قەسابخانەیەكی گەورەی لە شارەكە بۆ خەڵكە سڤیلەكە دروستكردو دەیان كەسی بێگوناهی شەهید كرد، ئێستا ناوی قوربانییەكان لەناو پاركی ئازادی هەڵواسراوە.

بە گشتی ئەو پەلامارو ستەمكارییە نزیكەی تەواوی باشووری كوردستانی گرتەوەو لە هەموو شوێنەكانیش كوشت و برو تاڵان بە رێوە چوو.

ناوی بەشێك لە قوربانییەكانی دەستی حەرەس قەومییەكان:

* **شەهیدەكانی ١٧ی ئابی ساڵی ١٩٦٣ی گوندی فەرقان**

مەلاتایر مەلا ئەحمەد مەلای مزگەوتی فەرقان
مەحمود محەمەد وەلی ئەندامی یەكێتی قوتابیان
ئەحمەد حەیدەر
كاكە رەش ئەحمەد قادر
قادر ئەحمەد قادر
عەلی عەبدولا بەسالاچوو ٧٠ ساڵ
جەبار عوسمان محەمەد
عوسمان قارەمان
محەمەد حەیدەر

بریندارەكان
سلێمان ئەحمەد
حەمید رەبعە
حاجی رەحمان رۆژبەیانی

ئەو گوندانەی تاڵانكران
یەكەم: باوا
دووەم: بەیانلو
سێیەم: فەرقان

هەروەها ئەم دێیانە سوتێنران " تەرجل، قازانبلاخ، پەنجا عەلی، كەوەڵە"

لە گەڵ بەشێك لە شاهیدەكاندا گفت و گۆمان كردووە، ئەوان بە دورو درێژی باسی چۆنێتی ئەو پەلامارو ستەمكارییەی سەر گوندی فەرقان و گوندەكانی تریان بۆ گێراینەوە، هەروەها باسی رۆڵی خەراپی هەندێ جاش و بە كرێگیراوی كوردیشیان بۆ كردین لەو رۆژەدا، ئەوەی كە منی زۆر ئازار دا جگە لە كوشت و برێ ئەو خەڵكە سڤیلەو تاڵانی مەرو ماڵاتی گوندەكە، لە ناوچوون و تاڵانكردنی كتێبخانە دەوڵەمەندەكەی مامۆستا مەلا جەمیلی رۆژبەیانی بووە، كە چەندین دەستنووسی نایابی تیا بووە، ئەو كتێب و دەستنووسانە پاش شاردنەوەشیان لە دەرەوەی گوند دۆزراونەتەوەو حكومەت بردونی. سەبارەت بە كتێب و دەستنووسەكان دەگێڕنەوە گوایە دواتر هەندێ پارەیان بۆ مامۆستا ناردوە، ئەویش ناردویەتیەوەو گوتویەتی، من بیست ئەوەندە پارە دەدەمە حكومەت دەستنووسەكانم بۆ بگێڕێتەوە.

پەلامارەكانی ١٩٦٣ ی حەرەس قەومییەكان نزیكەی هەموو كوردستانی گرتوەتەوە بەتایبەت لەوناوچانەی كە هاوسنوورن لەگەڵ ناوچە عەرەب نشینەكان و نزیكەی ٥١٪ی هەموو ناوچەكانی كوردستانی گرتوەتەوە لە پارێزگای باقوبەوە تا پارێزگای موسڵ، لە پارێزگاكانی " كەركوك، سلێمانی، هەولێر ".

لە نامیلکەیەکی بچوکدا بەکر تەیفور بەشێك لە چیرۆکی ئەو ستەمکارییە لە سنووری شوان و سالەیی و شێخ بزێنی دەگێڕێتەوە، حەرەس قەومییەکان بە پالپشتی سوپا لە ڕۆژی ٢٥- ٦-١٩٦٣ پەلاماری گوندەکانی " بیبانی گەورەو بچووك، قادر باغر، یارمجە، شانشین، کتکە، گورزەیی، زەردك، گەلۆزی، قەزنەفەر، گوڵدەرە، بیرەسپانی خوارو ژووریان دا" ئەم پەلامارانە کارێز و بیرالك و عەلی بەیان و تولکیشی گرتەوەو لە سنووری بیبانی ژوورو، کاکل ڕەزاو نەعمانی کوریان لە کاتی دروێنەدا شەهید کرد جگە لەم شەهیدانە لای وەکاشەش ئەم هاووڵاتیانە گوللە باران کران:

حەمید حەمەدەمین سولەیمان - بیرەسپانی ژوورو
فەقێ محەمەد عەلی - بیرەسپانی ژوورو
حاجی حەمە ڕەش سالح - بیرەسپانی ژوورو
عەلی عومەر سمایل - بیرە سپانی ژوورو
نامیق عەبدوڵا حەیدەر -بیرە سپانی ژوورو
فەتاح محەمەد ئەمین قولی - بیرەسپانی خواروو
نەعمان حەمەڕەش - بیرەسپانی خوارو
عەبدول تۆفیق محەمەد ئەمین - بیرەسپانی خواروو
سمایل ئەحمەد تەلانی - نەبیاوە
محێدین سالح -نەبیاوە لە گەڵ کوڕێکیدا
ئەحمەد محێدین سالح - نەبیاوە
سەعید مامە ئەحمەد - یارمجە
جەبار ئایشان - یارمجە
جەوهەر حەسەن - یارمجە
حەمەدەمین عەبدوڵا ڕەزا - زەردك
فازڵ ڕەشید - بیرە سپانی ژوورو
کاکە ڕەش حەمە عەزیز - بیرالك
سەید عەلی - بیرالك
شەریف حەمە عەلی - بیبانی گەورە
کوێخا نامیقی قادر باغر
ئەحمەد شوان - شوان بوو
دێوانە عەلی - بیرەسپانی ژورو
ئەحمەد لەتیف - شوان بوو
عەلی حەمە سەعید ئەرمەنی - شوان بوو
سەلیم هەولێری
عەبدوڵای حاجی قەرە سالم
حەمەد خدر قەشقەی - گەلۆزی

هەموو ئەم شەهیدانە لە ڕۆژانی ٢٥-٢٦-٢٧ ی ٦ی ١٩٦٣ شەهید بوون

شەهیدەکانی دەرماناو:
بەدیعە یاسین حەسەن - دەرماناو
فاتم - دەرماناو
محەمەد ئەحمەد - دەرماناو
مامز خێزانی محەمەد جوامێر - دەرماناو
عومەر محەمەد - دەرماناو
شەهید بوونی دوو منداڵ

بریندارەکان
کانەبی کەریم
غەفور محەمەد تەها
یابە تەها
عەتیە یابە - ئەمانە دەرماناوی بوو بە تۆپ باران بریندارو شەهید بوو ن

ئەم هاووڵاتیانەی قەرەدەرەش لە دەرماناو شەهید بوون:
عایشە
هەمینە سالح محەمەد
کەریم فەتاح سالح
ڕووناك فەتاح سالح
غەریبە تەها عەبدول
بەدریە عەبدول محەمەد
حەکیم فەتاح سالح
مونیرە عەبدول محەمەد
ڕەحیمە محەمەد ئەمین مەولود
قاسم سەعید سالح
غەریبە سەعید سالح
کافیە سدیق مستەفا
ئەحمەد محەمەد ئەحمەد
گوڵە حەسەن ڕەمەزان
مستەفا مەلا مەحمەد قەرەدەرە - سێ مانگ

هەروەها لە سنووری قەزای مەخمور حەرەس قەومییەکان ئەم هاووڵاتیانەیان شەهید کرد:
مام هەینی لە گوندی کاوەرە
خالید یاسین تەها لە گوندی سمایلاوە
حەمە عەلی لە گوندی تەلە رخێم
تاهیر محەمەد جوکز لە گوندی تەلە رخێمی گەورە
ئەنوەر محەمەد جوکز لە هەمان گوند
یاسین تەها لە سمایلاوە
کوڕێکی شەریف بێکراس لە سۆفی سمایل
شوانێك لە گوندی لاسۆر
سالح کاوێز لە نازیکەند
خەلیل لە تەلە ڕخێم
سەلام لە گردەشینە
میرەم بە کورینك لە گوێر
خالید برای مەلا عومەر لە جل هەوێزە
مەسعود برای کوێخا سلێمانی تەلە رخێم
سابیر کوێخا عەزیز لە کوشاف
عەریف سلێمان لە تەلە رخێم
خەلیفە خدر لە دەربەندی سیان
قادر عومەر لە دەربەندی سیان
حامید حەمەد لە دەربەندی سیان
ستیلە خدر لە دەربەندی سیان
سەعید شێخ ڕەشید لە دەربەندی سیان
محەمەد یابە لە دەربەندی سیان
فەرمان حەسەن لە شەعەل
ئەحمەد عەبدوڵا لە گورگە
ئەحمەد حوسێن لە سەرگەڕان
یاسین قادر لە سێبیران

عومەر سالح سەمین لە مشار
نامیق عەولا سەمین لە مشار
سەلیم حوسێن سەمین لە مشار
ئەحمەد مەولود یاقوب لە قەرانە سۆرانی مەرزان
حەسەن حاجی پیرداود لە قەرانە سۆران
جەمیل کەریم لە کەزۆکی حاجی حەمەد
عوسمان حاجی حەمەد لە لاسۆر
مەولود حاجی جەبور لە تەلە مەتار
خوشکێکی جەبار حەمید لە عەوێنە
محێدین کاکەمین لە مەحمەر ئۆمەران
سەعدی عەلی لە کەرەبەشەی کۆلان
عەولا عەبدولا لە سایمان بەخشیان

بەعسی و حەرەس قەومییەکان هەر لە سنووری کەرکوك و گەرمەسێر ئەوەیان نەکرد لە سنووری ناوچەکانی دیکەش ئەوەیان کرد بۆ نموونە ئەو ستەمکارییەی زەعیم سدیق دەرهەق بە خەڵکی سلێمانی کردی، ئەو کاتە دادگای دۆڵی مەرگ لەلایەن زەعیم سدیق مستەفاوە لە سلێمانی دانرا، لە ٩ی حوزەیران بڕیاری قەدەغە کردنی هات و چۆ درا سوپا بە یارمەتی حەرەس قەومی و بەکرێگیراوانی کورد، کەوتنە ڕەشبگیرو ٢٦٧ کەسیان گرت، لە دادگای شێوی مەرگا بڕیاری کوشتن و گولله باران بۆ ٨٤ کەسیان دەرچوو، دادگاکە بریتی بوون، لە " زەعیم سدیق مستەفا سەرۆکی دادگاو فەرماندەی لیوای بیست، عەبدولرەزاق سەید مەحمود موتەسەریفی سلێمانی، موقەدەم فەیسەڵ، عەقید جاسم بەغدادی، دکتۆر موحەمەد عەلی حوسێن " بە گشتی لەو یەك دوو ڕۆژەدا لە سلێمانی ١٧٦ کەس کوژران و گولله باران کران.هەر لەو ڕۆژەدا لە کەرکوك و هەولێر و کۆیەو چەمچەماڵ و ڕانیەو بێتواتە ڕەشبگیر کراو خەڵك گوللەباران کران. بڕوانە شاری سلێمانی نووسینی هەوراز جەوهەر مەجید چاپی ساڵی ٢٠١٢ تەوەری سێیەم کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ لاپەرە ١٤٦ هەتا دوایی.

ئەوەندەی من ئاگادار بم زەعیم سدیقی جەلاد تا دوای ساڵی ٢٠٠٣ ش مابوو کاتی بە سەرکردایەتی کورد وترابوو ئەو جەلادە ماوەو لە بەغدایە، ئەوان هیچ کاردانەوەیەکی ئەوتۆیان نیشان نەدابوو بۆ ڕاکێشانی بۆ بەردەم دادگا.

لە دوای دە ساڵ زیاتر لە ڕووخانی بەعس تا ئێستا وەك پێویست دەسەڵاتی کوردی کاری لەسەر ئارشیفکردنی ئەم بابەتە نەکردووە، کە بەلای منەوە، ئەم پرسە زۆر لە پرسی دوجەیل گەورەتر و کاریگەر ترە هەروەك بە یەکەمین ستەمکاری بەعسییەکانیش دەدرێتە قەڵەم.

لەنێو چیرۆکی ئەو ڕووداوە کاریگەرانەی ساڵی ١٩٦٣ دا چەندین چیرۆك هەن کە مرۆڤ نازانی چۆن هەڵوەستەیان لەسەر بکات، بۆ نموونە چوونەتە سەر ڕانەمەری کەسێك و پاش ئەوەی شوانەکەیان بە دیلی کوشتووە، ڕانەکەشیان تاڵانکردووە، یان داوای هاوکارییان لە خەڵك کردووە بۆ کارێك لە گەرمەی هاوکارییەکەدا کەسەکانیان گوللەباران کردووە، لە هەندێ ماڵ لە کاتی تاڵاندا ئەوەی بردوویانە بردوویانە، ئەوەی نەیانبردووە یان سووتاندوویانە یان لەناویان داوەو پیسیان کردووە، بۆ ئەوەی سوودی لێنەبینرێت.

لە کۆیەش ڕۆژی ٤ی تەمووزی ساڵی١٩٦٣ دوای قەدەغەکردنی دەرچوون سەدان هاووڵاتی دەگرن و بە زیندانکراوی دەیانبەن بۆ موسەیەب، تەنها شەش کەس لەوان دەهێڵنەوەو ئەو شەش کەسەش ڕۆژی ٧ی تەمووز لەناو شار بە دینگەکانی شارەوە بە پشتوێنەکانی خۆیان دەیانبەستنەوەو گوللەبارانیان دەکەن شەهیدەکانیش بریتی دەبن لە:

یەکەم: محەمەد وەهاب ئاغا
دووەم: شەفیق ئۆمەر چایچی
سێیەم: سولەیمان حەمە قاوەچی
چوارەم: حەمەئەمین ئەحمەد ئاغا
پێنجەم: یوسف حەنا مەسیحی
شەشەم: حەنا یوسف مەسیحی

هەر ڕۆژی ٤ی تەمووز بە دەسرێژی گولله ئەم هاووڵاتییانە شەهید دەکەن " حەمید فەقێ سمایل، مەلای شێخ تاهیر، جەلال سمایل ئەحەسوور، خاتوو مونیرە مەلاتاهیرو کۆرپەکەی شوان سابیر"هەروەها ڕۆژی ٣١ی تەمووزی ساڵی١٩٦٣ جارێکی تر چوار هاووڵاتی ئەو شارە گوللەباران دەکەن کە سیانیان بران بەناوەکانی:

یەکەم: حەسەن شەریف ئیبراهیم
دووەم: حوسێن شەریف ئیبراهیم
سێیەم: عومەر شەریف ئیبراهیم
چوارەم: قولی کوێخا عەلی کێلە سپی

ئەمان دوای ئەوەی شەوو ڕۆژێك بە دینگەکانی ناو بازارەوە دەمێنن مەلا عەلی حاجی تۆفیق و قەشەیەکی مەسیحی قورئان و ئینجیل دەبەنە تکای تاهیر شەکرچی تاوانباری ئەو ستەمە بۆ ئەوەی شەهیدەکان بکەنەوەو بیاننێژن. کازم عومەر دەباغ خۆی شاهیدی ئەو ڕووداوەیەو لە ژمارە ١٠٩٧ی ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ساڵی٢٠١٣ لە لاپەرە ١٨ی هاووڵاتی بڵاوی کردووەتەوە.

هەڵبەت ژمارەی قوربانییەکان هەر ئەوەندە نین و لە چەندین شوێنیش ناوی تریان باس کردووە یان بە نیوە چڵی بۆیان ناردووم لە ڕاستیدا من ئەمە وەك هەنگاوی یەکەم دەخەمە بەردەست و بە هیوام لە ئایندەدا کاری زۆر باشی لە سەر بکرێت.

*** بۆچی حەرەس قەومییەکان کوردیان کردە ئامانج:**

بەعس و قەومییەکان لە بەغدا حەرەس قەومیان بۆ ئەوە دروستکرد تا بە شیوعییەکان و قاسم بڵێن، خەڵکی ئەم وڵاتە ئێوەیان ناوێ، هەرچەند لە ڕاستیدا دروستکردنی ئەم هێزە ترسناکە میللییە بۆ ترساندنی هاووڵاتی ئێراقی و بەتایبەت بۆ ترساندنی بیرو ڕا جیاوازەکان بوو، بەڵام زۆری نەبرد ئەم هێزە میلیشیاییە بۆ لێدانی کورد بە کارهێنراو لە ناوچە هاوسنوورەکانی کوردو عەرەب لە پارێزگای کەرکوك، بەعسییەکان هاتن زۆرترین عەرەبی ئەو ناوچانەیان پڕ چەك کردو بەریاندانە کورد، ئەمەش لەلایەکەوە بۆ دوورخستنەوەی کورد بوو لەو ناوچانەو بۆ ترساندنیان بوو، لەلایەکی دیکەوە

بۆ ئەوە بوو کە تەعریبی ئەو ناوچانە بکرێت و هەنگاو هەنگاو پاشەکشە بە کورد بکات لە ناوچەکانی سنووری چیای حەمرین و حەویجە و تا ڕادەیەکی زۆریش لەوەدا سەرکەوتوو بوو، بەتایبەت ئەگەر بزانین نەخشەی تەعریبی ئەو ناوچانەو نیشتەجێکردنی عەرەب لێیان زۆر پێش هاتنی بەعسەکان و هەر لە سەردەمی پاشایەتی و یاسین هاشمییەوە کاری لەسەر کرابوو، پێویستە ئەوەش بووترێ کە قەومییەکان و بەعسییەکان هەمیشە وا سەیری کوردیان کردووە کە هەڕەشەیە بۆ سەر وڵات و وەك تەنێکی نامۆو ناجۆر وایە بە جەستەی وڵاتەوە.

ترسی بەعس لە بوونی کورد پەیوەندییەکی قوڵی بە فەلسەفەی سیاسی و دیدگای بەعسەوە هەیە بۆ ئەوانی تر، بەعس وەك بزووتنەوەیەکی سیاسی ناسیۆنالیستی عەرەبی بڕوای بە بوونی ئەوانی تر نییە لە چوارچێوەی وڵاتێکدا کە بەلای بەعسەوە دەبێت وەك وڵاتێکی عەرەبی سەیری بکرێت، هەر ئەمەش بەس بوو بۆ ئەوەی کە هەوڵی سڕینەوەی کورد بدرێت.

ئەوەی بەعسییەکان لە سنووری کەرکوك و دەوروبەری کردوویانە نەك هیچی لە کردەی ستەمکارانەی نازییەکان کەمتر نییە بگرە زۆر ترسناك ترە، تەنانەت لە هەندێ شوێن بەر لە کوشتنی کەسەکان سووکایەتی زۆریان بە قوربانییەکان کردووە.

هەڵبەت ئەم ستەمکارییانە زۆر لەوەی دوجەیل گەورەترن کە سەدامیان لەسەری لە سێدارە دا، هەروەها تا ئێستا هەوڵی ئەوەش نەدراوە ئەم دۆسیە گرنگە بخرێتە بەردەم دادگای باڵای تاوانەکان بۆ ئەوەی کاری لەسەر بکرێت، ئەوەی من کردوومە لەو بارەیەوە هەنگاوێکی بچووکەو هیچی تر.

*** چۆنێتی ئامادەکردنی ئەم پرسە بۆ بەردەم دادگا:**

لە ڕاستیدا هەر بۆخۆی چۆنێتی نووسین و ئامادەکردنی ئەم بابەتە وەك بابەتێکی دیرۆکی نییە تا ئەوەی ئەمە هەوڵێکە بۆ دروستکردنی دۆسیەی ئەو ستەمکارییە بۆ بەردەم دادگا، ئەوەی جێگای نیگەرانییە دەسەڵاتی ئێستای ئێراق نەگەڕاوەتەوە بۆ ئەو مێژووەو لە ساڵی ١٩٦٨ وە لە سەر ستەمکارییەکان وەستاوە، ئەمەش لاپەڕەیەکی گرنگی ستەمکاری پشتگوێ خستووە کە ناکرێ لە بیر بکرێت، ئەمەی من کردوومە هەنگاوێکی بچووکە و ڕەنگە لە ئایندەدا ئەگەر بوارم بێت وەك ئاوری دیرۆکی بگەڕێمەوە سەری، لانی کەم لەم هەنگاوەدا توانیومانە ڕێگە خۆشبکەین بۆ ئەوانی تر تا لە ئایندەدا توێژینەوە لەو بارەیەوە بکەن، ئامادەکردنی ئەم بابەتە بۆ بەردەم دادگا پێویستی بە چەند هەنگاوێك بوو، بەم جۆرەی خوارەوە:

یەکەم: ناوی قوربانییەکان لەم نووسینەدا زیاتر لە ناوی ١٠٠ قوربانیمان بە شەهید و بریندار نووسیوە کە دەکرێ دادگا بە دواداچوونیان بۆ بکات و کار لەسەر ئەوە بکرێت کەس و کاریان و تەنانەت بریندارەکانی ئەو ڕۆژگارە ئەوانەی کەماون بچنە بەردەم دادگا.

دووەم: ناوچەی قوربانییەکان، تا ڕادەیەك هەوڵمان داوە بە شێك لەو ناوچانە دیاری بکەین کە ستەمکارییەکانی تیا بە ڕێوە چووە.

سێیەم: ناوی بەشێك لەوانەی بەو کارە هەستاون واتە ستەمکارەکان، ڕاستە لەمەدا هەندێك کێشە دروستبوە بەوەی، خەڵکانێك نایانەوی ناوەکان بڵێن، بەڵام هەر ناو لەبەر دەستە بۆ ئەوەی بدرێنە دادگا.

چوارەم: بۆ ئەم مەبەستە جگە لەوەی ئێمە دیدارێکی زۆرمان کردووە، بەڵام هێشتا پێویستە درێژە بەو دیدارانەو کۆکردنەوەی ئەو چیرۆکە تاڵانە بدرێت، کە ڕەنگە بۆ من هەر ئەوەندە توانا هەبووبێت، بەو هیوایەی بۆ ئەو مەبەستە تیمی تایبەت دروست بکرێت.

پێنجەم: لەو ستەمکارییەدا هەر کوشتن و تاڵان و سووتاندنی گوندەکان بەڕێوەنەچووە چەندین شێوازی تری ستەمکاری پیادەکراوە کە پێویستە کاری لەسەر بکرێت، بۆ نموونەگواستنەوەی چەندین گوندلە سەر شوێنێکەوە بۆ سەر شوێنێکی تر وەك گواستنەوەی گوندەکانی سەر ناحیێ قەرەتەپە لە ساڵی ١٩٦٣ بۆ سەر جەلەولا بۆ نموونە گوندە کوردەکانی وەك " بەیانلو، بنە باغ، تەپە چەرمگ، شێخ بابا، کنە سوور، عەلوش " و تا دوای ئەوەی جێگەی داخە زۆر جار شاهید و گەواهیدەرەکان تەنیا لە بەرانبەر ئەوەدا قسە دەکەن و زانیاریەکان دەگێڕنەوە کە چیان لەبەرانبەر ئەوە دەست دەکەوێت، ئەوەش بۆ من ئازارو ناخۆشی خۆی هەیە، چونکە هێشتا ئێمە بە تەواوەتی لە بایەخی دادوەری گوێزەرەوەوسزادانی دیرۆك بۆ باشتر کردنی سبەینێ تێنەگەیشتوین.

شەشەم: ئەرکی حکومەت و لایەنی پەیوەندیدارە بانگەواز بکات تا کۆی ناسنامەی قوربانییەکان کۆبکاتەوەو دۆسیەی تایبەتیان بۆ دروستبکات، بۆ ئەوەی لە کاتی دادگای کردنا ئامادەبکرێن و سوودیان لێوەربگیرێت.

حەوتەم: دەبێت کۆی زەرەرو زیانەکانی ئەو ڕۆژگارە کە بەسەر خەڵکی سڤیلی ناوچە ستەملێکراوەکان هاتووە، ڕیزبەند بکرێت و ئامادە بکرێت، بۆ ئەم خاڵەو بۆ بەشێك لە خاڵەکانی دیکەی سەرەوە، پێویستە وەزارەتی شەهیدان و ئەنفال تیمی تایبەت دروست بکات.

ئەرکی وەزارەتی شەهیدو ئەنفال سەبارەت بەم بابەتە:

ئێمە پێشتر هەندێ ئاماژەمان بەوە کرد کە پێویستە وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوانی کورد چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم بابەتە بکات، هەڵبەت لەبەر ئەوەی ئەو وەزارەتە ڕاستەو خۆ پەیوەستە بەو ستەمکارییانەوە کە لە گەلی کوردو گەلانی دیکەی سەر خاکی کوردستان کراوە دەبێت ڕاستەوخۆ ئەو وەزارەتە لەگەڵ لایەنە جیاوازو جۆراوجۆرەکانی ئێراق و نێو دەوڵەتی ئەو بابەتە باس بکات و کار بۆ ئەوە بکات، کەوەك جۆرێك لە هەوڵی سڕینەوەو جینۆساید چاوی لێبکرێت، ڕاستی خودی هەوڵەکە شێوەیەکی بەرچاوە لە شێوەکانی سڕینەوەو جینۆساید، لانی کەم لەو ڕووەوە کە هەوڵ دراوە کورد و عەرەب وەك دوو نەتەوەی نزیك لە یەکترو دراوسی بکرێن بە گژ یەکدا و هۆسەکانی عەرەب بۆ هەوڵی تۆقاندنی کورد بە پاڵپشتی سوپای ئێراق بە ئێمە دەڵێت، ئەم دوو

بەرەكی و هەولی سرینەوەیە دەیان ساڵ بەر لەوەی لە رواندا كاری لەسەر بكرێت لە ئێراق كاری لەسەر كراوە.
هۆسە توند و تیژەكانی " احن بدو – وین العدو " احن العرب اهل الغیره – نگرد الاكراد من هاالدیره " پڕن لە بۆنی ستەمكاری و سرینەوەو لە ناودان، بە دوژمن نیشاندانی خەڵكی سڤیل و كوشت و بڕكردن و تاڵانكردنیان تەنیا لەبەر ئەوەی كوردن جینۆساید نەبێت چی جینۆسایدە، بانگەشەی ئێمە عەرەبین خودان غیرەتین، كورد لەم زێدە دەرئەكەین جینۆساید نەبێت ئەدی چی ناوی جینۆسایدی لێدەنرێت.
ئەركی وەزارەتی شەهید و ئەنفالە ئەم بابەتە لە لەناوچوون و لە بیرچونەوە بپارێزێ و كاری وردی لەسەر بكات بۆ ئەوەی لە ئایندەدا نەوەكانی ئایندەی هەردوو نەتەوەی كورد و عەرەب و گەلانی دیكەش بزانن، چی دەرهەق بە خەڵكی بێچەك و بێتاوانی كورد كراوە هەر لەبەر ئەوەی كوردن و هیچی تر.
هەندی چیرۆكی ئەو رۆژگارە:
یەكەم: نەنكی خۆم كە خەڵكی گوندی سەیدانی خوارووە بۆی گێرامەوە عەرەبە تاڵانچییەكان پێشتر لە هەموو ئەو ناوچانە تەلابیان دەكرد كە دواتر تاڵانیان كرد " تەلابی " بن خەرمان كۆكردنەوەو بن خەرمان ماڵین بووە، ئەو ووتی لە كاتی تاڵانەكەدا ئەوەی دەیانبرد، دەیانبرد، ئەوەی ناشیان برد دەیانرژاندو پیسیان دەكرد.ئەو باسی لەوە دەكرد كە هەندێك لەو عەرەبانە تەنانەت كراسی ژنانیشیان تاڵاندەكردو لە بەریان هەڵدەكێشاو دەیانبرد.
دووەم: مەلاتایری قەرەتامۆر ووتی ئەو عەرەبانە یەكێكیان دەیان ساڵ سەپانی ماڵی ناسیاوێكی خۆیان ئەبێت لە چەمچەماڵ و دەزانێ چی هەیەو چی نیە لە كاتی تاڵانەكەدا لە گەڵ یەك دوو عەرەبی تر دەچنە هەمان ماڵ ئەویش زۆری پێخۆش دەبێت و دەڵێت شوكر تۆ هاتی ئیتر ترسم نیە و خزمەتی زۆری دەكات، كەچی ئەو پرسیاری ئەسپەكانی كابرا دەكات ئەویش دەڵی وەڵا لە ترسی تاڵان ئەوەتا خستومنەتە ئەو خانوەوەو دەرگاكەم هەڵچنیوە، كابرای عەرەبیش دەرگای هۆدەكە دەشكێنێ و ئەسپەكان دەبات.
سێیەم: باوكی رەفعەت عەبدوڵای ئەندامی مەكتەبی سیاسی یەكێتی نیشتمانی لە گەڵ چەند هاورێیەكی تریدا لە دەرەوەی ئاواییەكەی خۆیان دەبن كاتی عەرەبە تاڵانچی و حەرەس قەومییەكان پەلامار ئەدەن، یەك دوو عەرەب لەو دەشتە گوایە ئۆتۆمبیلەكەیان پەكی كەوتوە داوایان لێئەكەن هاوكارییان بكەن ئەوانیش دەیانەوی هاوكاریان بكەن، كەچی عەرەبەكان بە شێوەیەكی دڕندانە دەیانكوژن و بە جێیان دەهێڵن.
دیارە دەیان چیرۆكی لەم بابەتە هەیە كەنموونەی دڕندەی و خەراپی ئەو حەرەس قەومیانەیە، لەم ماوەیەی پێشودا لە گەڵ ناسیاوێكما كە دوو عەرەبی دۆستی خۆی لەگەڵ بوو پێكەوە لە كەركوك گفت و گۆی ئەو رۆژگارەمان دەكرد، یەكێكیان باسی ئەوەی كرد كە چۆن لەو دیوی زابەوە تاڵانی رانە مەری كوردی بە شەر لە عەرەب سەندوەتەوەو هێناویەتیەوە بۆ دۆستە كوردەكانی، دیارە ئەوە ئەوەی وەك چاكەو پیاوەتیەك باس دەكرد.

ئەوەی بۆ من جێیتێرامانە ئەوەیە لەو كاتەداو پێشترو دواتریش شاعیرو رۆشنبیرو بیرمەندەكانی كورد زۆر جیاواز لەو مامەڵە دڕندانەیەی عەرەب و حەرەس قەومییەكان، باسی برایەتی كوردو عەرەبیان كردووەو شاعیرێكی نەتەوەیی گەورەی وەك بێكەسی ئازاو بوێر دەڵێت:
دۆستی كوردو عەرەب زۆر كۆنە تاریخ شاهیدە
ناحەزی رووڕەش لە داخا با یەخەی خۆی دادڕی
گۆرانی شاعیرو بیر روناكیش لە شیعرێكی ناوازەدا دەڵێت:
برای عەرەبی چاو گەشم
تاڵ بوو بەشت تاڵ بوو بەشم
لە یەك بادە تاڵی نۆشین
برایی كردین بە هەنگوین
پێشترو دواتریش نموونەی ئەم جۆرە شیعرانە زۆرەو هەرگیز كورد وەك دوژمن سەیری عەرەبی نەكردووە، كەچی دیدی ئەوان لە نووسین و بیرو باوەڕیشیاندا هەر ستەمكارانە بوە، دیارە كردەوەكانیشیان ئەوەتا بە بەر چاوەوە.

*** قانون الحرس القومي رقم ( ٣٥ ) لسنة ١٩٦٣**

عنوان التشريع: قانون الحرس القومي رقم (٣٥) لسنة ١٩٦٣
التصنيف: قانون عراقي
رقم التشريع: ٣٥
سنة التشريع: ١٩٦٣
تاريخ التشريع: ١٩٦٣-٠٥-١٨ ٠٠:٠٠:٠٠

باسم الشعب
رئاسة الجمهورية
استنادا الي القانون الدستوري للمجلس الوطني لقيادة الثورة، وبناء علي ما عرضه رئيس الوزراء واقره مجلس الوزراء وصادق عليه المجلس الوطني لقيادة الثورة.
صدق القانون الآتي:
مادة ١
تشكل منظمات شعبية مسلحة تدعي قوات الحرس القومي وتكون لها قيادة مستقلة مرتبطة برئاسة اركان الجيش أو بأية جهة يقررها المجلس الوطني لقيادة الثورة.
مادة ٢
الحرس القومي قوات شعبية منظمة ومدربة علي استعمال السلاح قوامها الشعب المؤمن بحقه في الحياة الحرة الكريمة، وواجبها: -
ا – حماية الانطلاقة العربية في العراق وتثبيت طريقها الثوري التقدمي.
ب – معاونة القوات المسلحة في الدفاع المدني والدفاع عن البلاد في حالة الحرب او وقوع اعتداء خارجي.
جـ – المساهمة في حفظ الامن الداخلي.
د – المساهمة في مهمات الخدمة العامة وحملات الاعمار والبناء الاقتصادي والاجتماعي.
هـ – القيام بالمهام التي يوكلها اليه المرجع المختص أو من

يخوله.

مادة ٣

تتألف قوات الحرس القومي من:-

ا - المتطوعين العراقيين.

ب - الجنود وضباط الصف ونواب الضباط والضباط الاحتياط (في غير حالة النفير) غير المستخدمين في الجيش.

ج - المتطوعين من الاقطار العربية بناء علي موافقة رئاسة اركان الجيش.

د - العسكريين المنسبين من الجيش للعمل في الحرس القومي بموافقة رئاسة اركان الجيش وبطلب من قيادة الحرس القومي.

مادة ٤

يشترط في المتطوعين للحرس القومي ان يكون: -

ا - سالما من الامراض والعاهات الجسمية التي تمنعه من تحمل مشاق الخدمة.

ب - حسن السلوك والاخلاق.

جـ - لا يقل عمره عن خمس عشرة سنة ولا يزيد علي الخمسين سنة.

مادة ٥

يتعهد المتطوع بالخدمة في قوات الحرس القومي لمدة سنة واحدة بضمنها مدة التدريب التي تقررها رئاسة اركان الجيش ويجوز تمديد الخدمة عند انتهائها بعقود أخري اذا شهد آخر وحدته بأن خدمته مفيدة.

مادة ٦

لقيادة الحرس القومي فسخ عقود التطوع متي شاءت.

مادة ٧

ا - تكون الخدمة في الحرس القومي علي أساس التطوع وبدون راتب.

ب - يحق لقيادة الحرس القومي منح مكافأة مالية شهرية محدودة لبعض أفراد هذه القوات اذا اقتضت الضرورة ذلك أو لأسباب معللة وفقا للتعليمات التي تصدرها قيادة الحرس القومي وبموافقة رئاسة أركان الجيش.

ج - اذا كان المتطوع موظفا أو مستخدما ودعي الي الخدمة أثناء الدوام الرسمي بموافقة الدائرة المختصة يمنح راتب وظيفته الاصلية من دائرته.

د - تعتبر الخدمة في الحرس القومي عند دعوة المتطوعين خدمة فعلية لغرض الترفيع والتقاعد والتعويض بالنسبة الي دوائرهم ومؤسساتهم.

مادة ٨

تكون رئاسة أركان الجيش مسؤولة عن تدريب الحرس القومي وتجهيزه وتسليحه وفقا للتعليمات التي تصدرها.

مادة ٩

الحقوق التقاعدية والتعويضات لمنتسبي الحرس القومي تنظم بقانون خاص.

مادة ١٠

تنظم شؤون الانضباط والعقوبات بقانون خاص.

مادة ١١

تتحمل وزارة الدفاع النفقات المالية للحرس القومي وفقا للتعليمات التي تصدرها دون التقيد بالقوانين المالية المرعية وللسنة المالية ١٩٦٣ - ١٩٦٤.

مادة ١٢

لرئاسة أركان الجيش اصدار التعليمات الخاصة بشأن كل ما يتعلق بتنفيذ أحكام هذا القانون.

مادة ١٣

يعتبر هذا القانون نافذا من ٨ -٢ -١٩٦٣.

مادة ١٤

علي الوزراء تنفيذ هذا القانون.

كتب ببغداد في اليوم الخامس والعشرين من شهر ذي الحجة لسنة ١٣٨٢ المصادف لليوم الثامن عشر من شهر مايس لسنة ١٩٦٣.

المشير الركن

عبد السلام محمد عارف

رئيس الجمهورية

علي صالح السعدي احمد حسن البكر

نائب رئيس الوزراء رئيس الوزراء

ووزير الارشاد

ووكيل وزير الاصلاح الزراعي

طالب حسين الشبيب صالح مهدي عماش

وزير الخارجية وزير الدفاع

عزت مصطفي عبد الستار عبد اللطيف

وزير الصحة وزير المواصلات

محمود شيت خطاب مهدي الدولعي

وزير البلديات وزير العدل

عبدالعزيز الوتاري بابا علي

وزير النفط وزير الزراعة

محمد جواد العبوسي احمد عبد الستار الجواري

وزير المالية وزير التربية والتعليم

شكري صالح زكي رجب عبد المجيد

وزير التجارة وزير الاشغال والاسكان

مسارع الراوي حميد خلخال

وزير الدولة لشؤون وزير العمل والشؤون

الوحدة الاتحادية الاجتماعية

ناجي طالب عبد الكريم العلي

وزير الصناعة وزير التخطيط

حازم جواد فؤاد عارف

وزير الدولة لشؤون وزير الدولة

رئاسة الجمهورية لشؤون الأوقاف

ووكيل وزير الداخلية

نشر في الوقائع العراقية عدد ٨٠٩ في ٢ -٦ -١٩٦٣

الاسباب الموجبة

الملحق

تحقيقا للمصلحة العامة في مجال صيانة ثورة ١٤ رمضان وتثبيتا لحقوق وواجبات الحرس القومي في الجمهورية العراقية شرع هذا القانون.

یەکێك لە کێشەکان ئەوەیە دادگای باڵای تاوانەکانی ئێراق، دادگای تاوانی باڵای عێراق لە ١٧-٧-١٩٦٨بۆ ١-٥-٢٠٠٣ دەستپێدەکات واتە ئەوەی بەر لەو مێژووە روویداوە بە دوادا چوونی بۆ ناکات، لە کاتێکا ستەمکارییەکەی ١٩٦٣ بەعسی و قەومییە عەرەبییەکان کردویانە، بەڵام لە یاساکەدا فەرامۆش کراوە، هەرچەند خودی یاساکە دەڵێت ئەم دادگایە هەموو ئەو تاوانانەدەگرێتەوە:

١- تاوانی قرکردنی بە کۆمەڵ
٢- تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی
٣- تاوانەکانی جەنگ
٤- پێشێلکردنی یاساکانی عێراقی کە لە مادەی ١٤ی یاساکەدا دیاری کراوە.

ئەمە هەموو لە مادەی یەکەمی یاساکەدا هاتووە، لە کاتێکدا ئەوەی لە ١٩٦٣ روویداوە هەموو ئەو خاڵانە دەیانگرێتەوە کە لەسەرەوە هاتوون.

ئەوەی بۆ من جێگەی سەر سورمانە ئەوەیە بۆ نووسینی یاساکە زۆر جار ئەوانەی نووسیویانە گەڕاونەتەوە بۆ بڕیارو یاساکانی بەر لە ساڵی ١٩٦٣.

*** کورد و کەرکووکییەکان لە حیزبەکەی نوری سەعیددا :-**

لە دوای شکستهێنانی رێککەوتنامەی (المیثاق الدستوري) لە عێراقدا، نووری سەعید لە هەوڵێکدا بوو بۆ دامەزراندنی حیزبێکی سیاسی نوێ بۆ هاوسەنگکردنی باری سیاسی ئەو کاتە و لە هەمان کاتدا بەربەستێك دابنێت بەرامبەر هەڵسووکەوتەکانی (الوصي)، کە هەڵسوکەوتەکانی لەگەڵ سیاسەتی نووری سەعیددا یەکانگیرنابوو.

هەستا بە دامەزراندنی حیزبی (الإتحاد الدستوري) کە پێکهاتبوو لە لاوان و پیاوماقوڵان و سەرۆك هۆزەکان بۆ ئەوەی بەرامبەر حیزبە چەپەکانی عێراق بێت و چالاکی بەرچاوی هەبێت لەسەر ئاستی عێراق. بۆیە بڕیاری دا کە دەستەی دامەزرێنەر لە هەشت کەس پێك بێت، کە نووری سەعید نیوەی هەڵدەبژارد و نیوەکەی تری (سالح جەبر) هەڵیدەبژارد، هەروەها بڕیاری دا کە (سالح جەبر) سەرۆکی حیزبەکە بێت، چونکە زیاتر ماوەی هەبوو بۆ چالاکییەکانی حیزب، بەڵام بەردەوام نەبوو لە کارەکەی بە بیانووی ئەوەی کە هەریەکە لە (محەمەد عەلی) و (مووسا شابەندەر) دوو کەسایەتی شایستەی دەستەی دامەزرێنەر نەبوون، بەڵام نووری سەعید بەشداری پێکردن بەبێ گوێگرتن لە داواکەی سالح جەبر.

لە ٢٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ بە ژمارە ١٦٣١٦ی نووسراوی وەزارەتی ناوخۆ، رەزامەندی وەرگیرا بەدامەزراندنی حیزب.

لە ٢٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٩ یەکەم کۆنگرەی خۆی بەست و نووری سەعید وتاری خۆی لەو کۆنگرەیەدا خوێندەوە، وە بە تێکرای دەنگ نووری هەڵبژێردرا بە سەرۆکی حیزبی (إتحاد الدستوري) لەدواییدا دەستەی باڵای حیزب هەڵبژێردراو (٤٧)ئەندام پاڵێوران کە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:-

نووری سەعید، عەبدولوەهاب مەرجان، محەمەد عەلی مەحموود، سەعد عومەر، جەمیل ئۆرفەلی، عەبدولمەجید عەباس، ئەحمەد ئەلعامری، خەلیل کنە، عیزەددین مەلا، عەبدولوهادی چەلەبی، شێخ عەبدوڵڵا یاسین، شێخ موحان خەیروڵڵا، شێخ شەعلان سەلمان، شێخ عەبدولموحسین جەریان، تاریق عەسکەری، حاجی عجە ئەلدلی، مەتی سەرسەم، فەرحان ئەلعەرسی، غانم شەمران، محەمەد حەسەن کوبە، جەمیل عەبدولوەهاب، عەبدولقادر باش عەیان، عەبدولرەزاق شەریف، محەمەد حەبیب ئەلئەمیر، شێخ خەمیس ئەلزاری، سلێمان شێخ داود، شێخ خوام ئەلعەبد عەباسی، شێخ سامر سەعدون، محەمەد سالح بەحرعلوم، شێخ عەبدولرەزاق ئەلعلی، شێخ موشحن حەردان، نیهاد ئەلزەهاوی، سدیق میران، عەلی ئەحمەد ئاغا، عەلی بەگ، حەمید بەگی جاف، محەمەد یونس، عەبدوڵڵا شەرەفانی، شێخ مەجید خەلیفە، شێخ عەبدولوەهاب تاڵەبانی، حوسێن رەشید ئاغا، ئەحمەد حافیز، عەلی شەبوت، سەید حەسەن ئەلنەقیب، کازم حاجی مرزوك، عەبدۆ ئەلشنین، عەبدولعەزیز کەریم، سەگبان ئەلعلی.

* سەرچاوە:-

- پاشکۆی رۆژنامەی (المدی) ژمارە (٤٣٢٢) لە رۆژی ٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٨ بەناونیشانی (کیف تأسس حزب نوري سعید سنة ١٩٤٩) لە نووسینی عیمدا کەریم عەکوب محەمەد.

*** (الجبهة العربیة الموحدة) لە کەرکوك:-**

- ئەم بەرەیە لەلایەن کۆمەڵێك کەسایەتی کۆمەڵایەتی و سەربازی و سیاسی عەرەبی سوننە پێکهێنراوە لە شاری کەرکوك. کە دیاریترین کەسایەتییەکانی بریتییە لە:- شێخ وەسفی عاسی، ئیسماعیل حەدیدی، جێگری پێشووی پارێزگاری کەرکوك سەفا ئەلعوبێدی، نازم ئەلشەمەری.

کاری ئەم بەرە عەرەبییە بۆ کۆکردنەوەی پەرتەوازەیی عەرەبە لە شارەکە و بەرگری لەسەر مافەکانی پێکهاتەی عەرەبی و لە هەمان کاتدا کارکردن لەگەڵ تەیارە عەرەبییەکانی تری کەرکوك.

هەروەها لە بانگەوازی ئەم بەرەیەدا هاتووە کە نرخی توانای هێزە ئەمنییەکان بەرز دەنرخێن لە حەشدی شەعبی و هێزی سەربازی، کە گەلێك لە دەستکەوتیان بەدەستهێناوە لە دوای ١٦ی ئۆکتۆبەری ساڵی (٢٠١٧)ەوە لە کەرکوك.

بەپێی وتەبێژی فەرمی نازم ئەلشەمەری:- ئەم بەرەیە بریتییە لە یەکگرتنێکی سەربەخۆی سیاسی، کە خۆی خۆی دەژێنێت و دەستەیەکی دامەزرێنەری هەیە وەکو جۆرە پەرلەمانێکە و زۆربەی بەشداربووانی بریتییە لە کەسانی ئەکادیمی و سەربازی و ئەفسەرانی پێشووی سوپا و پۆلیسی عێراقی.

* سەرچاوە:-

- مجلة الانصات المرکزي، ژمارە ٧٠٤٥ لە ١٤ی کانوونی دووەمی ٢٠١٩، لاپەرە (٨).

***دەستەی وەبەرهێنانی کەرکوك:-**

**دەستەی وەبەرهێنان بەپێی ئەو بڕیارەی کە لە ئەنجوومەنی نیشتیمانی عێراق بڕیاری لەسەر داوە، کاری بۆ کراوەو کەرکوکیش یەکێکە لەو پارێزگایانەی کە بڕیاری دامەزراندنی لەسەر دراوە دەربارەی ئەو دەستەیە.**

**١- بە دانانی بەڕێوەبەری گشتی لەلایەن (کرکوك المتآخية).**
**٢- بە دانانی ٥ کەس لە ئەندامەکانی ئەنجوومەن لە کەرتی گشتی و تایبەتی و لەگەڵ دانانی (٥) بەڕێوەبەری بەشەکان بە ڕێکەوتنی لەگەڵ هەموو پێکهاتەکان.**
**لە ئەنجامدا بڕیار درا بە دامەزراندنی دەستەی وەبەرهێنان بەم شێوەیە:-**



**کاری دەستەی وەبەرهێنان بریتییە لە:-**
**١- کار ڕاییکردنی بەرنامەی وەبەرهێنان و پشتگیری وەبەرهێنان بۆ ناوچەکانی پارێزگاکە.**
**٢- پێدانی مۆڵەتی وەبەرهێنان بۆ ئەو پڕۆژانەی کە لە چوارچێوەی پارێزگاکە کاری بۆ دەکرێت.**
**٣- هەوڵدان بۆ داڕشتنی نەخشەی پێویست بۆ پڕۆژەکانی وەبەرهێنان.**
**٤- هەوڵدان بۆ کردنەوەی دەرفەت بۆ پڕۆژەکانی وەبەرهێنان.**
**٥- دەستەی وەبەرهێنان بەشەکانی بریتییە لە:- بەشی یاسایی، کارگێڕی و دارایی، ئابووری و هونەری، پەیوەندییە گشتییەکان.**

**لە بەرواری ١١ی مایسی ساڵی (٢٠٠٨) پاریزگاری کەرکوك و ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك کۆبوونەوە بۆ هەڵبژاردنی بەڕێوەبەری گشتی دەستەی وەبەرهێنان بەپێی ئاماژە بە کتێبی ژمارە (١٤٩٣) لە ٨ ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٨) کە تێیدا ئاماژە بە ڕێگە پێدانی ئەنجوومەن بە هەڵبژاردنی کاندیدەکانی دەستە لە هەردوو لیستی (کرکوك المتآخية) و (المجتمع الجمهوري العراقي).**
**بۆیە بڕیار درا بە:-**

| | | |
|---|---|---|
| فەلاح عەبدولرەحمان بەزاز | بەڕێوەبەری گشتی | کەرتی گشتی |
| ئەسعەد فازڵ وەسمی | جێگری بەڕێوەبەری گشتی | کەرتی گشتی |
| فەوزی سەلمان حوسێن | ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕی | کەرتی گشتی |
| مەهدی موبارەك حەمید | ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕی | کەرتی گشتی |
| موکەرەم ئەمین لەیلانی | ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕی | کەرتی تایبەتی |
| عەبدولکەریم محەمەد عەبدولکەریم | ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕی | کەرتی تایبەتی |
| سەباح تاهیر شکور | ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕی | کەرتی گشتی |
| قاسم حوسێن عەلی | ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕی | کەرتی تایبەتی |
| غەزنفەر سەمین جەعفەر | ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕی | کەرتی گشتی |

***گرووپی (فەجرولعەزیم):**

بەپێی زانیارییەکانی و لە چەند سەرچاوەیەکی هەواڵگری و ئەمنییەوە لە سنووری کەرکوك و دیالە، پاشماوەکانی داعش گرووپێکی نوێیان درووست کردووە بۆ قۆناغی دوای کۆتایی هاتنی داعش.

هەر بەپێی سەرچاوەکان گرووپی (فەجرولعەزین) جگە لە پاشماوەکانی قاعیدە و داعش، گرووپی نەقشبەندییەکان، پاشماوەکانی حیزبی بەعس و سوپای موجاهیدین، سوپای ئیسلامی، سوپای محەمەد، تەوحید و جیهاد، ئەنساری سوننەو پاسسارییەکانی بەهەشت و کەتائیب سەروەت ئەلعشرین پێکهاتوون، لە سنووری قەزای حەویجەی باشووری کەرکوك و ناوچەی دووره دەستەکانی سنووری دیالە چالاکییەکانیان دەست پێکردووە.

شانەی نووستووی گرووپە تیرۆریستییەکان لە دوای ئازادکردنەوەی ناوچەکانی ژێر دەستیان، پەنایان بردووەتە چیای حەمرین و ناوچە شاخاوییەکان، کە جگە لە دروستکردنی ئاژاوەو کردەوەی ترسنۆکانە توانای وەشاندنی گورزی کوشندەو داگیرکردنی خاکیان نییە.

بەشێك لە پێکهێنەری ئەو گرووپە نوێیە پێشتر ناکۆك بوون لەگەڵ داعش، بەڵام پێدەچێت بێ هێزبوونی داعش لە ناوچەکە هۆکار بێت بۆ ئەوەی بە ناچاری پەنا بۆ هاوپەیمانێتیان ببات.

ئەو ئەفسەر و فەرماندانەی سوپای پێشووی عێراق کە ئەزموون و پسپۆڕی باشیان هەیە لە بوارەکانی ئەندازیاری سەربازی و هەواڵگری و شەرکردن لە پێکهاتەی گرووپەکەدان، لەلایەن زیاتر لە وڵاتێکی بیانییەوە پاڵپشتی دەکرێت.

*** هێزی ئەحراری عێراق - لیوای دووی کەرکوك:-**

هێزێکی نوێی سەربازییە لە کەرکوك مەشق و ڕاهێنانەکانی دەستپێکردو لەلایەن حکوومەتی عێراقییەوە بۆ شەڕەکانی داهاتوو پڕ چەك دەکرێن و سەرجەم پێکهاتەکانی کەرکووکی تێدایە دامەزراوە لەنێویاندا گەنجانی کورد، هێزەکە بەناونیشانی ناوی (لیوای دووی کەرکوك - هێزی ئەحراری عێراق) کە لە (٥)ی ئابی ساڵی ٢٠١٧ دەستی کرد بە مەشقکردن.

ئەم هێزە لەلایەن موفتی (شێخ مەهدی ئەحمەد سومەیدەعی) دامەزراوە و لە هەموو پارێزگاکان بوونی هەیە، لەلایەن ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقەوە ڕێگە پێدراوە و ئێستا کار بۆ بەدەستهێنانی مەشق و چەك دەکەن.

پاش بە فەرمیکردنی لیوای دووی کەرکوك، بڕیار دراوە ژمارەیان بۆ دوو هەزار کەس بەرز بکرێتەوە، بۆیە ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر کورد و عەرەب و تورکمان دێنە ریزیانەوە، ئەو لیوایە لە چەندین فەوج پێکهاتوون لەنێویاندا فەوجی سەلاحەدینی ئەیوبی کە (٣٥٠) چەکداری هەیە و هەموویان کوردن، خەڵکی ناوچەکانی چەمچەماڵ، تەکیە، بازیانن.

سەرپەرشتیاری ئەو فەوجە کوردە، لە ساڵی (١٩٩١)ەوە تا چەند مانگێك لە مەوبەر پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بووە، ئەو چەکدارانەی لە ریزی فەوجە کوردەکەدا جێگیر بوون، زۆرینەیان چەك و پێداویستی سەربازی خۆیان پێبووە.

مەشق و ڕاهێنانەکانی ئەو هێزە نوێیە، لە گوندێکی سنووری داقووق بەدووری (٤٤) کیلۆمەتر لە باشووری پارێزگای کەرکوك ئەنجامدەدرێت.

*** پارتی ڕزگاری کورد لە کەرکوك و دەوروبەری:-**

**ئۆژین ئیبراهیم ڕەزا**

*** بارودۆخی پێش دامەزراندنی پارتی ڕزگاریی کورد:**

**کوردستانو کورد لە جەنگی جیهانی دووەمو دواتر پێینایە قۆناغێکی دژوارتر لە قۆناغەکانی پێشتر، چونکە ئیمپریالیزمەکان بۆ سوود وەرگرتن لەو جووڵانەوە ڕزگارییخوازییە نیشتمانییانەی سەریانهەڵدابوو دەیانویست بەکەڵکی خۆیان بەکاریبهێنن، هەولیاندەدا نەخشەکانیان بۆ دەستگرتن بەسەر چاڵە نەوتەکانی کوردستان جێبەجێبکەن. هەریەك لەو وڵاتە ئیمپریالیستانە هەولیاندەدا سۆزی کورد بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، بۆ ئەم مەبەستە پروپاگەندەیان بڵاودەکردەوەو بەڵێنی ساختەو چەندین پرۆژەو پێشنیازیان بۆ چارەسەرکردنی پرسی کورد دەخستە بەرچاوو.**

**بەم شێوەیە هەلویستی ئیمپریالیستەکانو جەنگو شوێنەوارەکانی لەنێو ڕێکخستنە نەتەوەییە کوردییەکاندا لەسەروبەندی جەنگی جیهانی دووەمدا شوێنەواری خۆی بەجێهێشت.**

**کوردیش بۆ داکۆکیکردن لە مافو خاکی خۆیانو پاراستنی سەروماڵی میللەتەکەیان دژی بەدەستهێنانی ئیمپریالیستیو ئەو دۆخەی کوردستانی گرتۆتەوە کەوتنەخۆ.**

**تاکو پرسی کورد نەبێتە هۆی ئاڵۆزاندنی پەیوەندیی نێودەوڵەتان، لە هەلومەرجی ناسکی جەنگدا، بۆیە هەمووڵا بە پێشکەوتوخوازەکانو چەپڕەوەکان، لە پێناوی وەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکەیان خەباتیان دەستپێکردووە، لەسەروبەندی ساڵانی پێش بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانییەوە بەدەرکەوتن، بەتایبەتی لە ساڵانی (١٩٢٨) بەدواوە هەرایەکی زۆر لەسەرانسەری کوردستان کەوتەگەڕ، هەروەها لەلایەکی ترەوە چاپەمەنییە کوردییەکان پەرەیان سەند. هەر لەم ماوەیەدا گرووپە سیاسییەکانی کوردستان ئەوەندەی تر گەشەیانکرد، سەرەڕای گرووپە کۆنەکان، چەند گرووپێکی تازە هاتنە گۆڕێو لەژێر ئاڵاکەیاندا کۆبوونەوە.**

**ژمارەیەکی زۆر لەلاوانو پێشکەوتووخوازەکانیان کۆکردەوە، بە مەبەستی ئەوەی پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ بەرەنیشتمانییەکانی وڵاتە دراوسێکاندا ببەستن، تاوەکو مافە نەتەوەییەکانیان بەدیبهێنن.**

**سەرئەنجام کۆمەڵێك پارتو حیزبو گرووپی سیاسیو ڕێکخراوی کەلتووریو کۆمەڵایەتی کورد لە کوردستان دامەزران، کە زۆر بەبایەخنو کارو چالاکییان نواندوە.**

**لەوانە: گرووپی سیاسی (١٩٣٨) ی شێخ لەتیفی شێخ مەحمود، کە ئامانجی سەربەخۆیی بوو.**

**کۆمەڵەی لاوان، پارتی هیوا، حیزبی شیوعی عێراق (پارتی شۆڕش)، هەروەها (پارتی ڕزگاریی کورد)**

**ئەم پارتانەو کار و چالاکییەکانیان بەیەکێك لە گرنگترین تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی ئەم قۆناغە دادەنرێت، لە بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردیدا.**

**ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە بەشێکی زۆری هێزو لایەنە نەتەوەییە نیشتمانییەکان گلۆر ببوون، لە هەنگاوێکی هاوچەرخانە خۆیان لە چوارچێوەی ئەو ڕێکخراوانەدا ڕێکخستن، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، هەروەها چەندین پارتو ڕێکخراوی کوردی بەدیارکەوتن کە ئەمانە ڕۆڵیان بینی لەبەرپاکردنیو خۆشکردنی بلێسەی شۆڕشو ڕاپەڕین لە هەموو بەشەکانی کوردستان.**

**ئەم کۆمەڵەو ڕێکخراوە سیاسیو ڕۆشنبیرییە جۆراوجۆرانە بەشێوەیەکی بەربڵاوو بەرچاو لە زۆربەی شارەکانی کوردستانو عێراق پێکهێنران بەتایبەتی لە (سلێمانی، هەولێر، کەرکوكو بەغداد)، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە بەشێکی زۆری ئەم کۆمەڵەو ڕێکخراوانە پرۆگرامێکی نوسراوو بەرچاویان نییە، تاوەکو بتوانرێ بەشێوازێکی زانستیانە لێیبکۆڵرێتەوە، سەرەڕای ئەوەش ئەم کۆمەڵەو پارتانە لە هەولی گەشەپێدانی زانستو زانیاری دا بوون لەناو تاکەکانی کۆمەڵەی کوردیدا. بەهۆی ئەوەی ئەو پارتانە خاوەن پەیڕەوو پرۆگرامی ناوخۆیی زۆر گرنگبوون کە ڕۆڵیان هەبووە لە پێشخستنی بزووتنەوەی کوردایەتیو پارتایەتی لە کوردستانو عێراق. بۆ ئاشنابوونی زیاتر لە خوارەوە باس لە چەند پارتێکو دەوریان لە ڕێکخستنی میللەتو ئاراستەکردنیانو پەیوەندییان بەپارتی ڕزگارییەوە و کاریگەریان لەسەری دەخەینەڕوو..**

**بە نموونە وەك:**

**حیزبی هیوا (پارتی هیوا) کە ڕۆڵێکی مێژووی بەرچاوی هەبووە لە بزووتنەوەی ڕزگارییخوازی کوردی لە باشووری کوردستان، ئەم پارتە لەڕووی چینایەتییەوە تا ئەندازەیەکی زۆر گوزارشتی لە کۆمەڵگەی کوردی کردووە، تاکەکانی کۆمەڵی بەشێوەیەکی جیاواز هێناوەتە بەرەیەکەوە بە گیانی لێبوردنەوەو قبولکردنی جیاوازی یەکترییەوە بەیەك ئاراستە خەباتیان کردووە**

**ئەم پارتە لەگەڵ ئەوەی جیاوازی هەیە لەشوێنو چۆنیەتی دروستبوونی، بەڵام لە ساڵانی(١٩٣٧) لەلایەن دامەزرینەری کۆمەڵەی دارکەرەوە دروستکراوە. دیارە لە ساڵی (١٩٣٩) بەدەستپێشخەری ژمارەیەك ئەفسەرو ڕۆشنبیری کورد ئەم پارتە ناوی (هیوا)ی لێنراوە بەئامانجی خەباتی دژی فاشیو بەدیهێنانی سەربەخۆیی نەتەوەیی گەلی کورد. بەدەستهێنانی هەموو مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەباشووری کوردستان و لایەنی کەم بەدەستهێنانی ماڤ ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان هەولیداوە.**

**پارتی هیوا هاوکات لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵی گرنگی لەبواری پێگەیاندنی هۆشیاری نەتەوەیی لەنێو ڕووناکبیرانی گەلی کوردا بینیو بەردەوامیش لە هەولی هاوکاریکردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی نیشتمانیو نەتەوەیی تری کوردستان دا بووە بۆیە بۆ ئەو مەبەستەش لەگەڵ خستنەوە سەرپێی جووڵانەوەی نەتەوەییو شۆڕشگێڕی کورد لە کوردستانی ئێران چالاکانە لە (١٩٤٢) کەوتە هاریکاری لەپای دامەزراندنی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان (ژێ کاف).**

هەروەها پارتی هیوا كەوتە چالاكی نواندن، هاندانی جەماوەری كورد بۆ ڕاپەڕین،و شۆڕشەكەی مستەفا بارزانی، ئەم كار و چالاكیو سەركەوتنانەی لە كوردستان كاریگەری گەورەیان یاخود زۆر یان هەبووە، بۆ بەهێزكردنی حیزبی هیواو كۆبوونەوە جەماوەرییەكانی كورد لە دەوریو زیادبوونی چالاكییەكانی، پارتی هیوا یەكێكە لە پارتە سیاسییەكان كە لە كۆتایی سییەكانی سەدەی بیستەوە لە كەركوك سەریهەڵداوەو دەستی بەكاری سیاسیو چالاكی حیزبی كردووە.

بەرپرسی یەكەمی ئەم پارتە مامۆستا ڕەفیق حیلمی (١٨٩٨) بوو، ئەم پارتە ئۆرگانێكی فەرمی هەمیشەیی نەبووە، بەڵكو ناوە ناوە هەندێك چاپەمەنیان دەركردووە، ماوە ماوە ئەندامان كۆبوونەوەیەكیان كردووە لە بارودۆخی سەردەم ئاگاداربوون.

هەر لەو سۆنگەیەوە حیزبی هیوا ڕۆژ بەڕۆژ لەپێشكەوتنو پەرەسەندندا بووەو بەبەهێزترین پارتی سیاسی ئەژمێردرێت لە مێژووی بزووتنەوەی كوردایەتیدا، چونكە ڕێكخستنی پتەوی هەبووە.

هەروەها ژمارەی ئەندامەكانیو چالاكی جموجوڵی ڕوولەزیادبوون كردووە بەشێوەیەكی گشتی ژمارەی ئەندامەكانی ئەم حیزبە گەیشتۆتە (٥٥٠٠) ئەندام تاوەكوساڵی (١٩٤٣) بەهێزترین پارتی سیاسی كوردیی بووە.

ئەندامەكانیشی گەنجان بەگشتی لە دوا قۆناغی سەرەتاییو ناوەندیو دواناوەندییدا دەهاتە حیزبەوەو هەر ئەندامێكیش كەوەردەگیرا، پێویستی بوو سوێند بخوا وەك نەریتی حیزب كەئەویەش سوێند خواردن بوو (بەقورئان، ئاڵای كوردستان، گولەگەنمو خەنجەر).

بەم شێوەیەی دەبینین كە حیزبی هیوا لە سەرەتای ساڵانی جەنگی جیهانی دووەمەوە ڕێكخستنەكانی بەشێوەیەكی باش تەشەنەیان سەندووە لە هەموو شارو شارۆچكەكانی كوردستاندا بڵاوبووە.

بەتایبەتی لە باشووری كوردستاندا چەند لقێكی هەبووە لە (سلێمانی-هەولێر-كەركوك-كفریو بەغداد)و لە ساڵی (١٩٤٠) لە بادینان لقی خۆی دامەزراند. یەكێك لە سیما پێشكەوتووەكانی ئەویش بەشداریكردنی ژن بووە لە چالاكییە حیزبیەكاندا، كە دیارترینیان ناهیدەی شێخ سەلام، لوتفیەی مەلا سدیق، حەلاوەخانی كچی شێخ محەمەد و زەكییە بابان بوو.

هیوا وەك پارتێكی نەتەوەیی كورد دەیویست دیوارو شوورە دەستكردەكان ببڕێت، خەونی گەورەی بە كوردستانێكی ئازادو یەكگرتووەوە دەبینی.

تا ئەو كاتەی ڕەفیق حیلمی سەرۆكی پارتبووە حیزبی هیوا لەوپەڕی بەهێزیدا بوو، پەیوەندی نەك تەنها بە ناوەوەی وڵات، بەڵكو بەپارچەكانی تری كوردستانەوە هەبوو، بەڵام پاش وازهێنانی ڕەفیق حیلمی لە حیزبی هیوا ئەو توندوتۆڵییەی نەماوە.

پارتی هیوا دابەش بەشببوو بەسەردوو باڵدا، باڵێكی میانڕەو (ڕاست)، باڵێكی توندڕەو (چەپ). ئەم دابەشبوونە ناوخۆییە لە ڕیزەكانی كوردایەتی ناوخۆی لاوازكرد، پاشان (باڵی چەپ) بوو بەدوو بەشەوە كەئەوانیش (حیزبی ڕزگاریو شۆڕش بوون) ئەوەبوو پارتی هیوا وەك بەشی هەرەزۆری پارتە سیاسییەكان بێ كێشەو گرفتی ناوخۆیی نەمایەوە لە ساڵی (١٩٤٣) بەدواوە بەهۆی چەند فاكتەرێكی خودییو بابەتییەوە دووچاری دابەشبوون هات.

لە ئەنجامی دابەشبوونەكەوە، بەشی زۆری ئەندامانی سەر بەچەپ لەڕیزی حیزبەكە دووركەوتنەوە، چونكە پێیانوابوو تەنها یەكێتی سۆڤیەت، دەوڵەتە سۆسیالیستییەكان دەتوانن هاوكاری كورد بكەن بۆ گەیشتن بە مافە ڕەواكانی.

بۆیە لەمانگی شوباتی ساڵی (١٩٤٤) كۆنفرانسی گشتی حیزب لە كەركوك بەسترا، لەم كۆنفرانسەدا ناكۆكییەكان تۆختربوون، لە ئەنجامیشدا بەشێك لە ئەندامە چەپەكانی حیزبەكە پەیوەندیان كرد بەڕیزی (حیزبی شیوعی عێراق) ەوە، ڕاسترەوەكانی نێو حیزبیش بەڕێبەرایەتی (ڕەفیق حیلمی) مانەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەمانە بێسود بوون لەناكاو لە ساڵی (١٩٤٥) پارتی هیوا بەتەواوەتی هەڵوەشایەوەو دابەشبوو بەسەر باڵی ڕاستو باڵی چەپدا.

ئەندامانی بازووی چەپ چوونە ریزی گرووپی (القاعدە)ی حیزبی كۆمۆنیستی عێراقەوەو بەنهێنی ڕۆژنامەی (ئازادیان) دەركرد. بەشێكی تریشیان بوونە ئەندامی شانەی كۆمەڵەی (ژ.ك) لە كوردستانی عێراق دا.

ئەو بەشەكەمەی كەمابوو چوونە ریزی گرووپی (وحدة النضال) كە لە كوردستان دا بەناوی (یەكێتی تێكۆشین) شانەیان دامەزراند، چەند گرووپێكی تریش بەشێوەیەكی سەربەخۆ بەناوی جیاجیا مانەوە خۆیان بۆ پالپشتی جووڵانەوەی كوردستان دەزانی.

نوێنەرانی یەكێتی تێكۆشین پێكهاتبوون لە: سالح حەیدەری - دەستەی سەركردایەتی بوو، نافع یونس، عەلی عەبدوڵڵا، عەبدولكەریم توفیق، ڕەشید عەبدولقادر، نوری محەمەد ئەمین.

گفتوگۆیەكی بەردەوام هەبوو لەنێوان باڵی (یەكێتی تێكۆشین)و (حیزبی شیوعی عێراقی) دەربارەی یەكخستنی ڕیزەكانو ڕێكخستنی سەركردایەتی لقی كوردستان. پاش چەند كۆبوونەوەیەك لەپایزی ساڵی (١٩٤٤) سەركردایەتی باڵی (یەكێتی تێكۆشین) حیزبی شیوعی بۆ كوردستانی عێراق پێكهێنا.

ئەمەش لەكاتێك دا بوو كە لقە كوردییەكەی حیزبی شیوعی ئامادەنەبوو پەیوەست بێت بەبڕیارەكانی حیزبی شیوعی عێراقەوە بۆیە ئەم حیزبەیان دامەزراند. مەبە ستیشیان لە دامەزراندنی ئەم حیزبە ئەوەبوو لە چوارچێوەیەكدا هەوڵی بەدەستهێنانی مافی سەربەخۆیی بۆ كوردستان. یان مافی ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی عێراقدا بدەن.

(حیزبی شۆڕش) بەپێویستییەكی مێژووی ئەزانی كە هەموو كوردێكی دڵسۆز لە كۆمەڵێكی سیاسی خاوەن پەیڕەووپرۆگرامو لە پەیڕەوێكی گونجاو لەگەڵ بزووتنەوەی كوردایەتی ئەوكات كۆبكاتەوەو ئاراستەیان بكات تاكو

چاکترین سوود لە هەمو کوردێك وەربگرن‌و بزووتنەوەی کوردایەتی پێ بەهێز بکەن.

ئەمەش لەدوای ئەوەبوو کە لە ناوەڕاستی چلەکان بەدواوەو لەحیزبی شیوعی عێراقدا پەرەیسەندو لەشارەکانی کەرکوك‌و سلێمانی‌و هەولێرو بەشێکی زۆری خەڵکی سەر بەو حیزبە پەیام و ڕێبازەکانی ئەو حیزبەیان جێبەجێ دەکرد، لەشاری کەرکوکیشدا ژمارەی ئەندامانیان گەشتە ڕادەیەك توانرا لیژنەیەکی ناوخۆ دابمەزرێت.

هۆکاری چوونی کوردی کەرکوك بەو ڕێژە زۆرە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە کاریگەری کۆماری مەهابادیان لەسەر بوو، لەو باوەڕەدابوون ئەو کۆمارە لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە دامەزراوە، بۆیە حیزبی شیوعییان بەڕزگاریخواز دەزانی.

هەروەها هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی بیری چەپ لە کەرکوك بەگشتی بۆ خراپی بارودۆخی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە، ناشبێت ئەوە لەیاد بکرێت کە ڕۆشنبیرە چەپەکانی شاری هەولێر...لە هاندان‌و گەشەسەندنی بیری چەپ لای ڕۆشنبیرانی کەرکوك دیارو زەقە، بەتایبەتی پارێزەر (نافع یونس (١٩١٧-١٩٦٣) کە دووەم بەرپرسی ناوچەی کەرکوکی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوو لە ساڵانی(١٩٤٥) ەوە چالاکی فکری‌و رامیارییەکانی لقی کەرکوکی (حیزبی شیوعی عێراق) لە دەرکردنی چەند بڵاوکراوە پەخشان نامەیەکی هەمەچەشنی وەك (بانگی فەلاح- کرێکار- قوتابیان - تەندروستی) بوون، ئەمە جگە لە ئۆرگانە سیاسییەکەی لقی پارتی کۆمۆنیستی عێراق (ئازادی) کە مەڵبەندی سەرەکی گەڕەکی (شاترلو - شاتەری) بوو لە کەرکوك.

دیارە حیزبی شۆڕش ڕۆژنامەیەکی بەناوی (شۆڕشەوە) هەبوو، هەروەها پێڕەوی ناوخۆی حیزب هیچ جیاوازییەکی نەبووە لەگەڵ حیزبە شیوعییەکانی تر.

ئامانج و پرۆگرامی حیزبی (شۆڕش) زۆر ڕوون‌و ئاشکراو گونجاو بوو لەگەڵ بەرژەوەندی گەلی کوردو ڕەنجدەرانی کوردستان. ئامانجەکانی (شۆڕش) بریتی بوون:

١- هەوڵدان بۆ ناساندنی کورد بە جیهانی دەرەوە، دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ پارتە کوردییەکان.

٢- تێدەکۆشا بۆ دژایەتیکردنی ئیمپریالیزم، چاکسازی لە پێناوی باشکردنی بوارەکانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و کەلەپووری‌و ڕۆشنبیریی و سیاسی لە کوردستاندا.

٣- بەهێزکردنی پەیوەندی برایەتی نێوان هەردوو نەتەوەی کوردو عەرەب لە پێناو ڕزگاربوونی ئازادیخوازانی هەردوو میللەت‌و گەیشتن بە ئامانجەکانیان.

٤- کارکردن بۆ وەدیهێنانی یەکێتی نەتەوایەتی کورد لە ماوەیەکی دووردا، کارکردن بۆ گەشە پێدانی ئابووری، دامەزراندنی پیشەسازیی.

ئەم خاڵانەی سەرەوە وەك دەبینن ئامانجی سەرەکی حیزب بوون. ژمارەی ئەندامەکانی ئەم پارتە (شۆڕش) لەو سەردەمەدا نزیکەی (٣٠٠-٣٥٠) ئەندام دەبوو.

لە هەمان کاتدا حیزبی شۆڕش یارمەتیدەری (حیزبی ڕزگاری) بووەو هاوکاری زۆری کردووە، بە کۆکردنەوەی جەماوەر هاریکاری‌و پاڵپشتیکردنی (پارتی ڕزگاریی) لەکاتی دامەزراندنیدا، هەر بەم بۆنەیەوە حیزب بەیاننامەیەکی دەرکرد. کەلەژێر دوو ناونیشاندا خۆی دەبینیەوە کە ئەوانیش:

یەکەم- (یەکگرتن بۆ دامەزراندنی حیزبی ڕزگاریی)

دووەم - (تێدەکۆشین بۆ تێکشکاندنی پیلانەکانی ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستان) دەقی بەیانەکەش بەم شێوەیە بڵاو کراوەتەوە:

((لەم ڕۆژانەدا کە بەسەرکەوتنی بیروباوەڕی ئازادیی‌و نزیکبوونەوەی هەڵتەکاندنی بناغەی هێزەکانی ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستانی ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوادا، واتە بەتیاچوونی جێگری دەولەتە فاشیستەکان جەنگ کۆتایی پێهاتووە، هەموو نەتەوە بچوك‌و ژێردەستەکانی جیهانیش کە لە پێناوی پێشکەوتندا خەباتیان کردووە خوێنیان ڕشتووە، داوای ئازادی‌و مافی نەتەوەیی‌و مافی چارەی خۆنووسینی خۆیان ئەکەن.

بەپێی بارودۆخی تازەی دنیاو ئەوبەڵێنامانەی دەولەتانی یەکگرتوو ڕایانگەیاندوە کە:

پێویستە باش بزانین کە دەسائیسی ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستی بەهەموو تواناکانییەوە کار دەکەن، بۆیە لەبەرئەوە ئازادی ئاسان بەدەست نایەت. بەڵکو دەبێ بەهێزی پشت ئەستوور بە جەماوەری گەل‌و نیشتمانپەروەرانی دڵسۆز وەربگیرێ.

ئەم بیرەش بەکردەوە لە زۆر وڵاتانی ڕۆژئاوا دا جێبەجێکراوە بەناوی (بەرەی بەرگری) لەفەرەنساو (بەرەی ئەیام) لە یۆنان‌و (بەرەی ڕزگاریی وڵات) لە یۆگسلاڤیا، کە ئەمانە خەباتیان دژی هێزەکانی ئیستعمارو کۆنەپەرستی دەستپێکردووە.

نەتەوەی کوردی دابەشکراو بەپێی نەخشەکانی ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستی ئەبێ تێبکۆشێ لە پێناو مافی چارەنوس - ڕزگاریی کوردستانی گەورەدا، بەبەکارهێنانی هێزێکی داڕێژراو لەناو خۆیدا، بەتەواوی یەکگرتوو بێت لە هەموو ناوچە کوردییەکاندا.

لەم ڕۆژانەدا حیزبی هەمووان بەناوی (حیزبی ڕزگاریی کورد) لەبەر گرتنی زۆر کۆمەڵی کوردی عێراقی بچووك، لە ئەنجامی هەوڵ‌و کۆششی حیزبی شیوعی کوردستانی عێراق) و نیشتمان پەروەرانی تر پێکهات.

لەپاڵ ئەمەشدا کە (حیزبی شیوعی) پارێزگاری قەوارەی خۆی ئەکات، بەهەموو جۆرێ هاوکاری ئەکات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ئێستای، ئەم حیزبە لە پێناوی ڕزگاریی وڵاتدا تێکۆشاوەو لە پاشەڕۆژیشدا تێدەکۆشێن.

لە کۆتاییدا ئێمەی حیزبی شیوعی ڕایدەگەیەنین، بۆ جەماوەری کوردی خۆشەویست لە عێراق بۆ کارکردن‌و پێشکەوتنی حیزبی ڕزگاریی کوردو هاوکاری کردنیان.

بۆیە بانگەواز دەکەین، بەبەرزترین دەنگ بۆ نیشتمان پەروەرەکان کە هاوڕاو هاوخەباتی حیزبی ڕزگاریی کوردبن‌و درێغی لە هیچ تەقەلایەك نەکەن بۆ بەهێزکردنی حیزبی ڕزگاریی کورد.

مەکتەبی سیاسی حیزبی کۆمۆنستی کوردستانی عێراق)).

هەروەك ئەبینین لە بەیانەكەدا زۆر سەرنج ڕاكێشانە ئاماژە بەهەموو كێشەكانی میللەتی كوردو داواكارییەكانیان ئەكات، تەئكید لەوەدەكاتەوە كە ڕۆشنبیرە پێشكەوتووەكانی كورد بەڵێنیان داوە كەكار بۆ پەرەپێدانی زمانی سیاسی بكەن‌و خەبات بۆ نیشتمانی كورد بكەن لەوكاتەدا.

بەم شێوەیە حیزبی شۆڕش هەستا بە یارمەتی دانێكی فراوانی حیزبی ڕزگاری.

ئالوگۆڕكردنی چاوپێكەوتن‌و كاری هاوبەشی سیاسی و میدیایی‌و(اعلان)و وادیاریش بوو كە ئەم سەركەوتنە كارێكی زۆر باشبوو لە سیاسەتی كوردیدا، چونكە لە ڕابردوودا ڕاهاتبوون لەسەر جیابوونەوەو ململانێی سیاسی حیزبەكان، ئەم یەكگرتنە ببووە مایەی خۆشحاڵی هەردوو حیزبەكە، كە هەردووكیان دیدو ئایدۆلۆجیای جیاوازیان هەبوو.

كە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لێهاتوویی سەركردەكانیان كە هەردووكیان كاردەكەن بۆ یەك ئایندە ئەویش (كوردستانە)و هاوكاری یەكیان كرد زۆر بەدڵسۆزی ساڵح حەیدەری باس ئەكات كە دامەزرێنەری هەردوو حیزب ئەو كەسایەتییانە بوون كەپێشتر باسكران، بەم شێوەیە حیزبی شۆڕش یارمەتیدەری حیزبی ڕزگاریی بووە.

لــەگــەڵ ئــەوەشــدا (شـــۆڕش) خــاوەنــی هــەڵــوێــســتــی نیشتمانپەروەرانە بووە لە ئاست ڕووداو پەرەسەندنەكانی كوردستان، بەتایبەتیش لەكاتی ڕوودانی شۆڕشی (١٩٤٣-١٩٤٥) ی بارزان پشتگیری تەواوی شۆڕشەكەی كردووە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا (پارتی شۆڕش) بۆ ماوەیەك توانی بەشێكی ڕۆشنبیرانی كورد لە دەوری خۆی كۆبكاتەوە، وەك ڕێكخستنێكی (ماركسی) لە گۆڕەپانی سیاسییدا خۆی بسەلمێنێت.

دوای تەمەنێكی كورت وەك هەر پارتێكی سیاسی لە ئەنجامی كۆمەڵێ فاكتەری ناوخۆیی‌و دەرەكی كۆتایی بەبوونی ئەم پارتەهاتو هەڵوەشایەوە لە ساڵی(١٩٤٦)دا.

سەرەئەنجام ماوەی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩ -١٩٤٥) بەگەشانەوەی چالاكی سیاسی كوردستاندا دادەنرێت، چونكە ئەم ماوەیە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا گرنگترین‌و چالاكترین پارتە سیاسییەكانی كورد دامەزران، لە هەرەدیارەكانیشی: (كۆمەڵەی داركەر، حیزبی هیوا، حیزبی شۆڕش، حیزبی ڕزگاری، پارتی دیموكراتی كورد) بوون.

*** دامەزراندنی حیزبی ڕزگاریی كورد:**

لەكۆتایی ساڵی (١٩٤٤)و سەرەتای ساڵی (١٩٤٥)، واتە لە ساڵانی دووەم جەنگی جیهانی‌و دواتردا ڕەوتی سۆسیالیستی‌و گەشەكردنی لە كوردستان بووە لەمپەرێك لەبەردەم گەشەكردنی بیری لیبراڵی لە كوردستان.هەر بۆیە سەركردەكانی شۆڕش دركیان بەو ڕاستیە كردبوو ئەگەرەكانی سەركەوتن و زیندووكردنەوەی گیانی تێكۆشان‌و خەبات لەلای كورد لە ڕێگای ڕێبازێكی سۆسیالزمی و بەپێی پرۆگرامێكی تەواو چەپ لاوازە.

لەبەرئەوە بەوشێوەیە كاركردن لەنێو كۆمەڵی كوردەواریدا ناتوانن پەرە بەئایدیاكانیان بدەن، بۆیە بۆ ئەوەی بزووتنەوەی كوردایەتی هەنگاوێكی پێشكەوتوانەی ڕێكوپێك بهاوێژێت، زۆرترین گەلی كورد لەناو حیزبێكی گەلی كۆبكرێتەوەو ئاراستە بكرێت بەتەواوەتی بتوانێ بەفەرمانی ڕابەرایەتی خۆی هەستێت، كە ڕێكخراوێكی فراوانتر دروست بكەن.

لەبەر ئەوە كەوتنە بیركردنەوە لە دامەزراندنی بەرەیەكی نیشتمانی كوردی كە خاوەنی دروشمێكی ڕزگاریخوازانە بێت‌و شێوازی چەپخوازانەی ئاشكرای پێوە دیارنەبێت، بەڵام بتوانن بەنهێنی چالاكی چەپڕەوانە درێژە پێبدەن..

بەم جۆرە هەموو لایەنەكان لەسەر پرسی كۆكردنەوەی هەموو هێزەكان واتە هەموو هێزە نیشتمانی‌و گرووپە سیاسییەكان‌و پێشكەوتنخوازەكانی عێراق لەیەك بەرەی نیشتمانیدا یەكدەنگ بن، كە ئامانجی ئەم بەرەیە بریتی بوو لە خەباتی دژی ئیمپریالیزم‌و كۆنەپەرستی دەرەبەگایەتی‌و وەدەستهێنانی ماڤی چارەی خۆنووسین‌و ڕزگاریی كوردستان، هەروەها یەكخستنی خەباتی كۆمەڵانی خەڵكی كوردستان لەگەڵ كۆمەڵانی خەڵكی عێراق و سەرجەم هێزە نیشتمانی‌و ئازادیخوازە كوردییەكانی باشووری كوردستان یەك بگرن‌و بە ئامانجی بەدیهێنانی ماڤی چارونوس‌و یەكگرتنی پارچەكانی كوردستان.

هەموو ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی ڕۆڵێكی گەورەیان لە هاندانی كۆمەڵایەتی خەڵكی كوردستان هەبێت، بەم شێوەیە شار بووە ناوەندێك یاخود مەڵبەندێكی كاریگەرتری خەباتی كورد. بۆیە وەك بەرەیەك دژی گرووپە ئیمپریالیزمەكان بۆ سەربەخۆیی كوردستانی گەورە هەوڵیاندەدا.

لەڕاستیدا سەرەتاكانی سەرهەڵدانی بیرۆكەی پێكهێنانی بەرەیەكی نیشتمانی‌و نەتەوەیی دەگەڕێتەوە بۆ كۆتایی ساڵی (١٩٤٤)و سەرەتاكانی ساڵی (١٩٤٥)، كاتێك (ساڵح حەیدەری) بەسوود وەرگرتن لەو بەرە نیشتمانییەی كە شیوعییەكان لە ئەورووپا لەكاتی جەنگی جیهانی دووەم دایانمەزراند، بۆ نموونە وەك (بەرەی بەرگری - الجبهه المقاومه) لە فەرنسا، بەرەی ئەیام (الجبهه الایام) لە یۆنان‌و بەرەی ڕزگاریی وڵات (جبهه تحریر البلاد) لە یۆگسلاڤیا، ئەمانە هەموویان خەباتیان یەكخستبوو لە دژی ئیمپریالیزم، هەروەها بەكەڵك وەرگرتن لە بۆچوونەكانی (فەهد) كە داوای پێكهێنانی بەرەیەكی پێشكەوتووی كوردی دەكرد.

هەربۆیە هەوڵەكان بەئاراستەی ئەم ئامانجە خرانەگەڕ، هەریەك لە حیزبی شۆڕش و گرووپە چەپەكانی ترو لایەنە پێشكەوتووخوازەكانی حیزبی هەڵوەشاوەی هیوا و ڕۆشنبیرانی پێشكەتووی ناسراوی كورد ئەركی دامەزراندنی ئەوبەرەیان گرتەبەر.

بۆ ئەم مەبەستەش حیزبی شۆڕش كەوتە گفتوگۆكردن لەگەڵ كەسایەتی ڕێكخراوەكانی ئەوكاتەی كوردستان، بەتایبەتی پەیوەندیی بەژمارەیەك لە ئەندامە چالاكەكانی پێشوی حیزبی (هیوا) لە بەغداد كرد و چەند ڕێكخراوێكی تری وەك (ڕێی ڕاست- ئازادی.

هەروەها لە یەكخستنەوەی گرووپە كوردییەكانی ئەو سەردەمەو بەتایبەتی لەنێو چەپەكانی كوردا ڕۆڵیگێڕا، جگە

لەمەش لەگەڵ چەندین کەسایەتیو سیاسی کورددا گفتوگۆی چڕیان دەستپێکرد. لەوانە (عەلی حەمدی و جەعفەر محەمەد کەریم و ڕەشید باجەلان و جەوهەر عەزیز پاشای دزەیی).

بۆیە هەر یەك لەمانە بەدەم بانگەوازەکەوە هاتنو لە ساڵی(١٩٤٥) ڕەزامەندییان لەسەر دامەزراندنی حیزبێك بەناوی (حیزبی ڕزگاریی کورد) دەربڕی.

ڕاستییەکەی لەدایکبوونی ئەم پارتە، پێداویستییەکەی مێژوویی بوو تاوەك پارتێکی نیشتمانی پێشکەوتوخوازو کەنوێنەرایەتی بەرەیەکی فراوانو یەکگرتووی نیشتمانپەروارنی کوردستان بکات.

بۆیە لە شوباتی (١٩٤٥) (حیزبی ڕزگاریی کورد) لەدایکبوو، بڕیاریشدرا کە بڵاوکراوەش هەر بەو ناوەوە دەربکەن، واتە (ڕزگاریی کورد)، سەرکردایەتی ئەم حیزبە کۆمیتەیەکی حەوت کەسی بوو،کە نوێنەرایەتی حیزبی شۆڕشو لایەنە پێشکەوتووخوازەکانی تری تێدابوو، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی لەم حەوت کەسە پێکهاتبوون: ساڵح حەیدەری، نافع یونس، دکتۆر جەعفەر، نوری شاوەیس، نوری محەمەد ئەمین، ڕەشید باجەلان، تەها محێدین.(ساڵح حیدەری و نافع یونس) دوو بزوێنەری دیاری ئە م حیزبە بوون لەو سەرکردایەتیەدا، (نوری شاوەیس)و (نوری محەمەدئەمین) ئەندامبوون لە شۆڕشدا، بەڵام خۆیان ئاشکرا نەکردبوو، بۆ ئەوەی بەشی زۆری سەرکردایەتی (ڕزگاریی) لە ئەندامانی شۆڕش بن، بەتەواوەتی سەرکردایەتی ڕزگاریی لەلایەن (شۆڕشەوە) بکرێت لەبەر تیشکی سیاسەتی حیزبی شیوعی لە کوردستانی عێراقدا بەردەوام بێت لەڕابەرایەتی بزووتنەوەی کوردایەتیدا.

بەم شێوەیە قوتابیانی کۆلیجی یاسا و (خانەی باڵای مامۆستایان - دار المعلمین العالیە) ئەم پارتە واتە (پارتی ڕزگاریی)یان دامەزراند.

پاش دامەزراندنی پارتەکە لە کەرکوکداو دوای جەنگی جیهانی دووەم ئەم پارتە کار و چالاکییە سیاسییەکانی بەنهێنی ئەنجامدەداو دەبێتە دیارترین پارت لە کەرکوك دا، ژمارەی ئەندامانی پارتی ڕزگاریی (٥) هەزار تا (٦) هەزار ئەندام بووە، بەم هۆیەوە توانی لقی خۆی لە زۆربەی شارەکانی کوردستان بکاتەوە، چونکە پارتی ڕزگاریی یەکێك بووە لەدیارترین پارتەکانی باشووری کوردستان لەوسەردەمەدا بۆیە لەبەڵگەنامەیەکی بەریتانیادا هاتووە:

ڕزگاریی (داوای یەکگرتنی سەرجەم نیشتمانپەروەرانی کوردەکان) بەناو قوتابیانی کەرکوكو هەولێرو سلێمانیو کۆیسنجاقو ڕەواندزو عەمادییەو زاخۆدا بڵاو بووەتەوە، پەیوەندیی لەگەڵ بارزانییەکاندا هەیە کە ئێستا لە ئێران پەنابەرن). بەگوێرەی زانیارییەکانی نێو ئەو بەڵگەنامەیە (پارتی ڕزگاریی کورد) لە ناوچەکانی کەرکوكو دەوروبەریدا بڵاوبووەتەوەو ڕێگەشی بۆ پەرەپێدانو گەشەکردنی گیانی نەتەوایەتی لای لاوانی کەرکوك خۆشکردووە. هەروەها بەخێرایی بەنێو لاوانی خوێندەوارو هەژارانو جوتیارانی ئەم وڵاتە بڵاوبووەتەوە.

تەنانەت هەندێك لە کوڕە ئاغاکانی هەولێر هاتنە نێو ڕیزی ڕزگارییەوە. چینی دەوڵەمەندو خاوەن سامانەکان خۆیان لەم پارتە نزیك کردەوە پەیوەندیان پێوەکرد. بەشێوەیەکی گشتی دەستەیەکی هەڵبژاردەی ڕۆشنبیرانی کورد لەسەرجەم پێکهاتە جیاوازە کوردییەکان بەدەوریدا کۆبوونەوە بۆ ڕاکێشانی ئەو کوردانەی کە حەزناکەن بدەنە پاڵ ڕێکخراوێکی مارکسی.

ئەم پارتە لەسلێمانیدا ژمارەیەك ئەندامی دیارو چالاکی هەبووە وەك: (نوری شاوەیس - نوری محەمەد ئەمین - فەتاح شالی، نوری ئەحمەد تەها) جگە لە خوێندکارەکانو فەرمانبەرانو کەسانی سەربازیی.

لە چوارچێوەی ئەمانەدا ئەم پارتە بەپێی بەڵگەنامەی نهێنییەکان، لەلایەن خوێندکارانی بەشی یاسا دامەزرابوو، بۆیە بەشێکی زۆری ئەندامانی (ڕزگاریی) ئەو کاتە قوتابی بوونو لەبەغدا خوێندویانە لە هەمان کاتدا چالاکی سیاسیان ئەنجامداوە.

ساڵح حەیدەری لەوکاتە خوێندکاری کۆلێجی (ماف) بووە لە بەغداد. یەکێك لە چالاکترین ئەندامەکانی (ڕزگاری) لەوێدا کاریکردووە، پەیوەندی ڕاستەوخۆشی بە لقی حیزبەوە لە هەولێر هەبووە، بۆیە بەڵگەنامەیەکی نهێنی دەزگا ئەمنییەکانی عێراق ناوبراو واتە (ساڵح حەیدەری) لەڕیزی یەکەمی ئەو قوتابیانە داناوە کە چالاکی سیاسیان لە بەغدا ئەنجامداوە.

لەڕاستیدا ئەوەی حەیدەری ئەنجامیداوە لەو قۆناغەدا، گەمەیەکی سیاسی بووە، چونکە بەناوەڕۆك حیزبێکی مارکسی بووەو لەڕووکاری دەرەوەدا وەك حیزبێکی نەتەوەیی نیشتمانی دەربکەوێت.

لە هەمان کاتدا دروستکردنی ئەم پارتە بۆ ئەوەبووە پشت نەبەستێت بەدەرەبەگ و عەشایەرەکان، بەڵکو پشت ببەستێت بەهێزو جەماوەرو چینایەتی، بۆیە لە کورترین ماوەدا بووە میراتگری (پارتی هیوا)و توانی زۆربەی زۆری ئەندامەکانی لەخۆی کۆبکاتەوە.

لە هەرە پێشکەوتووەکانی (پارتی ڕزگاریی کورد)، ئەم ناوانە بوون: عەونی یونس، عاسم حەیدەری، محەمەد عوسمان، فائق نادر، میرزا عەبدولکەریم، ڕەشید عەبدولقادر، ئەنوەر حەسەن دزەیی، جەمال حەیدەری، عەزیز محەمەد، محەمەد ڕەئوف، یونس یەحیا، عەلی فەتاح دزەیی، حەمید عوسمان، ڕەسوڵ محەمەد ئەمین، بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد لەم پارتە (پارتی هیوا) ئەندام نەبووە، ئەویش بەهۆی جیاوازی بیروبۆچونەکانی ئەم پارتە.

ئەمانە لەژێردروشمی(بژی کوردو کوردستانی گەورە،ئازادیو سەربەخۆیی بۆ کوردستانی گەورە) دەستیانپێکرد، هەولیاندا بۆ ڕابەرایەتیکردنی بزووتنەوەیەکی ڕزگارییو دیموکراتی کوردستان لە پێناو ڕێکخستنی تیکۆشانی جەماوەریی لە کوردستان. هەربۆیە لەدایکبوونی پارتێك یاخود ڕێکخراوێکی لەو جۆرە پێویستییەکی مێژوویی بوو لەو قۆناغەدا.

سەرئەنجام لەو ڕۆژانەدا حیزبی هەمووان واتە (حیزبی ڕزگاریی) کورد لە ئەنجامی یەکگرتنی کۆمەڵە بچوکەکانی

کوردستانی عێراق‌و هەوڵ‌و کۆششی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق‌و نیشتمانپەروەرانی تر و هێزە پێشکەوتووخوازەکان هاوکاری یەکیان کردوو حیزبی ڕزگاریی کوردیان دامەزراند.

*** هۆکاری گەشەکردن‌و پەیڕەو و پرۆگرامی پارتی ڕزگاریی کورد:**

(پارتی ڕزگاریی) بەخێرایی بەنێو لاوان‌و خوێندەواران‌و جوتیارانی ئەم وڵاتە بڵاوبووەتەوە، بەهۆی ئەو کارو ڕێکخستنانەی لە کوردستاندا ئەنجامیدا توانی ژمارەیەکی زۆر ئەندام لە خۆی کۆبکاتەوە. بۆیەحیزبی ڕزگاریی زیاتر بەرەوپێش دەچوو، پرۆگرام‌و ڕێبازی گونجاوی لەگەڵ بزووتنەوەی کوردایەتی ڕۆژ بەرۆژ چاکترو بڵاوتر دەبووەوە. ئەوە بووە هۆی ئەوەی بۆ بەشی هەرەزۆری نیشتمان پەروەرو ڕۆشنبیران ئاشکرا بێت کەڕابەرایەتی بزووتنەوەی کوردایەتی دەکات، ناوبانگ‌و ڕادەی تێکۆشانی لە پێناو مافەڕەواکانی گەلی عێراق‌و نەتەوەی کوردا پتر بڵاوبووەوە، بیروباوەڕی ڕێکخستنی لە ناوچینە چەوساوەکانی کوردستان چاکتر گەشەیکرد.

لێرەوە دەردەکەوێ کە هەڵوەشانەوەی (حیزبی هیوا) ئەو ئامانجانەی نەبووە کە ئیمپریالیزمی بەریتانیا دەیویست، بەپێچەوانەوە هەڵوەشاندنەوەی ئەم حیزبە (حیزبی ڕزگاریی) هێنایەکایەوە.

کەحیزبی ڕزگاریی لە حیزبی هیوا پتەوترو تۆکمەترو یەکگرتوو تر دەربکەوێت، بزووتنەوەی کوردایەتی‌و دیموکراسی بەڕابەرایەتی (ڕزگاریی)و (شۆڕش) زۆر بەهێزو ڕۆژ بەڕۆژیش بەهێز دەبوو.

لەڕابردوو زیاتر بیروباوەری پێشکەوتوانەو ڕێکخستنی تازەی بەخۆیەوە دی. ئەو بۆشاییەی لە ئەنجامی تێکچونی (هیوا) پەیدابوو، پیاوانی ئینگلیز زۆر مەبەستیان بوو کە ئەو بۆشاییە پڕنەکرێتەوە بگرە هەمیشە هەوڵ و تەقەلای پیسیان ئەدا بۆ ئەوەی بزووتنەوەی کوردایەتی ڕێکخستنی نوێ‌و بیروباوەڕێکی دیموکراسی بەخۆیەوە نەبینێت.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (ڕزگاریی)و هاو خەباتکەی (شۆڕش) ڕێکخستن‌و ئاراستەکردنی بزووتنەوەی کوردایەتی دیموکراسیان گەلێ پتر چەسپاندبوو چاکتر بەدیاریان خست.

لەم ڕوانگەیەوە (ڕزگاریی) لەشێوەی بەرەیەکی فراوانی کوردیدا هەنگاوی بۆ پێشەوە دەنا، دەستی بۆ هەموو کوردێك درێژ دەکرد کەبیکات بەلایەنگری خۆی، تەقەلای دەدا زۆرینەی خەلکی کوردستان هەواداری بێت‌و یارمەتیدانی لۆژیکی بێ بەلگە بنێت، دژی ئیمپریالیست‌و فیودالْ لە پێناو ڕزگاریی کوردستانی گەورەداو بۆ ئەنجامی ماڤ چارەی خۆنووسین تێدەکۆشا.

بەرئەنجام بەماوەیەکی زۆر کەم ڕزگاریی خۆشەویستی‌و ڕێزی لەناو میللەتی کوردا پەیداکرد، بەلکو هێزە دیموکراتی‌و پێشکەوتووخوازەکانی عێراقیش بەچاوێکی هەلسەنگاندنەوە سەیری ڕێبازو تێکۆشانەکەیان دەکرد، پاشەڕۆژێکی باش‌و برایەتی لەنێو کوردو عەرەبدا لەسەرکەوتن‌و گەیشتن بەئامانجی ئەو(بەرەی نیشتمانییە یەکگرتووەی کوردستاندا) ئەبینی، هەموو ئەوانەی باسکرا هۆکارێك بوون بۆ گەشەسەندنی پارتی ڕزگاریی.

یەکێك لە هۆکارەسەرەکییەکانی تر کەبووە هۆی گەشەکردن‌و پەرەسەندنی ئەم بابەتە زمانحالی ئۆرگانەکەیان بوو ئەویش ڕزگاریی بوو، کەئەمە یەکەم ڕۆژنامەی نهێنی کوردی عێراقە بەچاپکراویی، تاڕادەیەك ڕێکوپێك‌و فراوان لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا بڵاوبێتەوە.

ڕۆژنامەکە سەرەتا بەڕۆنیۆو دواتر بەمەکینەی چاپ چاپدەکرا، ئەم ڕۆژنامەیە وەك ئۆرگانی حیزب بەهەردوو زمانی کوردیی‌و عەرەبی دەردەچوو لەڕێگای ڕێکخراوەکانیدا، لەشارو شارۆچکەکانی بڵاودەکرایەوە ڕۆڵێکی بەرزی دەبینی لەبڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی دیموکراسی‌و ئازادییەکان‌و هاندانی هەستی نەتەوەیی‌و گۆشکردنی لە پێناو بەدیهێنانی مافە دیموکراسییەکان دژایەتیکردنی کۆنەپەرستان.

(ڕۆژنامەی ڕزگاریی) بوو بەسەرچاوەیەکی سەرەکی باوەڕبەخۆبوون‌و هاندەر لەنێوان (ئەفسەرە کوردەکان)و ڕۆشنبیرەکان بۆ پەیوەندییکردنیان بە بزووتنەوەی کورد بۆ پتەوبوون‌و پشتگیرییکردن‌و سەرکەوتنی، بەپێچەوانەی هەموو ئەو بیرو بۆچونانەی کە ئاراستەی بزووتنەوەکەو سەرکردایەتییەکەی دەکرا.

هەروەها ئەم ئامێریی چاپە کەمەبەست تایپ‌و ڕۆنیۆیە، بێجگە لە (ڕزگاریی) ڕۆژنامەی شۆڕشی پێ چاپ دەکرا، تێکڕا مانگی جارێك دەردەچوون، هەرجارێك ژمارەیەکی لێدەردەچوو، وەکو پێشتر باسی لێکرا بەشێوەیەکی نهێنی‌و لە ڕێگای ڕێکخراوە حیزبییەکانەوە لەناوچەکانی کوردستان.

لە هەموو کون‌و قوژبنێکی کوردستاندا بڵاودەکرایەوەو دەخوێندرایەوە، بەسانایی لەمێشکی گەلی کوردا جێگیر دەبوو. زیاتر باوەڕیان بە پاشەڕۆژی خۆیان هەڵدەنا.

ئەوەی جێگەی گرنگییە ئەوەیە تائێستا هیچ ژمارەیەکی ڕزگاریی لەبەردەستدا نییە، تابخرێتە بەر باس، کە بۆ تێگەیشتن لە بیروبۆچونی حیزبی ڕزگاریی‌و ناوەڕۆکی بڵاوکراوەکانی کەلکی زۆریان هەیە.

لەگەڵ ئەوەدا لە سالی (١٩٤٥-١٩٤٦) چەند کتێبخانەیەك لەسلێمانی دانرابوون، وەك دەرکەوت ئەو کتێبخانانە سەربە حیزبەکان بوون، لەوانە کتێبخانەی (ڕووناکی) سەر بەکۆمەلە یاخود حیزبی ڕزگاریی بووە کەپاشان بووە بە پارتی دیموکراتی کورد، کتێبخانەی (بیری نوێ) سەر بە حیزبی (تەحەرور) یان حیزبی شیوعی بوو، ئەمانە لەپاڵ کتێب فرۆشتندا بەپارە شەوی (بەعانەیەك)، کتێبیان بەخەلك دەدا.

ئامانجەکانی حیزبی ڕزگاریی بەهۆی ئەو کار و چالاکییانەی ئەنجامیداوە، ئامانج گەلێکی نەتەوەیی گەورەی لەخۆگرتبوو، لەم ڕووەوە گەورەترین ئامانجی یەکخستن‌و ڕزگارکردنی پارچەکانی تری کوردستانی گەورەبووە. کۆمەلێك داواکاریی کۆمەڵایەتی پێویست‌و هەنووکەیی لەگەڵدا هەبووە، وەك چاکردنی باری ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و کەلتوریی لە کوردستاندا.

داوای کردووە مافە دیموکراتییەکان بۆ هەموو هاووڵاتیان بەبێ جیاوازی نەتەوەیی‌و ڕەگەز مسۆگەر بکرێت‌و ئاستی

کشتوکاڵو پیشەسازی بەرزبکرێتەوە.

بایەخ بە زیندووکردنەوەی دیرۆکو وێژەی کوردیی بدرێتو زمانی کوردیی لە هەموو دەزگاو قوتابخانەکانی کوردستان بەکاربهێنرێت، جگە لەوەی بەبایەخەوە سەیری توندو تۆڵکردنی پەیوەندییەکانی ناوخۆ و دەرەوەی کردووە، بەرزکردنەوەی ئاستی تەندروستیو پێشخستنی پیشەسازی ناوخۆو دابینکردنی مافەکانی کرێکارانو گرنگیدان بە بڵاوکردنەوەی زانستیلەبەرنامەی کاردابووە.

لەئاستی دەرەوەدا هەولی هێنانەکایەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەموو پارتو ڕێکخراوە دیموکراتییەکان، لە پێناو ناساندنی کێشەی کورد بەهەموو نەتەوەکان، بەتایبەتی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دەدا، ئەمەش بۆ بنەبڕکردنو لە کارخستنی نەخشەو پیلانەکانی داگیرکەرانو هەڵوەشانەوەی هەموو پیلانەکانی دژ بەکوردو ڕێگەگرتن لە زیندووکردنەوەیان.

(ڕزگاریی) دەستی باڵای لە زیندوو کردنەوەی بۆنە نەتەوەییەکان هەبووە، لە ڕۆژی ٢١ی ئاداری ١٩٤٦ بەبۆنەی (جەژنی نەورۆز)ەوە بە ئامادەبوونی جەماوەرێکی بەرفراوانو ژمارەیەك لە وەزیرو بەرپرسی حکومی لە هۆڵی (مەلیك فەیسەڵ) لە بەغدا ئاهەنگێکی گەورەیان سازکرد، کە حەیدەریی یەکێك بوو لە ڕێکخەرە سەرەکییەکانی ئەو ئاهەنگەو ڕۆڵی دیاری لە ئامادەکردنی ئاهەنگەکەدا هەبوو.

چالاکییەکانی زۆربەی شارو شارۆچکەکانی کوردستانی گرتبۆوە، وەکو شارەکانی هەولێر، سلێمانی، کەرکوك کۆیە، ڕەواندز، کفری، ئامێدیو زاخۆو مەخموورو ڕانیەو شەقڵاوەو ڕێکخستنی نهێنیان هەبووە.

لە ئەندامە چالاکەکانیش لەو شارانەی کە پێشتر باسکران لەوانەن لە شاری هەولێر: عەونی یوسف، شوعە مەخلوف، جەمال حەیدەری، سالح حەیدەری، ڕەشید عەبدولقادر، ئەنوەر حەسەن مەلا، ڕەقیب حەسەن مەلا، عەزیز محەمەد، عەزیز فەتاح دزەیی، حەمید عوسمان، شێخ محەمەد حەمەد، جەوهەر حوسێن دزەیی.

ئەو ئەندامانەی لەشاری کۆیسنجق کە پەیوەندییان بە ڕزگاری وە هەبوو پێکهاتبوون لە: جەمال عیزەت، عومەر مستەفا ناسراو بە (عومەر دەبابە)، عەلی عەبدوولڵا، مەحمود حەبیب، محەمەد خۆشناو.

ئەو ئەندامانەی تریش لەشاری کفریو دەوروبەری: عەلی محەمەد سلیم ئاغا، محێدین، مستەفا بەزاز، حەسەن حوسێن، فەقێ محەمەد سەعاتچی، عەتا تاڵەبانی، موکەڕەم تاڵەبانی، فەتاح ئەمین بەزاز، پێکهاتبوون.

بەم شێوەیە (ڕزگاریی) توانی ئەم قۆناغە گوشەگیرییە ناوچەییە لابەرێت،کە زۆربەی ڕێکخراوە کوردییەکان پێشتر تیایدا قەتیس مابوون، بۆیە چەندین شانەی ڕێکخراوی لە گوندەکانی کوردستاندا پێکهێناوە، شاڵاوی ڕێکخستنەکانی ئاراستەی گەلێ لەچینەکان کرد، لەوانە دامەزراندنی (لقی عەشایەری) کە لقێکی تایبەت بوو بە خاوەن موڵكو ئاغاکانو گەڕانو سوڕانەوە بەناو سەرۆك هۆزەکانو هاندانیان بۆ بەرپاکردنی شۆڕشو هەڵگەڕانەوە، دژی حوکمڕانی پاشایەتی، کە شێوازێکی نوێی ڕێکخستنەکانی جەماوەری کورد بوو، لە پێناوی شکاندنو دەرچوونی لە تەوقی دیلیو زوڵمو زۆرداری.

(حیزبی ڕزگاریی کورد) جگە لەو چالاکیو شانەو ڕێکخراوە نهێنیانەی توانیوەتی لەڕێگای ـ یاداشتو بەیاننامەو بڵاوکراوەکانی ڕۆڵێکی گەورە ببینێت لە دژایەتیکردنی هەموو ئەو بیرو بۆچونانەی کەلەلایەن حوکمڕانی پاشایەتی لە عێراقدا دەرهەق بەکورد دەریان دەبڕی.

کە بۆنە ڕەسمیەکانیان لە ناوەوەو دەرەوەی وڵاتدا بەکاردەهێنا بۆ چەواشەکردنی ڕاستییەکان لەبەردەم حکومەتو گەلانی ناوچەکەو جیهان.

ئەمەش لە وتەکانی سەرۆك وەزیرانی عێراق (تۆفیق سویدی) لەقاهیرە دەربارەی ژمارەی کورد لە عێراقو مافەکانی ڕاپەڕینی بارزان (١٩٤٥) بەئاشکرا دەردەکەوێت.

ڕزگاری بۆ بەرپەرچدانەوەی وتەکانی سەرۆك وەزیران لە (٤)ی نیسان سالی ١٩٤٦ بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە کەتێیدا هاتووە: قسەکانی سەرۆك وەزیران هەمووی هەڵەو هەڵبەستن، لە ئاستی ژمارەی کورد لە عێراقداو مەبەستی شاردنەوەی قەوارەی ئەم گەلەیە.. جوتیارەکان وەك کۆیلەکانی سەدەی ناوەڕاستو نەزانیو نەخوێندەواری تەشەنەی تیایاندا کردووە، نەخۆشی گەیشتۆتە مۆلی ئێسکەکانیان، بێ بەشکراوین لە خوێندن بەزمانی زگماکی نەتەوەییمان، تادەگاتە بێبەشبوونمان لەرۆژنامەیەکی سیاسی ئاشکرا، ئەمانە شایەدو بەڵگەی ئەو مافانەن کە دراوە پێمان، ئەوە جگە لەوەی هەر کوردێکی دڵسۆزو ئازاد داوای چاکردنی بارودۆخی گەلەکەی بکات ئەوا سزای دەربەدەری توندکردنە لە قوژبنی تاریکی بەندیخانەدا ... کورد هەیە کێشەی هەیە بەهۆی بوونی وەك گەلێك هەر بۆیە لەپاش ئەم کارەدا بەنزیکی لەو ماوەیەدا کۆمیتەی ڕاپەراندنی حیزبی ڕزگاریی کورد، ڕاگەیاندنێکی دەرکردووە تێیدا هەڵوێستی دەوڵەتە گەورەکانی بەرامبەر بە کورد شیکردۆتەوە.

تاوەکو کوردیش وەکو هەموو میللەتەکانی سەر ڕووی زەمین چیتر لەو کوێرەوەریو کولەمەرگییەی تێیدایە نەهێڵدرێتەوە، هەموو دەرگاکان بەڕووی کوردەکاندا بۆ باسکردن لە پرسەکەیان لەکۆنگرەکانی جیهاندا داخراون. تەنها یەك ڕێگەیان بۆ ماوەتەوە ڕێگایەك هەموو گەلێکی ژێردەستەو ماف خوراو پێیدا تێپەڕبووەو تێدەپەڕێ واتە خۆبەختکردن. دێهاتە گڕتێبەردراوەکان، کوشتنی کوردی عێراق، ئەشکەنجەدانو کوشتنی سەرکردەکانیان لەزیندانەکانی ئێراندا، کوشتارەکانی کوردی تورکیا، بەڵگەی کۆششی کوردن بۆ سەندنەوەی مافە زەوتکراوەکانی، بەڵام جیهان خۆی لێکەڕکردوون، چونکە حکومەتەکانی ئەم دەوڵەتە فاشیستانە تەنانەت دەرفەتی نوزەشیان بۆ ئەم گەلە نەهێشتووەتەوەو ناهێڵن شانۆبازی سیاسەتی ئیمپریالستیو دژی هەموو جۆرە مافێکن، هێز نەبێ هیچ شتێکی تر سەریان پێدانانەوێت، خەباتی دژی فاشیستیو زالبوونی بیروباوەری ئازاد بەسەر کۆنەپەرستیدا مایەی دڵخۆشی گەلی کوردبوو، جیهانی برایەتیو دادپەروەریو

برایەتی بێ زۆردارو زۆرلێکراوو جێگای ئومێدیان بوو، بەڵام دیارە هەموو ئەم شتە خەوێکی خۆشی زریاناوی بوون، گوایە ئەو خوێنە ڕژاوە هەر بۆ جێگیرکردنی ئیمپریالیزم بووە، ئەی ماملۆستای دیموکراسی ڕۆژئاوا، کوا پەیمانی ئەتلەنتیكو چوار ئازادییەکەو مافی چارەی خۆنووسین؟.

هەروەها لەسەر ئاستی دەرەوەش ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕابوو بۆ گەیاندنی کوردو ناساندنی کێشەکەی بەجیهان بۆیە لە (١٩ی کانونی یەکەمی ١٩٤٥) لەڕێگای باڵیۆزی بریتانیاوە لەبەغدا، یاداشتێکی ڕەوانەی کۆنگرەی وەزیرانی وڵاتانی (بریتانیا- فەرنسا - یەکێتی سۆڤیەت) لە مۆسکۆ کرد. کەئەمەش دەقی یاداشتەکەیە:

*** یاداشتی حیزبی ڕزگاریی کورد:-**

بۆ کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوە لە مۆسکۆ بەبۆنەی بڕانەوەی جەنگەوە: ((مرۆڤایەتی بەخۆشییەوە مژدەی بڕانەوەی جەنگو سەرکەوتنی هێزە دیموکراتەکانو تێکشکانی دزێوترین شێوەکانی ئیستعمار (فاشیزم)ی لەڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات وەرگرت.

گەلی کوردی دابەشکراوو ماف خوراو، ماوەیەکی درێژە لەژێر باری زوڵمو چەوسانەوە دەناڵێنێو لە ئەنجامی نەخشەو قازانجەکانی ئیستعماری بریتانیو حکومەتە کۆنەپەرستە فاشیستەکانی ئێران و تورکیاو عێراقدا، لە هەموو مافە مرۆڤایەتیو نەتەوەییەکانی بێبەشکراوە.

بەبۆنەی بڕانەوەی جەنگو سەرکەوتنی هاوپەیمانەکانیەوە، گەلی کورد داواکارە بەشێوەیەکی ڕەوا لە مەسەلەکەی بکۆڵرێتەوەو لەوبەڵێنو بڕیاری هاوپەیمانەکان سەبارەت بە ڕزگاریو مافی چارەی خۆنووسین گەلانی بچووك بێبەری نەکرێت.

ئەمڕۆکە وەزیرانی کاروباری دەرەوەی هەرسێ دەوڵەتە مەزنەکە لەمۆسکو کۆدەبنەوە ئومێدەوارین بەشێوەیەکی ڕەوا لەپرسی گەلانو نەتەوەکان بکۆڵنەوە. حیزبی ڕزگاریی کورد خۆی بەبەختەوەر دەزانێت ئەم خاڵانەی خوارەوە پەیوەندی پتەویان بەپرسی گەلی کوردو ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوەیە ڕوونبکاتەوە:

١- ئێمە لایەنگری لەخەباتی برا کوردەکانی ئێرانمان ئەکەین لەگەڵ برا ئازەربایجانەکان، لە پێناوی سەربەخۆی خۆیی و (ئیستقلالی زاتی)و حوکمی دیموکراتیو تیکۆشان دژی حکومەتی کۆنەپەرستیو لایەنگرەکانیان.

٢- بەگرنگییەوە سەیری بارودۆخی گەلی کورد لە تورکیا بکرێت، حکومەتی فاشستی تورکیا بەشێوەیەکی دڕندانە ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکات بۆ ئەوەی بەتەواوی لەناویان بباتو بیان کات بەتورك.

٣- بارودۆخی گەلی کورد لە عێراق واتە تاڕادەیەکی زۆر خراپ بووە، لە ئەنجامی وجودی ئیستعماری بریتانیو کۆنەپەرستی ئێستاو ئوسلوبە فاشیستەکانیدا لە هەموو مافە دەستورییەکانی بێبەشکراوە، سووتاندنی گوندەکانی بارزانییەکان شوێنە نزیکەکانیانو ڕاونانو گرتنی هاووڵاتیان وەکو (مەلا مستەفاو لایەنگرەکانی) بەڵگەی ئەمەن.

لەبەر ئەوە داوا ئەکەین خواستە نیشتمانییەکانی کورد لە عێراق جێبەجێبکرێت، بەڵام ئێمە لامانوایە ئەوەش ناکرێ بە لەناوبردنی ئیستعمارو حکومەتی کۆنەپەرستی ئێستاو گۆڕینی حکومەتێکی دیموکراتی ڕاستەقینە نەبێ، کە مافە نەتەوەییەکانی کورد لە عێراق دابین بکا.

وائێمە ئەم ڕاستیانەمان خستە بەرچاوتان، بەوهیوایەی کەبەگیانی مرۆڤدۆستانە چارەسەریان بکەن، چونکە چارەسەری ڕێکوپێکی ئەم پرسە مایەی پێشکەوتنی شارستانیو چەسپاندنی ئاشتیە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

هەروەها لە(١٨ی کانونی دووەمی ١٩٤٦) حیزبی ڕزگاریی کورد یاداشتیکی پێشکەش بە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان کرد لەڕێگای بالوێزەکانی بریتانیاو ولایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاو چینو یەکێتی سۆڤیەت.

هەموو ئەو نەهامەتیانەی تیایدا خستەروو، کەگەلی کورد لەژێر سایەی حکومەتە نادیموکراتەکانی عێراقو تورکیاو ئێران تووشی هاتووە، دابەشکردنی کوردەکانمان لەنێوان ئەم وڵاتانە کەگەلی کورد بەهەموو جۆرێك ڕەتیدەکاتەوە.

لەبەشێکی یاداشتەکە باس لەشۆڕشەکانی کورد دەکات کەلە ئەنجامی سەرنەکەوتنی هۆکارە سیاسیو دپلۆماسییەکان لەچارەسەرکردنی کێشەکەی بۆ ڕزگاربوونی لەمەینەتییەکانی. هەروەها باس لەڕۆڵی ئینگلیزەکان دەکات لەیارمەتیدانو پشتگیریکردنیان بۆ هێزەکانی عێراق بۆ لەناوبردنی شۆڕشی کوردیو چەسپاندنی حوکمێکی سەربازی لە سەرجەم ناوچە کوردییەکانو گرتنو بەندکردنی سەدان لاوی کورد بەبێ هیچ بەڵگەیەك لەسەریان، لە کۆتایی یاداشتەکەدا داوا دەکات نەتەوە یەککگرتووەکان ڕۆڵی خۆی لەنەهێشتنی ئەو کۆتو زنجیرەی کەلەپێی بەندکراوە ببینێت، ئازادییە دیموکراتییەکان بەهەموو عێراقییەکانو گەلی کورد بدرێتو خۆی بڕیاری چارەنوسی خۆی بدات.

لەسەر ئاستی عەرەبییش (حیزبی ڕزگاریی کورد) بۆ پشتگیریکردنی بزووتنەوەی ئازادیخوازی نەتەوەی عەرەب هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانەی دەربڕی، لە ساڵی(١٩٤٦) شانبەشانی هێزە نیشتمانیو دیموکراتەکانی عێراق لەشەقامەکانی بەغدا، بۆ پشتگیری لەخەباتو تێکۆشانی گەلی میسر دژی ئیمپریالیزمی بریتانی بەشداری خۆپیشاندانێکی جەماوەریان کرد، لەڕێگای کۆنسوڵخانەی میسری لەبەغدا یاداشتێکی پشتگیری گەلی کوردی بۆ گەلی میسری گەیاندە کاربەدەستانی میسر، کە تیایدا پیرۆزبایی گەلی کورد لە شۆڕشگێڕانی ئازادیخوازی میسر دەکات دژی ئەو ئیمپریالیزمەی کە بە خنکاندنی بانگی ئازادییو لەگۆڕنانی ئاواتی گەلانی ژێردەستە ناسراوە، کەهیندو چینو گریك نموونەی ئەم ڕاستیەن، کەواتە ئەمڕۆش دەرهەق بە هەردوو گەلی کوردو گەلی میسر دووبارەی دەکاتەوە.

ئەمەش دەقی یاداشتەکەیە:

((بەناوی گەلی کوردی عێراقەوە پیرۆزبایی لە گیانی شۆڕشگێرانەی برا میسرییە ئازادیخوازەکانمان دەکەین کە دژی ئیمپریالیزمی بریتانیا ڕاپەریون، ئەو ئیمپریالیزمە

زۆڵەی کە دەملیۆن کوردی گیرۆدەی ستەم وچەوسانەوە کردووە، سەدان ڕۆڵەی ئازادیخوازی کوردی زیندانی ئاوارە کردووە، سەدانی تریشی لەسێدارە داوە یاخود بەئاگری بۆمبی تۆپو تەیارە کوشتونی.

لە ئەنجامدا گەلی کورد کەوتە ژێر چەنگالی ئیمپریالیزمەوە، ڕەفتاری ئابڕووبەرانەی ئەم دواییەی ئیمپریالیزم لە گریك، هیندی،چینی، هیندستان دا هێشتا لەیاد نەسڕاوەتەوە.

ئەوەتا ئەمرۆش دەیەوێت درێژە بە هەمان ڕەفتاری ئابروبەرانەی بدات.

ئێمە لەبەرامبەر بەتاوانەکانی ئیمپریالیزمو بەتوندی نارەزایی خۆمان دەردەبڕینو سەبارەت بەدەرچوونی هێزەکانی ئیمپریالیزم لە دۆڵی نیل، دەسکاری کردنی پەیمانی نێوان میسرو بریتانیا بەوجۆرەی کەسەربەخۆیی سیاسیو ئابووری میسر میسر مسۆگەردەکا، دەنگی خۆمان دەخەینە پاڵ دەنگی میسری ئازادەوە گەلی کوردی هاوسۆزی گەلی میسر بۆ پشتگیری کردنی خەباتی پیرۆزی گەلی میسر لەخۆپیشاندانەکانی بەغدا بەشداری کرد.

کۆمیتەی ڕاپەراندنی هێزی ڕزگاریی کورد

((حیزبی بەرەی نیشتمانی یەکگرتوی کوردی عێراق))

شانبەشانی چالاکییە سیاسیو ڕێکخراوەییەکان (حیزبی ڕزگاریی کورد) گرنگییەکی زۆری بەچالاکییە جەماوەرییەکان دەدا، لەم ڕووەوە بۆنە نەتەوەییەکانی بەدەرفەت دەزانی بۆ کۆکردنەوەی جەماوەرو سازدانی ئاهەنگی تایبەتیو وتارخوێندنەوە، کەسەرچاوەیەکی تری جۆشدانو هاندانی جەماوەر بۆ تیکۆشانو کۆششکردن لەپیناو مافەکانیان بوو.

لەئاهەنگێك بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە لەشاری هەولێر کە بەشێوەیەکی ڕەسمی بەڕێوەچوو، بەئامادەبوونی موتەسەڕیفی هەولێر (سەعید قەزاز)و کەسایەتییە دیارەکانی شارو ژمارەیەکی زۆر جەماوەر، توانیان چەندین دروشمو وتاری تایبەت پێشکەش بکەن، یەکێك لە وتارخوێنەکان (عاسم حەیدەری) بوو.

لە هەمان ساڵدا (١٩٤٦) لەشاری کۆیە لەکاتی بەڕێوەبردنی یارییەکی وەرزشی، دوای کۆبوونەوەی یارییەکە بەوتەی (حەیدەر عوسمان) کەیەکێك لە ئەندامانی ڕزگاریی بوو، ناوبراو دەستیکردووە بە خوێندنەوەی وتارێك دەربارەی بارودۆخی کوردو نەخشەو پیلانی ئیمپریالیزم دژی کوردستان، هانی جەماوەرکەی داوە بۆ تێکۆشانو خەباتکردن لە پێناو ڕزگاربوونو سەربەخۆییان.

بەم جۆرە کار و چالاکییەکانی حیزبی ڕزگاریی بەردەوام لەمیانەی ئەو یاداشتو ڕاگەیاندراوانەی دەریانکردووە بەشێوەیە لەگەڵ داخوازیو ئاواتەکانی گەلی کوردا هاوجووت بوون، بەو هۆیەوە حیزبی ڕزگاریی کورد لەماوەیەکی کەمدا لەسەرانسەری کوردستانی عێراقدا چالاکییەکانی بەشێوەیەك بڵاوبۆیەوە، جێگای خۆی لەنێو ڕیزەکانی نەتەوەییدا بەدیارخست.

*** پەیڕەووپڕۆگرامی پارتی ڕزگاریی کورد:**

ئەنجومەنی دامەزرێنەری حیزبی ڕزگاریی کورد، بەیاننامەیەکی بەناوی (ڕاگەیاندنی نیشتمانی حیزبی ڕزگاریی کورد – لەلایەن دەستەی دامەزرێنەری حیزبەوە) دەرکردو پەیڕەوو پرۆگرامو ئامانجە دوورو نزیکەکانی نەتەوەیی کوردی تیاڕوونکردەوە، کەگرنگترینیان:

یەکەم – ئامانجی پیرۆزمان ڕزگارییو یەکگرتنی کوردستانی گەورەیە، ناوەندی حیزب لە کوردستانی عێراقدایە، لەبەرئەوە ئێمە بۆ ڕزگارکردنی عێراق لە نفوزی ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستان کە گەورەترین کۆسپن لەبەردەم ڕێگای پێشکەوتنی کوردی عێراقو بەدیهێنانی ئامانجی مەزن، واتە ئازادییو ماف چارەی خۆنووسین،تێدەکۆشین.

دووەم ـ تێکۆشان بۆ سەربەخۆیی ئیداری کوردستانی عێراق کەئەوە هەنگاوێکی گەورەی ماف چارەی خۆنووسینە.

سێیەم ـ کۆششکردن بۆ لابردنی هەموو جۆرە چەوسانەوەو جیاوازییەکی نەتەوەیی دژ بە کوردو کەمە نەتەوەکانی تر.

چوارەم ـ بەکارهێنانی زمانی کوردی لە هەموو دەزگاو قوتابخانەکانی ناوچە کوردنشینەکاندا.

پێنجەم ـ کۆشش بۆ پەیوەندیکردن بە حیزبو گرووپە کوردییەکانی دەرەوەی عێراق لەچوارچێوەی هەوڵو ڕەنجێکی هاوبەشدا، بۆ گەیشتن بەئامانجی پیرۆزمان، واتە ماف چارەی خۆنووسینو ڕزگاریی.

شەشەم ـ کۆشش بۆ چارەسەرکردنی گشت گیروگرفتە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو کەلتورییەکان بەسەلماندنی مافە دیموکراتییەکان، بەرزکردنەوەی ئاستی کشتوکاڵ پیشەسازی بڵاوکردنەوەی زانستو زیندووکردنەوەی مێژووی وێژەی کوردی.

حەوتەم ـ کۆشش بۆ ناساندنی پرسی کورد بەهەموو نەتەوەکانی بەگشتیو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتیی.

هەشتەم ـ( (کۆشش بۆ پەیوەندی کردن بە حیزب و ڕێکخراوە دیموکراتییەکانەوە))

نۆیەم ـ کۆشش بۆ پەیوەندیکردن بە دەوڵەتە دیموکراتەکانەوە بۆ لە کارخستنی پیلانەکانی ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستیو نۆکەرەکانیان، کە دەیانەوێت پەیمانی (سەعد ئاباد) زیندووبکەنەوە.

دەیەم ـ کۆشش بۆ هەڵوەشانەوەی هەموو پەیمانە ئیمپریالیستیو کۆنەپەرستەکان کەبەگشتی دژی ئازادییو بەتایبەتی دژی ئازادیی کوردن.

*** هۆکارەکانی هەڵوەشانەوەی پارتی ڕزگاریی کورد:**

پارتی ڕزگاریی کورد لەماوەی کارکردنیدا لەسەر گۆڕەپانی سیاسی کوردستان ببووە پێشەنگ، بەبەرزکردنەوەی یاداشتو داواکارییەکانی بۆ ئەنجومەنە نێودەوڵەتییەکانو کۆنگرە جیهانییەکان دەربارەی مافەکانی گەلی کورد ڕۆڵێکی باشی بینی لە بزووتنەوەی نیشتمانی.

بۆیە توانی بنچینەیەکی سیاسی بەهێز لە کوردستانی عێراقدا دابمەزرێنێت، کە زۆربەی نیشتمانپەروەرانو ڕۆشنبیران

لەژێر دروشمەکانیدا ڕێکبخات، ئەمەش وایکرد بکەوێتە بەر هێرشی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، هەریەك لەم دوو پارتە یەکتریان بەلادانو خراپ سەرکردایەتیکردن تۆمەتبار دەکرد. بگرە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی (پارتی ڕزگاریی)ەوە کەوتنە دژایەتیکردنی، ڕۆژنامەی (القاعیدە) لە ژمارەی (٢٤) ڕۆژی (١٨ی کانونی دووەمی ١٩٤٦) لەوتارێکدا بەتوندی دژی دامەزراندنی ڕزگاریی وەستانەوە تیایدا ئەوکارەی بەشتێکی بێ کەلك ناوبردووە.

گلەیی پارتی کۆمۆنیست لە ڕزگاریی نەتەوەیی ئەوەبوو کە ئەم پارتە دەیەوێت کوردستان لە عێراق دابڕێتو دەولەتێکی کوردیی دروستبکات. ئەمەش لەدیدو بۆچوونی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە زیان گەیاندن بوو بە بەرژەوەندییەکانی دەولەتی عێراق.

لەمەش بترازێ کۆمۆنیستەکانی عێراق، پارتی ڕزگارییان بەوە تۆمەتبار دەکرد کە ژمارەیەکی زۆر لەئەندامانی پارتی هیوا لەخۆدەگرێت، کەبەلای ئەوانەوە هیوا پارتێکی دواکەوتوی کۆنەپەرست بوو، ئەمە وێڕای هەندێك لەئەندامانی کۆمەلەو ڕێکخراوەکانی دیکە، کەوەك کۆمۆنیستە عێراقییەکان دەیانوت هیچ شوێن پەنجەیەکی باشیان بەسەر بزووتنەوەی کوردییەوە جێنەهەلشتووە.

یەکێکی تر لەو خالانەی کەتەواو پارتی کۆمۆنیستی عێراقو ئەو کوردە کۆمۆنیستانەی دەرەوەی ڕزگاریی بێزارکربوو، ئەوەبوو کە ڕێبەرانی (ڕزگاریی) پێیانوابوو کورد نەتەوە (امە) یەو گشت بنەماکانی نەتەوەبوونی تێدایە، چونکە کۆمۆنیستە عێراقییەکان بەپێی پێناسەی (ستالین) بۆ نەتەوە، کە ئابوورییەکی هاوبەشی بەمەرج لەمەرجەکانی نەتەوە دانابوو کوردییان بەنەتەوە دانەدەنا، لەبەر ئەوە کە کورد خاوەنی دەولەتێك نەبووە تا ئابووری هاوبەشی تێدا بێتەدی.

لەم بارەیەوە (فاتیح ڕەسولّ) نوسیویەتی: «دوو کادیری سەرەکی پارتی ڕزگاریی کوردستان کە تازە دامەزرابوو، چاویان بەمام جەلال کەوتبوو پێیان گوتبوو بڕۆ بە کۆمۆنیستەکان بلێ گەر دانبەوەدا بنێن کورد ئومەیە، ئێمەش دێینە ڕیزی ئەوان».

چالاکییەکانی ئەم پارتە نیگەرانی خستبووە دلی حکومەتی عێراقەوە، بۆیە کاربەدەستانی عێراق بەتوندیی بەربوونە گیانی هێزە پێشکەوتوخوازەکانی کوردستان. بەدەیان فەرمانبەرو بەڕێوەبەرو مامۆستاو ئەفسەرو پیشەکارو ڕەنجدەری کورد زیندانیکران، لەدامو دەزگا دەولەتییەکاندا کاریدەکرد، گومانی ئەوەی لێدەکرا کەلەسیاسەتدا کاردەکات یا دەردەکرا یاخود لە کوردستان دوور دەخرایەوە.

گۆڤاری گەلاوێژیش داخرا، ئەفسەرانو سەربازە کوردەکانیش وردە وردە ڕیزی سوپای عێراقیان بەجێهێشتو پەیوەندییان بە جوولانەوەی چەکدارییەوە کرد، کەلە سالی (١٩٤٣) بەسەرکردایەتی (مەلامستەفا بارزانی) دەستیپێکرد لەناوچەی بارزان، کە ئەم جوولانەوەیە لەماوەیەکی کەمدا چەند ناوچەیەکی تەنیەوە لەوانەش (هەولێرو بادینان).

وردە وردە نفوزی جوولانەوەکە فراوانتر بوو، بەهۆی ئامانجی جوولانەوەکە، کەبریتی بوو لە بەدیهێنانی مافە نەتەوەیە ڕەواکانو سەلماندنی ئۆتۆنۆمی.

بەم شێوەیە شەڕی نێوان پێشمەرگەو سوپای عێراقی چەند سالێك درێژەی هەبوو، بەیارمەتی (حیزبی ڕزگاریی کورد)و لایەنە پێشکەوتوخوازەکانی تر خێلو هۆزە کوردییەکان یەکخران، بەشێك لە کاتی پێویستدا بەچەکەوە دێنە نێو ڕیزی جوولانەوەکە، هەر لەم سۆنگەیەوە (حیزبی ڕزگاریی کورد) ڕاگەیاندنێکی بەسەر کوردەکانی عێراقدا دابەشکردو داوای پشتگیریی‌و یارمەتیدانی جوولانەوە چەکدارییەکەی لێکردن، هەربۆیە ئەم کارانەی حیزبی ڕزگاریی کورد بووە هۆی ئەوەی ڕووبەڕووی چەوسانەوەو ڕاونانێکی زۆربێت.

حکومەتی عێراق هەلمەتێکی ڕاوەدونانی لە دژیان دەستپێکردو ژمارەیەکی باشی لێدەستگیرکردن، تەنانەت توانی هانی ژمارەیەك لەمەلاو پیاوانی ئایینی بدات، کە بەمەبەستی دوورخستنەوەی جەماوەر لەڕیزەکانی، فەتوا لە دژی (ڕزگاریی) دەربکەن - بەکافرو هەلگەڕاوە لە قەلەمی بدەن.

هەروەها چالاکیو ڕێکخستنەکانی (ڕزگاریی) لە ناوچەکانی کوردستان هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە مەترسی بۆ سەر دەسەلاتی ئینگلیزەکان لەوناوچانە دروستکردبوو. چونکە (پارتی ڕزگاریی کورد) یەکێك لەو ڕێکخراوە بوو چالاکانە لە سەرەتای سەرهەلدانییەوە سەرنجی دیپلۆماتە ئینگلیزەکانی ڕاکێشابوو. هەر ئەوەندە لەبەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی حکومەتی بریتانی بەهەولدانی دامەزراندنو بیروڕاکانی (پارتی ڕزگاریی کورد)یان زانی: ڕۆژی بیستو شەشی تەموزی سالی (١٩٤٦) بەنامەی ژمارە ٤٦/٢/٢٢١ داوا لەبالوێزخانەی بریتانی لەبەغدا دەکات چی دەزانێت دەربارەی ئەوپارتەو ڕێبازو شێوازی کارکردنو ئەندامە چالاکەکانی بیکاتە ڕاپۆرتێكو بنێرێت. بالوێزخانەی بریتانیش داوا لە ئەفسەری پاراستنی ئاسایش (د. دەبلیو ئۆین) دەکات دەستوبرد ئەو فەرمانە جێبەجێ بکات.

(نهێنی)

ئەفسەری ئاسایشی گشتی، بەغدا،

بۆ:

بالوێزخانەی خاوەن شکۆ لەبەغداد:

بابەت / (پارتی ڕزگاریی کورد):-

١- وەلام بۆ نامەی ژمارە ٤٦/١٠/٢١١ ی ڕۆژی دوانزەی نەورۆزی سالی (١٩٤٦) تان وا لە خوارەوە پوختەیەکی ئەو زانیاریانەتان بۆ دەنێرین کە ئێمە دەربارەی ئەو پارتە هەمانن

ل. ن

٢- قوتابیانی کۆلێجی یاساو دار المعلمین العالیه ((پارتی ڕزگاریی کورد)) یان دامەزراند، ڕزگاریی داوای یەکگرتنی سەرجەمی نیشتمان پەروەرانی کوردەکان بەناو قوتابیانی کەرکوكو هەولێرو سلێمانیو کۆیسەنجەقو ڕەواندزو عەمادییەو زاخۆدا بلاو بووەتەوە، هەمان کات پەیوەندیشی لەگەلّ ئەو بارزانیانەدا هەیە کەئێستا لە ئێران پەنابەرن ئەورۆژنامانەی پارتی کۆمەلە لەمەهاباد (ئێران) پەخشیان دەکات لەڕێگای عەلی عەبدولای خاوەنی کتێبخانەی

ڕەواندزەوە دەینێرن بۆ ( (پارتی ڕزگاریی)) تا ئەو بەنهێنی لە عێراقدا دابەشیان بکات..

٣- لە هەولێر بەهۆی ئەو چالاکیانەوە کە ژمارەیەك لە قوتابیان‌و فەرمانبەرانی شار لە هەڵسووڕاندنی ئاهەنگی نەورۆزی (ئەمساڵدا - ك.م) نواندیان هەست بەبوونی ((پارتی ڕزگاریی)) کرا بەوەش زانرا کە کتێبخانەی شێخ محەمەد شوێنی کۆبوونەوەی ئەندامانی ڕزگارییە، وێرا ی ئەوە نەخشەیەکی ئەو پارتە دۆزرایەوە کەدابەش کردنی کوردستان بەسەر عێراق‌و تورکیاو ئێران وسوریا دا نیشان دەدات.

٤- زۆرنیە وێنەی مەلا مستەفا بارزانی بەبەرگی جەنەراڵی ڕوسیەوە لەسلێمانی دابەشکراوە، دەشلێت حکومەتی ناوەندی عێراق توانیویەتی لە هەولێر گورزی باش لە ((پارتی ڕزگاریی)) بووەشێنێت.

٥- وا پێدەچێت لە بەغدا ناکۆکی هەبێت لەنێوان باڵی حەیدەری‌و قوتابیان (سەرجەم

ڕێکخراوەکانی ك.م) سەبارەت بە وەی ئایا بێتو ئەگەر ڕزگاری بداتە پاڵ (پارتی ئەمرۆی نیشتمانی) یان وەك دەستەی سەربەخۆ بمێنێتەوە.

بەپێی دیاردە هەستپێکراوەکان لایەنگری سەربەخۆیی ڕزگاریی زۆرترن، هەرچەندە ژمارەیەك کورد تاوەکو ئێستەش وەك دەزگایەکی جیاوازی ئەمڕۆ کار دەکەن.

هەروەها ئەو ڕاپۆرتانەی باسی پرۆژەی پێشنیازکراوی (پارتی یەکێتی نیشتمانی)و (پارتی گەل) دەکەن دەڵێن (ڕزگاریی کوردیش) حەزدەکات بداتە پاڵ ئەو ڕێکخراوانەی سەرەوە بەپێی پەیڕەوکردنی مەرجەکانیان کەبریتین لە: وەستاندنی سەرجەمی چالاکییە نهێنییەکانی‌و بانگ دان وەرگرتنی ئاشکرای ئەندامێتی.

٦- بەلای سالح حەیدەرییەوە کە قوتابی (کۆلیجی یاسای بەغدا بووە بەکارکردن لە ڕزگارییەکی چەپڕەوی سەربەخۆی وەك ئەوەی ڕۆژانی پێشوی سەری ساڵی - ك. م) ڕابردوو دامەزرێنرا گەلێك باشترە لەڕزگارییەکەی باسی دەکەن.

بەم شێوەیە بالیۆزخانەی بریتانی لە بەغدا لە ڕۆژی بیست‌و شەشی تەموزی (ساڵی ١٩٤٦) ، ئەو زانیاریانەی سەرەوە دەربارەی ((پارتی ڕزگاریی کورد)) بەنامەیەکی تایبەتی دەنیرێت بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حکومەتی بریتانی لە لەندەن،

ئەمیش دەقی وەرگێڕدراوی نامەکەیە:

باڵیۆزخانەی بریتانی، بەغدا

ژمارە (٤٦/١٢/٢٢١، ٢٦ ی تەموزی ١٩٤٦)، بەشی ڕۆژهەلاتی خۆشەویست:

تکایە سەیری نامەی ژمارە (٢٢١ /٤٦/٥) ی بیست و نۆی کانونی دووەمی ڕابردووتان بکەن.

واپێدەچێت هیچ گومانێك لەوەدا نەبێت کە (پارتی ڕزگاریی کورد) ڕێکخراوێکی بەڕووکەش؟ یاخود بەڵکو تەنانەت لەوانەیشە دەستکردی کۆمۆنیست بێت.

وا وەك هاوپێچ وێنەی ڕاپۆرتەکەی ئەفسەری پاراستنی ئاسایش تان بۆ دەنێرم کەئەو زانیارییە نوێیانەی کە تێیدا دەستمان کەوتوون.

ئیمزا

دڵسۆزی هەمیشەییتان سکرتێر

هەربۆیە بەمەبەستی ڕێگریکردن لە چالاکییەکانی (ڕزگاریی) ئینگلیزەکان‌و کاربەدەستانی ڕژێمی پاشایەتی لە عێراق کەوتنە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەو هێرش‌و پەلاماردان‌و تاوانبارکردنیان بەدەرچوون لەڕێبازی کوردایەتی‌و دژایەتی کردنیان کەمەبەستی ئەوەی جەماوەری کوردی لێ بتەکێنن‌و لێیان دووربخەنەوە. لەلایەکی ترەوە دەزگا ئەمنییەکان‌و چاودێرانی تایبەت ئاگادارکرانەوە لە چالاکییەکانی حیزبی ڕزگاریی‌و فراوانبوونی ڕێکخستنەکانیی‌و دەستگیرکردنی‌و نەهێشتنی جموجوڵەکانی، فەرماندرا بە هەموو داموو دەزگا ئەمنی‌و پۆلیسییەکان کە چاودێریی توندی ئەو کەسانەش کەبەپێی زانیاری دەزگا تایبەتەکان جێگای گومانن یا ناسراون بەهۆی ئەو لیستانەی کەوتونەتە ژێر دەستی حکومەت. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ئەو هەلومەرجە ناسکەی کە حیزبی ڕزگاریی کورد پێیدا تێپەڕی درێژەی بەتێکۆشانی خۆی دەداو بەپارەو پێشمەرگە یارمەتی پێشکەش بەجووڵانەوەکە دەکرد، هەموو هەوڵ‌و کۆششەکانی کاربەدەستانی عێراق بۆ گەڕاندنەوەی ئەفسەرە کوردەکان لە ڕیزی سوپای عێراقیان جێهێشتبوو بێئەنجام بوو.

بەڵام سەرەتای کێشەی فکری‌و بۆچونی جیاجیا لەنێو بەرەی چەپ سەری هەڵدا، ئەویش بە هەڵگەڕانەوەو پەیوەندیکردنی ژمارەیەك لە ئەندامە باڵاکانی (پارتی ڕزگاریی کورد) بە پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە، ئەمەش گەلێك جاران گرژی‌و ساردی بەخۆوە گرت، زیانی زۆری بەبزووتنەوەی ڕزگارییخوازی کوردستان گەیاندو زەمانە دەریخست کە بنەماو ڕەگو ڕیشەی کێشەکان نەك تەنیا لە کوردستان یان لە عێراقدا، بەڵکو لەسەرانسەری دنیادا بۆ عەقلییەتی دەسەڵات‌و ڕۆڵی تاك حیزبی دەگەڕایەوە، کە ئایدۆلۆجیای ستالینزم سەرچاوەکەی بووە.

بەم شێوەیە هەر لەم سۆنگەیەوە کار و چالاکییەکانی پارتی ڕزگاریی کورد لەسەر گۆڕەپانی سیاسی کوردستان وردەوردە بەرەوکزی چوو.

ئیدی ڕزگاریی کورد تائابی ساڵی(١٩٤٦) لە کاری سیاسی‌و جموجوڵی گۆڕەپانی سیاسی کوردستان بەردەوامبوو، هەربۆیە ڕزگاریی لە سەرەتای مانگی (ئابی) ساڵی (١٩٤٦)دا کۆنگرەی بەست، بەڵام چالاکییەکانی ئەم پارتە تا ناوەڕاستی مانگی (ئاب) درێژەی کێشا.

هەفتەی یەکەمی مانگی (ئاب)ی ساڵی (١٩٤٦) (حیزبی ڕزگاریی کوردستان) کۆنگرەی خۆی لە بەغدا بەست، جگە لە جەماعەتی (سالح حەیدەری‌و نافع یونس) هەموو ئەندامەکانی سەرکردایەتی بەشدارییان لە کۆنگرەدا کرد.

لە کۆنگرەکەدا بەدوورو درێژی باسی باری کوردستان کرا، هەروەها باس لە پارتی کۆمۆنیست (شۆڕش)و پارتی (ڕزگاریی) کرا، بەوردی بارودۆخەکە تاوتوێ کرا.

کۆمەڵەی (ژ.ك)و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران‌و دامەزراندنی کۆماری ئۆتۆنۆمی مەهاباد پاڵپشتی ئەم

پرسەیان کرد، جگە لەمە هەموو حیزبە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق بڕیاریاندا لەکۆنگرەیەکی تایبەتدا خۆیان هەلوەشێننەوە.
سەرکردایەتی (ڕزگاریی)و (شۆڕش) بەدەرنەبوون لەو بیروباوەڕەو بڕیاریاندا خۆیان هەلبووەشێننەوەو ئامادەکاریی بۆ پێکەوەنانی پارتێکی نەتەوەیی یەکگرتوو بکەن، ئەویش پارتی دیموکراتی (کورد) بوو.
بەلام ئەوەی ڕاستی بێت بەشی زۆری ئەندامانی شۆڕش دوای هەلوەشاندنەوەی ئەم پارتە چوونە نێو ڕیزی پارتی کۆمۆنیستی عێراق.
سالح حەیدەریش لە یاداشتەکانی زیاتر باسی ڕووداوەکان دەکاتو نوسیویەتی: «کێشەی فیکریی لەڕیزی سەرکردەکانی پارتی کۆمۆنیستی کوردستان (شۆڕش)دا توندیی و گرژیی و ئالۆزیی تێکەوت، لە سەرەتای (ئابی ١٩٤٦)دا پارتەکە تێکچوو هەلوەشێنرایەوەو ژمارەیەك لە کادیرەکانی چوونە ڕیزی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە». بەلام ئەندامەکانی دیکەی پارتی ڕزگاریی لەبنەڕەتەوە ئەندامی نەبوونو چوونە نێو ڕیزەکانی (پارتی دیموکراتەوە).
لە کۆتاییدا لە(١٦ی ئابی ١٩٤٦)، دوای هاتنی (هەمزە عەبدولا) لەسەر داوای مستەفا بارزانی بەنهێنی دەگەڕێتەوە عێراق، بەتایبەتی کوردستانی باشوورو دانوستانکردنی لەگەل (حیزبی ڕزگاریی)و (حیزبی شۆڕش) گەیشتنە بڕیاری هەلوەشاندنەوەی هەردوو حیزب بۆ پێکەوەنانی حیزبێکی نوێ بەناوی (پارتی دیموکراتی کورد) کەلە (١٦ی ئابی سالی١٩٤٦) کۆنگرەی یەکەمی دامەزراندنی بەسترا، هەردوو هێزی ڕزگاریی - شۆڕش بەشێوەی یەکجاریی کۆتایی بەکارو چالاکییەکانیان هات.

*** دەرئەنجام:-**

١- مەملەکەتی کورد لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم و دواتریشدا لە قۆناغێکی ئالۆزدا تێدەپەڕی بەهۆی دەسەلاتی ئیمپریالیستەکانو دابەشکردنی کوردستان لەدوای بەستنی پەیمان نامەی سایکس پیکۆ لە سالی (١٩١٦)، کە بەپێی ئەم پەیمانە نەخشەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست گۆڕراو هەریەك لە ئیمپریالیستەکان بەبەرژەوەندیی نەخشەکەیان دارشتبوو، ئەم بارودۆخە وایکرد کوردەکان لە دژی دەسەلاتی ئیمپریالیستەکان بکەونەخۆ، بۆیە لەماوەی نێوان سالانی (١٩٤١-١٩٤٥) چەندین پارتو ڕێکخراو دروستبێت، کە هەریەك لەو پارتانە کاریگەریی جێ پەنجەی خۆیان نیشانداوە لە سەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردییو بەگژداچوونەوەی داگیرکەرە زلهێزەکانی ناوچەکە.

٢- ماوەی سالانی جەنگی جیهانی دووەمیش (١٩٣٩-١٩٤٥) بۆ کورد ماوەی گەشانەوەی چالاکی سیاسی بوو لە کوردستان، چونکە وەکو پێشتر باسم لێوەکرد کۆمەلێك پارتو ڕێکخراو دروستبوون کەلەناویاندا (دامەزراندنی پارتی ڕزگاریی کورد) لە سالی (١٩٤٥) لەلایەن (سالح حەیدەری)و بەهاوکاری پارتی (شۆڕش)، کە ئەم پارتە پارتێکی سیاسیو شیوعیی کوردیی بوو، دژایەتی دەسەلاتی کوردی داگیرکەری دەکرد بەتایبەتیو دەسەلاتی ئینگلیز، ئەم پارتە پارتێکی چالاکی سەردەمی خۆی بوو، لقی لە چەندین ناوچەی کوردستانو ئەندامێکی زۆری هەبوو لەسەرجەم ناوچەکانی کوردستان.

٣- پاش دامەزراندنی ئەم پارتەو بلاوبونەوەی لەبەشێکی زۆری شارەکانی کوردستاندا، کار و چالاکییەکانی ئەم پارتە دەستیکرد بەبلاوبوونەوە، کەلەڕێگەی یاداشتو ڕۆژنامەی تایبەت بە پارتەکە بەناوی (ڕزگاریی)، هەروەها لەڕێگەی ئەندامانی ئەم پارتەوە ڕێبازو کارنامەی ئەم پارتە بلاودەبۆوە، کە کار و چالاکییەکانی کاریگەری لەسەر کۆمەلانی خەلك دروستکردبوو، هەروەها پێشکەشکردنی چەندین یاداشتو بەیاننامە بۆ (یەکێتی سۆڤیەتو ولاتانی ئەوروپا کە تاوەکو هاوکاریی کورد بکەنو کورد لەو نەهامەتیو ژێر دەستییە ڕزگاربکەن کە بەهۆی داگیرکەرانەوە دەنالێنێت، هەروەها بلاوکردنەوەی پەیڕەو پرۆگرامی تایبەت بە پارتی ڕزگاری.

٤- کارو چالاکییەکانی ئەم پارتە مەترسی گەورەی خستبوە ناو دلی ئینگلیزو حکومەتی عێراقەوە، زۆر لە سەرچاوەکان ئاماژە بەو ڕاستییە دەکەن، چەند هۆکارێك وای کرد بوو هەولی سەرکوتکردنی لەلایەن حکومەتەوە بەلێدانو ئازاردانو گرتنو دوورخستنەوەی ئەندامو بەرپرسەکانی بکەن، ئەم پارتەو پارتەکانی تر کە مەترسیان هەبوو بۆ دەسەلاتی حکومەت، هەموو ڕێوشوێنێك گیراوەتەبەر بۆ لێدانیان، پارتی ڕزگاریی بەدەرنەبوو لەوپارتانە، هەروەها پەیوەندیکردنی سەرانی پارتی دیموکرات بۆ دامەزراندنی پارتێکی نوێو یەکگرتوو، بە سەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی، بووە هۆی ئەوەی ئەم پارتە لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦، لەیەکەمین کۆنگرەی دروستبونی پارتی دیموکرات خۆی هەلوەشاندەوەو کۆتایی بە کار و چالاکییەکانی خۆی هێنا.

* سەرچاوەکان:-
١-بورهان حاتەم گۆمەتالی: سالح حەیدەری (١٩٢٢-٢٠٠١) ڕژێمی سیاسی ڕوناکبیری، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٢،
٢-پشکۆ عەبدولڕەحمان ئاغجەلەری: شاری کەرکوك (١٩٣٢-١٩٧٧) دکتۆرا، بەشی مێژوو، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١١،.
٣-حامید گەوهەری: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٤،.
٤) حەسەن بارام: مەوسوعەی پارتەسیاسییەکانی کوردستان و عێراق (١٩٠٨ -٢٠٠٥) چاپی یەکەم، ٢٠١٢
٥-حەسەن زاز: عێراق لێکۆڵینەوەیەك لە مێژووەسیاسییەکەی (١٩٠٨ -٢٠٠٨)، و. ئامانج نیعمەت، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٩
٦-دلشاد مەحموود عەبدولڕەحمان: شاری کەرکوك (١٩٣٢ -١٩٥٨) نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٩
٧-سەروەر عەبدولڕەحمان عومەر: پارتی کۆمەنیستی عێراق و مەسەلەی کورد (١٩٣٤ - ١٩٧٥) نامەی دکتۆرا، بەشی مێژوو، زانستی مرۆڤایەتی، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٧،
٨-سەعدی عوسمان هەروتی(دکتۆر)، بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٦.
٩-شیخ لەتیفی حەفید: یاداشتەکانی شێخ (لەتیف)ی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ حەفید، ساغکردنەوەی، ١٩٩٥
١٠-عەبدولقادر شکاك: کورد لە سەردەمی ڕووداوەکانی (١٩٣٠-١٩٦٠) ، چاپی یەکەم، ٢٠١٤،
١١-عەزیز شەمزینی (دکتۆر): جووڵانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان، د. فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێهەم، سلێمانی، ٢٠٠٦
١٢-عەلی کەندی: ئینسایکلۆپیدیای مێژوونامە (ڕامیاری، مێژوویی، شارستانیی) لە ١٩٢٤/٦/١ تا ١٩٥٠/١٢/٣١، چاپی دووەم، بەرگی چوارەم، هەولێر، ٢٠١١.
١٣-علی عەبدوڵڵا: مێژووی پارتی دیموکراتی کوردستان - عێراق تابەستنی کۆنگرەی سێیەم، ئەیلولی ١٩٦٨.
١٤-عەلی قادر عوبێد و سیروان نەجم ڕەشید: خەباتی ڕزگاری نەتەوایەتی کورد، سلێمانی، ٢٠٠٢،
١٥-عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (دکتۆر): بەشێك لەیاداشتەکانم، دەزگای حەمدی، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٦
١٦-فاتیح ڕەسوڵ: بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ لە کوردستان، چاپی یەکەم، ستۆکهۆلم، ٢٠٠١،
١٧-فاتیح ڕەسوڵ: لە کاروانی دووروودرێژدا ((کورتەی خەباتی ئەزمونی پەنجا ساڵ)) ستۆکهۆلم، ١٩٩٧.
١٨-فەرەیدون نوری(دکتۆر): بزاڤی بارزانی، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧،.
١٩-فەرید ئەسەسەرد: ڕەهەندەکانی بیری سیاسی کورد و پاش جەنگی جیهانی دووەمی جیهانی بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، سلێمانی، چاپی دووەم، ٢٠١٢.
٢٠-فەیسەڵ دەباغ: حیزبی هیوا و شۆڕش. (١٩٤٣-١٩٤٥) ی بارزان، دەزگای ڕاگەیاندنی گەلان، هەولێر، ١٩٩٧،
٢١-کەریم یەلدز: کورد لە عێراق، و: د.شاهو بورهان، چاپخانەی کارۆ، چاپی یەکەم
٢٢-کەمال مەزهەر (دکتۆر): کوردو کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیا، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ٢٠٠٩
٢٣-کەمال مەزهەر(دکتۆر): چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ئا. عەبدوڵڵا زەنگەنە، بەرگی دووەم، چاپخانەی پەروەردە، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١
٢٤-کەمال مەزهەر: تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.
٢٥-کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەردەیەك لە مێژووی کورد، چاپخانەی ڕۆژهەڵات. چاپی شەشەم. سلێمانی. ٢٠٠٩،
٢٦-کریس کۆچیرا: کورد لەسەدەی ١٩-٢٠ دا و. محەمەد ڕیانی، چاپی یەکەم، تاران ١٩٩١.
٢٧-م. محەمەد باقی سعید: کەرکوك لە مێژوودا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئارۆما، سلێمانی، ٢٠١٤،
٢٨-محەمەد فاتیح: حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی عێراق (١٩١٠-٢٠١٠) سلێمانی، ٢٠١٢،.
٢٩-مەسعود بارزانی: بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد (١٩٣١-١٩٥٨)، وسەعید ناکام، چاپی یەکەم، ١٩٩٨.
٣٠-مـەسـعـود عـەبـدولخـالـق: نـاسـنـامـەی حـیـزبـە کوردستانییەکان (ڕەوتیان- ئایدۆلۆژیا - هەلسەنگاندن) چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٢،
٣١-مەردادی ئیزەدینی: چەردە باسێك لە بارەی کوردانەوە، و: ئەمین شوان، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٧
٣٢-نەجم سەنگاوی: کوردستان سەرکردەو ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی (١١٦٩ -١٩٩٥) چاپی یەکەم ٢٠١٢
٣٣-نەوشیروان مستەفا ئەمین: بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین، مێژووی سیاسی کوردستان، کتێبی سێهەم. ب ٣، بیروت - لبنان.٢٠١٤،
٣٤-نەوشیروان مستەفا ئەمین: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەوانی کوردی، بەرگی سێهەم، ٢٠٠٤.
٣٥-هیوا عەزیز سەعید: ڕەنگدانەوەی بیری لیبراڵی لە باشووری کوردستان. (١٩٠٠-١٩٥٨)، سلێمانی، ٢٠٠٦،
٣٦-هیوا عەزیز سەعید: کۆمەڵەی خۆیبوون، پارتی هیوا، کۆمەڵەی ژێکاف، مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)
*سەرچاوە عەرەبییەکان:-
٣٧-اسماعیل شكر رسول: اربیل - دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسي (١٩٣٩-١٩٥٧) اطروحة دكتوراه، مقدمة إلى كلية الاداب - جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٩٩.
٣٨-اركان محمد امين زرداوي: منشاه وتطور الجمعيات والاحزاب والتيارات السياسية الكوردیية في العراق، چاپی یەکەم ٢٠٠٩،.
٣٩-جلال طالباني: كردستان و الحركة القومية الكردية، ط (٢)، بيروت، ١٩٧١.
٤٠-جليل جليلي: واخرون الحركة الكردية في العصر

الحديث، د. عبدي حاجي، ط(١)، بيروت،
٤١-شيركو فتح الله: الحزب الديموقراطي الكردستاني، الحركة التحررية القومية الكردية في العراق (١٩٤٦-١٩٧٥) المطبعة رون، السليمانية، ط (١)، ٢٠٠٤.
٤٢-صالح حيدري: مختارات من مذكرات صالح حيدري، ط (٣)، سليمانية ٢٠٠٤
٤٣-صلاح الخرسان: صفحات من التاريخ الحركة الشيوعية في العراق ١٩٩٣, ل ٢٠٧
٤٤-صلاح خرسان: التيارات السياسية في الكردستان العراق، بيروت - لبنان، ط(١)، ٢٠٠١.
٤٥-عبدالرزاق الحسني: الاحزاب السياسية العراقية (١٩١٨-١٩٥٨) چاپی یەکەم.
٤٦-عبدالستار طاهر شريف: الجمعيات والمنظمات الاحزاب الكردية (١٩٠٨-١٩٥٨) ، ط(١)، بغداد، ١٩٨٩.
٤٧-عزيز حسن البارزاني: الحركة القومية الكردية التحررية في الكردستان العراق (١٩٣٩-١٩٤٥) ، ط(١)، ٢٠٠١.
٤٨-غانم محمد عبدالغفور (الدكتور): ا.د. عبدالفتاح علي البوتاني، الكرد والاحداث الوطنية في العراق خلال العهد الملكي (١٩٢١-١٩٥٨)، الطبعة الاولى، دمشق، ٢٠٠٨.
٤٩-فاتح رسول: صفحات من تاريخ كفاح الشعب الكردي ج(١)، السليمانية، ٢٠٠٥،
٥٠-لويسان رامبو: الكرد والحق: ت, عزيز عبدالاحد، ط (١)، اربيل، ١٩٩٨، ص ٧٠
٥١-ماجد عبدالرضا: القضية الكردية في العراق، بغداد، ١٩٧٥.
٥٢-محسن دزەيي: احداث عاصرتها، ط(١)، اربيل، ج (١)، ص ٥٨.
٥٣-محسن محمد متولي: كرد العراق، چاپی یەکەم، ٢٠٠١، الدار العربية الموسوعات.
٥٤-مسعود البارزاني: البارزاني والحركة التحررية الكردية، كوردستان، ١٩٨٧.
٥٥-مسعود البارزاني: الحركة التحررية الكردية و البارزاني والثورة البارزان، كوردستان، ١٩٤٥-١٩٥٨
٥٦-مكرم الطالباني (دكتور): حيزب هيوا، السليمانية، ٢٠٠٢،
٥٧-منذر الموصلي: الحياة السياسية والحزبية في الكردستان، ط(١)، لندن، ١٩٩١.
٥٨-نوري شاويس: من مذكراتي، الطبعة الاولى، ١٩٥٨،

* گۆڤارەکان:
٥٩-ئەحمەد باوەڕ: پارتی هیوا لە دروستبوونییەوە لە شاری کەرکوك تا هەڵوەشاندنەوەی (١٩٣٧-١٩٤٤)، گۆڤاری کەرکوك، چاپی دووەم، ژمارە (١) هاوینی ٢٠٠٠
٦٠-تاریق جامباز: وشیاری نەتەوەیی گەنجانی هەولێر لە کۆتایی سییەکان تا ناوەڕاستی چلەکان لەنێو حیزبی هیوا، گۆڤاری هەولێر. ژمارە (١). هەولێر ١٩٩٨
٦١-پزگاری (گۆڤار) ، ژ. (١)، ساڵی یەکەم، ١٩٦٩/٤/٢٥.
٦٢-شێخەشەل) ، (٢١ ك) گۆڤار، ژمارە (١٤) لەبەرهاری ٢٠٠٩
٦٣-صالح حيدري: كنت أول ماركسي الوحيد في اربيل (كولان العربية) مجلة القسم الثاني، ٤٠(١١) ٢٥/٤/١٩٩٧
٦٤-صالح حيدري: مخاطرات من مذكرات (الاتحاد) ، ط(٣)، سليمانية، ١٩٩٢
٦٥-صالح حیدری، یاداشتێك دەربارەی حیزبی پزگاری کورد کە لە ساڵی ١٩٤٥ لە کوردستانی عێراقدا دامەزرا، گۆڤاری (دەفتەری کوردەواری) بەرگی یەکەم، بەغداد، کانونی دووەمی ١٩٧٠
٦٦-گۆڤاری کەرکوك، بەشی دووەم، ژ. (٧)، زستانی، ٢٠٠٩،
٦٧-کریم شارەزا: مع اعلام الكرد (الميثاق الوطني الاستاذ نوری شاویس) (خبات) ((جديد)) ٢٠٠١، ٢٠٠١/١١/١٧.
٦٨-ناسك محەمەد: کۆنترین دەرمانسازی شاری کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٢٧) زستانی ٢٠٠٨
٦٩-ناهیدە ڕەفیق حیلمی، بەبۆنەی یادی (٣٥) ساڵی کۆچی دوایی ڕەفیق حیلمی باوکمان، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٨) بەغداد، ١٩٨١.
٧٠-نەجاتی عەبدوڵڵا: حیزبی هیوا (١٩٣٩-١٩٤٥). دوو ڕەوتی یەك کۆتایی، گۆڤاری (ڕابوون)، ژمارەی (٢٦). ١٩٩٩.

## بەشی سێیەم

# ئەو گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسانەی سەردانی کەرکوکیان کردووە

د. زرار سدیق ناروو جەیی
د. مووسا محەمەد خدر
د. نەجاتی عەبدوڵڵا
عالیە عەبدولکەریم مودەڕیس
ڕووخۆش عەلی
فەرەیدوون عەبدولقادر
سەربەست کەرکوکی
هێمن مەولوود
د. جەبار قادر
ج. کرامرز (تۆمابوا)
ئەحمەد تاقانە
ئەحمەد عەزیز
سمکۆ بەهرۆز
خالید دلێر
سمکۆ شوانی

کەرکوك لەبەر ئەوەی شارێکی گرنگی مێژوویی بووە، بۆیە هەردەم جێگەیەکی گەورەی هەبووە لەلای ڕۆژهەڵاتناس‌و گەڕیدەکان‌و هەردەم حیسابێ ووردی بۆ کراوەو لە پێگە سیاسییەکانداو زۆر بە هەستیارانەو ژیرانە هەڵسەنگێنراوەو خراوەتە مەلەفی تایبەتی دەولەتەکانەوە. بۆیە لە ماوە جیاجیاکاندا کەسانێکی زۆر هەرییەکەو بەکارو ئەرکێکی تایبەتییەوە سەردانی ئەم شارەیان کردووە.

ئەوانەی سەردانی کەرکوکیان کردووە یان گەڕۆك یان گەڕیدە یان ڕۆژهەڵاتناس بوونە، هەندێکیان بۆ کارێکی تایبەتی‌و هەندێك وەکو ئارەزوویەکی گەشت سەریان داوە، بۆیە دەبێت هەوڵبدەین کە پۆلێن‌و جۆری گەشتیارەکان‌و مەرامەکانیان بخەینەڕوو تا بەوەی ڕووی ڕاستی ڕووداوەکان شی بکەینەوە.

گەڕیدە یان گەڕۆك (بەو کەسانە دەڵێن کە زۆر بگەڕێن یان زۆر بسووڕێنەوە)[1] بە وولاتاندا، بۆیە دەبینین کە جاران ئەم جۆرە گەشتانە زۆر بووەو کەسانێکی زۆر ئارەزوویان لە گەڕان بووە بە شاراندا بۆ سوود وەرگرتن لە زانیاری‌و شارەزایی لە دابونەریتی نەتەوەکانی جیهان کە ئەمیش هەر لە سەردەمە جیاجیاکاندا سەریان هەڵداوەو قۆناغ بەپێی قۆناغ بۆ کارو مەبەستی دیاریکراو گەشتیان کردووە، بەشێکیان هەوڵیانداوە ڕووی مێژوویی‌و جوگرافیی‌و کۆمەڵایەتی‌و تەلارسازی ئەو نەتەوانە بنووسنەوە کە سەردانیان کردوون. هەندێك لەو گەڕیدانە بە ڕێککەوت سەریان لەو شوێنانە داوەو ئەوەی گرنگ بووە لێکۆڵینەوەی خۆیان نووسیوەتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی سەرپێیی یان بە شێوەیەکی سادەو ڕووکەش‌و دوور لە تایبەتمەندی نێو باسەکەمان. لەبەر ئەوەی بەبۆچوونی من گەڕیدەکانی بەشی یەکەم زیاتر جێگەی متمانەن‌و بابەتەکانیان‌و هەڵسەنگاندنی لێکۆڵینەوەکانیان قورسایی خۆی هەیە.

ئەگەر بێت‌و بە لێکۆڵینەوەو سەرچاوەکاندا ڕۆ بچینە خوارەوە لە ماوەی مێژوویی پێش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام دەبینین گەلێك لە گەڕیدەو پزیشك‌و سەربازانی سوپاکانی یۆنان‌و ڕۆما لەگەڵ لەشکرەکانیاندا لە پاڵ کارە سەربازییەکانیان هەڵساون بە نووسینەوەی بەشێك لە یاداشتەکانیان لەو شوێنانەی کە پێیدا ڕۆیشتوونە، یان بەشدارییان کردووە لە کارە سەربازییەکانیان، بۆیە ئەگەر سەیری ئەو سەرچاوانە بکەین کە نووسیویانەتەوە تا ڕادەیەك بایەخ‌و گرنگی خۆی هەیە لە نووسینەوەی مێژووی ئێستادا، یا بۆ تاووتوێکردنی مێژووەکانی کە لەو سەردەمەدا ڕوویداوە.



گەریدەکان لەو سەردەمەدا توانیویانە بەپێی گرنگیو پێویستی شەڕەکانیان هەوڵ بدەن ڕووانگەی نووسینەکان بخەنە ئەو لایانەوە یان بتوانن وا بکەن لێکۆڵینەوەیەکی بەرچاو ئامادە بکەن بۆ سوپاکەیان یان بۆ حکومەت یان ئیمبراتۆرییەتەکە تا بۆ ئەوەی لە دوا ڕۆژدا شارەزاییەکانیان لەبەر چاو بێت بۆ کاری سەربازی.

شوێنی کەرکوك یا بە واتایەکی تر پێگەی سەربازی خۆی بە شێوەیەکی ئەوتۆ بوو کە لە کاتی ئاماژە پێکردنی ئەو گەریدانەدا لە یاداشتەکانیان هەوڵیان داوە بە دوور یا نزیك لە باسکردنی کەرکوكو بەراووردی پێگەی ئەم شارە لە سەردەمی هەخامەنشیو ئەشکانیو ساسانیدا بەراورد بکەن لەگەڵ شوێنی بەربەرەکانی یۆنانیو ڕۆمانییەکان.

بۆ نموونە ئەگەر سەیری مێژوونووس (هیرۆدۆت) بکەین دەبینین لە کاتی ناوهێنانی شوێنەکانی ڕۆژهەلاتی یان لە کاتی ئاماژە پێکردنی شەڕەکاندا هەست دەکەین بە نووسینەوەی بەشێك لە ڕووداوەکانی کەرکوكو دەوروبەری.

"(هیرۆدۆت) یان (هیرۆدۆتس) یەکێکە لە مێژوونووسە ئەغریقییەکان کە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینییدا ژیاوە، بەناوبانگە بەوەی کاتێك وەسپی ئەو شوێنانەی کردووە یان چاوپێکەوتنی لەگەڵ خەڵکەکە کردووە لە پاڵ ناوهێنانی بەشێك لەو داگیرکارییەی فارسەکان بۆ سەر یۆنان.

(هیرۆدۆت) بەوە بەناوبانگە کە بە باوکی مێژوو بە ناوبانگە، چونکە یەکێکە لەوانەی دەستپێشخەری ڕووداوە مێژووییەکان بووەو هاوسەردەمی ڕووداوەکانی ئەغریقو فورسو میدییەکان بووە، توانای نووسینەوەی مێژوویی بە شێوەیەك بووە کە توانیوییەتی ئەوەی کە خوێندووییەتییەوە وای لێکردووە کە سەرنجی بەرامبەرەکەی رابکێشێت بە شێوەی ئەوتۆ تێکهەڵکێشی ڕووداوەکانی کردووە وەکو زنجیرەیەکی لێکنەپساوە"[٢].

"ئەوەی لێرەدا گرنگە بیلێین لە نووسینەوەی ئەو یاداشتە مێژووییانەیدا هەوڵی داوە هەموو ئەو شوێنانەی کە پێیدا ڕۆیشتووە ئاماژەی پێ کردووە، ناوچەیەکی وەکو کەرکوكو کوردستان بەشێك بووە لەو یاداشتانەییو دوورو نزیك هەوڵی داوە ئاماژە بە ناو و شوێنەکانیان بکات، یان باسکردنی ئەو شوێنانە لەو چوارچێوەیەدا بووە کە هەوڵی داوە لە باری سیاسی گشتی ئەو کاتەی دەوڵەتەکاندا ئاماژەی پێ بکات.

یا یەکێکی وەکو (سینۆهە) لە دەستپێکی گەشتە پزیشکییەکانیدا ئاماژەی بە گەلێك شوێنو جێگاو دابو نەریتی ئەو نەتەوانە کردووە کە هاوسەردەمی ژیانی خۆی بووە"[٣].

ئەگەر تاوتوێو لێکدانەوەی ئەو یاداشتانەی پێش ئیسلام بکەین دەبینین گەلێك یاداشتو لێکۆڵینەوەی جۆراجۆر سەری هەڵداوە کە خۆی دەبینێتەوە لە یاداشتی سەربازی، کۆمەڵایەتی، ئاینیی، هەموو ئەمانە قۆناغێکی گرنگ بوونە لە مێژووی ناوچەکەدا بۆ هەڵسەنگاندنی ئێستای مێژووی کەرکوك، بە تایبەتی لە بنەڕەتی ناوی شارەکە، دانیشتووانی، دابو نەریتیان، کەلەپوور.

گەریدەکانی پێش هاتنی ئیسلام سەرچاوەی بابەتەکانیان خۆی دەبینییەوە لە:

١. نووسینو کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر شەڕو پێگە سەربازییەکانی هەردوو لا، تا بۆ ئەوەی زانیاری پێویست کۆبکەنەوە لەسەر پێگە سەربازییەکانی دوژمن لە بەرامبەریان لە ڕووی جۆری چەك، سوپا، جلوبەرگ، کەرەستەی جەنگی، ئاژەڵی، سەربازی، تەکتیكو ستراتیژی شەڕکردن.

٢. نووسینو کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر پێگەی کۆمەڵایەتی ئەو ناوچانە لە ڕووی: (دابو نەریت، کەلەپوور، جلوبەرگ،

چین و کۆمەڵ، ئایین، زمان).

٣. نووسین و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر پێگەی جوگراف ناوچەکە لە رووی: (شوێن، ئاو و هەوا، پلەی گەرما، باران، شێ، جۆری زەوی، کشتوکاڵی، چیا، دۆڵ، دەریا).

٤. نووسین و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر جۆری نەخۆشییەکان و چارەسەرکردنی یان بەکارهێنانی ئەو رووەکانەی کە لەو ناوچەیەدا باوو بووە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان، کە زۆر جار لە چارەسەرکردنی نەخۆشی نێو سوپادا بە کاردەهێنرا.

٥. نووسین و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر پێگەی ئابووری و بازرگانی شوێنەکان.

٦. نووسین و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر زمانی دانیشتووان و پۆلینکردنی بەراوردیان لەگەڵ فەرمانڕەوایانی ئیمپراتۆرییەتەکە.

*** گەشتێکی سینۆهە بۆ ناوچەکانی رۆژهەڵات:**

"(سینۆهە) یەکێکە لە پزیشکەکانی فیرعەون، کتێبێکی گەورەی لە یاداشتەکانی خۆی نووسیوەتەوە لە ساڵی (٣٣٥٠)ی پێش زایین دەربارەی ئەو شوێنانەی کە سەری لێیان داوە باس و یاداشتەکانی سینۆهە باس لە (هاتی)و (میتانی)و (کۆرش)و گەلێك شوێن و جێگا دەکات، یەکێك لەو شوێنە گرنگانە، سەردانێتی بۆ ئاقارەکانی دەوڵەتی میتانی کە ناوچەی کەرکوك بەشێکی رۆژهەڵاتی ئەو ئاقارە بوو، ئاوا باس دەکات:

"لە (میتانی)ئەو شتەی لە هەموو زیاتر سەرنجی راکێشاین، جوانیی ژنەکانیان بوو، هەموویان باڵا بەرزو بەهێزو قەشەنگ بوون و هەر ئەوەندە زانییان کە من پزیشکێکی میسریم، هاتنە لام و گلەییان لە ساردو سڕی مێردەکانیان دەکردو دەیانگوت: پیاوەکانمان ناتوانن هەموو شەوێ لەگەڵماندا کۆببنەوەو ئەم بابەتە دەبێتە هۆی دڵرەنجانی ئێمە، من بینیم پێستی لەشی ئەو ژنانە ئەوەندە سپییە کە هاتوچۆی خوێنی ناو دەمارەکانیان بە رەنگێکی شین لەژێر پێستیانەوە دیاربوو.

پزیشکەکانی میسر لە کۆنەوە بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی کەم توانایی سێکسی بە ناوبانگ بوون و لە هیچ وڵاتێك بە ئەندازەی میسر لە چاککردنەوەی ئەم دیاردەیە شارەزا نەبوون و هەموو جارێك کە دەرمانێکم بۆ یەکێك لەو ژنانە دەبریەوە کە دەرخواردی مێردەکەی بدات، دەمزانی کە ئاکامێکی باشی هەبووەو ژنەکە دوای چەند رۆژێك دەهاتە لام و سوپاسی دەکردم و دەیگوت: ئێستا وەزعی مێردەکەم باشەو هەموو شەوێ دێتە لام، ئەوان دەرخواردی مێردەکانی خۆیانیان دەدا، یان دەیاندایە خۆشەویستە نهێنییەکەی خۆیان، چونکە لە (میتانی) ژنەکان وا راهاتبوون کە جگە لە مێردەکانی خۆیان، لەگەڵ پیاوێکی تریشدا پەیوەندییان هەبێت. سەرنجمدا ئەگەرچی ژنەکانیان کەڵەگەتن، بەڵام بە دەگمەن منداڵیان هەیەو تێگەیشتم کە خوایەکان لە گەلی (میتانی) تووڕەن، چونکە کاتێك منداڵ لەدایك نەبوو بەشێکی زۆری خەڵکی بریتی دەبێت لە پیرەمێردو پیرەژنەکان و ئەو گەلە لەناو دەچێت، ئەگەرچی چاککردنەوەی گرفتی ساردو سڕی پیاوەکان بەرادەیەکی زۆر بووە هۆی دەرکردنی ناوبانگم، بەڵام چارەسەرکردنی یەکێك لە دەوڵەمەندە بەساڵاچووەکانی (میتانی) سەرکەوتنەکەمی بە تەواوی گەیاندە لووتکە"[٤].

*** گەشتی (ستراپۆ):**

"ئەم گەڕیدەیە لە ساڵی (١٩)ی پ. ز.، سەری لە کەرکوك داوەو وەسفی ئەم شارەی داوە بەوەی کە ئەم ئاقارەی بە (ئەرتەکینی) ناو بردووە، هەرچەندە گەلێك لە مێژوونووسەکان سەرنجیان هەیە لەسەر گەلێك ناو کە (ستراپۆ) باسی کردووە"[٥].

*** دەوری گەڕیدەو مێژوونووسە عەرەب و ئیسلامەکان لە سەدەکانی ناوەراست:**

لە کاتی هاتنی ئیسلام، لە دوای بڵاوبوونەوەیان لە ناوچەکانی کوردستان و وڵاتی فارسدا، مێژوونووسە عەرەب و گەڕۆکەکان کەوتنە کۆکردنەوەو بەدواداگەرانی زانیاری لەسەر ئەو شوێنانەی کە ئایینی ئیسلامیان تێدا بڵاوبووەوە، تا بتوانن لە پێگەیەکی بەرچاودا زانیاری و لێکۆڵینەوەکانیان کۆبکەنەوە بۆ گەلێك مەبەستی جۆراجۆر لە مەڕ کۆمەڵایەتی و ئابووری و زمان و مێژوو و جوگرافیا.

لە سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا هەر چەندە بەشێکی زۆری عەرەب و موسڵمانەکان بە کاری شەرکردنەوە خەریك بوون، بەڵام بەشێکی کەمیان توانییان هەوڵ بدەن لە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەو شوێنانەی کە داگیریان کردبوو، تا بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینن بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان.

لە سەدەکانی سێیەمی کۆچی لەوەودوا عەرەب و موسڵمانەکان کەوتنە خۆ بۆ گەران و بەدوادا لێکۆڵینەوە لەسەر کۆکردنەوەی زانیاری لە ناوچە جۆر بە جۆرەکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا، بۆیە چینێك سەریان هەڵدا پێیانیان دەووت (ئەلبولدانیین – البلدانیین) یان (گەڕۆك و گەڕیدە عەرەبەکان).

ئەم زانستە (علم المصنفات البلدانية) لە ناوەراستی سەدەی سێیەمی بەرامبەر سەدەی نۆیەمی زایینی سەری هەڵداو لە رووی زمانەوە گەلێك شرۆڤەی لێکدانەوەی زمانەوانی بۆ کراوە، هەر وەکو ئەوەی کە ووشەی "(البلدان) دارێژراوە لە ووشەی (البلد) کە بەمانای ئەوە دەگەیەنێت بۆ هەر شوێنێك یان پارچەیەکی ئاوەدان یا ئاوەدانەبوو"[٦].

هەر وەکو ئەوەی لە (المعجم الوسيط)دا هاتوو کە ووشەی "(البلد) یان (البلیدة) بە مانای شوێنێکی دیاری کراو بۆ نیشتەجێکردنی کۆمەڵێکی دیاریکراو کە پێی دەڵێن شوێنێکی بەر فراوانە لە زەوی وڵاتێکدا"[٧].

یان خوا لە قورئانی پیرۆزدا دەڵێت: ((البلد الطيب يخرج نباته باذن ربه))، یان ((انما امرت ان اعبد رب هذه البلدة الذي حرمها))[٨].

"هەروەها لە پاڵ ئەمەشدا زانستێکی تر سەری هەڵدا کە ئەویش (علم المسالك والممالك) بە مانای (مسالك البلدان

والامصار)، ئەو زانستەیە کە لە باری ئەو شوێنە دەکۆڵێتەوە کە ووشکایی بێت یا ئاوی، یان دەشتی یا رووبار یان گردو دۆڵ، هەروەها لێکدانەوە لە جۆری ئەو ئاژڵو کشتوکاڵانەی لەو شوێنەدا هەیە لە رووی سوودو زیانییەوە، هەروەکو هەندێك وا بۆ دەچن کە زانیستێکە بایەخ بە ماوەی شوێنەکانو ئەو رێگایانە دەدات کە بۆی دەچێت لە رووی پێوانەی میلو فەرسەخەوە، بۆیە دەتوانین بڵێن کە (علم المسالك والممالك) زانیستێکە بایەخ بە جوگرافیای وەسفی دەدات"[٩].

"ئەگەر بێتو بەراوردێکی ئەو گەڕیدانە بکەین کە لە ئیسلامدا سەریان هەڵداوە دەتوانین بیکەینە چەند بەشێکەوە:

١. ئەو گەڕیدانەی بایەخیان بە جوگرافیا داوە، وەکو (ئیبن فەزلان)، (ئیبن حەوقەل)، (ئەلمەقدەسی)، (ئەبی دەلەف)، (عەبدوللەتیف ئەلبەغدادی)، (بیرۆنی)، (ئیبن بەتلان).

٢. ئەو گەڕیدانەی بایەخیان بە مێژوو داوە، وەکو (ئەلمەسعودی)، (ئەلهەرەوی)"[١٠].

*** هۆکارەکانی بایەخی موسڵمانەکان بۆ گەڕانو لێکۆڵینەوەی شارەکان:**

"١. کردنەوەی باوەشی ئیسلام بۆ زانستو بایەخدان بە بڵاوبوونەوەی تا بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینێت، هەر وەکو ئەوەی لە گەلێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەو گرنگییە کراوە، دەبارەی زەویو ئاسمانو رووبارو چیاو گەلێکی تر.

٢. هاتنی ئیسلام بۆ ئەو شوێنانە دەورێکی گرنگی هەبوو لە بایەخدان بە شارو رێگاو لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو نەتەوانەی لەو شوێنانەن، چۆنێتی هاتنیان بۆ سەر ئیسلام بە خۆشی یا بە شەڕ، یان چۆنێتی جێبەجێکردنی رێنماییەکانی ئیسلام دەوری خۆی هەبوو لە گرنگی بۆ ئەو شوێنانانە.

٣. بە هۆی فراوانی ئاقاری دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە سەردەمە جیاجیاکان بوو بە هۆی فراوانی پانتایی بازرگانیو بڵاوبوونەوەی ئاین لە هەموو شوێنێکدا، بۆیە وای کرد کە گەرۆکە عەرەبەکان بایەخ بدەن بە لێکۆڵینەوەو زانیاری ئەو شوێنانانە.

٤. خۆشەویستی موسڵمانەکان بۆ زانست وای کرد خۆی لە خۆیدا بایەخ بدەن بە گەڕان بە دوای زانستو سەرچاوەکانی.

٥. رۆیشتنی موسڵمانەکان بۆ بەجێ گەیاندن حەج خۆی دەورێکی باڵای هەبوو لە سەر هەڵدانی گەرۆكو گەڕیدە موسڵمانەکان بۆ شارەزابوون لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی موسڵمانان"[١١].

*** گەشتی مێژوونووسو گەڕیدە عەرەبەکان بۆ ناوچەکانی کوردستان:**

لە دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، عەرەبەکان کەوتنە کنەو گەڕان بە دوای شوێنەکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە دەرەوەی نیمچە دوورگەی عەرەبیو ئەو شوێنانەی بە بۆنەی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامەوە سەردانیان کردووەو هەوڵیان داوە زانیارییەکانیان کۆبکەنەوە چ بۆ کاروباری کارگێڕی یان سەربازی یان ئابووری تایبەت بە دەوڵەتە ئیسلامییەکان.

لە سەردەمی ئومەویو عەباسییەکاندا عەرەبەکان هەنگاوی گەورەیان نا بۆ نووسینەوەی مێژوو و کۆکردنەوەی زانیاری پێویست لەسەر شارەکانی کوردستان، کە کەرکوك بەشێکی گرنگی ئەو شارانە بووە کە عەرەبەکان سەریان لێداوە.

ئەو گەڕیدە عەرەبانە چەند هۆکارێك هەبووە کە دەوری هەبووە لە کاری گەڕانو پشکنینو کۆکردنەوە لەو ناوچانەدا:

١. هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام دەورێکی سەرەکی هەبووە کە لەگەڵ سوپای ئیسلامدا بەشێکیان هاتوونەو سەریان لە ناوچەکانداوەو زانیاری پێویستیان کۆکردووەتەوە.

٢. فراوانبوونی ئاقاری دەوڵەتە ئیسلامییەکان وای کرد کە عەرەبەکان بە هۆی فراوانبوونی توانای پەیوەندییە بازرگانیو ئابوورییەکان هەوڵ بدەن گەڕان بکەن بۆ بە دەست هێنانی زانیاری پێویست لە کۆکردنەوەی زانیارییەکان لە بواری ئابووریدا.

٣. خۆشەویستی گەڕانو دۆزینەوەی شوێنی تازە بە بەراورد لەگەڵ شوێنەکانی خۆیاندا کاریگەری خۆی هەبووە بۆ ئەوەی زانیاری پێویست لەسەر ئەو ناوچانە کۆبکەنەوە کە ببێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ دەوڵەتە ئیسلامییەکان.

٤. کاریگەری ئایینی ئیسلامو سەرهەڵدانی بزوتنەوەکانی (خەوارج) بە هەموو لقەکانییەوە دەوری باڵای هەبوو بۆ بەدوادا گەڕاندنی بەشێك لە مێژوونووسە عەرەبەکان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئەو بزووتنەوانە کە کەرکوكو ناوچەی داقوق بەشێکی گرنگی ئەو بزووتنەوانە بووە.

٥. سیخوری بۆ دەوڵەتە ئیسلامییەکانو کۆکرنەوەی زانیاری لەلایەن مێژوونووسانەوە دەورێکی باڵای هەبوو بۆ ئەوەی عەرەبەکان بەدوادا گەڕان بکەن لەو ناوچانەدا.

٦. پۆلێنکردنی ئەو گەڕیدەو مێژوونووسە عەرەبانە لەسەر ناوی (بلدانی)و (المسالك والممالك)و (علم البرد)و (جغرافی)و (المؤرخ)و (علم عجائب البلاد)و (علم وصف الكون). ئەمانە هەوڵیان دەدا هەر یەکەی بە جۆرێك لە کۆکردنەوەی ناوی شار، لادێ، دەڤەر، گەرەك، قەڵا، کووچەو گەلێك شوێنی تر کە پۆلێن دەکرا لەسەر بنەرەتی رووداوە مێژووییو زمانەوانیو ئایینیو نەتەوەییو پۆلێن کردنی لەسەر بنەمای ئیسلامبوونو مانەوە لەسەر ئایینی خۆیان، بۆیە لە هەندێك جاردا هەوڵیان داوە چەواشەکاری دروست بکەن لە نووسینەوەی ناوەکان لەسەر بنەرەتی ئەو ووشەکانی کە بێژەت دەکرێت بە زمانی عەرەبی بێ ئەوەی رەچاوی ئەوە بکەن کەوا دەبێتە تێکدانی بنەرەتی ناوەکەی کە لەلای خەڵك ئاشنابووە.

بەشێك لەم گەڕیدەو مێژوونووسانە دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی سێیەم یان چوارەمی کۆچیو بەشێکی دیان بۆ سەدەی پێنجەمی کۆچیو بەشێکییان دەگەڕێنەوە سەدەی شەشەمو نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی کۆچی:

١. گەڕیدەو مێژوونووسە عەرەبەکانی سەدەی سێیەمو چوارەمی کۆچی بریتی بوون لە:

(ابن خرداذبة، السرخسي، اليعقوبي، ابن روستة، ابن الفقيه الهمذاني، قدامة بن جعفر، سهراب، الجيهاني، البلخي، الاصطخري، ابن حوقل النصيبي، المسعودي، ابو دلف مسعر بن مهلهل، المقدسي).

٢. گەڕیدەو مێژوونووسە عەرەبەکانی سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچی بریتی بوونە لە:

(ناصر خسرو، ابو عبيد البكري، الادريسي، ابن جبير).

٣. گەڕیدەو مێژوونووسە عەرەبەکانی سەدەی شەشەم و نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی کۆچی بریتی بووە لە: یاقوت الحموی.

گەڕیدە عەرەبەکان لە باسکردنی شوێنەکانی ناوچەی کەرکوکدا زیاتر باسی (باجرمی، باجرمق، خانیجار، داقوق، داقوقا)یان کردووەو وەسفی شوێنەکانیان داوە بەوەی کە خانیجار ناوچەیەکە یان شارەدێیەکە لەنێوان بەغداو هەولێر لە نزیك شاری داقوقا، لە باسی داقوقاشدا دەڵێن: "شارێکە کەوتووەتە نێوان هەولێرو بەغداو بە تایبەتیش لە هەواڵی هێرشەکاندا زیاتر (یاقوت حموی) باسی کردووە بەتایبەتی لە شەڕەکانی خەواریجداو ئەو کوشتارانەی کە لەوێدا ڕوویداوە.

هەروەها (ابن خرداذبة) لە سەرچاوەکانیدا ئەوەی خستووتە ڕوو کە (باجرمی - باجرمق) ناوچەیەکە کە سێ شوێن لەسەرێتی وەکو (خنیاسابورو دقوقاو خانیجار)، ئەوەی خستووتەوە بەرباس کە ناوچەیەکە نزیك لە دقوقا.

ئەوەی گرنگە و جێگەی باسە گەڕیدەو مێژوونووسە عەرەبەکان سەر ڕاست نەبوونە لە گێڕانەوەی نووسینەکانییان و بێ لایەن نەبوونە بەرامبەر مێژوو چونکە نەیانویستووە یان شارەزاییان نەبووە لە ناوچەکان و زیاتر کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئایینی ئیسلامەوە.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١. (فەرهەنگی خاڵ)، شێخ محەمەدی خاڵ، لاپەڕە ٤١١-٤١٢.

٢. فەرهەنگی (ویکیپیدیا - الموسوعة الحرة).

٣. (سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون)، بەرگی یەکەم، چاپی چوارەم، میکاڤالتاری، وەرگێڕانی: سەیدا شێخ زرار، ٢٠٠٢، لاپەڕە (١٢)

٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٥).

٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٦).

٦. بڕوانە:

- (لسان العرب)، ئیبن مەنزور، بەیروت، ١٩٦٨، لاپەڕە (٩٤).

- (القاموس المحيط)، ئەلفەیروز ئابادی، بەیروت، ١٩٨٣، لاپەڕە (٢٢٨).

- (الكورد وبلادهم عند البلدانيين والرحاله المسلمين ٢٣٢ - ٦٢٦ هـ / ٨٤٦ - ١٢٢٩ م)، دکتۆر حەکیم ئەحمەد خۆشناو، (دار الزمان للطباعة و النشر)، دیمەشق، ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٣).

٧. (مجمع اللغة العربية المعجم الوسيط)، قاهیرە، ١٩٨٥، لاپەڕە (٦٨).

٩. سورەتی ئەلئەعراف، الایە (٥٨)، سورەتی ئەلنەمل، ئایەتی (٩١).

١٠. - ٦٢٦ هـ / ٨٤٦ - ١٢٢٩ م)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٧).

١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧).



*** کوردستانییەتی کەرکوک و دەوروبەری لە سەدەکانی ناوەڕاستدا:**

**د. زرار سدیق**

ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە کە کەرکوک و دەوروبەری هەر لە دێرزەمانەوە دەڤەرێکی کوردنشین بووەو، بەشێک بووە لە نیشتیمانی کورد- کوردستان، لەوەتی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی دامەزراوەو فەرمانڕەوایی وڵاتی عێراقی کردووە ئەم ناوچەیە (کەرکوک) هیچ پابەندییەکی جوگرافی و کارگێڕیی بە عێراقەوە نەبووە، جوگرافیاوانان و گەڕۆکانی موسڵمان و ڕۆژهەڵاتناسان و گەڕیدە ئەورووپییەکان بەڕاشکاوی ئەم ڕاستییەیان درکاندووەو بێلایەنانە ئاماژەیان پێداوەو ئەم هەقەی کوردیان چەسپاندووە، لای خۆمانیش سیاسەتوانانی کورد لەلایەک و ژمارەیەک لە مێژوونووسان و ڤەکۆڵەران و نووسەران لەلایەکی ترەوە بە هەموو شێوازێک لێبراوانە هەوڵدەدەن ئەم ڕاستییە مێژووییە بۆ دۆست و دوژمن بسەلمێنن و هەر یەکەو لای خۆیەوەو بە گوێرەی ئەو کەرەستەو بەڵگەنامەو تێکستە مێژووییانەی لەبەر دەست دا بووە کەم تا زۆر خزمەتی ئەم پرۆسەیەی کردووەو پاڵپشتییەکی زانستی- مێژوویی بۆ ئەم داوا ڕەوایەی کورد دەستەبەر کردووە، ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیەش دەچێتە خانەی ئەو هەوڵانەوە.

*** کەرکوک - باجرمێ لە جوگرافیاناسی ئیسلامیدا:**

لە مێژووی ئیسلامدا و لە سەدەی سێهەمی کۆچی، نۆهەمی زایینی ئەدەبی جوگرافیانووسی (الادب الجغرافي والرحلات) هاتە کایەوە، واتە بایەخدان بە لایەنی جوگرافی و وەسفکردنی تۆبۆگرافیای هەرێمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی و وڵاتانی دراوسێ و تۆمارکردنی هەر زانیارییەک پەیوەندی بە شارو باژێڕو شارۆچکەو گوندەکانی ئەو سەردەمەوە هەبێ، هەروەها دیاریکردنی دووریی نێوانیان و سروشتی کارگێڕییان. بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست ژمارەیەک جوگرافیاوان و گەڕۆک پەیدابوون بە پاداشت و نووسینەکانیان لایەنێکی هەرە گرنگی شارستانییەتی ئیسلامیان ڕوونکردەوەو کتێبخانەی مەعریفییان دەوڵەمەند کرد، لەوانە:

- ئیبن خەردازبە (لە (٢٨٠)ی کۆچی، (٨٩٣)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)،خاوەنی کتێبی (المسالك والممالك)ە.
- ئیبن ڕستە (لە (٢٩٠)ی کۆچی، (٩٠٣)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (الاعلاق النفسيه)یە.
- ئەلیەعقوبی (لە (٢٩٣)ی کۆچی، (٩٠٦)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (کتاب البلدان)ە.
- ئیبن ئەلفەقیە (لە (٣١٠)ی کۆچی، (٩٢٣)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (مختصر کتاب البلدان)ە.
- ئەلمەسعودی (لە (٣٤٦)ی کۆچی، (٩٥٧)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (مروج الذهب والتنبيه والاشراف)ە.
- ئەلئەستەخری (لە (٣٤٠)ی کۆچی، (٩٥١)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (مسالك الممالك)ە.
- ئیبن حەوقەل (لە (٣٦٧)ی کۆچی، (٩٧٨)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (صورة الارض)ە.
- ئەلمەقدیسی (لە (٣٨٧)ی کۆچی، (٩٩٧)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (احن التقاسيم في معرفه الاقاليم)ە.
- ئیبن جوبێر (لە (٦١٤)ی کۆچی، (١٢١٧)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (رحله ابن جبير)ە.
- یاقوت ئەلحەمەوی (لە (٦٢٦)ی کۆچی، (١٢٢٩)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (معجم البلدان)ە.
- شێخ ئەلرەبوە ئەلئەنساری (لە (٧٢٧)ی کۆچی، (١٣٢٧)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (نخبة الدهر في عجائب البر والبحر)ە.
- حەمەدوڵڵا ئەلمستوفی ئەلقەزوینی (لە (٧٥٠)ی کۆچی، (١٣٤٩)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (نزهة القلوب)ە.
- ئیبن بەتوتە (لە (٧٧٩)ی کۆچی، (١٣٣٧)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی کتێبی (رحلة ابن بطوطة)ە.

گەلێک دەنگوباس و زانیاری بە کەڵک و وەسفی وردو بەبایەخیان بە دەستەوە داوە لەمەڕ سەرپاکی هەرێم و ناوچەکانی دنیای ئیسلامی، لەوانەش بێگومان ناوچە کوردنشینەکان، پێویستە ئەوەش بگوترێت کە بۆچوون و ئاخافتنەکانیان ڕاست و دروست و جێگەی باوەڕن لەبەر دوو هۆ:

- زۆربەی ئەو وەسف و زانیارییانەی بەدەستیانەوە داوە بەچاوی خۆیان بینیویانەو لە سەرچاوەی ترەوە وەریانگرتووە.
- ئەم سەرچاوانە بە شێوەیەکی گشتی پتر تیشك دەخەنە سەر لایەنەکانی جوگرافی و ئابووری و دارایی و بیناسازی و کارگێڕی و بە دەگمەن تووخنی کاروباری سیاسی و سەربازی دەکەون، بۆیە کەمتر دەکەونە ژێر کاریگەری ڕەوشی سیاسییەوە.

وێڕای ئەم دوو خاڵەش هەندێك لەو جوگرافیاوانانەی باسکران، خەڵکی شارەکانی کوردستانن و بەخۆیان کەرکوک و باژێڕەکانی تری کوردستانیان بینیوە، (ئیبن ئەلفەقیە) خەڵکی هەمەدانە، (ئیبن حەوقەل) بە نەژاد خەڵکی شاری نەسیبین (نسێبین)ە، (ئیبن خەردازبە) چەندین ساڵ نامەبەرو پۆستەچی (صاحب البريد) بووە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات.

ئەم جوگرافیاوان و گەڕۆکانە لەمەڕ گەلێك پرسی کارگێڕی و جوگرافی ناکۆکن و زانیاری لێکجیا و تەنانەت دژ بە یەك دەدەن بەدەستەوە، وەك ڕێکنەکەوتنیان لەسەر دەستنیشانکردنی سنووری هەندێك هەرێم و ولایەتی دەوڵەتی ئیسلامی. بەڵام هەمووان کۆك و تەبان دەربارەی ئەوەی کە سنووری هەرێمی عێراق لە باکوورەوەو بەپێی هەموو ڕیوایەتەکان لە شارۆچکەی قەڵای تکریت تێپەڕ ناکات.

(ئیبن ئەلفەقیە) دەڵێت، عێراق لە درێژیدا لە عانەوە تا بەسرایە (مختصر کتاب البلدان، لاپەرە ١٥٣)، کەچی (ئیبن حەوقەل) دەڵێت، هەرێمی عێراق لە درێژیدا لە سنووری تکریتەوە تا شاری عەبادانە. تەنانەت تکریتیش عەرەبنشین نەبوو بەڵکو زۆربەی دانیشتووانەکەی مەسیحی (نصاری) بوون‌و لە ڕووی ڕێڤەبەریشەوە سەر بە شاری موسڵ بوو، موسڵیش وەك زانراوە بنکەی هەرێمی جەزیرە بوو (صورە الارض، لاپەرە ٢٠٥- ٢٠٨).

ئەم دوو ڕیوایەتە دژ بەیەك نین بەڵکو تەواوکەری یەکدین، (ئیبن ئەلفەقیە) لە ڕۆژئاواوەو لەسەر ڕووباری فوراتەوە بۆی چووەو (ئیبن حەوقەل) لە ڕۆژهەڵاتەوە لەسەر ڕووباری دیجلەوە دیاری کردووە. ڕاستییەکەی ئەوەیە، هێڵێکی وەهمی لە شاری تکریتەوە لەسەر دیجلە بۆ شاری عانە لەسەر فورات دەبێتە سنووری نێوان هەرێمی عێراق لە باشوورو هەرێمی جەزیرە لە باکوور، ئەم هێڵە وەك ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیز لیسترنج (١٨٥٤- ١٩٣٣) بۆی دەچێت لە دیدی جوگرافیای سرووشتییەوە نزیکترە لە دابەشکردنی سرووشتییەوە وەك لەوەی دەستکردبێت‌و سرووشت دەشتی پان‌و بەرینی نێوان دوو ئاوان (ما بین النهرین)ی کردووەو بە دوو کەرتەوە: کەرتی باکوور (مەملەکەتی ئاشووری کۆن کە زۆربەی خاکەکەی لەوەرگایە کە دەشتێکی نەژاد بەردینی داپۆشیوەو، کەرتی باشووری (وڵاتی بابلی کۆن) کە خاکێکی ڕسووبی بەپیتەو بە زۆری دارخورمای لێدەڕوێ کە بە ئاوی ڕووبارەکان ئاودەدرێت (بلدان الخلافه الشرقیه، لاپەرە ٤٠- ٤١) واتە نەك تەنها لە ڕووی کارگێڕییەوە بەڵکو لە ڕووی جوگرافیای سرووشتییەوەش دەڤەری کەرکوکی سەر هەرێمی جەزیرە جیاوازە لە هەرێمی عێراق‌و هیچ پەیوەندییەك پێکەوە گرێیان نادات.

سەبارەت بە چەمك‌و واتای پەیڤی عێراق، ژمارەیەك ڕاوبۆچوون‌و ڕیوایەت هەن کە زمانەوان‌و مێژوونووسانی موسڵمان دەریان بڕیوەو یاقوتی حەمەوی تۆماری کردوون، هەروەها (مورتەزا ئەلزوبەیدی) لە فەرهەنگی (تاج العروس) پەیڤی عێراقی شرۆڤەی کردووەو چەند واتایەکی بۆ هێناوەتەوە، لە هەموو ئەو ڕاوبۆچوون‌و شرۆڤە کردنانە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە عێراق بە واتای، کەنار دەریا، قەراغ دەریا، ئاوەڕۆگە نزیك دەریا، واتە مەبەست لە عێراق ئەو ناوچەیەیە کە نزیك دەریایە واتە نزیك کەنداوی فارسی کە لە سەردەمی ئیسلامی بە (بحر فارس) دەناسرا. خەڵکی حیجاز بە هەر شوێنێکی نزیك دەریایان دەگوت عێراق، بە کوفەو بەسرا دەگوترا (العراقان) (معجم البلدان ٤/ ٩٣- ٩٥).

دەربارەی ناوچەی کەرکوك، ئەو هەر لە سەردەمانی کۆنەوە لە سەرچاوە سریانێکاندا بە (بیث جرمی- باجرمی) ناسراوە کە وشەیەکی لێکدراوی سریانی- کوردییەو لە دوو وشە پێکهاتووە: (بیث) وشەیەکی سریانییەو بە مانای (وڵات - زێد)و لە زمانی عەرەبیدا بووەتە (بیت)و دووەم جرمی واتە هەر گەرمی کوردی، بەم پێیە (بیث جرمی) واتە ووڵاتی گەرم- گەرمیانە کە لای زێدەرە عەرەبییەکان بە (باجرمی) تۆمارکراوە، مەسعودی (المسعودي) لە شوێنێکدا باسی وڵاتی ساردو وڵاتی گەرمی (بلاد الصرود وبلاد الجروم) کردووە.

هەرچی خودی قەڵای دێرینی کەرکوکە ئەوە بە (الکرخینی) دەناسرا، یاقوتی حەمەوی کە پێیدا گوزەری کردووە پێناسەیەکی کورتی کردووە (معجم البلدان، ٤/٤٥٠)، هەروەها دەڵێت (باجرمق- باجرمێ) ناوچەیەکە نزیك داقوق (معجم البلدان، ١/٣١٣).

جوگرافیاوان‌و گەڕۆکانی موسڵمان هیچ گومانێکیان نەهێشتۆتەوە کە شارو باژێڕەکانی داقوق، خانیجار (کانی هەنجیر)، کرخێن‌و دەڤەری (باجرمی - باجرمق) بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست سەر بە هەرێمی جەزیرە بوونە (ابن خرداذبة، المسالك والممالك، لاپەرە ٨٥)، ابن رستة، الاعلاق النفیسة، لاپەرە ١٠٣، شیخ الربوة الانصاري، نخبة الدهر، لاپەرە ٢٥٥)، کەچی (حمد الله المستوفي القزویني) کە لە سەردەمی دەسەڵاتی مەغۆلەکاندا ژیاوە هەر چەند جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە سنووری عێراق لە تکریتەوە بەرەو خوار درێژ دەبێتەوە، وەلێ شارۆچکەکانی دوجەیل، داقووق، زەنگابادی لە چوارچێوەی هەرێمی عێراق داناوە (نزهة القلوب، لاپەرە ٤٢- ٤٤).

لە ڕاستیدا مەغۆلەکان دەستکاریی سنوورو قەڵەمڕەوی هەرێم‌و ولایەتەکانی خیلافەی عەباسیان کرد.

*** کەرکوك بەشێکە لە (جبال الاکراد- کوردستان):**

مەغۆلەکان دوای ئەوەی لە ساڵی (٦٥٦) کۆچی بەرامبەر بە (١٢٥٨) زایینی بەغدای پایتەختیان داگیرکردو خیلافەی عەباسییان لەناو برد، وەك باسکرا ڕابوون بە ئەنجامدانی هەندێك گۆڕانکاری کارگێڕی‌و دەستکاریکردن‌و گۆڕینی ناو و سنووری چەند هەرێمێك‌و لە دەرئەنجامی ئەم گۆڕانکارییانە بۆ یەکەم جار لە ناوەڕاستی سەدەی حەفتەمی کۆچی - سێزدەهەمی زایینی هەرێمێك هاتە کایەوە بەناوی (کوردستان) کە یەکەیەکی ڕێڤەبەری بوو و بەشێك لە دەڤەری کوردنشینەکانی دەگرتەوە، لەو دەمەوە سەرچاوەو تێکستە فارسی‌و تورکییەکان بەردەوام پەیڤی کوردستانیان بەکارهێنا وەك ناوێکی ڕەسمی وڵاتی شارەزوورو کوردستانی ڕۆژهەڵات، بەڵام سەرچاوە عەرەبییەکانی میسرو شام لە سەردەمی مەملوکی (٦٤٨ - ٩٢٣) کۆچی بەرامبەر بە (١٢٥٠ - ١٥١٧) زایینی لە بری کوردستان (جبال الکورد) یان بەکاردەهێنا لە سۆنگەی ئەوەوە کە زۆربەی ڕووبەری کوردستان شاخاوییەو کوردستانیش پەیڤێکی نە عەرەبییەو تا ڕادەیەك نامۆو نوێباوە، بەووردبوونەوە لەو سەرچاوانە ڕوون دەبێتەوە مەبەست لە (جبال الاکراد) هەموو شارو ناوچە کوردنشینەکانە نەك تەنها ولایەتی کوردستان.

دوڵەتی مەملوکی لە میسرو شام پەیوەندییەکی دۆستانەی گەلێك بەهێزو پتەوی هەبوو لەگەڵ سەرجەم دەسەڵاتدارو میرنشینەکانی کوردستان بە گەورەو بچووکیانەوە، هەر گاڤ هاتن‌و چوون نامە ناردن‌و هاریکاری سەربازی‌و هاوهەڵوێستی سیاسی لەنێوان هەردوولا لە ئارادابوو.

مێژوونووسانی مەملوکی زۆر هەواڵ‌و زانیارییان لەم بارەیەوە

نووسیوەو نووسەرانی دیوانی دارشتن و نامەناردن (دیوان الانشاء والمكاتبات)ی مەملوكی نامەو پەیام هەواڵنامەیان ئامادە دەكردو ئاراستەی میرو سەردارو سەرۆك هۆزەكانی كوردستانیان دەكردو پۆستەی هاتووی كوردنیشینیان وەردەگرت.

(شهاب الدين احمد بن يحيي بن فضل الله العمري) (٧٠١- ٧٤٩) كۆچی بەرامبەر بە (١٣٠١- ١٣٤٨) زایینیی ماوەیەك فەرمانبەر بوو لە دیوانی دارشتن و نامەناردن و، دارێژەرو ئامادەكەری نامەو پەیامەكان بوو. هاوكات نووسەرو مێژوونووسێكی بە برشت بوو. نزیكەی حەڤدە كتێبی داناوە، گرنگترین و بایەخدارترینیان كتێبی (مسالك الابصار في ممالك الامصار)ە، لە بیست بەرگی قەبارە مەزن، لە بەرگی سێهەمدا (السفر الثالث)، چەردەیەك زانیاری بەسوودو گرانبەهای لەمەر كوردستانی سەدەی حەفتەم و هەشتەمی كۆچی - سێزدەهەم و چواردەهەمی زایینیی پێشكەش بە خوێنەر كردووە. ژمارەیەك شارو بازێرو قەڵاو گوندو هۆزو خێڵ و تیرەی كوردی ناساندووە، سنووری هەرێمی (جبال الاكراد)ی دیاری كردووەو ناوو پێناسەی بیست شوێنی هەرێمەكەی خستووەتە روو، مخابن ئەم كتێبە پچڕ پچڕو لەملاو ئەولا چەند بەرگێكی لێ چاپ كراوەو هێشتا بە گوێرەی ئاگاداری ئێمە هەمووی پێكەوە چاپ و بڵاونەكراوەتەوە، كاتی خۆی دەستنووسێكی تەواوی لە كتێبخانەی كۆڕی زانیاری عێراق لە بەغدا هەبوو.

ئەوەی لێرە لە هەموو زانیارییەكی تر گرنگترە، ئەوەیە كە (ابن فضل العمري)یش زیاتر لە شەش سەدەو نیو ڕاستەوخۆو بەراشكاوی ئاماژەی بەوەداوە كە (الكرخين وداقوق الساقية) سەر بە (جبال الاكراد)ن بە واتای كەركوك و داقووق سەر بە كوردستانن كە وابزانم كۆنترین بەڵگەیە كوردستانییەتی كەركوك و داقووق بچەسپێنێ.

لە میانەی ئاخافتن دەربارەی شوێن و هۆزەكانی (جبال الاكراد)ەوە لە لاپەرە (١٢٧)ی بەرگی سێهەم دەڵێت: "ثم يليهم بلاد الكرخيني وداقووق الساقية وعددهم يزيد على سبعمائة وكان اميرهم (شجاع الدين ابا بكر) زاداً عن دينه محارباً عن قومه".

وەرگێڕانەكەی:

پاش ئەوان، لێرە مەبەست هۆزێكی تری كوردە، وڵاتی كەرخینی و داقووق (الساقية) دێت ژمارەیان، هۆزە كوردەكە، پتر لە حەفسەت كەسە، تەنها ژمارەی چەكدارو جەنگاوەر، و میرەكەیان شوجاعەددین ئەبا بەكر كە داكۆكی لە ئاینی خۆی دەكرد لەسەر لایەنگرانی دەجەنگا. (القلقشندي) (٨٢١) كۆچی بەرامبەر بە (١٤١٨)ی زایینیی كە ئەمیش نووسەر بوو لە دیوانی دارشتن و ئەم ئاخافتنەی (العمري) بەم شێوەیە گوێزراوەتەوە بۆ كتێبەكەی (صبح الاعشى، ٤/ ٣٧٥).

(بلاد الكرخين وداقووق الناقه، وطائفة منهم عدتهم تزيد عن سبعمائة ولهم أمير يخصهم)و (الكرخيني) شێوێندراوە بۆ (الكرخين)و (داقووق الساقيه) بۆ (داقووق الناقة) ئەمانەش هەڵەی كۆپیەكەری (نساخ) كتێبەكەن.

دوای عومەری (العمري) چەندین گەڕۆك و ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپی ئەم ڕاستییەیان دووپات كردووەتەوە، گەڕۆكی ئیتالی ناودار پیترو دیلاڤالا (١٥٨٦- ١٦٥٢)ی زایینیی كە لەسەرەتای سەدەی یازدەهەمی كۆچی- حەڤدەهەمی زایینی سەردانی ڕۆژهەڵاتی كردووە، لە نامەیەكدا بۆ هاوڕێیەكی ناردووە لە ڕۆژی (١٧)ی ئاداری ساڵی (١٦١٧)ی زایینیی دەگێڕێتەوە كە بە كوردستانا تێپەڕیوەو ئەو وڵاتە لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات دە تا دوانزە ڕۆژ ڕێیەو لە باكوورەوە بۆ باشوور ئێجگار درێژەو لە خاكی بەغداو سووسەوە دەست پێدەكات و تا پاش موسڵ و وڵاتی میدیاو ئەرمینیا درێژ دەبێتەووە (رحلة ديلاڤالييه الى العراق، لاپەڕە ١٠٢- ١٠٣).

لە ساڵانی (١٥٧٣- ١٥٧٥)ی زایینیی نوژداری هۆڵەندی لیونهارت ڕاوولف بە نیازی كۆكردنەوەو ناسینی ڕووەكی پزیشكی گەشتێكی ڕۆژهەڵاتی كردو لە ڕۆژی (٢٤)ی زایینیی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٥٧٤)ی زایینیی گەیشتە شاری تاووق- تاووغ- داقووق و بەم چەشنە یاداشتەكانی خۆی باس دەكات: "بە مەسافەیەكی كورت لە تاووغەوە قەڵایەكی قایممان دیت... و دەكەیتە ناوچەی كوردەكانەوە كە لێرەو، دەست پێدەكات و بە درێژایی ڕووباری دیجلە دەڕوات.. تا دەگاتە ئەرمینیا"، (رحلة الرحالة الهولندي ليونهارت راولف، لاپەڕە ١٢٦)، لە ڕۆژی (٢٦)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٥٧٤)ی زایینیی گەیشتە كەركوك و وەسفی كردووە، دەڵێت: "ناچار بووین لە وەرگێڕێكی كوردیزان بگەڕێین"، (رحلة ليونهارت راولف، لاپەڕە ١٩٧- ١٩٨). لەسەردەمی عوسمانیدا بۆ ماوەیەكی درێژ كەركوك بنكەو بارەگای ولایەتی شارەزوور بوو.

بەڵام بوونی كورد هەتا خوارەوەی كەركوك درێژبووەتەوە بە سەدان میل، بۆ نموونە دانیشتووانی شارۆچكەی خورماتوو كە ناوی ڕاستی شارەكەیە نەك (تووزخورماتوو) كە یەكێكە لە ناوچەكانی سەر بە كەركوك، كوردی تێدا نیشتەجێ بووە هەر لە سەردەمەكانی ناوەڕاستدا، بۆ یەكەم جار ناوی هاوگونجاو بووە لەگەڵ ناوی كورد، لە كاتێكدا ئەو كوردانەی لەوێ نیشتەجێ بوون بەرگرییان كردووە دژی (عومەر شێخ) كوڕی (تەیمورلەنگ)و توانییان بیكوژن لە كاتی هێرش كردن بۆ سەریان، لە مانگی جومادەی یەكەمی ساڵی (٧٩٦)ی كۆچی بەرامبەر بە مانگی ئاداری ساڵی (١٣٩٤)ی زایینیی ئەم ڕووداوە ڕوویداوە، هەروەها مێژوونووسی فارسی (موعینەددین نەتنزی) ئەوەی پشتڕاست كردووە كە قەڵای خورماتوو یەكێكە لەو قەڵایانەی كە كەوتۆتە ئاقاری كوردستانەوە، (منتخب التواريخ معيني، لاپەڕە ٣٦٠)یە.

*** سەرچاوەکان:-**

**١- پيترو ديلافالا، رحلة ديلافالا الى العراق، ترجمها عن الايطالية وعلق عليها الاب د. بطرس حداد (بغداد، ٢٠٠١).**
**٢- ابن خرداذبة، المسالك والممالك (بيروت، ١٩٨٨).**
**٣- حمدالله المستوفي القزويني، نزهة القلوب (تهران، ١٣٣٦ هـ. ش).**
**٤- ابن حوقل، صورة الارض (بيروت، ١٩٧٩).**
**٥- ابن رسته، الاعلاق النفسية (بيروت، ١٩٨٨).**
**٦- شيخ الربوة الانصاري، نخبة الدهر من عجائب الر والبحر (بيروت، ١٩٩٨).**
**٧- ابن فضل الله العمري- مسالك الابصار في ممالك الامصار (مخطوط).**
**٨- ابن الفقية الهمداني، مختصر كتاب البلدان (بيروت، ١٩٨٨).**
**٩- القلقشندي، صبح الاعشي في صناعة الانشاء (بيروت، ١٩٨٧).**
**١٠- لسترنج، بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة تبشيرمزسيس و گورگيس عواد (بغداد، ١٩٥٤).**
**١١- ليونهارت راوولف (رحلة المشرق) ترجمة سليم طه التكريتي (بغداد، ١٩٨٧).**
**١٢- ياقووت الحموي، معجم البلدان (بيروت، ١٩٩٥).**



*** وێنەی کورد لە سەرچاوە فارسییەکاندا:**

**د. مووسا محەمەد خدر**

"یەکێك لەو بابەتانە کە بووەتە جێگەی سەرنج و لێکۆڵینەوەی توێژەران و راستەوخۆش پەیوەندی بە سەرچاوە فارسییەکانەوە هەبێت ناوی (کوردستان)ە. وەك دەزانین تا سەردەمانێکی درەنگی مێژوو ئەم ناوە لە سەرچاوەکاندا بەکارنەهێنراوە، بەتایبەت لە مێژووی کۆندا بە هیچ شێوەیەك ئەم ووشەیە بەکارنەبراوە، بەهەمان شێوە لە سەرچاوە مێژووییەکانی سەرەتایی ئیسلامیشدا ئەو ناوە بەرچاو ناکەوێت، بەڵکو تەنها ناوی ئەو هەرێمانە هاتووە کە لە رووی کارگێڕییەوە، وڵاتی کوردانی بەسەر دابەشکرابوو، بە تایبەت هەرێمەکانی: چیا، جەزیرەی فوراتی، فارس، ئازربایجان، ئاران، ئەرمینیا، عێراق و خۆزستان.

هەرچۆنێك بێت ئەو دابەشکردنە کارگێڕییە هیچ کامێکییان تایبەتمەندییەتی هەرێمی و نەتەوەیی دانیشتووانی ناوچەکە، کە زۆربەیان کوردن، لە خۆوە نەگرتووە، تەنیا ئەوە نەبێت کە جەخت لەسەر سروشتی چیایی وڵاتی کوردان کراوەتەوە، بە پێی ئەوەی کە چیا وڵاتی ئەوانەو ئەو ناوەش دەشێ لە وڵات بنرێ"[1].

"بێگومان گەران بە دوای سروشتی کۆمەڵگای کوردی و رووخسارە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو میللەتە، لە دوو قۆڵی نووسینە مێژووییەکاندا، کارێکی ئاسان نیە، ئەوەندەی ئەو نووسینانە پرژاونەتە سەر مێژووی سیاسی و سەربازی، ئەوەندە لایان بەلای مێژووی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان نەکردووەتەوە"[2].

"هەرچۆنێك بێت، کۆمەڵگای کوردی وەك لەو سەرچاوانەدا دەبینرێ، کۆمەڵگەیەکی خێڵەکییە، لەزۆربەیاندا جەخت لەسەر تایبەتمەندی خێڵەکی- شوانکاری ئەو کۆمەڵگایە دەکرێتەوە، کۆمەڵگەیەك لە دەرەوەی بنکە شارستانییەکان دەژی"[3].

"هەر لە رووی رەفتاری کۆمەڵایەتییەوە، لە هەندێك سەرچاوەوە زێدەرۆیی تێدا کراوە، ئاماژە بۆ سادەو ساکاری مرۆڤی کورد تا ئاستی گێلی و نەزانی کراوە"[4].

"لەسەردەمی ئیسلامی بەگشتی رێگری و جەردەی وەك رەفتاری هەرە دیاری کۆمەڵگای کوردی خراوەتەروو، لەمەشدا هەموو زانینە ئیسلامییەکان، نەك هەر بە زمانی فارسی، بەڵکو لە نووسینە عەرەبییەکانیشدا هاوران و لێکدانەوەی جۆر بەجۆریان بەر ئەم رەفتارە نەکردووە.. لەسەرچاوە فارسییەکاندا زەق کردنەوەی ئەم رەفتارە بەرچاو دەکەوێت، ئەوەتا رێگری کوردان، بەرای مێژوو نووسێك لە سنوور دەرچووەو بووەتە دیاردەیەك کە بە کەس کۆنترۆڵ ناکرێ و دەبێت وەکو دیاردە قەبوول بکرێت"[5].

"مێژوونووسانی فارس نەیانتوانیووە لەو بۆچوونە ئەفسانەییانە رزگاریان بێت کە لە سەدەکانی ناوەراستدا لەسەر رەچەڵەکی کوردا هەبووە بەڵکو ئەوانیش لەنێو ئەفسانەکاندا بەدوای ئەو رەچەڵەکەدا گەراون و کوردیان بە ستۆتەوە بەسەرهاتی ئەفسانەیی و دوور لە راستی مێژووی"[6].

"لەو کتێبە مێژووییانەی نووسەرەکانیان هەوڵیانداوە مێژووی گشتی بنووسنەوە باس کوردو کوردستان لە دوو قولی رووداوەکاندا تۆمارکراوە، ئەگەر چی لە قۆناغی یەکەمدا، مێژوونووسیش مەیلی بەلای تایبەتمەندی و جەختکردنەوە لەسەر مێژووی فارسدا هەبووە"[7].

"لەو سەرچاوە فارسییانەدا گەلێك نووسەرو مێژوونووسیان تێداهەڵکەوتووە کە بایەخیان بە کوردو ناوچەکانی داوە، دووروو نزیکیش باسی کەرکوکیان کردووە، لەوانە:

١. (ئەبو سەعید عەبدولحەی کوری زوحاك کوری مەحمود)، لە کتێبی (گردیزی- زین الاخبار).

٢. (ئەبو فەزل ئەلبوهەیقی)، ناوی (ئەبو ئەلفەزل کوری محەمەد کوری حوسێن دەبیر ئەلبوهەیقی)،

٣. مەحمود ئەلوەراق.

٤. کتێبی (مجمل التواریخ والقصص)، کە ناوی نووسەرەکەی دیار نییە.

٥. (قازی بەیزاوی)، ناوی (ناسرەددین عەبدوڵ کوری عومەر ئەبو ئەلخەیرەین محەمەد کوری عەلی)، ناوی کتێبەکەی (نظام التواریخ).

٦. (خەواجە رەشیدەددین فەزلوڵڵا هەمەدانی).

٧. (فەخر بناکتی)، ناوی (ئەبو سلێمان داوود کوری ئەبی ئەلفەزل محەمەد کوری محەمەد کوری داوود ئەلبناکتی)، لە کتێبی (روضة اولي الألباب في معرفة التواريخ والانساب- تاريخ بناكتي).

٨. (عەبدوڵڵا کوری عەلی کوری محەمەد کاشانی - جەمالەددین ئەبو ئەلقاسم عەبدوڵڵا کوری عەلی کاشانی)، کە بە (قاشان) ناسراوە، لە کتێبی (اولجایتو- زبدة التواريخ).

٩. (ناسر خەسرەو)، لە کتێبی (تاريخ جيهانگشای و جامع التواريخ).

١٠. (حەمەدوڵڵا مستەوفی قەزوینی - خەواجە حەمەدوڵڵا کوری تاجەددین ئەبی بەکر مستەوفی قەزوینی)، لە کتێبی (نزهە القلوب- تاريخ گزيده).

١١. (زەهیرەددین نیشابووری).

١٢. (ئەلراوەندی - محەمەد کوری عەلی کوری سلێمان کوری محەمەد کوری ئەحمەد کوری حوسێن کوری هەم)، بە نازناوی (نەجەمەددین) کە ناسراوە بە (ئەبی بەکر).

١٣. (ئەلنەسووی - نورەددین محەمەد کوری ئەحمەد کوری عەلی کوری محەمەد مونشەئی زەیدەری نەسووی)یە، کە نازناوی (محەمەد منشی - محەمەد زەیدەری - شەهاب نەسویشی)، لە کتێبەکانی (نفثة المصدور)، (عتبی، ترجمە تاريخ يميني)

١٤. (ئیبن بی بی)، لە کتێبی (الأوامر العلائية في الأمور العلائية).

١٥. (تاريخ سلاجقه در اناگولی)، ناوی نووسەرەکەی دیار نییە.

١٦. (عەتا مەلیك جوینی)، لە کتێبی (تاریخ جهانگشای جوینی).
١٧. (شەرەفەددین کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی فازڵوڵڵا شیرازی)، لە کتێبی (تاریخ وصاف).
١٨. (ئیبن ئەلبەلخی)، لە کتێبی (فارسنامە).
١٩. (ئیبن فەندەق – ئەبو ئەلحەسەن عەلی کوڕی زەید کوڕی محەمەد ئەلئەوسی ئەلبەیهەقی)، لە کتێبی (تاریخ بیهق).
٢٠. (تاریخ سیستان)، کە ناوی نووسەرەکەی دیار نییە.
٢١. (سەیفەددین محەمەد کوڕی یەعقوب).
٢٢. (ئەحمەد کوڕی ئەبی ئەلخەیر زەرکووب شیرازی)، لە کتێبی (شیرازنامە).
٢٣. (محەمەد کوڕی عەلی کوڕی محەمەد حوسێن کوڕی ئەبی بەکر شوانکارەیی)، لە کتێبی (مجمع الانساب).

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:-**

١. (وێنەی کورد لە سەرچاوە مێژووییە فارسییەکاندا)، دکتۆر موسا محەمەد خدر، چاپخانەی (ڕۆژهەڵات)، هەولێر، ٢٠١١، لاپەڕە (٧٢-٧٣).
٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٠).
٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨١).
٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٦).
٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٧).
٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧٠).
٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧١).

*** ساڵنامەكانی عوسمانیو چیرۆكی بەڵگەنامە دەگمەنەكان لەسەر كەركوك:**

د. جەبار قادر

ساڵنامەكانی عوسمانی سەرچاوەیەكی گرنگن بۆ لێكۆڵینەوەی مێژووی نوێ بۆ ئەو وڵاتانەی كە لە ژێر دەسەڵاتی داگیركاری عوسمانیدا بوونە، ئەم ساڵنامانەی عوسمانی لە ناوەرۆكدا زانیاری زۆرو زەوەندی تێدایە دەربارەی باری گشتی ولایەتەكانی عوسمانی، بە دەگمەن مرۆڤ دەتوانێت لە سەرچاوە مێژووییەكانی تردا بەدەستی بهێنێت، لێكۆڵەرەو كارمەندانی بواری لێكۆڵینەوە مێژووییەكانو عوسمانییەكان بە شێوەیەكی تایبەتی خۆیان ماندوو كردووە لە لێكۆڵینەوەكانیاندا بۆ وردبینی لە بایەخی زانستیانە دەربارەی ئەو زانیارییە مێژووییانەی كە لە لێكۆڵینەوە مێژووكانیان هەن هەر لە چەند سەدەیەكەوە، رێژەیەكی بەرچاوە لە لێكۆڵەرەوان لە مێژووی ولایەتەكانی عێراق لە سەردەمی عوسمانیدا، لە لێكۆڵینەوەكانیان ئامادەیان كردووە لە ماوەی ئەم دوو سەدەی كۆتایی لە زانكۆكانی عێراق پشتیانبەستووە بە ناوەرۆكی ئەو زانیارییانانەی كە لە ساڵنامەكانی عوسمانیدا هەبووە.
گەلێك لەو لێكۆڵەوەرانە لێكۆڵینەوەكانیان لەسەر ساڵنامەكانی عوسمانی نووسیووەو بایەخی مێژووییان پێداوە، وەكو (دكتۆر خەلیل عەلی موراد، دكتۆر جەبار قادر، دكتۆر عەبدولفەتاح عەلی یەحیا، دكتۆر عەلا كازم نەورەس، دكتۆر عیماد عەبدولسلام رەئوف، دكتۆر عەلی شاكر ئەلمەولا (ئەلبەشیری)، دكتۆر فازڵ مەهدی بەیات، دكتۆر ئیبراهیم خەلیل)و دەیانی تر، دەتوانم لیستێكی بەرچاو لە لێكۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی مێژوویی ولایەتەكانی عوسمانی بكەم كە نووسەرەكانیان پشتیان بەستووە بە ساڵنامەكانی عوسمانی لە نووسینەكانیان[1].
ئەو راستییانەی كە لە سەرەوە ئاماژەمان پێكرد دەربارەی ساڵنامەكانی عوسمانیو ئەو زانیارییانەی كە لە ناوەرۆكی دایە دەربارەی ولایەتێكی عوسمانی یان شارێك نابێتە هۆی ئەوەی كە راستی یان شتێكی تازەو گەورە بخاتە سەر زانیارییەكانمان، دوور لە باسكردن لەلایەنی زانستییەوە، ئاماژەپێكردنی ئەم قسانە لەم كاتەدا وەك ئەوەی كە بڵاوكراوەتەوە لەلایەن (نەسرەت مەردان) لە ژێر ناونیشانی (وثيقة عثمانية نادرة عن كركوك)، بەرای من لە پێناو هێرش كردنە سەر كورد بوونی كەركوكو هەوڵدان و بۆ سرینەوەی ئەو ناسنامەیە، هەر چی زانیارییەكی مێژوویی لە هەر كتێبێكی مێژووی یان لە كاغەزێكی كۆن هاتبێت گرنگییەكی زۆری پێ دەدەن زۆر لەو بایەخە زانستییە راستییەی كە هەیەتی، هەر وەكو ئەوەی كە بەرێز (نەسرەت مەردان) لەم ماوەیەی دواییدا كەوتۆتە نووسینەوەی بابەتی مێژوویی و سیاسی كە لە رابردوودا لەلایەن خەڵكی ناسرابوو بە نووسینی لایەنی ئەدەبیو كەلەپووری، وا تێگەیشتووە كە سەرچاوەیەكی گرنگی دەستكەوتووە كە نووسەرانی تر بە دەستیان نەگەیشتووە، ئەم نووسەرە زانیاری چەوتی دەربارەی ئەو بەڵگەنامە عوسمانییە خستووەتە روو كە تەنها ئاماژەی بە ناو و ساڵی دەرچوونی كردووە كە (ساڵنامەی ١٨٩٢)ە.
ئەو راستییەمان زانییوە كە ساڵنامەی جۆراوجۆر دەرچووە لە دەوڵەتی عوسمانیدا لەلایەن وەزارەتەكانو دەزگاكانی تر لە پاڵ ولایەتە جۆراوجۆرەكانی عوسمانی كە بە شێوەی ناوە بە ناوە دەرچووە، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە كە بەڵگەنامەیەكی دەگمەن كە بەو شێوەیەی كە (نەسرەت مەردان) باسی دەكات ناتوانین پشتی پێوە ببەستین.
لێرەدا بۆمان دەردەكەوێت گرنگی دەستنووسی مێژوویی بە لێكۆڵینەوەو پشكنینو هەوڵدان بۆ شرۆڤەكردنی ئەو زانیارییانەی كە تێیدایە بە شێوەیەكی زانستیانە، ئەمەش ناكرێت بەو زانیارییە كەمانەی كە لەلایەن بەرێز (نەسرەت مەردان)ەوە خراوەتە روو بە ناوی بەڵگەنامەیەكی دەگمەن.
بۆ ئەوەی هەڵە تێنەگەینو بابەتەكان لە قەبارەی گرنگی خۆی گەورەتر پیشان نەدرێت، پێویستە رۆشنانییەتی بخەینە سەر ساڵنامەكانی عوسمانیو گرنگی لێكۆڵینەوەی مێژوویی نوێمانو بابەتیانەی زانیارییەكانو وەرگرتنی ناوەرۆكی ساڵنامەكان پێویستە ئاماژە بكەن بە هەندێك راستی بنەرەتی هاوپەیوەست پێوە.
بنەرەتی (ساڵنامە) پێكهاتووە لە زاراوەیەكی دارێژراو لە ووشەی (ساڵ) كە ووشەیەكی كوردیو ئێرانییەو (نامە) كە ووشەیەكی كوردیو ئێرانییە بە مانای (كتێب) یان كەشكۆڵ، كۆكردنی ئەم دوو زاراوایەش دەبێتە (كتێبی ساڵانە) یا (نامەی ساڵانە)ی چاپكراوی فەرمی لە دەوڵەتی عوسمانی كە لەلایەن وەزارەتە جۆراوجۆرەكان لە پایتەخت هەروەها لە ولایەتەكانی عوسمانی دەرچووە.
ساڵنامەكانی عوسمانی لە ناوەرۆكدا گەلێك زانیاری لەسەر دەوڵەتی عوسمانیو سوڵتانو دەزگاكانو یەكە كارگێڕییەكان لەگەڵ نەتەوەو پێكهاتەكانی (لەلایەن ئایینیو ئاینزاوە لە گەلێك باردا بێ ئەوەی بایەخ بدەن بە لایەنی نەتەوەیی، تەنها ئەو نەتەوانەو پێكهاتە نا موسڵمانانە نەبێت كە لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەكاندا بوونە)، لە پاڵ زانیاری دەربارەی نوێنەرانی بێگانەو سستەمی دراو و فەرهەنگی ساڵانەو كاروبارەكانی رووداوەكان لەگەڵ ناوی پێكهاتەكانی دەوڵەتو گەورە فەرمانبەرانو نازناوی فەرمی باو لە چوارچێوەی كاروبارەكانی دەوڵەتدا.
لە پاڵ ساڵنامەی عوسمانی گشتیدا بوونی ساڵنامەی تر هەبوو كە لەلایەن وەزارەتەكانەوە دەردەچوو، وەكو ساڵنامەی وەزارەتی دەرەوە، ساڵنامەی مەعاریف، ساڵنامەی زانستی، یان ئەو ساڵنامەیەی لەلایەن سوپاوە دەردەچووە (ئۆردو ساڵنامەسی).
ئەم ساڵنامانە رێرەوێكی هاوگونجاویان هەبوو لە رێكخستنی بابەتەكانیدا جگە لە هەندێك گۆرانكاری كەم. بۆ نموونە لە دوای بڵاوكردنەوەی دەستووری ساڵی (١٨٧٦) زایینی ساڵنامەكان پوختەی ناوەرۆكی یاسای بنەرەتی (دەستووری عوسمانی)یان بڵاو دەكردەوە بە شێوەیەكی ناوە بە ناوە

لەگەڵ ئەو نامەی ڕاسپاردەیە کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦ - ١٩٠٩) ناردبووی بۆ (میدحەت پاشا)و داوای لێی کردبوو بە ڕاگەیاندنی دەستوور[٢]، هەتا لە دوای هەڵوەشانەوەی ئەنجومەن و ڕاگرتنی کارکردن بە دەستوور.

ساڵنامەکان لەو کاتەدا هاوشێوەی ئەو کتێبە ساڵانەیانەی ئێستا بوونە کە لەلایەن دەزگاو فەرمانگەو کۆمپانیاکان لە دەوڵەتە جیا جیاکانی جیهاندا بڵاودەبنەوە.

ناوەرۆکی ساڵنامەی وەزارەتەکان بریتیی بووە لە درێژەی چالاکی وەزارەتەکان کە دەریان کردووە یان ئەوانەی کاریان تێکردووەو یەکە کارگێڕییەکانی و ڕێکخستن و یاساکانی تایبەت پێیەوە، لە پاڵ ئەمەشدا ساڵنامە هەبوو کە لەلایەن ویلایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە دەردەچوو.

ساڵنامەی ویلایەتی بەغدا ئاماژە بەوە دەکات کە یەکەم ساڵنامەی فەرمی دەوڵەتی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ دەرچووە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید لە ساڵی (١٢٦٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٤٦)ی زایینی، بە دەستپێشخەری لەلایەن (ئەلسەدر ئەلئەعزەم - سەرۆك وەزیران) مستەفا ڕەشید پاشا ئەویش لە کاتی گەڕانەوە بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران لە ساڵی (١٨٤٥)ی زایینی.

بەڵام ئاماژە بەوە دەکات کە یەکەم ویلایەت ساڵنامەی تایبەتی خۆی هەبووە ویلایەتی (بۆسنە) بووە، لە دواییدا ویلایەتەکانی تری عوسمانی یەك لە دوای یەك ساڵنامەی تایبەتی بە خۆیان دەرکردووە، ئەوەی هاوپەیوەستە بە ولایەتەکانی عێراقەوە، ویلایەتی بەغدا لە ساڵی (١٢٩٣)ی کۆچی بەرامبەر (١٨٧٦)ی زایینی ساڵنامەی تایبەتی خۆی دەرکردووە، بەڵام ویلایەتی (بەسرە) لەگەڵ ویلایەتی (موسڵ) ساڵنامەی خۆیان هەر لە ساڵی (١٣٠٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٩٠ - ١٨٩١)ی زایینی دەرکردووە[٣].

ئەو ساڵنامەی کە لە ویلایەتی موسڵ دەرچووە گەلێك ناوەرۆك و زانیاری گرنگی تێدایە هاوپەیوەستە بە کاروباری سەنجەقی کەرکوك کە بۆ لێکۆڵەر پێویستە لە مێژووی ناوچەکە بچێتەوە سەری، ئەوەی لێرەدا گرنگە لەلامان کە لە ویلایەتی موسڵ پێنج ژمارەی تایبەت بە ساڵنامەی خۆی دەرکردووە، ژمارە (١)ی لە ساڵی (١٣٠٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٩٠ - ١٨٩١)ی زایینی دەرکردووە، ژمارە (٢)ی لە ساڵی (١٣١٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٩٢ - ١٨٩٣)ی زایینی دەرکردووە، ژمارە (٣)ی لە ساڵی (١٣١٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٩٤ - ١٨٩٥)ی زایینی دەرکردووە، ژمارە (٤)ی لە ساڵی (١٣٢٥)ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی (١٩٠٧ - ١٩٠٨)ی زایینی دەرکردووە، ژمارە (٥)ی کە ژمارەی کۆتاییە لە ساڵی (١٣٣٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٩١٢)ی زایینی دەرچووە، لە سەرمانە بپرسین ئەمە کام ساڵنامەیە کە ئاماژە بە زانیارییەکانی بەڕێز (نەسرەت مەردان) دەدات.

بۆ ئەوەی ڕۆشنایی بخەینە سەر ناوەرۆکی ئەو ساڵنامانەو بەراوردی بکەین وەکو ئەوەی لە لای بەڕێز (نەسرەت مەردان) ەوە لە بابەتەکەی هاتووە، ئاماژە بەو بابەتانە دەکەین کە لە ژمارە (١)ی ساڵنامەی ویلایەتی موسڵدا هاتووە: پێناسەی ساڵنامە، ڕۆژژمێری ساڵانە، ڕووداوە بەناوبانگەکان هەر لە ساڵی (٦٢١٢)ی پێش کۆچی وەکو ئەوەی کە لە ساڵنامەکەدا دانراوە بە ساڵی لەدایکبوونی پێغەمبەر (ئادەم) (سڵاوی خوای لێبێ) تا سەردانی ئیمبراتۆری ئەڵمانیا بۆ ئەستەمبوڵ لە ساڵی (١٨٨٩)ی زایینی، ناوی خولەفاکانی ڕاشیدین و ئومەوییەکان و سوڵتانەکانی عوسمانی، لەگەڵ کورتەیەك لە ژیانیان و لەدایکبوونیان و ساڵەکانی هاتنە سەر دەسەڵات و ساڵی کۆچکردنیان، هەروەها لە ناوەرۆکی ساڵنامەدا هاتووە لیستێك بە ناوی پاشاو ئیمبراتۆرەکانی ئەو سەردەمە، لە دواییدا لیستێك بە ناوی والی و موتەسەریفەکانی کە فەرمانڕەوایی موسڵیان کردووە هەر لە ساڵی (١٥٩١)ی زایینی هەتا کاتی دەرچوونی ئەم ساڵنامەیە، هەر لەو ساڵنامەیەدا نازناوە فەرمییەکان و پلەو وسام و نیشانەکانی دەوڵەتی عوسمانی تێدایە.

بەڵام لە لاپەڕەکانی تردا تایبەت کراوە بە ئاماژەکردن بە فەرمانگەکانی دەوڵەت و یەکەکانی سوپا و جەندرمە و سەرۆکە ڕۆحانییەکان لە پێکهاتە نا موسڵمانەکانی ویلایەتەکان، هەر لەگەڵ ئاماژەکردن بە مەرقەدو شوێنە پیرۆزەکانی پێغەمبەرو ئەولیاکان، لە پاڵ زانیاری دەربارەی کانزاو چنراو و بەروبوومە کشتوکاڵییەکان و چیا لەو ویلایەتەو ئەو ئاقارانەی سەر بەون، لەناو ساڵنامەکەدا لێکۆڵینەوە دەربارەی شوێنی ویلایەتەکەو بەدوادا گەڕان دەربارەی ئەو یەکە کارگێڕییانەی سەر بەوەو ئاماژە بە دانیشتووان و قوتابخانەو داهاتوو و خەرجییەکانی. بەشی نیوەی باسی ساڵنامەکە دەربارەی مێژووی موسڵ جوگرافییەکەییەتی لە پاڵ زانیاری مێژوویی و جوگرافی ویلایەت و قەزاکانی (شارە دێیەکان) سەر بەو[٤].

لە پاڵ ئەوەشدا ساڵنامەکانی عوسمانی لە هەندێك باردا زانیاری تێدایە کە لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا بەرچاو ناکەوێت، لە هەمان کاتدا پێویستە بگەڕێنەوە بۆ هەمان ئەو سەرچاوانەی کە هاوسەردەمە لەگەڵیا بۆ ڕوونکردنەوەی بەشێك لەلایەنە نا ڕوونەکانی ساڵنامەکان تا بۆ ئەوەی زانیارییەکان ڕاستبکرێتەوە کە هەندێك زانیاری نا تەواوی تێدایە یان هاودژە لە گەلێك باردا، بۆ نموونەی ئەم قسەیە ساڵنامەکان دان بە کەمتەرخەمی دەنێن لە پێشکەشکردنی ژمارەی ناتەواو دەربارەی دانیشتووان، کە گوایە ژمارەکانیان خەمڵێندراوە یان سەرژمێرییەکانیان هەموو دانیشتووان ناگرێتەوە، بە تایبەتی کەسانی هۆزەکان، هەروەها ئەو ژمارانەی کە لە ناوەرۆکی ساڵنامەکاندایە تەنها تایبەتە بە پیاوان لە ژمارەی دانیشتووان، چونکە سەرژمێری ئافرەتی نەدەگرتەوە لە زۆر باردا لەبەر هەندێك هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئاینیی کە باوو بووە لەو کاتەدا.

دەربارەی پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتووانی سەنجەقی کەرکوك تەنها ئاماژەی بە یەك نموونە کردووە، لە ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ لە ساڵی (١٣٣٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٩١٢)ی زایینی کە ژمارەی دانیشتووانی لیوای کەرکوك بە گشتی بە (٩٤,٥٨٨) کەس داناوە، کۆی دانیشتووانی قەزای مەرکەزی کەرکوك بە تەنها (٤١,١٣٧) کەسە کە زۆربەیان لە موسڵمانی پیاون، بە پێی ساڵنامەکە زۆربەی دانیشتووانی

سەنجەقەكە لە كورد پێك دێت[٥]، بە دەگمەن سالنامەكان ئاماژەیان بە پێكهاتەی نەتەوەیی دانیشتووان كردووە، بەلام بەردەوام پێداگریان لەلایەنگری ئایینی كردووە لەگەل ئاماژە بۆ زمانی باوی ئەو كاتە كە زمانی توركی عوسمانی بووە لە كەركوك‌و لە پال هەموو ولایەتەكانی كە لە ژێر دەسەلاتی عوسمانییەكان بووە.

بۆ پێناسەكردنی ئەو دابەشكردنە كارگێڕیانەی كە لە نێو ئاقاری ئەو زەوییانەی كە ئەمڕۆ بە عێراق بەناوبانگە، پێویستە ئاماژە بكەین بە هەندێك راستی مێژوویی بەرچاو لەلایەن لیكۆلەران‌و ئەوانەی بایەخ بە لێكۆلینەوە مێژووییەكانی عوسمانی دەدەن، ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێی بكەین كە عوسمانییەكان هەلنەساون بە دابەشكردنی ولات كە بەناوبانگە ئەمڕۆ بە (عێراق) بۆ یەكە كارگێڕییەكان لە دوای داگیركردنی راستەوخۆ، بەلكو لەسەر ئەو رێكخستنە كارگێڕییانە هێشتیانەوە كە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیلیخانییەكان، بەلام دوای ماوەیەك بەسەر ئەو دابەشكردنەدا هەلسان بە دابەشكردنی بۆ یەكەی كارگێڕی كە ناسراو بە (ئەیالەتەكان) كە هەندێك جار ناوەكەی دەگۆڕێت بۆ ووشەی (ویلایە)، لە پال پاراستنی هەندێك بنەما و كاروباری باو بە تایبەتی هاوپەیوەست بە هۆزە عەرەبی و كوردییەكان.

ئەیالە خۆی دابەشكرابوو بۆ یەكەی كارگێڕی بچووكتر كە بە هەر یەكێكی دەوترا (سەنجەق) یا (لیوا) كە زۆر بەكاردەهێنرا لە بەلگەنامە فەرمییە عوسمانییەكاندا، كە ئەوكاتە عێراق پێكهاتبوو لە چوار ئەیالە: ئەیالەی بەغدا، ئەیالەی بەسرە، ئەیالەی موسل، ئەیالەی شارەزوور[٦]. لە هەمان كاتدا سەنجەق دابشكرابوو بۆ: قەزا، ناحییە، دێ.

ئەوەی هاوپەیوەستە بە ئەیالەتی شارەزوورەوە كە مێژووی ژیانی ئەم ئەیالەتە هەردەم لە بارێكی نا تەواودا بووەو بووتە گۆڕەپانی بەربەرەكانی عوسمانی - سەفەوییەكان، لە سەدەی شانزەهەمدا بریتی بووە لە ١٦ سەنجەق، بەلام لە ناوەراستی سەدەی دواییدا بەرزەوە بوو بۆ ٣٢ سەنجەق، كە زۆری پێكهاتبوو لە شێوەی قەلا لەسەر لووتكەی چیاكان‌و دەربەندە گرنگەكان، زۆربەی ئەم سەنجەقانە لە ناوچوون بە هۆی شەڕی بەردەوامی عوسمانی‌و ئێرانییەكان یان لەنێوان ئەمیرە كوردەكان خۆیاندا.

بە ناوبانگترین سەنجەقاكانی شارەزوور كە بەرامبەر كەركوكی ناوەند بوو بریتی بوو لە: ئەربیل، حەریر، كۆیە، شەمامك، دەشتی مەخمور، ئۆشنوو، سرۆچك، شەهرەزوور، شەهربازار، مەرگە، هەزارمێر، شەمیران، قەرەداغ، قزلجە، ئەنجیران، چیای حەمرین، لە پال هەندێك سەنجەقی تر كە ئێستا شوێنیان نازانرێت[٧].

پێویستە ئاماژە بەوە بكەین كە سنووری ئەیالەتەكان جێگیر نەبووەو بەردەوام لە گۆڕانكاریدا بووە بە هۆی گۆڕانكارییە كارگێڕییەكان كە بەردەوام دەولەتی عوسمانی هەلدەستا پێی یان لە دەرئەنجامی شەڕی عوسمانی‌و ئێرانییەكان، كە ئەیالەتی شارەزوور لەو كاتەدا گرنگترین گۆڕەپانەكانیان بووە.

رێكخستنە كارگێڕییەكانی عوسمانی بەردەوام لە گۆڕانكاری زۆردا بووە تا بەوەی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا عێراق بریتی بووە لە سێ ویلایەت: ویلایەتی موسل، ویلایەتی بەغدا، ویلایەتی بەسرا. ویلایەتی موسل پێكهاتبوو لە سێ سەنجەق (ئەلوییە) كە: سەنجەقی ناوەند، قەزای دهۆك، زاخۆ، زێبار، سنجار، عەقرە، سەنجەق شارەزوور (كەركوك)، قەزای ئەربیل، رانیە، رەواندوز، كوێسنجاق، سەلاحییە (كفری). بەلام سەنجەقی سلێمانی پێكهاتبوو لە: قەزای بازیان، شەهربازار، قەرەداغ، گول عەمبەر، مەرگە[٨].

شاری كەركوك مەركەزی ویلایەتی شارەزووری عوسمانی بووە لە سەدەی شانزەهەم، سنووری ویلایەتەكە پێكهاتووە لەو زەویانەی كە ئەمڕۆ ناسراوە بە پاریزگاكانی (كەركوك) و سلێمانی‌و هەولێر، ئەمیری كوردەكان لە (ئەردەلان)ی‌و (بابان)ەكان بوون كە كاروباری ویلایەتەكەیان بۆ چەند سەدەیەك بردووەتەوە رێوە.

لە دوای نەمانی ئیمارەتی (بابان) لە سالی (١٨٥١)ی زایینی دەولەتی عوسمانی دەستی گرت بەسەر فەرمانرەوایی كەركوكدا، لە سالی (١٨٧٩)ی زایینیدا كاتێك دووبارە ویلایەتی موسل رێكخرایەوە سەنجەقی كەركوك لە نێو سنووری كارگێڕییەكانیدا بووەو بەردەوام لە سالنامەو نامە گۆڕینی فەرمییەكاندا ناوهێنانی شارەزوور بەسەر سەنجەق كەركوكدا بووە، تا سالی (١٣١١)ی كۆچی بەرامبەر بە سالی (١٨٩٤ - ١٨٩٥)ی زایینی كە بڕیاردرا بە بەكارهێنانی ناوی كەركوك لە جیاتی شەهرەزوور بۆ دووركەوتنەوە لەو ئالووگۆڕی نامە فەرمیانەی كە لەنێوان شەهرەزوورو سەنجەق ئەلزووردا هەبوو لە ولاتی شام[٩].

سالنامەكانی عوسمانی ناوەرۆكی گەلێك زانیاری دەربارەی باری كارگێڕی، ئابووری، كۆمەلایەتی، تەندروستی، فێركاری ویلایەتە جۆراوجۆرەكان، دەتوانین سوود لەو زانیارییانە وەربگرین بۆ ئەوەی هەلسین بە لێكۆلینەوە ئەكادیمی لەسەر مێژووی كۆمەلایەتی‌و ئابووری نەك خۆ خەریك كردن بە لێكۆلینەوە بۆ پال پشتی كردنی لایەنی سیاسیمان.

بە هۆی ئەو گۆڕانكارییانەی لە باری ژمارەی دانیشتووان‌و ئابووری‌و كۆمەلایەتی‌و رۆشنبیری‌و گەلێكی تر روویدا لە سالانی سەدەی رابردوو بوو بە هۆی گۆڕانكاری گەورە لە شارەكانی عێراق‌و كۆچكردنی بە لاشاو لە لادێوە بۆ شار بە شێوەیەكی ئەوتۆ لە تواناادا نەبوو ناسنامەی بناسرێتەوە، هەندێك شار هەبوو ژمارەی دانیشتووانی لە سەرەتای سەدەی پێشوودا نەدەگەیشتە سی هەزار كەس، بەلام دانیشتووانی ئەمڕۆی خۆی دەدا لە ملیۆنێك كەس، ئەگەر هاتوو كۆمەلێك لە خەلك، مەبەستم كۆمەلێكی دیاری كراو نییە، رێژەی (٥٪) یا (١٠٪) یا لە (٥٠٪) ئەو ژمارەیە بێت، ئێستا لە باشترین باردا ئەم رێژەیە زیاتر لە (١٪)ە ئەو ژمارە زۆرەی مرۆڤەكان ناگەیەنێت، هەر شارێكی عێراق یان كوردستان وەربگرین‌و بەراوردی بكەین لەگەل ژمارەی دانیشتووانی ئێستا لەگەل ژمارەیان پێش نیو سەدە، یان ئەگەر توانیمان ئەوە لەبەرچاو بگرین لە راستی وێرانكردنی لادێیەكانی كوردستان‌و كۆكردنەوەی دانیشتووانەكەی لە شارو شارەدێ‌و ئۆردوگا زۆرەملێیەكان سەرسووڕمانێكی

سەیر دەبینین لەو جیاوازییانەدا.
ئەوەی هاوپەیوەستە بە خوودی دانیشتووانی کەرکوك کە ئاماژە دەکات بە ڕێـژەی دانیشتووانی کورد لە شارەکە لە سـەدەی ڕابـردوو هۆکارەکەی دەگەڕێـتەوە بەهۆی کۆچی دانیشتووانی کورد لە لادێیەکانییەوە (لە لادێی کەرکوکەوە نەك لە لیوایەکی ترەوە) بۆ ناو شارەکە، ئایا ڕاڤەکردنیان بۆ باری شارەکانی تری عێراق چییە؟ ئایا هەموو ناوچەکانی عـێراق دیـاردەی کۆچکردنیان لە لادێـیـەوە بۆ شـار ڕووی نەداوە؟ ئایا شارێك هەیە لە عێراقدا هۆکاری زیادبوونی زۆری دانیشتووانی بەهۆی کۆچ لە لادێیەوە بۆ شار نەبووبێت؟ ئایا تەنها بەس ئەمە چڕبووەتەوە لە شـاری کـەرکوك و بەپێی بەرنامەیەکی ستراتیجی درێژخایەن؟ کە جوتیارانی کورد ڕایانکردووە لە ترسی دۆزەخی ئەنفال و جینۆساید نەك لە پێناو پرۆسەی بە کوردبووندا لەم شارە کوردستانییەدا؟ ئایا ئەو بەرێزانە ئەو گۆڕانکارییە دراماتییەکیانەیان دیوە کە ڕووی داوە لە ڕێژەی دانیشتووانی لادێ و شار لە عێراقدا لە مـاوەی پەنجا سـاڵی ڕابـردوودا؟ ئایا تـا کـەی خەونی دۆنکیشۆتی مێشکی هەندێکیان دەخورێنێت؟

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:-**

١. بۆ نموونە لێرەدا ئاماژە دەکەم بە هەندێکیان: دکتۆر (فازڵ مەهدی بەیات) لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردووەتـەوە لە ژێر ناونیشانی (السالنامات العثمانية واهميتها لتاريخ العراق)، ژمـارە (٢)ی، بەرگی حەڤدە، لە گۆڤاری (المـورد)، ساڵی (١٩٨٢)، دکتۆر (جەبار قادر) لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی (اربيل في السالنامات العثمانية) لە کۆڕێك کە لەلایەن زانکۆی (سەلاحەدین)ەوە لە شاری هەولێری بەسترا لە ڕۆژانی (١٦ – ١٧)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٠)، ئەم لێکۆڵینەوەیە لە هەمان ساڵدا لە ژمارە (٩١)ی گۆڤاری (کاروان) لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٠) بڵاوکراوەتەوە، هەروەها دکتۆر (عەبدولفەتاح عـەلی یـەحـیا) دوو لێـکـۆڵـیـنـەوەی بـڵاوکـردووەتـەوە بە ناونیشانی (سالنامات الموصل العثمانية مصدرا لدراسة تاريخ السليمانية)، گۆڤاری (زانکۆی دهۆك)، بەرگی یەکەم، ژمارە (٢)، لەگەڵ لێکۆڵینەوەی (سالنامات الموصل العثمانية مصدرا لدراسة تاريخ دهوك)، بەرگی (٣)، ژمارە (١)، ساڵی (٢٠٠٠)، هەمان گۆڤاری پێشوو، هەروەها بەشداری کردووە بە لێکۆڵینەوەیەك لە ژێر ناونیشانی (كركوك في السالنامات العثمانية) لە کۆنفرانسی کەرکوك کە لە هەولێر بەسترا لە نیسانی ساڵی (٢٠٠١).

٢. بڕوانە:

– گۆڤاری (کـاروان)، ژمارە (٩١)، کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٠)، لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی (اربيل في السالنامات العثمانية)، دکتۆر جەبار قادر.

– (قـامـوس تـركـى)، شـەمسـەددیـن سـامی، ئەستەمبوڵ، (١٣١٧)ی کۆچی، لاپەڕە (٧٠١).

– (سالنامة دولت عليه عثمانية)، ساڵی (١٣٠٥)ی کۆچی، لاپەڕە (١٠٠ – ١١٩).

– بۆ زانـیـاری زیـاتـر بـڕوانـە: (كـركـوك في السالنامات العثمانية)، دکتۆر عەبدولفەتاح عەلی یەحیا، لاپـەڕە (٢)، بڵاونەکراوەتەوە.

٣. بڕوانە:

– (بـغـداد ولايـت جليله سنه مخـصـوص سالنامه در)، يكرمنجي دفعه در، ساڵی (١٣٢٤)ی کۆچی، چاپخانەی (ولایتده)، لاپەڕە (٨٣).

– بەڵام دکتۆر (فازڵ مەهدی بەیاتی) مێژووی جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە ئاماژەمان پێکردووە دەربارەی یەکەم ساڵنامەی عوسمانی فەرمییەکە لە ساڵی (١٢٦٣)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٤٧)ی زایینی، هەروەها یەکەم ساڵنامەی تایبەت بە ولایەتی بەغدا بە بۆچوونی ئەو لە ساڵی (١٢٩٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٧٥)ی زایینی دەرچووە.

– دکتۆر (فازڵ مەهدی بەیات)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٢ – ٤٤).

٤. (موصل ولايتی سالنامەسی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی (موسڵ)، ساڵی (١٣٠٨)ی کۆچی، ساڵی (١٣٠٦)ی ڕۆمی.

٥. (موصل ولايتی سالنامەسی)، ساڵی (١٣٣٠)ی کۆچی، لاپەڕە (٢٢٩).

٦. (تاريخ العراق الاداري والاقتصادي في العهد العثماني الثاني ١٦٣٨ – ١٧٥٠ م)، خـەلیل عـەلی مـوراد، نامەی ماستەر، بڵاونەکراو، زانکۆی (بەغدا)، (١٩٧٥)، لاپەڕە (٤٥).

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٠ – ٦٢).

٨. (سالنامة دولت عليه عثمانية)، ساڵی (١٣٠٢)ی کۆچی، لاپەڕە (٧٤ – ٧٥).

٩. (موصل ولايتی سالنامەسی)، ساڵی (١٣١٢)ی کۆچی، لاپەڕە (٣١٨).

*** كەركوك لە قاموسولئەعلامی شەمسەدین سامیدا لە سەردەمی عوسمانییەكان:-**

**ئەحمەد تاقانە**

شەمسەدین سامی كە نووسەرێكی عوسمانییە،بە رەسەن ئەرنادت (ئەلبانی)یە، ساڵی ١٨٥٠ لە (فراشەر)ی سەرپەرشتیاری (یانیە)ی (ئەلبانیا) لەدایكبووەو خوێندنی لە ئامادەییەكی یۆنانی لە (یانیە) تەواو كردووە.زمانی دایكی ئەلبانیو جگە لە زمانی رەسمی عوسمانی ئەوسا شەمسەدین سامی زمانی عەرەبی، فارسی، فەرەنسی، ئیتاڵی، یۆنانی كۆنو توركییش فێربووە.

ساڵی (١٩٠٤) لە تەمەنی ٥٤ ساڵیدا لە ئەستەمبووڵ كۆچی دوایی كردووە، یەكێكە لەو نووسەرانەی كە دەربارەی كەركوكو دەوروبەری گەلێك زانیاری ووردی داوەو ئامارێكی تارادەیەكی چاكی خستووەتە روو:

"كەركوك شارێكە ناوەندی لیوای شارەزوورە لە ویلایەتی موسڵی كوردستانو ١٦٠ كیلۆمەتر لە باشووری خۆرهەڵاتی موسڵ، لەژێر ریزە گردێكدا لە رۆخی دەشتێكی بەریندا، لەسەرزێی ئەدهەم واتە (خری خاسە)دایە، ٣٠٠٠٠ هەزار كەسی دانیشتووانی هەیەو ٣٦ مزگەوتو ٧ خوێندنگاو، ١٥ تەكییەو كونجو ١٢ خانو ١٢٨٢ كۆگاو دووكانو قەیسەریو ٨ گەرماو، پردێكی سەربەستو قوتابخانەیەكی ناوەندیو ١٨ قوتابخانەی منداڵانو ٣ كلێساو سیناگۆگ (پەرستگەی جوولەكەكان)ی هەیە، لەناوەوەی ئەو قەڵایەی لەسەر گردێكدا دروست كراوە، لەگەڵ ئەو گەرەكانەی ژێرەوەی قەڵاكەو لەبەشی لای راستی بەستەكە پێكهاتووە، سێ چارەكی خەڵكەكەی كوردو ئەوی دیكەش توركو عەرەبو هی دیكەن، ٧٦٠ جوو، ٤٦٠ كلدانیشی لێیە، لەبەر ئەوەی لە شوێنی بە یەككەیشتنی چەند كاروانە رێیەكدا جێی گرتووەتەوە، بازرگانیی چالاكە، لەبەر ئەوەی ئاوی رەوانیشی زۆرە، لە دەوروبەریدا باخو باخچەو بەروبومی پرتەقاڵو لیمۆو هەنارو خورماو میوەگەلی دیكەشی هەیە، لە نزیكیانەوە خوێناغلە (شوێنی خوێ لێ دەرهێنان)و ئاوی كانزاییو پیترۆڵ زۆرە، لەشاردا ٢٠ دەزگای چنینو كاڵا دروستكردن هەیە، هەندێك پیشەی پێستە خۆشكردنو گوریسی كندریش دروست دەكرێ، گوڵاو لە گوڵێكی پرتەقاڵ دەردەهێنرێت، هەواكەی هاوینان ئەگەرچی زۆر گەرمیشە، سازگارو خۆشە، لە شاردا نزرگەی پێغەمبەران: دانیالو عوزێر (سڵاویان لێ بێ)و چەند كەسێك لە سەیدەكان (ئەهلی بەیت)و گۆڕی هەندێك لە شێخە گەورەكان زیارەت دەكرێن.

كەركوك شارێكی كۆنە، ناوە كۆنەكەی (كەركوورە)یە، قەزای كەركوك، قەزای ناوەندیی لیوای شارەزوورە، لە خۆرهەڵاتەوە بە لیوای سلێمانیو لە باكورەوە بە كۆیەو بە قەزای ئەربیلو لە خۆرئاواوە بە لیوای موسڵو لە باشووری خۆرئاواوە بە ویلایەتی بەغداد لە باشووری خۆرهەڵاتەوە بە قەزای سەڵاحییە سنووردارە، پێنج ناحییەی بەناوی:. مەلحە، تووز خورماتوو، ئاڵتوون كۆپری، كێل (دەبێت گل بێت)و شوانەوە هەیە، بە تێكرای ٣٥٢ گوندی هەیە.

ئەدهەمی پەیوەست بە دیجلەو زێی خواروو ئاوێكی زۆری دیكە كە دەرژێتە ناو ئەمانەوە، یان راستەوخۆ دەرژێنە ناو دیجلە، بەناو قەزادا دەرۆنو خاكەكەی كەمێك بەرزاییەو بەشێكی زۆری بریتییە لە دەشتی تەختو بەرینو زۆر بەپیتە.

بەرووبوومە سەرەكییەكانی، لە گەنمو جۆو برنجو تووتنو ترێو میوەی دیكەو بەتایبەتی لیمۆ پێكدێ، لە باكووری ناوەندی قەزادا بیرە نەوتی زۆر دەولەمەند هەیە، خەلكەكە بۆ سووتاندن وەكو گاز دەیكرن، لە شوێنێكی بەناو باباگورگوریشەوە هاڵاوێكی شینباو دەردەچێت، كانی بۆ نەخۆشییە جیاجیاكان سوودبەخشو ئاوی خوێداریشیان زۆرە، هەندێك بیر لە باشووری خۆرئاوای ناوەندی قەزادا هێنراوەتە سەر بارودۆخی خوێ لێ وەدەستهێنان. برێكی زۆری خوێی لێ دەردەهێنرێت، مەرو بزنو حوشترو ئەسپو ئاژەڵی دیكەیان زۆرە، زۆربەی خوریو مووی بزن هەر لە جێی خۆیدا لە دروستكردنی بەرەو عەباو هی دیكەدا بەكار دەهێنرێت"[1].

هەروەها دەربارەی ئاڵتون كۆپری دەڵێت:

"شارۆچكەیەكە ناوەندی ناحییەیە لە قەزاو لیوای شارەزووری ویلایەتی موسڵ، كە لەسەر رێی (بەغدا – موسڵ)دایە، كە لەسەر دوورگەیەكی ناوەراستی زێی گچكە، یان ئاوی كۆپری كە ناوێكی دیكەیەتی، كە لە (٤٢) كیلۆمەتری باكووری خۆرئاوای كەركوكو نزیكەی (١٠٥) كیلۆمەتری باشووری خۆرهەڵاتی موسڵدایە، لەسەر لقی باشووری زێیەكەدا كە بەدوو لای شارەكەدا دەروا، پردێكی بەكەمەرە (كەوانە)ی جوانی هەیە پردی لقەكەی باكووری بەر لە سەد ساڵ رووخاوە، پێیان نەكراوە بە دروستكردنی بدەنەوە، لە دەرەوەی ئەم دوو لقە، دوو گەرەكی نزیكەی سەد ماڵێكی هەیە.

دانیشتووانی شار (١٠,٠٠٠) كەسێك دەبن، وەك رێژەی سەرەكی بە توركی قسە دەكەنو بە عەرەبیو كوردیش قسەی تێدا دەكرێ، لەگەڵ ئەوەشدا كە لەسەر رێیە، لە چیاكانی كوردستانەوە بەروبووی هەنجیرو هی دیكە، تا ئەرێ بە ولاخ دەهێنرێو لەبەر ئەوەی لەوێشەوە بە كەلەك بەناو دیجلەدا دەبرێتە بەغدا، بازرگانیی گەلێك چالاكە دوو جۆگەی لای راستو لای چەپییەوە كە دێن، لە نزیكی شارۆچكەدا دەرژێنە ناو زێی خواروو (گچكە)وە"[2].

*** سەرچاوەو پەراوێزەكان:**

١. (كوردو كوردستان، لە یەكەم ئەنسیكلۆپیدیای توركی لە مێژوودا، قاموسولئەعلامی شەمسەدین سامی)، وەرگێران بۆ كوردی: ئەحمەد تاقانە، دەزگای (ئاراس)، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەرە (٢٥٨ – ٢٥٩).

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٣).

*** دەوری ڕۆژهەڵاتناسی لە نووسینەوەی مێژووی کەرکوکدا:**

**سمکۆ بەهرۆز**

"(ڕۆژهەڵاتناس – المستشرق) بەو کەسە دەڵێن کە زانایە لە زمان و دابوونەریت و ئاداب و زانیاری ڕۆژهەڵات"[١].

"یان بە واتایەکی تر ڕۆژهەڵاتناس ئەو کەسەیە دەیەوێت کە زانیاری و لێکۆڵینەوە کۆبکاتەوە لەسەر ڕۆژهەڵات لە بوارەکانی زمان، مێژوو، جوگرافیا، تەلارسازیی، ئەدەب، زانست، بۆ ئەوەی مەرامەکانی خۆی بخاتە ڕوو"[٢].

"ڕۆژهەڵاتناسی لە ڕووی زمانەوانییەوە زاراوەیەکە لە بنەڕەتدا لە وشەی (Orientalism)ەوە وەرگیردراوە، لە ڕووی زمانەوانییەوە ئەم زاراوەیە لە وشەی ڕۆژهەڵات (Oreient)ەوە داڕێژراوە کە واتای هەڵاتنی خۆر یان دەرکەوتنی خۆی دەبەخشێت، واتا ئەو شوێنەی خۆری لێوەهەڵدێت، لای ئەوروپییەکان وشەی (Rient) ئاماژە کردنە بە ناوچەکانی ئەوان، (Orientalism)یش مانای لێکۆڵینەوە لە ڕۆژهەڵات دەگەیەنێت"[٣].

"لە زمانی عەرەبیشدا (الاستشراق) ووشەیەکی داڕێژراوە لە ووشەی (شرق) بە مانای (دەرکەوتنی خۆر)، یا (المشرق) بە شکانەوەی ڕاکەی بە مانای ئەوەی بە دەرکەوتنی خۆر لە ڕۆژهەڵات، لە دواییدا سێ پیتی (ئەلف)و (سین)و (تا)ی بۆ زیاد کراوە بووە بە (استشراق) بە مانای (داواکردنی ڕۆژهەڵات لە ڕووی زانست و ئەدەب و زمان و ئاینییەکانەوە لەگەڵ هەموو ئەوانەی هاوپەیوەستە پێوە)"[٤].

"لە زمانی کوردیشدا ماوەیەکی دوورو درێژدا ووشەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتناسی سەری هەڵداوەو پێناسەیە بەرامبەر (الاستشراق)، بۆیە هەموو ئەو تایبەتمەندیانەی کە وڵاتەکانی تر دەربارەی ڕۆژهەڵاتناسی باسیان لێوە کردووە لە مێژوو و زمانی کوردیشدا ئەم چەمکە بوونی هەیە"[٥].

"ڕۆژهەڵاتناس بوارێکی نادیار یان فراوان بوو بۆ زانایەکی ڕۆژئاوایی یان کەسێکی پەروەردەیی ڕۆژئاواو بتوانێت ماددەیەکی بەپێزو پوخت پێ بگەیەنێت کە خزمەت بە بوارە جۆر بەجۆرەکان بکات دەبینین زانایەکی ڕۆژهەڵاتناس کارەکانی لە چەندەها جۆر چڕ کردووەتەوە کە هەرییەکەی لە بوارێکدا خزمەتی کردووە، لەبەر ئەوە لێکدانەوەکان بۆ زانایەکی ڕۆژهەڵاتناس لەم چەند خاڵەدا خۆی دەبینێتەوە:

١. ڕۆژهەڵاتناس پابەندی ئەو کاریگەرییە سیاسییە بووە کە لە پێناویدا هاتووە بۆی، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە لە زۆر بوارو کاتەکاندا وەکو نێردراوێکی سیاسی کارەکانی ڕاپەڕاندووەو بە نهێنی یان بەکاری سیخوری لە پێناو خزمەتی وڵاتەکەی کاری کردووە، نموونەی لەم جۆرەمان زۆرە سەریان لە کوردستان و کەرکوك داوەو زانیاری تەواویان بە دەوڵەتەکانیان داوەو سیاسەتی دەوڵەتەکە لەسەر ئەو ڕاپۆرتانە داڕێژراوە کە ڕۆژهەڵاتناس ئامادەی کردووە.

٢. ڕۆژهەڵاتناس هەوڵی داوە لە پاڵ کارە سیاسی و سیخورییەکەیدا، زانیاری کۆکردووەتەوە بۆ سوود وەرگرتن لە بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی تا بتوانێت کارەکانی زۆر بە هێمنی و شاراوەیی بەڕێوە بەرێت، یان وا خۆی تێکەڵ کردووە کە هەموو دابونەریت و کەلەپوورێکی خۆی تێکەڵ بەو میللەتە کردووە.

٣. هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان لێکۆڵینەوەکانیان کەوتووەتە ژێر کاریگەری بارە سیاسییەکەو بەپێی ئەو بارودۆخە زانیارییەکانیان دارشتووەو لە زۆر باردا لێکۆڵینەوەی چەوتیان پێگەیاندووەو خزمەتی بە میللەتی ناوچەکە نەکردووەو لەپێناو بەرژەوەندییەکاندا کاری کردووە.

٤. کارێکی چاکی کە ڕۆژهەڵاتناسەکان کردیان هەڵدانەوەی ئەو پاشماوانە بوو کە تاکو ماوەیەکی دوورودرێژ (کنە – تنقیب) نەکرابوو یان هەڵنەدرابۆوە، بۆیە مێژوویەکی زۆری شاراوەیان خستەڕوو.

٥. بەشێکی زۆری ڕۆژهەڵاتناسەکان خەڵکی ناوچەکانی ڕۆژئاوان وەکو بەریتانیاو ئەمریکاو ئەڵمانیاو فەرەنساو هۆڵەنداو دانیمارك و گەلێك ناوچەی تر بوون.

بەشێکی تری گرنگ لەو گەڕیدانە لەو چوارچێوانەدا خۆیان دەگرنەوە کە هەڵساون بەکاری بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی (تبشیر)، کە لە پاڵ بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی، هەڵدەستان بە نووسینەوەی مێژوو و گەلێك ڕووداوی مێژوویییان تۆمار کردووە.

ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە کە بەشێکی زۆریان مێژووییان دابەشکردووە بەسەر ئەوانەی کە هاتوونەتە سەر ئاینی مەسیحی و ئەوانەی کە نەهاتوونەتە سەر ئاینی مەسیحی، بۆیە هەوڵدانەکانیان بۆ نووسینەوەی ئەو ناوچانەش لەو چوارچێوەیە دەقی گرتووە، لەبەر ئەوە زۆرجار ڕووداوە مێژوویییەکانیان بە چەوتی تۆمار کردووە لەبەر بڵاوکردنەوەی ئاینەکە. ئەگەر سەیرێکی ئەو ماوەیەی (موبەشیرەکان–مووژدەبەخش)ەکان بکەین، دەبینین لەزۆر باردا هەڵەی فەرهەنگیان هەیەو ناوی شوێنەکانیان بە هەڵە تۆمار کردووە، کە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە بنەڕەتییەکەی زۆر زەحمەتە، بەشێکی تری ئەو گەڕیدانە خەڵکی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتن و هەوڵی تۆمارکردنی ڕووداوەکانیان داوەو لێکۆڵینەوەو یاداشتەکانیان کەمەو ماوەیەکی دیاریکراوی داگیر کردووە، بەشێکی زۆری لێکۆڵینەوەی ئەو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانە بایەخێکی تایبەتی خۆی هەیەو دەتوانین لەسەر بنەڕەتی بەشێکیان لێکۆڵینەوەی بەپێز دابهێنین.

"بەشێکی گەڕیدە ئەوروپییەکان، هاتوونەتە ئەم شارەو باسیان کردووە، هەندێکیان هاتوونەتە کوردستان، بەڵام ماوەیان نەبووە تا سەر لەم شارە بدەن، یان لە بیریاندا نەبووە بێنە ئەم شارەو لەسەری بنووسن، بۆ نموونە گەڕیدە (جیمس برانت) کە قونسوڵی ئینگلیزی بووە لە (ئەرزە ڕۆم) لە هاوینی ساڵی (١٨٣٨)دا سەردانی باکووری کوردستانی کردووەو زانیاری بە پێزی لەسەر نووسیوە، هەروەها هەرییەکە لە گەڕیدەی ئیتاڵی (پیترو دیلاڤاڵ) لە سەدەی حەڤدەهەمو گەڕیدە (جین پانتیست تاڤیرنە) کە بازرگانێکی فەرەنسی بووەو بە هیچ جۆرێك باسی کەرکوکیان نەکردووە".

بەشێكی تریان سەریان لە كەركوك داوەو لە یاداشتەكانیاندا باسی ئەوەیان كردووە بە كەركوكدا ڕۆیشتوونە بۆ شار یان ناوچەیەكی تر، بەڵام هیچ شتێكیان لەسەر شارەكە نەنوسیوە، هەروەكو گەریدەی بێ ناوی ڕووسی لەسەدەی حەڤدەهەم، كە سووڕاوەتەوە بە توركیاو كوردستان و گەلێك ناوچەی تر، لێكۆڵینەوەكانی دەربارەی باری جوگرافی و ئەتنۆگرافی بووە.

* پاڵنەرەكانی سەرهەڵدانی ڕۆژهەڵاتناسی:

١. هۆكاری دەروونی:

"هۆكاری دەروونی بە یەكێك لەو پاڵنەرە گرنگانە دادەنرێت كە ڕۆژهەڵاتناس بایەخی پێداوەو خوودی هەر كەسێك و سرووشتی بیركردنەوەی لە ڕووی مادی و مەعنەوییەوە دەوری گرنگی هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت بگاتە ئامانج و ئاواتەكانی لە جێبەجێكەیاندنی ئەوەی دەیەوێت بیكات، چونكە لە زانستی دەروونناسیدا وا باس دەكات كە هەر كەسێك هەڵگری كۆمەڵێك سیفاتی دەروونی و سروشتی خۆیەتی كە هەوڵدەدات بۆ پێكەیاندنی خۆی لە تێكەیشتنی ئەو ژینگە نادیارانەی دەوروبەری، بۆ نموونە تێگەیشتن لە سروشتی ئیسلام، مەسیح، جوولەكە، نەتەوە جۆراوجۆرەكان خوودێكی دەروونی لای ئەو كەسانەی دروست دەبێت كە هەوڵ دەدەت بچنە ناو كرۆكی ئەو مەسەلانەی كە پێویستە بە دوایدا بگەڕێت"[٦].

٢. هۆكاری ئایینی:

"یەكێكە لەو هۆكارە گرنگانەی كە بە دوادا گەران بۆی گرنگی و پێویستی خۆی هەیە، فراوانبوونی دەوڵەتە ئیسلامییەكان و هاوسنوورییان لەگەڵ بەشێك لە دەوڵەتەكانی ئەورووپادا وای كرد كە كۆمەڵێك كەس هەستن بە بیركردنەوە لە تێگەیشتن لە ئایینی ئیسلام و لێكۆڵینەوە لەو ئایینە تا بۆ ئەوەی بگەنە ئەو باوەڕەی لە لێكۆڵینەوەكانیاندا بەراوردێكی ئاكادیمییانەی بكەن لەگەڵ ئایینی مەسیحی و جوولەكەدا"[٧].

٣. هۆكاری ئابووری:

"ئەم هۆكارەش هیچی كەمتر نییە لە هۆكارەكانی تر لە ڕووی لێكدانەوەو تێگەیشتن بۆ دەستبەسەرا گرتنی ئابووری ئەو ناوچانەی ڕۆژهەلات، چونكە ڕۆژهەلات خۆی لە خۆیدا بازاڕێكی گرنگە بۆ ساغكردنەوەی كەلوپەلە ئابوورییەكانی ڕۆژئاوا، هەندێك جار هەوڵدانی تاكە كەسی بۆ دەستكەوتنی پارە دەوری گرنگی هەیە لە كۆكردنەوەی زانیاری لەو شوێنانەی كە هەوڵیان بۆی داوە"[٨].

٤. هۆكاری زانستی:

"بەشێك لە ڕۆژهەڵاتناسەكان بۆ دەستكەوتنی زانیاری و زانستی ڕاست بووە بە پیشەی بەشێكیان بۆ لێكۆڵینەوە لەسەر ڕۆژهەڵات و مێژووی ئیسلامی، بۆیە دەبینین گەلێك لێكۆڵینەوەی زانستی بە پێز سەری هەڵداوە كە توانیوویانە گەلێك بابەتی چاكی زانستی و ئاكادیمی كۆبكەنەوە دەربارەی هەموو بوارەكان"[٩].

٥. هۆكاری گەشت و سەركێشی:

"بەشێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانە بە هۆی گەشت و سەركێشی و ئارەزووی دیتنی وڵاتەكانی ڕۆژهەڵات دەوری گرنگی بینیوە لە كۆكردنەوەی زانیاری لە هەموو بوارەكانی ژیاندا، بە تایبەتی لە بواری كۆمەڵایەتی و ئایینی و نەتەوایەتی"[١٠].

"كەواتە ئەگەرچی ئێستا ڕۆژهەڵاتناسیی كایەیەكی زانكۆیی و پسپۆڕییە، بەڵام پێشتر كەسانی دیكەش لەم پرۆسەیەدا بەشدار ببوون، لەنێوان ساڵانی (١٩٠٠ – ١٩٥٠) كە ناكرێت تەنها لەگەڵ بابەتە زانكۆییەكاندا وەك ڕۆژهەڵاتناسی مامەڵە بكرێت، چونكە بە دەیان لێكۆڵینەوەو دیراسەو بەدواداچوون و هەوڵی ناسینی ڕۆژهەڵات و تایبەت دەربارەی كوردو كوردستان لەسەر دەستی سیاسەتمەدار دیپلۆمات و ئەفسەرو كەسانی تری بەریتانی ئەنجام دراون، كە هەریەكەیان بە جۆرێك بایەخی تایبەت و زانستی خۆی هەیە.

لەگەڵ جیاوازی و جۆراوجۆریی ئامانج و كارەكانی ڕۆژئاواییەكان لە كوردستان، بەڵام سەرجەمیان هەستی دۆزینەوەو كنەكردنیان هەبووە بە دوای زانیارییەكان و تۆماركردنیان، كە بەم كارانەشیان ڕەگ و ڕیشەیەكی ڕۆژهەڵاتناسیان هەبووە، واتا سەرجەم ئەم كارانەی كە لەلایەن ڕۆژئاواییەكانەوە ئەنجام دراون، جا چ كەسەكە، كەسێكی تەواو ئەكادیمی و پسپۆر بووبێت یان كەسێكی ئاسایی لە هەر لایەنێكی تردا كاری كردبێت، دواجار ئەم كارەی بە هەر جۆرێك بێت كاریگەر بووە لە زیاتر ناساندنی وێنەی ناوچەكەو كورد لە دیدگای ڕۆژهەڵاتناسیانەی ئەوانەوە، جا ئەم كارە گەر بریتی بووبێت لە تۆماری یاداشتنامەو بیرەوەرییەكانیش، تا ڕادەیەك هەر بووەتە بەشێك لە پرۆسەی ڕۆژهەڵاتناسیدا، بۆیە ئاساییە ڕۆژهەڵاتناسی ئەكادیمی و تەواو زانكۆییمان هەبێت و ئاساییشە ئەو كەسانەمان هەبێت كە بە مەبەستی تر هاتوونەتە ناوچەكە، بەڵام بە مەبەستێكی ڕۆژهەڵاتناسییانە كاریان كردبێت و چەندین كارو بەرهەمی گرینگیان لەم ڕووەوە ئەنجام دابێت"[١١].

"لە سەدەی هەژدەدا كاتێك كە فیكری ڕۆشنگەری تا دەهات لە ئەورووپا لە گەشەدا بوو، لەو كاتەدا بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییەكانی بەریتانیا زیاتر بەرەو ڕۆژهەڵات و تایبەت هیندستان دەچوو، چونكە بازاڕی بەریتانییەكان لە هەردوو ئەمریكا لە نیوەی دووەمی ئەو سەدەیەدا تووشی قەیران هاتبووەوە"[١٢].

"كۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدە سەردەمی گەشەسەندنێكی ئابووری گەورەو كرانەوەیەكی بازرگانی جیهانی فراوان بوو لە جیهاندا، كە بەریتانیا سەرمەشقی بوو، بە هۆی شۆڕشی پیشەسازی، زیادبوونی بەرهەمهێنانی بەریتانییەوەو پێشكەوتنی ئامێرو ڕێگاوبانەكانی گواستنەوەی دەریایی و وشكانییەوە، بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییەكانی بەریتانیا لە كۆتایی سەدەی

هـەژدەوە وردە وردە لـەم پـەڕی ڕۆژهـەڵات بۆ ئـەو پـەڕی ڕۆژهەڵات دەتەنیەوە"[١٣].

"کەواتە لە سەدەی نـۆزدەدا بەریتانییەکان بە تەواوەتی لـە ڕۆژهـەڵات نزیك بـوونـەوەو مامـەڵـەکردنی بازرگـانیو دیپلۆماسیانەیان لەگەڵ ئەم ناوچانەدا بوو بە بەشێکی دانەبڕاو لە گەشەکردنی سیاسیو ئابووریی بەریتانیا، هەر بۆیە ناسینی ئەم ناوچانەو قوڵبوونەوە لە لێکۆڵینەوەی تـەواوی پێکهاتەی سیاسیو ژیـاریو کولتووریی ئەم ناوچانە، بوو بە کایەیەکی گرنگی پاراستنی بەرژەوەندییە جیاجیاکانی بەریتانیا"[١٤].

"بە زیاتر چڕبوونەوەی ململانێ نێودەوڵەتییەکان لەنێوان ساڵانی (١٨١٥ – ١٩١٤) لـە نـاوچـەکـانی ڕۆژهـەڵاتـی ناوەڕاستدا، ناوچەکانی میسۆپۆتامیاو کەنداوی فارسیش بوون بە بەشێکی گرنگی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیاو پاراستنی ڕێگا بازرگانییەکانی لە هیندستانەوە بۆ ئەوروپا، بۆیە لـەم ماوەیـەدا تا دەهـات بەریتانییەکان زیـاتـر کـارە دبلۆماسیو سیاسییەکانیان لەم ناوچانەدا بە هێزتر دەکردو زیاتر هەوڵی شوێن قایم کردنیان دەدا"[١٥].

"لە چارەکی کۆتایی سـەدەی نـۆزدەوە تا جەنگی جیهانی یـەکـەم لـە کـاتـێـکـدا تـا دەهـات بـەرژەوەنـدیـیـە ئـابـووریو بازرگانییەکانی بەریتانیا لە بـرەودا بوو لە ناوچەکە بە رادەیەك لە ساڵی (١٩٠٣)دا نزیکەی (٤٣٪)ی ئەو کاڵایانەی دەهاتنە ناوچەکانی عـێراقـەوە بەریتانی یـان (هیندی – بەریتانی) بوون"[١٦].

*** یاداشتنامەی ڕۆژهەڵاتناسو کۆمەڵێك گەڕیدە کە سەردانی کەرکوکیان کردووە:**

*** گەشتی (ئەبو دەلەف موسعەر کوری موهەلهەل ئەلخەزرەجی ئەلیەنبەعی) بۆ کوردستان لەنێوان ساڵانی (٩٥١- ٩٥٢)ی زایینی:**

"نووسـەر لە بنەڕەتدا لە هـۆزی (خـەزرەجی)یـە دەوڕێکی باڵایان هەبووە لە مەدینە، ئەم هۆزە کاریگەرییان هەبووە لـە پێش ئیسلامو لـە دوای ئیسلام، بـنـەڕەتی دووەمـی (ئەلیەنبەعی)، ئاماژە پێکردنە بۆ شوێنێك لەسەر ڕۆخی دەریای سوور، لەوانەیە شوێنی لەدایك بوونی بووبێت.

هـەروەهـا بەناوبانگ بـووە بە (موسعەر کـوری موهەلهەل) کە ناوێکی بـەربـڵاوبـووە لە نـاوەڕاسـتی نیمچە دوورگـەی عەرەبی هەر لە سەردەمە زووەکانەوە تاکو ئەم سەردەمانەی ئێستامان.

دەربارەی ژیانی زانیاری تەواومان نییە تەنها چەند سەرە داوێکی کەم نەبێت کە لەم لاو لەولا بڵاوبووەتەوە.

بەڵام زانیاریمان هەیە ماوەیەك لە کۆشکی نەسری دووەمی کوری ئەحمەد کوری ئیسماعیل سامانی بووە (٩١٤- ٩٤٣) ی زایینی لە (بوخاری)، کە لەوانەیە ئەمە ڕووی دابێت لە ماوەی کۆتایی فەرمانڕەواییەکەی، پێش ساڵی (٩٤٣)ی زایینی بە گەشتێك کە لەگەڵ نێردراوێکی چینی دا بووە، سـەری لە (تورکستان)و (تبت) داوەو گەیشتۆتە (چین)، لەدوایدا ڕۆیشتووە بۆ (هیند)و (سیستان)، هەموو ئەمانەی لە نامەی یەکەمدا ئاماژە پێکردووە، لە نامەی دووەمیدا ئـامـاژەی بە شوێنەکانی ئازەربایجانو ئەرمیناو ئێرانو شـارەزوور کـردووە بە تایبەتی لە ئاماژەکردن گەلێك لەو هۆزەکانی ئەو ناوچەیە کە جەلالی یان گەڵاڵی یان جاف یەکێکە لەوانە کە ناوچەکانی کەرکوكو کفریو چەمچەماڵ بەشێکی نیشتەجێیانە.

لەم بارەیەوە دەڵێت:

جەلالی یەکێکە لە هۆزە دیارەکانی کوردو لە مێژوودا، تاکو ئێستا کە ژمارەیان زۆرە، هەر لە سەردەمە ئیسلامییەکانەوە لە شـارەزوورو داقـوقو شنۆ، لە نێو ناوچەی ئازەربیجانی ڕۆژئـاوای ئێران، لە (کلیای) لە شوێنەکە لەسەر (جوانرۆ) لەنێوان (کرماشان)و (سنە) لە ئاقاری (مایدەشت).

کۆنترین ناوهێنانێك کە لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەمی کۆچی ناوی هاتبێت لەلایەن (ابن الاثیر)ەوە هاتووە، لەنێوان باسێك دەربارەی ئاقاری شارەزوور، لە ڕووداوەکانی ساڵی (٨٨٠- ٨٨١)ی زایینو (٩٢٧)ی زایین لە نیوەی یەکەمی سەدەی چواری کۆچی.

هەرییەکە لە یەعقوبیو (ئەلمەسعودی) لە کتێبی (مروج الذهب)و (التنبیەو الاشراف)و لە لای (یاقوت ئەلحەمەوی) لە کتێبی (معجم البلدان)و ئەلعومەری لە کتێبی (مسالك الابصار) هەرییەکە لە (القلقشندي) لە (صبح الاعشی)وە (المقریزی) لە کتێبی (السلوك لمعرفة دول الملوك) هەروەها (مسعر) لە گەشتەکەیدا بۆ شارەزوور لە ساڵی (٩٥٢)ی زایینی ناوی ئەم هۆزە هاتووە.

بەڵام (ئەبو دەلـەف موسعەر کوری موهەلهەل ئەلخەزرەجی) لەو باوەڕەدایە کە جەلالیو گەڵاڵی یەك نین، چونکە گەڵاڵی تاکو ئێستاکە بەو ناوەوە ماوەتەوە کە یەکێکە لە هۆزانەی کە نیشتەجێ بوونە لە کوردستانی عێراق کە ژمارە یەکی زۆریان لە هەڵەبجە نیشتەجێ بوون لەگەڵ ئێران لە باوەڕەدان کە گوایە (دۆڵی گەڵاڵ) لەوەوە هاتووە کە بۆیە بەو دۆڵەوە ناونراوە کە شوێنی لە وەرگەی ئاژەڵەکانیان بوونە بەڵکو بە پێچەوانەوە نییە"[١٧].

*** وەسپی مەتراقی زادە بۆ کوردستانی باشوور لە ساڵی (١٥٣٤)ی زایینی:**

"(نەسوح ئەفەندی ئەلسلاحی کوری عەبدوڵڵا قەرەقۆز) کە بە ناوبانگە بە (مەتراقی زادە) یەکێکە لە مێژوونووسو گەڕیدەو ماتماتیك زان، لە بنەڕەتدا خەڵکی ولایەتی بۆسنەی ئەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی بووە، لەبەر لێزانی لە سەربازیو سوارچاکیدا ناوبانگی (مەتراقی – مطراقي) وەرگرتووە.

هـاوڕێـیو هـاوسـەردەمـی هـەمـوو هێرشـەکـانی سـەردەمـی سوڵتان سەلیمی یەکەمو سوڵتان سلێمانی قانوونی بووە بۆ ناوچەکانی میسرو شامو ئێرانو ڕۆمانیا.

لـەبـەر ئـەوەی دەسـتـێـکـی بـاڵای هـەبـووە لـە نـووسـینو وێنەکێشاندا بۆیە ئـەو شوێنانەی کە پێیدا ڕۆیشتووە هەمووی تۆمار کردووە بە وێنەی جۆراوجۆرو ڕەنگاوڕەنگ.

دەربـارەی کـۆچ کـردنـی زانـیـاریـمـان کـەمـە بـەڵام هـەمـوو

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە ساڵی (١٥٦٠)ی زانییدا لە ژیاندا بووە.
مەتراقی گەلێك ناوچەی کوردستانی باشووری باسکردووە بە تایبەتی لە ماوەی شەڕەکانی سوڵتانە عوسمانییەکان لەگەڵ ئیمارەتە کوردییەکاندا.
لە یەکێك لە باسە مێژووییەکانی باسی میرانی سۆران‌و قەڵاکانی دەکات لە پردێ‌و چۆنێتی داگیرکردنی ناوچەکانی سەر بە ئاقاری ئەو ئەمیرە، هەروەها باسی چالاکییەکانی عوسمانییەکان دەکات لە زێی بچووك‌و چیای حەمرین"[١٨].

*** گەشتی ( لیۆنارد ڕائووڵف ):**
ئەم گەڕیدەیە لە ساڵی (١٥٧٤) گەشتی کردووەو وەسفی کەرکوکی بەم جۆرە داوە:
"کەرکوك شارێکی گەورەیەو جوانە، کەوتووەتە سەر دەشتاییەکی زۆر بە پیت‌و بەرەکەت، لە دووری چوار میل بەرزییەك هەیە کە ناوی قەڵای کەرکوکە، ماوەی دوو ڕۆژمان بەسەر برد لە کەرکوك پێش ئەوەی کە کۆچ بکەین بۆ گەشت کردن".
"لە ڕۆژی شانزەی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٥٧٤) دا لە بەغداوە بەرەو کەرکوك بەڕێ کەوتین، کە ماوەی شەش ڕۆژ دوورەو دەکەوێتە سنووری (میدیا)، گەشتەکەمان لە کەنارەکەی تری ڕووباری دیجلەوە دەستپێکرد، لە نزیك (داقوق) قەڵایەکی پارێزراومان بینی کە سەربازگەیەکی تورکیای تێدابوو، ئەمەش دەکەوێتە ناوچەی کوردەوە، کە لێرەوە دەستپێدەکات‌و بە درێژایی ڕووباری دیجلەدا تێدەپەڕێت لەنێوان (مادی میدیا)و هەردوو ڕووبارەکە تا دەگاتە ئەرمینیا.
کوردەکان بە زمانێکی تایبەت قسە دەکەن، ئەو هاوڕێیانەم کە لە گەشتەکەدا لەگەڵم بوون زمانی ئەوانیان نەدەزانی،



مستەفا عەبدوڵڵا خەلیفە

هەروەها کورد ناتوانن بە فارسی یان بە تورکی قسە بکەن‌و وەك وەرگێڕ وابوون بۆمان"[١٩].

*** گەشتی ( مستەفا عەبدوڵڵا خەلیفە ):**
گەڕیدەو جوگرافیناسی تورکییە کە خاوەنی کتێبی (جیهان نما)یە کە هەر لە سەردەمی ئەولیا چەلەبی ژیاوە (١٦٠٩-١٦٥٧)، لە کتێبەکەیدا نووسیوویەتی:
"ویلایەتی شارەزوور لە ٣٢ سنجەق پێکهاتووە، لە هەموویان گرنگتر سنجەقی کەرکوکە کە شوێنی پاشا نیشنە"[٢٠].

*** سەفەر نامەی ژان ئۆتەر ( ١٧٣٤، ١٧٤٣ )، سەردەمی نادرشا:**
"ژان ئۆتەر ئەم سەفەرە درێژخایەن‌و پڕماندووبوونەی، کە نۆ ساڵ (١٧٣٤، ١٧٤٣)ی پێچووەو لەسەر ڕاسپاردەی تایبەتی (لیۆی شازدەیەمی فەرەنسا)، کە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر: مێژوو، جوگرافیا، ئابووری، کۆمەڵایەتیی، سیاسی، ڕووناکبیریی، وڵاتانی ناو قەڵەمڕەوی عوسمانی، ئێرانی بووە.
لە (٢٧)ی شوباتی ساڵی (١٧٣٤)ی زاینیدا دەست پێ دەکات کە سەرەتا هەر لە وڵاتەکەی خۆی (فەرەنسا) مۆڵەتی لە وەزیری کاروباری دەرەوەی فەرەنسا وەرگرتووەو بە ڕێگەی زەریاو ناو کەشتیدا بۆ قوستەنتەنییە چووەوە ڕۆژی (١٠)ی مارتی ساڵی (١٩٣٤) گەیوەتێ‌و لەوێش ڕاستەخۆ لەلایەن دێنمای کارانەوە براوەتە باڵوێزخانەی فەرەنسا لە دەرباری عوسمانی وڕێزی لێگیراوە.
".. لە مووسڵەوە بۆ بەغداد، دوو ڕێگەی هەیە: یەکەمیان لەبەری لای ڕاستی دیجلەو بە بیاباندا دەچێتە سەر ڕێی تکریت.
لە مووسڵەوە تا عێراق، شەش ڕۆژ ڕێیە. ئەم ڕێگەیە تا تکریت، (شاپور)ی کوڕی ئەردەشیری پاپەکان دروستی کردووە.
دووەمین ڕێگە: کە لە موسڵەوە بۆ بەغدا دەچێت، لەبەری لای چەپی ڕووباری دیجلەوەیەو بە کەرکوکدا تێدەپەڕێ، ئەو ڕێگەیەمان دوورترە، بەڵام چاکترەو ئاسانترە کە ئێمە ئەم ڕێگەیەمان هەڵبژارد.
لە (٢٥)ی نیسان دا گەیشتینە شاری ئاشوورییەکان، کە هێشتا کەلاوەکانی شارەکە مابوون. ئەم شوێنە لە نزیك (تەنگە بوغازی)یە، کە دەکەوێتە شوێنی بە یەك گەیشتنی زێی بچووك‌و ڕووباری دیجلە. دەڵێن دارستان‌و گاشە بەردەکانی ئەو شوێنە، لانەی شێرە. لەسەر چەمکە پردێکی تازەیان دروستکردووە، کە ناوی (پردی زێڕ- ئاڵتون کۆپر)یە. ڕۆژی دوایی، دوای چوار سەعات ڕۆیشتن بەڕێی (گوێ تەپە)دا گەیشتینە کەرکوك پاشای کەرکوك لە ژێر خێوەتەکەیدا میوانداریی نانی نیوەڕۆی عەبدولباقی خانی کردو بۆ پێشوازی هاتنیشمان بۆ ناو شار، چەند گوللە تۆپێکی تەقاند، بەڵام داوای لێکرد نەچێتە ناو شار، چونکە لەوە دەترسا لەنێوان پیاوانی باڵوێزو یاساوڵەکانی شاردا، تێکهەڵچوونێك ڕوویدات. لەبەر ئەوە لە نزیك شار خێوەتمان هەڵدا. بە درێژایی ئەو شەو و ڕۆژەی لەوێ ماینەوە، باران

خۆشی نەکردەوە، کە بۆ ئێمە بووە سۆنگەی چەرمەسەری، چونکە ناچار بووین هەموو شتەکانمان بگۆڕین، تەنانەت ئەسپەکانیش، دیلەکان، هەندێ لە ئافرەتەکانو چەند کەسێکی تریش، لە بالوێز جیابوونەوە، تا لێرەوە بچنە ئێران، ئەوانیش رێگەی هەمەدانیان هەڵبژاردو ملی رێگەیان گرتو بەرێ کەوتن، بە ماوەی دوو سەعاتێك لەو لای کەرکوکو لە کەناری رێگەی کەرکوکدا، تەپۆڵکەیەکی لێیە، پێی دەڵێن (بابا گور گور). ئەگەر لەوێ زەوی هەڵکەندرێ، شتێك دێتە دەرەوە کە لە هەوای ئازاد دا دەسووتێتو ئاو دەکوڵێنێ. بەڵام ئەگەر خۆڵو گڵ بەسەر بڵێسەی ئاگرەکەدا بکەن، دەکوژێتەوە. کەمێك لەو لاترو لای خۆر ئاواوە سێ چاوگە نەوتی لێیە، کە بە قەرابی جۆگەیەکیان لەبەر دەروات، ئەگەر، لۆکە، یان پەڕۆیەکی ئاگراوی بخەنە ئەوێوە، قرمەیەکی گەورەی دێتو بڵێسەیەکی بەرز هەڵدەستێ. تا کاتێك کە چەورای نەوتەکە بمێنێت، ئەو کلپەیەش بڵێسە دەستێنێو دوای تەواو بوونی نەوتەکە، دەکوژێتەوە. هەر لەو نزیکانەدا کانییەکی لێیە، کە (رەزین)ی لێ دێتەدەر، کە هەر (قیر)ەو بێتو کەسێك ئاگای لە خۆی نەبێت، پێی تێ بکەوێ، تیایدا دەچەقێتو ئیدی ناتوانێت لێی بێتە دەر. چونکە زۆر چاك دەگیرسێ. لە رێی (داکوك، داقوق)، کە هەشت سەعاتە رێ لەوێوە دوورە، لە نزیك چەقێك، کە هەر بەو ناوەوەیە، کانی سەرچاوەی نەوت بەرچاو دەکەون. لەم شوێنەدا بوو، کە بەو ناوەوەیە، کانی سەرچاوەی نەوت بەرچاو دەکەن. لەم شوێنەدا بوو، کە تەتەرێك لە ئێرانەوە هاتو مزگێنی ئەوەی هێنا کە (نادر شا)، قەڵای (قەندەهار)ی گەمارۆداوە.

لە رۆژی (١)ی مانگی مایس دا، پاش شەش سەعات رێ گەیشتینە (توزخوورما- خوورماتوو)، کە گوندێکی گەورەیە. لێرەدا کە ئاو دەبێت بە هەڵم، خوێی لێ دروست دەبێت. ئەم گوندە داری خورمای هەیەو ناوەکەیشی لە دوو ووشەی (دوز)، واتا (خوێی)و (خورما) وەرگیراوە. کانە نەوتی زۆریشی لێیە. نەوتەکانی بە سەتڵو جام هەڵدەێنجێننو کەلکی لێ وەردەگرن.

پاش ئەوەی ماوەیەك سەتڵە نەوتەکە دادەنێن، ئەوسا دەنیشێ و بەشەکەی سەرووی بۆ سووتان بەکاردەبەن. لەم شارەشدا وەك شوێنەکانی تر، کەوتمان، لە خواستنی کەرەسەی ژیانو یارمەتی خۆیان دەپاراستو جار ناجارەش ناچار دەبووین پێداویستییەکانمان بە پارە بکرین.

رۆژی دوای، راسپێردراوەکەی (ئەحمەد پاشا)ی والی بەغدامان پێگەیشت کە بۆ پێشوازیمان ناردبوویە بالوێز، کە لە ماندوویی و لەرز و تای درێژخایەنی رزگاری بوو، لە نوێنەکەی هاتە دەرێ سواری ئەسپەکەی بوو. دوای نۆ سەعات رۆیشتن، گەیشتینە (کفری)، کە هیچ کەسێك و هیچ شتێکی تێدا نەدەبینرا. ئەم شارە سەر بە دەسەڵاتداری والی بەغدا بوو، پاشای (والی) کەسێکی بۆ بەپیرییەوە هاتنمان ناردبوو، هاوکات ئەوەشی پێویستمان پێی بوو، بۆی هێنابووین بەرنامەی رێکخستنەکەی پاشا، بەرێکوپێکی بەرێوە چوو. رۆژی (٣)ی نیسان، گەیشتینە (قەراتەپە- قەرەتەپە)و بۆ سبەی شەویش بە (نارین سو) گەیشتین، کە چەمێکی گەورەیەو پاشانیش بە (پل عەباسی) گەیشتین، کە چەند ماڵێکی لێ بوو. لە شەشی مانگی نیسانیشدا لە کاروانسەرای نزیك رووباری (دیالە) چادرمان هەڵدا. رۆژی دوای حەوت سەعات رێکردن، لە (یەنگیجە) تێپەڕین"[٢١].

*** گەشتی (کارستن نیبور) بۆ کەرکوك لە ساڵی (١٧٦٦):**

"(کارستن نیبوور Carsten Niebuhr) زانای ماتماتیكو نەخشەناسو گەریدەی بەناوبانگی ئەڵمانییە کە لە خزمەتی میرنشینی دەنیمارکی دا کاری کردووە. (نیبوور) لە بنەماڵەیەکی هەژارو جووتیاریی ئەڵمانی لەدایکبووە، لە (١٧)ی مارسی ساڵی (١٧٣٣) لە شارۆچکەی (لویدینگ فۆرت Luedingworth) سەر بە ویلایەتی (لاونبێرگ Lauenberg) لەدایکبووە.

ئەم گەریدەیە سەردانی ئەم ناوچەیەی کردووە لە سەدەی هەژدەهەمی زایینی، هەوڵی داوە بە تۆمارکردنی گەلێك زانیاری دەربارەی کەرکوك، لەکاتی سەردانی لە ساڵی (١٧٦٦) ی زایینی، کە لەوە پێش لەگەڵ نێردراوی پاشای دانیمارك بۆ وڵاتانی رۆژهەڵات لە ساڵی (١٧٦٠)ی زایینی بۆ کۆکردنەوەی هەواڵو زانیاری کۆکردنەوەی پێویست هاتووە.

لە (٢٦)ی ئەوریلی ساڵی (١٨١٥)دا لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵیدا لە شاری (مێلدۆرف meldorf) کۆچی دوایی کردووە. سەرەتا ئەویش وەکو هەموو منداڵێکی هەژاری جووتیار یارمەتیی باوکی دەداو خەریکی جووتیاریی بوو. خەونەکانی لەو کاتەدا لەناو کێڵگەو گژوگیاکاندا ژێر گڵ دەکەوێت. بەڵام لەناو مێشکی ئەم جووتیارە هەژارەی ئەڵمانیادا هیوایەکی گەورە، زانایەکی مەزن، گەریدەیەکی سەرکێشو ئازا، سەوز بوو.

پاشان دەچێتە زانکۆی دێرینی (گوتینگن Gottingen) لە وێندەر کۆلیژی ماتماتیك تەواو دەکاتو لەگەڵ ئەوەشدا شارەزاییەکی باشی لە نەخشەسازیو لە بواری رۆژهەڵاتناسی دا دەبێت. جێگای گووتنە (نیبوور) لە تەمەنێکی گەورەدا دەچێت بخوێنێت. کاتێك چووە زانکۆ (گوتینگن) تەمەنی بیستو دوو ساڵ بوو. ئەمەش لە چاو خوێندکارانی تردا زۆر بووە. بەڵام نابێت لە بیرمان بچێت، کە هەژارییو دەستکورتی هۆکاری سەرەکی دواکەوتنی (نیبوور) بووە لە خوێندن.

بیرۆکەی ئەم سەفەرە دەگەرێتەوە بۆ یەکێك لە رۆژهەڵاتناسە ئەڵمانییەکان بەناوی (Johan David Michaelis) رۆژهەڵاتناسو مامۆستای زانکۆی (گۆتینگن). (جوان دافید میشایل ١٧١٧- ١٧٩١) وەکو رۆژهەڵاتناسێکی شارەزا، دەیویست زانیاری لەبارەی ئەم شوێنە نامۆیەی جیهان دەست بکەوێت، هەر بۆیە بیرۆکەی ناردنی شاندێکی زانستیی بۆ ئەم ناوچەیە دای لە کەڵلەی.

ئەو دەیویست لە رێگای کۆمەڵێك زاناوە، زانیاری تەواو لە بارەی (ئەدەب، جوگرافیا، پزیشکی، نەریت، دەرمانسازیی، سامانی سروشتیی، سیستەمی ئیداریی، سیستەمی کۆمەڵایەتی، ئابووریی.. هتد بزانێت. دەیویست گەشتێك رێك بخات کە بە وردی باسی رۆژهەڵاتیی بۆ بکەن.

*** گوندی (یەنگیجە):**

دەکەوێتە سەر هێڵی ٣٤ پلەو ٥٢، لەم وەرزە دا ئەم ناوچەیە چۆڵ بوو، چونکە زۆربەی دانیشتووانی ئاوایی چووبون بۆ گەران بەدوای لەوەرگا بۆ مەرو وڵاخەکانیان.

لە دوزخورماتوو کە نزیکە لە یەنگیجە، خوێو قیرو سەرچاوەکانی نەوت هەیە. بەڵام خەڵکی ئەم ناوچەیە هیچ گرنگی بە قیر نادەن، چونکە لە هیت کە دەکەوێتە سەر رووباری فورات، خەڵکی لەوێ بۆ باشکردنی کەشتییەکانیان بەکاری دەهێنن بەڵام نەوتی رەش لێرە زۆر رەواجی هەیە، چونکە لە جیاتی زەیت بۆ چراکانیان بەکاری دەهێنن. دەچن لقی خورما پارچەی گەورەی لێ دەبرنو دەیچەقێنن بەناو نەوت دا و پاشان دایدەگیرسێنن.

دیارە کاتێك دایدەگیرسێنن لەم دارەشەوە بۆنێکی زۆر ناخۆش دێت کە لە کاتی ئاسایی دا ناتوانیت تەحەمولی بکەیتو هەروەها لە رووی تەندروستیشەوە باش نییە، بەتایبەتی جووتیارەکان لە وەرزی زستان دا بۆ گەرم کردنەوەی ماڵەکانیان بەکاری دەهێنن. لەم وەرزەدا جووتیارەکان لە پەنا سەرچاوەکانی نەوتەکەدا کارەکانیان دەکەن. بەڵام ئەو چرایانەی کە پاشاو نەجیبزادەو دەوڵەمەندەکانی بەغدا بەکاری دەهێنن، بریتییە لە بەکارهێنانی پلیتەیەك کە لە ناو نەوتدا نوقم دەکرێتو پاشان وشك دەکرێتەوە ئینجا لە جیاتی چرا بەکار دەهێنرێت.

جێگای گووتنە بەم نەوتە رەوەندو جووتیارەکان، لەسەرەتای بەهاردا ئەو حوشترانەی پێ رەنگ دەکەن کە تازە لە دایك دەبن. هەروەها بیستم گوایە لەم ناوچەیە دا نەوتی سپیش هەیە کە خەڵکی بۆ چارەسەرکردنی هەندێك نەخۆشی بەکاری دەهێنن.

خەڵکی ئەم ناوچەیە بۆیان دووپات کردمەوە کە ئەم نەوتە سپییە گەر بخرێتە ناو سەری کەسێك، ئەوا لە جەستەیەوە دەردەچێتە دەرێو لە پەنجەی دەستو قاچیەوە دێتە دەرەوە رێك وەکو ئارەقە وایە. کەسێکی ژێر باش لەوە تێدەگات کە من نامەوێت ئەم ئەزموونە بە چاوی خۆم ببینم.

لە رۆژی نۆیەم دا لە مانگی ئازار، پاش ئەوەی جوولەکەکانمان جێهێشت بەبێ ئەوەی هیچ دەستییان لێ بدەم، لە سەفەرەکەمان بەردەوام بووینو لە یەنگیجەوە بەرەو تاووق بەرێکەوتین. تاووق نزیکەی چوار میلو نیو لە یەنگیجەوە دوورە.

ئەم ئاوەدانییە دەکەوێتە سەر رووبارێك کە خوورەیەکی بەهێزی هەیە. لە رێگادا لەوەرگای زۆرو کێڵگەی سەوزمان بینی، بەڵام هیچ گوندێکمان نەبینی. پێدەچێت پێشتر ناوی تاووق بە جۆرێکی تر بووبێتو زیاتر (داقووق) بووە، ئەمیش شارێکی مەزن بووە، کە تێیدا شوێنەواری دەرگای شارو مزگەوتێکی گەورەی هەیە کە لە خشتی قورین دروست کراوە، زۆربەی ماڵەکانی یان گەج یان بەقوور بنیات نراون.

لە نزیکی ئەم گوندەوە مەزاری یەکێك لە ئەولیاکانی موسڵمانان هەیە، کە ناوی (زین العابدین)ە، خەڵکی ئەم ناوچەیە لەو باوەرە دان، کە ئەم مەزارە دەتوانێت، ساڵی یەکجار کوێرێك چاك بکاتەوە. لەبەر ئەوە ئاساییە کە ساڵانە موسڵمانەکان بە لێشاو سەردانی ئەم مەزارە بکەن.

مەحمودی کوریشی کە لە نزیکی ئەم قەبرەوە نێژراوە، موسڵمانەکان لەو باوەرە دان، کە گڵەکەی بۆ چاکبوونەوەی زۆر لە نەخۆشییەکان بەسوودە.

لە رۆژی دەیەم دا بەردەوام بووین لە سەفەرەکەمان، لە داقووقەوە بەرەو کەرکوك رۆیشتین، دیارە پاش ئەوەی کە پێنج میلی ئەڵمانیمان بری. کاتێك رێبوارەکان بەم رێگەیەدا تێدەپەرن، رێگایەکی شاخاویی نزم دێتە رێگایان؛ کەخەڵکی ناوچەکە ناویان ناوە "ئەسکەندەر"، ئەوان لەو باوەرە دان کە لەم ناوچەیەدا نێژراوە.

لەکاتی مانەوەمان لە داقووق خەڵکی، چوون بۆ لای جوولەکەکەو زۆر باسی چەتەی سەر رێگاو دزینی ترسێنەریان بۆ کرد، تەنانەت گوتیان جارێکیان رێگاشیان لە پاشای بەغداو پاشای کەرکوکیش گرتووە، ئەمەش لەنێوان داقووقو کەرکوك دا روویداوە. ئەمەش وای لە جوولەکەکان کرد کە چوار کەسی خەڵکی داقووق لەگەڵ خۆیان بهێنن بۆ ئەوەی لە رێگا دا لەگەڵیان بنو پارێزگاریان لێ بکەن، پاش ئەوەی پارەیەکی زۆریان لێ سەندن.

پاشان زانیم کە ئەو چوار کەسە خۆیان چەتەی رێگا بوون، ئەوانە بە ئەنقەست ئەو قسانەی بۆ جوولەکەکان کردبوو، بۆ ئەوەی ترسێکی زۆر بخەنە دڵیانەوە تا داوایان لێبکەن لەگەڵیان بێن، ئەمانیش پارەیەکی باشیان لێ بسێنن. کاتێك ئەو لە ماڵی یەکێکیان مامەوە لێم پرسی، ئاخۆ ئەم دەمانچە جوانەو ئەم شمشێرە نایابەی لە کوێ بووە؟ وەڵامی دامەوەو گوتی: جارێکیان یاوەری موسافیرێکی کردووە، پاشان ئەو دوو چەکەی پێداوە، چونکە ئەو خۆی نەیدەزانی بەکاریان بێنێت. پاشان پێی گوتم کە موسافیرەکە سکمان (سەربان) بووە، زۆر جاریش یاوەری موسافیرەکان دەکاتو بازرگانیان لەگەڵ دەکات.

*** کەرکوك:**

کەرکوك دەکەوێتە سەر گردێکی جوان، ئەم شارە خێراتێکی زۆریی تێدایە بەڵام کەمتر ئاوەدانی پێوە دیارە، شوێنی لەسەر نەخشە هێڵی پانایی ٣٥ پلەو ٣٩ یە. هیچ شوێنەوارێکی کۆنی شارە ئەسڵییەکە نەماوە کە دەکەوێتە سەر گردێك کە زۆر سەختە. بەڵام گردەکە خۆی، پریەتی لە دانیشتووانو شورایەکی بەرزیی لە قوور دروستکراو دەورەی داوەو سەربازگە (حامییە)یەکی سوپای یەنیجیریی تێدایەو پێی دەڵێن قەڵا.

ئەو شوێنەی کە پێی دەڵێن قەڵا، پیسترین شوێن بووە کە تا ئێستا بینیبێتم، ماڵەکانیشیان لەو پەری پیسو پۆخڵیو خراپی دا بوون. لە قەڵاکە دا سێ مزگەوت هەن کە منارەیان تێدایە. لە یەکێك لە مزگەوتەکان دا قەبری (دانیالو میخائیلو حنانیاو عزائیل)ی پێغەمبەری تێدایە، بێگومان جوولەکەکان دەزانن کە پێغەمبەرەکانیان لەم مزگەوتەدا نێژراون، بەڵام موسڵمانەکان ناهێڵن ئەوان بچنە ناو ئەم مزگەوتەوە بۆ ئەوەی سەردانی قەبری پێغەمبەرەکانیان بکەن.

هەروەها لە کەرکوک نزیکەی چل کلدانیو نەستووری هەن کە سەر بە کڵێسای ڕۆمان، کاتێک کە بیستیان گەڕیدەیەکی ئەورووپی هاتووە، یەکسەر ڕایانکرد بۆ لامو سەردانیان کردم. بە هاتنم زۆر خۆشحاڵ بوونو زۆر حەزیان کرد کە پیاوێکیان لە وڵاتی قەدیس بترۆس بینییەوەو زۆر تکایان لێکردم کە چەند ڕۆژێکی تر لەلایان بمێنمەوە، لە کاتی قسەکردن لەگەڵیان دا، زۆر ڕقم لە مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵات بۆوە، چونکە هێشتا خۆیان بە خورافاتی کۆنەوە بەستۆتەوەو باوەڕیش بە پاپا ناکەن وەکو خەلیفەی مەسیح لەسەر زەوی. من ئامۆژگاریی ئەو خەڵکە باشانەم کردو داوام لێکردن کە زۆر سەبرو تەحەمولیان هەبێتو دڵیان بەرامبەر مەسیحییەکانی تر فراوان بێت، بەبێ ئەوەی شتێکی وابکەم، کە ئەوان هەست بکەن کە سەر بە مەزهەبەکەی ئەوان نیم. جێگای ئاماژەیە من هەستم کرد کە هەموو مەسیحییەکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵات، زۆر لە یەکتری تێدەگەنو هاودەمن، بەڵام بەهیچ شێوەیەك حەزییان بەو مەسیحییانە نییە کە سەر بە کڵێسای ڕۆمیی کاتۆلیکین. هەروەها هەستم کرد کە هەندێك لەو مەسیحییانەی کە لە ڕێگای قەشە ئەورووپییەکانو شاندە میسۆنێرەکانەوە چوونەتە سەر مەزهەبی کاتۆلیکی ڕۆمانی، دوژمنی سەرسەختی براکانیانن ئەوانەی کە هێشتا لەسەر مەزهەبە کۆنەکانیان ماونو عەقیدەی خۆیان نەگۆڕیوە.

کەرکوک مەڵبەندی پاشایەتییە لە پلەی دوو خەت، بەڵام پاشا لەناو شار نائژی، بەڵکە لە لاکەی تری ڕووبارەکە دەژیو ناوچەیەکی کەمیش دەچێتە ژێر فەرمانڕەوایی ئەوەوە. بەڵام بەشەکانی تری ویلایەتی شارەزوور Schahr Essul کە دەکەوێتە سەر ڕێگای نێوان داقووقو (ئەربیل – هەولێر)، ئەوا هەمووی دەکەوێتە ژێر فەرمانڕەوایی پاشای بەغداوە، هەروەك پێشتریش باسم کرد.

کاتێك نادرشا پەلاماری شاری کەرکوکی دا، زۆر تووشی بەرەنگاریی نەبۆوە، بەڵام کاتێك لە بەرامبەر موسڵ تووشی فەشەل بۆوەو هێزەکەی لەوێ لەناوچوو و شکستی هێنا، بەپەلە لە شاری کەرکوک کشایەوە، پاش ئەوەی زەرەرێکی زۆری لێکەوت.

لە ڕێگادا کۆمەڵێکی زۆر چەك و تەقەمەنیم بینی، کەپێش بیست ساڵ فارسەکان لێرە لێیان بەجێماوە. لەم ناوچەیەدا کۆمەڵێك ئاشی ئاو هەیە، هەر بۆیە گەنمێکی زۆر لەم ناوچەیە دێتە بەرهەمهێنانو دەنێرێت بۆ بەغداو لە بەسرەشەوە خورماو شتی تر دێت، کە لەگەڵ گەنمدا دەیگۆڕنەوە.

لە نزیك کەرکوکەوە سەرچاوەی قیرو نەوت هەیە، لەوێ جێگایەکی لێیە پێی دەڵێن بابا گرگر (بابە گوور گوور). ئەم شوێنە زۆر سەرسوڕهێنەرە بە تایبەتی زەوییەکەی زۆر گەرمە بە شێوەیەك کە دەتوانرێت گۆشتو هێلکەی تێدا ببرژێت، پیاو پێویستی بە هیچ نییە، تەنها چاڵێکی بچووك هەڵبکەنەو ئەو شتەی تێکەو بۆ خۆی دەبرژێت. خەڵکی بۆیان گێڕامەوە کە لەم شوێنە ئاگرێکی گەورە بەرز دەبێتەوە، کە زۆر جار خەڵکی بۆ خۆشی دەچن سەیری ئاگرەکە دەکەن. پێشتر گووتم ماوەیەکی زۆرم لەبەر دەست دایە، هەر بۆیە پەلەم نەکرد بۆ سەردانی ئەم شوێنە، بەتایبەت ئەو موسڵمانانەی کە لە کاروانەکە لەگەڵمان بوونو کەروان بوون، دەیانویست بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لە کەرکوك بمێننەوە، بۆ ئەوەی پشووی جەژن "بیرم" بگێڕن. بەڵام لە ناکاو لە ڕۆژی یانزەمین دا، کاروانێکی گەورە لە بەرەبەیان دا خۆی کرد بە کەرکوك دا و دەیویست بچێت بۆ ئەربیل، ئێمەش بڕیارمان دا لەگەڵیان بچین.

لەم ڕێگایەدا هیچ گوندێکم نەبینی هەتا ئاڵتوون کۆپری کە شەوی دوانزەهەم گەیشتینە ئەوێ، بەڵام لە ڕێگادا زۆر بنەماڵەی کوردیمان بینی، کە لەم لەوەڕگا جوانانەدا، خەریکی لەوەڕدانی ڕەشەوڵاخو بەرخەکانیان بوون.

*** ئاڵتوون کۆپری:**

ئاڵتون کۆپری مانای (پردی ئاڵتوونی) دەگەیەنێت، ئەویش شارۆچکەیەکە کە ژمارەی ماڵەکانی دەگاتە نزیکەی چوار سەد تا پێنج سەد ماڵ. دەکەوێتە سەر زێی گەورەو لەناو دوورگەیەکی بچووك دایە، بەناو ئەو پردەشەوە ناویان ناوە، چونکە بەرزایی کەوانەیی (قەوس)کانی پردەکە زۆرترە لە چاو پردی ئاسایی، ئەو پردەی کە پێش چەند ساڵێك ڕووخا، بەرزاییەکەی هێندەی ئەمەی ئێستا نەبووە، هەر بۆیە ناچاربوون کە بەم شێوە جوانە ئەم پردە دروست بکەنو نەشیانتوانی پردێك دروستبکەن، کە کەوانەی لەمەی ئێستا کەمتر بێت.

شەوی ڕابردوو و ئەمڕۆش، بارانێکی زۆر باری بەسەرمان دا، بارانەکە هێندە زۆر بوو، کە هەموو گیانمانی تەڕ کردو هیلاکی کردین، لێ کاوانەکە توانی بگاتە شارۆچکەکەو بپەڕێتەوە بۆ ئەو بەری ڕووبارەکە. خەڵکەکە ئامۆژگاریان کردم کە لەگەڵیان بڕۆم، چونکە ئاوی ڕووبارەکە بەهۆی باران بارینی زۆری شەوەوە، ئاستەکەی بەرز دەبێتەوەو خوورەکەشی بەهێزتر دەبێت، بەشێوەیەك کە پەڕینەوە لێی کارێکی ترسێنەر دەبێت.

من هەموو وەختێك گوێگرای ئامۆژگارییەکانی خەڵکیم دەکردو بەپێی بۆچوونەکانی ئەوان دەڕۆیشتم. لێ تەنها ئەمجارەیان بیرم لە کەمێك ئیسراحەت کردەوەو دەمویست بە هێمنیو ئارامی شەو لێرە بخەوم، بەتایبەتی ئێمە چاوەڕوانی باران بارینی زیاترمان دەکرد، لەبەر ئەوە لە ماڵ مامەوەو جلەکانم وشك کردەوە، شمەكو سندوقو هێسترەکانم نارد بۆ ئەو بەری ڕووبارەکەو خۆمو خزمەتکارەکەمو ئەو پیاوەی ئاگاداریی ئەسپەکەم دەکات ماینەوە.

لەو کاتەدا کە ئێمە لە ئاڵتوون کۆپری ماینەوە، جەژن (بیرم) بوو، ئیتر خەڵکی بەو جەژنو ئاهەنگانەی کە خەڵکی ئەم شارۆچکەیە دەیانکرد، کە هەمان ئەو دیمەنانە بوون کە لە شەقامەکانی قاهیرە بینیمن، بەتایبەت ئەو جۆلانانەی کە لێرەو لەوێ دایاننابوون، کە خەڵکی بەبێ گوێدانە تەمەنیان لەناویدا بوون تەنانەت شێخەکانیش بە ڕیشە سپیەکانیانانەوە. هەروەها موبارەزەی بە تێڵام بینی، کە لەنێوان دوو کەس دەکرێتو هەر یەکەیان تێڵایەکی لە دەستدایە.

داوام لە پیاوێك کرد کە ماسولکەکانم بشێلێت، یان

بەشێوەیەکی تر بڵێم بە هەر دوو دەست بهێنێت بە لەشمدا. دیارە ئەم کارە یەکەمجار بۆ پیاوێکی ئەورووپی لەوانەیە ببێتە هۆی دروستکردنی حاڵەتێکی ناخۆش، هیچ تام و چێژم لەم کارە وەرنەگرێت، لێ ئەمە نەریتێکە لە ڕۆژهەڵاتدا باوە، بەش بە حاڵی خۆم، زۆر مورتاح بووم بەم کارە، بەتایبەتی پاش ئەو دوو ڕۆژەی کە بە ڕێگایەوە بووم و زۆر هیلاك کەوتم.
دیارە بۆ کاری شێلان پیاو پێویستی بە چالاکییەکی ئەوتۆ نییە، تەنها ئەوەندە نەبێت بەشێوەیەکی ڕێك لەسەر زەوی پاڵ دەکەویت و کەسێکی تر دێت هەموو جەستەت دەشێلێت و بە هەردوو دەستیی بە هێواشی فشار دەخاتە سەر لەشت، بەشێوەیەك وا دەکات خوێن بە شێوەیەکی ئاسایی سووری تایبەتی خۆی بکات"[٢٢].

*** گەشتی دکتۆر ئیڤز بە کوردستاندا لە ساڵی (١٧٥٨)ی زایینییدا؛**
"دوای دوو کاتژمێر ڕۆیشتن بەرێگەدا ئەو خەندەك و قوللانەیان بینی کە نادر قولی خان (نادرشا)[٢٣] لە کاتی ئابلوقەدانی بەغدا لە سەردەمی ئەحمەد پاشای[٢٤] والی پێشوو دایمەزراندبوو، بۆ ئەوەی تەوقێکی توند بۆ ماوەی حەوت مانگ بە دەوری ئەو شارەدا بسەپێنێ[٢٥]. یازدە قوللە بە وێرانی بینران کە بەخشت دروست کرابوون و لە هەموو لایەکەوە دەلاقەیان هەبووە بۆ ئەوەی سەربازان تفەنگ هاوێژی تێدا بکەن. هەرییەك لەم قوللانە بە ئەندازەی (٥٠٠) یاردە[٢٦] لەوی تر دوور بوو. دوای بەردەوامبوون لە ڕۆیشتن لە سەعات دوو و نیوەی دوای نیوە شەو گەیشتنە گوندی (یەنگیجە) یان گوندی نوێ کە تا ئێستا[٢٧] لە شوێنی خۆی ماوە. ئینجا دوای سەعاتێك ڕۆیشتنی تر بە ناو پەرێزی گەنمدا چوونە (دەوخەڵە) کە تا ئێوارەی ڕۆژی دواتر تیایدا مانەوە". دکتۆر ئیڤز دەڵێ ژمارەیەکی زۆر لە ڕەزو باخ دەوری ئەم دوو گوندەیان دابوو کە لە هەموو وەرزەکاندا سەوزە و میوەیان بۆ بەغدا دابین دەکرد.
لە دەوروبەری حەوتی ئێوارەی ڕۆژی دواتر کاروانەکە بە ئاراستەی ڕۆژهەڵات جوولەی کردو لەسەر ئەم ئاراستەیە بەردەوام بوو بۆ ماوەی سەعات و نیوێك تا گەیشتە چەمێك یان ڕووبارێکی بچووك کە دەڕژێتە دیجلەوە. بەهۆی پردێك کە لەسەری دانرابووو توانییان بپەڕنەوە ئەودیوی ڕووبارەکە کە لەوانەیە ڕووباری خالیس بێت. لێرەوە ئاراستەی گۆڕا بۆ باکوور، لە ڕێگادا بە ڕێکەوت پێشبینی خەڵکێکی زۆریان کرد کە بەرەو بەغدا دەچوون. لەنێو ئەوانە تێبینی کاروانێکی گەورەیان کرد کە لە نزیکەی (٣٠٠) وولاغ پێکدەهات. ئەم وولاغانە کە بریتیبوون لە هێسترو حوشترو کەر، (کا)یان بۆ ئاخورەکانی پاشای بەغدا بارکردبوو.
کاروانەکەی ئیڤز تا سەعات یەکی دوای نیوە شەو لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو ئینجا گەیشتە (خان مصباح) کە کاروانسەرایەك بوو تا ئێوارەی ڕۆژی دواتر تیایدا حەوانەوە. لەو کاروانسەرایە دوو کاروانی بچووکیان بینی لە ئەستەمبوڵەوە بەرەو بەغدا دەهاتن. لەنێوانیان تێبینی چەند سوارێکیان کرد کە لە ڕێگادا لە باکووری موسڵ ڕووت کرابوونەوەو بریندار کرابوون.

قۆناغی دواتر کە کاروانەکەی دکتۆر ئیڤز لە شەوی دواتر تیایدا وەستا کاروانسەرای (سەباح) بوو لە نزیك پردی سەباح. ئەو کاروانسەرایە لە تەنیشت بینایە کۆنەکەی سەر لەنوێ بنیادنرابۆوە. دکتۆر ئیڤز دەڵێ ئەو ئاغایەی لەگەڵیاندا بوو لێرە بۆ شوێنێکی نزیکی بردن و چیرۆکە بەناوبانگەکەی ئەحمەد پاشاو شێرەکەی بۆ گێڕانەوە. گوایا شێرێك بۆ ماوەی سێ ساڵ ترسی لەو ناوە دروست کردبوو خەڵکەکە لێی تۆقابوون، ئەحمەد پاشا کە بۆ سەیران هاتبووە ئێرە، ڕێکەوتی ئەو شێرەی کردو ناچار ڕووبەڕووی بۆوە.
هەرچەندە ئەسپەکەی ژێری لەدەستدا بەڵام توانی بە ڕەمەکەی شێرەکە بکوژێت. ئەمە لە کاتێکدا گەشتنامەی نیپۆرو سەرچاوە عەرەبی و تورکییەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو ڕووداوە لە ناوچەی (عەقەرقۆف)ی نزیك کازمییە ڕوویداوە کە پاشا زۆر جار بۆ ڕاو دەچووە ئەوێ. هەروەها دەڵێن لەو کاتەدا سلێمان ئاغای لەگەڵدابووە کە لە نزیکترین کۆیلەکانی ئەحمەد پاشا بوو. ئەویش هەمان سلێمان پاشای ئەبولەیلەیە کە دواتر بووە والی بەغدا. واتە لەوکاتەی دکتۆر ئیڤز سەردانی بەغدای کرد. ئەوەی زانراوە سلێمان ئاغای کۆیلە یارمەتی ئەحمەد پاشای داوە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو شێرە. لە پاداشتی ئەم کارەش پاشا عادیلە خاتوونی کچە گەورەی خۆی لێ مارەکرد.
دوای هەشت سەعات ڕۆیشتن کاروانەکە گەیشتە دەللی عەباس[٢٨]، لەوێ لەسەر پردێکی بەردین پەڕینەوە کە لە دوو تاق پێکدەهات، ئینجا لە کاروانسەرایەك بارگەیان خست. ئەو ڕۆژەش کە (٢٢)ی حوزەیرانی ساڵی (١٧٥٨) بوو، بە بۆچوونی ئیڤز گەرمترین ڕۆژ بوو. تەنانەت لە گەرمان هیچ خواردنێکی پێ نەخورا. هەروەها دەڵێت لە دوو قۆناغی دوایی ڕێگا کە ڕێکەوتی چەند چالاوێکی چڕی کوللەیان کرد. هەر لە ڕێگادا بەلای چەند ڕێبوارێکدا تێپەڕین لەنێوانیاندا پاشای کەرکوکی بەدبەخت کە سوڵتان لەبەر چەند هۆیەك لێی توورە ببوو. بۆیە بەرەو بەغدا بارگەی تێکنابوو تا سلێمان پاشا ڕەچاوی بکات و شەفاعەتی بۆ بخوازێت.
لە گرنگترین ئەو شتانەی لە بارەی ڕێگای نێوان ئەو مەنزڵە و قەرەتەپە باسی دەکات ئەوەیە کە پیاوانی کاروانەکە چەکیان ئامادەکرد و هۆشدارییان وەرگرت نەوەکو لە کاتی تێپەڕین بە بانی (کەسکەداوەری) تووشی جەردە وڕێگر بن. گەرماش توندی کرد بە جۆرێك دکتۆر ئیڤز دانیشتنی ناو کەژاوەی پەسەند کرد بەسەر سواری هێستر. دوای بڕینی بانەکە بە دەشتێکی کشتوکاڵی بەپیت تێپەڕین کە ڕووباری نارین ئاوی دەدا.
دکتۆر ئیڤز و ڕێبوارەکانی تر بینییان قەرەتەپە شارۆچکەیەکی لادێیی جوانە کە لەسەر بەرزاییەك بەقوڕ بنیادنراوە، بەڵام شەقامەکانی فراوانتر بوو لەو شەقامانەی کە ئیڤز تا ئەو کاتە لەهەر شارۆچکەیەکی تری تورکی بینیبووی.
خەڵکی قەرەتەپە ئەسمەرتر بوون لە دانیشتووانی بەغدا چونکە ناچار بوون لەو کێڵگەو ڕەزانە کاربکەن کە لە دەوروبەریان زۆر بوون[٢٩]. لەگەڵ ئەو هەموو ڕەزو باخە زۆرەش کاروانەکە نەیتوانی هەندێك میوەی بۆ خواردن

دەستبەکەوێ. لەو شتە سەیرانەی لەو گەشتەدا لە بارەی قەرەتەپە باسدەکرێ هەبوونی ژمارەیەکی زۆری باڵندی لەق لەقە، کە بە سەدەهایان لێ دەبینرا لە هەر لایەك لە لایەکانی ئەو شارۆچکەیە. لەسەر خانووەکانو لە ڕەزو سەر دارو دیوارەکان. دیارە ئەو لەق لەقانە هەروەکو ئیڤز دەڵێت هەستیان بە دڵنیایی دەکردو لەوێ نەدەترسێنران. لە هەر هێلانەیەك سێ تا چوار بێچووە لەق لەق هەبوون. گەورەکانیشیان دەنگێکی سەیریان هەبوو لەو دەنووکە کە درێژی دەگاتە (٨– ٩) بۆسە. شاراوەش نییە کە قەرەتەپە تا ئەمڕۆش لەنێو خەڵکدا بە لەق لەق بەنێوبانگە.

لەدوای قەرەتەپە کاروانەکە لە شارۆچکەی ئاسکی کفری بارگەی خست کە دەکەوێتە سەر گردێکی نزمو ژمارەیەك جۆگەی ئاوی سازگار بەدەورووبەردا تێدەپەڕێ. بەڵام لێرەش کاروانەکە هیچ میوەیەکی دەست نەکەوت، هەر لە ئاسکی کفری تێبینی ژمارەیەکی یەکجار زۆری شەمشەمە کوێرە کرا.

ئینجا کاروان بەرەو تووزخورماتوو بەڕێ کەوت، لەرێگادا ڕێکەوتی ژمارەیەکی زۆر کوللەیان کرد بە جۆرێك وولاغەکان لە رۆشتندا بەسەریان دەکەوتن. بەڵام دکتۆر ئیڤز دەڵێ ئەم کوللانە هەرچەندە زۆر بن ناگەن بەوەی کە پێشتر لە مەدغەشقەر بینیبووی. چونکە لەوێ ئەوەندە زۆربوون تەمومژێکیان لەدەوری مرۆڤ دروست دەکرد کە لە دەوری سەد یاردە زیاتر نەبینرێ.

تورخورماتوو لە ژمارەیەك خانووی قوڕی چاك پێکدێت، ڕەزەکانیش بەخشتی قوور بەرێکی پەرژین کراونو برێکی زۆر لە خورماو قەیسیو سێوی دەهێنایەبەر. بەڵام سەختی سەرماو بەستەڵەکی زستانی رابردوو بووە هۆی لەناوبردنی بریکی زۆری تری. لە کاتێکدا لە وەرزی ئاساییدا لێرە ترێیەکی زۆر دێتەبەرو شەرابی نایابی ترێی هەمیشە لێنابرێ. لەبەیانی ڕۆژی دواتر ڕێبواران بینییان ژمارەیەکی زۆر ئافرەتی تورخورماتوو خەریکن بە گۆزە لە چەمەکانی دامەن چیا نزیکەکان ئاو بۆ ماڵەکانیان دەهێنن. هەر لەو ڕۆژەدا دکتۆر ئیڤز سەردانی ئاوچەکەی کرد کە لاوێکی قۆزی تەمەن (٣٠) ساڵەی خزمی پاشای دیار بەکر بوو، هەر لەوێ چاویشی بە سەرکردەی هێزەکانی سەر بە سلێمان پاشا لەو دەڤەرە کەوت. کاتێك ئاغای کاروانەکە لەبارەی ڕێگای کەرکوك پرسیاری لێکردن گوتیان ئەو ڕێگایە مەترسیدارە، چونکە پێش چەند ڕۆژێك کۆچەرە عەرەبەکان هێرشیان کردبووە سەر تەتەری پاشای بەغداو هەشت سواری یاوەری، بۆیە ناچار بوون هێزێکی تایبەت لەگەڵ خۆیان ببەن.

لەگەڵ ئەمەشدا کاروانەکەی ئیڤز بێ مەترسی گەیشتە داقووق، کە بە گوتەی ئیڤز گوندێکی بودەڵەیەو لەسەر گردێك هەڵکەوتووە، خەڵکەکەشی لەسەر پەروەردەکردنی کرمی ئاوریشم (دود القز)و چنینی کوتاڵی ئاوریشم بەرێوەدەچن کە دەیفرۆشنە بازرگانانی بەغداو شارەکانی تر. بەڵام ئەوەی جێی سەرسورمانە ئەوەیە کە ئیڤز هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەو ئارامگەیە ناکات کە ئەمڕۆ بەناوی (ئیمام زەینولعابیدین) ناسراوە، لە کاتێکدا ئێستاو لەمەوبەر داقووق بەو ئارامگەیە ناسراوە. دوای جێهێشتنی ئەو گوندەو تێپەڕین بەلای تازەخورماتوو کاروانەکە لە ڕۆژی (٢٧)ی حوزەیرانی ساڵی (١٧٥٨) گەیشتە کەرکوك.

لە کەرکوك دکتۆر ئیڤزو هاوەڵەکانی لە خانوویەکی نزیك شار دابەزین کە بۆیان ئامادە کرابوو، ئەو خانووە لەوانەیە کەوتبێتە ناوچەی قۆریەی ئێستا چونکە ئەو مەبەستی قەڵای کەرکوکە. ئیڤز دەڵێ ئەو قەڵایە وەك دورگەی لێدێت کاتێك باران دەبارێتو ئاو لە دەوری کۆدەبێتەوە. هەروەها ئاماژە بەو ئابلوقەیە دەکات کە نادرشا (١٥)[٣٠] ساڵ لەمەوبەر سەپاندبوویە بەسەر ئەو شارە بەر لەوەی داگیری بکات، لە کاتێکدا بەرێوە بوو بۆ داگیرکردنی موسڵ. ئەو ئابلوقەیە (٢٤) ڕۆژی خایاندو لەو ماوەیەدا دانیشتووان بێ یارمەتی هیچ هێزێکی سەربازی بەرگریان کرد، چونکە پێنج هەزار کەسیان چەکدار بوو. بۆیە دوای چەند مەرجێك ئینجا شارەکەیان دا بەدەستەوە، ئەوەبوو لە گیانو ماڵیان دڵنیاکران لە بەرامبەر ئەوەی خواردنو ئازووقە بۆ لەشکری ئێران دابین بکەن.

نادر شا سەرەتا پابەندی بەڵێنەکانی بوو، بەڵام کە نەیتوانی موسڵ بگرێت هەرچەندە ئابلوقەیداو شوورەکانی بە توندی بۆردومان کرد، ئەو کاتە گەرایەوە سەر کەرکوكو سەرانەیەکی گەورەی بەسەر دانیشتووانەکەیدا سەپاند. کاتێکیش ئەو لەشکرە تورکییەی بۆ ڕزگار کردنی کەرکوك نێردرابوو لەو شارە نزیکبووەوە، نادرشا لێی کشایەوەو لەگەڵ خۆشی ئەوەندی دەسکەوتو کەلوپەلی دانیشتووان بردبوو کە زێتر بوو لە توانای هەڵگرتنی، ئەمەش سەرباری ئەو کاڵاو ئازوقەیەی کە لەشکرەکەی پێویستی بوو. بۆیە لە شوێنێکی نزیك باشووری کەرکوك برێکی زۆری ئازوقەو دانەوێڵەی عەمبار کردو شاردییەوە. چونکە نەیتوانی لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێو نەشیدەویست بیفەوتێنێ، بەڵام هەموو ئەمانە وەکو پارووییەکی سانا کەوتنە دەست تورکەکان.

لە کاتی ئابلوقەدانی قەڵای کەرکوك نزیکەی (٥٠٠) کەس لە بەرگریکاران کوژرانو خەڵکەکەش توقینو زۆر خراپ تەنگەتاو کران، گۆڕی حوسێن پاشای سەرداری کەرکوکی عوسمانی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی قەڵاکە، ناوبراو لە شەری دەربەند بە گوللەتۆپێکی ئێرانی بریندار بوو، دواتریش بە شمشێری سەربازێکی ئێرانی کوژرا کاتێ بە برینداری بینیبووی. بەڵام نادر شا خۆی سزای ئەو سەربازەی داو فەرمانیدا لە سێدارە بدرێو لاشەی حوسێن پاشاش بنێردرێتە کەرکوك بۆ ئەوەی بە ڕێزەوە لە گۆڕبنرێ. هەموو ئەو ڕووداوانەش پێش داگیر کردنی شارەکە ڕوویاندابوو[٣١].

لەو شتانەی ئیڤز لەکاتی مانەوەی لە کەرکوك باسی دەکات، هاتنی موتەسەللیم[٣٢] و فەرماندەی هێزی یەنیچەری (انکشاری)و سێ لە گەورە ئەفسەرانە بۆ ماڵەکەی. هەروەها دەڵێ ئەو پاشایەی کەرکوك بەرێوەدەبات بەزۆری پاشای خاوەن پلەی دوو تەوغە[٣٣]، ئەو پاشایەش ئەو کاتە لەوێ نەبوو بۆیە موتەسەللیم لە شوێنی ئەو کاروبار بەرێوە دەبات. هەروەها ئیڤز دەڵێ گەورە زانای ئاینی (مەلا)ی شارەکەش سەردانی کردو رایکێشایە ناو گفتوگۆیەکی ئاینی درێژ

سەبارەت بە ئیسلامو مەسیحییەتو بروانەهێنانی فەلەکان (مەسیحییەکان) بە پێغەمبەری ئیسلام محەمەد (د. خ). هەروەها پێ گوتووە کە ئارامگای دانیال پێغەمبەر لە قەڵایە، بۆیە موتەسەللیمو سەرۆکی کاروانەکەو هاوەڵەکانی، هاورێ لەگەڵ دکتۆر نیڤز چوون بۆ سەردانی ئەو ئارامگایەو بینینی شتەکانی ناوی.

کاتێك گەیشتن تیایدا گەڕانو سووڕان، منداڵان لێیان کۆبوونەوە تا ژمارەیان بوو بە (٣٠٠- ٤٠٠) منداڵ. ئینجا دەستیانکرد بە نارەحەتکردنو بەرد تێگرتنیان تا موتەسەللیمو ئاغا لێیان خوڕینەوە. نیڤز دەڵێ درێژی ناوچەی قەڵا دەگاتە نزیکەی (٢٥٠) یاردەو پانییەکەشی نزیکەی (١٢٠) یاردە دەبێ. کەچی بەرزییەکەی تا لوتکەی شوورەکە نزیکەی (٨٠) پێ دەبێت. چونکە هیچ شوێنەوارێکی قوللەو تۆپیان لە قەڵا نەبینی، بۆیە نیڤز باوەڕی وابوو قایمییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شوێنو بەرزییەکەی، بەجۆرێك تەنیا بە بەردو تفەنگ دەتوانرێ بەرگری لێ بکرێ. نیڤزو هاوەڵەکانی دوو دڵ بوون لە چوونە ناو ئەو مزگەوتەی گۆڕی دانیال پێغەمبەری لێبوو، هەرچەندە موتەسەللیمو مەلاشیان لەگەڵدابوو. ئەوان لەوە دەترسان ناخۆشییەکانیان بێتەڕێ، چونکە دەیانزانی موسڵمانان ڕێگەی کەسانی ناموسڵمان نادەن بچنە ناو مزگەوتەکانیان. بەڵام بەرپرسیان تێیانگەیاندن کە ئەو قەدەغەکردنە خەڵکانی وەك ئەوان ناگرێتەوە، چونکە تەنیان فەلەکانی خەڵکی ئەو وڵاتە جێی مەبەستن. ئینجا ناوبراوان چوونە ژوورەوەو دوو گۆڕیان بینی، یەکیان هی دانیال پێغەمبەرو ئەویتر هی ئیشەعیا بوو بەو پێیەی پێیان گوترا. وەك ڕێزلێنانو بەخێرهێنانیش ئیمامی مزگەوتەکە هەندێ گوڵاوی پرژاندە سەر دەموچاو و دەستەسرەکانیان.

نیڤز دەڵێ مەلاکە زۆر هەوڵی لەگەڵ لاوێکی هاوەڵیان دا کە ناوی مستەر پیکۆ بوو بۆ ئەوەی ببێ بە موسڵمان بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

هەروەها باس لە زۆری باڵندی لەق لەق دەکات لە کەرکوك، دوای ئەوەی لە قەرەتەپە لەم بارەیەوە بە درێژی دوا. ئینجا دەڵێ ئەوان هەر لەو کاتەوەی ناوچەی فوراتیان بەجێهێشتبوو گوێبیستی دەنگی باڵندە نەبوون.

بەڵام جێی سەرسامییە کە دەبینین دکتۆر نیڤز لە گەشتنامەکەیدا هیچ ئاماژە بۆ هەبوونی نەوت لە ناوچەی کەرکوك ناکات، جگە لە گوتەیەکی سەرپێی نامەفهوم کە لە کاتێکدا دەیڵێ کە باسی کەرکوك لە گۆڕێدا نیە. ئەمە لە کاتێکدا ژمارەیەك گەڕیدەی تر بەتایبەتی کارستن نیبۆر، بە ڕوونی باسیان لەو لایەنە کردووە. ئەوەتا نیبۆر کە لە ئاداری ساڵی (١٧٦٦)- واتە تەنیا هەشت ساڵ دوای نیڤز- بە ناوچەکەدا تێدەپەڕێت، زانیاری زۆر لە بارەی نەوتی کەرکوك تۆمار دەکاتو دەڵێت: "لە توزخورماتووی نزیك یەنگیجە خوێو قیرو کانی نەوت زۆرن، بەڵام خەڵك بایەخ بە قیری ئەو ناوچەیە نادەن چونکە سەرچاوەکانی ئەو ماددەیە لە (هیت) دا زۆرترە کە دەکەوێتە سەر فوراتو خەڵك لەوێ بە زۆری بۆ ناوپۆشکردنی کەشتییەکانیان بەکاری دەهێنن، کەچی لەو ناوچەیەدا نەوت ڕەواجی هەیە کە لە جۆری ڕەشی ئاساییەو خەڵك وەك سووتەمەنی بۆ چراکانیان لە جیاتی زەیت بەکاری دەهێنن... هەرچی چرای پاشاکانو دەولەمەندەکانی بەغدایە ئەوا لە پەڕۆی کۆنی بە نەوتکراو پێکدێت کە ووشك دەکرێتەوە لە جیاتی چرا بەکار دەهێنرێت. هەر بەو نەوتەش کۆچەرو جووتیارە عەرەبەکان لە سەرەتای بەهار لاشەی حوشترەکانیان سواق دەدەن کاتێك تووکی دەوەرێت بۆ ئەوەی تووکی نوێی بێتەوە. هەروەها زانیم کە لەو ناوچەیە نەوتی سپی هەیەو خەڵك وەك دەرمان بۆ چارەی هەندێ نەخۆشی بەکاری دەهێنن. بە دڵنیاییەوە پێیان گوتم کە ئەگەر ئەو نەوتە بڕژێنرێتە سەری هەر کەسێك ئەوا دەچێتە ناو لەشیو وەك ئارەقە لەپێو پەلی دێتەدەر"[٣٤].

لە (٢٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٧٥٨) کاروانەکەی نیڤز کەرکوکی بەجێهێشتو لەڕێگای هەولێرەوە بەرەو موسڵ هەنگاوی نا. لەبەرەبەیانی ڕۆژی دواتر گەیشتە ئاڵتون کۆپری (پردێ). دکتۆر نیڤز دەڵێ لە کاتژمێر چوارو نیوی بەیانی بەلای گوندێکی خراپووچەکەدا تێپەڕین کە لە دیوی چەپی ڕێگاکەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە پردێکی نوێ. ئەو پردە لە تەنیا تاقێکی بەرز پێکدێتو بەسەر پشتی وڵاغەوە سەرکەوتنی زۆر زەحمەتە. لەم دواییەدا لە کیسەی سلێمان پاشا ئەبولەیلەی والی بەغدا بنیادنراوە. پردە کۆنەکەش بە وێرانی لە نزیك پردە نوێیەکە دەبینرا بەڵام تا ئەو کاتە دوو تاقی بەپێوە مابوو کە (٤٥) پێ لە قووڵایی زێیەکە بەرز بوون. کاروانەکە دوای ئەوەی لە پردەکە پەڕییەوە بۆ ئاڵتون کۆپری چوو. ناوبراو لێرەدا چەند تێبینییەك تۆمار دەکات: لە بارەی پردە کۆنەکە دەڵێ کریستیانە کۆنەکان ئەو پردەیان لەو شوێنە دروستکردووە. لە بارەی زێی بچووکیش دەڵی ئەم زێیە لەناو جەرگەی شاخەکانی کوردستان سەرچاوە دەگرێو دواجار دەڕژێتە ناو دیجلەوە. هەروەها دەڵێ ئەم زێیە ماسی نایابی تێدایە کە کێشی هەندێکیان دەگاتە (٢٠٠) ڕەتل. گومان لەوەدانیە کە نیڤز لێرە مەبەستی ماسی (البز)ە کە جۆرێکی ناسراوەو قەبارەی گەورە دەبێتو هەتا ئێستاش لەم زێیەدا زۆرە. لەڕێگای هاتنیان بۆ ئاڵتون کۆپری نیڤز باس لەوە دەکات کە گوللە تۆپێکی بەردینی گەورەیان بینیو پێیان گوتن ئەوە یەکێکە لەو گوللەتۆپانەی کە تۆپەکانی نادرشا لە کاتی هێرشەکەیان بۆ ئەو ناوچەیە بەکاریان هێناوە. هەروەها ئاماژە بەوە دەکات ئەو گوندە بە ناوبانگە (واتە: ئاڵتون کۆپری) لە ڕووی ئابوورییەوە پشت بەو کاروانانە دەبەستی کە بەلایدا تێدەپەڕن. لە پاڵ ئەو بەروبوومە کشتوکاڵییانەی کە بەرهەمی دێنێت. بە تایبەتی شفتی نایابو گندۆرە بەنێوبانگە. ئینجا دەڵێ لوتکەو ناوچە شاخاوییەکانی نزیك ئێرە، زۆر جار دەبنە پەناگەی ئەو جەردەو ڕێگرانەی هێرش دەکەنە سەر کاروانو ڕێبواری بێ چەكو ئەوانەی توانای بەرگرییان نیە.

لە کاتژمێر (٧)ی ئێوارە کاروان لە ئاڵتون کۆپری کەوتەڕێ بەرەو هەولێر، لە ڕێگادا پاسەوانان ناوبەناو تەقەیان دەکرد بۆ ترساندنو دوورخستنەوەی جەردەو ڕێگران. ئەمە کارێك بوو هەموو کاروانەکان دەیانکرد. لە (١)ی دوای نیوەشەو

گەیشتنە (یەنی خان) واتە کاروانسەری نوێ، بەڵام لە ڕۆیشتن بەردەوان بوون تا لە کاتژمێر (٥)ی بەرەبەیان لە دوورەوە هەولێر بەدیار کەوت.

یەکەم سەرنجی ئیڤز لە بارەی هەولێر ئەوەیە کە لەوانەیە ئەو شارە پاشماوەی (ئەربێللا)ی کۆن بێت کە لە دەوروبەریدا دارای شای فارس لەبەرامبەر ئەسکەندەری مەکدۆنی شکستی خواردو لەنیوەی شەودا دوای کۆتایی هاتنی شەری گۆگامیبا (گۆگمێللا) پاشەکشەی کرد بۆ ئەوێ، بەڵام مانەوەی دارا لە ئەربێللا درێژەی نەکێشا، چونکە بەرەو وولاتی ماد چوو بە مەبەستی کۆکردنەوەی هێزی شەرکەری نوێ بۆ لەشکرەکەی. ڕاستەوخۆ دوای ڕۆیشتنی دارا ئەسکەندەر دەستی بەسەر هەولێردا گرت و برێکی زۆر کەلوپەلی شای ئێرانی تێدا دۆزییەوە، سەرباری ئازووقەی لەشکری ئێرانیو (٤٠٠) تالنت لەوەی کە دارا پێش شەرەکە لەوێی دانابوو. یەك تالنتیش بە گوێرەی فەرهەنگەکان یەك کێش (بە عەرەبی: وەزنە) زیوە کە ئەویش دەکاتە (٣٤٠) پاوەندی ئیستەرلینی، یان یەك کێش زێر کە بەرامبەری نزیکەی (١٠) هەزار پاوەندە.

سەبارەت بە قەڵای هەولێریش ئیڤز دەڵێ وەك قەڵای کەرکوك لەسەر گردێکی دەستکردی بەرزی شێوە بازنەیی دروستکراوە کە چوونە ناوی سەختە. گوندەکەی نزیك قەڵا- مەبەستی ئاوەدانی دامێنی قەڵایە- هەرچەندە تەنیا گوندێکی بوودەڵەیە، کەچی بە ئاشکرا گەواهی ئەوە دەدات کە لە شوێنی شارێکی گەورەی سەردەمانی پێشوو. ئەویش بە تێبینی کردنی فراوانی گۆڕستانە کۆنەکەو هەندێك کەلاوە کە تا ئەو کاتە لەوێ مابوون[٣٥]. ناوبراو قەڵای هەولێر بە (٢٠) پێ بەرزتر لە قەڵای کەرکوك دەقەبڵێنێ. هەروەها دەڵێ ئەو شارەش کەوتە بەر شاڵاوی نادرشاو دوای گەمارۆدانێك کە لە (٥- ٦) ڕۆژ تێنەپەری دەستی بەسەر داگیرا. ئینجا دەڵێ ئاوەدانییەکەی خوار قەڵا لەلای باشووری ڕۆژئاوای بوو. سەرباری ئەمانە لە بارەی هەولێر باسی ئەوە دەکات کە ڕێبوارانی کاروانەکە توانییان لەوێ برێکی تەواو نانی باش و هێلکەو شیریان دەستبکەوێ، لەگەڵ مەڕێك و هەندێك سێوە سوورە.

*** گەشتی تاها کوردی بالیسانی:**

"ئاوا باسی گەشتی خۆی دەکات لە کەرکوکدا:

"دوای دە ساڵ کارکردنم بەدوای زانست لە بوارەکانی (الفقه، الصرف، النحو)، هەروەها لە شیعرو نووسینیش، لەسەر دەستی زانای شێخی مورشید بەدرەدین کوری مەلا عیسا، ئەوەی کە مەبەستمە لەو مامۆستایە (مەلا عیسا) یە، خانووەکەی لە قەڵا بوو، ئەویش زاوای شێخ ئەحمەد عەباسە خوا دەست بە باڵایەوە بگرێت، کە تەمەنی گەیشتە هەشتا ساڵ کورەکەی زانای بەناوبانگ (مەلا ئەحمەد) کە جێگری دادوەری کەرکوك بوو، لەو بەروارەی کە باسم کرد (ساڵی ١٧٨٨ی زایینی – ١٢٠٣ی کۆچی) لە هەموو بوارەکان پێگەیشتبوو کەس نەدەگەییە ئاستی زانیارییەکانی، بەڵام کوری دووەمی برای مەلا ئەحمەد کە گەورەترە لە مەلا عومەر، بەڵام لەرووی زانست و خوێندنەوە لەو گەورەتربوو.

لەباسی کەرکوکدا دەڵێت:

"کاتێك بەرەو وڵاتی کوردان ڕۆیشتین، گەیشتینە قەڵای کەرکوك". بەوە دەچێت تاها کوردی لەوە پێشتر لە ساڵی (١٧٧٢) هاتبێتە کەرکوك و چەند هەفتەیەك مابێتەوە"[٣٦].

*** گەشتنامەی ژاك ڕیتۆری، مسیۆنێرێك بۆ ناوچەکانی کەرکوك و سلێمانی لە ساڵی ١٨٧٨:**

"یەکێکە لە گەرۆکە فەرەنسییەکان کە سەردانی ڕۆژهەڵاتیان کردووە بە تایبەتی کوردستان، کەرکوکیش یەکێکە لەو ناوچانەی یاداشتی خۆی تێدا نووسیووەتەوە.

ژاك ڕیتۆری لە (٢١)ی ئابی ساڵی (١٨٤١)ی زایینی لە ئەسقەفیەی (Boyges) لە (شاریتی- سوغ- لوار) لە فەرەنسا لەدایکبووە، لە نۆزدە ساڵیدا چووەتە ناو ڕاهیبەکانی (سانت، ماکسیمین). لە (١٩)ی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٨٦١) بووە بە دۆمینیکانی توولوز.

لە ساڵی (١٨٦٥) کراوە بەسەر دەستەی ڕاهیبەکان لە دێرەی (مازییەر)، لە ساڵی (١٨٧٤) بە هاوەڵی لیۆن، نوێنەری پاپا، دەچێتە میزۆپۆتامیاو لە (١١) ئاب دەگەنە میزۆپۆتامیا. سەرەتا وەکوو قەشە لە نشینگەی (مار یەعقوب) لە کوردستاندا جێینشن دەبێت، تاکو ساڵی (١٨٧٩) هەر لە مار یەعقووب دەمێنێتەوە. باوکە (ژاك ڕیتۆری) ماوەی چل ساڵ لە ناو ئاسوورییەکانی کوردستان کار دەکات و بە هەمان شێوە ئەرمەنی و کوردەکانیش بەشێکیان لە ناو کارەکانیدا هەیە.

ساڵی (١٨٧٩) بانگ دەکرێ بۆ مووسڵ لە ئامادە نەبوونی باوکە (دوڤال)، ئەرکی تەواوی مسیۆنی فەرەنسی بەڕێوە دەبات، ئەوە هەر لەو ساڵدا بوو کە گەشتەکەی لە مووسڵەوە بۆ ناوچەکانی هەولێرو کەرکوك و سلێمانی لە (١٧)ی حوزەیراندا دەست پێ کردو ڕۆژی (١٧)ی ئاب گەڕایەوە مووسڵ.

(ژاك ڕیتۆری) لە دوای خۆی کۆمەڵێك بەرهەمی ڕەسەنی بەجێ هێشتووە کە بەمە خزمەتێکی زۆری زانست و زانیاری کردووە بە تایبەتی لە ناوچەکانی کوردستان.

".. دوای پێنج ڕۆژ، لە سایەی چاکەی قەشە ئەلیاس کە میوانداریی کردم تەواو حەسابوومەوە، بەوەی کە هیچ شتێکم نەبوو لە ناو ئەم خەڵکەی کە پێیشوازییان لێ نەکردم، تەنها ئەوەم لە سەر مابوو ڕێگەکەم بگرمە بەر. کاتی مانەوەم لە عەنکاوە، دوو کاروان لە دەوروبەری رووت کرانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا متمانەم کردووە بە عینایەی خوداییی دوودڵ نەبووم لە وەی خۆم لەگەڵ کاروانێك بدەم کە بۆ کەرکوك بچێ.

ئێوارەی (٢٤)ی حوزەیران بوو، دوای سێزدە کاتژمێر ڕۆیشتن گەیشتینە (ئاڵتوون کۆپری- پردی زێرین)، ئاواییەکی موسڵمان، کە بەم شێوەیە بە هۆی پردێکی کەوناری زۆر جوان دروستکراو ئاوا ناویان ناوە، بەڵام ئەمڕۆ زۆری تێکچووە.

ئەم پردە کەوتۆتە ئەم شوێنە لەسەر ڕووبارێك کە پێی دەڵێن زێی بچووك. لەوێ ماسی فرە گەورە ڕاو دەکەن کە

لە مووسڵ پێی دەڵێن ماسی (تۆبی). تێ دەگەم ماسییە تۆبییە بچووکەکان زارەتك بووبوون، چونکە گەورەییەکەی بەقەد باری کەرێك دەبوو، من خۆم یەکێکم بینی لە تەنکەی رووبارەکە دا بوو. لەسەرەتا بەقەدی درەختێك کە بە رێککەوت لەو ناوەدا کەوتبوو، هەڵمگرتەوە.

لە ئاڵتوون کۆپری بە دە کاتژمێر گەیشتینە کەرکوك، رێگەم بدەن با رووداوێکی جێنشینی بوونی خۆمتان لەم شارەدا بۆ بگێرمەوە. کاتژمێر دووی بەیانی بوو وەختایەك چوومە ناو شارەکە. بەم سات و وەختە، چۆن نەمدەویست (مەتران)، کە دەبوو لای ئەو بمێنمەوە، جارسی بکەم، چووم لە دەرگای خانێکم دا، رەتیان کردەوە دەرگام لێ بکەنەوە.

چووم بۆ لای خانێکی دیکە، هەمان وەڵام. خۆم ئامادەکرد لە سەر تەختەبەندێك کە لە ناو کۆڵانەکە بەجێ هێڵدرابوو لێ خەوتم. وەختایەك بینیم خاوەنەکەی هات و لەسەر تەختەبەندەکە دەریکردم. بۆ ئەوەی کەس جارس نەکەم و بە ئسیراحەتی خۆم پاڵ بدەمەوە، چونکە لەو دوو قۆناغە بە زۆرەی کە لە عەنکاوەوە بڕیبوومان، زۆر شەکەت بووبووم، بۆیە قالیەکەم لە سووچێکی کۆڵانەکەدا راخست و دەمو دەست لێی راکشام. وەك کەسێکی زۆر بەختیار نووستبووم، وەختایەك زوو رەوە حوشترێك بە ناو ئەو کۆڵانەی کەمنی تێدا خەوتبووم، رەت بوون، فراوانی ئەم ئاژەڵە بەرەو رووی ماڵەکەم بوونەوەو ناچاریان کردم لەوێش هەڵبکەنرێم.

ئەو کاتە هەستم کرد دوو کەفییە کە لە رێگە سەرم پێ بەستووەتەوە، وون بوون و بۆم دەرکەوت دوو ژاندارمە کە منیان لە ئاڵتوون کۆپرییەوە لەگەڵ خۆیاندا هێنا، بکەری ئەم دزییە بوون کەوایە دروود بۆ سوڵتان بۆ ئەم بیرۆکە شیاوەی کە هەر ئێستە بۆ بریاری جەسوورانەی بۆ ریفۆرمی ژاندرمەی ئیمپراتۆریاکەی، تەنها بە پیاوی سەرراست ببەخشن، کە گەشتیاری گوناهە پێزانینی خۆیان پێ دەبەخشن، چونکە ژاندرمەی ئێستا دزی هەرە ترسناکن.

رۆژەکانی هەوەڵ رۆژ بەختم خراپ بوو، بەڵام دواتر بە زیادەوە تۆڵەم بۆ کرایەوە. بە موحیبەتێکی تەواو باوکانە لەلایەن پیرە مەتران، جەنابی عالی یۆحەنا و مەسیحییەکانی دیکەی وەك ئەو بە چاکترین شێوە پێشوازییان لێکردم. لەوێ جیهانێکی مەسیحی هەرە بەهێزی خودا پەرستیم بینی، رۆحانییەتی یەکگرتوویی، حەماسە بۆ پراتیکیکردنی ئاینی، رێزگرتن و گوێرایەڵی بۆ مەترانی پیرۆز. جیاوازخوازی بە شوێن ئەوەدا گەراوە ئەوانیش دابەش بکات، بەڵام لە بەرامبەر سادەیی ئاینیی ئەم خەڵکە میهرەبانە مەسیحییە و ووریایی قەشەکەیاندا سەرنەکەوتووە. باوەری ئایینی مەسیحییەکانی کەرکوك بەرەو دوا لە راگرتنی کڵێسەکەیاندا بوو کە وێرای هەژاری کڵێسەکە، کەچی پاك و تەمیزو لێزانانە رازاندبۆوە، جاران تاجی زێرو زیو کە بە نەزر پێیان درابوو، دیکۆری سەری مریەم وپیرۆزەکانی رازاندبۆوە، بەڵام ئەم دەوڵەمەندییانە هەمیشە جێگەی مەترسییە لە کڵێسەی مەسیحییەکان. ساڵێك دەبێت، لە شەوێکدا، هەموویان بە کاسەکانەوە، بە جلوبەرگی قەشەو شتە گرانبەهایەکانی دیکەشەوە دزران.

کۆمیونیتەی مەسیحییەکانی کەرکوك لە ناو شارەکەدا پەنجا ماڵێك و لە دەوروبەری (قۆرییە)ش بیست بنەماڵەیەك دەبن. ئەم گرۆ بچکۆلانەیە لەو ناو دەوروبەرێکی سی هەزار کەسیدا وون بووە. لەم ژمارەیە، کۆمیونیتەی جوولەکە نزیکەی دوو سەد ماڵ دەبێت، ئەوانەی دیکە موسڵمانن. بەڵام ئێمە شادمانین کە دەبینین وێرای هەمە چەشنەیی ئاینییەکان، خەڵکەکە لە هارمۆنییەکی باش پێکەوە دەژین. موسڵمانەکان هەروەکو مەسیحییەکان بە قەشە دەڵێن وەستا، واتا سەردار، پیرەمەتران بەگشتی رێز لێگیراوە. من ئەوە تەواو سەراسیمەی کردم کە بینیم هاوسێ موسڵمانەکان وەك باوکێك مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و بە هەموو بروایەکیانەوە جیاوازییەکانیان خستووەتە خزمەتی بریاری ئەو.

بێجگە لە مەتران، دوو قەشە مەسیحییەکانی شارەکە وییەکێکیش مەسیحییەکانی دەوروبەری (قۆرییە) بەرێوە دەبەن. لە ناوشاردا قوتابخانەیەکی کوران هەیە کە لەلایەن مسیۆنی بشیرییەوە پشتیوانی دەکرێ و منداڵەکان تێیدا فێری نوێژ، عەقیدەی مەسیحیایەتی، خوێندنەوەو نووسینی کلدانی دەکرێن. ئەمە بۆ شارێکی وەك کەرکوك شتێکی بنچینەییەو ئەوەی بە تایبەتی جێگەی تووڕەییە ئەوەیە کە بۆ خوێندنەوەو نووسینی تورکی کە زمانی هاوبەشی تەواوی دانیشتووانی شارەکەیە، منداڵەکان ناچارن بچن لە لای مەلایەکان لە مزگەوت دەرس بخوێنن، هەرچی کچەکانیش، لە ناو نەزانییەکی تەواودا بەجێ هێڵدراون.

چەندە ئەم مەسیحییە چاکانەی کەرکوك لێمان پارانەوە بۆ ئەوەی بایەخیان پێ بدەین بۆ رێنوێنکردنی منداڵەکانیان بۆ پرۆژەی دیکە کە وا پێ دەچێت بۆیان بە سوودبێت. دەبێت لە ناو ئەوانەدا فۆنداسیۆنێکی سیۆنێری و خوشکان دابمەزرێ بەڵام ئەوەندە ناوچەی دیکەی گرینگ داوای ئالێکاری ئێمە دەکات و ئێمەش ئەوەندە کارمەندمان کەمە بۆ ئەو شوێنە بەربلاوەی کە پێمان سپێردراوە.

کەرکوك لە سالنامە مەسیحییەکانی یەکەم سەدەی مەسیحیایەتیدا بەناوبانگە. هەزاران شەهید خوێنی خۆیان رشتووە بۆ ئاین لە ژێر چەوساندنەوەی فارسەکان. ئەمرۆ ئێستاکەش لە گەڵدابێت کەرکوك، شاری کڵێسەی (مار، تامزگار)، کە لە سایەی دەورانی کۆنسێیەنتێن دا دروست کراوە، بەگوێرەی گێرانەوەکان بەشێکی ئێسك و پرووسکە گرانبەهایەکانی پاراستووە.

جگە لەو پاشماوە پیرۆزە، کەرکوك شتی پیرۆزتری بە هەمان شێوە گرانبەهای لە خۆگرتووە، ئەگەر بروا بە گێرانەوەکانی وڵاتەکە بکەین. ئەوانە بریتین لە جەستەی سێ گەنجەکە کە فرێ دراونەتە ناو توون: ئەنانی، ئازەری و میزایل ئەم ئێسك و پرووسکانە لە ناو مزگەوتێکدا نێژراون کە موسڵمانەکان و جوولەکەکان یەکجار لە ساڵێکدا زیارەتیان دەکەن.

کەرکوك، بە هەمان شێوەی ئەربیل، لەسەر گردێکی ئاشووری بنیات نراوە، لەوەو پێش شارەکە دابەشی سەر قەڵا یان بەرزە شار و نزمە شار بووە، زۆربەی ناو رێگەی پێ داون باخچەی گەلێك جوان دروست بکەن کە هەموو درەختە گەرمەکانی تێدابێت: دار پرتەقاڵ، دار هەنار، لیمۆ، دار خورما، لەگەڵ

گوڵاو بۆنە ئاوێك بەکاردەهێنن کە عادەت وایە بەسەر جلو بەرگی ئەو کەسانەیدا دەپرژێنن کە هاتوون سەردانیان بکەن. وێرای ئەوەی لەوەی بەغدا کەمتر چالاکترە، دارخورما دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە بەشێوەیەك لە هەموو ماڵێکی نزمە شاردا دەبینن سەری شکۆی بەرزکردووەتەوەو بە هێشووی گەورە تێکەڵی منارەو گومەزەی مزگەوتەکان دەبێت، ئەوەی کە دیمەنێکی دڵڕفێن‌و ڕەنگێکی تەواو ڕۆژهەڵاتییانەی بە شارەکە بەخشیووە.

شارەکە وا پێ دەچێت لەسەر زەوییەکی بورکاناوی دروست کرابێت لە دەرەوەی شوورەکانی شارەکە، لە نزیك ئەو گردانەی کە لە نزیك شارەکەن، بە شەقاری زەوییەکەدا، لە زۆر جێگەدا ئاگرێکی شیناوی لێ بەرز دەبێتەوە کە بە زمانی بازاڕی پێی دەڵێن (بابە گوڕ گوڕ). لە یەك کاتژمێری شارەکە، لەسەر ڕێگەی ئاڵتوون کۆپری، سەرچاوەکانی نەوتی لێیە، کە گەلێك زۆرەو لە کۆندا لەلایەن ئیککزینۆفۆنەوە ناوی براوە. ئەم نەوتانە هەر بە دەرنەکراوی ماونەتەوە. لە ناوەڕاستی ئەم چاوگە نەوتانەدا جۆگەلە ئاوێکی ڕوونی هەڵدەقووڵێ کە ئاژەلەکان بە تێر نەخۆری ئاوی لێ دەخۆنەوەو بە گوێرەی ئەو تێبینیانەی وا ئێمە کردمان، ئاوەکە زوو قەڵەویان دەکات. هاوشارییەکان لایان وایە ئەم ئاوە چارەسەرێکی چاکە بۆ برێك نەخۆشی پێست.

ماوەی پانزە ڕۆژی مانەوەم، بە پیاو چاکیی پێشوازیکردنی مەسیحییەکانی کەرکوك خۆشنوودە بووم، کە ئەگەر بە ویستی خۆم بوایە هەر لەوێ دەمامەوە، بەڵام شوێنی دیکەی کڵێسەی خودای بانگەوازیان لێ دەکردم. نەمزانی چۆن چاکەی ئەو پێشوازییە بەخشندانەیە بدەمەوە کە لێیان کردم. (٩)ی تەمووز ماڵئاواییم لە شاری ئازیزی کەرکوك کردو لەگەڵ کاروانێکدا کە بۆ سلێمانی دەچوو بەڕێککەوتم دەبوو بەناو هۆزی گەورەی هەمەوەندەکاندا تێپەڕین. کە هەموو دەم بە ڕاو ڕووت ناسراون. بە گوێرەی ئەوەی بیستبووم‌و بۆمیان گێڕابووە، دەبوو بڕیار بدەم ئەگەر بمەوێ تەواو دڵنیابم لەکاتی سەفەرەکەی مندا، هەمەوەندەکان جورئەتی ئەوەیان کردبوو تەتەری ئینگلیزیی (تاران)یان گرتبوو.

دوای ئەوەی ژمارەیەك لە پیاوەکانی پاسەوانییەکە بریندار دەکەن، دەست بەسەر پارەکەدا دەگرن. دەمو دەست سەدان سەرباز لە کەرکوکەوە بۆ سەر چەمچەماڵ، ناوەندی ئیدارەی هۆزەکە دەنێردرێ. لە سایەی بوونی ئەم لەشکرەدا، کاروانەکەی ئێمە هیوا خوازبوو بە سەلامەتی بتوانێ تێپەڕبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، من بە چاوی خۆم بینیووم ئەو ڕۆژەی بە چەمچەماڵ دا تێپەڕبووم، هەمەوەندەکان هێندە زۆر بە بوونی ئەمنەرەکان سەغڵەت نەدەبوون. ئەو ڕۆژەیان، ئاغای هۆزەکە ئاهەنگی زەماوەندی ژنی نوێی دەگێڕا بۆ شەرافەتمەنکردنی ئاغا، دوو یا سێسەد سوارە لە هەموو لایەکی هۆزەکەوە هاتبوونە چەمچەماڵ"[٣٧].

*** سەفەرنامەی جاکسۆن بۆ باشووری کوردستان لە ساڵی (١٧٩٧):**

"جاکسۆنی گەڕیدە یەکێك لەو گەڕیدە ئینگلیزانەو هاتۆتە عێراق‌و دواتر لەوێوە چۆتە باکووری کوردستان، لە نێوەندی گەشتەکەیدا خستوییەتییە ڕوو، هەر لەبەسراوە تا دیار بەکرو نسیبین، ئەوەی بە چاوی خۆی بینووە باسی لێوە کردووە، لە هەندێك شوێندا باس لە پۆشاك‌و جلوبەگ وئەو چەکانە دەکات، کە ئەو کات باو بووە، هاوکات لە باشووری عێراقدا باسی زۆر شتی کردووە، کە جێگەی سەرنج بێ.

.. لە کاتژمێر یەك گەیشتینە شارۆچکەیەك کە پێی دەڵێن (قەرەتەپە) لەوێشدا ڕێبەرو خزمەتکارەکەی ئێمەیان بەجێ هێشت، کە لە بەغداوە لە گەڵمان هاتبوون، بەڵام هەتا ئەو کاتەش تورك‌و خزمەتکارەکەی یاوەرمان بوون، دووبارە دەستمان بە بەردەوام بوون کرد، بەڵام ئەمجارەیان بە ئەسپی دیکە، کاتێك کە قەرەتەپەمان بەجێ هێشت لە زۆر شوێندا ڕێگە سەخت‌و ناخۆش بوو، وەك ئاساییە دەبێ یەکێك لە خزمەتکارەکان بەسواری ئەسپەکانیانەوە وئەسپێکی دیکەیان لە تەك بێ واتە دوو ئەسپ، لەو کاتەدا یەکێك لە خزمەتکارەکان لە ئەسپەکەی من نزیك بۆوە ودەیویست بە قامچی لە ئەسپەکەم بدات، بەڵام من پێم باش نەبوو یەکێکی دیکە ئازاری ئەسپەکەم بدات، بەڵام من سوڕامەوە قامچییەکم لە خزمەتکارەکە دا، ئەمە هەڵەیەك بوو لەمنەوە هاتە ئارا، بەڵام دواتر ئەمە وایکرد خزمەتکارەکان بەقامچی لە ئەسپی کەس نەدەن، لە ڕێگەدا گەلێك ڕەشماڵمان بینی کە هەموویان بۆ ئەوە لەوێ بوون تا چەند قروشێك لە گەشتیاران وگەڕیدەکان وەربگرن. لە کاتژمێر دوو ونیوی شەو گەیشتینە (کۆپری) پاش ئەوەی زێی نارینمان بڕی، ئەمەش بەهۆی پردێك کە لەسەر زێیەکەدا بوو و بەبەرد هەڵچێندرابوو، پاش پشوویەك دووبارە لە کاتژمێر چواری بەیانی دەستمان بەسەفەرەکەمان کردەوە لەوێدا بەنێو خاکێکی ڕووتدا تێپەڕین کە ئاسەواری هیچ کشتوکاڵێکی تیا نەبووە، دواتر سوڕاینەوە بەتەنیشت ئەو زنجیرە گردەلۆکانە تێدەپەڕین کە بەلای ڕۆژهەڵاتەوەیە، ئێمە هەمیشە ئاگاداری ئەوە بووین لە ڕێگەدا ڕووبەڕووی هیچ ڕووداوێك نەبینەوە، لەگەڵ ئەوەی لە زۆر شوێندا ڕێگە زۆر باش بوو بۆ ڕۆیشتن، هاوکات لە کاتژمێر شەش‌و نیو گەیشتینە (توزخورماتوو)، لەوێشدا پێمان باش بوو پشوویەك بدەین.

شاری توزخورماتوو دەکەوێتە باکووری شاخەکانەوە و ئاودێرییەکی زۆر باشی هەیە کە لە شاخەکانەوە چەندین کانی‌و کەناڵ‌و جۆگە ئاوڕێژی دەکا، هاوکات ئەو شارە دەڕوانێتە دۆڵێکی فراوان کە تاوەکو باشوور دەڕوا، لە کاتی زستاندا گیایەکی زۆری لێیە، دەتوانین بڵێن تا ئێستا پاشماوەی وەرزی زستانی بەسەرەوە دیارە، لەگەڵ ئەوەی لەو وەرزەدا تیشکی ڕۆژ لەوێدا زۆر بەهێزە، بەهۆی توندی ئەو گەرمایەش زۆربەی کێڵگەو کشتوکاڵەکان لەناو دەچن، کە لەنزیك ئاوو ئاوەڕۆکاندایە کە ئاوەکەی لە چیایەوە دەڕژێتە ناوی، هاوکات لەوێدا مێگەلی مەڕو ماڵاتێکی

زۆرمان بینی، وەك دیاریشە ئێواران ئەو مێگەلانە دەگەڕێنەوە لە ترسی ئەوەی نەوەك ئاژەڵە درندەکان ڕووبەڕوویان ببنەوە، لەلایەکی بەدرێژایی ئەو دۆڵە کە زیاتر لە پازدە میلە شوێنەواری نیشتەجێ بوونی دانیشتووانمان نەبینی، لەو شوێنەی کە لێی دابەزین خەڵکەکەی زۆر ڕێك و پێك و باش بوون، لەلایەکی دیکەوە ئەوی سەیر بوو لەوێدا ئەگەر یەکێك لە خزمەتکارەکان شتێکی پشکوێ خست ئەوا ڕێبەرەکەمان پێی ئاسایی بوو بەقامچی لە خزمەتکارەکە بدات. لەوێدا گۆشتی مامزو مریشك خۆشترین خواردنە، هەروا نانیان لە شێوەی پارچە پارچە دەجوو، لەگەڵ ئەوەشدا خواردنی من تەنها نان و ماست بوو، هەروا گۆشتی بەرخ زۆر خۆش بوو، هەردەم پێشکەشی بێگانەیان دەکردو بۆ خۆیان زۆربەی دونەگ وبەزیان دەخوارد، لە کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ توزخورماتوومان بەجێ هێشت و هەموو گوندەکانی سەر ڕێگە وشك وبرینگ بوون، تا ئەو کاتەی گەیشتینە شارێك کە پێی دەڵێن (تاووق)، هاوکات لە کاتژمێر شەش و نیو گەیشتینە تاووق، تاووق دەکەوێتە باکووری دۆڵێکی فراوان لە هەموو لایەکی زنجیرەیەك چیای لەدەورە کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا دەکشێ، لەلایەکی دیکەوە کاتژمێر هەشتدا لە تاووقەوە تا شاری (تبللی) لەیلان چوار میلمان بڕی، ئەویش لە هەمان دۆڵدایەو لە چیاوە ئاو و کانییەکانی دەڕژێتە ئەو ناوچەیە، لەو شارە نەوەستاین وبەڵکو بەردەوام بووین وچوار میلی دیکەمان بڕی، بەڵام ڕێگە زۆر سەخت و ناخۆش بوو لە هەندێ کاتدا، لەو شەوە تاریکانە هەموو کات بۆ چوونم وابوو کە دوژمنەکان لە ڕێگەدان، چونکە ڕێگەکە زۆر ترسناك بوو، بۆیە لێ نەدەگەڕام ڕێبەرەکەمان بە خێرایی بڕوا، هاوکات لە کاتی ڕۆژدا پێم ئاسایی بوو زۆر بەخێرایی بڕۆین، هاوکات ئەوەی زانراوە تەتەرییەکان لە هاژووتن و سواربوونی ئەسپ زۆر کاران وگوێیان نەدەدا تا ئەو کاتەی ئاژەڵەکان دەمردن، ئەوە جگە لەوەی ئەسپەکانی ئەم وڵاتە زۆر باشترن لە ئەسپەکانی ئەورووپا، چونکە ئەسپەکانی ئێرە زۆر بەکەمی ماندوو دەبن، هەروا ئەوانە سواری ئەسپ دەبن زۆر بەکەمی لە کەوتن لە سەر ئەو ئەسپانە دەترسن، چونکە ئەو جلوبەرگانەی پۆشیویانە دەیانپارێزێ، ئەسپەکانیش لەسەرەوە سەرجێك هەیە ولە ژێر پێیانەوەش ناڵ هەیە، کە بریتییە لە پارچەیەك ئاسن بەدرێژی بن پێ.

زۆر بە سانایی تا کاتژمێر دووی ڕۆژی دووشەممەی بەرواری بیست و چواری تەمموز هەنگاومان نا، لەوێشدا گەیشتینە شاری کەرکوك، ئەو شارەش دەکەوێتە هەمان دۆڵ کە پێشتر باسمان کرد، کە لەلای ڕاستەوە بەسەر زنجیرەیەك دەکەوێ، هاوکات لەسەر چەند بەرزاییەك چەندین بیری نەوتمان بینی، ئەو شوێنەش ئێستا پێی دەڵێن (باباگور گور)، هەر بیرێکیش سێ پێ قووڵ بوو و نەوت لەوێدا گەلێك زۆرەو ئەمەو نەوت لەشلەیەك پێك دێ کە بۆنەکەی زۆر ناخۆشە، هەروا لە سەر ئەو بیرانە چەندین بەردی گەورەمان بینی، پارچەیەك خۆی بوو.

دواتر خۆمان لە نێوەندی چەندین گردەلۆکە وشاخدا دۆزییەوە کە بەهۆی ئاوەوە شێوەیەکی جوانی بەخۆیەوە گرتبوو وەك سەدەف و بەردی ڕەنگاو ڕەنگ، هاوکات دوای هەنگاونانمان چووینە نێوەندی دۆڵێکی پان و بەرین، ئێمە ئەو دۆڵەمان بەگەورترین فریاکەوتن لە قەڵەم دا، چونکە بەسەرکەوتنی گرد وشاخەکان لە هەندێك ڕووبەڕووی ناخۆشی دەکردینەوە، لەوێدا ئەسپەکانمان نەیان دەتوانی جێی پێی خۆی بکاتەوە، لە هەندێك شوێنیشدا ئەو گرد وشاخانانە وەك گیای وشك بوو، بەڵام دیمەنێکی دەگمەن بوو لە جوانی، کە لە ماوەی چاودا درێژ بوو بۆوە لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا، ئەوەی دەردەکەوێ ئەم زنجیرە گردلۆك وشاخانە دیوارێکی سروشتی پێکهێنابوو، ئەوە جگە لەوەی پاشماوەی دیوارێك لەو ناوچەیەدا بەدەردەکەوت، پاش ئەوەی گەیشتینە دۆڵەکە وزۆربەی ڕێگەکەمان بڕی گەیشتینە (ئاڵتون کۆپری- پردێ)، کاتێك گەیشتینە ئاڵتون کۆپری بینمان شارۆچکەیەکی گەورەیە ودانیشتووانێکی زۆری تیادا نیشتەجێیە، ئەم شارەش لەسەر دوورگەیەك دامەزراوە کە زێی (ئاڵتون) بەنێویدا تێپەڕ دەبێ ودواتر بەرەو باشووری دوورگەکە دەڕوا، ئێستا لەوێدا سەربازگەیەکی گەورەی تورکەکان لەوێدا جێگیر کراوە، کە بەچەندین قەڵای پتەو دەور دراوە، دوای ئەوەی بەسەر پردێکی بەبەرد هەڵچنراو تێپەڕین چووینە ناو شارۆچکەکە، ئەوەی شیاوی باسە ئەم پردە گەورەترین پردە کە لە ژیانمدا بینیوومە، لەلایەکی دیکەوە ئەو پردە لەزۆر شوێندا چاڵی تیادا هەیە، چونکە چەند جارێك زۆری نەمابوو ئەسپەکەم بکەوێ ئێستاش ئەم شارە بە پایتەختی کوردستانی تورکیا دەژمێردرێ، پاشانیش لەوێدا دەسەڵاتی لە دەستە (مەبەستیش لە کوردستانی تورکیا هاتنی ئەو تورك وتورکمانانەیە کە لەو شارەدا نیشتەجێ بوونە، ئەمەش لە سەردەمی سلێمان قانوونییەوە).

بەڵام ئەوەی ئێمە بزانین (ئەم شارە تەنها چەند بنەماڵەیەکی تورکمانی تیادا نیشتەجێ بوونە وخەڵکەکەی دیکە لەوانەوە فێری تورکمانی بوونەو ئەگینا خەڵکی ئەم شارە هەموو لە ڕەچەڵەکی کوردن، سەبارەت بە پایتەختیش لەوانەیە جاکسۆن ئەو شارەی زۆر لاجوان بووە، چونکە شوێنێکی ستراتیژی هەیە).

کاتێك کە ئاڵتون کۆپری – پردێمان بەجێ هێشت چەندین گوند ودیمەنی جوانمان بینی، ئەوە جگە لە چەندین کێڵگەی کشتوکاڵ و گەنم وجۆ، ئەو گەنم وجۆیانەش کاتی ئەوە بوو تا بدورێتەوە"(٣٨).

*** گەشتی ئەبی تالیب خان بۆ عێراق و ئەوروپا ١٧٩٩:**

"ئەبی تالیب کوڕی محەمەد خان، ڕەچەڵەکی تورکەو لە ئەسفەهان لەدایکبووە، بەهۆی زوڵم و زۆری (نادرشا)وە باوکی هەر لە گەنجیەوە ئەو ناوچەیەی بەجێ هێشتووەو چووە بۆ هیندستان. کوڕەکەی ئەبو تالیب لە (لکنو) لە ساڵی (١٧٥٣)ی زایینی لەدایك بووە.

گەشتی تالیب خان یەکێکە لەو گەشتە دەگمەنانەی کە لە بابەت و ناوەڕۆکدا توانایەکی چاکی هەیە، توانیوییەتی وەسفێکی پاك و پاراو بدات بە لێکۆڵینەوەکانی و گەشتەکانی



ئەبی تالیب خان

به زمانێکی ڕێکوپێك بخاته ڕوو. لە گەشتەکەیدا لە وەسفی ئاڵتون کۆپری و کەرکوك و داقوق و قەرەتەپە بەم جۆرە دەگێڕێتەوە:

"کەرکوك شارێکی گەورەیە، شووره ڕێژێکی چاڵکراوە، بەڵام خانووبەرەکانی بەرەو ڕووخاندن دەچێت، خانووەکان شوورەی قەڵا دەوریانی داوە، هەر هەمووی لەبەرد یان خشتی سوور دروست کراوە، بەڵام خانووەکانی خوارەوە لە خشتی قوڕ دروست کراوە کە کەوتووەتە دەشتێکی فراوان، دیمەنێکی جوانی هەیە ئەگەر لە دوورەوە سەیری بکەین.

لە ڕۆژی بیست و حەوتەمدا ماوەی سی میلمان بڕی و گەیشتینە دێی (داقوق – تاووق)، گەیشتە ئەم گوندە بە سەعاتێك پێش خۆرئاوابوون، لە دوایـیدا ڕۆیشتمە (خورماتی–خورماتوو) لە بیست و هەشتدا گەیشتمە (کفری) و (قەرەتەپە)، قەرەتەپە شارێکە کەوتۆتە لێواری زنجیرە گردۆڵکەی دەشتاییەکی فراوان کە درێژ دەبێتەوە تا بەغدا، ئەم شوێنە بەسەرکەوتنی (نادرشا) بەسەر تورکەکانەوە بەناویانگە.

دەتوانێت تاکو ئێستاکە بزانیت فراوانی ئەو شەڕە چەند بووە کە ڕووی داوە، ئەمیش بەهۆی پاشماوەی ئەو چاڵ و ڕەبایانەی کە ماوەتەوە لە شوێنەکان، لە هەمان کاتدا دەتوانین بڵێین کەرکوکیش جێگەی سەرکەوتنی (نادرشا) بووە"[٣٩].

*** گەشتی ئۆلیڤێ ١٨٠١-١٨٠٧:**

"گەڕۆکێکی فەرەنسییە کە بە فەرمانی حکومەتی فەرەنسی گەشتێك بۆ ناو ئیمبراتۆریەتی عوسمانی دەکات و دواتر سەفەرنامەکەی لە پاریس لە ساڵی (١٨٠١) بۆ (١٨٠٧) بە ناوی (گەشتێك بۆ ئیمبراتۆریەتی عوسمانی میسرو ئێران) لە سێ بەرگدا بڵاودەکاتەوە.

گەلێك لە ئاقارەکانی دەوڵەتی عوسمانی گەڕاوە، کە لە نێویاندا (میسر)و (فارس)و عێراق، گەشتەکانی لە ساڵەکانی یەکەمی شۆڕشی فەرەنسی بوو لە (١٧٩٣ – ١٧٩٧)، دووجار هاتۆتە عیراق، یەکەم جار لە تورکیا و سوریاوە هاتووە، دووەمی لە کاتی گەڕانەوەی لە ئێرانەوە بۆ فەرەنسا، لە نێوان ساڵەکانی (١٧٩٤ – ١٧٩٦)ی زایینی.

لە لاپەڕەکانی یەکەمی یاداشتەکانی بەدەردەکەوێت کە ئەنجوومەنی جێبەجێ کاری شۆڕشی فەرەنسا، ئەم ئەرکەی پێ سپاردووە لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٧٩٢)ی زاینیی بۆ وڵاتانی دەوڵەتی عوسمانی و فارس کە گەلێك سوودی هەیە لە بواری کشتوکاڵ و بازرگانی ومێژووی سروشتی و فیزیا و جوگرافیا و پزیشك و پەیوەندییە سیاسییەکان لە نێوان عوسمانی و فەرەنسا، چونکە لە ڕابردوودا ئەم بوارانە ڕوون نەبوو لەلای فەرەنسییەکان ئۆلیڤیە لە ماوەی گەشتەکەیدا بۆ کەرکوك و دەوروبەری وەسپی ناوچەکانی:– پردێ، کەرکوك، داقوق، کفری کردووە کە بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:–

".. بەدرێژای ڕۆژ ئاسمانی هەولێر باراناویی بوو، هەوا لە ڕۆژئاواوە بوو، هەشت سەعات و نیومان بڕی، کە (قوشتەپە) مان بینی، شوێنێکی بەرچاو نەبوو، گەلێك گردی بەردی و خۆڵ و زەوی سەوزمان بڕی تاگەیشتینە (ئاڵتون کۆپری) و پردی ئاڵتونی، کە لە سەر بەرد دروست کراوە لە سەر شانی ڕووباری زێی بچووك یان (کابروس) کە لە ڕابردوودا پێیاندەوت، دەچیتە ناو گوندەکە بە هۆی پردێکەوە کە بەردی قرمیدی دروست کراوە پردێکی تر بەجێ دەهێڵین کە بە کەوانەی بەرزو قەبە بنیاتنراوە، لەگەڵ دوو کەوانەی تری بچووك، کە ئەسپ زۆر بە زەحمەت بەسەریدا سەر دەکەوێت، ڕووبارە کەشی زۆر دەکات بە هۆی باران و توانەوەی بەفر لە ناوچەکەدا. چووینە نێو گوندەکە ولەلای ئاغای گوندەکەو منداڵەکانی نانمان خوارد، کە خزمەتکارێکی ماڵەکە خزمەتمانی کرد. خواردنی ئێوارەمان پێکهاتبوو لە دەفرییەك برنج کە پارچە گۆشتی مەڕی تێدا بوو، دەفرییەکی گەورە لەماستی مەڕ، دەفرییەك لە ماستاو، دەفرییەکی گەورەمان نەبوو تا بۆ ئەوەی هەرییەکە لە دەفرییەکی گەورە نان بخوات. داوای کەوچکمان کرد، بۆمانیان هێنا، کە لە دار دروست کرابوو، کە لە ئاقارەکانی دەوڵەتی عوسمانی و فارس تەنها ئەمانەیان دەزانی. منداڵەکانی ئاغا بەدەستەکانیان دەیانخوارد، برنجەکەیان لەگەڵ پارچە گۆشت و ماست تێکەڵ دەکردو شیریان بە نۆرە دەخواردەوە، لە دوای ئەوە سیگاریان بۆمان هێنا لەگەڵ قاوە، ئەمە هەموو ئەو خواردنانەمان بوو لە ماوەی گەشتەکەمان، برنجیش وەکو باو بوو بە ڕۆن دروست دەکرا، کە هەموو ئێواران پێش کەشیان دەکرد، هەروەها دەفری هێلکەیان بۆمان دەهێنا، لە کاتێکیش کە خورما پێدەگەیی، خورمایان لەگەڵ هێلکە بە سوورە وەکراوی بۆمان دەهێنایین، لەگەڵ برنجەکەش لە ئێواران.

دوای چارەکێك لە خواردنی ئێوارە، پێیان ڕاگەیاندین کە گوایە ئاغادێت بۆ ئەوەی کاتی خۆی لەگەڵ ئێمە بەسەرببات، سوپاسمان کرد بەڵام داوای لێبوردنمان کرد بەوەی ناتوانین

-----

پێشوازی بکەین لەبەر ئەوەی زۆر پێویستمان بە پشووە، کورەکانی دوا نەکەوتن لە ڕۆیشتن و هیوایان بە گەشتێکی خۆش خواست بۆمان.

*** کەرکوک:-**

لە ڕۆژی بیست و هەشتەم تەمێکی زۆر داپۆشی تا سەعات هەشتی ئێوارەی خایاند. لە سەرەتادا زەوی تەخت نەبوو، کە بەشێک بەردی تێدا بوو، لە دوایدا ماوەیەک ڕۆیشتین دووزنجیرە گردمان بڕی، کە لە پێشمانەوە دەشتایی درێژ دەبوو، لەوانەیە نۆ یان دە میلمان پێویستە ببڕین، بەڵام لەدوای سێ سەعات و نیو لە ڕۆیشتن سووراینە بەرەو ڕاست گردێکمان بڕی کە پێکهاتبوو لە خۆڵ و بەرد، پاشماوەی هەندێک لە قووری سواغ دراومان بینی، ژێرەوەی ڕێرەوی دەکرد بە چەند لایەکدا، کە چاڵیان هەڵدەکەند بە قووڵی پێنج تا ١٢ پێ، کە ڕۆژانە نەوتی لێدەردەهێنن، کۆیدەکردنەوەو بەبار لەسەر گوێدرێژ بەرەو کەرکوک دەیانگواستەوە.

قەشەیەک کە لە گەشتەکەدا لەگەڵمان بوو، ووتی لە دووری فەرسەخێک لەوشوێنەوە بەلای خوارووی ڕۆژهەڵات کە ماوەیەکی درێژو فراوان بڵاو دەبێتەوە تێدا گڕی ئاگر بەرز دەبێتەوە هەندێک جار، پیاوانی پۆستەش ئەمەیان پێوتین، بەڵام کاتێک داوامان لێیان کرد بمانبەنە ئەو شوێنە، لەبەرامبەر ئەوەی پاداشتیان بکەین، بەڵام ڕازی نەبوون لە ترسی ئەوەی سزا بدرێن، بۆیە ڕێگاکەیان دەگۆڕی.

دوو سەعاتی ترمان بڕی، گەیشتینە کەرکوک، قەشەکەمان بەجێهێشت تا بەوەی چاوی بە هەندێک لە کلدانەکان بکەوێت کە پەیوەندی لەگەڵیاندا هەبوو.

لە کەرکوک نەوەستاین، دوای ئەوەی فەرسەخێکمان بڕی گەیشتینە گوندێک بە ناوی (تسعین)، ئەم دوو شارۆچکەیە زەوییەکی بە پیتی هەیە، ئەمەی کەوتۆتە دەشتاییەک، بەڵام کەرکوک وەکو هەولێر لەسەر گردێکی دەستکرد لە ناوەڕاستی دەشتێکی گەورە بنیات نراوە، کە چواردەوری تەنراوە بەشورەیەکی بەرگری، کە هێزێکی گەورەی (یەنکچرییە) بەرێوەی دەبات بۆ پاراستن، سەرپەشتیارێک بەرێوەی دەبات کە لەلایەن پاشای بەغداوە دانراوە، بەشێکی تری شارەکە لە خواری گردەکەوەیە.

ماوەیەکی زۆر کەرکوک لە چوارچێوەی پاشایەتی شارەزوور بووە، بەڵام ئێستا شارەزوورو هەموو زەوییەکانی لای ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە، لە سەرەتای (زێی گەورە) تا کوردستان هاوپەیوەست کراوە بە پاشایەتی بەغداوەو کەرکوکیش لەلایەن بەغداوە هەڵبژێردراوە.

ئەمەوا بەدەر دەکەوێت کە ئەم شارە (مینیسی)ی کۆنە، هەروەکو ئەوەی (کونیتش کۆرسینی) دەڵێت کە لە کاتی خۆیدا (ئەسکەندەری گەورە) هەوڵی داوە لە ڕێگای بۆ گەیشتنی بە (بابل)، لە ماوەی چوار ڕۆژ لە (ئەربیلا)وە گەیشتۆتە (مینیس)، ئەو شارەیە کە ڕێژەیەکی زۆر (قیر) ی لێ دەهێنرێتە دەرەوە، کە خەڵکی لەو باوەڕە دا بوونە کە شوورەکانی بابلی پێ قیر ڕێژکراوە. بە پێنج سەعات ماوەی نێوان ڕێگای هەولێرو کەرکوکمان بڕی، شاری یەکەم لە سەرهێڵی ٣٦/ ١١ دقیقەیە، بەڵام دووەم لەسەر پلەی ٣٥/ ٣٩ دەقیقەیە، کە ئەمە بەڵگەیە لە نێوانیان بیست فەرسەخە، کە بە ڕۆیشتنی چوار ڕۆژە بە ڕۆیشتنی سەرباز، هیچ پاشماوەیەکی بەرچاومان بەرنەکەوتووە وەکو ئەوەی کەرکوک، هەروەها ئەم گردەش بە توانایەکی زۆرو زەحمەت لە سەر ئەو دەشتاییەوە بەرزکراوەتەوە.

*** هۆکارەکانی خۆگەرمکردنەوە ڕووناکی:-**

تا ئەو کاتەی کە موسڵمان بەجێهیشتووە، تەنها نەوتمان بەکارهێناوە بۆ ڕووناکردنەوە، بۆ ئەم جۆرە فتیلەی لۆکەیان بەکارهێناوە، لە دوایدا دەیکەنە نێو ئەو قیرە ڕەشەی کە لە نێو دەفرییەکی قووڕییدایە کە سەرێکی وەکو دەندووکی هەیە، بۆنی ئەم ڕووناکییە بەهەموو لایەکی ژوورەکەدا بڵاودەبێتەوە بە بەرگەگرتنی زەحمەتە، سەرنجی ئەوەیان نەداوە کە هەواکێشێک لە دیوارەکە دروست بکەن تا بۆ ئەوەی ئەو بۆنە ناخۆشە بکاتە دەرەوە هەروەها لە پاشماوەکانی مانگاو کای کوتراو تەپکە دروست دەکەن و لەنێو قیرەکە نقوومی دەکەن، بۆ ڕووناککردنەوەی حەوشەکە بەکاریدەهێنن، یان بۆ لێنانی چێشت، لە هەمان کاتدا مەشخەڵ لە لۆکەی کۆن لە نەوت هەڵدەکێشن و ڕێگاکانی پێ ڕووناك دەکەنەوە، ڕێنشیاندەرێکی تازەمان بۆ هات بۆ شارەزایی ڕێگاکە.

*** داقوق:-**

دوای سەعات و نیوێک لە دەرچوونمان لە شارۆچکەی (تسعین)، ڕووبارێکی بچووکمان بڕی لە نزیک گوندێکی بچووک کە دەورە درابووبە دارستان و بەشێکی لە داری بەردار، تا گەیشتنە (داقوق)، لە دوای شەش سەعات و نیو لە ڕۆیشتن داقوق دەورەدراوە بە دارستان، کە ڕوواوە بە داری خورما و لیمۆو هەنجیرو توو قەیسی و هەنارو ئاڵو باڵو، لەنێو دارەکان ڕێژەیەکی کەم داری زەیتونمان بەرچاوکەوت، یەکەم گوندمان بینووە کە داری خورمای بەم شێوەیە زۆربێت و بەم شێوەیە خورما پێبگات.

لە سی مانگدا، لە دووری یەك فەرسەخ لە داقوق، ڕێرەوی ئاوێکمان بڕی کە ئاماژەی پێکراوە لەلای (نیبور) بەناوی (دوس)، بەڵام ناوی (تۆرناتۆس) یان (ئودونیج) لە زۆربەی نەخشەکاندا، لەلای بەتلیمۆس بەناوی (کۆرکس) ولە لای (زەینەفۆن) بەناوی (فیسکس).

لە دوای سێ فەرسەخ و نیو ڕێرەوێکی ترمان بڕی، لە دوای شەش سەعات گەیشتینە (خورماتوو)، گوندێکی دەورە دراوە بە دارستان هەروەکو گوندەکەی پێشوو، لەو ڕۆژەدا لە دوای نیو فەرسەخ چیایەکی بەرز هاوشانمان بوو، بەڵام دەشتاییەکە درێژ دەبێتەوە بە داشکانێکی کەم بەلای ڕاستدا، کە پیتی زەوییەکەی کەمترە لەو دەشتاییانەی کەلەوەو پێشتر بینوومانە، دانیشتوانی ئەم ناوچەیە شەراب دروست دەکەن و دیفرۆشنە مەسیحییەکانی بەغدا.

سەر لە ئێوارە سەردانی چەند گردێکی نزیك لە گوندەکەمان کرد، کە مێژووی لە سەردەمی خەلیفەکان دەرناچێت، کە تا ئێستا پاشماوەکانی بە پێوەیەو، بورجەکانی لە خشتی

سوورەوە کراوە وەکو بوورجەکانی هەولێر، لەرابردوودا منارەی مزگەوتەکە بووە، لە دوای ماوەیەکی کەم دەرگای شارێکی کۆنمان بینی، کە تاکو ئێستاکە بە پێوەماوە بەخشتی سوورەوەکراو دروستکراوە، شتێکی نییە تا ئاماژەی پێوە بکات، وادیار کە ئەم شارە کۆنە پێشتر گەورە بووە، بەڵام ئەم گوندە ئەمڕۆ زۆر بچووکە.

*** کفری:-**

لە (٢١)ی نیسان دوای شەش سەعاتو نیو گەیشتینە شارۆچکەی (کفری)، لە دوای فەرسەخێك لە (خورماتوو) گەیشتینە جۆگەیەك کە بۆ ئاودانی دارستانی شارەکەو کێڵگەکانی دەوروبەری بەکاردەهێنرێت، لە نیوەی ڕێگا، پیاوانی پۆستە پێمانیان ڕاگەیاند، کە خەڵکی نەوت دەردەهێنێت لەو چیایەی کە لەلای چەپمانەوەیە، سەرنجی گەلێك لە پاشماوەی گەچمان بینیوە، کە پێمانیان ووت ڕێژەیەکی زۆری لە چیاکە هەیە، زەوییەکەی ژێرمان ووشکەو بەردییە، کە بۆ کشتوکاڵ زۆر بەکەم بەکار دەهێنرێت.
گەیشتینە (کفر) لەلای ئاغای شارەکە، کە هیچ شتێکمان نەبوو تا بیاندەینیو هیچ حەقێکیان بەسەرمانەوە نییە لەبەر ئەوەی پۆستە لە دەوڵەتی عوسمانی بەخۆراییەوەو بوراوە لە باجدان[٤٠].

*** گەشتی دۆبرییە بۆ عێراق ١٨٠٧ - ١٨٠٩ زایینی:**

"لە باسی وڵاتی کورددانا ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئەم ئاقارە درێژ دەبێتەوە بۆ ڕۆژهەڵات لە کەرکوکو هەولێرەوەو لە سەرووەوە لە موسڵ بەرەو ڕۆژهەڵات.
لە کاتێك دێتە سەر باسی کەرکوك دەڵێت:
"لە سەعات شەشی ئێوارە گەیشتینە بەشێك لە شارێکی بچووك کە (کەرکوك)ەو بە ناویدا ڕۆیشتینو زەوییەکەی بەرهەمێکی زۆری گەنمو جۆ بەرهەم دەهێنێت، ناوی کەرکوك وا بە زۆری ناوەکەی گۆرانکاری بەسەردا نەهاتووە، گومانی تێدا نییە کە (کورکورا) لە یاداشتەکانی (بەتلیمۆس)دا باسی هاتووە لەنێوان شارەکانی ئاشوور دەکاتە کوردستانی ئێستا، لە بەردەکانی دەوروپشتیدا جۆرێك لە زەیتی نەوت بەرهەم دێنن، لەو باوەڕەدام کە ئەم شارە کە (سترابۆ) ناوی ناوە (دیمتریاس) هەمان ئەو شارە بێت کە لە باسی هەولێرو ڕووباری کاربۆس ئاماژە بەم شارە کراوە کە شوێنی نەوتو غازە.
لە ڕابردوودا کەرکوك پایتەختی شارەزوور بووە، کەوتۆتە سەر چیایەکی درێژەوەبوو کە لە نێو زەوییەکەی تەختدایە کە هەندێك گردو گردۆڵکەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر تێیدا بڵاوبووەتەوە، ئەم شارە دەورە دراوە بە شوورەیەكو قەڵایەکی پارێزراوی تێدایە لەسەر شوێنێکی بەرز، کە لە ژێرییەوە ئاو هەڵدەقوڵێت، کاتێکیش باران دەبارێت ئاو چواردەوری دەدات، ئەو شوێنە بەرزە وەکو دوورگەیەك پیشان دەدات، لە کاتی خۆیدا (نادر شا) دەستی گرت بەسەر کەرکوکدا لە دوای (٢٥) ڕۆژی لە گەمارۆدانی، لە دواییدا بەرەو موسڵ کشاو نەیتوانی بە تەواوەتی داگیری بکات.

لە ڕابردوودا ئەم شارە لەلایەن فەرمانڕەوایەکەوە بەڕێوە دەبرا کە لە (باب ئەلعالی) ڕاستەوخۆ دادەنرا، کە لە هەندێك کاتدا کوڕی ئەمیر (جەنەوی جیکالا) فرمانڕەوایی ئەکرد، کە لە کاتی خۆی موسڵمانی بوونی ڕاگەیاند لەو کاتەی بەند بوو لە ئەستەمبوڵ، بۆیە ماوەیەك کرا بە فەرمانڕەوای ئەم شارەو ماوەیەك تێیدا نیشتەجێ بوو، لەبەر ئەوەی گەلێك شوێنەواری بەپێوە ماوە بەڵگەی بەئاگا هێنانی دانیشتووانێتی بۆ ئەو سەردەمە.
دوای چل ساڵ هەرەشەی جۆراوجۆر لەلایەن والی بەغداوە وای کرد کە (باب ئەلعالی) ئەم شارە بخاتە ژێر دەسەڵاتی کارگێری ڕاستەوخۆی حاکمی عێراق لە بەغداو یەکێکی بەسەرپەرشتییەوە کردە دەسەڵاتدار".
دەربارەی کفری دەڵێت:
"بریتییە لە گوندێك کە نزیکەی سەد ماڵی تێدا دەبێت، گەلێك زەوی کشتوکاڵی چێنراوی بە گەنم تێدایە، لە دوای ماوەیەك بیرێکمان دی کە نەوتی لێ دەردەهێنن بۆ سووتاندنو ڕووناککردنی ماڵان، کە ئەم شلە ڕەشە دەکەنە چراکانیانەوە لە جیاتی زەیت، بەڵام ئەو بۆنەی کە لێی دەردەچێت ئەوروپییەکان بەرگەی ناگرن"[٤١].

*** گەشتی بکنغهام لە ساڵی ١٨١٦:**

"یەکێکە لە گەڕیدە ئینگلیزەکان، کە کاری کردووە لە یەکێك لە دەزگاکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی بۆ ماوەی چەند ساڵێك، لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەم، ئەویش لەو ماوەیەی کە لەو کۆمپانیایە کاری کردووە گەلێك هاتووچۆو گەشتی کردووە، لەو ماوەیەی کە لە کوردستان ماوەتەوە، گەلێك لێکۆڵینەوەی لەسەر ژیانی کوردو کوردستان نووسیوەو، قسەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێت "کورد بەوە بەناوبانگە کە لە هەموو سەردەمەکان ئارەزووی سەربەخۆیی کردووە".
لە کاتی هاتنی بۆ کەرکوك، لە ساڵی (١٨١٦)ی زایینی باسی ژیانو ئاوەدانکردنەوەو کاروباری کۆمەڵایەتییەکانی کردووە:
"ئەم شارە بریتییە لە سێ بەشی دیاری کراو کە هەرییەکەی بەشێکی گەورەی لەم شارە داگیرکردووە، قەڵای کەرکوك بەشی سەرەکی ئەم شارەیە، ئەم بەشە ڕێگە نادەن بە غەیری موسوڵمانەکان لێی نیشتەجێی بن. بەڵام بەشی دووەم درێژ دەبێتەوە لەو دەشتەی دەوروبەری قەڵا، کە ئاپۆرەیە بە بازاڕو خانو قاوەخانە لە بەرامبەر دانیشتووانی بنەڕەتی گەلێك چینو توێژی وەکو ئەرمەنو نەستوریو سریان نیشتەجێ بوونە. بەڵام بەشی سێیەم کە لە هەمووی بچووکترە، خانووەکانی پەرشو بڵاوەو دانیشتووانی لە هەزار کەس تێپەڕ ناکات".
هەروەها (بکنغهام) وای داناوە کە دانیشتووانی گشتی شارەکە ١٥٠٠٠ هەزار کەسە.
دەربارەی سەرچاوەکانی نەوت دەڵێت: "ئاگر لەناو جەرگییەوە دەردەچێت کە خەڵکی سەیری دەکەن، نموونەی وەکو ئەمە نییە لە جیهاندا کە خوا پێی بەخشیون".

دەربارەی کورد دەڵێت کە گوایە کەیف خۆشن و ماوەی کاتی خۆیانی پێوە بەسەر دەبەن تا بەوەی دەڵێت "ئەوەی دیتم کە خەڵکێکی زۆر لە دەوری ورچێکی سەماکەر کۆبوونەوە، ورچەکە گەورەو سپی بوو، تووکێکی زۆری هەبوو، کە لەکاتی خۆیدا یەکێك لە کوردەکان لە چیا بە بەفر داپۆشراوەکانیانەوە هێنابوونی""(٤٢).

*** گەشتی ریچ بۆ کوردستان لە ساڵی (١٨٢٠)دا:**

"کلۆدیۆس ریچ لە (٢٨)ی مارتی ساڵی (١٧٨٧)ی زاینی لە نزیك (دیمبون)ی سەر بە (بورگەندی)، لە فەرەنسا لەدایکبووە.

کە تەمەنی دەگاتە هەشت ساڵان، لە گەنجینەی خانەدانێکدا لە (بریستۆل)، دەسنووسێکی عەرەبی دەدۆزێتەوە، ئیتر خولیایەکی بە تین دەکەوێتە سەری، کە بەدوای ئەم زمانەدا بگەرێت و هەوڵەکانی بۆ توێژینەوەکانی رۆژهەڵات بخاتە کار. زرنگیشی لە زمانەکانی خۆرهەڵات، شارەزای لە نەریتیاندا توانایەکی وای دابوو کە بتوانێ بە جلوبەرگی تورکانەوە لە گورجستان چاو بەست لە خەڵك بکات و لە دیمەشقیش لە ناو هەزاران لە حاجیاندا، کە بەرەو مەککە ئەچوون، چەند هەفتەیەك بمێنێتەوە، بەبێ ئەوەی سەرگەرمترین و ورياترين موسڵمان، هەستی پێ بکات.

(ریچ)ش ماوەیەکی کەم دوای ئاهەنگی ژن هێنانی، کە لە (٢٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٨٩٨)ی زاینی، چووە بۆ نشینگەکەی، کە لە بەغداو بەسرەشی گرتۆتەوە، ئەنجام لە بەغدا سەقامگیربووە، کە بارەگای (والی)یشی لێ بووە، چونکە بەو هۆیەوە کە شوێنەکەی لە ناوەراستدا بووە توانیوییەتی کاروباری سیاسی خۆی لەگەڵ دام و دەسگای والی دا بەرێوەبەرێ و هەموو دەنگ و باسەکانی دەوروبەری ببیستێت.

لە کۆتایی ساڵی (١٨١٣)ی زاینیدا بە هۆی تێکچوونی باری تەندروستییەوە ناچاربووە کاری نشینگەی بەغدا بۆ میستەر (هانی)ی یاریدەدەری بە جێبهێڵێ و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بچێت بۆ ئەستەمبوڵ.

هەر لەم ماوەیەشدا بووە دووەمین گەشتی (بابل)ی کردووە، لە ساڵی (١٨٢٠)ی زاینی دا باری تەندروستی وای پێویست کردووە ئاڵوگۆرییەك لە ئاوو هەوادا بکات، بۆیە گەشتێکی کوردستانی کردووە، کە لە یاداشتەکانیدا تۆماری رووداوەکانی ئەو ماوانەی کردووە.

لە (٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٨٢١)ی زاینی لە (شیراز) تووشی نەخۆشی رشانەوە دەبێت و کۆچی دوای دەکات، لە یەکێك لە باخچەکانی پاشایەتی (جیهان نوما)دا دەنێژرێت، کە پێشتر نیشتەجێی خۆی بووەو بۆ لە بیر نەچوونەوەیشی پەیکەرێکیان بۆ کردووە.

لە رۆژی (٢٦)ی نیسانی ساڵی (١٨٢٠)ی زاینیی ئاوها باس دەکات:-

".. نیو میل لە دامێنی خۆرهەڵاتی (کفری)یەوە، لە شوێن ئاوەرۆیەکدا شوێنەواری چەند دیوارێك، یان بنچینەی چەند دیوارێك هەیە، بارانی ئەم دواییە دەریخستووە لە دیوارێکدا پارچەیەك مەرمەری خۆش کراوی بۆیە کراوی نەخشینم دۆزییەوە، زۆرم مەبەست بوو زیاتر لەم کەلاوانە هەڵبکەنم تا راستیی ئاسەوارەکەو مێژووەکەی بزانم. لە ئەنجامی هەڵکۆڵینەدا ژوورێکی بچووك، یان شوێنەوارێکمان بینی، کە دیوارەکانی نزیکەی چوار پێ بەرز دەبوون. لەگەڵ دەرگای هاتنەژوورەوەدا، ژوورەکە بچووك بوو، پانتاییەکەی هەر دوانزە پێ چوارگۆشە دەبوو.

دیوارەکانی لە بەردی قسڵی سادەو بێ نەخش بوون و بە قسڵیش سواغ درابوون، سواخەکە نەخشی چری لەسەر کرابوو، چەند پارچە قسڵێکمان دەرهێنا، نەخش، یان گوڵی عەرەبی شێوەیان لەسەر بوو. نەخشەکان رەنگیان ئاڵێکی زەق بوون، بەڵام خەتەکانی تەختەکەی رەش بوون، رووەکەشی هەر لە رەنگی قسڵەکە بوو، ئەم رەنگانەش هەموویان دەتوت تازەن. لەبەر ئەوەش کە تەنیشتەکانیان نەخشیان پێوە نەبوو، پێم وابێ پارچەی بنمیچەکەی بووبن. دیسان هەندێ پارچە خەلووزی رووەکیمان دۆزییەوە... ئەم ژوورە بەشێك لە ژوورێکی تریشمان پشکنی، لەوە ئەچوو ئەمانە ریزە ژوورێك بووبن.

کەمێك بۆ لای خۆرئاوای باشووری خۆرئاواو خۆرهەڵاتی باکووری خۆرهەڵاتەوە درێژ بووبێتەوە، هەرواش بوو، چونکە شوێنەواری پێنج شەشێکیان بەریزی یەکەوە دەرکەوتن، کە لای سەرەوەی بە دیرەگێکی کورت و خر راگیرابوون لای خۆرهەڵاتیشەوە، لە ژێر ئەو زووڕگانەدا کە لە رۆخی چەمەکە بوون (دیوی لای خۆرئاوایان هەڵوەریبوو) گردێکی بەرزو تەخت و زۆریان هەیە، کە شێوەی چوار گۆشەی هەبووە، کرێکارەکان چەند سواڵەتێکیان دۆزییەوە، هەندێکیان بۆ هێنام، کەچی ئەستوور بوون و دیوی ناوەوەیان کووت و مت لەو رەنگە رەشە ئەچوو کە لە (سلوقیەو بابل) دۆزرابوونەوە، چرایەکی خەزەفیش لای من هەیە، هەر لەو چرایانە دەچێ، کە ئێستا گوندنیشینەکان بەکاریان دێنن.

هەر لێرە دراوی زێرو زیو ئەدۆزرێتەوەو گوندنیشینەکان دەمەو دەست ئەیان توێننەوە. بە داخەوەم کە نەمتوانیوە پارچەیەکیان ببینم. خۆ ئەگەر پارچەیەکیانم بدیایە شتێکی باشم لا گەڵاڵە ئەبوو، کە سەردەمی ئەو کەلاوانە دیاری بکەم. ئەو شەربەو فەخورییە دارێژراوانە، وام لێ ئەکەن کە بیانگێرمەوە بۆ سەردەمی ساسانی.

لەسەر ئەم گردە ئاسەواری خانووبەرەش هەیە، لەسەر تەپۆڵکەکەشییەوە بەلاشانەکانیا، تا دامێنەکەی و پاشان تا بەرامبەر (کفری)ش شوێنەواری خانووبەرە هەیە، کە زۆربەیان وەك ئەوانەی قەسری شیرین و، حۆش کەرەو و ژێرخان (Basemer)ی چوار گۆشەیان هەیە، هەر چەند زۆریش لە زەوییەوە بەرز نین. پانتایی ئەم کەلاوانە نزیکەی میلێك درێژو چارەکە میلێك پان ئەبن. لەم جێیە دەستمان کرد بە هەڵکۆڵین بەڵام هیچمان نەدۆزییەوە، لای خۆرئاوای چەمەکەشەوە شوێنەواری دیوار هەیە. دیسان ئەگەر رووەو کفری چەمەکە ببرین، پاشماوەی خانووبەرەی سەخت و گەورە ئەبینینەوە، کە ئاوی چەمەکە دایرووخاندووە. گوندنیشینەکان پێیان وایە ئەمە پاشماوەی بەستێکە،

لەسەر چەمەکە دروست کراوە، بەڵام من خۆم پێم وایە ئاسەواری شارێك بووە، بەڵام شێوەکارەکەی لە هی کەلاوەکانی بەشەکانی تری باشترەو، لە بەردی سادەو بە قسڵ ئاو کارەکەیان دروستکردووە. ئەو شوێنەوارانەش کە لە ناوەڕاستی چەمەکەدان بە ئاشکرا بۆمان دەرئەخەن کاتێ شارەکە هەبووە، ڕێڕەوی ئەوسای ئاوەکە وەك ئێستا نەبووە. لەوە ئەچێ پێشتر ئاوی لافاویان بۆ کشتوکاڵ بەکار هێنابێ. خەڵکەکە ئەو ئاسەوارانە بە هی (گاور)، یان کافر ئەزانن. لە ڕاستیدا زانیاری تا ئەواوی ئێمەش دەربارەی ئیمپراتۆرییەتی ساسانی ڕێ نادات شتێك دەربارەی ئەم جێگایە بڵێن. من گومانم لەوە هەیە کە ئەمانە هیچ پەیوەندییەکیان بە شەرەکانی ڕۆمانی و ئیمپراتورییەتەوە هەبێ. ئەو پەیوەندییەی کە تەنیا لە ڕێگەی ئەوەوە ئەتوانین شتێك دەربارەی کاروباری ئەم جێگایە بڵێن.

لای ژوورووی باکووری خۆرئاوای سەرووی چەمەکەشەوە شوێنەواری پشکنین لە بەردێکدا هەیە، پێی ئەڵێن (ماڵی کافر)، بۆیە میستەر (بەل لی نۆ) چوو بۆ دیتنی ئەو ئاسەوارانە، کە دە دەقیقە بە سواریی لەو سەری باشووری کەلاوەکانەوە دوور ئەبوو هەندێ ژووری دەیبوونەوە، کە سەریان لابراوەو، دەرگای زۆر نزمیشیان هەبووە لە هەر یەکەشیاندا شوێنی سێ گۆڕی دیبوو، ئەم هەڵکۆڵراوانە، لە بنچینەی گۆڕستانەکانی (ئەخمینییەکان Academia) ئەچێ لە (نەخشەکەی ڕۆستەم). بەڵام شوێنەواری هیچ نووسین و نەخشێکیان لەسەر نەبوو، سێ میلێکیش لە لای کەلاوەکان و، لەسەر گردێك ئاسەواری خانوویەك هەیە، خەڵکەکە پێی ئەڵێن (قیز قەلعەسی)، یان (قەڵای کچ)، هەندێ چینی و ئێسکی تیا دۆزرابووەوە. میستەر (بەل لی نۆ) خۆی چینییەکانی دیبووە. ئەم شوێنە ئەکەوێتە بەرامبەر (ئۆن ئیکی ئیمام- دوانزە ئیمام)، شتێکی تری وا تیانییە شایستەی باس بێت.

گەڕاینەوە شوێنی خۆمان، نێردراوێکی (مەحمود پاشا) ی سلێمانی چاوەڕێی ئەکردین. دوێنێ ئێوارەش هەر لای ئەوەوە، یەکێکی تر هاتبوو، بزانێ ئاخۆ گەیشتووین و، چ ڕێگایەك ئەگرینە بەر! ئەم بەیانییە هەردووکیان ڕووەو سلێمانی گەڕانەوە، کە لە وێوە (پاشا) میوان نەوازێك ئەنێرێتە پێشوازیمان لە (قەرە حەسەن). قەرە حەسەنیش کە بە ئاسانی تەختەرەوانەکەی پیا ئەڕوات، ئەو ڕێیەیە کە بڕیارمان لەسەری دا بوو بیگرینە بەر.

لە کفری هەندێ دارخورما هەن، بە پێچەوانەی ئەوانەی (توزخورماتوو)وە خورماکانیان ناگات. ئەو ماوەیەی کە لە کفری ماینەوە، سێڵاو لاشانی زۆری خەرەندەکانی هێنابووە خوارەوە. پلەی گەرما، لە سێی دوای نیوەڕۆدا ٨٢ پلە بوو، (با)ش لە باکووری خۆرئاواوە بوو.

(٢٧)ی نیسانی ساڵی (١٨٢٠):

بەیانیی بۆ دیتنی کەلاوەکانی (ئەسکی کفری) سواری ئەسپەکانمان بووین، کە کەوتبوونە باشووری خۆرئاوای کفری و، دوو سەعاتێك دوور ئەبوو، لە دەشتەکەدا. لە ڕاستیدا من هەمیشە پێم وابوو کەلاوەکانی (ئەسکی کفری) ئەو شوێنە بووە کە کاتی خۆی شاری (کفری) لێ دروستکراوە. بەڵام من ئێستا ئەبینم کفری هەر لەم جێگایەی ئێستایدا بووە، ئەم کەلاوانەش هی سەردەمی گاورن. بەدەم ڕۆیشتنمانەوە بەرەو لای ئەم کەلاوانە، ئاشێکی زۆرمان بەرچاو کەوتن، ئەتوت قەڵای بچووك بچووکن، لەو باخانەی کفری دا، کە جۆگەی هەڵبەستراو ئەیگێڕان.

لە نزیك ئاسکی کفری گردێکی تووڕەکە ڕێژی گەورە هەیە، لەوەی (مجیلیبە - یەکێکە لە کەلاوەکانی بابل) ئەچێ، کەشانی وەك شاقولی وایە، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە باراناو، کەندرو داروخانی تیا دروستکردووە. لەم دواییەدا لە یەکێك لەو کەندرانەدا تاقێکم دییەوە، لە خشتی گەورەی سوورەوەکراو دروستکرابوو، کاسەی داڕێژراوی زۆریان تیا دۆزیبووەوە، کە لە هەندێکیاندا دراوی زێڕی تیابووە، نەمتوانی یەکێکانم چنگ بکەوێ. تاقەکە ئەوەندە خۆڵ و کەرسەکی گردەکەی تێکەوتبوو، پڕ ببووەوە. درێژایی ئەم گردە لە سەرەوە بۆ خوارەوە نۆسەدو شەست پێ ئەبوو، پانییشی لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا زۆر لەوە کەمتر بوو، بەرزاییشی پەنجاو حەوت پێ بوو. ئەگەر چی ئەم پێوانانە تەواویش نین، بەڵام لە ڕاستییەوە نزیکن، چونکە دارتاشەکە پێوایی و (ئاغا سەیید)یش یارمەتی دا. من خۆم لە کاتی پێوان کردنەکەدا چووبوومە ژێر سێبەری کەندەڵانییەکەوە، کە باراناو دریبووی. لای باشووری خۆرهەڵاتەوە (با) هەبوو، هەواش زۆر گەرم بوو کەمێك حەسامەوەو ماندوو بوونم بیر چووەوەو هاتمەوە سەر خۆم. لە ڕاستیشدا ئەم کەندرانە باشترین جێگابوون بۆ پشکنینی شوێنەواری دێرینە، چونکە تازە بوون و باراناوی ئەم دواییە دروستی کردبوون، لەبەر ئەوە هەڵمان کۆڵی و ئێسکێکی زۆرو، وردی مرۆڤو پارچە فەخوریمان تیادۆزییەوە، کە هەموویان لە ناوەوە بە ڕەنگی ڕەش بۆیە کرابوون، کە فەخورییەکانیان جیاوازتر بوون لەوانەی پێشتر باسمان کردن. هەندێکیان زێڕو هەندێکیشیان جۆرێکی وردو جوان بوون، کە وێنەی ئاسك و مانگایان تیا دروستکرابوو، هەر چییەکیشمان دەیبووەوە هەڵمان گرتن. ئەوپەڕی تواناشمان خستە کار بۆ ئەوەی بتوانین کاسەیەك بە ساغی دەربهێنین، بەڵام نەمانتوانی. بەلای زۆریشەوە ئەوانەی کە بە ساغی ئەدۆزرێتەوە، بە تایبەتی ئەوانەن کە باراناوی زۆر گڵەکانیان لەسەر لائەبات. فەرمانم بە کۆمەڵەکەمان کرد کە لە هەموو لایەکەوە بەردەوام بن لە هەڵکەندندا، بەڵام ماندووبوونەکەیان بەهەدەرچوو، تەنیا ئەوەندە نەبێ هەندێ پارچە مەعدەنی ژەنگاوی و، چەند پارچە مس و شووشەو موورووییەکی بەللووری بچووکیان دییەوە. بەڵام ڕێ و شوێنم دانا بۆ ئەوەی فەخورییەکی ساغم چنگ بکەوێ.

تا زیاتریش ئەم کەندرەمان هەڵکەندبایە، گڵێکی ڕەشی زۆر بۆگەن و لەتە کوپەڵە و پارچە ئێسکی وردمان ئەدییەوە. لە ناوەڕاستی گردەکەشدا گۆڕستانێکی بچووکی عەرەبیانە هەیە. بەمجۆرە ئەبینین دەستکاری موسڵمان، تێکەڵ دەستکاری ئاگر پەرستانی فارسی ئەبێ. لە ڕووی هەڵکەوت و سروشت و شێوەی ئەو پارچانەی لە بەشی

سەرەوەی دیمانئەوە، ببێ و نەبێ ئەم گردە هەر ساسانی بووەو، تایبەت بووە بە شوێنی مردوو لێدانان و گومانیشم لەوەدا نیە.

ڕووەو باكوورو بۆ لای خۆرئاوای ئەم گردەوە، كەرسەكی كەلاوەی بچووك هەیە، وا دەرئەكەوێ كاتی خۆی ئەم جێگایە زۆر بەرفراوان بووبێ. لە خۆرئاواشەوە گردۆلەیەكی لەوانی تر گەورەتر هەیە پێی ئەڵێن (ئاش تۆقان). لە گەڕانەوەشمدا، كە بۆ سوار، چارەكە سەعاتێك ئەبوو، گەیشتینە لای هەندێ پاشماوەی وارشێكی بچووك، كە ڕەنگە هەر وارشی شارەكە بووبێ، هەر چەندە گوندنیشینەكان پێیان وایە پاشماوەی بەشێك بێت لەسەر چەمی كفری و بۆ پارێزگاری لە لافاو دروستكرابێ. هەر تەنیا بەشێكی مابێ، كە بەرزاییەكەی چەند پێیەك و درێژیشی سێ سەد پێ ئەبێ كە بە خرە بەردی وردە چاڵ لە دیوی دەرەوە دروستكراوە زەوییەكەیشی لە دیوی ناوەوەی دیوارەكەو بەرووی كەلاوەكاندا، بەرزترە وەك لەوەی سەرووتری، یان لە ڕووی دەرەوە، كەوەك سەكۆ، یان عەمارتەیەك وایەو بەم دیوارە ڕاگیرابێ. گومانی تیانییە كە دیوارەكە خۆی، مێژووەكەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاسەوارەكانی (قەسری شیرین و حۆش كەرو). كەمێك دوورتریش ڕووەو باكور بە سەمتی كفری دا، بۆ پیشتەوەی دیوارەكە شوێنەواری كەلاوە نابینین. لە سەعات دەو چارەكدا (ئەسكی كفری)مان جێهێشت و لە یانزەو پەنجا دەقیقەدا گەیشتینە كفری.

فەرمانم دەركردبوو بۆ ئەوەی هەر پارچە سكەو شتێكی تر، كە گوندنشینەكان دەیدۆزنەوە، بۆمی بهێنن. ئەمرۆ (ڕوبێن) سێ پارچە سكەو پارچەیەك بەردی هەڵكۆڵراوی بۆ هێنام، كە لای هاورێ جولەكەكانی دەستی كەوتبوو، بەڵام لەوە دوورتر بوون دەست بەدەن بۆ ئەوەی تیشكێك بخەنە سەر مێژووی كەلاوەكانی دەوروپشت، لەوە ئەچوو بەتایبەتی بۆ ئەوە دروستكرابن مرۆڤ سەرسام بكەن و زیاتر سەری لێ بشێوێ. سكەیەكیان (ئەرساسی Arsacisn)و، دووەمیان ساسانی و، سێیەمیشیان كوفی بوون، بەڵام بەردە هەڵكۆڵراوەكە خەڵاتێك بوو، سەركەوتنێكی ڕۆمانیایی ئەنواند. بەم جۆرە لە دواییدا توانیم پارچە ئاسەوارێكی جوانی ساسانیم چنگ بكەوێ كە هەندێ نووسینی لەسەر بوو. لە جێگەیەكی تریش كە ناوی (ئۆن ئیكی ئیمام– دوانزە ئیمام)ە و نزیكەی چواردە كیلۆمەترێك لە كفرییەوە دوور ئەبێ و، گردێكی تر، لەو چەندان گردەی لەم ناوەدا هەن و، لەوە ئەچێ هی سەردەمی كەلاوەكانی ساسانی بێت، لەم ناوەدا پەش و بڵاوبوونەتەوە بەرامبەر (ئۆن ئیكی ئیمام)ە، لە زنجیرە زوورگە گەچۆرەكان، چاوگە نەوت ئەبینین.ساڵێكیش بەر لە ئێستا چاوگەیەكی بچووك، لەو زوورگانەدا، لە دووری چەند دەقیقەیەكدا لە خۆرئاوای كفرییەوە دۆزرایەوە. بەڵام ئەو دۆزیبووییەوە، حكومەتی توركی گرتبووی و داركارییەكی زۆری كردبوو، لەسەر ئەوەی ئاخۆ پێش ئاشكرا كردنەكەی، نەوتی لەو چاووگە دۆزراوەیە فرۆشتووە، لە تاو ئەو ئازارەش كە لە ئەنجامی ئەم دۆزینەوە شوومەدا تووشی هاتبوو، ناچار بوو بە ماڵ و منداڵەوە بچێتە ئێران و لەوێ وەكو خۆی ئەڵێ ئاسوودە لێی دانیشتووە. ڕێككەوتیش وا بوو ئەو كاتەی ئەو لە كفری بوو منیش هەر لەوێ بووم، بۆ هەندێ كار هاتبوو، خۆی بەسەرهاتی خۆی گێڕامەوەو، وتی: "خوا ئەو نەوتە بەو توركانە ڕەوا نەبینێ، بەو زوڵمەیانەوە چونكە كاتی من ئەو نەوتەم دییەوە، تافە تاق بوو، بەڵام كە لێیان دام، وشكی كرد، ئێستاش لە چۆرە چۆڕێك زیاتر شتێكی وای تیانییە".

پلەی گەرما، لە سێی دوا نیوەڕۆدا ٨١ پلەبوو، لە دەی شەودا ٦٦ بوو، تاو تاوەش بایەكی كەمی هەبوو، شەویش لە خۆرئاواوە بارانێكی كەم باری و لای خۆرهەڵاتیشەوە بروسكە هەبوو.

– (٢٨)ی نیسان:

بەیانی سەعات پێنج و چل و پێنج دەقیقە سواری ئەسپەكانمان بووینەوە. ئەفسەرەكەش لە گەڵمان هات و، پێی لە سەر ئەوە داگرت، تا ماوەیەكی ڕێگاكە یاوەریم بكات. ڕێگاكەمان بەسەر زنجیرە زوورگێكی چەوەلانییەوە بوو كەڵە زوورگەكانی (كفری) جیا ئەبووەوە و، بەو زوورگانەوە ئەلكایەوە كەپێش چەند ڕۆژێ لێمان دا بوون. ڕێگاكەمان هەر تەنیا ئەو چەمەی كفری ئەهاتە بەر، كە ڕێگایەكی لەو دۆڵەی(چمن)دا بۆ خۆی دروستكردووە، كەبەرەو (ئەسكی كفری – كفری كۆن) لێمان دا. لە حەوت دا زوورگەكانمان بری و كەوتینە ئەو دەشتەی (بەیات)ەوە، كە لە سەرخۆ لە زوورگەكانی كفرییەوە بەرەو (چمن) لێژ ئەبۆوە. لەم ناوەدا دەشتێكی پڕ كشتوكاڵ بوو. لە حەوت و چارەكدا لە شیوێكماندا جۆگەیەكی بچووكی باراناوی تێئەرژا. لە هەشت و بیست دەقیقەدا گەیشتینە (قورو چای – قۆری چای)، كەچەمێكی پان بوو، ئاوی باراناوی كەم تیابوو، بەڵام وەك سەرنجمان دا دیار بوو پێش چەند ڕۆژی سێلاوێكی زۆری سەركەوتبوو، تەنانەت ئەو دەشتەیشی گرتبووە. ئێرە هەوارگەی بەیاتە توركمانەكان بوو، بۆیە سەرۆك خێڵەكەیان (حەسەن)، یان وەك هەندێ جار ئەوترێ: (قەرەقوش بەگ)، هات بەپیرمانەوە بانگ هێشتی كردم بۆ نان خواردن لە گەڵیا. پیاوێكی ڕووگەش و بەسەرو سیماو، ریشێكی سپی جوانی پێوە بوو، زۆر زیرەك و زمان پاراوو ڕەوشت چاك بوو. لەوە ئەچوو هەموو ژیانی هەڵكەوتەی ناو دەربارێكی ڕۆژهەڵاتییانە بێ. ئاگاداری كردم كە بەیاتەكان ئەم ناوچەیەیان لای سوڵتانەوە وەك خەڵات پێدراوەو، لە بەرامبەریا پارەیەك بە حكومەتی عوسمانی نادات. بەڵام ئێستا لە بەرامبەر ئەمەدا ئەبێ سەربازیی بۆ پاشای بەغدا بكەن، لەو كاتانەیدا كە خودی خۆی لە مەیداندا مەشق ئەكات. دیسان ئاگاداری كردم كاتێ كە (نادر شا) ناوچەكەی داگیر كرد، بەیاتەكانی گێڕایەوە بۆ ئامێزی بەیاتی گەورە لە (خوراسان)و، ئەوەیشی لێرە ماون، سەر بە بنەماڵەی سەرۆكن. وتیشی سەرەڕای ئەمانەش، ئەگەر پێوست بكات ئەتوانن هەزار سوار خڕ بكەنەوە. هەندێ عەرەب و خێڵاتی تری ڕاونراویش لە بن دەستی بەیاتدان و ئەسپەكانیشیان چاكن.

سەرۆك خێڵەکەیان ئاگادارییەکی تەواوی لە بارەی خێڵی گەورەیانەوە لە خۆراسان هەیە. بەڵام نەیتوانی پێم بڵێ هۆزەکانی خێڵەکە، بۆ یەکەمجار، کەی هاتوونەتە ئەم ناوە. لە راستیشدا عەرەب باشترین مێژوونووسن و باشترین گێڕەوەی شەجەرەن لە ناوچەکەدا. مۆڵەتم لە بەگ خواست و پێخۆشحاڵی خۆم بۆ دیتن و ئاخاوتنی نیشاندا. لە سەعات نۆدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. بەلای کشتوکاڵێکی زۆردا تێپەڕین (جۆ) بوون، هەندێکیان گەیشتبوون و جووتیاران سەر گەرمی درەوی بوون. جووتیارەکان هەندێ گوڵە جۆیان بۆ هێنام، لە بەر پێی ئەسپەکەمدا فڕێیانداو، هاواریان ئەکرد (دوژمنانتان ئاوا بمرن..) کە بەرامبەر بەمە چاوەڕێی هەندێ پارەیان ئەکرد. لە خۆرهەڵاتیشدا باوە هەموو رووداوێك ئەقۆزنەوە بۆ ئەوەی بیکەنە مایەی خەڵات و شاباش.

لە سەعات نۆ و نیودا گەیشتینە (قیزیل خراپە- کەلاوەسوور)، کە لە سەر ڕێگاکەدا بوو. گردو تەپوڵکەش لەو ناوەدا رووەو حەمرین دیاربوون، کە لای چەپمانەوە بوو، پەرش و بڵاو هەبوون، گردێکی زۆر بەرزی وەك ئەوەی (ئەسکی کفری)مان بینی، کەپێیان وتن (گاور کردە). ڕێیشی تێنەچێت ساسانی بێت. بەڵام من ئەمە هەر بە قسە نالێم، بەڵکو وەك ئەوەی (ئەسکی کفری)، بە دڵنیاییەوە ئەیڵێم.

پاش گەڕانێکی کەم، بەلای کەلاوەیەکی تردا ڕەت بووین، وادیار بوو سەر بەو شارە بوو کە (قیزیل خراپە) بەشێکی لێ پێك ئەهێنا. لە دەو چل و پێنج دەقیقەدا بەلای گوندێکی گەورەدا ڕەت بووین، هی بەیاتەکان بوو، کە ئێستا چۆڵیان کردبوو، چونکە ئەوان لەم وەرزانەدا لە تاو کێچ و بۆ چاوەدێری خەڵەو خەرمانیان لە دەشتدا هەوار هەڵئەدەن. هەوارێکی زۆریشیانمان بینی لە هەموو لایەکدا هەڵیان دابوو.

لە یانزەو دە دەقیقەدا بە گوندێکی تری گەورەدا ڕەت بووین، ئێستا ئیتر زنجیرە شاخەکانی (حەمرین)مان لێ ئاوا بوو، کە بە درێژایی ڕێکردنی ئەمرۆمان کەوتبووە لای چەپمانەوە، چونکە تا ئەهات زیاترو زیاتر رووەوخۆر ئاوا وەرئەچەرخا. (توزخورماتو)مان لێ دەرکەوت، کە (٢٠) پلە بەلای باکووری خۆرئاواوە بوو چارەکێکیش پێش ئەوەی بیگەینێ، لە چەمێکی زۆر پانماندا، کە بەرزایی ئاوەکەی ئێستای ئەگەیشتە ئەژنۆ، پانیشی هەر چەند یاردەیەك ئەبوو، بەڵام لە پایزاندا لەوە کەمتر ئەبێتەوە. ئەم هەڵسانەیشی بەهۆی باراناوی زۆرەوە بوو. چەمەکە پێی ئەوترا (ئاق صو – ئاوە سپی)، لە (ئیبراهیم خانچی)یشەوە ئەهات.

لای چەپیشمانەوە لە دووریی دوو سەعاتەوە گوندی (یەنی چە)مان دی، کە ئەکەوێتە سەر ڕێی پۆستەی ئێستای نێوان بەغداد وتاووق.

لە دوو و نیودا، پاش ئەوەی لە چەمەکەماندا، چەترەکەم هەڵدا، تا سێبەرم بۆ بکات و، شارەزایەکیشم نارد بۆ شار، تا (سەرا – کۆشك)مان بۆ ئامادە بکات. دوای تاوێ حاکم و نوێنەرەکەی (عومەر بەگ- کەموڵکایەتی شاری بە شێوەی تیماریی درا بوویەو، بە میراتی لە باوکییەوە بۆی جێمابوو) هاتنە لام. سواری ئەسپەکانمان بووینەوەو بە ناو باخی (خورما و پرتەقاڵ و لیمۆ و هەنجیرو قەیسی و هەنارو زەیتوون)دا ڕەتبووین، کە بە تەواوی شاریان گرتبوو. لە ماڵە دڵگیرەکەی عومەر بەگدا جێیان بۆ چاك کردین، کە لە چاو ئەوەشدا لە لادێ بوو، بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی بەغدادا، خانوویەکی قەشەنگ بوو، بەڵام تێکرای شارەکە لە قوڕ دروستکرابوو، دانیشتووانیشی تورك بوون و، زۆریان لە (ئیسماعیلی- چراغ سۆندیرەن)ەکان بوون. شەوی شەممە لە (توزخورماتوو) باران باریبوو، زیانێکی زۆری لە باخەکان دابوو. باسی تەرزەکەشیان کردو، وتیان دەنکی زۆر گەورە بوون. پێم وایە ئەو شەوەی لێرە باریبوو، هەر ئەو شەوە بوو کە لە (چوبوق) بێزاری کردین. توزخورماتو ئەکەوێتە نزیك زوورگەکانی کفرییەوە لە خۆرئاوای ئەو دەربەندەوەیە کە ڕێك ئەو زوورگانە ئەبڕێ و، (ئاق صو – ئاوە سپی) پیا دێتە دەشتەکەوە. لەم دەربەندەدا بیرەنەوتێك و خوێڵێنێك هەن، کەمێك لە خوار ئەو زوورگانەشەوە بیرەنەوتێکی تر هەیە، بەڵام خوێڵێنی لێ نییە.

نیو سەعات دوای گەیشتنمان، تەختەرەوانەکە هات. ئەو سەعات شەش دەرچووبوو. ڕۆیشتنی ئەمرۆمان زۆر لەوە زیاتریش ئەبوو ئەگەر یەکسەر بەو راستە ڕێیەدا بۆیە کە بە تەنیشت زوورگەکاندا ڕەت ئەبوو، بەڵام (ئودا- باشی – سەر هۆبە)کەمان ویستی قۆناغی ئەمرۆمان لە بەیات کۆتایی پێ بهێنێ و، ڕێگاکە بکات بە دوو قۆناغی ئاسانەوە، بەڵام کە گەیشتینە بەیات، وا بە بیرمدا هات، چاکتر وایە تا دنیا خۆشە، لە ڕۆیشتندا پەلە بکەین.

– (٢٩)ی نیسان:

بەیانیی بە پەرۆشەوە بۆ دیتنی عەنتیکەکانی قەراخ شار، لە خەو هەڵسام. بیرەنەوتەکەش کەوتۆتە دەربەندی زوورگەکانەوەو، میلێك لە باشووری خۆرهەڵاتی شارەکەوە دوور ئەبێ. لەبەر ئەوەش کە کەوتۆتە ناوەندی چەمەکەوە ئاو سەر ئەکەوێ، لەبەر ئەوە ماوەیەك پەکی ئەکەوێ، وەك پار روویدا. قووڵایی چاڵەکە نزیکەی (١٥) پێ ئەبێ و (دە پێ)ش ئاوی تیا ئەبێ. کە نەوتی ڕەشی تواوەی بەسەرەوە ئەبێ و، هەمیشە وردە بڵق سەری ئەکەوێ. خەڵکەکە بنەکەی هەڵئەگۆزن و توێژە نەوتینەکەی سەرەوەی ئەگرن و ئاوەکەی ئەکەنە جۆگەیەکەوە، کە ئەرژێتە کۆمەڵێك حەوزی بچووکی درێژکۆڵەوە، کە لە ناو ئەو چەمەدا هەڵکەندراون. ئیتر وازی لێ دێنن تا وشك ئەبێتەوە ئەبێت بە خوێیەکی چاکی دەنك وردو سپی و بریقەدارو بێ تاڵیی.

بەشێکی زۆری ئەم خوێیە ئەنێردرێ بۆ کوردستان. داهاتی ساڵانەیش بە بیست هەزار قروش دائەنرێ، کە بەسەر ئەندامانی خێزانی (دەفتەردار)ی کۆچکردوودا دابەش ئەکرێ. بەڵام نەوتەکە موڵکی گوندەکەیە، بەشێکی بۆ (خانووەکە – خانەکە) سەرف ئەکرێ، یان ئەفرۆشرێ و خانووەکەی پێ بەخێو ئەکرێ و، بەشێکی تری بۆ حوجرەی ئاییني و شتی تر سەرف ئەکرێ. ڕۆژانە دوو گۆزە لەم بیرە هەڵئەگۆزن، کە هەر یەکەیان شەش حۆقە، یان (باتمان)ێکی

بەغدادی ئەبێ. بەڵام سەرچاوەی نەوتەکە لە بنی چاڵەکە، یان بیرە کەدایە، کە هەموو گوندنیشینەکان، ساڵانە بە هەرەوەز پاکی ئەکەنەوە. ئیتر خواردن بەسەر هەژاراندا ئەبەخشنەوەو قوربانی ئەکەن و دەهۆڵ و زورنا لێ ئەدەن، ئەمەش هەر بۆ ئەوەی نەوت زیاتر سەربکەوێ. رەنگە ئەم نەریتەیان لە دێر زەمانەوە بۆ مابێتەوە. چاووگە سەرەکییە نەوتەکان لە زوورگەکاندان، کە رووەو کفری، کەمێك لە لای باشووری ئەم چاڵەوەن، ژمارەیان پێنج شەشێك ئەبێ و، بەرهەمیشیان لەم بیرە زۆرترە، بەڵام لەوێ خوێ نەدۆزراوەتەوە. لەوانەیە لە سەرتاپای ئەم ناوچەیەدا نەوت بدۆزرێتەوە. لە نزیك ئەو چاڵە نەوتەی لای زوورگەکاندا زاخ و گلەسپی هەن. ئەمانەش گەردیان وردەو، سپییان هەیەو بە تۆپەڵن. بەڵام خەڵکەکە کەڵك لەم بەروبوومە سرووشتییە وەرناگرن. جۆرە خۆڵێکیشیان دۆزیبووەوە، هەندێ لە شێوەکانی خواردنەکانیان پێ ترش ئەکرد. دیارە ئەبێ ترش بێ و تێکەڵیش ببێ. لێرە (گۆگرد)یش هەیە، گوندنشینەکان بۆ چارەسەری گەری و (خروو- ئالۆش) بەکاری دێنن، کە تووشی مەڕومالاتیان ئەبێ.

ئێستا ئیتر با بێمە سەر باسی دەربەندەکە، کە لە خۆرهەڵاتەوە درێژ ئەبێتەوە بۆ خۆرئاواو، لە شێوەی هەڵکەوت و رووخساریشیا ئەگەر چی بەرینیشە، لە دەربەندەکەی کفری ئەچێ. لە شانی خۆرهەڵاتی ئەو گردەشەوە کە بەرامبەر دەشتەکەیە، چینە زەوی هاوتەریبی ئاسۆیی ئەبینین، بەڵام لای شانی سەرووی دەربەندەکەوە رووەودامێن، بە گۆشەیەکی ٤٥ پلەیی، لێژ ئەبێتەوە، کە تا رادەیەك کەوانەیی و قۆقزە، زوورگەکانیش لای باشوورەوە، زووتر گڵێنن و باراناو خەت خەتی کردوون و هەڵیوەراندوون، لە هەندێ بەشیاندا وەك دیرەگی جیاجیای لێکردوون. لە راستیشدا ئەتوانین بڵێین چاڵی بیرەکە، کەوتۆتە ئەم بەشە رووخاوەی بنی چەمەکەوە، لە هەموو لایەکیشەوە گەچ دیاربوو. زوورگەکانیش لە شانی باکوورەوە، لە تەمۆخ پێکهاتبوون. لە ژێر ئەم هەموو خاك و تەمۆخەشدا وەك لە تاق، یان کەندەڵانێکی خوار خەرەندەکەدا (لەوحی سوورەوەکراو- clay slste)، یان لەوحی شینی سوورەوەکراوم بینی، بەڵام هەرچی ئاو هەیە، هەمووی ئەرژێتە لای باکووری دەربەندەکەوە، زوورگەکەیان دەریوەو کردوویانە بە چاڵێك، یان بەخەرەندێك. لە ژوور سەر خەندەکەشەوە پاشماوەی وارشی قەڵایەکی کۆن هەیە، کە مێژووەکەی نازانرێ، رەنگیشە ساسانی بێت. لە چاڵایی خەرەندەکەشدا ئەشکەوتێکی بچووك لەبەردێکدا هەیە، نەوتی تیایە، لەسەر ئەشکەوتەکەش تاقێك هەیە، لە بەردی چوار گۆشە دروستکراوە، پێ ئەچێ ئەم دەستکردە ئێجگار کۆن بێت. بیریشم چوو باسی ئەو لقە دارینەی سەر رووی ئاوەکە بکەم، کە لە بیرە نەوتەکەدا هەیە، هەردوو سەردەمی گاورەکان کۆنە، بەڵکو هەر بە هۆی پیرۆزیی نەوتەکەشەوە ماوە. خەڵکەکە قەڵاکەش هەر بە هی گاوور ئەزانن.

لەزەویشدا لەسەر چاڵایی ئەو گردەی قەڵاکەی لەسەرە، لە نزیك چاڵی بچووکی نەوتەکەوە پەڵەی زەردی درەوشاوەم زۆر بینی، کە بۆنی (گۆگرد)یان لێ ئەهات، لەسەر زوورگەکەو بەلای باکووری دەربەندەکەوە مەزارێکی بچووك هەیە بەسەر دەشتەکەدا ئەڕوانێ، نیشانەیە بۆ بەسەرهاتێکی ئەفسانەیی، کە لەوێ روویدا بێ و، ئەیدەنە پاڵ ئیمامی عەلی. ئەڵێن هەموو شەوانێکی هەینی، چرایەك هەر لە خۆیەوە گڕ ئەگرێ. رەنگە ئەمەش وەك دیاردە سروشتییەکەی (بابا گوڕ گوڕ) بێت.

دوای ئەوەی لە دیتنی بیرە نەوتەکە بووینەوە، بە رێگاکەی لای بەری خۆرئاوای چەمەکەدا پیاسەیەکمان بەدەوری شارەکەدا کرد بۆ دیتنی کەلاوەکان. بەڵام لێرە کەمێکی نەبێ شتێکی وامان نەدی شایستەی لێ وردبوونەوە بێ. بەلای دەستەیەك لادێیدا رەت بووین، جۆماڵیان ئەکرد، خەریکی دەهۆڵ کووتان و زورنا و نەقارە ژەندن بوون. دروێنەوانانیش هەندێ دروێنەیان ئەکرد. لە خۆرئاوای ئاریشدا هەندێ گردی توورەکە رێژمان بینی، کە شتێکی وایان نەبوو، لە هی تر جیایان بکاتەوە. رەنگیشە بە هۆی ئەو وردە شتانەوی تیایدا دۆزراوەتەوە، کۆن بێ بەڵام من تا ئێستا هیچ شتێکم لەو بابەتە نەدۆزیوەتەوە. لەسەر سەکۆیەك شوێنەواری خانووییەکی چوار گۆشەی بچووکمان بینی، کە پایەی قایم و گەورەی تیابوو، لەوە ئەچوو زۆر کۆن بێ، کەمێکیش لای سەروویەوە، شەش پایەی ترمان بینی، هەموویان بەشێك لە خانووییەکی درێژ کۆڵەیان پێك ئەهێنا و رووەو خۆرهەڵاتی خۆرئاوابوو. وا دیاربوو خانووەکە بریتی بووبێ لە کۆشکێك و دوو هەیوان، دەرگای کۆشکەکە ئەکەوتە خۆرئاواوە، کە لە بەرامبەریا لە خۆرهەڵاتی کۆشکەکەوە دەروازەیەك هەبوو، کە لاشە پانەکانی لەسەر کۆڵەکەی نیوە بازنەیی و هەمووشیان پێچاو پێچ راگیرابوون. بەڵام شێوەی خانوو سازییەکە ئێجگار زەبەلاح بوو. پێم وایە لە کاتی خۆی ئەم کۆشکە، کەنیسە بووبێ چونکە شێوەکەی زۆر لە شێوەی کەلاوەکانی کەنیسەی کلدانی، یان سریانی ئەچێت، کە دیومن. گردۆڵکە توورەکە رێژەکان تا مەودایەکی زۆریش لەم ناوەدا پەرش و بڵاو هەن، کە بەڵگەی ئەوەن ئەم شوێنە لە سەردەمەکانی زوودا جێگەیەکی گرنگ بووبێ. لە گردە سەرەکییەکەشەوە، شاخەکانی حەمرین، لە ئاسۆی خۆرئاواوە بە چاو ئەبینران، ئەڵێن نزیکەی نۆ سەعات دوور ئەبن، لێرەوە بە ئاسانی تا زیاتر رووەو خۆرهەڵات بڕوانین، ئەتوانین هەردوو سنووری زنجیرەی (قەرەتەپە)، یان (زەنگ ئاباد) لە شاخەکانی حەمرینەوە ببینین.

ئەشڵێن ئەو قەڵایەی رووخاوە، یان ئەو وارشەی لەسەر گردەکەی دەربەندەکەدا هەیە، کاتی خۆی درێژ ئەبووەوەو هەر دەربەندەکە خۆیشی ئەگرت، چونکە رووبارەکە لە شوێن ئاوەڕۆیەکی باشدا بەربەست کراوەو پردێکی لەسەر دروستکراوە، لەوە ئەچێ ئەمە هەر واش بووبێ، چونکە وارش و خەرەندەکەش، هەردووکیان لە پرێکدا لە یەك جێدا کۆتاییان دێ. پیاوێکیش کە لەم دواییەدا لە تەمەنی (١٢٠) ساڵیدا مردووە، وتوویەتی لە بیرێتی کە خەرەندەکەو دیوارەکەشی هەردووکیان تا جێگایەکی زیاتریش لەمەی ئێستایان بە گوێی چەمەکەدا درێژ ئەبوونەوە. چەمەکەش لە جێیەکی تەنگەبەردا گیر ئەدرا. وتووشێتی ئەم باسەی لە پیری کۆنە ساڵەوە بیستووە.

لەوانەشە ئەوە بەربەستێك- دەربەندێك بووبێ بۆ پارێزگاری وڵات لە هێرشی ئەو کوردانەی بە درێژایی سەردەمەکان، دراوسێیەکی پەژارە بەخش بوون. ئەمەش بە یەکێك لەو دەربەندانەی کە ئەچێتەوە سەر کوردستان، ڕێگایەکیشی لێ ئەبێتەوە ئەچێتەوە سەر (ئیبراهیم خانچی) کە سەختە، چونکە بە درێژایی ڕێگاکە بەسەر زوورگی بچووکدا ڕەت ئەبێ. ماوەی نێوان توزخورماتو، ئیبراهیم خانچی نۆ سەعات ئەبێ، لە کفریشەوە بۆ ئیبراهیم خانچیش هەر نۆ سەعاتە. ڕێگاکەش تەخت و پاکە.

تاوێ دوای گەیشتنمان (محەمەد ئاغا) گەیشتبوو، کە (ئیشیق ئاغاشی- سەرۆك تەشریفات)ی مەحموود پاشا بوو. بۆ ئەوەی ناردبوو یاوەرمان بێ بۆ چاوساغی کردنی میواندارییەکەی، نامەی بە سۆزیشی لە مەحموود پاشاوە بۆ هێنابووم، کە هەموویان نەزاکەت ئامێز بوون.

لە توزخورماتو (خانوو- خانووی حەسانەوە) هەیە، هەشتا ئەسپی تیایە، پلەی گەرما لە سێی دوای نیوەڕۆدا ٦٦ پلە بوو. لە باشووری خۆرهەڵاتیشەوە (با) هەڵێنەکردو، هەڵکردنەکەیشی توون بوو. دوای نیوەڕۆ بارانیشی لەگەڵدا باران.

- (٣٠)ی نیسان:

هەستم بە ئازارێك کرد کە ڕێی پیاسەی نەدام، بەڵام ئەم زانیارییانەم کۆکردەوە:

ڕووباری (ئاق صو- توزخورما - ئاوە سپی) لە (عەلی نەللو)ی قەرەداغ، لە کوردستان هەڵئەقوڵێ و بە (ئیبراهیم خانچی)دا ڕەت ئەبێ و ئەگاتە تووزخورماتوو. پردەکانی ئەم ناوە هەرییەکەیان قوللەیەکی بچووکی هەیە، کە لە قوڕ دروستکراوەو، بووەتە بەشێك لێی، تا پاسەوانی تیابێ بۆ چاودێری کردنی لە دز، چونکە هەموو شوێنەکانی سەر بە سنووری کورد، لەبەر هێرشی چەتەکانی ئەو گەلەدان، ژمارەی دانیشتووانی تووزخورماتوو، بە پێنج هەزار کەس دائەنرێ.

پلەی گەرما لە حەوتی بەیانیدا ٦٢ پلەو، لە سێی دوا نیوەڕۆدا ٧١ پلەو، دوای نیوەڕۆشدا زریانێکی کەم، بە بارانێکی کەمەوە لە خۆرئاواوە هەڵیکرد. شەو بروسکەی هەبوو کە لە خۆرئاواوە دەستی پێکردو، گۆڕا بۆ باشوور. ئەوەتەی لە بەغداد دەرچووین، ڕۆژێکمان لێ نەچووە بروسکە نەبێت.

- (١)ی ئایار:

لە پێنج و نیودا لە توزخورماتوو دەرچووین، سەمتی ڕۆیشتینەکەمان (٧٥) پلە بەلای باکووری خۆرهەڵاتدا بوو. ئەڕۆیشتین و لە نزیکی لای چەپیشمان دەشتێك بوو، تا ئەهات ڕووەو حەمرین لێژ ئەبووەوە، کە بە ئاسانی زوورگە گەچۆڕەکانمان لێوە دیاربوون. لەوەش ئەچوو لێرەدا وەرچەرخابێتەوە، یان ڕووبکاتە خۆرئاوا. نزیکترین بەشێکی لێمانەوە وەك وارشێکی قولێپدار گرنج گرنج بوو، بەڵام ٨٠ پلە بەلای سەمتی باکووری خۆرئاوادا بوو. ڕووباری (عەزێم)یش لە دووری نیو سەعات، لە ژێر ئەم بەشەوە شاخەکانی ئەبڕی لە ژێر ئەوەشەوە (دمیر قبو)مان ئەدی، کە دەربەندێك بوو، پێشتر قایمکاری تیا کرابوو، چونکە دەرگای ئاسنینی لێیە. وا دیاربوو زوورگەکەش بە پشت ئەو بەشە گرنج گرنجەوە، بەرەو خۆرئاوا وەرئەچەرخێتەوە. لە سەعات حەوتی بەیانیشدا سەمتی ڕۆیشتنەکەمان ٤٥ پلە ڕووەو خۆرئاوا بوو تا لێرەوە زنجیرە گەچۆڕەکە ئەتوت کۆتایی هاتووە، بەڵام من پێم وایە کۆتایی نەهاتبێ، یان بووبێت بە زوورگێکی چەوەڵەی نزم، کە ڕووی ئەکردە خۆرئاواو، لێرەو لەوێش تەمۆخی تیا دەر ئەکەوت. ڕۆیشتنەکەشمان بە تەنیشتی زوورگە گەچۆڕەکاندا بوو، کە کەوتبووە لای ڕاستمانەوە. لە حەوت و چل دەقیقەدا منارەکانی (تاووق)مان لێ دەرکەوتن. چوومە سەر گردێکی بچووك، کە یەکێك بوو لەو زوورگە چەوەڵانەی لقیان لێ ئەبووەوەو ڕاستەوخۆ کەوتبووە لای ڕاستی ڕێگاکەمانەوە. لێرەوە ئیتر بە تەواوی ئەمتوانی (تاووق و تووزخورماتوو) پێکەوە لەمسەرو ئەوسەری باکوورو باشووری ئاسۆ ببینم.

تاووق ئەکەوتە ١٥ پلە بەلای باکووری خۆرئاواداو، تووزخورماتووش ئەکەوتە ١٥ پلە بەلای باشووری خۆرهەڵاتدا. ئیتر هەر لێرەشەوە یەکسەر زنجیرە گەچۆڕەکە دوایی ئەهات، چونکە لە شانی لای خۆرئاوایەوە ئەو هێڵە زوورگە چەوەلەیە دوایی ئەهات، کە سەعاتە ڕێیەك بە تەنیشتیا ڕێمان ئەکرد، هێڵەکەش ڕووی ئەکردە خۆرهەڵات، بەڵام دەشتاییەکەی ناوەڕاست چاڵاییەکی وەك تونکە تونکە، یان زوورگێکی چەوەڵەی پێك ئەهێنا، کە باراناو و سیلاوڕدا بڕی کردبوون و پڕبوون لە جۆگەو چەم و شیوو.

لە دووری چەند یاردەیەکیشەوە، کارێزێك هەبوو، کە بۆ یەکەمجار بوو لەم ڕێیەدا تووشی ببین. کارێزیش بریتییە لە جۆگەیەکی سەرگیراو، بۆ ئەوەی لە کانیاوی بەرزەوە ئاو بگەیەنێتە مەزرای دەشتایی. ئەم جۆگە سەرگیراوانەش لە چەند جێگەیەکدا شوێنی هەڵدانەوەی تیا ئەهێڵنەوە بۆ دیاریکردنی ڕەوتی جۆگەکە. لە دووری دە دەقیقەیەکی تریشەوە چەمێکی پان هەیە، لێوان لێو ببوو لەو باراناوە لە ناکاو بە خوڕ باریبوو.

ئەم چەمە نەکەوێتە سەر ڕێگای نێوان (تاووق و تووزخورماتوو) کەمێك لەولاتریشەوە چەمێکی تر بوو، پڕ بوو لە ئاوی ڕوون. ئێستا ئیتر ڕێگەکەمان ببووە هەورازو نشێوییەکی کەم. لە (١٠)دا گەیشتینە ڕووباری (تاووق چای) گەورەو بە خوڕ، کە لە کوردستانەوە هەڵئەقوڵێ. ئەم ڕووبارە لای ڕاستی ئەو ڕێگایەمانەوەیە کە ئەبوایە پیایدا بڕۆین و، بە قەرەحەسەندا ڕەت ئەبوو. هەر کاتی پێویستی بکردایە ئەوەندەی جۆگە بۆ چەندان مەزراو گوند لێ هەڵئەگیرێ، کە ئاوی تیا نامێنێ. زۆربەی ئاوەکەیشی لە هاویندا بۆ کشتوکاڵ بەکاری ئەبرێ. لە پاییزانیشدا، لەم جێگایەدا، قووڵایی هەر پێیەك ئەبێ، یان پێ و نیوەێك ئەبێ. ئاوەکەیشی هەر بە تەنیا ئەم گوندە پاراو ناکات، بەڵکو ئەگاتە گوندێکی زۆری سەرو خوارووی خۆیەوە. لە زستان و بەهارانیشدا کە سێلاوی باراناو هەڵئەستێ، ئەبێتە ڕووبارێکی زۆر گەورەی وا، کە پانتایی ڕێڕەوەکەی خۆی لێوا و لێو ئەکا، کە پانتاییەکەی نیو میل

ئەبێ. ئیتر ئەبێتە سێلاوێکی ترسناك، تاشە بەرد را ئەداو، چاڵی و، کەندی واش لە ڕێڕەوی خۆیدا دروست ئەکات، کە هەمیشە لێدانی ترسناك، یان هەرگیز نابێ. ئاوەکەیشی لە ناکاودا هەڵئەستێ. وەکو بیستمان زۆر جاری وابووە، ڕێبواران لە ناوەڕاستەکەیدا بوون، کە ئاوەکەی لەناکاودا هەستاوە، ئیتر یان خنکاون، یان بە گران ڕزگار کراون. لەم چەند ڕۆژەی دوایشدا بە هۆی بارانی خوڕەوە، ئاوی (تاووق چای) ئێجگار زۆر هەستابوو، بۆیە چەند تەرمێکی خنکاو و کەلاکی چەند ئاژەڵێکی خنکاوی بەسەرەوە بوو. ئەمە هەمیشە لە کاتی بارانی خوڕو نا ئاساییدا ڕوو ئەدات. وەك پار هاوین باریبوو. بەڵام ئێستا لێدانی زۆر ئاسان بوو. ئەفسەرەکە بە نزیکەی پەنجا کەسێکەوە (بە تەپڵ و زوڕنا و نەقارەکانیانەوە) هاتبوونە پێشوازیمان بۆ یارمەتیدانمان لە پەڕینەوەی خۆمان و کەلوپەلەکاندا. لە کاتی پەڕینەوەدا لە ناوەڕاستی پانتاییەکەدا دوو کانیمان بینی، قووڵایی یەکەمیان دوو پێ و نیوو، پانتاییشی (١٠، ١٢) یاردە ئەبوو قووڵایی دووەمیشیان نزیکەی سێ پێ و نیو ئەبوو، پانتاییشی لەنێوان بیست تا سیی یاردە ئەبوو. هەردووکیشیان خوڕ بوون، بنەکانیشیان پڕبوون لە تاشە بەردی گەورە.. دوێنێ ئاو زۆر ببوو، بەڵام لە شەودا ئاوەکەی کەمی کردبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سووکە ترسێکی هەر خستە دڵێ هەندێ لە بەغداییەکانی دەستمەوە.

پەڕینەوەمان لە ڕووبارەکە، بەهەمووی بیست دەقیقەی خایاند، ئیتر ئەفسەرەکە خۆی و کۆمەڵەکەی جێیان هێشتین و، چوون بۆ یارمەتیدانی تەختەڕەوانەکە.. پاش ئەوەی لە ژێر چەترەکەمدا قاوەیەکمان خواردەوە سواری ئەسپەکانمان بووینەوەو، ڕوومان کردە گوندەکە، کە نێوانمان هەر دوو میلێك ئەبوو، بەڵام بە نیو سەعات بڕیمان.

بەلای منارەیەکی جوان و دێرینەدا ڕەت بووین، کەوتبووە لای ڕاستمانەوە، لە خشت دروستکرابوو. پێ ئەچێ پاشماوەی سەردەمی خولەفاکانی بێ. هەروەها بەلای هەندێ مەزراو ئەو مەزارانەدا ڕەت بووین، کە زیارەت ئەکران. ئەمەش وای ئەگەیاند کە ئەم شوێنە کاتی خۆی فراوانتر بووبێ، بەڵام ئێستا گوندەکە ئێجگار پیسەو، بریتییە لە خانێك کە شەست ئەسپی تیایە. پێش ئەوەش بگەینە (چای)، یان ڕووبارەکە، دوو میلێك لەولای چەپمانەوە، گوندی (عەلی سەرای) و لای ڕاستیشمانەوە لە دووری میلێك، لە بەری ڕاستی ڕووبارەکەدا، مەزاری (زبیەنولعابیدین)مان بینی. کە خەڵکێکی زۆری لە وانەی چاونێشەیان هەیە، ئەچنە سەری. زۆر نیگەرانی خۆ ئامادە کردن ببووم بۆ قۆناغی دووەممان، کە چاوەڕێم ئەکرد بە ناخۆشیی بیگەینێ، چونکە پێیان وتبووین حەوت سەعاتێك ئەخایەنێ، کە چی بە پێنج سەعات و نیو بڕیمان. کە کاتێکیش گەیشتین، دەستەیەك لە پیاو ماقوڵانی گوندەکە هاتنە پێشوازیمان، کە مەلاکانیان لە پێشیانەوە بوون، پیاوی باڵا بەرزو سەرو سیما جوانیان تیابوو.

کە بەسەر ئەسپەکەمەوە ئەبووم، محەمەد ئاغای چاوساغ و میران ئەواز، زۆری لێ ئەکردم کە هەوسارەکەی ڕابکێشێ، هەرچەندیشم تکا لێ ئەکرد کە ئەو کارە نەکات، بەڵام بێهودە بوو، پێی ئەوتم لەبەر خاتری مەحمود پاشا ئەمە ئەکات و، حەزیش ئەکات وەك مەحمود پاشا سەیرم بکات.. ساڵی پار، کە مەحمود پاشاو، شازادەی کرماشان، پەیمانێکیان دژی تورك بەستبوو، ئەم ئاغایە، سەرکردایەتی دەستەیەکی کردبوو، هەڵیان کوتابووە سەر ئەم گوندەو تالانیان کردبوو. دیاربوو گوندنیشینەکان مەبەستیان بوو دڵنەوایی بکەن، لە ترسی ئەوەی نەك لە داهاتوودا سەردانێکی وەك ئەوەی



کلۆدیوس جیمس ڕیچ

پێشوویان بکاتەوە. زۆریان ئەهاتن و دەستیان ماچ ئەکرد، بەڵام هەر ئەوەندەی دیار نەما، ئەیانوت: (خوا خێر نەهێنێتە ڕێی، هەر ئەم بوو، ساڵی پار گوندەکەمانی تالان کرد).

سەر لە بەیانی پلەی گەرما (٦١) بوو، لە سێی دوای نیوەڕۆدا (٧٢) پلەو، لە دەی شەویشدا (٦٦) پلە بوو، بەیانی لە خۆرهەڵاتەوە (با) هەبوو. لە سێی دوای نیوەڕۆدا هەور بەری ئاسمانی گرت، بەڵام کەش و هەوا هێمن مایەوە.

– (٢)ی ئایار:

کە بیستمان بە تەنیشت گوندەکەوە کومەڵە کەلاوەیەك هەن، شایانی دیتنن، ئەم بەیانییە چووینە دیتنیان. بریتی بوون لەو منارەیەی دوێنێ دیمان و پاشماوەی دیوارێکی قوڕ، کە ڕووی پێشەوەی لە خشت دروست کرابوو، خشتەکانیان لێ دەرهێنابوو. دەرگایەکی بچکۆلەشمان بینی، کە ئاسەوارێکی زۆری خانووسازییەکی جوان، لەسەر شێوەی ئەوەی (تەکییە)و، (موستەنسرییە)و نمونە جوانەکانی خولەفاکانی بەغداد ئەچوو، (ئۆلیڤەر)یش ئەم کەلاوانەی دیبوو، بەڵام وای پێ ڕاگەیاندبووین کە سەر بە (تووزخورماتوو) بوون، بەبێ ئەوەی هیچ پێویست بکات. ئەمەش وامان لێ ئەکات گومان لە یادداشتەکانی بکەین، یان بەلای کەمەوە گومان لەوەش بکەین کە پەیوەندەی بەم باسەوە هەیە، چونکە لەوە ئەچێ هەر پشتی بەبیرەوەری بەستبێ. خۆیشی دان بەوەدا ئەنێ کە باسی وردەکارییەکانی ئەکات، بەڵام ئەگەر بیەوێ

ئاماژەیان بۆ بکات، ئەبێ ناوی شوێنەکانی لە یاد بێ، ئەمەو بۆ دەرخستنی ڕاستیش ئەبێ ئەوە بڵێم کە ئەمە یەکێکە لەو هەڵە زۆر بچووکانەی تا ئێستا لە یادداشتەکانیا دەربارەی باسی ناوچەکە دیومە کە زۆر بە ڕاستی باسی ئەکات‌و، جێی سوپاسە.

لەوسەری گوندەکە بەدەم ڕێکردنمانەوە، بەلای مەزار، یان گلکۆیەکی بچکۆلەدا ڕەت بووین، گومەزێکی درێژ کۆڵەکەی وەك ئەوەی (سەییدە زوبیدە)ی بەغدای لەسەر دروستکرابوو، بەڵام لە رووی شێوەو جوانیی خانووسازییەکەوە بە هیچ جۆرێك بەو ئەنگەیشت گوندنیشینەکان ئاگاداریان کردینەوە کە ئاسەواری کەنیسەیەکیش هەیە. ئەمەش ڕێی تێنەچێ، چونکە ئەم جێگایە یادگاری کورسی قەشەکانی کلدانی بووە. ناوی ئەمەش لە دێرینترین سەدەکانی مێژوودا هەیە. ئەو کەلاوەیەشمان بینی کە گوندنیشینەکان پێیان وتین گوایە کەنیسە بووە، میلێك، یان میل‌و نیوێك، یان دوو میل ئەکەوتە لای ڕاستی ڕێگاکەمانەوە، بە دووربین سەیرم کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی دڵنیا بووم کە شتێکی وانییە، کاتم بەسەیر کردنەوە لە دەست نەدا.

لە دواییدا لە شەش‌و چارەکدا ڕۆیشتین، وەك دوێنێ زەوی بە ئەفسەنتین داپۆشرابوو (بە تورکی پێی ئەڵێن: یاوشان)و، جاترە کێوی‌و رووەکێکی زۆری تریش، بەڵام لەبەر ئەوەی نە ئەمناسین، ناویانم نەئەزانی. ئەفسەنتینیش بۆنێکی خۆشی لێ ئەهات، دڵی پێ ئەکرایەوە. هەروەها جۆگەیەکی زۆرمان بینی، هێشتا سەوز بوون. دروێنەوانان خۆیان بۆ دروێنەی هەندێك ئامادە کردبوو"[٤٣].

*** گەشتی (ئەلمونشیئ ئەلبەغدادی - المنشئ البغدادي):**

"ئەم گەشتە لە ماوەی سەردەمی (داود پاشا) رووی داوە، کە خۆی ناساندووە بە ناوی (سەید محەمەد کوڕی ئەحمەد ئەلحوسێنی ئەلمنشیئ ئەلبغدادی) کە یەکێك بووە لە فەرمانبەرەکانی بەریتانیا لە بەغدا، کە تاکو ساڵی (١٨٢٠)ی زاینی لە پیشەکەیدا ماوەتەوە کە ناسراوە بە (سەید محەمەد ئاغای فارسی) هاوڕێ بووە لەگەڵ (کلادیۆس جیمس ریچ)، جێنیشینی بەریتانیا لە بەغدا لە کاتی گەشتەکانی بۆ ناوچەکانی شارەزوور، سنە، سەقز، کەرکوک، پردێ، هەولێر. ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەم گەشتەیدا بۆ ئەوەیە تا زانیاری زۆر لەسەر پاشماوەو شوێنەوارەکانی ئەم ناوچانە کۆبکاتەوە، هیچ شتێکی فەرامۆش نەکردووە کە پێیدا تێپەربووبێت، لە بواری ڕێگا، خانوو، ناوچە، شوێنە جۆر بە جۆرەکان.

".. لە گوندی (قەرەتەپە)وە بۆ (کفری) نزیکەی حەوت فەرسەخ بوو، ئەم ڕێگایە بێ بەش نەبوو لە بەرزی‌و نزمی جۆراو جۆر، ناوچەیەکی چۆڵەوانیە. لە ڕێگادا (چای) رووبارێك هەیە کە قامیشەڵانە، کە بە فارسی (نی)و بە تورکی (قامیش)ی پێ دەوترێت لەسەر ئەم رووبارە پردێکی بۆ کراوەو ئاوەکانی ڕێژەی خوێی تێدایەو لە چیای (حەمرین) ەوە ئاوەکەی لێ هەڵدەقوڵێت.

کفری ئاوو هەواکەی سازگارە، لەلایەکی چیایەکەیەوە، ئاوەکانی لە چەند سەرچاوەیەکی جۆراو جۆرەوە دێت کە ئاوەکەی سازگارە، ژمارەی خانووەکانی کفری نزیکی دوو سەد ماڵ دەبێت، بێستانی چاکی تێدا هەیە کە شووتی‌و کاڵەکی سووری تێدایە، زۆر جۆرێکی چاکە خەڵکی شاری (کفری) بە زمانی کوردی‌و تورکی قسەدەکەن‌و هەندێکیان لە رووی ئاینیەوە سوونە مەزهەب‌و بەشێکیان (عەلی ئیلاهی) بووە.

لە دەرەوەی شارەکە رووبارێکی هەیە کە لافاوی هەیە لە جێگای ئەو لافاو و ئاوانە پاشماوەی تەلارسازی کۆنی تێدا هەبووە بەڵام ئێستا کەلاوەیە، کاتێك نزیکەی دە پێی بە درێژی‌و پانی‌و بە قووڵی دوو پێی هەڵکەندنمان کرد، تەلارسازی دەرکەوت کە دیوارەکانی ئەخشی جۆراو جۆری تێدا هەبوو.

لە دووری تەنها فەرسەخێکەوە لە کفری چیایەك هەیە نزیکەی حەوت ئەشکەوتی تێدایە، لە هەر ئەشکەوتێکدا سێ گۆڕی تێدایە لە دووری میلێك قەڵایەکی رووخاومان لەسەر چیایەکە بەرچاو کەوت، نەمانزانی چۆن ئاوی بۆ ڕۆیشتووەو چۆن خەڵکەکەی ژیاون بۆ بەدەست کەوتنی ئاو، کە سەرچاوەی ئاوەکە نزیکەی فەرسەخێك زیاتر لێی دوور بووە.

لە دووری فەرسەخێك لە کفرییەوە پاشماوەی (ئەسکی کفری) هەیە کە بە مانای (کفری کۆن) دێت لە لای سەرووی کفری‌و لەسەر گردێکی بەرز، درێژییەکەی چوار سەد پێ‌و پانی سێ سەدو بەرزی پەنجا پێ بوو، لە سەردەمی کۆندا شارۆچکەیەکی تۆکمەبووە، بەڵام لە ئێستادا کەلاوەیەکی رووخاوەو تەنها دیوارەکان‌و پاشماوەکانی ماوە کە نزیکەی پەنجا پێ درێژ بووە، لە یەکێك لە خشتەکانی نووسراوی لەسەرە.

لە کفرییەوە بۆ دووزخوورماتوو، حەوت فەرسەخە، لە (قۆری چای) کە رووبارێکی ووشکە شارکە دەبڕێت، ئەم رووبارە لە باراناو لە وەرزی بەهاردا هەڵدەستێت بۆ پەڕینەوە بەسەریدا زەحمەت دەبێت، لەو ناوچانەدا هۆزی (بەیات) هەیە، کە ژمارەی خانووەکانی نزیکەی هەزار ماڵ دەبێت، بە زمانی کوردی‌و تورکی‌و عەرەبی قسەدەکەن. هەندێکیان شیعە مەزهەبن‌و هەندێکی تریان سوونی مەزهەب، ئەسپی چاکیان هەیەو لە جۆری بەناوبانگە لە جیهانی عێراقی عەرەبیدا.

لە کاتی نزیك بوونەوە لە دووزخوورماتوو رووبارێکی گەورە هەیە، ئاوێکی زۆری هەیە لە وەرزی بەهاردا لە چیایەکی نزیك لە شارۆچکەکە، نەوتی رەش هەیە لەگەڵ خوێ، ئەم کانزایە بە دەست دێت لە بیرێکی گەورە کە بە تەنشیتییەوە ئاوگرێکی گەورەی هەیە، کە ئاو لە بیرەکەوە دەردەچێت، بە پڕبوونی ئاوگرەکە نەوتەکە سەردەکەوێتە ئاوەکە، بۆیە کۆی دەکەنەو، ئاوەکە لە ئاوگرەکەدا دەمێنێتەوە.

هەندێك لە هاووڵاتیانی ئەم شارۆچکەیە، ئاو دەخەنە چاڵەکانەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، وازی لێ دێنن تا بەوەی خوێیەکە دەنیشێت، ئەمە کارییانە لە دەرهێنانی نەوت‌و خوێدا.

لەو چیایەی تەنیشتیدا، خۆڵێکی سپی هەیە پێی دەوترێت

(گەچ)، ئەم خۆڵە پاك دەكرێتەوە لە ئاو، لە ئاوەکەشی جۆرە ترشیەکی لێ دەردەهێنرێت بەکاردێت بۆ خواردن. تورشیەکەی زۆر.. زۆرە.
کبریت لە چیایەکی تەنیشتییەوە هەیە بەرامبەر ئەو چیایەی کە لەسەر لووتکەکەی قەڵایەکی هەیە کە لە بەردو گەچ دروست کراوە، چوار دەرگای هەیە، لایەکی رووخاوەو سێ لایەکەی تری دیوارەکانی تاکو ئێستا ماوە، چونکە رۆیشتن بۆ لای بە شوێنێکی تووش و تەنگدا سەرکەوتنی مرۆڤ زۆر بە زەحمەت دەگاتە سەری.
هەر بەو شێوەیە لە سەرووییەوە بەردەوام بە دووری میلێك، گەلێك تەلارسازی هەیە کە تووشی کاولکاری بووە. بیناکارییەکی چوارگۆشەیی کە چوار دەرگای هەیە، هەر یەکەی بەرامبەر ئەوەی ترە، بەرەو رووی رۆژهەڵات، گردێك هەیە بیناکارییەکی گەورەی لەسەرە تووشی داررووخان بووە، لە شوێنێکی تردا هەشت (بورج) هەیە کە تووشی داررووخان بوونە.
لە (دووزدا) جۆرەها ترێو میوە بە شێوەیەکی زۆر هەیە، خورما هەیە بە کەمی بەڵام شەرابی زۆرە. هەموو خەڵکی شارۆچکەکە دەخۆنەوە، گۆرانیبێژی تێدایە، هەندێکیان (عود) دەژەنن. زمانیان کوردیو تورکییە، بیروباوەریان (عەلی ئیلاهیە)، میوانداری بێگانە دەکەن و رێزیان دەگرن لەو میوانداریەیەدا، ئافرەتیان بە ناوبانگن بە جوانیو خانەدانی، ژمارەیان دەگاتە نزیکەی هەزار ماڵ، شوێنێکی هەیە بۆ پۆستە (تاتار).
لە دووزخورماتوو بۆ داقووق (تاووق) نزیکەی حەوت فەرسەخ دەبێت، لە رێگادا دوو رووباری گەورە هەیە کە هیچ پردێکی لەسەر نییە، یەکێك لەو دوو رووبارە ئاوەکەی شۆرە.
داقوق لەسەردەمی رابردوودا دەیانوت(شاری مریشك) ە لە سەردەمی خەلیفەکانی عەباسی دا شارۆچکەیەکی گەورەبووە، لە دەرەوەی شارۆچکەکە منارەیەکی کۆنی هەیە، شوورەکەی کۆنە، دەرگاکانی تاکو ئێستا لە جێگەی خۆیەتی.
تاووق لە فەرمانی فەرمانرەواکاندا نووسراوە بە شێوەی (داقووق). خەڵکی ئەم شارە هەموویان لەسەر مەزهەبی سوونەدان، کاتێك نوێژ دەکەن، ژمارەی دانیشتووانی شەست کەس دەبێت، دەزگای پۆستەی هەیە کە نزیکەی سەد ئەسپی ئامادەکراوی هەیە بۆ کاری (تەتار)، کاتێ پۆستە لە ئەستەمبولەوە دێت یان بۆی دەروات هەروەها ئەسپەکان دەگۆرێت لەگەڵ هەر دەروازەی پۆستەیەکدا.
لە (تاووق)ەوە بۆ (لەیلان)، چوار فەرسەخ بووە، لەیلان یەکێکە لە گوندەکانی کەرکوك، بریتییە لە سێ گوندی بچووك نزیك لە یەکترەوە. لە رێگاوە چیایەکی بچووك هەیە کە رێرەوی کاروانسەرای پێدادەروات. لە لەیلانەوە بۆ کەرکوك سێ فەرسەخە. ئەو سێ دێیەی لەیلان هەرییەکەیان (٤٠٠) ماڵ دەبێت، هەموویان پیشەیان کشتوکاڵە، بە زمانی کوردیو توورکی قسەدەکەن، زۆربەیان لەسەر رێبازی (عەلی ئیلاهی)ین، بەشێکی کەمیان لەسەر مەزهەبی شافیعین.
لە لەیلانەوە بۆ (خر لەیلان) دوو فەرسەخ و نیو دەبێت، خر لەیلان لە ناحییەی قەرە حەسەنە کە یەکێکە لە ئاقارەکانی سلێمانی، کە هاوسنووری نێوان کەرکوك و وڵاتی کوردانە، کە نزیکەی شەست گوند دەبێت.
ئەفسەری ئەم شوێنە لەلایەن پاشاکانی وولاتی کوردانەوە دادەنرێت، هەموو دانیشتووانی بریتییە لە کورد، لە هۆزە عەرەبەکان هۆزی (ئەلرەواشد)ە کە لەوێ نیشتەجێن، لە کشتوکاڵیدا کار دەکەن، ژمارەیەکی زۆر بێستانیان هەیە، بەهار لێرە زۆر جوانە، هەوایەکی سازگارو ئاوەکەی بەتامە کە خرەکە پێکهاتووە لە ئاوی رۆیشتووی شوێنەکە.
لە (خر لەیلانەوە) بۆ (چەمچەماڵ)، چوار فەرسەخ و نیو دەبێت بریتییە لە بیابانێکی پر لە دارستان و لەوەر، دانیشتووانی ئەم ناوچەیە هەمووی لە هۆزەکانی کوردن.
هەر لەم شوێنەدا قەڵایەك هەیە، دەگەرێتەوە بۆ سەردەمێکی بچووك، دەڵێن گوایە شاپوور کوری ئەردەشێری ساسانی دروستی کردووە، مەزهەبی ئەم شوێنە شافیعین.
لە تازە خورماتوو بۆ کەرکوك حەوت فەرسەخە، کەرکوك شارێکی جوانە قەڵاکەی لەسەر گردێکە، شارەکە لە دەوروبەری قەڵادایە، خەڵکەکەی شەرانگێزن، هەموویان تورکی (یەنکچرییە)ن، کوردەکان زۆریان لەسەر مەزهەبی (شافیعی)ن، هەندێکیان حەنەفین، نزیکەی سەد گوندیان هەیە، هەموو دێیەکانی لەسەر (عەلی ئیلاهین) خەڵکی کەرکوك پیرو گەنجی شەراب دەخۆنەوە، پێشوازی لە میوانی غەریب دەکەن، بەوەفان، لە زۆربەی کاتدا ئیش و کارەکانی غەریب جێ بە جێ دەکەن، شەر لەگەڵ یەکتردا دەکەن لەپێناو پارێزگاری کردن لێی، لە هەموو ساڵێکدا نزیکەی بیست تا سی کەس دەمرێت بە بێ هۆو رووداو.
هەموو ماڵەکانی قەڵاو رووەکانی، نزیکەی شەش هەزار ماڵ دەبێت، نزیکەی سەدو پەنجا ماڵ هی مەسیحییەکانن نزیکەی سێ سەد ماڵ هی جولەکەکانە. پیادەکانی (بندقین) لە کەرکوکدا بە زۆری دەبینرێت، بە رووباری کەرکوك دەڵێن (خاسە)[٤٤].

***گەشتی (ستیفن هیمسلی لۆنگریك):**
"یەکێکە لە رۆژهەڵاتناسەکانی ئینگلیز کە گەلێك رووداوی مێژوویی بەبێ لایەنی نووسیوەتەوە، لەسەرەتای دروستبوونی حکومەتی عێراقدا، پشکێنەری کارگێری بووە لەو حکومەتەدا. لە باسی کەرکوکدا باسی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی رشانەوەی کردووە لە ساڵی (١٨٣٠)دا، کە ژمارەیەکی زۆر تووشی ئەم نەخۆشیە بوون، دانیشتووانی ئەم شارە بە کوردیو شارەزووی قسە دەکەن، لە باسی قەڵاکەدا باسی ئەوە دەکات کە قەڵایەکی بەهێزو توانای بەرگری هەیە"[٤٥].

*** گەشتی (جیمس بیلی فریزر) بۆ بەغدا لە ساڵی (١٨٣٤):**
"یەکێکە لە گەریدە ئوسکتلەندییەکان کە گەشتێکی دوورودرێژی کردووە بە ناوچەکانی کوردستان و عێراقداو گەلێك لە ناوچەکانی کەرکوك گەراوە وەکو قەرەتەپەو کفریو گەرمیان و ئالتون کۆپریو باسی بڵاوکردنەوەی کولێرە

دەکات لە کەرکوکدا"[٤٦].

*** گەشتی کۆنت دۆسێرسی بۆ کوردستان (١٨٣٩، ١٨٤٠):**

"(کۆنت دۆسێرسی)و دەستەیەک لە هاوڕێکانی بە نوێنەرایەتی دەوڵەتی فەرەنسا، ڕۆژی (٣٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٨٣٩) لە (بەندەری تولۆن)ەوە بە کەشتی بەرەو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کەوتنەڕێ، لە ڕێی (تەرابزوون)ەوە دێنە نێو خاکی تورکیا یەکەمین هەنگاویشیان بۆسەر خاکی کوردان، گوندی (داهار)ی کوردستانی باکوور، بەڵام لە ماوەی گەشتەکەیاندا سەریان لە هەریەکە لە : کفری، دووزخورماتوو، داقووق، کەرکوک، ئاڵتوون کۆپری داوەو چەند ڕۆژێک تێیدا ماونەتەوە.

".. ئێمە بە ناچارییەوە شەوێ لە (کفری) ماینەوە، گوندێکی مەزنە، شەقامەکەی باش و تەختە، بەڵام هێندە دونیا تاریکە، بە ئاستەم دەتوانین دوو هەنگاوی بەردەم خۆمان بناسینەوە. لەسەر ڕێگەکەماندا ڕووبارێکی پان و بەرین هەیە کە تا ئەندازەیەک ووشک بوو، لێرە بێشەڵانێکی چڕ لە بری ئاو دەبینرا کە بۆق و مارماسی تێدا دەژیا وێڕای ئەمە، هێندە تینوین بە ناچارییەوە بڕە ئاوێکی کەمی نێو ئەستێڵکەکانمان خواردەوە. ماوەی یەک سەعات حەواینەوە تا ئەسپەکانیشمان پشوو بدەن، کاتێک سەر لە نوێ سواری ئەسپەکانمان بووینەوە بە تەواوەتی شەو ڕاشکا. ئەم ڕەوتە کشوماتە لە نێو تاریکیدا هێندە خەمناک بوو، بیرو خەیاڵاتی پەرێشان کردین.

کاڵەکەکەی بە تایبەتی میوەکانی ئەم دەڤەرە زۆر بە چێژن، ئێمەش وەک گەشتیارێکی بە ویژدان پەی بەناوبانگی میوەی ئێرە دەبەین.

دووز خورماتوو، گوندێکی مەزنەو (١٢٠٠) کەس ژمارەی دانشتوانییەتی، دوای حەوت سەعات ڕێگە برین بەنێو دەشتێکی پان و پۆڕو پڕ ماندووییەتیدا گەیشتینە ئێرە.

دووز خورماتوو لە نێو ئەو ناوچە لەعنەتییەدا، دەڤەرێکی دڵگیرە و ناوی بەرفرەی هەیە. ئەم شوێنە جێگەی چاوتێبڕینی یاداشتی بەغداشەو کۆشکی تێدا بنیات ناوە، ئێمە شەوێ لەو کۆشکەدا ماینەوە، ژێر پەنجەرەی کۆشکەکە، ئاوێکی بێگەردو قووڵی پێدا دەڕوات، لە دووزخورماتووە تا تاووق حەوت سەعات ڕێیە ئەم گوندە هێندەش جێگەی سەرنج نییە، بەڵام ڕووباری (فاوشکای) لە تەک حەسارەکەیدایەو نزیکبوونەوەی لە کاتی شەودا مەترسیدارە، چەند ئارامگەیەکی پیرۆز لە دەوروبەری گوندەکەدا دەبینرێ.

ڕۆژی (٢٨)ی تەمووزی ١٨٤٠ ماوەی نۆ سەعات ڕێگامان بڕی تا گەیشتینە تاووق، ئێرە گوندێکی گچکەیە کە لەبناری چیاکانی کوردستاندایە. دەمانویست یەک ڕۆژ لەوێ پشوو بدەین، ئەمەش دەبووە هاندەرمان، کەش و هەواکەی باراناوییەو زایەڵەی هەورە بریسکەمان دەبیست بە داخەوە ئەم بریسک و هوری هەورە بە هیچ شێوەیەک هەواکەی فێنک نەکرد، لە بری بارانیش ڕەشەبایەکی توند دەهات کە لە عەرەبستان بە (سموم) یاخود (خوماسینی) ناوی دەبەن.

بە هەرحاڵ وێڕای مەترسییەکانی ڕەشەبای (خوماسینی) درێژەمان بە ڕێگای خۆمان دا، نزیکەی سەعات دووی پاش نیوەشەو گەیشتینە شاری کەرکوک.

کەرکوک یەکێکە لە شارە گرنگەکانی کوردستان، زۆر نزیکە لە چیاکانەوە، ناتوانرێ ئەو شارە بە بەشێک لە شارە عەرەبییەکان بژمێردرێ، چوار تا پێنج هەزار دانیشتووانی هەیەو لە نێویاندا (٣٠٠-٤٠٠) کەسیان کاتۆلیکن، ئوسقوفێکیان هەیە لەم ساتەدا لێرە نەبووە.

هەتا لە کوردستان نزیکتر ببینەوە، ژمارەی کلدانیە کاتۆلیکەکان زیاتر دەبن گرووپێکی بەربڵاوی کاتۆلیکەکان نەک تەنها لە شارەکان، بەڵکو لە گوندە گچکەکانیشدا دەبینرێن.

ڕووبارێک شاری کەرکوک دەکات بە دوو بە شەوە، لە وەرزی باراندا بڕێکی گرنگی زەوییەکەی کە لە ساتی گەشتەکەی مندا لە بەردەڵان دەچوو، ژێر ئاو دەخات و پاراوی دەکات.

خانووەکانی بە شێکی شارەکە بە شێوازی پێپلیکانەیی وبە شێوەی (کورسییەکانی شانۆ) دروستکراون، وێڕای ئەوەی زۆر هەژارن بەڵام دیمەنێکی سەرنجڕاکێشیان هەیە.

ئێمە لە کەرکوک لە تەک لافاوی ئەو بارانەدا ڕەشماڵمان هەڵدا، چونکە هەمیشە دەمانویست پتر لە ئاوەکەوە نزیک ببینەوە، لێرە دەمانتوانی چیامەزنەکانی کوردستان لە دوورەوە ببینین کە ترۆپکە بەفرینەکانیان لە نێو هەوردان و نزیکایەتیمان لەم چیایانە ببووە مایەی ئەوەی دوای ئەو گەرما پڕووکێنەرەی لەو ڕۆژەدا بینیمان هەنووکە سروەیەکی خۆشمان بەسەردا بێت. بەداخەوە دیسانەوە ناچار بووین چەندین دەشت بڕین تا بگەینە ناوچە شاخاوییەکان.

ڕۆژی (٢٩)ی تەمووزی ساڵی (١٨٤٠) کەرکوکمان جێهێشت. لە دوا ڕێگەماندا گەلێ ماندوو بووین، چونکە هەواکەی زێدە گەرمەو ئەسپەکانیشمان شەکەتن و زۆر پێویستمان بە حەوانەوەیە، بەو پشوودانەش هیلاکیمان تا ئەندازەیەک ڕەوییەوە.

ڕۆژی (٢٠)ی تەمووز شارمان لە دەمە دەمی زەردە پەردا جێهێشت بۆ گەیشتن بە ئاڵتوون کۆپری هەشت سەعات ڕێگەمان بڕی گوندێکی مەزنەو دەکەوێتە کەناری ڕووباری زابەوە، ئەم ڕووبارە لە چیاکانی کوردستانەوە هەڵدەقوڵێ پردێک لە دەروازەی شارەکەدا دەبینرێ، بە شێوازی کەوانەیی دروستکراوەو بە ساغی ماوەتەوە. ئەم پردە سێ پایەی هەیە، دوو پایەی گچکەو ئەویتریان گەورەیە. دیمەنی پردەکە قەشەنگە، ئاوی ڕووبارەکەش ڕوون و بێگەردو تیژڕەوە. کاتێ ئێمە دەستمان خستە نێو ڕووبارەکەوە سەرەنجمان دا ئاوەکەی زۆر فێنکە. زۆرینەی کاتی ڕۆژەکەم لە نێو ڕووبارەکەدا بەسەر برد تا گەرما کارم لێ نەکات.

لە نزیک پردەکەوە، ڕەشماڵمان لێ داکوتا و ئەوانی دیکەشمان لەسەر تەپۆڵکەیەکدا هەڵدا کە بەسەر ڕووبارەکەدا دەیڕوانی. لێرەوە دەمانتوانی ڕووخسارێکی دیکەی ڕووبارەکە ببینین، هەر دوولقی ڕووبارەکەی زابمان دەبینی کە بە دەوری ئاڵتوون کۆپریدا دەسوڕانەوەو ناوچەکەیان کردبووە دوورگەیەک.

پردێکی دیکەش بۆ چوونە دەرەوە لە شارەکە هەیە، ڕەوتی ڕووباری زاب کەش و هەوای ناوچەکەی سازگار کردووە،

ڕەنگە هەر لەبەر ئەم فاکتەرەش ئەو ناوچەیە کە لە بنەڕەتدا بەرهەمێکی ئەوتۆی نییە، دانیشتووانی لە دەوری خۆی کۆکردووەتەوەو دانیشتووانەکەی نزیکەی ١٢٠٠ هەزار کەسە.

وێڕای ئەمانەش لێرە دۆخی سروشتی زەوییەکەش جیاوازە ئیدی ڕێگای دەشتێکی پان و بێ کۆتایی هاوشێوەی ڕێگای شاری بەغدا تا ئێرەمان لەبەردەمدا نەماوە.

لەسەر ڕێگەدا کۆمەڵێك تەپۆڵکە دەبینرێت، لە ڕاستیدا ئێمە بەرەو بناری چیاکانی کوردستان دەبزوێین لەسەر یەکێك لەم تەپۆلکانە، کانیاوێك بەنێو (بیتوم) هەیەو بڕێکی زۆری ڕۆنێکی ڕەنگ ڕەش و بۆن ناخۆشی لێ هەڵدەقوڵێ. ئەسکەندەری مەکەدۆنیش بە پێی گوتەی نووسەرانی کۆن، کانیاوێکی لەو چەشنەی لەم دەڤەرەدا بینیوە، بەڵام نازانرێ ئایا هەمان کانیاوە یاخود لە شوێنێکی دیکەی نێوان ڕووباری دیجلەو فوراتدایە"[٤٧].

*** گەشتی (ئا. کلیمان) لە ساڵی (١٨٥٦):**

"گەڕۆکێکی فەرنسییە لە ساڵی (١٨٥٦) گەشتێکی بۆ کوردستانی خواروو کردووەو ساڵی (١٨٥٦) گەشتنامەکەی بە ناوی (گەڕانێك بە ناو کوردستانی خوارووی عوسمانی لە کەرکوکەوە تا ڕەواندوون) بە زمانی فەرەنسی نووسیوەو لە ساڵی (١٨٥٦)دا لە گۆڤاری (ئێم. ئێس. جی. جی) لە سویسرا بڵاوکردوەتەوە لە بارەی کەرکوکەوە دەڵێت:

"ڕۆژی (١٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٨٥٦) پێش خۆرهەڵاتن گەیشتینە کەرکوك، من بە وردی سەعاتی ڕێکانی کاروانەکەم بە هەنگاوی پۆستەچییانە یاداشت کردبوو، وەك چۆن من بەو شێوەیەی لە وڵاتدا وادەکەن لەلایەن حکومەتەوە ناسراوە، ڕێگەکە (٦١) هەنگاوی پۆستەچییانە بوو، دوورایییەك کە تەتەرە عوسمانییەکان بە دوو ڕۆژ دەیبڕن.

کەرکوك ناوچەی کارگێڕی پاشایەکی شارەزوورە، کەوتوەتە ئەو پەڕی سنووری ڕۆژهەڵاتی ناوچە بیابانەکان کە بەسەر لاپاڵی خواروی یەکەمین گردۆڵکەیەکەدا دەڕوانێت کە دەبوایە بیبڕین بۆ چوونە ناو کوردستانەوە، کەواتە ئەم شارە دەرگای چوونە ژوورەوەیە بۆ ئەم بەشەی کە هاوسنووری عێراقی عەرەبییە, شاری کەرکوك بۆ دوو بەش دابەش کراوە، بەشی سەرووی (شار) یان (قەڵا) کە ئەمڕۆ وێڕای ئەوەش کە بە شوورە دەورە دراوە کە چی بۆ بەرگری لە شارەکە لە حاڵەتێکی یەکجار بەرباد دایە شەقامەکانی پیس و پۆخڵن، تەسك و خراپ بەرد ڕێژ کراون.

سەرووی شار، ناوجەرگەی شارو کەناری شارەکە بێجگە لە سەربازەکانی ئۆردۆخانە نزیکەی (٢٥,٠٠٠) کەسێك دەبن کە سێ چارەگی کوردن"[٤٨].

*** گەشتی (کییوم لجان) بۆ عێراق:**

"یەکێکە لە گەشتیارە فەرەنسییەکان کە زۆربەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەڕاوەو گەلێك کتێب و لێکۆڵینەوەی هەیە لەسەر ناوچەکانی کە سەردانی کردووە، هەر بۆیە لە فەرهەنگی فەرەنسی (لارۆسی گەورە) ئاماژە بە بەشێکی کراوە وەکو ئەمانە:

١. دانیشتووانی تورکیای ئەوروپی، ساڵی ١٨٦١.
١. گەشتێك بۆ نیل، ساڵی ١٨٦٥.
٣. گەشتێك بۆ حەبەشە.
٤. تیۆدۆرسی دووەم و دەوڵەتی حەبەشە، ساڵی ١٨٦٥.
٥. گەشتێك بۆ ناوچەی بابل، ساڵی ١٨٦٦.

کییوم لجان لە ساڵی ١٨٢٨ لەدایکبووەو لە ساڵی ١٨٧١ کۆچی دوایی کردووە، لەو ماوەی ژیانیدا گەلێك لایەنی ئەو شوێنانەی باسکردووە کە سەردانی کردووەو گەلێك بەڵگەو نەخشەی جۆراو جۆری خستووەتە ڕوو دەربارەی ژیانی ئەو دەڤەرانە.

ئەم گەڕۆکە فەرەنسییە ماوەی سێ هەفتە لە موسڵ و کوردستان بوو، بەڵام لە بەشێکی ئەو کتێبەدا ئاماژەی پێ نەکراوەیان لەوانەیە دەرکرابێت و بەڵگەی گرنگی تێدا بووبێت بۆیە پشت گوێ خراوە.

لە باسکردنی بۆچوونی بۆ بەغدا ئاماژە بە ڕێگای کەرکوك دەدات و ئەوە دەخاتە ڕوو کە گوایە زۆری خەڵکەکەی کوردەو هیچ شتێکی ئەوتۆی تێدا نییە، بەڵام بەوە دەچێت سەری لە کەرکوك دابێت بەڵام زانیاریمان دەربارەی نییە"[٤٩].

*** گەشتی ئاینهوڵتی هۆڵەندی بۆ عێراق ساڵی ١٨٦٦ - ١٨٦٧ زایینی:**

"یەکێکە لە گەڕۆکە هۆڵەندییەکان کە لە شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا هاتۆتە عێراق، لە (٩)ی تەموزی ساڵی (١٨٣٧)دا لە شاری (بیستراوغ) هاتۆتە دنیاوەو خوێندنی لە هۆڵەنداو سویسرا تەواو کردووە، لە ماوەی ژیانیدا گەلێك گەشتی کردووە بۆ ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو سەرووی ئەفریقیاو ماڵتاو لە بواری زمانی عەرەبیدا لە پاریس خوێندوویەتی، لە ڕێگای بەرلین و بوترسبۆگەوە گەشتی کردووە بۆ ڕۆژهەڵات و ماوەیەك لە (تەفلیس) ماوەتەوەو فێری زمانی فارسی بووە، ئەم گەشتەی لە ساڵی (١٨٦٥)ەوە تا (١٨٦٨) بەردەوام بووە، لەو ماوەیەدا سەردانی ڕووسیاو قەفقاس و ئێران و عێراق و سوریا و فەلەستین و تورکیای کردووە.

هەموو ئەم گەشتانەی لە چوار بەرگدا بە زمانی فەرەنسی بڵاوکردووەتەوە، گەشتەکانی بۆ عێراق لەنێوان ساڵانی (١٨٦٦) تا (١٨٦٧)ی خایاندووە.

لە ماوەی گەشتەکانیدا بۆ عێراق باسی شارەکانی عێراقی کردووەو لە بارەی کەرکوکیشەوە گەلێك لێکدانەوەی جوانی نووسیوە دەربارەی باری ئابووری شارەکەو پەیوەندی بازرگانی موسڵ و کەرکوك و بەغداو سلێمانی لە ئاڵوێرکردنی بەرهەمە کشتوکاڵی و پیشەسازییەکان، کاریگەری هەر یەکێکیانی بەراورد کردووە دەربارەی گرنگی بەرهەمە ئابووری و بازرگانییەکان"[٥٠].

*** گەشتی (کیونی ڤیتاڵ) ١٨٩٠-١٨٩٤:**

"ئەم گەڕیدەیە ئامارناس و جوگرافیناسی خاوەن چوار بەرگی گەورەی کتێبێکە بە ناوی (تورکیای ئاسیایی) کە لە ساڵەکانی ١٨٩٠-١٨٩٤ لە پاریس بڵاکردوەتەوە،

ئاماری هەموو ویلایەت و قەزاو ناحییەکانی ئیمبراتۆرییەتی عوسمانی تێدایە، لەم ناوەدا بەرگی دووەمی بەشی زۆری دەنگ و باسی ویلایەت و قەزاکانی کوردستانی عوسمانی تێدایە.
دەربارەی کەرکوك نووسیوویەتی:
"کەرکوك قەزای سنجاقی شارەزوورە، بریتییە لە پێنج ناحییەو سێ سەدو دە گوند، کەرکوك شوێنی فەرمانڕەوای سەربازی سنجاقی شارەزوورە""(٥١).

*** گەشتی (بارۆن ئیدوارد نۆلد) ١٨٩١-١٨٩٤:**
"بە پێی ئامارەکانی نێو یاداشتەکەی ئەوە دەسەلمێنن کە لە ساڵی (١٨٩١) تا (١٨٩٤) گەشتی کردبێت بۆ عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستان.
دەربارەی کەرکوك نووسیوویەتی:
"من ترسم لە ڕێگەکە نەبوو چونکە لەلایەك شارەزای ڕێگەکان بووم و پاسەوانم لەگەڵ بوون و ئاشنایەتیم لەگەڵ هۆزەکانی ناوچەکەدا هەبوو؛ سەرۆك خێڵەکانم دەناسی... لە داقوق سەرۆکی هۆزی (داوودە) ئیسماعیل بەگ داوای لێکردم لەلای کار بەدەستانی کەرکوك هەوڵی بۆ بدەم، کوڕەکەی ساڵێکە لە کەرکوك گیراوە بەرەڵڵای بکەن... ئێوارەی (٩)ی مایس گەیشتمە (قەرەتەپە) ئەم ناوچەیە هیچ گومانی لێ ناکرێت کە ناوچەیەکی کوردییە، من لەلایەن دانیشتووانەوە وەك دۆست و ئاشنایەکی ناسراو بە گەرمی پێشوازی لێکرام. لە (١٨)ی مارس گەیشتمە کەرکوك بڕیارم دا دوو ڕۆژ لێرە بمێنمەوە بۆ ئەوەی خەڵك و ئاسیاوێکی زۆر بەسەر بکەمەوە، کەرکوك شارو ناوچەیەکی بایەخدارەو گرنگە بە پێی ئەو ڕاپۆرتانەی لە تورکیا بەرچاوم کەوتن، دانیشتووانی کەرکوك (١٧,٥٠٠) کەسە، لەبەر چەند هۆیەك تورکیا بە چاوێکی تر دەیڕوانییە ئەم شارە، لێرەدا نیزیکەی (٤,٥٠٠) چەکداری دەوڵەت مۆڵ درابوون.
دوکان و بازاڕو چایخانەو کاروان سەراو شەقام و جادەکانی کەرکوك وا نیشان ئەدەن کە لەم شارەدا کارو کاسبی و بازرگانی و کڕین و فرۆشتنێکی گەرم و گوڕ لە برەودایە، سەرەڕای کار بە دەستانی تورکی عوسمانی، شێخی کورد: شێخ عەلی شێخ عەبدولڕەحمان بارەگاکەی لێرەیە، ئەم شێخە پێشەوایەکی ڕۆحی و ئاینی و کەڵە پیاوێکی ناوداری کوردستانە(٥٢).

*** گەشتی مەتران ئەدی شێر بۆ کەرکوك ١٨٩٩:**
"یەکێکە لە پیاوانی لاهوتی کلدانی، لە شەقڵاوە لەدایکبووە لە ساڵی ١٨٦٧ لە دواییدا بە دەستی تورکەکان کوژراوە.
یەکێکە لەوانەی سەردانی کەرکوکی کردووەو سەری لە نەوتی بابا گوڕگوڕ داوە بە تایبەتی لە (٩)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٨٩٩)ی زایینی، ماوەیەك جێگری ئەسقەفییەتی ئەبرەشییەی کەرکوك ناسراوە بە (ئەدی ئیبراهینا صلێبا).
دەربارەی ناوچە نەوتییەکانی کەرکوك دەڵێت:
"لە باکوری ڕۆژئاوای کەرکوك لە ماوەی نیو کاتژمێر بیرێك هەیە نەوتی لێ دەردەچێت و لە تەنیشتی شوێنێك هەیە بە



مەتران ئەدی شێر

ناوبانگە پێی دەڵێن (بابا گوڕگوڕ)، بۆیە زۆر جار بیستراوە کە ئاگرێکی بەرزی هەیە، لە (٩)ی تشرینی یەکەم زوو هەڵسام بۆ بینینی ئەو ناوچەیە بۆ ماوەی کاتژمێرێك و نیو گەیشتینە بیرە نەوتێك کە ئاگرێکی نزیکی هەیەو نەوتی زۆری لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بووە، هەروەها لەم ناوچەیە سەرچاوەی نەوتی زۆرە، لە ساڵی (١٨٩٧) دانیشتووان نەوتیان دەردەهێناو دەیانخستە ناو کوندەو بەکاریان دەهێنا بۆ پێداویستی ڕووناککردنەوە، هەروەها خۆڵی ئەم ناوچەیە مزرەو بەدەمی خۆم تامم کردووەو دانیشتووان دەیانفرۆشتە منداڵان و هەندێك جار بەکاری دەهێنن لە جیاتی تورشی سماق چونکە زۆر مزر بووە.
هەروەها کرێکارێك لە بواری ئەم نەوتە پێی ڕاگەیاندم کە خەڵکانێکی زۆر سەردانی ئەم مەزارەیان کردووە بۆ چاککردنەوەی لە هەندێك نەخۆشی کە لەشی خۆیانیان پێی خۆلاوی دەکرد، هەروەها بە ئاوی ئەم ناوچەیە خۆیان دەشووشت بۆیە بە زووترین کات چاك دەبوونەوە، هەروەها ئەم ناوچەیان بە پیرۆز دادەناو زیارەتیان دەکرد لە ڕۆژانەی چوارشەممە""(٥٣).

*** کورد لە یاداشتەکانی (نارچی ڕۆزڤێلت)دا:**
"نووسەر یاداشتەکانی خۆی لە نۆ بەشدا پۆلێن کردووە، سەرەتا یاداشتەکانی بۆ تەمەنی منداڵی لە (ساگومورهێل)و چۆنییەتی تەواوکردنی قۆناغی خوێندنی زانکۆ، بەشەکانی تری تایبەتە بە شێوازی کارەکانی کە وەکو دیبلۆمات و هەواڵگری (CIA)ی ئەمریکا لە ئەفریقای باکورو زۆربەی وڵاتانی عەرەبی و ئێران و... هتد کاری کردووە، بەڵام گرنگترین بەشی یاداشتەکانی بەشی چوارەمە کە تیایدا ٤٢ لاپەڕەی تەرخانکردووە بۆ شۆڕشی شێخ مەحموودو کۆماری

مەهابادو نووسەر لە دیدی ئەمەریکاوە ڕۆشنایی خستووەتە سەر. ئەوەی کە سەرنج دەدرێت نووسەر بەتایبەتی باسی کەرکوکی نەکردووەو وەکو ناوچەیەکی کوردستانی باشوور باس کراوەو خۆی لە تایبەتمەندییەکانی سیاسی ئەو ناوچەیە نەداوەو نەیویستووە بەدرێژی باسی بکات"(٥٤).

*** گەشتی شاراوەی مێجەرسۆن:**

"مێجەرسۆن یەکێکە لە بەرپرسەکان کە گەشتێکی دوورودرێژی کردووە بۆ وولاتی میزۆپۆتامیاو کوردستان و گەشتەکەی لەنێوان سلێمانی و بەغدایەو دەربارەی کوردو هۆزەکان و شوێنیان گەلێك وەسفی داوە، گەشتەکەی (مێجەرسۆن) گەشتێکی شاراوە بووە، کە ناوی خۆی کردووەتە (میرزا غولام حوسێن شیرازی)، هەموو ڕاپۆرتەکانی خۆی لە خزمەت دەوڵەتەکەی خۆیدا جێبەجێ کردووەو ناردوویەتی بۆ لەندەن، لە وەسفی چەمچەماڵدا بەم جۆرە دەڵێت:

"شاری چەمچەماڵ دەکەوێتە تەنیشت گردۆڵکەیەکی قووچی دەستکردەوە، کە هەر لە کۆنەوە ئاشوورییەکان ئەمجۆرە گردە دەست کردانەیان لەگەڵێ مەڵبەندی گرنگی خۆیاندا لە ناوچەی هەولێرو جێگاکانی تردا دروستکردووە".

کاروانەکەمان بەرە بەرە کەم دەبووەوە، هەر دووریانێك و کۆمەڵێك لایان ئەداو جیا دەبوونەوە، ئێمەش لەبەر ئەوەی کە کەم بووینەوە، بۆ ئەوەی کە پێش نیوەشەو خۆمان بکەین بە شاری کەرکوکدا، چونکە دوای نیوەشەو دەرگا دادەخرێت، ناچار ئەبین بەلایەکی تردا هەڵگەڕێینەوە بچینە ناوشارەوە کە ئەمەش زۆر دەخایەنێت، زۆر بە پەلە لە وڵاغمان دەژەنی ناوچەی نزیك شارەکە بریتییە لە زوورگێکی پڕ تەقتەقە بەردو تاوێر کە بۆ وڵاغ ناخۆشە، تا نزیك تر دەبووینەوە هەواکەی گەرمتر دەبوو.

بەمجۆرە، دوای ڕۆیشتنی دە سەعات، لەدوا مەنزڵمانەوە، پێش نیوەشەو خۆمان کرد بەناو دەرگاکەی کەرکوکداو بۆ شەقامێك پێچمان کردەوە، کە لەم سەر تا ئەوسەر نزیکەی میلێك درێژ دەبوو"(٥٥).

*** گەشتی دبلیۆئارهەی:-**

* دوو ساڵ لە کوردستان گەشتێکی نهێنی بۆ میزۆپۆتامیا لە یاداشتەکانی دبلیۆ ئارهەی:

"یەکێکە لە ئەفسەرە سەربازییەکانی بەریتانیا کە ماوەیەکی چاك حاکمی سیاسی هەولێر بووە لەنێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٠) (دوو ساڵ لە کوردستاندا ١٩١٨-١٩٢٠ بووە).

لە بەرگی دووەمدا باسی ئاڵتون کۆپری و کەرکوکی کردووەو بەم جۆرە باسی دەکات:

"دوو هێزی سەربازی بەریتانیا پێش کەوت، لە مانگی تشرینی یەکەم لە ساڵی (١٩١٨) لە وڵاتی نێوان دووڕووباری سەروو، یەکێکیان بە لێواری دیجلەدا بەرەو موسڵ و ئەویتری بەرەو کەرکوك لەسەر ڕێگای کفری و لە (٢٧)ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ کەرکوکی داگیرکرد، لە کۆتایی مانگەکەدا هێزەکانمان گەیشتە (ئاڵتون کۆپری) لەسەر (زێی بچووك)".

بڕووسکەیەك گەیشت بە دامەزراندنم بە یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە ئاڵتون کۆپری.

ئاڵتون کۆپری یان پردی ئاڵتون ناوی ئەو پردەیە کە شارەکە دەبەستێتەوە بە ڕۆخی ڕووبار لەلای چەپەوە، بیرو باوەرێك وا باوە کە گوایە چەند سەدەیەك لەوەو پێش لەسەر ڕێنمایی ئافرەتێك دروست کراوە بە ناوی ئاڵتون، پردەکە لەسەر ڕووبارەکە دەپەڕێتەوەو پانییەکەی ٢٠ یاردەیە، تاقەکانی لەبەردو گەچ و کۆڵەکانی لەدار دروست کراوە، بەڵام کاتێك ویستم بگەمە سەر ئەم پردەو ئەو پردەی بەرامبەری، تورکەکان کاتێك کشابوونەوە هەردوو پردەکەیان ڕووخاندبوو، بۆیە لە باسەکەیدا هەوڵیداوە نووسەر کە وەسفێکی گشتی شارەکەی بخاتەڕوو، دەربارەی باری کارگێڕی ئەوکاتەی کەرکوك و ئاڵتون کۆپری و ڕووی باری گشتی ژیانی شارەکە.

"وڵاغ و عارەبانە بە زەحمەت دەیانتوانی لە بوارێکی خوار پردە ڕووخاوەکە، لە ڕووبار بپەڕنەوە، ئۆتۆمبیلەکەم لە بینایەك ڕاگرت و چوومە لای بوارەکە زۆر بە زەحمەت توانیم ئەسپێك وەرگرم و بە سەلامەتی بپەڕمەوە.

بە کۆڵانە پیس و پۆخڵەکانی پشتەوەدا ڕۆیشتم تا گەیشتمە شەقامی سەرەکی و سەرای، واتە خانەی حکومەت. زۆر سەرم سوڕما کاتێ (میستەر کاریت)م لەوێ دیت کە لە هێڵی خزمەتگوزارییە شارستانییەکانی (هیند) کاری دەکرد، لە بەغداوە گەیشتبوو تا تێبینی تۆمارکا دەربارەی سیستەمی داهات لەو ناوچانەی کە تازە داگیرکرابوون، بەمەش تەنیا چەند خولەکێك بەر لە گەیشتنی من گەیشتبوو. بە تەواوی سەرقاڵبوو بە قسەکردن لەگەڵ هەندێ پیاو ماقوڵانی ئەوێ و تێبینییەکانی یەکسەر تۆمار دەکرد.

بەشی سەرەکی ئاڵتون کۆپری لە تەك یەکدی ڕیز بووە لەسەر بەردێکی ناوەندی زێ. ژمارەیەك دوکان لەوبەر ئەو ڕێگا سەرەکییە هەن کە دەچێتەوە ناو جەرگەی شارۆچکەکە. کە لەوێ شۆڕ دەبیتەوە بە ناو تاقێکدا کە بە تونێل دەچێت تا دەگاتە لێواری لای ڕاستی زێیەکە. شوێنێکی فراوانە بەڵام ئاوی کەمە. ئەو ڕێیەی ئاماژەمان بۆ کرد جارێکی دیکە سەر دەکەوێتەوە تا دەگاتە پلیکانەیەك کە دەگاتە پردی دووەم. ئەو ڕێگایە ئەو شارە بەشدەکات ڕێی تێپەڕینی یەك عارەبانەیە، چەند کۆڵانێکی کەمی پیس و پۆخڵی لێدەبێتەوە، کە بە هۆیانەوە مرۆڤ دەگاتە ماڵ بەتەك یەکەوە.

لەسەر هەردوو بەری ڕووباریش هەندێ خانووبەرەی فراوان هەن، کە بۆشایی لەنێوانیاندا هەیە، بەڵام چۆڵکراون، پێشتر شوێنی سەربازە تورکەکان بوون.

لە (ئایار) تاکو (تشرینی یەکەم)، لەو کاتەی کە ئاوی زێ نزمە دەوروبەری ئەو بەردە دەبێتە بەشێك لە کەنار پڕ زبڵ دەبێ و خەڵکەکەش دەیکەنە شوێنی ئاودەست. ئەو ماڵانەی لەسەر لێواری بەردەکەن سولاوکەیان هەیە کە چی تێدابێ لە ڕووباری دەکات. لەو شارۆچکەیەو لە دەوروبەریشی ژمارەیەکی زۆری سەربازی تورك چەند مانگێك خێمەیان هەڵدابوو بۆیە زبڵی نیو ساڵ لەوێ کۆ ببۆوە.

هەرچی مێشە ئەوا لە باسکردن نایە، هەر هێندەی خواردنێك

لەسەر خوان دانرا لە چاوتروکانێکدا توێژاڵێکی ڕەشی لەسەر دروست دەبێت.

لەو سێ هەزار کەسەی کە لەو شارە دادەنیشتن هەزاریان شاریان بەجێهێشتووە ئەوەی دیکەی، ئەوەی لە برسان مردوون و ئەوەی ماوە، خەڵکانێکی پۆخڵ و بەد بەختبوون هەرچی گەورەی خەڵکەکەیە پیاوێك بوو بە ناوی (حەسەن ئاغا)، کە پیرێکی بەدفەساڵی بێدین بوو وەکیلی ئەحمەد پاشای دزەیی بوو، سەرۆکی شارەوانی کە پلەکەی وەك هومدە وایە لە ئینگللتەرا، پیاوێکی ڕیش سپی بوو وەك سپایتی بەرەبەیان، خۆشمێربوو، بەڵام نەفام بوو، زۆر جاران ناخی دەوروژاندم تا ڕادەی گێلی و دەبەنگی. بە بیرم دێ جارێکی پێم گووت من ئارەزوو دەکەم کە زێ هەڵسێ و دانیشتووانی شاریش ڕامالێ.

(مستەر کاربیت) ڕۆژێك دوو ڕۆژ لە ئاڵتون کۆپری مایەوەو هەموو کاتەکەی لە پێشوازی سەرۆك عەشیرەتەکان و موختاری گوندەکان بردە سەر، لە کاتێکدا من ئەو کاتە هەوڵمدا حاڵەتی فەوزاکە بگۆڕم بۆ ئارامی و ڕێکوپێکی.

ئەو ناوچەیەی بە من سپێردرابوو لە سێ ناحییە پێکهاتبوو، پێشتر سەر بە پارێزگای کەرکوك بوو، هەموویان دەکەوتنە باشووری زێ. هەندێ گوند نەبێ کە لەسەر لێواری ڕاستی زێیەکە بوون. کارێکی وا ئاسان نیە کە دەزگایەکی حکومی لە هیچەوە دابمەزرێن. بۆیە دەستم بە دامەزراندنی ئەو کەسانە کرد کە بۆ ژەندرك دەگونجان و چەکدارم کردن، هەوڵمدا هەندێ پیاوی دڵسۆز دابین بکەم بۆ ئەو فەرمانبەرانەی کە زۆر بوون. گەلێ ئەرزو حاڵم لابوو کە هی ئەوانە بوون داوایان کردبوو ئەو پۆستانەیان بدەمێ، بەڵام هیچیان بە کەڵکی ئەو کارە نەدەهاتن، بۆیە دەبوایە هەندێ کەس لە (ئەفەندی) یەکان لە کەرکوکەوە بێنم.

لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا (دەمژمێرێکی هیندی) گەیشتەجێ لەگەڵ هەندێ شتوومەکی نووسینگە. کاتێکی ئەوەندە تێنەپەڕی نووسینگەکەم ڕێککەوت. بە خێرایی هێزێکم لەو ژاندرمانە دروست کرد کە لە شەڕا نیترین و خراپترین کەسانی بەر خۆر بوون. ناچار بووم بە هەندێ لە تفەنگی کۆنی لوولە درێژ چەکداریان بکەم کە لە خەڵکی شار کۆکرابوونەوە. وە لە چاکبەختی بوو کە لەلایەن ئەوانەوە بەکارنەهات و سوودێکی بۆیان نەبوو و هیچ ئامانجێکی بۆ دەستەبەر نەکردن.

جەندرمەکان لە سەردەمی تورکەکان بەڵایەك بوون بەسەر خەڵکەوە لە وولاتی میزۆپۆتامیا، چونکە کارمەندانی لە خەڵکانی بەرەڵڵاو دڵرەق بوون و هیچ ڕاهێنان و بیروباوەڕێکیان نەبوو، دەسەڵاتی خۆیان لە تاڵان و زەوتکردن بەکاردەهێنا و ئەو ڕووداوانەش لە ژمارە نایەن.

خەڵکەکە زۆریان ڕقیان لێ دەبووە، لەبەر ئەوەی کە توانای ئەوەیان نەبوو پارەوە نانێك بۆ خۆیان پەیدابکەن تەنیا بە کلکایەتی حکومەت نەبێت، بۆیە هەمیشە لایەنگرو گوێ لە مستی دەوڵەت بوون، ئەوسا دەکرا پشتیان پێببەستێ لە جێبەجێکردنی ئەو ڕێ و شوێنانەی کە بۆیان دەردەچوو. هەندێکیان لە کاتی تەنگانەدا زۆریان ئازایانە ئەو فەرمانانەیان پشتگوێ دەخست.

(یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) کاتێك دەرچوو، هەر ناوچەیەکی نوێ دەبوایە هێزێکی کار ڕاپەڕاندن دروستبکا لەو ناوچانەی کە عەشایەری نەبوون لە جەندرمەی سەردەمی کۆنی تورکان زیاتر کەسی تر نەبوو.

هەوڵێکی زۆرمدا بۆ چاککردنی کەسانی ژاندارمەو دامەزراندنی گەنجان تیایدا، وەکو چۆن لە هەندێ ناوچەدا هێزی پۆلیسی نیزامی دامەزرا. بەڵام گەورەترین کێشەی (یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) ئەوە بوو کە چۆن بەر لە چاوچنۆکیان بگرێت کە لە دەروونیاندا بوو.

لە حەوتی تشرینی دووەمدا فەرمانێکم پێگەیی کە بچمە کەرکوك و موقەدەم (نوێل) ببینم کە وەك حاکمی سیاسی کەرکوك دامەزرابوو، ڕێنوێنی سیاسەتی دەکرد لە هەموو کوردستانی باشوور. ڕۆژی دوایی ئۆتۆمبێلەکەم لێخوری بەناو بارانێکی بەخوڕداو بایەکی سارد. موقەدەم (نوێل) ئەو سیاسەتی بۆ شیکردمەوە کە مەبەستییەتی پیادەی بکا، کە ئەنجامەکەی ئەوەیە حوکم کردن بە هۆی سەرۆك عەشیرەتەکانەوە بێ و لابردنی فەرمانبەرە تورکەکان و ژەندرمە گەندەڵەکان بەپێی توانا.

لە کاتێکدا کە لە کەرکوك بووم بروسکەیەك هات کە فەرمانی بەوەبوو ئەفسەرێکی سیاسی لەگەڵ هێزێکی بچووکی سوارە بە خێرایی بچێتە هەولێرو بۆ ئەوەی بە پێی مەرجەکانی ئاگربەست لە توورکەکان وەربگرێت.

(موقەدەم نوێل) منی دەستنیشان کرد بۆ ئەم کارەو (فەرماندەی هێزی کەرکوك) یا خەرەوەیەکی هاکەزایی دامێ، تا بیدەمە (فەرماندەی هێزی تورکی)، کە داوای لێدەکات بکشێتەوە بۆ موسڵ، دوای نیوەڕۆ گەڕامەوە ئاڵتون کۆپری"[٥٦].

*** گەشتی (سیسیل ج ئیدمۆندس):**

"نووسەری ئەم کتێبە، (سیسیل ج ئیدمۆندس) لە ساڵی (١٩١٨)وە کارگێڕی سیاسی و ڕاوێژکاری حکومەتی کۆلۆنیالیستی بەریتانیا لەو سوپایەی ئینگلیزدا بووە، کە لە شەڕی یەکەمی جیهانییدا دەستی بەسەر کوردستاندا گرتووە. بۆ سەقامگیرکردنی سیاسەتی دەوڵەتی ئینگلیزی لەو مەڵبەندەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا بێ وچان هەڵسوڕاوەو لە هیچ هەوڵێك بۆ خاشەبڕکردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەی کوردو کپکردنی دەنگی ئازادیخوازیی، لەو بەشەی کوردستاندا نەوەستاوە، لە چەند شەڕو پێکدادانی سوپای ئینگلیز دژی هێزەکانی لەشکری شێخ مەحمود ڕاستەوخۆ بەشداریی کردووە. زۆرجار، کاتی بۆمبارانی ناوچەکانی کوردستان لە تەنیشت ئەو فڕۆکەوانانەوە دانیشتووە کە بە دوا مۆدێلی بۆمبی سوتێنەرو پڕژۆڵی ئەوکات خانووە قوڕینییەکانی کوردیان بەسەر خاوەنەکانیاندا ڕووخاندووە لە ناو ئاگردا نوقمیان کردوون.

ئەم نووسەرە، لە بارەی بابەت و باسەکانی جوگرافیاییەوە دەوڵەمەندە، بە ووردیی ئاماژەی بە جوگرافیای سروشتیی ئەو بەشەی کوردستان کردووە، بەڵام لە بابەت جوگرافیای

سیاسیو مرۆڤایەتییەوە دوور لە ڕكو مەبەست نییەو نووسینەکانی لە مەبەستێکی تایبەتیو لەسەر بنەمای سیاسیەتی ئەو کاتی دەوڵەتی ئینگلیز سەرچاوەیان گرتووە، کە خوێنەر کاتی خوێندنەوەی کتێبەکە بۆ خۆی ئەو بۆچوونانەی لە دێرەکاندا بۆ دەردەکەوێ. نموونەی زەقی ئەو شێواندنە ڕوونو ئاشکرایەو نووسەر بە ئەنقەست هەوڵی داوە کە ڕادەی گشتیی کوردەکان بە تایبەت لە شارە گەورەکانی وەك موسڵو کەرکوك گەلێك کەمتر لە ژمارەی ڕاست پێشان بدات.

بەشێکی شاری کەرکوك، لەسەر تەپۆڵکەیەکی لاکێشەیی دروست کراوە، کە ئەو تەپۆڵکەیە ١٢٠ پێ بەرزترە لە دەشتەو بەشەکەی تریشی بەسەر هەردوو ڕۆخی ڕووبارە خێزەڵانەکەی (خاسەچای) سازکراوە.

زۆربەی خانووەکانی لای ڕۆژئاوای تەپۆڵکەکە ڕووخابوونو بنەماڵەی موسڵمانە ناسراوەکانی شار لەو بەشە خانووبەرە نوێیانەدا دەژیان، کە لە ژێر تەپۆڵکەکە هەڵکەوتوون، بەڵام گەڕەکی عیسابییەکان، بەسەر بەشی ڕۆژهەڵاتی تەپۆڵکەکەوە ئێستاش بۆ ژیان دەبوو و خانووبەرە بەرزەکانیان لە دیواری شار دەچوو و قەڵا و دیوارەکانیان بەسەر لێژایی تەپۆڵکەکەوە سەریان بەرەو ئاسمان بەرز کردبووەوە، لەنێوان مزگەوت، تەکییە، خانەقاو بیناکانی ئەو شارەدا پێویستە ئاماژە بە دوو دانەیان بکەم:

یەکەم: گۆڕی دانیالو ئەوی تریان کۆشکێکی هەشت سوچە، کە مێژووی سازکردنەکەی دەگەڕێتەوە سەردەمی سەلجوقییەکان. هەروەك دەزانین هەواڵو دەنگوباسەکان دەربارەی بینای یەکەم دەگەڕێتەوە سەر (تونخانەی ئاگر). ئەم تونخانانە، ئاگری نەکوژاوەی گازی نەوتن، کە لە جێیەکی قووڵ بە ناوی (بابە گورگوڕ)، لە دوو میلی باشووری ڕۆژئاوای نزیك بیرەتەنکەکاندا بەدەست هەڵکەنراونو بیرەوەری دەستپێکردنی پیشەسازیی نەوت پێشان دەدەن، کە لە سەردەمی هیرۆدۆتو تەنانەت بەر لەو، لەو ناوچەیەدا سازکراونو دەسووتێن.

بینای دووەم بە پێی نووسراوەیەك کە لە سەرییەتی لەئەسڵدا بە شانازیی ژنێکی ناسراو بەناوی (بوغدی خانم) سازکراوە، بەڵام ئێستا لە ڕوانگەی ماڵەکانی دراوسێیدا، نرخی سەرەکی ئەو بینایە لەوەدایە کە تەپاڵەی پێوە بنووسێننو ووشکی کەنەوە.

کەرکوك بە پێی یەکەم پەیمانی دیاریکردنی سنوور لە ساڵی (١٥٥٥) زاینییدا بە بێ ئەملاو ئەولا لەگەڵ خاکی عوسمانی خرا، بەڵام لە دوو سەدەی دوایدا هیچ نەبێ دوو جار ئێرانییەکان بۆ ماوەیی کورت لە ساڵی (١٦٢٣ – ١٦٣٠) بە هۆی (شا عەباس)و ساڵی (١٧٣٣ – ١٧٤٦) بە هۆی (نادر شا) دەستی بەسەردا گیرا.

ژمارەی دانیشتووانی شاری کەرکوك لەم سەردەمەدا کە باسی لێ دەکەین، نزیکەی (٢٥) هەزار کەس بووە. زۆربەی دانیشتووانی تورکمانو کوردیان پێك دەهێنا. جەماوەرێکی بچووکی عەرەب، مەسیحیو جوولەکەشی لێ بوون.

کەرکوك لە سەدەی هەژدەدا ناوەندی مەڵبەندی شارەزوور بوو، لە پارێزگاکانی نوێی کەرکوك، واتە هەولێرو (بەناو) سلێمانی پێکهاتبوو و لەلایەن کەسێکەوە سەرپەرشتی دەکرا، کە لە بەغدا دیاریکرابوو. بە پێی ئەو گۆڕانکارییانەی کە (مەدحەت پاشا) والی بەغدا لە ساڵی (١٨٦٩ – ١٨٧٢) ئەنجامی دان، ناوی شارەزوور کرا بە (سنجاق)ی کەرکوك (بەرامبەر لەگەڵ پارێزگاکانی ئێستای کەرکوكو هەولێر)، هەرچەندە شارەزووری مێژوویی لەگەڵ (سنجاقی) تازە پێکهاتووی سلێمانی مایەوە.

ویلایەتی موسڵ لە ساڵی (١٨٧٩) پێکهات، کەرکوك بە هۆی تێکەڵاویی زمانو ڕەگەزی دانیشتووانی وەك شارێکی گرنگی سەربازییو ناوەندێك بۆ دابینکردنی کارمەندی دەوڵەتو ژاندارمەیی بوو، دەزگای عوسمانی دەیتوانی حسابی لەسەر بکا.

بنەماڵە گرنگو دەوڵەمەندەکانی شار یا تورك بوون یان ئەگەر کوردیش بوویایە، خۆیان بە تورك دەناساند. لەو ناوەدا لە هەمووان گرنگتر، ئەو بنەماڵانە بوون، بنەماڵەی نەوتچی زادە، هەروەك لە ناویان دەردەکەوێ خاوەنی بیرە کۆنەکانی نەوت بوونو لەو بەرهەمە سروشتییە قازانجی باشی دەکرد، بنەماڵەی یاقوبزادە، خاوەن موڵك بوونو دەگوترا کوردی زەنگەنەن، بنەماڵەی (قیردار)، هەم خاوەن موڵك بوونو هەم تاجر، سەرەڕای ئەوانە ژمارەیەکیش ئەفسەرو کارمەند هەبوون کە هەر چەندە سەر بە بنەماڵە کۆنو دەوڵەمەندەکان نەبوون، بەڵام لە دەزگای عوسمانیدا بە پلەو پایەی بەرزی کارو خوێندن گەیشتبوونو دوای لەتبوونی ئیمپراتۆریی گەڕابوونەوە وڵاتی خۆیان. لەنێوان کوردەکاندا (سەیید ئەحمەدی خانەقا) لە بنەماڵەی بەرزنجە ناسراوتر لە ئەوانی تر بوو، بەڵام بە پێچەوانەی زۆربەی ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە، ئەو نەقشبەندیی بوو. دەرگای خانەقاکەی کە موڵکێکی زۆری هەبوو، بۆ هەموو کەس کراوە بوو، بێگومان دەسەڵاتی زۆری بەسەر هۆزەکەیدا هەبوو، بە گشتی گەورترین هۆزی پارێزگای پێکدەهێنا""(٥٧).

*** گەشتی أ. م هاملتن بۆ کوردستان:**

"ڕێگای هاملتن لە ئەربیلای ئەسکەندەرەوە دەست پێدەکاتو بە نیشتەجێی سەڵاحەدیندا تێدەپەڕێت، بەڵام هاملتن تەنها ئەورووپی بوو لە ناو تاقمێکداو بە کەرەستەیەکی زۆر ساکارەوە دەبوو تاقمەکەی فێری تەقاندنەوەی گردەکانو دروستکردنی ڕێگاکانی بکات.

ئەو بە تەنها توانی قووڵی دۆڵەکان بپشکنێتو ڕێگای دەرباز بدۆزێتەوە، بە تەنها ئەبوو سەرپەرشتیار بێتو پارەو خواردنو پێداویستییەکانی تاقمەکەی دابین بکات. ئەو لە هەمان کاتدا سەرکردەو باوكو میکانیکی بوو. نزیکەی بە پێنج ساڵ لە ژێر گەرمای خۆرەتاوی هاویندا و لە زوقمو سەرماو سۆڵەی زستاندا بە تەنها لە ناو خێڵە دڕندەکاندا توانی ڕۆڵێکی باش ببینێت لە تەواوکردنی ئەم کارە مەزنە.

ئەم گەشتەی (هاملتن) کە لەنێوان ساڵانی (١٩٢٧ – ١٩٣٢) لە عێراقدا کاری ئەندازیاریی کردووە، ڕێگا بەناوبانگەکەی (هاملتن)ی ئەنجامداوە، کە لە هەولێرەوە بۆ حاجی ئۆمەرانە.

گەلێك باسی شوێنە کوردەواریی و ناوچە جۆر بە جۆرەکانی عێراقی تێدا کراوە کە کەرکوکیش بەشێکە لەو یاداشتانە.

".. هێڵی شەمەندەفەری (بەغدا، کەرکوك) بەرەو باکوور دەڕوات و زۆر هێواشەو لە هەموو ئێستگەیەك ڕادەوەستێت و لە هەموو ڕاوەستانێکدا پۆلیسی شەمەندەفەرەکە دادەبەزن و پاسی دەکەن نەبادا دزو جەردە نەفەرە خەوتووەکان ڕووت بکەنەوە، هەر چەندە لەم ساڵانەی ئەم دواییەدا، ڕووتکردنی ناو شەمەندەفەر زۆر کەمبووەتەوە.

هێڵی شەمەندەفەرەکە بە ناوچەیەکی دەوڵەمەند بە نەوت تێدەپەڕێت، لەژێر شەوقی مانگە شەودا ڕیکی بیرە نەوتەکان دیاربوون و بە ئاسماندا هەڵچووبوون. ئێمە بە جەبەل حەمریندا تێپەڕین، کە یەکەمین دامێنە گردی کوردستانەو لە سلێمان بەگ بۆ چەند چرکەیەك شەمەندەفەرەکە ڕاوەستا، کە لە شوێنێکا ڕیکی گەورەی کۆمپانیای نەوتی عێراقی لێیەو ئەوملاو ئەولای بە بۆڕی نەوت و ئامێری پێویست هەڵچنرابوو، ئامادەبوو بۆ ناردنی بۆ (بابە گوڕ گوڕ)، کە نزیکی کەرکوکە.

لەو شوێنەدا کێڵگەیەکی گەورەی نەوت دۆزراوەتەوە بە هۆی لێکۆڵینەوەو هەڵکۆڵینی ئەو شوێنە لەلایەن کۆمپانیاکەوە چیرۆکی دۆزینەوەی کێڵگەی نەوتی (بابە گوڕ گوڕ)م لە نەفەرێکی ناو شەمەندەفەرەکە بیست، کە فەرمانبەرێکی گەنجی سەر بە کۆمپانیاکەبوو، کە لە پشوو دەگەڕایەوە. کاتێك لە بیر هەڵکەندندا گەیشتبوونە نەوت، ئەوەندە بە توندی دەرپەڕیبوو، تەلی ڕیکەکە پچڕابوو ترازابوو نەوت و گازیش بە ئاسماندا هەڵچووبوو، هەورێکی ڕەشی درووستکردبوو دەشت و دەرو دۆڵەکانی ئەو ناوچەیەی پڕکردبوو. خۆشبەختانە ئاگر نەکەوتبووەوە، بەڵام چەند کەسێك بە هەڵم خنکابوون و ئەوانەی تریش ئازایانە خۆیان ڕزگار کردبوو.

دەرکەوت، کە ئەم کێڵگەی نەوتە یەکێکە لە هەرە گەورەترین کێڵگەکانی نەوتی جیهان و بەو هۆیەشەوە بۆڕی نەوتی (کەرکوك – دەریای سپی ناوەڕاست) هاتە کایەوە، کە سەدان کیلۆمەتر ئەو بیابانە چۆڵ و هۆڵە دەبڕێت و لەوێشەوە بە پاپۆڕی نەوت هەڵگر دەبرێت بۆ نەوت پاڵێوەکانی ئەوروپا، بۆ جوداکردنەوەی نەوت و بەنزین بۆ ئۆتۆمبیل و فڕۆکەکانی ئەوروپا.

بەیانی زوو گەیشتمە کەرکوك کە شوێنێکی زۆر کۆنەو بە درێژایی مێژوو شار لەسەر شار بەدوای یەکدا لەسەر یەك دروستکراون، ئەمەیش بووەتە هۆی دروست بوونی گردێکی بەرز، کە بەسەر دەوروبەرەکەیدا دەڕوانێت و بەهەر چواردەوریدا کراوەو بووەتە قەڵاو شارۆچکەیەکی قایم و توانای بەرگری هەبووە.

ئێستا قەڵا هەر لە شوێنی خانووبەرەیەو بازاڕو کۆگاو دوکانەکان یەقیان کردووەتەوە بۆ پێدەشتەکەی خواری نزیك بۆ ئاوەکەی خاسە، کە زۆر جار لافاو ئەوناوە دەخاتە مەترسییەوە.

لە کاتی دەوڵەتی تورکدا، بەقایە پردێکی کەمەرەیی لەسەر ئاوەکەی خاسە دروستکراوە، کە توانای بەرگری تەوژمی لافاوی زۆری هەبوو. بەڵام ئەگەر پایەکانی ناوەڕاستی بە ئاو خوراونەتەوەو کەندەر بوون، بۆ چارەسەری ئەم حاڵەتە، شێلمانی ئاسنین بەو بەرەو ئەوبەری کەمەرەکاندا ڕایەڵکردووە بۆ پاڵپشت و ڕایەڵکردنی پردەکە، ئەمەش بووەتە هۆی دیمەنێکی تێکەڵەی سەیری کۆن و نوێ لە کاری ئەندازیاریدا.

نزیك بە کەرکوك لە کۆنەوە گرێك هەڵدەستێت بە هۆی دەرپەڕینی گاز لە زەوییەکەوەو لە ناوچەکەدا وا باوە ئەمە بریتییە لە تەنوورە سوورەوە بووەکەی پەرتووکەکەی دانیاڵ (BOOK OF DANIEL) هەر لەو ڕۆژەدا دەبوو ١٤٥ کیلۆمەترێك بەرەو باکوور بچم بۆ شەقڵاوە، کە گوندێکی کوردەو کامپی سەرەکی ڕێگا نوێیەکەی ڕەواندوزی لێیە.

لە کەرکوك هیچی ترم پێ نەکرا لەوە زیاتر، کە خۆم بناسێنم بە سەرۆك ئەندازیار مێجەر پۆڤەر (W. A. POVER)، کە لەو کاتەدا خۆی ئامادە دەکرد بچێت بۆ پشوویەکی شەش مانگی.

کە دەستم بە لێخوڕین کردو شارە کۆنەکەی کەرکوکم بە جێ هێشت و بەرەو قۆناغی ١٤٥ کیلۆمەتری ڕۆیشتم، لە ڕێگادا تووشی کابرایەکی کوێربووم، کە لە لاڕێیەکدا لەسەر ئەو عەردە بەرداوییە بە تەنها هەڵقوڵنجابوو. بە هەر چوار لادا نیشانەی هیچ گوندێك لە ئارادا نەبوو. کابرایەکی زۆر لات و هەژار دیاربوو، لەبەر ئەوە ڕاوەستام و ڕوپیەیەکم دایەو ئەویش بە کوردی دوعای بۆ کردم و لە خودا پاڕایەوە.

لە کەرکوکەوە بە دەشتێکی بەرز تێپەڕیم، هەتا گەیشتمە زێی بچووك و شارۆچکەی (ئاڵتوون کۆپری)، کە بە تورکی واتاکەی پردی زێڕینەو لەوانەشە ڕۆژێك لە ڕۆژان پردێکی زێڕین لەو شوێنەدا هەبووبێت، بەڵام لەو شوێنەدا پردێکی ئاسنینی سوپای لێ دروست کرابوو لە ساڵی (١٩١٨)دا و لە کاتی پاشەکشێیاندا تورکەکان تەقاندبوویانەوە.

بەشی زۆری شارۆچکەکە لەسەر دوورگەیەکی ناو زێیەکە دروستکرابوو. ئەم شارۆچکەیە بە ناوبانگە بە ماسی گەورەی نزیك بە دوو مەتر درێژ. ڕاوی ئەم ماسیانە بە خواردنی دەرماناوی دەکرێت. دەرمانەکە ماسییەکان گێژ دەکات و دەکەونە ناو تۆڕی ماسیگرانەوەو ڕایدەکێشن بۆ ڕۆخی زێیەکە، ئەمەش لە خۆیدا ڕێگەیەکی سەیرە بۆ ڕاوەماسی"[٥٨].

* **گەشتی (گۆتفرید میوللەر):**

"ناوی (گۆتفرید جۆهانس میوللەرە) کە یەکێکە لە گەڕیدەکانی (ئەلمانیا)یە، وەکو خۆی دەڵێت (میوللەر) لەگەڵ هاوڕێیەکیدا وەك گەڕیدەیەکی ئارەزوومەندی سەرکەش دەزەیانکردووەتە ناو کوردستانەوەو کتێبەکەی لە ساڵی (١٩٣٦) لە چاپخانەی (فیلادلفیا) لە ئۆگسنت فور – ڕۆتلینگن لە چاپداوەو بڵاوکردووەتەوە.

بەڵام هەر لە خوێندنەوەی ناونیشانی کتێبەکەو بە تایبەتی هەندێك لە پەرەگرافەکانی ناوەوەی نووسینەکە، ئەو ڕاستییە وەردەکەوێت، کە هاتنە ناوەوەکەی ئاسایی نەبووە، بەڵکو ئەویش یەکێك بووە لەوانەی کاری هەواڵگریی کردووە بۆ

بەدوادا گەرانی سامانە سرووشتییەکانی وەکو نەوت.
گۆتفرید یۆهانس میوللەر لەگەڵ هاورێکەیدا (زێپ) یەکەمجار لە بەغداوە بە شەمەندەفەر دەچێت بۆ کەرکوك، بەم شێوەیە باسی سەرنیشینانی شەمەندەفەرەکە دەکات:
"ئەوانەی لەگەڵماندا سەفەریان دەکرد لە پلەی سێیەمی فارگۆنی شەمەندەفەرەکەدا بوون بریتیبوون لەوانەی کە مێزەری رەشیان بە سەرەوە بوو، ئەوانە زۆر بە ساردییەوە سەیری ئێمەیان دەکرد، ئەوەی بۆ ئێمە گرنگبوو، هەر چەندە زۆریش قوورس بوو ئەوە بوو دەبێت بە هەر شێوەیەك بێت خۆمان لەو کوردانە نزیك بکەینەوە تاوەکو نەخشەکەمان سەر بگرێت، ئێمە زمانی عەرەبیمان باش دەزانی، بەڵام لەنێوان زمانی کوردی و عەرەبیدا نەوەکو جیاوازی هەیە بەڵکو زمانی عەرەبی بۆ کوردەکان زمانێکی نامۆیە و بێگانەیە، لەبەر ئەوە پێویست بوو زمانی کوردی فێربین"(٥٩).

*** یاداشتی بنەماڵەی دکتۆر سەیید عەزیز:**
"بنەماڵەی دکتۆر سەیید عەزیز شەمزینی، یان بنەچەی شێخانی نەهری، کە سەیید عەزیز نەوەیانە، دەچێتە سەر شێخ عەبدولقادری گەیلانی.
سەیید عەزیز شەمزینی کوری سەیید عەبدوڵلا کوری شێخ عەبدولقادری شەمزینی کوری شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینی، لە کۆتایی ساڵی (١٩١٨)ی زایینی لە موسڵ لەدایکبووە لە ساڵی (١٩٢٩) لە هەولێر چۆتە قوتابخانەی ناوەندیو بە زمانی کوردی پۆلی یەکەمی ناوەندی تەواو کردووە، لە ساڵی (١٩٣٠) باوکی ناردوویییە بۆ موسڵ بۆ ئەوەی فێری زمانی عەرەبی بێت و لە ناوەندی (غەرب) خوێندوویییەتی.
لە ساڵی (١٩٣٢- ١٩٣٣) چووەتە کۆلێژ، لە بەغدا لە ساڵی (١٩٣٤- ١٩٣٦) چووەتە کۆلێژی سەربازییەوە لە ساڵی (١٩٣٦- ١٩٣٧) لە کۆلێژی سەربازی بە رۆتبەی مولازمی دووەم دەرچووە، لە دوایدا چووە راهێنانی مەشقی (ئەسپ سواری) لە ساڵی (١٩٣٨) لە موسڵەوە گواسترایەوە بۆ قاعیدەی فیرقەی دوو لە کەرکوك بە یاوەری (نورەددین مەحموود) بەڵام لە دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٣٩) کە نورەددین مەحموود گواسترایەوە بۆ سەرۆکی ئەرکانی سووپا ئەویش گواسترایەوە بۆ کەتیبەی ئەسپ سواری لە بەغدا.
"رۆژێك بۆمان دیاری کرا، کە لەگەڵ (ماجید مستەفا) بچین بۆ کوردستان. رەفیق حیلمی، کە سەرۆکی حیزبی (هیوا) بوو، ئێمەش جگە لە فوئاد عارف، هەموو ئەفسەرەکانی دیکە (ئیرتبات)، ئەندامی حیزبی هیوا بووین، لە ناو ئەو ئەفسەرانەدا منی بانگ کرد، بە منی گوت: باوەر بە تۆ دەکەمو سەد دیناری دا بە من، گوتی ئەو سەد دینارە بە مەلا مستەفا بدە پێی بڵێ: ئەوە لە حیزبی (هیوا)وە نێردراوەو پێی بڵێ بروا بە ماجید مستەفا نەکات ئەوە لەلای نووری سەعیدەوە نێردراوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئێمە لە مەواعیدا، لەگەڵ ماجید مستەفا بە شەمەندەفەر چووین بۆ کەرکوك، لە یانەی ئەفسەران بۆوە بە مشتومرو دەمە قاڵە لەگەڵ ماجید مستەفا. ئەو شەوە ئەگەر ئەمین رەواندوزی نەبوایە، دەبوو بە شەری ئەو دووانە..."""(٦٠).

*** یاداشتی سیرل بۆرتەر لە کەرکوك لە کتێبی (العراق ما بین الحربین العالمیتین من خلال رسائل سیرل بورتر):**
"سیرل بۆرتەر یەکێکە لە بەریتانییەکان کە لە ساڵی (١٨٩٥)ی زایینی لەدایکبووە، یەکێکە لەو کەسایەتیانەی ئینگلیزەکان عێراق کە هاوسەردەمی رووداوەکانی شۆرشی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨)بووە.
هەموو ژیانی لە عێراق بردووەتە سەروو، لە ماوەی ژیانی تا کۆچکردنی لە ساڵی (١٩٦٧)ی زاینیدا، دووجار ژنی هێناوە لە عێراق و لە خۆشی و ناخۆشی ئەو وڵاتە دا بەشداربووە، هەر لە بەغداش نێژراوە، بۆیە (ئەمەل بورتر) یەکێکە لەو منداڵانەی کە لەنێوان ئافرەتێکی عێراقی و باوکێکی بەریتانی لەدایك بووە.

*** نامەیەك لە (سیرل) بۆ (جاك) ساڵی (١٩٤٢):**
هەواڵی دڵخۆشکەرم پێیە، کارێکم بە دەست کەوتووە، کە خەوم پێ دەبینی، ئەندازیارێکی کارەبایی بووەتە بەرپرسی کارەبای کەرکوك و دەوروبەری بە گشتی.
هەروەکو لە پێشوودا بۆتام باسکردووە، دەربارەی ئەم شوێنە، ئەوکاتەی سەردانی ئەم شارەم کردووە لە بیستەکاندا ئێستا لە دووای دوو گرێی ئەو ساڵانەدا، دووبارە دەگەرێمەوە بۆی، لێرەدا من بەرپرسیارێتییەکی گەورە دەگرمە دەست دەربارەی بەرەوپێش چوونی وێستگەکانی بەرهەم هێنانی کارەبا و چاککردنی گەیاندنی ناو لەم ناوچەیەدا، کارێکی زۆر گرنگە، هێڵی کارەبا بەشێکی کەمی شارەکە رووناك دەکاتەوەو، ناوچەیەکی دیاری کراوە، ماوە بۆ ماوە کارەبا دەبردرێت، ئەمیش دەگەرێتەوە بۆ کۆنی کەرەستەوەو نەبوونی چاکسازی لە کەرەستەکانیدا.



سیرل بۆرتەر

مووچەکەم زۆر بەرزە، ژیان لەم شارە هەرزانە، هەر چەندە شەڕ بەردەوامە، بەڵام لەم شارەدا هەستی پێ ناکرێت. دەستەبەرکردنی خانوو بۆم، خانووەکەم لەگەڵ وێستگەی بەرهەم هێنانی کارەبایە، بریتییە لە دووبەش، بەشی سەرەوەو خوارەوە.

لە دەرگای یەکەمدا دەچینە پانتایەکی فراوانو کراوە کە دەڕوانێتە ژوورێکی دیاری کراو لە لای ڕاست، ئەم ژوورە فراوانەو دەرگاکەی دەڕوانێتە سەر باخچەیەکی فراوانو جوان، بەڵام پێویستی بە چاککردنەو ڕێکخستنەوە هەیە لە باخچەکەوە دەچیتە کۆگای سەرەکی وێستگەی بەرهەم هێنانی کارەبا.

لەو حەوشە فراوانەدا ژووری دووەم هەیە، فراوانە، پەیژەکە هاوگونجاوە لەگەڵ ئەو ژوورەی کە دەچێتە بەشی سەرەوە، کە پەیژەکە پانەو پایەکانی دووری یەکتری نییەو بە ئاسانیو خۆشی پێدا سەردەکەوێت، لە بەشی سەرەوە ڕارەوێکی فراوانو گەورەی هەیە، کە کۆتاییەکەی چێشتخانەیەکی فراوان هەیە، لە سەرەتای بەردەوامی یەکەم پەیژەیەك هەیە کە دەروازەی ماڵەکەیە، لەم بەشەدا گەرماو و سێ ژووری خەوتنو هۆڵێك هەیە کە دەڕوانێتە سەر شەقامی گشتی شارەکە.

ئەم شەقامە یەکێکە لە شەقامە گرنگەکانی کەرکوك، کە قیرتاوە، بەڵام ڕووناك نەکراوە، لە چەپی ئەم خانووە، کۆشکی یەکێك لە دەست ڕۆیشتووەکانی کوردی لێیە کە ناوی (سەید ئەحمەدی خانەقا)یە، بەرامبەر خانووەکە جۆگایەکی ئاوی بچووك هەیە، لە دوایەوە گۆڕەپانێکی مەشق پێکردنی سووپا هەیە، کە شوێن یان مۆڵگەی سەربازە لەلای ڕاستی خانووەکە کارگەیەکی دروستکردنی بەفر هەبوو کە دەگەڕایەوە بۆ یەکێك لە خێزانە تورکمانە دەوڵەمەندەکان کە پێی ئەوترا (ئەوتچی)، بەرامبەر کارگەی بەفرەکە لەلای ڕاستی بەرامبەر خانووەکەم، خانوویەکی گەورەو فراوان هەیە کە خۆی حەشارداوە لە پەرژینێکی فراوان لە گژوگیاو داری قەڵەمتۆز کە خانووی مستەر جایمەنە، لە تەنیشتەوە خانووی بەڕێوەبەری تەندروستییە، کە پزیشکێکی عەرەبە، خێزانەکەی ئافرەتێکی ئینگلیزە کە دوو کوڕی هەیە بە ناوەکانی (قەحتان)و (عەدنان)و کچەکەی بە ناوی (فاتیمە)، لە پاڵ ئەمەدا ناوی ئینگلیزیشیان هەیە، ماڵی ئاوچی دوور نییە لێیانەوە کە خێزانێکی موسڵمانی تورکمانی دەستڕۆیشتووە.

ئەم شەقامە لە لای دەستە ڕاستەوە دەتگەیەنێتە لای ماڵی موتەسەریف لەلای چەپ (لەلای دووری ماڵی خانەقا) باڵەخانەی کتێبخانەی گشتی کەرکوكو سەراو دەزگاکانی حکومەتو بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی لێیە لە دوایدا پردی بردینی کۆن دێت، کە دەڕوانێتە سەر شوێنەوارێکی گرنگ کە خەڵکی کەرکوك شانازی پێوەی دەکەن کە ئەویش قەڵای کەرکوکە.

ئەم خانووە کارەباو ئاوی بۆ ڕاکێشراوە بە بۆری، گەرماوەکە تازەکراوەتەوە بۆ ئەوەی دڵگیربێت، بەهۆی نەبوونی خۆ لە ئاوهەڵکێشان لەبەر نەبوونی لە بازاڕدا، بەهۆی شەڕەوە، بۆیە وازم هێنا لەمەداو هەستام بە برینی بەرمیلێك لەنیوەوەو بۆیە کردنی تا بۆ ئەوەی بەکاری بهێنم بۆ خۆڵە ئاوهەڵکێشان,

گەرم کردنی ئەم گەرماوانە بەڕێگای کۆنی جارانە کە لە عێراقی کۆن بەکارهاتووە، ئەم گەرماوانە بە بەرزی نیو مەتر لە زەوییەوە دروست کراوە، تا بۆ ئەوەی کە سوودی لێ وەربگیرێت بۆ گەرم کردنی گەرماوەکەو ئەو مەنجەڵە گەورەیەی کە لە زەوییەکە چەسپ کراوە بۆ گەرم کردن، ئەو جۆرە گەرماوانە جۆرێکی عەرەبی بەغدادییە، بەڵام بە هەڵە دەڵێن گەرماوی توورکی. ئەو ئاگرەی کە بەدەست دەکرێتەوە لەگەرمکردنی ئەم گەرماوانەدا بریتییە لە دارو تەپاڵە بەتایبەتی هی مەڕو پاشماوەکانی ماڵان، سووتاندنەکە لەلای دیواری گەرماوەکە لە دەرەوە ڕوودەدات، خزمەتکار هەڵدەستن بەم کارە.

لەماوەی شەش هەفتەم لەم شارەدا، گەلێك شتی زۆر.. زۆر ڕووی داوە، نازانم سەرەتا لە کوێوە دەست پێ بکەم، بۆیە سەرەتاو کۆتاییەکانم تێکەڵ کرد لەبەر زۆری ڕووداوەکان.

لە کەرکوك ڕووبارەکەی لە ڕووباری عوزیم جیابووەتەوە، بە درێژایی ساڵ وشکە تەنها لەوەرزی بەهاردا نەبێت، مرۆڤ دەتوانێت بەپێ بیبڕێت، بەڵام لە بەهاردا وەکو ڕووباری دیجلە، لافاو دەکاتو هەڵدەچێت.

کەرکوك بە گەنمو پترۆڵ داپۆشراوە، چۆنێتی دابەش بوونی دانیشتووانی کەرکوك دابەشبوونێکی جیاوازە کە نموونەی نییە لە هەموو جیهاندا، گەلێك پێکهاتەی جۆراو جۆری تورکمانیو کوردیو ئەرمەنیو ئاسووریو عەرەبی تێدایە، لەگەڵ ڕێژەیەکی کەم لە کلدانو سریانی زۆریان هاتوونەتە کەرکوك لە ناوچەکانی هەولێرو موسڵەوە.

بەڵام ئاین، ئایینی ئیسلام (سوونەو شیعە)و جوولەکەو مەسیحیو ئەرسەدۆکسو ئەرمەنیو کلدانیو کاسۆلکیو نەستووری ئەرسەدۆکسیو ئینجیلی پرۆستانیتە، کە ئەوەی کۆتایی لە ڕێگای موژدەبەرەکانەوە هاتوونەتە شوێنەکە.

زۆربەی عەرەبەکان لە موسڵمانی سوونەن، مەسیحییەکان لە هەموو نەتەوەکان، تورکمان، مەسیحیو موسڵمانیان هەیە، کورد و تورکمان زۆربەیان سوونەن، بەڵام شیعەی تورکان هەیە، کە خەڵکی دێی تسعینن پێکهاتە و تێکەڵاوییەکی سەیری هەیە.

ئەوەی جێگەی بایەخ و سەرنجە، کە هەموو لایەك لە نزیکی یەکترییەوەن، گەرەکێك نابینیت کە تایبەت بە نەتەوە یان ئاینزایەك، پێکەوە ژیان زۆر سەیرە، هیچ کێشەیەکی ئاینی و نەتەوەیی نییە هەموویان لە ڕێککەوتنێکدان هیچ کەسێکیان سنووری ئەوی تر نابەزێنێت و لە خۆشیو ئاشتیدا دەژین.

ئەو دکتۆرەی کە هەموو خێزانەکان باوەڕیان پێی هەیە پیاوێکی ئاسووری مەسیحییە کە ناوی (مەڵەك)ە, قایمەقام پیاوێکی خۆشەویستی موسڵمانی کوردە، بەڕێوەبەری تەحریرات مەسیحی عەرەبی بوون، خاوەن دووکانی سەیدەلی تورکانی مەسیحی بووە لە خێزانی ئەڵلاوێردی، بازرگانێك هەیە کە قووماشی ئاڵتویدی ئۆسکەتلەندیو موکاشیلو بوساك دەفرۆشێت مەسیحی برۆستانتییە، خاوەن کۆگای

ڕەشید موسڵمانێکی سوونی کوردە، کە بەربەرەکانی کۆگای جەجاوی دەکات خێزانێکی مەسیحییە لە موسڵ.
مەزارگەیەکی ئاینی هەیە لە کەرکوك، خەڵکێکی زۆر لە هەموو چین و توێژەکان و ئاینییەکان سەردانی دەکەن، بۆ پیرۆزی و چاك بوونی نەخۆشی، ئەم نەزارگەیە دەگەڕێتەوە سەر تیپێکی ئاینی تەسەوفدا کە ناوی تەکییەی (قادری نەقشەبەندی شێخ جەلیل)ە، لەم تەکییەیەدا مزگەوت و بڵندگۆییەکی چەماوەی هەیە کە ڕەنگی سوورە، مەسیحییەکانی قەڵاکە تورکمانن گەلێك ئەفسانەی لەسەر دەگێڕنەوە، وا باسی لێ دەکەن کە گوایە هەزار مەسیحی کاتێك سەربڕاون لەسەر ئەم بڵندگۆیەوە فڕێ دراونەتە خوارەوە، بۆیە لەو باوەڕەدان کە بۆیە ئەم بڵندگۆیە چەماوەتەوە لەبەر زۆری خەڵك لەسەریدا لە کاتی سەربڕینیاندا هەر بۆیە ئەم بڵندگۆیە ڕەنگی سووری گرتووە و چەندێك هەوڵی چاکسازیان دا نەیانتوانی ئەو ڕەنگەی بگۆڕن، من ئەم جۆرە ئەفسانانەم پێ خۆشە.
مەزارگەیەکی تر هەیە بریتی لە ژوورێکی بچووك کە پێوانەکەی لە سێ مەتر چوارگۆشە تێپەڕ ناکات، هەموو کەسێك بۆی دەچێت، کەوتۆتە دارستانەکانی گاورباغ، کە بە مانای کفرکردن دێت بۆیە ووشەی (گاور) مانای (کافر).
خەڵکێکی زۆر سەر لەم مەزارە دەدەن بەرد لە دیوارەکەی دادەنێن کە زۆر کاتدا بە دیوارەکەدا دەنووسێت و لەو باوەڕەدان کە ئاواتەکانیان دێتە دی، ئەم شوێنە پیرۆزە دەگەڕێتەوە بۆ مریەمی پاکیزە و قەدیس یوسف، بەڵام ئافرەتێکی موسڵمان بایەخ بەم شوێنە دەدات و دیباتە ڕێوە.
ئارامی باڵای بەم شارەدا کێشاوە، بە شێوەیەکی گشتی، زۆری نەتەوەو ئاینەکان، هەموویان ملکەچی پێکەوە ژیانن، هیچ نەتەوەو ئاینییەکی دەسەڵات دار نیە کە دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەوەی تردا بسەپێنێت.
من لەو باوەڕەدام کە هۆکاری کاولکاری مرۆڤ، لە بنەڕەتدا لە هەستی نەتەوەی سەرکێش و باوەڕی ئاینیی کوورت بینی لە بیرکردنەوەو دەمارگیری، کە ئەم هۆکارانەن لە هۆی دەست بەسەراگرتن و کوشتن و شەڕ، باشترین نموونە لە لاتان ئەوەیە کە ئەو بیرکردنەوەیەی کە نەتەوەی ئەڵمانیا پەیڕەوی دەکات یان ئەوەی کە ڕوویداوە یان کە تا ئێستا ڕوودەدات لە ئێرلەندە بە هۆی ئاینەوە"(٦١).

*** گەشتی (هنری فیلد):**
"لە ساڵی (١٩٥١)، لەلایەن نێردراوێکی زانکۆی هارڤردی ئەمریکی، گەشتی کوردستانیان کردووە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆجی.
دەربارەی کەرکوك زۆر کەمی نووسیوە، ئەوە دەخاتەڕوو لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە، نەخۆشی ڕشانەوە بڵاوبووەتەوە، گەیشتە ئەوەی کە خەڵکێکی زۆری لەناوداو بەشێکی چینی ڕۆشنبیرو کەلەپوری ناوخۆی ئەم شارەی لەدەستدا.
بەرووبوومە ئابوورییەکانی ئەم شارە بە پلەی یەکەم لە گەنم و جۆو برنج و ترێ پێکهاتووە ئاینزای سونی زاڵە بەسەر ئاینزای شیعەدا"(٦٢).

*** بێرنارد ویتمان Bernard Wittmann:**
"لە سەرەتادا لە شێوەی نامە ناردووییەتی بۆ کەس و کارەکانی لە ئەڵمانیا لەنێوان ساڵانی (١٩٥٤-١٩٦٣).
لەو کاتەدا ئەو ئەندازیارە ئەڵمانە لە باشووری کوردستان ڕێگەو پردی دروست کردووە، بەردەوام نامەی بۆ هاوسەرەکەی و کچەکەی دەنووسی و دەینارد‌ەوە بۆ ئەڵمانیا، لە نامەیەکدا بە فراوانی باسی ژیان و کارەکانی خۆی کردووەو باسی گەلێك ناوچەی کوردستانی کردووە کە کەرکوك بەشێکێتی، بەڵام لە ساڵی (٢٠٠٨)دا ئەم نامانە هەمووی لە کتێبێکدا بە چاپ گەیەنراوە بە ناوی (نامەکانی کوردستان ١٩٥٤-١٩٦٣).
لە باسی کەرکوکدا بەم جۆرە دەدوێت:
".. پاش ٢٤ کاتژمێر شەمەندەفەری خۆم گەیشتە کەرکوك، خۆم لە عێراقی کورد بینییەوە، بەڵام دیسانیش لە دەوڵەتی عەرەبی عێراقی بووم، تفی خۆم قووتدایەوەو چاوەکانم فرکاندن، بەڵام یەکێکی وەکو من کە جاری یەکەم دێتە ئێرە دەتوانێت یەکسەر شتەکان ببینێت.
ئەو شوێنە تەنها کوردی لێدەژین، دەتوانی بڵێی عەرەبی هەر لێ نین، تەنانەت دەتوانی بڵێی عەرەبی هەر لێ نەبووە".
"شەمەندەفەرەکەمان باریك و لەسەرخۆ بوو، کە پێکهاتبوو لە چواردە فارگۆن، تەنها سیانی بۆ خەوتن بوو، لە دوای ٣٠٠ کلیۆمەترو یانزە سەعاتدا گەیشتینە کەرکوك، ڕێگا بیابان.. بیابان و لم.. لم و لە دوامانەوە تۆزو خۆڵ و گەردەلوولەکانی بە جێ دەهێشتن لە کاتی سوواربوونم لە ئۆتۆمبیل لە وێستگەوە بۆ ئوتێلەکە، هەستم بە بێ تاقەتییەکەی گەورە دەکرد بە هۆی ئەو جەنجاڵییەوە، کە خەڵکێکی زۆر لە کوردو ئینگلیزو فەرەنسی و ئەمریکییەکان کۆبوونەوەو لەو نێوەدا کەرو حوشترو بزن و ئۆتۆمبیلی جۆراوجۆر لە (فۆلکس واگن) و (مارسیدیس) و (کادیلاك) و (فۆرد) و (بی) کۆن و عەرەبانەی ئاژەڵ بڵاوبووبوونەوە، من زۆر بێ تاقەت و بێ هێز بووم بەڵام دوو شت سەرنجی دام: یەکەمیان ئەم شارە جوانە وەکو تابلۆیەکی شێوەکاری، دووەمیشیان گەیشتمە شارێك دەتوانی بڵێت عەرەبی تێدا نییە شارێکی کوردییە.
کاتێکی کەمم لەبەردا مابوو بۆ سەفەر کردن، گەشتێکی بازارم کرد، زۆری شتەکان هەژارانەو پیس بوو، بەڵام لە بازاڕدا گەلێك کەرەستەی مسی ڕۆژهەڵاتی جوان و دووکانی فرۆشتی ئاڵتون و زیوو هەبوو، کڕین و فرۆشتن لە ئاستێکی زۆر بە جمووجوڵ بوو، خەڵکی بازاڕیش بریتی بوون لە ئەرمەن و کوردو دەگمەن عەرەبت بەرچاو دەکەوت.
ئافرەت نابینرێت، ئەگەر بە ڕێککەوتیش چاوت پێی بکەوێت خۆی پێچاوەتەوە بە عەبا، ژمارەیەکی زۆر منداڵیش بەرچاو دەکەوێت کە هەموویان گاڵەگاڵ و ژاوەژاو لە بازار دروست دەکەن""(٦٣).

*** یاداشتەکانی (ئەمەل پۆرتر):**

"یەکێکە لە هونەرمەندو ئەدیبو لێکۆڵەری عێراقی کە لە باوکێکی ئینگلیزیو دایکێکی عێراقی هاتۆتە دونیاوە لەبەر خۆشەویستی بۆ شارستانی میزۆپۆتامیاو رەگی ڕۆچووی لە ڕۆشنبیری ئەورووپای نوێ، ماوەیەك لە هونەری شێوەکاری ژیانی لە (رووسیا) بردووەتە سەرو لە بوارەکەی خۆیدا ئەسپی هونەری شێوەکاری تاوداوە.

ئەمەل پۆتەر لە کەرکوك لەدایکبووەو لە بەغدا ژیانی بردووەتەسەر بەتایبەتی لە ناوچەی (المسبح)، هەر لە سەرەتاوە توانای وێنەکێشانی تێدا هەڵکەوتووە، لە ساڵی (١٩٥٧)دا پەیوەندی کردووە بە پەیمانگای هونەرە جوانەکان، خوێندنی لەسەر دەستی مامۆستاکانی قوتابخانەی عێراقی بۆ هونەر خوێندووە وەکو فایق حەسەن، جەواد سەلیم، ئیسماعیل شێخلی، عەتا سەبری، حافز ئەلدروبی.

لە ساڵی (١٩٦٠) ڕۆیشتۆتە مۆسکو بۆ تەواوکردنی خوێندی باڵا، لە کاتی گەڕانەوەی بۆ عێراق کاری کردووە لە مۆزەخانەی شوێنەواری (بەغدا)، لە دوایدا شووی کردووە بە دەرهێنەری تەلەفیزۆنی عێراقی (یوسف جەرجیس)، کاریگەری گەورەی بەسەرییەوە بەجێ هێشتووە لە بواری هونەریدا.

لە هەشتاکاندا مێردەکەی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە خراوەتە بەندینخانەو لە کاتی دەرچوونیدا زۆر بێ تاقەتو نەخۆش بووە لە دوایدا کۆچیان کردووە بۆ لەندەنو لەوێ مێردەکەی کۆچی دوایی کردووە.

لە هەشتاکاندا لە بواری نووسینی لێکۆڵینەوەو ڕۆماندا کاری کردوە هەر یەکە لە ڕۆمانی: (دعبول السلام)، (نوار ماتت)، (ماری اسمر)، وەرگێڕانی کتێبی (الانثى في ديانة العراق).

هەروەها هەستاوە بە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێك لە یاداشتەکانی باوکی (سیرل بۆرتەر) کە دەربارەی ئەو ماوەیەی نێوان شەڕی جیهانی یەکەمو دووەم لەنێوان ساڵانی (١٩١٥، ١٩٤٥)دا.

گەلێك لێکۆڵینەوەی هونەری بڵاوکردووەتەوە لە ڕۆژنامە عەرەبیو ئینگلیزییەکاندا، گەلێك پێشانگای هونەری لە بەغداو بەیروتو لەندەنو ڤییەناو مەسقەتو نیوکاسل کردووەتەوە.

ئەمەل پۆتەر لە ساڵی (١٩٤١) لە کەرکوك لەدایکبووەو لەو نامانەی کە بۆ خوشکەکەی ناردووە گەلێك یاداشتی گرنگی تێدایە دەربارەی ژیانی لەکەرکوكو عێراق.

".. باوکی وەکو سەربازێك لە سوپای بەریتانیا هاتۆتە عێراقو گیرۆدەی دوای ئافرەتێکی عێراقی بووەو لە عێراقدا ماوەتەوە، چونکە باوکی یەکێك بووە لەوانەی کە شەقامەکانی کەرکوکی بە ڕووناکی کارەبا بڵاوکردووەتەوە لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو لە کەرکوك ژیاوە".

"... لە ماڵێکدا گەورە بووم کە جیاوازی نێوان پیاو و ژندا نەبووە، خانووەکەمان کراوە بووە بۆ سەردانی جۆرەها کەس لە پیاو و ژنو منداڵان، هەروەکو چۆن لە کەرکوك دا بوو لە بەغداش هەر بەو شێوەیە بەردەوام بووە".

*** میس بێڵ:-**



خاتوو گێرتروود مارگرێت لوسیان بێڵ (١٤ی تەمووزی ١٨٦٨-١٢ی تەمووزی ١٩٢٦)، خانمێکی ئینگلیز بووەو نووسەر، گەڕیدە، سیاسەتمەدار، ڕۆژهەڵاتناس، شوێنەوارناسو سەر بە دەزگای هەواڵگری بەریتانیا بووەو کاریگەرییەکی ئێجگار زۆری لە دارشتنی نەخشو سیاسەتی ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیادا بەهۆی ئەو زانیاریو شارەزاییەوە کە لە سەرڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدەستهێنا بوو لە میانەی گەشتو گەڕانێکی چڕو پەیوەندیی بەرفراوانی لە وڵاتانی مێسۆپۆتامیاو شام (سووریای گەورە)و ئاسیای بچووك (تورکیای ئەمڕۆ)و نیمچە دوورگەی عەرەبداو بەزۆری بەوە ناسراوە کە لەگەڵ تۆماس ئێدوارد لۆرەنس (ناسراو بە لۆرەنسی عەرەب)ی هاوڕەگەزو هاوپیشەیدا یارمەتیدەری دروستکردنو دامەزراندنی مەملەکەتی هاشمی بوون لەو دوو وڵاتەی ڕۆژگاری ئەمڕۆ بە عێراقو ئوردن ناسراون.

ئەم خانمە بەریتانییە، کە زیاتر بە میس بێڵو پاشان لە بەغدا بە خاتوون ناوبانگی دەرکرد لە سەروەختی داگیرکردنی ئەم وڵاتەی ئێستا عێراقەو پێشتر سێ ویلایەتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانلی بوو، لە ئاخرو ئۆخری جەنگی جیهانیی یەکەمدا لەلایەن بەریتانیاوە، لە سۆنگەی ئەو ڕۆڵە سەرەکییەوە کە گێڕای لە دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراقداو بە سوود وەرگرتن لەو ئەزموونە جیاکارو دەوڵەمەندەی کە لە میانەی گەڕانو پەیوەندییەکانیدا دروستیکردبوون لەگەڵ دەمڕاستو سەرۆك هۆزەکانی ناوچە جۆراوجۆرەکانی

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستداو بە تایبەتی عەرەبەکان. ئەم خانمە لە ماوەی ژیانیدا زۆر بەرز دەنرخێنراو متمانەی پێدەکرا لەلایەن کاربەدەستە باڵاکانی بەریتانیاوەو دەسەڵاتێکی زۆر بەرفراوانیان پێدابوو وەك ژنێك لەو سەردەمەداو بەوە وەسف دەکرا کە" یەکێکە لەو کەمە نوێنەرانەی حکوومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا کە لەلایەن عەرەبەکانەوە بەسۆزو خۆشەویستیی یادی دەکرێتەوە".

بێل لە ١٤ی تەمووزی ١٨٦٨ لە ناوچەی دورهامی هەرێمی ئینگلاند لە بەریتانیا لە دایکبووەو لە خێزانێکی دەوڵەمەنددا گەورە بووە، کەوا کاریگەریی بەرچاوی هەبووە لە کۆمەڵگای ئینگلیزداو هەر ئەم خوشگوزەرانییەش دواتر دەرفەتی گەشتو گەرانی وڵاتانی بۆ دەستەبەر کردووە. باپیری یەکێك بووە لە سەرمایەدارە گەورەکانی وڵاتو خاوەن کارگەی پیشەسازیی ئاسن بووەو لە هەمان کاتیشدا ئەندامێکی لیبراڵی پەرلەمان بووە ڕۆڵی لە دارشتنی سیاسەتی بەریتانیادا کاری کردووەتە سەر گێرتروودی کورەزای لە تەمەنی گەنجیدا کە بایەخ بە مەسەلە نێودەوڵەتییەکان بداتو پاشانیش مەراقی تیکەڵبوون بە سیاسەتی نێودەوڵەتی بکەوێتە سەر.

سێر هیو بێلی باوکی ماوەی چەندین ساڵ سەرۆکو کاربەدەستی گەورەی شارو ناوچەکەی خۆیان بووەو ڕۆڵی سیاسیو ئیداریی کاریگەرو بەرچاوی بووە. لە تەمەنی چوار ساڵیدا دایکی بە سەر لە دایکبوونی مۆریسی برایەوە دەمرێت. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا باوکی ژنی دووەم دەهێنێتو ئەم خانمە باوەژنەی کە ناوی فلۆرەنس بێل دەبێتو وەك ژنێکی نەریتیو موحافزەکاری سەردەمی ڤیکتۆریی کۆمەڵگەی ئینگلیزی ڕۆڵێکی کاریگەر لە پەروەردەی ئەم دوو منداڵەدا دەبینیو جیایان ناکاتەوە لەو سێ منداڵەی کە لە ژیانی هاوسەریدا لە باوکی گێرترورد دەبێت. فلۆرەنس بێلی باوەژن نووسەری شانۆییو چیرۆکی منداڵان بووەو بێجگە لەوەش نووسەری توێژینەوەیەك بووە لەسەر کرێکارانی کارگەکەی بێلو ڕۆڵێکی گەورەی بووە لە پێگەیاندنو دارشتنی بنەما ڕۆشنبیرییەکانی گێرتروودداو ڕەنگە هەر ئەمەش کاری کردبێتە سەر هەڵوێستی دواتری میس بێل لە پێشخستنی باریی پەروەردەو فێرکردنی ژنان لە عێراقدا.

گێرتروود خوێندنی مێژووی مۆدێرنی لە زانکۆی ئۆکسفورد تەواو کردووەو بە ماوەی دوو ساڵو بە پلەی شەرەف کۆتایی پێهێناوە و بە شێوەیەکی لە ڕادەبەدەر زیرەك بووە. هەرگیز لە ژیانیدا هاوسەرگیریی نەکردووەو ئەزموونێکی سۆزداریی سەرنەکەوتووی هەبووەو دوای کوژرانی دەزگیرانە ئەفسەرەکەی لە شەری گالیپۆلی جەنگی جیهانیی یەکەمدا ئیتر خۆی بە تەواوی تەرخان کردووە بۆ چالاکییەکانی کە دواتر باسیان دێت.

- ١٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠

... مستەر کاربێتی داماو بە فرۆکە ویستی بچێت بۆ کەرکوك بۆ بەشداربوون لە کۆنفرانسێکدا، بەڵام فرۆکەکەیان لای تاوق (داقوق) تێکشکاو ئەم بە برینداری گەیەنراوەتە نەخۆشخانە لە کەرکوكو قولێكو دوو پەراسووی شکاوەو بیستوومانە کە نیشانەی نەخۆشیی سنگو سییەکانی لێدەرکەوتووەو دەترسم پەراسووە شکاوەکانی چەقیبێتە سییەکانی. لە ڕووداوەکەدا فرۆکەوانەکە مردووەو بەراستی ئەمە کێشەیەکی ناخۆشەو ئەوان ویستوویانە بە ناچاری بنیشنەوەو خۆیان کێشاوە بە تەپۆڵکەیەکدا. ئەمە یەکەم فرینی مستەر گاربێت بووەو پێموایە بەسەرهاتە بێماناکەی ئەی. تی. ویلسنم بۆ نەگێراونەتەوە کاتێ کە بە فرۆکە چووە بۆ هەولێرو مووسڵ لە مانگی سێپتەمبەرداو هەر کە ئەوێی بە جێهێشتووە کەوتووەتە ناوجەرگەی ئەو خێڵو هۆزانەی لە یاخیبووندانو فرۆکەکەی تێکچووەو ئەگەر بهاتایەو بە ناچاری بنیشتایەتەوە ئەوە بە مسۆگەری خێڵەکان دەیانکوشت. ئەو ڕێك لەو کاتەدا کە (کەرکوك یان هەولێری بەجێهێشتووە) لە بنکەی فەرماندەییەوە برووسکەیەکی پێگەیشتووە بە دەقی ئەم وشانە " ئەگەر کۆمیسیاری مەدەنی بەردەوام بێت لە ڕۆیشتن بۆ مووسڵ کارێکی باش دەکات ئەگەر بۆمبێك بەسەر باتاسدا بەربداتەوە"، بێگومان باتاس لەو کاتەدا بەتەواوی لە حاڵەتی یاخیبووندا بوو ئەڵبەتە ئەوەش جۆرێك بوو لە خۆشبەختی کەوا ویلسن بەرهەڵستیی جێبەجێکردنی نەکرد، بەڵام دارشتنی وشەکانی برووسکەکە وەك بێمێشکییەکی ناوازە ئازاریدام.

- ٢٨ی مایسی ساڵی ١٩٢٤.

باوکی ئازیزم، دواناەمەت کە لە ١٤ی مایسدا ناردبووت زۆر مایەی خۆشیو ئاسوودەییم بوو، نازانم ئەگەر مستەر تۆماست ناسیبێتو ئەو ئێستا نەخۆشەو هەموو ئەو شتانەی کە بە چارلست وت زۆر ڕاستن تەنها یەك خاڵ نەبێت ئەویش کەرکوکە کە لە پار ساڵەوە لە ژێر ڕکێفی سەرۆکە جێمتمانەو بەرێزە ناوخۆییەکەدایەو (ئێستا پێیدەوترێ موتەسەریف) کە ئێستا باشترینو ئارامترین بەشی عێراقە. کەرکوك گەلێ ئیمتیازی تایبەتی خۆی هەیە وەك زمانی لۆکاڵیی خۆیو کاربەدەستی خۆڵاتیو لەم بارودۆخەی تەواو قایلە ببێتە بەشێك لە عێراق بۆ ئەوەی سوودو قازانجی پەیماننامەیەك بەدەستبێنێ لەگەڵ ئێمەداو بە پێچەوانەوە هەرگیز نەبووە بەشێك لە عێراق. ئەڵبەتە هیچ ڕووداوێکی تێدا نەدەبوو ئەگەر بهاتایەو هێزە بەریتانییەکان یان هندییەکان لێرە بوونایە، بەڵام نەکرا لێرەیان دابنێینو ئەمەشیان کێشەیەو کەرکوکلییەکان هەمیشە داوای دەکەن، ئێستاش باسێکی لێڤیت بۆ دەکەمو ئەمانە زۆر سەیرو بەرەڵانو ئەو پلانێکی لە ڕادەبەدەر خراپە کەوا بکەیت هێزێکت لە کریستیانەکان هەبێتو هێزێك لە موسڵمانەکان، هەرچەندە ئەمان کەمێك ئەهوەنترن، لە ژێر سەرپەرشتیی ئەفسەرە بەریتانییەکاندا. ئەوانە بە شێوەیەکی ڕەها دەبنە ناحەزو دوژمنی دانیشتووانو ئیرەیی نێوان ئەمانو سوپای عێراقو حکوومەت زۆر گەورەیە، ئەمانە کەشو فشی ئەوە دەکەن کەوا بوون بە سەربازی بەریتانیو عەرەبو کوردی پیس نینو ئێمەش بە ناچاریو فشاری دۆخەکە لەم کێشەیەوە تێگلاوین.

ساڵی (١٩٢٠)و کاتێ لە دوای یاخیبوونەکە ئێمە کوتوپڕ

بەرەوڕووی کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیا بووینەوە، دەبوو لیڤییەکان بەکاربێنین بۆ پاسەوانی کردنی هێلی شەمەندەفەرو ئەو دەمە ژمارەیان زۆر بووو نەمانتوانی بیانخەینە ناو سوپای عێراقەوە لەبەر کۆمەڵێك هۆکارو پاساو، کە لە نێوانیاندا، نەبوونی پارەی پێویست بوو بیاندەینێ. ئەوان بارێکی گران بوون بە سەر باری دارایی بەریتانیاوەو گەنجینە نەیدەتوانی لە ڕووی یاساییەوە کاری بۆ بکات‌و بەهیچ شێوەیەك نەیدەتوانی یارمەتیی هێزە ناوخۆییەکانی خەڵکی خۆولاتی بدات کە لەژێر سەرپەرشتیی ئەفسەرە بەریتانییەکاندا نەبوون، بۆیە گەیشتینە ڕێگەیەکی داخراوو دەبوو پەنا بەرینە بەر ئەو لیڤییانە کە لەژێر سەرپەرشتیی ئەفسەرانی بەریتانیدا بوون‌و لەو کاتەدا ژمارییەکی کەمی ئاسوورییەکانمان هەبوو بەم جۆرەبن و دواتر هەرەشەی تورکیا هاتە پێشەوە لە شوباتی ساڵی ۱۹۲۳داو ئێمە دوو بەتالیۆنی زیادەمان بەسەربازگرت‌و بە تایبەتی بۆ پاسکردنی سنوور، هەر کە هێزەکانمان بە شێوەیەکی بەرچاو هاتنە کەمی ئەمانە ناونووسکران‌و مەشقیان پێکرا بۆ ئەوەی جێگەیان بگرنەوەو ئەم لیڤییانە بێ جیاکاریی لە لیواکانی باکووردا بەکاردەهێنران‌و بێ جیاوازی کردن بەگشتی دوودلی‌و نیگەرانییەك هەبوو لە بەکارهێنانی هێزە کریستییانەکان لە شارە موسڵمان نشینەکاندا، بەڵام ژمارە کەمییەکی ئاو های لە هێزەکاندا تا ڕادەیەك ئەم مەسەلەیە پەیڕەوی نەدەکراو بوونیان لە کەرکوك لەم سۆنگەیەوە بوو، هەروەها وا ڕێکەوتبوو کە بەتالیۆنەکەی ئەوێ لە هۆزە کێوییەکانی ئاسوورییەکان ناونووس کرابوو بەڵام ئەفسەرەکانیان بە تەواوی جێمتمانەو ڕەفتار جوان بوون، شەڕێکی لەناکاو دروست بووو کوتوپڕیش گۆڕا بە هات‌و هاوار دژ بە موسڵمانان‌و دیسپلین‌و توندوتۆلیی سەربازی بابردی‌و ئەوەی ڕوویدا، ڕوویدا. بۆ بەدبەختی ئەوە بوو کە بۆ ڕۆژی دواتر وا بڕیار داربوو کە ئەم بەتالیۆنە ئاسوورییە بنێردرێتە دەرەوەی کەرکوك بۆ گوندی چەمچەماڵی سەر ڕێگەی سلێمانی‌و نیوەیان ڕۆژی پێشتر ڕۆیشتبوون‌و وا ئێستا هەموویان لەوێن. بە ڕای من، کە ئەمە تەنها ڕایەکی تایبەتییە، کەوا لە پاشە ڕۆژدا دەکرێ ئاسوورییەکان تەنها لە ناوچەکانی خۆیان خزمەت بکەن‌و پاسەوانیی سنوورەکانی خۆیان بکەن، کە لە هەمان کاتدا سنووری عێراقیشەو ئەودواشیان دەبێ بلاوەیان پێبکرێت‌و بە هیوام لە کاتی خۆیدا بەشێکیان لە سوپای عێراقدا دابمەزرێن، ئەلبەتە ئەوان لە ناو پۆلیسی عێراقدا بە قەناعەتەوە لەژێر رکێفی ئەفسەرانی عێراقیدا کار دەکەن‌و من پێمخۆشە ئەم مەسەلەیە بۆ چارلس ڕوونبکەیتەوە.

هێزە خۆولاتییە تایبەتییەکانی لەم چەشنە هەمیشە ئەگەری سەرچاوەی مەترسین، بەتایبەتی ئەگەر ئایینەکەشیان جیاواز بێت، بە بۆچوونی من حکوومەتی بەریتانیا دەبوو بە شێوەیەکی ڕاست ئەم هێزە دروست بکات‌و بە ستراتیجێك کە پارە لە خزمەتی سوپای عێراقدا خەرج بکات، کە مەشقیان بەریتانییەو بەڵام ئەفسەرانیان عێراقین، بە هەر حاڵ ئەم پڕۆژە خرابووە بەر باس‌و ڕەتکرابووەوە.

ئێمە دوێنێ‌و ئەمڕۆ کاری خۆمان دژ بە شاری سلێمانی جێبەجێ کردو شێخ مەحموود دەرفەتی ڕووداوەکەی کەرکوکی قۆستەوە بۆ جاردانی جیهادو کاری لەم چەشنە دەبوو دەستبەجێ بوەستێنرێ. بڕوانە ئەو هۆزە کێوییانەی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەیت، موسڵمان‌و مەسیحیی دانیشتووانی شارەکە (واتە کەرکوك – و) هۆشدارییەکی توندیان درایەو بەو پێیە ئاواتەخوازین زیانی گیانی کەم بێت یان هەر نەبێت، ئەوان تەنها زۆر نیگەرانی ئەوەن بۆ دەرکردنی شێخ مەحموودو دوای ئەوەش نەهێلن بگەڕێتە دواوەو بێگومان ئەو لە ئێستادا هەڵاتووە بۆ چیاکان. ئەلبەتە تێدەگەیت کەوا هێزی تەواومان نییە بۆ جێگیر کردن‌و پاراستنی شوێنێکی دووری وەك سلێمانی. فەوجێکی سوارە ئامادە کراوە کە بە زۆری لە کوردەکان پێکدێت‌و نێردراوە بۆ کەرکوك. دواجار من باوەڕم وایە کە سوپای عێراق لە توانایدا دەبێت سلێمانی بگرێت، بەڵام لە حاڵی حازردا تاقە چەك کە هەمانبێت فڕۆکەیە.

با ئەوەشمان لا ڕوونبێت کە ئەگەر سەرچاوەکانمان هێندە لاواز نەبوایە ئەوە هۆکاری تر دەبوو بۆ پاراستنی وڵات، بەڵام سەبارەت بە تورکەکان‌و کۆکردنەوەی هێزەکانیان لەسەر سنووری باکوور ئەوە دەبێ لە بەرانبەردا تا لە توانادا بێت سوپای عێراق لە ناوچەی مووسڵ کۆبکرێتەوەو پێگەی بەهێز بکرێت.

– ١٨ی شوباتی ساڵی ١٩٢٥.

... هەواڵەکان لە باکوورەوە دڵخۆشکەرن‌و ڕاستییەکەی هەولێر زۆر باش ڕەفتاری کردووەو کەرکوکیش لەو باشتر بوو کە چاوەڕوانی بووین‌و وەك دەزانێت ژمارەیەکی باشی تورکمان لەوێ هەن‌و پێمانوابوو ڕێژەیەکی گەورەیان داوا دەکەن بگەڕێنەوە بۆ تورکیا، بەڵام کەمێکیان ئەوەیان کرد. وەرگێڕە هۆڵەندییەکە، وەك چاوەڕێم دەکرد، تەواو بێتوانا بوو لە وەرگێڕانی زمانی ئاسایی هەر زمانێکداو تەنانەت کوردیش! ئێمە بیستوومانە کەوا "پسپۆڕانی" زمانی تورکی تادێت گرژو مۆنتر دەبن.

هەرچوونێك بێت ئێمە ئێستا لە گەرمەی قەیرانێکی وەزاریدایین لە سەر مەسەلەی ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی. پێموایە لە بارەی ئەم کۆمپانیاوە باسم بۆ کردوویت‌و ئەمە کۆمپانیایەکی ئینتەرناشناڵ‌و بەریتانی‌و فەرەنسی‌و ئەمریکییەو گرووپێکی زۆر گەورەیەو هێند قەبەو بەتوانایە کە دەتوانێت سەرمایەی زەبەلاحی پێویست پەیدا بکات بۆیە بۆریی ڕاکیشانی نەوت بەناو دەریای ناوەڕاستدا. لە دیدی ئێمەوە مەسەلەی گەورە ئەوەیە کەوا گەشەکردنی وڵات دەبێ دەستپێبکات‌و سەرمایەی دەرەکیش پەرەبسێنێت. بەشداریی فەرەنساو ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا پارێزگارییەکی ئیزافییەو ئێمە پێمان خۆشەو باوەشی بۆ دەکەینەوە. بەڵام هەڵچوون‌و دنەدانێکی گەوجانەو نەزانانە سەری هەڵداوەو بەشێوەیەکی سەرەکی لەلایەن کەسانی دەرەوەی حوکم‌و وەك کوتەکێك بەکاریدێنن بۆ هاندانی گشت کۆمپانیاکانی تر تا وەکو ڕێگەیان پێبدرێت بۆ کێبڕکێ‌و بەدەستهێنانی ئیمتیاز ئەگەر هەل‌و مەرجی باشتر پێشکەش

بکەن‌و ئەنجامەکەشی وادەبێت کە ئەوان تا رادەیەك هەر مەرجێك پێشکەش بکەن بە لای خۆیانەوە گونجاو بێت کە دواجار بیفرۆشنەوە بە کۆمپانیای نەوتی تورکی وەك سێرجیم. کادمان بۆی دەچێت. ئەمەش دواخستنی دوو سێ ساڵ‌و ناهاوتایی ئابووریی گشتی دەگەیەنێت. مەلیك کارێکی زۆر گران دەکات بۆ ئەوەی کابینەکە راستیی مەسەلەکەی بۆ دەربکەوێت بەڵام سیان لە وەزیرەکان هێشتا هەر هەرەشەی دەست لەکار کێشاوە دەکەن‌و بە سێر هێنرییان وتووە کەوا ئەوان مەترسییەکان لە پێشەوە دەبینن ئەگەر کۆمپانیای نەوتی تورکییان رەتکردەوە، بەڵام متمانەیان بە حکوومەتی خاوەن شکۆیە (واتە بەریتانیا - و) بۆ دەربازکردنیان لەم هەراو ئاژاوەیەی تێیکەوتوون‌و بەم داوا کراوە لە حکوومەتی خاوەن شکۆ دیدو بۆچوونی خۆی لە بەهێزترین تێرمدا بە برووسکەیەك رەوانە بکات [٦٤].

*** دەوری ئافرەتانی کەرکوك لە شۆرش‌و بزافی نەتەوەی کورد.**

هەموو بزووتنەوەیەکی سیاسی کۆمەڵێك کۆڵەکەو بنەمای گرنگ پێکەوەی دەبەستێ یان هەنگاوێکە بۆ ئەوەی کە لەسەر پێی خۆی بووەستێت هەرییەکەی دەورو گرنگی خۆی هەیە لە پێگەیاندنی دەستکەوت‌و چالاکییەکانی ئەو بزووتنەوەیە، چ لەسەر ئاستی ناوخۆ، یان لەسەر ئاستی دەرەکی.

خەباتی نەتەوەی کورد لە هەموو قۆناغەکانی مێژوودا هەڵگری کۆمەڵێك سیفات‌و خەسڵەتی خۆیەتی کە دەوریان بینووە لە سەرهەڵدان‌و گەشەکردنی لەسەر هەموو ئاستەکان یان بەشێوەیەکی تر کارەکتەری سەرەکی یان لاوەکیی لە چوونە پێشی هەموو ئاستەکان.

ئافرەت هەر لەبەرەبەیانی مێژووە لەم دەڤەرە دەوری سەرەکی‌و راستەخۆی بینیووە لە چالاککردنی بزاڤی نەتەوەی کوردو بە تایبەتی لە ماوەی خەباتی ژێر زەمینی‌و خەباتی پارتیزانی‌و چەکداریدا.

هەموو ئەو سیفەتانەی کە شۆرشی کوردی لەسەر دامەزراوە لە هەوڵدانی ئەوە دابوو کەلە کۆمەڵگەوە دەست پێبکات بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە هەوڵی چاککردنی بدات یان بەرەو گۆرانکاری هەنگاوبنێت بۆیە بایەخ دان بە ئافرەت وەکو دایك‌و نیوەی کۆمەڵگە دەوریان بینووە لە ئەکتیڤ کردنی خواستەکانی بزووتنەوە یەك لە دوای یەکەکان لە کوردستان.

تەنها بزوتنەوەیەکی کوردی نابینیت لە ماوەی خەباتی ئاشکراو نەهێنیدا نەچووبێتە ئەو ئاستەی کە ئافرەتی بەکار هێنا بێت‌و دەوری نەدا بووبێت پێی، چونکە بەشداری کردنی بزوتنەوەکەی بەرەو پێشەوە بردووە ئەوەی بەرچاو بێت لە رۆڵی ئافرت لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد خۆی دەبینێتەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:-

١- بەشداری سەرەکی ئافرەت لە رێکخستنە نهێنییەکاندا، ئەویش لەسەرئاستی ئەڵقە نهێنییەکان وەکو بەشداری شان بە شانی پیاو بۆجێ بەجێ کردنی رێکخستنەکان‌و بەجێ گەیاندنی رۆڵی بەرچاو لە بەرەوپێش چوونی هەنگاوە سیاسی‌و سەربازییەکان.

٢- بەشداری کردن وەکو کاری کۆمەڵایەتی‌و پەیوەندی دابوونەریتەکان ئەویش کارکردنیان لە چوار چێوەی چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگە، کە ئافرەت رۆڵی گەورەی بینیووە لە چارەسەرو هەوڵدان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی مەرامە سیاسییەکانی بزوتنەوەی رزگارخوازی کورد، هەندێك جار کێشەی ژن بە ژن‌و ژن بە زۆر بە شوودان.. و کوشتنی ئافرەت‌و کێشەی نێو ماڵەکان ئامانجی سەرەکی ئافرەت بووە لە هەموو شارەکانی کوردستان.

٣- بەشداری پێکردنی ئافرەت وەکو پەیامبەرو پۆستەچی لەنێو شارو بەندیخانەو گەرەك‌و شارۆچکە جۆربەجۆرەکان چوارچێوەی ئەم کارە یان زۆر پیرۆز بووە کە توانیوویەتی گەلێك ئاستەنگی گەورە گەورە چارەسەر بکات کە هاتووەتە رێگایان یان توانیوویەتی ئەو هەنگاوە گرنگانە بنێت کە ببێتە بنەمای چاککردن‌و ئەکتیڤکردنی رێکخستنەکان بە شێوەیەکی بەرچاو.

٤- کارکردنی ئافرەت لە بەرەکانی شەر وەکو یارمەتیدەری پیاو، چ لەسەر ئاستی چێشت لێنان، ئامادە کردنی چەك، گواستنەوەی پێداویستییەکانی شەر بۆ شوێنی پێویست.

٥- کاری سیخوری کردن بەسەر دووژمنەوە لە نێو گەرەك‌و شارو شارۆچکەکان، بۆ ئەوەی بتوانن بەشێك لە چالاکییەکانی دوژمن، بە هەڵسووکەوت و پێکەوەبوونی لەنێو کۆمەڵگە بزانن.

"... ئەم خەباتکەرە ژنانە، ئێستا وەکو مێینەیەکی تێکۆشەر ناسراون، ژیانێکی سەخت‌و دژواریان بەسەر بردووە، ئەم خانمانانە رێگای شاخ‌و بەندیخانەو کارکردنی سەختی ناو شاریان لە رێکخستنەکاندا گرتووەتە بەر.

لە دەیەی چلەکانەوە تا نەوەدەکان بەبێ جیاوازی حیزبایەتی گفتوگۆی چرو پریان ئەنجامداوە. لە دامەزراندی حیزبی شیوعییەوە دەستپێدەکات تا پارتی دیموکراتی کوردستان‌و یەکێتی نیشتمانی‌و سۆشیالیست‌و حیزبەکانی تر ئەم ئافرەتانە تێکرا سەختی ژیانیان هەڵبژاردووە لە دۆڵەکان‌و قوولەکان‌و ئەشکەوتە بەرزەکان‌و لەنێو چیاو پێدەشتەکانیاندا ماڵیان لەگەڵ مارو مێروو و درەندەی کێویاندا بەشکردووە. جگە لە زریان‌و تۆفان‌و باو باران بەردەوام لەبەر ترسی نەبراوی تۆپ‌و فرۆکەدا ژیاون، ئەو هێزە گەورەی گەلەکەمان بەرجەستە دەکەن، زۆر بەهۆی ئەو ژیانە سەختە لە خوێندن‌و فێربوونی تەواوەتی دابراون لە بچووکترین هەلومەرجی دروست بۆ گەشەو مانەوە بێبەشبوون ئەمانە ئەو نەوەیەن لە مێیینە کە منداڵەکانیان لە ناو کونە تەیارەو حەشارگەی کێواندا پەروەردە دەکرد.

".. هەزاران مێیینەمان بوونە قوربانی لە رێگای پارتیزانیدا لە کاتی ئەنفالەکاندا گیران‌و تا ئەمرۆش کەس نازانێت دوا مەزارو دوا گلکۆیان لە کوێیە؟.

سەدان مێینەیان بوونە قوربانی تۆپباران‌و کیمیاوی‌و مین، ئەم ژنانە هەرگیز خەباتگێری پلە دوو نەبوون وەك ئەمرۆ نیشاندەدرێت. بکەری دەستەراست نەبوون کە ئیشیان تەنیا یاریدەدانی پیاوبێت، بەڵکو بکەری راستەقینەی شۆرش بوون، بەردی بناغەی شۆرشە یەك لە دوای یەکەکانی کوردستان توانای ئەوان بوو.

مەخابن ئەوەی بە ڕوونی سەیر بکات دەبینین ئەو مێیینە تێکۆشەرو نیشتمانپەروەرانە توێژێکی لە بیرکراوو فەرامۆشکراون نەوەك لە پەراوێزدانین بەڵکو لە هەموو پەراوێزێکیشیدا کراونەتە دەرەوە، چ وەکو مێینە فەرامۆشکراون چ وەك خەباتگێڕ.

شارێکی وەکو کەرکوك هیچی کەمتر نەبووە لە شارەکانی تر، هەردەم ئافرەت ڕۆڵی خۆی بینووە لە خەباتە یەك لە دوای یەکەکانی بزاڤی سیاسیو گەلێکیان دەوری بەرچاویان بینیووە لەبەرەو پێشچوونی چالاکییە سیاسییەکاندا کە کار گەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە تووشی شەهید بوونو گرتنو کوشتنو ئەنفال بوونە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە کە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە، کە دووژمن لە شارێکی وەکو کەرکوك هەردەم ئافرەتی بەکارهێناوە وەکو سیخوری دژی بزاڤی کوردی هەردەم گەلێك ئافرەت لەو بوارەدا دەوری بەرچاویان بینووە بۆ کۆکردنەوەی زانیارییو تووشبوونی گەلێك کەس لە ڕێگای ئافرەتەوە، بۆیە کاری ئافرەتە شۆڕشگێڕەکانی ئەم شارە ئەرکەکانیان زۆر قورس بووە بۆ چاودێریکردنی بارگەو ڕزگار بوون لێی.

* یادداشتی ( لەیلا عەلی بەرزنجی )

من لە بنەماڵەیەکی کوردپەروەری شاری کەرکوکی کوردستان بوومو لە ساڵی (١٩٤٩) لە دایکبووم، لە ساڵی پەنجاکاندا باوکم یەکێك بووە لە ڕێبەرانی کوردایەتی لە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستانو دەورێکی کاریگەری هەبووە لە سوپای عێراقدا، پاش شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی (١٩٥٨) لە نووسینگەی مەکتەب عەسکەری لە ریزی سوپادا نایب زابت بوو لە فەوجی تەدریب لێپرسراوی سەربازی بوو، ئابوونەی هەموو فەوجەکە باوکم کۆی دەکردەوە نایب زابتەکان (٢٥٠) فلس ئابوونەیاندەدا، عەریفەکان (١٠٠)فلسو عەسکەرەکان (٥٠) فلس هەمووی دەیکردە (٤٩) دیناری ئەو ڕۆژە.

ئەو کاتە (ئەمنەخان)ی دایکیشم هێندە دڵسۆزبوو بۆ کوردو کوردستان یەك دینار مانگانەی هەبوو باوکم دەیدایە بۆ پێداویستییەکان خۆی دەیوت "توخوا شێخ عەلی من ئەو مانگانەیەم ناوێت بیخەوە سەر پارەکە بابێت بە (٥٠) دینار" ئەو پارەیە دەدرا بە خێزانی پێشمەرگە.

دایکم سوپاسنامەی لە "مەکتەبی سیاسی"یەوە بۆ هاتەوە، ڕۆژێکیان (زێبا خان)ی خوشکی (خالید دلێر) سوپاسنامەکەی بۆ هێنایە ماڵەوە، خەڵکەکە ئەوەندە حەماسیان بۆ کوردایەتی هەبوو ئەوەندە خەمی پارەیان نەبوو وەکو ئەم سەردەمە.

لە ساڵی (١٩٥٩) کە بارزانی لە ڕووسیا هاتەوە سەردانی کەرکوکی کرد لە "نادی زوبات لە سەر مەنەسەکە وەستابوو قسە بۆ خەڵك بکات باسی برایەتی کوردو عەرەبی دەکردو دەیوت کەرکوك شارێکی کوردستانییەو هەموو بەیەکەوە دەژین، هیجران هەبوو زابتی ئیعاشە باوکی کوردبوو دایکی تورکمان بوو، بە باوکمی وتبوو تورکمانەکان بەنیازن پیلان لە بارزانی بکەنو بیکوژن، چونکە دایکی تورکمان بوو زانیبووی، باوکیشم جلی سەربازی لەبەردابوو نەیدەتوانی بەو جلانەوە بچێتە شوێنی حیزبییەوە، باوکم یەکسەر (بابە عەلی) هاوسەرمی بانگکردبوو پێی ڕاگەیاندبوو کە پیلانێکی وا لە ئارادایە، ئەویش بە (عومەر دەبابەو عەلی عەسکەری) وتبوو بچۆ بڵێ واخەریکی پلاندانانن بۆ بارزانی، (عەلی عەسکەری) خێرا جێبێکی هێنابوو (مەلا مستەفا)یان تێکردبوو بردبوویان بۆ فرۆکەخانە، (هیدایت ئەرسەلان) یەکسەر جەڵتە لێیدابوو لە داخاندا مردبوو.

دوای ماوەیەك مقۆ مقۆ پەیدا بوو، لەولاشەوە حیزبی شیوعی لە ئیمام قاسمو شۆڕیجەوە" بەکۆماتبوون هێرش بکەنە سەر تورکمانەکان هەموویان بەرپێوان هاتبوون لەسەر پردەکە (عومەر دەبابەو عەلی عەسکەریو عەقید نوری کە بە نوری کەلەشێر) ناسراوە بینوویانو بلاوەیان پێکردبوونو نەیانهێشت شەڕ ڕووبداتو هێرش بکەنە سەر تورکمانەکان وتیان بارزانی دەرچووەو ڕزگاری بووە پێویست ناکات شەڕ لەنێوان تورکمانو حیزبی شیوعی دا ڕووبدات.

لە تەمووزی (١٩٥٩)دا جەماوەری هەردوو حیزب کە بە دیموکراتییەکان ناسرابوون حیزبی شیوعی عێراقیو پارتی دیموکرات، جەماوەر هاتنە سەرجادە بۆ یادکردنەوەی (١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨) کە ساڵێك بەسەریدا ڕۆیشتبوو، پێش کردنەوەی یادەکە بەعسییەکانو قەومییەکانو تۆرانییەکان لەبرەودابوون، حیزبی شیوعیو پارتی ئەم حەرەکەی ئەوانی بەپلان دانا، کرێکارانو قوتابییانو لاوان بە خۆپیشاندان بە شەقامەکانی شاردا دەرۆیشتن، کە جەماوەر گەیشتنە بەر سینەما ئەتڵەس کۆمەڵێك لە قەومییەکانو تۆرانییەکانو بەعسییەکانو کوردەکان جەماوەری خۆپیشاندەریان لەناو سینەماکەوە دایە بەر بەردو بەرد بارانیان کردن، جەماوەری خۆپیشاندەر هێرشیانکردە سەر تۆرانییەکان ئەو کۆمەڵەی کە بەردبارانی جەماوەریانکردبوو، کۆمەڵێك لە کەسایەتی تورکمانەکانو نەوتچییەکانو ئاوچییەکان کەوتنە بەردەستی جەماوەر، ئاوچییەکان ئاویان لە کانییەکان هەڵدەگۆزیو دەیانفرۆیشت بۆیە ناویان نابوون ئاوچییەکان.

نەفچییەکان لە بابەگوڕگوڕەوە نەوتی ڕەشیان هەڵدەگۆزیو بەدەبە دەیانفرۆیشت بەشاری کەرکوك، ئەم خۆپیشاندانو بەزمە تاکاتژمێر پێنجی ئێوارەی خایاند (شێخ مارف بەرزنجی) بەڕێوەبەری شارەوانی کەرکوك بوو، لاشەکانی ئەو (٢٣) کەسەی کۆکردەوەو بەشێوەیەکی جوان ناشتیانن، (عەبدولکەریم قاسم) لە کانیسەی ماری یوسف لە کەرکوك خوتبەیەیەکی دا شیوعییەکانی تێدا تاوانبارکردو شێخ مارف گیرا، (جەباری پیرۆزخانو شێخ حوسێنو جەلالی ئەحمەد فەهمی و شێخ نوری شێخ ئەحمەد کە نایب زابت بوو لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی تردا) ئەوەبوو لە ساڵی (١٩٦٣) دا هەندێکیان وەکو شێخ مارفو شێخ حوسێنی برای لە سێدارەدران.

لە ساڵی (١٩٦٣)دا قەتڵو عام بوو لە دوای ئینقیلابی (١٩٦٣) بەعسییەکانو قەومییەکان شێخ مارف لەگەڵ هەندێك لە برادەرەکانی لە سێدارەدرانو عەبدولسەلام عارفیشیان لەگەڵیاندابوو، بەعسییەکان دەستیان کرد بەکاری نامرۆڤانەو (عەبدولسەلام عارف)یش پێی ناخۆشبوو، لە تشرینی دووەم دا ئینقلابی کرد بەسەر بەعسییەکاندا، لە حوزەیرانی

(١٩٦٤) هودنەیەك بوو لەنێوان حکومەتی عێراقی‌و پارتی دیموکراتی کوردستاندا هودنەکە سەرکەوتوو نەبوو، سوپای عێراقی دووبارە هێرشی کردەوە بۆ دێهاتەکانی حەویجەو دوبز، هەموو خەڵکەکانی ئاوارەبوون، کە هێرشی کرد بۆ ناوچەی شوان ئەوەی بەردەستی کەوت شەهیدی کرد هەتا گوندەکانی قەڵاسێوکان‌و گەیشتە سنووری "ئاغجەلەر"و گوندەکانی دەروروبەری شەریکەی نەوت هەموو خەڵکەکەی ئەنفالکران، لە ساڵی (١٩٦٣)دا قەرەدەرەو مامشەو قەلعەتوو هەتا ناحییەی دوبزیشی گرتەوەو خەڵکی عەرەبی خستە جێگای کوردە ئەنفالکراوەکان.

کە شۆڕشی کوردستان دەستی پێکردەوە دووبارە لە یارەلی‌و گۆگجەو حەسارەکان‌و ئۆمەربەگ‌و جولعان‌و قەفارو تۆمارو کلاو قووتوو مام ڕەش)و پەنجا دێهاتی تر چۆڵکران‌و عەرەب خرایە شوێنیان، بەتایبەتی ئەو دێهاتانەی بەدەوری شەریکەی نەوتدابوون بەتایبەتی لای نەوتەکەی حەویجەوە، هەتا ساڵی (٢٠٠٣) یەك کورد نەیدەوێرا بچێتە ئەو شوێنانە، هەتا ئەمڕۆش دە ساڵ دوای ئازادی عێراق هەر کێشمەکێشی سیاسی لەسەر نەوتی کەرکوك هەیەو شوێنێکی هەستیارەو لە هەموو ئان‌و ساتێکدا کڵپەی شەڕو ئاگری لێوە نزیکە.

ئەو کاتەی لە کەرکوك بووین باوکم بەردەوام هاوکاری پێشمەرگەی دەکردو لە ڕێگای چەمی ڕەزانەوە سندوقە فیشەکی دەنارد بۆ پێشمەرگە، جارێکیان لەناو کەرکوکدا کۆبوونەوەی هەموو لێپرسراو ڕێکخراوەکان بوو (شێخ عەلی ) باوکم لێپرسراوی سەربازی بوو، ئەوان لە کۆبوونەوەدا بوون‌و ژنی خاوەن ماڵەکە لەبەردەرگادا دانیشتبوون ئەگەر سەربازو ئەفسەرەکان بهاتنایە ئاگاداری دەکردنەوە، کە هاتبوون ژنەکە کۆکەیەکی کردبوو، ئەوانیش بەیانەکانی بەردەمیان کۆکردبۆوە خستبوویانە ژێر دۆشەکێك، پیاوێکی زەعیفی ڕەنگ زەردی تێدابوو لەسەر ئەو دۆشەکەی کە ژێرەکەی بەیانات بوو پاڵیان خستبوو بەتانیان پێدادابوو، پیاوەکە زۆر لە نەخۆش دەچوو، هەموویان دانیشتبوون بەدیارەییەوەو جگەرەیان کێشابوو، کەسەربازەکان خۆیانکردبوو بەماڵەکەداو ئەو دیمەنەیان بینی بوو هیچیان نەوتبوو گەڕابوونەوە دواوە وایان وێناکردبوو کە ئەو پیاوە بەڕاستی نەخۆشە.

لە کەرکوك (عایشە خان)ی خۆشکی (شێخ مەحمود کوردی) ئامۆزای دایکمی لێبوو کە بەڕێوەبەری کارگەی جگەرەی سلێمانی بوو، ئەویش ئافرەتێکی زۆر کوردپەروەرو تێکۆشەر بوو کاری دەکرد بۆ شۆڕش جلی کۆدەکردەوە (کاك حەمە ساڵح) برای عەقید بوو لە سوپادا جلی پێ کۆدەکردەوە جلەکانی دەکردە فەردەو دەینارد بۆ پێشمەرگە، ڕۆحی کوردایەتی زۆر تێدابوو، ئەو ساڵەش کە زانکۆ کرایەوە وتیان با ئافرەتان یارمەتی زانکۆ بدەن، (عایشە خان) گۆبەرۆکەکەی خۆی فرۆیشت‌و پارەکەی لە کەرکوکەوە نارد بۆ بناغەی زانکۆی سلێمانی، لەگەڵ (درەخشان خانی حەفیدا) هاوڕێیەتی هەبووەو لە پەرتوکەکەیدا باسیدەکات، (عایشە خان) هێندە کوردپەروەربوو لە کاتی کۆبوونەوەکاندا هەتا ئەندامەکان ئامادەدەبوون ئەم دەموچاوی هەندێك ژنی چاکدەکردو پارەکەی بۆ شۆڕش دادەنا، دڵسۆزییەکەی بۆ شۆڕشی کورد وای لێکردبوو ئەو دەرفەتە کەمە بقۆزێتەوە.

لە دوای ئینقلابەکەی (١٩٦٣) باوکیشم لەگەڵ چەند ئەندامێکی پارتی دیموکراتدا حیجز کرابوو، سەربازەکانی حکومەت هاتنە سەرمان شروشیتاڵیان فڕێ داینە دەرەوە، دەیانوت " شێخ عەلی باوکتان ڕایکردووە بۆلای بارزانی، لای خۆشیان گیرابوو، کاتێکمان زانی (کاك شێخ محەمەد) ئامۆزای باوکم هات‌و ماڵەکەی بردینە ماڵی خۆیانەوەو تاسێ مانگ دەنگوباسی باوکم نەبوو نەماندەزانی چی لێهاتووە، پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ لە فاوە"وە نامەیەکی بۆ ناردبووین‌و نووسیبوی " با نەقلم بکەن دێم بەشوێنتانداو دەتانبەم، جارێك بالە شوێنێك جێگیرببم"، سێ مانگی تری پێچوو ئەوسا باوکم گوێزرایەوە بۆ شاری "عەمارە" ئەو بەندیانە هەرییەکەیان لە شوێنێك بەندبوون، پاشتر باوکم کە مووچەی وەرگرت هات‌و ئێمەی برد بۆ "عەمارە" ئەو ڕۆژگارەی کە لە عەمارەش بووین باوکم هەر بەنهێنی لەگەڵ سەربازە کوردەکاندا خەریکی کاری حیزبوو.

دوای ساڵێك باوکم خانەنشین کراو هاتینەوە بۆ سلێمانی، من بەهۆی هاوسەرگیریمەوە تا پۆلی سێی ناوەندیم خوێندو وازم لە خوێندن هێنا، لەگەڵ (مامۆستا بابە عەلی) کە پورزای خۆمە شانبەشانی هاوسەرەکەم لە ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتدا دەست بەکاربووم، لە ساڵی (١٩٦٩)ەوە زۆربەی نهێنییەکانم پاراستووە، بەتایبەتی پاش (١١ی ئازاری ١٩٧٠) زۆر هاوکاری بووم، کاتێك حکومەتی بەعس پاشگەزبووەوە لە ڕێکەوتنامەکەی (١١ی ئازاری ١٩٧٤) هاوسەرەکەم شاری بەجێهێشت‌و من مامەوەو لە ماڵی (کاك شێخ محەمەدی شێخ غەریب) بووین‌و خۆمان شاردبۆوە، چونکە بەعس بەدواماندا دەگەڕا، پاش چەند ڕۆژێك من‌و (من‌و فاتمە خانی دشم‌و ئامینەی ئەحمەد شێخ ئەولا) تا بێستان سوور بەپێ دەڕۆیشتین، ڕێگاکە زۆر ناخۆشبوو دەمانوت شتێك نییە لەسەری بنووسین‌و بڵێین بەرد نییە ئێمە لەسەری دانەنیشتبێتین، ڕێگەکە زۆر ناخۆشبوو هەمووی قوڕە سوورە بوو بەلۆفەکاندا لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بووین هەتا گەیشتینە دەشتی "زەڵێ"، لە ڕێگادا پیکابێك سەریخستین‌و نیوەشەو گەیشتین، هاوسەرەکەم خەوتبوو بەئاگایان هێنایەوە، ئەویش بەدەم خەوەوە لە خۆشیاندا باوەشی بەرژنێکی تردا کرد کە لەگەڵماندابوو وایزانی منم زوو زوو دەیوت "ئۆخەی لەیلێ گیان هاتیت".

من لە بەرزنجە هیچ دریخیم نەکردووە لەوشیاری ئافرەتانی کوردستان، لەلایەك بەژیانی لادێ ڕانەهاتبووین‌و لەلایەکی تر خزمەتی میوانم دەکرد، ئێمە لە بەرزنجە لە خانووی ماڵی مامدا دەژیاین کە لەترسی بۆردومانی تۆپ‌و فڕۆکەکان چۆڵیان کردبوو، کە فڕۆکەکە بۆردومانی بەرزنجەی کرد باشبوو لە قەراغ گوندەکەدا هەندێك ڕەشەوڵاخ پێوەبوون‌و خەڵکەکە کارەساتی ناخۆشیان بەسەردا نەهات، دواتر چووینە "وەزڵ" لەولای شێخ عیسا و موساوەیە بەبەردەوامی ترسی بۆردومانمان هەبوو خزمەتی پێشمەرگەشمان دەکرد،

لە سەرەتای چوونە دەرەوەمان بەهۆی ئەو هووروژمە ناکاوەی خەڵکی شارەکە دارژان بەسەر دێهاتەکاندا خواردن کەم دەستدەکەوتو زۆر جار برنجی سادەم لێدەناو شلەمان نەبوو، پێشمەرگەکان دەیانوت دۆشاوەکە بکەرە ئاوەوەو بۆمان بهێنە لەبری شلە جاری وا هەبووە پێشمەرگەکانی قیادەی مەرکەزی کە هاوڕێی (خاڵە عەلی)و بوون دەهاتن بۆ ماڵمان، دواتر چووینە خوێندنگەکەوە کە لە خوار دێکەوەبوو، جارێکیتر بە ناپاڵم بۆردومانی بەرزنجەی کردەوەو خەڵکەکەی خۆی هەموو چۆڵی کردبوو بەس پێشمەرگەو ماڵە پێشمەرگەی تێدابوو لە ناچاریدا چووینە باخەکانی نێوان بەرزنجەو باساك هەر ماڵەو بۆخۆی کەپرێکی دروستکرد، لەوێوە چاومان لێوە بوو کە فڕۆکەکان بۆردومانی ئەو دێهاتانەی دەکرد کە جارێکیان (حاجی مامەند)ی دایەبەر ناپاڵم لەو کەپرانەدا بەکولەمەرگی دەژیاین‌و ژیانمان زۆر سەخت بوو لەناو ئەو خۆڵە پەتانییەدا.

من چووم سەردانی ماڵی خاڵم کرد لە گوندی "کاژاو" کە چووم ئەوانیش لە ژیانێکی سەختدا دەژیان (ئەختەر خان)ی خاڵۆژنم دەرزی چووبوو بەقاچیا لە ترسی حکومەت نەیدەوێرا بگەڕێتەوە بۆ شار لەوەش دەترسا دەرزییەکە بچێتە ناو خوێنەوە، لەو کێشەیەدا بوون لای خۆی خاڵم لێپرسراوی قیادەی مەرکەزی حیزبی شیوعی بوو لە ژوورێکی بچکۆلەی مشکاویدا دەژیان‌و ژیانیان زۆر قورس‌و ناخۆشبوو پاشان گەڕامەوە بۆ بەرزنجە، کە تازە چووبووین بۆ بەرزنجە فرۆشگا کرایەوە برنج‌و ڕۆن‌و شەکرو چاو هەموو شتێك دەستدەکەوت وەکو یەکەم جار نەبوو.

پاش ماوەیەك ماڵمان باریکرد بۆ "پارەزان" وتیان با ڕێکخراو بڕوات بۆ ئەوێ، ماڵەکەمان ئەوەندە نەبوو کەمێك ئاردو زەخیرە بوو، پاش شەوێك مانەوەمان وتیان "شۆڕش تەواو نسکۆیە دەڕۆین بۆ ئێران، هەرکەس نایەت بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی" (مامۆستا بابە عەلی) هاوسەرم وتی "ئاڕۆین بۆ ئێران"، ئەوکاتەی ماڵمان لە بەرزنجە بوو وتمان باسەفەرێکی ئێران بکەین، وتی من پێناخەمە خاکی ئێرانەوە، ماڵی کاك نوری برای لە ئوردوگادابوو نەچووین بۆسەردانیان‌و ئەو ماوەیە لە بەرزنجەبووم نەگەڕامەوە بۆ سلێمانی، (ئەمنەخان)ی دایکم سەردانی کردم، لە نسکۆی (١٩٧٥)دا زۆری نەبرد پێشمەرگە دامودەزگاکانیان بەجێهێشت‌و شۆڕش کەوتە دەس کۆمەڵێك چاو چنۆك‌و گیرفان بڕ کە خۆیان بۆ ڕاو و ڕووت ئامادەکردبوو، هاوارمان دەکرد ئەو خەڵکە هەژارە ئابوونەیان بە حیزب داوەو پیاو ژن‌و کوڕیان یارمەتی شۆڕشیانداوەو تەنانەت ئێسترو گوێدرێژەکانیان خزمەتی شۆڕشی کردووە با ئەم هەموو خۆراك‌و فیشەکە بدرێت بەو خەڵکە زەحمەتکێشە، بەڵام لەو ساتە وەختەدا کێ گوێ لە قسەی کەس دەگرت لەو زەمەنە پڕ جەنجاڵییەدا هەتا یەکێك لە زەلامەکان میلی کلاشینکۆفێ لە مامۆستا (بابە عەلی) هاوسەرم هێنایەوەو وتی "قسە بکەیت دەتکوژم".

بابە عەلی وتی "وانابێت با نەختێك برنج یان سابوون بدەین بەو خەڵکە هەژارە، بەڵام ئەو کۆمەڵە تاڵانچییە دەستیان گرت بەسەر فرۆشگاکەدا، کە ئێمە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی هاوسەرەکەم داوای (٢٥٠) فلسی تەکسییەکەی لە باجی فاتمەی خوشکی کرد، بەڵام من لەگەڵ ئەو هەموو نەهامەتی‌و ناخۆشیەدا هەرگیز درێغیم نەکردووە لە هەوڵدان‌و خزمەتکردن، ئەو کارە نهێنییانەی کە بە هاوسەرەکەم نەدەکرا دەبووە هۆی بەڵاو دەردەسەری بۆیە خۆم قۆڵم هەڵماڵیوەو کردوومە، وەکو ئافرەتێکی دڵسۆز بە کوردو شۆڕش کاری خۆم کردووە کەلە دەرەوەش بووین من هیچ درێغیم لە خزمەت پێشمەرگەو شۆڕش نەکردووە هەتا تووشی نەخۆشی بڕبڕەی پشت بووم‌و بڕبڕەکانی (٣و٤)م نەشتەرگەریم بۆکردو لە یەکەمیاندا سەرکەوتوو نەبوو.

ڕاستە پیاوەکان بەچەکەکانیان لە مەیدانی شۆڕش‌و خەباتدا بوون، بێگومان ئێمەش کەمتر نەبووین لەوان بە ئامادەکردنی خۆراك‌و پۆشاك‌و چاودێری دوژمن‌و گەیاندنی چەك‌و نووسراوەکان، ئەو کارانەی ژنان لەناو شاردا دەیانکرد لە کاری پیاوان کە لە دەرەوە دەیانکرد هیچ کەمتر نەبووە.

ئاواتی من سەرکەوتنی گەلی کورد بووە کە ئازادبێت لە دەست زوڵم‌و زۆرداری وەکو هەموو گەلانی دونیا گەلی کوردیش سەرکەوتووبێت‌و ژێردەست نەبێت‌و خۆی حوکمی وڵاتی خۆی بکات.

*** جەعفەران شێخ محمود بەرزنجی.**

من لەدایکبووی ساڵی (١٩٤١)م لە ناحییەی "قادرکەرەم"ی گەرمیانی سەر بەپارێزگای "کەرکوك" لەبنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەرو تێکۆشەر لەپێناو کوردو کوردستاندا هاتمە ژیانەوە، من لەچلەکاندا منداڵبووم، (خاڵەکانم‌و شێخ مارف بەرزنجی‌و شێخ حوسێن بەرزنجی‌و مامەو کەسوکارم) کەسانێکی زۆر تێکۆشەر بوون لەناحییەی "قادر کەرەم" بیرم دێت تەمەنم شەش ساڵان بوو گۆڤارێکی بچووکی (١٥) لاپەڕەی دەردەچوو بەناوی دەنگی داس هەر لاپەڕەیەی باسی لەبابەتێك دەکرد، ئەو ڕۆژکارە (شاکر فەتاح) بەڕێوەبەری ناحییەی "قادر کەرەم" بوو گۆڤارێکی دەردەکرد بەناوی "باسەرە کەناوی ئاوەکەی "قادر کەرەم" بوو زۆر لەو گۆڤارانەم هەڵگرتووەو نووسینی زۆر جوانی تێدا بڵاوکراوەتەوە، (شێخ مارف‌و شێخ حوسێنی) خاڵم کە لە کۆلێژی یاسا لە بەغداد دەیانخوێند ئەم گۆڤارانەیان بە عەرەبی دەهێنا بۆ "قادر کەرەم"و دەیانخوێندەوە بۆ کوڕی جووتیارو کرێکار.

حیزبی شیوعی لە ساڵی (١٩٤٣)دا خۆی دەزگای چاپ‌و ڕۆنیۆی دەستکەوتووەو "دەنگی داس" لە قادر کەرەم دەرچوو، بەڵام لەبەر پارێزراوی چاپەمەنییەکان بەسەرپەرشتی (ئەبوسەربان) گوێزراوەتەوە بۆ ناوچەی "شاربازێڕ" واتە لە چلەکاندا لە "قادر کەرەم" بزوتنەوەی ڕزگاری هەبووە کوڕی شێخ لەگەڵ جووتیارەکاندا بەیەکەوە دادەنیشتن‌و کۆبوونەوەیان دەکرد من منداڵبووم، بەڵام براکانم‌و خاڵەکانم لە حیزبدابوون، جووتیارەکانیان ڕۆشنبیر دەکرد دەیانوت حیزبی شیوعی حیزبی کرێکارو جووتیارو چینی چەوساوەیەو پارێزگاریتان لێدەکات، دەبێت چینی کرێکار زۆردار لەناو بەرێت‌و دەسەڵات بەدەست چینی کرێکارەوە

بێت ئەوسا هەموو مافێك بۆ مرۆڤەكان‌و بەتایبەتی مێینەی كورد دەستەبەر دەبێت، منیش نەخوێندەواربووم هەر بەو وشانە كەلەناو هزرمدا نقوم دەبوو هێواش گەورە دەبووم‌و ئاشنادەبووم بەباسی زۆڵم‌و ستەم‌و ئیمپریالیزم ئیستعمار وتێكۆشان‌و چاوسانەوەی مێینەی كورد، تێكۆشان لە پێناوی ئازادی وڵات‌و سەربەخۆی گوێم كرایەوەو هاتمە مەیدانی ژیانەوە.

لە ساڵی (١٩٥٤)دا نوێنەر بۆ پەرلەمانی عێراق هەڵبژێردرا ئەوسا پێمان دەوتن نوێنەری گەڵ هێزە نیشتمانییەكان لە عێراقدا بەهێزبوون، پەرلەمانێكی كارتۆنی هەبوو بەس پیاوەكانی خۆیان دادەنا بەهۆی فیشاری گەلەوە بۆ سەر حكومەت، ئەوساوتیان با گەلیش نوێنەری خۆی هەڵبژێرێت، حیزبی شیوعی (شێخ مارف)ی هەڵبژارد پارتیش (ئیبراهیم ئەحمەد)ی هەڵبژاردو هەردووكیان دەرچوون لە پەرلەمان دا، بەڵام حكومەتی كۆنەپەرست ئەوكاتە فەرمانی گرتنی هەردووكیانی دەركردو لە ساڵی (١٩٥٤)دا لە جێگەی ئەمان پیاوی خۆیانی دانا.

من زۆر تامەزرۆی خوێندن بووم، بەڵام بەهۆی ئەوەی باوكم شێخ بوو تەكییەی هەبوو، هەرچەندە باوكم پیاوێكی تێكۆشەرو دیموكراتی بوو "انصار سلام" بوو ئاشتی خوازان لەگەڵ (گۆرانی شاعیرو شێخ لەتیف حەفید)و ئەواندا لە دوای شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ لەو ڕێپێوان گەورەیەدا كە ڕێپێوانی ملیۆنیان پێدەوت بەشداربوون‌و شەش كاتژمێری خایاند، انصار سلام" بۆ پشتگیری لە شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ هەموو تێكۆشەرو كەسایەتییە بەناوبانگەكانی تێدابوو، باوكیشم شێخ بوو نیشتمانپەروەر بوو تەكییەی هەبوو ڕێگای بەكورەكان دەدا بەشداربن، بەڵام دەیوت "كۆمەڵگەی ئێمە ڕێگە نادات كە كچ بخوێنێت، لەبەرئەوە قورئانیان پێ خەتمكردم، بەڵام نەچوومە خوێندنگە تا لە ساڵی (١٩٥٥ - ١٩٥٦) كە لە سلێمانی خوێندنگەی ئێوارانكرایەوە پیاوان بەجیاو كچان بەجیا ئەو خوێندنگەیە بەشی "خوێندن‌و خەیاتی‌و نەسیج"بوو بەباوكم وت بابە دەچم فێری خەیاتی دەبم، وتی باشە بچۆ خەیاتی بۆ ئەم دیوو ئەودیوو بكە، كە پێم چووە خوێندنگە لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا یەكسەر چوومە بەشی خوێندن تا بتوانم فێری خوێندەواری ببم، من كە ئەو هەموو ئەدەبیات‌و بەیانات‌و شتانەم دەبینی براكانم دەیانخوێندنەوە زۆر خەفەتم دەخوارد، من ساڵێك چووم خوێندم سەری ساڵ بەیەكەم دەرچووم زۆر دڵم خۆشبوو (بەهێ خان‌و سوعات خانی) براژنیشم لەهەمان خوێندنگەبوون وتم بەباوكم مەڵێن هیچ نەبێت با تا پۆلی پێنج‌و شەش بخوێنم‌و خوێندەوارییەكەم باش بێت، وەلا (بەهێ خان) براژنم خۆی پێنەگیراو وتی كاك شێخ محمود جەیران دەخوێنێت، باوكم تورەبوو وتی مادام نەچوویت بۆ خەیاتی ڕێگەش نادەم بچیتەوە بۆ خوێندنگە، ئەو ڕۆژگارە وابوو نەیاندەهێشت كچ بخوێنێت، بەڵام باشبوو فێری پیتەكان بووم‌و خۆم فێردەكرد.

پێش هاوسەرگیریم چوومە ڕیزەكانی حیزبی شیوعی عێراقی (٤٩) ساڵ لەو حیزبەدا زۆر فیداكاریانە تێكۆشاوم من لە تەمەنی (١٦) ساڵاندا چوومە رابطة الدفاع عن حقوق المراة العراقیە ئەو كۆمەڵەیەی ئێستا كە لە كوردستان سەربەخۆی وەرگرت، كۆمەڵەی ئافرەتانی كوردستان دروستبوو من لە لیژنەی شاری سلێمانی هەڵبژێردرام، پێش شۆڕشی (١٤) ی گەلاوێژ بەنهێنی ئیشماندەكرد یەكەم مامۆستام كە فێری كردم لەو ڕێگایەدا (زەكییە خان)ی ژنی (مستەفا خۆشناو) دووەم كەسیش (زەكییە بابان) بوو هاوڕێ (مونیرە ڕەشید سەعاتچی)ش لەو مێینە تێكۆشەرانی ئەو سەردەمە بوون.

لەگەڵ (شێخ عەلی عەبدولكەریم)دا هاوسەرگیریم كرد، ئەویش تێكۆشەر بوو لە حیزبی شیوعی دا كاریدەكردو خۆی مامۆستا بوو وتی "خۆم فێری خوێندەواریت دەكەم، حیزب ڕۆژنامەی ئازادی، اتحاد شعب یان دەردەكرد هەموو ڕۆژێك ڕۆژنامەكانی پێدەخوێندمەوەو پێی دەنووسیمەوە ماناكانیشی پێ لێكدەدامەوە تا بەباشی فێری خوێندن‌و نووسین بووم، من بەردەوامبووم‌و خەمم نەما دەمتوانی بنووسم‌و ڕۆژنامەو پەرتوكم دەخوێندەوە.

دوای هاوسەرگیریم چووین بۆ چەمچەماڵ لەوێشەوە بۆ كەركوك‌و لەگەڵ دەستەیەك لە خوشكان دەست بەكاربووم، كە لە لیژنەی شاردا هەڵبژێردرام لەگەڵ كۆمەڵەی ئافرەتانی كوردستاندا بەشداری كۆنگرەكانی بەغدادیشم كرد، بەڵام لە ساڵی (١٩٥٩)دا نەمتوانی بەشداری كۆنگرە بكەم.

پێش شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ چالاكی زۆریان هەبوو بەفەردە جل كۆدەكرایەوە لەوژنە تێكۆشەرو ئیشكەرانەی ئەو ڕۆژانە (بەدیعە خانی خێزانی غەفوری میرزا كەریم‌و نەجیبە مەجید نەزیرە حەمیدو شەمسە مەحمود توبای كەریمە كەچەڵ‌و توبای خێزانی كاك جەلال‌و پەخشان خان‌و مونیرەی سالحە ئەفەندی‌و خێزانی حوسێن عەلی غالب) پێش شۆڕشی (١٤) ی گەلاوێژ لیژنەمان دروستكردبوو، دوو خوشك لێپرسراوی كۆكردنەوەی جل بوون بۆ ماڵە هەژارەكان، سێ چوار ئافرەت لێپرسراوی بەڕۆشنبیركردنی ژنە نەخوێندەوارەكان بوون لە ماڵی هەردوو (مونیرە خان)دا مەكتەب كرابۆوە خەڵكان فێری خوێندن دەبوون جموجۆڵی ئەو ڕۆژگارە ئەو كارانەبوو، بەڵام دوای شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ خوێندنگەو نەخۆشخانەی گەڕەكەكانمان دانابوو، منداڵ كوتان‌و چۆنیەتی منداڵ پەروەردەكردن‌و چۆن منداڵەكانیان بخوێنن جیاوازی نەكەن لەنێوان كوڕو كچ داو مافی مێینەكان زەوت نەكرێت لەلایەن پیاوانەوە بەزۆر كچ بەشوو نەدرێت ئەوسا رابطة المراة العراقیة ئەم كارانەیان دەیانكرد.

كە حەرەكە پەرەی سەند لەدوای شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ (شێخ مارف بەرزنجی) خاڵم بەشداریان لەڕێپێوانەكاندا كرد، بەبڕیاری سەرۆك كۆماری ئەوسای عێراق (عەبدولكەریم قاسم) (شێخ مارف) كرا بە بەڕێوەبەری شارەوانی كەركوك، لەو كەركوكەدا یەك كرێكاری بێ ئیشی نەهێشت، شەش مانگ لێپرسراوی ئەو شارە بوو هەتا پلانەكەی (شەواف) لە موسل‌و كەركوك یش یەكیانگرت، یەكەم یادی شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ (شێخ مارف) یان تاوانبار كرد بەراكێشان‌و كوشتنی توركمانەكانی شاری كەركوك، لەو زەمەنەدا ئەو ئاگاداری هیچ شتێك نەبوو كە تۆرانییەكان ئۆتۆمبێلی

شارەوانیان بردبوو، توارنییەکان داخ لە دڵبوون لە شیوعییەکان ئەوانەی کە گیران (٢٩) کەسبوون بێجگە لە (شێخ مارف‌و شێخ حوسێن‌و نوری سەید وەلی) هەموویان ساڵی (١٩٥٩) (لای عەبدولکەریم قاسم) گیران‌و بەتەوقیفی لە بەندیخانەکاندامانەوە.

من لە ساڵی (١٩٦٠)دا لە دووەم کۆنگرەی ڕابیتەی ئافرەتانی حیزبی شیوعی عێراقی دا بەشداربووم، یەکەم کەس دکتۆرە نەزیمە دلێمی بوو بوشراو زەکییە خەلیفە عەرەبەکان یانزە خوشك بوون، لە کوردستانەوە من چووم خوشکە جەمیلە ئەمین یامولکی نوێنەری کەرکوك بووین‌و سێ خوشکی مەسیحی‌و سەفیە جەباری بوو کە براکەی لەگەڵ خاڵە شێخ مارف‌و خاڵە شێخ حوسێن‌و ئەو کۆمەڵەدا لە (٢٣)ی حوزەیرانی (١٩٦٣)دا کە بەعس‌و حەرەس قەومییەکان هاتنە سەر حوکم لەسێدارە دران‌و بەعەمودەکانی شاری کەرکوکدا هەڵیان واسین، تۆرانییەکان دەستیان گرتبووە خەنەو هەڵدەپەڕین بەدەهۆڵ‌و زوڕناوە، ئاوا ئیهانەی حیزبی شیوعی‌و بزووتنەوەی نیشتمانیان دەکرد، ئەو خوشکە عەرەب‌و تێکۆشەرانە ئەوپەڕی ڕێزی خوشکانی کوردستانیان دەگرت، لە کۆنگرەدا بووین بێگومان هەڵسوکەوت‌و کارەکانی "ڕەجعییەت" لە ساڵی (١٩٦٠)ەوە دەستی پێکرد، ئەو ئازادیەیان پێ ناخۆشبوو بۆیە جامخانەی هۆڵە گەورەکەیان بەربەرد دا دکتۆرە نەزیمە دلێمی وتی "کەس هەڵنەستێت، ئێستە ئاگاداری ئەو لایەنانە دەکەین چەند کەسێکن بێن لایان بەرن، ئێمە بەردەوامیمان دا بە کۆنگرەکە تا هەفتەیەك، بەشداریکردن لە کۆنگرەی حیزب دا زۆر خۆشبوو بەلامەوە.

لە ساڵی (١٩٦١)دا بەشداریمکردو مەندووبی هەولێر بووم، لە کۆنفراسێکی تردا لە بەغداد بەشداریمکرد نوێنەری سلێمانی بووم، کۆنگرەی سێیەم نوێنەری کەرکوك‌و سلێمانی بووم، واتە لەدوو کۆنگرەو کۆنفراسێکدا بەشدار بووم من بەدرێژای ساڵانی (١٩٥٧)ەوە هەتا (٢٠٠٦) نزیکەی (٤٩) ساڵ لە خەباتی حیزبی شیوعی بەردەوامبووم.

*** گەلاوێژ عەبدولڕەحمان عەلی عەسکەری.**

(گەلاوێژ خان) وەکو خێزانی (ساڵح عەسکەری)و خۆیشی ئەندام بووە لە حیزبی شیوعی دا.

لە ساڵی (١٩٥٨)دا تورکمانەکانیان ڕاکێشا ئەوەبوو بوو بەشەڕی کوردو تورکمان شوبراکەم (مستەفا عەسکەری) ئامۆزاشمە لە (جەمعییەی فەلاحی سەرۆکی جەمعییە)ش بوو لەگەڵ (شێخ مارف)و ئەواندا حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو، ئامیرلیوایەکی لێبوو وتبووی (مستەفا عەسکەری) نەبوایە ئەم شارە لەناو دەچوو، (کاك مستەفا) وتبووی ئۆتۆمبێلم بدەنێ باجووتیارەکان ببمەدەرەوە بالەمەزیاتر ناخۆش نەبێت، دزی‌و تاڵانی هەلەوەدا نەبوو، ئەو ئامیرە فریای کەوت ئەگێنا لەگەڵ (شێخ مارف)دا لە سێدارە دەدران، چوار پێنج ساڵ دوای لە سێدارەدانی ئەو کۆمەڵە شەهیدە بەکافالەت ئازاد بوو دواتر کاك (مستەفا) چووبووە ناو خۆپیشاندانەوە ئەو جارەش گرتیان‌و لێیانداو پەردەی گوێی درابوو، لەوێشەوە ناردبوویان بۆ نوگرە سەلمان دوای ئەوەش هەتا ماوەیەکی زۆر لە شاری ڕوومادی دەستبەسەر بوو.

من لە خێزانێکدا گەورە بووم لە کەرکوك هەموویان لە حیزبی شیوعی دا کاریاندەکرد.

لە ساڵی (١٩٦١)ەوە لە کۆمەڵەی ئافرەتاندا لە تەپەی مەلا عەبدوڵڵا کارماندەکرد، ئەگەر خێزانێك ناخۆشیان بوایە ئێمە پێکمان دەهێنانەوە، لەیادەکانی حیزبی شیوعی دا ئامادە دەبووم دواتر بووم بە ئەندام لە حیزب دا، لە ساڵی (١٩٦١و ١٩٦٢)ش نەشراتیان بۆ دەهێنام دەبوایە دابەشم بکردایە، شانەم هەبوو کۆبوونەوەم پێدەکردن، ڕۆژێکیان نامەیەکیان بۆ هێنام وتیان دەبێت بیخەیتە ئۆتۆمبێلەکەی (سوبحی عەبدولحەمید)ەوە کە وەزیری داخلیە بوو نامەکە داوای لێخۆش بوون یان کەمکردنەوەی ئەو دادگایە بووکە درابوو بەسەر (شێخ مارف بەرزنجی‌و هاوڕێکانی)دا کە حوکمی لەسێدارەدانیان لەسەربوو، هەر لەبەیانیەوە وەستام هەتا نزیکی کاتژمێر دوونیوی پاشنیوەڕۆ پیرەژنێکیان لەگەڵدا ناردم کە ئەو نامەکە کە ئەو نامەکە بخاتە ئۆتۆمبێلەکەی وەزیرەوە، کە هاتە دەرەوە پیرەژنی داماو لەو قەرەباڵغیەدا لەرزە لەرز هات، منیش نامەکەم لەدەست سەندو لە بەینی شورتەو عەسکەرەکاندا ڕێگاکەم دری‌و ڕامکرد خستمە ئۆتۆمبێلەکەوەو وەستام بەدیارییەوە تا نامەکەی کردەوە، ئێستاش دایکی (پەروینی مەلا شکور) هەر دەیگێڕێتەوە ئەو ئازایەتییەی لەوژنەم بینی لەبەینی ئەو هەموو عەسکەرو پۆلیسەو موخابەراتی حکومەتەدا نەترسا لە گرتن‌و ئەشکەنجەدان ئازایانە نامەکەی خستە ئۆتۆمبێلەکەوە.

لە ساڵی (١٩٦٣)دا (ساڵح عەسکەری) هاوسەرم مامۆستابوو، ئەو خەڵکە هەمووی ڕایدەکرد هێشتا ئەم بەناو کەرکوکدا دەگەڕا لە کاتێکدا دەبابەو زرێپۆشەکان بەناو کۆڵانەکانی کەرکوکدا دەگەڕان‌و خەڵك دەگیرا، لە کاتی ڕاگرتنی دەبابەکاندا خەڵکانی تێکۆشەر چووبوون لوولەی دەبابەکانیان پڕ کردبوو لەنەشراتی حیزبی، حەرەس قەومییەکان چاویان چووە پشتی سەریان کەوتنە ناوشار باوکی (ئەژی) هاتەوەو وتی "گەلاوێژ من دەڕۆم وتم بۆ کوێ؟، هەفتەیەك لە ماڵی خۆمان نەبوو هەواڵی بۆ ناردم کە دەچێت بۆ "شوان"، ئەو هاوڕێیانەی لەگەڵ ئەودابوون وتی کوڕینە بارودۆخی ناو کەرکوك ئەمەیە من دەڕۆم دێن لەگەڵم یان نایەن"، ڕەنگە حەفتا تا هەشتا کەس بەرەو ناوچەی شوان‌و لەیلان‌و قادر کەرەم، ڕۆیشتن، ئەوسا شۆڕشی ئەیلوول دەستیپێکردبوو کە ئەمان بەرەو دەرەوەو ناوچە ئازادەکان دەچوون دەیانگرتن‌و ئازاریان دەدان، لەناو شاریشدا حەرەس قەومی‌و بەعسییەکان کون بە کون بەدوای شیوعییەکانەوە بوون.

من لەناو کەرکوکدا لەئیشوکاری حیزبی دا هاوکاری بووم بۆ گواستنەوەی چەك‌و بەیانات، ژنەکانی تر دەیانوت مێردەکانمان ناهێڵن ئەوئیشانە بکەین، هاوسەرەکەم لەوێ نەبوو خۆم پەلاماری ئەو ئیشانەم دەدا، ئەو ژنانە ڕاستیشیان نەدەکرد، بەڵام خۆیان لەگرتن دەترسان، کەمن کارەکانم

رادەپەراند (کاك دڵشاد) دەیوت "هەموویان بەمیوانت بن"، من لەگەڵ کچەکاندا دەچووم بۆ "تەپەی مەلا عەبدوڵڵا" چەکەکانمان دادەنا، هاوسەرەکەم‌و (سالح عەسکەری) خۆی لە "حەسار" بوو وتی دەتوانیت" چاپ‌و رۆنیۆکەم" بە پارچە پارچە کراوی بە دوو سێ جار هاتووچۆ بۆ بهێنیت بۆ حەسار بۆ ماڵی (جەبار) کە ئەویش لە سێدارەدرا، هەموویم بە پارچە پارچە بۆ برد، هاوسەرەکەم ئۆتۆمبێلی بۆ گرت‌و لەگەڵیدا رۆیشتم هەتا گۆپتەپە لەوێدا ئۆتۆمبێلەکە گەرایەوەو چووینەسەر رێکەو بەکەڵەك پەرینەوە ئەوبەر هەتا بردیانین بۆ ئاوە گرد هاوسەرەکەم ئەو شتانەی برد، ئەمە ساڵی (١٩٦٥)دا بوو، بەڵام من کە سواری کەڵەك بووم لەگەڵ باوکی ئەژی لەیەکتری جیابووینەوەو من گەرامەوە بۆ "گۆپتەپە" بۆ سەردانی خوشکەکەم‌و دواتریش گەرامەوە بۆ کەرکوك.
لەناو شاریشدا تابیعەیەك لای ماڵی (کەریم خەیات) بوو ئەمیش "حەساری" بوو زۆری ئیش بۆ حیزب دەکرد خەیاتیشی دەکرد بەهۆی چل دوورینەوە زۆر کەس رووی تێدەکرد، ئەویش گیراو دوای باوکی ئەژی لەسێدارەدرا.

* **ئامینە محەمەد مراد.**

من لە گەڕەکی "یادگار"ی کەرکوکی کوردستانی هاتوومەتە ژیانەوە، هەر چاوم‌کردەوەو سەرەتای ژیانی منداڵیم بوو دایکم لە رێکخستنەکانی "پارتی دیموکراتی کوردستان" و" یەکێتی ئافرەتانیش"دا ئیشی دەکرد لەگەڵ (یاساوڵە) خەیاتبوو کوردبوو خەڵکی "زەنگەنە" بوو دایکم نەیتوانی بەردەوام بێت لە ئیشکردن، کە گەورەبووم‌و لە رێکخستنەکانی پارتیدا ئیشم دەکرد کاتێك دەچووم بۆ ئابوونە کۆکردنەوە بەناو کۆڵانە تەسك‌و قوراوی‌و بۆگەنەکانی کەرکوکدا دەرۆیشتم کەپیسی زێرابەکانی دەهاتە کۆڵانەکان، دەوڵەمەندترین شاری نەوت لە جیهاندا مۆڵگای پیس‌و پۆخڵی‌و گوێ پێنەدانە لەلایەن داگیرکەرانەوە هەتا ئەمرۆش، بەڵام ئەوان چاویان بریوەتە سامانە زۆرو زەبەندەکەی‌و میللەتی کوردیش بەدەست بێ خزمەتییەوە دەناڵێنێت، هەواڵێك شتێك بوایە دەمگەیاند، بەهۆی رێکخستنەوە بەخۆشەویستی هاوسەری خۆم هەڵبژارد سەربازبو لە "فەوجی ئەوەل" لە ساڵی (١٩٦٣) دا کە حەرەس قەومییەکان هاتنە سەر تەخت ژیان لە شاری کەرکوك ئەستەم بوو، هەمووی شەڕو فەرتەنەبوو لەکاتی حەرەس قەومییەکاندا زیاد لە (٥٠٠)کەس ئەنفالکران لە گەڕەکی یادگار لای چاخانەی "عاشور"ەوە لە ژن‌و منداڵ‌و پیرو گەنج، هیچ کەس نەیزانی چارەنووسیان چیە؟ کەس نەیدەوێرا لە ماڵەکاندا بجوڵێتەوەو سەر دەربهێنێت، هەر ئێمە بووین ژیانی خۆمان کردبووە فیدای خاك‌و وەتەن‌و کاری حیزبیمان دەکرد، هاوسەرەکەم لەلایەن حەرەس قەومییەکانەوە چاودێری توندی لەسەربوو بە (یاساوڵە) ی وت"من ئاشکرابووم ناتوانم لێرە بمێنمەوە دەچمە ناو شۆڕش ئاگات لە منداڵەکانم بێت"، ئەو رۆیشتە ناو شۆڕش‌و خۆم‌و کچێکی یەك ساڵان لەناو کەرکوکدا مامەوەو لەسەر کاری حیزبی خۆم بەردەوام بووم سەر بەچایخانەی عاشور بوو کەبە "زێوێ" بەناو بانگە، من مانگانە ئابوونەی سی بۆ چل کەسم کۆدەکردەوە لە سەرەتادا یەك فلس بوو دوای بوو بە پێنج فلس دواتر بووە دەفلس خەڵکەکەی زۆر هەژاربوون هەر ئەوەندە دەسەڵاتیان بوو، من لەناو کەرکوکدا بووم لەو رۆژگارەدا نەتدەوێرا لەگەڵ کوردەکانیشدا قسە بکەین.
من لەگەڵ سێ چوار خاتووندا کارم دەکرد (حاجی ئامین‌و حاجی عاسم‌و سەبری‌و خاتوونە)بوون، کە هاوسەرەکەم رۆیشت هەتا سێ چوار مانگ دەنگی هەر نەبوو، کاتێك (یاساوڵە) هەواڵی ئەوی پێگەیاندم کە (٣٠٠)دیناری ئەو رۆژەی لای برادەرێکێتی بۆی دەنێرێتەوە، پاش چەند رۆژێك (یاساوڵە) پارەکەی بۆ هێنامەوە بۆ ئەو رۆژگارە زۆر زۆر بوو من بەو بارودۆخە قورسەوە بەکچێکی پێنج ساڵەوە بەتەنها لەناو کەرکوکدا مامەوە، لەو ساڵانەدا بە حەرەس قەومی‌و عەرەب‌و تورکمان بەهەموویان لەناو کەرکوکدا لە میللەتی کوردیان دەدا.

* **بەهێ ئەحمەد کەریم.**

من لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٧)م هەر لە ساڵانی (١٩٤٥) بۆ (١٩٤٦)ەوە لە حیزبی شیوعی دا دەست بەکاربووم‌و تاکو ئەمڕۆش وازم نەهێناوە، ئەو رۆژگارانە تێکۆشان ئاستەنگ‌و چەرمەسەری خۆی هەبوو وەکو ئەمڕۆ جاددەکەی پان نەبوو، کە لە (قادر کەرەم) بووم حیزبی شیوعی بەرهەڵستی لە گەورە بە بچووك دەکردو لە ژن بەژن‌و لە کچی منداڵ نەدرێت بە پیاوی پیر تا نەکەوێتە تەمەنی خۆی نابێت بکەوێتە ژیانی هاوسەرییەوەو داوای ماف ئافرەتان‌و دایەنگەو باخچەی ساوایان‌و مافی جووتیارمان دەکرد، کە خەڵکی جوت نەکات بە وڵاخ‌و بە تراکتۆر خەڵکی کاربکات بەدەست درەوی دەکرد بە جەنجەر وڵاخ گێرەی دەکرد، هەروەها داوای خوێندنگەی کچان‌و جادەو نەخۆشخانەمان دەکردو دەمانوت ژێر خاکەکەمان هەمووی پەترۆڵە بۆ خەڵکی وابژی؟، هەژاری‌و کەمدەستی بەدەست نەخۆشی‌و ئازارو ژانەکانمانەوە بناڵێنین هەموویمان دەکرد بەراپۆرتێك‌و دەماننارد بۆ وڵاتە ئازادیخوازەکانی دونیا وەکو سۆڤیەت‌و کوبا بۆ وڵاتە سۆسیالیستەکانی تر دەمانوت ژیان‌و گوزەرانی ئێمە لەئاستێکی زۆر نزمدایە هەموو خەڵکەکە لەخانووی قوڕی بچووکدا دەژیاین.
ئەوسا لەئاوباریك (شێخی ئەمر) شەڕی دەکرد نەوتیان وەکو ئاو هەڵنەگۆزی ئێستاش هەروایە، ئێستاش لەهەمان رۆژگاری ئەمڕۆماندا لە ئاوچەی ئێمە (قادر کەرەم) رۆژی چەندەها بەرمیل نەوتی لێدەردەهێنرێت، هەروەها سوود لە غازەکەشی دەبینین ئێمە لە خاکێکی وا دەوڵەمەندا ژیاوین، چاویشمان کردووەتەوە تارادیەك رۆشنبیر بووین، وە نەبێت لادێییەکی نەفام بووبێتین لەوساتەی لەدایکبووین لەناو کۆری خەباتی سیاسی‌و رۆشنبیری دا گوێچکەمان کراوەتەوە، ئەو رۆژگارانە وەکو ئەمڕۆ نەبوو رێکخستنی ئافرەتان هەبێت، ئەنکم دەیگێڕایەوە بۆمان و دەیوت ئەوسا نەماندەزانی نەوت چییە؟ هەر بۆیە وایان وێناکردبوو بابەگوڕگوڕ کە پیاو چاکێکە ژنی بردووەتە سەر بابە گوڕگوڕ کە چوون وتوویانە:

بابە گوڕگوڕ
بە گوڕهاتم
بۆ کوڕ هاتم

هەر هەمان ژن بۆ ساڵی دوایی کوڕێکی بووە ناوی (سەید ئەحمەد)ە، دوای ساڵی (١٩٤٥) لە قادرکەرەمەوە هاتین بۆ سلێمانی.

*** شۆکەت محەمەد شوکور.**

من لە ساڵی (١٩٦٤) لە گوندی "تاڵەبان" لەدایکبووم، لەکاتی شۆڕشی ئەیلوولدا باوکم لێپرسراوی پارتی بوو لە گوندی "تاڵەبان" و زۆر کوردپەروەر بوو، وەکو ئەنجوومەن کاری دەکردو خەڵك لە هەورامانەوە دانەوێڵەی دەهێنا ئێمەش دەمانکردە عەمبارەوە، گەنمو جۆمان بەجیا دادەناو (کاك عەبدولرەحمان)و باوکم سەرپەرشتیان دەکرد، (کاك رەحمان) ئێستاش لەگەڵ حەمید مەلا مەجید پێشمەرگەی پارتییەو ماڵیان لە چەمچەماڵە، هەموویان بە یەکەوە سەرپەرشتی ئەو خواردنانەیان دەکرد کە بۆ هێزی پێشمەرگەیان ئامادە دەکرا، (ئەحمەد فەتحوڵڵاو عەدنان کەریمو نەجمەدین حەسەنو عەریف ستار جەباری) پارتی بوونو هاوڕێی باوکم بوونو هەتا نسکۆکەش باوکم لەگەڵ ئەواندا کاری دەکرد، لە شۆڕشی نوێدا باوکم دەستپێکردەوەو (مامە ریشە) زیندانی کرا، ئەو لە تەمەنێکی زۆر گەنجییەوە شێتو شەیدای خاکی کوردستانو شۆڕش بوو چەندین جار هەوڵیدابوو ببێتە پێشمەرگە، ڕۆژێکی ساڵی (١٩٧٧) یەك دوو کەس هاتن بۆ ماڵمان بۆ میوانی کە ناویان (تالبی حاجی جەمالو کامیل تەیب دێوانە) بوو، لەو ڕۆژگارەدا (مامە ریشە)ی برام تەمەنی (٢٤) ساڵ بوو تالیب بەندکرابوو دادگاییکرابوو بە (٢٢) ساڵ زیندانیو ڕژێمی سەدام پێیان وتبوو"برۆ بۆ ناو شۆڕشو شەهید سیروان تاڵەبانیو سامان گەرمیانی بکوژە ئێمە لەو دادگاییەت دەبوورینو ئازادت دەکەین، حکومەتی بەعس دوو برنەوی درێژی پێدابوو بۆ کوشتنی ئەوان ئەویش هاوڕێیەکی خۆی هێنابوو لای ئێوارەیەکی مانگی یەك کە زستانێکی سەختی پڕ بەفرو باران بوو خۆیان کرد بەژووردا کە باسی بابەتەکەیان کرد مامە ریشە تووڕە بوو وتی "چۆن کاری وا ئەنجام دەدەن؟، لە هەمانکاتدا مامە ریشە زۆر هەوڵی بوون بە پێشمەرگەی دەدا، باوکم دەمانچەیەکی ستاری گەورەی لە تاقێکدا حەشاردابوو کە دەمانچەی (کاك فەخرەدین)ی برام بوو، دەمانچەکەی لەگەڵ خۆیدا بردو کەوتە شوێنی ئەو دوو کوڕە ئەگەر ئەو دەمانچەیەی پێ نەبوایە شۆڕش ئەویشی ڕەمی دەکردو وایاندەزانی ئەویش جاسووسە، ئەو دەمانچەیە ماوەیەکی زۆر لای (شەهید سیروان تاڵەبانی)بوو کە ڕێکخراوی نهێنی ناو کەرکوك بوو، مامە ریشە لەگەڵ ئەو دوانەدا کەوتەڕێ (کاك تەیب جەمال) لە "ئاوە سپی" گەڕابووەوەو نەخۆشبوو (مامە ریشە) برنەوەکی لێکڕیبوو بە (١٠٠) دیناری ئەو ڕۆژە، دوای گەڕانەوەی ئەو کوڕە ئەمانیش بەرەو "مەسۆیی بەرگەچ و مەسۆیی سەرچەم" ڕۆیشتبوون لەوی پێشمەرگەکانی (خالید گەرمیانی)و (مەحمود سەنگاوی) دەستگیریان کردبوونو هەواڵیان دابوونێ کە جاسووسن وتیان ئێمە لە ڕێکخستنەکانی کەرکوکەوە هەواڵمان پێگەیشتووە کە ئێوە هاتوون بۆ کوشتنی سیروان تاڵەبانیو سامان گەرمیانی، زۆر زۆریان لە مامە ریشە دابوو (کامل تەیب دێوانە) پێی وتبوون چی لەمن دەکەن بیکەن، بەڵام هیچ لەم کوڕە مەکەن ئەو بێخەتایەو لەگەڵ مندا نییەو شوێنمان کەوتووە مەیکوژن دەیەوێت ببێت بەپێشمەرگە، کاتێك کە کاکمیان بردبوو بۆلای (شەهید سیروان) دەمانچەکەی دابووە دەست (شەهید سیروان)و ئەویش دەمانچەکەی ناسیبووەوە، هەرچەندە شەهید سیروان خزمی خۆمان بوو، بەڵام زۆر سەرزەنشتی کاکمی کردبوو وتبووی بۆچی لەگەڵ جاشو جاسووسدا هاتوویت بەڵکو بیانکوشتیتایە؟، بەهەر حاڵ کامیل تەیبیان کوشت پاش ئەوەی خزمی دوو گوندمان بوونە کەفیلی ئازاد بوو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە دوای ماوەیەك (سیروان تاڵەبانی) دەمانچەکەی ناردەوە بۆ باوکمو باوکیشم لە هەمان تاقدا حەشاریدایەوەو جوان سواقی داو لەگەڵ دیوارەکەدا تاقەکەی ڕێککردەوەو کەس نەیدەزانی کە دەمانچە لەو تاقەدا هەیە، من مامە ریشەم زۆر خۆشدەویستو زۆر باشو ڕووخۆشبوو لەگەڵماندا، کاتێك دەچوو بۆ پێشمەرگایەتی من لەخەفەتدا یەك هەفتە نەخۆشدەکەوتم، کاتێك کە مامە ریشە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئەو قسەیەی ئەوان زۆر کاری تێکردبوو کە پێیان وتبوو تۆ جاسووسیت، لەو ساتەوە سوێندی خوارد بە خاکی کوردستان ناوێك تۆمار بکات کە لە هەموو کوردستان دەنگبداتەوەو ببێت بە گەورەترین خۆشەویستی میللەتی کورد، بڕیاری دا دەست لە حکومەتو جاش نەپارێزێت، مانگێك بۆ گەڕابووەوە باوکم بە هیوا بوو ڕادەستی حکومەتی بکات بۆ ئەوەی بزانن کە پێشمەرگە نیت، ئەویش بە باوکمی وت ئەگەر هەمووشتان ڕەمی بکەن من ناگەڕێمەوەو دەبێت ناوێك تۆمار بکەم لە مێژوودا بێ وێنە بێتو نەبێت چەکیشم بۆ بکڕیت، هەر لەبەر ئەوە (کاك فەخرەدین) هەواڵی نارد بۆ (کاك رەحمان)و وتی وەرە بۆ ئێرە ئیشمان پێتە، کە هات ناردی بۆ چەك کڕین بۆ هەرێنەو بردیان بۆ مامە ریشە ئەویش کەوتە چالاکی کردن، بەشەو دەیەدا بەسەر ڕەبایەو قافڵەی سەربازیو خزمەکانیشی یارمەتییان دەدا، مامە ریشە ئەم کارانەی بە سەربەخۆیی ئەنجام دەدا بەبێ ئەوەی پەیوەندی بەهیچ حیزبێکەوە هەبێت، خزمەکانمان (عەبدوڵڵا سەیدا) کە خەڵکی گوندی موفەرە لە چەمچەماڵو (عومەر قەرە)ی ئامۆزای خۆمانو بەشەو یارمەتی ریشەیان دەداو بەیەکەوە کاریان دەکرد، ئێمە شەوانە بەنهێنی نانمان دەبرد بۆ ناو کونە ئەشکەوتەکان بۆ ریشەو هەتا شەش مانگ بەردەوام ئەو کارەمان دەکرد، ریشە خۆی بەتەنها حکومەتی هەراسان کردبوو، پاش شەش مانگ باوکم لەلایەن جاشەکانی (تەحسین شاوەیس)ەوە دەستگیرکراو زۆریان لێدابوو، لەو کاتەدا من خەریکی نانکردن بووم کاتێك کە ئەحمەدی برام قیژاندیو گریا بۆ باوکم منیش بەدەم هاوارەکەی ئەوەوە چووم کە سەیرم کرد دەبینیم باوکمیان برد بۆ خوارەوەی گوندەکەو لێی دەدەن، ئێمەش لەگەڵ کۆمەڵێك ژندا کەوتینە دوای باوکم خزمێکمان جاش بوو ناوی (تۆفیق جەبار

قارەمان) بوو وتبووی بۆ لەو پیاوە پیرە دەدەن؟، ئەوانیش بە باوکمیان وتبوو کورەکەت ڕادەستی حکومەتی عێراقی بکە، باوکیشم وتبووی کورەکەم بەقسەم ناکات، بەڵام من هەوڵی خۆمی لەگەڵدا دەدەم ئیتر بەو شێوەیە باوکمیان ئازاد کردبوو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، (شەهید سیروان‌و سامان گەرمیانی) مەفرەزەیان نارد بۆ گوندی قایتەوەن لای گوندی گەڕاوێ، ماڵی پوورم لەو گوندەدا بوون‌و (کاك واحید)ی کوڕی پوورمیان لەگەڵ مەفرەزەکەدا ناردبوو بەدوای مامە ڕیشەدا، کە زانیبوویان مامە ڕیشە هێندە ئازایە وتبوویان بەڕاستی هەقی پێشمەرگایەتی هەیە، دوای ئەوە مامە ڕیشە چووە ناو شۆڕشەوەو بوو بە پێشمەرگە، کە مامە ڕیشە بوو بە پێشمەرگە ئیتر ئێمە ژیانمان نەما بەدەست جاش‌و حکومەتەوە، چونکە دەبوایە بەردەوام خۆمان بشاردایەتەوە، کاتێك کە ڕژێم دەهاتە ناو گوندەکەوە زۆر هەوڵی دەستگیرکردنی ماڵی ئێمەی دەدا بەتایبەتی من‌و خوشکەکەم، حکومەتی بەعس نەیدەتوانی مامە ڕیشە لە چالاکییەکانی بووەستێنێت‌و دەیانوویست بە دەستگیرکردنی من‌و خوشکەکەم سەری پێدانەوێنن‌و خۆی ڕادەستی ڕژێم بکات، ئەویش هەمیشە دەیوت" ئەگەر ڕژێم هەمووتان سەر ببڕێت من ناگەڕێمەوە تا شەهید نەبم، لەبەر ئەوە ئێمە ژیانمان زۆر ناخۆشبوو ئێمە خەمی مردنمان نەبوو، بەڵکو خەمی دەستگیرکردنمان بوو، چەندەها جار جاش داویەتی بەسەرمانداو ئێمە لە تاڵەبان خۆمان حەشارداوەو زۆر جاریش کۆپتەر دەهاتە سەر گوندەکان‌و بۆردومانی دەکردین ئێمەش دەچووینە ناو کونە تەیارەوەو لەوێ خۆمان حەشار دەدا.

مامە ڕیشە کاتێك کە یەکەمجار چووە دەرەوە لەگەڵ (خالید گەرمیان)دا تووشی شەڕێکی زۆر قورسبوو، لەو شەڕەدا کاکم ئازایەتییەکی زۆر بێوێنەی نواندو بوو بە ئامیر مەفرەزە، لەو شەڕەدا سێ فیشەك بەر قۆڵی کەوتبوو هەتا سێ مانگ نەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ئێمە نەمانزانیبوو کە بریندار بووە، دواتریش بەهۆی چالاکی‌و تێکۆشانی خۆیەوە پلەی "ئامیر کەرتی جەباری" بەدەستهێنا.

گوندی "تاڵەبان" زۆر قووڵ بوو لەنێوان دوو شاخدا بوو هەتا بەباشی نەهاتنایەتە ناو گوندەکەوە نەماندەزانی، (خالید گەرمیانی) بە مامە ڕیشەی دەوت "ئەم پیاوە دەست دەکات بە کونە زەردەواڵەدا ئێوەی لەم گوندەدا داناوە تا حکومەت دەستگیرتان بکات، هەموو ئەو گوندانەی ناوچەی جەباری هەتا دەیگەشتە "لەیلان‌و سیامەنسوورو خاڵەبازیانی‌و ساڵەیی" هەموویان جاش بوون، مامە ڕیشە نامەی بۆ دەناردن‌و خەڵکی دەستگیر دەکردو فەرمانی پێدەکردن‌و دەیوت ئەگەر چەکی جاشێتی‌و خۆفرۆشی دانەنێن دەدەین بەسەرتانداو دەستگیرتان دەکەین، ڕیشە ئەو ناوچانەی بەشێوەیەکی بەرفراوان پاککردەوە لە جاش‌و خۆفرۆشان، زۆر جار دەچووە سەر پیاوانی ڕژێم کە لە گوندی "تەرجیل"ی نزیك شاری کەرکوك بوو، لەوێ چالاکی سەربازی ئەنجام دەداو پێشمەرگەش شەهید دەبوو.

ئێمە وەکو ماڵی خۆمان من‌و دایکم خوشکەکەم بەردەوام لە خزمەت پێشمەرگەدا بووین تا ئەنفال بەرپابوو، هەروەها لەیلای ئامۆزاشم وەکو ئێمە خزمەتی پێشمەرگەی دەکردو نان‌و خواردنی ئامادە دەکردو جلی پێشمەرگەشی دەشوشت، ئێمە لە زستاندا ئیشوکارمان زۆر زۆر بوو شەو هەتا بەیانی لە ترسی جاش‌و کۆپتەر کارمان دەکرد، جارێکیان سوپای عێراقی‌و جاش چواردەوری ئاواییان گرت زۆر ترساین خۆمان لەگەڵ کۆمەڵێك ژن تێکەڵ کرد لە دووری ماڵەکانەوە دانیشتبووین، من‌و خوشکەکەم لە تەنیشت یەکەوە دانیشتبووین‌و دایکیشم کەمێك دوورتر لە ئێمەوە دانیشتبوو سەربازو ئەفسەرەکان کەوتنە پشکنین، ئەفسەرێکی عەرەب ڕوویکردە ژنەکان‌و وتی "کوان خوشکەکانی ڕیشە؟، ژنێك لەوێبوو ناوی (جیهان) بوو وەڵامی دایەوەو وتی ئێمە نازانین خوشکەکانی ڕیشە لە کوێن، بەڵام ئەو پیرە ژنە دایکییەتی، هەموو ئەفسەرو سەربازەکان بەرەو ڕووی دایکم ڕۆیشتن‌و ئێمەیان بەجێهێشت، چووبوونە لای دایکم‌وتبوویان "نەجمەدین لە کوێیە؟، دایکیشم زۆر ترسابوو وتبووی لەو شاخەیە نایەتەوە بۆلای من‌و هەر نایبینم‌و ناشزانم لە کوێیە؟، ئەفسەرەکان بە دایکمیان وتبوو تۆ پێت ناخۆش نییە نەجمەدین بکوژرێت؟، دایکم وتبووی نازانم دووبارە وتبوویان بە دایکم دەزانین پێشت ناخۆشە، بەڵام یاخوا بکوژرێت با لە کۆڵی تۆش‌و ئێمەش بێتەوەو ڕزگارمان بێت لە دەستی دواتر کەوتنە پشکنینی ماڵەکەمان‌و سندوقێکمان هەبوو شکاندیان (٧٥٠) دیناری سویسری ئەو ڕۆژەو کامێرایەکی فەوری‌و ئەلبوومی ڕەسمی من‌و خوشکەکەم‌و کۆمەڵێك ڕەسمی پێشمەرگەی تێدابوو هەموویان برد، هەواڵیان ناردبوو بۆ مامە ڕیشەو وتبوویان "چواردەوری گوندەکەتان بە جاش گیراوەو ماڵەکەتان تاڵانکراوە، وتبووی بەس خوشکەکانم دەستگیر نەکرابێتن چی ڕوودەدات با ڕووبدات کێشەم نییە"، پیاوکی نارد ناوی (فەقێ محەمەد) بوو من‌و خوشکەکەم‌و محەمەدی برامی لەو گوندەی خۆمان بردە دەرەوەو بردینی بەرەو گوندی حەمە بارام" لەوێ ڕۆیشتین بۆ ماڵی ئامۆزایەکی دایکم ناوی (حاجی عەبدولکەریم) بوو، کاتێك کە ڕۆیشتین بۆ ئەوێ شەو بوو لە ڕێگە تووشی ئاوی ڕۆخانە هاتین‌و زستان بوو ئاوەکە زۆر ساردبوو لە ترسی هاژەی ئاوەکە خەریکبوو زیرەمان دەکرد، کاتێك کە لە ئاوەکە پەڕینەوە ئاو تا سەر سنگمان دەهات شەوێکی زۆر سەختبوو، ئەو شەوە گەیشتینە گوندەکەو بەیانی زوو بە دووربین سەیری گوندی "تاڵەبان"مان دەکرد، سوپای عێراق‌و جاشەکان چواردەوری گوندەکەیان گرتبوو، ئەمکارەش زۆر مامە ڕیشەی توورە کرد چووە سەریان‌و لەو شوێنە دووری خستنەوە، لەیلای ئامۆزام لە "تاڵەبان" مابووەوەو بۆی گێڕامەوە کە چۆن ڕیشە بەتەنها چووەتە سەریان دەیوت مامە ڕیشە قەمسەلەکەی دەدا بە دارێکداو خۆی دەڕۆیشت لە شوێنێکی ترەوە تەقەی لێدەکردن‌و هەروەها دەستە سرەکەی لە شوێنێکەوەو کڵاوەکەشی لە شوێنێکی تر دادەناو تەقەی لێدەکردن، جاشەکان قەمسەڵەو کڵاو دەستە سرەکەیان دەدایە بەر فیشك‌و دەیانووت ئەو هێزێکی گەورەی لەگەڵدایە، بەمەرجێك مامە ڕیشە بەتەنها شەڕی دەکرد، زۆربەی جاشەکان بەڕۆژ سندووقە فیشەکیان

بۆ دەهێناو هاوکارییان دەکرد، یەکێك لەوانە (حاجی شەماڵو مستەفا عەلی فاتە) بوون، هەروەها چەندین کەسی تریش ڕیشەیان زۆر خۆشدەویستو بە تێکۆشەرێکی گەورەیان لە قەڵەم دەدا، ئێمە پاش شەش مانگ ئەو گوندەمان بەجێهێشتو گەراینەوە بۆ ماڵەوەو دواتریش مامە ڕیشە لەگەڵ (مامۆستا دڵشاد)ی کادیردا هاتەوە بۆ سەردانمان، ئێمەش بەرەو پیری ڕۆیشتین‌و دەستمان کردە ملی‌و ئەویش باوەشی پێداکردین‌و وتی تەنها خۆتان مەدەنە دەست جاش‌و دەوڵەتی عێراقی ئیتر هیچم لە ئێوە ناوێت، (کاك دڵشاد) کە خەڵکی گەڕەکی تووی مەلیك بوو (٣٠) دیناری دایە دەست من‌و وتی ئەو پارەیە بگرەو خەرجی بکە بۆ خۆتان بەداخەوە دواتر شەهید بوو.

باوکم زۆر جار لەسەر مامە ڕیشە دەستگیرکراوەو ئازاد بووە، بەڵام کۆتا جار لە مانگی (١٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨١)دا دەستگیرکرا ئیتر لەو دەقەوە تەنانە تەرمەکەشمان نەمانبینییەوە، بەقسەی خەڵکی گوایە باوکمیان خستووەتە ناو بیرەوە لە گوندی "تەرجیل"و خەڵکی ئەو ناوچەیەش نەیانوێرا بوو بچن بەدەم هاوارەکانی باوکمەوە، ئێمەش نەماندەوێرا بچینە دەرەوەو خەڵك لە شارەوە پێویستییەکانیان بۆ دەهێناین، ئەگەر نەخۆشیش بکەوتینایە (دکتۆری شۆڕش) چارەسەری بۆ دەکردین، چەندەها جار من تا بەیانی نەخەوتوومو ناوساجیم دروستکردووەو هێلکەم کوڵاندووەو ئیشم کردووەو کچە گەورەی ماڵبووم خزمەتی پێشمەرگەمان کردووە، شەوانە پێشمەرگە هەواڵیان بۆ دەناردم‌و دەیانووت نانمان بۆ ئامادە بکەن ئیتر منیش هەموو خواردنێکم بۆ ئامادە دەکردن‌و کوڕێکی ئامۆزام هەیە ناوی (محەمەد شەریف)ە، نیوە شەو بە نهێنی‌و بەدزی خەڵکی گوندەکەوە بە کۆڵ خواردنەکانی دەبرد بۆ ناوچەکانی کەلۆزی مۆلەقەو شەرەف گاو چەمی دارە قەساب، گەورەترین ئاواتی مامە ڕیشە پەلاماردانی ڕەبایەکانی حکومەت‌و مۆڵگەی جاشە خۆفرۆشەکان بوو، ئەو هێشتا لە چالاکییەکانی نەگەڕابووەوە سوپای عێراقی‌و جاشەکان چواردەوری گوندەکەیان داین‌و هاتن بۆ ئێمە، ئەفسەرە عەرەبەکە وتبووی ئەمشەو ڕیشە لە ناوچەی (باوەو لەیلان)بووەو لە جەیش شەعبی داوەو گرتوونی، چۆن ئێستە گەیشتووەتە (تاڵەبان‌و قرغ)؟، خۆ فڕۆکەی پێ نییە یان بە فڕۆکە هاتووچۆ ناکات!.

شەڕی "حەمك: یەکێك بوو لەشەڕە بەناوبانگەکانی ناوچەی "قەرە حەسەن"، ئەو دوازدە پێشمەرگەیەی کەلە شەڕ گەڕابوونەوە لە ڕەبایەیان دابوو، زۆر ماندوو بووبوون‌و ویستبوویان لە گوندی حەمك پشوویەك بدەن، ئەوان خەوتبوون‌و ئەو مەکینەیەی کە ئەوانی گەیاندبوو جاشەکان شوێنیان کەوتبوون‌و لە شۆفێری تراکتۆرەکەیان دابوو خۆیان لە شۆفێرەکە گۆڕیبوو خۆیان لێکردبوو بە پێشمەرگەو پێیان وتبو "شوێنی پێشمەرگەکانمان پێ بڵێ، چونکە هەرچی هێزی حکومەت هەیە لە دەوری چەمچەماڵ‌و کەرکوك هەیە هێناویانن‌و لەگەڵ جاشەکاندا دەوری گوندی حەمکیان داوە، ئەو دوازدە پێشمەرگەیە پاڵەوانانە شەڕیان کردبوو مامە ڕیشە بەپێشمەرگەکانی وتبوو نامەوێت بمخەنە دوای ئۆتۆمبێل‌و بە شاراندا بمگەڕێنن‌وخەڵکی سەیرم کات، بەڵکو دەبێت هەموویان شەڕ بکەین تا شەهید دەبین‌و یەکی دوو فیشەك بهێڵنەوە بۆ ئەوەی ئەگەر دەرنەچووین خۆمانی پێ بکوژین، پاش شەڕێکی پاڵەوانانە چوار پێشمەرگە شەهید بوون‌و تەرمەکانیان هێنانەوە بۆ گوندی تاڵەبان کە ئەوانیش (شەهید فەتاح‌و شەهید عەلی ڕەش‌و شەهید ستارو شەهید شوان ئەحمەد) بوون‌و ئاومان گەرم کردو دوو سێ پیاو کفن‌و دفنیان کردن‌و بەخاکیان سپاردن، مامە ڕیشە بە خەڵکەکەی وتبوو هەر کەس ڕاستی لەسەر قەبری ئەو شەهیدانە بڵێ بە حکومەت منیش دەیکوژم.

مامە ڕیشە چووە داخوازی کچی (کوێخا حەسەن)و هاوسەرگیری کردو هاوسەرەکەی ناوی (کچان حەسەن کەریم)بوو، ماوەیەك بە جەولە لە گەڵیاندا دەگەڕاو گوند گوند دەگەڕاو ماڵی دادەناو دواتر لە گوندی "تاڵەبان" ماڵی دانا، بەڵام لە ماڵی خۆمان نا بەڵکو جەیران خان کە ئامۆزای دایکم بوو، هەروەها دوای ماوەیەك ماڵیان باریکرد بۆ گوندی شێخ جیری‌و ساڵێکی پێنەچوو لە ئاگربەستەکەی ساڵی (١٩٨٤) دا (تەحسین شاوەیسی) هەواڵی ناردبوو بۆ مامە ڕیشە وتبووی من دەبم بە پێشمەرگەو خەڵکێکی زۆرم لە گەڵدایە، ئەوەبوو کاکم پرسی بە (کاك ئازاد سەرگرمە) کردبوو کە سەرتیپی (٥٧)ی سەرگرمە بوو، هەروەها پرسیشی بە بەڕێز (مام جەلال) کردبوو، بەڵام مام جەلال وتبووی ڕیشە تۆ مەڕۆرە خوارەوە دەتکوژن با ئەو بێت بۆلای تۆ!!، بەڵام ڕیشە بەقسەی ئەوانی نەکردبوو لای خۆشمان باسی هیچ شتێکی نەکردبوو ڕۆیشتبوو بۆ گفتووگۆکردن لەگەڵیاندا، بەڵام ئەو ناپاك‌و خۆفرۆشانە سێ کەمینیان بۆ دانابوو، لە کەمینی یەکەمدا هیچیان نەوتبوو، بەڵام لە کەمینی دووەمدا ئاربیچییەکیان دابوو لە ئۆتۆمبێلەکەیان‌و پێش ئەوەی بگاتە شوێنی کۆبوونەوەکە کە لە گامێشەکان ئەنجام دەدرا شەهیدیانکرد، لەگەڵ (شەهید سەرداروو شەهید موحسین)دا لە بەرواری (٢٤ی کانوومی دووەمی ساڵی ١٩٨٥)دا شەهید بوون، دوای ئەوە پێشمەرگە گەڕابووەوە بە شوێنیان و لە خاڵەبازیانی شۆردبوویان‌و کفن‌و دفنیانکرد بوو، پاش دوو ڕۆژ تەرمەکەیان هێنایەوە ئینجا ئێمە زانیمان، ئاگربەست بەرەو کۆتایی دەچوو ترسی شەڕبوونەوە لە ئارادا بوو گوندییەکان زۆریان چۆڵیانکردبوو شەش حەوت ماڵ لەو گوندەدا مابوونەوە، دایکیشم چوو بوو بۆ چەمچەماڵ بۆ پرسە، سەیر دەکەم (حاجی حەسەن) دەگریا‌و خۆڵی دەکرد بەسەری خۆیدا، منیش هەر لە خۆمەوە وتم ئەوە چییە مامە ڕیشە نەماوە؟، وتی بەڵێ چۆن باوکت ڕۆیشت ڕیشەش ڕۆیشت، بەعس هەردووکیانی شەهید کرد.

ڕیشە کە ڕۆیشتبوو تەنانەت پرسیشی بە براکەم نەکردبوو، من لە دوای نەمانی ڕیشە ژیانم زۆر قورس‌و ناخۆشبوو وامدەزانی هیچ کەس لە سەر زەوی نەماوەو پەردەی تاریکی درا بەسەرما، لەو ڕۆژەوە هیچ ساتێك دڵخۆش نەبووم، بەراستی ڕیشە هەر تاریکی‌و غەمی بۆ ئێمە نەهێنا، تروسکەیەکی گەشی شۆڕشی کوردبوو کڵپەیەك بوو لە ئاگر

بەرانبەر دوژمن، بەڵام بەداخەوە بەدەستی کوردان شەهید کراو ئەو چرایەی میللەتی کورد کوژایەوە.

دوای شەهیدبوونی مامە ڕیشە ئەحمەدی برام لە چەمچەماڵ خوێندکار بوو لە ترساندا هێنامانەوە بۆ ئەوەی دەستگیر نەکرێت، ئەویش بوو بە پێشمەرگەو خوێندنەکەی فەوتا، ٢٤ی ئابی ساڵی١٩٩٤دا لە شەری ناوخۆدا لە ناوچەی قەڵادزێ لە شاخی "هەڵشۆ" شەهید کرا، ئێمە تا ئەنفالەکە لە "قرخ" ماینەوەو دواتر بە قاچاخی گەڕاینەوە بۆ چەمچەماڵ کەمێك زەخیرەو خواردنم کڕیو بڕیارمدا بچین بۆ دەشت، خزمێکمان هەبوو ناوی (زیرەك قەرەتەمۆری) بوو وتی: سەرگەڵو ئەنفالکراوەو سەرەی ئێرەیەو سوپای بەعس لە هەموو شوێنێکەوە هێرش دەکاتە سەری ڕۆژێکیان حەیوانمان سەربڕیبوو من شەڕواڵم هەڵکێشابوو چێشتێکی زۆرمان لێنا، چونکە بۆ شەوەکەی میوانمان دەهات، ئەوەبوو ئەنفال گەیشتە لای ئێمەش‌و دەوری دێیەکە گیراو ڕاجیمە وەکو باران بەسەرماندا دائەباری، دایکمیان لەناو کونە تەیارەدا دەستگیرکردو بردیان‌و ئەحمەدی براشم ڕایکردو خۆم‌و محەمەدی برام لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگەدا لە قرخ بووین بانگی شێوان بوو لێی داین‌و ئێمەش ڕامانکرد، حکومەت ڕانەکانی گرتین‌و تاڵانیکردن‌و ماڵەکەیان سووتاندین پیاوێك منی هێنا لێمان دەترساو نەیگەیاندینە چەمچەماڵ، من‌و محەمەدی برام بەو شەوە ساردو سرە تا خۆر دەرکەوت ڕێگەمان بڕی ئینجا لە چەمچەماڵ نزیکبووینەوە، ئاگام لە دایکم‌و ئەحمەدو فەخرەدینی برام نەماو نەمزانی چییان بەسەردا هاتووە؟.

دایکم دەستگیر کرابوو دوای شەش مانگ زیندانی لە نوگرە سەلمان ئینجا ئازاد بوو، لە چەمچەماڵیش پشکنین دەستپێکردبوو کەس نەیدەوێرا کەس بگرێتەخۆی، ئەگەر لە سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧)دا لە چەمچەماڵ نەبوویتایە دەستگیریان دەکریت‌و ئەنفالیان دەکردیت، لە ماڵی خاڵێکمەوە بردیانم بۆ ماڵی مامێکم، ناسیاوێکمان هات کوڕی خەسرەو بوو من‌و ژنەکەی مامە ڕیشەی برد، بۆ ڕۆژی دوایی سواری لۆرییەکی کردین‌و بردینی بۆ چەرمەگا، بۆ ماڵی (ئەحمەد ڕۆستەم)و دوو خێزانی هەبوو، یەکێکیان لە "چەرمەگا" بوو ئەوی تریشیان لە سلێمانی بوو، ئێمەش پاش (١٥) ڕۆژ لە مانەوەمان لە چەرمەگا هاتینەوە بەرەو سلێمانی‌و چووین بۆ ماڵی خێزانەکەی تری‌و هەر لەوێ بووین تا حکومەت لێبوردنی گشتی دەرکردو دایکم ئازاد بوو، گەڕایەوەو لە ناوچەی "شۆڕش" پارچە زەوییەکیان دا بە دایکم‌و دوو ژوورمان تێدا دروستکرد.

*** فەزیلە محەمەد عەزیز**

ناسراوم بە (فەوزییە)و لە ساڵی (١٩٥٣) لە گوندی "کنربانە"ی لای کفری لە دایکبووم، لە خێزانێکی کوردپەروەردا گەورە بووم، باوکم لە شۆڕشەکەی (مەلا مستەفا)دا پێشمەرگە بووەو دوازدە پێشمەرگەی لەگەڵدا بووە، منیش هەمیشە هاوکاری باوکم بووم‌و نان‌و چێشتم بۆ پێشمەرگە دروستکردووە، باوکم مرۆڤێکی شۆڕشگێڕ بوو ڕۆڵێکی سەرەکی بینیوە لە شۆڕشدا، دوای نسکۆی ساڵی (١٩٧٥) خەڵك هەمووی پەرتەوازە بوو هەرییەکەو بەلایەکدا ڕۆیشت.

من لە ساڵی (١٩٧٥) ژیانی هاوسەریم لە گەڵ (مام جەلال) گەرمیانی پێکهێنا کە ئامۆزای خۆشم بوو، ئەو پێشتر پێشمەرگەی شۆڕش بوو لەگەڵ هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێدا دووبارە پەیوەندی بە "هێزی ئاگرین"ەوە کرد لە کفری، خەباتی نهێنی ناوشار دەستپێکردەوە، لە ساڵی (١٩٧٩) دا هاوسەرەکەم ئاشکرا بوو چووە شاخ، خەباتی نهێنی لە شارەوە گواستەوە بۆ شاخ‌و لەگەڵ (شەهید قانیع‌و شەهید سیروان)دا بوو، کە ئەو چووە شاخ‌و من سێ منداڵم هەبوو تا دوو مانگیش حکومەت نەیزانی کە هاوسەرەکەم چووەتە شاخ، دوای ئەوەی کە حکومەت زانی هاوسەرەکەم ڕۆیشتووەتە شاخ، ڕۆژێکیان باوکم هات بەڵام وتی: ئێستە ئەمنەکان دێن بۆلات نەترسێیت ئەگەر پرسیاری هاوسەرەکەتیان کرد بڵێ هاوسەرەکەم شێتە من هیچ دەسەڵاتێکی ئەوم نییەو ناشزانم بۆ کوێ ڕۆیشتیووە، ئەوەبوو ئەمنەکان هاتن بۆلام‌و وتیان کوا هاوسەرەکەت؟ منیش وتم هاوسەرەکەم شێتە شەڕی لەگەڵ کردووم‌و سەری خۆی هەڵگرتووە نازانم بۆ کوێ ڕۆیشتووە، ئەمنەکان سواری مسەڵەحەیان کردم‌و بردیانم بۆ ئەمنی"قەرەتەپە" کە گەیشتینە ئەوێ ڕەسمێکیان پیشاندام وتیان ئەو پیاوە کێیە؟ منیش وتم سوێند بەخوا نایناسم‌و هەرگیز نەمدیوە، وتیان بۆ نایناسیت ئەوە هاوسەرەکەتە لەوێشەوە سواری ئۆتۆمبێلیان کردم‌و بردیانم بۆ جەلەولا لەوێش ڕەسمێکیان هەڵواسیبوو وتیان هاوسەرکەت ناوی چییە؟ وتم ناوی جەلال حەمە ئەمینە ناسراوە بە (مام جەلال گەرمیانی)، باوکم لەگەڵدا بوو بە ئەفسەرەکەی وت ئەو پیاوەی ئەو هەرچییەك بێت ئەم کچەی من دەسەڵاتی ئەوی نییە، ئەو پیاوێکی شێتە من کچی خۆمی نادەمەوە، بە باوکمیان وت ئەم کچەی تۆ دەستبەسەرە دەبێت لە ماڵی موختار بمێنێتەوە، باوکم وتی من شەرەف خۆم ناخەمە دەستی موختار ئەگەر دەتانەوێت هەر ئێستە بیکوژن من خۆم دەبم بە کەفیلی کچەکەم ئەفسەرەکە وتی مادەم تۆ دەبیت بە کەفیلی کچەکەت دەبێت شەش مانگ لە زینداندا بمێنیتەوە هەتا بزانین کەی هاوسەری کچەکەت دەگەڕێتەوە، باوکم وتی من بە هەموو شتێك ڕازیم بەڵام واز لە کچەکەم بێنن، منیان خستە ناو مەسڵەحەیەکەوەو وتیان ئەوە باوکتمان بەند کردووە برۆ هاوسەرەکەت بدۆزەرەوە، چونکە تا هاوسەرەکەت نەدۆزیتەوە باوکت لای ئێمە دەمێنێتەوە، منیش وتم هاوسەرەکەم منی ناوێت گەر منی بویستایە بەسێ منداڵەوە ڕاینەدەکردو من بەجێبهێڵێت ئەو تەواو نییە من چۆن بەسێ منداڵەوە بەداویدا بگەڕێم، ئەوەبوو وازیان لەمن هێناو باوکمیان بەند کرد هەموو ڕۆژێك دەهاتن سەرژمێرییان دەکردین‌و هەتا شەش مانگ لەو سەرژمێرییە بەردەوام بوون بۆ ئەوەی بزانن کە من ڕامنەکردووە.

کە هاوسەرەکەم چووە شاخ کچێکم بوو ناومان نا (خەیاڵ) لەو سەردەمەدا ئەوانەی کە نەخوێنەوار بوون حکومەت بەزۆر دەیناردن بۆ ئەوەی بخوێنن منیش یەکێك بووم لەوانە

کە خەیاڵی کچم لە دایکبوو مامۆستاکانم (٢٠) ڕۆژ مۆڵەتیان دامێ، بەڵام ڕۆژێکیان لە "کنربان"ەوە بانگیان کردمو وتیان "تۆ"، لەچ خوێندنگەیەك دەخوێنیت؟ چۆن دەچیت بۆ خوێندنگە؟ منیش وتم لە فلان خوێندنگەمو هەموو ڕۆژێك دەچم بۆ خوێندنگەو ئەوەش مندالەکانمن، کە من وام وت (مامۆستا پرشنگ) لەولامەوە وەستابوو وتی ڕاست دەکات هەموو ڕۆژێك دێت بۆ خوێندنگە، لەبەر ئەوەی منداڵی وردە من یارمەتی دەدەم، نامەیەکی نووسی تێیدا نووسیبووی (فەزیلە حەمە عەزین) لای منەو کەس بۆی نییە دەستدرێژی بکاتە سەری، هەموو مامۆستاکانی ئەو خوێندنگەیە بەرگریان لێکردم دووبارە وازیان لێهێنامو هاتمەوە بۆ ماڵەوە، هەشت مانگەی کە لە کفریماینەوە ژیانمان زۆر سەخت بوو زۆر بەهەژاریو نەبوونی ژیانمان دەگوزەراند، لەبەر ئەوەی هاوسەرەکەم لە شاخ بوو خۆشمان لەژێر ترسو هەڕەشەو گرتنی ئەمندا بووین، دەستمکرد بە ئیشکردنو دەستم دەگرتەوە لە کرینی جلوبەرگدا، خۆمان کەمێك پارەمان هەبوو کە پێویستییەکانی ڕۆژانەمانی پێ بکرینو هەندێکجاریش ماڵی کەسوکاریشم یارمەتیان دەداین، هەرچەندە من زۆریشم پێناخۆشبوو کە کەسوکارم یارمەتیان ئەدامو دەموت من هاوسەرەکەم بۆ پێشمەرگایەتیو خەباتکردن چووەتە دەرەوە بۆ دەبێت ببم بەئەرك بەسەر ئەوانەوە، شەو تا بەیانی نەدەخەوتم بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن لە شار بچمە دەرەوە؟ چۆن پاداشتی ئەو خەڵکە بدەینەوە کە هاوکارمان بوون؟ لە یەکێك لە شەوەکان پێشمەرگە هاتە ناو کفرییەوە، حکومەت (قازی)و پێشمەرگەیەکی تر کە ناوەکەم لەیاد نەماوە بەدار شەهیدی کردن.

باوکم لەناو بەندینخانەدا هێندەی غەمی خواردبوو تووشی شێرپەنجە بووبوو، کە ئازادیان کرد تەندروستی زۆر خراپبوو بردمان بۆ "مدينة طب" بۆ شاری بەغداد، پاش مانەوەی (٩) ڕۆژ لە نەخۆشخانەی بەغداد کۆچی دوایی کرد، پاش شەهیدبوونی باوکم بە ماڵی باوکمیان وتبوو، فریای کچەکەتان بکەون گەر دەستگیر بکرێت ئازادبوونی نییە بەخێرای لە شار بیبەنە دەرەوە هەر کە هەواڵەکەیان بەمن گەیاند بەرواری (٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٩) کاتژمێر (٩)ی سەرلەبەیانی برایەکی خۆم کە ئەفسەر بوو لەگەڵ ئامۆزایەکمدا ئۆتۆمبێلێکیان هێناو بردیانین بۆ مەسوێی، بەرگەج، بۆ ئەوەی لەدەستی ڕژێمی بەعس ڕزگارمان بێت، ئەوکاتە من (کەژاڵو ئاسۆو خەیاڵ)و هەبوو هیچ شتێکمان لەگەڵ خۆماندا نەبرد.

ئەو ڕۆژگارە پێشمەرگە دەچوو بۆ سەرکردایەتی، کە من گەیشتمە ئەوێ هاوسەرەکەم لە سەرکردایەتی بوو، حکومەت دەستی دەگەیشتە هەموو گوندەکانی کوردستان ماڵە پێشمەرگە نەیدەتوانی بە ئارامی بژی، هەر ئەوەندەمانزانی سوپای ڕژێمی بەعس چواردەوری ئاواییان دەگرت بۆ دەستگیرکردنی کەسوکاری پێشمەرگە، ڕۆژێکیان هاواریان دەکرد دەیانووت ڕاکەن وا ئەمنەکان هاتن دەستگیرتان بکەن، میمکە (خازە) کە دایکی پێشمەرگەیەك بووە لەگەڵ دایکی (ڕەئوف) دا بردیانم بۆ جەمیلە، کە چووین بۆ ئەوەی لە ڕێگەدا دامان لە ئاوەکەی، مامەران، ئاوەکە هێندە سارد بوو سوێی کردبوو بەدلمدا، هەروەها هەموو پێیەکانمی قلیشاندبوو، دەیانووت گەر لە جەمیلە، خۆتان حەشار نەدەن ئەوا هیچ شوێنێکی تری لێ نییە خۆتانی تێدا حەشار بدەن، من دزداشەیکم لەبەردا بوو وتیان کراسێکی کوردی لەبەر بکەیت باشترە، منیش کراسێکی کوردیم لەبەر کردو ڕۆیشتین کە گەیشتینە ئەوێ بۆ ماوەی سێ ڕۆژ منیان لە ماڵی حەسەن جەمیلە حەشاردا، دوای ڕۆیشتنی سوپاکەی بەعسو جاشەکان گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.

سەرەتای شۆڕش بوو پێشمەرگە زۆر کەمبوو لێپرسراوەکانیش کەمترین پێشمەرگەیان لە گەڵدابوو، هەروەها جاشو حکومەت ترسیان نەبوو بە ئاشکرا بە ڕۆژدا دەهاتنە ناو دێهاتەکانی گەرمیانەوە.

* کەژاڵ خان.

لە شەڕەکەی سەنگاودا (باوکمو شەهید سوبحیو کاك پۆلا) کەمینیان دانابوو، بەڵام لەسەر جادەی سەنگاو زیانیان لێدرابوو ڕژێم فڕۆکەی بۆ هەستاندبوونو بە بێدەنگی هاتبوون بۆ ئەوەی هەرسێکیان دەستگیر بکەن، کە نزیك بووبوونەوە کەوتبوونە بۆردومانکردنیان، سوبحی شەهید بووبوو باوکیشم بریندار بووبوو هەموو گیانی پارچە هاوەن بوو، فڕۆکەکان هێندە لە باوکم و ئەوانەوە نزیکبووبوون کە بینیبوویانن هەرسێکیان بریندار بوونو لەسەر زەوییەکە کەوتوون یەکێك لە فڕۆکەوانەکان وتبووی با دابەزین لاشەکانیان ببەین خۆ مردوون یەکێکی تریان وتبووی با دەستی خۆمان بەوان پیس نەکەین کە گەڕاینەوە زیلی سەربازی دەنێرین جەنازەکانیان بهێننەوە، دوای ئەوەی کە فڕۆکەکان ڕۆیشتبوون باوکم هەستابوویەوەو کە سەیریکردبوو سوبحی شەهید بووەو پۆلاش چاوێکی هاتبووەوە دەرەوەو باوکم لە هەردووکیان باشتر بوو بوو (١٢٨) پارچە هاوەنی پێوە بوو بوو، کاتێك کە فڕۆکەکە بۆردومانی کردبوون باوکم لەسەر دەم کەوتبوو پارچەکان بەرپشتی کەوتبوون، باوکم هەر چۆنێکی کردبوو بەسك ڕۆیشتبوو تا خۆی گەیاندبووە سەر شاخەکەو فیشەکێکی تەقاندبوو ئیتر برادەرەکانی زانیبوویان فڕۆکە بۆردومانی ئەوانی کردووە بەخێرایی سێ هێستریان هێنابوو بۆیان، کە هێسترەکانیان هێنابوو باوکمیان خستبووە سەر ئەو هێسترەکە کۆپانەکەی نەوتی پێوەبوو بوو، کاتێك کە گەیشتبوونە شوێنی مەبەستو باوکمیان لەسەر هێسترەکە داگرتبوو پارچەیەکی هاوەنەکە بەر ئەندامی زاوزێی کەوتبوو، پزیشکیان بۆ هێنابوو ناوی (دکتۆر حەسەن) بووبوو ئەو پزیشکە کە باوکمی بینیبوو وتبووی گەر تا ئێوارە میز نەکات ئەوا دەمرێت، وتبووشی ئەم نەخۆشە سکی بە نەوت سووتاوەو پشتی هەمووی پارچە هاوەنە باشە من چارەسەری کوێی بکەم کە ئەو لەسەر لێواری مەرگە؟، دوای ئەوەی کە چارەسەریان بۆ باوکم کرد بۆ ماوەی یەك مانگ باوکم لەسەر دەم کەوت، بەو نەخۆشییەوە دێ بە دێ باوکمیان دەگێڕا بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەردەستی حکومەت،

پاش ماوەیەکی زۆر باوکم چاك بووەوەو ئەوجارەش لە مردن ڕزگاری بوو، (کاك پۆلا)ش چاوێکی هاتبووە دەرەوە، بەڵام نەمردو تائێستاش ماوە.

من وەکو هاوسەری پێشمەرگەیەك بەیانیان زوو کە لەخەو هەڵدەستام دوو سەلك سابوون‌و دوو پاکەت تایتم دەبردو دەرۆیشتم بۆ کانی‌و دەستم دەکرد بەجلشتنی پێشمەرگە، یاخود بەیانیان کاتی مەلا بانگدان هەڵدەستام‌و بەتەشتی گەورە نان‌و ناوساجیم دەکرد بۆیان، بێگومان ئەگەر ژنی پێشمەرگە پاڵپشتی هاوسەرەکانیان نەبوونایە هەرگیز شۆڕش بەرپا نەدەبوو.

من دوو گیان بووم، هاوسەرەکەشم دەچوو بۆ شەڕەکانی "قرناقاو" پشت ئاشان‌و ئالوەتان ئەمانە ئەو شەڕانە بوون کە کاتی خۆی پێشمەرگە لە "ئێران" بۆ ئازادکردنی خاکەکەیان دەیانکرد، ئەوکاتە من منداڵەکەم لە دایکبوو دوای ئەوەی کە ماوەیەك ژیا دواتر مرد، پاش مانگێك لە داوی مردنی منداڵەکەم هاوسەرەکەم گەڕایەوە بۆلامان، ئەگەر بە توانایی‌و بەهێزی ژنی کورد نەبێت کێ دەتوانێت بێ هاوسەرو بێ خۆراك‌و بێ جلو پێڵاو بێ هیچ دەرامەتێك‌و لەژێر ترسی گرتن‌و دڵەڕاوکێدا ژیان بەسەر ببات‌و منداڵی خۆی بە جوانی پەروەردە بکات؟!، سەرەڕای قسەو باسی خەڵکیش کە لە هاتنەکانی بەعس‌و چواردەور گرتنی دێهاتەکانی قوورسترو سەختتربوو، ئەوکاتەی کە هاوسەرەکەم بەجێی هێشتبووم پێیان دەوتم "چۆن دەتوانێت لەگەڵ پیاوێکدا بژیت بە دوو سێ ساڵ تۆ بە جێبهێڵێت، تۆ چۆن لێی قبووڵ دەکەیت؟، منیش دەموت "بە هیچ شێوەیەك ڕازی نابم کەس قسە بە هاوسەرەکەم بڵێت خۆ ئەو بۆ ئیشی نامەردی نەڕۆیشتووە، ئەو ڕۆیشتووە کار بکات بۆ ئازادی خاکەکەمان‌و ڕزگاربوونی نەتەوەیەکی ژێردەستە لەژێر دەسەڵاتی دوژمن، خۆ نەچووە بۆ سەیران‌و گەشت‌و گوزارو ڕابواردن، ئەو لەژێر گوللەی دوژمندا چەندین جار بریندار کراوەو بەتەمای نەبووین، ئیتر بۆ من ئەم ژیانە قبوڵ نەکەم؟!، ئەی کەی ئەم خاکە ئازاد دەبێت گەر کەس چەرمەسەرییەکان قبوڵ نەکات!؟، من کە چوومە شاخ بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی سەردانی کفری بکەمەوە، چەندین پرسەمان هەبووەو برام مردووەو ئامۆزام مردووە نەچوومەتەوە بۆ پرسەکەیان، لەبەر ئەوەی کفری قەزایەکی بچووك بوو جێگای سەرنج‌و تێڕوانینی بەعس بوو هەر کەسێك بڕۆیشتایە بۆ شاخ بەعس بەوردی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرد، هێندە توندووتیژی بەرامبەر بەناوچەکانی گەرمیان‌و پێشمەرگەو ماڵە پێشمەرگە دەکرا بۆ ناوچەکانی تر وانەبوو.

من تەنها یەك برام هەبوو ئەویش لە سوپای حکومەتدا ئەفسەر بوو، هەروەها لە ڕێکخستنەکانی ناوشاردا بوو لەترسی گیانی خۆی ناوی منی سڕییەوە بەشێوەیەکی وا کە ئەو خوشکێکی نییە بەناوی (فەزیلە)وە، من بەهیچ شێوەیەك نەمدەتوانی سەردانی شار بکەم‌و بچم بۆ ماڵی براکەم، من‌و هاوسەرەکەم ئامۆزا بووین گەر حکومەت بیزانیایە کە هاوسەرەکەم براکەم ئامۆزان ئەوا تووشی گێچەڵی زۆر گەورەیان دەکردو سەرزەوی نەدەبینییەوە.

لە ساڵی (١٩٧٩)دا خێزانەکەی (شینەی حەمە ڕەش) کە ناوی (کافێ) بوو ئەو یەکەم کەس بوو کە چووە شاخ، بەڵام بەداخەوە ژنەکەی‌و ماڵ‌و منداڵەکەی کەوتنە بەر شاڵاوی ئەنفال‌و ئەنفال بوون، دوای حەوت ڕۆژ لە چوونی ئەوان بۆ شاخ منیش چووم، پێش ئەو هاتن بەشوێن مندا کە بچم بۆ شاخ، بەڵام لەبەر ئەوەی باوکم لە بەندینخانەدا بوو نەمتوانی بڕۆمە دەرەوە، دەنا من یەکەم ژنی گەرمیان دەبووم کەبچم بۆ شاخ، کە چووینە شاخ کچە گەورەکەم لە پۆلی دووەمی سەرەتایی بوو، حکومەت لەناو دێهاتەکاندا خوێندنگەی کردبووەوەو لەژێر چاودێری‌و سەرپەرشتی خۆیدا بوو، دەسەڵاتی بەسەر هەموو گوندەکاندا هەبوو، منداڵان دەیانتوانی لەو خوێندنگەیەدا بخوێنن، کچەکەم تا پۆلی دووی لەوێ خوێندو دواتر کە شۆڕش گڕوتینی بەهێزبوو حکومەتی بەعس نەیدەتوانی دەسەڵاتی بکاتە گوندە ئازادکراوەکان، کە ئەو دەسەڵاتی نەما شۆڕش مامۆستای شۆڕشی دامەزراندو مامۆستاکانی تری لابرد، کچە گەورەکەم تا پۆلی پێنجی سەرەتایشی لە مەسۆیی‌و بەرگەچ خوێندو دواتر لە ئێران پۆلی پێنج‌و شەشی خوێندو گەڕاینەوە بۆ عێراق، کە گەڕاینەوە بۆ عێراق وازی لە خوێندن هێنا.

شەوێکیان من‌و پێشمەرگەیەکی تر کە ناوی (شەهید جیهاد بوو)بوو پاسەوانی ماڵەکەی خۆمان بووین، چونکە ماڵەکەمان پڕبوو لە چەك، ئەو خەوت‌و منیش بەحەوشەو بانەکەدا دەگەڕام‌و دەستمکرد بەپاسەوانی کردن، بەڵام منیش خەوم لێکەوتبوو، دوو کوڕی پێشمەرگەی ترمان لابوون ئەوان چووبوون بۆ گوندی ژاڵە کاتێك کە خەبەرم بووەوە بەئاسماندا ئیشارەت دەدرا کەمێك گوێم گرت‌و سەیری دەرەوەمکرد بۆ ئەوەی هۆکاری ئەو ئیشارەتانە بزانم سەیر دەکەم نە ڕەشەبایە نە باران کە زۆر وردبوومەوە بینم دەستی دەرگای دیوەخانەکەمان دەجولێتەوە، دەمزانی کە پێشمەرگەکان مۆڵەتیان وەرگرتووەو لەوێ نین، بەڵام من بەدەم خەوەوە بانگم دەکردو دەموت جیهاد، جیهاد کەسیش وەڵامی نەدەدامەوە لەبیرم چووبوو کە ئەوان لەوێ نین، لەبەر خۆمەوە دەموت لەوانەیە کارێکی هەبووبێت‌و ڕۆیشتبێت بۆ چەمەکە، جولەی دەرگاکە تا دەهات زۆرتر دەبوو چوومە پێشەوە دواتر بەپشتدا گەڕامەوە بۆ دواوە ئەوندەم زانی شەقێك درا لەدەرگاکە، ماڵێك لە حەوشەکەی ئێمەدا بوون تاقێکمان لەنێواندا بوو بانگمکرد، وتم حەمە، حەمە خۆ مستەفا لە دەرگاکانی دا بۆچی دەرگای بۆ ناکەوێتەوە، وتی مستەفا لە بەیانییەوە چووە بۆ (تیلەکۆ)، منیش وتم باشە ئەی کێبوو شەقی لەدەرگاکە دا؟، ئەویش تووڕە بوو وتی باشە بۆچی شتێکت لەدەرگاکە نەدا؟، وتم نەمتوانی دەرگاکە بکەمەوە ترسام بێنە ژوورەوەو تەقە لە منداڵەکانم بکەن‌و بیانکوژن، دواتر زانیمان کە ئەوان سێ کەس بووبوون هاتبوون بۆ کوشتنی جەلالی هاوسەرم، کە دەنگە دەنگەکە دروستبوو خەڵك کە هەمووی شڵەژاو هاتنە دەرەوەو دەیانووت هیچ نییە لەوانەیە خزم‌و کەسواری تۆ بن‌و هاتبن بۆلات، بەڵام دواتر بۆمان دەرکەوت کە بەپلان هاتوون‌و زمانمان لێدراوەو جاشەکان وتبوویان ئەو ژنە پاسەوانی

دەکات، ئەو جاشانەی کە هاتبوونە سەر ماڵمان چووبوون لای پیرەژنێکی گوندەکە ئاویان خواردبووەوەو وتبوویان ئێمە لەترساندا سیانمان هەڵهاتووین‌و ئەوی ترشمان لەوێ ماوەتەوە ئەوەی کە هەڵنەهاتبوو ئەوەبوو کە خەریکی کێلۆنی دەرگاکەی ئێمەبوو کەدەیویست بیشکێنێت.

لە شەڕێك لە شەڕەکانی پێشمەرگەدا هێزەکانی پێشمەرگە دەشکان لەبەر ئەوە سەرۆك (مام جەلال) هەواڵی ناردبوو وتبووی هێزێکی گەورەم دەوێت لە ناوچەی گەرمیان، هەروەها سامان گەرمیانیشم بۆ بنێرن بۆ شەڕەکانی سەرکردایەتی، کە پێشمەرگەکان گەیشتبوونە ئەوێ لە شەڕێکی زۆر گەورەدا قارەمانانە دوژمنیان تێکشکاندبوو، (سەرۆك مام جەلال) (سامان گەرمیانی) بانگکردبوو وتبووی ئەو پێشمەرگە قارەمانانەی کە بۆت ناردبووم سەریان بەرز کردمەوە، فلان پێشمەرگەم بۆ بنێرە مەبەستی جەلالی هاوسەرم بووبوو، کاتێك هاوسەرەکەم چووبوو بۆلای مام جەلال مام جەلال وتبووی کوڕم ناوت چییە؟، هاوسەرەکەم وتبووی ناوم مام جەلالە لەبەر ئەوەی کوڕی پیاوێکی هەژارم‌و جووتیاریشم خەڵکی خۆشیان دەوێم‌و بەرەزامەندی ئەوان هەڵسوکەوت دەکەم‌و لە خۆشەویستیدا ناویان ناوم مام جەلال، مام جەلال وتبووی من زۆر خۆشحاڵم کە تێکۆشەرێکی وەکو تۆ لە گەرمیانەوە هاتوویت بۆلای من لەئێستە بەداوە تۆ ناوت (مام جەلال)ەو منیش (کاك جەلال)م، بۆ ڕۆژی دوایی نامەیەك هاتبوو بۆ سەرۆك (مام جەلال)و هاوسەرەکەم نامەکەی کردبووەوە کە بە هیچ شێوەیەك نەدەبوو کەس نامەی سەرۆك بکاتەوە، (مام جەلال) هاوسەرەکەمی بانگکردبوو وتبووی بۆ ئەو نامەیت کردووەتەوە؟، هاوسەرەکەشم وتبووی ئەی تۆ دوێنێ نەتووت تۆ مام جەلالیت‌و منیش کاك جەلالەم، (سەرۆك مام جەلال) دەستیکردبوو بەپێکەنین وتبووی خۆشحاڵم کە کورد نەوەی وەك تۆی هەیە، پلەت چییە؟، هاوسەرەکەم وتبووی ئامیر مەفرەزەم، (سەرۆك مام جەلال) وتبووی کوڕم تۆ لەم دەقەوە دەبیت بە ئامیر کەرت، هاوسەرەکەم چەندین پلەی لەژێر دەستی مام جەلالدا وەرگرتووە، لەبەرئەوەی خۆشەویست بوو لەلای.

من شەو خەوم بە هاوسەرەکەمەوە بینی لەخەومدا هاوسەرەکەم بریندار بوو، بۆ ڕۆژی دوایی (مامۆستا عەبدوڵڵا) هات پێش ئەوەی هیچ قسەیەك بکات وتی بەهیچ شێوەیەك کەس نەقیژێنێت مام جەلال بریندارە دایدەگرین‌و هێندەی پێناچێت چاك دەبێتەوە، کە هاوسەرەکەمیان داگرت چیمان بینی تەنها هەناسەی دەدا، ئەو سەردەمە نەدەبوو پێشمەرگە لەناو گوندەکاندا بمێننەوە دەبوایە بەو برینە سەختەوە هەر ڕۆژێك لە شوێنێك حەشار بدرانایە، ئەو جارە وا هەواڵمان بۆ هات کە گوایە هاوسەرەکەم شەهید کراوە، بەڵام کە هێنایانەوە بۆ ماڵەوە نەمردبوو ئێمە بینیمان‌و پشوویەکی داو بردیان‌و لە گوند دووریان خستەوە.

دووبارە شەڕ لەنێوان جاش‌و پێشمەرگەدا دەستیپێکرد کە شەڕێکی زۆر بەناوبانگ بوو دووبارە هاوسەرەکەم لەو شەڕەشدا بریندار بووەو ئەمجارەشیان پزیشك وتی نامێنێت، هاوسەرەکەمی لە ژیانیدا سێ جار بە سەختی بریندار بووە.

*** یادداشتەکانی (فەوزییە خان)**

پێش ئەنفالەکە هاوسەرەکەم مەعاونی تیپی (٥١)ی گەرمیان بوو، لە سەرەتای ئەنفالەکەدا من گاڵتەم بە عەقڵی ئەو خەڵکە دەکرد کە ڕایاندەکردو دەموت باشە ئەو خەڵکە بۆچی وورەی ڕووخاوە؟، من شەوان نانم بۆ ئەو خەڵکە ڕاکردووە دەکردو دەموت "غیرەتتان هەبێت بۆ کوێ ڕادەکەن؟، ڕامەکەن.

کاتێك ئەنفال ڕوویکردە گەرمیان کەس ئاگای لەکەس نەماو منیش پێنج منداڵی وردم هەبوو، باوکی منداڵەکانی بانگی کردم‌و وتی "فەوزییە تۆ لە هەموو ژیانی من‌و هەموو بیرەوەرییەکانمدا بوویت‌و هیچ کات بەرامبەر هەڵوێستی من هەڵەت نەکردووە، ئەم خاکە خاکی خۆمە ئێوەش بۆ کوێ دەڕۆن بڕۆن دەتوانن وەکو ئەو خەڵکە بچن خۆتان ڕادەستی حکومەت بکەن، خۆ منداڵی من لە منداڵی میللەتی کورد زیاتر نییە، من هەتا ئەو ڕۆژەی شەهید دەبم خەباتی ژێرزەمینی دەکەم، من‌و منداڵەکانم‌و مام جەلالی هاوسەرم زۆر گریان بەسەر یەکتریدا بۆ ئەو ساتە وەختەی کە چارەنووسی ئەو گەلەو ئێمەش نادیار دەبێت، جەلال وتی فەزیلە چی لە منداڵەکان دەکەیت، وتم هەموویان سەر دەبڕم، چونکە شەرم لە خۆم دەکەم بەسەر شۆڕی بچمەوە ناو خەڵك، یان لەگەڵ تۆ لەم شاخە دەبین یانیش خۆشم‌و منداڵەکانیشم بکوژە، لەبەر ئەوەی ئێمە چەندین ساڵە هاتووینەتە دەرەوە جەفا دەکێشین بۆ میللەتی کورد، کەچی شۆڕشی کورد ئاوای لێ بەسەردا هات، هاوسەرەکەم وتی ئەو کارە باش نییە چاوەڕوان بە ئێمە هەر خەبات دەکەین تا سەردەکەوین، منیش بڕیارم دا خۆم ڕادەستی حکومەت نەکەم بە هاوسەرەکەمم وت ئێمە دەڕۆین گەر دەستگیرکراین لەت‌و کووتیشمان بکەن بەهیچ جۆرێك لەبەر ژیانی ئێمە خۆت ڕادەستی حکومەت نەکەیت‌و لەسەر هەڵگیرسانەوەی شۆڕش بەردەوامبە، چونکە دەزانم تۆ ماڵ‌و منداڵی خۆتت خۆشدەوێت دەبێت وەکو مەردی مەیدان بمێنێتەوەو شۆڕش بکەیت، وتی ئێوە بڕۆن بۆ ماڵی فلانە کەسی برام‌و بڵێن ئێمە خێزانی مام جەلالین تا بزانین چیمان لێ بەسەر دێت، ئێمە لەم قسانەدا بووین (شەهید ساڵح) لەولامانەوە دانیشتبوو وتی مام جەلال بەڕاستی هەرگیز ژنی وەکو ئەوم نەبینیووە، دوای تەواوبوونی قسەکانمان من هەموو شتێکم بەجێهێشت تەنانەت ئاڵتون‌و تەسکەرەشم نەبرد لەگەڵ خۆم‌و بەڕێکەوتم بۆلای ئەو حکومەتە دڕندە فاشییەی کە نەماندەزانی چارەنووسمان بەچی دەگات.

لە (٤ی نیسانی ساڵی١٩٨٨)ەوە نە ئێمە ئاگامان لە هاوسەرەکەم ما نە ئەویش ئاگای لە ئێمە ما، چونکە دوای ئەوەی کە هاوسەرەکەم وتی بڕۆن بۆ فلانە ماڵ خۆتان حەشار بدەن من دەستم ناچێتە ئێوەو بتانکوژم‌و خۆم لە ژیاندا بمێنمەوە، کۆمەڵێك خەڵك لە گەرمیان هەبوون خەڵکیان سەر دەبڕی‌و سەرەکانیان دەبردن بۆ حکومەت کە ئێستاش ئەوکەسانە هەر ماون‌و لە گەرمیان دەژین، هەر ئەو کەسانە لەلای ئێمەدا کوڕێکی شیوعیان سەربڕی‌و سەرەکەیان برد بۆ حکومەت، کاتێك کە ڕۆیشتین ماڵ‌و منداڵەکەی (حەمەی سەید محێدین) هاتن لەگەڵماندا‌و ئەوانیش کە باوکیان

بینی باوەشیان پێداکرد، کورەکانی ئەو گەورە بوون و ژنەکەشی گەنج بوو، بەلام بەداخەوە سەید محەمەد لە سێدارە دراو مال و منداڵەکەشی ئەنفالکران، لەبەر ئەوەی ئێمە ناسراوبووین خەلك زیاتر دەیناسین لەوان جیابووینەوە بۆ ئەوەی بەند نەکرێین بەرەو سموود بەرێکەوتین، لە رێگەدا هەندێك کەسی باش یارمەتی داین بەهۆی یارمەتی ئەوانەوە گەیشتینە سنووری مەسۆیی لەوێوە دەچووین بۆ ملەسوورە کە گەیشتینە ئەو سنوورە جاشەکان و حکومەت رێیان لێگرتین و وتیان بۆ کوێ دەچن؟، مەرۆن وەرن فیلمێکی سنەمایی سێ رۆژەتان پیشاندەدەین، وتم کاکە ئێمە نە بۆ ئێران دەچین نە بۆ توووران، ئێمە دەچینەوە ناو حکومەت خەلکی داماو هەژارو عەشایەرین، ئێمە سێ ئۆتۆمبێل و عەرەبانەیەك و مەکینەیەکمان پێبوو چاوەڕوانی گەنجەکانمان دەکرد بۆ ئەوەی بێن و خۆمان رادەستی حکومەت بکەین، بەعسییەکان بەزۆر دایاننیشاندین و بە قۆناغە تفەنگ تێمان بەربوون و دەیاندا بەسەرو شانماندا، من کورەکەشمم بەباوەشەوە بوو هەموو گیانمایان خەلتانی خوێن کردو خستیانینە ناو ئاوەکەی نێوان ملەسوورە و ژێر پردەکە، بارانێکی زۆر دەباری لافاو هەستابوو منیش هێندە شارەزای ئەو ناوچەیە نەبووم ئەوان وتیان ئەو لێدانەی ئێوەمان بۆ فیلمێکی سینەمایی دەوێت، منیش درۆیەکم لەگەڵ ئەواندا کردوو وتم ئێمە ۳۰۰ گەنج و پێشمەرگەی ترمان لەگەلدایە، هەر نەشمدەزانی پێشمەرگە لە چ شوێنێکە، چونکە کە لە پێشمەرگەکان دابڕام ئیتر نەمبینینەوە، من کە ئەوەم بە سەربازەکان وت تەنها بۆ ئەوەبوو کە رێگەیەك بدۆزمەوە بۆ دەرچوونمان، ئەو بەعسیانەی کە لێیانداین وتیان ئێوە لێرە دانیشن ئێمە دەچین ئەو گەنجانە دەستگیر دەکەین و دێینەوە، ئەوەبوو فێلەکەمان سەری گرت و ئەوان رۆیشتن دونیاش بەرەو تاریکی دەرۆیشت هەر کە ئەوان دوورکەوتنەوە ئێمەش دەستمان کرد بەرۆیشتن لەناو ئەو قووڕو چلپاوەداو شارەزای رێگەکەش نەبووین، من شەش منداڵیشم پێبوو کەس نەبوو هاوکاریم بکات کە کورەکانم لێدوور دەکەوتنەوە بەهۆی بۆنەوە دەماسینەوە، ئاری کوڕم کە ئێستە مامۆستایە ونبوو بە بۆن دۆزیمەوە، لە کاتی رۆیشتنماندا کۆمەلێك جاش بەرەو رووومان هاتن و کەوتنە گریان و باوکە رۆ وتیان باجی فەوزی ئەوە شیوە چیتان لێبەسەر هاتووە لەو قووڕاوەدا؟، جاشەکان ئاری کوڕمیان بردو پێلاوەکانیان بۆ پاککردەوەو لە باوەشیان کرد منداڵەکانی تریشم خۆیان دەرۆیشتن، بۆ ماوەی (۱۰)رۆژ لە رێگەدا بووین ئینجا گەیشتینە سموود ئێمە نەمادەویست برۆین، بەلام کە رۆیشتین ناونیشانمان دا بەجاشەکان ئەوانیش وتیان گەر زیلەکان و سوپای بەعس و جاشی تر گەرانەوە بۆتان ئێمە دەلێین ئەوانمان دەستگیرکردوون گەر نەشگەرانەوە ئێمە دەرتاندەکەین، ئێمەیان هێنایە سموودو بردیانینە مالێکەوە بێ نان و بێ ئاو دایاننناین و منداڵەکانمان لەبرساندا دەگریان و هاواریان دەکرد، ئەو مالەی کە تێیدا بووین زۆر دەترسان، ئەو پیاوەی کە ئێمەی برد بۆ مالەکە بە مالەکەی وتبا تا بەیانی لێرە بن خۆم فرسەت دەهێنم و دێم دەیانبەم، بەلام بەیانییەکەی ئەو پیاوە کە وتی دێمەوە لە هاتنەوەکەی دواکەوت و نەهاتەوە ئەو مالەشی کە تێدا بووین دەیانووت باشە بۆ نارۆن؟، بۆ خاتری خوا لێرە برۆن، منیش وتم شوێن و جێگەم نییەو نازانم بۆ کوێ برۆم و روو لە کوێ بکەم؟، وتیان باشە تۆ چۆن هاتوویت بۆ ئێرە؟، وتم هاوسەرەکەم شوانەو پەکی کەوتووەو زیلی سەربازی هاتووەو خستوویانەتە ناوی و بردویانە وتیان باشە تۆ چۆن کەست نییە، وتم ئەو لە بێ کەسیدا منی خواستووەو کردوومی بە هاوسەری خۆی، لەبەر ئەوەی نەمدەتوانی بلێم هاوسەرەکەم پێشمەرگەیە، چونکە گەر بیانزانیایە رەمییان دەکردین، کاتێك زانییان ئەو مالەی کە لەوێ بووین بەردەوام پرسیاریان دەکردو دەیانووت تۆ چۆن هاوسەرگیریت لەگەل پێشمەرگەدا کردووە؟ خەلکی کوێیت؟ کەس ناناسیت؟، منیش وتم بەلێ کەسێك دەناسم لێرەیەو ناوی (حەمەئەمین دوانزە ئیمام)ەو کەسێکی بەناوبانگە دەشزانم کە هێشتا لە ژیاندا ماوە، بەلام ناچم بۆلای نەوەکو حکومەت پێی بزانێت و دەستگیری بکات، وتیان پێشمەرگەی زۆری لێبوو؟، وتم بەلێ وەکو گەلای دار پێشمەرگەی لێبوو، دواپی بۆم دەرکەوت ئەو مالەی کە منی تێدابووم خۆشیان مالە پێشمەرگە بوون، ئەوان لەمن ترسابون و منیش لەوان کە وتم حەمە ئەمین دوانزە ئیمام دەناسم پیاوی خاوەن مالەکە وتی ئەو سمێلەم سمێلی پیاو نەبێت گەر بەیانی (حەمە ئەمین دوانزە ئیمام) نەهێنم بۆلات یان تۆ نەبەم بۆلای ئەو.

منیان بردە مالێکی تر کە بوو بە سەعات (۷)ی بەیانی مالەکە دەریانکردین و وتیان بچۆرەو بۆ ئەو مالەی کە شەو قسەی دەکردو وەکو پیاوێکی ئازا خۆی دەردەخست، پیاوێکی تر وتی کچە باشەکەم ئەو کەلاوەیەت بۆ ئامادە دەکەم و ئاو رۆن و هەر شتێکی تر کە لە توانامدا هەبێت بۆت دەهێنم و بۆخۆت لەوێ بژێ، منیش لەبەر خۆمەوە دەمووت گەر کەسوکارم بزانن من نیازم لێرەدا بژیم هەرگیز لێم قبوول ناکەن، نەشمدەوێرا هیچ شتێك بلێم لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە هەژارە بەهۆی ئێمەوە تیا دەچێت، دوای ئەو قسەو باسانە چووینەوە بۆ ئەو مالەی کە یەکەم جار لەوێ بووین تەقەمان هێنا لە دەرگا، بەلام دەرگایان لێنەکردینەوە شیروانی کوڕم چووە سەر دیواری مالەکەوە دەرگاکەی کردەوەو چووینە ژوورەوەو دانیشتین وتیان تۆ ئەو هەموو منداڵەت پێیە گەر حکومەت پێت بزانێت دێت دەستگیرت دەکات لێرە برۆ با بەو منداڵە جوانانەوە دەستگیر نەکرێیت، بۆ گەڕایتەوە؟، وتم مالەکەی تر دەریانکردم وتیان برۆرەوە بۆ مالی ئەوان، ئاساییە با بێن و دەستگیرمان بکەن هەر لەسێدارەدان و مردنەکە نییە خۆ کەس من ناناسێت، ئەو سەردەمە نان و خواردن زۆر هەرزان بوو کەچی ئەو مالە بۆ یەك شەو رۆژ ئەو هەموو بەزەمەیان بەمن کرد، ئەگەر وەکو ئێستە گرانی بوایە چیمان بکردایە؟!، مالەکە دوو کچی گەورەیان هەبوو وتم ئاردتان هەیە؟ ئەگەر هەتانە بۆم بێنن تا سوپای حکومەت و جاشەکان دەرۆن با نانتان بۆ بکەم و منداڵەکانیشم دەکەمە ئەو دەشتەوە با بۆ خۆیان یاری بکەن بۆ ئەوەی پێمان نەزانن، منیش بە منداڵەکانم وت برۆنە ئەو دەشتەوەو بۆ خۆیان

یاری بکەن، چونکە ئەگەر ئەوان بزانن ئێمە کەسوکاری پێشمەرگەین ئەوا هەموومان دەستگیر دەکەن، منداڵەکان ڕازیبوون و ڕۆیشتنە دەشتەکەوە منیش تەشتێکی گەورەم هێناو هەویرم شێلاو دەستمکرد بە نانکردن ئەو هەموو نانەم کرد دوو سێ گونکم مابوو تەواوی بکەم ئۆتۆمبێلێك لەبەر دەرگا وەستاو تەقەی دا لە دەرگا منیش زۆر ترسام دەمووت باشە گەر من دەستگیر بکرێم ئەو منداڵە ووردانەم چیان لێبەسەر دێت؟، کە دەرگاکەمان کردەوە (حەمەی حاجی ئەحمەد) بوو ناسراوی خۆمان بوو خۆی کرد بەژووردا و وتی فەزیلە ئەمە چیدەکەیت لێرە؟، کە ئێمەی بینی منداڵەکانی کردە ناو ئۆتۆمبێلەکەوەو وتی نابێت هەمووتان بەیەکەوە ببیەن بۆ ئەوەی گومانمان لێنەکەن دەبێت سێ سێ دەرتان بکەین، نانیش ئامادەبوو، بەڵام نانمان نەخواردو بردیانین بۆ کەلارو خۆیان گەڕانەوە، کە بردیانین بۆ کەلار دابەشیانکردین بەسەرماڵەکاندا واتە من و منداڵەکانم بەجیا دەژیاین، لەبەر ئەوەی لە ماوەی یەك کاتژمێردا حکومەتی عێراقی (١٠)جار دەگەڕا بەسەر ماڵەکانداو ڕێگەی دەگرت و دەیووت مەنعە تەجەوله، بەو شێوەیە سێ ڕۆژ لە کەلار حەشاریان داین و لە ترسی حکومەت ئەو سێ ڕۆژە هەر ڕۆژەو لە ماڵێکدا بووین منیش هەواڵم نارد بۆ خزمانی ئەوێم و وتم هەواڵ بنێرن بۆ براکەم و زاواکەمان بەڵکو بتوانن هاوکاریمان بکەن خۆمان ناتوانین بێینە ناو کفرییەوە، چونکە دەستگیرمان دەکەن کە هەواڵەکە گەیشتبوو بە براکەم و زاواکەمان بڕیاریاندا بوو کە ژێرزەمینمان بۆ دروست بکەن و لەوێ حەشارمان بدەن، دوای ئەوە براکەم هات بەشوێنمانداو تەکسییەکی تایبەتی بۆ گرتبووین و بردینی بۆ جەلەولا، ئەو تەکسییەی کە براکەم گرتبووی من خاوەنەکەیم دەناسی ئەویش منی دەناسی کەسیشمان نەماندەوێرا قسە بکەین، براکەم ویستی پارەی تەکسییەکە بدات کە (١٠) دینار بوو پیاوەکە بەبراکەمی وت ئەو ئافرەتە چی تۆیە؟، براکەم وتی خوشکمە وتی خوشکی تۆیە، خوشکی منیشە پارە وەرناگرم، ئیتر پارەی وەرنەگرت و بردینییە جەلەولا، شەش ڕۆژ لەوێ ماینەوەو دواتر هێنایانینەوە بۆ سلێمانی، بەڵام مەخابن کە گەیشتینە سلێمانی دەریانکردین و وتیان لە کوێوە هاتوون بڕۆنەوە بۆ ئەوێ ئەوماڵەی کە ڕۆیشتین بۆ ماڵیان وتیان تۆ نە لە سلێمانی نە لە هیچ شارێکی تر جێگەت نابێتەوە بچۆ بۆ دەشت یاخود بڕۆ بۆ ئێران دەنا دەستگیر دەکرێیت، منیش وتم گەر دەشت هەبوایە بۆ دەهاتم بۆ ماڵی تۆ؟، یان گەر بڕۆیشتمایە بۆ ئێران ئیشم بە ماڵی تۆ چیبوو؟ بەڵکو بتوانن یارمەتیم بدەن ئەم شەش حەوت ڕۆژە لێرەبم بۆ ئەوەی منداڵەکانم دەستگیر نەکرێن، بەڵام بێسوود بوو ئەوان هەر لەسەر قسەی خۆیان سوور بوون کە ئێمە بڕۆین و ماڵەکەیان بۆ بەجێبهێڵین و تووشی کێشەیان نەکەین، ئێمەش بەناچاری بڕیارماندا بگەڕێینەوە بۆ سموود، شەو منیان دایە دەست جاشێك و ژنی خاوەن ماڵەکە بە جاشەکەی وت کە ئەمانە خێزانی (مام جەلال) گەرمیانین، کە ژنەکە وای ووت جاشەکە سەیرێکی منی کردوو وتی ئەو ساڵە حکومەت ئێمەی بەفڕۆکە هێنا بۆ مەسۆیی!!، منیش چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە بمێنم ڕوومکردە جاشەکەو وتم جەلالی هاوسەرم ئاواتی ئەوەبوو هەمووتان بکوژێت، چەندین جاشی لێ کوشتوون و خۆشی نەکوژراوە، هەروەها لە ئێستگەی شۆڕشیشەوە بڵاویکردووەتەوە کە (مام جەلال) نەبەردییەکەی گەورەی تۆمارکردووەو جاشێکی زۆری کووشتووە، کە زانی هاوسەرەکەم لە ناوچەی گەرمیان ماوەتەوەو بەڵێنی داوە کە شەڕی پارتیزانی بکات و دەست بەرداری خاکی خۆی نابێت و خەباتی ژێرزەمینی دەکات جاشەکە هیچی نەوت، گەر بیانزانیایە هاوسەرەکەم نەماوە یان دەستگیر کراوە هەمومانیان دەستگیر دەکردو لەبەر پارە ڕادەستی حکومەتیان دەکردین، بەڵام نەیانوێرا دەستگیرمان بکەن و بەجێیانهێشتین.

ئێمە گەڕاینەوە بۆ سموود حکومەتی بەعس ئۆردوگایەکی بۆ کەسوکاری بەجێماوی ئەنفال دروستکردبوو، ئێمە لە دوو سەرەوە خەفەتبار بووین، لەلایەکەوە خۆمان لە ئەنفال دزیبووەوە لەلایەکی تریشەوە پێشمەرگەو پارتیزان بووین و خەڵکی لێمان دەترسان و وەکو ڤایرۆسێکی ترسناك مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردین، فەرمانێك لە حکومەتی بەعسەوە دەرچوو کە ئەگەر هەر کەسێك میوانی هات و لە دوو ڕۆژ زیاتر مایەوە ئەوا مونەزەمەی بەعس ئاگادار دەکاتەوە، دەبێت بەر دەرگاکاتان گڵۆپی پێوە بێت دەنا دەستگیر دەکرێن، هەروەها هەر ماڵێکیش وێنەی سەدام هەڵنەواسێت ئەوا ئەشکەنجە دەدرێت.

* گورجی عەبدولکەریم.

من لە گوندی "تۆپخانەی"ی سەر بە قادر کەرەم هاتوومەتە ژیانەوە، ئێمە خێزانێکی یەککگرتوو بووین و شێوازی خوشك و برایەتیمان زۆر تایبەت بوو، براکەم کە ناوی (مامە قالە) بوو شەهید بوو پێشمەرگەی کەرتی دووی (٥٩ی گەرمیان بوو، لە کەرتی (جەلال سەعدە) بوو.

شەهید مامە قالە خاوەنی مێژوویەکی پڕ سەروەرییەو لە ساڵی (١٩٧٩)ەوە پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی ناو شاری کەرکوکەوە هەبوو، هەروەها خاوەنی حەوت ساڵی خەباتی ژێر زەمینی بوو لە قادر کەرەم، کاتێك کە لە ڕێکخستندا کاری دەکرد تەنها من دەمزانی و کەسی تر نەیدەزانی و من یارمەتیدەرو هاندەری بووم.

ئەو زۆر خولیای پێشمەرگایەتی بوو باوکیشم ڕێگەی پێنەدەدا، دواتر چووە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگەوەو لە ئەستێڵی سەرەوەو خوارەوەدا بوو، پاش شەش مانگ گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆمان بۆ تۆپخانە.

(مام قالە) کەرتەکەی گەڕایەوە بۆ گەرمیان و ئامۆزایەکی باوکم ناوی (سەلام) بوو لە گوندی "قولی تەپە" لە ناوچەی "داوێ" شەهید کرا مامە قالە وتی "من دەڕۆم تۆڵەی شەهید سەلام دەکەمەوە" ئەوەبوو ڕۆیشت و لە کاتی ڕۆیشتنیدا لە تراکتۆر وەرگەڕابوو دەستی ئازاری پێگەشتبوو، من لە کنگر کردن بووم کە گەڕامەوە بەر دەرگای ماڵمان زۆر قەرەباڵغ بوو بە باوکمم وت چی ڕوویداوە بۆ وا حەپەساویت؟!، باوکم وتی قەرەباڵغی مەکەن باگورجی نەترسێت و وتی کچێ هیچ نییە

تراکتۆرەکە وەرگەڕاوەو مامە قالە دەبەین بۆ تەپەی عەرەبی حاجی مارفو شەو لەوێ دەمێنێتەوە، بردمان بۆ ئەوێو پاش دوو سێ ڕۆژ بە جەولە گەڕایەوە بۆ تۆپخانە، منیش سوێندم خواردبوو کە پەنجەی ماچ بکەم لەبەر ئەوەی زۆر زۆرم خۆشدەویست، مامە قالە وتبووی من هەرگیز خەمی شەهید بوونی خۆمم نییە، بەڵام گورجی گەر نەشمرێت ژیانی دەکەوێتە مەترسییەوە.

دوای مانەوەمان لە گەرمیان ڕۆیشتین بۆ داستانی قەیوان ماوەتو برزوو بالۆسەو خەجە لەرزۆكو هۆنراوەیەکم بۆ وت هەتا ئەمرۆش لەبیرم ماوە ئەمەش هۆنراوەکەیە:-

شاخەکەی خەجە لەرزۆك تەلاش تەلاشە
مامە قالە تێیدا عەدەد ڕەشاشە
جاشی خۆفرۆش بۆ مردن باشە

یاخود دەمووت:

لەهارەی ڕەشاش نالەی بیکەیسی خۆت بوویتە کۆمەڵە شاخ بەشاخ دەچوویت.

دوای سێ مانگو نیو مامە قالە گەڕایەوە، ڕۆژێکیان لەتەنور باندا بووم نانم دەکرد کە هاتمەوە دایکمو باوکم زۆر بێتاقەت بوون منیش نانەکەم بەجێهێشتو گەڕامەوە دەزانم مامە قالەو جەمال مەلای هۆمەر گەڕاونەتەوەو هەشت ڕۆژ لە ماڵەوە مانەوە لەبەر ئەوەی کە مامە قالە گەڕابووەوە شەهید نەکرابوو ئێمەش هەشت سەر حەیوانمان کرد بە مەولوود مەخابن هەموو ئەو کەسوکارەی کە لەوکاتەدا کۆبوونەوەو لەوێ نانی مەولودیان خوارد هەر هەموویان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن.

ئێمە ئاومان لەکانی دەهێناو چێشتو نانمان دەکرد، مامە قالە هیچی لەمن نەدەشاردەوە، پێکەوە کاتژمێر یازدەو نیوی شەو ڕۆیشتین ئاو بهێنین وتی دەڕۆین بۆ چالاکییەك گەر سەرکەوتوو بووم دەبم بەسەرتیپ، ئەوەبوو ڕۆیشت بۆ چەمچەماڵو هەتا لە گوندەکە دەرچوو من هەر سەیرم دەکرد، مام وتی تازە لە دەستمان دەرچوو ڕۆیشت بۆ چەمچەماڵو چل خولەك ڕێگەی بڕیبوو دواتر بریندار کرابوو، کە بریندار کرابوو گوللەیەك دابووی لەلاملیو (دکتۆر جەبار)یان لەگەڵدا بووبوو بە پێشمەرگەکانی وتبوو ئاگاتان لە مامە قالە بێت نامێنێت، مامە قالە لەبەر ئازایەتیو خۆڕاگری تەمەنی پێشمەرگایەتی تەنها دوو ساڵ بوو لە ڕۆژی (٢٨ی تەمووزی ساڵی ١٩٨٧)دا لە چەمچەماڵ شەهید کراو لە ماڵی باوکی شەهید سیروان لە دێ ڕەشە کفنو دفن کراو هەر لەوێش ناشتیان.

شەهیدبوونی ئەو تاریك سەڵات بوو لای من کۆتایی دونیا بوو، لەخەفەتی شەهیدی بوونی ئەودا کە گەڕابوونەوە کاتژمێرێکی بەدیاری بۆ هێنابووم فڕێمدا.

شاخی "ئاژداغ" بەرامبەر "تۆپخانە" بوو ڕەبییەی حکومەتی پێوەبوو لەکاتی ئەنفالەکەدا ڕۆژانە کۆپتەرمان دەبینی، ناسراوێکی باوکم وتبووی تۆ کوڕێکت شەهید بووە با ئەوانی تریشت نەفەوتێنو کوڕەکان ڕزگار بکەو تراکتۆرەکەت لێرە مەهێڵە.

باوکم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە وتی کوڕەکەم کارەساتێکی وا بەڕێوەیە براکەم وتی خۆ ئێمە لە مامە قالە زیاتر نین با هەر لێرە بینو شەهید ببین، ئەوەبوو ئێمە لەوێ ماینەوەو پێشمەرگە بە جەولە دەهاتن ژیان زۆر زەحمەتو دژوار بوو سوپای عێراقی هێرشی بۆ هێناینو لەگەڵ برا گەورەکەمدا لە دەرەوەی گوندەکەوە خواردنو کەلوپەلمان حەشاردا.

ئێمە ڕۆیشتینە شاخەکانو دوو تراکتۆر لەدزە ڕێگەوە هاتن پێشمەرگە بوون کاکم زۆر پەشۆکابوو مامیشم پێشمەرگە بوو، هەر لەو کاتەدا کۆپتەرەکان هاتنو ئێمەش ڕۆیشتینە بەردەم تراکتۆرەکانو کاکم هەواڵی مامی پرسیو ئەویش وتی مامت باشە لەگەڵ ئەواندا بە ترکتۆرەکە ڕۆیشتین بۆ فەقێ مستەفا، شەو قەمسەڵەی پێشمەرگەیەکم شۆردو وشکم کردەوە هەمووی کون کونو دڕاو بوو حکومەت لە شاخی ئاژداغەوە تەقەی لێکردین، یەکێك کە خەڵکی گوندەکە بوو بریندار کرا.

ئێمە بە برسێتیو تینوێتیو پێی پەتی بەرەو قادر کەرەم ڕۆیشتین لەوێ ڕۆیشتین بۆ ماڵی مامێکمو براکەم وتبووی من دەبمە پێشمەرگەو لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا دەبم، مام زۆر قسەی بۆ کردبوو زۆر هەوڵی لەگەڵدا دابوو گەڕابوویەوە بۆ قادر کەرەم بۆلای منداڵەکانیو بۆلای ئێمەو لەکاتی گەڕانەوەیدا دەستگیر کرابوو ئەنفال کرا.

منو کچێکی مامم بەپێ ڕۆیشتین بۆ بیرەکانی قادر کەرەمو بڕیارمدا گەر ئەوان دەستگیر کرابن منیش خۆم ڕادەستی حکومەت بکەم، خەڵکەکە هەمووی پەشۆکابوو دامابوو جاشەکان وتبوویان "چەکەکانتان ڕادەستمان بکەن هیچتان لێناکەین"، بەوشێوەیە نزیکەی حەڤدە کەسمان لێ ئەنفالکرا، دواتر براکەم هات بۆ ماڵی مامو وتی با ئەم سێ چوار ژنە ببەین بۆ ماڵێکی تر بۆ ئەوەی هەموویان لێرە کۆنەبنەوە، ئەوەبوو من لەترسی گرتن لە چەمچەماڵ لە ماڵی ناسراوێکمان مامەوە.

ئێمە کۆمەڵێك ئاژەڵمان هەبوو باوك هەندێکی فرۆشتو هەندێکی تریشی هێنابوو دواتر گەڕایەوە بۆلای دایکمو براکەمو ئێوارە لەکاتی خۆرئاوا بووندا ژنێکی خزممان هاتو وتی دەڵێن هەرچی خەڵکی شارۆچکەی قادر کەرەمە هەمووی ئەنفالکراون، منیش کە ئەوەم بیست خەریکبوو تێکدەچووم، بەڵام ئێوارە درەنگانێك باوکمو هەردوو براکەم بەتراکتۆرەکەی خۆمان گەڕانەوە، لەکاتی گەڕانەوەیاندا بەگوندەکانی فەقێ مستەفاو علیاواو قەرە حەسەن دا بەرەو چەمچەماڵ هاتبوونو لە ڕێگەدا سەربازەکانی بەعس تراکتۆرەکەیان گرتبوو، باوکم دانەویبووەوەو قاچی سەربازەکانی ماچ کردبوو وتبووی تەنها ئەو دوو کوڕەم مەبن هەرچی سەروەتو ماڵمە بۆ ئێوە، بە پاڕانەوەکەی باوکم ئازاد کرابوونو ماڵو تراکتۆرەکەیان بردبوو، من باوکمم زۆر خۆشدەویست وەکو هاوڕێیەك وابووین وتم گەر ئێوە ئەنفال بکرانایە منیش خۆم ڕادەستی حکومەت دەکرد، ئەوەبوو ماوەی مانگێك لە چەمچەماڵ ماینەوەو بەردەوام لە دڵەراوکێدا دەژیاین، دوای ئەو حکومەت دەستیکرد بە دابەشکردنی زەویو باوکیشم پارچەیەك زەوی وەرگرت، براکەشم ئەنفالکراو براژنم بە شەش منداڵەوە لەگەڵ ئێمەدا

دەژیا.

لەساڵی (١٩٨٩)دا دوای ئەنفال هاوسەرگیریم کردو ژنمکرد بۆ براکەم، ژنێکی ناسراوی خۆمان هاتبوو بۆلای باوکم وتبووی گورجی نەخۆشە، باوکم هات بۆلامو وتی ڕۆڵە چیتە ئەمشەو لەتاو خەفەتی تۆ نەخەوتووم وتم باوکە بابڕۆینە ناو کەلاوەکەی خۆمان، هێشتا سەریشمان نەگرتبوو، ئەوەبوو ڕۆیشتینە ناو خانووەکەوەو لەو تەپووتۆزو خۆڵەدا دانیشتین تا دوو ژوورو هەیوانێکمان دروستکرد، ژوورێك بۆ براژنەکەمو ژوورێکیش بۆخۆمان.

ڕاپەڕین بۆ ئێمە زۆر خۆشبوو لە ئۆردوگای شۆڕشدا بووین کاتێك کە کەرکوك ڕووخاو کۆڕەو ڕوویدا بوو بەڕۆژی حەشر، ماڵە دراوسێیەکمان لۆری هەبوو هاواریان کردو وتیان باجی گورجی ڕاکەن سوپای عێراقی گەیشتە ناوشار، منیش تەنها فریای ئەوە کەوتم دوو سێ پارچە جلم کۆکردەوەو ڕۆیشتینە ناو لۆرییەکەی دراوسێکەمانەوە، بەڵام هاوسەرەکەم بەهۆی میوانەکانەوە نەهاتو هەتا ئەو گەیشتە لای ئێمە لۆرییەکە لەترسی بۆردومانی ناوشار ڕۆیشتو هاوسەرەکەم بەجێما، کە گەیشتینە مەعەسکەر سەلام بۆ من زۆر ناخۆشبوو ئافرەتێکی گەنج بەبێ مێردو منداڵو بێ خواردن بوومو زۆر دەترسامو بەردەوام بیرم لای دایکمو براکەم بوو زۆر خەفەتم دەخوارد.

دوای ئەوەی کە ئێمە ڕۆیشتبووین هاوسەرەکەشم هاتبوو بەدوامانداو هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە بەدوای ئێمەدا گەڕابوو هەتا هات بۆ سەربازگەی سەلامو منی دۆزییەوە، لەوێوە بەپێ هاتینو لە ڕێگە خۆمانمان هەڵواسی بەپیکابێکداو گەیشتینە سلێمانیو لە دووڕێیانەکەی سەرچنارەوە بەپێ ڕۆیشتین بۆلای فلکەی دەستەکەو ڕۆیشتین بۆ ماڵی خزمێکمان بەهیچ شێوەیەك ئاگاداری ماڵی باوکم نەبوومو زۆر پەرۆشیان بووم.

*** حەپسە عەلی شەریف.**

من لە ساڵی (١٩٤٢) لە ناوچەی گەرمیان لە گوندی "کێلە بەرزە" هاتوومەتە دنیاوەو لە گوندی "گەرە چیا" دادەنیشتین (شەهید نەجات)ی کوڕم پێشمەرگەی کەرتی دووی (٥)ی گەرمیان بوو پێشمەرگەی پارتیزان بوو جێگری شەهید (حەمە ڕەشید) بوو.

لە کاتی ئەنفالەکەدا لەبرسا بەگاوگوڵکێ دەڕۆیشتم لە کاتێکدا کە ئێمە یەکەم دەوڵەمەندی گەرمیان بووین، کوڕەکەم دۆینەی دۆزییەوە لە خۆشیاندا خەریکبوو شا گەشکە بێت، ئەوبوو ڕامانکرد بۆ کەلارو بۆ ماوەی حەوت مانگ لە کەلار حەشاریان داین، دواتر (کاك ساڵح) کە خوشکەزای هاوسەرەکەم بوو بردینی بۆ سلێمانیو بۆ گەڕەکی ولووبە.

ئێمە ماڵێکی زۆر دەوڵەمەند بووینو نزیکەی هەژدە مانگای گوانکردو پازدە مانگاو گوێرەکەو هەشت نوێن سێ گوێرەکەمان هەبوو هەموویان بەجێهێشتنو هەموویان پەرتەوازە بوونو دواتر لە گوندی دەرەوار گایەلەکەمان هێنا، بەڵام بۆمان دەرنەچوو. لەپێناو ئەوەی لەو کارەساتە ڕزگارمان بێت گایەلەکەمان کردە قوربانی.

کە گەیشتینە ولووبە خانوویەکمان کڕیو نەمانوێرا بیخەینە سەر خۆمانو نەماندەوێرا بڕۆین بۆ بازاڕو بەردەوام لەترسو لەرزدا دەژیاین، ڕۆژێکیان ڕۆیشتین بۆ بازاڕ دوو ژن هاوسەرەکەمیان بانگ کردبوو وتبوویان حاجی نەجم توو ئەو خوایەی نوێژی بۆ دەکەویت تۆ مام جەلالیت یاخود برای ئەویت؟، ئێمەش لەو قسەیە زۆر ترساین.

لەکاتی کۆڕەوەکەدا لە ولووبەوە تا دوو ئاوی ئێران ڕۆیشتینو منو کەسوکارەکەمو حاجی یاسینو هەندێك برازای خۆم بووینو بەپێ کەوتینەڕێو تا زەڵم ڕۆیشتینو هەر خەڵك بوو لەتاو برسێتی لەسەر ئەو زەوییە کەوتبوو دەیزریکاند منیش پێنج کیلۆ کشمیشم پێبوو هەموویم دا بە هەژارو برسییەکانو کەسمان دەممان تێوە نەدا، هەروەها کە چێشتیشم لێدەنا بەشەکەی خۆمم دەدا بە ئەوان.

لە زەڵمەوە سواری تراکتۆر بووینو هەتا هەڵەبجەی شەهید نەوەستاینو دوو سێ ماڵ بووین لەوێ لە خانوویەکی چۆڵدا ماینەوە، شەو کچەکەم ناوساجی دروستکردو تەنەکەو نیوێك ئاردمان پێبوو هەر هەمان شەو ئەویشمان کرد بە نان بۆ ئەوەی دابەشی بکەین بەسەر خەڵکەکەدا.

لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا شەهید نەجاتی کوڕم لەگەڵ شەهید حەمە ڕەشیدا بوو فیشەك بەر شانی کەوتبوو لەپشتەوە دەرچووبوو منیش ئاگاداری ئەوە نەبووم کە کوڕەکەم بریندارە، (کاك عەدنان) هاتو وتی نەجاتی کوڕت بریندارەو ناردوویانە بۆ تاران بۆ ئەوەی چارەسەری بکەن، پاش شەش حەوت ڕۆژ کاتێك کە هۆشی هاتبووەوە وتبووی پێشمەرگەکان کوان؟، وتبوویان تۆ بریندارێتو لە نەخۆشخانەی تارانیت، کە وایان وتبوو بەو برینداریيەوە هەستابووەوەو وتبووی من دەبێت بگەڕێمەوە بۆلای پێشمەرگەکانمو ماڵی باوکم هەرچۆنێك بووبوو گەڕابووەوەو لەکاتی گەڕانەوەیدا ئێمەی نەبینیبوو، بەڵام ئامۆزاکانی بینیبوو (٢٠٠) دیناری خستبوویە ناو دەستەسڕێکەوەو بۆی ناردبووم بۆ ئەوەی باوەڕ بکەم کە هێشتا لە ژیاندا ماوە.

ئێمە بەپێ ڕۆیشتینو بۆ ماوەی شەش حەوت ڕۆژ ئینجا ڕۆیشتینە ناو خاکی ئێرانەوە بۆ ئۆردوگای کانی دینارو پاوەو جوانڕۆو مامۆستا کاوە کە کادری گەرمیان بوو خەڵکی کەلار بوو هاتو وتی خەمت نەبێت کوڕەکەت سەلامەتە ژیانمان زۆر سەخت بوو هەر سێ ماڵو لەیەك خەیمەدا بووینو لەسەر ئەو زەوییە ساردو ڕەقەدا دەخەوتینو لەبەر قورسی کارەساتەکە کەس بیری لەلای سەرماو برسێتی نەبوو، دوای دە ڕۆژ خەیمەیەکی تریان داینێ، من خۆم پارەم پێبوو منداڵەکانم دەڕۆیشتن خواردن بکڕن، بەڵام خواردن دەست نەدەکەوت بیکڕن، ژنێکی ئامۆزام هەبوو وتی هەموو خواردنەکانتان لە ڕێگە بەخشییەوە کەچی ئێستە خواردن نییە خۆمان بیخۆین.

دوای مانگێك مانەوەمان بە ئۆتۆمبێل لە سەرتەکەوە گەڕاینەوە بۆ دەربەندیخانو دواتر ڕۆیشتین بۆ سەید سادقو خەیمەیەکمان هەبوو هەڵمانداو چوار شەو لەسەر سنوور ماینەوە، ئەوێ پڕ بوو لە دوو پشك یەکێك چووبووە ناو کراسەکەمەوە، بەڵام بەدەست گرتمو فڕێمداو نەمهێشت پێمەوە بدات.

كە لە شەڕی براكوژی گەڕاینەوە لەبەرئەوەی كەسوكاری پێشمەرگە بووین زۆر داماو بووین جاری وا هەبوو پازدە ڕۆژ لە ماڵاندا دەیانشاردینەوە، كوڕەكەشم لە شەڕی نێوان یەكێتی و پارتیدا لە شاخی سەفین لە كاتی شەڕدا شەهید كرا، من هەموو ژیانم لەدەردەسەری و ڕاكردندا بەسەر بردووەو لەكاتی كۆڕەكەو ئەنفال و ٣١ی ئابدا ماڵمان تالانكراوەو هاتوومەتە سەر ساجی عەلی و لەسەر گوێنی دەخوتین.

*** ڕووناك محەمەد مەردان.**

كەمن منداڵ بووم ئەو نەتەوانەی لە كەركوكدا دەژیان كوردو توركمان بوو زۆر بەكەمی عەرەبمان دەبینی، هەتا ئەگەر هارییەكمان بكردایە بە عەرەب دەیانترساندین، ئەو ڕۆژگارە پێش جەژنەكان عەرەب دەهاتن پیاوی پیر پیر ڕەبابەیان لێدەداو پارەیان كۆ دەكردەوە، یان پشقلیان دەفرۆشت تەنها ئەوەندە عەرەبمان بینیووە لە كەركوكدا، بەڵام كوردو توركمان هەبوو لەپێشدا كەركوك دوو گەڕەكی گەورەبوو ئیمام قاسم ئەمبەر خاسە بوو گەڕەكی كوردەكان بوو، قۆرییەش ئەوبەر خاسەبوو گەڕەكی توركمانەكان بوو، شۆڕیجەو گەڕەكەكانی تر خانووی بچووك بچووك بوون و لە قوڕ دروستكرابوون، هۆكاری ئەوەی باوكم لە شەریكەی نەوت كاری دەكرد، هەر شەریكە خانووی دروستكردبوو بۆ فەرمانبەرەكانی خۆی لە پەنای گەرماوەكەی (شێخ قابیل تالەبانی)دا لە دیوی ئەو دیویشەوە بەرامبەر ماڵی شەوكەت ڕەشیدی هونەرمەن بووین، ئەو ڕۆژگارە دراوسێیەتیمان زۆر خۆشبوو زۆر تێكەڵبووین لەگەڵ ماڵە كوردەكاندا هاتووچۆی یەكتریمان دەكرد، بەڵام كوردو توركمان هەر ناخۆشی و دووبەرەكی هەبووە لەنێوانیاندا، كاتێك یادی ساڵانەی سەركەوتنی شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ بوو كوردو توركمان لەو خۆپیشاندانەدا كارەساتێكی گەورەیان تووشبوو توركمانەكان كەوتنە پەلاماردانی كوردەكان كوردەكانیش بۆیان هەڵگەڕانەوە چەند توركمانێكیان كوشت.

لە ساڵی (١٩٦٣)دا كە بەعس هاتە سەر حوكم دووبارە توركمانەكان كەوتنەوە پەلاماردانی كوردەكان، بۆ نموونە پەیكەری كەسایەتییەكی توركمان دروستكراوە لەبەردەم مەركەز عامی كەركوكدا نازانم ناوی چییە؟ بەڵام ئەو پەیكەرە بۆ دژایەتیكردنی نێوان كوردو توركمان دانراوە، هەروەها كە (سەدام)یش هاتە سەر حوكم ئەو پەیكەرەی هێشتەوە بۆ ئەوەی دوژمنایەتی بەینی كوردو توركمان هەر درێژە بكێشێت، تا ئەمڕۆش ئەو پەیكەرە ماوەو هێمای شەڕو ئاژاوەی نێوان كوردو توركمانە.

ماڵی خاڵوانم توركمانن لەبەر ئەو هۆكارەش زۆر كۆك نەبووین ئێمە كوردین و ئەوان توركمانن، دایكم خەڵكی گەڕەكی قۆرییەیەو باوكم خەڵكی گەڕەكی ئیمام قاسمە، دایكم توركمانە پێیاندەوتن تۆرانی نەیدەوێرا لە ئیمام قاسم سەر بهێنێتە دەرەوە هەموو كوردەكان پەلاماریان دەدا، بەڵام مامێكم لە ڕێكخستنی پارتی دابوو لە بەغداد گیرابوو زەمانی حەرەس قەومییەكان بەنزینیان كردبوو بە چوار دەوریاندا بیانسووتێنن لە هەمان شەودا كە ئینقیلابەكە كرا بەسەریاندا ئەوان ڕزگاریان بوو دواتر بەربوون.

لە كەركوكدا ئاشی ساوەریان هەبوو كە بە ئاشی دەوڵەت ناسراوە لە ڕۆژگاری زووەوە ئەو ئاشەمان هەبووە، منداڵیمان زۆر خۆشبوو منداڵان شوێن یەكتری دەكەوتین بەدەم ڕاكردنەوە بە كۆڵانە تەسك و قوراوی و پیس و پۆخڵەكانی شاری كەركوكدا دەمانوت "بژی مەلا مستەفای بارزان"، ئەمە لە ساڵی شەستەكاندا بووە دراوسێیەتی بەینی ئەرمەنی و مەسیحی زۆر خۆشبوو بەیەكەوە زۆر خۆش دەژیاین لە ساڵی (١٩٦٣)دا شێخ مارف و كۆمەڵێك خەڵكیان لە سێدارەدا ئەوانە شیوعی بوون، خوێندكاری ناوەندی بووم مامۆستایەكمان هەبوو فیزیای پێدەوتین ناوی (مامۆستا شێرزاد) بوو لەسەر ئەوەی شیوعی بوو گیرا لەگەڵ ست قومرییەی خوشكیدا لە بەندینخانەدا زۆریان ئەشكەنجەدابوون هەتا ئوتوویان هێنابوو بەپشتی ست قومرییەدا كەمئەندامیان كردبوو، بەهەمانشێوە مامۆستا شێرزادیش هەموو جەستەی شێوابوو ئەم خێزانە بەڕێزە خەڵكی سلێمانی بوون، بەڵام لە كەركوك دادەنیشتن، هەتا لە شاری كەركوك لە ساڵی (١٩٦٥) ئاژاوە هەبوو لەنێوان جەلالی و مەلایی دا.

من هەر لە منداڵییەوە حەزم لە كوردیەاتی بوو هەر لەبەرئەوەش بوو لە پۆلی پێنجی سەرەتاییەوە هۆنراوەم بۆ پێشمەرگە دەنووسی، وشەی پێشمەرگەم زۆر لەلا گەورە بوو لە كاتێكدا هێشتا پێشمەرگەم لە بنەماڵەكەماندا نەبینیبوو، تەنها مامم نەبێت كە پێشمەرگە بوو، بەڵام نەمدەزانی پێشمەرگە چییە؟، ڕێباز مانای چیی؟، تەنها ئەوەندەم دەزانی كە (مەلا مستەفا) سەرۆكی كوردە.

وردە وردە هەستی نیشتیمانپەروەریم گەشەی كرد، ئێمە خۆمان لە كەركوك لە گەڕەكی "ڕەحیماوا" دادەنیشتین و لە پەیمانگای فنی كەركوك بووم هەر كە تەواوم كرد هاوسەرگیریم لەگەڵ (ئازادی شێخ غەریب) كرد كە خەڵكی سلێمانییە، ئەوەبوو لە ساڵی (١٩٨٣)دا ڕۆیشتین بۆ شاخ كاتێك كە ڕۆیشتم بۆ ئەوێ هیچ شارەزاییەكم لە ئیشی گونددا نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی حەزم لە شەركردن و تێكۆشان بوو هەر كە گەیشتمە ئەوێ شەرواڵم لەپێكرد، زۆریش حەزم دەكرد چەك هەڵبگرم تەنها لەبەر ئەوەی هیچ ژنێكی تر نەبوو منیش نەمتوانی چەك هەڵبگرم و بەردەوام یارمەتی برا پێشمەرگەكانم دەدا، بۆ ماوەیەكی زۆریش لە شارباژێر ماینەوە.

*** یاداشتی عالیە عەبدولكەریم مودەرس:**

".. باوكم ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و كەلوپەلی ماڵ كۆ ئەكەنەوەو بارئەكا بۆ كەركوك و لەوێ لە گەڕەكی (بەرتەكییە) لە نزیكی تەكییەی تاڵەبانییەوە خانوویەك بە كرێ ئەگرێ و بەم جۆرە ماڵمان ئەچێتە كەركوك.

حاجی شێخ جەمیل خۆی و سەدرییە خانی خێزانی و شێخ عەلی و شێخ عەبدولرەحمانی كوڕی، خوا لە هەموویان خۆش بێ، قەدرو حورمەتێكی زۆری باوكم ئەگرن و كوڕەكانی دەست ئەكەن بە خوێندن لای فەقێ و فەقێی تریشی لە تەكییە بۆ ڕائەگرن و زۆریش لە مەلا گەنجەكانی كەركوك

دێنە لای بۆ خوێندنو ئیتر تا لە کەرکوک بوو هەر خەریکی دەرز وتنەوە بە فەقێو نووسینی کتێبی ئایینیو ئەدەبی بوو. پاش بەربوونی کاکە فاتیحمو کاکە حەمەیشم لە زیندان لەگەڵ ئەوانیش شەرحی دیوانی مەولەوی ئەنووسیٖ.

کورەکانی تری حاجی شێخ جەمیل (شێخ نووری)و (شێخ عیرفان)یش زۆر ڕۆژ دێن لە ژوورەکەیدا لە تەکییە لای باوکم دائەنیشن، ئەو کاتە ئەوان لە کۆلێژی حقووق لە زانکۆی بەغدا ئەیانخوێند.

کچەکانی حاجی شێخ جەمیلیش بوون بە دەستە خوشکی منو عەتییەی خوشکمو ئیتر بەم جۆرە تا لە کەرکوک بووین زۆر باشو خۆشو بە گوێرەی دڵی خۆمان ئەژیاین.

حاجی شێخ جەمیلو سەدرییە خانی خێزانی چوار کچیان هەبوو دوانیان لە تەمەنی مندا بوونو یەکێکیشیان منال بوو، کچێکی گەورەشی هەبوو شووی کردبوو بە شێخ عەتای تاڵەبانی کە خزمی خۆیان بوو، منو دوو کچەکەی حاجی جەمیل کە لە تەمەنی خۆما بوون، بووین بە خوشکی یەکتریو هاوڕێی گیانی بە گیانی، کچە بچووکەکەشیان بوو بە هاوڕێی عەتییەی خوشکم، ئەم کۆمەڵە بێ یەک نەمان ئەکرا دووربکەوینەوە، سەدرییە خانی دایکیشیان تا بڵێی ئافرەتێکی باشو وریاو تێگەیشتوو بوو، قەدری دایکیشمی زۆر ئەگرتو دایکیشم گەلێ جار ئەچووە سەرلێدانی.

بەم جۆرە باوکم لە تەکییەی تاڵەبانی دامەزراو چەند فەقێیان لە تەکییە بۆ ڕاگرت، هەموو ڕۆژێکیش کۆمەڵێ مەلاو فەقێ لە مزگەوتەکانی کەرکوکەوە ئەهاتن بۆ لای بۆ دەرز خوێندنو، تەکییەی تاڵەبانی بوو بە خوێندنگایەکی بەرچاوی ئایینی لە کەرکوکو باوکم وردە وردە پەیوەندی دۆستایەتیو هاتووچۆی لەگەڵ بەشێکی زۆری مەلاکانی کەرکوک پێکەوەناو سەردانی یەکترییان ئەکرد، بەشی زۆری کاتی باوکم بە دەرز وتنەوەو دانانی کتێبی ئایینیو ئەدەبییەوە بەسەر ئەبرد.

هەموو هەفتەیەک چەند جار حەلقەی زیکر بۆ پیاوانو ژنان، بە جیا لە یەک لە تەکییە ئەبەسترا، سەدرییە خان بۆ خۆی سەر حەلقەی زیکری ژنان بوو، لەگەڵ زیکرەکەدا دەفژەنی باشیش دەفیان لێ ئەداو زیکرەکەیان ئەوەندەی تر گەرم ئەکرد، ئافرەتێکی تریش کە خوشکەزای حاجی شێخ جەمیل بوو و ناوی فەریدە خان بوو و مێردەکەی کۆچی دوایی کردبوو، ئەویش لە حەلقەی زیکرەکەدا بەشداریی ئەکردو ئەگەر سەدرییە خان لەبەر خەریک بوونی بە کارێکی ترەوە نەهاتبوایە بۆ حەلقەی زیکرەکەی، فەریدە خان ئەبوو بە سەر حەلقە، فەریدە خانیش هەروەها ئافرەتێکی ڕێکوپێکو تێگەیشتوو بوو، لەگەڵ منیش بوو بوو بە دۆستو برادەرو بەوەوە لەگەڵ کچەکانی شێخ جەمیل بوو بووین بە چوار هاوڕێ.

گەلێک لە ژنە کوردەکانی بەرتەکییەو کچەکانیانو ژنانو کچانی کوردی گەڕەکەکانی کەرکوکو هەروەها بە شێکیش ژنو کچی تورکمان ئەهاتن بۆ حەلقەی زیکرو بەشداریان تیا ئەکرد، منیش وەک کچە کوردێکی بەر تەکییە، وردە وردە کەوتمە بەشداری کردن لەو حەلقانەی زیکرداو لەو ڕێگایەوە دۆستایەتیو ناسیاویم لەگەڵ زۆر لە ئافرەتە کوردەکانو بە تایبەتی ئافرەتەکانی بەر تەکییە پەیدا کرد، ئیتر دوای تەواو بوونی زیکرەکە زۆر جار هەر لەوێدا پێکەوە ئەماینەوەو دەستمان ئەکرد بە قسەی خۆش بۆ یەکو منیش زۆر جار نوکتەکانی (ڕشتەی مراوی)ی مامۆستای خوالێخۆش بوو عەلائەددین سەجادیم بۆ ئەگێڕانەوەو ئەمخوێندنەوە، هەروەها ئاشنایی و خوشکایەتیم لەگەڵ زۆر لە ئافرەتانی (ئیمام قاسم)و (شۆریجە)و گەڕەکە کوردەکانی تری کەرکوک دامەزراند.

وردە وردە لە قسەی خۆشو نوکتە گێڕانەوەوە ئەچووینە بابەتی تایبەتی ئافرەتانو باسی مافەکانی ئافرەتانیشم بۆ ئەکردنو ئەوانیش باش گوێیان بۆ شل ئەکردمو لە بارودۆخی ژیانی ئافرەتان ئەدواین، ئیتر ئەوانیش خۆشەویستی من ئەچوو بە دڵیاناو قسەکانمیان بە دڵ وەرئەگرت.

ئێوارانی دەوروپشتی بەرتەکییە زۆر خۆشە، لەو دیو گەڕەکی بەرتەکییە گۆڕستانێکی گەورە هەبوو لە پێش هاتنی بەهارەوە سەوز ئەبێ، زۆر جار کۆمەڵ کۆمەڵ کچانی بەرتەکییە ئەچووین بۆ ئەو دەوروبەرەو دائەنیشتینو قسەی خۆشمان بۆ یەک ئەکرد، منیش لە بارەی ئافرەتو مافەکانی ئافرەتەوە قسەم بۆ ئەکردنو ئەوانیش بە دڵو لە دەروونەوە گوێیان بۆ ئەگرتم.

ئەو شوێنە سەوزو خۆشانەی دەوروبەری بەرتەکییە سەیرانگای کچانی گەڕەک بوون، لەوێ کۆئەبووینەوەو تەماشای دیمەنی جوانی سروشتمان ئەکردو دڵمان پێی ئەکرایەوە، من زۆر جار لەو سەیرانانەو لەو دانیشتنانەدا شیعری جوانی کوردیی وەک شیعرەکانی مامۆستای ڕەحمەتی (قانیع)م بۆ ئەخوێندنەوە کە لە زۆریانا باسی ئافرەتی کوردو مافەکانی ئافرەتانی کورد ئەکا، ئەوانیش لەو بابەتانەوە وردە وردە چاویان ئەکرایەوەو زۆریان پێ خۆش ئەبوو، هەروەها شیعری تری شاعیرانی نیشتیمان پەروەرم بۆ ئەخوێندنەوە کە باسی کوردو کوردستانو کوردایەتییان تیا ئەکراو داکۆکییان لە مافەکانی هەژاران ئەکرد.

ناو بەناو لەگەڵیان کۆ ئەبووەوەو قسەم بۆ ئەکردنو باسی مافەکانی ئافرەتانم بۆ ئەکردنو تێم ئەگەیاندن کە ئافرەت نیوەی کۆمەڵەو ئەویش وەک پیاو هەموو مافێکی هەیەو ئەبێ بە ئارەزووی ئازادی خۆی چارەنووسی لە ژیانا بۆ دیاری بکرێ و، قسەکردنمان لەم سنوورەیش تێدەپەڕیو باسی جیاجیای سیاسیو کۆمەڵایەتیشم بۆ ئەکردنو بەم جۆرە گیانێکی نیشتیمان پەروەرانەیان لەناو پەیدا ئەبوو، کە بابەتێکی نیشتیمانییش ئەهاتە ناوەوە ئیمزام بۆی پێ ئەکردن.

ئەو کچە دۆستو برادەرانەیشم زۆر دڵسۆز بوون بۆ من زۆر جار پێکەوە ئەچووین بۆ دەورو پشتی گەڕەکەکانی خۆمان بۆ گەڕانو کات بەسەر بردن، ئیتر بەم جۆرە من زۆر دڵسۆزانە لەگەڵیان بوومو ئەوانیش منیان زۆر خۆش ئەویست.

لە ئەنجامی ئەو پەیوەندییە نوێیانەی کەرکوکمەوە وردە وردە سلێمانیم لەبیر چووەوە ئەگەر چی لەگەڵ ئەوەیشدا هاتنمان بۆ کەرکوکو بەجێهێشتنی سلێمانیم لەکاتی خۆیدا زۆر پێ

ناخۆش بوو، بەڵام هاوڕێ تازەکانی کەرکوکم وایان لێکردم بە زووترین کات هۆگریان بووم‌و ئەوانیش هۆگری من بوون. بەم چەشنە پەیوەندیمان تا ماوەیەك بەم جۆرە مایەوە، ئینجا ڕوویـیەکی تـازەی وەرگـرت کە ئەویش هەستی نیشتمان پـەروەری‌و داکـۆکـی کـردن بـوو لـە مافەکانی گـەل‌و ماڤ ئافرەتان‌و بابەتی مرۆڤایەتی‌و نەتەوەیی.

هەر لەو ماوەیەدا پەیوەندیم بە کۆمەڵەی ماڤ ئافرەتانی لقی کەرکوکیشەوە پەیدا کردو ئاگاداری بووم‌و ئیتر ئەمانیش لە هەموو دەنگوباسێکی کۆمەڵە ئاگاداریان ئەکردم، بەم جۆرە ئەتوانم بڵێم ناچار کردنمان بۆ گواستنەوە لە سلێمانییەوە بۆ کەرکوك بە پێچەوانەی خواست‌و ئارەزووی دووژمنی لێ دەرچوو و زۆر بۆ ئێمە سوودبەخش بوو، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتانی ئەم شارە بە وورياييەوە ئارەزوومەندی هاتنە ناو کۆمەڵەی نهێنیی داکۆکی لە ماڤ ئافرەتان بوون چونکە من بـاوەڕی زۆرم بـەوان هەبوو و ئەوانیش هـەروا باوەڕیان بە من هەبوو.

ئەو بەرنامەی کارەی لە کۆمەڵی سەرەکیی داکۆکی کردن لە ماڤ ئافرەتانەوە لە بەغداوە ئەهات بۆ لقی کەرکوك بە منیش ئەگەیشت‌و منیش لای خۆمەوە ئەم گەیاند بە بەشێك لە ئەندامانی لقی کەرکوك کە پەیوەندییان بە منەوە هەبوو، من کۆمەڵ کۆمەڵ دابەشم کردبوون.

یەکێك لەو کچە ئەندامە سەرەکییانەی لقی کەرکوك کە یەکەم جار پەیوەندی بە منەوە کرد، فەهمییە خانی کچی حاکم عەبدولرەحمان سەعید بوو لەگەڵ کچێکی تریش کە ناوی جەمیلە خانی یامولکی بوو هەردووکیانماڵیان لە کەرکوك بوو، جەمیلە خان خێزانی یەکێك بوو لە شێخە بەرزنجییەکان، پەیوەندی کردنی ئەو دووانە بە منەوە یەکەمین پەیوەندی بوو لە ئاستی سەرەوە بە منەوە کرا.

دوای ئەوانیش لە بەغداوە پەیوەندییان پێوە کردم‌و لە هەموو شتێکی پەیوەندی دار بە کۆمەڵەوە ئاگاداریان ئەکردم، ئیتر منیش لەسەر ئەو ڕێ‌و شوێنە بەڕێوە ئەڕۆیشتین لەناو کۆمەڵەکەماندا، کە لە بەغداوە بۆیان دائەنێن.

من لە ماڵی کچێك لە کچەکانی یەکێك لە کۆمەڵەکان کە پێکەوەم نابوون‌و قسەم بۆ ئەکردن‌و بەڕێوەم ئەبردن ئەو کچە هـاوڕێـی شەخسیم بـوو، ماڵیان لـە مـاڵمانـەوە نزیك بوو، ژوورێکم کردبوو بە قوتابخانە‌و کچەکانم لەو ژوورەدا فێری خوێندەواری ئەکردو تەختەیەکی ڕەشم بە دیـواری ژوورەکەدا هەڵواسیبوو دەرزەکانم لەسەری بۆ ئەنووسینەوە، ئەو کچە ناوی نەزیرە محەمەد بوو، ماڵیان ماڵێکی کوردی خۆمانـەی بـەڕێـز بـوو، کچانی کۆمـەڵـەکە لـەو مـاڵـەدا کۆ ئەبووینەوەو دەرزم پێ ئەوتن تا وایـان لێ هات بە باشی فێری نووسینم کردن کە ئـەوە ئەو کاتە لە قوتابخانەکانی حکوومەتدا لە کەرکوك نەبوو، لە چوارچێوەی دەرزەکاندا شیعری نیشتمانییشم پێ ئەوتن‌و پێم لەبەر ئەکردن‌و بۆم ئەنووسینەوە وەك شیعرەکانی کـامـەران موکری‌و قانع‌و مامۆستا گۆران‌و کاکەی فەلاح.

ئـەم شیعرانەم لـەنـاو ژنـانـی گەرەکیشدا ئـەخـوێـنـدەوە کە ئەندامی کۆمەڵەیش نـەبـوون، هـەنـدێ لـەو ئافرەتانە لەو شیعرانە ئەترسان کە بۆنی سیاسەتیان لێ ئەهات، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا هـەر ڕێـزی زۆریـان لـێ ئەگرتم‌و بە باشی گوێیان بۆ شیعرەکان شل ئەکردو بڕاوایـان بە ناوەڕۆکی شیعرەکان هەبوو.

باوکم بەم مەسەلەی کۆمەڵ دروست کردن بۆ ژنانی گەڕەك‌و شیعر بۆ خوێندنەوەیان و فێرە نووسین‌و خوێندنەوەیەکی کچەکانیانی زانی، وا دیار بوو کەسانێك دابوویان بە گوێیاو پێیان وتبوو کچەکەت کچانی گـەڕەك فێرە سیاسەت ئەکاو دەرزیـان پێ ئەلێ‌و فێری نووسین‌و خوێندنەوەیان ئەکات، باوکم هەڕەشەی لێکردم کە ئەبێ دەست لەمە هەڵبگرم، منیش لەوە ئەترسام کە باوکم زۆر دڵی لێم عاجز ببێ چونکە باوکم لەوە ئەترسا کە لە کەرکوکیش وەك لە سلێمانی، تووشی ناڕەحەتی ببێ‌و ناچاری بارکردن لە کەرکوکیش ببێ، چونکە ئەمزانی دوژمنانی گەل بە هیچ جۆرێ نایانەوێ ئافرەتان چاویان بکرێتەوەو فێری خوێندنەوەو نووسین بن، چونکە ئەوە وایـان لێ ئەکا باشتر هەست بە بارودۆخی ناخۆشی ژیانی خۆیان بکەن‌و بتوانن لەسەر ماڤ ڕەوای زەوت کراوی خۆیان بێنە دەنگ.

بـەڵام من لەگەڵ ئەو کۆسپانەیشا کە ئەهاتنە ڕێم سڵم لە هیچ نەئەکردەوە و بەردەوام بووم لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵانی ئافرەتان‌و فێرە نووسین‌و خوێندنەوە کردنی کچاناو بەم هەڵوێستە ڕەنج‌و تەقەلاکانی دوژمنانی ئازادیی ئافرەتانمان ئەدا بە باو بۆیە ئیتر هەمیشەو ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر پێوەندیم لەگەڵ ئافرەتان هەبوو و زیاتر لە دەرزوتن بە کچاندا گەرم بووم.

عەتییەی خوشکم هاتە ناو ڕیزی ئەو کچانەوە کە ئەیانخوێندو لـەگـەڵ کچانی هـاوڕێ‌و هاوتەمەنی خۆیا کەوتە چالاکی نواندن‌و خۆیشی چالاکانە خۆی فێری خوێندنەوەو نووسین کردو کچانی تریشی فێر ئەکرد، ژنان‌و کچانی گەڕەکیش کە ئەم چالاکییەی ئێمەیان ئەدی خۆیشیان زیاتر گەرم ئەبوون‌و بە دل گەرمییەوە ئەهاتنە مەیدانەوە.

بارودۆخی وڵاتیش کە کەمێك بەرەو ئارامی‌و کەم بوونەوەی زەغتی حکوومەت ئەڕۆیشت، ئێمەیش لە چالاکی نواندنی خۆمانا ئەمانتوانی لـە کـاروبـاری سیاسەت‌و نیشتمان پەروەرییش بدوێین‌و چاونەترسانەتر بجوولێینەوە.

لەم سەردەمەدا ماڵە جووتیارێکی زۆر لە لادێکانی هەولێرەوە هەڵاتبوون‌و هاتبوونە کەرکوك بە دوای کاردا ئەگەڕان، ئەمانە لەتاو زوڵم‌و زۆری میری‌و دەرەبەگەکانی ئاغایان هەڵاتبوون، کەرەستەیەکی خاو بوون بۆ تێکۆشان لەناویاناو بۆ وریا کردنەوەیان لەبارەی گیروگرفتەکانی ژیانی ڕۆژانەیانەوە، ئێمەیش چەندین کـەسـمـان دەستنیشان کـرد بـۆ چوونە ناویان‌و پێوەندی کردن پێیانەوەو قسە بۆ کردنیان.

من یەکێك بووم لەوانەی پێوەندییان ئەکرد بەو ئافرەتانەوە، بەبێ ئەوەی کەسیان لێ بناسم، ئەچووم بۆ ماڵەکانیان‌و خۆم ئەکرد بە دۆست‌و ناسیاویان‌و قسەم لە بارەی چۆنییەتی ژیـانـیـان‌و ڕێـز گرتن لـە ئـافـرەت‌و خـێـزانـەوە بـۆ ئـەکـردن‌و تێم ئەگەیاندن کە پێویستە هـەوڵ بدەین بۆ نەهێشتنی چەوساندنەوەی ئافرەتان کە بەپێی یاسای ڕاستی ئەرزو

ئاسمان نابێ ئافرەت بچەوسێنرێتەوەو دەبێ فێری خوێندەواری بکرێ‌و هەموو مافێکی ئابووری‌و کۆمەڵایەتیی خۆی وەربگرێ‌و چارەنووسی بە ویستی خۆی دیاری بکا، نەك وەك ئاژەڵ بکڕرێ‌و بفرۆشرێ، بۆیە ئەو ئافرەتانەی ئەچوومە ناویان باوەڕێکی زۆریان پێم پەیدا کردبوو و ژمارەیەکی زۆریان ئەهاتنە ناو کۆمەڵەی نهێنی ئافرەتانەوەو هەموو جارێ ئامادەی کۆبوونەوەکانی ئەو کۆمەڵانە ئەبوون، بەڵام ئەمانە چونکە شارەزای ئەو قانوونانەی کێشەی ناو کۆمەڵ نەبوون وایان ئەزانی لە ماوەیەکی نزیکا ئاواتەکانیان دێنە دی، من‌و هاوڕێکانیشم ڕێگای تێگەیاندنی ڕاستیمان لەم ڕووەوە کردبوو بە ئەرکی لەمەولا کە باشتر لە ژیان بگەن‌و بزانن ئاواتەکانی گەل چۆن دێنە دی، ئێستا کە زیاتر لە پەنجا ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژگارەدا تێپەڕیوەو هێشتا لە سەرەتایی ڕێداین، ئەزانین سەرکەوتنی یەکجاری گەل قۆناغگەلێکی زۆری ماوەو ئەبێ ئێمە وەچەی پاشماوەیشمان هەر چالاکانە لە کۆڕی تێکۆشانا بمێنێتەوە، بەڵام هەر چۆن بێ سەرکەوتنی خواستی گەل هەر وەك ڕاستییەك ئەمێنێتەوەو ئەبێ هەر بێتەدی بە تێکۆشانی کۆڵنەدەرانەی شان بەشانی یەکی هەموو ڕەگەزێکی هوشیاری ئەم گەلە بە پیاو و ئافرەتییەوە. ئەو سەردەمە گەنج بووم ئەمتوانی خۆم دەرباز بکەم، ئێستا توانای هیچم نەماوە، ئەگەر کۆسپێکی وەك ئەوەی ئەو ڕۆژەم بێتە ڕێ بە هیچ کلۆجێك خۆم پێ دەرباز ناکرێ.

کۆمەڵی وام هەبوو ژنی گەورە گەورەی تیا بوو لە تەمەنی دایکم گەورە تر بوون، یەکێك لەو دایکە بەڕێزانە دایکی کاك عوسمان خۆشناو بوو کە پێشتر لە باسی دادگایی کردنی زیندانە سیاسییەکانا ناوی کاك عوسمانی کوڕیم هێنا، ئەو ئەو ژنە گەورەیە بوو منیش منداڵێك بووم تازە پێ ئەگەیشتم قسەم بۆ ئەو و هاوڕێکانی ناو کۆمەڵەکەیان ئەکرد.

زۆریان بەلایانەوە سەیر بوو منداڵێکی تازە هەڵچووی وەك من قسەیان بۆ بکاو باوەڕی پێ بکەن؟ بۆیە ئەوانیش لەناو برادەرانا وتبوویان ئەو منداڵە گچکەیە چییە ناردووتانە قسە بۆ ئێمە بکا؟ لە وەختێکا ئێمە جاران قسەمان لەگەڵ ئەو ئەکرد ئێمە دەنگو باسەمان ئەزانی لە کاتێکا کە لەوانەیە دایکی ئەو شووی نەکردبێ، جا برادەرانیش ووتبوویان قسەکانی ڕاست بوون یان بە پێچەوانەوە بوون؟ ئەمانیش وتبوویان قسەکانی ڕاست بوون، بەڵام ئێمە حەزمان ئەکرد ئافرەتێکی بەتەمەن بهاتایە بۆ لامان.

ڕۆژی زۆر ساردو باران‌و قوڕو چڵپاوی وا ئەچوومە دەرەوە بە دزیی دایکمەوە بۆ لای کۆمەڵەکانمان یان لە گەڕەکی شۆڕیجە یان لە تەپەی مەلا عەبدوڵلا یان لە پریادی یان لە ئیمام قاسم یان قەڵا یان ڕەحیماوا یان گەڕەکی قۆرییە، هەموو گیانم تەڕ ئەبوو لە قوڕو لیتە شڵپەی گیانم ئەهات لە تەڕیداو هەڵئەکێشرا بە ئاواو چۆڕاوەگەی ئاو بە سەرو گیانما ئەهاتە خوار، ئەچەقیمە ناو قوڕو سەگ پێم ئەوەڕین ئەکەوتمە حاڵێکی شڕەوە، جا ئەگەر ناسیاوێك بەو جۆرە بیدیمایە چی پێ ئەوتم، چۆن سەیری ئەکردم، جاری وا بوو دوو سێ سەعاتم پێ ئەچوو تا ئەهاتمەوە لە دڵی خۆما ئەموت ئەی خوایە ئێستا دایکم چیم پێ ئەڵێ؟ خۆ ئەر چیم پێ بڵێ ماف خۆیەتی، یان ناسیاوێك لەماڵمانا بێت چیم پێ ئەڵێ‌و چۆن سەیرم ئەکا؟ یان باوکم بزانێ پێم چی بڵێم؟ ئیتر بەم جۆرە سێ‌و دووی دڵی خۆم ئەکرد.

ئەو ساڵە لە ساڵەکانی شۆڕشی جەزائیر بوو، کە باسی بەسەر زمانی هەموانەوە بوو، جەمیلە بووزیاف‌و جەمیلە بووحێرەد لەلایەن حکوومەتی فەرەنساوە گیرابوون‌و حوکم درابوون بە سەریانا بەخنکاندن، بێ گومان شۆڕشی جەزائیر شۆڕشێکی نیشتیمانی بوو، شۆڕشێکی ئازادیخواز بوو لەبەر ئەوە هەموو گەلێکی ئازادیخواز پشتی ئەگرتن بۆیە هەر بە دەرچوونی ئەو حوکمە نارەوایە ئێمەی ئافرەتانی کوردیش بەشێوەیەکی تایبەتی‌و بەشێوەیەکی گشتییش هەموو ئافرەتانی وشیاری عێراق داوای ئازادبوونمان بۆ ئەکردن.

ئێمەش کە ئافرەتانی کورد بووین لە کەرکوك کەمتەرخەمیمان نەئەکرد، بە هەموو جۆرێ هەوڵمان ئەدا بۆ کۆکردنەوەی ئیمزاو پەنجەمۆر بۆ دەربڕینی ناڕەزایی لەو حوکمە داوای بەربوونیانمان ئەکرد.

من بە تەنها خۆم هەزار پەنجە مۆرو ئیمزام کۆ کردەوە بۆ داوای بەربوونیان‌و بۆ ئازادی گەلی جەزائیرو چووین بۆ بەغدا بۆ سەفارەتخانەی فەرەنسا و ئەو ئیمزاو پەنجەمۆرانەمان پێشکەش کرد، حکوومەتی عێراقیش پۆلیسی تێ بەرئەداین‌و ئێمەش هەموو جارێ کە ئەچووین بۆ سەر سەفارەتی فەرەنسە بە هەزار کولەمەرگی خۆمان لە دەستی پۆلیس ڕزگار ئەکرد لە گرتن.

یەکێ لەو کچە کوردانەی کەرکوك کە هاوڕێم بوو بە دڵ‌و بەگیان لەگەڵمان بوو کچێ بوو ناوی ڕووناك بوو، کچی مامۆستا شێخ عەبدولرەحمانی مەلای مزگەوتی نەبی دانیال بوو لە کەرکوك لە گەڕەکی (قەڵا)، ماڵیشیان هەر لە قەڵا بوو، هەردووکمان کچە مەلا بووین زوو زوو سەرمان لە یەك ئەداو بووبووین بە هاوڕێی یەك، ڕووناك کچێکی وریاو خەباتگێڕی لێ دەرچوو، دووهەم کەس بوو کە توانیی ژمارەیەکی زۆری لە پەنجەمۆرو ئیمزا لەناو ئافرەتانا کۆبکاتەوە بۆ پیشتیوانی کردن لە جەمیلە بووحێرەدو جەمیلە بووچیاڤ جەزائیری‌و داواکردنی بەرەڵاکردنیان‌و بۆ پیشتیوانی لە خەباتی گەلی جەزائیر.

لە بیرم دێ ڕۆژێك لەو ڕۆژانە لەگەڵ ڕووناك چووین بۆ ماڵی مامۆستا مستەفا نەریمان خوا لێی خۆش، من ماڵی مامۆستا نەریمانم ئەناسی‌و ئەویش هەروەها ئەیناسین، ڕۆیشتین بۆ ماڵیان بۆ ئەوەی ئەوانیش ئەو عەرزوحاڵی نارەزاییە لە حوکمدانی هەردوو جەمیلەی جەزائیری‌و بۆ پیشتیوانی لێکردنی گەلی جەزائیر ئیمزا بکەن مامۆستا نەریمان هەستی پێکردین بۆچی هاتووین بۆ ماڵیان، فەرمووی لێکردین، خێرا خێزانەکەی بانگ کردو وتی: خێرا مۆری خۆت بکە تۆزی ئامۆژگارییشی کردین کە ئاگامان لە خۆمان بێ، وتیشی بە ڕاستی ئێوە نموونەی کچی کوردی ئازاو چاونەترسن، یاخوا هەر نموونەتام هەر زۆر بێ، ئەو ڕۆژە هەموو کەسێ نەیئەتوانی سیاسەت بکا ئەگەر زۆر بە جەرگ‌و نەترس نەبوایە، بەڕاستی ئەڵێم من‌و ڕووناك دووان بووین لەو کچە کوردە نەترسانەو گوێمان لە هیچ نەبوو، بە

جۆرێك وا چووبوونە ناو سیاسەتەوە خۆمان لە پێناوی ریاکردنەوەی ئافرەتان‌و خێرو خۆشیی خەلکدا تەرخان کردبوو، زۆرترینی ئەو ئافرەتانەی کەوا لە دەشتی هەولێرەوە بۆ کەرکوك هاتبوونە ناو ریزەکانی کۆمەڵەی ئافرەتانەوە.

رۆژێکیان وەرزی بەهار بوو دەمەو چێشتەنگایەك خۆم لە دایکم دزییەوە بەرەو شۆریجە کەوتمە رێ بەڵام بە لارێدا ئەرۆیشتم نەوەك ناسیاوێك بمبینێ وردە وردە بارانیش ئەباری هەموو هەنگاوێکم ئەکرد بە دوو تا زوو بگەمە جێگەی مەبەست، بارانەکە چرکە بە چرکە توندتر ئەبوو، زۆر تەر بووم خوا خوام بوو بگەمە جێ هەموو گیانم نیشتە سەر ئاو، هەر چەند کاتەکە کاتی ئەوە نەبوو کەس ماڵ جێ بهێڵێ من زۆر لەوە ئەترسام ناسیاوێك بەو جۆرە بمبینێ ئەبێ هەڵوێستم چی بێ لەو کاتەدا؟

باران زۆری بۆ هێنام پێش ئەوەی بگەمە ماڵی مەبەست لە کۆڵانێکا دام لە دەرگای ماڵێك بێ ئەوەی بیانناسم، دەرگایان لێکردمەوە منیش بێ ترس‌و بێ ئەوەی بیر لە هیچ شتێ بکەمەوە چوومە ژوورەوەو سەلامم لە دانیشتووان کردو وتم ببورن باران زۆری بۆ هێنام، خوا هەڵناگرێ ئەوانیش زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیان لێکردم، وتیان ماڵی براو خوشکی خۆتە، منیش زۆر سوپاسم کردن‌و زۆریش دلم خۆش بوو بەو بەخێرهاتن‌و رووخۆشییەیان.

لەوان قسەیەك لە من قسەیەك بەتەواوی کەوتینە قسە پێکەوە کردن لەبارەی چۆنییەتی ژیان‌و کاروبارو کاسبییەوە، بۆم دەرکەوت کەوا ئەوانیش جووتیاری دەشتی هەولێرن‌و لە دەست ئاغاو دەرەبەگ دەرچوون‌و هاتوون بۆ کەرکوك، منیش لێم پرسین خوشکێ ئێوە ئێستا چی ئەکەم؟ وردە وردە لەیەك گەیشتین... منیش لە خوام ئەویست ناسیاوێك زیاتر بناسم، ئەوەبوو رێم کەوتە ئەو ماڵە رەنجکێشانەو ئەو ئافرەتانەم ناسی.

بروا بکەن ئەو ماڵە سێ ئافرەتی تیابوو هەر سیانیان تووشی نەخۆشی سیل بووبوون، ئەو سێ کەسە هەر سیانیان لە ژوورێکی بچووکا ئەژیان کە هەرچی نیشانەی ژیان مەرجی ژیان بێ تیا نەبوو، چەند کۆنە حەسیرێکی شرو وری تیا راخرابوو لەسەریان راکشابوون، نەخۆشەکان رادەی نەخۆشییەکەیان جیاجیا بوو، یەکێکیان لەو دووانەکەیان وەزعی خراپتر بوو، یەکێکیشیان دیار بوو تازە تووشی نەخۆشییەکە بوو بوو، بێ ئەوەی شەرمی لێ بکەم چوومە پێشەوە بۆ لای یەکەمیان پاش چاك‌و چۆنی لەگەڵ کردنی پێم وت: پشت بە خوا چاك ئەبیتەوە. وتی چاك بوونەوەی من زۆر زەحمەتە چونکە ئێمە لەم ژوورەدا ئەژین کەوا ئەبینی، نە دەرمانمان هەیە نە خواردەمەنییەکی باش، بەدەم هەناسەبرکێوە چەند قسەیەکی کردو لەگەڵیشیا ئەکۆکی، منیش پڕ بە دڵ بەزەییم پێیدا ئەهاتەوەو بە دەمیش پێم وت: خوشکە گیان! نائومێد مەبە، پشت بە خوا چاك ئەبیتەوە.

کەوتمە قسەکردن لەگەڵ ئەوانی تریان کە باشتر بوون لەم، لەبارەی ژیان‌و گوزەرانیانەوە لێم پرسین یەکێکیان وتی: خوشکە تۆ بۆچی هاتووی بۆ لامان؟ منیش لە وەڵاما وتم: من خۆم بە خوشکی ئێوە ئەزانم، لەم رێگەوە تێپەریم تینووم بوو، لە دڵی خۆما وتم ئێستە ئەرۆمە ئەم ماڵە چۆری ئاو ئەخۆمەوەو ئەیشبین بە ناسیاو، ئێستا زۆر زۆر دڵخۆشم بووم بەوەی کە بووم بە ناسیاوتان، ئومێد ئەکەم ئەگەر بتوانم شتێکم پێ بکرێ یارمەتیتان بدەم.

نەخۆشەکە بەدەم هەناسەبرکێوە وتی: خوشکێ گیان! ئێمە ماڵمان لێرە نەبوو، جووتیاری دەشتی دزەیین، لەتاو چەوساندنەوەو زۆر لێکردن سەری خۆمان هەڵگرت هاتین بۆ ئێرە.

لەگەڵ قسەکردنیا وردە وردەیش بۆی ئەکۆکی، هەناسەی بۆ دەرنەئەهات‌و هەناسەی سوار ئەبوو، هەر چەند حەزم نەئەکرد زۆر قسە بکات، بەڵام وا دیار بوو دەروونی پڕ بوو لە خەم‌و خەفەت‌و ئەیویست هەموویم بۆ هەڵبرێژێ، وتی: ئێوەش ئاوا ئەمانبینن وەزعمان باش نییە، بە کوێرەوەری ژیان ئەبەینە سەر وا تووشی ئەم نەخۆشییە پیسەیش بووین لە ئەنجامی ئەم ژیانە ناخۆشەوە، بێ دەرمان کەوتووین، رۆژ لە دوای رۆژ خراپتر ئەبین، هەناسەیەکی تری هەڵکێشاو وتی: ئێمە چۆن باش ئەبین.

لە هەستیان تێگەیشتبووم زۆر دڵگران بووم بۆیان، خەم‌و پەژارەی ئەوانیش تێکەڵ بە خەم‌و پەژارەی خۆم بوون ئەوەندەی تر کەوتمە ناو دەریاری خەم‌و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆری زەمانەو چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤی نامرۆڤەوە لە پێناوی پەرژەوەندی تایبەتیی خۆیا.

چاوەکانم پڕ بوو لە فرمێسك بێ ئەوەی هەست بە خۆم بکەم فرمێسکەکانم دەنکە دەنکە ئەکەوتنە خوارەوە، بێ دەنگ لەناو گێژاوەدا نوقوم بووبووم بۆیە ژنە نەخۆشترەکەیان دەستی درێژ کرد بۆ دەم‌و چاوم فرمێسکەکەمی سرییەوە، لە سرینەوەی فرمێسکەکان راچەڵەکیم، وتم لێم ببورە ئاگام لێت نەمابوو، تەواو کەوتبوومە ناو گێژاوی جۆراو جۆری ئەم دنیایە، ئەبێ خۆمان بگرین.

دوو سێ منالی سێ‌و چوار ساڵانیش بە دەورویشتیانا ئەهاتن‌و ئەچوون، منالێکی بچووکیش خێرا خێرا سەری ئەنا بە سنگی دایکە نەخۆشەکەیەوەو مەمکە چەقە بێ شیرەکەی دایکی ئەمژی بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە هیچ شیری تیا نیەو دڵۆپێ شیر ناچێتە ناو دەمییەوە، ئەوانی تریشان سەرو پارچە نانە رقیان گرتبوو بە دەستەوەو ئەیانکرماند، بەراستی ئەو دیمەنە دڵتەزێنە کارێکی گرانی کردە ناو دڵم، تەنانەت خۆیشم لەبیر چووبووەوە، نە بیرم بە لای ماڵەوە ماوە نە هیچ بەدەم خەیاڵەوە هەر قسەم ئەکرد بۆیان، وا دیار بوو ئەوانیش لەگەڵ ئەو ژان‌و دەردەیانا گوێیان بۆ من گرتبوو، قسەکانمیان بە دڵ بوو لە مەبەستی دڵم گەیشتبوون، بۆیە پێیان وتم: توخوا خوشکە زوو زوو سەرمان لێ بدە، وا دیارە تۆ فریشتەی خێری منیش لە کانگای دڵمەوە ئەوەم ئەویست کە هاتنەکەمیان پێ خۆش بووبێ‌و بێزار نەبووبن لێم.

بۆیە پڕ بە دڵ سوپاسم کردن‌و وتم تخوا زۆر دواکەوتم، بەڵام ئەبێ رۆژێك دانێن بۆم تا بێم بتانبەم بۆ نەخۆشخانە بەڵکو چارەتان بکرێ، چ رۆژێك ئەڵێن تا بێمەوە بە دواتانا، قسەکەمیان پێ خۆش بوو، بۆیە وتیان هەر رۆژێك دێت ئێمە ئامادەین ئەگەر نەمردین، ئێمە نەشارەزاین، هەروەها

پترەو پوولیشمان نییە، مێردەکانمان کرێکارن و بە کرێکاری ئەوان ئەژین لێرە، ئەوانیش تا ڕۆژێك کاریان دەست دەکەوێ دووان دەستیان ناکەوێ، ئەو پارەیەیش کە دەستیان ئەکەوێ ئەوەند کەمە بەشمان ناکا و بەو کولەمەرگییە پێی ئەژین کەوا ئەمانبینی، دووبارە هەردوو چاوم پڕبوونەوە لە فرمێسك و هیچ دەسەڵاتم نەما بەسەر فرمێسکەکانما، نەمتوانی ڕێیان لێبگرم نەهێڵم بێنە خوارەوە، پێم وتن ئومێد ئەکەم بە زووترین کات بتانبەم بۆ نەخۆشخانە، ئیتر ماڵاوایم لێکردن و هاتمە دەرەوە.

هەر لە گەڕانەوەشمدا کە هاتمە دەرەوە بڕیارم دا ئەبێ نەڕۆمەوە ماڵەوە و سەر لەو ئاسیاوانەمان بدەم کە وا ماڵیان لەم دەوروبەرە بوو، باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەم خێزانەیان بۆ بکەم، بەڵکو ئەگەر هەیانبێ شتێکم دەست بکەوێ بۆیان، بۆیە گەڕانەوەم بۆ ماڵی خۆمان لەبیر چوویەوە، هەر لەو ڕۆژەدا سەرم لە چەند ماڵێك دا کە ئەمناسین، هەر بە هۆی ئەوانیشەوە چووینە چەند ماڵێکی تر کە ئاسیاوی ئەوان بوون، بەو جۆرە هەندێ پارەو خواردەمەنیمان بۆ کۆکردنەوە، لەماڵی یەکێك لەو ئاسیاوانە دامننا و وتم بەم نزیکانە دێم لەگەڵ یەکێکتان ئەیبەین بۆ ئەو ماڵە نەخۆشە موحتاجە، ئیتر گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان.

پاش ڕۆژێك بەناوی قورگ ئێشەوە گوایە ئەڕۆم بۆ نەخۆشخانە، هاتمەوە بۆ ماڵی هاوڕێکەم شتەکانمان هەڵگرت و ڕۆیشتین بۆ ماڵی نەخۆشەکان کە گەیشتینە کۆڵانەکەیان دیمان خەڵکێکی زۆر لەبەر دەرگاکەیانا ڕاوەستاون دێن و دەچن بەیەکدا، پرسیمان ئەوە چییە؟ لە وەڵاما پێیان وتین ژنی ئەو ماڵە مردووە، لە ڕاستیدا پاڵم دایەوە بە دیوارێکی ناو کۆڵانەکەوە و تاس بردمییەوە هەردوو چاوم سێبارە پڕبوونەوە لە فرمێسکی گەرمی نائومێدی بۆیان و خۆم بۆ نەگیراو لەگەڵ هاوڕێکەما چووینە ژوورەوە، ئێمەش بەشداری شین و گریان و خەم بووین، ئەو پارەو خواردەمەنییە کە بۆمان بردبوون بۆمان دانان.

لقەکانی کۆمەڵەکانمان لە گەڕەکەکانی بەرتەکییە، ئیمام قاسم، ئازادی، شۆڕیجە، پڕیادی، تەپەی مەلا عەبدوڵڵا، ڕەحیماوا، قۆرییە بوون، من و ڕووناك ئەم کۆمەڵانەمان بە گوێرەی ئەو بەرنامەیەی لە کۆمەڵی سەرەکییەوە لە بەغدا بۆمان هاتبوو بەڕێوە ئەبرد، ئیتر هەر کۆمەڵێك لەو کۆمەڵانە بەگوێری بارودۆخی خۆی و ژیانی جیاوازییان تێدا بوو و ئێمەیش بەو پێیە ئەجوڵاینەوە لەگەڵیانا، دیارە ئەو ئافرەتانەیش کە هاتبوونە ناو کۆمەڵەکانەوە هەموو یەك ئامانج کۆی کردبوونەوە کە تێکۆشان بوو بۆ مافەکانی ئافرەتان بە هەموو چین و توێژو نەتەوە و ئایینەکانیانەوە لەگەڵ تێکۆشان بۆ پاراستنی ئاشتی جیهانا.

کەنیسەیەکیش لەو نزیکانەوە هەبوو لەهەمان کاتا گۆڕستانی مەسیحییەکان بوو، لەناو ژنانا وا بڵاوبوو ئەگەر ژنێك منداڵی نەبوو بچێتە بەردەمی ئەو کنیسەیە میز بکا ئیتر سکی پڕ ئەبێ و ئەبێ بە خاوەنی منداڵ، مێشکی ژنان بەو قسە هیچ و پووچە پڕکرابوو بۆیە ئەچوومە ناو قسەکردنەکانی ئەو ژنانەوە بە مەبەستی وریاکردنەوەیان و دەرکردنی ئەو ئەفسانەیە لە مێشکیان و لەگەڵ هاوڕێکانم هەوڵم ئەدا بۆ ئەوەی هۆشیاریان بکەینەوە و لەو بیرە پووچانە ڕزگاریان بکەین.

لە یادم دێ وا بزانم لە پاش ساڵەکانی (١٩٥٦)، (١٩٥٧) بوو ئێمەی کچانی سەر بە کۆمەڵەی ئافرەتان، خۆمان ئامادە کرد بۆ یادکردنەوەی جەژنی ئافرەتانی جیهان و بۆ بە پیرەوەچوونی جەژنی نەورۆزی نەتەوەییمانەوە.

ئەو دوو یادەمان یەك خست و لە یەك ڕۆژا یادمان کردنەوە چونکە بارودۆخی وڵات گران بوو پێمان نەئەکرا دوو جەژنی جیاجیایان بۆ بەرپا بکەین، بۆیە لەگەڵ ڕووناکی هاوڕێم ژمارەیەکی زۆر لە ژنان و کچانمان ئامادە کردو ڕۆژێکمان دانا بۆ گێڕانی ئەم ئاهەنگەو شوێنی ئاهەنگ گێڕانەکەیشمان لە (جەوەڵ بۆر) دەستنیشان کرد کە ئەکەوێتە نزیکی کەرکوکەوە.

ئەو ڕۆژە کە چووین بۆ جەوەڵ بۆر لە بەیانییەوە تا ئێوارە لەوێ ماینەوە و ئاهەنگێکی خۆشمان گێڕاو گەلێ وتارو شیعری جوان خوێنرایەوە، ئافرەتێکی زۆرمان لە ژن و کچە جووتیارەکان و کەم دەرامەتەکان هێنابوو بۆ ئەو ئاهەنگەو تا نزیکی ئێوارە لە ئاهەنگ گێڕانا بووین، کاتێکمان زانی برادەرێك هات و ئاگاداری کردین کەوا سیخوڕێکی میری پێی زانیوین و ئەیەوێ شتێکمان بۆ ڕێك بخا.

ئێمەش دەستبەجێ چۆنییەتیی ئاهەنگەکەمان گۆڕی بە بارێکی ترا لە وتارو شیعر خوێندنەوەوە دەستمان کرد بە هەڵپەرکێ و گۆرانی وتن و بەم جۆرە تا نزیکی خۆراوا بەردەوام بووین و پاش ئەوە کە گەڕاینەوە بۆ کەرکوك.

*** سەیرانێك بۆ (عەمشە- سۆنەگۆلی):-**

ئەگەر بە هەڵە نەچووبم وا بزانم هەر لە ساڵەکانی (١٩٥٦)، (١٩٥٧)دا بوو لەگەڵ ماڵی جەنابی شێخ جەمیلی تاڵەبانی، بە خاو خێزانیانەوە چووین بۆ سەیران و سەیرانەکیشمان بۆ دێیەك بوو ناوی (عەمشە) بوو لە دەوروبەری کەرکوك، ئەو دێیەش دێی جەنابی شێخ جەمیل بوو، هەروەها سەیرانێکی تریشمان کرد بۆ دێیەکی تری هەر لەو دەوروبەرە کە ئەویشیان هەر دێی جەنابی شێخ جەمیل بوو، ناوی (سۆنەگۆلی).

سەیرانی یەکەمی دێی عەمشەمان زۆر خۆش بوو، بۆیە ماڵی شێخ ناردیان بە شوێن گەلێك لە خەڵکی دێی سۆنەگۆلییشدا، ئێمە و گەلێك لە خەڵکی هەردوو دێ پێکەوە سەیرانەکە بکەین ئەوانیش هاتن بۆ عەمشەو لەناو دێکەدا ماوەیەك لەگەڵمان مانەوە، تامی ئاو و هەوایەکی شیرین و خۆشمان چەشت، سەیرانگاکە چۆن سەیرانگایەك بوو؟ پڕ لەگوڵ و گوڵزارو سەوزە گیا، نەك هەر دڵی، هەزاران دڵ بۆی حەیران ئەبوو...

پاش ماوەیەك حەسانەوە خەڵکی هەردوو دێیەکە پێش نیوەڕۆ چەندین مریشکیان سەربڕی و چێشتێکی زۆریان لێنابوو و ماست و دۆی خەست و خۆڵ و هێلکەو کەرەیان ئامادە کردبوو بۆ نیوەڕۆ، ئەوانەیشیان نەهاتبوون بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ، پاش نیوەڕۆ هاتن خواردن ئەوەندە زۆر بوو بەشی چەندین کەسی تریشی ئەکرد لەولایشەوە

دوو سێ سەماوەری گەورە تێخزابوون گیزەیان ئەهات.
هەر پێش ئەوەی نان پێبگا کوڕانو کچانی گەنج دەستیان کرد بە هەڵپەرکێ کردنو ئاهەنگ گێڕان، شوانی دێیەکەیش شمشاڵەکەی نابوو بە لادەمییەوە بە جوانترین ئاواز شمشاڵی لێ ئەدا بۆ هەڵپەرکێ کەرەکان کە بە گەرمترین جۆشو خرۆش هەڵئەپەڕین، ئاواتو نیازەکانی ناو دڵو دەروونی ئەو کچو کورە شۆخو لاوانە بە جوانترین شێوە دەرئەکەوت کە بەهیوا بوون لە دوا ڕۆژدا بۆیان بێتە دی.
لە هەموو شتێ جوانترو دڵرفێنتر هەڵپەرکێی تازە بووکو زاوایەك بوو چەندین ساڵ بوو دڵدارو خۆشەویستی یەکتر بوونو لەم دواییەدا بە هەزار گێرەو کێشە بۆ یەك بوون، جا هەڵپەرکێ کردنو کەیفو خۆشی ئەو یارو دڵدارە تازە بۆ یەك بوو و بەیەك گەیشتووە، لەنێوان سەرجەمی هەڵپەرکێ کەرەکاندا دیار بوو.
سەیرانکەری سەرەکییش کە ئێمەی لە کەرکوکەوە هاتوو بووین، گەنجەکانمان دەستمان کرد بە هەڵپەڕین، هەر چەند ئێمە وەك ئەوان نەئەهاتو لێمان نەئەزانی، بەڵام هەر چۆن بوو زاخاوی مێشکی خۆمانمان دایەوە، بەو دیمەنە جوانەی دەرو دەشتو دڵپاکیی ئەو کچە جووتیارانە کە شایەنی هەموو ڕێزو سوپاسێك بوون لەسەر ئەو پێشوازییە گەرمەی لێیان کردینو بە هێنانی ئەو هەموو نانو خواردنەی بە دەستە ڕەنگینەکانیان بۆیان دروست کردبووینو بۆیان هێنابووین.
ئیتر دوای ئەوەی کچەکان تێر هەڵپەڕین نان دانراو دەست کرا بە نان خواردن، لەولایشەوە گیزەی چەندین سەماوەر ئەهات کە قۆری جوان جوانو گەورەیان بەسەرەوە بوو، بە دەم نان خواردنی سەیرانکەرەکانەوە چایەکەیش پێنەگەیشتو پاش لەنان خواردن بوونەوە چاییشمان خواردەوە.
جا وەختی ئەوەیش هات ئێمەیش واتە کچانی تازەپێگەیشتوو بیر لەوە بکەینەوە بە تەنها خۆمان تۆزێك بەناو ئەو سەوزە گیاو گوڵاڵە ڕەنگاوڕەنگانەی ئەو دەرو دەشتەدا بگەڕێنو دڵو دەروونی خۆمان بەو دیمەنە جوانانەی سروشتو سەوزە گیای بەهارەو بە بیستنی جریوەی چۆلەکەو بولبول روون بکەینەوەو کەمێك زاخاوی دڵو دەروونمان بۆ یەکتری هەڵبڕێژینو لە هەستی دڵی یەکتر بگەین، بڕیارمان دا بڕۆین بۆ گەڕان.
بۆیە منو کچەکانی شێخ، کچە جووتیارەکانمان بانگ کردو پێکەوە کەوتینە گەڕان بەناو ئەو دەشتودەرەدا و بەو دیمەنە جوانانەی دێهاتی دەورووپشتی کەرکوکی ئازیزدا و کەوتینە قسەکردن لەناو خۆماندا لەبارەی ژیانی کۆمەڵایەتیو بەتایبەتی ژیانی کۆمەڵایەتی ئافرەتانی جووتیارو کچە جووتیارەکانەوەو هەستو نەستی ناو دەروونیانو گیروگرفتی زۆری ناهەمواری ژیانیان کە دێتە ڕێیان، بەتایبەتی لەبارەی هاوسەرگیرییانەوە کە ناتوانن دەم بکەنەوە لەبارەی پاشەڕۆژی ژیانیانەوەو هیچ دەسەڵاتێکیان لە دیاری کردنی دوارۆژی خۆیانا نیەو هەمیشە ئەبێ بە چاوی بوویەکی بێ دەسەڵات مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ، لەگەڵ ئەوەیشا کە کچی کوردو ئافرەتی کورد تێکڕا دەورێکی

ئەوتۆیان لەبارەی چارەنووسو دوارۆژی خۆیانەوە نیە، هەر باوكو برا قسەکەر بوون لەباتیی ئەوانو هەر ئەوان هەموو شتێك بوون لە بارەی ژیانی ئەمانەوە.
بەڵکو زۆر جاریش سەرەکی هۆز دەستی باڵای هەبووە لە کاروباری کۆمەڵایەتیی ژنو کچانی جووتیارانو ڕەعییەتەکانا، چونکە بارودۆخی ئەوساو ئەو سەردەمەی عێراق وابوو، کەس خاوەنی خۆی نەبوو بەتایبەتی ئافرەتان لە چەندین ڕووەوە زیاتر لە پیاو ئەچەوسێنرانەوە، ئەو ئەگەر یەکێك لە ڕەعییەت کارێکی تایبەتیی خۆیشی هەبوایە پرسی بە گەورەی هۆز بکردایە چونکە ئەو زیاتر دەسەڵاتی هەبوو بەسەر کچانی ڕەعییەتەکانیان، خۆ ئەگەر ئەوان کچی ڕەعییەتێکیان بە دڵ بوایە، ئەبوو بۆ ئەوان بێ کەسی تر مافی قسەکردنی نەبوو با ئەو کچە دەزگیرانیشی هەبوایەو دەزگیرانەکەی خۆی بەدڵ بوایە، زۆرجاریش وائەبوو لە مەسەلەی ویستنی هێنانی کچێکدا چەند کەس ئەدرا بە کوشت.
بەدەم قسەکردن لەم بابەتەو ئەم جۆرە بابەتانەوە قسەی زۆرمان کردو کاتی زۆرمان بردەسەر کە هەموان هەر لە کاتی خۆیەوە جۆرە بەشدارییەکی تیا ئەکرد، کچە جووتیارەکان بەتەواوی گوێیان شل کردبوو بۆ ئەو قسانەو بەلایانەوە سەیر بوو، چونکە پێشتر قسەی وایان نەبیستبوو، بۆیە هەندێکیان ئەیانوت بەڕاستی ئێوە ئەڵێی لەو دڵەی ئێمەدان، یان غەیب ئەزانن خۆزگە کەسانێکی وەك ئێوە لە نزیکی ئێمەوە بوونایە تا هەندێ شتیان تێبگەیاندینایە، ئێمە هەر هیچ لە بارەی خۆمانەوە نازانین هەر ئەوەندە ئەزانین کە ئەبێ کاربکەین بێ ئەوەی کەسێك دان بە مافمانا بنێ بە دەم ئەو جۆرە قسانەوە تا دەمەو خۆرئاوا کاتمان بەسەر برد.
ئیتر بۆ دواجار ماڵاوایمان لە یەکتر کردو کچەکانو ژنەکانی عەمشەو سۆنەگۆلی گەڕانەوە بۆ گوندەکانی خۆیانو ئێمەیش هاتینەوە بۆ کەرکوکی ئازیز.
هەر لە ساڵانی (١٩٥٦، ١٩٥٧)دا بوو فەهیمە خانی کچی حاکم عەبدولڕەحمان سەعید هات بۆ ماڵمان بەهۆی باوەژنەکەیەوە کە بە خزمایەتی ئەگەیشتەوە بە باوکم، ئیتر لەوەپاش هەر بەو بۆنەیەوە گەلێ جار ئەهات بۆ ماڵمان، بەڵام لە ڕاستیدا هەر بۆ ئەوە ئەهات کە چاوی بە من بکەوێ، چونکە ئەو خۆیشی پەیوەندی بە کۆمەڵی ئافرەتانەوە هەبوو.
هەر دەنگوباسێکی لابوایە پێی ئەوتمو هەر بڵاوکراوەیەکی تێکۆشەرانەی سیاسی لابوایە بۆی ئەهێنام.
ڕۆژێك لەو ڕۆژانە لە ماڵی خۆمانا دانیشتبوو لام منیش ڕۆژنامەیەکی (ژین)م هێناو لای ئەوا دەستم کرد بە خوێندنەوەی بە دەنگێکی بەرز، ئەویش گوێی بۆ شل کردبووم، کە لێبوومەوە وتی بەڕاستی تۆ کوردییەکی زۆر باش ئەزانی بۆچی جار جار لە بارەی ئافرەتانەوە لەم ڕۆژنامەیەدا نانووسیو باسی گیروگرفتەکانی ژیانی ژنان ناکەی؟ لە ڕاستیدا تا ئەو کاتە من بە بیرما نەهاتبوو کەوا دەس بدەمە نووسینو بڵاوکردنەوە، ئەو قسەیەی فەهیمە خان بوو بە هاندەرێکی باش بۆمو لە ڕاستییشدا زۆرم پێ خۆش بوو ئەگەرچی بە خۆیشما ڕانەئەپەرمووموەوە کە بتوانم بنووسمو

بۆم بڵاوبکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەیشا هیوام نایە بەرخۆمو بە باوەڕێکی پتەوەوە دەستم کرد بە نووسین، یەکەم نووسینم بە ناونیشانی ئەوەبوو کە (ئافرەت نیوەی گەلە) بێ ئەوەی کەس یارمەتیم بدا لە ڕێکوپێك کردنی نووسینەکەما، تەنها کاکە فاتیحو کاکە حەمەم هەبوون بتوانن یارمەتییەکم بدەن، ئەوانیش لەو سەردەمەدا لە بەندیخانە بوو، سەلاّحی برایشم هەبوو ئەویش ئەو کاتە تازە وردە وردە بەرەو گەورەبوون ئەچوو و شتێکی ئەوتۆی لەبارەی نووسینەوە نەئەزانی یان هەر هەستی بەو جۆرە نووسینە نەئەکرد بەتایبەتی لەبارەی ئافرەتانەوە.

هەر چۆن بێ وتارێکم نووسی و بەناوی (ئافرەت نیوەی گەلە) و ئەم ناوە خواستەنییەم لەسەر دانا: (کەرکوك، کچە کورد، پرشنگ)و دام بە سەلاّحی برام بردی خستییە پۆستە بۆ سلێمانی بۆ رۆژنامەی (ژین) کە لەوێ دەرئەچوو، لە هەفتەی دوابیدا کە رۆژنامەکەمان کری و وتارەکەمم تێدا خوێندەوە، بەوە لە رادەبەدەر شادمان بووم کە ئەوە یەکەمجار بوو ناوم ئەکەوێتە سەر لاپەڕەی رۆژنامەیەکی کوردیو وتارێکم بۆ بڵاوکرایەوە، بڕوام بە تەواوی بە خۆم پەیدا کردو زانم هاتەبەر کە ئەتوانم هەمیشە بنووسم، ئەوە یەکەم وتارەم هانی دام بۆ بەردەوام بوون لەسەر نووسین.

پاش بڵاوبوونەوەی ئەو وتارەم لە ژیندا لە ژمارەی داهاتوویدا مامۆستای خوالێخۆشبوو شاکر فەتاح هەر لە ژیندا وتارێکی بڵاوکردەوە پێخۆشحاڵیی خۆی لەوە دەربڕیبوو کە ئافرەتی کورد پەیدا بووە بنووسێو گیروگرفتەکانی ژیانی ژنان بخاتە روو و هیوای سەرکەوتنی بۆ کردبووم و ئاواتی هاتنە مەیدانی زیاتری ئافرەتانی دەربڕیبوو، ئەو نووسینەی مامۆستا شاکر فەتاح ئەوەندەی تر هێزی نووسینم تیا پەیدا بوو.

شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) رووی دا، ئیتر وتارم بە ناوی ئاشکرای خۆمەوە ئەنووسی (عالیە عەبدولکەریم) هەروەها بۆ گۆڤاری (هەتاو)یشم ئەنووسی کە لە هەولێر دەرئەچوو، بەلاّم بۆ (هەتاو) بەناوی (پیرۆز)و (خاتوون)ەوە ئەمنووسی.

هەر وەکو وتم کە شۆڕشی ١٤ی تەمووز بەرپابوو ئیتر هەر بەناوی خۆم (عالیە عەبدولکەریم)ەوە ئەمنووسی ئەگەر بەهەڵە نەچووبم لەیەکەم ژمارەی دوای شۆڕش لە هیوادا کە تیامدا نووسی، لەسەر تێکۆشانی بارزانیی نەمرو گەلی عێراقم نووسیو باسی راپەڕینە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقو جەنابی بارزانیم نووسی ئەوەندەی لەو کاتەدا لەو مەسەلانەم ئەزانی.

دوای رێگادانی بە ئاشکرا کارکردنو بە قانوونی بوونی کۆمەڵەکەمان (کۆمەڵەی داکۆکی کردن لە مافەکانی ئافرەتان)، خوشکێك بە ناوی خوشکە (عەمیدە)وە یادی بەخێر بێ، هات بۆ کەرکوك بۆ سەرپەرشتی کردنی خەباتی کۆمەڵەکەمان، ئەم ناوەی عەمیدە ناوێکی خواستەنیو بزووتنەوەیی بوو، من ناوی راستەقینەیم نەئەزانی بەراستی ئافرەتێکی بەرێزو تێگەیشتوو بوو، ئەوەندە خوو و رەوشتی جوان بوو بە یەکجار چاوپێکەوتنو قسەکردن لەگەڵیا بەتەواوی ئەچوو بە دڵو دەروونی ژنانو کچاناو لە ئامانجەکانی ئێنەگەیشتن، ئاگاداریەکی باشی لە دەردو ئازارو گیروگرفتەکانو ناتەواوییەکانی ژیانی چینی هەژار هەبوو.

ئەو ئافرەتە ئەوەندە بەرێز بوو جاری وا هەبوو کە ئەهات بۆ لای من چاویشی بە جەنابی باوکم ئەکەوت، ئەوەندە بە رێزەوە قسەی لەگەڵ ئەویش ئەکرد ترسم لە باوکم نەبوو بپرسێ ئەم ئافرەتە کێیەو بۆچی هاتووە بۆ ماڵی ئێمە؟ ئەگەر پێیشم بووتایە بۆ لای من هاتووە پێی ناخۆش نەئەبوو چونکە لەوە گەیشتبوو کە ئەو ژنە لە ژنە سیاسییە تێگەیشتووەکانە.

هەر وەکوو وتم پاش شۆڕش زۆر لە ئافرەتان ئەهاتنە ناو ریزەکانی کۆمەڵی ئافرەتانەوەو بەتایبەتی لە ئافرەتە مامۆستاکانو لە قوتابییان، یەکێك لەو ئافرەتە مامۆستایانە مامۆستا سەنییە جەباریی خوشکی شەهید فاتیح جەباری بوو کە پاش کوودەتای (٨)ی شوباتی سالّی (١٩٦٣) لەگەڵ کاروانی شەهیدانی کەرکوکا کران بە دارا، هەروەها مامۆستایان کافییە ئیبراهیمو مامۆستا لوتفییە عەبدولواحیدو پەخشان عەبدولواحیدو گەلێکی تری زۆر کە ناویانم لە یاد نییە.

لە راستیدا ئەمانە دەورێکی باڵایان هەبوو لەناو کۆمەڵەکەماناو خاوەنی خوو و رەوشتی جوان بوون، ئەمانە وابزانم لە پاش شۆڕش هاتبوونە ناو ریزەکانی کۆمەڵی ئافرەتانەوە.

پێش شۆڕش ئەوانەی کۆمەڵەیان بەڕێوە ئەبرد تەنها منو رووناکی کچی مامۆستا شێخ عەبدولرەحمانو فەهیمە عەبدولرەحمان سەعیدو جەمیلە یامولکی بوون، بەلاّم بە جۆری سەرەکی لە سەردەمی نهێنییەتیدا تەنها منو رووناك بووین لە ناو جەماوەری ژنانا ئەجوولاّینەوەو قسەمان ئەکردو تووشی گیرەو کێشە ئەهاتین لە گەڕەکەکانی کەرکوکا، بەلاّم بە روودانی شۆڕشی پیرۆز کەوتینە قۆناغێکی نوێوەو کەسانی لێهاتووی زۆر لە دەوری کۆمەڵە خربوونەوەو ئەهاتنە کۆڕی تێکۆشانو سەرکردەیی کردنی تێکۆشانەوەو ئەبوو گەلێ لە جاران زیاتر هەوڵ بدەین بۆ وریاکردنەوەی نیوەی گەلیشە ئەگەر لە نیوەیشی زیاتر نەبێ، بۆیە ئەبێ ئەوانیش گەلێ لە جاران زیاتر بێنە مەیدانی خەباتەوە، چونکە دوژمنانی ئازادی چاویان بە ئازادیی مرۆڤدا هەڵنایەت، ئازادیی مرۆڤیش بە خوێندەواریو وریابوونەوەی مرۆڤەکان ئەبێ بێ جیاوازی لەنێوان هەردوو رەگەزی نێرو مێدا.

کەواتە ئەبێ بچینە ناوچەگەری جەماوەری میللەتەوەو ئەبێ باری خوێندەواری لەناو خەڵکیداو بەتایبەتی لەناو کۆمەڵی ئافرەتاندا بەرزبکرێتەوە، بۆیە بڕیارمان دا بە هەر جۆرێك بووە هەوڵی کەم کردنەوەی نەخوێنەواری بدەینو بۆی تێبکۆشین تا بەتەواوی لەناوی ئەبەین، بۆیە ئێمە کۆمەڵەی ئافرەتانی کەرکوك بە سەرکردایەتیی خوشکە عەمیدەو رووناك عەبدولرەحمانو منو بەیارمەتی هەموو لیژنەکانی لقەکانی کۆمەڵە دەستمان دایە کۆکردنەوەی ئیمزاو پەنجەمۆرێکی زۆر بۆ پشتگیری کردن لە داوای کردنەوەی چەندین مەڵبەندی نەهێشتنی نەخوێندەواری لەناو ئافرەتانا، منو خوشکە عەمیدە چووین بۆ لای بەڕێوەبەری

پەروەردە کە ئەو سەردەمە پێیان ئەوت (مەعاریف)و پێمان وت ئێمە بە ناوی هەموو ئەو کەسانەوە کە ئەم داوایەیان پەنجەمۆر کـردووە، هاتووین داوای کـردنـەوەی چەندین قوتابخانەی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری لە شاری کەرکوکا ئەکەین، پێشمان وت ئێمە نیوەی گەلین و ئەگەر نیوەی گەل بە نەخوێندەواری بمێنێتەوە، هەموومان لە هەموو بوارێکی پێشکەوتنا بە دواکەوتوویی ئەمێنینەوە، واتە هەموو گەلەکەمان هەر دواکەوتوو ئەبێ چونکە ئێمە نیوەی گەلین گەل بە تەنها نیوەی کە پیاوە ناتوانێ ولاتەکەی پێش بخا، لەبەر ئەوە ئەبێ ئێمەیشیان لەگەل بین و ئەوەیش بە خوێندەواربوونمان ئەبێ.

بەڕێوەبەری مەعاریف کە ئەم قسانەی لە ئێمە بیست زۆری پێ خۆش بوو و ئافەرینی کردین و پەیمانی داینێ کە بە زووترین کات چەندین قوتابخانەی نەهێشتنی نەخوێندەواری لە کەرکوکا بکرێتەوە.

هەفتەیەك زیاتری نەبرد بڕیاری کـردنـەوەی چەندین قوتابخانەی نەهێشتنی نەخوێندواری لە کەرکوکا دراو بەم پێیە قوتابخانە لە بەرتەکییەو شۆریجەو ئیمام قاسمو قەلا کرایەوە، من خۆم چونکە لە مێژ بوو لە مالەوە بە یارمەتی براکانم فێری خوێندەواری بووبووم، نەچوومە قوتابخانەی نەهێشتنی نەخوێنەواری تا مالمان چووە بەغدا، لەوێ چوومە قوتابخانەی ئاسایی و لە پۆلی پێنج وەرگیرام، بەلام عەتییەی خوشکم کە من وردە وردە فێری نووسین و خوێندنەوەم کردبوو، ناوی خۆی لە قوتابخانەکەی بەرتەکییە نووسی و لەپۆلی دووهەم وەرگیرا، لەسەر خوێندنیش بەردەوام بوو تا سانەویی لە بەغدا تەواو کردو بوو بە فەرمانبەری میری.

بە کردنەوەی ئەو قوتابخانانەی نەهێشتنی نەخوێندەواری ژمارەیەکی زۆر لە کچان و ژنانی گەورەی کەرکوك چوونە ئەو قوتابخانانەو ناوی خۆیانیان نووسی و گەلێکیشیان هەر بەردەوام بوون لە خوێندن تا بوون بە مامۆستای سەرەتایی و ئێستا خانەنشین کراون.

ئەو هـەوڵ و تـەقەلایانـەی بۆ کـردنـەوەی قوتابخانەکانی نەهێشتنی نەخوێنەواری دران، بێ گومان هەوڵ و تەقەلای گەورەو زۆر بە سوود بوون و هەنگاوێکی گەورەیش بوون بۆ وریاکردنەوەی ئافرەتان و بۆ بە مرۆڤ زانین و هەست کردنیان بە مافە رەواکانیان و لە بواری پاڵ پێوەنانیانا بۆ تێکۆشان لە پێناوی مافە رەواکانیانا و بۆ گوێ دان بە پاراستنی دایکان و ساوایان و دان نان بە مافە کۆمەلایەتییەکانیانا و لە پێشی هەموویانەوە ماف دیاری کردنی چارەنووسیان بەدەستی خۆیان، ئەوەبوو لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەلە کۆمەلایەتییەکان، بەلکو سیاسییەکانیش کەوتنە نواندنی چالاکی بە ئاشکراو لە نهێنکاریی جاران ڕزگاربوون و خەباتیان چووە قۆناغێکی ئاشکراوە بۆ بەرەو پێشەوە بردنی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژو بۆ دەست خستنی هەموو مافە دیموکراتییەکانی گەل و پارێزگاری کردن لە دەسکەوتەکانی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژو هێنانەدیی هەموو ئامانجە سیاسییەکانی گەل کە سالەها بوو لە پێناویانا تێئەکۆشا و ڕێگادانی کۆمەلی داکۆکی لە مافەکانی ژنانیش یەکێك بوو لەو ئامانجانەو لە کاری نهێنی دەرباز بوون و هاتنە قۆناغی کاری ئاشکراو قانوونییەوە لە هەموو عێراق و لەناوچەی کوردستانیشا لە ژێر چاودێریی مەلبەندی کۆمەلی سەرەکیدا لە بەغدا"(٦٥).

*** یاداشتی بەهیە فەرەجوللا زەکی مەریوانی:**

"شێخ فەرەجوللا زەکیی مەریوانی لە سالانی ژیانی قاهیرەیدا بوو بووە ئیماندارێکی بەباوەڕی بەهایی و کتێبەکانی بەهائوللاوو ڕێبەرانی تری ئایینی بەهایی لە چاپخانەکەیدا چاپ کردبوو. بەهیە خاتوونی کچی خۆی و مێردە ئەمەریکاییەکەشی هەر بەهایی بوون.

هەندێك نووسراوی بەهیە لەسەرانسەری جیهاندا بلاوبووەتەوە، لەوانە:

بەشداریکردنی لە هەندێك کتێبدا وەك (ئەفریقایی خوێندەوار، ١٩٦٢) یان وەرگێردراوی عەرەبیی نهێنییەکانی شارستانییەتی خوایی نووسراوی عەبدولبەها، بەلێ هەموو تەمەن نووسراوی جۆرج تاونسی هیندو دوو بلاوکراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان بەناوی (مندالەکەتان لە یەك سالانەوە تا شەش سالان و مندالەکەتان داهاتووتانە، ١٩٨٤).

هەر چۆنێك بێت، نووسەر لەلایەن گەلی کوردەوە ڕێزی زۆری لێ گیراوەو دەگیرێت، مەیل و لایەنگری کوردێکی زۆر، کەوەك گەنم یان مندال ئەویندارى بەرنامەیەکی ڕادیۆی بەناوی (صديقة الاطفال) بوون، تا ئێستاش هەر زیندوو ماوەتەوە، بەرنامەیەك کە بەهیە بۆ ماوەی زیاتر لە هەشت سال لەسەر ڕادیۆی بەغدا بەڕێوەی دەبرد.

بەهیە فەرەجولا لەماوەی ژیانیدا یاداشتێکی لە دوو توێی کتێبدا، بەجێ هێشتووە بەناوی (کوردستان ئەی خۆشەویستم) کە گەلێك باسی لایەنی بەهایی و ژیان و یاداشتی لە کوردستان خستووەتە ڕوو کە ماوەیەکیش لە یاداشتەکانیدا ئاماژە بە کەرکوك دەکات.

"ناتوانم ئەمین ڕەواندزی نەجیب زادە فەرامۆش بکەم کە ئەویش هاتنە سەردانم و دایکم و منی بانگهێشت کرد بچین بۆ کوردستان، ئێمەش بانگهێشتنەکەیمان وەرگرت و خۆشیمان لەو میوانداری و میهرەبانی و ئەوینە بینی کە هاوسەرە خۆشەویستەکەی (ناجیة) بۆ ئێمەی پیشاندا.

ناوبراو ژنێکی جوان و سەرنجراکێش بوو، (پیرۆز)ی کچیشیان بەهەمان شێوە، پیرۆز لە کۆلێژی پەروەردەی مامۆستایان قوتابیی خۆم بوو، ئەو و قوتابیانی کوردی تر گەلێك شانازییان بەوە دەکرد کە مامۆستای وانەی سایکۆلۆجیی پەروەردەیان بە (من)ی کورد بوو.

لەو ماوەیەدا کە لە کوردستان بووین، تاسەی ئەوەم هەبوو سلێمانی ببینم، ئەوە هەمان ئەو ناوچەیە بوو کە بەباشی دەمناسی و بۆ ماوەیەکی زۆرپێش وتنیشی، هەستی خۆشەویستیم بۆی هەبوو، هۆکاری ئەوەش ئەوە بوو کە سلێمانی شوێنێك بوو وا بەها ئوللا بناغەی دانەری ئاینی بەهائی، وەك پەناگەیەکی تاکە کەسی خۆی هەلی بژاردبوو و لەوێدا لەگەل خوا ڕازو نیازی دەکرد، لە ڕێگەی ڕۆشتن بۆ سلێمانی.

چەند ڕۆژێـك لە كـەركوك مانەوە، میـوانداری بنەماڵەی ڕەواندوزی بووین، لەوێ دەرفەتی ئەوەمان هەبوو كە چاومان بە كوردانی مەزن و ماڵی تریش بكەوێت. بەتایبەتی ئەحمەد خانەقاو كچەكەی (مریەم خاتوون)، هێشتا ڕووخساریان لەمێشكمدا بە ڕوونی ماوەتەوە.

ئەحمەد خانەقا كوری زۆری بوون ئەوانیشم چاو پێ كەوت. لە بیرمە ماڵێكی گەورەیان هەبوو، كە سۆفییەكان زۆر جار سەردانیان دەكرد.

ئەو سەبارەت بە (بەهائوڵلا) شتی دەزانـی و پێی گوتم كە هەندێك نووسراوی ئەو لەلایەو پێمیان دەدا، بەڵام كاتی كە چوو منەیان بكات وەبیری هاتەوە كە برادەرێكی بە ئەمانەت لێی وەرگرتوون و ئیتر پێی نەداونەتەوە"(٦٦).

*** یاداشتی عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی لە كتێبی (رحلة في العراق أو خاطرات الحسني):**

"لیوای كەركوك لیوایەیەكی چیاییە هیچی كەمترنی لە لیوای هەولێر، گرنگی لەوە دایە كەوتۆتە نێوان دیالەو سلێمانیو هەولێرو هاو سنوورە لە باكوورەوە لە گەڵ وولاتی ئێران.

سەنتەری كەركوك یەكێكە لە شارە كۆنەكانی ئاشووری، كە پاشای ئاشووری (ئاشور ناسربال) لە سـەدەی هەشتەمی پێش زایینی بنیاتی ناوە، كە لە ڕابـردووا بە ناوبانگ بووە بە (گەرگورە) لە دوایدا ناونراوە بە (كەرخ سلوخ) كە عەرەب پێی دەڵێن (شەهرەزوور) كە لە دوایدا بە (كەركوك) ناونراون كە لە ڕووی ئاوەدانییەوە بووەتە دوو بەشەوە:-

قەڵاو دەشتایی، خانەدان و بازرگانەكان و قسەڕۆیشتوو، لە دەشتایدا نشیتەجێن، لە دەشتایدا بازاڕی بازرگانیو كۆگای تێدایە، لە كـەركوك ڕووبـارێـك دەڕوات بە نـاوی (خاسە) كە پێكهاتووە لە لقی ڕووبـاری بچووك.. بچووك كە پێی دەوترێت: قۆرییە، تسعین، زاوییە، بێلاوە، هەموویان لە چیاوە هەڵدەقووڵێت لە دووری (٥٠) كیلۆمەتر.

ئەم شارە دەوڵەمەندە بە كانزاو نەوت و ئاو و بێستان و گەنم، سێ بیری بە ناوبانگی نەوتی لێیە بە ناوی:- گێل، كەركوك، خوورماتوو، ژمـارەی دانشتووانی بە نزیكەی (٤٣٠٠٠) كەس دەبێت. ئاوو هەواكەی ووشك و سەلامەتە، ئاوەكەی سازگار نییە، بەم نزیكانە هێڵی شەمەندەفەری بۆ ڕاكێشراوە (بەغدا- كنگربان)، بازرگانی بە شێوەیەكی گشتی فراوانە، بەرەوفراوان بوون دەچێت ئەگەر هێڵی شەمەندەفەرەكەی بۆ بكێشرێت.

لیوای كەركوك پێكهاتووە لە قـەزاو ناحییە كە قەزاكانی بریتییە لە (الصلاحیە- كفری)، لە گەڵ قـەزای كەركوك، بەڵام ناحییەكانی بریتییە لە مەلحە، تاووق، ئاڵتون كۆپری، قەرەحەسەن، شـوان، كە هەموویان بە نـاوەندی لیواوەوە هاوپەیوەستن بـەڵام قـەرەحـەسـەن، تـووز خـورمـاتـوو، گیل هاوپەیوەستبێ قەزای كفرییەوە.

* ناحییەی مەلحە:

گـونـدێـكی بـچـووكـە، زێـی بـچـووك بـە سـەریـدا دەڕوات، كەپێكهاتووە لە (٢٧) گوند كە ژمارەی دانیشتووانی نزیكەی (٣٠٠٠) كەسە، لە ناویدا مەرقەدی ئیمام ئیسماعیل لە نزیك گەلێك گردۆڵكەی كۆن هەیە.

* ناحییەی (تاووق):

دێیـەكە كـەوتـۆ خـوارووی كـەركـوك پێكهاتووە لـە چەند گوندێك و ژمـارەی دانشتووانی (٢٥٠) كەسە، كە گەلێك بێستان و داروردەختی لێیە.

* ناحییەی (ئاڵتون كۆپری):

شارۆچكەیەكی ئـاوەدانـە، ژمـارەی دانشتووانی زیاتر لە (٣٠٠٠) هـەزار كەسەو پردێكی ئاسنینی لێیە و یەكێكی لە دار دروست كراوە كە زێی بچووك دەیبڕێت، پێكهاتووە لە (٢٧) گوند، كەكەوتۆتە ناوەندی ڕێگای كەركوك - هەولێر.

ناحییەی قـەرەحـەسـەن: شارۆچكەیەكی خەڵكی كەمی تێدایە، كە نزیكەی (٢٠) گوندی لێیە، لە ناوەندی لیواوە بە نۆ سەعات دوورە.

* ناحییەی شوان:

گوندێكە كەوتۆتە سـەرووی ڕۆژئـاوای كـەركوك ژمـارەی دانشتووانی (٣٠٠٠) هـەزار كەسە بە سەر حەفتا گوندا دابەش بووە كە هەموویان لە مۆزەكانی شوانن.

* قەزای سەلاحییە:

ئەم قەزایە پێكهاتووە لە سێ ناحییە كە مەركەزەكەی لە (كفری)یە، شارۆچكەیەكی ئـاوەدانـە كە دەڕوانێـتـە سەر چیایی (شـاهـسـوان)، چـوار سەعات لـە مـەركـەزی لیواوە دوورە، شەقامێكی فراوان دەیبەستێتەوە بۆ (كنگربان) كە خەڵكی دەگوازێتەوە بۆ وێستگەكە.

كفری بەناوبانگە بە پاكی هـەواو سازگاری ئـاوەكـەی لە نزیكییەوە هەندێك كانزای وەكو خەڵووزی بەردی هەیە كە ئەڵمانەكان تا سەردەمانێك لەگەڵ توركەكان لە ڕابردوو بە كاریان دەهێنا.

ناحییەكانی بریتی بووە لە قەرەتەپە، تووزخورماتوو، گێل ناحییەی قەرەتەپە:- شارۆچكەیەكی ئاوەدانە تارادەیەك گرنگییەكی ئەوتۆی ئابووری تێدایە، ژمـارەی دانشتوانی نزیكەی (٢٠٠٠) كەسە.

* ناحییەی تووزخورماتو:

بەراستی ئەم شارۆچكەیە گرنگی هەیە لە ڕووی ئابوورییەوە كاتێك هێڵی شەمەندەفەر بە نـاویـدا دەڕوات: بـەغداد- كەركوك، ئێستا (٢١٠٠) كەس دانشتیووانێتی لە نزیكییەوە گەورەترین چاڵگەی نەوتی لێیە كە بە ناوییەوە ناونراوە.

* ناحییەی گێل:

كەوتۆتە سەرووی ڕۆژهەڵاتی كەركوك، پێكهاتووە لە (٦٧) گوندوو ژمارەی دانشیتوانی (٤١٠٠) كەسە.

*** پاشماوەو شوێنەوارەكانی كەركوك:**

هیچ پاشماوەیەكی ئەوتۆ لەم لیوایەو قەزاكانی نابینین كە جێگەی باس بێت، تەنها پاشماوەی دیواری كڵێسەیەكی كۆن كە لە كاتی كشانەوەی توركەكان لە كەركوك تەقاندیانەوە، لەمڕۆدا هیچ پاشماوەیەكی ئەوتۆی نەماوە، كەبەم كڵێسەیان دەوت كڵێسە سوورەكە، بەڵام هەندێك مزگەوتی گەورە هەیە وەكـو دانیـال پێغەمبەر، مزگەوتی ئەمیر محەمـەد پاشا، ئەرسەلان، تەكییەی مەولوییە، مزگەوتی مەیدان و نوعمان كە

لە باوەرەدام کۆن بێتو حەقی ئەوەی هەیە کە شوێنەوارێکی گرنگ بێت هەروەکو ئەوەی دانشتووانی دەیگێرنەوە"(٦٧).

*** گەشتی (یۆست هیلتەرمان):**

"جێگری بەرێوەبەری پرۆگرامی خۆرهەلاتی ناوەراستو باکووری ئەفریقایە لە گرووپی قەیرانە نێودەولەتییەکان، لە سالی ١٩٩١ بۆ یەکەم جار سەردانی کەرکوکی کردووەو لە ماوەی مانەوەی لەم شارەدا بەم جۆرە باسی دەکات:

".. ئێمە بە ناوچەی شۆریجە تێپەرین، یەکێکە لە شارۆچکە کوردنشینەکانی نزیك کەرکوك، بلدۆزەرەکان خانووەکانیان دەرووخاند، کەرپوچەکانیان لە ژێر یەك دەردەهێنا، ماوەیەك دوای ئەوە بۆم روون بووە کە بلدۆزەرەکان نزیك دەبوونەوەو دواتر دەنگی بەرز دەبێتەوە، رژێم دانیشتووانی ئەو ناوچەیەی سزا دەدا بە هۆی بەشداریکرنو پالپشتیکردنی چەکدارەکانو دوای چەند رۆژێك کوردەکانی لە شارەکە راگواستو خانووەکانی تێکشاندن.

ئەوەی من بینیم لە کەرکوك لە نیسانی (١٩٩١) ئەوەبوو کە پیاوانی رژێم شوێنی کوردەکانیان دەگرتەوەو دوای جەنگی کەنداو راپەرینیان بەکارهێنا وەك پالنەرێك بۆ ئەوەی بە عەرەبکردنی زیاتر لە کەرکوك ئەنجام بدەن، گەورەکراوەو گۆردراوە بۆ چەکێکی سیاسی، هیچ گومانی تێدا نییە کە سیاسەتی درێژخایەنی بە عەرەبکردن دووبارە گەراوەتەوەو لە عێراق سەریهەلداوەتەوە، هەروەك لە دوای (٢٠٠٣) کوردەکان بە زۆر دەگەرێنرێنەوە، بە دوای ئەوەدا دەگەرێن نەك تەنها بۆ بەدەستهێنانەوەی شتە لە دەستچووەکانیانو دروستکردنەوەی خانووەکانیان بەلکو بۆ لکاندنی کەرکوك بە هەرێمە ئۆتۆنۆمییەکەیان، ئاواتێکە کە عەرەبو تورکمانەکان بە توندی لە دژی دەوەستنەوە، لەگەل مانەوەی ناکۆکییەکانی پارێزگا کە بە چارەسەرنەکراوی کێشەی کەرکوك بووەتە گەورەترین دابەشکەرو گەورەترین کێشەی ناوەندی لە سیاسەتی ئەمرۆی عێراقدا"(٦٨).

*** بیرەوەرییەکانی (عەلی ئەکبەر خانی سەنجاوی - سەردار موقتەدر) لە کەرکوك:**

* جێگیربوون لە کەرکودا:

ماوەی مانەوەمان لە سلێمانی دوانزە رۆژ بوو، رۆژی دەهەم سەر لە نوێ دیدەنیم لە پارێزەر کردو سەیرم کرد سەبارەت بەو قسانەی کە لە دانیشتنەکەی پێشوودا ووتبووی پەشیمانەو تکای کرد کە ئەو قسانە لە روانگەی دۆستایەتییەوە سەیر بکەم، وەك دانوستانێکی تایبەتیو نافەرمی بزانم، سەبارەت بەو قسانە لەگەل کەسدا باسی نەکەم.

عاشر بەگ فەرماندەی گشتی هێزی کەرکوك تەلوگرافێکی بۆ قووماندانی گشتی کردبوو فەرمانێکی دابوو کە ئێمە بەرێزەوە بەرەو کەرکوك ببەن، مووچەی خۆمانو ئالیکی دوو رۆژی وولاخەکانی سوارەکانمان لەگەل دوو سەدو پەنجا مەجیدی پێشکەشمانی کرد هەر ئەو شەوە کە بریاربوو



عەلی ئەکبەر خانی سەنجاوی

بۆ سبەی بۆ کەرکوك برۆین چەند کەس لە سوارەکانمان لە نارەحەتیدا هەلهاتن. سولەیمانی خزمەتکارم تفەنگەکەی دایەوەو پیادە بەرەو ئێران گەرایەوە.

لە هێلی رێگاکەماندا بەرەو کەرکوك پێویست بوو کە لەنێوان تایفەکانی ئەحمەد وەند (هەمەوەند) (حەمەوەندی چەلەبی) تێپەرین. ئەم تایفەیە لەو دەورو زەمانەدا کە ئێمە بەرپرسی پاراستنی سنووری قەسری شیرین بووین زۆربەی کات دەست درێژییان دەکردە سەر سنووری ئێران، زۆر جار لەنێوان ئێمەو ئەواندا دەرگیریو لە یەکدان روویدەداو چەند کەسێك لە ناودارەکانو بەگزادەکانیان کوژرابوون، بە تایبەت لە شەرێکدا کە لە گەل خۆمدا لە دەورەی حوکمرانی ئیقبال ئەلدەولەو عەلائەلدەولەدا روویدا حەوت کەس لە سەرکردەکانیان کوژران. چونکە رێگای تێپەرین هەر ئەو رێگایەبوو بە بەرژەوەندیمان زانی بەپێی دابو نەریتی عێلایەتی وەك میوان برۆینە مالەکانیان، دەمانزانی لەلایەن پارێزگارو فەرماندەی هێزی کەرکوکەوە فەرمانیان بە لێپرسراوانی نێو رێگاکە دابوو کە ئاگاداریمان بکەن.

شەو کەوتینەرێ دوای رۆژێ لەگەل خۆرهەلاتندا نزیکی بازیانو چەمچەمال بووینەوەو رۆیشتینە مالی کەریم بەگی کوری فەتاح بەگی هەمەوەند کە لە حەقیقەتدا سەرۆکی هەموو هەمەوەندەکان دەژمێردرا، نزیك بووینەوە، بە بینینی سوارەکانمان بەپەلە کەریم بەگی خۆی لەگەل چەند کەسێکدا کە لەگەلیدا بوو لە بەرزاییەکی پشت مالەکەیەوە سەنگەری

گرتو ژنو منالەکەی لە ماڵ هێنایە دەرەوە، زانیمان ئەم ترسانە بە بۆنەی ئێمەوە نییە، بەڵکو لە بەر کینەو دوژمنایەتییە کە عێلاتی کورد سەبارەت بە تورکەکان هەیانە. سوارێکمان بەتاو نارد کە کەریم بەگ خۆی بە ئێمە بناسێنێت، لەلای جۆگەی ئاوێکدا پیادەبووینو سەرو ڕوومان شۆرد. بە خۆمان پێدەکەنین دەمانگووت ئایا عەشیرەتو عێلێك هەیە کە لەگەڵ ئێمەدا دوژمن نەبێت؟ هەر کە سوارەکەمان نزیکی کەریم بەگ بووەوەو پەیامەکەی پێگەیاند لە سەنگەرەکەی هاتە خوارەوە، ژنو منالەکەی گەڕاندەوە، خۆی هاتە پێشەوەو بە میهرەبانیو ڕووخۆشییەوە بردینیە ماڵەوەو خزمەتێکی باشمانی کرد. دوایی لە ڕێی خێرخوازییەوە وتی بە بەرژەوەندی نازانم برۆنە کەرکوك، عوسمانییەکان تا ئەو کاتەی پێویستیان هەیە دۆستو میهرەبانن، بەڵام هەر کە پێویستییەکەیان نەما هەمووان فەرامۆش دەکەنو لەبیری دەبەنەوە، دڵنیابن کە خێرێ لەوانەوە دەستگیرتان نابێت. قسەکانیم سەلماندو وتم: ناچارینو دەبێت لەم ڕێگایەدا بەردەوام بین. شەوو ڕۆژێك گلی داینەوە دوایی کەوتینە ڕێ وپێش نیوەڕۆ گەیشتنە چەمچەماڵ. قائیمقامی ئەوێ لەگەڵ مەحمود ئاغای ئەحمەدوەندو کورەکەی فەقێ قادر هاتنە پێشوازیمانەوەو ئێمەیان لە جێگای ئەفسەرەکانی تورکدا جێکردەوە، کە شوێنێکی خاوێن بوو. خواردنی نیوەڕۆیان هێناو خواردمانو بۆ خواردنی ئێوارە قائیمقام بۆ ماڵی خۆی دەعوەتمانی کرد، دوای شام خواردن گەڕاینەوە ماڵەکەمان.

مەحمود ئاغای ئەحمەدوەند کە بە (مەحمود خدر) بەناوبانگە کە پلەی تابور ئاغاسی لە لەشکری عوسمانیدا هەبوو بۆ دیبەنیمان هات. بێ ئەوەی خۆی یان یەکێکی تر لە تایفەکانی هەمەوەند لەلایەنگیری ئینگلیسەکان بن لە ڕووی دەمارگیری عێلایەتیو کوردایەتییەوە ئامۆژگاریمانی کرد کە دەوڵەتی عوسمانی جێ پەنای لێقەوماوان نییە، ئێمە ئەمانە دەناسین دڵنیابە لە جێی چاکەدا خراوەتان لە گەڵدا دەکەن. بەڵام کاری ئێمە لەم قسانە تێپەڕیبوو، پێش خۆرهەڵاتن چەمچەماڵمان بەجێهێشت، لاهوتی خان لەگەڵ ئەو هەموو هاندانەدا لە هەڵەبجەو سەرپێچی لە بیروباوەڕ کە قسەکانی سەرکردەکانی عەشایری ئەحمەدوەندی بیست بیروباوەڕی گۆڕی، هەر ئەو شەو کە بڕیاربوو لە چەمچەماڵ لە (سیکە) سەیفوڵا خزمەتکارەکەی سالار زەفەر کە گاڵتەچی بوو لێی نارەحەت بوو، ئەوەی کردە بەهانەو بە تۆرانەوە لە ئێمە جیابووەوە، تا خۆرهەڵاتن هەرچی گەڕاین ئاسەوارێکمان لێ پەیدا نەکرد، بەناچاری ڕێگەمان گرتەوە بەر. نزیکی کەرکوك لەلای کانییەکدا پیادەبووینو ئەم جارەیش ئیسماعیل خانی موجاهیدمان بۆ ئامادەکردنی ماڵی بۆ شار ڕەوانە کرد شەومان هەر لەو شوێنەدا بردە سەرو سبەی گەیشتینە دەروازەی کەرکوك، ماڵەکەمان لە قوتابخانەی پیشەسازیدا بوو، ماڵی سوارەکان لە سێ خانودا لە نێو شاردا دەست نیشانکرابوو جێگاکانمان کەمێ دووری ماڵەکانی سوارەکانمان نەبێت خراوییەکی ئەوتۆی نەبوو. یەك سەعاتی مابوو بۆ ئێوارە سەیرمان کرد سەروکەلەی لاهوتی خان لەگەڵ دوو سواری هەمەوەندا پەیدابوون.

لەگەڵ یەکێ لە هاورێکانیدا هاتە سەرەوە نامەیەکی دا بە دەستمەوە، نامەکە لە مەحمود خدرەوە بوو کە سەبارەت بە لاهوتی بوو کە شەفاعەتی لێکردبوو. مەعلوم بوو کە هەر ئەو شەوە لە ئێمە جیابوتەوە ڕۆیشتوەتە ماڵی موشیر ئاغای کوری مەحمود سلێمانی هەمەوەندو لەوێوە ڕۆیشتوەتە ماڵی مەحمود خدر کە شەوێك لە مەوپێش لای ئێمە دژی عوسمانییەکان دەدوا، بەو بڕوایەوە کە ئەو لایەنگری ئینگلیسەکانە، لەگەڵدا بنێرێت. مەحمود خدر پێی دەڵێت مەگەر لە سەردار موقتەدر چی خراوەو سوکییەکت بینیوە کە دەتەوەێ لێی جیابیتەوەو برۆیتە لای ئینگلیسەکان، ئاشکرایە پیاوێکی خراو وبەدتەشەی، هەروەك لە ماڵی منەوە تا ئۆردووی ئینگلیسەکان پتر لە پێنج سەعات دوورتر نییە، ئەم کارە ناکەم، وئەگەر لە ماڵەکەمدا نەبوایەی لە ژێر چاودێریدا ئەمدایت بە دەستی عوسمانییەکانەوە، بەڵام ئەمجارەیش ناچاریت برۆیتەوە خزمەتی سەردار موقتەدر، بتەوێ یان نەتەوێ. لەگەڵ دوو سواردا ناردبوویەوەو نامەیەکی دۆستانەی بۆ شەفاعەتی نوسیبوو. نامەکەم خوێندەوەو پێم گووت شێتێتییەکەی تۆ نوێ نییە. بە زەبوونییەوە تکای کرد نامەکەی مەحمود خدری بدەمێ وتم دەزانم دەترسی نیشانی عوسمانییەکانی بدەم، دڵنیابە ئەو کردەوە لەمن ناوەشێتەوە.

عەسری هەر ئەو ڕۆژە عاشر بەگ فەرماندەی هێز، خەیری بەگ بەرپرسی ئەرکانی شەر لەگەڵ پزیشکێکی فیرقەدا بۆ دیبەنیمان هاتن. دوای ڕۆژێك لەگەڵ سالار زەفەرو سالار موقتەدر ولاهوتی خاندا بۆ دیداری عاشر بەگ ڕۆیشتین. دوای دانوستانێك سەبارەت بە کوشتن وتالانی سەنجاوی دیلیی سەردار ناسر، پرسی ئێستا چی جۆرو کۆمەكو یارمەتییەکەت دەوێ؟ من سەر لە نوێ پێشنیازەکانی خۆمم دووپات کردەوە. وتی بێ فەرمانی فەرماندە پایە بەرزەکان ناتوانم لە خۆمەوە بەڵێنێکی دیاریکراوتان بدەمێ، بەڵام چونکە فەرماندەی ئەم جەبهەیە عەلی ئیحسان پاشایە تۆیش بە چاکی دەناسێ، منیش کە عاشر بەگم لە پێشینەی موجاهەدەتو خەباتی تۆ ئاگادارم دڵنیام کە هەموو جۆرە یارمەتیو کۆمەکێ بە تۆ دەکات، ئێستاکە پێویستە چاوەڕوان بین تا عەلی ئیحسان پاشا لە ئەستەمبوڵەوە دێتەوەو دەگاتە جێگای فەرماندەیی خۆی. دوایی سەبارەت بە ژمارەی سازو چەكو بەرگی ئینگلیسەکان لە ئێراندا پرسیاری کرد، منیش ئەوەی دەمزانی بۆم گێڕایەوە.

عاشر بەگ ئەفسەرێکی ئازاو دلێرو فەرماندەیەکی لایقو کارامەو ڕەوشت بەرزو لە بنەچەکی چەرکەسییەکان بوو نزیکەی یەك ساڵ سەرۆکایەتی ئەرکانی شەری خەلیل پاشای لە ئەستۆدا بووە، دوو مانگ لە مەو پێش فەرماندەی فیرقەو هێزی کەرکوك بە ئەستۆی عەلی بەگەوە بوو، ئینگلیسەکان لە ناکاو هێرشیان هێنایە سەر کەرکوك، ئەم هێرشە بووە هۆی غافڵگیر بوونیانو بە تۆمەتی کەمتر خەمییەوە عەلی بەگیان لە فەرماندەیی فیرقەی کەرکوك بەلاوەنا، عاشر بەگیان خستە شوێنەکەی.

ئەو فیرقەی کە لە ژێر فەرمانی ئەودا بوو بریتی بوو لە

هەشت هـەزار سەرباز کە سێ هـەزار سەربازی لە جەبهەی تـاوغ‌و خـورمـاتـوودا بـوون‌و نـزیـکـەی چـوار هـەزاریـان لە دەوروبـەری کەرکوکدا بوون. هەموو ڕۆژێك بەیانی، نیوەڕۆ وعەسر لەلایەن مامۆستایان‌و ئەفسەرانی ئەڵمانییەوە بە مەشقکردن سەرگەرم بوون، نەخۆشەکان‌و زامدارەکان لە سێ بیمارستانی ئامادەکراودا تیمار دەکران، نزیکەی هەزار کەس بەرپرسی وەسایل‌و ئەبزاری هاتوچۆو سازو بەرگ بوون کە هەموو ڕۆژێك ئازووقەیان دەهێنایە نێو شارەوە، ئەم فیرقە هەشتا مەتریلۆزو شانزە تۆپ‌و پێنج فڕۆکەو تەلوگراف‌و بێ تەلی هەبوو بە ڕێکوپێکییەوە کارەکانیان هەڵدەسوڕاندو دەگەیاندە ئەنجام. عاشر بەگ هەموو ڕۆژێـك بەیانی یان عەسر سەرکێشی لە ئۆردووگاکە دەکـردو بارودۆخەکەی چاودێری دەکردو لەگەڵ ئەفسەر وسەربازەکاندا خواردنی دەخواردو گفتوگۆی لەگەڵیاندا دەکردو هەمووان خۆشیان دەویست.

ڕیـزدارانـی کـەرکـوك‌و لـێـپرسـراوانـی دەوڵـەتـیـش هاتنە دیبەنیمان شێخ مەحمود کە دەست بەسەر بوو نامەیەکی بۆ عاشر بەگی نووسیبوو، داوای بینینمی لێکردبوو، مۆڵەتیان داو لە ژێر چاودێری شەش سەربازی چەکداردا هاتە ماڵمان. ئەو یەك سەعاتەی کە لەگەڵ یەکدا بووین سەربازەکان لە هۆدەکەی سەربازەکاندا بوون. شێخ سەبارەت بە ستەمی تورکـەکان‌و مەزلومییەتی میللەتی کورد قسەی کرد بێ ئەوەی ووشەیەك سەبارەت بە دۆستی ئینگلیسەکان باس بکات. دوایـی عوسمانییەکان ئـەفـسـەرە ئەڵمانییەکان‌و پزیشکەکان بۆ دیبەنیمان هاتن، سالار زەفەر دوو ڕۆژێك بوو نەخۆش بوو دیاربوو سەرمای بوو بوو، پزیشکە ئەڵمانییەکە کە تەوقەی لەگەڵیدا کرد پێی گووت تۆ تایەکی زۆرت هەیە ئایا موعالەجەت کردووە؟ سالار ووتی شتێکی گرنگ نییە وابزانم ئاڵەمەتمە. پزیشکەکە ووتی خەیر، ئەمە ئاڵەمەتی سادە نییە، ئەمە نەخۆشیەکی سرایەتدارە کە ئەنفلۆنزای نـاوە، لە ئـاسـیـاوەوە دەرکـەوتـووەو بە هەموو ئـەورووپـادا بڵاوبوەتەوەو گەیشتۆتە ئەیراش، فەرمانی دەرمان‌و پارێزو ئیسراحەتی پێدا. لە مـاوەی دوو ڕۆژدا هـەر پـەنجاودوو کەسەکەمان تەنها لاهوتی خان نەبێت، تووشی ئەو نەخۆشیە بووین. قوتابخانەی پیشەسازی جێگاکەمان سەرداوێکی لە ژێـر زەویـدا هەبوو بیست کەسیمان لـەو ژێـر زەویـیـەدا خەوتین‌و پاشماوەی سوارەکان لە ژێر چاودێری پزیشکیدا لە ماڵەکەی خۆیاندا مـانـەوە. پزیشکەکانی عوسمانی بە میهرەبانی‌و نەوازشتەوە هەموو ڕۆژێـك دووجـار بۆ تیمار وبینین‌و سەرکێشیمان دەهاتن، چاودێری چاکیان لە یاد ناچێتەوە.

لەو کاتەوە گەیشتینەتە کەرکوك بەرپرسانی ئەڵمانی بەرپرسی تەلوگراف (بێ تەل) ڕاپۆرتی هاتنمانی بە کونسولی ئەڵمانی دانیشتووی موسڵ ڕاگـەیـانـدبـوو، لـەم کـاتـەدا کـارووبـارو کێشەی ئێران لە وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمان لە ژێر چاودێری مسیۆ نادولنی بالیۆزی پێشووی ئەڵمان لە ئێراندا بوو، کە بە چاکی ئێمەی دەناسی‌و سەبارەت بە ململانێ‌و خەباتمان دژ بە ڕووسەکان بە تەواوی ئاگادار بوو. ڕۆژێ هێشتانە کە لە ژێر زەوییەکەی قوتابخانەی پیشەسازیدا خەوتبووم دەنگی ئۆتۆمبێلێکم لە بەرامبەر ماڵەکەماندا بیست خەبەریان هێنا کە یەك نەفەر ئەڵمانی دەیەوێ تۆ ببینێ، لاوێك بوو لە تەمەنی سی‌و حەوت هەشت ساڵدا، بەموییەکی ڕەشەوەو باڵایەکی بـەرزەوە هاتە سـەرداوەکـەوە، بیست کـەس بە نەخۆشی لەگەڵ یەك یاریدەی پزیشکدا بینی زۆر نارەحەت بوو، بێ ئەوەی پارێزبکات لەگەڵ من‌و سالار زەفەرو سالار موقتەدردا تەوقەی کردو خۆیی بەناوی زیلەر کونسولی ئەڵمان لە موسڵ ناساندو ووتی ماوەیەك لە ئێران بوومەو دوایی کەوتوومەتە دیلی ئینگلیسەکان‌و لە دەستیان هەڵهاتوومە لەنێوان عەشایەری ئێراندا بەجلوبەرگی گۆڕاوەوە گەیشتمە قەسری شیرین. دوایی زەرفێکی دەرهێنا دای بەدەستمەوە، ووتی تەلوگرافێکە کە لەلایەن دەوڵەتی ئەڵمانەوە پێم گەیشتووەو فەرمانم پێدراوە کە بێمە کەرکوك‌و پیرۆزبایی هاتنتان لێ بکەم‌و بە پێی ئەم تەلوگرافە لە تۆ بانگهێشت کراوە لەگەڵ سەرکردە کانی سەنجاوی چەند خزمەتکارێکدا بۆ بەرلین برۆن‌و ببیتە میوانی دەوڵەتی ئەڵمان. لە وەڵامی قسەکانیدا سوپاسم کرد، ووتم بەداخەوە کە هەنووکە لەبەر دوو هۆ ناتوانم ئەم دەعوەتە نەقبوڵ بکەم‌و نەرەتی بکەمەوە. زیلەر سەبارەت بە هۆکەی پرسی، ووتم دەزانـی کە چی زیانێك تووشی تایفەی سەنجاوی بوو؟ ئێمە ئومێدو چاوەڕوانین هەر لەو شوێنەدا لەلایەن دەوڵەتی ئەڵمان‌و عوسمانیەوە یارمەتی بدرێین تا بتوانین تۆڵەی خۆمان بکەینەوە. هۆکەی تر ئەوەیە ئێمە ئێستاکە لەنێوان عوسمانییەکانداین وەکو دەزانیت هەر ئێرانییەك لەگەڵ ئێوەدا دۆست بێ دەکەوێتە بەر تانەو تەشەرو دوژمنایەتییان، ڕووداوەکـەی سلێمان مـیرزام وەك نموونە گـەڕانـدەوە. وەڵامـی دایـەوە لەپێشدا وەها بووە بەڵام ئێستاکە توانای ئەو جموجوڵانەیان نەماوە، سەرلە نوێ بۆچوونمی سەبارەت بە قبولـکردنی دەعوەتی ڕۆیشتن بۆ ئەڵمانی لێ پرسیم. ووتم چاوەڕوانی ئێمە لە ئێوە لە بانگهێشتی ڕۆیشتن بۆ ئەڵمان گەورەترە. پرسی چی جۆرە یارمەتییەکە کە دەتەوێت دەوڵەتی ئەڵمان بۆت فەراهەم بکات؟ ووتم پێنج هەزار تفەنگ‌و لەگەڵ هەر تفەنگێکدا هەزارو پێنج سەد فیشەك، دە مەتریلۆز وچوار تۆپی کێوی لەگەڵ چەند ئەفسەرێك پلەدارداو مەبلەغێك پوول‌و پارەی کاف بۆ دلڕاکێشان‌و ئامادەکردنی موجاهیدینەکانی عەشایەر، جگە لەمانەدوو تابور سەربازی عوسمانی یاریدەرمان بێت، بەم یارمەتییەوە بەڵێنت پێدەدەم هەموو عەشایری ڕۆژئـاوای ئێران دژی ئینگلیسەکان ڕاپەڕێنم‌و وەزع‌و بارودۆخیان لە دەڤەری ڕۆژئاوای ئێراندا شڵەژاوە.

زیلەر هەموو ئەم داخوازیانەی یاداشت کردو ووتی چۆن کونسولی فەرمی موسلم پێویستە ڕووداوی مامورییەتەکەم بۆ عاشر بەگ بگێڕمەوە. لە ماڵی منەوە یەك ڕاست بۆ دیبەنی ئەو ڕۆیشت، دوای بینینی لە جێگای مانەوەی ئەڵمانەکانی نیشتەجێی کەرکوك جێگیر بوو. دوای ڕۆژێك کە بۆ دیبەنی ڕۆیشتم بیروباوەڕی عاشر بەگم سەبارەت بە دەعوەتەکەمان بۆ ئـەڵمـان لێپرسی، ووتـی پرسی لێم سـەردار موقتەدر دەعوەتەکانی قبوڵ کردووە یا خەیر، وەڵامم دایەوە هەنووکە

نەقبوڵی کردووەو نەڕەتی کردوەتەوە، زیلەر دوای چەند ڕۆژ مانەوە بۆ موسڵ گەڕایەوە. خەبەر گەیشت کە عەلی ئیحسان گەیشتوەتە مەقەڕی فەرماندەییەکەی، لەبەر نەخۆشی منو سالار زەفەر هێشتانە بە تەوای خاس نەبووبووینەوە لاهوتی خانم ناردە لای عاشر بەگ لە پێش هەموو شتێکدا لەم ماوەدا لەبەر نەخۆشی نەمانتوانیوە بێین بۆ لای لەم بارەوە داوای لێبووردنمان بۆ بکات.
دووەم تکا بکات ئێستاکە عەلی ئیحسان پاشا گەڕاوەتەوە بۆ موسڵ وەزعی ئێمە زووتر یەك لا بکاتەوەو ئەگەر بە پێویستی دەزانێ خۆم بۆ موسڵ دەڕۆم و لەگەڵیا دانوستان دەکەم. زۆری پێنەچوو لاهوتی خان بە پەرێشانیو ڕەنگ تێپەرینەوە گەڕایەوە. پرسیم چی ڕوویداوە؟ ووتی ئیمچە شەڕێکم تووشبوو. ووتی کە گەیشتمە ماڵی عاشر بەگ بە پاسەوانەکانیم گووت دەمەوێ عاشر بەگ ببینم لەلایەن سەردار موقتەدرەوە هاتووم لەگەڵ قوماندانداا گفتوگۆ بکەم ئاجوودانەکەی هەواڵەکەی گەیاند. عاشر بەگ بە تووڕە بوونو ئالۆزییەوە هاتە دەرەوە، وەکو بۆمبایەك تەقییەوە، ووتی تۆ بۆچی هاتوویتە ئەیرا؟ ووتم لەلایەن سەردار موقتەدرەوە هاتووم. ووتی خەیر خەیر سەردار موقتەدر کارێکی لەگەڵ ئێمەدا نیە، کاری ئەو لەگەڵ ئەڵمانەکاندایە، بێ ئەوەی مۆڵەتم بداتێ، وەڵامێکم بداتەوە چووە هۆدەکەیەوە. منیش سالار زەفەرم هەروەك هێشتانە نەخۆش ولاوازبوو نارد کە بە عاشر بەگ بڵێت ئێمە لە تۆ چاوەڕوانی میهرەبانی وکۆمەكویارمەتیو دۆستایەتی بووین، ئەگەر ئەو بێ لوتفیو کەم نەوازشتییە لەگەڵ لاهوتی خاندا بەهۆی دەعوەتی ئێمە لەلایەن ئەڵمانەکانەوە بووە، خۆ ئێمە ئەم داخوازییەمان لە ئەڵمانەکان نەکردووە، ئەوان مەحەبەتو نەوازشتیان نواندووە، بەڵام ئێمە هێشتانە بانگهێشتەکەیانمان نەقبوڵ کردووەو نەڕەت کردۆوەتە، ئێمە چاوەڕوانی دەوڵەتی عوسمانین چی بڕیارێك سەبارەت بە ئێمە دەدات. عاشر بەگ لە سالار دەپرسێ سەردار موقتەدر دەعوەتی ئەڵمانەکانی قبوڵکردووە یان خەیر؟ سالار وەڵام دەداتەوە هێشتانە قبوڵی نەکردووەو ئەگەر لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە بێ لوتفی نەکرێت قبوڵی ناکات وبەودەعوەتە ڕازی نابێت، عاشر بەگ دەڵێ لەم حاڵەتەدا منیش لە هاوکاریو هاوڕێیەتیتان درێغی ناکەم، هەر ئەم یەك دوو ڕۆژە لەگەڵ پاشادا دانوستان دەکەم ئەنجامەکەیشی پێتان ڕادەگەیەنم. (سەید ڕۆستەم ئەفەندی) برای خوالێخۆشبوو سەید وەلەد ئەفەندی لە سەیدە ڕێزدارەکانو دەست ڕۆیشتووی ئەهلی حەقی ئەو دەڤەرەیە، دەعوەتمانی کردبوو کە چەند ڕۆژێك بڕۆین بۆ ماڵیان لە تاووغ، من لەبەر چەند هۆیەك داوای لێبووردنم کرد کە ناتوانم خۆم بێم بەڵام زەفەرو سالار موقتەدرم لەگەڵ دە سوارێکدا نارد بۆ ماڵیان ڕۆژی دوای ڕۆیشتنی سالار زەفەر عاشر بەگ هاتە دیبەنیم، دوای داوای لێبووردن ووتی پاشا حەز دەکات خۆت لە موسڵدا ببینێ ئەگەر سوار لەگەڵ خۆتا نەبەیت بایتۆن ئامادەیە سبەی بۆ موسڵ بتبات[٦٩].

*** کەرکوك پاشەڕۆژی منی دروستکرد، لە کەرکوکیشدا بوومە کادیرێکی ڕێبازی کوردایەتی:-**

خالید دلێر

شاعیرو سیاسەتمەدارو هونەرمەند (خالید دلێر)، ماوەیەکی دوورو درێژ لە شاری (کەرکوك) ژیانی بەسەربردووەو برا گەورەی شەهیدی سەرکردە (جەعفەر عەبدولواحید)ە.
سەرەتا کەرکوك بۆ ژیانی تایبەتی من زۆر گرنگ دەگەیەنێ، من لە ساڵی (١٩٥٢)لە (کۆیە) گیرام و دراینە (مەجلیسی عورفی عەسکەری)و ئیدانە کرام، حوکمیان نەدام، (ئیفراجیان کردم – واتە بەریاندام)، ساڵی دوایی چوومە (بەغدا)، تا لە کۆیە نەمێنم بەو هیوایەی بە ڕۆژ ئیش بکەم و بە ئێواران بخوێنم، ساڵی (١٩٥٤) چوومە کەرکوك، لەوێ خۆم گرتەوە، (زێبا)ی خوشکم و (جەعفەر)ی برام هێنایە لای خۆم، ئەوانیش خوێندنیان لە کەرکوك تەواوکرد، ئەمنیش ئامادەییم تەواوکرد، لە (کۆمپانیا)ی نەوت دامەزرام، سەرەتا شۆڕشی تەممووزی (١٩٥٨) ڕوویدا، ئەو کاتە من ئەندامی (پارتی) بووم، پارتی جەماوەرێکی زۆری لە دەور کۆبووبۆوە، ڕێکخەرمان کەمبوو، ئیشێکی زۆرم لە ئەستۆ گرتبوو، کەرکوك بە نسبەت من ئەو شوێنەیە کە تیایدا خۆمگرتەوە، لە کەرکوك پێگەیشتووم، خوشك و براکەم دامەزراند، خۆم لە پارتی دەورێکی گرنگم هەبوو، خەباتکردنێکی چاکم تیادا کرد، من بڕوام بە خۆمە گەر بڵێم خزمەتی میللەتم کردووە، خزمەتی شارەکەم کردووە.
کەرکوك لەلای من بەقەدەر (کۆیە)و (قەڵادزە)، کاریگەری لە ژیانی من کردووە، من لە مێژە کەرکوکم بە شارێکی پیرۆز داناوەو سەرەتا ئەوە هاتە خەیاڵم ناوی بنێم (قودسی کوردستان)، بەڵام لە دواییدا بەو ناوە ڕازی نەبووم، کەرکوك لە (قودس) پیرۆزترە، قودس شارێکی پیرۆزی ئایینییە، بەڵام کەرکوك شارێکی پیرۆزی ئابوورییە، ئەگەر کەرکوك بە شارێکی عادەتی سەیر بکەین غەدرە، شارێکە بۆ کورد لە قودس گرنگترە، لایەنە ئایینییەکەی ناڵێم قودس لەلای ئیسلام و دیانەوە پیرۆزە، بەڵام کەرکوك بۆ کورد شاری خەبات و خۆڕاگرتن و نەبەزینە، (شۆڕیجە)و (ئیمام قاسم)و (ڕەحیم ئاوا)و (تەپە)و (قۆرییە)و (گەڕەکی شوان)، ئەوانە بە سەدان کۆبوونەوەیان تێداکراوە، بەسەدان گەنجیان پێگەیاندووە، خەباتی کوردستان بناغەکەی کەرکوکە، هەروەها لە هەموو شارەکان خەباتی کوردایەتییان تێداکراوە، ئەگەر لەسەر کەرکوك قسە بکەم، نابڕێتەوە، کەرکوك لە کۆنەوە سەرچاوەی بزووتنەوەی کوردایەتی بووە، خەڵکی کەرکوك لە پێناو (بابە گوڕگوڕ)و نەوتەکەیدا قوربانییان داوە، میللەتەکەی شۆڕشگێڕە، ئەگینا شارەکانی تری کوردستان هیچیان لەم کەمتر نییە.
سەرەتا من بە منداڵی جارێکیان کەرکوکم دی، لەگەڵ خاڵە (سەعید)م چووینە ماڵێك نزیك مەرقەدی (ئیمام قاسم) بووە، کەرکوکم نەدی، تەنها بە گەراجدا تێدەپەڕیم. بەڵام جاری

دووەم کە هاتمەوە کەرکوك، لەوێ بۆ ئەوەی بژیم، لەوێ خۆمگرتەوە، لەوێ ژیانی براو خوشکەکەم دابین کرد، لەوێ وەك گەنجێك دەرکەوتم، لەوێ ڕێزێکی تایبەتیم لای خەڵکی کەرکوك هەبوو، کەرکوك واتە پێگەیشتنی خالید دلێر، منیش ڕێزێکی تایبەتیم بەرامبەر خەڵکی کەرکوك داناوە، بوونم لە کەرکوك وەك خەباتکەرێکی نەتەوایەتی پێشکەوتنخواز، منی زیاترو قووڵترکرد، کەرکوك شاری کرێکارانی کوردستانە، میللەتی ئەو شارە لە کۆمپانیاکانی نەوتی کەرکوك ئیشیان دەکرد، لە شارەوانی لە کارەبا، لە ئوتێلەکان، لە (شۆڕیجە) و (جووت قاوە)، نموونەی کرێکاری خەباتکەر بوون. کە چوومە کەرکوك کاك (تایەر) برای شەهید (عومەر دەبابە) یارمەتیدام، یەکەمجار لەسەر پاسەکانی (ئەحمەد جاسم) کە کۆمەڵێك پاسی هەبوو، من بووم بە (جابی – پارە کۆکەرەوە)، فێری (ئۆتۆمبیل) نەبوومو دەرشامەوە، ڕۆژی (٢– ٣) جار دەرشامەوە، بەڵام ناچار بووم، لەبەر بێ نانی ئەو ئیشە بکەم، بەڵام هەموو (جابی)یەکان فێڵیان دەکرد، پارەیان وەردەگرتو بلیتیان نەدەدا، بۆیە من ئەوەم نەدەزانی دەریان کردم. چوومە (کۆمپانیای نەوتE mployme)و عەریزەیەکمدا، ئەمە بەسەرهاتێکی خۆشە بۆتانی دەگێڕمەوە، چوومە بنکەی دامەزراندن، داواکارییەکم پێشکەش کرد، دەبوو بیدەمە (قادر دارا) کە باش کاتبی ئەوێ بوو، خەڵکێکی زۆر ڕیز بووبوون، هەرییەکە داواکارییەکی پێبوو، نۆرەیان گرتبوو، قادر دارا بە نۆرە داواکارییەکانی وەردەگرتو وەڵامی دەدانەوە، ئەمنیش سەرنجم لەو پیاوەدا قسە دەکا زمانی دەگرێ، ئەمنیش لاڵم، چیبکەم بچمە لای ئەو ئەترسم وابزانێ لاسایی دەکەمەوە، کە نۆرەم هات، نەچوومە لای ئەو چوومە لای بەڕێوەبەری دامەزراندن، بەڕێوەبەرەکە جامخانەیەکی گەورەی لەبەردەم بوو، لە پشتییەوە فەرمانبەرەکان تیایدا دانیشتبوون، چوومە لای بەڕێوەرەکە بە (عەرەبی) پێیگوتم: برۆ لای قادر. گوتم: ناچمە لای قادر. گوتی: بۆ؟ گوتم: من لاڵو ئەویش لاڵ دەترسم بمداتە بەرشەقو کەوتەپێکەنین، بەڕێوەبەرەکە کابرایەکی (موسڵاوی) بوو، ناوی (محب احمد الجليلي) بوو، یاسای تەواو کردبوو، جێگری بەڕێوەبەری دامەزراندن کەوام گوت، کەوتە پێکەنین، پێکەنینێکی گەرم، جەرەسێکی بۆ قادر لێدا، بانگی کردو گوتی: قادر ئیشی ئەم کورە جێبەجێ بکە، چوومە لای قادر قسەم نەکرد، نەموێرا قسە بکەم، قادر ئیشەکەی بۆ جێبەجێکردمو منی نارد بۆ تاقیکردنەوەی زمانی ئینگلیزی، چووم مەکتەبێکی هەبوو پێیان دەگوت: (Training) واتە مەلبەندی فێربوونو ڕاهێنان، چوومە ئەوێ تاقیکرنەوەم کرد، زۆرباش بووم، نووسیبوویان ئەم کورە لە (ئینگلیزی) باشە، بۆ خوولی بازرگانی خوێندنەکەی باشە، ئەو (خوولە) مانگێك بوو، ساڵێکی مابوو، تازە خوولەکەیان کردبۆوە، دەبوو ئەو خوولە تەواو بێت ئینجا من بخوێنم چوومەوە لای بەڕێوەبەری دامەزراندن، گوتی: کوڕم تۆ بۆ خوولی بازرگانی وەردەگرین، ئێستا ئیشمان نییە، منیش گوتم: گەورەم ناچێتە عەقڵمەوە ئیشتان نەبێت، ئەمن داوای ئیشێکی گەورەم نەکردووە، داوای ئیشێك ناکەم لە تواناتدا نەبێت، داوای ئیشێکی بچووك دەکەم هەر نانی پێبخۆمو خوێندنەکەم تەواو بکەم، گوتی: لە پۆلی چەندیت؟ گوتم لە پێنجی ئامادەییم. گوتی سبەینێ وەرەوە ئیشم پێتە. سبەینێ چوومەوە دەستی گرتم، بردمی بۆلای بەڕێوەبەری دامەزراندن. بە زمانی ئینگلیزی گوتی: ئەم کورە وایە.. زیرەکە... ئیتر ئیشێکیان دامێو گوتی: تا خوولەکە تەواو دەبێ، خوولە بازرگانییەکەش دەکرێتەوە، ئەوجا لە کۆمپانیای نەوت (تحقيقاتي جينائي – لێپرسینەوەی تاوان) هەبوو، فەرمانگەیەکی بچکوڵانە بوو، چاودێری کەسانی نیشتمانپەروەرو کوردپەروەریان دەکرد پێناسەیان وەرگرتمو ناردیان بۆ (تحقيقاتي جينائي) لە بەغدا. وەڵام هاتەوە دەڵێ: ئەو کورە لە کۆیە لە خۆپیشاندان گیراوە، لەسەر هەڵبژاردن دراوەتە دادگەی عورفی، بەڵام یەك شایەدی لەسەر بووە، بۆیە بەریانداوە. بۆیە ڕەزامەندیمان لەسەر دامەزراندنی نییە! بەڕێوەبەرەکە بانگی کردم، قۆڵی گرتمو گوتی: تۆ سیاسیتو خۆپیشاندانت کردووە لە کۆیە. گوتم: من لە خۆپیشاندان نەگیراوم، لە ماڵەوە گیراوم، دوای ئەوە هەتا ئەگەر دادگە حوکمی دابم، ماوەی یاسایی بەسەرچووە، ئەو مافەم بۆ گەڕاوەتەوە، من هاووڵاتییەکی عێراقیم، زیندانی نەکراوم، تەلەفۆنی لەگەڵ (تحقيقاتي جينائي) کرد، گوتیان: لە خۆپیشاندان گیراوە، (محب احمد الجليلي) گوتی: ئەمنیش لە خۆپیشاندان گیراومو ئێستاش بەڕێوەبەری دامەزراندنم! گوتی ئەم کورە چییە عینادی لەگەڵ دەکەن تا دانەمەزرێ؟ بەڵام دایمەزراندم، بەس گوتی: خالید فێڵم لێ نەکەیت، هەقت بەسەر هیچەوە نەبێت، تەنها ئیشی خۆت بکە، ئەوجا من زۆر گورجو گۆڵ بووم، بە ماوەی (١٠) ڕۆژ فێری ئیشەکان بووم، ئیشەکانم تەواو دەکردو دادەنیشتم، ئیتر بە ڕۆژ ئیشم دەکردو بەشەو دەمخوێند، بەشی وێژەیی ئامادەییم لە کەرکوك تەواوکرد. بوونم لە کەرکوكو هەستکردنم بە ستەمی قووڵی نەتەوایەتی خەڵکی کەرکوك، لایەنی سیاسی منی قووڵتر کردەوە، زووتر من ئەندامی (پارتی) بووم، هەروەکو لەوەو پێش گوتم: لە ساڵی (١٩٤٦) ئاوێتەی سیاسەت بووم، هەستم کرد بۆ خەباتکردن لە کەرکوك زیاتر پێویستیان بەمن بوو، منیش بێ درێغیکردن، لە گەڵ خەڵکی کەرکوك کە سەرچاوەی خەبات کردن بوون، زیاتر تێکەڵاوبووم. بەڵێ لەو بەسەرهاتانە زۆر شارەزام، ئەو وەختە ساڵی (١٩٥٩) من تەمەنم (٢٦) ساڵ بوو، واتە قۆناغی گەنجایەتیو گورجو گۆڵییە، من ئەندامی کارگێڕی لقی کەرکوك بووم، ڕۆژی بەسەرهاتەکە چۆن بوو، کرا؟ بە تەمامە وتارێك لەسەر ئەو مەسەلەیە بنووسم، چیم لەلایە چیم دیو چۆن بوو، بە درێژی ڕوونی بکەمەوە بۆ میللەتەکەم، زۆر شتم بینیوە لەسەر ئەو ڕووداوانە، پیاوی وا نووسیوییەتی شێواوە، من خۆم لەناو ڕووداوەکان بوومە، ئەگەر بێتو من بتوانم ئەم ڕووداوانە بنووسمەوەو بیدەمە دەستی خەڵك، وەکو ئەوە وایە بە قسە ڕەسمێکیان بۆ بکەم، بە خزمەتێکی گەورەی دەزانم، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، من ئەوە ڕوونبکەمەوە، زۆر کەس نووسیویانە، بەڵام وەکو من شارەزانین، یا کاریگەری نووسینی تریان لەسەر بووە، ئەوە بە ئەمانەتێکی مێژوویی خۆمی دەزانم، لێرە ناتوانم هەمووی

ڕوونبکەمەوە، ئەوەندە بەسە کە ئەو ئەرکە جێبەجێ دەکەم. حەرەس قەومی ساڵی (١٩٦٣) پیاوەکانی (کەریم قاسم) کەوتنە بەربەرەکانیکردنی کوردو بەوپەڕی دڕندەیی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرد، بۆ نموونە ئەوانەی لە ڕووداوی ساڵی (١٩٥٩)و ڕۆژی (١٤)ی تەمموز گیرابوون، (بەعس) ئەمانەی لە بەندیخانە دەرهێنان‌و بردنیانە سەر (خاسە) سێدارەیان بۆ هەڵواسین‌و ئیعدامیان کردن، ئەوە تاوانێکی ئینسانی بوو، مرۆڤ کە دادگاییکراو حوکم درا، هیچی لەسەر نامێنێ، تەنیا بەسەربردنی ماوەی حوکمەکەی لەسەر دەمێنێ، یەکی (٣- ٤) ساڵ بوو لە حوکم دابوون، ژمارەیان نازانم هەموویان هەڵواسین، ناوی دوانیانم لە بیرە: (شێخ مارف بەرزنجی)و (حوسێنی برای)، بوون، کاك جەبار محەمەد پیرۆزخان، دەوری سەرەکی هەبوو لەو ڕووداوانە، ئیتر کەرکوك لای من یەکەمین شوێن بووە، کە زەربەی عارەبی بەرکەوتووە، هەر هێرشی عەرەب بۆ کوردستان دەستیپێکرد، یەکەمین شوێن پێش هەموو جێگەیەك کەرکوکی بەرکەوتووە، چوویتە هەر شوێنێك حەمامەکانی قۆرییەو جووت قاوەو بۆیاخچییەکانی سەر شەقامەکان کوردبوون‌و گیران. خەڵکەکەی قوربانی زۆریداوە، بەڵام خۆڕاگرو دلێر بوون، نەبەردو شێربوون، ئەو خەباتەی لە کەرکوك‌و گەرمیان کراوە، لە هیچ جێگەیەك نەکراوە، باسی (بەعس) بکەین کۆتایی نایە، باسی ئەوەندە بەسە بەبیرتان بێنمەوە کە ئەنفالیان کرد، ئەنفال واتە ئەوپەڕی دڕندایەتی، ئەوە بە نموونە دەهێنمەوە ئەگینا لە ساڵەکانی (١٩٦٣ - ١٩٨٨) کردەوەی زۆر خراپیان کردووە.

لە کەرکوك خۆمگرتەوە، گەنجێك بووم بێ پارەو بێ نان‌و بێ شوێن‌و بێ پشتیوان، لە کەرکوك خۆمگرتەوە، ئیشیان دامێ، ئیشەکەم بۆ ئەوە بوو خوێندن تەواو بکەم، خوێندنم لەوێ تەواوکرد، لە زانکۆی: (لۆمۆمبای ڕووسیا)، وەرگیرام، خەریکی (ئەوراق) ئامادەکردن بووم فەرمانی گرتنم دەرچوو، ئیتر نەمتوانی بچم بخوێنم، خوێندنەکەم لەکیس چوو. کەرکوك کاریگەری لەسەر من گەلێك زۆرە، لە کەرکوك کورد زوڵملێکراوە. شاعیرێکی تازە پێگەیشتووی وەکو من حسابیان لەگەڵ دەکرد، لەبۆنەکانی پارتیدا ئاهەنگمان ساز دەکرد، ئاهەنگەکان ئەمن دەمکرد، لە ساڵەکانی (١٩٦٠) ئەگەر مۆڵەتی پارتی وەرنەگیرابا، کۆمپانیا گۆڕەپانی نەدەدایێ، لە مانگی (٣)ی ساڵی (١٩٦٠) پارتی مۆڵەتی بۆ ئاهەنگەکە وەرگرت، کەرکوك پاشەڕۆژی منی دروستکرد، من لە (کۆیە) ساڵی (١٩٣٣) لە دایکبوومە، لە (قەڵادزە)و (پشدەرایەتی) فێری زمانی کوردی بووم، لە کەرکوکیشدا خۆمگرتەوەو بوومە کادیرێکی ڕێباری کوردایەتی، لەناو کرێکارەکان ڕێزم هەبوو و قسەم دەڕۆیی، ڕێکخستنی کرێکاران ئەمن دامەزراند، ڕێکخستنی کرێکاران خرایە ئەستۆی من، لەبەر ئەوەی من بناغەیەکی (مارکسی) لە مێشکمدا بوو، زۆر گرنگیم بە کرێکاران دەدا، هەتا کودەتایەکە نەبوو، حکومەت بە کورد نەدەوێرا، ڕێکخستنەکان ئەوەندە بەهێزبوو.......... بەعس واتە دوژمنی کورد، واتە قەسابی کورد، واتە هەرچی خراپە ئەوەیە. دوو سێ شیعرم هەبوو لە (عەرەفە) دامناون، ئێستا لەبیرم نەماون، بابەتی هونەریم زۆر بڵاوکردووەتەوە، لەوانە (سروودی ئاشتی)، ئەم سروودە لە ئاهەنگی (نەورۆزی) ساڵی (١٩٦٠) لە گۆڕەپانی کۆمپانیای نەوت پێشکەشم کرد، تا ئێستا تۆمارنەکراوە، ئەو سروودە دوای ئەوەی (پارتی دیموکراتی کوردستان) ئیجازە واتە مۆڵەتی فەرمی وەرگرت، من پێشتر گۆرانییەکی سیاسیم ئامادە کردبوو، بە ناوی ئیجازەی پارتی ئەڵێ: (هەڵسن خوشك‌و برایان هەڵسن ئەمڕۆ ڕۆژی شادییە ڕۆژی ئیجازەدانی پارتی دیموکراتییە)، ئەم گۆرانییە هەندەی پێنەچوو لە هەموو کوردستان بڵاوکرایەوە، گەیشتە (حاجی ئۆمەران)و (پێنجوین). هەموو کورد دەیگوتەوە، دوای گۆرانی (ئەی قومری) شیعرو ئاوازەکەم لە (کەرکوك) داناوە، (خەڵات)ی کچم ئەیڵێ. شتی تریشم داناوە، بەڵام ئێستا لەبیرم نەماوە کەرکوك بۆ من سەرچاوەی (ئیلهام)و بەهرەو خۆڕاگری‌و خۆپێگەیاندنی منە، کەرکوك بۆ من چی بڵێم کەمە. پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی توندو تۆڵم لەگەڵ خەڵکەکەی بووە، خەڵکی (ڕەحیماوا)و (ئیمام قاسم)و (شۆریجە) هەمووی برادەرم بوون. هەموو ڕژێمەکانی عێراق هەوڵیانداوە، بەرێژەیەك کوردایەتی‌و کورد لە کەرکوکدا کەم بکەنەوە، بە هەموو ڕێگەیەك هەوڵیانداوە، کورد لە کەرکوك ژێردەست بکەن، تەنیا بۆ نۆکەرایەتی کوردیان ویستووە، کوردیش هەرچی ئیشێك هەبوایە خۆی تێدەکرد، دەچووە ئەو ئیشە، گرنگ ئەوەبوو ئیشی هەبێ لە کەرکوك‌و خۆی بگرێت، کەرکوك زۆربەی خەڵکەکەی کرێکارو جووتیارو کاسب بوون، دەوڵەمەندی کورد لە کەرکوك کەمبوو، تورکمانەکان ئەوانەی دەوڵەمەندبوون، ڕێزی کوردیان دەگرت، بەڵام عەرەبەکان زۆر دڕندانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کوردا دەکرد، بە کوشتن‌و برین‌و ڕاونان، هەموو ڕێبازێکی دکتاتۆریان بەکاردەهێنا[٧٠].

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١. (المنجد في اللغة الادب)، لاپەڕە (٣٨٤)، هەروەها بڕوانە: (الاستشراق وسحر حضارة الشرق)، دکتۆر ئیناس حەسەنی، پاشکۆی ژمارە (٦٢)ی گۆڤاری (دبي الثقافية)، ٢٠١٢، لاپەڕە (٣٨).

٢. (الاستشراق وسحر حضارة الشرق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩).

٣. (مێژووی کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانیدا ١٩٠٠ - ١٩٥٠)، سامان حوسێن ئەحمەد، چاپخانەی (موکریانی)، هەولێر، ٢٠١٤، لاپەڕە (١٥).

٤. گۆڤاری (المأمون)، ژمارە (٤)، ساڵی نۆیەم، ساڵی ٢٠١٣، لاپەڕە، (١٩)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (الاستشراق وعنايته بالتراث العربي الاسلامي)، نووسینی دکتۆر عەلا ئەبو ئەلحەسەن ئیسماعیل.

٥. (مێژووی کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسی بریتانیدا ١٩٠٠ - ١٩٥٠)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٦).

٦. گۆڤاری (المامون)، ژمارە (٤)، ساڵی نۆیەم، ساڵی ٢٠١٣، لاپەڕە، (٢٣)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (الاستشراق وعنايته بالتراث العربي الاسلامي)، نووسینی دکتۆر عەلا ئەبو ئەلحەسەن ئیسماعیل.

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٣ - ٢٤).

٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٤).

٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥).

١٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦ - ٢٧).

١١. (مێژووی کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسی بریتانیدا ١٩٠٠ - ١٩٥٠)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١ -٢٢).

١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٨).

١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩).

١٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٠ - ٤١).

١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤١ - ٤٢).

١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٤).

١٧. (ابو دلف مسعر بن مهلهل الخزرجي ورحلته الى كردستان في الرسالة الثانية خلال السنتين ٣٤٠ - ٣٤١ هجري - ٩٥١ - ٩٥٢ ميلادي)، د. حوسامەددین عەلی غالیب ئەلنەقشبەندی، دەزگای (ژین)، ٢٠١٢، لاپەڕە (٣٢ - ٤٠).

١٨. دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، دکتۆر عیماد عەبدولستار ڕەئوف، هەولێر ٢٠٠٨، لاپەڕە (٢٣ - ٢٨).

١٩. (کێ کەرکوکی داگیر کـردووە؟)، عـارف قوربانی، چاپخانەی (یاد)، ٢٠٠٩، لاپەڕە (٩).

٢٠. (کێ کەرکوکی داگیر کـردووە؟)، عـارف قوربانی، چاپخانەی (یاد)، ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٨).

٢١. (سەفەرنامەی ژان ئۆتەر ١٧٤٣ - ١٧٤٤، سەردەمی نادر شا)، وەرگێڕانی: محەمەد حەمە باقی، ٢٠١٣، چاپخانەی (موکریانی، هەولێر، لاپەڕە (٤٩ - ٥٤).

٢٢. سەفەرنامەی نیبوور لە سـەدەی هـەژدەدا)، ئـەردەڵان عەبدوڵڵا، چاپخانەی (موکریانی)، ٢٠١٣، لاپەڕە (١١ - ١٣) و (١١٧ - ١٢٥).

٢٣ نادرشا: لە کەسایەتییە مێژووییە دیارەکانی ئێران و ناوچەکەیە بە گشتی. لە ساڵی (١٧٣٠) ئێرانی لە داگیرکاری ئەفغانییەکان ڕزگار کردو دواتر چەندین فراوانخوازی لە وڵاتـانـی دەوروبـەر ئـەنجامـدا. لـە سـاڵـی (١٧٣٦) تاجی شـاهێتی لـەسـەرنـاو بنـەماڵـەی دەسـەڵاتـداری ئەفشاری دامەزراند. لە ساڵی (١٧٤٧)دا کوژرا.

لە بارەی ژیان و سەردەمی نادر شا بڕوانە: lokhart, nadir .(shah), london, ١٩٣٨.

٢٤. ئەحمەد پاشا: یەکێکە لە والییە بەتوانا و ناسراوەکانی بەغدا لە سەردەمی عوسمانی کە لەنێوان ساڵانی (١٧٢٣- ١٧٤٧) حوکمڕانی ئەم ئیالەتەی کرد. لەبارەی سەردەمی ئەم والییە بڕوانە: علي شاكر علي، (تأريخ العراق في العهد العثماني)، بغداد، (١٩٨٤)، صفحة (١١٣)و دواتر.

٢٥. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د. علاء نورس، (العراق في العهد العثماني، دراسة في العلاقات السياسة ١٧٠٠- ١٨٠٠)، بغداد، (١٩٧٩)، صفحه (١٥٤- ١٧٩).

٢٦. یەك یاردە دەکاتە سێ پێ (قدم- فووت).

٢٧. ووشەی ئێستا واتە ساڵی (١٩٦٦).

٢٨. دەللی عەباس: ئێستا ناوی (المنصورية)ی لێنراوە.

٢٩. لەو برگەیەدا پچڕ پچڕییەك لە نووسین بەدی دەکرێت. بـەڵام بۆ پابەند بـوون بـە دەقەکە بەناچاری وەکـو خۆی وەرگێردرا.

٣٠. لـە دەقـە عەرەبییەکە (٥٠) سـاڵ نـووسـراوە، بەڵام ڕاستەکەی (١٥) ساڵە چونکە ئەم ڕووداوە لە ساڵی (١٧٤٣) ڕوویداوەو گەشتەکەش لە ساڵی (١٧٥٨) بوو.

٣١. بۆ زانیاری زیاترو ووردتر لە بارەی شاڵاوەکانی نادر شا بۆ سەر کەرکوك و ناوچەکانی تری کوردستانی باشوور بڕوانە: د. سعدي عثمان حسين، (كوردستان الجنوبية في القرن السابع عشر والثامن عشر، دراسة في علاقاتها السياسية والادارية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل)، اربيل (٢٠٠٦)، الفصل الرابع.

٣٢. موتەسەللیم، پایـەیـەکی کـارگـێڕی عوسمـانـی بـوو، بـەو کـەسـە دەگـوتـرا کـە شـوێـنی والـی دەگـرتـەوە لەکاتی ئامادەنەبوونی لەبەر هەر هۆیەك لە هۆیەکان. بۆیە پێشی دەگـوتـرا (قـائیمـەقام). هـەروەهـا بـەسـەرداری ئـەو شـارو ناوچانەش دەگوترا کە سەر بە دەسەڵاتی ناوەندی ئیالەت بوون. وەك بەسرا کە لە سەردەمی حوکمڕانی مەمالیکەکان لە بەغدا سەر بە ئیالەتی بەغدا بوو. عبدالرحمن بن عبدالله السويدي، (تأريخ حوادث بغداد والبصرة)، تحقيق: د. عماد عبدالسلام رؤوف، بغداد (١٩٧٨)، صفحه (٥).

٣٣. تەوغ: .

٣٤. (رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر)، ت: د. محمود حسين الأمين، بغداد (١٩٦٥)، صفحة (٨٣- ٨٤).

٣٥. لەوانەیە مەبەستی منارەی چۆلی بێت.

٣٦. (رحلة طه الكردي الباليساني في العراق وبلاد الشام والاناضول ومصر والحجاز)، د. عیماد عەبدولسەلام ڕەئوف،

٢٠٠٧، دەزگای (ئاراس)، لاپەڕە (٣٨ – ٤٠).

٣٧. (گەشتنامەی مسیۆنێرێك بۆ ناوچەکانی کەرکوك و سلێمانی ساڵی ١٨٧٨)، ژاك ڕیتۆرێ، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: نەجاتی عەبدوڵڵا، بنکەی (ژین)، ٢٠٠٨، لاپەڕە (٢٩ – ٣٧).

٣٨. (سەفەرنامەی جاکسۆن بۆ باشووری کوردستان لە ساڵی ١٧٩٧)، ڕەسول بەختیاری، چاپخانەی (موکریانی)، ٢٠١٣، لاپەڕە (٦٢ – ٦٦).

٣٩. (رحلة ابي طالب خان الى العراق واوروبا سنة ١٢١٣–١٧٩٩)، وەرگێڕانی بۆ فەرەنسی: د. مستەفا جەواد، چاپخانەی (الایمان)، بەغدا،

٤٠. (کێ کەرکوکی داگیر کردووە؟)، عارف قوربانی، چاپخانەی (یاد)، ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٢).

هەروەها بڕوانە:–

– معرفة الشرق في العصر العثماني (الرحلة الفرنسية الى العراق)، ئۆلیڤیە، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە، دکتۆر یوسف حەبی، المرکز الأکادیمي للأبحاث، بەیروت، ٢٠١٤، لاپەڕە (٣٨ – ١٩).

٤١. (رحلة دوبریه الى العراق ١٨٠٧ – ١٨٠٩)، وەرگێڕانی: دکتۆر بوترس حەداد، (بیت الوراق)، بەغدا، (٢٠١١)، لاپەڕە (٤٣ – ١١٥).

٤٢. (رحلتي إلى العراق سنة ١٨١٦)، جیمس بکنغهام، وەرگێڕانی: سەلیم تەها ئەلتکریتی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی (اسعد)، ١٩٦٨، لاپەڕە (٤ – ١٧١).

٤٣. (گەشتی ڕیچ بۆ کوردستان ١٨٢٠)، کلۆدیۆس جێمس ڕیچ، وەرگێڕانی: محەمەد حەمە باقی، ١٩٩٢، لاپەڕە (٣١ – ٩٦).

٤٤. بڕوانە:

– (رحلة المنشيء البغدادي الى العراق)، عەباس ئەلعەزاوی، چاپی یەکەم، (الوراق للنشر)، ٢٠٠٨، لاپەڕە (٩٢ – ٩٦).

– (سەفەرنامەی مونشی بەغدادی لە تەك مستەر ڕیچدا ١٨٢٠) ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، چاپخانەی (موکریانی)، ٢٠١٤، لاپەڕە ٤٥ – ٥١).

– گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە ١٩، زستانی ساڵی ٢٠٠٤، لاپەڕە (١٩٩ – ٢٠٢)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (کرکوك وتوابعها في رحلة المنشيء البغدادي)، نووسینی: سەلاحەددین ئەنوەر قەیتولی.

٤٥. (اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، كتاب يبحث عن تاريخ العراق في العصور المظلمة)، ئەلمستەر ستیڤن هیمسلی لۆنگریك، وەرگێڕانی: جەعفەر ئەلخەیات، چاپخانەی (التنفيض الاهلية)، بەغدا، ١٩٤١، لاپەڕە (٤ – ٣٣٩) و کۆمەڵێك لاپەڕەی جۆراوجۆر.

٤٦. (رحلة فريزر الى بغداد في سنة ١٨٣٤)، جیمس بیلی فریزر، وەرگێڕانی: جەعفەر ئەلخەیات، چاپخانەی (المعارف)، ١٩٦٤، لاپەڕە (١٢ – ١١٠).

٤٧. (گەشتی کۆنت دۆسێرسی بۆ کوردستان ١٨٣٩ – ١٨٤٠)، وەرگێڕانی: کارزان محەمەد، بنکەی (ژین)، ٢٠١٣، لاپەڕە (٧٠ – ٨٠).

٤٨. (کێ کەرکوکی داگیر کردووە؟)، عارف قوربانی، چاپخانەی (یاد)، ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٣).

٤٩. بڕوانە:

– (رحلة لجان الى العراق ١٨٦٦)، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: دکتۆر بوترس حەداد، بەغدا، ٢٠٠٩، لاپەڕەی جۆراوجۆر.

– (رحالة أوروبيون في العراق)، (دار الوراق للنشر والطبع)، ٢٠١٠، لاپەڕە (١٩٢ – ١٩٦).

٥٠. (رحلة اینهولت الهولندي الى العراق سنة ١٨٦٦ – ١٨٦٧)، وەرگێڕان: میر بەسری، (بیت الوراق)، بەغدا، (٢٠١٢)، لاپەڕە (٨٣، ٩٤، ١٠٥ – ١٠٦).

٥١. (کێ کەرکوکی داگیر کردووە؟)، عارف قوربانی، چاپخانەی (یاد)، ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٤).

٥٢. (کێ کەرکوکی داگیر کردووە؟)، عارف قوربانی، چاپخانەی (یاد)، ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٤).

٥٣. بڕوانە:

– (سیرة اشهر شهداء المشرق القديسين)، ئەدی شیر، بەشی یەکەم، (معهد التراث الكردي)، ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٩ – ٢٢).

– گۆڤاری (المشرق)، ساڵی ١٩٠٠، ساڵی سێیەم، لاپەڕە (١١٦ – ١١٨)، بەیروت، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (منبع النفط في بابا كركر)، نووسینی: مەتران ئەدی شیر.

٥٤. (کورد لە یاداشتەکانی ئار چی ڕۆزڤێلتدا)، نووسینی: ئار چی ڕۆزڤێلت، وەرگێڕانی: کارزان محەمەد، چاپخانەی (دیلان)، ٢٠٠٣، چەند لاپەڕەی هەمە جۆر.

٥٥. (رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين وكردستان)، مێجەر سۆن، وەرگێڕانی: فوئاد جەمیل، بەغدا، ١٩٧٠،

٥٦. (دوو ساڵ لە کوردستان، گەشتێکی نهێنی بۆ میزۆپۆتامیا)، دبلیو ئار هەی، وەرگێڕانی: باپیر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی (ڕۆژهەڵات)، لاپەڕە (١١٠ – ١١٢).

٥٧. (کورد تورك عەرەب)، سیسیل جۆن ئیدمۆندس، وەرگێڕان: حامید گەوهەری، چاپی دووەم، دەزگای (ئاراس)، هەولێر، ٢٠٠٤، لاپەڕە (٧) و (٩) و (٣٢٢–٣٢٤).

٥٨. (ڕێگایەك بە کوردستاندا)، ا. م. هاملتن، وەرگێڕان: د. عەلی عەبدولڕەحمان عەسکەری، ٢٠١٣، لاپەڕە (٥٧ – ٦١).

٥٩. (دزەکردنە ناو کوردستانی داخراو)، گۆتفرید یۆهانس میوولەر، وەرگێڕان: عەبدوڵڵا هەڵەبجەیی، بنکەی (ژین)، چاپخانەی (شڤان)، لاپەڕە ٧٠ – ٧١).

٦٠. (بیرەوەرییەکانی سەیید عەزیز شەمزینی –زیندەگی مـن)، ئامادەکردنی: محەمەد حەمە باقی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠١٠، لاپەڕە (٣٤، ١١٤).

٦١. (العراق بين الحربين العالميتين)، ئەمەل پۆرتەر، (دار میزوبوتامیا)، لاپەڕە (١٧٦ – ١٩٩).

٦٢. (جنوب كردستان، دراسة انثروبولوجية)، هنری فیلد، وەرگێڕانی: جەرجیس فەتحوڵڵا، لە بڵاوکراوەکانی (دەزگای ئاراس)، هەولێر، ٢٠٠١، لاپەڕە (٨٤ – ٩١).

٦٣. (رسائل من كردستان ١٩٥٤ – ١٩٦٣)، بێرنارد ویتمان، وەرگێڕانی: غەسان نەعسان، مەکتەبی بیرو هوشیاری، ٢٠٠٩، لاپەڕە (٢٦ – ٢٨).

٦٤. سایتی ئێلیکترۆنی (الصباح)، بابەتێك بە ناونیشانی:

(شهادة الفنانة التشكيلية العراقية المغتربة امل بورتر:ابي كـان لـه الـفـضـل الأول بـظـهـور نـور الـكـهـربـاء في كـركـوك) نووسینی: تەوفیق ئەلتومەیمی، لە ڕۆژی (٣٠)ی حوزەیرانی سالی (٢٠١٣).
هەروەها بڕوانە:-
- کورد لە نامەکانی میس بێڵ دا، محەمەد حەمە سالح تۆفیق، ناوەندی توێژینەوەی مێژوویی جەمیل ڕۆژبەیانی، ٢٠١٦.
٦٥. مێژوویی تێکۆشانی مێینەی کورد لە مەلەکییتەوە تا دوای ڕاپـەڕیـن، بەشێك لە مێژوویەکی فەرامۆشکراو، ڕووخۆش عەلی، سلێمانی ٢٠١٥
هەروەها بڕوانە:-
- (بـەشـێـك لـە بـیرەوەرییـەکـانـی ژیـانـم هـەر لـە سـەردەمـی منداڵیمەوە)، عالیە عەبدولکەریم مـودەڕس، چاپخانەی (شڤان)، ٢٠١٣، لاپەڕە (٤٧ - ٨٦).
٦٦. (کوردسـتـان ئـەی خۆشەویستم، بیرەوەرییـەکـانی بەهیە فەرەجوڵڵا زەکی مەریوان)، وەرگێڕانی: ئەنوەر سولتان، چاپخانەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠١٠، لاپەڕە (٣٥).
٦٧. (رحلة في العراق او خاطرات الحسني)، عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، (الرافدين للطباعة والنشر والتوزيع)، ٢٠١٣، لاپەڕە (١٨٠ - ١٨٢).
٦٨. ڕۆژنـامـەی (ئـاسـۆ)، ژمـارە ١١٢٠، (٢١)ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٩، (بابلیۆنێکی لێکترازاو)، لاپەڕە (٢ - ٣).
٦٩. (بیرەوەرییەکانی عەلی ئەکبەرخانی سەنجاوی، سەردار مـوقـتـەدر)، سـاغـکـردنـەوەی: دکـتـۆر کـەریـمـی سـەنـجـاوی، وەرگـێـڕانـی: دکـتـۆر حـەسـەن جـاف، چاپخانەی (هـاشـم)، هەولێر، ٢٠١١، لاپەڕەکانی (٥٧٥ - ٥٨٣)
٧٠- بیرەوەرییەکانی خالید دلێر.

*** کوردستانییەتی کەرکوك لە ئینسکلۆپیدیای وولاتانی ئەوروپاو ئەمەریکاو ئیسلامیدا:**

ئەحمەد عەزیز

سەرەتا: بە پێویستی دەزانم بۆ چوونە ناو باسەکەوە، پێناسەیەکی کورتی ئینسکلۆپیدیا دەست پێ بکەم، بۆ ئەوەی مەبەست لە هەڵبژاردنی ئینسکلۆپیدیای وولاتی ئەوروپاو ئەمەریکا، وەك بنەماو سەرچاوەیەك بۆ ئامادەکردنی ئەم باسە بزانرێت:

ئینسکلۆپیدیا (الموسوعة، دائرة المعارف):– لە دوو وشەی لێکدراوی گریکییەوە هاتووە، (Engkyklios) بە واتای بازنەیی یان هاوبەش، هەروەها (Paideia) بە واتای پەروەردەکرن یان دارشتن، ئینسکلۆپیدیا بە واتای فەرهەنگێکی گەورەو بەرفراوان دێت، لە گرێکی کۆندا بۆ کۆی زانیارییەکان بە کار هێنراوە، دواتر ئەم چەمکە بۆ بەرهەمی زانیاری ئەکتوێلی یان نوێی سیستەماتیکیانەی مرۆڤ، جا گشتی بێت، یان بۆ بوارێکی تایبەت بە کار هاتووە، لە شێوەی بانکێکی زانیاریو بابەتەکان بە شێوەی ئەلفوبێ، بە دوای یەکەوە ریزکراون[1].

دیارە دەرکردنو بەرێوەبردنی ئینسکلۆپیدیا خەڵکانێکی ئەکادیمیو پسپۆر لە ئەستۆی دەگرن، هەر زانیارییەك لە ئینسکلۆپیدیادا تۆمار بکرێت، راستییەکی زانستیو بابەتییە بە شێوەیەك، زۆربەی لایەنەکان هاوبیردەبن لەسەری، سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ هەموو لێکۆڵەرەوەو پسپۆرەکان لە جیهاندا.

لە نوێترین چاپی ئینسکلۆپیدیای گەورەی وولاتی دانمارك، پێناسەی شاری کەرکوك بەم جۆرە دەکات:

کەرکوك: شاری چاڵگە نەوتەکان، دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی عێراقو سەر بە کوردستانە، کەوتووەتە (٢٥٠) کم لە باکوری بەغداوە دوورە، وا مەزندە دەکرێت چاڵگە نەوتەکانی شاری کەرکوك (٥– ٧٪) یەدەکی نەوتی هەموو جیهان پێکبهێنێت، لە کەرکوکەوە لوولەی نەوت بەرەو سوریاو لوبنانو تورکیا دەروات، بەڵام بە هۆی گەمارۆی ئابووری نەتەوەیەکگرتووەکانەوە، رێژەیەکی کەم لە توانای چاڵگە نەوتەکانی شاری کەرکوك بەرهەم دەهێنرێت.

کەرکوك دەکەوێتە تەنیشت زنجیرە چیای زاگرۆس، ژمارەی دانیشتووانی نزیکەی (٥٠٠,٠٠٠) کەس دەبێت، پێشتر زۆربەی دانیشتووانی شاری کەرکوك کورد بوون، بەڵام لە دوای ساڵی (١٩٧٠)وە، ژمارەی کورد لە کەرکوك رووەوو کەمی دەچێتو لە بەرانبەیشدا ژمارەی عەرەب لە بەرز بونەوەدایە[2].

پێناسەی شاری کەرکوك بە پێی ئینسکلۆپیدیای وولاتی (نەرویج): شارێکی کوردستانی عێراقە، لە کۆتایی خوارەوەی چیاکانی زاگرۆسە، (٢٣٠) کم لە باکوری بەغداوە دوورە، ژمارەی دانیشتووانی کەرکوك بە پێی سەرژمێری ساڵی (١٩٧٠) (٢٠٧,٩٠٠) کەسە، ناوەندێکی گرنگی بازرگانییە بۆ کوردستانو گەورەترین چاڵگەکانی نەوتی عێراق لە کەرکوکە[3].

ئینسکلۆپیدیای ئەڵمانیا: دوای پێناسە کردنێکی ووردو قوڵی شاری کەرکوك دەڵێت: بە پێی مێژوو شاری کەرکوك دەگەرێتەوە بۆ سەر کوردستان، کوردستانو عێراق ساڵی (١٦٣٨) کەوتە ژێر ڕکێفو دەسەلاتی عوسمانییەکان، هەروەها لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەم کەرکوك کەوتە ژێر دەسەلاتی بەریتانیا، ساڵی (١٩٢٧) گەورەترین چاڵگەی نەوتی عێراقی تیا دۆزرایەوە[4].

کەرکوك لە ئینسکلۆپیدیای وولاتی سوید باس کراوە: کە نەخشەی کوردستانی تێدا هاتووەو چوار چێوەکەی کێشاوە، کەرکوکی بە رەنگی جیاکارەوە، دیاری کردووەو لە ناو چوارچێوەی نەخشەی کوردستان دانراوە، وەك یەکێکە لە شارەکانی کوردستان[5].

پێناسەی شاری کەرکوك بە پێی ئینسکلۆپیدیای زانکۆی (کۆلۆمبیا) لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا: دانیشتووانی شاری کەرکوك بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٨٧) (٣١٨,٦٢٤) کەسە، سەنتەری پیشەسازی نەوتی هەموو عێراقە، بە هۆی لوولەی نەوتەوە ئەگاتە بەندەرەکانی دەریایی سپی ناوەراست، بەرهەمی نەوت تێدایە پاش ساڵی (١٩٨٠) دابەزی بە هۆی شەری نێوان (عێراق– ئێران) کەرکوك بازارێکی گرنگە بۆ ناوچەکە، بەرهەمی کشتوکاڵی ناوچەی کەرکوك بریتییە لە (دانەوێڵە، میوەهات، لۆکەو. هتد)، هەروەها کارگەیەکی بچووکی مافوری لێیە، شوێنەواری لێیە دەگەرێتەوە بۆ (٣٠٠) ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح زۆرینەی دانیشتووانی ناوچەکە کوردن[6].

کەرکوك لە ئینسکلۆپیدیای وولاتی بەریتانیا (Britannica Encyclopedia): بەم جۆرە باس کراوە، شارێکە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی عێراق، کەوتووەتە (١٤٥) میل (٢٣٣) کم باکووری بەغداد (پایتەختی نیشتمانی)، بەهۆی رێگای زەمینیو هێڵی شەمەندەفەرەوە دەبەسترێتەوە بە بەغداد، کەرکوك دەکەوێتە نزیك زنجیرە چیای زاگرۆس لە هەرێمی کوردستان– عێراق، بەشی کۆنی شار، لە دەورووبەری قەڵا کۆبووەتەوە، کە لە سەردەمی ئاشوورییەکان دروست کراوە، لە سەدەیی (٩– ١٠) پێش لەدایك بوونی مەسیح[7].

کەرکوك لە ئینسکلۆپیدیای دەزگای (Microsoft)ی ئەمریکی: کەرکوك شارێکە ئەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی عێراق، پایتەختی هەرێمی کەرکوکە، دەوڵەمەندترین چاڵگە نەوتی عێراق لە کەرکوکە، هێڵی سەرەکی لوولەی نەوتی عێراق لە کەرکوکەوە دەروات بۆ سەر کەنارەکانی دەریای سپی ناوەراست هەروەها سەرنتەرێکی گرنگە بۆ بازرگانی ناوچەکە بە هۆی بوونی بەرهەمی دانەوێڵەو میوەهاتو ئاژەڵداری، کەرکوك شوێنەواری شارستانییەتی لێ دۆزرایەوە، دەگەرێتەوە بۆ پێش (٣٠٠٠) ساڵ، رێژەی دانیشتووانی خەڵکی کەرکوك دابەزی بە شێوەیەکی راستەقینە لە ساڵی (١٩٨٠)وە، بەهۆی پیادە کردنی سیاسەتێك لەلایەن رژێمی عێراقەوە، بۆ دەرکردنی کوردی نیشتەجێی ئەو ناوچەیە، کە ناوچەیەکی کلتوریو رۆشنبیری کوردییەو، خەڵکێکی تر

دەهێنرێت لە جێگایان نیشتەجێی دەکات، دانیشتووانی کەرکوك بەپێی سەرژمێری سالی (١٩٨٧)، (٤١٨,٦٢٤) کەسە[٨].

خۆرهەلاتی ناوەراست! کێ؟ چی؟.. دەربارەی کەرکوك دەلێت: کەرکوك شارێکە دەکەوێتە باکووری عێراقەوە، لە سالانی سییەکانەوە سەنتەرێکی گرنگی گەشەکردنی نەوتی عێراق بووە، زۆربەی دانیشتووانی کەرکوك کوردن، بەلام کەمینەی تریش لەو شارە دەژێت، لەوانە تورکمانەکان، لە (١٩٥٩) شەرێکی خوێناوی لەنێوان کوردەکان و تورکمانەکان رووی دا، لە سەر وەرگرتنی دەسەلاتی لە شاری کەرکوك، شەرەکە بە قازانجی کوردەکان کۆتایی هات.

سەرکردەکانی کوردیش هەردەم سوور بوونە لەسەر ئەوەی، کە کەرکوك بەشێکە لە کوردستانی عێراق، لە کاتی گفتوگۆکانی کوردو رژێمی عێراق، لە کاتی جیاجیادا، حکومەتی مەرکەزی لە بەغداد، بە تەواوەتی ئەوەی رەتکردووەتەوە کە ئەو شارە بەشێك بێت لە ناوچەی کوردەکان[٩].

وەکو لە سەرەوە لە پێناسەی (Encyclopedia)دا هاتووە، هەر زانیارییەك لە ئینسکلۆپیدیادا تۆمار کرابێت راستییەکی بابەتییە، لەسەر بنەمایەکی زانستی و ئەکادیمی و، زۆربەی لایەنەکان هاوبیردەبن لەسەری.

کەواتا کوردستانییەتی کەرکوك و زۆرینەی دانیشتووانی کورد لەو شارە (کەرکوك)، راستییەکە و گشت لایەك (ئینسکلۆپیدیای زۆربەی وولاتانی ئەورووپا و ئەمریکا) هاوبیرن لەسەری، لە روانگەی ئەوەی تۆمار کراوە لە پێناسەکانیان بۆ شاری کەرکوك. ئێمە وەکو نموونە بۆ ئامادە کردنی ئەم لێکۆلینەوەیە، ئینسکلۆپیدیای چەند وولاتێکی گرنگ و جیاجیای وولاتانی ئەورووپا و ئەمریکامان هەلبژاردووە، گەر لە پێناسە شاری کەرکوك و زانیارییەکان وورد بینەوە سەبارەت بە ناساندن و دیاری کردنی باری نیشمانی و نەتەوەیی شاری کەرکوك و، زانیارییەکان پۆلێن کەین، بەم شێوەیە:

دەبێت:

- سەبارەت بە باری نیشتمانی شاری کەرکوك ئینسکلۆپیدیای وولاتانی (دانمارك، نەرویج، ئەلمانیا، سوید، بەریتانیا، Microsoftی ئەمریکی)، کەرکوکیان بە شارێکی کوردستانی ناو هێناوە و تۆمار کردووە.

دیارە دەست نیشان کردنی هەر شارێك، وەکو شارێکی کوردستانی بە مانای ئەویش دێت، کە شارێکی کورد نیشینە و زۆرینەی دانیشتووانەکەی لە کورد پێکهاتووە، ئەگینا تا ئێستا هیچ شارێك بە کوردستانی ناو نەبراوە، جگە لەو شارانە نەبێت کە زۆرینەی کورد نیشینە، بۆ نموونە بە سەدان هەزار کورد لە شاری بەغداد دەژین، بەلام بە شارێکی کوردستانی ناو نابرێت.

- سەبارەت بە باری نەتەوەیی شاری کەرکوك: ئینسکلۆپیدیای وولاتانی دانمارك، زانکۆی کۆلۆمبیا لە وولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا، دامەزراوی مایکرۆشۆفتی ئەمریکی، ئاماژەیان بەوە کردووە، کە زۆرینەی دانیشتووانی شاری کەرکوك کوردەو تەنانەت ئاماژەیان بە سیاسەت و هەولەکانی رژێمی عێراقیش کردووە، کە دەدرێت لە پاش سالی (١٩٧٠)وە، بۆ دەرکردنی کورد لە کەرکوك و هێنانی عەرەب بۆ جێگایان، بە مەبەستی کەم کردنەوەی رێژەی کورد و بەرز کردنەوەی رێژەی عەرەب لە بەرانبەردا. بۆیە بە پێی ئەو راستییانەی سەرەوە دەگەینە ئەنجامی ئەوەی کە:

١- کەرکوك شارێکی کوردستانیە.

٢- زۆرینەی دانیشتووانی شاری کەرکوك هەردەم کورد بوونە.

تەنانەت لە ئینسکلۆپیدیای یەك وولاتیشدا، پێچەوانەی ئەو راستییە نەهاتووە، کە کەرکوك شارێکی کوردستانییە و زۆرینەی دانیشتووانی کوردن.

ئەوەی لە سەرەوە خستمانە روو، ئامانجی سەرەکی باسەکەمان بوو، بۆ سەلماندنی راستی ئەوەی کە، کەرکوك شارێکی کوردستانییە و زۆرینەی دانیشتووانی لە کورد پێکهاتووە، لەسەر بنەمایەکی زانستی و زانیاری و سەرچاوەی نوێ لەم سەردەمە.

لە رابردووش بە هەمان شێوە بووە، ئەگەر بگەرێینەوە بۆ سەرچاوە گرنگە مێژوویی و ناوچەییەکان دەتوانین (قاموسی ئیعلامی عوسمانی) بکەین بە نموونە و بناغەیەك، کە لە پێناسەی باری نیشتمانی و نەتەوەیی شاری کەرکوکدا دەلێت:

شارێکە دەکەوێتە (١٦٠) کم باشووری رۆژهەلاتی ویلایەتی موسلی کوردستانیی و سەنتەری هەرێمی شارەزوورە، ژمارەی دانیشتووانی (٣٠,٠٠٠) کەسە، سێ بەشی (٢٢٥٠٠) کەسە ئەو ژمارەیە کوردەو، بەشەکەی تری بریتییە لە تورك و عەرەب و خەلکانی تر، هەروەها (٧٦٠) جوولەکە و (٤٣٠) کلدانی تیا دەژێت[١٠].

بە پێی نەخشەیەکی دەسەلاتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە کیشوەری ئاسیا، کە لە سالی (١٨٩٣) زاینیدا نەخشە کێشراوە، لە سەردەمی خەلافەتی سولتان عەبدولحەمید، لەو نەخشەیەدا بە ئاشکراوە روونی دیاری کراوە، کە کەرکوك دەکەوێتە ناوەراستی کوردستانەوە، ئەمەش بەلگەیەکی تری زۆر گرنگی مێژوویی جوگرافی بێگانەیە بۆ سەلماندنی کوردستانی بوونی کەرکوك[١١]، بە پێی سەرچاوەی بێ لایەن و بێگانەیش نموونەی ئەندازیاری رووسی (یوسف) مان هەیە، ناسراوە بە چێرنیك، کە لە ماوەی نێوان (١٨٧٢-١٨٧٣)، لە چوارچێوەی گەشتێکی زانستیدا سەردانی لێکۆلینەوەکەی لە سالی (١٨٧٩) بلاوکردووەتەوە لە بەرگی شەشەمی گۆڤاری کۆمەلەی جوگرافی پاشایەتی رووسی- بەشی قەفقاس، لەو لێکۆلینەوەیدا چێرنێك ژمارەی دانیشتووانی شاری کەرکوکی مەزندە کردووە بە ١٢ بۆ ١٥ هەزار کەس و دووپاتی کردووەتەوە، کە جگەلە ٤٠ خێزانی ئەرمەنی نەبێت، دانیشتووانی شاری کەرکوك سەرجەمی کوردن[١٢]. بەلگەیەکی تر بۆ سەلماندنی ئەوەی هەردەم زۆرینەی دانیشتووانی شاری کەرکوك کورد بووە، خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە هەمیشە نوێنەرانی کەرکوك لە پەرلەمانی عێراق ٣/٢ کورد بوونە و بەشەکەی تریشی بریتی

بووە لە تورکمان و عەرەب کەمنییەکانی تر[13]، ئەویش ئەوە دەسەلمێنێت کە هەردەم کورد لە لیواو شاری کەرکوك لە پەرلەمانی عێراق کورد بوونە.

* سەرچاوەکان:-


١.

- Politikens retskrivnings- og betydnings ordbog, ٢. udgave ١٩٩٧,S. ١٤٩.
- Politikens Nudansk ordbog, ١٥. udgave, ١٩٩٤, S. ٣١٣.
- Politikens filosofi leksikon, ١, udgave ١٣, oplag, ١٩٨٤, S. ١٠٩.
- Cassel Concise English Dictionnary, London, ٤. edition, Cassl, ١٩٩٤.

٢. (ئینسکلۆپیدیای گەورەی وولاتی دانمارك)، ٢٠ بەرگە، ساڵی ١٩٩٤ دەستی پێ کراوەو یەکەم بەرگی ئامادە کراوەو لە (١٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠١)، بەرگی بیستەم کۆتایی هاتووەو تەواو بووە، بە گشتی پتر لە ٣٠٠٠ پسپۆر بە نووسین بەشداری کردووە لە ئینسکلۆپیدیای وولاتی دانمارك، هەروەها لەلایەن ٨ پرۆفیسۆرو، ٦ بەرێوەبەری گشتیو، ٣٦ بەرێوەبەری هونەری، سەرپەرشتیو ئامادە کراوە، پێناسەی کەرکوك: بەرگی دەیەم، لاپەرە ٥٦٠.

٣. ئینسکلۆپیدیای گەورەی وولاتی نەرویج چاپی ١٩٩٨، بەرگی ٨، لاپەرە ٥٦٠.

٤. ئینسکلۆپیدیای گەورەی وولاتی سوید، چاپی ١٩٧٠، بەرگی ٢، لاپەرە ٢٣٥.

٥. ئینسکلیپیدیای گەورەی وولاتی ئەڵمانیا، دوایین چاپ لاپەرە ٣٥، لە پیتی ك.

٦. ئینسکلۆپیدیای زانکۆی کۆلۆمبیا (لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا)، دوایین چاپ ٢٠٠٢، لەسەر تۆری ئەنتەرنێت (WWW. encyclopedia. com).

٧. ئینسکلۆپیدیای بەریتانیا (Britannica Encyclopedia)، دوایین چاپ لەسەر تۆری ئەنتەرنێت (WWW. encyclopedia. com).

٨. ئینسکلۆپیدیای دامەزراوی (Microsoft)ی ئەمەریکی، دوایین چاپ ٢٠٠١.

٩. لە نووسینی (ئەنەس پەریشۆ، یۆرگن بێك سیمونسن)، کتابێکی دانمارکییە، بە ناونیشانی: خۆرهەڵاتی ناوەراست! کێ؟ چی؟ لە کوێ؟، لاپەرە ١٠٧، چاپخانەی پۆلتیکن، ١٩٩٢، دانمارك.

١٠. ڕۆژنامەی (الاتحاد)، ژمارە ٤٧٤، ساڵی (٢٤)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٢)، (شمس الدین سامی)، قاموسی ئیعلامی عوسمانی، ١٣١٥ هیجری، ١٨٩٨ زاینی، ئەستەنبوول.

١١. وێنەی ئۆرجەناڵی نەخشەی دەسەڵاتی ئیمبراتۆرییەتی عوسمانی لە کیشوەری ئاسیا، لە ساڵی (١٨٩٣)ی زایندا نەخشە کێشراوە، لە سەردەمی خەلافەتی سوڵتان عەبدولحەمید، لە ئارشیفی دەوڵەتی عێراق لە مانگی نیسانی ساڵی (٢٠٠٣) لە پرۆسەی ئازادی عێراق دەست جەنابی مام جەلال، سەرۆك کۆماری عێراقی فیدراڵ کەوت لە هەمان ساڵدا (٢٠٠٣) لە بەغدادی پایتەختی عێراق، لە کۆبوونەوەیەکی مەجلیسی حوکمدا خستییە روو وەك بەڵگەیەکی تری گرنگی مێژوویی و جوگرافی بۆ سەلماندنی کوردستانی بوونی کەرکوك.

١٢. د. جەبار قادر، لە لێکۆڵینەوەیەکیدا بە ناونیشانی: (التركيب الاثني لسكان كركوك خلال قرن).

١٣. محەمەد ئەمین زەکی بەگ، دوو تەقەلای بێ سوود، (١٩٨٤) چاپخانەی (هەلۆێست)، لەندەن.

١٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

*** کەرکوک لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا:**

نووسینی: ج. هـ. کرامرز (تۆما بوا).
وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: دکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵا

**- پێشبار:**

**(ئینسکلۆپیدیای ئیسلام) یەکێکە لەو سەرچاوە ڕەسەنانەی، کە بۆ لێکۆڵینەوەو نووسینەوەی مێژووی جیهانی ئیسلام کارێکی زانستیی کەم وێنەیە. ئەم سەرچاوە زانستییە کە لە وەتای ساڵی (١٩١٣- ١٩٣٨)ەوە نووسراوەتەوە، ساڵ لە دوای ساڵ پاکنووس و راستکردنەوەی بۆ دەکرێت و لێی زیاد دەکرێ، بووەتە یەکێك لەو سەرچاوە ڕەسەنانەی کە جێگەی پشت پێبەستنە.**

**بەشی کورد لەم ئینسکلۆپیدیایەدا زۆر بەرچاوەو کۆمەڵێك مەتریاڵ و کەرەستەی زۆر پڕ بایەخ لەناو ئەم ئینسکلۆپیدیایەدا لەبارەی هۆز، شار، شارۆچکە، ئاین، ئاینزا کوردییەکان دەبینرێن، کە هەق وایە تا ئەو کاتەی هەموو ئینسکلۆپیدیایەکە بەسەر یەکەوە دەکرێتە کوردی هەر هیچ نەبێ ئەوەی تایبەتە بە کوردو کوردستان بکرێتە کوردی. لێرەدا ئەم ووتارەی کە تایبەتە بە شاری کەرکوک دەکەنە کوردی. ئەم ووتارە لە نووسینی ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی هۆڵەندی ج. هـ. کرامرز (١٨٩١- ١٩٥١)[1]ە.**

**لە چاپەکانی یەکەمی ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا (١٩١٣- ١٩٣٨)، بەرگی دووەم (١٩٢٧) بڵاوکراوەتەوە، بەڵام لە چاپەکانی دواتردا ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسایی تۆما بوا (١٩٠٠- ١٩٧٥) زانیاری زیادەی خستە سەرو زانیارییەکانی تازە کردوونەتەوە، بۆیە لە چاپی دووەمی فەرەنسایی ئینکسلۆپیدیای ئیسلام (١٩٥٤- ٢٠٠٥)، بەرگی پێنجەم (١٩٨٦)، لە کۆتای وتارەکەدا ناوی تۆما بوا لە دوای ناوی ج. هـ. کرامرز خراوەتە ناو دوو کەوانە، بەو واتایەی، کە بە زانیارییەکاندا چۆتەوە. (وەرگێر).**

**- کەرکوک:**

**کەرکوک KIRKÛK: یەکێکە لە گەورەترین شارەکانی ناوچەی میزۆپۆتامیایە (کەوتۆتە سەر هێڵی ٣٥،٤٥° لە ڕۆژهەڵات، ٢٥،٣٥° لە باکوور)، زێی بچووك لە باکووری- ڕۆژئاوا، چیای حەمرین لە باشووری- ڕۆژئاوا، دیالە لە باشووری- ڕۆژهەڵات و زنجیرە چیاکانی زاگرۆس لە باکووری ڕۆژهەڵات دەوریان داوە. لەلایەن برێك نووسەران (بۆ نموونە س. ژ. گادو سیدنی سمیت)[2] وەکو شوێنی شاری کۆنی (ئەرابخا) دەستنیشان کراوە. کەرکوك بەشداری لە شۆڕشی کورێکی شەلمانسەری دووەم (٨٥٨- ٨٢٤ ی پ. ز)دا کردووە دژی باوکە پیرەکەی. کەرکوک جارێکی دیکە لەژێر حوکمڕانیی ئاشووری- دانی سێیەم (٧٧١- ٧٥٤ ی پ. ز) ڕاپەڕیوە. پێش ئەوەی کەرکوك لەلایەن کەیخەسرەوی[3] پاشای مادەکان لە کۆتایی ساڵی (٦١٥ ی پ. ز) داگیر بکرێت لەشکری سەرکەوتووی نەبووپۆلاسەر[4] لە ساڵی (٦١٦ ی پ. ز)، بەناو شارەکەدا تێپەڕیوە[5].**

**لە سەردەمی ئیمپراتۆریای کۆنی بابل و لە دەورانی ئاشووریشدا، چەندین جار شاری کەرکوك و هەموو دەوروبەرەکەی بەرەو رووی لەشکرکێشیی گەلانیی چیانشینی لای باکووری- ڕۆژهەڵات بووەتەوە. لە دەورانی ساسانیدا (٢٢٦- ٦٥١)ی زاییندا، بە مەڵبەندی کەرکوك گوتراوە هەرێمی گەرمەکان (لەلایەن مێژوونووسی ئەرمەنی موسی خۆرین)، لەسەرچاوە سریانییەکاندا بەناوی (بێت گەرما Beth Garmai) ناوی هاتووە. لە هەمان ئەو سەرچاوانەدا، شاری کەرکوک بەناوی (کەرخای بێت سلوق) ناوی هاتووە[6]. ئەم ناونانەی کەرکوک لەلایەن نیکاتۆری پاشای سلوقی یەکەم (دەورووبەری ٢٨٠ - ٢٥٥ ی پ. ز) ەوە لێنراوە، کە لەناو قەڵاکەدا بورجێکی دروست کردووەو تەنانەت لە دەورانی ساسانییەکاندا کەرکوك هێشتا هەر ناوەندێکی بەناوبانگی نەستوورییەکان بووە، سەرۆکی ئەسقەفەکانی (بێت گەرما)ی تێدا ژیاوە[7].**

**مەسیحییەکان لە دەورانی شاپووری دووەمدا لەوە کەمتر بەرەو رووی چەوساندنەوە نەبوونەتەوە بە تایبەت لە ساڵی (٤٥٥) زایینی، چەوساندنەوەی مەسیحییەکان لە دەورانی یەزدگەری دووەمدا، چەندان هەزار قوربانی لێکەوتەوە[8]. دواتر ڕەوشی مەسیحییەکان چاکتر بووە، چونکە لە دەورانی شۆسرۆسی دووەم (٥٩٠- ٦٢٨ی زایین)، یەکێکە لە مەسیحییەکانی شارەکە، بەناوی (یەزدین) کراوە بە وەزیری دارایی، ئەو هێندە بەناو و شۆرەت بوو، تەنانەت زێدی لە دایکبوونی بۆ ماوەیەك ناوی (کەرخی یەزیدین)ی بەخۆوە گرتبوو[9].**

**مێژوونووسە عەرەبەکان بەناوچەی (بێت گەرما)ی سەرچاوە ئاشوورییەکان دەڵێن (بادجرمای). یاقووت باسی شارێك دەکات بەناوی (کەرخینە)[10] کەهۆفمان[11] پێی وایە ڕێك بە شاری کەرکوکی دەناسێتەوە. ڕاستییەکەی ئەمڕۆ هێشتاکە، خەڵکی شەقڵاوەو عەنکاوە کە سەفەری کەرکوك دەکەن دەڵێن دەچین بۆ (کەرخینە)[12].**

**لە سەردەمی شەشەمی (کۆچی)، دوانزەهەمی (زایینی)، ناوچەی کەرکوك سەر بەو زەوی و زارانە بوو کە لەژێر دەسەڵاتی میرنشینی بەگتاکییەکاندا بوو، کە شوێنی دانیشتنیان لە ئەربیل بوو. دوای مردنی موزەفەرەدین گۆکبوری لە (٦٢٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٣٢) زایینی، موڵك و قەڵەمڕەوی ئەم میرنشینە خرایەوە سەر قەڵەمڕەوی خەلیفەی عەباسییەکان، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم، شاڵاوی داگیرکردنەکانی مەگۆڵەکانی بەدوادا هات. ناوی کەرکوک بۆیەکەم جار لە مێژووی (تەیمووری شەرەف ئەلدین عەلی یەزدی)[13]دا هاتووە. دواتر دەورانی حوکمڕانیی ئاق قۆیلنوەکان دێت، دوای ئەوە داگیرکردنەکانی میزۆپۆتامیا لەلایەن شا ئیسماعیلی یەکەم لە ساڵانی یەکەمی سەدەی شانزەیەمدا پەلاماری شا ئیسماعیلی یەکەمی بەدوادا هات. کاتێکیش دواجار میزۆپۆتامیا و عێراق کەوتنە بندەستی**

سوڵتانەکانی عوسمانی، سوڵتان سەلیمی یەکەم‌و سوڵتانی یەکەم (یەکەمین پەیماننامەی ئاشتی تورکی- ئێرانی لە (٢٩)ی ئایاری ساڵی (١٥٥٥) لە ئەماسیە مۆرکرا).

کەرکوك ڕۆڵی کۆنی خۆی وەك قەڵایێکی گرینگ دژ بە دوژمنی ڕۆژهەڵات وەرگرتەوە[١٤]. دوای کەوتنی بەغدا لە ساڵی (١٠٣٢) کۆچی بەرامبەر بە (١٦٢٣) زایینی، شارەکە سەر لە نوێ کەوتەوە بندەستی ئێرانییەکان. بەڵام خەسرەو پاشا لە ساڵی (١٦٣٠) دووبارە شارەکەی داگیر کردەوە. لە ساڵی (١٦٣٨) سوڵتان موورادی چوارەم لەکاتی لەشکرکێشی بۆ دووبارە داگیرکردنەوەی بەغدا، بەناو شاری کەرکوکدا تێپەڕیوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا شەڕداری ئەو دەرو ناوچەیە هەر ئاغا کوردە ناوخۆییەکانی هەرێمی ئەردەڵان بوون[١٥]. بەڵام کەمێك دواتر، لەسایەی جموجووڵی پاشاکانی ئەیالەتی شارەزوور، دەسەڵاتی عوسمانی لە کەرکوکدا جێگیر بوو. ئەم ئەیالەتە لە (٣٢) سنجاق پێکهاتبوو، کە یەکێك لەو سنجاقانە شاری کەرکوك بوو. دوای قەڵای شارەزوور لەلایەن شا عەباس (١٥٧١- ١٦٢٩)ەوە لەگەڵ زەوی تەخت کرا، ئەم شارە بووە نشینگەی پاشایەتی شارەزوور[١٦].

لە ساڵی (١٧٣٢)، نادرشا، کە هێشتا تاجی شایەتی لەسەر نەنابوو، بێهوودە شاری کەرکوکی گەمارۆدا. ساڵی دواتر شەڕێکی گەورە لە نزیك کەرکوك ڕوویدا تێیدا تورکەکان بە تەواوی لەژێر سەرکردایەتی تۆپاڵ عوسمانی پاشای سەروەزیر (وەزیری ئەعزەم) تێکشکان. هەر لەو شەڕەدابوو، کە تۆپاڵ عوسمان سەری تێداچوو، لە ساڵی (١٧٤٣) کەرکوك سەر لەنوێ کەوتەوە بندەستی ئێرانییەکان، بەڵام دوای مۆرکردنی پەیماننامەی ئاشتی ساڵی (١٧٤٦) دووبارە گەڕایەوە بۆ ژێردەستی تورکەکان‌و شارەکە تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی، هەر لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای عوسمانیدا مایەوە. لە (٧)ی ئایاری ساڵی (١٩١٨) کەرکوك لەلایەن ئینگلیزەکانەوە داگیرکرا، بەڵام لەدوای (١٥) ڕۆژ چۆڵیان کرد تا لە کۆتایی تشرینی یەکەم ئینگلیزەکان دووبارە لە سەروبەندی ئاگربەستی مودرۆسدا داگیریان کردەوە. شاری کەرکوك لە دەرەوەی دەسەڵاتی شێخ مەحمود بوو (تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ – ئایاری ساڵی ١٩١٩) لەم ماوەیەدا کەرکوك‌و هەرێمەکانی بەهێمنی بەڕێوە دەبردران. ڕۆژنامەیەك بە زمانی تورکی تێدا بڵاو دەکرایەوە‌و (١٦) قوتابخانەی تێدا کرایەوە. لە سەروبەندی ڕاپرسی لە تەمموزی ساڵی (١٩٢١)دا، کەرکوك مەلیك فەیسەڵی یەکەمی وەك پاشای عێراق ڕەت کردەوە. لەوساوە پڕۆپاگەندەی تورکەکان لە ناوچەکەدا پەرەی سەند، کە لەلایەن لیژنەیەکی تورکی بە پشتگیری بنەماڵەی نەفتچیزادە‌و چەند بنەماڵەیەکی تورکخوای دیکەوە پشتگیری دەکرا، بەڕێوە دەچوو.

لە (١٧)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٢) تورکەکان قایمقامێکیان لە ڕەواندز دانا‌و لە کۆتایی تەممووزیشدا کۆلۆنێل (عەلی شەفیق) ناسراو بە ئۆزدەمیر یان پیاوە ئاسنینەکە، لە ویلایەتەکە بڕێك پێشوەچوونی بە دەست هێنا، بەڵام نەیتوانی هەموو ویلایەتی موسڵ بگرێتەوە، کە تورکەکان بە بێ سەرکەوتن لە کۆنفرانسی لۆزاندا (٢٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٢)–(٢)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٣) داوایان دەکردەوە. پەیماننامەی لۆزان (٢٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٢٣) پرسی ویلایەتی موسڵی بە بێ چارەسەری بە هەڵواسراوەیی هێشتەوە‌و خستییە بەردەم کۆمەڵەی گەلان. کۆمەڵە گەلانیش کۆمسۆنێکی بە دواداچوونی بۆ ناوچەکە ڕەوانە کردو لە کاتی کۆبوونەوەی (٣٧)ەمینی وەرزی خۆیدا، کە لە (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٤) لە جنێڤ بەسترا، ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان، بە یەکجارەکی پرسەکەی چارەسەر کرد بە بەخشینی هەموو ئەو زەویوزارانەی کە کەوتبوونە باشووری هێڵی ناسراو بە هێڵی برۆکسێل بە عێراق. لەو ساتەوە کەرکوك کەوتە ناو پاشانشینی عێراقەوە.

شاری ئێستای کەرکوك بەشێکی لەسەر گردێکی دەستکرد یان قەڵایەك، کە بە بەرزی چل مەترێك بونیات نراوە‌و بەشێکی دیکەشی لە خوارەوەدا کەوتۆتە سەر کەناری دوو ڕووباری خاسە چای، کە ئاوەکەی تێکەڵ بە ئاوە سپی دەبێ، دواتر ڕووباری عوزێم پێك دەهێنن‌و لە ٣٠ کیلۆمەتری باشووری بەلەدەوە دەڕژێنە ناو ڕووباری دیجلەوە. لەسەر کەناری ڕاستی خاسەچای، لە ناوەڕاستی سەوزاییەکەدا، گەڕەکی ئیشنکەیی عەرەفەی لێیە.

دانیشتووانی شاری کەرکوك لە ساڵی (١٩٢٢) لەلایەن (ئی . بی. سۆن)[١٧] بە (١٥,٠٠٠) پانزە هەزار کەس‌و ساڵی (١٩٢٢) لەلایەن (ئیدمۆندن) بە (٢٥,٠٠٠) بیست‌و پێنج هەزار کەس خەمڵێنراوە. ساڵی (١٩٦٥) ئامارە ڕەسمییەکان، بە لەبەرچاوگرتنی پێوەری زمانی دایك، ژمارەی دانیشتووانی شارەکەیان بە (٢٨٤,٠٠٠) دوو سەدو هەشتا‌و چوار هەزار کەس داناوە، ئەوانە حەفتا‌و یەك هەزاری (٧١,٠٠٠) کورد، پەنجا‌و پێنج هەزاری (٥٥,٠٠٠) تورکمان‌و چل‌و یەك هەزاری (٤١,٠٠٠) عەرەب بوون. دانیشتووانی ئێستای کەرکوك[١٨] بە دڵنیاییەوە لە دوو سەد هەزار (٢٠٠,٠٠٠) کەس زیاترە‌و دەبێ ئاماژە بەوە بکەین، کە لەوەتای چەند ساڵێکە دەسەڵاتکاران بایەخێکی زۆر تایبەت دەدەن بەوەی کوردەکان کۆچ پێبکەن‌و شوێنەکانیان بە عەرەب بگرنەوە.

کەرکوك ناوەندی ئیداری لیوایە‌و لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە بووە بە پارێزگا[١٩]. بۆ یادکردنەوەی خۆماڵیکردنی کۆمپانیاکانی نەوت لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٢)، هەروەها بە مەبەستی لە کوردیی شۆردنەوەی ناوی شارەکە، لەوەبەدوا ناوەکەی گۆڕدرا بۆ (ئەلتەئمیم) کە واتای (خۆماڵیکردن)[٢٠] دێت (کەچی وێڕای ئەمانە شارەکە تایبەتمەندێتیی خۆی هەر پاراست). ژمارەی دانیشتووانی پارێزگاکە بە خێرایی لە سایەی پەرەسەندنی پیشەسازی نەوت زیادی کرد. لە ساڵی (١٩٥٧) ژمارەی دانیشتووانی شارەکە لە سێ سەدو هەشتا‌و هەشت هەزارو نۆ سەد (٣٨٨,٩٠٠) کەسەوە گەیشتە پێنج سەدو بیست سێ هەزار (٥٢٣,٠٠٠) کە لە ساڵی (١٩٧٠).

لەگەڵ زۆرینەیەکی کوردی، لە کەرکوکدا کوردو عەرەب‌و تورکمانەکانی شارەکە موسڵمانی سوننە مەزهەبن، بەڵام تورکمانی ئاواییەکان سەر بە مەزهەبێکی تایبەتی ئایینی (لە ئایین هەڵگەڕاوە Heterodox)و نهێنی قزڵباشن[٢١]. مەسیحییەکان زۆرینەیان کلدانین (نزیکەی ٤,٥٠٠ کەسن)

کە مەترانێك (ئارشەڤێك)و ژمارەیەك قەشەیان هەیە، نەستورییەکان قەشەیەکیان هەیە لە هەریر دادەنیشێت. کۆلۆنییەکی بچووکی جوولەکە، کە بریتین لە بازرگانەکان لە شارەکە نیشتەجێن، یەکێکیان لێ بوو بە ئەندامی پەرلەمان لە بەغداو یەکێکیشیان بوو بە بەڕێوەبەری ئیدارەخانەی دارایی لە لیوای کەرکوك، ئەم کۆلۆنییە جوولەکەیە لە ڕۆژگاری جەنگی ئیسرائیل - عەرەب لە ساڵی (١٩٤٨) شارەکەیان جێهێشتووە. ئەو جوولەکانە باوەڕیان وابوو ئەوان نەوەی ئەو جوولەکانەن، کە نەبوخوزنەسر دوای داگیرکردنی ئۆرشەلیم، لە ساڵی (٥٨٦)ی پێش زایین، هێناونی بۆ بابل، ئەوان بە زمانی ئارامی دەدوان.

لە مزگەوتی بچووکی نەبی دانیال، کە دەکەوێتە سەر قەڵای کەرکوك، یادی ئەم پێغەمبەرە جوولەکەیان دەکردەوە، کە لە هەمان دەوراندا کۆچی پێ کراوە. هەروەها لە شارەکەدا تاوەکو ساڵی (١٧٠٠) کڵێسەیەکی کۆن‌و بەهەمان شێوە مزگەوتی (ئولو جامیع Uludjami)یشی لێ بووە، بەڵام کۆنترین کڵێسە لە جیهان کڵێسەی شەهید (مار تەهمازگەردە Mar Tahmazgerd)، کە لەلایەن سەرۆکی قەشەکان لە دەوروبەری (٤٧٠)ی زایینی لە ڕۆژهەڵاتی قەڵای کەرکوك بوونیات نراوەو بە ناوی (شەهادەتی گەورە Garand Martyrion) ناسراوە، لە کاتی کشانەوەی لەشکری تورکەکان لە ساڵی (١٩١٨) لە سۆنگەی ئەو تەقەمەنییانەی کە ئاخنیبوویانە ناوییەوە تەقێنرایەوە[22].

نەخشەی شارنشینی کەرکوك وای کردووە شارەکە ببێتە ناوەندێکی گرنگی ڕێگەوبانی پانوپۆڕ. مەسیحییەکان بە دەورانێکی هەرە کۆنەوە لە شارەکەدا جێگیر بوون، وا دیارە لە سەرەتاوە لەگەڵ زۆرو کەمی گرنگیدا لە شارەکە ماونەتەوە. هەرچی سەبارەت بە تورکمانەکانە، ئامادەبوونی نا ئاساییان لە کەرکوك‌و ناوچەکانی دەوروبەریدا لەناو گرۆبەندییەکی کوردیدا، بە ڕای بڕێك لە توێژەرەوەکان دەگەڕێتەوە بۆ پێش داگیرکردنی شارەکە لەلایەن سوڵتانی عوسمانییەکانەوە. سەبارەت بە بنەچەکەیان دەبێ لەناو ئەو ئۆردووە تورکییانە بگەڕێن کە خەلیفەکانی عوسمانی لە سەدەی سێیەم - نۆیەم بۆ ناو شارەکە کۆچیان پێکردوون، یان لەناو ئەو کۆچپێکردنانەی سەلجووقی‌و بەکتاییەکان‌و ئەتابەگییەکانی ئەربیل[23] بگەڕێن. هاتنیان بۆ ناوچەکە هەر چۆنێك بێت، ئەوا تورکمانەکانی کەرکوك هەمیشە پشتیوانییەکی بە هێز بوون بۆ ئیمپراتۆریای عوسمانی‌و فەرهەنگەکەیی‌و سەرچاوەیەکی بە پیت بوون بۆ فەرمانکارە عوسمانییەکان[24].

ڕەوشی بەڕێوەبەرایەتی کەرکوك بە گوێرەی سەدەکان جیاواز بووە. "لە سەدەی هەشتەم کەرکوك ناوەندی - ئیداری ئەیالەتی شارەزوور بووە، کە لیوا تازەکانی کەرکوك‌و ئەربیل‌و (بە شێوەیەکی رووکەشیش) سلێمانی دەگرتەوە، کە لە ژێر قەڵەمڕۆی موتەسەلیمێك کە لەلایەن بەغداوە دیار دەکرا، بەڕێوە دەبردرا. لەگەڵ چاکسازییەکانی مەدحەت پاشای والی بەغدا لە ساڵی (١٨٦٩) تا ساڵی (١٨٧٢)، ناوی شارەزووری بە سنجاقی کەرکوك بەخشی، کە لیواکانی ئێستای کەرکوك‌و ئەربیلی دەگرتەوە، لە کاتێکدا کە شارەزووری مێژوویی لە دەورەی سنجاقی نوێی سلێمانی مایەوە، ویلایەتی موسل لە ساڵی (١٨٧٩) پێکهات‌و کەرکوك وەك شارێکی گرنگی سەربازیی مایەوە"[25].

لە دەورانی تورکەکاندا ویلایەتی موسڵ دابەشی سەر سێ سنجاق یان لیوا کرابوو: موسڵ، کەرکوك‌و سلێمانی. لە ساڵی (١٩١٨)، سێ قەزا لە باکووری زێی بچووك لە کەرکوك جودا کرانەوە بۆ ئەوەی لیوای ئەربیلی لێوە دروست بکەن. لە دەستووری ساڵی (١٩٢٥)ی دەوڵەتی نوێی عێراقدا، کە لە سێ ویلایەتی عوسمانی: ویلایەتی بەغدا کە بوو بە پایتەخت‌و بەسرەو موسڵ پێکهات، لیوای کەرکوك لە (١٤) قەزا پێکهاتبوو: کەرکوك، کفری، چەمچەماڵ‌و گل. ئەمڕۆ پارێزگای ئەلتەئمیم[26] (کەرکوك) لە ژێر دەسەڵاتی پارێزگارێك (موحافین) دایە، پێنج قەزا دەگرێتەوە خۆ، کە بریتین لە قەزاکانی: کەرکوك، توزخورماتوو، قەرەحەسەن، ئاڵتون کۆپری، دبس، شوان. ناحییە لەلایەن مودیر ناحییە بەڕێوە دەبردرێت. کەرکوك دادگەیەکی بەرایی‌و دادگەیەکی تێهەڵچوونەوەو ئۆردوویەك‌و فرۆکەخانەیەکی لێیە. هەروەها بارەگای یەکێتی نووسرانی تورکمانیشی لێیە.

کەرکوك ناوەندێکی بازرگانی گرنگ‌و بازارێکی بەرهەمی کشتوکاڵی‌و دانەوێڵەیی‌و ئاژەڵی ناوچەکانی دەوروبەرییە. کەرکوك ڕێگەوبانی چاکی هەیە، بەرەو بەغدا لە ڕێگەی تاووق‌و کفری، بۆ موسڵ لە ڕێگەی ئاڵتوون کۆپری - ئەربیل، بۆ سلێمانی لە ڕێگەی چەمچەماڵ‌و لەگەڵ درێژبوونەوەی ڕێگەکە بۆ سەنەندەج‌و هەمەدان لە ئێران. هێڵێکی ڕێگەی ئاسنینی شەمەندەفەری تەسك کەرکوك بەغدا لە باشوورو بە ئەربیل لە باکوورەوە دەبەستێتەوە[28].

ئەو زەویوزارانەی کە لە دەوروبەری کەرکوکدان، بە زۆری زۆرینەیان کوردیان تێدا نیشتەجێن، بەڵام لە ڕۆژئاوای شارەکە پێدەشتی میزۆپۆتامیا دەست پێدەکات، کە بە ڕوویەکی تایبەتی عەرەبەکانی تێدا دەژین، لە دەوروبەری شارەکەدا ڕاستەوخۆ میوەگەلێکی زۆر بەرهەم دەهێنرێن.

ناوچەی کەرکوك دەوڵەمەندە بە گۆگردو کەرەسەتگەلی ئەسفەلتی‌و بە تایبەتیش چاڵگەی نەوت، کە لە دەورانی کۆنەوە دەرهێنراوە. پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کەوا نەوتی بەدەستهاتوو هەر لە دەورانی عوسمانییەوە هێندێك گرنگیی خۆی هەر هەبووە: لەلایەن سوپاوە بەکارهێنراوە[29]. فەرمانێك لە ساڵی (١٦٣٩) قۆرخی وەبەرهێنانی نەوتی بە تورکمانەکانی ناوچەی کەرکوك، نەفتچیزادەکان بەخشیوە. بەڵام وەبەرهێنانی ڕێکوپێکی چاڵگە نەوتییەکانی کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ ئاداری ساڵی (١٩٢٥)، ئەو کاتەی ئیمتیازی نەوت بە کۆمپانیایەکی نەوتی تورکی (.T. P. C) درا، کە لە ساڵی (١٩١٤) دامەزرابوو، بۆ وەبەرهێنانی چاڵگە نەوتییەکانی هەردوو ویلایەتی موسڵ‌و بەغدا لەسەر بنەمای مافی ئیمتیازی (٤) شیلینگ زێڕ بۆ هەر تۆنێك نەوتی دەرهێنراو. پێش کۆتایی ساڵی (١٩٢٥) کاری جیۆلۆجی‌و ڕاکێشانی ڕێگەوبان لە ویلایەتی موسڵ‌و دابینکردنی ئاو و دانانی بۆری نەوت‌و کاری بیناسازی دەست پێ کرد. پەنجا

(٥٠) بەریتانی و دوو هەزارو پێنج سەد (٢,٥٠٠) کرێکاری عێراقی دەستیان بە کارکردن کرد. شوێنەکانی بیرلێدان لە ناوچەی جەبەل حەمرین لە نزیك تووزخورماتووی دراوسێی کەرکوك دانران. هەڵمەتی هەڵکەندن لە نیسانی ساڵی (١٩٢٧) لەلایەن مەلیك فەیسەڵی یەکەم کرایەوەو بۆ یەکەم جار نەوت لە (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٧) لە بابا گوڕگوڕی نزیك کەرکوك هەڵقوڵی. ساڵانی (١٩٢٧) تا (١٩٣١) تەرخان کرابوو بۆ ئامادەکردنی ناوچەی کەرکوك بە ئامانجی بەرهەمهێنان. بۆ هەڵکەندن‌وو بە دواداگەڕانی زانستی لە ڕێگەی پەرەپێدانی خزمەتگوزارییەکانی پێویست: جێگیرکردنی بەرهەمهێنان، عەنبار، وەرشە، شوێنی نیشتەجێبوون.. هتد. لە هەمان کاتدا بۆ درێژکردنەوەی وتووێژ لەگەڵ حکومەتی عێراقی بە ئامانجی درێژکردنەوەی ماوەی دەستنیشانکردنی ئەو زەوییزارانەی، کە لەناو ڕێککەوتننامەی ساڵی (١٩٢٥)دا هاتوون. لە ئاداری ساڵی (١٩٣١) کۆمپانیاکە، کە لەوەتای ساڵی (١٩٢٩)وە بووە بە کۆمپانیای نەوتی عێراقی (I. P. C.) توانی لە هەموو ناوچەکانی باکووری – ڕۆژهەڵاتی عێراقدا وەبەرهێنان بکات، بەو مەرجەی لە ساڵی (١٩٣٥) بۆرییەکی نەوت دروست بکات، کە بگاتە سەر دەریای سپی ناوەڕاست بە توانای (٣) ملیۆن تۆن لەگەڵ بردنی لقێك بۆ (حەدیسە)، لەسەر ڕووباری فوراتەوە بەرەو (حەیفا) و (تەرابلووس) کە پشکی حکومەتی عێراقی ساڵانە (٤٠٠,٠٠٠) پاوەند بێت.

هەر لە ساڵی (١٩٣١) ئیدارەخانەی گشتیی کۆمپانیای نەوتی عێراقی بۆ وەبەرهێنان لە تووزخورماتووەوە گواسترایەوە بۆ کەرکوك‌و هەروەها ئەوەی ئیدارەخانەی بۆرییە نەوتییەکانیش لە حەیفا جێگیر کرا. وەبەرهێنانی نەوتی خاوی کەرکوك لە کۆتایی ساڵی (١٩٣٤) دەستی پێکردو لە ساڵی (١٩٣٥)وە بەرهەمی ساڵانەی گەیشتە ٤ ملیۆن تۆن‌و عێراقی گەیاندە پلەبەندی هەشتەمی وڵاتانی نەوت بەرهەمهێن.

لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٣٥)، لە کەرکوك ئاهەنگی ڕەسمیی کردنەوەی بۆرییەکی دووانەی دوانزە (١٢) ئینجی بەستراو بە دەریای سپی ناوەڕاست گەیەنرا. جەنگی ئیسرائیل – عەرەب لە ساڵی (١٩٤٨) وای کرد ئەو لقەی کە بۆ حەیفا ڕاکێشرابوو بوەستێت، کە ئەمە بوو بە سۆنگەی زیانی (٧) ملیۆن تۆن نەوت‌و ماف ئیمتیازی بەرانبەر. لە ئەنجامدا لە ساڵی (١٩٤٩)، بۆری نەوتی بەرەو تەرابلوس، بۆرییەکی دیکەی (١٦) ئینجی بۆ زیاد کرا (کە ئەمە بەرهەم‌و وەبەرهێنانی نەوتی سێ هێندە کرد).

لە ساڵی (١٩٥٢) سێیەمین بۆری نەوت ئەمجارە بە (٣٠) ئینجی خرایە کار لەنێوان کەرکوك‌و بانیاس (سوریا). لەوساوە بازاڕی جیهانیی نەوتی عێراق پەرەی سەندو ساڵانە گەیشتە (١٤) ملیۆن تۆن. لە (٣)ی شوباتی ساڵی (١٩٥٢) ڕێککەوتننامەیەکی نوێ لەنێوان حکومەتی عێراق‌و کۆمپانیای نەوتی عێراقی لە بارەی دووبارە دابەشکردنەوەی فەرمانبەران‌و بەرهەمهێنان‌و دەرامەتەوە مۆرکرا. بەو جۆرەی چاوەڕوان دەکرا دەبوو ساڵانە ئاستی کەمیی بەرهەمهێنانی نەوت لە ساڵی (١٩٥٣) بگاتە (٢٢) ملیۆن تۆن‌و داهاتی نەوت لە (٣٠) ملیۆن پاوەند لە ساڵی (١٩٥٢)ەوە بگاتە (٦٠) ملیۆن پاوەند لە ساڵی (١٩٥٥). بەم شیوەیە قازانجی هەردوو لا لە بەرهەمهێنانی نەوتدا لەسەر بنەمای پەنجا بە پەنجا دابەش کرا.

شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨)ی عێراق ئەم ڕێکەوتننامەی نێوان حکومەت‌و کۆمپانیای نەوتی دەستکاری نەکرد. ئامانج لەوە بەدەستهێنانی بەرهەمهێنانی داهاتێکی (١٠٠) ملیۆن پاوەندی بوو بە توانای (٧٠) ملیۆن تۆن ساڵانە. ئەوەبوو لە ماوەی چوار ساڵدا بەو ئاستە گەیشتن، بەڵام هەتا ئێستاش ژمارەیەکی کێشەی پەیوەست بە لێکدانەوەی ڕێکەوتننامەکە هەر لە ئارادایە. لە نیسانی ساڵی (١٩٦١) گفتوگۆکان دەستیان پێ کردەوە، دوای چەندین دابڕان‌و سەرنەکەوتن دواجار بە دەرچوونی قانونی ژمارە (٨٠) لە (١١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦١) کۆتایی هات، کە لە (٩٩,٥٪)ی ئەو زەوییانەی کۆمپانیاکان ماف بە دواداگەڕانیان پێدرابوو، وەرگرتەوە.

کۆمپانیای نەوتی عێراقی تەنها (٢٢) خاڵی هێشتەوە، لەوانە (١٢) خاڵیان لە کەرکوك بوون، واتە ڕووبەری (٤٧٨,٧٥) کم چوارگۆشە، (٦) خاڵ لە (بای حەسەن) واتەی (١٨٢,٥) کیلۆمەتری چوارگۆشەو (٤) خاڵ لە (جەمبوور)، واتەی (٥,٨٦) کیلۆمەتری چوارگۆشە[٣٠]. لەنێوان مانگی ئایاری ساڵی (١٩٦٤)و حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٥) لە چوارچێوەی کۆمپانیای نیشتمانیی نەوتی عێراقی (I. N. O. C.) کە تازە دامەزرابوو (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٢)، گۆڕانکاری نوێ هاتنە ئاراوە. دواتر هەروەها دوای ئەوەی قانوونگەلی نوێ دەرچوون: قانوونی ژمارە (٩٧) لە (٦)ی ئابی ساڵی (١٩٦٧) ڕێگەی لەوە گرت هیچ ئیمتیازاتێکی نوێ بدرێتە کۆمپانیا بێگانەکان‌و قانوونی ژمارە (١٢٣) لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٧) ڕێگەی بە (کۆمپانیای نەوتی نیشتمانیی عێراق I. N. O. C.)دا ماف وەبەرهێنانی باقی ئەو کەرتانەی پێ بەخشی کە مابوونەتەوە، کە ئەمە کۆتایی بە مۆنۆپۆلیزەکردنی بەرهەمهێنانی نەوتیی کۆمپانیای بێگانەی (کۆمپانیای نەوتی عێراقی I. P. C.) هێنا.

لە (١٤)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٢) کۆمپانیای نەوتی عێراقی ئەویش خۆماڵی کرا، بەم شێوەیە عێراق بە تەنیا خۆی بووە سەرداری بەرهەمە دەوڵەمەندییەکانی نەوتیی خۆی. بەرهەمی ساڵانەی نەوتی خاوی عێراق بە شێوەیەکی بەردەوام زیادی دەکرد: لە (٤٧) ملیۆن‌و (٥٠,٠٠٠) تۆن لە ساڵی (١٩٦٠)، گەیشتە زیاتر لە (١١٠) ملیۆن تۆن لە ساڵی (١٩٧٥)، کە لەوەش (٦٠) ملیۆن تۆنی لە ناوچەی کەرکوك بەرهەم هێنراوە. یەدەگی عێراق لە نەوتی خاو لە ساڵی (١٩٧٣) بە چوار ملیارو ١٤٣ ملیۆن تۆن خەملێندراوە.

جا ئەگەر چی پیشەسازی نەوت‌و هەموو ئەو کارانەی سەروساختیان بەم پیشەسازییەوە هەبوو، ڕەوشی کۆمەڵایەتیی ئەو کرێکارانەی کە کاریان تێدا دەکرد باشتر کرد، چونکە ئاستی ژیانیان لە چاو کرێکارەکانی دیکەی وڵات بەرزتر بوو، بەڵام ئەمە کۆتایی بەو جووڵانەوانە

نەهێنا، کە خاوەن مۆرکێکی کۆمەڵایەتی بوون. چەندین پشێویی گرنگ لەناو کرێکارانی نەوتی کەرکوکدا روویان دا. گەورەترین ئەم پشێوییانە ئەوەبوو، لە ساڵی (١٩٣٧) رووی دا، کە هاوزەمان بوو لەگەڵ مانگرتنەکانی کرێکارانەی بەنداوی کووت، مانگرتنی کرێکارانی بیرهەڵکەن، مانگرتنی کرێکارانی هێڵی ئاسنین، مانگرتنەکانی کرێکارانی رستنی نەجەف، هەموو ئەم پشێوییانە هۆشیاریی کرێکارانی سەلماندو بۆ خۆیان چەکێکی سیاسیی نوێ بوون[٣١]. لە تەموزی ساڵی (١٩٤٧) مانگرتنێکی راستەقینە، کە لەلایەن سیاسەتوانانی رەوتی کۆمەنیستخوازەوە بەرپا کرا، لە کۆمپانیای نەوتی عێراق، ژمارەیەك قوربانی لێکەوتەوە[٣٢].

پشێویکەلی دیکە، کە زیاتر سیمایەکی سیاسییان پێوە بوو، روویان دا: تەنیا راگەیاندنی پەیماننامەی پۆرتسمۆس لە (١٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨) بوو بە سۆنگەی مانگرتنێکی گشتیی سێ رۆژە لە کەرکوك، کونسوڵی گشتیی بەریتانیا پەلامار درا. لە هەمووشی تراژیدیانەتر ئەوەبوو کە ناونرا بوو بە (پاکژکردنەوەی کەرکوك)، کە چەند توخمێکی شیوعییەکان بە یاریدەی گرووپە کوردەکان[٣٣] بە بۆنەی یەکەمین ساڵوەگەری راگەیاندنی کۆمار لە (١٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٥٩) کوشتارگەیەکیان بۆ تورکمانەکانی شارەکە سازکرد، کە وەکو دژە کۆمەنیست رەفتاریان لەگەڵدا کردن[٣٤]. لەو کوشتارگەیە (١٢٠) کەس کوژران و نزیکەی سەد کەسیش بریندار بوون. بەشداریکردنی کورد هەر بە تەنیا لەسەر بنەمای ناکۆکی دژ بە یەکی نەتەوەیی (کورد – تورکمان) لێك نەدەدرایەوە، بەڵکو بە کێبەرکێی کۆمەڵایەتیش لێك دەدرایەوە: تورکمانەکان کە لە رووی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەوە زۆر پێشکەوتووتر بوون و بە لێوەشاییەوە وەزیفەی بەرزتریان بە کۆمپانیای نەوتی عێراقیدا داگیرکردبوو، لە کاتێکدا کوردەکان دەبوو بە وەرگرتنی وەزیفەی لاوەکی دەستبەردار بن[٣٥].

بەڵام نابێ ئەوەش لە بیر بکرێت کەوا یەکێك لە ئاستەنگەکانی بەردەم چارەسەرکردنی یەکجارەکیی پرسی کورد لە عێراق، بریتییە لە داخوازینامەی کوردەکان پەیوەست بە ناوچەکانی کەرکوك و دەوروبەری کە دەیانەوێ بیخەنەوە سەر خاکی کوردستانی خاوەن ئۆتۆنۆمی. ئەم داخوازییەش حکومەتی عێراق بە تەواوی رەتی دەکاتەوە. سەرژمێرییەك دەبوو لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٠) بکرێت، ئەم خاڵە ناکۆکە چارەسەر بکات، بەڵام بۆ کاتێکی نادیار دواخرا[٣٦] کە ئەمە یەکێکە لە هۆیەکانی هەڵگیرسانەوەی جەنگ بوو لە ئاداری ساڵی (١٩٧٤)، لە کاتێکدا کە حکومەت دەستی کرد بە پیادەکردنی پەیماننامەی کوردی – عێراقی لە (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠). قانوونی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٤) بە گوێرەی ئامارەکانی ساڵی (١٩٥٧)[٣٧] ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەکانی کوردستان سەلماند. بەڵام ئەم ئامارانە لە دەورانی مەلەکیدا کرابوون لە کاتێکدا، کە کوردەکان دەترسان لەوەی خۆیان وەکو کورد ناونووس بکەن. بۆیە ئەمە زۆرینەی کوردی نەدایە شاری کەرکوك، بەم شێوەیە شارەکە نەچووە ناو چوارچێوەی ناوچەکانی حوکمی زاتییەوە.

یەکێك لە کەسایەتیی زۆر ناسراوەکانی کەرکوك شاعیری کورد (شێخ رەزای تاڵەبانی)یە (دەوروبەری ١٨٣٧ – ١٩١٠)[٣٨]. کەم تا زۆر خۆنەویست و لەگەڵ ئەوەشدا ئیماندارێکی دەمارگیر (فەناتیك)ە. ئەو کەسایەتییە ساتیریکە بەهرەی لە وتاردان و لە شیعری برێك جار رووهەڵماویشدا هەیە، شیعرەکانی بە کوردی، تورکی، فارسی و عەرەبی نووسیوە. ئەم شیعرانە ساڵەکانی (١٩٣٥)و (١٩٤٦) لە بەغدا چاپ کراون. (شێخ رەزا) یەکێکە لە شاعیرە هەرە ناسراوەکانی کوردستانی عێراق[٣٩].

* پەراوێزەکان:-

١. (جۆهانس هایندریك کرامرز Johannes Heindrik Kramers) (٢٦)ی شوباتی ساڵی (١٨٩١) – (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥١). یەکێك لە رۆژهەڵاتناسە گەورەکانی هۆڵەندییە. ساڵی (١٩٠٩) لە زانکۆی لیدن رۆژهەڵاتناسی دەخوێنێ و هەر لەو ساڵانەدا زمانەکانی: عەرەب، فارسی و تورکی و شارستانییەتی ئیسلامی دەخوێنێ. لە (٥)ی ئاداری ساڵی (١٩١٥) دکتۆرانامەکەی لە بواری قانوون بەدەسن دەهێنێ. ساڵەکانی (١٩١٥ – ١٩٢٢) دەبێتە وەرگێر لە باڵیۆزخانەی هۆڵەندا لە ئەستەمبوڵ. ساڵی (١٩٢٢) کۆرسی زمانی تورکی و فارسی لە زانکۆی لیدن وەردەگرێ و ساڵی (١٩٢٩) کۆرسی زمانی عەرەبی. خاوەن کۆمەڵێك بەرهەمی زۆری رۆژهەڵاتناسییە بە تایبەتیش لە ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام (چاپی یەکەم) لە بەرگی دووەم و سێیەمدا کۆمەڵێکی زۆر (دەروازە)ی ئینسیکلۆپیدیایی نووسیوە.

٢. C. J. Gadd, Rev. d'Assyr. Et d' Archéol. Orient., et par Sindey Smith.

٣. کەیخەسرەو یان هەوخوشترە، بە فەرەنسی (کیاکسار Cyaxar) یەکێك لە بەهێزترین پاشای مادەکان بووە (٦٢٥ – ٥٨٥)ی پێش زایین، (وەرگێر).

٤. (نەبووپۆلاسەر Nabopolassar) یەکێك لە پاشاکانی ئیمپراتۆریای دووەمی بابل بووە و باوکی مەلیکی مەزن نەبووخوزنەسر بووە و لە (٦٢٥ – ٦٠٥)ی پێش زایین حوکمرانی بابلی کردووە، (وەرگێر).

٥. G. Roux, Ancient Iraq, Londers, ١٩٦٤, ٢٤٧, ٢٥١, ٣١٢, ٣١٣.

٦. Cf. Hoffmann, Aussügeaussyrischen A Kienpersischer Mârtyrer, dans abh. Für die Kunde des Morgenlands, VII/٣ (١٨٨٠), ٢٦٧ sqq.

٧. J. M. Fiey, Assyrie chrétienne, III, Beyrouthn ١٩٦٨.

٨. Fiey, Histoire de Karka d'BetSloh, dans –Analecta Bolllamdiana, LXXXII (١٩٦٦), ٢٠٣ ٢٠٩.

٨.–٩. Fieym Assyrie, III, ٢٣

١٠. (یاقوت)، بەشی چوارەم، لاپەرە (٢٧٦).

١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٧٢).

١٢. Fiey, Assyrie, İII, ٤٤.

٥;–١٤٢٤/١٣. Zafar–nâmah, composé vers ٨٢٣ trad. Petit de la Croix, Delft, ١٧٢٣, II, ٢٥٩.

١٤. لێرەدا مەبەست لە دوژمنی ڕۆژهەڵات، ئێرانە، (وەرگێڕ).

١٥. خەلیفە، جهان نوما، ٤٤٥.

١٦. خەلیفە، جهان نوما، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٧. E. B. Soane, To Mesopotamia and Kurdistan in disguise, Londers, ١٩١٢, ١٢٠.

١٨. مەبەست ساڵی نووسینی وتارەکەیە، بە ئاگاداربوون لەوەی وتارەکە لە ساڵی (١٩٢٢) بڵاوبووەتەوە، (وەرگێڕ).

١٩. کەرکوك ساڵی (١٩٦٤) لە سەردەمی کۆمارییەوە ناوەکەی لە لیواوە گۆڕدرا بۆ پارێزگا. (وەرگێڕ).

٢٠. ئەم ناوە دوای ڕووخانی حکومەتی بەعس لە ساڵی (٢٠٠٣) لابراو ناوی (کەرکوك) گەڕایەوە بۆ ناوی شارەکە، (وەرگێڕ).

٢١. قزڵباش واتە (کڵاوسوور) بە زمانی تورکی، کۆمەڵێك ئێلی پەیڕەوکاری تەریقەتی سەفەوی بوون. هەروەها بەو سەربازە شیعانەش دەوترا کە لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەمی زاینییەوە وەکو سوپای ئێران بەکارهاتوون. بە گشتی ڕەوتێکی سۆفییانەی شیعەگەران و بە هیچ شێوەیەکی لە ئایین هەڵگەڕاوە یان لە ئایین دەرچوو (هیترۆدۆکس) نین و موسڵمانی شیعە مەزهەبن، (وەرگێڕ).

٢٢. Edmonds, ٢٦٧; Fiey, Assyrie, III, ٥٤.

٢٣. (ئیدمۆندز C. J. Edmonds) ئاماژە بە چەند ڕایەکی دیکەش دەکات، ٢٦٧.

٢٤. Türk Yurdu, ١٩١٥.

٦.–٢٥. Edmonds, ٢٦٥

٢٦. ئەم زیادەیە لە نووسینی تۆما بوایەو مەبەست لێی دەورانی دوای شۆڕشی (١٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٥٨)ە، (وەرگێڕ).

٢٧. ئەم دابەشکردنە بە مەبەستی سیاسی و گۆڕینی پێکهاتەی ئیتنیکی شارەکە لە ڕۆژگاری حکومەتی بەعسدا کراوە، (وەرگێڕ).

٢٨. ئەم هێڵە ئاسنینە ئەمێکە نەماوە، (وەرگێڕ).

٢٩. V. J. Parry, Materials of War in the Ottoman Empire, Studies in the Economic History of the Middle East, ٢٢٠.

٣٠. Vernier, ٤٣٥.

٣١. Longrigg, Iraq, ٢٥٢.

٣٢. Ibid, ٣٣٨.

٣٣. لە تێکستە فەرەنسییەکەدا نووسراوە (باندە کوردەکان) کە ئەمە هەم بە واتەی گرووپ و هەم دەشێ بە واتەی (چەتە) و (ڕێگر)یش بەکاربێت، (وەرگێڕ).

٣٤. ئەمە خوێندنەوەیەکی زۆر لایەنگیرانەو بە هیچ شێوەیەك باسی ئەوەی نەکراوە کە کۆمیونییەتی تورکمانەکانی کەرکوك ئەوەندەی (قوربانی) ئەم ڕووداوە بوون ئەوەندەش زیاتر (هۆکاری) ئەم کوشتارگەیە بوون. ئەوان تەنیا لە پێناو پەیڕەوکردن و کلکایەتی کردن بۆ تورکیا سیاسەتێکی زۆر کورتبینانەیان پەیڕەو دەکرد، کە ئەمە دواجار سەری کرد بەوەی ئاگری ناکۆکی نێوان کەمینە نەتەوەکانی شارەکەی لێ بکەوتەوە، (وەرگێڕ).

٣٥. Khadduri, Republican Iraq, ١٢٥.

١٦٢.–٣٦. E. O'balance, ١٦١

٣٧. ئەم ئامارە باشترین ئامارە لە عێراق کراوە، کە هێشتا ئەوەندە گۆڕانکاری لەو وڵاتە نەکرابوو.

٣٨. لە وتارەکەدا نووسەر بە هەڵە ساڵی لە دایکبوونی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە (دەوروبەری ساڵی ١٨٤٢) نووسیوە، کە ئەمە هەڵەیەو ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئێمە نووسیومانەتەوە، (وەرگێڕ).

٣٩. Cf. Soane, ١٣٥–١٣٤; Edmonds, ٨–٥٧, –٢٩٠ ٥; Edmonds, A Kurdish lampoonist: Shaik Raza Talabani, "JRCAS, XXII, ١, ٢٧–١١١.

* سەرچاوە:

J. H. Karmers (Th, Bois), (KIRKÜK), In Encyclopédie de l'islam (Nouvelle Edition), ٨٢, E. J. Brill, Leiden–Tome V, Livraison ٨١ & Editions G, –P. Maisonneuve & LAROSE ١٤٩.–S. A, Paris, ١٩٨٠, pp: ١٤٦

*** هەڵسەنگاندنی یـادەوەری ئەو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانەی سەریان لە کەرکوك داوە:-**

١. گەلێك گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناس سەریان لە کەرکوك داوە کە ئەگەر بەراوردیان بەکەین ڕێژەیەکی زۆریان لە باسکردنی کـەرکـوك یـان لـە هـەڵـسەنـگـانـدنی ئـەم شـارە لـە هـەمـوو ڕووەکانەوە دەورێکی باڵایان بینیووەو بەشێکی گەورەیان لە کارو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیاندا سەریان لەم شارە داوە. لـە هەڵسەنگاندنی ئـەم لێکۆڵینەوانەی کـە نووسیویانە هەموویان لەو چەقەوە سەرچاوەی دەگرێت کە لێکدانەوەو بیرکردنەوەیان لە پێناو بەرژەوەندییەکی تایبەتی خۆیان بووە بۆ ئەو کارە گرنگەی کە پێیان سپێردراوە تا بتوانن کۆمەڵێك زانیاری گرنگ لە هەموو بوارەکاندا کۆبکەنەوە کە ببێتە سەرچاوەیەکی گرنگ لە پێناو نووسینەوە یان زانیاری بەردەست بۆ حکومەتە یەك لە دوا یەکەکان.

٢. بەشێکی زۆری ئـەو گـەڕیـدەو ڕۆژهـەڵاتـنـاسـانـەی کە سەریان لە کەرکوك داوە گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامە گرنگە یـان هەڵسەنگاندنەکانیان لە بۆچوونێکی ئەکادیمیانەوە داڕێژراوە بەوە کە کەرکوك بەشێکی دانەبڕاوی کوردستانە، یان بەو واتاییەی کەرکوك بە یەکێك لە شارە گرنگەکانی کوردستان ژمارە کراوە، تەنها بەشێکی کەمیان نەبێت کە لە پەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکات کەرکوکیان لە کوردستان دابڕیووە بەڵام نەیاتوانیوە بە تەواوەتی لە بۆچوونەکانیان ڕەنگ بداتەوە.

٣. لە یـادەوەری ئـەو گـەڕیـدەو ڕۆژهـەڵاتـنـاسـانـەوە ئـەوە بەدەردەکەوێت کە لە هەڵسەنگاندنی لایەنە ئابوورییەکەدا بایەخیان پێـداوەو بە شـاری گرنگی ئـابووریـان دانـاوە، بەشێك لـەوانـەش هاتنەکانیان بۆ ئـەو شـارە لە پێناو ئەو مەبەستە ئابوورییەدا بووە، یان توانیویانە وا لێکیبدەنەوە کە لێکۆڵینەوەی چڕو پوخت لەسەر ئەم شارە بنووسنەوە بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە لە دواڕۆژدا بەرنامەی پوختی بۆ دابڕێژن.

بۆیە بەشێکیان لە سەرووبەندی پێش دۆزراندنەوەی نەوت لەم شـارەدا بیریان لە سەردانی ئەم شارە کـردووەتـەوە بە شێوەیەکی ئەوتۆ تا بتوانن لاپەڕە نەهێنییەکانی ئابووری ئەم شارە بدۆزنەوە.

٤. لە هەڵسەنگاندنی ئـەو گـەڕیـدەو ڕۆژهەڵاتناسانە ئەو ڕاستییە یەکلا دەبێتەوە لە ڕووی کشتوکاڵی و مەڕدارییەوە شوێنێکی گرنگەو زەوی کشتوکاڵی بە پیتی هەیە.

هـەنـدێك لە ڕۆژهـەڵاتـنـاسـەکـان لـە هەڵسەنگاندنی پیتی زەوییـەکـەی ئـامـاژەیـان بە گەلێك بەروبوومی کشتوکاڵی کردووەو ئەو ڕاستییەیان خستووەتە ڕوو کە زۆری ئاو و بە پیتی زەوی سەرچاوەیەکی گرنگ بووە لە ڕووی ئابووری و بایەخی بازرگانی لـەم شـارەداو دەوری ئـەو گۆڕانکارییە بازرگانیانە لە گرنگی ئەم شارەو هاوپەیوەستی بازرگانی لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریدا.

٥. زۆربەی ئەو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانە لە پێناسەکردنی چەمکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان گەیشتوونەتە ئەو دەرئـەنجـامـەی کە گرنگی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئـەم شـارە لـەنێوان نـەتـەوەو پێکهاتە ئاینییەکانی ئەو دەورەی بینیووە لـە بـەردەوامـی ژیـان لـەم شـارەدا، بۆیە هـەردەم لە هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەو پەیوەندیانە بایەخیان بەو ڕاستییە داوە کە تواناکانی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان شوێنێکی بەرچاوی هەیە لە خزمەت بەردەوامی ئاین‌و سرووتە ئاینییەکاندا بە شێوەیەکی ئەوتۆ بگونجێت لەگەڵ لێکدانەوەی عەقڵی هەر تاکێکی نێو ئەو شارە، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە بیرکردنەوەی ئـاوەزی هەر یەکێکیان خزمەت لە چەمکی پێکەوەژیان بکات.

٦. لە هەڵسەنگاندن یان پۆلێن کردنی هەر یەکە لە گەڕیدەو ڕۆژهـەڵاتـنـاسـانـە دەگەینە ئـەو ئەنجامەی کە هـەر یەکەی تایبەتمەندی خۆی هەیە بە تایبەتی ڕۆژهەڵاتناسەکان، بۆیە ڕۆژهەڵاتناسێکی ئینگلیزی لەگەڵ ئەڵمانی، فەرەنسی، دانیمارکی، هۆڵەندی، نەرویجی، ئەمریکی، هەر یەکەیان بیرکـردنـەوەی یـان شـێـوازی نووسینەوەو مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەم شارەدا جیاواز بووە، بۆیە دەتوانین پۆلینی بەش‌و ئامانجەکانیان لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە خزمەت بە بارەی سیاسی‌و سەربازییەکانیانی کردووە، بە شێوەیەی دەوری هەر یەکە لەو پەیوەندیانەی نێوان دەوڵەتە ئەوروپییەکان ڕەنگدانەوەی خۆی هەبووە لە پێناوی خزمەتکردنی ئەو مەبەستەی بۆی هاتووە.

ڕۆژهەڵاتناسێکی بەریتانی زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانی تردا، چونکە بیرکردنەوەی ئەو وەکو سەرکردەیەکی ئینگلیز هەوڵیداوە لە پێناو ئەو مەبەستی کە بۆ هاتووە بتوانێت چوارچێوەی خۆی بپێکێت.

جێـگـەی سـەیـر نییە کە ڕۆژهـەڵاتـنـاسـێـکی ئینگلیز لە خەمڵاندنی ژمارەی کورد لە چاو تورکمان چاوپۆشی بکات یان بە ناحەقانە پێوەرەکان بخاتە ڕوو لە پێناو مەبەستێکی سیاسیدا، ئینجا دارشتنەوەی یان باسکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی لە دەمارگیرییەوە سەرچاوەی گرتووە کە خزمەت بە بەرژەوەندییە سیاسییەکەی بکات، بۆ نموونە لە باسکردنی (سەیید ئەحمەدی خانەقا) وەکو کەسایەتییەکی کوردی ئەم شارە نەیتوانیووە ئەو حەقەی خۆی بداتێت چونکە لایەنگری ئەوان نەبووە لە سیاسەتدا.

ڕۆژهەڵاتناسە فەرەنسییەکان لە چاو ئـەوانـەی تـرەوە تا ڕادەیەك هێوەری‌و بابەتییانە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا چوونەتە نێو ئەنجام‌و لێکدانەوەکان‌و نەبوونی بەرژەوەندییەکانیان لە ناوچەکەدا بە شێوەیەکی فراوان ئەو بەرچاوەییە گرنگەی بە خۆیـەوە نـەدیـووە تا بتوانێت چاوپۆشی لە گەلێك لە ڕاستییەکان بکات.

٧. گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسەکانی کە سەریان لە کەرکوك داوە بەشێکی کەمیان لە بواری ئەدەبی‌و ڕۆشنبیریدا سوارچاك بوونە، نەیانتوانییوە بگەنە ئەو ئاستەی کە بگەڕێن بە دوای بەشێك لە شارستانییەت‌و ڕۆشنبیری ئەم شارە، تا بەوەی ئـامـاژەی سەرپێی هەیە دەربـارەی ڕۆشـنـبـیـری‌و ئـەدەب‌و

شیعر، هۆکاری ئەمەش لەوانەیە نەبوونی تێکەڵاوییان یان گرنگی بایەخنەدانیان لەو بوارەدا ئەو ڕاستییەی یەکلا کردووەتەوە کە نەتوانن بە دوای شاکارە گرنگییەکانی ئەم شارەدا بگەڕێن.

٨. زۆربەی ئەو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانە ماوەیەکی زۆر کەم لە کەرکوکدا ماونەتەوە، بۆیە نەیانتوانیووە بە شێوەیەکی چڕو بەردەوام تایبەتمەندیو گرنگی ئەم شارە بخەنە ڕوو، هەندێکیان وەکو ڕێرەو بە لێواری شارەکەدا ڕۆیشتوونە، لە دوورەوە هەڵسەنگاندنیان کردووە، یان لە کەسانی تریان بیستووە، ئەمەش وای کردووە ڕەنگدانەوەی تایبەتی لێکۆڵینەوەکانیان لە مەودایەکی تایبەتیدا گیر بخوات، بێ ئەوەی ووردو درشتی ئەم شارە بزانرێت.

٩. بەشێکی زۆری ئەم گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانە بایەخیان بە شوێنەوار داوە یان بە دوایدا گەڕاون بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان، لە هەندێك باردا وای بۆ دەچم بە دوای شتی گرانبەهادا گەرابێتن بەڵام لە نووسینەکانیاندا ئاماژەیان پێ نەکردووە، بەڵام باسی کۆمەڵێك شوێنەواریان کردووە کە بەو شوێنانەی پێیدا ڕۆیشتوونە ئاماژەو سەرنجی خۆیان نووسیووە.

١٠. هەندێکی ئەو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسانە لە نووسینەکانیاندا شێوەیەکی وەسفی چڕو پڕیان وەرگرتووەو ڕۆژاو ڕۆژ یاداشتەکانیان نووسیوەتەوە، بەڵام بەشێکی تریان یادداشتەکانیان سەرپێیانەیە.

١١. بەشێك لە گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسەکان لە شوێنەکانی تر دەستی باڵایان هەبووە لە وێنەکێشاندا، بەڵام بە داخەوە ئەوانەی سەریان لە کەرکوك داوە وێنەی دەگمەنیان بەرچاو دەکەوێت کە کێشابێتیان، ئەمیش هۆکارێکی گرنگە لەوەی کە بایەخیان لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەیەکی سیخووڕی نەچۆتە دەرەوە، یان ئەو ماوە بەرچاوەیان نەبووە بتوانن بە شێوەیەکی گرنگ سوودی لێ ببینن.

## * کەرکوکی ساڵی ۱۹۳۳ و سوجادەکەی پێغەمبەری ئیسلام(

فریبا ستارك
و. سەربەرست کەرکوکی

ئەم کتێبەی کە بە ناونیشانی ( لەودیوی ئاوفورات)ەوەیە، کتێبێکی رۆژنامەنووسی گەشتیار (فریبا ستارك)ە.
Freya Stark : Beyond Euphrates, Century Publication Co Ltd, 1983
لە شاری لەندەن لە ۱۹۸۳ چاپکراوەتەوە. شایانی باسە یەکەم چاپی ئەم کتێبە لە ساڵی ۱۹۵۱ لەلایەن دەزگای چاپی (جۆن موورای) کەوتبووە بازارەوە. کتێبەکە کە ۳٤۱ لاپەرەیە، قەوارەکەی (۲۱،۵۰ سم بە ۱۳،۰۰ سم ) ە.
مسز ستارك، جگە لـەم کتێبـەی، چـەندین کتێبی تری پەیامنێری و گەشتیاری بـەم ناونیشانانەی خـوارەوەی بڵاوکردۆتەوە:
ئەم کتێبەی نووسـەر، کە پێکهاتووە لە کۆی هەموو ئەو نامانەی لە ساڵانی ۱۹۲۸ەوە تا ۱۹۳۳ لـە رۆژهـەڵاتی ناوەراست و شوێنی ترەوە نوسیوویەتی و ناردوویەتی بۆ خزم و کەسوکارو ئاشنایانی خۆی، پێکهاتووە لەم بەشانەی خوارەوە:
- یەکەم گەشت ۱۹۲۸
- کەنەدا ۱۹۲۸-۱۹۲۹
- بەرەو بەغداد ۱۹۲۹
- لە ئێرانەوە ۱۹۲۹ - ۱۹۳۰
- رۆژنامەنووسیی لە بەغداوە ۱۹۳۲
- دواین هەواڵی بەغداد ۱۹۳۳.

لە دێر زەمانەوە وەکو عادەتی رۆژنامەنووسی بەریتانی، زۆربەی رۆژنامەو گۆڤارە گەورەکان، هەفتانە یا مانگانە ریڤیو و پێداچوونەوەو کورتە شیکاریی کتێبی تازەی جۆراوجۆر پێشکەش دەکەن. لەو ساڵەی کە دووەم چاپی ئەم کتێبە کەوتە بازارەوە، زۆربەی رۆژنامە ناودارەکان شرۆڤەیان لەسەری پێشکەش بە خوێندەوارانی خۆیان کرد. رۆژنامەی (ئۆبزێرڤەر) بەم تایتڵەوە ناساندنی کتێبەکە پێشکەشکردبوو:( لەو دیوی ئاوفورات، ئەو کتێبەیە کە لە پاش خوێندنەوەیدا هەستی سوپاسگوزاری و سەرسورمانت بۆ بەجێدەهێڵێت). هەروەها هەفتەنامەی (صەندەی تایمز) بە خەتی درشت نوسیبووی کە :( پەسنی خەڵکان و وەسفی سروشت و ژیاری عێراق و ئێران لەم کتێبەدا، بە تێکەیشتنێکی سروشتیانەی بێ رتوش، ژیرانە هەڵسەنگێنراون) .
خاتوو ستارکی نووسەر، جگە لەوەی لەناو نووسەرانی ئینگلیزدا، یەکێ بووە لە خەڵکانی سەرکەوتووی بواری نووسینی گەشتیاری، پەیامنێر و نووسەریش بووە لە رۆژنامە و گۆڤارە بە ناوبانگەکانی ئەو ساڵانەی بەریتانیا، وەکو:
The Cornhill, The Times, Spectator , Illus–trated London News ......
هەروەها هەڵگری چەندین خەڵاتی نووسینی بەریتانی و جیهانی بووە.

### * کەرکوك ۸ ئادار ۱۹۳۳ :

ئێرە شارێکی بچووك و دڵگیرە، قەڵایەکی کۆنی لە ناوەراستە، کە بەندە بە پردێکی چەندین تاق و دەروازەوە. قەڵاکە؛ تەپۆلکەیەکە بە چەندین بازاری پر هەرج و مەرج گۆرێچەدراوە. ئەم بازارانە پرن لە ئاڵ و واڵایی جل و بەرگی کوردی و شەرواڵی دەڵبی تورکی. لە دوورەوەش لە سێ لاوە شارەکە بە زنجیرە شاخ و گردەوە دەور دراوەو پرە لە روانگەی سەوز و کێڵگەی تازە چەکەرەکردوو.
ئەم بەیانییە هەڵستام چووم بۆ تەماشای مزگەوت و کڵێسەکان و شوێنی سوجادەی پێغەمبەر. لە پێشا تەلەفۆنم بۆ مەلا عەبدولقادر کرد؛ مەبەستم ئەو کەسەیە کە مستەر کوك دەربارەی نامەی بۆ نوسیبووم. ئەو بەرێزە بەرێوەبەری ئەوقافە. مرۆڤێکی زۆر خۆشرەفتارە. جەنابیان، پیرە نۆکەرێکی تورکی عەمامە بەسەری لەگەڵمدا نارد، کە رێنماییم بکات بەرەو مزگەوتی گەورە، ئەو مزگەوتەی کە لەسەر قەڵایە. مزگەوتەکە لە سووچێکی بێ دەنگ و هێمن لە نێوان کوچەو ماڵاندایە. بە حەوشەیەکی پر لە دار پرتەقاڵی ناو ئینجانەی گەورە گەورە دەوردراوە. لەو لاوە مەیدانێکی رێکی هەیە لەگەڵ قەبرێکی زۆر رازاوە کە لە قەفەزێکی ئاسنینداپە. دەرگای دەرەوەی مزگەوتەکە، دەرگایەکی نزمە کە بە گەچکاری سوواخدراوە.

### وەکو دەڵێن

لە مزگەوتەکەدا زۆر مەرمەری ساف موسڵلی هەیە. کە لە داپۆشین و رازاندنەوەی دیوارەکاندا بەکارهێنراون. ناوەوەی مزگەوتەکە بە شێوازی کۆنە کۆشکی ئاشوورییان، بە پایە و کۆڵەکەی قۆقزی کەوانەیی، بە بەرزی ۷ فووت راگیراوە. لەو مزگەوتەدا مەزارگەی (نەبی حەنین، عەزرا و دانیاڵ پێغەمبەر) هەیە. جوولەکەکان، لە جەژنی دانیاڵ پێغەمبەردا سەردانی ئەم مەزارە دەکەن. بەڵام مەسیحییەکان نایەن بۆ سەردانی ئەم مەزارە. کۆنە مزگەوتەکە، وەکو دەڵێن لە رابردوودا کڵێسە بووە، مەزاری دانیاڵ پێغەمبەر بە قوماشێکی سەوزی بە رەنگی بێجی نەخشێنراو، داپۆشراوە. گۆری (حەنین) لە پای مینبەرەکەدا جێگەیەکی باشتری دراوەتێ و بە گەچکاری سپی لەسەر رەنگی شین نەخشێنراوە.
کلیسەی ئاشورییەکان (مەبەستی کلدانەکانە) ، زۆر نزیکە، بینایەکی درێژکۆڵەیەو لە سەر ستوون (دینگە)ی نزمی بە سەوزی کاڵ بۆیەکراو، دروستکراوە. بەشی پێشەوەی بیناکە بۆ پیاوانەو پشتەوەشی بۆ ژنانە. شێوە پێپلکانەیەکی تێدایە بەرەو سەرخانێکی تایبەت بە کچان. لەم شارە دوو سەد خێزانی مەسیحی و نزیکەی هەمان ژمارەش خێزانی جوولەکە هەیە. هەندێ خێزانی (عەلی ئیلاهی) لە گوندەکانی دەوروبەری شار هەن و گروپێکی بچووکی ٤۰ نەفەریش کە سەر بە ئاینزای یەزیدین لەم شارەدا دەژین.
شوێنی خانووی سوجادەکەی موحەمەد، لە بەری ئەو بەری قەڵاکەیە. ئێمە بە سواری عەرەبانەی ئەسپ بە ناو بازارەکانەوە بۆی چووین، کە لە خواروو دەوروبەری قەڵاکەدان. ئەو خانووانەی لە رۆخ و لە قەد قەڵادا

دروستکراون، تەپۆلکەی قەڵاکەیان بەرزتر نمودکردووە. شێوەی هەلۆیەك یا کۆلارەیەکی زەبەلاح ڕووەو ئاسمانی شین لە قوڕنەیەکی دیواری حەوشەی کڵێسەکەدا دەبینرێت.

*** شەقامەکەشی درێژەی هەبوو:**

بازاڕەکان شوێنی زۆر دڵگیرن، لە دوکانێکی بچووکدا کە پڕ لە ئینجانەو گۆزەو شەربەی سپی، خاکی و شین و سەوزە، لاوێك بە دیار دوکانەکەوە دانیشتووە و خەریکی قورئان خوێندن بوو. بە هێمنی و بەبێ ئەوەی سەرنجی ئەو رابکێشم، فۆتۆیەکم لێگرت. جیرانەکانی دوکاندارەکە ئەم کارەی منیان زۆر بەلاوە پێ خۆش بوو. بازارەکە لە شوێنی کۆتایی هات کە مەیدانی ژمارەیەك کاروانسەرا بوو. شەقامەکەشی درێژەی هەبوو تا دەگەیشتە دوو ڕێچکەی خوڵاوی کە بە شوێنێکی پیس و پۆخڵ بەرەو خوار دەبوونەوە. ڕێچکەیەکی ناوەڕاستیش هەبوو، ئێمە ئەو ڕێچکەیەمان گرتە بەرو تا گەیشتین بە شوێنێکی فراوان و کراوەو .... قەبرستانێك، کە دروست لە قەڵایەکی دێرین دەچێت و لەگەڵ کۆمەڵێ خانووی بچووك بچووك. لەوێدا لە پشت پەرژینێکی کراوەدا، دەوردراو بە درەختی پرتەقاڵ و داری کالیپتۆس، قوللەی هێلانەیەکی لەقلەق و لە پشتی ئەوانەشدا تانکییەکی ئاو کە بە پایەی چیمەنتۆیی دەوری گیرابوو. ئەوێ خانووی سوجادەکە بوو.

*** سوجادەکە لەناو ئەو سەندوقەکەدایە :-**

شێخەکەی، پیرە موسڵمانێکی چاك بوو، دەموچاوێکی بچووك و ریشێکی قەڵەمکراوی هەبوو. عەمامەیەکی لەسەرنابوو. دیمەنێکی جوان و لەتیفی هەبوو. دانیشتبوو، لەسەر مێزە بچووکەکەی بەردەمی خەریکی نووسینی نامە بوو. دیاربوو کە بە داواکردنی تەماشاکردنی سوجادەکە قەڵس بوو. چونکە هەفتەیەك یا دوو هەفتە لەمەوپێش مستەر (هیچکۆك) هاتبوو پیشانی دابوو، لە حاڵەتێکدا ئەو سوجادەیە دەبێت تەنیا لە جەژناندا پیشانی جەماوەری بینەر بدرێت. هەرچۆنێ بێت شێخ مالیناوا نەرمی نواندو بردمی بۆ ژوورەکە؛ ژوورێکی زۆر سادە بوو، ئەرزێکی رووتەن لە ژێر قوبەیەکی شین باو. چەند سوجادەیەکی بچووك بچووك ڕاخرابوون. مێزێکیش هەبوو لە تەنیشت ئەو چەکمەجە دیوارییەی کە یادگارییە پیرۆزەکەی تێدا دانرابوو. دەرگاکانی چەکمەجەکە تەختەی ئاوێنەبەند بوون.چەکمەجەکە بە قفڵێکی سەوزی ئاسنین کلۆم درابوو. کاتێ دوو دەرگاکەی دەکرێنەوە، مرۆڤ سەندوقێکی سووری مس تێکیراو دەبینێت. سەندوقەکە بە لێفەیەکەوە پێچراو و بەستراوەتەوە. سوجادەکە لەناو ئەو سەندوقەکەدایە، لە دەرەوەیدا بە بازەی سپی و لەناوەوەشی بە ئاورێشمی سپی پێچراوەتەوە، ئەوجا لەناو پارچە ئاورێشمێکی تۆختر و پاشانیش لەناو رووبەرێکی زیوین، سوجادە پیرۆزەکە شاردراوەتەوە. سوجادەیەکی کۆن، بە مووی حوشتر دروستکراو، کە بە دوو هێڵی تۆختری مووی مەڕ دەورتێگیراوبوو. سوجادەکە ئەوەندە کۆن بوو کە لە شوێنی لۆچەکانی بواردبووی و کونکون ببوو.

*** هیچ شتێکی تر نییە:**

موحەمەدی پێغەمبەر، ئەم سوجادەیەی داوە بە ئەبوبەکری خەلیفە، فامیلی ئەبوبەکریش هەتاکو (عەباسییەکان) هاتنە سەر حوکم، ئەو سوجادەیەیان لە دیمەشق گل دابۆوە، پاشان نەوەکانی ئەبوبەکر لە سیستان و لە شیراز بڵاوبوونەتەوە. ئەو سوجادەیەش، یا بەشێك لەو سوجادەیە بردراوە بۆ شیراز. لەوێوە هێناویانە بۆ کەرکوك و لەم شوێنە قایمکراوە؛ ئەمە ئەو سوجادە گرانبەهایەیە.

هیچ شتێکی تر نییە کە بگوترێت سەبارەت بە کاڵاو شتی بەجێماوی پێغەمبەری ئیسلام، جگە لە ئاڵایەك و سەعاتێك کە لە ئەستەنبوڵدا هەڵگیراون.

شێخە پیرەکە گوایە لە نەوەی ئەبوبەکرە، پشتێنی خەلیفەو کلاوێکی بچووکیش کە هی نەوەیەکی تری خەلیفەیە، لە ژێر سوجادەکە هەڵگیراوە.

شێخە پیرەکەو کابرای ڕێنماییکارم، لە کاتی کردنەوەی سوجادە پیرۆزەکەو شتەکان، داخستن و گێراندنەوەیان ، لە ژێر لێوەوە هەر خەریکی خوێندنی ئایاتی قورئانی بوون. ئەوان قبوڵیان نەکرد کە هیچ پارەو پاداشتێك وەربگرن، بەڵام کە من ناوی مستەر (کۆك) م هانی، بینیم زیاتر و زۆرتر نەرم و نیانیان لە گەڵمدا نواند، بەخۆشییەوە ماڵئاواییمان کردو ئیتر ڕۆیشتین. پێی ناچێت هیچ تۆریستێ، شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بەم سوجادەیە بزانێت و بیەوێت بیبینێت.

لە نزیکی ئەو شوێنە پیرۆزەدا، کڵێسەیەکی دیانەکان لە شوێنێکی دێرینی سەر تەپۆلکەیەك دروستکراوە. لەو شوێنەدا لە دێر زەمانێکدا جارێك دیانەکان قەتڵوعام (جینۆساید. س،ك) کراون؛ شوێنەکە پێی دەگوترێت (تەعماسیان) بەڵام ئەوان دەڵێن لەوێ هیچ شتێك نییە لەو کڵێسایە زیاتر، بۆیە من نەچوومە سەردانی.

دوێنێ دیمەنێکی زۆر دڵشام بینی؛ خۆشی بینینی بیرەنەوت: لەوێدا زۆربەی نەوتە خاوەکە بە فیڕۆ دەسوتێت. دوو بۆری نەوتی لێیە کە دەبێت ڕۆژانە ٥٠ هەزار بەرمیل نەوتی خاوی بەرهەمهێنراوی پێیدا بروات. نێلەی ئاگر لە دوو لوولەوە بەرەو ئاسمان بە توندی هەڵدەکشێن و بە تەن شاڵاوی هوورۆژمی گڕ بەرز دەکەنەوە. مرۆڤ لە دووریی ٣٠٠ یاردەشەوە هەست بە گەرمیەکی تاقەتفەرسا دەکات. نێلەی گڕەکە نزیکەی ١٥٠ بۆ ٢٠٠ فووت بەرز هەڵدەکشێ. گڕەکە بە پرتاوی رەنگێکی زەردی تۆخەوە بەرزدەبووەوە. لەلایەکەوە، لوولەی تەلخ و تۆخی دوکەڵ کە زۆر بەرز دەبووەوە، یەکسەرە لە ئاگرەکە جوێ دەبووەوە. لەلایەکی ترەوە وەکو شیری تازە، یا وەکو بەفری هەرەسی تازە، نەرم و چەور شەپۆلی دەدا. بەڵێ ئەو ئاگرە بە شاڵاوە کە بە چینێك لوولە دوکەڵ پێچراوبوو، لە دارستانێکی بێگەڵاو بێ گەردی بناری شاخێ دەچوو. تاوناتاو سێبەری زەبەلاحی دوکەڵی رەش، رووناکی گڕەکەیان دەشاردەوە، هەمە رەنگییەکی وەك دوو سێبەری دروستکردبوو؛ سێبەری شاڵاوی بەرزی شەپۆلی ئاگر ، دژ بە سێبەرێکی تەلخی رەنگ شین کە بە چواردەوری شاڵاوی ئاگرەکەوە بوو. رووناکییەکی تۆخیش لەناو گۆلاوە نەوتەکەی سەر زەوی پای ئەو بیرە نەوتەی

ئاگرەکەی لێهەڵدەستا، دەبزوا و شەپۆلی دەدا.

**کێڵگەکانیان دەکوژێت و لەناوی دەبات:-**

لەناو ئەو دەشتە چۆڵ و ئارامەدا، دیمەنێکی زۆر شرینتر دەبینرا؛ بە تایبەتی کە ڕووناکی ئاگرەکە دەگەیشتە لای تەپۆلکە دوورەکان و خەلکەکە لەوێ جووتیان دەکرد و ئێسترەکانی خۆیان دەگەیاندە نزیکترین شوێنی شیاو، ئا لەو حەلانەدا، ئاگرەکە وەکو پەردەیەکی فراوان لە پشتیانەوە بەرز دەبۆوە. لێ ئەوان دەیانگوو کە ئەم گەرمییەی زەوی هەموو کێڵگەکانیان دەکوژێت و لەناوی دەبات.

ئەم هەموو نەوت سووتاندن و گاز بە فیرۆدانە، تەنیا بۆ تاقیکردنەوەی هێزی پاڵەپەستۆی گازی بیرە نەوتەکانە. بە گشتی ئێستا لێرەدا ٣٦ بیرە نەوت ئامادەن و بەلام تا تەواوکردنی بۆرییەکانی هێڵی حەیفا، سەرمۆرکراون. دوو بۆرییەکان ڕووەو (حدیثة)ی سەر ئاوی فورات دەکشێن و لەوێوە بەسەر چوار بۆری دابەشدەکرێن؛ دووانی بەرەو ئەسکەندەرونەو دووانەکەی تریشی بەرەو حەیفا، کارمەندان بە تەمان کە لە ماوەی ١٨ مانگدا پرۆژەکە تەواوبکرێت. ئێستا نزیکەی هەزار مرۆڤ بە هەموو هیلاکییەکەوە لێرەدا کاردەکەن.

دوێنێ، سەرلەبەیانیم لەناو بازاردا بەسەربرد، تەماشای ئاسنگەرەکانم دەکرد، کە بە شێوازی دێرینە، میتاڵەکانی خۆیان بە ئاگر سوور دەکردو دەیان کوتا و شێوەی پێویستیان دەدایێ. لە بازارەکەدا، کلاوێکی ڕازاوەم بینی بە ناوی (تەپەی سەر) لە بە زیو و دوگمەی شین و شتی وردەی ئاوێزان ڕازابۆوە. شتێکی کوردی بوو، بەلام لە بازاردا لەسەری کەسم نەبینی.

ژنان لێرە شەرواڵی دەلب لەبەر دەکەن؛ کە لە گۆزینگەوە تەسك و کۆدەبێتەوە. پیاوانیش شەرواڵی تورکی لەبەر و مشکی لەسەر دەکەن. کوردەکان لە سەرووی هەموو جلەکانییانەوە خۆیان لە فەروی مەڕ پێچاوەتەوە، بۆیە لەسەر جادەکان پان و پۆڕ دیارن لە بازارەکاندا زۆر شت دەست ناکەون، شتومەکی باش لە دەرەوەی ناوچەکەوە دێنن. بەلام بازارەکان، ڕەنگین و دلگیرن و سەرنجی بینەر ڕادەکێشن: سوجادەکان (قالی – س.ك) لە سلێمانی و هەولێرەوە دەهێنرێن. پێلاو لە (مەندەلی) یەوە. لەوە دەچێت لە کەرکوك هیچ بەرهەم نەهێنرێت لە شەربەو گۆزەو کاشی سەوز زیاتر. لە تەختایی ئەوبەری پردەکەدا، قوتابخانەیەك، باغچەی مندالان و سەرای حکومەت، باغچەیەکی گشتی (زۆر باغچەیەکی جوان و نوێ) هەیە. هەروەها ژمارەیەك مۆلگەی سەربازیی لێیە، کە یەکێکیان کراوەتە خەزینەی ئازووقە، حالیحازر لەوێدا دوو هەزار سەرباز هەیە.

*** بە گشتی درەختی وەرزین**

یەکێ لە خۆشیەکانی ئەم شارە، ئەوەیە کە لێرەو لەوێدا بەسەر سەربانەکانا چلی دارو درەخت و دارخوارما شۆربۆتەوە. بەلام درەختەکانی ئێرە بە گشتی درەختی وەرزین و گەلاکانیان لە پایزدا دەچنە خەزانەوە. لێرە لەسەر ئاسیاوەکان (ئاشەکان . س.ك) سەکۆی بەرزو کاتیی دروستکراون، لە کاتێکا گەنم و دانەوێڵە دەخرێنە ناو مەکینەی ئاسیاوەوە، چاودێری ئاسیاوەکە لەسەری دادەنیشێت.

مزگەوتەکان لەبەردو قور دروستکراون، پەنجەرەکانیان زۆر بچووك و کونکونن. دەرگای ماڵەکان بە زۆریی بە نەخشی بچووك بچووکی هەلکەندراو، ڕازێنراون. بەلام لەم شارەدا هیچ پەنجەرەیەکی نەخشێنراوم بەدی نەکرد، وەکو ئەوانەی لە بەغدا هەن.

مرۆڤ کە بە قالدرمە (پێپیلکانە . س.ك) بۆ قەلاکە سەردەکەوێت، هەلبەتە لە هەر دوو لای ڕێگەی سەرەکی قەلاکە، پێپیلکانە هەیە، هەست دەکات کە ئەم قەلا قشتیلەیە، وەکو مەلبەندی سەرەکی ناوچەکە وایە.

**٩ ئادار ١٩٣٣ :**

دوێنێ چووین بۆ تەماشای کارو کردەی لێدانی بیرێکی تری نەوت؛ بیرەکە لە دەشتایەکی پشت گوندێکی بچووکی خانووی بە قورو گل دروستکراوبوو، کە لە نموونەی ئەو گوندە کەونارە هەزار ساڵیانە دەچێت.ئەو بیرانەی خەریکیانن، بە بورجی ئاسنینی شێوازی بورجی ئیڤیل سەریان گیراوە. لە سەرتۆپی ئەم بورجە بەکرەیەکی زل هەیە؛ ئەو بەکرەیە شەفتی گەورەی ٨٠ فووتی ڕاگرتووە. دەمی کونکردن (درێل) ی گەورەیەو بە بورغی بە خواری شەفتەکەوە لکێنراوە. بۆ تەماشاکردن، ئەم بەشە هەژێنترین بەشی کاری بیرە نەوت هەلکەندنە. درێلەکە تەنیا ٧٠٠ فووت ئەرزی هەلدڕیووە و گەیشتۆتە ئاستی نەوتەکە. قوولترین بیرە نەوت لەم ناوچەیەدا دەگاتە ئاستی ٣٠٠٠ فووت، بەلام لە شوێنەکانی تری جیهان بیرەکان تا دەگەنە ئاستی نەوت دەبێت ١٣ هەزار فووت هەلبکەندرێن.

لەوە ناچێت جێی باوەرکردن بێت هەموو مەکینەیەك ئەو هێزەی هەبێت کە بتوانێت ئەو شەفتە هەرە قورسە سەرولێژ بجولێنێتەوە. خواری شەفتەکە، شفرە یا درێلی کونکردنە، شفرەکە دوو دەمی هەیە کە لە ستیل دروستکراون. بەردەوام دەخولێنەوە خاکەکە هەلدەکەنن و بەرەو قوولایی خاکەکە ڕۆدەچن. شفرەکە بەردەوام بە ئاوی قوراوی ئاوڕشێن دەکرێت تا یارمەتی دەمەکان بدات لە ئاسانکاریی بڕین و هەلکەندن و داماڵینی بەردەکان. شەفتەکە پەیتا پەیتا پەمپ ئاسا هەلئەکشێت و دائەکشێت بۆ ئەوەی خاك و خۆلە داماڵراوەکە فڕێ بداتە دەرەوەی بیرە نەوتەکە.

پاش چەند سەعاتێکی کونکردن، دەمە تیژەکانی شفرەکە کول ببوون، پێویستیان بە گۆڕین دەکرد. ئێمە زۆر بەختەوەر بووین کە دروست لەو کاتەدا گەیشتینە سەر کۆتایی کارەکە. چوار کرێکاری کورد لەلای شەفتەکەوە وەستابوون، دووانی تریش سەرکەوتنە سەر بورجە ٨٠ فووتییەکە. پسپۆرە ئەمریکییەکە نزیك بووەوەو تەرازووی مەکینەکەی گۆڕی بۆ ئەوەی شەفتەکە هەلکشێتە سەرەوە. ئەو پیاوە؛ پیاوێکی بە هێزو ژیر دیاربوو. پێی گووتم کە ئەو هەر لە شێوەی گۆڕانی دەنگی درێلەکەو دەنگی مەکینەکەوە دەزانێت کە دەمی شفرەی ناو خاکەکە چ جۆرە خاکێك هەلدەقەنێت. شفرە بریقەدارەکە، بە دەرکەوت و لەو کاتەدا کرێکارێکی کورد بۆ داماڵینی قورەکەی بەردەوام ئاوی پێدا دەکرد. شفرەکە بە قورسی دەخولایەوەو هاتە خوارەوە. کوردەکان زۆر قیت و قۆز و ئازاو بەهێز دیاربوون: کاتێ شەفتە ٨٠ فووتییەکە لە

بەرزیدا بوو، ئەوان ئازایانە بە دوو بەندی گەورەی ئاسنین، لە شوێنی دیاریکراویدا بەستیانەوە؛ مەکینەکەیان بە گشتی خوارکردو شوێنی بورغییە گەورەکانیان شلکردەوە. کوردەکان خوارووی شەفتە درێژەکەیان بە قولاپی ئاسنین ڕاگرت و کۆنترۆلیان کردو بەرەو لایەك سووڕاندیانەوە. ئەو مەکینەیەی شەفتەکەی لە سەردابوو، بەردرا و هێنرایە خوارەوە تا دووەم بەشی درێژایی شەفتەکە گرێ بدرێت، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە شەفتی یەکەم – ٨٠ فووتییەکە – هەر وەکو قامیشێ خوارکرابۆوە. ئەو کرێکارانە بە هیچ شێوەیەك گوێیان نە دەدا بە مەترسی سەر بورجە ئاسنینەکە، هەر هەموو جەربەزە کارو ئەرکەکانیان بە پەلە بە کارئەندازەیی تەواوکرد. ئەو کوردانە نزیکەی سێ ساڵە لەم ئیشەدان و کارەکانیان زۆر پێخۆشە. لەگەڵ هەموو دژوارییەکی کاری مامڵەکردن لەگەڵ ئەو ئاسنە قورسانە، بەڵام هەردەم دەم بە خەندەو پێکەنینن.

مەکینەکە وا دروستکراوە کە بە هەڵم کاربکات؛ ئەو هەڵمەش شەش مەکینەی گەورەی ئاوکولاندن بەرهەمی دەهێنێت. لەو کاتانەدا کە نەوت لەژێر فشارێکی زۆرەوە دەردەکەوت و سەریهەڵدەدا، لەسەر ئەرزەکەدا گرێکی زۆر سپی دەپرژاند؛ گرێك کە مرۆڤ پێی نەدەکرا زۆر دیقەتی بدات. نەوت و ئاو لەسەر زەوییەکەدا ئاوێتە ببوون، لەگەڵ ئاگرە مەزنەکەدا ، بە جوانی پاڵەپەستۆی هەڵم لە ژێر دوکەڵی ڕەشدا دەبینرا.

کاتێکی زۆرتر لەوێ مامەوە، سەرەتای هێڵی بورییە نەوتیەکانم بینی، بۆرییە ئاسنییەکان و لە تەنیشتیەوە دارتەلی تەلەفۆن، یەکراست ڕووەو دەشتایی بۆ دەرەوەی ناوچەکە درێژ کرابوونەوە. ئەمە سەرکەوتنی عەقڵ و مێشکە بەسەر ڕووبەری سروشت و چۆڵەوانیدا، کە دیمەنی ئەو وایەرو دارتەل و بۆرییانە دروستیان کردووە و لە دوورەوە لەناو تراوێلکە (سەراب) و خۆڵدا وونبوون، ئەگەر ئەم کارانە لە ڕۆژانی زووتردا بکرانایە، شاعیران و پەیکەرتاشان پێی شاگەشکە دەبوون و ئاهەنگیان بۆ دەگێرا، لەوانەبوو بێ سێ و دوو وەکو سەمبولی هێزو توانای مرۆڤایەتی تەماشا بکرانایە. لە پاش ئەو هەموو خۆشییە، بۆ چای خواردنەوە چووین بۆ لای خێزانی جیۆلۆجیستەکە. لە سەربانی ئەوانەوە تەماشای دیمەنەکانی دەوروبەرمانکرد. ئێرە شارێکی خۆشە؛ تەپۆلکەکەی وەکو قەلایەك چووەتە ئاسمانەوە. کۆمەڵێ باغچەی فراوانی دارزەیتون لێرەو لەوێدا و لەناو خانووەکانی دەوروبەری شارەکەدا هەن.

دیمەنی هەموو ئەو زنجیرە چیایانەی لە هەموو لایەکەوە ، لە دوورەوە بە ڕەنگێکی شین باوەوە دیاران، جوان و شیرینە. ئەم شەو من بەرەو ناسریە، ئێرە بەجێدەهێڵم.

*** خەباتی (کۆمەڵە) لە کەرکوک**

**فەرەیدوون عەبدولقادر**

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٠ دا، کە سەردەمی سەرهەڵدان و پەلوپۆهاویشتنی (کۆمەڵە) بوو، لە کۆبوونەوەیەکی ناوەندی (کۆمەڵە)دا، لە دابەشکردنی کارەکاندا پارێزگای کەرکوک بەر من کەوت، لەسەرەتادا (کاکە شەهاب)، بۆ بەغدا و دهۆک و خانەقین و (فوئاد قەرەداخی)، بۆ هەولێر و (فازیلی مەلا مەحموود) بۆ سلێمانی و (دلێر سدیق)، بۆ بادینان دیاریکران و منیش ڕەوانەی کەرکوک کرام.

لە بەغدا و لە سلێمانی و هەولێر و دهۆک و خانەقین، شانە و ئەلقەی تێکۆشەری (کۆمەڵە) هەبوون، بەڵام لە کەرکوک هیچ کەسێکی دیارییکراو بە من نەناسرا ! چونکە من ژن وماڵم هەبوو خێزاندار بووم، ئیتر بڕیار درا ماڵ و کارەکەم بگوێزمەوە بۆ کەرکوک، ئەو کاتە دوو منداڵم هەبوو بە ناوەکانی (بێستوون و شوان).

دروستکردنی ڕێکخستن لە کەرکوک لە خاڵی سفرەوە خۆتەرخان کردن و ماندوبوونی دەویست، بەراستیش بڕیارێکی ئاسان نەبوو، لە هەندێ هاوڕێ و ئاسیاوی سەردەمی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) بەولاوەو لە ئوتێلەکەی (عەبەی دەروێش کەریم و ئاسۆی مەکتەبە) کەسی ترم نەدەناسی.

پاش چەند ڕۆژێ بە دڵێکی خۆش و شەوق و زەوقەوە، جانتام پێچایەوەو بەرەو کەرکوک و بۆ ئوتێلی (عەبەی دەروێش کەریم)، کە لە ناوەندی شاردا بوو، کەوتمە ڕێ و لەوێ دابەزیم، لە ئوتێلەکەدا کوڕێکی جوانخواسی باڵا بەرزی رووگەش، کە ناوی (عەبدولرەزاق) بوو بە گەرمی دۆستانە پێشوازی لێکردم، بە بایەخێکی دیارەوەو بە ئارەزووی دڵی خۆم ژوورێکی بۆ دانام، پاش ڕێکخستنی کەلوپەلی ناو جانتاکەم و هەڵواسینی جلەکانم بۆ حەوانەوەیەك چوومە سەر جێگاکەم بە دەم چا خواردنەوە جار جار دڵەراوکێ و جارجاریش بە دڵی خۆش کەوتمە بیرکردنەوە لەو کارو ئەرکەی پێمسپێردراوە.

کەرکوك شارێکی زیندووی شۆڕشگێڕە، مەڵبەندێکی گرنگی خەباتە و مێژوویەکی تایبەتی هەیە، لە پاش (ڕێککەوتننامەی سایکس بیکۆ) و دابەشکردنەوەی ناوچەکەو پاش گفتووگۆی ئینگلیز و فەرەنسا بە ئاگاداری روسیا، نەوتەکەی کەرکوك بووە هۆی بەزۆر لکاندنی بەشێکی کوردستان، بە شاری کەرکوکیشەوە بە عێراقی عەرەبییەوە! ئیتر لەو کاتەوە ململانێ و خەبات دژی ئینتیداب و ئینگلیز، دژی کۆمپانیای نەوت و گرێبەستەکانی و جووڵانەوەی چەپ لەم شارەدا بە چەندین ڕێگەی هەوراز و نشێودا ڕۆیشتووە تا شەقڵی تایبەتی خۆی گرتووە، لەلایەکەوە کارەکانی کۆمپانیای نەوت لە دەرهێنان و پاڵاوگە و چەوسانەوەی کرێکاران و لەلایەکی تریشەوە چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و بێ مافی، هەموو ئەوانە زەرورەتی پێکەوە گرێدانی خەباتی نیشتیمانی و چینایەتی لێکەوتەوەو کەرکوکی کردووەتە مەڵبەندی ڕاپەڕینە پڕ شکۆکەی گاور باخی! لەلایەکی تریشەوە بەهۆی خێروخێراتی زۆر و زەوەندی ئابوورییەوە، هەمیشە جێگەی چاو تێبڕین و نەتەوەی سەر دەست بووە، بۆیە لە مێژووی نوێدا سیاسەتی تەعریب کردنی کەرکوك، لە تەنیشت دۆزینەوەی نەتەوە سەری هەڵداوە، هەرچەندە کەرکوك نەتەوەو ئاینی جۆراوجۆری تێدایە: کورد، تورکمان، عەرەب، ئاشوری و کلدانی و موسلمانی سوننەو شیعە، گاور و بەهائی و کاکەیی (ئەهلی هەق) و تەنانەت لە کۆندا جوولەکەشی تێدا ژیاوە، بەڵام ئەم دیاردەیە چەندە مێژوو کردە، هێندەش عەرەبە سەردەست و شۆفینییەکان ترش و خوێیان کردووە، بۆ ئەوەی سیمای کوردانەی ئەم شارە لە بنەرەتەوە بسڕنەوەو بیکەنە شارێکی عێراقی و بگرە شارێکی عەرەبیش، ئیتر ئەم شارە بووەتە مەڵبەندێکی دیاری ململانێی چینایەتی و نەتەوایەتی ئاینی و بەمەش ماوەیەك مەڵبەندی ململانێیەکی دوورو درێژی نیشتیمانی بووە دژی ئیستعمار و کۆمپانیا نەوتییە مۆنۆپۆلەکان، بۆیە لە درێژەی ئەم ململانێیەدا لە ڕۆژگارەکانی حوکمی پاشایەتی دا، ڕژێم هۆزەکانی (عوبێدی و جبوریان) بۆ خوارو ڕۆژئاوای کەرکوك هێناوەو لەوێ نیشتەجێی کردوون، هەرچەندە (سەعید قەزاز)ی وەزیری ناوخۆی ئەو سەردەمە، هەوڵێکی زۆری دا، تا هۆزە کوردەکان بۆ ئەو ناوچانەو بە تایبەتی بۆ ناوچەکانی حەویجە و ڕیاز بهێنێ، بەڵام هۆزە کوردەکان بە قسەیان نەکردووەو بەمەش یەکەمین سیاسەتی تەعریب کردن جێ پێی خۆی خۆش کرد، دواتریش لە بۆتەی ئەو خەبات و ململانێیەدا کەڵە پیاوی گەورەی وەك (شێخ مارف بەرزنجی) تێیدا لە سێدارە دراوە، (شێخ مارفی بەرزنجی، ئیبراهیم ئەحمەد، یەکێك بوو لەو نیشتیمان پەروەرانەی جووڵانەوەی نیشتیمانی لە کوردستاندا کە بۆ ململانێکانی هەڵبژاردنی پەرلەمان کاندیدیان کرد و دواتریش بووە سەرۆکی شارەوانی شاری کەرکوك).

ئەم شارە تابلۆیەکی مۆزاییکی هەمەرەنگە و سیخناخە بە ئازار و زوڵمی هەمەرەنگ، ئازارەکانی نەتەوایەتی، چینایەتی، ئاینی و مەزهەبی، سیمای ڕەنگە جیاوازەکانی زوڵم و چەوساندنەوەن لەم شارەدا، بۆیە دەکرێ کەرکوك بۆ (کۆمەڵە) و خەبات زەمینێکی بەپیت و فەڕ بێت، کەرکوك بۆ کورد پڕە لە یادگار و بیرەوەری تاڵ و شیرین، کە بەداخەوە ململانێ و شەڕی خوێناوی برا کوژی نێوان هێزە کوردییەکان، ڕەنگی ئەم پارێزگایەی ژاکاندووە، ئێستا ئیتر بۆ من لە ڕووی مێژووییەوە کەرکوك ئەم شارە گرنگ و گەورەیەیە لە ڕووی سیاسیشەوە ئەو شارە فرە ڕەنگ و فرە دەنگەیە، ئیتر چۆن دڵم بە هاتنەکەم و بە ئایندەی کارەکانم و (کۆمەڵە) خۆش بێت، یەکەمین ڕۆژ بوو لە بێتاقەتیدا چوومە لای کاتبی ئوتێلەکە، کە کوڕێکی ڕەش تاڵەی ئەسمەر بوو بەناوی (عەبدولرەزاق) بۆ ئەوەی هەم هەندێ کات بەسەر بەرم هەم بە شێوەیەکی گشتی لەسەر بارودۆخەکە شتێ وەربگرم، هەر لە یەکەم بینینمەوە ئەو کوڕەم چوو بە دڵدا، ئەو پیاوە گەورەیەی، کە لە شوێنی تر و قۆناغی جیاجیادا باسی

دەکەم چ ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە سەد حەیف هەر لە پرۆسەی ئازادکردنی کەرکوکیشدا گیانی خۆی بە ڕزگارکردنی ئەو شارە بەخشی، ئەو زاتە بە گەرمی پێشوازی لێکردم و خولقی کردم بۆ چا خواردن، سەرەتا بە باسی پاکوخاوێنی ئوتێلەکە دەستمان کرد بە قسەکردن تا باس گەیشتە سەر چۆنییەتی کاروکاسبی و ڕۆڵی ئەو دوو خزمەی تری خۆی، کە لە ئوتێلەکەدا پێکەوە کار دەکەن و بۆ قەڵەباڵەغی ئوتێل و کاری سەخت و سەعاتی کاری دوورودرێژوو مووچەی کەم و بازاڕو بازرگانی لە شارەکەداو بەمەش قسەکانمان بۆ گەلێك باس و خواسی هەمەجۆر پەلی کێشا، لەوانە باسی تری وەك ڕێککەوتنی ئازار و ئەگەرەکانی پەیوەندی (جەلالی و مەلایی) و ڕژێم و حزبی بەعس و شوعییەکان و شوێنەواری ڕووداوەکان لە سەرباری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیری لە پارێزگای کەرکوکدا لەم دانیشتنەدا من (عەبدولرەزاق) م وەك کوڕێکی وشیارو چەپرەو هاتە بەرچاو، ئەمەش بۆ من لەو کاتەدا وەك ئەوەیە مەنگوینم لە کلۆری دارا دۆزیبێتەوە، (جەلال) ی ئامۆزاشی، کە کرێکار بوو لە ئوتێلەکەدا و جاروبار لە شوێنی ئەو دادەنیشت، هەردوو خۆش بەرخورد و دۆستانە بوون، یەکێکی تریش کە هەر خزمی ئەوان بوو، بەداخەوە ئێستا ناوەکەیم لەبیر نەماوە، کوڕێکی باش بوو.

ئەو ڕۆژەی کە دەمەتەقێم لەگەڵ (عەبدولرەزاق) کرد، دەمەو ئێوارەکەی چووم بۆ (مەکتەبەی ئاسۆ) کە خاوەنەکەی کوڕێکی ناسیاوم بوو بەناوی جەبار، مەکتەبەکە کەوتبووە سەرشەقامی جمهوری، لەڕاستیدا هەم بۆ سەردانێکی کاك جەبار ڕۆیشتم و هەم ویستم بزانم هەندێ کتێبم دەست ناکەوێ، کاك (جەبار) زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردم و بەدەم قسە و باسەوە بەهەرێکە لە (حەمە شکورو عەلی کەریم و جیهاد زۆراب . دڵپاك)ی ناساندم، ئەم دوو تێکۆشەرە لە ئایندەدا بوونە دوو هونەرمەندی گەورەو ناسراو، لە کەرکوکیش بە ڕێنوێنی (کۆمەڵە) شانۆگەری (تەقینەوە)، یان لە میهرەجانێکی گرنگ و گەورەدا و لە هەلومەرجێکی سەختدا لە بەغدا پێشکەش کرد و لە دەنگدانەوەیەکی کەم وێنەدا پلەی یەکەمیان بەدەستهێنا، هەر ئەو دەمە کاك (جەبار) خولقی داوەتی نان خواردنی ئێوارەی داهاتووی کردم، قسە و خواسیان زۆر دڵی خۆش کردم و تا دەهات دڵ بە هاتنەکەم خۆشتر دەبوو، لەوێ دانسقەیەکی کتێبەکەی (سەلام)ی شاعیر و چوارینەکانی (خەیام)م دەستکەوت لەگەڵ کتێبێکی نووسەری چەپرەوی فەلەستینی بە ناوی (ناجی علوش) لەگەڵ خۆم هێنامنەوە بۆ ئوتێل. ئیتر وردە وردە لەگەڵ (عەبدولرەزاق) بووینە هاوڕێی نزیك و لەگەڵ (جەلال)ی ئامۆزایشی بووینە ئاشنا، بەهۆی ئەوەوە لەگەڵ زۆر لاوی باش و تێکۆشەردا ئاشنایەتیم پەیدا کرد و بوومە هاوڕێ، لەوانە (عەلی بچکۆل و قادری مەلا عومەر و مامۆستا حەمید).

بیرمە بەهۆی عەلی بچکۆلەوە (حەمیدە سوری پۆلیس و ئیحسان نەجم و عەلی کەریم و جیهاد دڵپاك و مەلا ناسیحە سوور و کوێخا جەلال و ئەحمەد کرێکار)مان ڕێکخست و مامۆستا هۆشمەندم دۆزییەوە (ئازادی برای کە دەکاتە، ئازاد هەورامی)، بووە هاوڕێم کە لە قۆناغێکی دواتردا بووە هاوڕێ و کۆڵەکەیەکی گرنگی (کۆمەڵە).

پاش فراوان بوونی ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی (کۆمەڵە) و زۆربونی ئەندامەکانی و هاتنی(ئیبراهیم جەلال و فەیسەڵ تاڵەبانی - سیروان)، یەکەمین کۆمیتەی کەرکوکمان دامەزراند، کە لە سەرەتادا بریتی بوو لە (عەلی بچکۆل، ئیحسان نەجم، عەبدولرەزاق و ئیبراهیم جەلال) بە لێپرسراوێتی (فەرەیدون عەبدولقادر) و پاش زیاتر گەشەکردنی ڕێکخستنەکان و هاتنی کاك (شەهاب)یش بە نهێنی بۆ کەرکوك، بەرەبەرە (ئەحمەد کرێکار و ئازاد هەورامی و فەیسەڵ تاڵەبانی)، بە هاوکاری و هیمەتی زۆری کاك (حەمیدە سووری) گومرك، کە بەڕاستی نموونەی تێکۆشەری بەزات و چالاك بوو، هەر لە ماڵی ئەویشدا بە هێزی بازووی ئەو لە ماڵەکەی خۆیدا ژێر زەمینێکی نهێنی و شاراوەی ڕێك و پێکمان بۆ کاری چاپەمەنی و بۆ خۆحەشاردانی کاك (شەهاب) دروست کرد، ئیتر بەم جۆرە ڕێکخستنەکانمان شانبەشانی گەشەکردنی ڕێکخستنەکانی شارەکانی تر، لە کەرکوکیشدا گەشەی کرد و شانەکانی پەرەی سەند.

لەو کارو سەرکردایەتییەدا، ناشێ بۆ یەك سات ڕۆڵی گەورەی شەهید (شەهاب) لەبیر بکەین، کە چۆن لە ساڵی ۱۹۷۳ وە بڕیاری دا بە ئێجگاری خۆی و هەموو کاتەکانی خۆی بۆ کۆمەڵە تەرخان بکات، ئیتر ناوی لە (شەهابەوە) بوو بە خاڵە (عوسمان) و بە نهێنی دەستی دایە چالاکییەکی زۆر و بەردەوام و لە کەرکوکەوە سەرپەرشتی هەموو شارەکان و سەرجەم ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی دەکرد، ئەو کاتە لە ماڵی بەندەو ناو بەناو لە ماڵی کاك (حەمیدە سوری) گومرك و لە ماڵی (ئیبراهیم جەلال و فەیسەڵ تاڵەبانی و ئیحسان نەجم - ئەبو شەهاب)، بە نهێنی دەژیا و کاری ڕێکخراوەیی و سیاسی دەکرد، دەورەی بۆ پەروەردەکردنی کادرەکان دەکردەوەو لەلایەکی تریشەوە هاوکاری دەکردن و بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی ناوەندی کۆمەڵەی دەکرد، لەو ماوانەدا و لە ساڵی ۱۹۷۳ وە بە کردەوە بەهۆی بوونی کاك شەهاب و بەهۆی ئەوەی هەر لە کەرکوکیش ئێمە گۆڤاری (ئاڵای سورمان) دەردەکرد، کە ئەو کاتە وەك ئۆرگانی (ناوەندی کۆمەڵە) وابوو، ئیتر کەرکوك وەکو ناوەندێکی گرنگی (کۆمەڵەی) لێهات و هەر لەوێش ژمارەکانی بەدەست دەنووسرایەوە، بەبیرم دێت (نەجمەدینی فەقێ عەبدوڵڵا)، یەکێ بوو لەو هاوڕێیانەی کە بەدەست و خەتی خۆی دەینووسییەوە،

لەوماوەیەدا چەند جارێك لە کەرکوك و جارێکی تریش لە ئوتێل هەورامانی هەولێر چەند کۆبوونەوەیەکمان کرد لە باسی ڕێکخستنەکان و گەشەکردنیان مام جەلال ئاگاداری کردین کە دەچێتە دەرەوەی وڵات و قاهیرە لەو کۆبوونەوەیەدا ڕێگە و شوێنی پەیوەندی و گۆڕینەوەی بیروڕاو هاتووچۆی نامەی هەردوو لامانی ڕێکخست و سەفەری کرد، پاش سەفەرەکەی بۆ دەرەوەی وڵات لە بەیروت و جارجاریش لە شام دەمایەوە، لەو ماوەیەدا زۆر تێکەڵ بە ڕێکخراوی (جەبهەی شەعبی)، ئەو ڕێکخراوە (بەرەی میللی بۆ ڕزگاری

فەلەستین) لە دوای جەنگی حوزەیران و لە کانونی یەکەمی ١٩٦٧ دا، لەسەردەستی ئەمینداری گشتی (جۆرج حەبەش)، دامەزراو ڕێبازی سۆسیالیستی مارکسی گرتبووە بەر، ئیتر وردە وردە (مام جەلال) پەیوەندییەکانی لەگەڵ (جۆرج حەبەشی و ودیع حداد) وە باقی سەرکردەکانی ڕزگاری لە فەلەستیندا پەرەی سەند و لە چالاکییەکانیاندا هاوکاریان بوو، ئەو ڕێکخراوە چونکە بە فراندنی فڕۆکەو (لەیلا خالید) ەوە ناوی دەرکردبوو، لەناو لاواندا بە تایبەتی لەناو کچاندا خۆشەویستییەکی پەیدا کردبوو.

جارێکیان (مام جەلال) داوای کرد کە کاك شەهاب ڕەوانە بکەین بۆ لای، کاك شەهابیش پێی باش بوو سەردانی بکات و ماوەیەك لە نزیکەوە هەندێك مەسەلەی فیکری لەگەڵ تاوتوێ بکات و لەگەڵی بمێنێتەوە و لە پاشدا بتوانێت بە نهێنی بگەڕێتەوەو ئیتر خۆی بە تەواوی بۆ کاری کۆمەڵە تەرخان بکات و هیچ کارێکی تر نەکات، کە کاك شەهاب سەفەری کرد لە ناوەندی کۆمەڵە بەتەنها (دلێر سدیق) مایەوە هاوکارم بێت، کە هاتنەوەی کاك شەهابیش دواکەوت، بیرمان لە فراوانکردنی (ناوەندی کۆمەڵە) کردەوە، بەڵام بۆ نەگبەتی هێشتا هیچمان نەکردبوو، (دلێر سدیق) بڕیاری کشانەوەی دا، گەرچی گفتی دا کە لەلاوە هێندەی پێی بکرێت هەر یارمەتیم بدات، ئیتر بە تەنها مامەوەو بەوەش دۆخێکی سەخت و کارێکی زۆر و گران ڕووی تێکردم، بەڕەزامەندی (مام جەلال و کاك شەهاب)، هاوڕێیان (جەعفەر عەبدولواحید و ئاوات عەبدولغەفور و حەمەی میرزا سەعید) مان سەرخست بۆ کۆمیتەی (ناوەندی کۆمەڵە) و ئیتر منیش بەیارمەتی ئەو هاوڕێیانە ئامێکم پیا هاتەوە، پێکەوە (جەعفەر عەبدولواحید، ئاوات عەبدول غەفور و حەمەی میرزا سەعید) وە من کە سەرپەرشتیکەر بووم، ناوەندی تازەی کۆمەڵە بووین و چالاکانە پێکەوە کارمان دەکرد، (جەعفەر عەبدولواحید) تێکۆشەرێکی گەورەو بەکار بوو، لە خێزانێکی تێکۆشەر بوو، برا گەورەکەشی (خالید دلێر)، پیاوێکی پێشمەرگەو تێکۆشەر و شاعیر بوو، خاڵ و هاوڕێی نەرمین عوسمان)ی تێکۆشەر بوو، (نەرمین هاوڕێیەکی نزیکم بوو)، لەگەڵ (داڕۆی شێخ نووری) دڵیان بەیەکەوە بوو، زۆرجار لە بەغداوە دەهات بۆ کەرکوك و پێکەوە دەڕۆیشتین بۆ هەولێر بۆ سەردانی (جەعفەر عەبدولواحید) بۆ کۆبوونەوەکان، ئیتر بەو جۆرە تێکەڵییەکی زۆرمان لەگەڵ کەسوکاری یەکتردا هەبوو، (جەعفەر و نەرمین) و من بۆ دایکی نەرمین زۆر خۆشەویست بووین و ناوی هەریەکێکمان، هەرسێکمانی بیردەخستەوە ئێستاش یەکێکە لە هاوڕێکانم، جەعفەر هاوڕێیەکی گیانی بەگیانیم بوو لە بەغدا، لە چوار ساڵی خوێندنی زانکۆ، هەردووکمان لە زانکۆی (ئەلموستەنسریە) پێکەوە بووین، ئەو لە کۆلێژی زمانی ئینگلیزی بوو لەگەڵ (غاندی)، جوانەمەرگدا، کە برای کاك (فازیل کەریم . مامۆستا جەعفەر) بووم، (جەعفەر عەبدولواحید) لاوێکی جوانخاسی بەکار و زیرەك، پیاوێکی حازر جوابی دەم بە نوکتەی شیرین خەندە بوو، لەبەر خوێندنی زانکۆو هاوکات ساڵانی زووتر، کە پێشمەرگایەتی کردبوو خەڵکێکی زۆری دەناسی پەیوەندیەکی خۆش و فراوانی کۆمەڵایەتی هەبوو، ئەم کەلە پیاوە توانایەکی باشی لە نووسین و شیعری بە زمانی عەرەبی هەبوو، لە ساڵانی زانکۆدا دڵی چوو بوو بە کچێکی ئێجگار جوانی عەرەبدا ناوی (عالیە) بوو، کچەکەش (جەعفەر)ی خۆشدەویشت.

لەوماوانەدا کە من ماڵم لە کەرکوك بوو لەگەڵ جەعفەر پێکەوە لە ناوەندی کۆمەڵە کارمان دەکرد، بیرمە ڕۆژێکی عەسر خەریکی خوێندنەوە بووم دەرگای ماڵی کردەوەو هاتە ژوورەوە، ئاخر لەو جۆرە سەردانەی زۆر بوو . وتی پێش ئەوەی دابنیشم با پێت بڵێم خەریکم ژن دەهێنم و زۆریم تەواو کردووە، منیش بە باوەڕی خۆم وامزانی کە عالیەی خۆشەویستی دەهێنێت، وتم یاخوا پیرۆز بێت و بە خۆشی، بەڕاستی کارێکی باشت کرد عالیە زۆر کچی چاکە، دەنگی هەڵبڕی و وتی: دەسا عالیە نیە کچێکی زۆر باشی هەولێریە ناوی (قانیعە) یە، دەست ڕەنگینەو خەیاتێکی زۆرباشە گەر من لێم قەوما یان لە سێدارە درام، ئەو دەتوانێت خۆی ماڵ و منداڵ بە خێوبکات، ئایندەش دەریخست (قانیعە) خان لەو ستایشانەی جەعفەری زیاتری ئەهێنا بەڕاستی قانیعە، ژنێکی چاك و ڕەوشت بەرز و قورس و گران بوو، بەڵام وەڵامەکەی جەعفەر تاساندمی، چاوەڕوانی ئەنجامی وانەبووم درێژەی بە قسەکانی دا و بە دەم حەسرەت و ڕوویەکی شپرزەوە کە هەر خۆم دەزانم چۆن زەردەخەنە هەمیشەییەکانی تۆرابوون، بۆلای بیرەوەرییە شیرینەکانی پەلکێشی کردم وتی  چۆن کچێکی وا خۆشەویست و جوان دەخەمە ئەم ژیان و ئایندە نادیارەوە، دەزانم ڕۆژێك هەر لە سێدارە دەدرێم و ئەوسا دەبێت هەموو مەینەتییەکانی ژیانی بۆ بەجێ بهێڵم و نا من شتی واناکەم ئەمەیان کچێکی کوردە وەك من ئەرکی خۆیەتی لەو ڕێبازەدا هەرچی بەسەر بێت، بۆیە خۆم دەزانم چی دەکەم و کێش دەهێنم، هەندێکی تر لەو باسە دواین و دواتر هاتینە سەر باسی کاروباری خۆمان. جارێك لە بەغدا (ئاوات عەبدولغەفور)م بینی هاتبوو بۆلای کاك شەهاب ناسیم کوڕێکی زیرەك و باوەڕ بەخۆی و بە گەنجێکی وریاو پڕمەعلومات هاتە بەرچاوم، ئەویش لە خێزانێکی تێکۆشەر بوو.

هەروەها (ئاوات) لەگەڵ (فازیلی مەلا مەحموود) یشدا، خالۆزاو پورزا بوون و برای (هیوا غەفور)ی تێکۆشەر کە لە بۆردومانەکەی ساڵی ١٩٧٤ لە قەڵادزێ شەهید بوو، هەرچی (حەمەی میرزا سەعید)ە من نەمدەناسی و هیچ جۆرە ناسیاوییەکیم لەگەڵی نەبوو، بۆیە هیچ جۆرە زانیارییەکم لەسەر نەبوو، تەنها کاك شەهاب بۆی باس کردبوو کە تێکۆشەرێکی کۆنی سەندیکای کرێکاران و کۆنە کۆمۆنیستە، ئیتر ئەویشمان لەسەر پێشنیاری کاك شەهاب هێنایە پێشەوە بۆ (ناوەندی کۆمەڵە).

بەڕاستی (جەعفەر و ئاوات) بەباشی و چالاکانە، (ئاوات) لە سلێمانی و (جەعفەر) لە هەولێر و کۆیە کاریان دەکردوو لە ماوەیەکی کەمدا بوونە هۆی گەشە پێدانی ڕێکخستنەکان، (حەمەی میرزا سەعید)، لەوان بەتەمەنتر بوو خەریکی بادینان بوو بۆ ماوەیەکیش خەتی خانەقین و مەندەلی و

ماوەیەکیش سەرپەرشتی هەرێمی بەغدای دەرکرد،خوا هەڵناگرێ لەو ماوەیەدا کە ئێمە کارمان لە گەڵدا دەکرد هەم پیاوێکی باش بوو هەم ڕۆڵی هەبوو لە گەرم کردنی برایەتی لە ناو هاوڕێیاندا، ئەوکاتە کۆبوونەوەکانی (ناوەندی کۆمەڵە) زۆربەی لە کەرکوك و لە ماڵی خۆمان دەرکرا ناوبەناویش لە سلێمانی یا لە هەولێر لە ماڵی شەهید جەعفەر یان لە ماڵی (کاکە حەمە) کۆبوونەوەکانمان دەرکرد.دوای هەموو کۆبوونەوەکانیش کاغەز و شتە زیادەکانمان دەسوتاند و لە پاڵ خۆپاراستمان لە دەزگا سیخوڕیەکان گرنگیەکی زۆریشمان بە مەسەلەی پەروەردەکردن و ئەلقەی ڕۆشنبیری هاوڕێیان دەدا.

لەو ماوەیەدا کە پێکەوە بووین، چەند نامەیەکی مام جەلالمان بۆ هات، بیرمە لەیەکێ لە نامەکاندا باسی پێویستی کارێکی نیشتیمانی فراوانی لەدەوری کۆمەڵە کردبوو بە جوانی هۆی پێویستیەکانی ڕێکخراوێکی لەو بابەتەی بۆ باسکردبوون، دیارە ئەو مەسەلەیەی لا مەبەست بوو، بۆیە لە نامەیەکی تریشدا جارێکی دی باسی ئەو مەسەلەیەی کردبۆیەوە، باقی نامەکانی دەنگوباسی ڕێکخراوو حیزب و جوڵانەوە شۆڕشگێڕەکانی ناوچەکەو فەلەستینیەکان بوو، جگە لەوانەش دوو سێ بابەتی لەمەر هەڵسەنگاندنی ڕژێمی عێراق و ئاسۆی ڕووداوەکان باس کردبوو، یەکێکی تریشیان لەسەر گرنگی نەوت و مەسەلەی خۆماڵیکردنی نەوت و ڕەنگدانەوەو شوێنەوارەکانی بوو لە سیاسەتی حوکومەتی عێراقدا و نووسراوێکی تریشی بۆ ناردین، کە بە هەڵسەنگاندنی ڕێککەوتنی ٢٥ ساڵەی ستراتیژی نێوان عێراق و یەکێتی سۆڤیەت دەستی پێکردبوو، کاریگەری ئایندەی ئەو پەیمانەی باسکردبوو، ئیتر لەو ماوەیەدا پەیوەندیمان باش و تووندو تۆڵ بوو لەگەڵ مام جەلال و کاك شەهابدا و لە وردی ئاگاداری یەکتر بووین و ناوبەناویش ئێمە لە هەلوومەرجی ناوخۆ و ڕەوتی پەرەسەندنی ڕووداوەکان و گەشەکردنی ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵە) ئاگادارمان دەکردنەوە.

*** گەڕانەوەی کاك (شەهاب)**

هەر ساڵی ١٩٧٣، پاش زیاتر لە شەش مانگ کاك شەهاب بە شێوەیەکی نیمچە نهێنی و بێ ئاگادارکردنەوەی ژن و ماڵ و کەسوکارو هاوڕێکانی، لە ڕێگەی سنورەوە بە موسڵدا گەڕابووەوە هەولێر تەنها من و (جەعفەر عەبدولواحید)، دەمانزانی کە لەو ڕۆژانەدا دەگەڕێتەوەو ئیتر کە هاتەوە خۆی دەرناخات و بە نهێنی لە کوردستان دەمێنێتەوەو خۆی بۆ کارەکانی (کۆمەڵە)، تەرخان دەکات،پاش نیوەڕۆیەکی درەنگی پێنج شەممەیەکی گەرمی هاوین بوو، لە پڕ(جەعفەر) خۆی کرد بە ماڵدا شادیو زەوقێکی خۆشی لەگەڵ خۆی هێنایە ماڵەکەوە، ئاخرئەو هەمیشە یەك دوو نووکتەی خۆشی پێ بوو زوو زوو دەیگێڕایەوە دیاربوو فریای نان خواردن نەکەوتبوو، بۆیە داوای خواردنی کرد، تا سفرەی خواردن ئامادەکرا هاتە لامەوەو بە دەنگێکی نزم وتی : کاك شەهاب هاتوەتەوە و داوای کردوە سبەی بە ئامادەبونی هەموو هاوڕێیانی (ناوەندی کۆمەڵە)، کۆبوونەوەیەك بکەین لە هەولێر و لە ماڵی خۆمان، منیش پاش پشوو دانی ئەو جوابم نارد بۆ (ئاوات عەبدولغەفور) تاکو لە کاتی دیاریکراودا ئامادەبێت ئایشارمەوە زۆر پەرۆشی دیدار و بینینی کاك شەهاب و لایەنە نادیارەکانی دەنگوباسەکان بووم، بۆیە تا ڕۆژی دوایی دەتووت بەسەر ئاگرەوەم، ڕۆژی هەینی ئاوات زوو گەیشتە لام، پاش نان خواردنی بەیانی بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆم هەردووکمان بەرەو هەولێر کەوتینە ڕێ، نزیکی نیوەڕۆ لە ماڵی (جەعفەر) بە دیداری کاك شەهاب و دەنگوباسی مام جەلال و جوڵانەوەی ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکانی ناوچەکە گەیشتین، ناوەندی کۆمەڵە، هەموو هاوڕێیان (کاك شەهاب، حەمەی میرزا سەعید، جەعفەر و ئاوات و من) ئامادە بووین، جێگەی داخ بوو دلێر سدیق لەگەڵمان نەمابوو، بۆیە کاك شەهاب هەر زوو پرسیاری کرد : ئەوە چۆن بوو دلێر کشایەوە! ؟

لە ڕاستیدا دلێر هیچی نەوت لەوە زیاتر کە وتی : بارە گرانیەکانی ئەم ئیشە بە من هەڵناسوڕێت، هەرچەندە من زۆری لەگەڵ خەریك بووم، کە هەلوومەرجەکە ناسکەو بۆچی زووتر تا کاك شەهاب لێرە بوو قسەت نەکرد، بەڵام قسە و هەوڵەکانی من هیچ سوودیان نەبوو، تا ئێستایش دلێر بێدەنگە هەرچەندە من بۆ خۆم هاوڕێیەتی و خۆشەویستیم تا ئەمڕۆش لەگەڵدا پاراستووەو ئەویش هەمیشە خۆی بە لایەنگرێکی وشیاری خەبات دەزانێت، بەڵام ئەو جۆرە کارانە ئاوازە نین و لە هەوراز و نشێوەکانی خەباتدا مرۆڤ دەبێت چاوەڕوانی کارو پێش هاتی وابکات و ئاساییە، هەموو کەس نەتوانێت تا سەر بڕیکات ئەوەی گرنگە زۆر باش نهێنی ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵە) ی وەك چاوی پاراست.

(حەمەی میرزا سەعید) وتی : بەراستی کوڕێکی زیرەك و باش بوو، نەدەبوو لەم کاتەدا وازبهێنێت لەپاشدا ڕووی کردە کاك شەهاب وتی : ئەرێ قسە قسە دەهێنێ ئەوە (حەمە جەزا) ی ئەندازیار چۆنە! زۆر باشەو کوڕێکی چاکە، ماوەیەکی زۆر لە ماڵی ئەو بووین وە خزمەتێکی زۆری کردین، ئێستایش (مام جەلال) لە بەیروت لە ماڵەکەی ئەوە، هەرچەندە لەم ڕۆژانەدا بۆ سەفەر چووە بۆ قەتەر.

نیوەڕۆ (قانیعە) خانی ژنی جەعفەر خواردنێکی شەوە یاپراخ یا گیپەی بۆکردبووین، دیاربوو لەوێ باوی بوو، ناوی (میمبەر) بوو، شتێکی تازە بوو، ئاوات زۆری لێ خوارد، قانیعە ژنێکی ئایاب بوو دڵسۆزو بێ قسە بوو، ئاوەکەی خەسار نەکردبوو بەراستی قانیع و خۆراگر بوو، لە درێژەی کۆبوونەوەکەدا کاك شەهاب جگە لە باسی جموجۆڵی ڕێکخراوو تێکۆشەرە چەپەکانی عەرەب و فەلەستین و دەنگوباسی (بەرەی میللی ڕزگاری فەلەستین) و بەرنامەی دەست هەڵگرتنیان لە فڕۆکە فڕاندن باسی بەرنامەی کارکردنی خۆی کرد، کە ڕەنگە لەمەودوا زۆرتر بە نهێنی و لە کەرکوك جێگیر بێت، چونکە کەرکوك لە ناوەڕاستی سلێمانی و هەولێردایە، بۆ ئەمەش منی ڕاسپارد جێگەی بۆ ئامادەبکەم، لەوەڵامدا پێم وت : تەکبیری ناوێت ماڵی خۆمان و ماڵی کاك ئیبراهیم جەلال و هاوڕێیانی تریش هەن، پەك ناکەوێت.

لەپڕ(ئاوات) هەڵیدایەوەو وتی : کاك شەهاب ئیتر نابێت کاك

ئیسماعیلی کەشکۆڵ ببینیت، مەبەستی (ئیرەجی کەشکۆڵی)، سازمانی ئینقلابی بوو، کە کاك شەهاب لە ساڵانی رابردوودا نێوانی لە گەڵیدا گەرم بوو، دیار بوو ئاوات، لە قسەکەی دوو مەبەستی هەبوو، یەکەمیان مەبەستی لایەنی ئەمنی بوو، تا زۆر کەس هەست بە بوونی نەکەن و نەزانن، کە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان، دووەمیش دەیویست بڵێت (ئیرەجی کەشکۆڵی ـ ئیسماعیل) کە تێکۆشەرێکی کۆمەنیست و سەرکردەیەکی (سازمانی ئینقلابی حیزبی تودەی ئێران بوو) کوردستانی بە جیا لە ئێران یان لە عێراق نەدەبینی و لە ئالا هەڵگرەکانی یەکێتی ڕێکخراوەیی چینی کرێکار بوو، باش یان خراپ هەموو هەڵەکانی چین و (ماوتسی تۆنگ)ی پینە دەکرد و لە بانگدەرەکانی (تێزی سێ جیهان) بوو، چینیەکان لەو ساڵانەدا لەگەڵ زۆرێك لە وڵاتی عێراق و تەنانەت لەگەڵ ئێرانیش پەیوەندیان هەبوو، بەو هۆیەشەوە تیۆری (تێزی سێ جیهانی چینیەکان) پاساوی بۆ هەنگاوەکانی (چین) دەهێنایەوەو وڵاتانی وەك عێراق و سوریای بە بەشێك لە خەباتی جیهانی سێ و خەباتی گەلان دژی ئیمپریالیزم دەزانی و ئەمەش مانای وایە ئەو وڵاتانەو ڕژێمەکانیان پێشکەوتوو خوازن و لە دژی ئیمپریالیزم لە خەباتدان و دەبێت تێکۆشەرە مارکسیەکان، سیاسەتی (یەکگرتن و ململانێ ـ ئەلوەحدە وە ئەلسراعە) یان لەگەڵدا پیادە بکەن و ناکۆکی لەگەڵ ئەو ڕژێمانەدا نەگەیەننە ئاستی ناکۆکی سەرەکی، بەلای ئێمەشەوە ئەمە هەڵەیەکی زۆر زەقی سیاسیی و فیکری بوو، بۆیە ئەگەر بڕوامان بەو بۆچوونە هەبوایەو لە بواری پراکتیکدا پەیڕەومان بکردایە، ئەوا دەبوو چاو لە قەڵا چۆکردنی نەتەوەکەمان بنوقێنین و ناکۆکیمان لەگەڵ ڕژێمی عێراق نەگاتە ئاستی ناکۆکی سەرەکی و خەبات بۆ ڕووخاندنی یا لادانی نەکەین دیارە ئەمەش لەگەڵ خەبات و بیرو بۆچوونی ئێمەدا نەدەهاتەوە.

لەو کۆبوونەوەیەدا باسی ڕژێمی عێراق و (پارتی دیموکراتی کوردستان) و پەیوەندی هەردوکیان و وەزعی خەڵك و ئایندەی ڕووداوەکانی نێوانیان کرا، باسی وردەکارییەکانی ڕێکخستن و گەشەکردن و باری ژیان و گوزەران و ئابووری کرا و وەزعی خراپ و شپرزەی (حیزبی شیوعی) ش بەدەر نەبوو لە باسەکان، هێڵە گشتیەکانی نەخشەی کارکردن بۆ ئایندەو چۆنیەتی پەیوەندی کردن لەگەڵ مام جەلال باس کرا، ئیتر عەسرێکی درەنگ کاك شەهاب و من گەڕاینەوە بۆ کەرکوك و بەهۆی ئەوەی کە ئاوات کاری هەبوو مایەوەو نەگەڕایەوە.

لە کەرکوك تەنها ترسمان لە منداڵەکانی من هەبوو، کە ناوی کاك شەهاب بهێنن دایکیان لە کۆنەوە ناسیاوی و هاوڕێیەتی لەگەڵی هەبوو، بۆیە ئیتر لە بەر منداڵەکان وتمان ئەوە خاڵە عوسمانە، من خاڵێکم هەبوو ناوی عوسمان بوو، نەدەهاتە سەردانمان بۆ کەرکوك، زۆر تاقەتی سەفەر و سەردانی نەبوو، ئیتر لای هەموو هاوڕێ و منداڵەکانمان کاك شەهاب بووە خاڵە عوسمان و بەهۆی هەندێ هاوڕێی خۆشمانەوە، ناسنامەیەکی ـ ناسنامەی باری شارستانیمان، بەو ناوەوە بۆ دروست کردن پاکیزەی خێزانیشم پڕبەدڵ خزمەتی دەکرد و بە دڵ و بە گیان نهێنیەکانی دەپاراست و سەلامەتی کاك شەهابی زۆر بەلاوە مەبەست بوو، کاك شەهاب زۆرجار لە کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی هەرێمی کەرکوکدا بەشداری دەکرد، بوو بە دۆستی نزیکی هاوڕێیان، (ئیحسان نەجم هەورامی و حەمیدە سوور و ئەحمەد کرێکار، قادری مەلا ئەنوەر، فەیسەڵ تاڵەبانی ـ سیروان) ماڵیان لە گەڕەکی ئازادی کەرکوك بوو دراوسێمان بوو، کوڕێکی ئازا و ڕەوشت بەرز و چالاك بوو، ئەم هاوڕێیەم زۆر خۆش دەویست، بۆیە هارکاتێ بچوکترین کاتم هەبوایە، دەچووینەلای یەکتر و بەرنامەی کتێبێکم لەگەڵ تاوتوێ دەکرد، هەرچیم بزانیایە لەسەر هەر بابەتێك بوا، هەمیشە هەوڵی دەدا شتی نوێ فێر ببێ،ساڵی ١٩٧٤ بوو بە پێشمەرگە جاری دووەمیش لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێدا بووەوە بە پێشمەرگە و ناوبانگێکی باشی پەیدا کرد، بەداخەوە لەبۆسەیەکی دووژمناندا شەهید بوو.

لەبەر لایەنی ئەمنی و پاراستنی کاك شەهاب، لە زاری خەڵکی و لە چاوی دەزگا ئەمنیەکان ماوە ماوە دەمانناردە ماڵی (ئیبراهیم جەلال، ئیحسان نەجم، یان بۆ ماڵی حەمیدە سوور) کە نێوانیان زۆر خۆش بوو، هەر لە ماڵی ئەوانیش بە هیمەت و دەست و بازووی هاوڕێ (حەمید)، ژێر زەمین و ژوورێکی خاوێن و ڕێکوپێکمان بۆ کاتی تەنگانەی کاك شەهاب دروست کرد، کە زۆربەی کات بۆ کاروباری چاپەمەنی سوودی لێ وەردەگیرا، لەو ماوەیەشدا، کە لە ساڵی ١٩٧٤ شەڕ هەڵگیرسایەوەو من چوومە ریزی شۆڕشەوە، کاك شەهاب چووە ماڵی کاك ئیبراهیم جەلال.

بیرمە جارێکیان دەورەیەکی کادیرانمان لە کەرکوك کردەوە، زۆربەی کات کاك شەهاب دەرسی پێ دەوتن، (ئازاد هەورامی) و (علی)، کە لەم دووایەدا بە (شوانەی تەنسیق) ناسراو بوو، هەردووکیان شەهید بوون، دوو کادیری ئەو دەورەیە بوون، (ئەحمەد کرێکار) یش یەکێکی تریان بوو، لەو دەورەیەدا مێژووی کورد و کوردستان و ئابووری و جەنگی گەل (جەنگی ڕزگاری نیشتیمانی و ناکۆکیەکان)، بابەتەکانی بوون،

لە کەرکوکەوە کاك شەهاب سەردانی ڕێکخستنەکانی بەغدا، سلێمانی و هەولێری دەکرد، ماوەیەکیشی لە سلێمانی بردە سەر، کە گەڕایەوە بڕیاری دا لە هەولێر بە نهێنی منداڵەکانی لە ماڵی (شەهید جەعفەر) ببینێ،(نازەنین) خانی خێزانی و منداڵەکانی خۆی (سۆران و سۆزان)، یەك دوو ڕۆژ لای مانەوە، جارێکی تریش بیرم دێ (ئاسۆی شێخ نوری) هێنانی بۆ ماڵی ئێمە لە کەرکوك جاروباری تریش هەروا بە نهێنی دەیبینین، شتێکی تایبەتی هەبوو کاك شەهاب نە فەرمانی گرتنی هەبوو، نە ناچاربوو خۆی لە ماڵ و منداڵ بکات و واز لە کارو فرمان و بژێوی ژیانی بهێنێ و بەو جۆرەو بەو حەسرەتە زۆر ناخۆشەوە ژن و منداڵەکانی بتوانن باوکی خۆیان ببینن، بۆیە لای (سیروان تاڵەبانی) ببوو بە پرسیار و ڕۆژێك لەو بارەیەوە پرسیاری لە کاك شەهاب کرد، لە وەڵامدا کاك شەهاب وتی: تێکۆشەری ئەم ڕێبازە دەبێت یەکەمین شەڕ لەگەڵ خۆی بیکات و خەبات بکات لەگەڵ دەروون و دژی خواست و حەزە شەخسیەکانی خۆی، دەبێت ڕاهێنانی

بەردەوامی پێ بکەیت تا بتوانێت خۆ نەویست و خەڵك ویست و گیان باز بێت، بۆ خەڵکی و مەسەلەکانی سەربەستی و ئازادیەکانیان و ژیانیان تێبکۆشێت، جگە لەوانەش خۆ تەرخان کردن بۆ مەسەلەیەك بۆ رێکخراوێك مانای خۆی هەیە، بۆیە پێویستە ببێتە دەروێشی ئەو رێکخراوە.دەبێت من بتوانم فریای هەموو کارەکان و هەموو ئەو ئەرکانەی خراوەتە ئەستۆم بکەوم، لەوەش زیاتر دەمەوێ گەر بتوانم رۆڵی لە پەروەردەکردنی هاورێکانمدا بگێرم، قسەکانی کاك شەهاب لەم چەند رستەیە پاراوتر و فرەوانتر بون، بەڵام من تەنها شتە گشتیەکانیم لەبیر ماوە، (شەهید جەعفەر) لەسەر ئەو بیرو کردارەی کاك شەهاب، هەمیشە دەیووت : کاك شەهاب پیاوێکی ئێجگار گەورەیە، بۆ من مامۆستاو نموونەی تێکۆشەرێکی هەڵکەوتووە، لە کەسایەتیە خاکی و کۆمەڵایەتیەکەیدا خۆی هاورێکانی (سازمانی ئینقلابی) گرتووە.

جارێکیان کاك شەهاب، حەزی کرد سەردانی ناوچەی حەسار بکات بۆ لای (کویخا جەلال)،ئاخر بۆ کاك شەهاب زۆر خۆش بوو (کویخا) کۆنە کۆمۆنیستەو کاتی خۆی لە جوڵانەوەی جوتیاراندا دەوری هەبوەو ئاشنای (مەحمود عەدۆ) ی لای هەولێرەو هەردووکیان پێکەوە هەمان رۆڵیان لەو ناوچانە دیوە، تۆزێ بدوێنێ بۆیە دۆستایەتیەکی خۆش لە نێوانیاندا پەیدا بوو، چونکە کاك شەهاب زۆری پێخۆش بوو، کە لە کەرکوك کەسی وەك (ناسیحە سور) ی ناوشوان و لەو جۆرە هاورێیانەمان کۆکردووەتەوە، ئەوەی راستی بێت ئەم هاورێیە ئەبو شەهاب رێکی خستبوو بۆ (کۆمەڵە)، بەو جۆرە کاك شەهاب، وەك تەنها سەرکردەیەك هەموو کاتەکانی بۆ کۆمەڵە تەرخان کردبوو، چالاکانە بۆ هەموو رێکخستنەکان کاری دەکردو شوێنی سەرەکیشی هەر لە کەرکوك بوو، تا ساڵی ١٩٧٤ شەر هەڵگیرسایەوەو رێگەی شاخ و پێشمەرگایەتی گرتەبەر، (گەلاوێژ جەباری) ئەندامێکی چالاك و خانمێکی ژیرو بەکار بوو، ژمارەیەك هاوتەمەنی خۆی کۆکردبوەو رێکی خستبوون، ماوەیەکی زۆر خۆم راستەوخۆ سەرپەرشتیم دەکردو لەبەر ئەوەش کە ئافرەت بوون، هەموو کۆبوونەوەکان یا لە ماڵی ئەوان یان لە ماڵی خۆمان بەرێوە دەچوو، بەمەش لەگەڵ دایك و باوکی و کەسوکاری تێکەڵ ببوم و وەکو خزمان لێهاتبوو، هاورێیەکی تریشمان هەبوو بە ناوی (شێرزاد جەباری)، کە بەداخەوە لەم دواییەدا شەهید بوو،ئەویش هەر لاوێکی هەڵکەوتوو بوو، لەو هاتووچۆیەی من بۆ ماڵی گەلاوێژ و هی ئەو بۆ ماڵی ئێمە، رێککەوت یەك دوو جار (شێرزاد) م دەبینی قسەی لەگەڵ دەکرد و بە تەنها لەگەڵی دەوەستا، لە هەلوومەرجی ئەو کاتەی کەرکوك و گەرەکی شۆریجە و ئازادیدا، بەکارێکی ئاسایی نەهاتە بەرچاوم، رۆژێك شێرزادم بانگ کرد و پێم وت.. کە شتێکی لەو جۆرەم تێبینی کردوەو پێم ناخۆشە، دەستی کردە قاقای پێکەنین و وتی : بۆ تۆ نازانیت گەلاوێژ ئامۆزامەو لەوەش زیاتر، دەزانی زۆر نابات دەبینە هاوسەری یەکتری و ئەو هەواڵەم زۆر لا خۆش بوو بەتەواوی ترسم رەوییەوە، ئیتر لە ساڵانی دواتردا بوونە نمونەی دوو تێکۆشەر لە هاوسەرە بە ئەمەکەکانی (کۆمەڵە) و شێرزاد گیانی خۆی بە کۆمەڵە و رزگاری و ئازادی گەلەکەمان بەخشی.

وردە وردەو تا دەهات زیاتر لە تەواو بوونی چوار ساڵی ماوەی جێبەجێکردنی رێککەوتنی ئازار و یاسای ئۆتۆنۆمی نزیك دەبووینەوەو (بەعس)هیچی دیار نەبوو بەمەش رووی راستەقینەی رژێم دەرکەوت و هەقیقەتی بروای بەعس بە ماڤ چارەی خۆ نووسینی کورد بە تەواوی کەوتە روو، کە سروشتی چینایەتی ئەم حیزبە و ئایدیا شۆڤینیەکەی هی ئەوە نییە مافی گەلانی بن دەست بسەلمێنێت، ئیتر بە بیانووی جۆراوجۆر رۆژ بەرۆژ گرفت لەسەر تەفسیری برگە گرنگەکانی ئەو یاسایە پەیدا دەبوو بەعسیەکان و شۆڤێنیە عەرەبەکان، بۆ لە قاڵبدانی کورد و دەست کەوت و مافی ئۆتۆنۆمی، کە بە زۆریان دەزانی بۆ کورد و چاویان بەرایی نەدەدا دانی پیا بنێن، کەوتنە پلان گێران، پاش گفتووگۆو هاتووچۆیەکی زۆر، پەشیمان بوونەوەی رژێمی بەعس، لە بەڵێنەکانی رێککەوتنی ئازاری ١٩٧٠، هیچ بواری بە چارەسەری عادیلانەی کێشەی کورد نەدا و بەمەش گێچەڵ کردن بە کوردستان بە قسە و بە کردەوە دەستی پێ کردو ئاگری شەرێکی تر لە کوردستان هەڵگیرسا، خەڵکی کوردستانیش لە دژی سیاسەتەکانی بەعس و بۆ پشتگیری شۆرش بە هەزاران کەس روویان کردە شاخ و بەرەو رووی سیاسەتی شۆفینیانەی بەعس بوونەوە، کۆمەڵە لە ئاستی ئەو هەلومەرجەدا نەیتوانی بێدەنگ بێت وتەنها هەر تەماشا بکات، بۆیە بریاری دا لە تەك رۆڵەکانی گەلەکەی بۆ بەدەست هێنانی ماف و داخوازییەکان سەنگەر بگرێت بۆ ئەمەش بە بریاری (ناوەندی کۆمەڵە)، زۆربەی سەرکردەو کادرەکانی کەرکوك، وەك باقی شارەکان روویان کردە چیاکانی کوردستان و بونە پێشمەرگەی جوڵانەوەی رزگاری نیشتیمانی و لە شاخەوە سەرکردایەتی رێکخستنەکانیان لە سەرجەم شارو شارۆچکەکانی کوردستان، لە سلێمانی و هەولێر و دهۆك و خانەقین و گەرمیان دەکرد، بەڵام دوای شکستی گەورەی جوڵانەوەی چەکدارانەی کوردستان لە ئازاری ١٩٧٥ و تەقەلاکانی سەرلەنوێی رێکخستنەوەی ریزەکانی کۆمەڵە، لەهەموو شارەکاندا و پاش ئەوەی سەرکردەکانی کۆمەڵە کەوتنە زیندانی بەعسەوە، شەهیدان (ئازاد هەورامی، عەبدولرەزاق و ئەبو شەهاب و حەمیدە سور) بە هاندان و یارمەتی کۆمیتەی هەرێمەکان سەرکردایەتی ئەوسای کۆمەڵە . توانیان جارێکی تر رێکخستنەکانی کەرکوك لە پەشۆکاوی دەرباز بکەن و سەرلەنوێ رێکی بخەنەوە، بەمەش رێکخستنەکانی کەرکوك تا ساڵی ١٩٨١ بە باشی بەردەوام و پارێزراو بوو، دواتریش کە ئێمە کەوتینە زیندان و ژێر زەبری ئەشکەنجە دانەوەو منیش لێپرسراوی راستەوخۆی کەرکوك بووم، ئەوا سەرباری شاڵاوی گرتن و دەست وەشاندنی رژێم و بە درێژاییی هەموو ساڵانی زیندانی ئێمە، رێکخستنەکانی کەرکوك و هاورێکانمان هیچ جۆرە زیانێکیان بەرنەکەوت و لە زەبری دوژمن بەدوور بوون، ئەم بەرخودان و تۆکمەیەش تا ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨١ مایەوەو لە هەموو شارەکانی تری کوردستان سەلامەت تر و لە زەبری دوژمن بەدورتر

بوون، ئیتر بەو جۆرە ڕێکخستنەکان درێژەیان بە خەبات و تێکۆشان دا، تا دەورێکی تری (کۆمیتەی ئاگر) ی کەرکوك، کە لە ساڵی ١٩٧٩ . ١٩٨٠ لەلایەن سەرکردایەتی (کۆمەڵە) وەو بە سەرپەرشتی راستەوخۆی کاك (نەوشیروان مستەفا) و هەریەکە لە شەهید (فاتیح و مامۆستا کاکە رەش)، یەك لەدوای یەك بۆ ماوەیەك سەرپەرشتی چالاکیەکانی کۆمەڵەیان لە کەرکوك دەکرد، مامۆستا (کاکەرەش) لەتەك کۆمیتەی ئاگردا وەك تاکتیکێکی ڕێکخستن کۆمیتەیەکی نهێنی تری بە ناوی شەهید (ئەنوەر زۆراب) دروست کرد، ئیتر لەو دەمەشدا ڕێکخستنەکانی کەرکوك زیاتر روویان کردە گەشانەوەو پەرەسەندن هەرچەندە چەندین تێکۆشەری ئەو شارە لەوانە شەهیدان (دارا و مەلا محێدین) و دەستەیەك تێکۆشەری تر لە سێدارە دران، ئەوانیش لەو کادرانە بوون کە لەو دەمەدا پەروەردە کران و پێگەیشتن و بوون بە ئەندامی (کۆمیتەی ئاگر).

ساڵی ١٩٨١ لە خڕی نێو زەنگی بناری مامەندا، ئەندامی (ناوەندی کۆمەڵەی رەنجدەران) بووم، شەهید (عەبدولرەزاق) لەسەر وەزعی کۆمیتەی ئاگر، هەواڵی دامێ کە لە ڕۆژی ١٧ ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨١ دا، زەبرێکی گەورە بەر ڕێکخستنەکانی کەرکوك کەوتوەو لەو کارەساتەدا (مەلا محێدین و دارا و نەبەز) و دەستەیەك لە تێکۆشەرانی تری کەرکوك بە ناوەکانی (حەسەن، عەبدولقادر، جەبار، رەشاد، فەهمی، ئەسعەد، فاروق) دەستگیر کران و دواتر لە سێدارە دران و گیانی خۆیان بەخشیوە بە رزگاری و دادی کۆمەڵایەتی و (کۆمەڵە) ئیتر پاش ئەو زەبرە کوشندەیە (ناوەندی کۆمەڵە) بەسەرپەرشتی کاك نەوشیروان و هاوکاری شەهید عەبدولرەزاق و ڕێکخستنی شارەکان، هەوڵێکی زۆریان دا بۆ سارێژکردنی برینەکانی کەرکوك، بۆ ئەمەش (مامۆستا قادری مەلا عومەر) چاکی مەردانەی لێکرد بەلاداو بە هاوکاری شەهید (شێرزاد جەباری) سەرلەنوێ ڕێکخستنەکانی کەرکوکیان خستەوە سەر شارێی گەشەکرد، تا لە ڕۆژی ١٠ ی ٩ ی ١٩٨٦ لەگەڵ چەند تێکۆشەرێکی تر کە یەکێکیان (رەئوف عەبدولرەزاق) بوو دەستگیر کران و لە ٦/١٧ی ساڵی ١٩٨٧، لە سێدارە دران و گیانی خۆیان بە کورد و کوردستان و ئامانجە پیرۆزەکانی بەخشی.

لەسەرەتاکانەوە تێکۆشەرەکانی کەرکوك، شەهیدان (ئازاد هەورامی و ئەنوەر حەسەن و شوان و ئەحمەد عەسکەری و نەجمەدینی فەقێ عەبدوڵڵا) توانیبویان زۆربەی ڕێکخستنەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، لەکەرکوك بەلای (کۆمەڵە) دا رابکێشن و ڕۆڵێکی ئێجگار گرنگ و کاریگەریان لە گەشەکردنی کۆمەڵەدا نواند، شایەنی باسە (ئازاد هەورامی و عەبدولرەزاق، سێ گرتکانی و فەیسەڵ تاڵەبانی . شەهید سیروان . ئەنوەر حەسەن) سەلماندیان کە سەرکردەی زیرەك و تێکۆشەری بە کارو ئازاو قارەمانی کۆمەڵەو گەلەکەمانن، هاوکات کۆمەڵە هەر لە شاری کەرکوك چەندین تێکۆشەری تری پێگەیاند، کە کوری ڕۆژی تەنگانەو پیاوی ئازا و بەجەرگی نەبەردیەکان بوون و کادر و فەرماندە و پێشمەرگەی قارەمانی شۆڕشی گەلەکەمان بوون، لەوانە (حەمیدە سوری گومرك و شەهیدان بێستون و نەجمەدین و مەلا ئەحمەد و مارف) و دەیان تێکۆشەری تر، کە لە سەنگەری بەرگری و پێشەوەی پێشمەرگایەتیدا، بە شێوەیەکی وا قارەمانانە شەهید بوون، کە هەتا دنیا بمێنێ لە لاپەرەی سەروەراندا ناویان بە نەمری دەمێنێتەوە، هەندێکی تریش لە هاورێیانی کۆمەڵە وەك (قادری مەلا عومەر و شێرزاد جەباری و مەلا محێدین و دارا) و هاورێکانیان لە خەباتی ژێر زەمینی و لە سەختترین ژێرزەمینی و لە سەختترین هەلومەرجی دژواردا، سەرکردایەتی چالاکیەکانی ڕێکخستنیان دەرکرد و زۆر ئازایانە لە هۆڵە تاریك و نسرمەکانی سێدارەدا، بەسەر دوژمناندا شێر ئاسا دەیاننرکاند و بە دەم هاواری (کەم بژی و کەڵ بژی)، رووەو پەتی سێدارە، گیانی پیرۆزیان بە گەل و نیشتیمان و بە کاروانی روو لە ئاسۆی رزگاری و یەکسانی و کۆمەڵایەتی بەخشی و بەمەش سەروەرییەکی گەوریان بۆ خۆیان و بۆ رێبازەکەیان تۆمارکرد، ڕێکخستنەکانی کەرکوك لاوی زۆر بە هیمەت و زیرەك و ئازا و قارەمانی گرتبوە خۆی، زۆربەیان رۆڵەی نەبەز و زەحمەت کێشی گەلەکەمان بوون و لە سەردەمە جیا جیاکانی تەمەنی کۆمیتەی ئاگردا تێن و تەوژمێکی گەورەیان بە فراوان بوون و گەشەکردنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بەخشی، لەوانە شێرە ژنی وەك (گەلاوێژ جەباری) لاوی چاپوکی وەك (مامۆستا هۆشمەند هەورامی، ئەحمەد عەسکەری و مامۆستا ئەمین و شێرکۆ نەجمەدین و عەبدوڵڵا و ناسیح) یان تیا بوو کە نمونەی خەڵکی ئازاو چاونەترس و تێکۆشەر بوون.

هەریەکە لەو سەرکردە و فەرماندەوکادرو پێشمەرگە و تێکۆشەرانە لە ڕۆژگاری خۆیدا نمونەی مرۆڤی ئازا و جوامێر و خۆراگر بوون و ڕۆڵی گەورەو کاریگەریان لە بالاکردنی تەلاری ڕێکخراوەیی کۆمەڵەدا هەبوو، ئەمانەو چەندین تێکۆشەری دی پێکەوە لەگەڵ باقی تێکۆشەرەکانی تری کۆمەڵە، لە شارەکانی تری کوردستان، توانیان جومگەیەکی بەهێز و هۆیەکی گرنگ و کاریگەر بن، لە رەوتی رووداوەکانی کوردستان و لە گۆڕینی نەخشەی سیاسی جوڵانەوەی رزگاری و دیموکراسی خەڵکی کوردستاندا، ئیتر لەو ڕۆژگارەدا و لە ساڵی ١٩٧٠ بە دواوەو واتا لە ٤٥ ساڵ لەمەوبەرەوە، هاتنە مەیدانی چەندین کەس لە کورو کچی لاوی کورد بۆ مەیدانی سەختی خەبات، کارێکی هەروا سادەو ئاسان نەبوو، بگرە گەر تینی بیروباوەڕوو بوونی مەسەلەیەکی رەواو پیرۆز نەبوایە، کەلەو هەلەمەرجە دژوارو سەختەدا هەموویانی بە عەشقەوە لە دەوری (کۆمەڵە) و بۆ رووبەرووبونەوەی مەرگ کۆکاتەوەو فێریان بکات پێویستە مرۆڤ لە پێناوی مەسەلەی رەوای گەلەکەیدا، وەك کەڵ بژین ئەگەر چی کەمیش بژین و هەموو تەمەنی لاوی خۆیان و ژیانیان بکەنە قوربانی بەدەست هێنانی ئامانجەکانی گەلەکەیان، کێ دەیتوانی شان بداتە بەر کارێکی واسەخت و مێژوویی، ئەوە کۆمەڵە بوو، توانی هەموو ئەوانەو دەیان هەزار تێکۆشەری تری کوردستان لە سەنگەرە جیا جیاکانی خەباتدا کۆبکاتەوە گیانبازیان پێ بکات، ئەوە (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) بوو، توانی پاش نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ ی گەلەکەمان، کاروانی سەرکەوتوی (یەکێتی

نیشتیمانی كوردستان)، بخاتە ڕێ و بالاّ بە شۆڕشی نوێی گەلەكەمان بكات.
لە ڕێرەوی شۆڕشگێڕانەی چالاكیەكانی هێزەكانی پێشمەرگە لە ناوچە جیاجیاكانی كەركوكدا، ئەو ڕاستییە خۆی سەلماند كە هەرێم و كەرت و تیپەكانی هێزی پێشمەرگەو كادرە سیاسییەكانیشی چەند چالاك و بەكارو كاریگەر بون و چەندە فەرماندەی لێهاتوو پێشمەرگەی ئازا و قارەمان بوون و چۆن ناوچەكانی (دەشتی كەركوك و شوان و قەلاّ سێوكەو خالخالاّن و دەم زێ و باسەرەو سەنگاو و زەنگەنەو بناری كفری)، لە دوژمن كرا بە ئاگر، چۆن لە سێبەری ڕزگاریشدا ڕەنگدانەوەی گیان و هیمەتی ئەو تێكۆشەرانە و دلسۆزی و ژیری و هۆشیاری هاوڕێكانی ئەمڕۆیان كەركوكیان لە هەلبژاردنەكاندا كردووەتە نموونە.
منیش لەم دەڤەرەی كەركوك و لەو (كۆمیتەی ئاگر) دا، شەرەفی هاوڕێیەتی ئەو هەموو تێكۆشەرە قارەمانەو پێشمەرگەكانیانم پێ براو هەر لەوێدا و بۆیەكەمجار ئەركی دانانی بەردی بناغەی ڕێكخستنەكانی كۆمەلّەم لە كەركوكدا بەركەوت و هەر لەوێش زۆربەی ساتەكانی خەباتی شۆڕشگێڕانەم لەگەلّ (شەهید شەهاب) و دەستە هەرە هەلّكەوتۆكانی كۆمەلّە و یەكێتی و گەلەكەمان پێ برا ئێستاش هەقی خۆیەتی ئەو ڕاستیە بلێم، كە ئەگەر ئەو تێكۆشەرە گەورانە نەبوونایە و گەر ورەی شۆڕشگێڕانەی خەلّكی كەركوكمان لەگەلّ نەبوایە، نە من و نە هیچ سەركردەیەكی تر نەیدەتوانی ببێتە شەریكی ئەو سەركەوتنانەی كوردستان و ببێتە بەشێ لەو هەموو بیرەوەریە پڕ لە شانازیانەی، كە ئێستا باسیان دەكەین.

*** تیرۆ و ڕاوەدوونانی ئەندامانی حیزبی شیوعی لە کەرکوك:-**

حیزبی شیوعی یەکێکە لەو حیزبانەی عێراق کە مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە و لەسەر ئاستی عێراق، حیزبێکی گەورەی گۆڕەپانی سیاسی عێراق بوو کە هەر لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوو چالاکی و بزاڤی سیاسی خۆی هەبووە و تاکو ئێستاکە جێگە و پێگەی هەبووە و هەیە و کەرکوکیش یەکێکە لەو شارانەی پێگەی خۆی هەبووە لەسەر ئاستی سیاسی و ڕێکخراوەیی و چالاکی لەنێو هەموو چین و توێژەکاندا بووە.

ئەم حیزبە لەسەرەتادا چالاکی خۆی لە ڕێگای حیزبی شیوعی سوریاو لوبنانەوە دەستی پێکردووە و لە عێراق بنەماو بنەرەتی ئەم حیزبە نشونمای کردووە کە چاپکراو و کتێب و ڕۆژنامەکانی خۆیان ڕەوانەی عێراق دەکرد.

لەسەرەتادا چالاکی ئەم حیزبە لەناو چین و توێژە ڕۆشنبیرەکان گەشەی کرد و لەدواییدا پەلی هاویشتە هەموو چین و توێژەکانی تر و چالاکی سیاسی و ڕۆشنبیری جۆراوجۆریان دەست پێکرد، کە گەلێك ڕێکخراو و چالاکی پیشەیی جۆربەجۆریان گەشەی کرد لەسەر هەموو ئاستی عێراق، کە لە هەندێك کاتدا چالاکی و خۆپیشاندانەکانیان کاریگەری هۆی هەبوو بۆ جێبەجێکردنی داواکاری کرێکار و چینە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگەی عێراق، کە بەشێك لەو خواستانەیان هاتووەتە باری چارەسەر و ئارامکردنەوەی بارودۆخەکە، بەڵام هەر لە بیستەکانی ڕابردوو، دوورروونزیك چالاکی حیزبی شیوعی برەوی خۆی سەندوو بە گەلێك ئاستەنگ و سەرکەوتنیدا نووچدانی بەخۆیەوە بینی، لە گەلێك قۆناغدا ڕۆڵێکی کاریگەری سیاسی بەرچاوی خۆی خستە ڕوو، کە دوورروونزیك بەشێوەیەکی نهێنی و بەرچاو لەسەردەمی پاشایەتیدا گەشەی کرد و لەسەر ئاستی ڕێکخراوەیی و پیشەیی نێو هەموو چین و توێژەکاندا.

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە لە سەردەمی پاشایەتیدا تووشی هیچ ئاستەنگێك نەبووبێت، بۆیە لە سەردەمە جیاوازەکانی پێش ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتی، ئەم حیزبە تووشی گەلێك ئاستەنگ و ڕاوەدوونان بووە، کە دوورروونزیك کاریگەریان لەسەر ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی هەبوو لەسەر ئاستە جیاوازەکاندا.

لێکۆڵینەوە و سەرچاوەکانی پۆلیس و دەزگا ئەمنییەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە لەگەڵ ئەندامانی حیزبی شیوعیدا کراوە، بەتایبەتی لە بەغدا و موسڵ و کەرکوك بەشێوەیەکی بەرچاو هەندێکیان دانیان بە چالاکی و ڕێکخستنەکانیان ناوە و بەشێکیان حوکم و سزای پێویست دراون کە هۆکارەکانیش خۆی دەبینێتەوە لەم خاڵانە:-

١- نا تەبایی نێو حیزبی شیوعی لەم ماوەیەدا و برەودانی جۆرەها لق و باڵ و تەکەتوولی جۆراوجۆر، کاریگەری هەبووە لەسەر ئاشکراکردنی بەشێکی زۆری چالاکییەکانیان.

٢- لە هەندێك باردا نە گونجاندنی چالاکی ڕێکخراوەکانی حیزبی شیوعی لەنێو کۆمەڵگە، سەرهەڵدانی چەندان کاری نابەجێ کە لەگەڵ دابونەریتی ئەو سەردەمەدا نەگونجا، کە لەگەڵ دەزگا ئەمنییەکانی عێراق بەرەو ڕووەدەبوونەوە.

٣- زۆری گۆڕینی وەزارەتەکانی حکومەت ڕۆڵی هەبوو لە هەرەس و ڕاوەدوونانی حیزبی شیوعی لەسەردەمی پاشایەتیدا، کە هەریەکەی بیر و باوەڕی جۆراجۆری هەبوو بە تایبەتی لە کودەتای ڕەشید عالی گەیلانی لە ساڵی ١٩٤١.

٤- سەرهەڵدانی حیزب و ڕێکخراوی تر کە بەشێکیان لە هەوڵی ئەوەدا بوونە کە جێ پەنجەیان لەسەر گۆڕەپانی سیاسی عێراقدا بچە سپێنن و چالاکی خۆیان گەشە پێبکەن، بەتایبەتی حیزبی ئیسلامی عێراق (ئیخوان موسلمین) کە لە سەردەمی پاشایەتی چالاکییەکی بەرچاویان هەبوو کە دژ بە بیر و باوەڕو کاری ڕێکخراوەیی حیزبی شیوعی بوون، بەڵام لەپای هەموو ئەو ئاستەنگاندا حیزبی شیوعی لەو ماوەیەدا گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی کە توانی پەل بە هەموو شوێنەکانی عێراقدا بنێت و پەلوپۆ بهاوێت و ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕێکخراوی جۆراوجۆری خۆی هەبێت، بەتایبەتی لایەنی ڕاگەیاندنییان ڕۆڵیان بینی لەسەرکەوتنی چالاکییەکانیان.

کەرکوك یەکێك بوو لەو شارانەی کە حیزبی شیوعی برەوی خۆی هەبوو کە بەرەو ڕووبووە لەگەڵ نەتەوە پەرستانی کورد و تورکمان و جێگەی بەربەرەکانی و ململانێ بوونە.

*** ڕاوەدوونان و کوشتنی سیاسی شیوعییەکان لە سەردەمی کۆماریدا (١٩٥٨-١٩٦٨):-**

لە ماوەی سەردەمی کۆماری، کۆمەڵێك تیرۆری گەورە بۆ ژمارەیەك لە لایەنگرانی حیزبی شیوعی ڕوویدا، لەپای بەربەرەکانی شیوعی و نەتەوەپەرستانی عەرەب بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی عێراق، ئەم تیرۆرکردن و کوشتارانە بوو بەهۆی لەناوچوونی دیالۆگی سیاسی لەنێوان لایەنەکان کە لەجیاتی ئەوەی زمانی دیالۆك بەکاربهێنن، بوو بەهۆی ڕوودانی پشێوی و نەبوونی یاسا لە وڵاتدا.

تیرۆرکردنی شیوعییەکان لە عێراق، هەر لە خۆڕا ڕووی نەداوە، بەڵکو لەپای ڕووداوی مێژوویی (بزووتنەوەی شەواف) ڕوویدا، کە بوو بەهۆی خوێن ڕشتنی ئەندامانی هەردوولا.

بزووتنەوەی شەواف لەعێراق ڕوویدا بەتایبەتی لە شاری موسڵ و کەرکوك دژی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم بەسەرۆکایەتی عەبدولوەهاب شەواف لە ئاداری ساڵی ١٩٥٩ لەدوای ئەوەی عەبدولکەریم قاسم توانی بە لایەنگری شیوعییەکان، دەسەڵاتی خۆی بەسەر عێراقدا بسەپێنێت و هەموو دەسەڵاتە گرنگەکانی وەکو سەرۆکایەتی وەزیران، وەزیری بەرگری سەرۆکی گشتی هێزە چەکدارەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتییەوە، کەوتە بەربەرەکانی لەگەڵ نەتەوەیی و ئەوانەی دژی دەسەڵاتی بوون، بۆیە ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرەکانی لە بەندیخانە توند کرد، بەڵام بەرەبەرەکانی بەهێز لەنێوان عەبدولکەریم و نەتەوەییەکان ڕوویدا لەکاتی گرتنی عەبدولسەلام عارف لە ٤ی تشرینی دووەمی ١٩٥٨ و لە ٥ی شوباتی ١٩٥٩ دادگاییکردنی و بڕیاری لە سێدارەدانی

و دەرکردنی لە سوپا، هەرچەندە بڕیارەکە جێبەجێ نەکرا، کە بوو بەهۆی ئەوەی نەتەوەییەکان هەستن بە بەربەرەکانی و بەکارهێنانی هێزی چەکداری دژی عەبدولکەریم قاسم یان بەشێکیان هەستان بە کشانەوەیان لە حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم، هەر بۆیە لە ٦ی شوباتی ١٩٥٩ ئەم وەزیرە نەتەوەییانەی (القومیون) حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم دەست لە کارکێشانەوەی خۆیان ڕاگەیاند:-

١- محەمەد سدیق شەنشەل
٢- فوئاد ئەلرەکابی
٣- جابر عومەر
٤- ناجی تالیب
٥- محەمەد سالح مەحموود (تورکمانی سەربەخۆ).
٦- بابا عەلی شێخ مەحموود (کوردی سەربەخۆ).
٧- عەمید نازم تەبەقچەلی (ئامری تیپی سێی کەرکوك).
٨- رائید مەحموود عەزیز (جێگری ئامری تیپی دووی کەرکوك).
٩- موقەدەم عەزیز ئەحمەد شەهاب (جێگری ئامری تیپی دووی کەرکوك).
١٠- عەقید رەفعەت حاجی سری (سەرۆکی ئیستیخباراتی سەربازی).
١١- رائید عەبدولجەواد حەمید (ئامر سرییەی لیوای دووی پێنجی موسڵ.
١٢- عەقید ڕوکن عەبدولوەهاب شەواف (ئامر لیوای پێنجی موسڵ).

هەر بۆیە بزووتنەوەی شەواف لە موسڵ بوو بە ڕەنگدانەوەی کوشتارێکی گەورە لەنێوان نەتەوەیی و شیوعییەکان و خەڵکێکی زۆر لەو نێوەندەدا کوژران و بێ سەر و شوێن بوون بەشێکیان ڕاپێچی دادگا کران.

* تیرۆر و ڕاوەدوونانی شیوعییەکانی کەرکوك لە ساڵی (١٩٦٠-١٩٦٣):-

لە سەرتاپای عێراقدا کۆمەڵێك تیرۆرو ڕوودانی کوشتنی ئەندامانی شیوعی دەستی پێکرد کە گەلێك نموونەی جۆراوجۆریان هەبووە لەوانە:-

١- یرفاندا کیراکوسیان
لە هاوینی ١٩٦٠ بەدەستدرێژی گولە شەهید کرا.
٢- نۆجین شەمعون کاوا
لە ٢٠ی ئابی ١٩٦٠ لەبەردەمماڵەکەی خۆی تیرۆرکرا
٣- قاسم خەلیل مەردان
لە ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکوك تیرۆر کرا
٤- قاسم قەساب تورکمانی
لە ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکوك تیرۆر کرا
٥- کەریم ڕەشید حەمە ئەربیلی، لە ٣ی ئایار ١٩٦٢ لە نزیك قاوەخانەی ئەحمەد ئاغا تیرۆر کرا
٦- سەرلەبەیانی ٢٣ی مایسی ساڵی ١٩٦٣ حکومەتی ئەو کاتەی عێراق هەستا بە لەسێدارەدانی پۆلێك لە نیشتمان پەروەرانی کورد کە بە دووروونزیك دەوریان نەبوو لە تاوانی ١٤ی تەممووزی ساڵی ١٩٥٩.

هەر بۆیە لایەنەکانی وەکو حەرەس قەومی هەر لە ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣وە کەوتنە ڕاوەدوونان و تیرۆری ئەندامە باڵاکانی حیزبی شیوعی لە هەموو ناوچەکانی عێراقدا. هەر لەم پێودانگەدا لە ١٩ی شوباتی هەمان ساڵ گەورەترین مۆڵگەی ئەندامەکانی حیزبی شیوعیان دۆزییەوە، دەست بەسەر کران یان کوژران.

هەر لەو چوارچێوەیەدا، لەسێدارەدانی ئەندامە شیوعییەکانی کەرکوك هەنگاوێکی تر بوو توانای خۆیان خستە ڕووکە باڵا دەستی هەموو عێراقن، لەلایەکی تریش بوو بە ڕازیکردنی تورکمان بۆ پشتگیرییکردنیان کە شەهیدەکان بریتی بوون لە:-

مارف بەرزنجی، عەبدولجەبار محەمەد پیرۆز، حوسێن بەرزنجی، عەبدولحافز عەزیز حاجی شەریف، مەحموود عەلی بەستێ، سەید نوری سەید وەلی، ئیحسان حوسێن، تالیب عومەر، نەجمەدین نادر شوان، نوری عەبدوڵڵا، فەتاح سالح زەنگەنە، عەتا جەمیل، محەمەد حوسێن، کەریم ڕەمەزان، فاتح داود جەباری، موختار بەرغەش، مەهدی مەردان، خەلیل ئیبراهیم عومەر، تۆفیق مستەفا، حوسێن مستەفا، عەبدولرەحمان سەعید مەحموود، خورشید مەحموود، خورشید مەجید.

لە دوای لەسێدارەدانی ئەو نیشتمان پەروەرانە، کەوتنە گیانی ژمارەیەکی زۆری کەسایەتییەکانی کەرکوك بە ناوی حیزبی شوعییەوە بەشێکی زۆریان ئاوارەی دەرەوەی کەرکوك و عێراق بوون وەکو د. ئەحمەد عوسمان، د. موزەفەر حەساری، کە تورکمانەکانی کەرکوك دەوریان هەبوو لە ڕاوەدوونان و دەربەدەرکردنیان.

*** ڕاوەدوونان و تیرۆرکردنی شیوعییەکان لەنێوان ساڵانی (١٩٦٨-١٩٧٩):-**

دوای ئەوەی بەعسییەکان لە ١٧ی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨ هاتنە سەر دەسەڵات سەردەمێکی نوێ دەستی پێکرد، ئەویش بە تیرۆرکردنێکی فراوان دژی شیوعییەکان بە سەرۆکایەتی سەدام حوسێن لەگەڵ کۆمەڵێک لە یەکەی پاراستن بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی.

بۆیە هەر یەکە لە ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حوسێن ڕێکەوتبوون بۆ دوورخستنەوەی هەر کەسێك بەهێز لە دەسەڵات، یان بییەوێت بەشە شەریکی بێت لە دەسەڵاتا، لە زۆری کارەکاندا بە کوشتن کۆتایی دەهات.

هەر لە سەرەتاوە گەلێك توندوتیژیان بەکارهێنا دژی دەسەڵاتە سیاسییەکان بەتایبەتی شیوعییەکان، هەر ئەمەش وایکرد کە گەلێك دەنگی نارەزایی و خۆپیشاندان لەلایەن شیوعییەکانەوە لە گەلێك لە شارەکانی عێراق دەستی پێکردبوو

لەدوای بەیاننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ لەنێوان بەعس و کورد ئەمە بوو بە هەنگاوێکی گەورە بۆ ئەوەی زیاتر ڕێگایان بۆ خۆش بێت کە دژی شیوعییەکان چالاکی تیرۆر کوشتن جێبەجێ بکەن.

هەر بۆیە لە ١ی تەمموزی ساڵی ١٩٧٠ دا لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی عەبدولکەریم ئەحمەد داود دژی ئەو توندو و تیژییە نارەزایی دەربڕی، هەر لەپای ئەمەدا لە ٢٠ی تەمموزی ساڵی ١٩٧٠ ئەحمەد حەسەن بەکر داوای کرد کە شیوعییەکان یاری بە ئاگر نەکەن، بۆیە کۆمەڵێك کاری کوشتن و تیرۆر دژی ئەندامانی شیوعی لە خواروو و ناوەڕاست و کوردستان دەستپێکرد.

ئەندامی شیوعییەکانی کەرکوکیش دووروونزیك تووشی تیرۆر و ڕاوەدوونان و شوێن بزر کردن بوون کە بەشێکیان تاکو ئێستا چارەنووسیان نادیار بووە یان بردرانە بەغدا و لە دادگایی ژێراوژێر لەسێدارە دران.

یەکێك لە ئەندامەکانی حیزبی شیوعی (فەتحوڵڵا عیزەت ئاغا) لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، لەنێو بازار بە ڕۆژی ڕووناك و بەبەرچاوی خەڵکی گیراو سەرەونگوم کرا تاوەکو ئێستاش چارەنووسی نادیارە، کە کادیرێکی بەرچاوی حیزبی شیوعی بوو، دەوری باڵای هەبوو لە ڕێکخستنەکان و دادوەرێکی بەتوانا بوو لە پیشەکەیدا.

لە ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٨ عادل سەلیم لە ڕێگای هەولێر کەرکوك تیرۆرکرا، ئەویش لەو کاتەی لەگەڵ هاوڕێیەکی شیوعی نێردرابوو بۆ کەرکوك تا لێکۆڵینەوە لە داڕووخانی ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی بکات لە شارەکە.

بۆیە یەکێك لە ئەندامەکانی حیزبی شیوعی مەلا شوکر کە بە ناوبانگە بە (مام فەتاح) ئەو دەخاتە ڕوو کە لە ١٢ی ئەیلوول ١٩٧٨، چاوی کەوتووە بە عادل سەلیم لە بارەگای حیزبی شیوعی لە کەرکوك کە لەو کاتەدا ئەندامێکی چالاکی لیژنەی باڵای بەرە بوو، زۆر سەرقاڵبووە بە گەلێك کێشەی جۆراجۆر لەگەڵ بەعسییەکان لەدوای کۆبوونەوەکان.

بەردەوام دەبێت و دەڵێت:-

"پێم وت کە حیزبی بەعس بەشێوەیەکی ڕوون و بەرچاو هەستاون بە شەڕ دژی ئێمەو و بۆ لەناوداننماندا، چونکە لە ماوەی ئەم هەفتەیەدا (١٠٧) ئەندامی حیزبی شیوعی بە ناشرینترین ڕێگا وازیان لە حیزبەکە هێناوە، چاودێر بەدووماندا دەکەوێت، هەر ئەندامێکیش کە ڕادەکات خێزانەکەی دەستگیر دەکەن و هەموو ئەندامەکانمان بە قورسترین شێوە سزا دەدرێن تا بۆ ئەوەی واز بهێنن.

لەدوای تیرۆکردنی (عادل سەلیم) ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی حیزبی شیوعی گیران یان تیرۆر کران یان دەربەدەری کەرکوك بوون، کە لە زۆربەی گەڕەکەکانی کەرکوك بەدوایاندا دەگەڕان و لێپیچینەوە لەگەڵ کەسوکاریان دەکرا.

لەکاتی دەسەڵاتی سەدام حوسێن لەنێوان ساڵانی (١٩٧٩-٢٠٠٣) هەستا بە ژمارەیەکی زۆری تیرۆرکردنی ئەندامانی حیزبی شیوعی لە کەرکوك و عێراق و بە سڕینەوەی هەموو شوێنەوارێکی ڕێکخستنەکانیان و لەناودانی هەموو چالاکییەکانیان.

* سەرچاوە:-

- الحزب الشيوعي العراقي في عهد البكر ١٩٦٨-١٩٧٩، سەیف عەدنان ئەلقەیسی، دار الحکیم، لەندەن، ٢٠١٤.
- الشيوعية تحت ظلال الرصاص لأشهر الإغتيالات السياسية لشيوعي العراق ١٩٥٨-٢٠٠٣، فایز ئەلخەفاجی، دار القناديل، ٢٠١٨.

*** دەروازیەکی مێژوویيانە بۆ ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ی شاری کەرکوك:-**

**سمکۆ بەهرۆز محەمەد**

*** زەمینەی ڕووداوەکانی ناوچەکە لەپێش کارەساتەکەی ساڵی ١٩٥٩:-**

**یەکێك لەو خاڵە گرنگانەی کە دەورێکی باڵای هەیە لە نووسینەوەی مێژوو، ئەویش گەڵاڵەکردنی زەمینەی شوێنی ڕووداوەکە لەڕووی هەمەلایەنەوە، وەکو باری مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری، چونکە بەئاسان گەیاندنە بۆ باری ڕاستی نووسینەکە ئەوەی لێرەدا بەپێویستی دەزانم هەوڵدانە بۆ شیکردنەوەی چمکی هەموو لایەنەکانە لەپێش ڕووداوەکەدا، هۆکارەکانی ئەو دەرئەنجامانە بۆ پوختەکردن و دەرپەڕاندنی ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩، لەمەو دواوە هەوڵدەدەم بکەومە شیکردنەوەی ئەو زەمینە دروست بووەی کە بووە هۆکاری ئەوەی وای کرد بتوانێت ببێتە تەقینەوەی ڕووداوەکە. گەورەترین کاریگەرییەکی بەرچاو لەمێژووی عێراق و کوردستاندا، ماوەی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی عوسمانییە، کە ناوچەی کەرکوك شوێنێکی بەرچاوی ئەو ماوەیەی عوسمانییەکانە...**

**ئەو ماوە دوورو درێژەی لەعێراقدا بەسەریان برد گەلێك دەرئەنجام و هۆکاری دروست کرد، کە لەگەڵ خۆیدا بووە هۆی بەجێهێشتنی گەلێك پاشماوەو ئەنجامی مێژوویی گرنگ ... گرنگ، کە تاکو ئێستاکە پێوەی دەناڵێنین.**

**دەتوانین عوسمانیەکان وەکو هێزێکی گەورە سەیر بکەین لەناوچەکەدا، کە گەلێك جار بووەتە هۆی گۆڕینی تەرازووی ڕووداوەکان لەگەڵ ململانێی دەوڵەتەکانی ناوچەکەدا، هەر لەبەر ئەمەیە کاریگەری خۆی دروست کردووەو جێ پەنجەی بەگەلێك شوێندا دیار دەدات... عوسمانیەکانیش وەکو هەر دەوڵەتێکی تر خاوەن تایبەتمەندی سیاسی خۆیانن و گەلێك ڕێگەو ڕێکخستنیان هەبووە بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەتەکەیان. هەر لەم ڕوانگەیەوە کاتێك سەیری ماوەی عوسمانییەکان بکەین دەبێت هەوڵی ئەوە بدەین بکەوینە بەراوردی ئەو پاشماوانەی کە بەجێماوە لەو کاتەداو کاریگەری ئەو کارانە بەسەر ئەمڕۆوە.**

**عوسمانیەکان هەوڵیان دەدا بۆ چنینەوەی تەرازوی سیاسییان لەگەڵ سەفەوییەکان، هەموو دەم کاریان دەکرد بۆ دروست کردنی سیاسەتێك کە لەناوەوەو دەرەوەی ئیمپراتۆریەتەکە هاوسەنگ بکەن و بتوانن پارچەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەباری ئەوەدا ڕابگرن کە بتوانێت بەرەنگاری هۆکارە دەرەکییەکان، کاریگەرە سیاسییەکەیان هەردەم لەگەڵ کاروباری بەڕێوەبەرییەکەیان لەگۆڕاندا بوو. ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بکەین لەو ماوەیەدا ئەوەیە کەوتبووە بەر کاریگەری ئەو سیاستەو لەپارچەکانی تر زیاتر کاریگەری خۆی بەجێهێشتبوو، کە ئەویش چەند هۆکارێك دەوریان دەبینی...**

**١- کەرکوك یەکێك بووە لەو ناوچە گرنگانەی دەوڵەتی عوسمانی هەردەم حیسابی وردی بۆ کراوە، تا بتوانن هەوڵبدەن کە لەگەڵ حیسابەکان دەربچێت و ببێتە ئەوەی کە بیر لەستراتیژی سیاسەتەکەیان بکەنەوە، ناوچەکە یەکێك بووە لەو هێڵە خەیاڵییەی کە دروستی کرد لەبەربەرەکانی لەنێوان عوسمانی و سەفەویی لەلایەك و لەنێوان نەتەوەکانی وەکو کوردو عەرەب لەلایەکی تر بۆ سازدانی ئاژاوە نانەوە. ئەگەر بەچاوێکی ورد سەیری هێڵەکە بکەین دەتوانین زیرەکی سیاسەتەکەیان و چنینەوەی ئەنجامەکەیان بۆ کپ کردنی هەر چالاکییەکی نەتەوەیی کە سەر هەڵبدات.**

**((هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەم پێکهاتە جوگرافیاییە کۆنە، ستراتیژێکی گرنگی لە عێراق پێکهێناوەو بووەتە جێگەی بایەخ و سەرنجی زۆرینەی لێکۆڵەرەوەو مێژوو نوسان و ئەو گەڕۆکانەی کە سەریان لەعێراق داوە لەماوە جیاوازەکاندا، سەرنج و بۆچوونیان هەبووە لەسەر چۆنێتی ئەو شوێنە ستراتیژیە جوگرافییەی کە دەوری هەبووە لەپێکهاتەی دەوڵەتی عێراقدا...))**

**عوسمانییەکان هەموو هەوڵێکیان ئەوەبوو کە بتوانن بکەونە دروست کردن و ئامادەکردنی هێز لەو هێڵەدا ئینجا یان لەبارێکی سەربازی یان کۆمەڵایەتییەوە، بۆیە بەئەنجام بچن، هەر بۆیە زیاتر پاداگرتنەکەیان لەناوچەکەدا (کەرکوك) بووەو لەهەموو شوێنەکان زیاتر حیسابی وردیان بۆی کردووە... لەچنینەوەی ئەو سیاسەتەدا، تا بەوەی لەهەموو لایەنەکانی ڕۆشنبیری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەنانەت لەتەرزی بیناکاریش، توانیویانە کە ئەوەی پێویست بووە هەوڵیان بۆی داوە، ئەو بیناکارییەیان لەچوارچێوەی پێویستی سەربازی نەچۆتە دەرەوە.**

**٢- ئەوەی کە زیاتر بایەخیان بەناوچەکە داوە هەوڵدان بووە بۆ قۆستنەوەی نەتەوەکانی نێو شارەکە لەکوردو تورکمان و ئاسووری و ئەرمەنی و نەتەوەی تر، هەر لەبەر ئەمە هەوڵی سیاسەتی (فرق التسد)یان بۆی داوە، تا بتوانن لەپاڵ ئەو سیاسەتەوە هەناسەی ئاسوودەیی هەڵمژن، کە مێژووەکەیان لەناوچەیەکی وەکو کەرکوك زۆر بەڕوونی بەدیار دەکەوێت.**

**٣- عوسمانیەکان، لەناوچەکەدا هەوڵی ئەوەیان دەدا کە بکەونە دروست کردنی چینێکی کۆمەڵایەتی کە بتوانێت بگاتە بەرزترین پلەی کۆمەڵایەتی و دەرئەنجامی کاروبارە بەڕێوەبەری و کارگێڕییەکانی پێ بەڕێوەبەرن، کە ئەو چینەش بکەنە ژێر رکێفی بیروڕایی عوسمانێتی و تورکچێتی و دەمارگیری نەتەوەیی، بۆ جێبەجێ کردنی مەرامەکانیان، کە دوور بێت لەبیرکردنەوەی ڕاستی ڕۆشنبیری نەتەوەیی وەکو یەکێکی کوێر تەنها ئەوەی کە پێی ڕادەسپێرن جێبەجێی بکات و چاو لەبەرژەوەندییە شەخسییەکانی بپۆشێت کە کاریگەری ئەم بۆچوونەیان ڕەنگی داوەتەوە لەبزوتنەوەی تۆرانچێتی لەکۆتایی دەوڵەتی عوسمانی.**

**٤- ((ڕژێمی باج گری لەدەوڵەتی عوسمانیدا بەری سەدەها ساڵانی ناتەواوی و کەم و کوڕی ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و چینایەتی بوو، ئەنجامی سەدەها ئەو فەرمانانە**

بوو کە سوڵتانەکان بۆ سوودی خۆیانو دەستو پێوەندەکانیانو کاربەدەستە چڵێسەکانی دەوروبەریان دەریان دەکردو بەئارەزووی خۆیان هێندەی تریان دەنایە سەری... ئەو رژێمە وەك لەدۆخی ناوچەکەوە هەڵقوڵابوو، وەهاش پەیوەندی بەشەریعەتی ئیسلامەوە هەبوو... لەتەك ئەم جۆرە باجانەشدا پەرەسەندنی دەردی بیرۆکراتییەت کە وەك نەخۆشییەکی بێ چارەدا بوو بەگیانو لەشی دەوڵەتی عوسمانیو گشت دەزگاکانی پەك خستبوو...))

هەر بەم پێودانگەوە ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بکەین، هەردەم جێگەی بەربەرەکانیو داسەپاندنی جۆرەها باجو باجگری دەوڵەتی عوسمانی بووەو، هەردەم کەوتبووە بەر کوتەکی سەپێندراوی جۆرەها باج کە هەمووی لەبەرژەوەندی چینی دەسەڵاتداردا بووە، وەکو باجی جووتانە، چاڵانە، مەرانە، سەرانە، کەرانە، مریشکانە، کە هەریەکە بۆ مەرامێکی دیاری کراو لەسەردەمێکی جودادا بەکارهاتووەو هەریەکەی کارتێکردنی خۆی لەشارەکەدا ((دەوڵەتی عوسمانی لەشارەکەدا سیاسەتێکی تایبەتی دابەشکردنی زەویو زاری بەسەر دامو دەستەکەیدا پەیرەو دەکرد، هەوڵی دەدا ئەوانە لەخۆی نزیك بکاتەوە کە توانای سەرکوت کردنی خەڵکەکەیان هەیەو، بەستنەوەیان لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتدا، هەروەکو لەوەدا دەبینین کە زەویو زارێکی زۆریان بەخشیبوو بە ((ئاوچی))یەکان لەکەرکوکداو دەسەڵاتیان دەرۆیی بەسەر دەزگاکانی دەوڵەتو کارووبارە کارگوزارییەکانی شارەکە، ئەوە لەدوای ئەوە بۆیان بەمیرات مابۆوە... بۆ نمونە خێزانی ئاوچییەکانیش بەپێی ئەوان زەوییەکانیان دابەشکردبوو بەسەر چەند کارمەندێکەوە بۆ بەرێوەبردنی کارووباری زەوییەکانیان، ئەمانە لەهەمان کاتدا هەڵدەستان بەجێبەجێ کردنی کارووباری زەوی لەرووی کۆکردنەوەی بەروبوومە کشتوکاڵییەکانو گەیشتنی ئەم بەروبوومانە بۆ خاوەن موڵك. بۆیە لەشارەکەدا رژێمێکی دەرەبەگایەتی زیاتر بەرێوە دەبراو چەند دایەك یان کۆمەڵە زەویو زارێکی چەند لادایەك لەلایەن ئاغایەکەوە یان چەند ئاغایەکەوە بەرێوە دەرۆیشت.

٥- یەکێك لەو هۆکارو کاریگەرانەی کە دەوری بینیو رەگی تا ماوەیەکی دوورو درێژ لەدەوڵەتی عوسمانییەوە مایەوە جووڵانەوەی تۆرانیەت بوو، دەرئەنجامێکی زۆر بەهێزی دروستکرد لە گۆرینی بۆتەی چینایەتیو کۆمەڵایەتی شارەکە.

تۆرانیەت جووڵانەوەیەکی تەسكو تروسکی نەتەوەییە، لەئاخرو ئۆخری سەدەی پێشودا نیشانەی دەرکەوت. وەکو رێبازێکی دوژمنانە بلاوبۆوە، کە تا شۆرشی ١٩٠٨ی تورکیا مەبەستی ئەوەبوو ئەو نەتەوانەی ژێر دەستی تورکیا کە تورك نەبوون بیانکات بەتورك، پاشانیش شێوەیەکی تازەی وەرگرتو بانگی ئەکرد بۆ یەکخستنەوەی ((توران))ی نیشتمان کە بەتەما بوون بەشێکی زۆری عێراقیش بگرێتەوە...

تۆرانییەت لەپێشانا وەکو جووڵانەوەیەکی تەسکی وەها دیاریدا کە رێزی لە مافی نەتەوەکانی تر نەدەگرت، هۆیەکەشی ئەمە ئەوەبوو کە لە ئیمپراتۆریەتێکا پەیدا بوو کە بەهۆی ووریاییو خەباتی گەلە ژێر دەستکراوەکانیەوە لەلایەکەوە، بەهۆی هێرشی ئەوروپاوە بۆ دابەشکردنی کەلاکی، لەلایەکی ترەوە، کەوتبووە گیانەڵا. لەبەر ئەوە کراسی دوژمنایەتی لەگەڵ نەتەوە ژێر دەسکراوەکان لەبەر کردبوو ... بەئاشکرا بانگی ئەکرد بۆ چەوسانەوەی ئەو نەتەوانەی کە تورك نین...

٦- عوسمانییەکان بایەخو سوودیان بەوە دەدا کە رێبازی ئیسلامییان لەبەرێوەبردنی کارووبارە کارگێرییەکان بەئەنجام بگەیەننو بتوانن بگەنە ئاکامی بەرچاو بۆ چنینەوەی بەپێی ئارەزووەکانیان، ئەویش بە بەکارهێنانی هێڵی لەرینەوەی ئایینو دەمارگیری ئایین، ئەگەر سەیری ئەم ناوچەیە بکەین کە جێگەی بڵاوبونەوەی ئایینی ئیسلامو مەسیحیو ئایینەکانی تر بووە، هەر لەم روانگەیەوە جێگەیەکی بەرچاوە بۆ گەشەکردنیو کنەکردن لەنێو ئایینەکاندا، تەنانەت کار گەیشتبووە ئەوەی لەنێو بۆتەی ئایینی ئیسلامەکەشدا ئایینزایی (مذهب) دەوری خۆی بینیووە لەتەرازوی سیاسەتی عوسمانیو سەفەوییەکانداو، سوود بینرا لەهاوسەنگ کردنی ئەو تەرازوە سیاسییەدا. ئەویش بە بەکارهێنانی ئایینزای شیعەو سونیدا، لەت کردنی ئەم دوولایە بەشێوەیەکی زۆر زیرەکانەو مامڵەکردن لەگەڵیان بۆ جێبەجێ کردنی خواستەکانیان نەك لەروانگەی سوودی کۆمەڵایەتی نەتەوەکانی نێو شارەکە.

هەر لەم رووەوە هەوڵیان دەدا کە ئەوەی لە هێڵە ستراتیژیەکەیان نزیك تر دەبۆوە زیاتر دەکەوتنە بەکارهێنانی ئەو لەرە ئایینییە کە ناوچەی ((داقوق))و ((دووز)) باشترین بەڵگەی ئەم راستیەن، چونکە لەبەر ئەوەی جێگەیەکی بەرچاوی نزیك بوونەوەیە لە هێڵە نەتەوەییەکەو نزیکی سنوورە لەگەڵ قەڵەمرەوی سەفەوییەکاندا.

یان هەر لەم رووە ئایینەوە، ئاینییەکانی تریان دەکردە دەسکەلای خۆیانو بەکاریان دەهێنا بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ئایینەکانی تردا، بۆ نمونە هەستابوون بە بەکارهێنانی کڵێسەکانی وەکو کڵێسە سوورەکە بۆ شوێنی ئازووقەو تەقەمەنی و کڵێسەکانی سەر قەڵا بۆ بەکارهێنانی نەخۆشخانەی سەربازی کە ئەمە لەخۆیدا بەکاربردنێك بوو بۆ بەکارهێنانی بەربەرەکانی ئایینی تا پێوەی کاریگەری خۆی بەدەست بهێنێت... بیکاتە بنکەیەکی پێوانە لەتەرازووی زۆریو کەمیو رێژەی ئایینەکان لەنێو شارەکەدا، کە راستی ئەمیش بەدەردەکەوێت لەپشت گوێ خستنی مافی برا مەسیحییەکان لەنێو شارەکەدا، لەماوەی فەرمانرەوایی عوسمانییەکاندا. هەر بۆیە لەکاتی کشانەوەیان لەشارەکە کەوتنە تەقاندنەوەی کڵێسە سوورەکەو بووە لەدەست دانی بەنرخترین پاشماوەی تەرزی بیناکاری شارەکە.

دەرئەنجامی هەموو ئەو رووداوو کارەساتو گۆرانانەی لەماوەی دەوڵەتی عوسمانیدا روویدا بووە دەرپەراندنی کۆمەڵگەیەکی دیارو بەرچاوی وا لەناوچەی کەرکوك، کە تا ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ جێ پەنجەی بەجێهێشتو بووە دروست بوونی کۆمەڵێکی هەمە لایەنەی چینایەتیو

قاودراوی نێو بووەتەی سیاسەتی عوسمانی و گەلێك خراپە کارو بەد ڕەوشتی لێ کەوتەوە کە ئاکام و ئەنجامی خراپی دروست کرد بەسەر مێژووی ناوچەکەداو کۆلەکەیەکی وای لەو سیاسەتەدا ڕۆنا (بناء) کە ئەنجامەکەی درێژەی سەردەمەکانی لەوەو دواوە بێت و زۆر بەزەحمەت لێی ڕزگار ببێت، ئەویش لەتەرازووی بەراووردەکاندا ڕەنگی دایەوەو کۆلەکەی لەبارێکی زۆر چەوت و چەواشە کردو کاریگەری زمانەوانی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بەجێهێشت کە تاکو ئەم سەردەمەی ئێستامان پاشماوەی هەر ماوە... گەورەترین کارتێکردنێك کە جێ پەنجەی بەجێهێشت، چالاکی و کنەکردنی بزوتنەوەی تۆرانچێتی بوو، کە زۆر ئەنجام و کاریگەری خراپی لێ کەوتەوە، تا ئەم سەردەمەی ئێستامان هێڵەکانی بەروونی بەدەردەکەوێت. کە ڕۆژ ... لەدوای ڕۆژ ئامانجەکانی خۆی لەنێو نەتەوەکانی شارەکەدا دەکاتەوەو بۆشایی دەخاتە دوو توێی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیانەوەو دەبێتە ئاستەنگ لەچوارچێوەی ئەو پەیوەندییانە. چونکە ئەو ماوە درێژەی عوسمانییەکان لەناوچەکەدا بووە توانەوەی نەتەوەکانی شارەکە لەنێو بووەتەی بەتورك کردن و هەرەس هێنانی پەیوەندییەکانی نێو نەتەوەکان کە ئەمیش خۆی دەبینێتەوە لەکاریگەری چەند هۆیەك ((کە گرنگترینیان لەژێر کارتێکردنی دەسەڵاتی سەربازی و سیاسی و کارگێری و ڕۆشنبیری تورکی بووە لەشارەکەدا هەر لەسەدەی شانزەهەمی زایینیدا، هەروەها سەرهەڵدانی چینێکی گەورەی سەرمایەداری موڵکداری لەنێو تورکمانەکان بەهۆی داگیرکردنی سامانە کشتوکاڵی و ئاژەڵداریی لادێ کوردنشینەکان لەنێو بازارەکانی شاری کەرکوکداو ڕازیکردنی بەشێکی ئەو چین و توێژی کوردە لەبەشداریکردن لەبەرگری کردن لەبەرژەوەندییەکانی ئەو خاوەن موڵکانە، هەروەها دەسەڵاتی تورکی کە زمانێکی چینی ئۆرستوقراتی بەسەر زمانی بازاڕی ناوخۆی شارەکە هەر لەسەردەمی عوسمانییەکانەوە)) زەمینەیەکی گەورەی دروست کردبوو بۆ بڵاوبوونەوەی زمان و کەلەپووری تورکی.

### * دەوری هاتنی ئینگلیزەکان لە سەنگی ڕووداوەکەی ساڵی (١٩٥٩)دا:-

ماوەیەکی کاریگەرتر لەسەردەمی عوسمانییەکان سەری هەڵدا ئەویش هاتن و داگیرکردنی عێراق بوو لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، کە دادەنرێت بەماوەیەکی گرنگ لەڕوانگەی ڕووداوە مێژووییەکانەوە، گەلێك دەرئەنجام و ڕووداوی ناوچەیی مێژوویی گرنگ ڕوویاندا بووە گۆڕینی گەلێك دەڤەرو شوێن و سەرهەڵدانی سیمایەکی بەرچاو لە مێژووی عێراق و کوردستان.

ئەوەی لێرەدا گرنگەو پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر ڕووداوەکانەوە بەجێهێشت کە بووە هەڵگەڕانی سیمای ئاقارەکان، ئینجا ڕووداوەکان لەسەر ئاستی عێراق بوو یان لەسەر ئاستی کوردستان، یان تێکەڵکێشی ڕووداوە دەرەکی و ناوخۆییەکان بوو. لێرەدا ئەوەی کە دەمەوێت بیڵێم، ئەوەیە کەدەکەومە توێژینەوەی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە هاوپەیوەستە بەسەرە دەزووی ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ و چنینەوەی ئەو ماوەیە هەر لەساڵی (١٩١٩. ١٩٥٩)و، دەوری ئینگلیزەکان لەباڵا دەستی ئەو ڕووداوەدا.

کاتی هاتنی ئینگلیزەکان گەلێك گۆڕان ڕوویانداو چەندەها ڕێکەوتننامە مۆرکرا لەسەر دابەشکردنی ڕۆژهەڵات لەنێوان دەوڵەتە زلهێزەکان، وەکو ڕێکەوتننامەی (سیڤەر)و (لۆزان) و (سان ڕیمۆ)و (پاریس)و گەلێکی تر، هەروەها تەرازووی ڕێکەوتنەکانیش بووە گۆڕینی گەلێك ناوچەو دەڤەر کە لەگەڵ خۆیدا سەنگێکی گەورەی دروست کرد وەکو ڕزگارکردنی دەوڵەتی تورکیاو هەرەسی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و قوت کردنەوەی کێشەی موسڵ و شۆڕشی شێخ مەحمودو ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی و بەربەرەکانی (ئۆزدمیر) لەسەر سنوورو بەربەرەکانی ئینگلیزەکان لەگەڵ شێخ مەحمودو گەشەکردنی بزوتنەوەی (تۆرانچێتی) لەبەرگێکی تردا، کە تێکەڵ بەبزوتنەوەی دەمارگیری تورکی ئەتاتورك کراو زیاتر لەوەی دەوڵەتی عوسمانییەکان گەشەی کردو کارتێکردنی کەوتنە ململانێ بۆ توانەوەی نەتەوەکانی نێو شارەکە بۆ کارڕایی و مەرامکردنی خواستی سیاسی دەوڵەتی تورکیا. هەر لەم پێودانگەدا بوو شارێکی وەکو کەرکوك کەوتە نێو چەقی ڕووداوەکانەوەو بووە شوێنێکی گرنگ لەکێشەی موسڵ و ناوچەکەو هاوپەیوەستی پەیداکرد لەگەڵ ڕووداوەکانی کە ڕوویان دەدا لەناوچەکانی دەوروبەری شارەکەدا. لەهەمان کاتدا ئینگلیزەکان دەورێکی باڵایان بینی لەبەڕێوەبردنی ڕووداوەکانداو هەوڵیان دەدا کە بکەونە ئەوەی بتوانن خواستەکانیان لەنێو ڕووداوەکان بدۆزنەوەو وا بکەن کە بەپێی ئارەزووەکان کێشەکان چارەسەر بکەن و ڕێگەی دیار بدۆزنەوە بۆ ئەوەی ڕووداوەکان لەچوار چێوەی عێراق نەچێتە دەرەوەو هاوپەیوەست نەبێت بەڕووداوەکانی ڕێکەوتنامەی (لۆزان)و (سیڤەر)ەوەو، چارەسەری بۆ بدۆزنەوە لەچوار چێوەی ناوچەگەرێتی و هەوڵی هەموو جۆرە کپ کردنێك بدەن کە بۆنی جیابوونەوەو سەربەخۆیی بدەن، هەوڵیان ئەوە بوو کە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك لەڕووداوەکانی کوردستان و جیهان بەدوور بگرن...

ئەوەی کە بەڕوونی و ڕاشکاوی بەدیار دەکەوێت لە سیاسەتی ئینگلیزەکان هاوسەنگکردنی ئەو کێشەیە بوو، هەوڵدان بۆی تا لەچنگی خۆیان نەچێتە دەرەوە... ئینگلیزەکان هەموو دەم هەوڵی ئەوەیان دەدا کە کوردستان بکەنە چوارچێوەی عێراقەوە، لەو ئاستەنگەوە داوای مافەکانیان بکەن. هەر بەهەمان شێوەیش کەرکوکیان لەهەموو شوێنەکان زیاتر مەبەست بوو بۆ چوارچێوە ڕاگرتنی ڕووداوەکانی ئەویش پاش دۆزینەوەی نەوت لەساڵی (١٩٢٧)دا تێدا، تەرازووی ڕووداوەکانی بەتەواوەتی گۆڕی. هەڵوێستی ئینگلیزەکان بەڕوونی لەو نامەیەدا بەدەردەکەوێت کە مەندوبی سامی بەریتانی لەبەغدا، کیلبێرت کلایتن دەربارەی عەریزەی نائیبەکانی کورد لە(٢٠)ی ئەپریلی (١٩٢٩)دا نوسیوویانە:.

((... لەبەر ئەوە، من لام وایە کە شتێکی بنەڕەتییە هەر ئارەزوویەك بەرەو جیابوونەوە خوازی لەناو پارچەیەکی هەر

بەشێكی تایبەتی ئەم نەتەوەیەدا هەبێ دابمركێنرێتەوە... بەڵام وەكو سەرەتایەكی گشتی دژی دانانی هەر ڕێو شوێنێكم كە بەرەو جیابوونەوە خوازی بچێ نەك یەكێتی، من لام وایە كە باشتر قازانجی نەك هەر هی دەوڵەت بەگشتی بەڵكو هی كوردیش بەتایبەتی، لەوەدایە كار بكەن بۆ پشت بەستن بەیەكتری و هاوكاری نزیكتر... لەم دواییانەدا بزوتنەوەیەكی جیابوونەوە خوازانە لەلیوا كوردیەكاندا سەری هەڵداوەتەوە كە خۆی نواندوە لەژمارەیەك عەریزەدا كە دراون بەمەلیك، سەرۆكی وەزیران و من...)) كورد هان بدەن وەك هاوولاتی دڵسۆزو ڕازی لەناو دەوڵەتی تازەی عێراقدا بژین.. بیری دامەزراندنی كوردستانێكی سەربەخۆ شتێكی گەوجانەو لەكردن نەهاتووە. هەر واتە واتێك دەربارەی ئەوەی كە حكومەتی خاوەن شكۆ هانی شتی وا ئەدات درۆیە...

ئینگلیزەكان هەر لەسەرەتاوە ١٩١٨ تا كاتی ڕوودانی كارەساتەكە ١٩٥٩، لەهەوڵی ئەوەدا بووەو كاریان بۆ ئەوە دەكرد كە ناوچەیەكی وەكو كەركوك لەكوردستان دابڕن و نەهێڵن كە خۆی وەكو ئاقارێكی كورد نشین سەیر بكات، بەڵكو ڕێگەو نەخشەكان لەچوارچێوەیەكی عێراقیدا خولی دەخواردەوە، چونكە یەكێك بووە لەو شارانەی كە دەنگیان بۆ مەلیك فەیسەڵ نەدا، هەروەها جێگەی بەرچاوو چەقی كێشەی موسڵ بوو بۆ تەقینەوەی هەر ڕووداوێك كە ڕوویدات لەناوچەكەو دەرەوەدا.

یەكێك لەو كێشانەی كە ترسی خستبووە دڵیانەوە جووڵانەوەكەی شێخ مەحمود بوو، كە خۆی لەخۆیدا ڕێگەیەك بوو بۆ تەقینەوەی ناوچەكە ئەگەر دیبلۆماسی كورد ئەو كاتە بیتوانیایە هەڵەكانی بقۆزێتەوە بۆ سەر مێزی نێو دەوڵەتی. هەر ئەم گرنگییە بوو كە ڕوودانی شۆڕشی ١٩٢٠ خۆی لەخۆیدا دەنگدان و تەقینەوەی لەناوچەكەدا زیاتر بوو وەكو ئەوەی لەخوارووودا ڕەنگی دابوو كە چەقی شۆڕشەكەی ئیبراهیم خانی دەلۆ ڕەنگدانەوەی زیاتری سیاسەتی ئینگلیزەكان بوو لەناوچەی كەركوكدا، كە تەنانەت توركمان و عەرەبەكانی ناوچەكەش بەرگریان كرد لەئیبراهیم خانی دەلۆو هێزی خۆیان بەكارهێنا لەپشتگیری كردن لێی. لەتشرینی دووەمی ١٩٢٢دا شێخ مەحمود بانگی (مەلیكی كوردستان)ی بۆ خۆیدا. بەڵام بەپێچەوانەی ئاواتی ئینگلیزەكان دەستی كرد بە بەهێز كردنی سوپاو لەشكری لەڕۆژی ٢١ی كانونی یەكەم ١٩٢٢ ئاڵای حكومەتی كوردستان لەناوچەی چەمچەماڵ هەڵكرا...هەر بۆیە لەساڵی ١٩٢٣دا شێخ مەحمود بڕیاریدا بوو كە ((خوا یاریدەدەرمان بێت بڕیار دەدەم ئەچم بۆ كەركوك و بەبازوو گیانی كورد ئەیخەمەوە سەر كوردستان و نەخشەی هەموو كوردستانی جنوبی بەگێتیدا بڵاودەكەمەوە...))

خاڵێكی گرنگ كە ئینگلیزەكان هەوڵیان بۆی دەدا، هەوڵدان بوو بۆ كەلێن دروست كردن لەنێو نەتەوەكانی شارەكە ئەویش بە بەكارهێنانی پەیوەندی كۆمەڵایەتی و چین و توێژەكان بەلای خۆیان و ڕاكێشاندن و چەواشەكردنی ڕووی ڕاستی لایەنە كۆمەڵایەتییەكانیان و ڕاكێشانی لەتەرازووی مەرامەكانیاندا.

هەر لەو پێودانگەدا دەكەوتنە نووسینەوەی مێژوو لەتەرازووی لایەنگیری و بێ لایەنی ئینگلیزەكان، ئەوانەی كە سەریان لەناوچەی كەركوك داوە، مێژووی ناوچەكەیان نووسیوەتەوە لەو ڕێبازەو مەلۆتكەیان داوەو بەو جۆرە وەسپی پیاوە ناودارو خاوەن هۆزو عەشیرەتەكانیان نوسیوەتەوە، ئینجا كە چاویان گێڕاوە بەمێژووەكەیدا هاوپەیوەستیان كردووە لەگەڵ گۆڕانە سیاسییەكەدا ئەگەر چاوێك بەمێژووی ئەو ماوەیەدا بخشێنین دەبینین كە ئینگلیزەكان هەموو كاتێك سەرۆكی شارەوانی و موتەسەرفیان لەغەیری كورد بەكار دەهێناو زیاتر هێلی كەمە نەتەوەییان بەكاردەهێنا بۆ چەوساندنەوەی خاوەن نەتەوەو زۆرینەی شارەكە.كە ئەمیش مەبەستیان خۆی دەبینیەوە لەكپ كردنی بیروباوەڕی سەربەخۆیی لەعێراق و پاڵدان بەحكومەتەكەی، چونكە كاریان لە چوارچێوەی ڕێكەوتنامەی لۆزان بوو، كە دەیانویست دەوڵەتێكی عێراقی پێكبهێنن ئینجا هەڵدەستان بەدروست كردنی ئاستەنگ لەنێو پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی شارەكە تا بەوەی بتوانن بگەنە ئەنجامێكی بەرچاو بۆ ڕێكخستنی مەرامە سیاسییەكەیان.

(( لەكەركوك .... مەجید یەعقوبی ڕەئیس بەلدیە بوو ئەویشیان كرد بەمتصرف بۆ ئەوەی بەتەواوی لەسلێمانیان جیابكەنەوە ( میجر میلل) ناوێكی توركی زانیان دۆزیوەو بەناوی حاكمی سیاسی و ناردیان بۆ كەركوك. ئەم ئینگلیزە توركی زانەو متصرف هانی كەركوكییەكانیان ئەدا داوای استقلالی خۆیان بكەن و هەر بۆ ئەوەی لەسلێمانیان ببچڕنەوە...)) هەر لەم ڕوانگەیەوە بوو، كە ئینگلیزەكان هەوڵیان بۆی دەداو هەموو دەم دەیانویست كە مافی گەلێكی گەورەی شارەكە بخەنە ژێر پێوەو حەقەكانی بخۆن كە ئەویش زۆر بەڕوونی بەدەر دەكەوێت لەهاتنی مەندوب سامی بەریتانی و (رئیس الوزرا) بۆ كەركوك لەساڵی ١٩٣٠دا كەگوایە بۆ چارەسەركردنی كێشەكانیان هاتوون، بەڵام بێ عەدالەت لەخیتابەكاندا دەبینرێت و فێركردنی لایەنەكان بەئاشكرا بەدیار دەكەوێت.

مامۆستا ئەحمەد خواجە لە(چیم دی) دا ئاوا باسی ئەو كۆبوونەوەیە دەكات:

(( لەسر مراجعاتی متمادی كوردانی لیوای سلیمانی و كەركوك و هەولێر فخامتی و كیلی مندوب سامی و كیلی رئیس الوزرای عێراق ڕۆژی جمعەی (١٩٣٠/٨/٨) لەبەغدادەوە تەشریفیان هێنایە كەركوك و لەعەینی ڕۆژدا لەقشلەدا عموم اشراف و اعیانی كەركوك و ڕوئەسا گەورەكانی ئەو لیوایە كە هەموو كوردن كۆیان كردەوە.

لەدوای ئەوەی هەریەكە لە(رئیس الوزراء) و مندوب سامی بەیانی خۆیان خوێندەوە ئینجا عەبدوڵڵا سافی ئەفندی یعقوبی هەڵساو بەم جۆرە كەوتە قسەكردن:.

(( لەم بیانە زور تشكرین ذاتا ام لوایە عبارەتە لەتورك و عرب یعنی نفوسەكەی سەد هەزار لەم دوو عنصرەیە وایمە عێراقین و لەوحدەتی عێراق جیا نابینەوەو مصطفی برایشی عینا تایید قسەكەی كاكی كردەوە)).

بەڵام بەهۆی بەیانەکەی (عەبدوڵڵا سافی) بووە، دەنگدانەوەیەکی گەورەو لەچەند کەسێك هیچ لەخەڵکەکە پشتگیریان نەکردو وای کرد کە (محەمەد بەگی جاف) بێتەگۆ:.

((لوای کەرکوك اکثریتی عظیمەی کورد یعنی لە١٥٠ هەزاری کوردێکی خالصە. ئنجا اگەر بەزیادەوە حسابی بکەین اوی تری انجا تورك‌و عەرەبن‌و ام قسەیەی منیش معلومی جیهانەو بەاحصائیات معلوم‌و اشکرایەو فرموی بندە کە لیرەدا تمثیلی عشیرەتێکی زۆر گەورە وەکو جاف اکەم امیش روئەسای داودەو زنگنە، جباری و شوان...))

لێرەدا سەیری هەریەکە لەخیتابەکان بکەین دەگەینە ئەو ڕاستییە کە ئینگلیزەکان چ دەورێکیان بینیووە بۆ تێکدانی ڕووی ڕاستی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی شارەکە. هەردەم سیاسەتەکەیان تا ساڵانی دوای (١٩٥٩)یش هەر بەو جۆرە هەنگاوی ناوە.

ئینگلیزەکان شتێکی زۆر گرنگیان کرد ئەویش قوت کردنەوەی هێزی (لیڤی) بوو لەسوپای ئینگلیزەکاندا، وەکو هێزێکی سەربازی بەکاریان دەهێنا بۆ کپ کردنەوەی ناوچەکان‌و هێرش کردنە سەری. کە ئەندامەکانی پێك هاتبوو لەئاسووری‌و ئەرمەنی لەناوچە جۆربەجۆرەکان هێنرابوون، کە کاریگەری ئەم هێزەو مەرامی ئینگلیزەکان زۆر بەڕوونی ڕەنگی دایەوە لەکارەساتی ساڵی (١٩٢٥ـ ١٩٢٦)ی کەرکوك‌و هێرش کردنە سەر گەرماوی ژنانی لای قەڵا لەلایەن داموو دەستەکانی ئەم هێزی لیڤییەوە بوو.

بۆ ڕاستیدەست تێوەردانی ئینگلیزەکان لەڕووداوەکاندا هەر لەساڵی (١٩٢٥. ١٩٢٦)دا، داوایان لەمەلیك فەیسەڵ کرد ئەو هێزە لیڤییەی کە ئاژاوەیان نایەوە لایان ببورێت‌و بەرەڵڵا بکرێن بێ ئەوەی لەگوێ کالێیان پێبکرێت بێجگە لەم کارەساتە گەلێك ڕووداوی تر وەکو خۆپیشاندانی گاورباغی و گەلێکی تر دەوری ئینگلیزەکان بۆ سەرهەڵدان‌و کپ کردنەوەی زۆر باڵا دەست بوونەوەو هەردەم حیسابی وردیان بۆی چنیوەتەوەو. بەلای خۆیان‌و لەبەرژەوەندی خۆیان پەلەکێش کراوە ئەگەر سەیری ئاماری ئەو پرۆژانە بکەین کە لەناوچەکەدا جێبەجێ کراوە، هەمووی لەچوارچێوەی پێویستی و کاری سەربازی‌و سیاسی نەچۆتە دەرەوەو لەخزمەتی ئەودا بوون، کە ئەمیش زۆر بەڕوونی لەڕاپۆرتی (نائبەکان) بەدەردەکەوێت کە داوایان کردووە بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژەکان کارێکی تر کە ئینگلیزەکان دەیانکرد بەکارهێنانی زمانی تورکی وەکو دەسکەلایەك بۆ پروپاگەندەو بڵاوکردنەوەی ناڕاستی دژی زۆرینەی نەتەوەیەکی شارەکە، تا بەوەی بیکەنە دەسکەلایەك بۆ تێکدانی ڕووی ڕاستی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هەروەکو ئەوەی کردیان لەڕوودانی کارەساتەکانی وەکو هێزی لیڤی و سەرژمێری شارەکەو گەلێکی تر.

* گەشەکردن‌و بڵاوبوونەوەی تۆرانییەت لەدەوری ئینگلیزدا:—

ڕەنگی تۆرانییەت هەر لەماوەی دەوڵەتی عوسمانییەوە ڕەگی داکوتاو بڵاوبۆوە کە ئەوەی لەو ماوەیە گەشەی کرد جیاواز بوو لەوەی کە لەماوەی ئینگلیزەکاندا گەشەی کرد ((لەپاش جەنگی یەکەمی جیهانیش تۆرانییەت لەسیاسەتی حکومەتی تورکیادا زۆر باش دەرکەوت کە چەندی پێ کرا هەوڵ‌و تەقەلای دا بۆ زەوت کردنی ویلایەتی موسڵ لەعێراقدا)). هەر لەبەر ئەمە بوو ئەم کاریگەرییە زۆر بەڕوونی بەدەردەکەوت لەبڵاوبوونەوەی لەناوچەیەکی وەکو کەرکوك‌و هەموو ئامۆژگارییەکی لەدەرەوە لەتورکیا وەردەگرت، تا بۆ ئەوەی چەقی کێشەی موسڵ بەلای تورکیادا بکێشێتەوە.

ئەو بەڵگانەی کە ئەو کاتە حکومەتی تورکیا دەیهێنایەوە تا ئیسپاتی بکات کە موسڵ بەشێکە لەتورکیاو هەرگیز لێی جودا نابێتەوەو بەئاشکرا نیازی ئەو حکومەتەی لێوە دیاری دەدا کە دەیویست وڵاتی خەڵك داگیر بکات.

بەڵگەیەکی (نا ڕاستی) ئەوە بوو کە گوایە زۆربەی خەڵکی بەشی ژووروی عێراق تورکن‌و، کەمایەتییەکی عەرەبیشیان تێدایە کوردەکانیش تورکن بەپێی قسەی (عیسمەت پاشا).

بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێت کە کەسی وا لەعێراقدا نییە یارمەتی تەماعی حکومەتی تورکیا بداو لایەنگیری بگرێت زیاتر لەیەك مێژوونوس باسی هەڵسووڕانی (لوجنەی تورك)ی یان کردووە کە لەساڵانی (١٩٢٠)و بەم لاوەدا دامەزراوە هەوڵی ئەدا بۆ نوساندنی ویلایەتی موسڵ بەتورکیاوە.

مێژوونوس (لۆنگریك) دەڵێ:

بەم نیازە لوجنەی تورك پێکهات لەکەرکوك، ئەوانەی کە دایان مەزراند لەبنەماڵەی نەوتچی بوون لەکەرکوك کە لەوانەن دەماری خۆشەویستی تورکیایان زۆر قایمە.

هەروەها نووسەری ئینگلیزی (ئەدمۆدندس) کە لەو ساڵانەدا حاکمی ئینگلیز بوو لەبەشی سەرەوەی عێراقدا کرا بەئەندامی لوجنەی کۆمەڵەی نەتەوەکان کە هات بۆ لێکۆڵینەوەی وەزعی ویلایەتی موسڵ، نوسیویەتی:

ئەم بنەماڵەیە سەرکردەی ئەوانە بوون کە داوایان دەکرد ویلایەتی موسڵ بکرێتەوە لەعێراق‌و بخرێتە سەر تورکیا. شایانی باسە (نازم بەگی) گەورەی ئەم بنەماڵەیە ئەندامی وەفدی تورکیا بوو کە لەگەڵ لوجنەی کۆمەڵەی نەتەوەکاندا هات بۆ عێراق بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەی ویلایەتی موسڵ ئەم کابرایە خۆی جنسیەتی عێراقی هەبوو بەڵام چوو بۆ تورکیاو چووە پاڵ سوپای تورکیا کە لەساڵانی (١٩٢٠)و بەم لاوە تردا هەندێ ناوچەی بەشی سەرووی لەعێراقدا داگیرکرد.

نازم نوێنەری کەرکوك بوو لەئەنجومەنی نێردراوان ((مبعوثان مجلس))ی عوسمانیدا، بەتەما بوو پاش داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بکرێ بەموتەسەریفی کەرکوك، بەڵام ئینگلیزەکان لەبەر شتێك ئەمیان دانەناو یەکێکی تریان کرد بەمتصرف.

کۆمەڵەی نەتەوەکانیش کە لەساڵی ١٩٢٥دا بریاریدا لوجنەیەك بنێرێ بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەی موسڵ، بەگی ناوبراو ئەندامی وەفدی تورکیا بوو کە لەگەڵ لوجنەی باسکراودا هات، گوایە شارەزای کاروباری کەرکوکە.

هاتنی ئەم کابرایە بۆ عێراق لەگەڵ وەفدی تورکیادا بوو بەهۆی بێزاری میللەتی عێراق، تورەیی میللەت لەم کابرایە هەموو لایەکی گرتەوە، تا حکومەتی ئەو کاتەی عێراق ناچار بوو پرۆتستۆ (احتجاج)ێك بدات لەسەر هاتنی بۆ

عێراق لەگەڵ وەفدی بێگانەدا، چونکە هاوولاتییەکی عێراقی بوو، لەدەستی داد ڕای کردبوو، خزمەتی وڵاتێکی بێگانەی دەکرد.

کاتێکیش کە لوجنەی کۆمەڵی نەتەوەکان هات بۆ کەرکوك بۆ پرس کردن بەمیللەت دەربارەی پاشەرۆژی ویلایەتی موسڵ لوجنەی تورکیا لەکەرکوك بەگەرمی خەڵکی بانگ ئەکرد بۆ دەنگدان بۆ جویێ کردنەوەی ویلایەتی موسڵ.

(ئەدمۆندس) کە خۆی ئاگای لەو دەنگ وەرگرتنەی کەرکوك بوو ئەگێڕێتەوە:-

ئەندامانی بنەماڵەی نەوتچی لەکەرکوك چییان پێکرا کردیان بۆ ئەوەی لوجنەکەی کۆمەڵەی نەتەوەکان کە هاتبووە کەرکوك بۆ زانیینی باوەڕی خەڵك لەم ڕووەوە بێنێتە سەر ئەوەی کە ویلایەتی موسڵ بەشێکە لەتورکیا..

((.. لەئەنجامدا خەڵکی کەرکوك‌و سلێمانی دژی لکاندن بوون، بەڵام هەولێرو موسڵ لەگەڵ لکاندندا بوون بەمەرجێك ئۆتۆنۆمییەك لەچوارچێوەی عێراقدا دیاری بکرێت...

بەڵام لەدواییدا هەموو ئەو هێڵانەی کە دەکەونە خوارووی هێڵی (برۆکسل)ەوە درایە دەوڵەتی عێراقی تازە، کە بەو پایە کەرکوك بووە بەشێك لەعێراق . هەروەها گەلێك ڕێکخراوو کۆمەڵەی نهێنی کاریان کردووە لەکەرکوکدا هەر لەبیستەکانەوە تا ساڵی ١٩٥٨ بۆ گەڕانەوەی تورك بۆ شارەکە یان هەوڵی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی تۆرانچێتی دراوە، تا ڕادەیەك دوورو نزیك دەوریان هەبووە لەتێکدانی بارودۆخەکەو شڵەژاندنی کە ئەمە زۆر بەزەقی لەساڵی ١٩٥٩دا ڕەنگی دایەوە .. بۆ ئاوەژوکردنی بەرەو خواستی مەرامەکانیان‌و تا دەوری کۆتایی شەستەکان کاریگەری خۆی هەبوو. هەر لەو ماوەیەدا ژمارەیەکی زۆری گۆڤارو ڕۆژنامەی بڵاوکراوەکانی سەردەمی (ئەتاتورك) دەگەیشتە کەرکوك وەکو (حریت) و (ینی صباح) و (دنیا)، کە هەر هەمووی پڕبوو لەگریان بۆ سەردەمی پاشایەتی‌و هاندانی تورکمان‌و ئاژاوەنانەوە لەنێو نەتەوەکانی شارەکە لەکوردو تورکمان‌و عەرەب‌و ڕشتنی فرمێسکی تیمساح بۆ نەتەوەکان، کە هەمووی لەخواستی خۆیان‌و بەرژەوندییەکانیان خولی دەخواردەوە. کە کار گەیشتە ئەوەی ببێتە داخستنی قونسڵخانەی تورکی و قەدەغەکردنی ئەو بڵاوکراوانە...

پاش سەرنج دان لەو ماوەیەی هاتنی ئینگلیزەکان تا کاتی ڕووداوەکە، دەتوانین بگەینە چەند ڕاستیەك لەدەست تێوەردانی ئینگلیزو ئەمریکی‌و هێزو لایەنە دەرەکییەکان لەسازدانی کارەساتەکەو دەوری هەریەکەیان لەجێگەی خۆشکردنی ڕووداوەکەو کەوتنەوە لەبەرژەوەندی خۆیاندا.

ئەگەر سەیری ئەو بەڵگەنامانەی ئینگلیزەکان‌و ئەوەی کە لەو ماوەیەدا بڵاوکراوەتەوە، تا ڕادەیەکی چاك دوورو نزیك ئاماژە کراوە بۆ ڕووداوەکەو بەڵگەنامەیەکی ئەو ماوەیە نییە کە باسی لەکارەساتەکەدا نەکردبێت‌و دەستنیشانی مەرامەکانی خۆیانی تێدا نەکردبێت، بەزووترین کات هەوڵیان داوە بەرپرسە باڵاکانیان لەسەرووی خۆیان ئاگادار بکەنەوە.

لەبەڵگەنامەکاندا وا بەدەردەکەوێت کە هەموو دەم وەکو چاودێریکەر سەیری ڕووداوەکانیان دەکردو زۆر بەوردی لەگەڵیدا دەجووڵانەوەو حیسابی وردیان بۆیەچنی ئەگەر چاوێك بەبەڵگەنامەو نوسراوەکانیاندا بخشێنین دەبینین کە لەگەلێك کاتدا ((عەبدولکەریم قاسم))یان تاوانبار کراوە یان لەکاتی تردا (شیوعی)یان تاوانبار کردووە یان هەندێك جاری تر بەڕووداوێکی ناوخۆیی باسیان کردووەو وەکو ڕووداوەکەی موسڵ بەدەست تێوەردانی دەرەکییان نەبەستۆتەوە، یان لەهەندێك بەڵگەنامەی تردا چاوەڕوانی ئەنجامی دادگایی کردنەکان بوونە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکە لەسەر ئاستی ناوخۆیی یان لەسەر ئاستی دەرەکی ڕووداوەکان. خاڵێکی گرنگ هەیە کە سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە ڕێگەی پێناچێت کە لایەنی دەرەکی دەوری نەبووبێت لەسازدانی ڕووداوەکەدا، چونکە ئەگەر ڕاست نەبێت بەعەقڵ ناچێت کە ڕووداوێکی وەکو موسڵ لەهەڵسانەکەی (شەواف)ە دەستی مەملەکەتی یەککگرتووی تێدا هەبێت‌و کارەساتەکەی کەرکوك دەستی هێزی دەرەکی تێدا نەبێت لەکاتێکدا بەڵگەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە هاتووچۆ لەنێوان (تەبەقچەلی)و (شەواف) هەبووە، نوێنەری (جەمال عەبدولناسر) بۆ هەریەکێکیان دیارە جێگەیەکی دیاری هەبووە کە لەکاتی باسی (تەبەقچەلی) بەدرێژی دێمە سەری‌و شی دەکەمەوە بۆ ڕاستی‌مێژوو.

زۆر لەهەواڵەکان ئەوەیان دەگەیاند کە گەلێك پروپاگەندە بڵاودەبۆوە لەشارەکە بۆ تێکدان‌و ئاژاوە لەنێوان نەتەوەکانی شارەکە، کە دام‌و دەزگاکانی ئینگلیزو ئەمریکییەکان دەستێکی درێژیان هەبوو بۆ ئەو جۆرە بڵاوکردنەوەیە، کە بەتایبەتی لەلایەن قونسلی بەریتانیاوە...

هەروەها سەرچاوەیەکی تر بۆ ئەم دووبەرەکییە دامودەزگاکانی کۆمپانیای نەوت بوو لەگەڵ بنکەی پرسگەی ئەمریکی بوو بەهۆی بەکارهێنانی کارمەندەکانیانیەوە لەم دامودەزگایانە ئەویش بەخشینی پارەیەکی زۆر بۆیان..

ئینگلیزەکان ئەم شارەیان داگیر کردو کۆمپانیای نەوت وەك ئاوی ڕووباری خاسە نەوتی لێ دەردەهێناو بەسەدان ملیۆن دۆلار سوودی لێ دەبینی.. شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ هەڕەشەی لەبەرژەوەندییەکانیان کرد بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای نەوت بەخۆڕایی نەیوتوە ((لەم وڵاتەدا خوێنێکی زۆر ڕژا بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورە کە دڵۆپێك نەوت نەڕژا)).

ئەم وتەیە بۆ ئەوە دەشێت کە لەسەر شەقامەکانی ئەم شارەدا بنوسرێت‌و ببێتە سەر وتاری ئەو ڕۆژە خوێناویانەی شاری نەوتی باوەگوڕگوڕ

خاڵێکی گرنگ کە ئینگلیزەکان‌و دام‌و دەزگاکانیان لەشارەکەدا پێی هەڵدەستان‌و هەردەم جێگەیەکی بەرچاوی هەبوو لایان، هەوڵدان بوو بۆ دروست کردنی لایەنگیرانی خۆیان لەنێو چین‌و توێژەکانی شارەکەو، کارکردن بۆ دروست کردنی پیاوی خۆیان لەنێو حیزب‌و لایەنە سیاسییەکانی شارەکە ئەویش بەخزاندنی لایەنگرانیان بەنێو حیزبی دیموکراتی کوردستان‌و حیزبی شیوعی‌و (مقاومە شعبیە) و (شبیبة الدیمقراطیة)و ڕێکخراوی تورکمان‌و کۆمەڵگەی ئاسوورییەکان.

هەریەك لەو لایەنگرانەی ناو ئەم لایەنانە زۆر بەپوختی هەواڵیان بێ پایان دەگەیاندو، نهێنی لایەنەکانیان زۆر بەجوانی روون دەکردەوە بۆ دامو دەزگاکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، هەر بەو پایەش خەڵك و کارمەندیان وەردەگرت لەدامو دەزگاکانیانداو زۆر باش شارەزای هەموو لایەنێکی ئەو کەسەو کۆمەڵگەکەی دەبوون هەر ئەم پێو دانگە بووە کاریگەری خۆی دروست کردووە لەسەر ڕووداوەکەو جێگەیەکی بەرچاوی هەبووە بۆ سازدانی ڕووداوەکان.

* نازم تەبەقچەلی لەیاداشتەکانیدا ئاوا باسی ترسناکی ئەو دامو دەزگایانە دەکات:-

((لەکاتی وەرگرتنم بەسەرکردایەتی (الفرقة الثانية) هەستم دەکرد بەجموجوڵێکی گەورەی لایەنگران و دەستەکانی قونسڵییەکان لەشارەکەدا. کە دەبووە زەرەرو زیانێکی گەورە بەسەر بەرژەوەندی گشتی و پروپاگەندەی دووبەرەکی و ئاژاوەو دەمارگیری، کەوای دەکرد ئەم دامو دەستەیە مرۆڤی دەخستە شکەوە، بۆیە هەوڵم دا بەسنووردانیان و داخستنیان لەشارو شارۆچکەکان، بەتایبەتی لەڕووداوی پێکادانەکەی مانگی دەیەم لەساڵی ١٩٥٨، کە بەچاوی خۆم دیم کە قونسڵی ئەمریکی چۆن لەدوورەوە چاودێری خۆپیشاندانەکەی دەکرد لەگەڵ دەرچوونی گەلێك عورفی دبلۆماسی هەندێك لەقونسلییە بیانییەکان لەکارو فرمانەکانیان و چوونە نێو خۆپیشاندانەکانەوە.... هەر لەهەمان کاتدا چەند جارێك (الفرقة الثانية). دەسەڵاتدارانی سەروی ئاگادار کردۆتەوە بەوەی کە کۆمپانیاکانی نەوت هەستاون بەهێنانی چەك و تەقەمەنی لەدەرەوەو بڵاوکردنەوەی بەسەر لایەنگرانی خۆیان. لەبەر ئەوەی کەرکوك جێگەی کۆمپانیای نەوتی عێراق بوو، کە دوور نییە کە پاڵ بەگەلێکەوە بنێت خۆیان بخزێنە نێو حیزبە سیاسییەکانەوە بۆ جێبەجێ کردنی ئامانج و مەرامەکانیان.

هاتووە لەنوسراوی بەڕێوەبەرێتی ئەمنی کەرکوکی نهێنی لەڕۆژی (٨) ی ئەیلولی ساڵی ١٩٥٩دا کە بەم جۆرەیە:

((وا بەدەر دەکەوێت لەڕووداوەکانی ئەم دواییەی کەرکوك بەبوونی ژمارەیەك ئێرانی لە(حیزبی توودە)، کە ئەمانە هاتوونەتە عێراقەوە بەشاراوەیی و دزیی و بەبێ بوونی (جواز سفر)، ڕاستەوخۆ بەشداریان کردووە لەو ڕووداوەداو دەستیان هەبووە کە لەو ئێرانییانە بریتین لە(سيف الله كريم) و (تۆفیق مستەفا) جێگەی خۆیەتی کە ئاماژەی بۆ بکەین کە بەڕێوەبەری پۆلیسی گشتی چەند جارێك بەڕێوەبەرییەکان و (فرقه العسكری)یەکان ئاگادار کردۆتەوە بەبوونی ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی حیزبی تودەی ئێرانی و هاتنە ژوورەوەیان بۆ کۆبونەوەو خۆپیشاندان و مەرامیان بۆ دروست کردنی ئاژاوەو گێچەڵ

هەروەها دەوری تورکیا هیچی کەمتر نەبوو لەدەوری ئێرانییەکان بۆ دژایەتی کردنی تورکمانەکان دژی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم

حکومەتی تورکیا گەلێك ڕێگەو شوێنی گرتبووە بەرو کەوتبووە پروپاگەندە کردن و ڕێنمایی دەکرد لەپروپاگەندەکانی دەربارەی ڕێژەی تورکمان لەعێراقدا. کە یەکێك لە ڕۆژنامەکانیان لەئەیلولی ١٩٥٨دا ژمارەیانی بەیەك ملیۆن کەس دانابوو کە ئەمیش بۆ ئەوە بوو بکەوێتە کنە کردن لەنێوان تورکمانەکان لە دژی شۆڕش،

هەروەها ئەویش بوو کە لەدوایدا دەرکەوت کە حکومەتی تورکیا (٥٠٠) پارچە چەکی ناردووە بۆ عێراق بۆ هەندێك کۆمەڵەی یاخی بوو بۆ نانەوەی ئاژاوە لەنێو عێراقدا دژی شۆڕش بەتایبەتی بۆ کۆمەڵە نهێنییەکانی ناو شارەکە.

هەر لەبەر ترسناکی کارەکانی حکومەتی تورکیا پاڵی نا بە(نازم تەبەقچەلی) کەهەستێت بەداواکردنی وەرگێرانی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی تورکیا لەلایەن مستەفا نەریمانەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی، کە ئەمە وای کرد لەبەر زۆری بیروباوەری تۆرانچی ببێتە داخستنی قونسڵییەکەو قەدەغە کردنی ڕۆژنامەکان....

* دەوری تەبەقچەلی لەدروست کردنی ئاژاوە نانەوەی کارەساتەکەی ١٩٥٩:-

(نازم تەبەقچەلی) یەکێکە لەوانەی کە دەورێکی گرنگی بینیوە لەکارەساتەکەی کەرکوك، هەرچەندە لەکاتی ڕووداوەکە لەجێگەی (فرقة الثانية) نەبووە، بەڵام ئەو ماوەیەی لەکەرکوك بووە جێ پەنجەی دیار بووە بۆ تێکدانی بارەکەو شڵەژاندنی. لەیەکەم مانگی شۆڕش عەمید روکن نازم تەبەقچەلی کرایە قائیدی فیرقەی دوو خۆیشی لەئەفسەرە ئازادیخوازەکان بوو، بەردەوام بوو تا نیسانی ١٩٥٩ کە لەدوایی خۆی عەمید روکن (داود جەنابی) هاتە جێگەی[٢٢]، کە نزیکەی نۆ مانگی خایاند یا زیاتر، لەکەرکوك مایەوە هاتنی تەبەقچەلی بۆ کەرکوك سەرەتای دەستپێکی گیروگرفتەکان و تێکدانی برایەتی دانیشتوانی کەرکوك بوو بەپای دەستێوەردانی تەبەقچەلی لەکاروباری ئیداری و بەپێی ڕاپۆرتە ژێر بەژێرەکانی هاتنی ئەو هەر لەسەرەتاوە بۆ گێرانی ئاژاوەیەك بوو، دوو ڕۆژ دوای شۆڕشی (١٤)ی تەموز.

لەکاتی هاتنی و ماوەی تەبەقچەلی لەکەرکوك بارودۆخی ناوچەکە بەم جۆرە بوو:-

((لەسەرەتای کۆمارەوە پارتی دیموکراتی کوردستانی لەکوردستان پەرەی سەند ڕۆژنامەی خەباتی لەبەغدا دەرکرد، هەروەها حیزبی شیوعیش کەوتە چالاکی لەناو شاری کەرکوك، جگە لەم دوو حیزبە حیزبی ئیسلامیش کەوتە جموجوڵ و حیزبی بەعسیش لەناو شاردا هەبوو، حیزبی (وطنی) دیموکراتیش وەك بیروباوەڕێك چەند کەسێکیان لەگەڵدا بوو ڕۆژنامەیەکیان بەکوردی دەرئەکرد ڕەحمەتی (سدیق بلوکێن)ی بەسەرەوە بوو. چ پارتی و چ شیوعیش ڕێکخراوی تایبەتی خۆیان هەبوو. پارتی لەناو لاوان و قوتابیان و کرێکارانی کورد دەوریان ئەگێڕا، شیوعیش لەناو گەنجان و کرێکاران و قوتابیانی کوردو تورکمان پروپاگەندەیان ئەکرد لەنێوان پارتی و شیوعی ڕێکەوتنێکی دوو قۆڵی هەبوو ئەمەش بوو بەهەنگاوێك بۆ داخڵ بوونی پارتی بۆ بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو.

شیوعی و چەپڕەوەکان دروشمی (اتحاد فيدرالي)یان هەڵگرتبوو، هاواریان ئەکردو ئەیانوت (اتحاد فيدرالي مطلبنا

الغالي)، بەعس و قەومییەکانیش داوای وەحدەی یەکگرتنی کتوپڕییان دەکرد.

برا تورکمانەکانی کەرکوکیش کۆمەڵێکیان لایەنگیری مەلەکی بوون یان لەنێو حیزبی شیوعیدا بوون یان لەژێر کارتێکردنی بیروباوەری هەوای سیاسی کەمال ئەتاتورك و بیروباوەری تۆرانچی دەیانالاند تا رادەیەك دووره پەرێزیان پێوه دیار بوو و زیاتر کەناری وەزعەکەیان گرتبوو.

ئەم هەڵچوون و داچوونەی نێوان شیوعی و قەومی سەرانسەری عێراقی گرتبۆوە و تا رادەیەك لەکەرکوکیش رەنگی دابووە. جەماوەری تورکمان کەرەستەیەکی خاوو بوو دەیانویست خۆیان بنوێنن بەڵام بەدەست هەندێکەوە ببونە دار دەست

هەر لەم پێودانگەوە کاتی هاتنی تەبەقچەلی هەستا بەقۆستنەوەی وەزعەکە و زیاتر کەوتە گرتنی لایەنی برا تورکمانەکان و خۆی سەر بەنەتەوە خوازەکان بوو و لەدوایدا دەرکەوت کە یەکێك بووە لەلایەنگرانی ئەوان و بۆ ئەوان کاری کردووە.

((برا تورکمانەکان ماوەیەك لەدەور (عطاء خیرالله) کۆبوونەوە و ئیمزایان کۆدەکردەوە تاکو (عطاء) ببێتە سەرۆکی شارەوانی پێش ئەو لایەنە سەر بەشیوعییەکانەوە بۆ سەرۆك شارەوانی (فاتح جباری) هەڵبژێردرا بوو.

(نازم تەبەقچەلی) پشتگیری (عطاء)و (فاتح)ی نەکردو مامۆستا (نورالدین واعظ)ی کردە سەرۆکی شارەوانی کەرکوك کە بەبێ هیچ هۆیەك (موعتەصەم خەلیفە)ی لابردو ئەوی لەجێگەی دانا بەم کارەی دڵی کوردی هێشان و درزێکی خستە نێو پەیوەندی کورد و تورکمانەوە

ئەوەی کە جێگەی سەرنج بوو، سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن ئەوەیکە تەبەقچەلی لەهەموو خۆشی و ناخۆشییەکی تورکمانەکان بەشداری دەکردو زۆرتر لەکۆرە ئایینییەکانی شەوانەوە کە لەگەرەکە تورکمانەکان دەگێردرا، جۆرەها وتاری بەناو ئایینی و سیاسی دەخوێنرایەوە و تەبەقچەلی لەپێشەوەی کۆرەکان دادەنیشت و دەچووە نێو کۆرەکانیانەوە.

لەکاتی دادگایی کردنەکەیدا چەند جارێك ئاماژە بۆ ئەم لایەنی کۆرانە کراوە، بەڵام ئینکاری کردووە و بەڵگەی پەرەسەندنی تورکمانەکان لەکاتی ئەودا باشترین بەڵگەیە بۆ راستی قسەکەمان، زیاتر وا بەدەردەکەوێت ئەو کۆرانە بۆ مەرامی تایبەتی گێراوە نەك لەبارێکی سروشتیدا پێك هاتبێت، لەخزمەتی برا تورکمانەکان.

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوەیش دەکەن کە تەبەقچەلی هاتوچۆی هەبووە لەگەڵ خێزانە گەورەکانی تورکمان و بەشداری گەلێك لایەنی ژیانیانی کردووە کە نمونەمان گەلێك زۆرە لەگەڵ خێزانی (نەوتچی) و (قیردار)ەکاندا..

ئەوەی کە جێگەی سەرنجە لەنزیك کردنەوەی تەبەقچەلی لەتورکمانەکان خۆی دەبینێتەوە لەم چەند خاڵانەی خوارەوە:-

١- ویستویەتی کە تورکمانەکان بەکاربهێنێت وەکو کەرەستەیەکی خاو، وا بکات کە رابکێشێتە نێو مەرام و جێبەجێ کردنی کارەکانییەوە.

٢- هەروەها بەنزیك بوونەوەی لەتورکمان دەیویست گورزێك بدات لەحیزبەکانی نێوگۆرەپانەکە و بتوانێت لەو رێگەیەوە هەموو هەواڵێکی وردو بەسوودی دەست بکەوێت.

٣- پەیوەندی بەشۆرشەکەی (شەواف) خۆی لەخۆیدا دەیویست هێزێك بۆ کاتی پێویست پێك بهێنێت کە لایەنگیری هەبێت بۆیە تەنها تورکمانەکان پشتگیرییان دەکرد و دەیتوانی خواستەکانی بقۆزێتەوە.

یەکێك لەخاڵە گرنگەکانی تەبەقچەلی ئەوەیە کە پەیوەندییەکی بەتینی هەبووە لەگەڵ شۆرشەکەی (شەواف) لە ئاداری ساڵی ١٩٥٩، هەرچەندە لەدادگا کردنەکەیدا ئینکاری کردووە بەڵام زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەو پەیوەندییە دەکەن و پاڵ خستنی ناوچەی کەرکوك بۆ نێو شۆرشەکە یەکێك بووە لەمەرامەکانی تەبەقچەلی و (شەواف)، بۆیە تێکدانی ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بۆ ئاژاوە و پشێوی لەبەرژەوەندیان بووە

* مامۆستا نەریمان ئاوا باسی ئەو پەیوەندییە دەکات کە دەڵێت:-

((نازم تەبەقچەلی لەلایەکەوە پەیوەندی بەشەوافەوە هەبوو لەسەرێکی دیکەوە بەرقیەی پشتگیری بۆ (عەبدولکەریم قاسم) لیدەدا ئەمە بوو بەهۆی تاوانبارکردن و بانگ کرایە بەغداو درایە دادگای مەهداوی...))

لەدوای ئەوەی کە ناوی تەبەقچەلی هات لەبەیانەکەی شەواف لەئێستگەکەی موسڵ رۆژی (٨)ی ئادار بۆیە هەر یەکە لەشیوعی و پارتییەکان کەوتنەچاودێری کردنی تەبەقچەلی و کەوتنە دروست کردنی دەورییە بەدەوری ماڵ و بنکەی (الفرقة الثانیة)و، بووە تێکچونی ئاسایش لە ناوچەکەو... [٢٦]، ئەمە وای کرد لەتەبەقچەلی کە کەرکوك بەجێ بهێڵێت لەرۆژی (١٥)ی ئادارو (داود الجنابي) بێتە جێگەی بۆ سەرۆکی (الفرقة الثانیة) لەرۆژی (١٧) ی ئاداری ١٩٥٩ کە پێشوازی کرا لەلایەن شیوعی و پارتییەکانەوە بەرێزەوە. پێکدادان لەکەرکوك و دەوروبەری شوێنەکانی کە سەر بە(مقر الفرقة الثانیة) بوو روویدا بەڵام خۆشبەختانە وا نەبوو، لەو ماوەیەدا (تورکمان)و (قومیە)کان تووشی ناخۆشی بوون بەهۆی ئەوەی کە گوایە پشتگیری شۆرشەکەی شەوافیان کردووە .

لەیاداشتەکانی العقید (سوبحی عەبدولحەمید)دا ئاوا باسی پەیوەندی (شەواف)و تەبەقچەلی دەکات:-

((لەدوای ئەوەی کە لەبەغداوە هاتمەوە وا بریارم دا کە برۆم بۆ ماڵی (قائد الفرقة الثانیة)، کە ئەو کاتەی گەیشتم نیوەرۆ بوو، بەڵام سەرم سوورما کە چوومە باخچەی ماڵەکەیەوە پاسەوانەکانی نەیانهێشت بچمە ژوورەوە، داوای کارتی رێگەدانی (امر الانضباط العسکري)یان لێم کرد، بەڵام نەموێرا برۆم بۆلای لەبەر ئەوەی لەشیوعییەکان بوو کە چاودێری جموجۆڵی (قائد الفرقة)ی دەکرد.

دوای بیر کردنەوەیەکی زۆر بۆ رێگا چارەیەکی تر بۆ چاوپێکەوتنم بە تەبەقچەلی، رێگای خێزانی (ئەمین قیردار) م هەڵبژارد کە کەس هەست ناکات بەهاتنم بۆلای تەبەقچەلی

ئەویش بەوەی ماوەیەکە کە پەیوەندیم هەیە لەگەڵیان‌و بەڕێگەی سەرخۆشی کردن لێی دەربارەی کۆچی (ئەمین قیردار) خۆم بگەیەنمە ماڵیان‌و کەسیش پێی نەزانێت دوای سەرخۆشی کردن داوام لێکرد کە پەیوەندیم پێوە بکات بەخێزانی تەبەقچەلی، لەماوەی قسە کردنەکە بەخێزانەکەیەوە رابگەیەنێت کە من لێرەم‌و ناتوانم کە بێم بۆ ماڵیان کە پاسەوانەکان قەدەغەیان کردووە بۆ ژوورەوە بیرەکەم سەری گرت‌و خۆی بەجلوبەرگی خەوەوە لەبەردەرگاکەی چاوەڕێی دەکردم:-

ئینجا دەڵێت :-

دیتم کە تەبەقچەلی زۆر دڵ خۆش بوو بەراگەیاندنی شۆڕش‌و پشتگیری فرقەکەی راگەیەند بۆ لایەنی شۆڕشەکەو تورکمانەکان پشتگیری دەکەن‌و دەستم دەروات لەلای هۆزە کوردەکان تا چەمچەماڵ لەنێوان (کەرکوك - سلێمانی)و ئەوەشی راگەیاند بوو کە هەریەکە لە(اللواء حسين العمري)و محامی ساڵم باشعالم وعبدالرحمن السيد محمود) پەیوەندیان پێوە کردووەو بەیانی شۆڕشیان راگەیاندوە، ئەوەشی راگەیاند کە پەلەبکەن لەراگەیاندنی شۆڕش بەزووترین کات‌و بێ‌دواکەوتن...

ئەم پیاوە هەر لەسەرەتای شۆڕشەوە بەربەرەکانی حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسمی دەکردو لەگەڵ (عەبدولوەهاب شەواف) رێکەوت (امر جحفل اللواء الخامس) لەموسڵ بۆ ڕووخاندنی ڕژێمەکەی (عەبدولکەریم قاسم)، ئەوەی کە لەسەری پێویست بوو کە هەریەکەیان هەوڵ بدەن بۆ تێکدانی ئەمن‌و ئاسایشی دام‌و دەزگاکانی دەوڵەت بۆ بێ‌هێز کردنی دەسەڵات‌و ڕژێمەکەی لەبەر ئەوە چەند کارێکی کرد کە گەواهی ئەم ڕاستیە دەدەن:-

١- لەهەموو کاتێکدا پێشنیاری ئەوەی دەکرد بۆ دەسەڵاتە باڵاکانی (رئاسه الاركان العسكريه)، بۆ گواستنەوەی ئەفسەرە کوردەکان‌و دانانی ئەفسەری عەرەب لەجێگەیان، بۆ ئاسان کردنی کودەتاکەیان بەسەر ڕژێمەوە.

٢- یەکێك بوو لەوانەی کە زانیاری تەواوی هەبوو بۆ کوشتنی خوالێخۆشبو (بارزانی)، هەرچەندە کە لەو ماوەیە لەکەرکوك نەبوو.

٣- لەکۆتایی تشرینی یەکەم (١٩٥٨)دا دەستەیەك پێك هات لەکەرکو ك بەناونیشانی (لجنة التعاون الوطني في كركوك) کە ئامانجی ئەم دەستەیە بۆ دروست کردنی ئاسوودەیی‌و خۆشەویستی‌و برایەتی لەنێو نەتەوەکانی ئەم شارە کە ئەندامانی کوردی ئەم دەستەیە بریتی بوو لەمامۆستای پارێزەر (عەبدولکەریم بەرزنجی)و مامۆستای پارێزەر (عومەر مستەفا)و موکەرەم تاڵەبانی‌و (عقيد عەبدولقادر بەرزنجی). هەموو دەم (نازم تەبەقچەلی) لەراپۆرتەکانیدا کە بەنهێنی بۆ دەسەڵاتدارانی دەنارد وەسفی ئەم زاتانەی بەباشی نەدەکردو بەوە ناویانی دەبرد کە گوایە ئاژاوە گێڕو چاك نین‌و هەوڵی ناخۆش دەدەن لەشارەکەو هەمووده‌م دەریانی دەکرد لەکاتی هاتوچۆیان بۆ قیادەی فرقەی دووەم بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان.

٤- دەرکردنی فەرمانبەری کوردو گواستنەوەیان بۆ دەرەوەی شارەکە، لەکاتێکدا کە ئەمە ئیشی ئەو نەبوو کە دەست وەربدات لە کاروباری بەڕێوەبەری‌و کارگێری.

٥- دژایەتی کردنی گەڕانەوەی (بارزانی) بۆ وڵات‌و داواکردن لەسەرووی خۆی بۆ ئەوەی ڕێگەی گەڕانەوەی نەدرێت.

٦- داواو دژایەتی دانانی مەعاریفی کوردستانی دەکرد لەکەرکوك‌و لەراپۆرتەکانیدا کە لەرۆژی (٩-٩-١٩٥٨)دا بەرزی کردبۆوە گەواهی ئەم ڕاستییە دەکەن.

٧- هەر لەسەردەمی ئەودا دەست درێژی کرایە سەر بەڕێوەبەری قوتابخانەیەك بەناوی (لبيبه) کە سەر بەشیوعییەکان‌و دەستی تەبەقچەلی تێدا بوو، لەدادگایی کردنەکەیدا چەند جارێك ئاماژە بۆ ئەو دەست درێژییە کراوە .. لەیاداشتەکانی بەروونی باسی ئەمەی تێدایە.

٨- لەکاتی هاتنی (بارزانی) بۆ شاری کەرکوك بووە هۆی دروست کردنی ئاژاوەو پێکدان لەنێوان کوردو تورکمانەکان کە سەرچاوەکان ئاماژە دەکەن بۆ پیلانی تەبەقچەلی لەو کێشەیەدا. بەڵام خۆشبەختتانە سەری نەگرت.

ئەگەر سەیری قەبارەی ئەو ڕووداوانەی کە لەماوەی تەبەقچەلیدا ڕوویدا، دەگەینە ئەو ڕاستییە کە تەبەقچەلی ئەگەر هەرچەندە ئەو ماوەیە لەوێدا نەبووە بەڵام دەستی سەرەکی بووەو هەوڵی داوە بۆ شێواندنی ناوچەکە لەبەرژەوەندی بزوتنەوەکەی (شەواف)، چونکە ئەگەر وا نەبوایە بۆچی ئەم هەموو کارەی دەکردو لەژێرەوە راپۆرتی نهێنی دەنارد بۆ دروست کردنی ئاژاوەو چۆڵکردنی ناوچەکە لەوانەی کە لەگەڵ سیاسەتەکەیدا ناڕۆن.

ئەو ڕاستییە دووبارە دەکەمەوە، ئەگەر شۆڕشەکەی شەواف سەری بگرتایە ئەو تەبەقچەلییە ناوچەی کەرکوکی دەکردە گۆمی خوێن زۆر لەڕووداوەکەی ١٤ی تەموز گەورەتر دەبوو، لایەنێکی زۆر بەئاگرەکەی دەسووتان، بەڵام خۆشبەختانە پێش ڕووداوەکەیان ئاشکرا کرا. سەرچاوەکان ئەوەیان بەدەرخستووە کە تەبەقچەلی یەکێك بووە لە(قومی)یەکان‌و لەبەرژەوەندی ئەواندا کاری کردووەو بۆ سیاسەتی ئەوان لەکەرکوکدا هەوڵی داوە کە پشێوی بخاتەوە تا لایەنگرانی قەومییەکان جێگەی خۆیان بگرن‌و سیاسەتەکەیان بڵاوبکەنەوە. یەکێك لەوکارانەی کە دەیویست بەرێگەیەوە بەئەنجامی بگەیەنێت ئەوە بوو کە ژنەکەی (هاوسەرەکەی) لەتورکمانەکانی (تەلعەفەر بوو))، کە تا رادەیەکی چاك دەمارگیری نەتەوەییان هەیەو بەو ڕێگایەوە دەستی کرد بەتۆڕچنینی بۆ تێکدانی بەینی کوردو تورکمان. خاڵێکی گرنگی تر کە تەبەقچەلی زۆر بەزیرەکانە بۆی دەرۆیی بەکارهێنانی ئیستخباراتی سەربازی لەسەرکەوتنی نەخشەکەی‌و هەوڵی دەدا کە زانیاری چەواشە دەربارەی ناوچەکە لەلای دەسەڵاتە باڵاکان دروست بکات کە لەدوایدا بەڵای خۆیدا بشکێتەوە .. کە تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی (معايده)ی درۆ چاپ بکات‌و کوردەکانی پێ تاوانبار بکات بۆ جیابوونەوەو جودا خوازی.

ڕاستییەکی تر هەیە کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە کە تەبەقچەلی ((خۆی ڕێرەوی موسڵمانێتی گرتبوو))..[٢٨].

کە ئەم بەڵگەیەمان لەوەدا بەدەردەکەوێت کە هەستا مامۆستا

(نورەدین)ی واعیزی کردە سەرۆکی شارەوانی چونکە لەبەر ئەوەی وەکو خۆی ڕێرەوی موسلمانێتی هەبوو. لەهەمان کاتدا هاوڕێ و ڕەفیقی تەبەقچەلی بوو. ویستی لەهەمان کاتدا دووبەرەکی لەنێوان کوردو تورکمانەکاندا بنێتەوە بەلام ڕێرەوەکە بەجۆرێکی تر شکایەوە کە بووە هۆی کپکردنی هەلچوونەکە، نورەدەینیش یەکێك بوو لە ئەندامانی ئیخوان ئەلموسلمین).

*** دەوری داود جەنابی و حیزبی شیوعی لەسەنگی ڕووداوەکان:-**

لەپاش ڕۆیشتنی نازم تەبەقچەلی و درانە دادگایی، عەمید ڕوکن (داود جنابی) جێگەی گرتەوە لەنیسانی ١٩٥٩ بوو بەقائید فیرقەی دوو لەئێستگەی شەمەندەفەر پێشوازییەکی گەرمی لێکراو وەفدێکی پارتی و شیوعی چوونە پێشوازی (داود جەنابی) نزیکەی سێ مانگ لەکەرکوك مایەوەو بەس لەو ماوەیەی ئەو لەو ناوچەیە بوو شیوعی لەکەرکوك پەرەی سەند، بارەگای شبیبە (گەنجان) لەهەموو گەرەکەکانی کوردو تورکمان کرایەوە، ڕێکخراوەی ئافرەتان و جوتیاران و لاوان و قوتابیان و کرێکاران کەوتە دەست شیوعییەکان، ئەم ڕێکخراوانە کە ئاهەنگیان دەگێڕا (داود جەنابی) لەڕیزی پێشەوە دادەنیشت و سەرکردەکانی شیوعییەکان وەك بازنە دەوریان دەدا، لەهەموو لایەکی کوردستان سەدان کەس گیران، ئەمە دەرەبەگە ئەوە کۆنەپەرستەو ئەویش تۆرانی لەپاڵ ئەوانیشدا چەند پارتییەك ڕاپێچ دەکران.

سیاسەتی پارتی لەکەرکوك لەو ڕۆژانەدا هاوکاری کردن بوو لەگەڵ شیوعی و دیموکراتییەکان بەرامبەر کۆنەپەرست و کلك و گوێی ئیستعمارو شەریکەی نەوت...

(داود جنابی) زۆر چالاك بوو سرەوتی نەبوو زۆربەی شارو شارۆچکەکانی کوردستان گەڕا لەهەموو شوێنێك شیوعییەکان پێشوازی گەرمیان دەکردو قوڵ و بازووی خۆیان پی بەهێز دەکرد. وەك بڵاوکرایەوە چەند کەسێکی سەر بەشیوعی و دژ بەبەرزانی بۆسەیەکیان نابووەوە بۆ تەقە کردن لەبەرزانی ئەمەش پاڵی نا بەبەرزانییەوە شکات بەرێتە بەر قاسم و هەوڵی لابردنی (جەنابی) بدات، لەو ڕۆژانەشدا دڵی قاسم لەئەفسەرە شیوعییەکان شکا بوو (هاشم عەبدولجەبار) یان لەجەلەولا دوور خستەوە ئەمە پاڵی بەداود جەنابییەوە نا پێش ئەوەی قاسم ئەم لابەرێت هەوڵی لابردنی بدات، نەخشەی نهێنی دەکێشا بۆ کودەتایەك دژی قاسم بەلام حیزبی شیوعی ئەم جموجۆڵەی داود جەنابییان پەسەند نەدەکرد چونکە قاسم لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە پەسەند کرابوو، (عەبدولکەریم قاسم) بەهۆی پیاوانی خۆیەوە لەمەترسی (جەنابی) ئاگادار کرا ئەویش لەحوزەیرانی ١٩٥٩ بانگی کردو خستیە ژوورەوە))

دەڵێن (جەنابی) کە بەنهێنی لەگەڵ ئەفسەرە شیوعییەکان کۆبووەوەو پیلانی بۆ لابردنی قاسم دانا دوا وشەی لەو کۆبونەوەیەدا ئەمەبوو کە وتبوی ((سوف ترفرف الراية الحمراء على الارض الحمراء)) قاسمیش کە هێنایە حزوری پێی وت ((لن ترفرف الراية الحمراء على الارض الحمراء)..[٢٩]. پاش ڕۆیشتنی داود جەنابی، (عەمید ڕوکن مەحمود عەبدولوەهاب) بوو بەجێگری قائید ئەمەش کاری کردە سەر حیزبی شیوعی و زۆربەی ئەو تورکمانانەی کە لەترسانا لەناو ریزی ڕێکخراوەکان خۆیان مەڵاس دابوو بڵاوەیان لێکردو هەندێکیان وا هەڵگەڕانەوە بوون بەدوژمنی حیزبی شیوعیش.

لەلایەکەوە ڕۆیشتنی تەبەقچەلی و ئینجا هاتنی (داود جنابی) بووە خولقاندنی زەمینەیەکی لەبار بۆ دروست کردنی ئاژاوەو گێڕانی ناوچەی کەرکوك لەڕووداوەکان کە هەریەکەی لەڕێرەوێکی جیاوازەوە کاریان کردووەو دوژمنایەتییەکی گەورەیان لەناوچەکەدا دروست کرد. لەهەمان کاتدا کەمی ماوەی هەریەکێکیان دەورێکی گرنگی بینی لەسووڕدانی گەورە کردنەوەی ئاژاوەکان و کەوتنە دوژمنایەتی کردنی لایەنی هەریەکێکیان لەگەڵ ئەوی ترداو هەوڵدانی هەر لایەنێك بۆ چەواشە کردن و بەکرێگرتنی ئەندامی زیاتر بۆ خۆشکردنی ئاژاوەکە.

هەروەها هاتنی (داود جنابی) خۆی لەخۆیدا سیاسەتێکی چەوتی (عەبدولکەریم قاسم) بوو بۆ ئاگردانی ناوچەکە، کە کەوتە گیانی لایەنگیرانی سەر بە تەبەقچەلی کە جاری وا هەبووە کەسانی بێ تاوانیش بەتۆمەتی (تەبەقچەلی)یەوە کراوەتە ژوورەوە. کەئەمەش کاری کردە سەر زۆر کەس کە خۆی مەڵاس داوەتە نێو حیزبی شیوعییەوە لەترسی گرتن یان کوشتن و ڕاونان و لەناودان کە نمونەمان زۆرە لەم جۆرە بابەتانە.. کە برا تورکمانەکانمان بەشێك بوو لەوراووەدونانە.

لەهەمان کاتدا گۆڕینی ماوەی کەمی قائید فرقەکان دەورێکی کاریگەری بینی لەبێ هێز کردنی ڕووی سەربازی فرقەکان و نەتوانی ڕاپەڕاندنی بۆ کاری پێویست، ئەویش بەخزاندنی جۆرەها ئەفسەرو سەربازی سەر بەحیزبەکان کە هەریەکەیان لەبەرژەوەندی حیزبەکان کاریان کردووە وەکو ئەوەی لەبۆچوونێکی سەربازییەوە هەنگاوی نەنابێت، کە ئەمیش بووەتە لەدەست دانی ئاسایش و زانیاری فیرقە کە بەدەست ئەندامانی حیزبەکانەوە لەشارەکە، کە کاریگەرییەکی خەراپی دروست کردنی کە لەڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩دا بەراشکاوی بەدەرکەوت. کە تا چ ڕادەیەك سوپای فیرقەی دوو بێ هێزە لەئاست ڕووداوەکەو دەستە پاچەی حیزبەکانە کە حیزبی شیوعی یەکێك بووە لەو حیزبانەی شارەکە، باڵا دەست بووە لەگێڕانی ڕووداوەکان و کپ کردنەوەی.

یەکێك لەکاریگەرییەکانی حیزبی شیوعی لەناو شاری کەرکوك بەسەر زەمینەی ڕووداوەکەوەو چۆنێتی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی حیزبی شیوعی بوو و دروست بوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نەتەوەکان لەشارەکەو کاریگەری ئەو پێکهاتەیە بەسەریەوە لەڕێکخستنی حیزبی شیوعییەوە.

ئەوەی لەڕووی کۆمەڵایەتی نەتەوەکانی شارەکە بەرچاو دەکەوێت کە هاوپەیوەستە بەچەند ئامانج و مەبەستێکی مێژووییەوە کە پێکهاتەی خۆی دروست کردووە بەچەند خاسیەتێکی هەمەلایەنە کە دەروازە کردن و دزە کردن لێی زۆر مەحاڵە هەر لەم ڕووەشەوە حیزبی شیوعی هەوڵی کنەکردنی دەدا لەنێو ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییەی نەتەوەکانی و هەوڵدان بۆ گۆڕینی بنەما سەرەکییەکانی

ئەویش بەرچاو کردنی ڕێنومایییەکانی حیزبی شیوعی عێراقی کە تا بتوانێت بگاتە ئامانجەکانی..

حیزبی شیوعی لەناو شاری کەرکوك لەگەڵ واقیعی ڕووی کۆمەڵایەتی خەڵکەکەدا نەدەڕۆیی بەڵکو هەوڵی دەدا لەزەمینەیەکی دوور لەواقیعانەوە کار بکات، کە ببێتە گۆڕینی هێڵە سەرەکییەکانی بێئەوەی ڕەچاوی مێژووی و ئەو حیزبانەی کە لەو ناوچەیە بوونە کە دەبووایە دەرسی وەربگرتایە لەحیزبی (هیوا) کە ڕابردوویەکی گەورەی هەبوو هیچ کاتێك خۆی لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان نەدەدا.

* مامۆستا مستەفا نەریمان باس دەکات:-

((لەسەردەمی (جەنابی) مامۆستا (ئەنوەری حەمەئاغا) وەك ئەندامێکی ڕۆشنبیری ناو شیوعییەکان پێی سپێردرا بوو کە لەناو شبیبەکان هەوڵ بدات تورکمانەکان ڕابکێشێتە ناو حیزبەوە، ئێواران کە لەچاپخانە دادەنیشت شانازی بەوەوە دەکردو بەئێمەی دەوت ئێوە ئیمانتان بە (تطور) نییە ئەوانەمان هەموو کەسب کردووە کە (جەنابی) لەئارادا نەماو ئەوانەی کەسب کردبوو هەڵفرین خۆی گەڕایەوە وتی (والله دایلیکتێك ئەم بێعەقڵانە ناگرێتەوە) ئێمەی شیوعی بەهەڵەدا چووبوین...

ئەمە نمونەیەك بوو لەنێو برا تورکمانەکان هەروەها لەنێو کوردو گەڕەکە کوردییەکان گەلێك نمونەی لەو جۆرە ڕوویدا کە هەمووی لەمەحاڵی گۆڕینی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بوو کە کار گەیشتە ئەوەی پیاوێك ژنەکەی سەر بڕی لەبەر ئەوەی پەیوەندی بەحیزبی شیوعییەوە هەبوو، سەرپێچی کردبوو لەجێبەجێ کردنی کاروبارەکانی ماڵدا وەکو ئەندامێکی حیزبی شیوعی جولاًبۆوە لەگەڵ مێردەکەیدا .. کە گەلێك نمونەی ئەم جۆرە ڕووداوانە هەمووی لەئەستۆی حیزبی شیوعیدا ئەوەی کەزیاتر ئەم کاریگەرییەی دروست دەکرد پشت گوێ خستنی حیزبی شیوعی لەرەچاو کردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی وەکو ژن هێنان و شایی و ناخۆشی و هاتوچۆو جلوبەرگ و ئاین و پەیوەندییە ئایینییەکان نێو نەتەوەکانی شارەکە بوو.

نەتەوەکانی نێو ئەم شارە هاوپێویستییەکی ئاینییان هەبوو، کە لادان لێی زۆر مەحاڵ بوو، وەکو شوێنی ئافرەت لەکۆمەڵگا کە وەکو چەوسانەوەی و مافەکانی و ئامانجەکانی ژیانی کە ئەمانە هەمووی بەربەستێك بوو بۆ حیزبی شیوعی کە دەیویست لێی دەرچێت و هەوڵی گۆڕینی ئافرەت بدات لەکۆمەڵگەکەدا، کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگەی پیاوان دەبۆوەو گەلێك کێشەی دروست دەکردو گۆڕینی واقیعەکە مەحاڵ دەبوو بۆی کە ئەمە وای کرد دوژمنایەتییەك دروست بکات لەگەڵ کۆمەڵی نەتەوەکانی شارەکە.

خۆی لەخۆیدا ڕێکخراوەکانی دەورێکی کارتێکراویان دەبینی بۆ تێکدانی کۆمەڵگەکەو هەڵتەکاندنی بنەماکانی.. ئەوەی کەزیاتر دوژمنایەتییەکەی دروست کردبوو لەگەڵ برا تورکمانەکان بوو، کە کۆمەڵگەکەیان داخراوبوو لەهەموو ڕوویەکەوە هیچ گۆڕان و پێشکەوتنێکی وەرنەگرت و لەچوارچێوەی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوە تۆرانچییانە کاری دەکرد نەك لەنێو حیزبێکی وەکو شیوعی کە دوور لەبۆچوون و بیروباوەڕو بنەما کۆمەڵایەتییەکانیان بوو، دوور لەئاواتەکانیان بوو بۆ گۆڕینی کۆمەڵگەی شارەکە بەرەو خواستی ئەو ڕێکخراوانە.

هەروەها کوردەکەش کەوتبووە بەر کارتێکردنی چەند حیزبێکی وەکو حیزبی (هیواو حیزبی دیموکراتی کوردستان) کە ئەمانە تا ڕادەیەکی چاك کنەیان کردبوو، لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگەی کوردەواری دەگونجان و تاڕادەیەك کەم و کورییەکانیان کەمتر بوو لەچاو ئەوەی حیزبی شیوعی ڕێکخستنی خۆی دروست بکات.

خاڵێکی گرنگ کە دەوری هەبوو بەسەر ڕووداوەکەو بەسەر حیزبی شیوعییەوە، ئەویش هاتنی (جەنابی) بوو، بەزۆرو بەکوتەك و بەترس خەڵکێکی زۆری کردە شیوعی و هەردەم هەوڵی بۆ ئەو کارەی دەدا بەڵام ((لەکاتی هاتنی عەمید ڕوکن (مەحمود عەبدولوەهاب) بوو بەجێگری قائید ئەمەش کاری کردە سەر حیزبی شیوعی و زۆربەی ئەو تورکمانانەی کە لەترسانا لەناو ڕیزی ڕێکخراوەکان خۆیان مەڵاس دابوو بڵاوەیان لێکردو هەندێکیان وا هەڵگەڕانەوە بوون بەدوژمنی حیزبی شیوعیش)) کە ماوەی ئەم ڕووداوەو ماوەی کارەساتەکەی ١٩٥٩ زۆر کەم بوو، کە زۆر ئاسان بوو بۆ تەقینەوەی بەشێوەیە کە دەستێکی ئەم دوژمنایەتییە لەئەستۆی حیزبی شیوعیدا بێت.

خاڵێکی تر ئەو ڕێکخراوو لایەنانە بوو وەکو (مقاومة الشعبية) و (شبيبة الديموقراطي)یە کە سەر بەشیوعییەکان بوو کە زۆر لەئامانج و خواستی دانانەکانیان دوور کەتبوونەو ئەو ئەرکانەیان وەکو پێویست بەجێنەدەهێنا کە لەخاڵەکانیدا بۆی دانرابوو.

هەر لەم ڕوانگەیەوە بەدەرکەوتنی ڕووداوەکە (مقاومە الشعبیە)و بوونی چەك بەدەستی کاریگەری هەندێك لەئەندامەکانی بەدەرکەوت بەبەشداری ڕاستەوخۆیان لەڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ کە ئەمیش بەخاڵێکی بەشداری حیزبی شیوعی دادەنرێت کە نمونەمان شکاندنی (مخفر شرطة امام قاسم) جۆرێکەو لەو لادانەو سەرپێچی کردن بوو لێی وەکو ئامانجەکانی (مقاومە الشعبیە) ((هەر لەسەردەمی (جەنابیدا))، شیوعییەکان قازانجێکی زۆریان کرد بۆ چەسپاندنی شوێنەکانی خۆیان، ئەویش بەدابەشکردنی گەلێك شوێنی سەربازی بەسەر ئەندامانی حیزبی شیوعیدا کە هەموو جێگەی بەرپرسیاری گەورە بوو لەشارەکە، لەهەمان کاتدا بنکەی (مقاومە الشعبیە)ی سەرووی عێراق لەکەرکوك بوو و سەرۆکایەتی دابووە یەکێك لەشیوعییەکان هەر لەبەر ئەوە ژیانی شیوعییەکان لەکەرکوك لەخۆشیدا بوو زیاتر وەکو ئەوەی شیوعییەکانی موسڵ ئەوەی کە شیوعییەکان فرسەتیان دەبینی لێی ماوەی بەوەی باسی دەکەن بە((الانحسار القومي))و بەرزکردنەوەی ((المد الشيوعي)) لەکاتی بزوتنەوەکەی موسڵ (شەواف)دا. ئەویش بەلێدانی هێزی بەرگری لایەنەکانی تر زۆر بەتوندو تیژی، ئەو لایەنانە سەرقاڵی سارێژ کردنی برینەکانیان بوون و ژمارەیەکی زۆری ئەندامەکانیان لەبەندینخانە بوون لەلایەن دەزگاکانی حکومەتەوە ڕاودەنران، کە ئەمە ماوەیەکی گرنگ بوو بۆ

حیزبی شیوعی)) کە دەستی دیار بێت بەسەر ڕووداوەکەی ساڵی (١٩٥٩)ی کەرکوك.

((خاڵێکی گرنگی تر کە حیزبی شیوعی سوودی لێدەبینێت لەدوای بزوتنەوەکەی موسڵ هەڵسان بەکاری ئەوەی کە خۆیان پێیان دەوت (العنف الثوري)، ئەویش بەبەکارهێنانی چالاکیەکانیان دژی دوژمنەکانیان)) کە خۆی لەخۆیدا ڕێگا خۆشکردنێك بوو بۆ ئەوەی کاری ئەوەی شاری موسڵ لەشارێکی وەکو کەرکوك دووبارە ببێتەوە))

ڕوویەکی تر سیاسەتە چەوتەکەی عەبدولکەریم قاسم بوو، کە سیاسەتی دوو فاقەی بەکاردەهێناو، حیزبی شیوعی کردبووە دەسکەلایەك بۆ لێدانی حیزبەکانی تر، جارێك لەگەڵ قەومی و جارێك لەگەڵ پارتی و لایەنی تر کە هەر هەمووی بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی خۆی بوو، ئەمە پاڵی بەشیوعییەکانەوە نابوو کە جۆرە هەوایەکی سیاسییان وەرگرتبوو تا بتوانن خواستەکانیان جێبەجێ بکەن.

*** گلەییەکی برایانە لەبرا تورکمانەکان دەربارەی کارەساتەکەی ساڵی ١٩٥٩:-**

ئەوەی کە جێگەی سەرنجە لەڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ دا ئەوەیە کە دەتوانین چەند هەڵوێستێك بکەین دەربارەی برا تورکمانەکان و دەوریان لەو کارەساتەدا چی بووەو چۆن ڕێگەیان خۆشکردووە بۆ ڕووداوەکە. ناتوانین چاوی لێ بپۆشین..

١- ئەوەی کە جێگەی ڕوونەو ناتوانین بیشارینەوە، پەیوەندی برا تورکمانەکانمانە لەگەڵ (تەبەقچەلی)دا لەشارەکە هەر لەهاتنی (تەبەقچەلی) بۆ شارەکە، ئەویش خۆی دەبینێتەوە لەهاندانی (تەبەقچەلی) تورکمانەکان بۆ دژی سیاسەتەکەی (عەبدولکەریم قاسم)و هەوڵدان بۆ شۆڕش دژی ڕژێمەکەی، ئەویش بەبەشداری کردنی تەبەقچەلی لەهەموو کۆڕو کۆبونەوەیەکداو پشتگیری کردن لێیان و لایەنگرییان لەچارەسەری گیروگرفتەکاندا.

٢- بەشداری و لایەنگیری برا تورکمانەکان لەبزوتنەوەکەی (شەواف) و هەوڵدان بۆ ئەوەی (تەبەقچەلی) کە تورکمانەکان بکاتە هێزێك بۆ پشتگیری بزوتنەوەکە، کە لەوەو پێش ڕوونمان کردەوە لەهاتووچۆی نوێنەری شەواف بۆلای تەبەقچەلی و پەیوەندی ماڵی (ئەمینی قیردار) بەهاتووچۆی نێوانیان کە بەڵگەیە بۆ باوەری نوێنەری شەواف بەتورکمانەکان بۆ ئەو هاتووچۆیەو پەیوەندی کردنی بەهۆی تورکمانەکانی شارەکە بە (تەبەقچەلی)یەوە. بەڵگەیەکی ترمان بۆ ئەم بەشدارییە (گیرانی خاوەنی ڕۆژنامەکانی (بەشیر) و (آفاق) بەهۆی بەشداری کردنی هەر یەکێکیان لەپیلانەکەی شواف داخران)).

٣- هەروەکو بەڵگەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە (بعثی)یەکان تورکمانەکانیان هان دەدا بەهۆی ئەندازیار (عبدالملك) کە کارمەندێکی بوو لەو دەزگای هێڵی شەمەندەفەر)). بۆ دژی شۆڕشەکەی ١٩٥٨.

٤- کارێکی ناشرین کە تورکمانەکان پێی هەڵدەستان بەهەڵواسینی وێنەی پشیلەو دار لاستیك لەبەرۆکیان دژی شیوعییەکان وەکو گاڵتەپێکردنی دژی کۆتری سپی و ئاشتی.. کە هەریەکە لەشیوعی و (انصار السلام) بەکاریان دەهێنا.

٥- هەردەم برا تورکمانەکان وەکو کەرەستەیەکی خاو وابوون هەرکاتەی بەدەست یەکێکەوە بوون و توانای گۆرانیان نەبوو لەپای گۆڕانە سیاسییەکەدا بەڵکو هەردەم لەقاوغێکی تەسك و داخراو خولیان دەخواردو هەر لەو قاوغەوە بۆچوونەکانیان شیدەکردەوە.

٦- هەر بەفیتی (تەبەقچەلی)و (تۆرانچی)یەکان هەستان بەدانانی بۆسە بۆ (بارزانی) ڕەحمەتی و خۆپیشاندانیان کرد دژی لەکاتی هاتنی بۆ (کەرکوك)، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەو سەرکردەیە ڕۆژێك لەڕۆژان گلەیەکی نەبووە لێیان و هەردەم بەچاوی براوە سەیریانی کردووەو ڕێزی هەبووە لەلایان و بەبرای کورد حیسابی کردوون، بەڵام زۆر بەداخەوە ئەمە لای تورکمانەکانەوە وا دەرنەچوو، چاکەکەیان بەو جۆرە دایەوە.

٧- ئەوەی لەبەشەکانی پێشودا ئاماژەم بۆی کرد دەربارەی بزوتنەوەی تۆرانچی لەشارەکەدا هەر لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەوە تا سەردەمی شۆڕشی ١٤ ی تەموز ١٩٥٨ برەوی هەبوو، بەردەوام بوو، بەڵام ئەوەی کە جێگەی داخە برا تورکمانەکان بەشێکیان لەسەر ئەم ڕێرەوە هەر بەردەوام بوون و لێی جیانەبوونەوە، لەڕێبازەکانی دەرنەچوون.

زۆر لەوانەی کە لە کەرکوك ژیاون و مامۆستاکانیان تورکمان بوون دەزانن مامۆستاکانیان بەجلوبەرگی کەواو چاکەتەوە دەوامی قوتابخانەیان دەکردو شانازیان بەجلوبەرگی تورکیەوە دەکرد یان لەجێبەجێکردنی بیروباوەڕیی تۆرانچێتیدا هاوتەریب بوون.

مامۆستا نەریمان لەبیرەوەرییەکانیدا ئاوا باسی ئەو مامۆستایانە دەکات:-

((.. هەندێك لەمامۆستاکانمان تورکمان بوون بەشێکیان تۆرانچێتییان دەکردو کتێبی تورکییان بەسەرماندا دابەش دەکرد، ئەو کتێبانەی کە لەتورکیا لەسەردەمی مستەفا کەماڵ دەخوێنرا بەهۆی بڵاوبوونەوەی پیتی لاتینی لەساڵی (١٩٢٨) لەغو کرا بوون من لەپێشدا تورکمانیم نەدەزانی ناچار نیشتمە سەری و فێری بووم هەندێك لەو مامۆستایانەمان ڕقیان لەقوتابییە کوردەکان دەبووەوەو بەزۆری زۆردارەکی تەنگیان پێهەڵ دەچنین ..))

((لەوانە هەندێکیان ناچارکران قوتابخانە بەجێبهێڵن وەك (نوری) ناوێکی کارێزی و قوتابییەکی دوانزە ئیمامی و لەم دواییەش سایری خاڵم))

مامۆستا ڕەفیق حلمی ئاوا باسی ئەو کاتە دەکات:-

((ڕۆژنامەکانی ئەستەموڵ سەرچاوەی باس و هەواڵی ئەو ڕۆژە بوو. ئەوانەش کە لەعەرەبی و بەئینگلیزی دەردەچوو، ئەهاتە کەرکوك پڕ بوو لەباسی تورك و شەری (کمالی)یەکان...))

بۆیە جێگەی داخ بوو هیچ کاتێك سەیری نەتەوەکانی شارەکەیان نەکردووە بەچاوی سەردەم، بەڵکو بەشێکی ناڵێم هەبوو لەدەروازەی ڕۆشنایی تۆرانچییەوە ڕابردووی نەتەوەی شارەکەیان قۆستبۆوە..

٨- زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە دەکەن بەوەی کە تورکمانەکان بڵاویان دەکردەوە لەچەند ڕۆژێك پێش ئاهەنگی١٤ تەموزی ١٩٥٩ کە گوایە بزانە چیدەکەن لەو ڕۆژەیان و چۆن حەقی خۆیان دەکەنەوەو چی دەکەن ئا لەم جۆرە بیروبۆچوونانەیان بەگوێی خەڵکی دەدا.

٩- ئەی ئایا بۆ برا تورکمانەکان پرسیارێك لەخۆیان ناکەن کە ئەو تاقانەی کە (اقواص) دروستیان کردبوو بۆ ئاهەنگ . لەکاتی ڕووداوەکەدا شکاندیان پڕی بوو لە(دۆنکی)، کە لەلایەن تورکمانەوە لەکاتی ڕووداوەکە بەکارهێنرا بۆ پێکدادان و شەڕ، ئایا لەلایەن کێوە ئاخێنرا بووە تاقەکانەوە.

*** دەوری کورد لەڕووداوەکە :-**

ئەوەی کە جێگەی سەرنجەو زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، ئەوەیە کە کورد تاوانبار دەکەن و وای دادەنێن کە دەستی هەبووە لەڕووداوەکەدا، بەڵام ئەگەر بچینە بنج و بنەوانی سەرچاوەکان و بەڕوویەکی مێژووییەوە بۆی بچین دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستییە کە چەند هێڵێکی ئاماژە پێکراو هەیە کە دەتوانین ئەو بۆچوونانە ئاوەژوو بکەینەوەو ڕاستی و چەوتی لێکۆڵینەوەکانیان بەدەربخەین، کە تا چ ڕادەیەك مەرامە سیاسییەکان زاڵە بەسەر نووسینەوەو لێکۆڵینەوەو باسەکانیاندا. زۆر لەوانەی کە خۆیان لەقەرەی ئەم جۆرە نووسینانە داوە هاتوونە هێڵێکی سیاسییان کێشاوە، چۆنێتی کۆمەڵگای کوردەواری شاری کەرکوکیان فەرامۆش کردووە، بێ ئەوەی بتوانن ڕووی سیاسی ئەم کۆمەڵگەیە شی بکەنەوە بۆ چین و توێژەکانیان، بەڵکو تەنها لەناوی (کورد)ە کەوە سەقامییان گرتووەو بەس.

ئەوەی من لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە کە من نامەوێت پاکانە بۆ (کورد) بکەم کە گوایە بەشداری ڕووداوەکەی نەکردووە، بەڵام چەند خاڵێکم لا گەڵاڵەبووە ناتوانین دەوری کورد وەکو لایەنێکی ڕاستەوخۆ هەڵنەسەنگێنن بەڵکو تەنها کاریگەری دەوروبەرەکەی وای خستووەتە ڕوو. زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە باسی کوردیان کردووە لەڕوداوەکەدا خاڵێکی گرنگیان لەبیرکردووە ئەوەیە کە نەیانتوانیوە ڕووی کۆمەڵگای کورد لەشارەکە شی بکەنەوەو ڕووی دابەش بوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بەدەروازەیەکی مێژووییەوە هەڵسەنگێنن...

ئەوەی کە ڕوونە، بوونی لەم شارە دەگەڕێتەوە بۆ بەرەبەیانێکی زۆر .. زۆری گەورەی مێژوویی کە خاوەنی کەلەپوورێکی مێژوویی کەڵەکە بووە، بەڕاشکاوی دەڵێم کە تاکە نەتەوەی ئەم شارەیەو دامەزرێنەری شارستانی (چەرمو)و (مەتارە)و (قادیش)و (ئەراپخا)و (ئال. ئیلانی)و (تشینوی. تسعین)و (نوزی)و (کوڕوخانی) یە..

ئەوەی کە لەلای ئەم میللەتە گەڵاڵەبووە ئەوەیە کە خاوەنی کەڵەکە بوونێکی کۆمەڵایەتی گەورەیە، کە ڕەگێکی قوڵی هەیەو خاوەنی چەند خاسیەت و تایبەت مەندی و بنەمایەکی گەورەیە، دەتوانین زۆر بەڕاشکاوی بڵێین کە هەڵگری زۆربەی خاسیەتە کۆمەڵایەتییەکانی شارەکەیەو هەموو نەتەوەکانی تر دەتوانن سوودی لێ وەربگرن و لەو شارستانییەی کوردەوە ئاو بخۆنەوە. بۆیە ڕێگەی پێ ناچێت کە ڕۆژێك لەڕۆژان ببێتە ئەوەی کە هێزو کاریگەرییەکی سیاسی ببێتە پچڕانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی و ببێتە تێکدانی لەگەڵ نەتەوەکانی تری کە هەرچەندێك کاریگەری لایەنە سیاسییەکە دەوری خۆی بینیبێت. گەلێك دەسرازەی وەکو ژن هێنان و شین و شایی و داب و نەریتی نەتەوەکانی ئەم شارە بووەتە پێکدانی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی بەهێز کە تێك چڕژاوە بەناو یەکتریداو هاوپەیوەستی یەکترین و پچڕاندنی هەریەکەی لەوی تر زۆر مەحاڵە، بەڵگەی مێژووییمان زۆرە کە ڕۆژێك لەڕۆژان کوردی ئەم شارە بیری لە دەمارگیری نەتەوەیی و تۆڵە نەکردۆتەوە، ڕۆژێك لەڕۆژان هەوڵی نەداوە کە بیەوێت هێزو کوتەك بەکاربهێنێت کە هەرچەندە لەڕووداوەکانی ١٩٥٩یش بەهێزتر بووە، نزیك ترین نمونەش ڕووداوەکەی حەمامی ژنانی لای قەڵا بوو (هێزی لیڤی)، کە ئینگلیزەکان لەپشتەوەی پەردەوە ڕووداوەکەیان قۆستەوە بۆ تێکدانی نێوان کوردو تورکمان و ئاسووری، بەڵام چونکە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان ئەوەندە بەهێز بوو خۆشبەختانە سەری نەگرت. یان نمونەی ترمان خۆپیشاندانی گاورباغی بوو کە هەموو چین و توێژە کرێکارەکانی شارەکە بەیەك دەنگ هەڵسان، یان خۆپیشاندان (مەلا ڕەزای واعین) دژی ئینگلیزەکان کوردو تورکمان بەیەك دەنگ دژی ڕەوشتی ئینگلیزەکان بوون لەشارەکە.

بۆیە ئەو ڕاستییە دەڵێم ئەگەر کورد ئارەزووی لەو جۆرە ڕووداوانە هەبوایە زۆر بەئاسانی هەڵیدەگیرسان و هەر خۆی براوە دەبوو لەگۆڕەپانەکە، بەڵام توخنی شتی لەو جۆرە نەدەکەوت و ڕۆژێك لەڕۆژان بیری لێ نەدەکردەوەو ئەو حیزبە کوردیانەی وەکو (هیوا)و (پارتی) کە جەماوەریان لەشارەکەدا هەبوو بیروباوەڕی حیزبەکەیان لەسەر ئەو بۆچوونانە ڕۆنەناوە بەڵکو دەنگی برایەتی و هاوژینیان بەرزکردبۆوە لەشارەکە. ئەوانەی کە کورد تاوانبار دەکەن هیچ جیاوازییەك ناکەن لەنێوان (کوردی. شیوعی)و (کوردی. پارتی)و خەڵکە گشتییەکەی کورد لەشارەکەدا، لەکاتێکدا لەنێو حیزبی شیوعی لەشارەکە، لەهەموو چین و توێژەکانی وەکو کوردو تورکمان و ئاسووری و ئەرمەنی تێدا هەبوو، کە هەریەکەی جێگەی دیاری هەبووە لەنێو ڕێکخراو و کۆمەڵەکانی حیزبی شیوعیدا، بۆیە هەر کارێکی خراپە کاری لەنێو حیزبی شیوعی هەموویان هەر خستووەتە ئەستۆی کورد، بێ ئەوەی سەنگی نەتەوەیی بەکاربهێنن. لەهەمان کاتدا کوردێکی زۆر هەبووە لەنێو پارتیداو جەماوەرێکی بەرفراوانی هەبووە، چالاکی لەنێو کەرکوك و دەوروبەری لادێکانی زۆر بەهێز بوو، لەهەمان کاتدا لە(جبهە) بوو لەگەڵ حیزبی شیوعیدا.

لێرە پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەوەیە کە ئەو بیروڕایەی سەرەوە پوچەڵ دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر کورد بەشداری ڕاستەوخۆی بکردایە ئەوکاتە کورد دەیتوانی دەسەڵاتێکی گەورە بەدەست بهێنێت و بتوانێت بەسەر گۆڕەپانەکەدا زاڵ بێت.

مامۆستا مستەفا نەریمان ئاوا باسی هەڵوێستی پارتی

دەکات هەر لەیەکەم ڕۆژی ڕووداوەکە.
(وەکو ئەندامێکی پارتی چووینە بارەگا تا بزانین سەرکردایەتی پارتی فەرمانی لەسەر چییە؟ عومەر مستەفای پارێزەر لەوێ نەبوو، مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل جێگری بوو ئەو بەو خەڵکەی وت کەس نەچێتە ناو ئەو هەراو هوریایەو ئەبێ ئەندامی پارتی بەشداری لەو کارەساتە نەکەن، ئێمەش لێماندا گەراینەوە ماڵەوە ئەو شەوە تا بەیانی تەقەی دەمانچەو تفەنگو دەنگی قیرەو هەراو دوکان برین بوو... لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییە ئەگەر پارتی وەکو حیزب بەشداری بکردایە ئەوا بەشداری دەکردو ئاگاداری ڕووداوەکە دەبوو، یان بەلانی کەم پشتگیری دەکرد بەرامبەر ڕووداوەکەو ئەندامەکانی هاندەدا دژی برا تورکمانەکان. یان ئەگەر خەڵکە گشتییەکەی کوردی شارەکەو دەوروبەر بەشداری بکردایە ئەوا بۆ پارتی زۆر ئاسان بوو کە (بیان) یان بانگەواز بۆ خەڵکەکە بڵاو بکاتەوەو بەئاسانی بەسەر ڕووداوەکەدا زاڵ دەبوو. بەتایبەتی لادێکانی دەوروبەری کەرکوك گەورەترین هێز بوو بۆ بەشداری کردن.
دەربارەی کارەساتی کەرکوك ڕۆژنامەی (خەبات) زنجیرە نووسینێکی دەربارەی هۆی کارەساتەکە دەربڕی کە بنەماکەی ئەوە بوو مەلا عەبدوڵڵا دەریبڕیبوو...کە ئۆباڵی توندو تیژی خستە پەنجەی بێگانەو دوورە پەرێزی هەندێ لەتورکمانەکانو توندو تیژی شیوعییەکانو هەردوو قائید فرقە (تەبەقچەلیو جەنابی).. هەربۆیە لەکتێبێکی وەکو (تأریخ الوزارات العراقیه فی العهد الجمهوری) ئاوا باسی هەڵوێستی پارتی دەکات:.
(( ومع ذلك فان الحزب كان یسعی الی منع الناس فی المشاركه فی احداث القتل..
یەکێك لەو سەرچاوانەی کە باسی بەشداری کورد دەکات لەکوشتار یان ڕاستر بڵێین بەشداری پارتی لەکوشتار (عەبدولستار تاهیر شەریف) ە کە ئەندامێکی چالاکی ئەو کاتەی پارتی بوو، بەرپرسی ناوچەی (شوان) بووە، ئەوەی کە جێگەی سەرنجە لەدوایدا ئەم ڕایەی بڵاوکردۆتەوەو لەکاتی ڕووداوەکەدا باسی لێوە نەکردووە.
بەڵام ئەوەی ڕێگەی هەڵوێستە بەرامبەر ئەم بۆچوونە چەوتە، ئەم بەرێزە خۆی یەکێك بووە لەوانەی کە لەدوایدا لەپارتی هەڵگەڕایەوەو چووە پاڵ پارتی شۆڕشگێری کوردستان (حزب الثوري)و هاتنەوە پاڵ حکومەتو کرایە وەزیر، ئینجا کە ڕایەکی وا دەخاتەڕوو مەبەست شێواندنی پارتیو پاکانە بۆ جێ پەنجەی خۆی دەکات لەجیابوونەوەی لەحیزبەکە نەك سەرنجی بۆ نووسینەوەی ڕاستیمێژوویی کە زۆر لەواقیعەوە دوورەو بۆ شێواندنی مێژوو لەچەواشەکردنو ڕاستکردنەوەی بەلای خۆیاندا.
زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە کورد تاوانبار دەکەن بریتین لەلایەنە دەرەکییەکانو قەومیو بەعسیو برا تورکمانەکان، کە هەر یەکەی لەبۆچوونێکی شۆڤینانەو سیاسییانەوە بۆ ناوهێنانی کورد دەچن، کە مەبەستیان تاوانبار کردنێتی تەنها بۆ جێبەجێ کردنی مەرامەکانیان، ئەگەر سەرنجێکی بەڵگەنامەکانی ئینگلیزەکان بدەین کە لەهەموو باسێکدا ناوی کوردیان هێناوەو لەگەڵێك جاردا کەوتوونەتە هەڵەوەو مەرامەکانیان زۆر بەروونی دیارە کە تەنها مەبەستیان تاوانبارکردنی کوردەو بەسو دەیانەوێت لەگەڵ خواستی سیاسییاندا، لەزەمینەی گۆڕەپانەکە هاوگونجاوبێت.
بەڵام ئەوەی جێگەی پێ وتنە ئەوەیە کە کورد دوای ڕوودانی کارەساتەکەو ڕاستر بڵێین پارتی لەنێوان ساڵانی (١٩٦١.. ١٩٦٤) دەستی هەبووە لەتۆڵە سەندنەوە کەئەمیش ئەستۆی دەگەڕێتەوە سەر برا تورکمانەکان کە هەر دەستیان هەڵنەگرت لەکوشتنی خەڵکی بێ تاوانی کورد، مامۆستا نەریمان ئاوا باسی ئەو هەڵوێستە دەکات:.
(( بۆ بەربەست کردنی ئەم کوشتنانەش وەك بیستمان پارتی لەگەڵ شیوعییەکاندا پەیوەندی کردەوە ئەوان دەرکەوت سەری خۆیان کز کردبوو لەگەڵ تۆڵەسەندندا نەبوون، کە گوایە بیانویان ئەمە بوو ئیمانیان بە (اغتیالات فردی) نییە بەڵام ئەگەر دەسەڵاتیان بەدەست بوو بۆیان ڕەوایە بەکۆمەڵ خەڵك بکوژنو بەشەقامەکانیشدا سەحلیان بکەن. لەناو پارتی دەستێکی سوور پەیدا بوو بۆ تۆڵەسەندنەوە، ((العین بالعین والسن بالسن)) لیژنەی ناوچە بەزۆربەی دەنگ لەگەڵ ئەم ڕایە نەبوون تازە جڵەو کەوتبووە دەست جەماوەری سەر بەپارتی. لەناوچەی پارتی (جەلال عەبدولڕەحمان)و (عەبدولڕەحمان کەریم) لەگەڵ تۆڵەسەندنو کوشتن بەرامبەر کوشتن بوون. ئەو کەسانە لەپێشدا هەندێ لەناودارەکانی تورکمانەکانیان لەمەبەستی ئەم پیاو کوشتنە ئاگادار کرد سوودی نەبوو، لەلای ئەوانیش کار بەدەست پیاوە ئاقڵەکانیانەوە نەمابوو، ئەو کوردە چاو سوورانە گەڕان یەکێکیان لەتاقم پیاو کوژەکان دەست نیشان کرد چوونە سەریو بەڕۆژی نیوەڕۆ لەناو بازاڕو دوکانی کوشتیان، کە ناوی (سەڵاح تەرزی.. سەڵاح خەیات) بوو چوارشانەیەکی چاپوكو ئازا بوو دوکانەکەی لەگەڕەکی (چای) نزیك بەئوتێل ڕافیدەین شێخ ڕەشید بوو... ئینجا ئەو دەستە سوورە چوو شەخسی دووەمی لەناو پیاو کوژاندا لەبەر دەرگای ماڵی خۆی لەگەڕەکی (پیریادی) کوشت، کە ناوی شوکور (شەکەرەی قایەچی) بوو بەیانی زوو لەخەو هەستا بچێتە کوورەکەی(کوورە گەچ) خۆی لەبەردەم ماڵی خۆیدا کوشتیان بەکوشتنی ئەو دوو کەسە ئیتر پیاوکوژان هاتنەوە هۆشی خۆیانو دەستیان لەو جۆرە دەستدرێژی کردنانە هەڵگرت.

* دەروی عەبدولکەریم قاسم لەڕووداوەکە :-
دەتوانین بەڕاشکاوییەوە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە (عەبدولکەریم قاسم)، دەورێکی گرنگی بینیووەو سیاسەتە چەوتەکەی دەورێکی باڵای بینیووە بەسەر ڕووداوەکەوە، ئەگەر بێتوو ڕوویەکی ڕاستەوخۆی نەبێت بۆ ڕووداوەکە بەڵام توانیوێتی باڵا دەستی بپێکێتو خۆی لەم چەند خاڵەی خوارەوە گەڵاڵەکردووە...
١- سیاسەتە دوو فاقەکەی (عەبدولکەریم قاسم) یەکێك بووە لەهۆکارە گرنگەکانی هەڵایسانی گەلێك ڕووداو وەکو ئەوانەی ڕوویدا لەشارەکانی (موسڵ)و (کەرکوك)و (بەسرە) و (ڕومادی)و (فەلوجە)و (دیالە)، کە هەریەکەی لەماوەیەکی

نزیك ڕوویانداو هاوشێوەی یەکتری بوون.

٢- عەبدولکەریم قاسم پیاوێکی عێراقی بوو، (اتحاد)و (وحدی) نەدەویست، بەڵام (عەبدولسەلام عارف)ی جێگری یەکگرتنی کتوپڕی داوا دەکرد. لەیەکەم ڕۆژەکانەوە ئەم دوو ناوداره ناکۆکی کەوتە ناویان، قاسم بۆ بەربەست کردنی قەومییەکان لەپێشدا پشتگیری شیوعیەکانی گرت و ماوەیەك بەری بۆ بڵاوکردن و کردی بەگژ قەومییەکانداو خۆیشی لەدوورەوە تەماشای دەکرد شیوعییەکان دروشمی چوونە سەر حکومیان بەرز کردەوە. ئەم هەڵچوون و داچوونەی نێوان شیوعی و قەومی سەرانسەری عێراقی گرتبۆوەو تارادەیەکیش لەکەرکوکیش ڕەنگی دابۆوە...کە عەبدولکەریم قاسم دەورێکی باڵای هەبوو لەم بەربەرەکانییە، بۆیە یەکێکی هاوسەردەمی خۆی ئاوا باسی دەکات ((ان عبدالكريم قاسم هو الذي ورط الاكراد في ذبح التركمان. كما ورط الضباط الثائرين في الموصل الى اعلان ثورتهم لكي يسحقهم..)) هەرچەندە بۆچوونەکە هەندێ هەڵەی تێدایە.

٣- عەبدولکەریم قاسم زۆر بەڕوونی ئاگاداری ئەوە هەبوو کە کارەساتێك وەکو ئەوەی موسڵ لەکەرکوکیش ڕوودەدا، بەڵام خۆی لێ گێل دەکرد چونکە چەند جارێك خوا لێ خۆشبوو (مەلا مستەفا)و (حیزبی شیوعی)و (پارتی) نوێنەریان چووە لای (عەبدولکەریم قاسم)و باسی وەزعی ناوخۆی شارەکەیان بۆی کرد، هەروەها گازندەیی (جبهه الاتحاد)و (انصار السلام)و ئاگادارکردنی چەند جارێکی بەڵگەن بۆ ئەوەی کە عەبدولکەریم قاسم ئاگای هەبوو، بەڵام بۆچوونەکانیانی بەهەند وەرنەگرتووە. هەروەکو ئەوەی لە(٢٦)ی کانونی یەکەم ١٩٥٨ عەبدولکەریم قاسمیان تێگەیاند دەربارەی بوونی ژمارەیەکی چەك لەماڵە تورکمانەکان، بەڵام بابەتی لێکۆڵینەوەکەی زۆرتەنگی و بێ نرخ سەیر کرد، ئەو کار راییە پێویستییەی نەکرد.

٤- پشتگیری کردنی (عەبدولکەریم قاسم) بۆ شیوعییەکان و (عەبدولسەلام عارف) بۆ قەومییەکان بووە هۆی دروست کردنی بەربەرەکانییەك کە تەقینەوەی لە شارێکی وەکو کەرکوك زۆر ئاسان بوو، یان بەشێوەیەکی راستر بڵێین بووە دروست کردنی بەربەرەکانی چینایەتی نەتەوەیش لەشارەکە کە ئەستۆی زۆرتری لەسەر عەبدولکەریم قاسم بوو کە جڵەوی ڕووداوەکانی شل کردبوو تا لەدەوری خۆی دوور کەوێتەوە.

٥- خۆشباوەڕی عەبدولکەریم قاسم لەڕوودانی ڕووداوەکان دەورێکی گەورەی بینی بۆ لەوەی (١٩٥٩)، لەوەی دواوەی ئەم ڕووداوە کە هەر جارەی خیتابەکانی لەمەڕ کارەساتەکە بەجۆرێك دەگۆڕی، کە باشترین نمونە لەنوێنەری تورکمانەکان بوو بۆلای (عەبدولکەریم قاسم)، کە بێ ئەوەی ئاگاداری راستی و چەوتی باوەڕەکانیان بێت، خۆشباوەڕانە خیتابەکەی لەکلێسەی (مار یوسف)دا، کە زۆربەی لایەنەکانی تاوانبار کرد.

٦- عەبدولکەریم قاسم زۆر باش دەیزانی کە تاوانباری ڕاستی کێیەو کێ هەڵگیرسێنەری ڕووداوەکەیە، بەڵام دەستە وەستان بوو لەئاست کار ڕاییکردن (إجراءات) دژی ڕووداوەکە، بۆیە ئەوانەی کە گیران بڕیاری ئیعدام کردنیانی نەدا تا ئەو لەژیاندا بوو، بەڵام کە (قەومی)یەکان هاتنە سەر حوکم بێ سێ و دوو جێبەجێیان کرد کە ئەمیش بەڵگەی بێ دەسەڵاتی بوو لەئاست ڕووداوەکە... لەهەمان کاتدا ڕوونی دەستی قومییەکان بۆ چنینەوەی ڕووداوەکە.

٧- پشێوی سوپا لەئاست ڕووداوەکان و کەرت کردنی سوپا بۆ چەند لایەنێکی سەر بەحیزبەکان، ئەمە وای کردبوو دەستە وەستان بێت بەدەست عەبدولکەریم قاسمەوە کە ڕووداوەکەی کەرکوك باشترین بەڵگە بوو بۆ ئەوەی سوپا تەماشا کەر بوو، نەیتوانی ئەو پشێوییە چارەسەر بکات...

*** هەڵسەنگاندنی زەمینەی ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩**

لەلاپەڕەکانی پێشوودا گەلێك لایەن و هۆکارو دەرئەنجامی ڕووداوەکەمان باس کردووە، کەوتینە شیکردنەوەی زەمینەی پێش ڕووداوەکان و دەوری هەریەکە لەو لایەن و هۆو ئەنجامەکانی لەسازدانی ڕووداوەکەدا، کارتێکردنی دەوروبەری ڕووداوەکە لەئاگر خۆشکردنی.

ئەوەی لێرەدا گرنگەو دەوری هەیە لەسازدانی باسەکەدا چۆنێتی ڕوودانی ڕووداوەکەیەو دیاری کردنی وەزعی گشتی چەند ڕۆژێکی پێش ئاهەنگی ساڵ ڕۆژی ١٩٥٩ی تەموزە، هەرچەندە کە لەوەو پێش نەخشەی بۆ کێشرا بوو، بەڵام چەند هۆکارێك دەوریان بینیووە، لەپەلەکردنی ڕووداوەکە. کاریگەری شۆڕشەکەی (شەواف) لەموسڵ، لێدان و گرتنی ئەوانەی کە هەڵسان بەکاری جووڵانەوەکە، دەورێکی ڕاستەوخۆی بینی لەسەر ناوچەیەکی وەکو کەرکوك و نزیکترین شوێن بوو لەموسڵەوە، جێگەیەکی هاوبەش بوو بۆ هەردوو ناوچەکە، کە سەرتاپای عێراق بگرێتەوە، خۆی لەخۆیدا دەورێکی بەرچاوی هەبوو بۆ شڵەژاندنی ناوچەکەو گرتنی ژمارەیەکی لەوانەی کە دەستیان هەبوو لەجووڵانەوەکەی (شەواف).

ئەوەی کە زیاتر ناوچەی کەرکوکی شڵەژان سیاسەتەکەی تەبەقچەلی و (جەنابی) لەئاست ڕووداوەکان و دروست بوونی بەربەرەکانی و پشێوی، تەبەقچەلی نەخشەکێشی جووڵانەوەکەی (شەواف) بوو، (جەنابی)یش دامەزرێنەری کپ کردنی جووڵانەوەی (قەومی)یەکان و ئاژاوە گێڕبوو بۆ تێکدانی ناوچەکە تا بەوەی شیوعییەکان جێ پەنجەی خۆیان لەناوچەکەدا بگرن. هەر بۆیە لەکاتی ڕوودانی جووڵانەوەکەی شەواف تا ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ هەرهەمووی زنجیرەیەکی نەپساوە بوو بۆ تێکدانی بارودۆخەکە لەشارەکە.

لەدوای ڕوودانی جووڵانەوەکەی شەواف (مجلس الوزراء) بڕیاریدا بەناردنی (فؤاد عارف)، وەزیری دەوڵەت بۆ سەرۆی عێراق بۆ هێور کردنەوەی بارودۆخەکە، کە لەدوایدا ڕاپۆرتێکی دا بەعەبدولکەریم قاسم لەئەنجامی گەشتەکەیدا کە بەم جۆرە بوو:. کە گوایە بێ هێزی زەبت و ڕەبت و بڵاوبوونەوەی پشێوی و ئاژاوەو بێ حکومەتی لەبەرامبەر دەسەڵاتی حیزبەکاندا بەتایبەتی حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردستان، هەریەکە بەپێی دەسەڵاتی لەناوچەکەدا، حیزبی شیوعی دەسەڵاتێکی گەورەی هەبوو بەتایبەتی لەڕیزەکانی سوپادا ئەویش بەوەی زۆری

سەرکردەکانی لەسەردەمی (جەنابی) لەشیوعییەکان بوون. بەلام کاتێك چووم لای عەبدولکەریم قاسم زۆر بەساردییەوە پێشوازی لێکردم چونکە ئەم جۆرە (مصارحة)انە لەگەل خۆی ئەودا نەدەگونجا، هەر لەهەمان کاتدا شیوعییەکان هەولیان دەدا کە گەشتەکە سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت کەگوایە ئەمە دژی دیموکراتییە.

لەدوای گەشتەکەی (فوئاد عارف) بریاریدا بەدانانی (موکەرەم تالەبانی) بەپارێزگار، بەلام پارێزگار هیچ دەورێکی نەبوو بەهۆی فراوانی دەسەلاتی (جەنابی)، بۆیە داوای کرد لە(عەبدولکەریم قاسم) بەزیادکردنی دەسەلاتی پارێزگارو کەم کردنەوەی دەسەلاتی جەنابی‌و بەردانی ژمارەیەکی زۆری تورکمان کە بەتاوانی (تۆرانی) گیرابوون‌و (جەنابی) بوختانی بۆیان کردبوو، بەلام داواکارییەکەی دووەمی جێبەجێ کردو داواکاری یەکەمی رەت کردەوە. تالەبانی باسی ئەوە دەکات کە عەبدولکەریم قاسم ترسی کوشتارێکی وەکو ئەوەی خستبووە پێش چاو، بۆیە پێشنیاری کردە سەر سەرکردایەتی حیزبی شیوعی بەگۆرینی سکرتێری دەستەی ناوخۆیی حیزب لەکەرکوك کە (نافع یونس) بوو، کە خەلکی شارەکە نەبوو بۆ دەرەوەی شارەکەو دانانی سکرتێرێك لەخەلکی شارەکە.

بەلام عەبدولکەریم قاسم هەموو ئەو پێشبینییانەی دەزانی و دەستە وەستان بوو لەئاست کار راییکردن‌و هێورکردنەوەی بارودۆخەکە.

بەردانی گیراوەکان هەرچەندە لەخۆیدا بووە هێور کردنەوەیەکی کاتی لەشارەکە بەلام لەهەمان کاتدا دەوری گرنگی بینی لەشلەژاندنی بارودۆخەکە بەتایبەتی لەرووداوی ١٤ی تەموز کە رق‌و قینەیەکی گەورەیان بەجێهێشتبوو لەدژی (جەنابی)و شیوعییەکان، دەیانویست تۆلەی خۆیان بکەنەوە. کە ئەویش زۆر بەروونی بەدەرکەوت‌و راستی قسەکەمان دەپێکێت...

دیاردەیەکی تری بەرچاو کە لەچەند رۆژێکی رووداوەکەدا روویدا بەرچاوی هاتنە پێشەوەی تورکمانەکان بۆ ئاهەنگ گێران بەبۆنەی ١٤ی تەموزەوە.

ئەوەی زۆر بەرچاو بوو و سەرنجی خەلکەکەی را دەکێشا لەو چەند رۆژەدا کۆمەلی تورکمانەکان بوون کە پشتگیری خۆیان بۆ شۆرش رادەگەیاندو ئاهەنگیان دەگێراو خۆیان ئامادە دەکرد بۆ جوانکاری‌و رازاندنەوەی شارەکە بۆ سازدانی ئاهەنگی تەموز، کە زۆر زیادەرۆیی‌و مەسرەفی تێدا دیاری دەدا، کە ئەمە خەلکی شارەکەی دەخستە شکەوە کە ئاوا بەکت‌و پری سەری هەلدا بۆ نمونە تورکمانەکان هەستان بەدروست کردنی کەوانە یان تاقێکی گەورەی ئاهەنگ گێران کە پارەیەکی زۆری تێدا خەرج کرابوو، کە شێوەی تاقەکە، وەکو دەروازەی وەزارەتی بەرگری وابوو، لەناوەراستەوە لەسەرەوەی رەمزی (شعار)ی سوپای عێراق پێدا هەلواسرابوو و لەژێریەوە بەناوی تورکمانەوە بیروبۆچوونی پشتگیری‌و دلسۆزی کۆمارو (زعیم) روون کرابۆوە.

بۆیە خەلک‌و لایەنەکان داوایان لە (مقر الفرقة الثانية) کرد کە گوایە ئەم جۆرە تاقە دەربری هەموو نەتەوەکانی عێراق نییەو داوای کار راییکردنی کرد لێیان‌و داوا کرا کە شکل‌و شێوەیەکی وای بۆ دابنرێت کە لەگەل خواستی نەتەوەکان بگونجێت.

هەر لەهەمان کاتدا لایەن‌و رێکخراوە دیموکراتییەکان کە داوای پارەیان دەکرد بۆ رازاندنەوەی ئاهەنگ، لەپارێزگا گەلێك (حجە)یان دەهێنایەوە بەکەمی دیاری کردنی پارە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە بۆ سەرف کردنی لەئاهەنگ گێراندا، کە لەهەمان کاتدا رێگە بەتورکمانەکان دەدرا بەو جۆرەی کە ئەم لەخۆیدا بووە هۆیەکی گەورە بۆ پشێوی لەشارەکە یەکێك لەو هۆیانەی کە دەوری بینی لەپشێوییەکەدا دەورە درانی هێزێکی زۆری سەربازی لەناوچەی کەرکوك پێش رووداوی ئاهەنگەکانی ١٤ی تەموز، وەبێ رەبت‌وزەبتی سەربازی تیانداو زال بوونی سیفەتی حیزبی بەسەر شێوازی سەربازیدا، کە هەندێك لە ئامرەکانی ئەم هێزە سەربازییە پشتگیری‌و رێگەیان دەدا بەسەربازەکانیان بەدروست کردنی قول‌و دەستەی حیزبایەتی بەنێو (وحدە) سەربازییەکان‌و سەر بەرێکخراوە دیموکراتیەکاندا، کە هەندێك لەسەربازەکان پەیوەندیان بوو بەحیزبەکانەوەو کە لە(جبهە)دا بوو لەناو کەرکوك.

یەکێك لەوانەی کە رێگەی ئەم جۆرە کارانەی دەدا لەنێو هێزە سەربازیەکان (داود جەنابی) بوو گەلێك بەلگە ئەوە دەسەلمێنێ کە ژمارەیەك زۆر لەکاتی ئەودا هاتووچۆی (الفرقة الثانية) یەیان دەکردو راوبۆچوونی خۆیان دەخستەروو دەربارەی روو دەربارەی دانان‌و گواستنەوەی سەربازو ئەفسەرەکانی فرقەکە، کە بەتایبەتی (سرية انضباط) باشترین بەلگە بوو بۆ کنەکردنی ئەو جۆرە کەسانەو بەشداری راستەوخۆی کرد لەرووداوەکەی سالی ١٩٥٩..

هەروەها کارێکی ترکە ئەم هێزە سەربازیانە پێی هەلسان، ئەو کارە (استفزازية)یان بوو لەلادێ تورکمانەکان، بەماوەیەکی کەم پێش رووداوەکە، بۆ گەران بەدوای چەك‌و کۆکردنەوەی لەخەلکەکە هەتا لەچەکی رێگە دراویش، دەورێکی گەورەی بینی لەپشێوی رووداوەکە.

رێگەدانی ئەفسەرەکانی ئەم وحدانە بەسەربازەکانیان بەبەشداری خۆپیشاندانەکان کە ئەمە وای دەکرد لێیان بچنە دەرەوەی رەبت و زەبتی سەربازی‌و ببێتە بەرەلایی هێزە سەربازیەکانیان...

ئەوەی کە زیاتر بەدەردەکەوت لەم پشێوییە لە(وحدة) سەربازییەکان (لواء مشاه الرابع)و (كتائب المدفعية) بوو لە (الفرقة الثانية)، کە زۆر بەئاشکرا جیاوازی لەنێوان سەربازەکان‌و هەرەشەکردن‌و تۆقاندنی تێدا بلاوبوو بۆوە... شتێکی گرنگ کە جێگەی باسە، رووداونی جوولانەوەکەی شەواف‌و هەرەس هێنانی‌و بەبەشداری ژمارەیەکی بەرچاوی (قەومی)یەکان شاری کەرکوك تیایاندا بەتایبەتی سەرانی سەر بە تەبەقچەلی وای کرد کە هەریەکە لەحیزبی دیموکرات‌و حیزبی شیوعی زۆر بەورییایی لەبارودۆخەکە بجولێنەوەو لەبچوکترین کار سەرنج بدەن کە تا شتی لەوەی شەواف رونەدات.. یان بترسن لەدەست وەشاندنی عەبدولکەریم قاسم لەشیوعییەکان بەتایبەتی پاش جوولانەوەکەی

شەواف و گرتنی (الجنابی)، کە بووە بەڵگە بۆ جێ پێ شێل کردنی شیوعییەکان و بەرچاوی کارەکانیان لەناوچەکەدا، کە ئەمەش وای کردبوو لەشیوعییەکان کە هەنگاو بنێن لەمەر کارێکیان کە پێی هەڵدەستن و زۆر بەوریاییەوە سەرنج بدەن لەدەوروبەرەکەیان، بەتایبەتی لەجووڵانەوە بەرچاوەکانی تورکمانەکان.

*** چۆنێتی ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩**

**مامۆستا مستەفا نەریمان ئاوا باسی دەکات:**

_((...بۆیەکەم بیرەوەری شۆرشی چواردەی تەموز هەموو قوتابخانەکان و رێکخراوەکان خۆیان ئامادەکرد، منیش وەك بەرێوەبەرێکی قوتابخانەی (نەجاح) لەبەر تەکیە ئۆتۆمۆبیلێکمان بۆ ئەو نومایشە رازاندەوە، رێکخراوەکان بەلاوان و جوتیاران و کرێکاران و ئافرەتانەوە رێرەوێکی گەورەیان ئامادەکرد قوتابخانەکانیشیان لەگەڵدا بوو ئەو رێرەوە پردی (تەبەقچەلی) بڕی و لەدەوری قەڵا سووڕایەوەو هاتەوە سەر پردی بەرامبەر شەقامی (ئەتڵەس)، کە نووکی ئەو رێرەوە گەورەیە گەیشتە بەرامبەر چایخانەی (یلدز)، هوتاف کێشان دژ بەرەجعیەت و تۆرانیەت لەشیوعییەکانەوە گەرمتر بوو هەندێ لەلاوە تورکمانەکان لەو چایخانەیە دانیشتبوون و دروشمی خۆیان بۆ پشتگیری کردنی شۆرش هەڵواسیبو، لەناوچاخانەکەدا گوایە رێرەوەکە بەردەباران کرابوو ئەمانیش بەردیان تێگرتن نەخێر بوو بەشەرە تێلاو گوایە یەکێك لەدەرەوەی رێرەوەکە دەمانچەیەکی تەقاندوەو ئیتر بوو بەتێك ڕژان و شەرە بەردو تەقەی دەمانچەو رێرەو تێك چوو...

بەڵام ئەوەی لەراپۆرتی بەرێوەبەری پۆلیسی کەرکوك هاتووە بەم جۆرەیە..:-

((دەستەی ئاهەنگ گێرانی کەرکوك کاتژمێری شەشی ئێوارەی دانا لەرۆژی (١٤ تەموز) بۆ کاتی دەرچوونی رێرەو ئاهەنگ بۆ رێکخراوە دیموکراتیەکان بەسەر شەقامە سەرەکیەکانی کەرکوکەوە. لەنزیکەی کاتژمێری حەوتی ئێوارە لەکاتی گەیشتنی رێرەوەکە بۆ پردە کۆنەکە لەرێگەیەوە بەرەو لای قەڵا بەرەو رێرەوی خۆپیشاندانی تورکمانی بووە کە سواری ئۆتۆمۆبیلی سەربازی بووبوون، هەستام چوومە نێوان هەردوو رێرەوەکەو بەرەو پێشەوە چووم و رێرەوەکە من لەسەریەوە بووم، لەکاتی گەیشتنم بۆ شەقامی (الاستقلال) چاوم بەتابوورێکی (٦٠) سەربازی کەوت کە گوریسیان هەڵگرتبوو کە رایان دەکرد بەپێچەوانەی رێرەوەکەو لەسەر ئەمری خۆم پیاوانی پۆلیس لایان دا بەرەو شەقامی تەنیشتی (مدیریە المعارف)، کاتێکیش رێرەوەکە گەیشتە بەرامبەر چایخانەی (١٤ تەموز)، کە تورکمانەکان هوتافی خۆیان دەدا. گوێم لەدەنگی تەقە بوو، بەڵام زۆر زەحمەت بوو ئەو کەسە دیاری بکەم کە تەقەکەی دەکرد، بەڵام خۆپیشاندەرەکان هێرشیان کرد، لەدوایدا بووە تێك ڕژان و بووە بەکارهێنانی سەربازو پیاوانی (المقاومە) بەکارهێنانی چەك کە بووە کوشتنی (٢٠) تورکمان و لاشەکانیان راکێشرا. هەموو ئەم کارانە لەلایەن سەربازو پیاوانی (مقاومە)و (الشعب)و خەڵك دەکراو لەهەمان کاتدا (رجال المقاومە) هەستان بەهێرش کردنە سەر پۆلیسخانەی (ئیمام قاسم) و دەستیان گرت بەسەر (١٨) چەکی پۆلیس و چەکەکانی کەتایبەت بە (مقاومە) بوو لەلایەن (نوری وەلی)و کۆمەڵەکەی کرا ...

ئەوەی کە سەرنج دەدرێت لەسەرەتای یەکەم رۆژی ڕووداوەکە، چەند خاڵێك هەیە کەجێگەی باس و هەڵوێستە لەبەرامبەریدا.

هەست دەکرێت بەبوونی بەربەرەکانیەك لەنێوان حیزبی شیوعی و تورکمانەکان، کە هەریەکەی ویستویە خۆی بەدەربخات بەوەی کە پێی باشتر بووە، یان بەرووبەکی تر هەست کردنی هەریەکێکیان بەجیاوازی بۆچوونیان لەگەڵ ئەوی تر لەمەر شیکردنەوەی پشتگیری چالاکیەکانی شۆرشی (١٤)ی تەموز.

هوتاف کێشانی هەریەکەیان خۆی لە هێڵێکی جیاوازو خاوەن گێروگرفت دەگواستەوە، کە جیاوازی هەریەکێکیانی بەدەر دەخست.

رێگەدان بەبەرا تورکمانەکان بەرازاندنەوەی تاقێکی گەورەو بەرچاو لەشارەکەدا، خۆی لەخۆیدا دیاری کردنی دەستێکە بۆ ئاژاوە گێڕان و خەفەکردنی ئەو دەستە لەنێو تورکمانەکان بۆ تەقینەوە، دژی حیزبی شیوعی، چونکە ئەوەی کە سەرنجمان دەدات کە لەو چەند رۆژەی دوایی بەرچاو دەکەوت، تورکمانەکان بەشێوەیەکی دیارو بەرچاو دەهاتنە پێشەوەو خۆ خستنە پێشیان و بەقسەی خۆیان کە لەناو شاردا بڵاویان دەکردووە کەبزانە لەرۆژی ئاهەنگ چیدەکەن و لەکاتی رووخاندنی تاقەکەی کەلەلایەن خۆیان دروست کرا بوو پری بوو لە(دۆنکی) کە هەڵگیرا بوو بۆ مەبەستێکی دیارو نەخشەیەکی بەرچاو. هەندێك سەرچاوە کە ئاماژە بۆ بەربەرەکانی کوردو تورکمانەکانە کە دەکەن، بەڵام لەوەو پێشی ڕووداوەکە هیچ جۆرە ئاژاوەیەکی نێوان ئەم دوو نەتەوەیە رووی نەدا لەگەڕەکەکانی کەرکوك کە جێگەی سەرنج بێت، ئینجا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە کە چۆن راستەوخۆ بەربەرەکانییەکە لەنێوان کوردو تورکمانە کە بوو لەگەڕەکێکی وەك (ئیمام قاسم)و (ئاخور حوسێن) خێزانە کوردەکان باوەشیان کردەوە بۆ برا تورکمانەکانیان لەگەڕەکەکانی قەڵاو ڕوحی خۆشەویستی خۆیان بەدەرخست، کە ئەمە دەخەمە روو پاکانە بۆ کورد ناکەم بەڵام زمانحاڵی تورکمان باس دەکەم، کەس باسی ئەم هەڵوێستەی کورد دەکەن ئینجا چۆن گیانی بەربەرەکانیان تێدا هەبووە...

لەکاتی ڕووداوەکەدا، هەرچەندە کە بەژمارە کوردەکان لەشارەکە ژمارەیان زۆر بووە، بەڵام ئەو خۆپیشاندانەیان نەبووە بۆ ئاهەنگەکە، کە وەکو برا تورکمانەکان خۆیان بەدەربخەن کە ئەمەش بەڵگەیە کە دەستێك نەبووە سازیان بدات بۆ ئەو ڕووداوە کە بۆ نمونە حیزبێکی وەکو (پارتی) یان (شیوعی)، دەستی هەبووبێت لەرێکخستنی خەڵکەکە.

ئەوەی سەرنج دەدرێت لەراپۆرتەکان کە برا تورکمانەکان بەئۆتۆمبیلی سەربازی سووراونەتەوەو رێرەوێکی بەرامبەر رێرەوە گشتییەکان کردووەو هوتافی زەقیان خستووەتە روو

كە جێگەی هەڵوێست بووە.

بوونی هێزێكی سەربازی لەنێو ڕێرەوەكە بەڵگەیە بۆ بوون و دەوری (الفرقة الثانیة)، لە ڕێكخستنی ئاژاوەكەو سازدانی، كە لەكاتێكدا ئاسایشی ڕێرەوەكە لەئەستۆی پۆلیس دا بووە نەك هێزی سەربازی.

تەقاندنی دەمانچە لەلایەن یەكێكی نادیارەوە لەنێو ڕێرەوەكەو لەنزیك چایخانەكەی توركمانەكان، بەڵگەیە كە دەستێكی شاراوە خۆی حەشاردابوو بۆ تەقینەوە لەهەمان شوێن. بەڵام شتێكی تر هەیەو جای سەرنجەو پێویست بەهەڵوێست دەكات لەبەرامبەریدا بوونی ئەوەیە كە جیاوازی بكەین لەنێوان (تۆرانی)و (خەڵكە گشتتییەكەی توركمان) لەو ئاهەنگ گێرانەدا.

((سەرچاوەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە تۆرانییەكان ڕێرەوێكی تایبەتییان كرد لەشەقامی (ئەوقاف)و ژمارەیەك توركمانی سادەیان لەگەڵ بوو بێ لافیتەو ڕازاندنەوەو، ڕێرەوەكە ژمارەیەك منداڵیان لەپێشەوە دانا بوو كە بانگەوازی ((عاش الزعیم وتعمی عیون اعدائنا)))، بەڵام لەدوای دووچار ڕۆیشتنی ڕێرەوەكە لەهەردوو شەقەماكە منالەكانیان دوور كردبۆوە لەڕێرەوەكە.

لەسەعاتی حەوت و چارەك ڕێرەوی حكومەت و گەل هاتە نێو شەقامی (الاستقلال)، لەكاتی گەیشتنی هەندێك دەستەی ڕێرەوەكە بەرامبەر چایخانەی ١٤ی تەموزو سینما (اطلس)و دوكانی شیش كباب، لەو شوێنەدا تۆرانییەكان. كۆبونەوەو كەرێرەوەكان هوتافیان لیدەدا بەژیانی عەبدولكەریم قاسم و برایەتی نەتەوەكان، كە لەوكاتەدا ڕێرەوەكە شلەژا بەبەردە باران كردنی بەبەرد لەشەقامەكەو لەسەرەوەی بانەكان و چایخانەی ١٤تەموز، كە هەندێك لەتۆرانییە دیارەكان هەوڵیان دا بەبرینی هێلی كارەبایەكە بەسەر خەڵكیدا بۆ ئەوەی كە بیانگرێت، هەروەها تەقەكردن بووە تێكدانی ڕێرەوەكە، كە بووە شلەژانی خەڵكەكەو هەوڵدان بۆ بەرگری كردن لەخۆی، كە هەندێكیان هەستان بەبەردە باران كردنی دەست درێژی كەران بەردو پێكدان ڕوویدا كە لەهەردوو لاوە بریندار ڕووی دا، كە بووە كوشتنی خاوەنی چایخانەكە، كە دەمانچەی تەقاند لەنێو چایخانەكەوەو لەنێو چایخانەكە گەورەی تۆرانییەكان دانشتبوو، لەدواییدا پێكدادانەكە فراوان بووەو دەنگی تەقە لەقەڵاوە دەبیسرا))

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا ئەگەر ئەمە هەڵوێستی تۆرانییەكان نەبێت، ئەی لەسەروبەرندی تۆرانی و (قومی) یەكان لەو ئاژاوەیەدا ڕوون دەكاتەوە وەكو ((بۆئەوەی كە هەوڵ بدەین بۆ دیاری كردنی ڕاستییەكان و دەركردنی ڕەگی ڕاستییەكان، كە لەكتێبخانەی (عباس حلمی) گەلێك وێنەی (عەبدولسەلام عارف)و (جەمال عەبدولناسر)و ژمارەیەكی چەكی وەكو رەشاش و برنەو دۆزرانەوە، هەروەها دۆزینەوەی سندوقێكی گولەو چەك لەماڵی (نازم تەبەقچەلی)و دۆزینەوەی رەشاشێك لەچایخانەی (شاترلو)و گرتنی دەمانچەیەك لەژنێك كە لەقەڵاوە هاتبووە خوارەوە، وە دۆزینەوەی گلۆپ كە لەناویدا ئالای توركی تێدا هەبوو....[٥٠] لێرە دەگەینە ئەو ڕاستییە كە پەیوەندی نێوان تۆرانی و قومییەكان، لەنێو شاردا هەبووەو دۆزینەوەی وێنەكان بەڵگەی دەستێكی دەرەكیش هەبووە لەگێرانی ئاژاوەو ئاگر خۆش كردن.

**كارتێكردنی ڕووداوەكە بەسەر پەیوەندی نەتەوەكانی شارەكە**

ڕووداوەكە چەند ڕۆژێكی خایاند بەڵام كاریگەری بەسەر چەند سەردەمێكی نەتەوەكانی شارەكەدا مایەوەو، تا ئێستا هەندێك خاڵ و هێڵی كاری ئەو ڕووداوە بەسەر شارەكەدا ماوەو دەمێنێت تا بەتەواوەتی عێراق ئارام نەگرێت ئەو بەربەرەكانییە هەر بەردەوام دەمێنێت..

گرنگترین خاڵێك كە جێ‌پەنجەی خۆی بەجێ‌هێشت بووە لێك ترازانی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی نەتەوەكانی شارەكەو، بووە دروست كردنی كەلێن و بوغزو قینە لەنێوانیاندا. كە هەریەكەی بووە هەڵگرتنی هەڵوێست دژی ئەوی تر.

ئەم كارتێكردنە بەدیاری دا لەپەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی وەكو ژن هێنان و دراوسێیەتی و برادەریی و پەیوەندییە كارگێری و بەڕێوەبەرییەكان هەر لایەك، كە تا ئەم ساڵانەی دوایش ئەم لێك ترازانە بەزەقی بەدەردەكەوت و خەڵكەكە تێدا دەناڵن و لایەنە دەرەكییەكان هەریەكەی بەجۆرێك دەیهۆنێتەوەو ڕێگەی بۆ دادەنێت، كە هیچی لەبەرژەوەندی نە كوردەكەو نە توركمانەكە نییە..

خاڵێكی تر كە لەدوای ڕووداوەكەدا ڕوویدا پیا وكوشتن و تێزاب ڕشتن و چاو سووركردنەوە لەكاربەدەستانی كورد لەلایەن توركمانەكانەوە زۆر بەزەقی دیاری دا ((.. پاش ئەو گرتن و بەرەڵلاكردنە هەندێ داخ لەدڵان شێوازێكی ناشرینیان گرتەبەر ئەویش (تێزاب ڕشتن) بەسەروچاوی ئەمو ئەو لە (خاڵۆ سەعید)ی باوكی مامۆستا (حوسێن سەعید)ەوە دەستیان پێكرد ئینجا بەرگدرو (محێدین جەباری)و مامۆستا (محەمەد قەرەداغی)و بازرگان (ئەحمەدی حاجی رەزا) كە ئەم پیاوە ئازایە كابرای تێزاب بەدەستی گرت و بردییە پۆلیسخانە كەچی تاوانباریان بەرەڵلا كردو (ئەحمەد) خۆیان تەوقیف كرد، كاربەدەستانی كەركوك بەبەرچاویاندا ئەم دەست درێژییانە ئەكرا كەچی دەستە پاچە قپ و قر وەستا بوون هەر لەو هەڵو مەرجەدا دەست درێژی لەهەندێ كەس كرا (ئۆجین) خاوەن كتێبخانە لەشەقامی ئەوقاف كوژرا بەبیانووی ئەوەی شیوعییە، قەسابێك توركمانی شیوعی لەبەری قەڵا لەناو دوكانەكەی خۆی كوژرا، (حەمەد ئەمین شەربەتچی) لەبەردەم قەیسەری كوژرا، وا دیارە دەستێكی سوور بۆ ئەم دەست درێژی كردنانە لەژێر باڵی كاربەدەستانی كەركوك هاتبووە گۆڕێ...

هەروەها هەوڵی كوشتنی بەڕێوەبەری تەندروستی كەركوك (ئەحمەد عوسمان) كە خەڵكی هەولێر بوو درا كە ئەوەی ناردبوویان ئاگاداری كردبۆوە، هەروەها هەوڵی كوشتنی (د. موزەفەر حەساری)یان دابوو كەگوایە ئۆتۆمبیلەكەی ڕەنگی سوورەو دیارە شیوعییە .. بۆیە كەركوكی بەجێهێشتوو لەبەغدا نیشتەجایە ((كوشتنی قومیسەرێكی ئەمنی كورد لەقەڵا بوو لەبنەماڵەی (بابان) بوو لەبەردەم ماڵەكەی كوشتیان...)).

**هەوڵدان بۆ دەرکردنی ژمارەیەکی زۆر لەکارمەندانی کورد لەدامودەزگاکانی حکومەت بەفیتی کاربەدەستانو جێ خۆشکردنی کارمەندنی (قومی)و تۆرانچییەکان لەجێگەیان. هەر بەوەوە نەوەستا بەڵکو هەزاران کەس هاتە گرتنو بەفیتی ئەمو ئەو کەوتە بەر داوی کوشتنو هەزاران بێتاوان لەبەندینخانەکان توند کران.**

*** چەند پێکێ لە مێژووی یەکێتی خوێندکارانی کوردستان (ی. خ. ك):-**

**سمکۆ شوانی**

بیری دامەزراندنی ڕێکخراوی خوێندکاران لەلایەن ڕابەر و هەڵگیسێنەرانی شۆڕشی نوێی گەلی کوردستان چەکەرەی کرد. بۆیە دوای کۆمەڵێك دانیشتن و گەڵاڵەکردنی دامەزراندنی ئەو ڕێکخراوە لە ٢٦ی نیسانی ١٩٧١، یەکێتی خوێندکارانی شۆڕشگێڕی کوردستانی عێرا ق لە کۆبوونەوەیەك لە کەرکوك لە ماڵی مامۆستا محەمەد حەسەن خورشید دامەزرا.

بەشداربووانی کۆبوونەوەی دامەزراندنی هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسول عەلی، ڕەوف ئاکرەیی، شەهید شامیل، بوونە، ئەم پێنج کەسە شەهید ئازاد هەورامی بە یەکیانی ناساندووە بۆ ئەم کارە، دوایی لەسەر ڕاسپاردەی بەرێز مام جەلال وشەی شۆڕشگێڕی لێ لادراوە، لەبەر ئەوەی خوێندکاران توێژێکی کۆمەڵن نەك چین، بۆیە ناکرێت شۆڕش بەرپا بکەن بەڵکو دەتوانن پشت و پەنای شۆڕش بن، بۆیە ناوەکەی گۆڕا بۆ یەکێتی خوێندکارانی کوردستانی عێراق و دواجار بە حوکمی بیرە جیاوازەکان لەسەر شۆڕشی نوێی گەلەکەمان ناوەکەی بۆ یەکێتی خوێندکارانی کوردستان- عێراق، دواتریش بۆ کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان ناسراو تا ئێستا بەو ناونیشانە خزمەت بە خوێندکاران دەکات.

هەر لەسەر ڕاسپاردەی مام جەلال یەکێتی خوێندکاران بە درێژەپێدەری یەکێتی قوتابیانی کوردستان خۆی ناساند، ساڵانە لە یادی دامەزراندنی یەکێتی قوتابیان لە ساڵی ١٩٥٣ بەیاننامەی دەرکردووە.

یەکێتی خوێندکارانی کوردستان لە درێژەی خەباتی لەپێش ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ سێ کۆنفرانسی بەستووە:-

کۆنفرانسی یەکەم لە ٥ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٨ لەژێر دروشمی (خوێندکاران جۆگەلەیەك ڕۆشنبیرن بۆ شۆڕشی نیشتمانی دیموکراسی لە کوردستاندا) بەسترا لەبەر هەڵە و کەموکورییەکانی ئەم کۆنفرانسە گیروگرفتی فیکرە جیاوازەکان لە ٣ی ئاداری ساڵی ١٩٨٠ کۆبوونەوەیەکی بە پەلە ساز دەکەن وەك درێژە پێدەری کۆنفرانسی یەکەم، بەڵام وەکو پێویست ناگەنە ئەنجام.

کۆنفرانسی دووەم لە گوندی (بارەپان) نزیك قەڵادزێ لە ٢٠-٢٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٢ بەسترا لەژێر دروشمی (لەپێناو پتەوکردنی ڕیزەکانی خوێندکاران گرێدانی خەباتمان بە خەباتی سەرجەم خوێندکارانی کوردستانەوە، بەشداربووان بەم شێوەیە بوو:-

جەمال عەبدوڵلا، ڕۆستەم ناسراو بە هەڵکەوت عەبدوڵلا، خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی بوو تەواوی نەکردبوو لەبەر ئەوەی لەلایەن ڕژێمەوە ئاشکرا دەبێت و ڕادەکات کە ئەوکات لە دەرەوە بوو نەك لەناو شار، لە کەرکووکەوەش ساڵح عەزیز ڕەشید، کە ئێستا بە سالار ڕەشید ناسراوە و ئەوکات ناوی نهێنی جوتیار بووە، خالید محەمەد فاتیح، لە موسڵەوە د. عیسام نامیق و ڕزگار ناوێك، لە هەولێریشەوە سیروان کەریم خەڵکی کەلار بوو خوێندکاری زانکۆی سەلاحەدین بوو، لە سلێمانییەوە ئاوات ئەحمەد عەلی ناوی نهێنی (سەرچڵ) بوو.

*** هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی خوێندکاران لە کۆنفرانسی دووەم:-**

١- جەمال عەبدوڵلا ڕۆستەم (هەڵکەوت سکرتێری (ی. خ. ك)

٢- ئاوات ئەحمەد عەلی (سەرچڵ) لێپرسراوی لقی سلێمانی.

٣- ساڵح عەزیز ڕەشید (سالار ڕەشید) لێپرسراوی لقی کەرکوك.

٤- د. عیسام نامیق لێپرسراوی لقی موسڵ.

٥- سیروان کەریم لێپرسراوی لقی هەولێر.

لەدوای کۆنفرانس عیدۆ قاسم شوکر ناسراو بە (شوان) خەڵکی ئاکرێ کە تازە ببوو بە پێشمەرگە و لە بارەگای خوێندکاران لە بالیسان کرا بە لێپرسراوی لقی دهۆك

لەدوای ماوەیەك هەڵکەوت بەرەو هەندەران کۆچ دەکات و واز دەهێنێت، دکتۆر لە جێگەی ئەو دەبێت بە سکرتێر، هەروەها سیروان کەریمیش خوێندن تەواو دەکات و واز دەهێنێت، بۆیە لە شوێنی ئەو ساڵح عەزیز ڕەشید دەبێت بە لێپرسراوی لقی هەولێر و زانکۆ، خالید محەمەد فاتیحیش لە شوێنی ساڵح دەبێت بە لێپرسراوی لقی کەرکوك، خالیدیش لە ساڵی ١٩٨٣ واز دەهێنێت لە شوێنی ئەو عیزەددین مەجید (کرێکار) دەبێت بە لێپرسراوی لقی کەرکوك.

کۆنفرانسی سێیەم لە خوێندنگەی سەرەتایی گوندی خەتێ لە دۆڵی خۆشناوەتی بە دروشمی (بەرەو پتەوکردنی ڕیزەکانی یەکێتیمان و گەشەپێدانی خەباتمان و گرێدانی بە جەماوەری شۆڕشگێڕی کوردستانەوە) بەسترا.

*** ستافی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی ی. خ. ك ئەمانە بوون کە بەشداربوون لە کۆنفرانسەکە:-**

١- د. عیسام نامیق سکرتێر و لێپرسراوی لقی موسڵ، بە حوکمی ئەوەی خوێندکاری زانکۆی موسڵ بوو.

٢- ساڵح عەزیز ڕەشید خەڵکی کەرکوك، ئەندامی ئەنجوومەن و لێپرسراوی لقی هەولێری ی. خ. ك. کە خوێندکاری کۆلێژی زانست بوو لە زانکۆ سەلاحەدین لە هەولێر.

٣- عیزەددین مەجید (کرێکار) خەڵکی کەرکوك خوێندکاری زانکۆی سەلاحەددین، ئەندامی ئەنجوومەن و لقی کەرکوك.

٤- جەزا ئەحمەد کوردە، خەڵکی سلێمانی و ئەندامی ئەنجوومەن و لێپرسراوی لقی سلێمانی.

٥- عیدۆ قاسم شوکر (شوان) ئەندامی ئەنجوومەن و پێشمەرگەی بارەگای خوێندکاران و لێپرسراوی خوێندکاران.

کۆنفرانسەکە سێ شەو و سێ ڕۆژی خایاند و تەوەرەکانی بریتی بوون لە:-

- خوێندنەوەی نامەی ئەو سەرکردانەی بە نامە بەشدارییان لە کۆنفرانسەکە کردبوو وەکو مەلا بەختیار، د. پێشەوا تاڵەبانی، د. کەمال خۆشناو.

خوێندنەوەی ڕاپۆرتی ی. خ. ك لەلایەن د. عیسامەوە لە کار و چالاکییەکانی ئەنجوومەن لە ماوەی ساڵانی ١٩٨٢-١٩٨٤ بەتایبەتی ئەو ماوەیە، ماوەیەکی پڕ گەرم و گوڕی خەباتی خوێندکاران بوو وەك خۆپیشاندانەکانی خوێنداکاران لە شارەکانی کوردستان و زانکۆکانی عێراق و زانکۆی سەلاحەددین لە هەولێر و دواییش خۆپیشاندان و مانگرتنەکانی خوێندکاران لە سەرجەم خوێندنگاکانی کوردستان بە کەرکوکیشەوە بۆ نارەزانی دەربڕین لەسەر دەرکردنی ئەو خوێندکارە کوردانەی ئامادە نەبوون لە وەرزی

هاوینی خوێندن بێن بە جەیش ئەلشەعبی هەروەها باسی گفتوگۆی ڕژێمی بەعس و یەکێتی نیشتمانی کوردستان یەکێك بوو لە باسە گرنگەکانی.

- دارشتنەوە و پەسەندکردنی پەیڕەو و پرۆگرامی نوێی (ی.خ.ك).

- هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی (ی.خ.ك).

- سەرجەم ئەنجوومەنی کۆن ئامادە نەبوون خۆیان هەڵبژێرنەوە، دوای کۆنفرانسیش بە وازهێنانی جەماعی دوو توێی ڕاپۆرتێکی وازهێنانی ١٧ لاپەڕەیی واژۆکرا بۆ وازهێنان لە ڕیزی یەکێتی خوێندکاران.

ئەوانەی بۆ ئەنجوومەنی سەرکردایەتی هەڵبژێردران بریتی بوون لە:-

١- ئەحمەد مەحموود محەمەد (ڕەئوف) خەڵکی سلێمانی گەرەکی کانێسکان کە ئەوکات خوێندکاری ٦ی ئامادەیی بوو، لەدواییدا کۆلێژی کارگێڕی و ئابووری تەواو کرد لە زانکۆی بەغدا و ئێستا مامۆستایە لە سلێمانی، ماوەیەکیش لە ناوەندی پیرەمێرد بوو لە سلێمانی.

٢- ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد (سمکۆ شوانی) کە ناوی نهێنی لەناو خوێندکاران شاهۆ بوو لە کەرکوك لە گەرەکی لای حەمام عەلی بەگ، ئەوکات خوێندکاری ئامادەیی ئەبو ئەیوب ئەلئەنساری بوو کە هەڵبژێردرا بۆ ئەندامی ئەنجوومەن و لێپرسراوی لقی کەرکوك، کۆنفرانسی ناوخۆی لەماڵی ئەوان کرا بۆ بەشداری کۆنفرانسی سێ لە گەرەکی حەمام عەلی بەگ.

٣- سیروان خەڵکی هەولێر بوو ئەوکات خوێندکاری ئامادەیی بوو لە ناوەندی شۆڕش لە هەولێر، ئەندامی ئەنجوومەن و لێپرسراوی لقی هەولێر بوو، ناوبراو نزیکەی ساڵێك دوای کۆنفرانس بەرەو هەندەران کۆچی کرد لە شوێنی ئەو نەجات فاتیح ئەمین خەڵکی کەرکوك دانیشتووی هەولێر وەك لێپرسراوی لقی هەولێر، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە سمکۆوە هەبوو.

٤- کەسێك خەڵکی قەڵادزێ، ئەوکات خوێندکار بوو لە زانکۆی موسڵ هەڵبژێردرا بە ئەندامی ئەنجوومەن و لێپرسراوی لقی موسڵ.

٥- فازڵ عوسمانی فەقێ عەزیز، خەڵکی کەرکوك، گەرەکی ئیمام قاسم لەبەر ئەوەی هەر ئەو تەنیا خوێندکاری زانکۆی تەکنەلۆژی کۆلێژی ئەندازیاری بوو لە بەغدا ئەو دەستنیشان کرا بە لێپرسراوی لقی بەغدا، کە پێشتر ئەو لقە بوونی نەبووە.

٦- عیدۆ قاسم شوکر (شوان) وەکو ئەندامی ئەنجوومەن و لێپرسراوی لقی دهۆك داندرایەوە.

ئەنجوومەنی تازە دوای تەواوبوونی کۆنفرانس لە درەنگانی شەوی ٩ی تەمووزی ساڵی ١٩٨٤ لە هەمان خوێندنگەی سەرەتایی خەتێ کۆبوونەوەی یەکتر ناسینیان ئەنجام دا چونکە لەم کۆنفرانسە هەموو بە دەمامکەوە بوون، هەر لەو کۆبوونەوەیە وادەی کۆبوونەوەی ئەنجوومەن دیاریی کرا، کە ماڵی ئەحمەد مەحموود ڕەئووف لە گەرەکی کانێسکانی لە سلێمانی بۆ زیاتر یەکتر ناسین و کاری داهاتووی خوێندکاران و وەرگرتنەوەی لیستی ئەو ڕێکخستنانەی لای ئەنجوومەنی کۆن بوو.

هەروەها بەپێی پەیڕەو پرۆگرامی پەسەندکراوی کۆنفرانسی سێ لە یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی خوێندکاران دەنگ لەسەر هەڵبژاردنی سکرتێری (ی.خ.ك) بدات کۆبوونەوەکە بەپێی وادەی دیاری کراو ڕۆژی هەینی ٢١ی تەمووزی ساڵی ١٩٨٤ لە ماڵی ئەحمەد لە سلێمانی ئەنجام درا تیایدا بە دەنگی ئامادەبووان لێپرسراوی لقەکانی هەولێر و سلێمانی و موسڵ و کەرکوك دانرا.

ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد(سمکۆ) هەڵبژێردرا بە سکرتێری یەکێتی خوێندکارانی کوردستان سەرباری لێپرسراوێتی لقی کەرکوك تا ساڵی ١٩٨١ بە نامەیەکی دەستلەکارکێشانەوەی لەلایەن ئەحمەد مەحموود کە لێپرسراوی لقی سلێمانی ئیسماعیل مەحموود سکرتێرو لێپرسراوی لقی کەرکوك بۆ مام جەلال وازیان لە خوێندکاران هێناو ئەبو زەید سەمەد شەریف ناسراو بە سامان کەرکوکی لێپرسراوی بارەگای خوێدکاران و پەیوەندییەکانی خوێندکاران بوو، بوو بە سکرتێری یەکێتی خوێندکاران تا ساڵی ١٩٨٧ لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەستگیر دەکرێت ئیتر ڕێکخراوی خوێندکاران کار و چالاکییەکانی بەناو ڕێکخراوەیی مایەوە تا دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ دووبارە ڕێکخراوەکە وەکو درێژەپێدەری هەمان ڕێکخراوەکە بۆ دیدار و کۆبوونەوەکان و ڕاپەراندنی ئیش و کاری ڕاگەیاندن و بڵاوکراوەکانی خوێندکاران و بە چاپ گەیاندن و ناردنەوەی بڵاوکراوەکان بۆ ناو شار و پەیوەندییەکانی خوێندکاران لەگەڵ پارت و ڕێکخراوەکانی تر بە تایبەتی یەکێتی نیشمانی کوردستان و یەکێتی مامۆستایان کە بارەگای لە بالیسان بوو دەستبەکاربووە.

*** بارەگای خوێندکاران پێکهاتبوو لە سێ پێشمەرگە:-**

١- ئەبو زەید سەمەد شەریف.

٢- عیدۆ قاسم شوکر

٣- عەبدولرەحمان حەمید جۆڵا ناسراو بە ئاوات.

٤- سیروان عەزیز فەلامەرز ناسراو بە سیروان دیسکۆ

*** بڵاوکراوەکانی یەکێتی خوێندکارانی کوردستان:-**

١- گۆڤاری (ڕێبازی خوێندکاران) لە سەردەمی ١٩٨٢-١٩٨٤ سێ ژمارەی لێدەرچووە، لە سەردەمی دوای کۆنفرانسی سێ تەنها یەك ژمارەی لێدەرچووە.

٢- گۆڤاری (بابە گورگور)، لقی کەرکوك دەریدەکرد، سێ ژمارەی لێدەرچووە، دووانیانی بەدەستخەت و بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوە، یەك ژمارەی بە تایپ دەرچووە.

٣- گۆڤاری (هەڵوێست) لقی موسڵ دەریدەکرد، نازانرێت چەند ژمارەی لێدەرچووە.

بێجگە لە گۆڤار چەندان نامیلکەیان بە چاپ گەیاندووە وەکو:-

١- ئەرکەکانی ڕێکخراوی لاوان، لینین، وەرگێران، هەڵگورد ناوی نهێنی نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد بوو.

٢- کەموکورییەکانمان چۆن چارەسەر دەکرێت، نەسرەوت، ناوی نهێنی ساڵح عەزیز ڕەشید بوو.

*** خۆپیشاندانی ساڵی ١٩٨٢ی کەرکوك ڕۆژێکی پرشنگدار لە مێژووی کەرکوك و کوردستان:-**

**هێمن مەولود**

٦ی ئایاری ساڵی ١٩٨٢ئەو ڕۆژەیە کە سەراپای کەرکوك هەژا، شار خرۆشا، ڕژێم و دام ودەزگاو سیخوڕەکانی پەشۆکان، کوردەواری هەناسەیەکی پڕ بەسییەکانی هەڵمژی وبزەو خەندە و فرمێسکی شادیش لە ڕووخساری کەرکوکییە ستەمدیدەکان ئاوێتە بوون. لەدوای مانگرتنی گاورباغییەوە بۆ یەکەمجار و دوای نزیکەی چل ساڵ کەرکوك و کەرکوکییەکان دەنگی نارەزایی و ڕاپەڕینیان بەرزکردەوە و لەپاڵ کوردی شارەکانی دەستە خوشکی لە کوردستاندا دەستیان نایە بینە قاقای ڕژێمی ئاگر و ئاسنی بەعس و وەکو دەنگێکی زوڵاڵی قەڵایەکی هەمیشەیی کوردایەتی بەرژێمەکەی سەدامیان گوت ئیتر جامەکە پڕبووە و لێی دەڕژێ. دوای چەندین ساڵ لە ڕاگواستن و دەرکردن و تەعریب و سەرکوتکردن و زیندانی و کوشتن و بڕین، کوردی کەرکوك بەیەك دەنگ گوتیان ((نابۆ ڕاگواستن و گرتن وڕاوەدوونان دوورخستنەوە، ئازادی بۆ زیندانە سیاسییەکان، بەهێزی مامەڕیشە دوژمن ئەدەین لە شیشە، یەکێتی نیشتیمانی-ئاگرە بۆ دوژمنانی)) کەرکوکییەکان ڕژانە سەرشەقام و کۆڵانەکانی شار و کوورەی ورە و باوەڕی کوردایەتی جۆشی سەندو گڕی لەترسی پەنگخواردووی چەندین ساڵەی سەرکوتکردن بەردا و گەنجان و خوێندکارانی شار بوونەوە بە شنەی شەماڵی شۆڕشێکی شادی بەخشی پەرچەمی باوەگوڕگوڕ و کڵپەی ترس و تۆقاندنیان لە هەناوی ڕژێم و دەزگا سەرکوتکەرەکانی بەردایەوە. نەعرەتەی گەنجانی کەرکوك لەدوای خوێنی بەناهەق ڕژاوی هێشتا تەڕ و وشکەوە نەبووی خوشکە سنەوبەر و دایە ئامینەی قەڵادزە و کاکە سەفا ڕەشیدی کەرکوك و تاکە شەهیدی زانکۆی سەلاحەدین، دڵی سەدامییەکانی داخورپاند. ئەو ڕۆژە کەرکوك وەك کڵپەی ئاگرەکەی باوەگوڕگوڕ داگیرسا و لە سەر گۆڕستانی شیخ محێدینەوە زیاتر لە سێ سەد گەنجی کورد، هەڵمەتی خۆپیشاندانیان هێنا بەرەو خوارەوە بۆ گەڕەکی کۆماری و ئاخوڕحوسێن و سەرجادەی حەسیرەکە و بەرەو بناری قەڵاو جووت قاوە، وڕەی کوردانەی کوڕان و کچانی شار بەدەم هاوار و هوتافی بەعسی بەزێنەوە هەموو شارەکەی هەڵگێڕایەوە، دەبوایە سەرلەبەیانی خۆپیشاندانەکە لەبناری قەڵاوە چەخماخەی بدایە وهاوکات خوێندکارانی پەیمانگەی تەکنیکی لە خوارشارەوە دەوام بەجێبهێڵن و بەرە ناوجەرگەی بازار و شار هەڵکشێن و لەگەڵ ئەم قۆڵەی قەڵادا یەك بگرنەوە، بەڵام ترسی ڕژێم لەو ڕاچەنینەی کوڕانی کەرکوك لەو ئان و ساتەی ڕژێمی نقوم بوولەناو خوێنی شەڕی ئێراندا و مەترسی ڕاپەڕینی گەورە تر، هەرزوو سەرلە بەیانییەکەی بەردەگای پەیمانگە بەقوەخاسە و ئەمنە گورگە برسییەکانی بەعس گیرا و ئابلۆقە درا، بۆیە چاوەڕوانی هەواڵی خوێندکارانی پەیمانگەش چەخماخەی خۆپیشاندانەکەی بۆ دوای نیوەڕۆ دواخست و کۆمەڵبوونەکەشی لەچاوی گومانی ڕژێم بۆ سەر گۆڕستانی شیخ محێدین گواستەوە. سەعات سێی پاش نیوەڕۆ گەنجانی ئامادە بەرەو مەرگ بۆ پێشوازی لەمەرگ و گیانبازی ئارامیان نەما و پۆل پۆل لە پەنای کێلی گۆڕەکانەوە هاتنە دەرەوە و کۆمەل کۆمەل لە گەڵ گیانی پاکی مردووانی ئەو گۆرستانەدا بوونە شەپۆلی هاوار و بەدەم هۆتاف کێشانەوە شۆڕبوونەوە.

سێ ئافرەتیش شێرانە تێکەڵ بەخۆپێشاندەرانبوون، دوانیان پرشنگ عەبدوڵلا و سارا واحید بوون ئەوی تریان نازانم، بە کۆڵانەکانی کۆماری و ئاخوڕ حوسێن و بەدەم لە دەرگا دانی ماڵان بۆ بانگەوازی کڵپەی نارەزایی و هاندانی دایکان بۆ ناردنی رۆڵەکانیان شەپۆلەکە بە خوڕ تر و پڕبلێسە تر دەبوو، هەرلە ڕێوە داوا لە دوکاندارەکانی سەر ڕێگاکە بازارەکەی نزیك مزگەوتی نایب ئۆغلو دەکراکە دوکانەکانیان دابخەن و ئەو ڕۆژەمان بگرن و دوکان نەکەنەوە، ئینجا بەرەو سەرجادەی حەسیرەکە و ناو بازاڕی حەلواچییەکان و بۆ خان خورما داگەڕان و بڵاوبووە و حەماسی خۆپیشاندان کرایە یەکپارچە ئاگری نارەزایی و جەلادەکانی شێت وهار کرد و هێزی ئەمن لە ئەمنی کەرامەوە و قوە خاسە و پۆلیس و تەنانەت ئەو جەیشی شەعبیانەی فریاش دەکەوتن شێتگیرانە هاتنەسەر خۆپشاندەران،لەسەرەتاوە بەپیکابێکی شۆفرلێتی سووری پڕ لە قوە خاصە و ئەمنەوە بە تەقەکردنەوە کەوتنە دەستریژ و مل پێوەنانیان.ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە خۆپیشاندەران بەناو دوکان و ماڵەکانی بن قەڵاو خانخورماداپەرتەی لێ بکەن.هەندێکیان دەرگایان بەروودا داخرا و هەندێکیشیان داڵدە دران وشاردرانەوە, بەڵام زۆریش دەسگیرکران و پەستێنرانە ناو شۆفرلێتەکە و ئۆتۆمبیلی پۆلیسەوە و پۆل پۆل بەرەو ئەمنی کەرامە بردیانین ئەمنی کەرامە کە زۆر نزیك بوو لە ڕێڕەوی خۆپیشاندانەکەوە لەسەر خاسە و بەرامبەر بە قەڵا هەر زوو خۆیان بۆ پێشوازی گیراوەکان ئامادەکردبوو، بۆیە هەر بەگەیشتنیان بەکۆمەڵ قوەخاسە لەبەر دەگاو هەردوو دیوی ڕێڕەوەکەی حەوشە تا بن هەیوانەکەی بارەگای ئەمنی کەرامە وەستابوون و بەدار و بە کێبل و سۆندەوە بەردەبوونە ئەو گیراوانەی کە بەشەق و مشتەکۆڵە لەئۆتۆمبیلەکانەوە دەهێنرانە خوارەوە .هیچ کەس نەبوو بە ساغی بە بێ خەڵتانی خوێن کردن بگاتە بن هەیوانەکە. پاش دووسەعات حەوشەو بەرهەیوانی ئەمنی کەرامە پڕ بوو لەگیراو بۆیە دیاربوو ئۆتۆمبیلی داپۆشراو وێنەی پاسی بچووکیان هێناو بەپالە پەستۆپڕیان دەکرد بەرەو ئەمنی مەنسوور و مودیرییەی ئەمنی کەرکوك دەیانبردین، بەڵام تا گەیشتینە ئەوێ هەندێکمان لەبەر تەنگەنەفەسی بێهۆش بوون. لەوێش پەڕۆی لافیتەیان بۆ بەستانەوەی چاوی گیراوەکان کۆمەڵ کردبوو،هەرلەگەڵ دابەزاندنمان بەدەم شەق و تێهەڵدانی دەس بەدارێکەوە بەو پەڕۆیانە چاومان دەبەسترایەوە و کەلەپچەشیان دەکردین پاشان هەر بەشەق

و تێهەڵدانەوە براینە چەندژوورێکەوە، ئیتر لەبەرەوە ئەوەی برینەکانمان زۆر بوو دەیانبردین بۆ تەداوی کردنێکی پیس و سەرپێیی، کە بە ئازارترین ئەشکەنجەو کولاندنەوەی برینەکان لەبەر هەیوانی یەکێك لە ژوورەکانی ئەشکەنجەدا ئەنجامیان دەدا.دواتریش دەبراینە خوارەوە بۆ ئەو ژێر زەمینە گەورەیەی کە بە دوو دەرگای ئاسنی زنجیر و قفڵ بەند دەچوونە خوارەوە.ئەمە هەمووی تاکو ئێوارەیەکی درەنگی ٦ی ئایاری خایاند و شەویش هەرزوو دەستیان بە ئەشکەنجەدانی یەك بە یەکی گیراوەکان کرد بە ئامێری کارەبا و بە کێبل و گوشینی برینەکان و کولاندنەوەیان و کوژاندنەوەی جگەرەی رۆسمان بە چزاندنی بەسەر دەست و جەستەی گیراوەکانداهەر ئەو شەوە چەند گیراوێك بەو پەری درندانە لەژێر ئەشکەنجەدا گیانیان سپارد و مردن و هەندێکیش ئیفلیج و کەم ئەندام کران. جەللادەکان چێژیان لە ئەشکەنجەدان و ئازاردان و کولاندنەوەی برینی گیراوەکان وەردەگرت و بەدەم دەیان جنێوی پیس و دەیان قسەی ناشایستە بەخوا و پێغەمبەر و دایك و خوشکی گیراوەکانەوە کەف و کوڵی دڵی جەللادانەیان دادەمرکاندەوە ئیتر بەم شێوەیە ئازار و ئەشکەنجە بەردەوام بوو تاکو چەندین گیراوی تر لەژێر ئەشکەنجەدا مردن و هەرخۆیان شەوان بەنهێنی تەرمەکانیان دەبردن بۆ دەرەوە و کەس نەیدەزانی بۆ کوێیان دەبەن،ئەوانەی بۆ ئەشکەنجە دەبردران و نە دەهاتنەوە لەوانە بوون کە لەژێر ئەشکەنجەدا دەمردن یەکەمجار کەبردیانین بۆ ئەمنی کەرامە (ئێستا کۆمیتەی ئیمام قاسمی لێیە) ئیتر لەوێ بەدوو ریزی بەرامبەر بە یەکتر لەدەرگای حەوشەوە تاکو ناو هەیوانەکە لە هەردوو لاوە دار و کێبل و سۆندەمان بۆ دەهات، تا ئەبوو کەس بەساغی بگاتە بەر هەیوانەکە، هێشتا هەرلەوێ بووین، یەکێك لەو دووکچەشیان هێنا کە لەگەڵمان بوون لەخۆپیشاندانەکە (پرشنگ عەبدوڵلا) یان هێنا و قسەی زۆر سار دو سووك و جنێویشیان پێ دەدا تاکو شەو پریان کرد و ئیتر لەبەرەوە بەسەیارەی قەپات و نەفەس بڕ، کۆمەڵ کۆمەڵ دەیانگواستینەوە بۆ ژێرزەمینەکەی ئەمنی مەنسووروەدیریەو لەوێ چەندین جۆری ئەشکەنجە دەستی پێکرد، بەڵام هەر بە گەیشتنمان بەپەرۆ کۆنەی لافیتە چاومانیان دەبەستەوە و دەستیشیان کەلەپچە دەکردین، ئینجا بریندارەکان بۆ چارەسەر و ئەشکەنجەیان بردین من هەر ئەو ئێوارەیە بەئەشکەنجەوە ٧ تەقەڵ پشتی سەرم و سێ تەقەڵیش سەروو برۆی چەپمیان دوورییەوە و شووشەیەك سپرتۆیان کرد بە سەرما، زۆری تریش لەبریندارەکان بەهەمان شێوە تەداوی کران

ئەو شەهیدانەی کە لە راپەرینی ٦ی ئایاری ساڵی ١٩٨٢ شەهید کران وزۆربەیان تائێستاش گۆڕیان ونە و کەس نازانێت لەکوێ نێژراون، دووورنییە ئەو گۆڕانەی کە چەند شەوێك دوای گرتنمان و زیندانی و ئەشکەنجەدانمان، کە لە گۆڕستانی شێخ محێدین شەوانە لەلایەن جەللادەکانی رژێمەوە دەنێژران ئەم هاورێیانەی ئێمە بووبن، بەڵام بە نەناسراوی نێژراون ولە گۆڕنراون و ئەوکات لەترسی رژێم کەس نەیتوانیووە بەدواداچوونی بۆ بکات

ناوی شەهیدەکان:-

١- ستار عوسمان (بێ کراس) هەر یەکەم سەعات لە دەرگای جووتقاوە شەهید کرا
٢- عەلی خەتاب، لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو
٣- جەلال ئەحمەد حەسەن، لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو
٤- هیوا رەشید، لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو
٥- فەرەیدون فەتحوڵلا، لەژێر ئەشکنجەدا شەهید بوو
٦- عەباس عەلی مەولود، لەژێر ئەشکنجەدا شەهید بوو
٧- عەبدولقادر حەسەن، لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو
٨-ئازادعەبدولقادرحەمەموراد،لەژێرئەشکەنجەداشەهیدبوو
٩- عەلی سەلیم، لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو
١٠- رەسول کەریم شەریف، لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو
١١- رەشاد مورادخان، لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو

بۆ هێورکردنەوەی خەڵکی کەرکوك و درێژە نەکێشانی کەشی گرژی ناوشار و قلیشانەوەی زیاتر و هەوڵە بەردەوامەکانی گەنجانی کەرکوك بۆ راپەرین و خۆ پیشاندان، رژێم لەترسا پۆل پۆل ئازادی دەکردین، بەڵام باوك و لێپرسراوی یەکەمانیان بانگ دەکرد بۆ بەردەم بەڕێوەبەری ئەمنی کەرکوك و لەو پاش وتارێکی بەعسیانە و کوڵێ هەرەشە و چاوسوورکردنەوە لەباوکانمان و هەرەشەکەی بەڕێوەبەر (جارێکی تر لە یەك گوللە زیاتریان لێ سەرف ناکەین) دەرۆیشتینەوە، بەڵام بەدەگمەن کەسێکمان مابوو سەری یان شوێنێکی نەشکێنرابێت و و خەڵتانی خوێن نەکرابێ من خۆم لە دووجێوە سەریان شکانبووم و هەر لەوێ بۆیان دووریمەوە وەکو ئەوەی پارچە قوماشێك بدوورنەوە، پشتی سەرم ٧ تەقەڵ و سەرووی برۆی چەپیشم ٣ تەقەڵ، کەپاشان بۆماوەی ٥مانگ زیاتر بەتەری مایەوە و هەوی کرد و بووە هۆی ئەوەی نەتوانم لەوانەی فیزیا لە دەوری دووەم دەربچم و ئەوساڵە تەنها لەبەر ئەو وانەیە مامەوە و لەبەر برینەکانم نەمتوانی بخوێنم . نەجمەدین سالح لاقیان شکاند، عەبدولخالق پێیان سووتاند و دواتر کرم لێی داو هەندێکی برایەوە، بەختیار هەردووچاوەکانی لەگەڵ ئەشکەنجە و لێدان نەختێك دەرپەرینەدەرەوە کەتاکو ئێستاش پێوەی دیارە، هەموو ئەوانی تریش لانی کەم سەریان شکێنرا بوو .

ناوی ئەو زیندانیانەی کەدوای ئازاد کردنیان لە ٢٢ی تەمموزی ساڵی ١٩٨٢ لە شوێنی ترو لە پێشمەرگایەتی شەهید بوون :

١- کامیل عەزیز، دوای ئازاد کردنی هەر بە برینەکانی زیندانەوە کۆچی دوایی کرد.
٢- فوئاد فەرەج، لە کۆرەوەکە شەهید کرا .
٣- ئەسعەد یابە، دوای ئازاکردنی کۆچی دوایی کرد.
٤- ئەنوەر عەلی مەولود، لە پێشمەرگایەتی شەهید بوو.
٥- شێرکۆ جەلال (وێنەگر)، بە پێشمەرگایەتی گیراو لە سێدارەدرا.
٦-سەعیدعەبدولرەحمان،دوای ئازادکردنی کۆچی دوایی کرد.
٧- عەبدولرەحمان حەمە سالح، دوای ئازاد کردنی کۆچی دوایی کرد.

هەموو ئەوانەی کەدوای ئازاد کردنیان

مردوون، یان بەهۆی برینەکانیانەوە بووە، یانیش گومانی ژەهراوی بوونیان لێدەکرێت نەوزاد فەتحوڵلا ناسراو بە (هیوا) پێشمەرگەی تیپی (٥٢)ی خاڵخالان ی یەکێتی نیشتیمانیی کوردستان کەبە پێشمەرگایەتی شەهیدبوو، ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لەخۆپیشاندانەکەدا ... لەم بەشەدا ناوی ئەوخۆپیشاندەرانەی لەڕۆژی ٦ی ئایاری ١٩٨٢دالەلایەنهێزەسەرکوتکەرەکانی بەعسەوەدەسگیرکران، بڵاو دەکەمەوە هەرچەندە هەمووی نییە بەڵام هیوادارم ناوی ئەوانی تریشم دەستکەوێ بیانخەمە سەر لیستەکە. ئەم ناوانەی خوارە ناوی زیندانیانی خۆپیشاندانەکەیە کە لەڕۆژی ٦ ی ئایاری ١٩٨٢دا گیران و لەژمارە ١ هەتا ٧٥ لە٢٢ی تەمموزی ساڵی١٩٨٢ بەلێبوردنی گشتی ئازادکران و لەژمار ٧٥ بەدواوە پێش ٢٢ی تەمموز دوای ئازار و ئەشکەنجە و لێکۆڵینەوەی چڕ پۆل پۆل ئازادکراون .

ناوی زیندانییەکان:

١- ئاشنا محەمەد سەعید
٢- نەوزاد عەلی حەسەن
٣- یوسف عومەر عەبدولڕەحمان
٤- سالم مستەفا
٥- ئەحمەد عەلی مەولود
٦- سەباح عەبدوڵلا حەمەدئەمین
٧- ڕزگار ئەحمەد عەزیز
٨- غالب کامل شامار
٩- شەماڵ کەماڵ عەزیز
١٠.ستار عەبدوڵلاعەلی
١١- نەجمەدین عەبدولقادر
١٢- سیروان عەبدولقادر
١٣- ئەحمەد عادل عەلی
١٤- دلێر عەبدولڕەزاق
١٥- نەجمەدین محێدین
١٦- غەریب خورشید
١٧- سەعدوڵلا ڕەشید
١٨- فەرەیدون مستەفا
١٩- نەوشیروان ئەحمەد
٢٠- عەبدولخالق سدیق ڕەشید
٢١- نەوزاد عەبدولقادر
٢٢- سەباح عەبدولڕەحمان
٢٣- مەجید محەمەد سەڕاج
٢٤- لوقمان عەلی حەسەن
٢٥- سالح یوسف
٢٦- بورهان فەقێ وەیس محەمەد
٢٧- سەباح حەسەن عەبدولکەریم
٢٨- سەباح سەمەد عەزیز
٢٩- ئەحمەد عەبدول
٣٠- نەجمەدین سالح ڕەمەزان
٣١- بەختیار عەبدولڕەحمان
٣٢- دیاربەکرخورشید
٣٣- جەلال محەمەد
٣٤- ستار عەباس
٣٥- بورهان سەلاحەدین محەمەد
٣٦- لوقمان حەمە ڕەش
٣٧- غالیب محەمەد نەجم
٣٨- ئاکۆ
٣٩- کاوە
٤٠- خەلیل نازم عەلی
٤١- سەلاح عەرەسەیی
٤٢- فازڵ عوسمان فەقێ
٤٣- پرشنگ عەبدوڵلا شەریف
٤٤- شێرزاد خورشید
٤٥- جومعە عەبدوڵلا عەلی
٤٦- نەجات حەمەڕەشید
٤٧- هیدایەت عەبدولوەهاب عەبدولکەریم
٤٨- سامان حەمید سەعید
٤٩- سامی جەلال عزیز
٥٠- کامەران
٥١- ئازاد عەباس خاڵەباوە
٥٢- نەجات محەمەد دمە
٥٣- ئەنوەرعەلی مولود
٥٤- سەباح عەبدولعەزیز
٥٥- ماجد ئەحمەد محەمەد
٥٦- محەمەد عومەر عەبدولکەریم
٥٧- عەدنان محەمەد مەولود
٥٨- ئەبوبەکر مەولود ڕەشید(هێمن مولود)
٥٩- سەرکەوت محەمەد
٦٠- محەمەد عومەر عەبدولکەریم
٦١- غالب سەعید
٦٢- نەوزاد حەمزە
٦٣- عەبدولڕەحمان ڕەسوڵ محەمەد
٦٤- جاسم محەمەد (ڕێبوار)
٦٥- فەرهاد هیدایت
٦٦- ئیحسان محەمەد محێدین
٦٧- شێرزاد سادق تالەبانی
٦٨- بەرزان
٦٩- کاوە حوێز
٧٠- سدیق
٧١- عومەر
٧٢- شوان وەلی
٧٣- نەبەز
٧٤- دلشاد
٧٥- مەمەدحاجی ئاغا
٧٦- سەید حەمە جەمال
٧٧- ئیسماعیل حاجی مورشید کەبابچی
٧٨- سەلاح مەجید پیرۆت
٧٩- سەباح حارس

*** تێبینی بێگومان ئەمە هەموو ئەوانە نین كە دەستگیر كرابوون، بەڵكو ئەوەندەی كەوتە دەستمان و دۆزیمانەوە، بۆیە سوپاسی هەركەسێك ئەكەین كە هاوكارمان بێ بۆ ناردنی ناوی ئەوانەی رۆژی خۆپیشاندانەكەی ٦ی ئایاری ١٩٨٢ لە كەركوك دەستگیر كرابوون**

*** ڕێکخراوی (أطباء بلا حدود) لە کەرکوك:-**

ڕێکخراوێکی پزیشکی مرۆڤایەتی سەربەخۆیە، کار و کۆشش دەکات بۆ چاودێری پزیشکی لەناکاو و کوتوپڕ، هەنگاو دەنێت لەپێناو ڕزگارکردنی ژیانی خەڵکی، کارەکانی لە (٧٢) دەوڵەت و دەڤەرانی جیهاندا پەرەپێداوە.
کاری لەسەر چارەسەری پزیشکی بێلایەن دەکەن و لایەنگری هیچ کەس و لایەك ناکەن، سەیری ئایین و بنەچە و لایەنگری سیاسی و ڕەگەز ناکەن، هەربۆیە سەربەخۆیی خۆیان پاراستووە، باربوو لە هیچ حکومەت و دەزگایەکی نێودەوڵەتی وەرناگرن و کارەکان لەسەر یارمەتی تایبەتی لە کۆمەڵانی خەڵك بەڕێوە دەچێت لەسەرتاپای جیهان بۆ بەردەوامی لە پرۆژە و کارەکانیان.
ئەم ڕێکخراوە هەر لە ساڵی ١٩٩١ەوە بە یارمەتی ١٥٠٠ فەرمانبەر لە عێراق کارەکانی بەردەوام کردووە، بە پێشکەشکردنی چاودێریی تەندروستی بە خێرایی و بە کوالیتی زۆر چاك و بەرز، کارەکانی لە پارێزگاکانی بەغداو دیالە و هەولێر و موسل و کەرکوك پەرەپێداوە و خزمەتی کردووە.
هەر لە ساڵی ٢٠٠٩ەوە لە کەرکوك کار دەکات و چاودێری تەندروستی و مرۆڤایەتی پێشکەش بە ئاوارەکان دەکات لە حەویجە و ناوچەکانی تر، بەڕێوەبردنی کارەکانی لە شێوەی نۆرینگەی گەڕۆکە لە دوبز و مەکتەب خالید بۆ ماوەی ١١ مانگ، هەروەها پشتگیری بەشی فریاکەوتنی نەخۆشخانەی ئازادی و نەخۆشخانەی کەرکوك دەکات لە ڕێگای بەخشینی کەرەستە و ئامرازی پزیشکی.
هەروەها هەر لە دیسەمبەری ساڵی ٢٠١٧ تا داخستنی کۆمەڵگای ئاوارەکان لە دیسەمبەری ساڵی ٢٠١٨ یارمەتی پزیشکی پێشکەش بە ئاوارەکانی کۆمەڵگای داقووق کردووە.
هەر لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٨ەوە چارەسەری پزیشکی بۆ بریندارەکانی نەخۆشییەکانی (غیر ساریە) پێشکەش کردووە، بارێکی دەروونی بۆ چارەسەرکان گونجاندووە لە (العباسی) لەلای قەزای حەویجە کە چارەسەری ٩٢٧ نەخۆشی کردووە، هەروەها ١٨٠٧ کەس بەشداری لە کۆبوونەوە ڕۆشنبیریی پزیشکییەکان کردووە، لەگەڵ ئامادەبوونی ٩٣ نەخۆشی لە چارەسەری تاکە کەسی

# پێرست

لە هەڵسەنگاندنی ڕووداوە مێژووییەکاندا، گەلێک چەمکی جۆراو جۆر هەیە کە دەرهاویشتەی ئەو ڕووداو دەسەڵاتە سیاسیانەیە کە دەسەڵات یان فەرمانڕەواییان دەسەڵاتی ڕەهایان وای کردووە کە ببێتە بنەمایەکی گرنگ لە دەست بەسەڕاگرتنی هەموو ئەو بنەمایانەو تواناکانیان لە توانەوەی دەسەڵاتەکانیان گەلێک ڕێبازو شێوازییان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی کە دەسەڵاتە فراوانەکانیان شەرعیەتو بەردەوامی خۆی هەبێت. ئەو چەمکی دەسەڵاتانە خۆی گونجاندووە لەگەڵ جۆری شێوازەکانیانو توانییانە ئەو شێوەیە لە فەرمانڕەواییان تا ماوەیەکی دوورو درێژ بنەمای خۆی بگرێت.

ڕاگواستن، تەعریب (عەرەباندن- بەعەرەبکردن)، پاکتاوی نەژادی، ئەنفال، جینۆساید، تەتریک، تەفریس هەموو ئەمانە لەو چەمکانەن کە دەوریان هەبووە لە سڕینەوەی نەتەوەیی ئاینیی نەتەوەیەک بەسەر نەتەوەیەکی تردا.

**دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان**
**لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە**
**2023**